

قەلاّى هەولێر

- ناوی کتێب: ئینسکلۆپیدیای هەولێر «ئەربیل»
- ئامادەکردنی: لیژنەی باڵای ئامادەکار:
د. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د. مەولود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد،
د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- سەرپەرشتیاریی هونەریی و خۆشنووسی: محەمەد زادە.
- دەرهێنانی هونەری: عوسمان پیرداود.
- جێبەجێکردنی هونەری: عصام موحسین نادر، رزگار موحسین نادر.
- نەخشەکان:سەردار محەمەد - وشیار حەمەددمین
- هەڵەبڕی و پێداچوونەوە: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، عەبدولڕەحمان مەعرووف، رەحیمی سورخی.
- هەڵەبڕی کۆمپیوتەر: مەسعود ئیبراهیم، ئەیوب یوسف.
- سکەنەری وێنەکان و رێکخستن: بەدرخان یوسف.
- سەرپەرشتیاری گشتیی چاپ: حەمید ئەبوبەکر بەدرخان.
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٩ لوبنان
- چاپخانە: گرین گالۆری- لوبنان
- تیراژ: ٢٥٠٠ دانە.
- رۆژی دەستپێکردن: ٢٠٠٥/١٢/٢٦ - رۆژی تەواو بوون ٢٠٠٩/٩/٢٥
- لە کتێبخانەی گشتی ژمارە «١٨٣٢» ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ.

- نرخ: (١٥٠٠٠) دیناری عیراقی

**لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان**

# ئەندامانی لیژنەی باڵای ئامادەکاری ئینسکلۆپیدیای هەولێر (ئەربیل)



**د.عەبدوڵلا محەمەد عەلیاوەیی - سەرۆکی لیژنە**

* ١٩٥٧ هەولێر. * ١٩٩٨ بڕوانامەی دکتۆرا لە مێژووی کورد، زانکۆی سەلاحەددین.
* ٢٠٠٥ ئەندامی پەرلەمانی عێراق - لیستی هاوپەیمانی کوردستان.



**د.مەولود ئیبراهیم حەسەن- بەڕێوەبەری گشتی ئینسکلۆپیدیا**

*١٩٥٣هەولێر. * ٢٠٠٦ بڕوانامەی
دکتۆرا لە بەشی کوردی،
زانکۆی سەلاحەددین.



**فەرید سابیر قادر ئەسەسەرد- ئەندام**

* ١٩٥٦ هەولێر. * ١٩٨٠بڕوانامەی
بەکالۆریۆس، دەروونناسی، زانکۆی بەغدا.
* بەڕێوەبەری سەنتەری لێکۆڵینەوەی
ستراتیجی کوردستان.



**د. ئومێد ئیبراهیم جۆزەلی - ئەندام**

* ١٩٦٦ هەولێر.
* ٢٠٠٤ بڕوانامەی دکتۆرا لە مێژووی
ئیسلام، زانکۆی غازی ئەنقەرە.



**حەمید ئەبوبەکر بەدرخان - ئەندام**

* ١٩٦٧هەولێر. * ١٩٩٣ بڕوانامەی
بەکالۆریۆس لە ئابووری، زانکۆی سەلاحەددین.
* لێپرسراوی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان.

# بیرۆکەی دانانی ئەم ئینسکلۆپیدیایە

نووسین و دانانی ئینسکلۆپیدیا هیوا و ئاواتی هەموو کوردێکە، جا چ ئینسکلۆپیدیای گشتی کوردستان بێ، یا ئەوەتە ئینسکلۆپیدیای بەش بەش و بابەت بابەت و شار، .. شار بێ! بە تایبەت بۆ میللەتی کورد و خەلکی کوردستان، کە لەم رووەوە زۆر دواکەوتووین. ئەم وڵاتە -کوردستان- مێژوویێکی دوور و درێژ و پڕ و چڕی هەیە و جوگرافیایەکی پان و پۆر و هەمەڕەنگ، ئەم مێژوو و جوگرافیایە جگە لە میللەتی کورد: رێڕەو و هەوارگەی زۆر میللەتی تریش بووە و مێژوویێکی دیاری لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆنترین شارستانیەت و زۆرترین شارستانیەتدا هەیە. جا وڵاتێکی ئاوا بێ شک پێویستی بە چەندین ئینسکلۆپیدیای جۆراو جۆر هەیە. بۆ ئەوەی بەتێری و بە دەوڵەمەندی هەموو گۆشەیەکی جوگرافی و هەموو قۆناغێکی مێژوویی روون بکاتەوە و بەدنیای بناسێنی، بەداخەوە باری سیاسی کوردستان تا ئێستاش بۆ ئەم جۆرە کارە زۆر لەبار نەبووە! ئەوەتا (بەڕێز دکتۆر مارف خەزنەدار) باسی ئەوە دەکات کە لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردووی هەزارەی رابردوو لەگەڵ بەڕێزان (دکتۆر جەمال نەبەز و دکتۆر کەمال فوئاد و د. عیسمەت شەریف وانلی) بەرنامە یان بۆ ئەم کارە داناوە و دواجار - بەهەر هۆیەک بێ- سەری نەگرتووە، ئێستا بەهۆی دڵسۆزی و لەخۆبوردوویی هەندێ نووسەری بەڕێز سەرەتایەک بۆ ئەم کارە پەیدابووە و هەندێ ئینسکلۆپیدیاش هاتوونەتە بەرهەم.

بیرۆکەی ئینسکلۆپیدیای هەولێر- سەرەتا لای دکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاوەیی پسپۆر لەبواری مێژووی نوێی کورد سەری هەڵداوە و ئەویش لەگەڵ حەمید ئەبوبەکر بەدرخان بەرپرسی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان لە شەوی ٢٥ لەسەر ٢٠٠٥/١٢/٢٦ لە ئوتێلی ئەبوسەنا و لەشاری سلێمانی گفتوگۆی لەسەر دەکەن و دەگەنە بڕیاری سەرەتایی، بۆ جاری دووەم لە شاری هەولێر و لەماڵی دکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاوەیی لە لەگەڵ کاک حەمید بەدرخان بڕیاری یەکجاری و دەست پێکردن دەدەن. هەر لەو دانیشتنە بڕیار دەدەن کە پەیوەندی بە چەند بەڕێزێکەوە بکەن و لیژنەیەک پێکبهێنن، دواجار لیژنەکە بەم شێوەیە پێکهات:

١- د. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی پسپۆڕی مێژوو و ئەندامی پەرلەمانی عیراق -(سەرۆک).
٢- د. مەولود ئیبراهیم حەسەن مامۆستای زانکۆ لە کۆلیژی زمان. زانکۆی سەلاحەدین - بەشی کوردی- (ئەندام).
٣- د. ئومێد ئیبراهیم جوزەلی مامۆستای زانکۆ- لە کۆلیژی ئەدەبیات بەشی مێژووی زانکۆی سەلاحەددین -(ئەندام).
٤- فەرید ئەسەسەرد- بەڕێوەبەری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی- (ئەندام).
٥- حەمید ئەبوبەکر بەدرخان- بەرپرسی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان. - (ئەندام).

پاش ئەوەی لیژنە پێکهات و دەست بەکار کرا، گرفتی باری دارایی گرفتێکی گەورە بوو، بەتایبەت ئینسکلۆپیدیا پێویستی بە پشتگیرییەکی چاک هەیە، ئەم گرفتە بۆ ئێمە، ئەندامانی لیژنە کۆسپێکی گەورەبوو، لەلایەک هەموو کەس و لایەنێک بڕوایان بە سەرکەوتنی کارەکە نەدەکرد و لەلایەکی تریشەوە پارەیەکی زۆری دەویست لە توانای هەموو کەس دانەبوو، هەرچەندە لەسەرەتا حەمید بەدرخان چووە ژێرباری خەرجیەکان و لەپاشان لە چەندین دەرگا درا، تا دواجار ئەم پێشنیازە خرایە بەردەم بەڕێز کاک کۆسرەت رەسوڵ عەلی جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستانی باشوور بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات، خۆشبەختانە، بەڕێزیان زۆر بەدەست و دڵکراوەیی هەموو خەرجی- ئینسکلۆپیدیای هەولێر-ی گرتە ئەستۆی خۆی وەک جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان. کە ئەم بڕیارەش لە راستیدا گیانی وەبەر کارەکەمان هێنا و لەخەمی پارە بێ خەمی کردین و بە گەرمی دەستمان بەکار کردەوە.

**لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیای هەولێر**

# ئینسکلۆپیدیای هەولێر بۆچی و چۆن؟!

دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن

ئەمڕۆ لە جیهاندا هەندێ دەستەواژە و پێناسە لەبارەی میللەتی کورد و خاکی کوردستان بلاوبوونەتەوەو چەسپاون و هەموولایەک دانی پێداناون، بەتایبەت زاناو پسپۆڕان، دەستەواژ و پێناسەکانیش بەشێکیان ئەمانەن:

١- کورد گەورەترین نەتەوەیە لە جیهاندا کە تائێستا دەوڵەتی سەربەخۆی نییە.

٢- کوردستان لانکەی مرۆڤایەتییە.

٣- کوردستان لانکەی شارستانیەتە.

٤- ئەشکەوتی شانەدەر دەوڵەمەندترین و کۆنترین ئەرشیفی مرۆڤایەتیە.

٥- هەموو پێشکەوتن و شارستانیەتێک لەدەرگای ئەشکەوتی (شانەدەر)ەوە هاتووتەدەردەوە.

٦- سۆمەریەکان کۆنترین میللەتن نووسینیان داهێناو شارستانیەتیان دامەزراند.

٧- هەولێر شارێکە باپیرانی سۆمەریەکان دروستیان کردووە.

٨- هەولێر کۆنترین شاری جیهانە کەتائێستا بەئاوەدانی ماوەتەوە.

ئەم هەشت پێناسەو دەستەواژەیە، هەر هەشتیان و زۆری تریش، هەمووی پسپۆڕان و شارەزایانی غەیرە کورد ئەمانەیان لەبارەی میللەتی کوردو خاک و شارو ئەشکەوتەکانیان گوتووە، هیچ یەک لەم پێناسەگرنگانە (کورد) نەیگوتوون.

میللەتێک و ولاتێک کە ئەم هەموو پێناسە زانستی و گرنگانەی لەلایەن زاناو پسپۆرە بیانیەکانەوە پێداهەلگوترابێ و رابردوویێکی ئاوا گرنگ و دەوڵەمەندی هەبێ، پێویستە خۆی خۆی بناسێ و خۆشی بە دنیا بناسێنێ، کەچی ئەوە پسپۆڕانی بیانی و دڵسۆزانن کە کورد و کوردستان بەدنیاو بەکورد خۆشی دەناسێنن، کەچی بەداخەوە کورد خۆی ئەگەر کارێکی ئەوتۆو وەکو پێویستی نەکردووە، زۆر جاریش- بەداخەوەیەکی تر- خۆشیان بڕوا بەو ڕاستی و حەقیقەتانە ناکەن کە زاناکان لەبارەی کوردەوە گوتوویانە.

لەم سەرەتای سەدەی بیست و یەکە کە جیهان لەرووی زانستی و پێشکەوتنەوە، خەریکە (پەرجو) دەکات بەزانست و زانست دەکات بە پەرجوو و چەکی زانست خەریکە ئەوا مەودا دوورو نەزانراو و بڤەکان داگیردەکات، کەچی هێشتا کورد (چەکی خەبات)ی لە شانەو ماندووی بەدەست هێنانی مافی (مرۆڤ!!) بوونیەتی. ئەم چەکی خەباتە کە لە چەکی سادەی سۆمەریەکانەوە دەست پێدەکات و دەگاتە (تیرەرم) و (بەردە ساچمە) ئاساکانی کاردۆخیەکان و بەردەوام دەبێت تا چەکی ئاگراوییەکانی هاوچەرخ کورد هەموو چەکەکانی خەبات و بەرگری بەکارهێناوە، ئەگەرچی ئەم چەکە (نەمرو نەژین) کوردی پاراستووە، بەلام؛ نەیگەیاندووتە ئامانج! ئامانجی بوونە مرۆڤ و ئازادبوون!! کورد ئەگەرچی مێژوویێکی دووروودرێژو پڕ لەکێشەو خوێنی لەگەڵ داگیرکەراندا هەیە لەبەکارهێنانی چەکی بەرگری و خەباتدا! کەچی ئەوەتا سەدەی بیست و یەک خەریکە جوگرافیاو جۆری چەک و ئامانجی خەباتەکان

دەگۆڕی و لەم (شەڕی ژیان)ەو ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم چەکە میراتیەی کورد بێ کاریگەر تر دەبێ! (شەڕی ژیان) دەمێکە لە جیهاندا چەکی تری پەیداکردووەو شەڕ لەسەر مافی تر دەکات. بە کوردی کورد بەم چەکە ئاساییە شەڕی (مانەوە) دەکات. کەچی مرۆڤایەتی بە چەکی زانست خەریکی (داگیرکردنی داهاتوو)ە!

ئەمڕۆ لەهەموو ڕۆژێک زیاتر کورد پێویستی بەوە هەیە کە خۆی خۆی بناسێ و هەر خۆشی خۆی- وەکو هەبووەو هەیە- بەجیهان بناسێنی، ناسین لەڕێگە هونەری و ڕۆشنبیریی و ئەکادیمی و زانستییەوە. ئەم ئەرکە لەهەموو کەسێک زیاتر لە ئەستۆی ڕۆشنبیرو زاناو پسپۆڕو ئەکادیمییانی کوردە. کە بابەتە جیاجیاکانی مێژوو و کلتوورو ئاین و زانست و تەواوی بەشە جیاجیاکانی شارستانییەتەکانی کورد، کورد وەکو هەبووەو هەیە بە جیهان بناسێنن، لەم کارەشدا ئەرکی لە پێشینەی حکومەتی هەرێم و وەزارەتەکان و زانکۆ و نێوەندە ئەکادیمییەکانیەتی کە بە پلانی زانستی و سەرمایەی پێویست و کادری دڵسۆزو پشووی درێژ بەرنامە بۆ ئەم کارە پیرۆزانە دابڕێژن. بەداخەوە لەم ڕووەوەش حکومەتی هەرێم بەتەمەنی حەڤدە ساڵیەوە ئەم بەرپرسیاریەتیەشی لە ئەستۆدایە.

کورد، بەم مێژوو دوورو درێژەی کە هەیەتی و بەم فراوانیەی کە جوگرافیاکەی داگیری کردووەو بەم دەوڵەمەندییەی کە ئەم جوگرافیاو مێژووە پڕە لە ڕووداوە، پێویستی بەزۆر ئینسکلۆپیدیا هەیە، بۆ خۆناسین و خۆ بە خەڵک ناساندن. لەبەر ئەوەی سەردەمی ئەوە تێپەڕی کە چیتر کورد وەک (قوربانی) و (بەزەیی پێکراو) خۆی بخاتە بەرچاوی دنیاو پێویستە لە (گرێی بێ دەوڵەتی) خۆمان ڕزگاربکەین و هەموو جوانی و گرنگییەکی کە وەکو کورد هەمانە، لەپەناو لاوازی و بێ دەسەلاتی پەنا نەدەین و لەبیر نەکەین، کار لە سەر ئەم واقیع و بەرچاویەی هەمانە بکەین و شەرم نەکەین و نەترسین خۆمان وەک خۆمان بناسێنین و واقیع وەک هەیە قبووڵ بکەین و بەدوای شتی دروستکراو و خەیاڵیدا نەگەڕێین.

ڕۆژگار تێدەپەڕی و نێوەندە ڕۆشنبیریی و ئەکادیمییە بەرپرسەکانی کوردستان بەو بەرنامە بێ بەرنامەییەی کە هەیانە، ڕۆژ بە ڕۆژ بێ هیواترمان دەکەن و هەتا دێش ئەرکەکان زۆرترو گرنگتر دەبن و دانیشتن و چاوەڕێ کردنیش دۆم گوتەنی: «ماڵ وێران دەکات» پاش ئەوەی لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیای هەولێر پێکهات. هەموو لایەک لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە کار بۆ شاری هەولێر بکەن و (ئینسکلۆپیدیای هەولێر) بکەن بە پرۆژەی یەکەمی لیژنەی باڵای دامەزراو، هەروەها لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن کە ئینسکلۆپیدیای هەولێر ئینسکلۆپیدیای هەولێر بێت نەوەک ئینسکلۆپیدیای تەنیا یەک بابەت بێ. بۆ نموونە: ئینسکلۆپیدیای مێژوو..یا جوگرافیا، یان ئایین، یا ئەوەتە هەر بابەتێکی تر، ئەگەرچی هەریەک لەم بابەتانەو زۆر بابەتی تری هەولێر هەڵدەگرن کە بەتەنیا ئینسکلۆپیدیای خۆیان هەبێ. بەڵام، سروشتی پێکهاتەی لیژنەکەو ئامانجی کارەکە وای دەخواست کە ئینسکلۆپیدیای گشتی هەولێر بنووسین، چونکە نووسینی ئینسکلۆپیدیا لەسەر یەک بابەت، بۆ شارێکی وەکو هەولێر کارێکی زەحمەتەو پشووێکی درێژی دەوێ و پێویستی بەکەسانی پسپۆڕەو کە پسپۆڕەکان بتوانن هەموولایەکی بابەتەکە ڕوون بکەنەوەو بۆشایی کەلێنی تێ نەکەوێ. بۆ نموونە: ئەگەر بابەتی مێژووی شاری هەولێر هەڵبژێردرابوایە، ئەوا هەولێر بەومێژووە کۆن و دووروودرێژە کە هەیەتی، زۆر کەمی لەسەر نووسەراوەو هێشتا زۆر سەردەم و ساڵ و سەدەو هەزارەی بەتاریکی ماوەتەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە. ئەگەر ڕای مێژوونووسەکان بەڕاست بزانین و هەشت هەزار ساڵەی تەمەنی شاری هەولێر قبووڵ بکەین، ئەوا بۆ نووسینی ئینسکلۆپیدیای مێژووی هەولێر پێویستیمان بەوە دەبوو کە لەم مێژووی هەشت هەزار ساڵەیە هیچ کەلێن و تاریکیەک لەنێو ئەم مێژووەدا نەهێڵینەوە. کەئەمەش کارێکە لەم ڕۆژگارەدا ئەستەمەو هێشتا شاری هەولێر زۆر نهێنی خۆی لەژێر زەوی و لەنێو شوێنە دێرینەکاندا پەناداوەو کە هێشتا دەستی هەڵکۆڵین و پشکنینی نەگەیشتووەتێ، جگە لەوەی کە بەشێکی گرنگی مێژووی هەولێر لەنێو لاپەڕەی دەستنووس و کتێبە کۆن و پەرت و بڵاوەکان لەنێو

کتێبخانە جیاجیاکانی زمانە جیاجیاکانی ولاتانی دەوروبەرو دنیادا هەن و تا ئەمڕۆکەش بەسەر نەکراونەتەوە. خۆ ئەوەش کە لەبارەی مێژووی هەولێر تا ئێستا نووسراوەو لەبەردەستە، پێویست دەکات جارێکی تر مشت و ماڵ بکرێ و ڕێکبخرێتەوە، بەم حاڵەشەوە، لەڕۆژی ئەمڕۆدا ئەستەمە بتوانرێ ماوەی هەشت هەزار ساڵەی تەمەنی شاری هەولێر بخرێتەوە سەریەک و مافی خۆی بدرێتێ، ئەگەر بۆ هەر (سەت) ساڵی تەمەنی هەولێر تەنیا یەک لێکۆڵینەوەمان پێویست بێ ئەوا دەبوو بەلانی کەمی هەشتا لێکۆڵینەوەی زەمەنە جیاجیاکانی مێژووی شاری هەولێر لەبەر دەست بوایە، کە ئەم ڕێژەیەش بۆخۆی ڕێژەیەکی کەمی تەواوی مێژووی ئەم شارە دێرینەیە. ڕاستییەکەی ئێمە ئەندامانی لێژنەی بالای ئینسکلۆپیدیای هەولێر لەسەر ئەوە کۆکین، کەبەم نووسراوانەی لەبەردەستە و ئەم توانایانەی لەبەرچاوە هیچ بابەتێکی هەولێر بەتەنیا ناتوانی- لەڕۆژی ئەمڕۆدا- ئینسکلۆپیدیای تەواوی پێ بنووسرێتەوە. ئەگەر کارێکی ئاواش بکرێ ئەوا کەم کورتییەکەی زۆر بەدەردەوە دەبێت، بەلام، ئەگەر ئینسکلۆپیدیاکە گشتی بێ و هەموو بابەت و لایەنەکانی ژیان و شارستانیەتی پارێزگای هەولێر بگرێتەوە، ئەوا هەرچەندە کارەکە زەحمەت ترە؛ بەلام، زەمینەی کار لەبارترەو دەرکەوتنی کەم و کورتیەکانیش سروشتی ترە.

**بۆچی هەولێر؟**

هەولێر وەکو شار لەڕووی مێژووییەوە دڵی زیندووی کوردستان و جیهانە. زیندووە بەوەی کە کۆنترین شاری جیهانەو تائێستا بەئاوەدانی ماوەتەوە. جگە لەوەی لەڕووی مێژووییەوە شارێکی کۆنە خاوەنی قەلایەکی یەکجار کۆنیشە، کە قەلاکەی یەکێکە لەپاشماوە شوێنەواریە برواپێکراوەکانی جیهان، کە چەندین هەزار ساڵە ئەم قەلایە وەکو کێوەکانی کوردستان بەزیندوویی و هەیبەتەوە لەم ڕۆژهەلاتە بەپیرۆزییەوە گەرمی ژیان دەپارێزێ. لەدامێنی ئەم قەلایەش (منارەی چۆلی)یە، کە پاشماوەی سەردەمێکی گرنگی دەسەلاتی کوردی موسلمانەو سەدان ساڵە ڕۆژانە تیشکی یەکەم هەلهاتنی ڕۆژی خۆرهەلاتی بەردەکەوێ و بای شەماڵی لەبەژن دەناڵی و منارە سەربلندانە سەیری هەیبەتی قەلا دەکات. ئەگەر لەمێژوودا هەولێر شوێنی تایبەتی خۆی هەیە لەنێو لاپەڕەی مێژووی جیهاندا، ئەوا ئەمڕۆکەش خاوەنی جێگەو تایبەتمەندی خۆیەتی لەسەر نەخشەی سیاسی ناوچەکە، هەر بۆیەشە ئێستا پایتەختی هەرێمی کوردستانەو شانۆیەکی گەرمی ڕووداوی گرنگ و بڕیارە سیاسیەکانی کوردستان و عێراقە، ئەمانەو زۆر خاڵی تریش بوونە هۆی ئەوەی کە پارێزگای هەولێر و هەولێری پایتەخت لەپێشی پێشەوەی شارو کارەکانی تربێت. هەولێر لە ئێستای خۆیدا بەم شوێنەگرنگەی کە هەیەتی، تەنیا لەنێو لاپەڕەی کۆن و گرنگی مێژوو نەماوەتەوە، بەڵکە بەگەرمی کەوتە نێو لاپەڕەی سیاسەت و ئابووری و ڕۆژانە لەسەر رووی یەکەمی لاپەڕەی ڕۆژنامە گرنگەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بەخەتی درشت و ورد جێگای تایبەتی خۆی دەگرێ و لەمەودواش بەرە بەرە دەخزێتە نێو هەواڵە هونەری و ئەدەبییەکانیش. بەکورتی هەولێر لەسەرەتای ڕێگای قۆناغێکی تری گرنگی مێژوویی ژیانی خۆیەتی. لەرەوشێکی ئاوادا هەولێر پێویستی بە ئینسکلۆپیدیاو کتێب و نامیلکەو نەخشە جۆراوجۆرو هۆکاری خۆدەرخستن و خۆناساندن هەیە. بۆیە ئەمڕۆ هەولێر لە هەر شارێکی تری کوردستان پتر پێویستی بە ئینسکلۆپیدیایەک هەیە. بۆ ئەوەی خۆمان و خەڵکیش باشترو لەیەک سەرچاوەو بتوانن لەزۆر ڕووەوە هەولێر - هەتا رادەیەک - بناسن. هەر بۆیە بە پێویستمان زانی ئینسکلۆپیدیای هەولێر بکەین بە میدیالیایەک و وەک دیارییەکی سەرسنگی قەلاو گەردنی منارەی پێ برازێنینەوە، بەم هیوایەی کە ئەم دیارییە لەم ڕۆژگارەدا جێگای ئالەکۆکی شوان بگرێتەوەو شیاوی بالای بەرزی منارەو هەیبەتی قەلای هەولێر بێت. و هەروەها وەک دیارییەک پێشکەش بە گیانی پاکی شەهیدەکانی هەولێر و هەموو کوردستانی بکەین، کە درێخیان نەکرد بۆ گەیشتنی هەولێر بەم ڕۆژەو بوونی بە پایەتەختی هەرێمی کوردستان.

ئەرکی ئێمە نیە لێرەدا باسی مێژووی ئینسکلۆپیدیا بکەین و بلێین کەی و لەکوێ و چۆن یەکەمینجار

نووسراوەو بڵاوکراوەتەوە، یان باسی جۆری ڕێبازەکانی نووسینی و نووسینەوەی ئینسکلۆپیدیای جۆراوجۆرەکانی بکەین. هەروەها ئەوەش بەزیاد دەزانین- بۆ ئێرە- بێین باسی مێژوو و جۆری ئینسکلۆپیدیاکانی کورد بکەین. بەڵام، بەئەرکی خۆمانی دەزانین کە بۆ خوێندەوارانی ئینسکلۆپیدیا روون بکەینەوە کە چۆن و چیمان کرد.

### چۆن دەستمان بەکارکرد؟

هەموو لایەک ئەوە چاک دەزانین، کە دانان و نووسینی ئینسکلۆپیدیای کارێکە پێویستی بە چەند لایەنێک هەیە، کەوا پێویست دەکات بۆ هەر جۆرە ئینسکلۆپیدیایەک ئەمانە لەبەردەست بن:

١- پلانی کارکردن.
٢- دەستەی پسپۆر.
٣- سەرمایەی پێویست.
٤- ماوەی کارکردن.
٥- بارەگای شیاو بۆ ئەم کارە.

بەداخەوە ئینسکلۆپیدیای هەولێر لەم ڕووەوە کارەکەی بەم شێوەیە نەبوو، دەتوانین بڵێین: کارکردنەکەمان پێشمەرگانە بوو. بەو مانایە پێویستییەکان وەک دەبوو بێ، وانەبوو! بەڵام، دڵگەرمی و دڵسۆزی ئەو دەستەیەی کە کارەکەیان گرتە ئەستۆ، بووە هۆی ئەوەی کە دەست بەکاربکرێ و دواجار ئینسکلۆپیدیای هەولێر بەم شێوەیەی ئێستا لەبەردەستانە چاپکرا. هەربۆیە پێمان خۆشە پسپۆران و خوێندەوارانی بەڕێز ئەم چەند خاڵە لەبەرچاو بگرن، کە کاریگەرییان لەسەر جۆر و چۆنیەتی کارکردنی ئێمەدا هەبووە:

١- ئینسکلۆپیدیای هەولێر تایبەت نییە بەیەک لایەنی شاری هەولێر: بەڵکو هەموو لایەنێکی گرتووەتەوە. وەک ئێستا بەچاپکراوی لەبەر دەستی ئێوەی بەڕێزدایە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە سروشتی کارەکە زۆر لەکاری ئینسکلۆپیدیایی یەک بابەت فراوانترو پڕ زەحمەتتر بێ.

٢- ئێمە ئەوانەی کە کارەکەمان کەوتە ئەستۆ، هەرچەندە پێشتر خاوەنی کتێب و بەرهەمی ئەکادیمین. بەڵام، پێشینەیەکمان لە ئینسکلۆپیدیا نووسیندا نەبووە، یەکسەرەش دەستمان بەکارکرد.

٣- ئەو بابەتانەی کە لەم ئینسکلۆپیدیایەدا کۆکراونەتەوە، زۆربەی هەرە زۆریان، بەتایبەت بۆ ئەم ئینسکلۆپیدیایە نەنووسراون، بەڵکو بابەتی گشتێن لەنێوان لێکۆڵینەوەی زانستی و وتاری ئەدەبی و کاری ڕۆژنامەوانیدا دەخولێنەوە. هەندێکیان ڕاستەوخۆ لە خاوەنەکانیان وەرگیراون و ئەوانەی تریش ئێمە لەنێو بڵاوکراوە جۆراوجۆرەکاندا کۆمان کردوونەتەوە.

٤- پاش ئەوەی کە بڕیاری نووسین و دانانی ئینسکلۆپیدیا چەسپا، بەشەخسی و ڕووبەڕوو و بەهۆی بڵاوکراوەو بانگەواز داوا لە هەموو نووسەران و لێکۆڵەرەوان کرا، لە دوور و لە نزیک لەناوەوە و لەدەرەوە لە کورد و غەیرە کورد، کە بەرهەم و نووسینی خۆیان لەبارەی هەولێرەوە، بۆ هەر لایەنێک بێ، چەپکە گوڵی خۆیان بخەنە سەر ئەو خەرمانەیە و جێگای شیاوی خۆیان لەنێو ئەم ئینسکلۆپیدیایەی هەولێرە بگرنەوە.

٥- بەم هۆیانەوە ئەم بابەتانەی ئێستا ئینسکلۆپیدیای هەولێریان پێکهێناوە. بەشێوازی جیاو بەزمانی جیاو بەڕاوبۆچوونی جیاجیا نووسراوبوون و هەندێکیشیان لەزمانانی جیا جیا نووسەرو وەرگێڕی جیا جیا بەشێوازی جیا جیا وەریانگێڕاون.

٦- لەوبابەتانەی کە هێشتا بەتەواوی ساغ نەکراونەتەوەو لێرە زیاتر لەبۆچوونێک بڵاوکراوەتەوە. ئەمە ڕای نووسەرەکان خۆیانەو مەرج نیە ڕای لێژنە تەواو لەگەڵ ڕاوبۆچوونەکان بێت چونکە زۆر بابەت هێشتا بەتەواوی ساغ نەکراوەتەوەو لێکۆڵینەوەی زۆرتری دەوێ.

### دواتر چیمان کرد؟

١- هەوڵماندا لەڕووی زمانەوە، ئەم هەموو شێوازە جیا جیایە هەتا ڕادەیەک لێک نزیک بکەینەوە، هەرچەندە ئەمە کارێکی یەکجار گرانەو ناتوانین بڵێین تەواو تێیدا سەرکەوتووین.

٢- هەوڵمانداوە ڕای تایبەت و ئایدۆلۆجیای ئاشکراو

بەرچاو کەم بکەینەوەو بابەتەکان بەرەو ئەو راستییانە ببەین، کە تا ئێستا لەبارەی بابەتەکانەوە هەن، لێرەش ناکرێ بڵێین: ئەوەی کە کراوە بەدڵی ئێمەیە. هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوەکو پێشتر گوتمان: بابەتێک کە سەرلەبەری بەشێوەی خواستی نووسەرەکەیەوە نووسراوە، گۆڕین و گونجاندنی لەگەڵ دەیان بابەتی تری لەو جیا کارێکی ئەستەمە!.

٣- هەندێ بابەت هەن، بەتایبەت بابەتە مێژووییەکان، رای جیا لەلایەن نووسەر و لێکۆڵەری جیا جیاوە دەربڕاوەو ئەو بابەتانە هێشتا لێکۆڵینەوەی زۆتر هەڵدەگرن، بۆیە ناچار ئەم جۆرە جیاوازیانە هەرماون.

٤- بابەتەکان، هەموو بابەتەکانی نێو ئینسکلۆپیدیای هەولێر لە کورتی و درێژیدا و لە زۆر و کەمیدا وەک یەک نین، ئەمەش هەر پەیوەندی بە باری گشتی نووسین و لێکۆڵینەوەکانەوە هەیە، کە نووسەر و زانیارییەکان جیان.

٥- هەر بابەتێک گەیشتبێتە دەستمان و لەهەر بەرێزێکەوە هاتبێ و بابەتەکە پەیوەندی بەم ئینسکلۆپیدیاییەوە هەبێ، بابەت جێگای خۆی گرتۆتەوە. هەروەها بابەت و سەرچاوەیەک زانیبێتمان و هەستمان پێکردبێ، بۆ ئەم کارە دەشێ، خۆمان پەیدامان کردووەو خستوومانەتە نێوبابەتەکانی ئینسکلۆپیدیا. لەگەڵ ئەوەشدا بەدڵنیاییەوە دەیڵێین: بابەتگەلی تر هەن سەبارەت بە هەولێر و دەست ئێمە نەکەوتوون یا ئەوەتە هەستمان پێنەکردوون.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەتەواوی قەناعەتەوە دەینووسین، کە ئەم ئینسکلۆپیدیای هەولێرە بێ کەم و کورتی نییە! هەندێک لە کەم و کورتییەکانی ئێمە خۆشمان دەیزانین، ئەوانەش کە ماوەتەوە، چاوەڕێی دەست و قەڵەمی زانا و دڵسۆزانین بەگەورەیی خۆیان. هەڵەکانمان بۆ راست بکەنەوەو کەم و کورتییەکانمان بۆ دەستنیشان بکەن، بۆ ئەوەی لەچاپی داهاتوودا، بەهاوکاری هەموو لایەک ئینسکلۆپیدیای هەولێر کەم و کورتییەکانی کەمتر بکرێنەوە.

**ناوی ئینسکلۆپیدیا:**

ئینسکلۆپیدیا بەم شێوەیەی کە ناسراوە، ئەمڕۆ لەنێو زۆربەی هەرە زۆری زمانەکان بەو (فەرهەنگ DICTICONARY)ە دەوڵەمەندە دەڵێن: کە بۆ زۆر وڵات و شارو نەتەوەو مێژوو و بابەتی جیهانی دەنووسرێ و زۆرترین زانیاری دەگرێتەخۆ لەبارەی ئەم وڵات و شارو نەتەوەوە بابەتەی کە ئینسکلۆپیدیاکەی بۆ دانراوە، هەر ئەم ناوەش واتە(encyclopedia) یەش وەک ناو چووەتە نێو زمانان و هەروەک خۆی یان بەکەمێک گۆڕانەوە بەکاریان هێناوە.

ئەوەی ئێمە لێرە مەبەستمانە ئەوەیە کە ئەم ناوە، بەچەند شێوەیەک هاتووتە نێو زمانی کوردی و چەند بەرێزێک لەبواری جیاجیادا لەم بارەوە کاریان کردووە، نووسەر (فەیسەڵ دەباغ) بەناوی (ئینسکلۆپیدیای ئابووری) لەساڵی ٢٠٠١ کارەکەی خۆی چاپکردووە. هەروەها نووسەر (یاسین سابر ساڵح) لەساڵی ٢٠٠٥ (ئینسایکلۆپیدیای گشتی) چاپکردووە، دیسان نووسەر (زنار تەها) لە ساڵی ٢٠٠٦ (ئینسکلۆپیدیا ئەلقاعیدە)ی بڵاوکردووتەوە. وەکو دیارە فەیسەڵ دەباغ (ئینسکلۆپیدیا)ی نووسیوەو هەردوو نووسەریش (یاسین سابر ساڵح و زنار تەها)ش (ئینسایکلۆپیدیا)یان نووسیوە، هەرچەندە نووسەر یاسین سابر ساڵح لەسەر بەرگدا (ئینسایکلۆپیدای)ی بە (ڵ) واتە لامی قەڵەو نووسیوەو لە پێشەکیشدا زیاتر لە جارێک (ئینسایکۆپیدیا)ی بەکارهێناوە، زۆر نووسەری تریش لە وتارو نووسیندا- ئینسایکۆپیدیا- و ئینسکلۆپیدیا- ئینسۆکلۆپیدا)یان بەکارهێناوە، وەکو دەرکەوت هەرچەند کورد سەروکاری لەگەڵ ئەم (ناو) و (کار)ە تازەیە لەگەڵ تازەییەکەشدا، لەبەکارهێنانی ناوەکەش رای جیاواز هەیە، ئەمەش کارێکی ئاساییە، هەرناوێک لەهەر بابەتێکەوە کە لەزمانێکی ترەوە دێتە نێو زمانەکەمان، بەزۆر شێوە کۆدەکرێ و تا دواجار لەسەریەک شێوە (گۆکردن و نووسین)دا دەوەستێتەوە، نابێ ئەم جۆرە نووسینە جیاجیایانە بۆ (encyclopedia)بە هەڵەبزانین، چونکە جگە لەوەی ناوەکە غەوارەیە، میزاجی کەسی نووسەریش رۆڵی

خۆی هەیە لە جۆری نووسین و گۆکردنەکەدا، ئێمە لەم کارەی خۆماندا (ئینسکلۆپیدیا)مان بە چاکتر زانی چونکە بەڕای ئێمە (ئینسکلۆپیدیا) ئاسانتر بەگەرووی کوردەکە دەردەبڕدرێ، لە شێوەی (ئینسایکلۆپیدیا) کە جۆرێک زۆر لە خۆکردنی پێویستە لەکاتی گۆکردندا، جگە لەوەش لەنووسینیشدا ئینسکلۆپیدیا ئاسانترو کەم مەسرەفترە لە ئینسایکلۆپیدیا، جارێکی تر ئەمە روون دەبێتەوە کە ئەم کارە بە ناوی جیاجیا بەشێوەی نووسینی جیاجیاو شێوە گۆکردنی جیاجیا هاتووەتە نێو زمانی کوردی، لەنێو هەموو شێوەکاندا ئێمە (ئینسکلۆپیدیا)مان هەڵبژارد بەو هیوایەی بەدڵی هەموولایەک بێت.

**سوپاس:**

لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیای هەولێر بەئەرکی خۆی دەزانێ لەدڵەوە سوپاسی هەموو ئەم بەڕێزانە بکات چ زیندووەکان (تەمەندرێژ بن) و چ مردووەکان (بەهەشتی بن) کە نووسین و بابەت و وێنەو بەڵگەیان لەنێو لاپەڕەکانی ئینسکلۆپیدیادا بڵاوکراوەتەوەو داوای لێبووردنیشیان لێ دەکەین، لەوەی کە ئەوبابەتانەی بڵاوکراونەتەوە دەقاودەق وەک ئەو لێکۆڵینەوەو نووسینانەنین کە نووسەرەکانیان نووسیویانن و پێشتر لەجێگای تر بڵاویان کردوونەتەوە، لیژنە هەوڵی داوە هەموو بابەتەکان پێکەوە بۆ بڵاوکردنەوە لەنێوئینسکلۆپیدیادا بگونجێنی، هەروەها سوپاسی ئەو دڵسۆزانەش بکەین کە هەریەکەو بەشێوەیەک لەم کارەدا ماندووبووین و سوپاسی ئەو بەڕێزانەش بکەین دووروونزیک ئەگەر بابەتێکیان دەست کەوتووەو زانیویانە بەکەڵکی ئینسکلۆپیدیا دێت دڵسۆزانە ئاگاداریان کردووینەتەوە. هەر لەئێستاشەوە سوپاسی ئەو نووسەرو لێکۆڵەرانە دەکەین چ بیانی و چ خۆماڵی کە هەڵەکانمان راست دەکەنەوەو بەبابەتی تازەو نوێی چاپەکانی داهاتووی ئینسکلۆپیدیای هەولێر دەوڵەمەندتر دەکەن دواجار سوپاسی تایبەتیمان بۆ بەڕێزان:

١- پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار.

٢- پرۆفیسۆر دکتۆر خەلیل ئیسماعیل.

کە زۆر جار پرسمان پێکردوون و رامان وەرگرتوون، ئەوانیش دڵسۆزانە بەدەنگمانەوە هاتوون.

هەروەها سوپاسی هەموو ئەو مامۆستا و زانا و لێکۆڵەر و نووسەر و رۆشنبیرانەش دەکەین لە کورد و غەیرە کورد، کەوا بەرهەمەکانیان لەنێو لاپەڕەکانی ئەم ئینسکلۆپیدیایە جێگای شیاوی خۆی گرتووتەوە و لەسایەی بەرهەمی هزر و دەستی ئەو بەڕێزانە، ئەم ئینسکلۆپیدیای هەولێرە دەوڵەمەند و ئاوەدان بووە. هەروەها سوپاسی هەموو بەڕێزێک دەکەین کە لەرووی مەعنەوییەوە بەدڵسۆزی کارەکەیان بە پێویست و پیرۆز زانیوە و هەموو ئەو بەڕێزانەش کە پاش چاپ و بڵاوکردنەوە بە زانایی و دڵسۆزی کەم و کورتییەکانیان بۆ راست کردینەوە. هەروەها بەهیممەتی مامۆستایان"سۆران- عیزەدین فەیزی، د. اسماعیل قەرەداغی، محمد زادە، رەحیمی سورخی، فەیسەڵ دەباغ، محەمەد خۆشناو، پیرداود مەخموری، کەنعان موفتی، مامۆستا دڵشاد عەزیز زاموا، مامۆستا هوشیار محەممەد سالح کۆیی، محێدین تەهاو جەوهەر شێخانی و شێرزاد فەقی، عوسمان پیرداود، ژیان دزەیی، خالص یونس، سەلام عەدۆ، فارس سعدی، کمال سعدی، ئەیاد عەبدوڵلا، جەمال داود، زاهیری مسەوەر، محمود هەولێری، رۆژنامەی خەبات"کەریم قادر"، کوردستانی نوی "کاوە محەممەد"، گۆڤاری هەولێر، گۆڤاری مێرگ، گۆڤاری شانەدەر، گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، گۆڤاری بارش، هەموو ئەو کەسانەش کە بە وتارێک یا بە وێنەیەک یا بە رێنوێنییەک دەستیان گرتووین، و هتد..." ناشکری رۆڵی کارمەندانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان بەتایبەتی "عەبدولڕەحمان مەعروف، حەسەن یاسین، یوسف ئەبوبەکر، ئەیوب یوسف، بەدرخان یوسف، مەسعود ئیبراهیم،" لەبیر بکری لەخۆ بوردوانە کاریان کردووە، ئەوە جگە لەوانەی لە دەرەوەی کوردستان هاریکارمان بوون لەوانە"د. نەجاتی عەبدوڵلا، ئاسۆ حەیدەری، فەرهاد باپیر، حوسام بەرزنجی، شێرزاد هەینی".

هەموو ئەو کەسانەش کە چوار ساڵە وەکو سەربازێکی ون لە خەمی تەواوکردنی ئینسکلۆپیدیادا بوون.

# "هەولێر - اربیل" مێژوو و ناو

دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن

لەهەرکوێ باسی"اربیل – هەولێر" بێتە ناوەوە، هەرزوو ئەو دەستەواژەیە دەکەوێتە بەرچاو، "هەولێر کۆنترین شاری جیهانە کە تائێستا بەئاوەدانی ماوەتەوە"، ئەمەش وایکردووە کە ئێمەی خەڵکی ئەم شارەو هەموو خەڵکی کوردستانیش، زۆر شانازی بەم شارەو بەم دەستەواژەیەوە بکەین. بەڵام، کە بەنێو لاپەڕەی ئەو کتێب و لێکۆڵینەوانەدا گوزەر دەکەین کە باس لە دروست کردن ناولێنان ومێژووی ئەم شارە دەکەن و سەرنج دەدەین، دەبینین مێژووی دروستبوونی ئەم شارە تائێستا بە تەواوی یەکلا نەبۆتەوەو هێشتا زۆر رای لێک جیاو مێژووی لێک دوور بۆ ئەم شارە باسدەکرێن، هەربۆ نموونە وەک لەنووسینەکانی نێو ئەم ئینسکلۆپیدایەدا دەیخوێننەوە، لێکۆڵەران مێژووی دروستبوونی ئەم شارە بۆ هەزارەی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و هەتا حەوتەمی پێش زایینیش دەگەڕێننەوە، هەندێ لە لێکۆڵەرانیش بەڵگەی خۆیان بۆ ئەو مێژووانە هەیەو هەندێکیشیان بەبێ بەڵگەن، بەڵام، ئەوەی راستی بێ هیچ یەک لە لێکۆڵەرەکان راو بۆچوونەکانی خۆیان سەبارەت بە مێژووی دروستبوونی شاری هەولێر لە گومان دانە مالیوە، واتە هەر هەموویان، ئەگەرچی باسی مێژووی دیاریکراو دەکەن! بەڵام، زۆر پێ لەسەر ئەوە داناگرن، کە ئەو مێژووەی ئەوان بۆ دروستبوونی شاری هەولێر بە پەسەندی دەزانن، یەککە مێژوو دوا مێژووە!! ئەمەش بەڵگەی ئەوەمان دەخاتە بەردەست، کە مێژووی شاری هەولێر و سەردەمی دروستبوونی، هێشتا پێویستی بە پشکنین و لێکۆڵینەوەی زۆرتر و وردتر هەیە.

ئێمە لێرە وەکو نووسەرانی ئینسکلۆپیدیای هەولێر، لەپەراوێزی ئەو نووسین و لێکۆڵینەوانەی کە باس لە مێژووی دروستبوونی شاری هەولێر و ناولێنانەکەیدا دەکەین و باری سەرنجی خۆمان دەردەبڕین، بەڵگەش بۆ راو سەرنجەکانمان دەهێنینەوە، بەڵام، دیسان ئێمەش ناتوانین رای یەکلاکەرەوەو جێگیر بخەینە بەرچاو! ئەویش لەبەر چەند هۆیەک:

یەکەم: وەک دەزانرێ هەولێر کۆنترین شاری جیهانەو تائێستا کە بەئاوەدانی ماوەتەوە، شاریش هەتا کۆنتربێ، مێژووەکەی ئاڵۆزتر دەبێ، بەتایبەت شارێکی وەکو شاری هەولێر، کە زۆربەی راکان لەسەر ئەوەن کە ئەم شارە پێش پەیدابوونی نووسین دروستکراوە، ئەوەش زانراوە کە خەت و نووسین، لە داهێنانی سۆمەرییەکانەو پاش ئەوەی لەهەولێر و کوردستان دەچنە خوارەوەو لە ٣٢٠٠پ.ز ئەوسا نووسین دادەهێنن.

دووەم: هەموو ئەو بەڵگەو دیکۆمێنتانەی کە باس لەکۆنی شاری هەولێر دەکەن و تائێستا دەستکەوتوون و زاناکان لە رۆژهەڵات و رۆژ ئاوا باسیان کردوون، پەرتن و هەموویان

نەهاتوونەتە سەر یەک و کۆ نەکراونەتەوەو پێکەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکراوە، کەواتە هێشتا زۆر بەڵگەو را هەن لەبارەی دروستبوونی شاری هەولێر نەهاتوونەتە ناو ئەم بەڵگانە.

سێیەم: هێشتا لەخودی شاری هەولێر بەتایبەتی قەلاکەی وەکو پێویست پشکنین و هەڵکۆڵین نەکراوەو زانایانی شوێنەوارناسی ئەوەی کە پێویستە لەرووی شوێنەوار ناسی و زانستییەوە، بۆئەم شارەو دەوروبەری بکرێ، نەیانکردووە. ئەوەش رێگەی ئەوەمان بۆ خۆشدەکات، کە بەدڵنیاییەوە بڵێین: هێشتا زۆر نهێنی گرنگ، چ بۆ دروستبوونی شاری هەولێر، چ بۆ مێژووی ناوچەکەو جیهان لەژێر زەوی شاری هەولێردا ماوەتەوەو چاوەڕێی دەستی زانایان و هیمەتی دڵسۆزانە.

جا لە رەوشێکی ئاوادا، ئەوەی کە بگوترێ، ئەنجامی بینین و خوێندنەوەی ئەم نووسینانەیە، کە دەستمان کەوتوون و هەستمان پێکردوون.

**مێژووی دروستبوونی شاری ئوربل- ئوربیللو- ئوربیللوم - هەولێر**

هەمووولایەک ئەوە دەزانن، کە شار بەرهەمی دەستی مرۆڤەو بەرهەمی سەردەمێکی پێشکەوتووشەو ئەویش سەردەمی سەرهەڵدانی شارستانیەتە، شارستانیەت بە پێی سەردەمی خۆی.

ئەوەش وا دەخوازێ کە لەناوچەکە بەدوای مێژووی "مرۆڤ"دا بگەڕێن، باشترین مێژووش بۆ ئەو مرۆڤانەی کە شاری هەولێریان دروستکردووە، مێژووی مرۆڤە لە ئەشکەوتی"شانەدەر" کە ئەشکەوتێکی کۆن و گرنگە نەک تەنیا بۆ هەولێرو کوردستان و ناوچەکە، بەڵکە بۆ هەموو جیهان، چونکە ئەم ئەشکەوتە کەوتووەتە نزیک شاری هەولێر ئەوەش ساغ بووتەوە، کە سەدو پەنجاهەزارساڵ پێش زایین مرۆڤ لەو ئەشکەوتەدا ژیاوە، خۆ تەمەنی ئیسکبەندەکان کە بۆ ٦٠ تا ٦٥هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، ئەم تەمەن و مێژووەش تەمەن و مێژوویێکی سەلمێندراوو زانستییە، ئەوەش ئاشکرایە لەپاش ئەو مێژووە ، واتە دوای ٦٠ تا ٦٥ هەزار ساڵ پێش زایین، تائەمرۆکە هیچ رۆژگارێک ئەو ناوچەیە "واتە ئەشکەوتی شانەدەر و شاری هەولێر" بێ مرۆڤ و دانیشتوان نەبووە: سالانی (٥٥) هەزارو (٤٠ هەزارو) ٣٥ (هەزار و) ٢٥ (هەزار و) ٢٠ (هەزار و)١٥ (هەزارو) ١٢(هەزار و) ٩ (هەزار و) ٧ (هەزار(*)پێش زایین کە لەهەریەک لەو سالانە بەڵگەو تایبەتمەندی خۆیان هەیە لەناوچەکەو بۆ پاشماوەو بوون و ژیانی مرۆڤ و بەڵگەشن بۆ بەردەوامی ژیان و پێشکەوتنی، ئەو مێژوو و ئاوەدانییەش دواجار نزیکمان دەکاتەوە لەمێژووی دروستبوونی شاری هەولێر، ئەگەر لەگەڵ هاتنە پێشی مێژووەکەش گۆڕان و پێشکەوتنی ژیان لەناوچەکە لەبیر نەکەین. کەواتە لە (١٥٠) هەزار ساڵ پێش زایینەوە تا هەزارەی حەوتەم لەئەشکەوتی شانەدەرو دەوروبەری ناوچەکە بەهەولێریشەوە- هەولێر وەکو جوگرافیا- ژیان بەردەوامە، هەر ئەو هۆیەشە کە هەندێ لەزاناکان کوردستان بە (لانکەی مرۆڤایەتی) دەزانن.

لێرەوەش پەنا بۆ رای هەندێ لەو زانایانە دەبەین کە لەبارەی کوردستان و مێژووی مرۆڤ و هەولێر قسەیان کردووەو رایان دەربڕیوە. یەکێ لەزاناکان دەنووسێ:"لە شەش هەزار ساڵ پێش زایین، لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس، مێژوو جگە لە باسی کورد زیاتر باسی هیچ میللەتێکی ترمان بۆ ناکات" کەواتە لە هەزارەی شەشەم و لەزنجیرە چیاکانی زاگرۆس"مرۆڤ - کورد"هەن، هەولێریش لە جوگرافیای ئەو زنجیرە چیایە. هەروەها مێژووناسێکی تر ئەم ناوچەیە دەنووسێ: نابێ بڵێین کورد سۆمەرین، بەڵکو دەبێ بڵێین سۆمەرییەکان کوردن. لەوەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو مرۆڤانەی هەزارەی شەشەم سۆمەرین و سۆمەرییەکانیش بەقسەی ئەو زانایە کوردن!! کەواتە کوردبوونی سۆمەرییەکان و

کوردەکانی شەش هەزارساڵ پێش زایین لەزنجیرە چیاکانی زاگرۆس یەکدەگرنەوەو رێگا بۆ رایەکانی داهاتوومان خۆشدەکەن، هەر ئەو رایەی ئینسکلۆپیدیای بەریتانیش ئەو رایانە بەهێزتر دەکات، کاتێ دەنووسێ:"هەولێر شاری باپیرانی سۆمەرییەکانە" مەبەستیش لەباپیرانی سۆمەرییەکان، ئەو سۆمەرییانەن کە پێش ئەوەی بچنە خوارەو کە ئەوانەی چوونەتە خوارەوە، ئەوەی ئەو باپیرانەن! هەر ئەم رایەش پشتگیری ئەوە دەکات، کە ئەو شارە، واتە- هەولێر - ئوربل- باپیرانی سۆمەرییەکان دروستیان کردووە. ئەگەر ئەوە لەبیر نەکەین کە مێژوو پێش شەش هەزار ساڵ پێش زایین جگە لە باسی کورد و سۆمەریەکان لەناوچەکە باسی هیچ میللەتێکی تر ناکات، لەهەولێر و دەوروبەری دیسان ئەوەش لەبیر نەکەین، کە سۆمەرییەکان چوونەتە خوارەوە، پەیوەندییان لەگەڵ زێدو وڵاتی خۆیان - کوردستان- و بەتایبەت شاری هەولێر نەبراوە، جا چ پەیوەندی حوکمرانی راستەوخۆبێ، چ پەیوەندی ئایینی و بازرگانی بێت.جا ئەگەر چوونە خوارەوەی سۆمەرییەکان لەهەزارەی پێنجەم و چوارەمی پێش زایین بێ، وەک مێژوو ناسان باسی دەکەن، ئەوا بێشک دەبێ دروستکردنی هەولێر - ئوربل- یش زۆر پێش ئەو چوونە خوارەوەیەبێ و واتا پێش هەزارەی پێنجەم و چوارەمی پێش زایین، ئەوەش مێژووەکە، واتا مێژووی دروستکردنی شاری ئوربل - هەولێر- دەباتەوە بۆ هەزارەی شەشەم و حەوتەم و ئەولاتریش!؟! کەواتە ئەگەر مێژوو لە ناوچەکە لەهەزارەی شەشەم: تەنیا باسی کورد بکاتن و کوردیش ئەو سۆمەرییانەبێ کە چوونەتە خوارەوەو پێشتر هەر باسی سۆمەرییەکان بکات و دروستکردنی شاری هەولێریش هەر بۆ ئەو مێژووەو پێشووتریش بگەڕێتەوە، کەواتە بەزۆرترین بەڵگە هەولێر شارێکە سۆمەرییەکان یان وەک ئینسکلۆپیدای بەریتانی باس دەکات، باپیرانی سۆمەرییەکان- دروستیان کردووە. دروستکردنەکەش لە شەش هەزارساڵ پێش زایین کەمتر نییە!

## ناوی ئوربل - هەولێر

ئەوەش زانراوە، هەر شارێکیش کەمیللەتێک دروستی بکات،هەر ئەو میللەتەش ناوی لێدەنێ، کۆنترین ناوهێنانیش تائێستا بۆ ناوی هەولێر دەگەڕێتەوە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایین و هەرچەندە هێشتا وەڵامی ئەوپرسیارە روون نییە کە ئایا هەولێر یەکسەر وەکوو قەڵا (شارە قەڵا) دروستکراوە، یان دەورووبەری ئاوەدان کراوەتەوە!! ئەوەی زانراوە کۆنترین ناوهێنانی ئەربیل- هەولێر. وەک مامۆستا کۆزاد باس دەکات لە دەوری ٢٣٠٠ پ.ز بووە، لە دەقێکی میخیدا ۆ یەکەمینجار گوتییەکان لە سەردەمی پاشا (ئیریدوپزر) بە شێوەی (ئوربلیوم) ناویان هێناوە. رایەکی تر هەیە و دەڵێ: (سوبارییەکان شوێنی قەڵای هەولێر کە گوندێک بووە دەیکەنە شار و ناوی دەنێن شاری ئوربلیوم) ئەوەی زانراوە سوبارییەکان لە کۆتایی هەزارەی سێیەم و سەرەتای هەزارەی دووەم گرنگی بە شاری هەولێر دەدەن و هەر بە ناوە کۆنەکەش کە ئوربل- ئوربیل- ئوربلیوم ناوی دێنن، ئەوەش ساغ بووەتەوە کە هەولێر وەک شارە قەڵا و وەک شار زۆر پێش ئەم زەمەنە دروستکراوە، ئەوەش ئاشکرایە هەر سۆمەرییەکان و باپیرانی سۆمەرییەکانن لەو زەمەنە شاری هەولێریان دروست کردووە، چونکە زەمەنی دروستکردنی شاری هەولێر کە بۆ زیاتر لە شەش هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، هەر لەگەڵ زەمەنی بوون و دەرکەوتن و سەرهەڵدانی شارستانیەتی سۆمەرییەکان- شارستانیەتی پێش چوونە خوارەوە دەگونجێت.

لە بەڵگەنامەیەکی سۆمەرییەکانیش لە دەوروبەری ٢٠٠٠ پ.ز بە شێوەی- ئوربیللوم- ناوی شاری هەولێر هاتووە، ئەگەر ئەوەش لەبیرنەکەین، کە سۆمەرییەکان دەچنە خوارەوەو لەوێش

شار دروستدەکەن، هەرزوو چەند شارێک بەناوی - ئور- ئەریدۆ - ئوروک- دروستدەکەن، ئەگەر فیکرەی شار دروستکردن، لێرەوە لەهەولێر-ئوربل- کوردستان- لەگەڵ خۆیان دەبەنە خوارەوە وەک زۆر شتی تریشیان لەگەڵ خۆیان بردووە، ئەوا لە ناو لێناکەش هەر کاریگەری- باپیرانیانی خۆیانی- پێوەدیارە، کە ئەویش پێش ناوی"ئور"ە، کە لە - ئوربل-دا هەیەو لەوێش شاری - ئور- ئەریدۆ -ئوروک- درستدەکەن و لەناو لێنانەکەشدا سوود لە پێشینەی ناولێنانی شاری - ئوربل- وەردەگرن و بۆ ناوی شارە تازەکانیان لە هەوارە تازەکەیان هەر لەسەر ئەو کلتوری ناولێنانە دەڕۆن، کە پێشتر باپیرانیان لەسەری ڕۆیشتوون، واتە - ئوربل-ی پێش چوونە خوارەوەو - ئور- و -ئوروک-ی دوای چوونە خوارەوە بەرهەمی هەمان میللەت و هەمان کلتوورە. هەرچەندە هەندێ رای لاواز هەن، کە ناوی شاری هەولێر - ئوربل- بۆ زمانی خوری و سوبارتوویی دەگەڕێننەوە، بەڵام ئەگەر سەیری زەمەنی دەسەڵاتی خوری و سوبارتووەکان بکەین لەهەولێرو دەوروبەری، ئەوا دەسەڵاتدارییەکەیان دەکەوێتە دوای سەردەمی یەکەمی دروستبوونی شاری هەولێر، ئەویش، ئەو رایە زۆر لاوازتر دەکات، کە دەڵێ: ناوی ئوربل ناوێکی خوری یان سوبارتوویيە. ئەگەرچی نابێ ئەوەش رەتبکەینەوە، کە خوری و سوبارتوویيەکانیش، لەکاتی حوکمکردنی ناوچەکەو هەولێردا، ناوی -ئوربل-یان بەشێوەزاری خۆیان گۆ کردبێ، وەک ئەوەی کە ئاشوورییەکان کردوویانە، دەبینین - ئوربیللو - ئوربیللوم- ئوربیللا- ئوربیل- ئوربل- کە پێش دەسەڵاتی ئاشوورییەکان بەم شێوانە باسکراوە، لەسەردەمی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان هەر ئەو - ئوربل-ە، لەگەڵ زمان و فۆنەتیکی زمانی ئاشووری رێک دێ و بەکەمێک گۆڕانەوە مانایەکی تر بۆخۆی پەیدا دەکات و دەبێت بە ئوربائیل - ئاربا - ئیللو- کە لەزمانی ئاشووری مانای"چوار خوداوەند"دەدات، وەک دەشڵێن:"ناوەکە لەبنەڕەتدا پەیوەندی بەچوار خواوەندەوە نییەو ناوەکەش ناوێکی ئاشوری نییە"،واتە ناوی (ئوربل) کە ئەمەش ئەوەندەی گۆکردنێکی تازەیە بۆ ناوێکی کۆن، هێندەش هەڵگری مانایەکی تازەیە، لەسەر بنەمای ناوە کۆنەکە، چونکە بەڕای ئێمە- هەولێر لەسەرەتای دروستبوونییەوە وەک شارێکی گەورەو پەرستگایەکی گەورەی ئایینی دروستکراوە، ئەگەر ئەو مانا فەرهەنگییە بەڕاست بزانین، کە بەپێی هەندێک سەرچاوە ئوربل ناوێکی سۆمەرییەو لە فەرهەنگی زمانەکەشیان"ئور"مانای وڵات، شار، پەرستگا، شوێن دەدات و "بل"یش ناوی خواوەندی زەمینە، کە بەگشتی دەکاتە "شاری خواوەندی زەمین" خۆ ئەگەر هەتا ئوربل ئەو مانایەش نەبەخشێ، ئەوا ئێمە هەر ناوەکە بەناوێکی سۆمەری دەزانین! چونکە بڕوای تەواومان هەیە بە پێی بەڵگەکانی سەرەوە کە سۆمەرییەکان ئەم شارەیان دروستکردووە، وەک شارێکی ئایینی، کەواتە هەر ئەو ناوە ئایینییە، مانای گشتی خۆی دەپارێزێ، چۆن شارەکە "ئوربل" لەزۆربەی قۆناغە مێژووییەکان، بەتایبەت پێش زایین، هەر شارێکی پیرۆز و گرنگ و پەرستگایەکی گەورەیە، جا لەهەر سەردەمێکدا بووبێ و پەرستگای هەر ئایین و هەر خواوەندێک بووبێ، ناوەکەش مانای ئایینی خۆی پاراستووە! نەک هەر - ئوربل- بەڵکو هەولێر-یش هەندێک لە رایەکان بۆ ناوێکی ئایینی دەگێڕنەوە، کە ئەویش"خورلیر- هورلیر- هەولێر"ە، کە مانا ئایینییەکەی بۆ ئایینی "خۆر پەرستی - میترایی- میترایی- میهرپەرستی"دەگێڕنەوە، کە ئەوەش واپێدەچێ، کە دیسان هەولێر لە سەردەمی دەسەڵاتی ئایینی خۆر پەرستی- شارێکی پیرۆزی ئەو ئایینەش بووبێ! ئەگەر هەولێر لە - خورلیر-ەوە هاتبێ!؟ خۆ ئەگەر هەر گۆڕانی لەفزی -ئوربل- یش بێ، ئەوا دیسان هەر لەناوە

ئایینییەکەوە- کە ماناکەی مانایەکی ئایینییەو کۆنە، گۆڕانی بەسەرداهاتووە، گۆڕانەکە گۆڕانێکی لەفزییە بەزمانێکی تر، کەواتە دواجار دەتوانین بە پشت بەستن بەو رایانەی کە لەنێو ئەم ئینسکلۆپیدیایەی هەولێردا دەیانخوێنینەوە، دەگەینە ئەوەی کە مێژووی دروستبوونی شاری ئوربل - هەولێر - لەسەرەوەی شەش هەزارساڵ پێش زایینییەو ئەم شارەش سۆمەرییەکان و باپیرانیان دروستیان کردووەو هەرخۆشیان ناویان لێناوە، کەواتە ئێستا تەمەنی هەولێر لای کەم هەشت هەزار ساڵ دەبێ و ناوەکەشی هەر لەهەوەڵەوە- ئوربیللو- ئوربل- یان شێوەیەکی نزیک لەم شێوانە بووە. ئەگەر ئێمە تائێستا ئەو رایە بەڕاست دەزانین، بەڵام، ئەوەش لەبیر ناکەین، کە دوور نییە، لەداهاتوودا بەڵگەی گرنگ و زانستی دەربکەون، کە تێزاران هەڵبوەشێنێتەوە.

- چەند وشەیەک لەبارەی"ئور"ەوە

لەنێو زمانی کوردی ئێستاو ناوەکانی مێژوودا. لەزمانی سۆمەری و زمانی میدیەکانیش، ئەم "ئور"ە، بەشێوەی جۆراو جۆر لێک نزیک لەماناو شێوەدا زۆر دووبارە بووەتەوەو زۆربەی جارەکانیش هەر ناوی شوێنە بۆیە زۆرجار"ئور- ئیر- ئار- ئێرە- وار" لە دارشتنی ناو دەکەونە بەرچاو، کە هەموویان لەماناد هاوبەشییەکی بەهێزیان هەیە:

ئور - واتە= شار - وڵات - پەرستگا - شوێن"ئوربل" ئور- ئوروک.

ئیر- واتە = وڵات - سەرزەمین- شوێن"ئیریەنڤیچ"

ئار- واتە = شوێن - شوێنی نیشتەجێی ئارییەکان "ئارماوا" ئاریدۆ- ئەریدۆ.

ئێرە- واتە = جێگا - جوگرافیا"ئەم وشەیە ئێستا بەو مانایە بەکاردێ" ئێرە هەولێرە.

وار- واتە= وڵات- شوێن- شار- جێگا- "کوردەوارییی- شوێنەوار- جێوار"

ئەگەر سەرنج بدەین، ئەم وشانە، ئەگەر بەشێوەی پێشگر لەوشەدا بەکار هاتبن، یان ناوگر یان بەشێوەی پاشگر، زۆرترین وشەی تازەو ناوی تازەیان بۆ"جوگرافیا"دروستکردووەو لەهەمووشیاندا مانای لێک نزیک هەیەو دەشێ مانای لێکدووریشیان هەبێ.

وەک: ئور - ئوربل- ناوی شار بەزمانی- سۆمەری

ئیر- ئیریەنڤیچ- ناوی هەرێمێکی فراوان- - زەردەشتی میدی و بە زمانی ئاڤێستایی

ئار- ئارماوا- گوند- ناوێکی کۆنەو ئێستاش لەزمانی کوردیدا ماوە و بە کار دێ و رەگی پەهلەویی و ئاڤێستایی تێدایە.

ئیرە- واتا (ئێستای جێگیا) نزیکە لە"ئیریەنڤیچ"ئێرە کوردستانە"ئێر+ ە = ئێرە. ئێران.

وار- واتە-ئار- بەمانای وڵات، کە کۆنەو ئێستاش لەزمانی کوردی بەکاردێت"شوێنەوار - جێوار - کوردەواری". وار = ڤار.

ئەگەر ئەوەش لەبیر نەکەین، کە لەزمانی سۆمەری و زمانی میدییەکان و ئاڤێستادا پیتی"ر" و"ل" جێگۆڕکێ دەکەن و هەرئێستاش لەزمانی کوردی بەتایبەت لە -زار-ی هەولێر-دا ئەم جێگۆڕکێیە زۆر بەرچاوە. لێکۆڵەران و زمانناسان، ئەوانەی کە شارەزای زمانی سۆمەری و ئاڤێستان باسی پەیوەندییەکی بەهێزو راستەوخۆ دەکەن، کە لەنێوان سۆمەری و کوردی- ئاڤێستاو کوردی-دا هەن ئەگەر ئەو پەیوەندییە لە وشەو ناوو زمانەکاندا بەرچاوە، ئەوا زەوی جوگرافیای ئەم زەمانانەش هەر یەک جوگرافیایەو ئەو خەڵکانەش کە بەو زمانانە قسەیان کردووەو قسە دەکەن، هەر ئەو مرۆڤانەن کە لەبەردەوامی ژیان و مرۆڤەکان لەشانەدەرەوە گەیشتوونەتە هەولێر و ماونەتەوەو ئێستاش لەهەمان جوگرافیاوە درێژە بەهەمان کلتوورو زمان دەدەن، کە ئەویش" زمانی میللەتی کورد و کلتور و زمانی کورد"ییە. ئەوەش رێگەی ئەوەمان بۆ خۆشدەکات کە بتوانین

بلێین هەولێر لەگۆڕانی -ئوربل-ەوە هاتووە، بەتایبەتی کە لە هەندێ سەرچاوەی ئێرانی- فارسی!! و پەهلەوی ئوربل- بەشێوەی -ئوربیر- هاتووە، دەبینین کە"ل"ی ئوربیل - گۆڕاوە بووە بە"ر"ی ئوربیر، کە ئەمەش تایبەتمەندە بەزمانەکانی سۆمەری و میدی- ئاڤێستایی- کوردی- زاری ئێستاو کۆنی هەولێر واتە گۆڕانی"ر" بە"ل"لە هەولێر.. کەواتە ئەم دوو ناوە- ئوربل- و - هەولێر- بەئیحتیمالێکی زۆرەوە بۆیەک سەرچاوە دەگەڕێنەوە، ئەگەرچی -ئوربل- ناوهێنانەکەی- بۆ پێنج هەزارساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە. بەڵام، بۆ ناوهێنانی - هەولێر- بەڵگەیەکی کۆن و نووسراومان لەبەردەستدا نییە کە بۆ پێش زایین بگەڕێتەوە بەشێوەی"هەولێر"ناوی هاتبێ، بۆ ئەو رایەش کە دەڵێ هەولێر لە"خۆرلیر"ی سەردەمی ئایینی خۆر پەرستییەوە هاتووەو بۆ چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەود، بەڵگەی نووسراو بەشێوەی"خۆرلیر" لەبەردەستدانییەو زیاتر راو بۆچوونە.

جگە لەوەی کە -ئوربیر- کە لەهەولێر نزیکە ئەویش ریشەکەی بۆ هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، هێند هەیە ئەمڕۆ لەکوردستان و هەموو کورد ئەم شارە بە "هەولێر"ناودەبەن، بەڵام لە بەڵگە مێژوویی و رەسمییەکاندا، هەمیشە بە -ئوربل- ئەربیل- ناوی هاتووە، تاوەکو"ئیبن مستەوفی"یش کە زانایەکی دانیشتووی شاری هەولێرەو یەکێ لەدانراوەکانی خۆی هەربەناوی"تأریخ أربل" مێژووی ئوربل"ەو باسی شاری هەولێر دەکات، هەر بەوناوەی ناودەنێ، واتا لەسەردەمی دەوری حەوت سەد ساڵ پێش ئێستا لای کەم- ناوە فەرمییەکەی هەر"ئوربل"بووە وەک لە سەرەتاشەوە هەر بەو ناوە بووە. ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەگەر شاری هەولێر لەدروستکردنییەوە، تائێستا کە سەر لە هەشت هەزارساڵ دەدات (کە هەر لەو تەمەنەشە کە رێکخراوی "یۆنسکۆ" شوێنەوارناسی جیهانی بڕوای پێهێناوە و تۆماری کردووە) خۆی بەزیندوویی و ئاوەدانی هێشتووەتەوە، ئەوا ناوە کۆن و رەسەنەکەی خۆشی هەر پاراستووە، هەرچەندە زۆر نەتەوەی جیاو بە زمانی جیا و زۆر ئایینیش لەم شارە دەسەڵاتیان پەیداکردووەو مێژوو و سەردەمی دیاریشیان هەیە. ئەمەش بەڵگەی رەسەنی خۆڕاگریی و کۆنی و ئەم میللەت و ئەو شارو وڵاتەیە، هەر ئەم خۆڕاگرییەشە شارەکەی بەئاوەدانی هێشتووەتەوەو ناوەکەشی وەک خۆی پاراستووە.

لە سەدەی شانزەهەمی زایینی و رێک لە ساڵی "١٥٧٤"دا نووسەری گەڕۆک "راوولف لیونارد **rauwolf leonhard**" لە بارەی ناوی هەولێرەوە دەنووسێ: (بەشەو گەیشتینە شاری "هاربیل- **harbil**" هەروەها (جیمس بکغنهام لە ساڵی ١٨١٦ی زایینیدا دەنووسێ: "لەگەڵ هاتنی تیشکی خۆر گەیشتینە شاری "ئوربل" یان "ئەربیل" کە دانیشتوانەکەی بەهەردوو زاراوە ناوی دەبەن). ئەگەر سەرنج بدەین ئەوا لە سەدەی شانزەهەم و سەدەی نۆزدەهەم "هەولێر- ئەربیل" بەشێوەی "هاربیل" و "ئوربیل" ناوی هاتووە، ئەمەش وا پێدەچێ کە ئەم گەڕۆکانە گۆکردنی ناوی "ئەربیل"یان بەم شێوەیە "هاربیل و ئوربیل" هاتبێتە بەر گوێی و هەر ئاواشیان تۆمار کردبێ، ئەوەتە "جیمس بکغنهام دەنووسێ: دانیشتوانەکەی -مەبەستی دانیشتوانی هەولێری ئەو سەردەمەیە- بەهەردوو زاراوە ناوی دەبەن" ئەمەش جارێکی تر ئەوەمان بۆ دووپات دەکاتەوە کە شاری "ئوربیلو- ئوربیل- ئوربل" هەر لە کۆنەوە ناوەکەی خۆی پاراستووە و دانیشتوان و خەڵکە گەڕۆک و بێگانەکانیش ناوەکەیان هەرچۆنێک گۆکردبێ و بەهەر شێوەیەکیان نووسی بێ، هەر لە دەوروبەری ناوە رەسەنەکە سووڕاونەتەوە.

(*١) لەم نووسینەدا باسی سەرچاوەکان ناکەین، چونکە هەر ئەو سەرچاوانە لەنێو ئەم ئینسکلۆپیدیایە زۆرجار دووبارە دەبنەوە.

هەولێر ( أربل ) لە نەخشەی






**نەخشەی کارگێری هەرێمی کوردستانی عێراق**




**نەخشەی کارگێڕیی پارێزگای هەولێر ٢٠٠٩**




نەخشەی کارگێڕیی عیراق



# هاملتۆن و خۆڵی کوردستان

## نەژاد عەبدوڵلا عەزیز

هاملتۆن ئەندازیاری پردی گەلی عەلی بەگ، لە ساڵی ١٩٦٠ لە شاری (بەنجاب)ی پاکستانی لە کۆلیژی کشتوکاڵ، کە من لەوێ دەمخوێند کۆڕێکی گێرا و باسی ئەو پردە گرنگانەی دەکرد، کە لە ئاسیا و ئەفریقیا کردوویەتی، پاشان باسی پردی گەلی عەلی بەگی کرد، منیش لەکۆتایی کۆڕەکە لەبارەی گەلی عەلی بەگەوە پرسیارم لێکرد، کە زانی من کوردی عێراقم لە جێگاکەی خۆی هەڵسا و بەرەو رووم هات و لە باوەشی کردم و رووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی: (ئەو گەنجە سەر بە نەتەوەیەکی چەوساوەیە، کە یەکێکە لە رەسەنترین نەتەوەکانی جیهان، کوردەکان نموونەی رەوشتی بەرز و وەفا و میواندارین).

دواجار هاملتۆن پێی گوتم: (من وەسیەتم کردووە ئەگەر مردم لە کوردستان بمنێژن، دەشترسم وەسیەتەکەم جێبەجێ نەکەن، داوات لێدەکەم **چنگێک خۆڵی کوردستانم** بۆ بنێری، بۆ ئەوەی، کە مردم لەگەڵ من پێکەوە لە گۆڕ بنرێن).

پاش گەڕانەوەم بۆ کوردستان داوایەکەم جێبەجێ کرد و چنگێک خۆڵ بە تایبەت خۆڵی گەلی عەلی بەگم بۆ نارد، دواجار بیستم ئەو ئەندازیارە بەریتانییە ناودارە لە (لەندەن) مردووە و لەوێش نێژراوە.



# لێکدانەوە لە مانای (ئەربیل)

دکتۆر محەمەد عەبدوڵڵا عومەر

تەمەن و مێژووی شارەکانی کوردستان هاوشانە لەگەڵ بوونی مرۆڤ تیایاندا و پەیوەستە بەو پێشکەوتنەی شارستانیەتی کورد بینیویەتی، شاراوە نییە کە وڵاتی ئێمە کۆنترین لانکەی مرۆڤایەتییە لەسەر رووی زەوی. هەر بۆیە مرۆڤی کورد مێژووەکەی دیارە، کاتێک لە قۆناغێکی شارستانی پێشکەوتووەوە بۆ قۆناغێکی تر، وڵاتی کوردانیش هاوشانی وڵات و کۆمەڵگەی تر لە ژیانی پەرتەوازەی سەرەتایی گواستراوەتەوە بۆ ژیانی جێگیر و دروستبوونی کۆمەڵەی بچووکی ژیان و ئینجا گوند و دواتر دروستبوونی شار، دوای ئەوەش کە دەسەڵات دروست بوو، بووە پێویست کە دەبێ شارێک هەبێ دەسەڵاتدار تیایدا دابنیشێ و لەوێوە فەرمان دەربکات.

لەگەڵ پەیدابوونی ئیمپراتۆرییەتەکان لە کوردستانی کۆن، زیاتر لە پایتەختێکی ناوچەیی بەرچاو دەکەون، هەر لە سەردەمی میدییەکان و پارثییهکان تا سەردەمی ساسانییەکان، جگە لەوانە هەندێک شار گرنگی تایبەتییان پێ درا لە لایەن ئایینەکانەوە بە جۆرێک شاری وا هەبوو تەنها بۆ پەرستنی خواوەندێک یان دوان تەرخان کرابوو بە تایبەتی لە سەردەمی سۆمەرییەکان، یان هەندێ شار بوون بە مەڵبەندێکی بازرگانیکردن.

شاری هەولێر یەکێکە لەو شارانەی ئەم قۆناغانەی مێژووی هەموو بڕیوە، لە ئێستاشدا قەڵاکەی بۆتە نموونە و نیشانەی شارەکانی دەوروبەری و چەندین دیرۆک و مێژووی بینیوە و لە ئەمڕۆشدا یەکێکە لە گرنگترین شارەکانی کوردستانی عیراق و هەروەهاش پایتەختی هەرێمی کوردستانە.

ناوی هەولێر لە سەردەمی سۆمەرییەکان و لە کاتی حوکمڕانی شا (شولکی)(١) ساڵی (٢١١٢-٢٠٠٤پ.ز)دا هاتووە، هەروەها لە

سەردەمی ئۆری سێیەمیش، دواتر بووە بە مەڵبەندێکی ئایینی بۆ پەرستنی خواوەند (عەشتار) و لە سەردەمی ئەخمینییەکان بۆ گۆڕستانی پاشاکانی ئەوان... سەرەڕای تێپەڕاندنی هەموو ئەو قۆناغ و مێژووانە، شتێکی لێ نەگۆڕابێت، ئەوا ناوە کۆنە کوردییەکەیەتی (ئۆربلیوم) کە دواتر بووە بە (ئەربیل) یان (هەولێر).

**وێنەکانی ناوی هەولێر**

ناو کاتێ زەمەن و کاتێکی زۆر بەکاردێت، تووشی گۆڕان لە مانا بنچینەییەکەی دێت، کە لێوەی هاتووە، زۆرجاریش ئەو گۆڕانە زۆر یان کەم دەبێت وەک چۆن بەسەر ناوی هەولێردا هاتووە، لە لایەکی تر تێکەڵ بوون و هاموشۆ کردن لەگەڵ خەڵکانی تر لە دەوروبەر ناوەکە بە مانایەکی تر دەگۆڕێت. بە تایبەتیش کە زمانی کوردی لە چەندین زاراوە پێکهاتووە بۆیە ناوەکە لە مێژوویدا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، ئەوەی گرنگە سەرەڕای بە چەندین جۆر ناوهێنانی ئەو شارە ئەوەیە کە ناوەکە ناوێکی کوردییە و نکۆڵیش لەم راستییە ناکرێت لە رووی لێکدانەوەی مێژووییەوە، چونکە ئەو ناوە بەر لە هاتنی سۆبارتییەکان (ئاشووری)یەکان هەبوو، وەک هەندێ کەس دەڵێن ناوەکە ناوێکی سۆبارتییەکانە. گرنگە بزاندرێت کە ناوەکە سەدان ساڵ پێش ئەوان هەبووە.

ئەمەی خوارەوەش خشتەیەکە لە چۆنیەتی ناوهێنانی ئەربیل هەر لە سەردەمی کوردە سۆمەرییەکان تا ئێستا.

**لەم خشتەیە دەردەکەوێت، کە:**

١- هەندێ پیتی رەسەن هەیە بە هیچ شێوەیەک نەگۆڕاوە، بەڵکو دووبارە بۆ ئەوە (١٠٠٪) وەکو پیتەکانی (أ، ر، ب، ی، ل) لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە (٢٠٠٠پ.ز) تا ئێستا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە کە ئێستاش ناوی ئەربیلی هاوچەرخمانە.

بەڵام ئەو پیتانە کە بەلاوە نراون دووبارە کردنەوەیان کەمە وەکو پیتی (و) کە لە دوای (أ) لە سەرەتای وشەوە دێت کە لە (١٠٪) دووبارە کراونەتەوە، هەروەها پیتی (ا) کە لە دوای (ل) دێت لە کۆتایی وشەکە کە لە زمانی کوردی پەهلەوی دیار دەکەوێت کە رێژەی دووبارە کردنەوە تەنها لە (٣٥٪)، بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە بەلاوەنانی ئەم پیتانە هیچ کاری لە ناوە رەسەنەکە نەکردووە. (*)

٢- هەندێ برگەو پیت هەیە بەلاوەنراون و گۆڕدراون بە گۆڕانی سەردەم و مێژوو لە خشتەکە، بۆ نموونە برگەی (کی) سۆمەری زوو لادراوە، پیتی "ن" لە سەردەمی سۆمەری گۆڕاوە بۆ "م" کە ئەمڕۆش لە زمانی کوردی بەرچاو دەکەوێت (مەکە- نەکەی) کە ئەمەش مانای وشەکە ناگۆڕێت.

٣- لە سەردەمی ئەکەدییەکان وشەکە وەکو خۆی خۆی پاراستووە تەنها پیتی (م) لە کۆتاییەکەی لادراوە و لەوانی تر بەدواوەش دیار نەماوە.

٤- لە کوردی زاگرۆس لە دەوڵەتی کاردۆنیاش (کوردستان) کە بە سەردەمی بابلیش دەناسرێت ناوەکە خۆی پاراستووە تەنها پیتی "ب" گۆڕاوە و بووە بە "بە" و بە زیادکردنی پیتی "ۆ" لە کۆتایی ناوەکە.

٥- لە کوردی پەهلەوی کە سەردەمی گۆران و پێشکەوتنی زمانی کوردییە ناوەکە بووە بە (ئەربیرا) یان (ئەربیرە) و پیتی (ر) لێرە لە پیتی (ل)ەوە وەرگێردراوە و خۆی (ئەربیلا)یە.

٦- لە لای یۆنانی و لاتینییەکان ناوەکە پیتی (س)ی بۆ زیاد کراوە، کە ئەمەش سروشتی زمانەکەی خۆیان بووە، بۆیە لای کورد ئەم پیتی (س)ە بەلاوە نراوە، چونکە هیچ بایەخێکی لای ئەوان نەبووە، بەڵام لای ساسانییەکان ناوەکە (ئەربیلا)ی پەهلەوی بووە، بەڵام پیتی (ر) کراوە بە (ل) و پیتی (أ) کۆتایی لادراوە.

**ماناکانی لەسەر ناوی (ئەربیل) هاتوون**

زۆر مانا لە مێژوودا بەبەر ناوی ئەربیـل بردراوە لە سـەردەتای مێـژوودکـەی تا ئێسـتـا، بۆیە هەندێکیان بەرچاو دەخەین.

١- سۆبارتییەکان (ئەربیل)یان بە (چوار خواوەندەکە) تۆمار کردووە، کـە ئەمـەش ناوی باوی سـەردەمی سۆمەرییەکان بووە، هەرچەندە ئەم بۆچوونە بەهێند وەرناگیرێت، چونکە لە وشەی (ئەربائیلو) وەرگیراوە نەک لە وشـەی (ئۆربلیـوم) تەنانەت مێژووش باس لە بوونی چوار خواوەند ناکەن لە دەرگاکانی ئەربیل.

٢- لە سـەردەمی دواتر لە کـاتی هاتنی ئیسـلام هەندێ کـەس ناوی شـارەکـەیان لە وشـەی (روبل) لێکدایەوە کە جۆرە دارێکەو گەڵاکەی درێژو لوولە، گـوایە لە پاییزدا کـە هەڵدەوەرێ خـاکی ئەو شـارە بەوە دادەپۆشـرێت، هەرچەندە ئەم ناوەش گـومـانی زۆرە، چونکە ئەربیـل ناوەکەی عەرەبی نییە و پێش عەرەب هەبووە.

**لێکدانەوەی ناوی ئەربیل**

دوای ئەوەی هەندێ نموونەمـان هێنایەوە ئێسـتـا هەوڵ دەدەین لێـکدانەوەیەکی تازەی بۆ بکەین، بۆیە دەردەکەوێت ناوی ئەربیل لە دوو برگە پێک هاتبێت:

١- (ئور) یان (ئەر) کـە بەشی یەکەم و لای سۆمەرییەکان واتە شار، ئێسـتـاش ئاسـەواری شـارێکی تری سۆمەری هەیە لە شاری (ذی قار)ی عیراق، کە هەمان ناوی پێوە لکاوە.

ئەو برگەی (ئور) پیتی (و) لێوە دەرهێنراوە لە سـەردەمی کـاردۆنی (کـیـشـیـیـەکـان) (١٥٩٥-١١٥٧پ.ز) کە کـتومت بۆتە وشەی (ئار) کـە بە مـانای ئاگـر دێت، لە زمانی کوردیشدا ئەم مانایە دەبینرێت (ئایر، ئاور، ئاهیـرن ئاتر، ئاگـر)ە، وشەی (ئاری) مـانای ئاگـر پەرست، لەوانەیە لەسەر ئەم مانایە ئەو شـارە بووبێتە گۆڕستانی پاشا پارثییەکان، چونکە مـەڵبـەندێکی گـرنگی ئاگـر پەرستی بووە.

٢- برگـەی دووەم لە ناوەکـە (بیلیوم، بیلیون، بیلم)ی سۆمەری، لە برگەی یەکەم بە (گۆ)ترە، هەروەها لە سـەردەمـەکـانی ئەکـەدی و کیشییەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

دەردەکەوێت ئەم برگەیە بەم شێوە گۆڕاوە و پێشکەوتووە:

بیلیـوم، بائیلو، بایلوو، بیـران بیـلا، بیل، لەمـەوە دەردەکەوێت کە ئەم گـۆکـردنەی ئەم وشـەیە بەپێی زاراوە و قـسـەکـردن ناوچە جـیـا جیاکانی کوردستان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بە تایبەت لە سەردەمـەکانی کـاردۆنی و سـۆبارتی و لاتینی و ساسـانی، نزیکـیـەکـیش لە نێـوان هەردوو وشـەی (بایلوو) و (باڵا)ی کـوردیدا دەبینین کە بە مـانای بەرزی دێت، لە کـوردسـتـانی تورکـیـاش نـاوچـەیـەک هـەیـە پـێـی دەڵـێـن (بالو)(٦) کـە لە (بایلوو) مـیـدی نزیکە.... کـەواتە ناوی هەولێـر لە دوو برگـە پێک دێت و رەنگە بە یەکێک لەم دوو مانایە بێت:

١- ناوی هەولێـر (ئۆرباڵا) واتە ئەو شـارەی لە بەرزییـەوەیە، چونکە قـەڵا (٢٧) مـەتر(٧) لە دەشتاییەکەی دەوروبەری بەرزترە.

٢- شـاری (ئور)ی یەکـەم لە باکـووری عـیـراق بووە، واتە (ئەربیل)ی ئێـسـتـا، ئەوەش پێش ئەوەی سۆمەرییەکان بەشێکیان کۆچ بکەن بۆ باشوور و لەوێ شاری (ئۆر) هەر بە نـاوی (ئـەربـیـل) دروست بکەن، کە دەکـەوێتـە نزیک شـاری ناسریەی ئێسـتـا، بۆ جـیـاکـردنەوە ناویان لەوەی یەکەم نابێت (ئۆرباڵا) بە مـانای (ئۆری سـەروو) کە نموونەی ئەم ناوانەش لە کـوردسـتـان زۆرن، وەکو (مزوری باڵاو بەرواری باڵا).

بەڵام لەم دووەی سەرەوە کـامـەیان لە راسـتـییـەوە نزیکە، بەڕای من هی یەکـەمـیـان چونکە (ئەربیـل) شوێنەکەی بەرزە.

**هەولێر**

هەندێ بیـرمـەند شـرۆڤـەی ناوی هەولێر دەکەن، بەبێ گەڕانەوە بۆ ناوە

کۆنە مێژووییەکەی کە (ئەربیل)ە، هەرچەندە ئەم ناوە واتە (هەولێـر) ناوێکی کۆن نییە و نوێیە، ناوەکە وا لێکدراوەتەوە کە لە (خۆرلێر)(٨) هاتبێت بە مانای (خۆ پەرستی)، کە ئەمەش ناوی پەرستگای عەشتارە کە لە هەولێری کۆندا هەبوو.

ئەم ناوە ناکـرێت وا لێک بدرێتەوە، چونکە خۆپەرستی لە هەموو کوردستانی باشووردا هەبووە و بەناوی (سوریا)ش پەرت و ناسراو بووە.

رایەکی تر لەسەر ناوی هەولێر ئەوەیە کە دەڵێن بە مانای (ها لێرەیە) هاتووە، گوایە ئەوانەی بەرەو ئەو شارە چوون، دوای چەندین رۆژ و شەو رێگا برین بە حەسرەتەوە بوون بگەنە جێگاو گوتوویانە (ها لێرەیە)، بەڵام ئەمە لێکدانەوەیەکی لاوازە و بەهەند هەڵناگیرێت.

دەتوانین بڵێین (هەولێر) شێوەیەکی تری وشەی (ئەربیل)ە لە زمانی کوردیدا. چونکە ئەم جۆرە پیت هەڵگێر و وەرگێر کردنە لە زمانی کوردیدا زۆر باوە:

١- گۆڕینی پیتی (أ) بە (ه) وەکو ئەنجوومەن- هەنجوومەن، ئەحمەد وەند- هەمەوەند.

٢- گۆڕینی پیتی (ب) بۆ (و) وەکو بارام- وارام

٣- پاش و پێش کردنی پیت لە وشەدا لە کوردیدا نموونەی هەیە، وەکو ئەنودر- ئەونەر.

بەم پێیە ئەگەر ناوی (هەولێر) و (ئەربیل) بەرامبەر یەک دابنێین و گۆڕانەکان سەیر بکەین دەبینین بەم جۆرەی لێ هاتووە. پیتی (ه) بکەین بە (أ) دەبێتە (ئەولێر) گەر پیتی (و) بگۆڕین بۆ (ب) دەبێتە (ئەبلیر) و گەر پیتەکانی (ر،ێ) بینینەوە پێش ناوەکە وەکو خۆی لێ دێتەوە (ئەربیل) دەتوانین بڵێین گۆڕانەکان بەم شێوەیە بووە:

(ئەربیلا- ئەربیل- ئەرویل- ئوربل- هوربیل- هەولێر)(٩)

تێبینییەکان:

* ناوی ئەربیل سۆمەرییە و پێش هاتنی ئەکەدییەکان لە نیمچە دوورگەی عەرەب ئەم ناوە هەبووە.

** رێژەی سەدی بەپێی ئەم هاوکێشەیە دەرهێنراوە.

هێڵکاری بەش
——————— × ١٠٠ =
هێڵکاری گشت

*** خشتەی دووەم دروستکراوی نووسەرە بە کەڵک وەرگرتن لە خشتەی یەکەم.

سەرچاوەکان

١- طه باقر، جولات تاريخية بين مواطن الاثار في شمال العراق، مجلة المجمع العلمي الكوردي، العدد الاول، مطبعة المجمع العلمي الكوردي، بغداد، ١٩٧٥، ص ٦٤٣.

٢- فەرهاد پیربال، هەولێر ناوەکەی لە چییەوە هاتووە، ژمارە (١٢٢٧)، هەینی ١٩٩٦/٣/١، ساڵی پێنجەم.

٣- طه باقر. نفس المصدر، ص ٦٣٤.

٤- ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج ١، دار صادر بيروت، سنة الطبع بلا، ص ١٣٧.

٥- محەمەد مەردۆخی کوردستانی، مێژووی کورد و کوردستان، وەرگێرانی عەبدولکەریم محەمەد سەعید، چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد، ١٩٩١، لاپەڕە ٤٤٠.

٦- جمال رشيد و فوزي رشيد، تأريخ الكورد القديم، اربيل، مطابع دار الحكمة، ١٩٩٠، ص ٣٧.

٧- عبدالباقي عبدالجبار امين الحيدري، التجديد الحضري لقلعة اربيل، مطابع جامعة الموصل، ١٩٨٥، ص ٦٤.

٨- هادي رشيد الجاوشلي، تراث اربيل التاريخي، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥، ص ١٧.

٩- زبير بلال اسماعيل، اربيل في ادوارها التأريخية، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٠، ص٦٢.

و: ئەحسین ئەحمەد عەبدوڵلا هەرشەمی



# شوێنی پارێزگای هەولێر

دکتۆر هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

پارێزگای هەولێر یەکێکە لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان و، پایتەختی هەرێمەکەیە. کۆنترین شاری کوردی لەباوەش دەگرێت، کە شاری (هەولێر)ە، تاکو ئێستا ژیانی تێدا بەردەوامە. هەولێر وەک پارێزگا دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی عێراق. ئەو پارێزگایە، وەک ناوچەکانی تری جیهان شوێنی جوگرافی و فەلەکی تایبەتی خۆی هەیە. لەڕووی جوگرافییەوە لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی هاوسنوورە لەگەڵ هەردوو وڵاتی تورکیا و ئێران و پارێزگای سلێمانی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتییەوە، هەروەها ڕووباری زێی بچووک سنووری باشووری ڕۆژهەڵات و باشووری پارێزگاکە پێکدەهێنێت و، لە پارێزگای کەرکووکی جیادەکاتەوە. لە باکووری ڕۆژئاواش ڕووباری شین لە پارێزگای دهۆکی جیادەکاتەوە. پارێزگای نەینەواش دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوا و بەشێکی باشووری ڕۆژئاوای پارێزگاکە، زێی گەورە لێکیان جیادەکاتەوە.

لەڕووی فەلەکییەوە پارێزگای هەولێر دەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی (٣٥.٣٠-٣٧.١٥)ی باکووری گۆی زەوی و هەردوو هێڵی درێژی (٤٣.٢٢-٤٥.٠٥)ی ڕۆژهەڵات.

هەروەها لەڕووی کارگێڕییەوە پارێزگای هەولێر لە ساڵی (٢٠٠٨) لە (١٠) قەزا پێکدێت، کە ئەمانەن: (سەنتەری هەولێر، چۆمان، مێرگەسوور، سۆران، ڕەواندز، شەقڵاوە، کۆیە، خەبات، بنەسڵاوە، مەخموور)، بەو پێیە ڕووبەرەکەی دەگاتە نزیکەی (١٥٤٢٠ کم٢).

# پێکهاتەی خاکی پارێزگای هەولێر

فەتاح حەسەن قەڵاتی

**سەرەتایەک**

بە پێویستی دەزانم وەکو جوگرافیزانێک پێناسەی خاک بکەم، هەرچەندە بیروڕای جیاواز دەربارەی ئەمە هەیە و هەر پسپۆڕو تایبەتمەندێک بە پێی شارەزایی و پسپۆڕی زانستی خۆی پێناسەی دەکات، بەڵام لای من (ئەو سامانە سروشتییەیە، کە هەموو بوونەوەرە زیندووەکانی لە سەر ئەم خاکە دەژین خۆراکیان لەو دەست دەکەوێت و خاکیش بۆ هاوسەنگی بەپیتییەکەی خۆراک لەوانە وەردەگرێت و ئەمانەش دەکەونە ژێر کارتێکردنی مرۆڤ).

پارێزگای هەولێر دەکەوێتە ناوچە وشکەکان، کە هاوینی گەرمە و زستانی ساردو باراناوییە و خاکەکەشی ڕێژەیەکی بەرزی لە کاربۆناتی کالسیۆم تێدایە. مەبەستیش لە هەر توێژینەوەیەکی کشتوکاڵی بایەخدانە بە بواری زیادکردنی توانای خاک و بەرهەمی کشتوکاڵی و کەرەستەی خاوی پیشەسازی و زیادبوونی داهاتی نەتەوایەتی.

**شوێن - رووبەر - بەرزی و نزمی - ئاو و هەوای پارێزگای هەولێر**

پارێزگای هەولێر سەبارەت بە هێڵەکانی درێژی و بازنەکانی پانی، شوێنێکی جوگرافیایی گرنگی هەیە و شێوەیەکی درێژکۆڵە لە نەخشە دەگرێت و شوێنەکەی دەکەوێتە نێوان (٣٥-٤٠) و (٣٠-٣٧) هێڵی پانی بەرەو باکوورو (٢٠-٤٣) و (٣٠-٤٥) هێڵی درێژی رووەو رۆژهەڵات، وڵاتی ئێران دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی و تورکیاش دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای، پارێزگاکانی (دهۆک و موسڵ) دەکەونە لای رۆژئاوایی و پارێزگای سولەیمانی و وڵاتی ئێران دەکەونە رۆژهەڵاتی، بەڵام لە باشووری رۆژهەڵاتی کەرکوک دراوسێیەتی.

پارێزگای هەولێر رووبەرێکی فراوان لە خاکی هەرێمی کوردستانی عێراق پێک دەهێنێت: خۆی لە نزیکەی (٦,٢٧٣,٢٠٠) دۆنم دەدا، رووبەری زەوی و مڵکی کشتوکاڵی بە نزیکەی (١٣٦,٠٠٠) دۆنم دادەنرێت و رووبەری گشتی خاکی هەولێر، کە لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە نزیکەی (٥,٣٢١,٠٥٤) دۆنمە، بەڵام ئەو رووبەرەی لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمدایە و بۆ بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی لە پارێزگای هەولێر دەگونجێت، دەگاتە نزیکەی (١,٤٢٦,٠٨٤) دۆنم.

خاکەکەیشی بە پێی بەرزی و نزمی (تضاریس) دەکرێتە سێ یەکەی فیسیۆگرافی. هەروەک راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی لقی هەولێر لە ساڵی ١٩٨٥ ئاماژەی پێ کردووە، کە ئەمانەن:-

١- ناوچەی شاخاوی: بەشی باکووری رۆژهەڵات لە پارێزگای هەولێر دەگرێتەوە و نزیکەی (٣,٧٩٣,٦٠٠) دۆنمە.

٢- ناوچەی زوورگ: دەکەوێتە نێوان هەردوو ناوچەی شاخاوی و دەشتایی و رووبەری نزیکەی (١,٠٣٧,٦٠٠) دۆنمە.



٣- ناوچەی دەشتایی: دەكەوێتە بەشی باشوور لە پارێزگای هەولێر و نزیكەی (١٩,٤٠٠) دۆنمە.

**ئاو و هەوا:** پارێزگای هەولێر ئاوو هەوایەكی نیمچە وشكی هەیە، كە هاوینان گەرمە و زستانان ساردو بەبارانە، بارانەكەشی لەوەرزی زستان و نیوەی پایز و نیوەی وەرزی بەهار لە ساڵدا دەبارێت و لە هۆكارە سەرەكییەكانی ئاوو هەوای هەولێر باران بارینە و زۆری و كەمی ئەو دیاردەیە لە ساڵێكەوە بۆ ساڵێكی دیكە دیاریكراو نییە، بەڵكو لە زیادو كەمی دەدات و دەگۆڕێت، ئەو بارانەی كە دەبارێت بە سەر سێ ناوچە دابەشی دەكەین:-

١) ناوچەی بارانی كەم، كە ناوچەكانی باشووری پارێزگا دەگرێتەوە و بارانی لە ساڵدا لە (٢٠٠ ملم) كەمترە، باشووری چیای قەرەچووغ هەتا سنووری باشووری رۆژئاوای پارێزگای هەولێر دەگرێتەوە.

٢) ناوچەی بارانی گونجاو، بڕی بارانەكەی لە ساڵدا لە نێوان (٢٠٠-٤٠٠) ملیمەترە و لە باشووری دەشتی هەولێر و كەڵەك هەتا باكووری زنجیرەی چیای قەرەچووغ دەگرێتەوە.

٣) ناوچەی بارانی زۆر، بڕی بارانی لە (٤٠٠) ملیمەتر زیاترە، هەموو ناوچە شاخاویەكانی باكووری پارێزگای هەولێر هەر لە حاجی ئۆمەرانەوە هەتا دەشتی هەولێر دەگرێتەوە.

لە دیاردەیەكی دیكەی ئاوو هەوای پارێزگای هەولێر پلەی گەرمییە و پلەی گەرمیش فاكتەرێكی كاریگەرە لە سەر پارێزگا و هەڵكەوتنی شوێنی هەولێر لە ناوچەیەكی نیمچە گەرم وا دیاردەخات، كە پلەی گەرمی مام ناوەندییە و پلەی گەرمی ساڵانەی دەشتی هەولێر ١٩/٦٤ پلەی سەدییە.

**پێكهاتە سەرەكییەكانی خاكی پارێزگای هەولێر**

١) **مادەی كانزایی:** لە سەرەتادا خاك لەو وردیلە بەرد و خۆڵانە پێكهاتووە، كە تووشی ترازان و شكاندن هاتوون و بەشێكی گەورەیان لە پانتایی خاك پێكهێناوە. لێرەدا هەندێك كەرەستەی كانزایی لە خاكی پارێزگای هەولێر روون دەكەینەوە:-

أ) **ڕێژەی گەچ:** ڕێژەكەی لە خاكی پارێزگادا زۆر نزمە، لە چینەكانی توێكڵی سەرەوە و ناوەوە و قووڵایی زەوی خاكی باكووری شاری هەولێر لە نێوان (٠٧٪-٠٥٤٪) دایە، بەڵام لە ناوچەكانی باشووری شاری هەولێر ڕێژەكەی لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی دیكە جیاوازە.

ب) **ڕێژەی كلس (كسل)،** ڕێژەكەی زۆر بەرزە و لە نێوان (١٩,٢٪) لە چینەكانی سەرەوە و (٦٣,٥٪) لە چینەكانی ژێرەوەی قووڵایی زەویدایە.

ج) **پۆتاسیۆم:** ڕێژەی پۆتاسیۆم لە خاكی پارێزگا لە نێوان (١,٥٧) ملم مكافئی لە هەر (١٠٠)گم خۆڵ بۆ (٣٥) ملم مكافئی لە هەر (١٠٠)گم خۆڵ لە چینەكانی توێكڵی سەرەوە لە چینەكانی قووڵایی بەرەو كەمی دەچێت.

د) **نیترات:** بڕەكەی لە چینەكانی توێكڵی سەرووی خاك دەگاتە نێوان (١٢-١٧٦) بەش لە ملیۆن (P.P.M).

هـ) **فۆسفۆر:** ڕێژەكەی لە نێوان (٨,٠- ١٢,٦) بەش

لە ملیۆن لە چینەکانی توێکڵی سەرەوەی پارێزگادایە.

٢) **مادەی ئەندامی:** مادەی ئەندامی کاریگەرییەکی زۆر گرنگی لە سەر دیاریکردنی تایبەتییەکانی (صفات) خاک لە رووی بە پیت کردن و بەرهەمەکەی هەیە، و پێکهاتووی ئەندامیی لە خاکی پارێزگای هەولێر لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی پاشماوەی رووەک و زیندەوەرو ئاژەڵەکان لە چینەکانی توێکڵی سەر زەوی پەیدا بووە و تاقیگە زانستییەکان شییان کردۆتەوە، کە رێژەی مادەی ئەندامیی لە خاکی پارێزگا لە چینەکانی توێکڵی سەرەوە لە نێوان (٢,٢٩٪-٨٨.٠٪) لە قووڵایی (٣٥) سم دایە، بەڵام لە چینەکانی خوارەوە بە شێوەیەکی نارێک کەم دەکات.

هەروەها هەردوو هۆکاری سەرەکی (ئاو -هەوا) ش کاریگەرییان لە سەر پێکهێنانی خاکی پارێزگا هەیە.

**فاکتەرەکانی پێکهێنانی خاک**

١- **ئاو و هەوا:** یەکێکە لەو هۆکارانە، کە کاریگەریی لەسەر پێکهێنانی خاک هەیە و ئەمەش لەو بە یەکتر بەستنەوەی نێوان هەرێمەکانی ئاوو هەوا و هەرێمەکانی خاک لە جیهاندا بەدیار دەکەوێ و دەبینین باران و بەفری تواوە و رنوە بەفر کاریان لە سەر داماڵین و ورد کردنی بەردە کۆنەکان هەیە و بارانی زستان زیاتر کاریگەری لە سەر پێکهێنانی خاک هەیە لە چاو بارانی هاوینە، ئەمەش بە هۆی کەمی پێویستی رووەک بەم بارانە. تیشکەکانی رۆژیش (پلەی گەرمی) هۆکارێکی گرنگن بۆ خێراکردنی پرۆسەی شیکردنەوەی کیمیایی خاک و ئەو دوو هۆکارە پەیوەندییەکی توندیان لەگەڵ رووەکی سروشتی خاکی پارێزگای هەولێردا هەیە و دیسان پلەی گەرمیی بەرز لە هاوینان و بارانی بەرێژنە لە زستانان رێگا بۆ گەشەکردنی هەندێک رووەکی وەرزی خۆش دەکەن، کە رەگیان بە قووڵایی زەویی دەچێتە خوار.

٢- **تاوێرە بەردەکان:** بەردە بنچینەییەکان بۆ پێکهێنانی خاک بە مادەیەکی سەرەتایی دادەنرێت. بەردە ئاگرینەکان نزیکەی ٣٥٪ی تاوێرەکانی زەوی دادەپۆشن. ئەم بەردانەش بە هۆی رەقییەتییان لە هەموو جۆرەکانی دیکە زیاتر بەرگەی خورانییان هەیە، بەڵام بەردە گۆڕاوەکان بەرگەیان لە جۆری یەکەم کەمترە و بەردە نیشتووییەکان بەرامبەر کاریگەری داخورانی هەوایی (تجویف) بەرگرییان زۆر کەمە.

بەردی بنچینەیی لە خاکی هەولێر هەیە کە لە بەردی نیمچە و بەردی نیمچە تفت (صخور قاعدیة) پێکهاتووە، کە خاکێکی نیمچە نەرم یان نەرم (ناعمة) پێک دێنن.

٣- **بەرزی و نزمی:** لە سەرەتای بابەتەکە ئاماژەمان پێکرد.

٤- **بوونەوەرە زیندووەکان:** رووەکەکان بۆ پێکهێنانی مادەی ئەندامی خاک رۆڵێکی گرنگ و پێویستیان لە دروستکردنی زنجیرەیەک لە پرۆسێسە کیمیاوی و سروشتییەکاندا هەیە، لە کاتی شیکردنەوەیاندا دەیگۆڕن بۆ مادەیەک پێی دەڵێن (دبال) دەبینین پاشماوەی رووەکە رزیوەکان لە پێکهاتنی کیمیاوییان کارێکی راستەوخۆیان لە سەر زیادکردنی رێژەی ترشێتی ئاوی خاک (PH) هەیە و رووەکە سروشتییەکان لە پارێزگای هەولێر بە پێی بەرزبوونەوە لە سەر ئاستی دەریاوە بڕی باران بارینی ساڵانە دەکرێن بە سێ بەش، ئەمانەن :

١) **ناوچەی (سهوب) لەوەڕگای شێدار:** کە دەکەوێتە خوارووی دارستانە شاخاوییەکان و رووبەرێکی فراوان دادەپۆشن لە بەرزایی (٣٠٠-٥٠٠) مەتر لە سەر ئاستی دەریا و بارانی لە نێوان (٣٥٠-٥٠٠) ملم و لە ئەنجامی ئەم بارانە زۆرە خاکەکەی بە بەرهەمی گەنم و جۆ دەچێندرێت و ئەم ناوچەیە خاکی دەشتی هەولێر و دەوروبەری و شەقڵاوە و کۆیە و هەریر دەگرێتەوە.

٢) **رووەکی ناوچە دارستانەکان:** رووەکی ئەم ناوچەیە درەختەکان دەگرێتەوە. بەرزایی لە نێوان (٥٠٠-١٨٠٠) م لە ئاستی دەریایە و رووەکەکانی بریتین لە (دار بەڕوو و گوێزو چنار و مازی و گێوژ و کرۆسکی چیایی و ئەسپیندار و هەرمێ کێویلکە و داری هەورێز و خڵپە گوێز و ماش) و خاکی ناوچەی رواندز، سۆران و جوندیان و مێرگەسوور دەگرێتەوە.

٣) **رووەکی ناوچەی (ئەلپی-ئەلبی) دارستانە شاخاوییەکان:** ئەم ناوچەیەش سەرووی ناوچەی دارستانەکان دەگرێتەوە، کە بەرزاییان لە سەر ئاستی دەریا لە نێوان (٢٠٠٠-٣٧٠٠) مەتردایە و بارانی ساڵانەی لە (١٤٠٠) ملم زیاترە و خاکی شێروان مەزن و چۆمان و حاجی ئۆمەران و ناوچە سەر سنوورەکانی پارێزگای هەولێر دەگرێتەوە.

زیندەوەرەکانی دیکەش وەکو (بەکتریا، کەروو و کرمەکان) ئەمانەش کار لە پاشماوەی رووەکەکان، کە نیشتوونەتە سەر زەوی، لە سەر رووی خاک و ناوەوەیدا دەکەن.

٥- **کاری مرۆڤ:** مرۆڤیش بە شێوەی بنیاتنەرانە و رووخێنەرانە رۆڵی لە پێکهێنانی پەینەکان و داشۆرینی خاک لە خوێیەکانی هەیە و پڕکردنەوەی گۆم و زەلکاوەکان لە لایەن مرۆڤەوە بە کارێکی باش و زانستیانە دادەنرێت، بەڵام برینی درەختەکانی کوردستان و لە رەگ هەڵکێشانیان، ئاودانی زۆرو کێڵانی سەر بەرەو خوار بە شێوەی ستوونی دەبنە هۆی راماڵین و نەمانی توێکڵی سەرەوەی خاک...

### تایبەتمەندیی فیزیاویی خاکی پارێزگای هەولێر

١- نەسجە (پێکهاتەی خاک (Soil Texture)، توێکڵی سەرەوەی خاکی پارێزگای هەولێر زۆر توندو یەکگرتووە، بەو واتایە گەردەکانی یەکگرتوو و پێکەوە نووساون و چینێکی قوڕینی نەرمیان پێک هێناوە و لە نێوان (لە زۆربەی ناوچەکانی پارێزگای هەولێر- (Sill-C بۆ CL) دایە، واتە خاکەکەی نیمچە نەرم و وردیلەکانی بەیەکەوە نووساون، بەڵام ئەم یەکگرتنە لە چینەکانی خوارەوە و قووڵایی زەوی لە نێوان (Si-c بۆ Clay) دایە، واتە خاکێک کە زۆر نەرم پێکەوە نووساوە.

لە نزیک دۆڵەکان و لێواری رووبارەکان یەکگرتنی وردیلەکانی خاک (نسجە) بەم شێوەیە، لە چینەکانی سەرەوە بەشێوەی (Sill-L بۆ SL)، واتە پێکهاتەی خاکەکەی نیمچە گرژە (متوسط الخشونة) بۆ نموونە ئەگەر هەندێک لەو شوێنانە وەربگرین، کە لە خشتەی یەکەم ئاماژەمان پێکردوون بۆمان روون دەبێتەوە کە پێکهاتەی خاکی دەشتی هەولێر (مەزیجی -قوڕییە) (clay Low) هاوینەهەواری سەڵاحەدین (قوڕییە Clay) و عەنکاوە (قوڕی -لیتەیی)یە وەک کەڵەک (مەزیجی -قوڕی) یە.

بەڵام لە چینەکانی ناوەوە بەرەو خوارەوە و تا قووڵایی زەوی لە خاکی ناوچەی دۆڵەکان و لێواری رووبارەکان دەبینین بە پێی نیشتووی چینەکان لە کاتی دروستبوونیان دەگۆڕێت.

٢- رەنگی خاک، (Soil colure)، ئەمەش دەودەستێتە سەر رێژەی پێکهاتووەکانی لە مادەی ئەندامی و کانزایی بە تایبەتی (دوبال) و گیراوەکانی ئاسن بە پێی ئەمە رەنگی سوورو زەرد بەڵگەی بوونی ئۆکسیدەکانی ئاسنە لە ناو خاکدا و رەنگە سپات و مەیلەو رەشەکان بەڵگەی بوونی بیرێکی زۆرە لە دوبال و نایترۆجین، رەنگی سپات و مەیلەو سپی بەڵگەی بوونی خوێیەکانە.

رەنگی چینەکانی سەرەوەش لە خاکی پارێزگای هەولێر بەم شێوەیە:-

- Brown7/5 yR5/4 dry
- Yellow wish Brown 10 Yr 5/4 dry
- Dark Brown7/5 yR 4/4 moist
- Dark yellow Wish Brown10 yR4/4 moist

رەنگی خاکیش لە چینەکانی ژێرەوە و بەرەو قووڵایی ژێرەوە لە پارێزگای هەولێر بەم شێوەیە:-

- Dark Brown 7/5 YR 4/4 to Brown 7/5 yR 5/4
- Dark Yellow Wish Brown 10 YR 4/4 to Yellow Wish Brown 10 yr 5/4

بەڵام لە ناوچەکانی دەوروبەری لێوارەکان (Low terrace) رەنگی سووری روونە و رەنگی لە چینەکانی سەرەوە بەم شێوەیە :-

- Brown 10yR 5/3 dry to Dark Brown 10 yR 3/3 Moist

لە چینەکانی ژێرەوە بەم شێوەیە:-

- Light olive Brown 5/2 yR 5/2 Moist

لە چینەکانی قووڵایی ژێرەوەش بەم شێوەیە :-

- Dark grayish Brown 5 yR 5/2 Moist

ئەگەر خاکی ئاسکی کەڵەک بە نموونە وەربگرین دەبینین رەنگی قاوەیی تۆخە، بەم شێوەیە :-

(قاوەیی تۆخ) Dark Brown 10 yR 3/3 -

رەنگی خاکی چینەکانی سەرەوەی شارۆچکەی عینکاوە وەکو لە خشتەی ژمارە (١) ئاماژەمان پێکرد رەنگەکەی قاوەیی تۆخ (10 yR 4/3) ی شێدارو قاوەیی (10 yR 6/3)، و لە چینەکانی قووڵایی ژێرەوە رەنگی قاوەیی مەیلەو زەردە

(10 yR 5/4) شێدار و قاوەیی (10 yR 6/3) وشک.

بەڵام لە قوشتەپە رەنگی چینەکانی قاوەیی مەیلەو زەردی ئاڵە (10 yR 4/4) شێدار و قاوەیی روون (10 yR 6/3) وشک و رەنگی چینەکانی قووڵایی ژێرەوەش وەکو

رەنگی چینەکانی سەرەوەیە.

٣- ژێر خانی خاک (Soil structure)::

پێکهاتووی چینەکانی خاکی پارێزگای هەولێر، بەتایبەتی دەشتی هەولێر دەبینین لە جۆری دروستبوونیان پێکدەچن: بەتایبەتی لە چینەکانی سەرەوە، کە پێکهاتووی وردیلەیی (Granular)یە لە هەموو خاکدا، بەڵام ئەم پێکهاتنە لە چینەکانی ژێرەوە لە نێوان چینی گۆشەییە (Angular bloekg) بۆ چینی نیمچە گۆشەیی (Sybanguar bloekg) بۆ چینی سەرەتایی کە دروست نەبووە (Structure Less) بەتایبەتی لە چینەکانی بنەوە.

٤- ئەستووریی خاک (Soil Depth): ئەستووریی خاک دەوەستێتە سەر تەمەن و ماوە جیۆلۆجییەکان، کە چینەکانی زەوییان پێکهێناوە، ئەگەر مەودای پێکهاتن لە مەودای رامالین (الازالة) کەمتر بوو، ئەوا ئەستووری کەم دەبێت، بەڵام ئەگەر پێچەوانە بوو، ئەمەش راستە، هەتا خاک ئەستووری چینەکانی زیاتر بێت ئەوا بە پیتتر و مادەی خۆراکی بۆ گەشە کردنی رووەک زیاتر دەبێت، بەڵام خاکی بێ گڵ و تەنک هەمیشە بێ پیت و بەرەکەتە و سەرچاوە خۆراکییەکانی تێدا نییە. بە گشتی لە گەڵ ئەو جیاوازییەی، کە لە ناوچەی دەشتاییەکان بۆ ناوچە چیاییە بەرزەکان هەیە ئەستووریی خاکی پارێزگای هەولێر زۆرە و زیاد دەبێت، هەتاکو بەرەو ناوچە شاخاوییەکانیش بچین کاریگەری پرۆسێسی رامالین و ئاوی زێیەکان و با زیاتر دەبێت و دەبێتە هۆی تەنکبوونی بەشی سەرەوەی خاک، بەڵام لە دەشتاییەکان ئەستووری چینی تووێکڵی زەوی زیاد دەکات بە هۆی کەمی کاریگەری دامالین و با و خاکی ئەم ناوچانە زۆر بە پیت و چاڵاکە و بۆ بەرهەم هێنانی کشتوکاڵیش زۆر لە بارە.

### تایبەتییە کیمیاوییەکانی خاکی پارێزگای هەولێر

١- مادەی ئەندامی: ئەم مادەیە لە ئەنجامی ئەو پاشەڕۆیە رووەکی و ئاژەڵییانە لە چینەکانی تووێکڵی سەر زەوی کۆدەبێتەوە و تاقیگە زانستییەکان سەلماندوویانە، کە مادە ئەندامییەکان لە چینەکانی سەرەوە لە نێوان (٢.٢٩٪ بۆ ٨٨.٠٪) لە قووڵایی (٣٥) سم دایە، بەڵام لە چینەکانی خوارەوە بە شێوەیەکی ناڕێک کەم دەکات. خشتەی ژمارە (١) بۆمان روون دەکاتەوە، کە مادە ئەندامییەکان لە (٤) ناوچەی خاکی دەشتی هەولێر وەکو (عەنکاوە -قوشتەپە -شاوێس -شێراوە) بە شێوەیەکی گشتی لەو ناوچانە کەمە و ئەم مادەیە لە قووڵایی خاک هەر زۆر کەم دەبێت، رێژەی ئەم مادەیە لە نێوان (١٤.٠٪) لە چینی GI بۆ (١.٨٣٪) لە چینی API لە خاکدایە.

لە ئەنجامەکە بە دیار دەکەوێ، کە خاکی (عەنکاوە و قوشتەپە) مادەی ئەندامییان لە خاکی هەردوو ناوچەی (شاوێس و شێراوە) زیاترە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی یەکگرتن و بە یەکەوە نووسانی وردیلەکانی خاکەکە کە لەم دوو ناوچەیە (١، ٢) نەرمە و لە (٣، ٤) ناوەندییە وەکو لە خشتەی یەکدا دیارە.

دیسان کەمی ئەم مادەیە لە (شاوێس و شێراوە) بۆ سروشت و شێوەی بەکارهێنانی خاک و چڕی رووەکی سروشتی و شێوەی پێکەوە نووسانی وردیلەکانی خاک دەگەڕێتەوە.

٢- سوێریتی خاک: خاکی پارێزگای هەولێر خوێی زۆر کەمە، دوای ئەوەی وەکو سەرنج ناوی هەندێک ناوچە



**خشتەی ژمارە (١) هەندێک خاسیەتی فیزیاوی و کیمیاوی لە توێکلی سەرەوەی خاکی هەندێک شوێنی پیارێزگای هەولێر**

| ز | ناوچەکان | فەسلجە clayloom | خوێ Bc ----- | PH پلەی کارلێکی | مادەی ئەندامی ٪ | کاربۆناتی کالسیوم | کاربۆناتی کالـــیوە | --- مەگنیسیوم | --- پۆتاسیوم | خوێ سۆدیۆم | ڕەنگی چینی سەرەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| -١ | هەولێر | مزیجی -قوڕی | ٠.٣٢ | ٨.١٧ | ١.٣١ | ٣٧.٣٠ | ٠.١٧ | ١.٠١ | ٠.٠٠٠٩ | ٠.٠٠٣ | قاوەیی ٠.٠١١٩ |
| -٢ | قوش تەپە | قوڕی | ٠.٣٧ | ٧.٨٣ | ١.٧٨ | ٣١.٧ | ٠.٠٠٥ | ٠.٠٠٤ | ٠.٠٠٦ | ٠.٠٠١ | 10YR4/4 قاوەیی مەیلەو زەردی تۆخ |
| -٣ | صلاح الدین | = | ٠.٤٥ | ٧.٩٩ | ١.٣١ | ٣٤.١٠ | ٠.٠٠٩ | ٠.٠٠٦ | ٠.٠٠١ | ٠.٠٠٥ | ---- |
| -٤ | یارمجە | = | ٠.٥٨ | ٧.٨٧ | ٠.٤٣ | ٤٠.٩٣ | ٠.١٧ | ٠.٠٠٣ | ٠.٠٠٠٤ | ٠.٠٠٥ | قاوەیی مەیلەو زەردی ئاچوغ |
| -٥ | چەمی دبس | مزیجی-قوڕی | ٠.٤٦ | ٨.١٠ | ١.٣٣ | ٣٤.١٠ | ٠.١٠ | ٠.٠٠٥ | ٠.٠٠١ | ٠.٠٠٤ | قاوەیی مەیلەو زەرد |
| -٦ | خەبات | = = | ٠.٣٥ | ٧.١٥ | ١.٠٤ | ٣٦.٣٨ | ٠.٠٠٤ | ٠.٠٠٥ | ٠.٠٠٠١ | ٠.٠٠١ | قاوەیی مەیلەو زەردی تۆخ |
| -٧ | عەینکاوە | قوڕی-غرینی | ٠.٥٤ | ٧.٨٣ | ١.٨٣ | ٣٥.٣ | ١٩.٨٩ | ١.٣٧ | ١.١٠ | ٠.٣٣ | 10YR4/3 قاوەیی تۆخ |
| -٨ | شاویس | مزیجی-قوڕی | ٠.٧٦ | ٧.٩٣ | ١.٠٧ | ٣٥.٨ | ١٧.٧٤ | ١.٠٣ | ٠.٦٦ | ٠.٤٨ | 10YR4/4 قاوەیی مەیلەو زەردی تۆخ |
| -٩ | شێراوە | = = | ١.١١ | ٨.٤٥ | ٠.٩٤ | ٣٤.٣ | ٨.٦٠ | ٣.٣٧ | ٠.٥٦ | ٠.٤٣ | = = = |
| -١٠ | کەلەک | = = | ١.١٩ | ٨.٣ | ١.٩ | ٣٩.٥ | ١٣.٤ | ٥.٤ | ٠.٧ | ١.٥ | 10YR3/3 قاوەیی تۆخ |
| -١١ | قەراج | غرینی -لوجی | ٢.٠٤٥ | ٨.٣٥ | ٠.٦٨ | ٣١.٧٥ | | | | | قاوەیی مەیلەو زەردی تۆخ |

و بیـردکانی ناو خـاکی پارێزگای هەولێرمان وەرگرت و لە تاقیگە بە دیار کەوت کە زۆربەی ئاوی ئەم خاکە لە گروپی دووەمە (C2)، واتە خوێی کەمە. تەنها باشووری پارێزگا نەبێت، کە لە گروپی (C3) واتە نیمچە سوێرە و ناوچەی مەخمـوور دەکـەوێتـە ناو گـروپی چـوارەم (C4)، کە خـوێی هەیە، ئەمـەش هۆی ئەوەیە، کە گەیاندنی کارەبایی (EC) کەمـتـرە لە (١ ملیـمـوز، سم) و ڕێژەی بوونی سـۆدیۆم لە ڕێژەی بوونی کالـسیۆم و مەگنسـیۆم کەمتـرە، لە بەر ئەمە کۆبوونەوەی سۆدیۆم لە ناو ئاوی ئەم خاکە زۆر کەمە و ئەمە کـار ناکـاتە سـەر بەرهەمی کـشـتـوکـاڵ لەو ناوچانەی کـە بارانیـان زۆرە، لە بەر ئەوەی خاکەکە بە بەردەوامی بە هۆی ئاوی باران و بەفر بارین دەشووریتەوە، بەڵام لەو ناوچانەی لە توێکلی سەرەوەی زەوی کۆ نابێتەوە.

بە پێی خشـتـەی یەکەم بە دیار دەکـەوێ، کە هەمـوو خاکی دەشتی هەولێر لە ناوچە کەم خـوێیـەکانە و بە پێی پۆلێنکردنی (ریچارد، ١٩٥٤) کە گەیاندنی کارەبایی بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان (٠.٣٨ ملم. سم لە چینەکانی سەرەوەی خاکی شاوێس بۆ ١.١٩ ملموز/ سم لە چینەکانی سـەرەوەی خـاکی شێـراوە) دایە و بە ڕێژەی ٠.٧٤ ملـموز، سم و کـەمی خـوێش دەگـەڕێتـەوە بۆ کـاریگەری بەهێـزی شوشتنەوەی خوێیەکان و نەبوونی شۆرەکات و نزمی ئاستی ژێر زەوی.

٣- پلەی کـارلێکی خـاک منیـە (PH)، ئەم هۆکـارە ڕۆڵێـکی گـرنگی لە پێکهـێنانی سـەرچاوەکـانی خـۆراکی خاک هەیە، بە تایبەتی خۆراکە گرنگەکان و ڕێژەی ترشێتی خاک، خوێ ئەم مادانە دەتاوێنێتەوە و بۆ ڕووەک ئامادەی دەکات، کاربۆناتی کالسیۆم ڕێکخەرێکی گرنگە بۆ خاک، کـە ئەم کـارلێکە لە نێـوان (٧/٤ - ٨/٥) دابین دەکـات و لێرەدا ئۆکسیدەکانی ئاسن توانای توانەوەیان زۆر کەمە.

بە شێوەیەکی گشتی خاکی پارێزگای هەولێر کارلێکی تفتە (قاعدی)، کە پلەکەی لە نێوان ٧.٩٥ لە چینەکانی سەرەوە بۆ ٨.٤ لە چینەکانی ناوەوە لە هەندێک ناوچەداو، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ زۆری ئایۆنەکانی تفتی خاک، واتە خاکی ناوچەی تفت سووکە و نیمچە سووکە.

وەکـو لە خـشـتـەی (١) دیارە، کـە خـاکی پارێزگـای هەولێر نیمچە تفتە و، بەتایبەتی لە دەشتی هەولێر و پلەی کارلێکی لە نێوان ٧,٨٣ ٧ لە چینەکانی سەرەوە لە ناوچەی عەنکاوە بۆ ٨,٣٠ ٨ لە چینەکانی ژێرەوە لە خاکی ناوچەی شێـراوەدایە بە ڕێژەی (مـعـدل) ٨.٠١ و ڕێژەی (PH) جیـاوازیـەکی زۆری نییـە، بەڵام هەتا قـووڵایی زۆر بێت کـارلێکی خـاک بە هێـزتر دەبێت، وەکـو لە خـاکی هەردوو ناوچەی (عـەنکاوە و قـوشـتـەپە)، کـارلێکی خـاکی شـارۆچکەی سـەلاحەدین دەگـاتە ٧.٩٩ کە ئەویش بەرەو تفـتی دەچێت. لە خـشـتـەی یەک (١) دیـارە، کـە پلەی کـارلێکی ناوچەی (شێـراوە) لە هەمـوو ناوچەکـانی دیکە زیاترە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتنی خاک بە ڕێژەیەکی

بەرز لە کاربۆناتی کالسیۆم.

٤- کاربۆناتی کالسیۆم: وەرینی گەڵاو پاشماوەی ڕووەکەکان و زەردبوونیان لە ئەنجامی کەمیی مادەی ئاسنی ژێر خاک هاوبەندە لە خاکی کلسی (Soils Calcareous)، ئەوەش هۆی کەمیی ئاسنە لە خاکی کلسی (Lime -inducedchiorosb)، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو ڕۆڵەیە، کە کاربۆناتی کالسیۆم دەیگێڕێت.

زۆربەی ئەو ناوچانەی ئاسنیان کەمە بیری بارانیان لە (٥٠٠) ملم لە ساڵدا کەمترە، لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە، کە ڕووەکەکان لە هەستکردنیان و پێویستییان بە کاربۆناتی کالسیۆم و کەمی ئاسن جیاوازییان هەیە.

خشتەی (١) بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە خاکی دەشتی هەولێر، بەتایبەتی ڕێژەیەکی بەرزی هەیە لە کاربۆناتی کالسیۆم، کە خۆی دەدا لە نێوان ٣, ٣٠٪ لە چینە قووڵەکانی ژێرەوەی خاکی (شاوێس) بۆ ١, ٤٠٪ لە چینەکانی قووڵایی ژێرەوەی خاکی عەنکاوە بە تێکڕای ٣٠,١٥٪ و خاکی عەنکاوە لە نێوان ٣٠,٣٪ لە چینەکانی سەرەوە بۆ ٤٠,١٪ لە چینەکانی قووڵایی ژێرەوەی لە هەمان ناوچەدا بە ڕێژەی ٣, ٣٥٪، بەڵام لە خاکی قوشتەپە لە نێوان (٣٨٪) لە چینەکانی خوارەوە بە ڕێژەی (٣١,٧٪).

## دابەشکردنی جوگرافیی خاک لە پارێزگای هەولێر

سیفەتەکانی خاک لە کوردستانی عێراق پشت بە هەندێ هۆکار دەبەستێت، لەوانە جۆری تاوێرە بەردەکان و تەمەنیان، مادەی کارلێک کردنیان و کاریگەرییەکانی ئاوو هەوا و ڕووەک و بەرزی و نزمی و شێوەی بەکارهێنانیان لە لایەن مرۆڤەوە لەم خاکەدا.

زانای هۆڵەندی (بیورینگ) بە پێی جیاوازی پێکهاتنی جۆری بەردەکان، خاکی کوردستان و پارێزگای هەولێریان بەتایبەتی بۆ (٣) سێ ناوچەی سەرەکی پۆلین کردووە:-

١- خاکی شاخاوی: ئەم خاکە دەکەوێتە ناوچەی شاخاوی و لە هەموو لایەکی وەکو یەک نییە، بەڵکو لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە بە پێی بەرزی و نزمی و، ماوەی تووشبوونی بە شاڵاوی داماڵین جیاوازە. خاکی شاخاوی ڕەنگی قاوەییە و پێکهاتووە لە بەردی گەورە و قووڵایی لە نێوان (١٠ - ٣٠)کم دایە.

## خاکی شاخاوی لە پارێزگای هەولێر ئەم جۆرانەیە:-

أ) **خاکی کەستەنائی:** خاکی دەشتایی ناوچە شاخاوییەکان دەگرێتەوە، وەک دەشتی شارەزوور -ڕانیە و زاخۆ (سندی) و ئەم جۆرە خاکە لە خاکی پارێزگای هەولێر نییە، بەڵام دەکەوێتە دەوروپشتی خاکی پارێزگای هەولێر و ڕانیەو شارەزوور و ڕەنگی قاوەیی تۆخە و خاکێکی نەرم و بە خۆڵە، مادەی ئەندامی لە نێوان (١-٤) دایە و کەمترە لە کالسیۆم، کە تەنها ٩٪ یە، ئاوو هەوای ئەم ناوچەیە هاوینی گەرمە و ناوەندی بارانی لە نێوان (٤٠٠-٨٠٠) ملمترە و ڕووەکی سروشتیشی لە گژوگیای درێژ پێک هاتووە.

ب) **خاکی بەردینی تەنک:** ئەمەش لەو بەرزاییانەدا هەیە کە دەکەوێتە ناوچەی نیمچە شاخاوی و خاکەکە بێ گڵ و تەنکە و لە سەر تاوێرە بەردەکان دروست بووە و هەموشیان بەردی کلسی و گەچین.

ج) **خاکی ڕندزینا (Rendzina):** ڕەنگی ئەم خاکە لە نێوان قاوەیی تۆخ و ڕەشدایە و وردیلەکانی خیزاویی و قووڵایی لە نێوان (١٠-٣٠) سانتیمەتردایە و لە سەر بەردی کلسی دروست بووە و ئەم خاکە لە گرنگترین خاکی هەرێمی کوردستانە و دوو سیفەتی هەیە کە ئەمانەن:-

١- بەرزی ڕێژەی تاوێرە بەردەکان لەم خاکە.
٢- بەرزی ڕێژەی مادەی ئەندامی تێیدا.

ئەم خاکە بۆ پەیدا کردنی خۆراکی گەشە کردنی ڕووەک سەرچاوەیەکی گرنگە و بە نەبوونی ئەم خۆراکە ڕووەک شین نابێت.

بەڵام خاکی شاخاوی پارێزگای هەولێر بە پێی دابەشکردنی جوگرافی لە بەشەکانی باکووری پارێزگا جیاوازە وەک ئەمانە:-

أ - خاکی بەردی لە ناوچە بەرزەکان.
ب - بەردی کلسی و نیشتووەکانی دەریای ناوەڕاست.
ج - بەردی کلسی و قاوەیی (بونی).

٢- خاکی نیمچە شاخاوی و گردۆڵکەکان، ئەمەش خاکی خوار ناوچەی شاخاوی دەگرێتەوە، کە خۆڵەکەی و

قـووڵاییـشـی زیاترە لە بەر ئەوەی خـاکـەکـە لە چاو خـاکی شاخاویدا هێندە سـەخت و بەرز نییـە و بڕی بارانیـشی لە ناوچەی شاخاوی کەمترە و خاکی ئەم ناوچەیە لە پارێزگای هەولێر ئەم بەشانە دەگرێتەوە :

أ) **خاکی قاوەیی (گەنمی) (Brown Soils)**، ئەمەش دەکـەوێتـە ناوچەی نیـمـچـە شاخـاوی و لە خـاکی ناوچەی شاخاوی زیاتر باوەو ڕەنگی قاوەییە. خاکی ئەم ناوچەیە لە سنووری پارێزگـای هەولێـر بە تایبـەتی خـاکی بۆرکـەیە (سەمرار) کە لە دەشتەکانی (هەریر -خەلیفان -شەقلاوە -سەلاحەدین -کۆیە -تەق تەق و هەیبەت سوڵتان لە گەڵ هەندێک ناوچەی دەشتی هەولێر هەیە و ڕوودکـەکانی گژو گیای کورت و درێژ دەگرێتەوە.

ب) **خـاکی بەردینی تەنک:** ئەم خـاکـە لە هەردوو ناوچەی شـاخاوی و نیـمـچـە شـاخـاوی و لەو بەرزاییـانەدا هەیە کـە دەکـەونە ناوچەی نیـمـچـە شـاخـاوی و ئەمـەش توێکڵێـکی تەنک لە خـاک دەگـرێتـەوە وەک تەق تەق و بەستۆڕە و هەندێک خاکی باکووری دەشتی هەولێر.

٣- **خاکی دەشتایی:** خاکی دەشـتاییەکان لە پارێزگای هەولێـر دەکـەوێتـە سـەر ئەم ناوچەیە و ناوچەی دەشـتی هەولێـر بە گـشـتی و ناوچەکـانی قـوشـتـەپە -تەق تەق -دیبەگە -کەندێناوە - دەشتی مەخموور - گوێڕ و قەراج و.....هتد دەگرێتەوە.

ئێـسـتـاش هەندێک نموونە لە خـاکی دەشـتـاییـەکـان لە پارێزگای هەولێر وەردەگرین:

### دەشتی هەولێر

ڕووبەری ئـەم دەشـــتـــــە نزیکـەی (٤٠٠)کم ٢ و درێژییـەکەی هەر لە باشووری ڕۆژهەڵاتییـەوە هەتا باکووی ڕۆژئاوای نزیکەی (٨٥)کم و پانتـاییـەکـەی لە نیـوەی درێژییـەکـەی کـەمـتـرە و لە ڕووبەرێکی قـووڵایی فـراوان پێکهاتووە، کە نیشتـووەکانی لیتەیی و قوڕی و قومی وردە زیخ پڕی کـردۆتەوە و ئەگـەری هەبوونی ئاوێکی زۆری ژێر زەوی هەیە لە کـاتی هەڵکەندنی بیـری ئیـرتیـوازی لەم دەشـتـەدا و چینێکی فـراوان لەو وردە زیخی بەختـیـاری و بەردی پارچە پارچەیی هەیە، ئەم دەشـتـــە لە هەمـــوو دەشتـەکانی دیکە زیاتر بە کەڵکی کشـتوکاڵی گەنم و جۆ دێت و بەرزی ئـەم دەشـــتـــە لە نێـــوان (٣٠٠-٤٥٠) مەترداییە.

ئەم دەشتە شێوەیەکی سێگۆشەیی هەیە کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایدا گـردو تەپۆڵکە هەیە و چیـای (ئاوانە داغ) دەکـەوێتـە باشـووری درێژبوونەوەیەکی تەسکی هەیە بەرەو باشـووری ڕۆژهەڵات، کـە بە چیـای (کـانی دۆمـەڵان) و شاری کەرکووک دەگات. جۆرە بەردی کلسی و کەڵێناوی لە چیایەکانی دەوروپشتی هەن، وەکو چیای پیرمام و سەفین.

لەم دەشتەدا کانی و بیرو کارێزی قووڵ و درێژ هەنە، کە درێژی هەندێ لـەو کـارێزانە دەگـاتە ڕووبەری (١٠)کم و دەشتی هەولێر لەو دەشتە بە پیتانەیە کە کشتوکاڵی گەنم و جۆی لێ دەچێندرێت و پشت بە ئاوی باران لە زسـتـانان و ئاوی بیرو کارێزەکانیـش لە هاویندا دەبەستێت.

### سەرچاوەکان

١- دراسـة مـسـوحات التـربة ضـمـن مناطق محـافظة اربيـل (مـشـروع ري مـخـمـور ومنطقـة كنديناوه وسهل اربيـل وآسكي كلك وشمامك).
٢- سـەردان بۆ بەڕێوەبەرایەتی کشـتـوکـاڵی پارێزگـای هەولێـر (بەشی ڕووبەرو بەشی نەخشـەکێشـان) لە ڕۆژانی و١٩٩٦/٣/٢ و١٩٩٦/٣/١٠.
٣- عـمـاد عـبـد صـالح السلطان، رسـالة الماجـسـتـير بعنوان (خـصـائص وتصنيف بعض ترب سـهـل اربيـل) مطبعة صلاح الدين، سنة ١٩٨٧
٤- سـعـد داوود طه الملك، رسـالة الماجـسـتـير بعنوان (جـاهزيـة الحـديد في بعض التـرب الكلسـيـة في شمال العراق)، مطبعة صلاح الدين، سنة ١٩٨٦
٥- د. شـاكـر خصبـاك، العراق الشـمـالي، مطبـعـة شفيق، سنة ١٩٧٣
٦- دیدارێک لە گەڵ مـامۆسـتـای بەڕێز، ڕسول تاهیـر باب لە مەڵبەندی توێژینەوەی کشتوکاڵی
٧- GULDE LIENE F-A-O
٨- MUNSEL Soil Colure- Charts - U.S.A
٩- گۆڤـاری (علوم الزراعـیة) ژمارە (٢) و هاوبەندی ژمارە (٤) لە ساڵی ١٩٨٧ -مطبعە صلاح الدین

* ئەم بابەتە لە گـۆڤـاری هەولێـر - ژمـارە ٨ ی پایزی سـاڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.




نەخشەی پارێزگای هەولێر ٢٠٠٩

# جوگرافیای پارێزگای هەولێر

نووسینی: زوبێر بیلال ئیسماعیل

**هەولێر:** دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووک. لە باکووریدا تورکیا و بەشێک لە شاری موسڵە، لە باشووریدا شاری کەرکووکە. لە ڕۆژهەڵات ئێران و، بەشێک لە شاری سلێمانی لە ڕۆژئاواشی شاری موسڵە.

رووبەرەکەی (١٦/٦٠٠کم٢) بەپێی بۆچوونی داوسن، بەڵام بەپێی بۆچوونی بەڕێوەبەرایەتی رووپێوی گشتی (١٦/٤٨٦کم٢)، کەچی د. ئەحمەد سوسە بە (١٥/٨٧٠ کم٢) مەزەندەی دەکات.

هەولێر دەکەوێتە سەر هێڵی پانی درێژییەکەی (٣٦/١١) و لەسەر هێڵی درێژی (٤٢/٢) بەرەو

ڕۆژهەڵات، کەوتۆتە ناوچەیەکی بەپیت و بەردەکەت لەسەر بانێکی تەختایی ڕاست، کە نێوەندی بەرزاییەکەی (١٣٠٠) پێیە. بەڵام ئەو دەشتەی نزیک بەقەڵاکەیە بەرزییەکەی (١٣٣٢) پێیە لەسەر ڕووی دەریاوە. ئەو بانە هێڵی دابەشی ئاوە، لەنێوان هەردوو زێیەکە.

دەشتی هەولێر چەند چیایەکی، کە هێندە بەرز نین لێوەی نزیکن.

دەشتەکە لەشێوەی سێ گۆشەوایی بە درێژبوونەوەیەک هەتا کەرکوک. پێچەوانەیەکی، کە هەندێ خڵت و قوڕو لیتە و بەردی تیادا کۆبۆتەوە.

ئەو دەشتەی هەندێک جۆگە پاکی دەکاتەوە، کە ئاوەکانیان بەرەو هەردوو زێ دەچێت. لەسەر ئەم دەشتەی لەلای باشووری ڕۆژئاوای چەند گوندێکی کشتوکاڵی بەپیتی لێیە، دەشتی کەندیناوەیە پانییەکەی (١٠) میل و درێژییەکەی لە (٥٠) میلە ئاوەکانیان دەچێتە هەردوو زێیەکە بەهۆی ئەو جۆگەلانەی کەندیناوە. چیای قەرەچووغ نزمە لەکاتی دابەشبوونی ئاوەکە لەبەر ئەو هۆیەش ڕێگای دیبەگە مەخموور ڕێگایەکی خۆش و ئاسانە، ئەو پارێزگایە نزیکەی (٤٠٠٠) کم٢ ڕووبەری کشتوکاڵی بەرهەم دێنێ، واتە (٢٥٪)ی هەموو ڕووبەری پارێزگاکە، زۆربەی تۆکردنەکەی ساڵانەیە بۆیە هەر تاکێک لە خەڵکی گوند نزیکەی (٨) مەشایری بەردەکەوێت، واتە ئەگەر خێزانێک لە (٥) کەس پێکهاتبێت (٤٠) مەشایری بەر دەکەوێت، زۆربەی ئەو زەوییانەی بە ئاوی باران ئاو دەدرێت.

**باران:** هەولێر دەکەوێتە ناوچەیەکی نیمچە چیایی لە عێراق کە پشت بە ئاوی باران دەبەستێت. وەرزەکانی کشتوکاڵیش لە هەولێر ئەوەندە پشت بە چەندییەتی ئەو بارانە نابەستێت ئەوەندەی پشت بە کاتەکانی باران بارین دەبەستێت. واتە ئەو بارانەی دەبارێت گرنگ ئەوەیە لە کاتی پێویست ببارێت. وەرزە باران لە هەولێر و باکووری عێراق بەگشتی لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی یەکەم تاکو مانگی مایس، بەلای کەمەوە ئەو بارانەی کە زۆرە لە مانگی کانوونی دووەم یا شوباتە. بەڵام هەندێ جار جیاوازی هەیە، بەڵام ئەو بارانە، کە دەبارێت لە نێوان مانگی مایس و تشرینی یەکەم بارانێکی ئەوها نییە لە کەش و هەوایەکی بێ هەورە. دەتوانین ڕۆژەکانی باران بارین لە هەولێر مەزندە بکەین لەنێوان (٥٥- ٦٥) ڕۆژ لە ساڵێکدا. بارانە بەهاری ناوچەکە زۆر زیاترە لە باشووری عێراق، بۆیە لەبەر ئەو ڕاستییە ناوچەکە گرنگییەکەی لە کشتوکاڵی دێمییە.

**بەروبوومە کشتوکاڵییەکان:** گرنگترین بەروبوومە کشتوکاڵییەکان لە ناوچەکە گەنم و جۆیە، ساڵانە بەرهەمەکەی نزیکەی دەگاتە (١٠٠) هەزار تەن، لەپاش ئەو بەرهەمانە تووتن دێت، کە بەرهەمێکی هاوینەیە، ئەو ڕووبەرەی کە دەچێنرێت نزیکەی (١٠) هەزار دۆنمە، ئەمەش دەگاتە چارەکی ئەو ڕووبەرەی کە لە ڕێگا دەچێنرێت، لەپاش تووتن برنج و پەمۆ دێت، ئەمانەش بەروبوومێکی هاوینەن ڕووبەرێکی دیاریکراویان هەیە لە چاندن، بەڵام بەروبوومەکانی تر کە لە ناوچەکە دەچێنرێت، بریتییە لە (کونجی، نیسک، ماش، نۆک) هەروەها لە چیاکان (گوێز و باوی، فستق و سماق و ترێ و هەنجیرو سێو) هەیە.

بەخێوکردنی مەڕو ماڵات لەتەک کشتوکاڵ، کە لەناوچەکە ڕانە مەڕێکی گەورە لە مەڕو بزن لە نێو دۆڵ و چیاکان و دەشتەکان تا ڕادەیەکی چاک هەیە. ژمارەی مەڕ و بزن بە (٣٠٠/٠٠٠) سەر مەزندە دەکرێت ژمارەی چێڵ نزیکەی (٣٠) هەزار سەر دەبێت، بەخێوکردنی مێش هەنگوین گرنگییەکی تایبەتی هەیە ئەو ڕووپێوەی ساڵی ١٩٥٣ کراوە کە نزیکەی ٤٥٠٠ شانەی هەنگوین لە پارێزگاکە هەیە، بەرهەمێکی کشتوکاڵی و گیانداری دەنێرێتە ناوچەکانی تری عێراق، وەکو ماست و پەنیر و پێستە و خوری و هەنگوین و دار.

چیاکانی هەولێر بەشێکی ناوچەی چیاکانی عێراق لە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی پێک دەهێنێت بەشێک لە دارستان پێک دەهێنێ، کە ڕووبەرەکەی (٥٠٠کم٢) دەبێت، ئەمەش ناوی ئەو چیایانەیە لەگەڵ بەرزاییەکەیان لە ناوچەکە:

**حەسارۆست:** بەرزاییەکەی (٣٦٠٧) مەترە، کە بەرزترین چیایە لە عێراق.

هەوارە چووکە: بەرزاییەکەی (٣٥٨١) مەترە.

کێوە ڕەش: بەرزاییەکەی (٣٥٧٦) مەترە.

قەندیل: بەرزاییەکەی (٣٤٥١) مەترە.
هەندرێن: بەرزاییەکەی (٢٥٩٦) مەترە.
شیرین: بەرزاییەکەی (٢٣٧٨) مەترە.
برادۆست: بەرزاییەکەی (٢٠٦٨) مەترە.
سەفین: بەرزاییەکەی (١٤٧٥) مەترە.
پیرمام: بەرزاییەکەی (١٠٩٠) مەترە.
حەریر: بەرزاییەکەی (١٤٤١) مەترە.

ئەوەی جێی ئاماژەکردنە، کە چیاکانی هەولێر بە جۆرەها بەردی مەرمەڕ دەوڵەمەندن لە هەندێ لاوە، کە لە مەرمەڕی ئیتالی باشترە ئەمەش بە چەندەها ڕەنگ لە گەلێک شوێن هەیە لەوانە:

بەردی مەرمەڕی سماقی لە گوندی دەربەند لە ڕێگای ڕایات.

بەردی مەرمەڕی سپی لە گەلاڵە.

بەردی مەرمەڕی ڕەش لە ڕایات.

بەردی مەرمەڕی سوور لە حاجی ئۆمەران.

**هاوینەهەوارەکانی هەولێر:** ئەو هاوینە هەوارانە دەکەونە سەر ڕێگای گشتی لە نێوان هەولێر تا حاجی ئۆمەران، کە یەکەمیان (هاوینەهەواری سەلاحەددین)ە، کە دەکەوێتە سەر لووتکەی چیای پیرمام بەرزاییەکەی (١٠٩٠) مەترە، لە هەولێرەوە (٣٢) کم دوورە. لە پاش ئەو هاوینەهەواری شەقلاوەیە کە بەرزییەکەی (١٦٦) مەترە، لە سەلاحەددین (٢١) کم دوورە، شەقلاوە دەکەوێتە سەر چیای سەفین لەبەری باکووریدا. لە پاش گەلی عەلی بەگ دێت ئەو ڕێڕەوەی کە بەرەو ڕەواندز دەچێت (٦٠) کم لە شەقلاوە دوورە.

لە کۆتایی ڕێگا لەنێوان سنووری عێراق و ئێران هاوینەهەواری (حاجی ئۆمەران) دێت، کە بەرزاییەکەی (١٧٨٠) مەترە لەگەڵ ئەوەی، کە ئەو هاوینەهەوارە (١٣٠) کم لە شەقلاوە دوورە، بە خۆشترین و جوانترین هاوینەهەواری کوردستانی عێراق دادەنرێت، کە ئاوێکی ئێجگار خۆش و ئاو و هەوایەکی سارد و وشکی هەیە، کە دەکەوێتە بەر کاریگەری ئەو بەفرەی هەمیشە لووتکەی چیاکانی دەورو پشتی دادەپۆشێت. لە هەموو ئەو هاوینەهەوارانە ئوتێل و خواردنگای مۆدێرن هەیە.

**سەرچاوەکانی ئاو:** هەولێر بۆ کشتوکاڵ کردن پشت بە ئاوی باران دەبەستێ. تا ڕادەیەک بە ئاوی ژێر زەوی. کە چەندەها بیری ئیرتیوازی لێدراوە بۆ ئاودانی باخ و بێستانەکان، ئاوی ژێر زەوی گرنگییەکی زۆری هەیە لەسەر ژیانی خەڵکی ناوچەکە، لەبەرئەوەی شاری هەولێر دوورە لە هەردوو زێ. ئاوی ئەو بیرانەش تا ڕادەیەک بەشی پێویستەکانی خەڵکەکە دەکات، ڕێژەی خوێ لەو ئاوانە کەمە بۆ خواردنەوە و بۆ ئاودان دەشێت، ئەو بیرانە نزیکن لەسەر ڕووی زەوی، کە قووڵاییان لە نێوان (٥٠-١٠٠م) دەبێت، لەبەر ئەوەی ئێستا شارەکە زۆر گەورە بووە و خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری ڕوویان لە شارەکە کردووە. بۆیە تا ڕادەیەک ئاوی کەمەو ئاو لە زێی گەورە بەبۆری گەورە بۆی ڕاکێشراوە. کە ئەو زێیەش (٣٢) کم لە هەولێر دوورە، خەڵکەکانی کە لە زووەوە لە هەولێر ژیاون، ئەوانیش لە دابینکردنی ئاو بۆ شارەکە درێخییان نەکردووە. نووسینەکانی ئاشووری ئاماژە بەوە دەکەن، کە هەولیان داوە سەرکەوتووش بووینە لە دابینکردنی ئاو بۆ شارەکە، پاشای ئاشووری (سەنحاریب) پرۆژەیەکی گەورەی بۆ ئەو مەبەستە ئەنجامداوە، ئەو لێکۆڵینەوانەی، کە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارەکانی عێراق ئەنجام دراوە لەو پرۆژەیەی سەنحاریب ئەو زانیارییە بە کەڵکانەی تێدایە، نزیک گوندی (قەڵەمورتک)، کە (٢٠) کم لە هەولێر دوورە، بەندە ئاوەکەی لێیە کە لە بەردی چوارگۆشە دروست کراوە لە ناوەڕاستەکەی کونی ئەو ئاوەی لێیە، کە بەرەو باشوور دەڕوات، واتە بۆ هەولێر. لەسەر یەکێک لە بەردەکانی بە خەتی بزماری نووسراوە (من سەنحاریبم پاشای جیهان و پاشای وڵاتی ئاشوور، سێ بیرم لێداوە لە چیای خانێ، کە چیای بەرزی هەولێرن، کە لە هەردوو لای بەنداوەکە ئاوی کانییەکان دەڕژێتە جۆگەکە، لەپاشا ئەو جۆگەیە دەچێتە ناوەڕاستی شاری هەولێر شوێنی ختووی شکۆدار خوای عەشتار، ئاوەڕۆکەم ڕاست بردووە بۆ شاری هەولێر)، لە بەرزاییەکانی شارەکە چیایی (سەفین و سەلاحەددین) سەرچاوەی ئاوی ڕووباری بەستۆڕەی لێ هەڵدەقوڵێت. لە دۆڵەکانی ئەو چیایە چەند ڕووبارێک دەڕژێتە بەستۆڕە، کە کۆدەبنەوە لە نزیک گوندەکانی (سوسێ، زیارەت، قیرژە)، بەڵام چوکی ئاوی زۆرە لە ناوچەکە، ئەو ڕووبارو

سەرچاوانە ئاویان زۆرە، ئێستا کێلگە و بەراویەکی فراوان تا دەگاتە گوندی دنجیزاوە ئاو دەدەن، ئەو ئاوەی دەمێنێتەوە هاوینان بلاودەبێتەوە لە بەستۆرە دووبارە لەسەر زەوی بەدیار ناکەوێت تا دەگاتە نزیک گوندی (قەلە مورتک) لە رۆژئاوا لەبەرئەوەی کونی جۆگەکە لە ئاستێکی تەسکی بەستۆرە بووە لە قوولایی نزیکەی (٢٠) پێ لەسەر رووی زەوی بۆیە وا دەچێتە بیرەوە ئەو پرۆژەی ئاوە لە کاریز چووبێت، کە بەکارهێنانی لەو ماوەی دواییدا لە هەولێر بلاوبووبوو، بەلام پرۆژەی سەنحاریب جیاوازی هەبووە لەگەل کاریز، چونکە پرۆژەکەی سەنحاریب ئاوەکەی لە سەرچاوەی چیاکانەوە بوو، کەچی ئاوی کاریز بریتییە لە کۆمەلێک ئاوی بیری هەلکەندراو. لە نەخشەی هەولێر وا بەدیار دەکەوێت کە سەرچاوەی جۆگەکە بەرە بەرە لێژدەبێتەوە بەرەو باشوور و هەروەها بەرەو رۆژئاوای گوندی (مورتکە) لە ئاستی ئەو دەشتایەی نزیک هەولێر بەرزترە، نزیکەی (١٥٠) پێ، ئەو نزمایەش بەسە بۆ داخزانی ئاو لە جۆگەکەوە بۆ هەولێر. لەوانەیە کە جۆگەو دیاردەیەکی سەر رووی زەوی بێت، لە نشێوەکان بۆتە بەربەستی درێژبوونەوەی بۆ هەولێر و نزیکبوونەوە لێی. لە باشووری رۆژهەلاتی گوندی (بەحرکە) لە نێوان (هەولێر - قەلەمورتک) پاشماوەکانی هەندێ جۆگە بەدیار دەکەوێت، پانی (٩) مەترە لەوانەیە بەشێک بووبێت لە پرۆژەی سەنحاریب. کونی جۆگەکە پرە لە بەرد، بەستۆرە رادەمالێ لە وەرزەکانی باران بارین، شێوەکەی چوارگۆشەیە بەرزییەکەی (١٢٠) سم پانییەکەی (١١٢) سم، دیوارەکەی بە بەرد هەروەها ژێرەکەشی بەهەمان بەرد دروست کراوە.

**بنچینەی دانیشتوانەکەی:**

زۆربەی دانیشتوانی پارێزگاکە لەبنچینەدا دەگەرێتەوە سەر وەچەیەکی سەر پان و لەشێکی گەورە و کەپوویێکی چەماوەی ئەستوور، کورد دەچنەوە سەر ئەو وەچەیە. ئەو وەچەیە رەسەنایەتی و زمان و مرۆڤایەتی خۆیان لە ناوچەی چیاکانی پارێزگاکە پاراستووە، هەندێک کاریگەری ئەنترۆپۆلۆژی تایبەت بە ناوچەکە کاری لێ کردوون، واتە عەرەبەکانی وەچەی دەریای سپی ناوەراست، مینۆرسکی وای دەبینێت، کە کورد نەتەوەیەکی ئێرانین لە فارس و قەوقازو تورکیا و عێراق دەژین، دۆخی کوردەکان دەباتەوە گەل گەلانی ئیسلامی بۆ زمان و مێژوو، لەوانەیە کە گەلی کورد لەبنەرەتدا لە رۆژهەلاتەوە (رۆژهەلاتی ئێران) کۆچی کردبێت و بۆ رۆژئاوا (کوردستانی ئێستا) تیایدا ژیاوە، هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە ئەو بارودۆخەش نابێتە لەمپەر پێش ئەوەی ئەو گەلە بێت لە کوردستانی ناوەراست نەتەوەی جیا جیا ژیابن لە ژێر هەمان ناوی لەوچوو، وەک (کاردۆ) لەگەل کوردی ئێران چووبنە پال ئەو گەلە پاش تێکەلبوونیان لەگەل یەکتر بوونە نەتەوەیەکی یەکگرتوو بەدرێژایی رۆژگار و دۆخەکە.

رۆژهەلاتناس (یژو دابخن Tharcau) لە کەفی ئاشوورییەکان ناوچەیەکی دۆزییەوە بەناوی (کار-دا-کا)، ئەو ناوچەیەش نزیک بەخەلکی (سو) و (سو) دەکەوێتە باشووری دەریاچەی وان، هەروەک (درایڤەر Driver) دەلێت. بدلیسی لە شەرەفنامەدا دەلێت: قەلایەکی کۆن هەیە بەناوی (سوی) هەرێمی بدلیس. پاش ئەوە بە هەزار سال (تجلات بلاسر ١٠٩٨-١٠٦٨) پێش زایین جەنگێکی کردە سەر گەلێک بەناوی (کورتی) لە جیاتی (ئازو) درایڤەر کردیی (خرو) ئێستا (صاصون)ە.

هیرودوت لە سەدەی پێنجەمی پێش زاین ئاماژە بە ناوێکی لەو جۆرە ناکا، بەلام دەلێت هەرێمی سێزدەمی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی لکاوە بە ئەرمینیە و ناوی (بوختە یوخە)، هەندێک لە رۆژهەلاتناسان بەناوی بوختان (بوهتان) مەزەندەی دەکەن.

(جزینیفون Xenophon) (٤٠١-٤٠٠) پێش زایین ناوی گەلێک دەبات (کردوک)، کە دەژین لە رۆژهەلاتی (گنتریس - بوختان - بوهتان)، پاش ئەوە ئەو ناوە زۆر باس کراوە لەو هەرێمەی نێوان لای چەپی رۆخی دجلەو چیای (جودی)، کە مێژوو نووسەکان ناویان لێ ناوە (کوردئین)، ئەو هەرێمە بە ئارامی پێی دەلێن (حەوزی کاردۆ).

ئەو ناوەیان (گازارتای کاردۆ) خستۆتە سەر دەریاچەی ئیبن عومەری ئێستا، لە کۆنەوە ئەرمەنییەکان ئەو

ناوچەیان بە (کور دوز) ناسیوە.

یاقوتی حەمەوی کە لە ئیبن ئەثیر دەگێڕێتەوە: وڵاتی (بەقردا) بەشێکە لە جەزیرەی ئیبن عومەر، ناوی (بەقردا) نەما کە لە سەردەمی یەکەمی ئیسلامی بەو هەرێمە دەگوترا، لە سەرچاوە عەرەبییەکان بوو بە ناوی جەزیرەی ئیبن عومەر یا بوهتان.

گومانی تێدا نییە، کە (کاردشو) لە کۆن پێگەی گەلی کاردۆ ناوەندی پێگەی ڕاستەقینەی گەلی کوردە ئێستا. ئەگەر ئەوە سەلمێندرا ئەوە وشەی (کارد شوی - کرد) هاومانان. ئەو بۆچوونەش گەلێک ئاماژەیان پێکردووە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ورد، کە مینۆرسکی بۆ لێکۆڵینەوەی زمان، کە چەند شارەزایەک پێی هەڵساون لەوە ئەمەیان هێناوەتە ئاراوە، لە سەردەمی ئەو جەنگانەی عەرەب وشەکە تاک (کورد) بووە و کۆیەکەی (کوردەکان)ە.

(سیدنی سمیث sidny smith) وای دەبینێ بۆچوونی شارەزایەکان لە سەردەمی نوێدا بەرامبەر بەزمانی کوردی گۆڕاوە، هەندێک وای بۆ دەچن، کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە، پێکهاتوو نییە لە فارسی و زۆر کۆنترە لە زمانی فارسی، کە نەخشەکانی (دارا) ی پێ نووسراوە.

ئەمین زەکی دەڵێت: (کوردستان پێگەی یەکەمی وەچەی مرۆڤایەتی دووەم بووە، لەوێوە پەلی هاویشتووە بۆ شوێنەکانی تر بەپێی ڕووداوەکانی مێژوو. لەپێش بەرەبەیانی مێژوو گەلەکانی چیای زاگرۆس تیایدا ژیاون) ئەمانەش (لولو) (گوتی) (کاشی) (خالدی - کالدی) و سەبارو - هوری - خوری.

ئیسلامییەکان لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی باشووری نیشتەجێ بوون. هەموو ئەو گەلانە تەنها ئیسلامییەکان نەبێت بنچینەی کۆنی گەلی کوردە.

هەروەها زیاتر ئامادە دەکات (جیاوازی لەسەر ناوەکانی گەلی کورد لە سەردەمەکانی کۆن سوودی نییە لە چەندیەتی هۆز گەلەکان ئەو جیاوازییە بەپێی سروشتی گۆڕانی بارودۆخەکە بووە. ئەوەش ئیعتیماد دەکاتە سەر گۆتەی (سپایزر)، کە دەڵێ (ناوی ڕاگەیاندراوی گەلان دەکرێت لەلایەن گەلانی تردوە گۆڕانی بەسەر دابێت).

کاشییەکان بە درێژایی سەردەم پێیان دەگوتن: (کاسای، کاسی، کاشتو، کوش) ئەمان هەمووی یەک ناون بۆ گەلی کاسی. هەروەها گەلی لوللو (لوللومی، نوللو) ئاواش بەچەندەها ناو گەلی کورد دەکرا نەتەوە دێرینەکان کوردیان بەو ناوانەی دەناسی:

گوتی. جوتی. جودی: لەلای سۆمەرییەکان گوتی. کوتن. کارتی. کورتی. کاردوو. گاروگا. کاردان. کارکتان. کارداک: لەلای ئاشوورییەکان و ئارامییەکان کورتیوی. سیرتی. کوردراها: لەلای ئێرانییەکان کاردواسوی. کاردوخوی. کاردوک. کردۆک. کردوکی. کردوخی. کاردویکای: لەلای یونان و ڕۆمان کوردئین. کورچیخ. کورتیخ. کرخی. کورخی: لەلای ئەرمەنەکان کردی.کاردوی. کارتاویە. جوردی. جودی: لەلای عەرەبەکان.

**هۆزە کوردەکان لە هەولێر:**

مێژوونووسە موسڵمانەکان لە لێکۆڵینەوەکانیان دەربارەی کورد بە گشتی لە گەلێک بۆنەی مێژوویی و جوگرافی ئەوهایان باس کردووە، مەسعودی ساڵی(٣٣٢ک- ٩٤٣ز) ئەستەخری (٣٤٠ک-٩٥١ز) زانیاری زۆر نایابیان داوە بەڵام ئیبن حەوقەل (لە سەدەی دەیەی زاینی) دەڵێت: لە نێوان هەردوو زێدا پاوانێکی بەرفراوان هەیە بەڵام بەهۆی ئەو شەڕو شۆڕەی، کە تووشی ناوچەکە هاتووە، هەمووی بەفیڕۆ چووە و کەسی تیا نەماوە، ئەوە لە زستاندا شوێنی کوردەکانی هەزبانی بووە هاوینگەی شیبانییەکان بووە. هۆزی هەزبانی لە ئازەربایجان دەژیان، میرنشینێکی بەهێزیان هەبوو، بەڵام لە زستان هاتوونەتە نێوان هەردوو زێ، قەڵای هەولێر ناوەندیان بووە، ئیبن حەوقەل ئاماژە بەو جەنگ و ئاژاوە کاولکارییانە، کە لە نێوان ڕۆمانییەکان و ساسانییەکان هەبووە دەدات، کە لە پێش هاتنی ئیسلام ڕووی داوە، هەولێریش چەقی ئەو پێکدادانە بووە و بۆتە هۆی کوشتن و ماڵوێرانی خەڵکێکی زۆر. هەزبانییەکان لەگەڵ دەوڵەتی عەباسی ساڵی (٢٩٣) کۆچی لە سەردەمی خەلیفە (مکتفی باللە) بەسەرۆکایەتی محەمەد کوری بیلال پێکیان داداوە، هەروەها هێرشیان کردە سەر نەینەوا.

خاوەنی کتێبی (صبح الاعشی) و خاوەنی (مسالک الابصار) لە سەدەی هەشتەمی کۆچی لەسەر کورد قسە دەکەن بیست بابەت ئاماژە پێ دەکەن لە ناوچەی چیاکان لە چیای هەمەدان و شەهرەزوور دەست پێ دەکەن کۆتایی بە (قلاع) دێن لە هەر هۆزێک لە کورد نموونە دێنن و لێرە ئاماژە بە هەندێک دەکەین، کە بۆ لێکۆڵینەوەکەمان گرنگە.

١- ئالیستر: هەر لەگەڵ کارەکانی (ئەربل- ئەربیل) بوو، کە هۆزی قرتاویە (کرتاویە) تیایدا نیشتەجێ بوون، هەولێر و هەندێ جێگای تریان بە دەستەوە بوو لە (صبح الاعشی) ژمارەیان زیاتر لە چوار هەزار کەسە، میرێکی تایبەتی خۆیان هەبوو.

٢- ولاتی کەرکار: هۆزی حەسناوی (خشناو) لێی نیشتەجێ بوون، سێ تایفە بوون، تایفەیەکیان عیسا شەهابەدین، تەلیە، تایفەی جاکیە (صبح الاعشی) دەڵێت: هەموویان ١٠٠٠ پیاو بوون، بەڵام تایفەیەکیان میرێکی تایبەتییان هەبوو (دائیرەی معارفی ئیسلامی) وای دەبینێ، کە ئەو هۆزە (خۆشناو)ن، کە سێ تیرە بوونە، یەکێکیان لە ولاتی (کارتاوی و دەرمەندی قەرەبویلی) (هوفمان) وای دەبینێ، کە دەکەوێتە چیای رۆخی رووباری زێی بچووک.

٣- دەربەندی قەرایلی: پێگەی تیرەی (قەریاوی) بوود، خاوەنەکەی لە دەرگای سولتانی نووسییە لە میسر.

٤- نێوان دوو چیا لە کارەکانی ئەربل: کوردی لێ نیشتەجێ بوو، کە لایەنگری میسر بوون، ژمارەیان هەندەی ژماردی کەلالییەکان بوو، میرێکی تایبەتییان هەبوو. میرەکەیان تاجەدین خضر کوڕی سولێمان.

٥- مازنجان، بیروە، بێخمە (بخمە) ولاتی سەهرانیان، مازنجانییەکان لێی نیشتەجێ بوون، کە سوارچاکی زۆر لێهاتوو بوون.

٦- ولاتی سەهریە: ولاتی سقلاوە (شقلاوە) و ئەبی عەلی، کە بە (خفتیانی بچووک) دەناسرێن لە نێوان ئەو دەشت و دەربەندە گەورە، تیرەی سەهری (سەهران- سۆران) تیا نیشتەجێ بوو (صبح الاعشی) دەڵێت: (نەتەوەیەک بوون ژمارەیان نەدەگەیشتە هەزار کەس، چیاکانیان زۆر سەخت بوو، دەربەندەکەیان لە نێوان دوو



**نەخشەی دابەشبوونی هۆزەکان لە پارێزگای هەولێر**

چیای بەرز بوو، زێی گەورەیان ئاو دەدا. مەسالیک ئەبصار دەڵێت: دەربەندەکە سێ پردی لێ بوو دووانیان بە بەرد و قوڕ دروست کرا بوو، ناوەندەکەیان لە دار حەسیر، بەرزیان کردبۆوە لەڕووی ئاودوە ١٠٠ پێ لە هەوا. درێژییەکەیان لەنێوان هەر دوو چیا ٥٠ پار بوو، کە رووبار بەسەریا دەڕۆیشت، بلند و نەوی دەبوو ئێشکیان لێ دەگرت، خەڵکێک بوون غەدریان دەکرد و میرێکی تایبەتییان هەبوو و پەیوەندی لەگەڵ سوڵتانی میسر هەبوو.

٧- ولاتی دینار: کوردی دیناری تیایدا نیشتەجێ بوون لە (صبح الاعشی) دەڵێت: (ولاتی گردی جولەمێرگ تیرەی کوردی لێ بوو پێیان دەگوتن (دیناریە)، ژماردیان ٥٠٠ کەس بوو بازاڕ و شاریان هەبوو، دوو میریان هەبوو، یەکێکیان ئەمیر ئیبراهیم کوڕی میر موحەممەد سەنگایی هەبوو لای خەلیفەکان دووەمیان

شەهاب کوڕی بەدرەدین، باوکی مرد گەورەکەیان جێگای گرتەوە لەگەڵ مازنجانییەکان لە شەڕدا بوون.

مێجەر رولسۆن دەڵێت کە هۆزەکانی کوردی شنۆ و رواندز دەخاتە روو لە ماوەی دیراسەکردنی پایتەختی میدیا لەو گەشتەی، کە ساڵێکی پێ چوو لە ساڵی ١٨٣٦ زایینی.

هۆزی بڵباس لە ناوچەی (شنۆ و- رواندز- رانیە) دەکرێن بە سێ بەشی گەورە ئەوانەش: (پیران، مەنگوڕ، مامەش) بەشەکانی ئەو سێ تیرە ئەوەیە:

١- پیران: لقەکانی (موخانە- بەرچەم- سوریک- یوسف خەلیکە- سێتا بەسەر- پێوە).

٢- مەنگوڕ: لقەکانی (قادر وەیسی- زوری- باسکەیی).

٣- مامەش: لقەکانی (هەمزە ئاغایی- جۆخۆر- بلاوەند).

ئەوەی جێی ئاماژە کردنە ئەحمەد پاشای والی بەغدا لەگەڵ ئەم تیرەیە شەڕی کرد ساڵی ١٧٣٦ بە هۆی ئەوەی ئەمن و نیزامیان شێواندبوو رێگایان دەگرت و تالانییان دەکرد. پاشا بە سوارەکانی و پیاوەکانی هێرشی کردە سەریان، بەڵام بە توندی لە قەڵا و شوێنەکانیان بەرپەچی هێرشی والییان دایەوە، هەردوو لا یەکتریان گوللە باران دەکرد، ژنانی هۆزەکە لەتەک پیاوەکانیان چەکیان هەڵگرتبوو، بە سەربازەکانی دوژمنیان وەدەنا، پاش شەڕەکە رەزامەندییان دەربڕی کە خۆیان بەدەستەوە بدەن و فەرمانی والی جێبەجێ بکەن، نیبو لەو گەشتەی ساڵی ١٧٦٦ بۆ عێراق کردی باس لەو هۆزە دەکات بەناوی پاشای کۆیسنجەق (لەو گوندانە ناسیم، کە دەکەوێتە ناوچەی (پاشای کۆیە) گوندی (روش) گوندی (موران) و گوندی (دووین) لە پاشا بڵباس کە گوندێکی گەورەیە دەکەوێتە سەر چیایەکی بڵند، بڵباس ناوی هۆزێکی گەڕۆکە گەلێک تیرەی لێ دەبێتەوە لە وڵاتی فارس و سوریە. ساڵی ١٨٠٢ عەلی پاشا والی بەغدا شەڕی لەگەڵیان کرد، بەهۆی ئەوەی کە هەڵساون بۆ سەر سابلاغ و مەراغە و ئورمیە. وای لە حکومەتی ئێران کرد داوا لە دەوڵەتی عوسمانی بکات، کە لێیان بدەن وەزیر بۆ والی بەغدا ئیبراهیم پاشای بابانی نووسی، کە کاردانەوەیەک لە دژیان بکات، بەڵام ئەوانەی هاتبوونە گوندەکانی دەوروبەری هەولێر، وەزیر لە ژێر فەرماندەی خۆی هەڵمەتێکی سەربازی کردە سەریان، کاتێک گەیشتە ئالتوون کۆپری بڵباسەکان هەڵاتن بەرەو جێگاکانیان لە چیاکان لە هەڵمەتەکەی توانی دەست بەسەر مەڕومالات و کەلوپەلەکانیان بگرن، ئیبراهیم پاشا توانی لە دەوروبەری کۆیسنجەق وەدەریان بنێت هەتا گەیشتە هەولێر سەلاوی بۆ وەزیر نارد کەلوپەلەکانیان کەوتە دەست هێزی وەزیر، کە بریتی بوو لە ٦٠ هەزار سەر مەڕو بزن هەزار سەر مانگا، چەندەهای تر، کە لە رێگا لەناوچوون، وەزیر ئەوانەی دابەش کرد بەسەر خەڵکانی هەولێر و کۆیە و کەرکووک خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری لەجیاتی ئەو زیانەی لێیان کەوتبوو.

رێش لەو سەردانەی، کە بۆ سولەیمانی و هەولێر کردبووی زانیاری گرنگی لەسەر هۆزی بڵباس باس کردووە، کە دەڵێت: (بڵباس لەو هۆزانە پێک دێت:

١- کابایز: ئەو بنەماڵەیە فەرمانڕەوایی دەکەن، کە ١٠٠ کەس دەبن.

٢- مەنزوور.

٣- مامەش.

٤- بێران.

٥- رەمک.

٦- سنو تاخا کە یەک هۆزن. بە سەرۆک هۆزیش دەڵێن (مەزن)

هەر سەرۆکێک چەند دزێکی هەیە، کە دزی بۆ دەکەن ئەندامانی هۆزەکە دیاری بۆ دەبەن بەدەستی خۆیان، ئەمەش دەستکەوتی سەرۆکە یاسا لەنێویاندا بەشێوەیەکی عەشائری سەرۆک هۆز جێبەجێی دەکات لەمەش ئەنجومەنی پیران هۆز یارمەتی دەدەن سزای لە سێدارەدان تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە زینا دەکەن، بڵباسەکان لەبارەی ژن هێنان و شووکردن کچیان نادەنە بێگانە تەنها دەبێ لە هۆزەکەی خۆیان بێت، دەمەتەقی لە ژیانی کۆمەڵایەتییان هەیە، هەڵاتنی دوو خۆشەویست بە قەسدی هاوسەر پێکهێنان لەنێویاندا باوە، ئەگەر سەرۆک هۆز مرد ئەوە باشترین و ئازاترین پیاوی هۆزەکە شوێنی دەگرێتەوە، ئەگەر کوڕە گەورەکەی ئەو توانایەی تێدا نەبوو جێگای

باوکی بگرێتەوە ئەو برایەکی تر، کە بەتوانا بێت جێگای دەگرێتەوە.

ئەگەر یەکێک سەرۆک دایبنێ، ئەوا کەس بۆی نییە لای بیات، بەلام کە هاتنە ناوچەی قەرەچووغ وازیان لەوە هێناوە چەندەها سالە هەندێک مەڕ سەرانە دەدەنە پاشا، زۆر حەزیان لە چەک هەلگرتنە، زۆربەیان لە گەورەکانیان تەواوی کەلویەلی چەکیان هەیە.

مستەر ریچ دەلێت: (هەر یەکێک لە هۆزی بلبّاس) پێگەی هەر چی بێت لەناو هۆزەکە هەقی ئەوەی هەیە لە کاروباری گشتی هۆزەکە بیروڕای خۆی بدات.

ریچ ئەوەشی بە گەورە دانا، کە پایەی ژن لەنێو بلباسەکاندا زۆر گرنگ بووە، دەلێن: (پایەی ئافرەت لە کوردستان زۆر باشترە لە پایەی ئافرەتی تورک و ئێرانی لەلایەن پیاوەکانیانەوە، بە یەکسانی مامەلەیان دەگەلدا دەکەن). ریچ دەربارەی هۆزەکانی (خۆشناو) دەلێت: سێ تیرەن میر مەحمەلی، ببر یوسفی، پشدەری) لەنێو دوو تیرەی یەکەمدا تۆلەیەکی کۆن لە نێوانیاندا هەیە، بۆیە هەمیشە لە شەڕ بوون لەگەل یەکتردا ئەوەش بە قازانجی پاشای بابان دەشکێتەوە، کە بەو هۆیە هەمیشە بەسەریاندا زال بوو هەروەها تورک و ئێرانییەکان بەتەواوی لەژێر چەپۆکیاندا بوون و ئەو ناکۆکییەی نێوانیان قۆزتبووەوە. رووبارێکی بچووک لێکیان جیا دەکردنەوە، مزگەوتێکی هاوبەشیان هەبوو، کە رۆژانی هەینی نوێژیان تیا دەکرد، لە پاشا لە یەکتر جیا دەبوونەوە، بلباسەکان لە جل و بەرگیان لە کوردەکانی ئامێدی دەچوون، زمانەکەیان بابانی و بەهدینانی بوو، بەلام ئەوەی پەیوەندی بە هۆزەکانی (رواندز) هەیە ریچ ئاماژەی پێ دەکات: (رەواندوز قەلای یەکێک لە هۆزە سەربەخۆیەکانە میرەکەیان مستەفا بەگە. رەواندوز کەوتۆتە سەر لووتکەی چیایەکی زۆر بەرز لە چیاکانی زاگرۆس، رواندوزییەکان تیر هاوێژی کارامەن (عەباس میرزا) پێش چەند سالێک لەشکرێکی ناردە سەریان بۆ رکابەرایەتییان، بەلام بەناچاری گەڕایەوە، تۆپەکانی لەپاش خۆی بەجێ هێشت، ئەو تۆپانە ئێستا لەنێو قەلاکەی رەواندوزە، هۆزەکانی رەواندوز لە جل و بەرگیان لە خەلکی ئامێدی دەچن، بەلام شێوەی قسەکردنیان نزیکە لە کۆیییەکان.

بەلام رولسۆن سالی ١٨٣٦ دەربارەی هۆزەکانی رەواندوز دەلێت" ئەو شوێنانەی کەوتبووە نێوان شنۆ و زێی بچووک لە سەردەمی محەمەد پاشا دوا میری رەواندوز لەژێر دەستی ئەو میرە بوو، کە خۆی سۆرانی بوو. ئەو هۆزە بەسەرۆکایەتی یەکێک لە میرە بەتواناکانیان رەواندوزیان گرت، چەند سەدەیەک دەبوو ژمارەی خێزانەکانی رەواندوز لە بنەڕەتدا (٨٠٠) خێزان بوو، زۆربەی خەلکی رەواندوز سەر بەهۆزی (رواندی) یان (رەواندوز) بوون، ژمارەی هۆزی (رەواندوز) گەورە (١٢٠٠) خێزان بوو، هەموویان لەژێر فەرمانەدەی میرەکانی سهران- سۆران بوون، قەلای (روان) یا (رەواندوز) بە درێژایی فەرمانڕەوایی سهرانی پێگەیەکی قایم بوو بۆیان، ئاماژەی زیاتر بە هۆزەکانی رەواندوز دەکات و دەلێت: ١٢ بەشن، وەک: (مام گرد، مام سال، مام خال، مام بال، مام وەیس، مامەوی، مەمکەکال، مام سکی، پیربال، کەلو، مامە سام) هەندێک هۆزی تر جگە لە هۆزی رەواندزی لەگەلیان تێکەلاون، وەکو: (شێخ ئاب، مال یاس، تورک، هەناری، خەیلانی، کاسان، شێخ مەحمودی) ناوچەی (سیدک- سیدەکان) کە چیاییە نزیکەی ٤٠ گوندی بچووکی لێیە ژمارەی خانووەکان ١٠٠٠ خانووە، هۆزەکانی سەر بە (رواندک، بیروسوی، شێروانی)ان.

دەربارەی هۆزی بالەک دەلێت: (بەهێزترین هۆز لەوانە هۆزی (بالەکییە) کە ژمارەی خانوو و خێزانەکانیان ١٠ هەزار مالە).

ئەو هۆزە شوێنەکانیان دەکەوێتە ناوچەیەکی چیای زۆر سەخت، لەبەر ئەوەی دەکەوێتە پشت چیای قەندیل و سنووری شنۆ و لاهیجان، ناوەندەکەیان شارۆچکەی (رایاتە)، میری سۆران ئەوانەی خستبۆوە ژێر رکێفی خۆی، لە هەر مالێک یەکیانی کردبووە سەربازی سوپاکەی، لە دوای نەمانی میرنشینی سۆران ئەو هۆزە بەسەربەخۆیی ماوە، سەرۆک هۆزەکە ئێستا (عەزیز بەگە) ریچ لەو گەشتەی کە سالی ١٨٢٠ بۆ هەولێری کردووە، دەربارەی هۆزی دزەیی دەلێت: گەیشتمە چادرە گەورەکەی فارس ئاغا سەرۆکی هۆزی دزەیی لە گوندی (قوشتەپە)،

كە بەناوی گردێكەوە ناونراوە، هۆزی دزەیی كوردن، پێشتر سەر بە كۆیسنجەق بوو پاشای بەغدا جیای كردەوە لە كۆیسنجەق و هەولێر، خستیە ژێر كۆنترۆڵی خۆی و ئەمەش وای لە هۆزەكە كرد، كە گوێ نەدەنە كەس.

كابتن های ڕوونكردنەوەی گرنگ دەربارەی هۆزی كورد لە لیوای هەولێر دەخاتە ڕوو:

١- هۆزی دزەیی: سێ بەشن (پیران، مامان، كونتولا) ٦٠٠٠ هەزار كەسن، لە دەوروبەری چیای قەرەچووغ و كەندێناوە لە قەزای مەخموور لە لیوای هەولێر دەژین، زەوییەكانیان زۆر بە پیتە، لە گوزەرانێكی خۆشدا دەژین و دەوڵەمەندن تا دەگاتە ڕۆخی ڕووباری دیجلە، كە هۆزە عەرەبەكانی ناچار كردووە لە ڕووبارەكە بپەڕنەوە بۆ ڕۆژئاوای، دزەییەكان لەو پەڕی چالاكیدان.

٢- گەردی: ٦٠٠ كەسن نیوەیان گەڕۆكن، لە باكووری هەولێر و هەندێكیان لە كۆیسنجەق دەژین، لە هاوینان دەچنە وزنە هۆزێكی گەورەن لە باكووری هەولێر ١٥ گوندیان هەیە.

٣- گۆران: نیشتەجێن لە هەندێ گوندی ڕۆژئاوای شەقڵاوە.

٤- خۆشناو: ٢٠٠٠ خێزانن بەكاری كشتوكاڵی خەریكن لە ٢٠٠ گوندی ناحیەی شەقڵاوەن لقەكانی تری هۆزەكە لە كۆیە و ڕانیەن.

٥- پیران: ٦٠٠ خێزانن لە هۆزی (ڕانیە) لە باكووری ئەو شارە دەژین دەگەڕێنەوە سەر (بلباس)، لەگەڵ ئەوەی ژمارەیان كەمە، بەڵام ئازان.

٦- ئاكۆ: ١٠٠٠ خێزانن، نیشتەجێن و لە باكووری ڕانیە دەژین، ئەوانە چەند تیرەیەكن ٤٠- ٥٠ گوندیان هەیە لە چیای ڕانیە و باكووری قەڵادزە.

٧- زراری: ٣٠٠ خێزان نیشتەجێن لە باكووری بەستۆرە لە ١٢ گوند.

٨- سورچی: ٣٠٠٠ خێزانن، نیشتەجێن و بڵاون لەنێوان ڕۆخی باكووری ڕووباری زێی گەورە و ڕەواندوز ٥٠ گوندیان هەیە لەگەڵیان هەندێك لە هۆزی مامەكانی دەژین.

٩- باڵەك: ١٢٠٠ خێزانن، نیشتەجێن لە باكووری ڕووباری ڕەواندوز لە ٦٠ گوندن.

١٠- شێروان و برادۆست: ١٥٠٠ خێزانن نیشتەجێن لە سەرووی قەزای ڕەواندوز و شێروان، بەهێزترن لە برادۆست، بەڵام ژمارەیان لە ٨ هەزار كەس تێ ناپەڕێت.

١١- هەركی: ٥٠٠٠ خێزانن هۆزێكی زۆر بەهێزن، هەندێكیان لە چیاكانی سەر سنوور دەژین، بەشێكیان لە دەوروبەری ئاكرێ، ٨ هەزاریان لەناوچەی ڕەواندوزن، لە بەستۆرەش هەندێك لەو هۆزە هەیە، نزیكەی ٢٠ هەزار كەسن، بەشێكیش لە ئەرزەرووم و وان دەژین.

١٢- خەیلانی: ٢٠٠ خێزانن، نیشتەجێن لە چیاكانی باكووری باڵەكایەتی، هەندێكیان لە دەوروبەری هەولێرن، ژمارەیان ١٠٠٠ كەسە.

١٣- بۆلی: ١٥٠ خێزانن، لە باشووری باڵەكایەتی لە زستان بەرەو قەزای كۆیە دەچن، لە هۆزی خەیلانی كەمترن.

١٤- براوری باڵا: ٧٠٠ خێزانن، نیشتەجێن لە باكووری ڕووباری گارە بە كشتوكاڵ و بازرگانی خەریكن.

١٥- بارزان: ٢٧٥٠ خێزانن، نیشتەجێن لە باكووری زێی گەورە لە قەزای زێبار، گوندەكەیان بەناوی هۆزەكەیانە ناو ناوە بە كشتوكاڵ و بەخێوكردنی هەنگوین خەریكن، لەوپەڕی ئازایەتی و نەبەردیدان.

١٦- زێباری: ١٢٠٠ خێزانن، لەنێوان ئاكرێ و زێی گەورە و دەوروبەری پیرە كەپرە دەژین بە جووتیاری و چاندنی میوە خەریكن.

### هۆزەكانی هەولێری ئێمرۆ

ئەو هۆزانەی كە لە لیوای هەولێر نیشتەجێن و شوێنی دانیشتنیان و ژمارەیان لە هەر تیرەیەك بەپێی یەكەی ئیداری كە ئەو هۆزانەی تیایدا دەژین. بۆ زانین هەندێك لە هۆزەكان لەشوێنێك زیاتر نیشتەجێن.

هۆزی دزەیی، كە ناوەندی هەولێر و قەزای مەخموور و ناحیەكانی دەژین.

**أ- ناوەندی ناحیەی هەولێر:**

١- دزەیی: ١١٠٠٠ کەسن، ناوەندەکەیان گوندی قوشتەپەیە.

٢- گەردی: ژمارەیان ٢٩٦٠ کەسە، ناوەندەکەیان گوندی بەحرکەیە.

٣- شێخ بزێنی: ٦٠٠ کەسن ناوەندەکەیان گوندی کەورگۆسکە.

٤- هەرکی: ژمارەیان ٥٣٨ کەسە.

٥- شومەر: لە هۆزی شمر لە ناوچەی جەزیرە لە لیوای موسڵ نیشتەجێن، ژمارەیان لەناوەندی هەولێر ٥٢ کەسە.

**ب- ناوەندی هەریر: هۆزی خۆشناو و هۆزانی تر**

١- خۆشناو: ژمارەیان ٦٥٠ کەسە لە باشووری ناوەندی ناحیەکە، ناحیەکەش بەشێکە لە خۆشناو لە قەزای شەقلاوە نیشتەجێن.

٢- حەیدەری: ٣٠٠ کەسە، ناوەندەکەیان باشووری رۆژئاوای ناحیەی خۆشناوە.

٣- هەروتی: ٣٥٠ کەسە ژمارەیان، ناوەندەکەیان ناحیەکەیە و لەگوندەکانیان (نەردان و باوان) لە رۆژئاوای ناحیەکە.

٤- زراری: ژمارەیان ٣٠٠ کەسە، لە رۆژئاوای ناحیەی خۆشناو هەروەها لە گوندەکانی ناحیەی سەلاحەددین نیشتەجێن.

٥- ئاسووری: ژمارەیان ٤٣٥ کەسە، لە ناحیەکە و گوندەکانی (باتاس، هەنارە، دیرشیروک) نیشتەجێن.

**ج. ناوەندی سەلاحەددین: هۆزی خۆشناو و هۆزانی تر**

١- خۆشناو: ژمارەیان ٢٠٠٠ کەسە، زۆربەیان لە ناحیەی خۆشناو و هەندێکیان لە ناحیەی سەلاحەددین و حەریر نیشتەجێن.

٢- گەردی: ژمارەیان ٢٨ کەسە، بەشێکن لە هۆزێکی گەورە، کە لە باکووری هەولێر و کۆیسنجەق دەژین.

٣- زراری: ژمارەیان ١٥٠٠ کەسە، لە ناحیەی حەریر و سەلاحەددین نیشتەجێن.

٤- ماوەرانی: ژمارەیان ١٥٠٠، کەسە لە گوندەکانی دەوروبەری سەلاحەددین نیشتەجێن.

٥- میران بەگی: ژمارەیان ١٥٠ کەسە نیشتەجێن لە گوندەکانی (ئیفراز، گردمامک) لەسەر زێی گەورە.

٦- هەرکی: ژمارەیان ٣٥٣٦ کەسە، لە هۆزە کۆچەرەکانن، هاوین بەرەو کوێستانی چیاکانی سەر سنووری عێراق و ئێران دەچن لە زستانیش لە دەشتەکانی باکووری هەولێر و حەریر و باتاس دەچن، هەرکی لە ناوچەی هەولێر دوو لقن هەرکی سەرهات و هەرکی سەیدان، ئێستا بڵاون لە هەولێر و سەلاحەددوین.

**د- قەزای مەخموور: هۆزی (دزەیی) و هۆزانی تر**

١- دزەیی بەرەبابی فارس: ژمارەیان (٩٥) کەسە، ناوەندەکەی گوندی (باقرتە).

٢- دزەیی بەرەبابی مام خولە: ژمارەیان (٤١٨) کەسە، لە گوندی (گەرەسورن عەین ئەیوب) نیشتەجێن.

٣- دزەیی بەرەبابی بایزی: ژمارەیان (١٢٣٤) کەسە بڵاون لە ناوەندی قەزاکە و گوندەکانی.

٤- بندیان: ژمارەیان (١٨٠) کەسە، لە گوندی ئازیکەند نیشتەجێن.

٥- مامەسێنی: ژمارەیان (١٢٨) کەسە، لە گوندی (دووسەرە، بیر مەهێدی) نیشتەجێن.

٦- سیان: ژمارەیان (٣١٠) کەسە، لە (دووسەرە، گردەپۆر، گردەچاڵ) نیشتەجێن.

٧- ئاری کوتکی: ژمارەیان (٢٩٤) کەسە، لە گوندەکانی (خەزنە کرول، کەندی باریکە) نیشتەجێن.

٨- ئۆمەربل: ژمارەیان (٣٣٥) کەسە، لە گوندی (گردەپان، محسناوە) نیشتەجێن.

٩- پالانی: ژمارەیان (٣٤١) کەسە لە گوندەکانی (پالانی، گردی گۆمێ، حەسارۆک، حوشترالووک) نیشتەجێن.

١٠- سارمەمی: ژمارەیان (٢٢٢) کەسە، لە گوندی

(وادی غراب) و هەندێ گوندی تر نیشتەجێن.
١١- باجەڵان: ژمارەیان (١٢٠) کەسە، لە گوندی (گردی قوشتەپە، کەلەشخان) نیشتەجێن.
١٢- ئەبو هەمدان: ژمارەیان (١٤٢) کەسە، هۆزێکی عەرەبن لە گوندی (سارتک، خازر، عنبر) نیشتەجێن.
١٣- شەلیلە: ژمارەیان (١١٤٩) کەسە، لە گوندی (بەهانە، کیروک، عەین شەهاب، خالدیە) نیشتەجێن.
١٤- لهێب: ژمارەیان (٣٧٨) کەسە، لە گوندی (جەدیدە، خەرابە جاراللە) نیشتەجێن.
١٥- سمبس: ژمارەیان (٣٤٨) کەسە، لە گوندی (خەریانی، رواله، خەربە مەحمود) نیشتەجێن.

**ناوەندی ناحیەی گوێر و هۆزەکانی عەرەب و هۆزەکانی دزەیی هی تر**

١- سمبس: ژمارەیان (٢٠٦) کەسە، لە ناوەندی ناحیەی گوێر نیشتەجێن.
٢- ئەلحەرب: ژمارەیان (٣٣٨) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٣- ئەلعەلینە: ژمارەیان (١٧٤) کەسە، لە ناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٤- فەقی مولکی: ژمارەیان (ڵ) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٥- جەبور: ژمارەیان (٢٠٩) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٦- شێخان: ژمارەیان (٩٤٥) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٧- کاکەیی: ژمارەیان (٤٢٤) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٨- مەرزانی: ژمارەیان (١٤٣) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
٩- شێخ مەمموندی: ژمارەیان (٣٨٢) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
١٠- ساداتی بەرزنجە: ژمارەیان (١١٥) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن.
١١- گەردی: ژمارەیان (٩٤٧) کەسە لەناوەندی ناحیەکە نیشتەجێن هەندێ کەسی تر لە هۆزەکانی تر لەگەڵیاندان.
١٢- دزەیی: ژمارەیان (١٥٩٥) کەسە، ئەوانە لە هۆزی دزەیین.
١٣- نعیمی- سادات: ژمارەیان (ڵ) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە و دەوروبەری نیشتەجێن.
١٤- طەی: ژمارەیان (٥٧٧) کەسە، لەناوەندی ناحیەکە و هەندێ گوندی دەوروبەری نیشتەجێن.

**و- ناوەندی ناحیەی کەندێناوە: هۆزی دزەیی و هۆزانی تر**

١- بەرەی پاشای: ژمارەیان (١٠٠٥) کەسە، لە گوندی (عبداللە گوجلان، چەلتوک، مەلەک ئاغا) نیشتەجێن.
٢- بەرەی فارس ئاغا: ژمارەیان (١٠٠٣) کەسە، لە گوندی (شۆرە زەردکە، خورمەڵە، خەزنە، بەرزەوار) نیشتەجێن.
٣- بەرەی بابیز ئاغا: ژمارەیان (١٥١٨) کەسە، لە گوندی (جانە، گردی گۆمێ، کەندارەقەل، پەلکانە) نیشتەجێن.
٤- مامەخولە: ژمارەیان (١١٩٥) کەسە، لە گوندی (دیبەگە، کاریتان، شۆربجە، سۆفی سمایل) نیشتەجێن.
٥- سیان و سومال: ژمارەیان (٩٤٠) کەسە، لە گوندی (سەربەشاخ، رەشید سارەلو) نیشتەجێن.
٦- سیان: ژمارەیان (٩١) کەسە، ناوەندەکەیان گوندی شەناغەیە.
٧- مامەسێنی: ژمارەیان (٥٠٦) کەسە، لە گوندی (سەرگەڕان، داودگورگە، کەندارەقەل) نیشتەجێن.
٨- شێروانی: ژمارەیان (٥٨٧) کەسە، لە گوندی (دارەخورما، حەسەن بلّباس) نیشتەجێن.
٩- ئاری کوتکی: ژمارەیان (٤٣٥) کەسە، لە گوندی (کەندارەقەل، یارمجە، گاوەرە) نیشتەجێن.
١٠-ساڵەیی: ژمارەیان (٧٥٧) کەسە، لە گوندی (مەلاقەرە، ماجد، شێخ لاس، رەش حەسەن) نیشتەجێن.

١١- لەک: ژمارەیان (١١٦) کەسە، لە گوندی (دووشیوان).
١٢- هۆرمزیار: ژمارەیان (٢٣٥) کەسە، لە گوندی (سمایل ئاوە، هێلەوە، شێخ شێروان) نیشتەجێن.
١٣- بەرزنجە: ژمارەیان (٢١١) کەسە، لە گوندی (یەدی قوو، حەسارۆک) نیشتەجێن.
١٤- بەنی تەیم: ژمارەیان (٨٠) کەسە و عەرەبن، لە گوندی (درگەی گەورە) نیشتەجێن.

**ز- هۆزەکانی قەزای کۆیە**

١- غەندری: ژمارەیان (٤٣٠٠) کەسە، لە گوندەکانی (ئازەنین سماقولی، کروژ، گومە شێخان، داربڕ) نیشتەجێن، سەرۆک هۆزەکە لە کۆیە دادەنیشێ.
٢- حەویزی: ژمارەیان (٣٠٠٠) کەسە، لە گوندی (بارەمێش، تۆبزاوە، هەواوان، سناوە) نیشتەجێن، سەرۆک هۆزەکە لە کۆیە دادەنیشێ.
٣- خۆشناو: ژمارەیان (٤٣٠٠) کەسە، لە گوندی (سکتان، ونکە، بالیسان، بێداوە، سووسێ) نیشتەجێن ناوەندەکەیان بالیسانە.
٤- گەردی: ژمارەیان (١٢٠٠) کەسە، لە گوندی (کانی کەوان، پەڵکەرەش، ئاربان، ئەشکەوسەقا، تەرگینە، حاجی وسوو) نیشتەجێن. گوندی ئەشکەوسەقا ناوەندی هۆزەکەیە.
٥- سارات: ژمارەیان (١٥٠٠) کەسە، لە گوندی (چنارۆک، جەلی، ئاخورە، تەشقە) نیشتەجێن.
٦- کورک داران: ژمارەیان (٢٥٠٠) کەسە، لە گوندی (بانە قەرات، کانی سووسکە، رەسول بسکۆل، تەکەور، گۆیتەپە) نیشتەجێن.

**خ- ناوەندی تەق تەق**

١- زەندی: ژمارەیان (١٤٠٠) کەسە، لە گوندی (تەق تەق، سێگردکان، ناسرئاغا) نیشتەجێن.
٢- غەفووری: ژمارەیان (١٠٠٠) کەسە، لە گوندەکانی (خەرابە، کاولان، کانی سوور، کاریز) نیشتەجێن.
٣- شێخ بزێنی: ژمارەیان (٢٠٠) کەسە، لە گوندەکانی (گۆمەشین، سەوتک) نیشتەجێن.
٤- هۆرمزیار: ژمارەیان (١٥٠٠) کەسە، لە گوندی (ساتوقەرە) نیشتەجێن.
٥- لەک: ژمارەیان (١٠٠٠) کەسە، لە گوندی (بەردەسپی) نیشتەجێن.
٦- تاڵەبان: ژمارەیان (٥٠) کەسە، ناوەندەکەیان گوندی (قزلو)ە.
٧- گۆران: ژمارەیان (٢٠٠) کەسە، لە چەند گوندێک نیشتەجێن.
٨- شێخان: ژمارەیان (١٧٥٠) کەسە، لە گوندەکانیان (نێرەگین، بانەمورد، بابیزئاغا، بانی ماران، کانی کوردە، شیواشوک) گوندی (بانەمورد) ناوەندی هۆزەکەیە.
٩- جافە رەشکە: ژمارەیان (١٢١) کەسە، ناوەندەکەیان گوندی کلیسەیە.

**گ- هۆزەکانی ناحیەی باڵەک**

١- مەلا شەرەفی: ژمارەیان (١٩٥٠) کەسە، ناوەندەکەیان ناحیەی باڵەکە.
٢- شیوەزوری: ژمارەیان (ڵ٩ کەسە، لە ناحیەی بەشێک لە باڵەک نیشتەجێن.
٣- سەکرانی: ژمارەیان (٢٩٢) کەسە، لە ناحیەکە نیشتەجێن.

**ی- هۆزەکانی ناحیەی برادۆست**

١- برادۆست: ژمارەیان (٩٠٠) کەسە، لە ناوچەی برادۆست لە سێ گۆشەی سنووری عێراق و ئێران و تورکیا نیشتەجێن.
٢- زدوەندۆک: (٨٥٠) کەسن.
٣- برەش: (٨٠٠ کەسن.
٤- خواکورک: (٥٠٠) کەسن.
٥- مهاجر: (٣٥٠) کەسن.
٦- کەردید: (٤٢٠) کەسن.

لە ناوچەی برادۆست نیشتەجێن، نزیکەی (٥٠) گوندن، خانوودکانیان (١٠٠٠) ماڵە.

**ک- هۆزەکانی ناحیەی مێرگەسۆر**

١- شێروانی: ژمارەیان (٤٢٠٩) کەسە، لە گوندی (مێرگەسۆر، شێروان) نیشتەجێن.

**وەرگێرانی: عەبدولخالق هۆرمزیار**




نەخشەی دابەشبوونی
چڕی دانیشتوان
کەس/کم٢ لە پارێزگای
هەولێر ساڵی ٢٠٠٥

# تایبەتمەندییە دیمۆگرافییەکانی شاری هەولێر

پ.ی.دکتۆر تاهیرحسۆ زێباری
کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

**پێشەکی:**

ئەوانەی گرنگییەکی زۆر بە شار دەدەن، خەریکە لا لە توێژینەوەی شارستانی دەکەنەوەو وەکو دیاردەیەکی بەرچاو، جودا لە دیاردەکانی دیکەی شارستانی سەیری شار دەکەن، بەوپێیەی شار گرنگترین و ئاڵۆزترین وێنەی ئاوەدانکردنەوەی مرۆڤایەتییە، لەکاتێکدا دانیشتوانی ئەم نیشتەجێبوونە - شار - لەکاتی ئێستادا نزیکەی (٥٠ ٪)ی کۆی دانیشتوانی هەموو جیهان پێکدێنن[١].

لەبەر ئەوە سەددی بیستەم بەسەددەی (شۆڕشی شارستانی) دادەنرێت، هەر وەکو زانراوە، گەشەسندنی دانیشتوانی شار بەڕێگەی رێکەوت نەبووە، بەڵکو گەلێ هۆکار لە رووودانیدا بەشدارییان کردووە، لەوانە هۆکاری سروشتی و دیموگرافی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ئیداری، سەرباری هۆکاری گواستنەوەو گەیاندن.

لەبەرئەوە توێژینەوەی شار یاخود نەخشەکێشان وەکو باوە پێویستی بەکۆمەڵێ تایبەتمەند هەیە، لەوانە لە بواری جوگرافیاو کۆمەڵناسی و ئابووری و ئەندازیاری و هی دیکە.... ، هەر گۆشە نیگایەک لەمانە، لەرووی وردبینییەوە تایبەتە بەو پسپۆرییەی کەناومان هێنان.

شاری هەولێر یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی کوردستانی عێراق، بەمێژووە شارستانیەکەی دەوڵەمەندە، یەکێکە لە کۆنترین مەڵبەندی شارستانی کەئێستا دانیشتوانی لێیە، ئەم توێژینەوەیەش لە ئەنجامی ئەوەوە هات، کە هەولێر مەڵبەندێکی بەرچاوە لە کوردستانی عێراق لەرووی سیاسی و ئیداری و رۆشەنبیری، بەجۆرێ پاش ئەوەی زانکۆی سلێمانی لەساڵی (١٩٨١) گواسترایەوە هەولێرو ناونرا (زانکۆی سەلاحەددین) بەردەهەندە رۆشەنبیرییەکەی جودا کرایەوە، وەک دیارە سەرهەڵدانی زانکۆ لە هەولێر تەواوکەری ئەو پەرەسەندنانەبووە، کە لەبواری سیاسی و ئیداری و رۆشەنبیری و ئابووری و دانیشتوانەوە بەدەستی هێنابوو.

ئەم توێژینەوە لەلایەنی دیمۆگرافی شاری هەولێر دەکۆڵێتەوە، هەروەها لەو هۆکارانە دەکۆڵێتەوە کە کاری کردووە لە رێوڕەسمی وێنەی دانیشتوان و ئاراستەکانی و گۆڕاوە ئابووری و کۆمەلایەتی و جوگرافییەکان، تادەگاتە شیکردنەوە لە تایبەتمەندی گەشەسەندن و پێکهاتەی ناوچەی توێژینەوەکە. ئەم توێژینەوە سەقفە زەمەنیەکەی لە ماوەی (١٩٤٧-١٩٨٧)، بۆ ئەم مەبەستەش ئەو داتا ئامارییانەی پەیوەندییان بەبابەتی توێژینەوەکە هەیە سوودی لێ وەرگیراوە.

**پەرەسەندنی**

**مێژوویی شاری هەولێر:**

شاری هەولێر بە یەکێ لەشارەکانی کۆنی کوردستانی عێراق و کلتوورە رەسەنەکەی دەژمێردرێت، ناوەکەی لەتەواوی سەردەمەکاندا لە دەقە مێژووییەکاندا هاتووە،



پێدەچێ هەولێر (ئەربل) تاکە شاری ئاشووری بێت، کە تائێستا دانیشتوانی لێ بێت، هەر بەناوە کۆنەکەی مابێتەوە، مێژووەکەشی بەقەڵا بەناوبانگەکەیەوە پەیوەستە، کە بۆتە مەڵبەندی سەرەکی شارەکە، هەر لەسەرەتاوە لە سەرهەڵدانیەوە وەکو کۆنترین مەڵبەندی شارستانی کە تا ئەمڕۆکە ماوەتەوە و دانیشتوانی لێیە، تا رۆژگارە مێژووییە جوداو بەرچاوەکان. شاری هەولێر سەر بە ئیمپراتۆریەتی ئوور بوو، پێدەچێ داگیرکارییەکانی سەرجۆنی ئەکەدی گەیشتبێتە هەولێر، بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئەو رێگایە دابگرێ کە لە باکوورەوە بەرەو ناوەڕاست و باشوور دەچێ[٢].

لەماوەی دەوڵەتی ئاشووریدا هەولێر (ئەربل) لە شکۆدارترین رۆژانیدا دەژیا، بەجۆرێ بووە پایتەختی ئایینی ئاشوورییەکان، چونکە مەڵبەندی پەرستنی عەشتاری خوداوەندی بەناوبانگ بووەو بەناوی عەشتار (ئەربلا) ناسراوەو ناوی ئەم پەرستگەیەش لە کتێبە بزمارییەکان بە شێوازی (ئای - کشان-کلێما) هاتووە، بەواتا ماڵی خاتوونی هەرێم، هەروەها پەرستگەی (ئاشوور)ی خواوەندیشی تێدابوو[٣].

سەرجۆن لەدوای خۆی سەنحاریبی کوڕی لەسەر تەخت جێهێشت، ئەویش بەهۆی کەناڵێک لەدۆڵی باشوورەوە، بەستۆڕە بەدرێژایی (٢٠)کم ئاوی گەیاندە شاری هەولێر،

شوێنەواری ئەو پرۆژەیەش تا ئەمڕۆ ماوەتەوە[٤].

کە دەوڵەتی ئەخمینی رووخا، رووبەرووی هێزێکی نوێی تازەپێگەیشتوو بۆوە، ئەو هێزەش ئەسکەندەری مەکدۆنی رێبەرایەتی دەکرد، توانی لە جەنگی (ئەربیلا)[٥] بەسەر داریۆشی ئەخمینی سەرکەوێ، بەم شێوەیە هەولێر بووە بەشێکی ئیمپراتۆریەیە فرەوانەکەی ئەسکەندەر، کە لەشانۆی سیاسی ناوچەکەدا وەکو دەوڵەتێکی یەکگرتوو دەرکەوت، لەماوەی فرسییەکان کە دەوڵەتەکەیان لەچەند میرنشینێک پێکهاتبوو، و لەژێر سایەی دەوڵەتێکی یەکگرتوودا، لەوانە میرنشینی روهاو تەدمرو شەنگاڵ و حەزەرو میرنشینی حدیاب، هەولێریش لەگرنگترین شارەکانی حدیاب بوو[٦].

لە دوادواییەکانی حوکمی پارشا ساسانیەکان لەهەولێر، ململانێی نێوان ساسانیەکان و رۆمانیەکان توند بوو، هەولێرو تەواوی کوردستانی عێراق بووە شانۆی گەلێ لەو جەنگانەی لەنێوانیان هەڵگیرسا.

لە سەردەمی ئیسلامدا دووبارە گرینگی شارەکە بەدەرکەوت و بووە پایتەختی هەندێ لەمیرنشینەکان، لەوانە میرنشینی ئەتابەکی و شارەکە لە سەردەمی موزەفەرەدین کۆکبەری بەناوبانگترین سوڵتانیدا بووە خاوەن پایەوشکۆ[٧].

ئەمە لەلایەک و لەلایەکی دیکەوە توندبوونی ململانێ لەسەر ناوچەکە پاش مردنی موزەفەرەدین، وایکرد هەولێر بکەوێتە ژێر رەحمەتی رووداوە خوێناویەکان، پاشان رووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی برسییەتی هێنایە شارەکە، کەئەمەش لەسەر قەبارەو گەشەکردنی دانیشتوان رەنگی دایەوە، بگرە بەسەر بارودۆخی ئابووی و کۆمەڵایەتی و سیاسی شارەکە رەنگی دایەوەو دواتر گۆڕانکاری دیمۆگرافی فەرز کرد.

شاری هەولێر سەبارەت بەفرەوانبوونی و کشانی خانووبەرەو ئاوەدانکردنەوەو بزافی بازرگانی و ئیداری سوودی لە شوێنی جوگرافی وەرگرتووە، لە گەڵ پەرەسەندنی ئەمانەش ژمارەی دانیشتوانەکەی زیادی کردووە، بەو جۆرە چەند گەڕەکێکی نوێ بەدەوری ئەو دەشتەی دەوری قەڵای داوە، لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم سەری هەڵدا، یاخود ئەوانەی روویان لە هەولێر کردووە، لەماوەی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی رابردوو، گەڕەکی نوێیان لەو دەشتە بنیات ناوە، کە ئەم گەڕەکانە بوونەتە سەنتەری سەرەکیی کۆبوونەوەی خەڵک لەماوەی پێشوودا، کە لەرووی مێژووییەوە سەبارەت بەهەڵکشانی قەبارەی دانیشتوانی هەولێرو پەرەسەندنی گرینگی زۆریان هەیە[٨].

**گەشەسەندنی دیمۆگرافیی دانیشتوانی هەولێر:**

توێژینەوەی دیاردە دیمۆگرافییەکان، بەتایبەتی گەشەسەندنی دانیشتوان لەپێناو دۆزینەوەی پەرەسەندنە دانیشتوانییەکانی شار، کارێکی پێویستە. هەروەها بۆ دۆزینەوەی کاریگەری لەسەر بونیادی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکردنەوەش، کارێکی پێویستە، هەروەها دەرکەوتووە توێژینەوە لەو دیاردانە، گرنگی پێکهاتەی ئاوەدانی و جۆری ژیانی ئابووری شار دەردەخا، لەبەر ئەوە دەبینین هەر زیادەیەک یا کەمییەک لە فیئە تەمەنیەکان کار لەپێکهاتەی ئابووری دەکا.

شاری هەولێر لە قۆناغی سەرهەڵدانیدا، گەشەسەندنێکی رێکوپێکی دانیشتوان یان چڕی دانیشتوانی زۆری بەخۆوە نەدیوە، بەجۆرێ لەساڵی (١٨٣٧) ژمارەی نەگەیشتۆتە (٤٥٠٠) کەس[٩].

لەساڵی (١٨٤٧) شاری هەولێر دانیشتوانەکەی لەنێوان (٥٠٠٠-٦٠٠٠) کەسدا ماوەتەوە، کەچی دانیشتوانی شار لەساڵی (١٩١٦) هەڵکشاوە و گەیشتۆتە (١٠٠٠٠) کەس[١٠].

**خشتەی ژمارە (١)**

ژمارەی دانیشتوانی هەولێر
لە ماوەی (١٨٣٧-١٩١٦)[١١].

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر |
|---|---|
| ١٨٣٧ | ٤٥٠٠ |
| ١٨٤٧ | ٥٠٠٠-٦٠٠٠ |
| ١٩١٦ | ١٠٠٠٠ |

لەبەر ئەوەی زۆربەی ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر بەر لەساڵی (١٩٤٧) زۆر وردنین، بۆیە لەم توێژینەوەیەدا پشت بە ئامارى فەرمیی، ئەو ئامارانەی لەساڵانی

(١٩٤٧)و دواتر کراون، بەستراوەو کراودتە سەقفێکی زەمەنی بۆ زانینی گەشەی دانیشتوانی شاری هەولێر. داتا فەرمییەکانی تایبەت بە سەرژمێرکردنی دانیشتوان دەریدەخەن، کە لە ماوەی سالآنی (١٩٤٧-١٩٨٧) شاری هەولێر رووبەرووی گەشەسەندنێکی خێرا بۆتەوە، بەشێوەیەک پلەی گرنگیدان بە نیشتەجێبوون لەشار لە (١١٪) هەڵکشاوە بۆ (٤١٪) لە کۆی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر لەماوەی باسکراودا، ئەمەش گرنگی شاری هەولێر لە پارێزگاکەدا روون دەکاتەوە، سەیری خشتەی ژمارە (٢) بکە:-

خشتەی ژمارە (٢)

رادەو پلەی شاربوون لە شاری هەولێر لە بەرامبەر تێکرای دانیشتوان، پارێزگای هەولێر لە ماوەی (١٩٤٧-١٩٨٧)[١٢] دەردەخا

| سالّ | رێژەی نیشتەجێبوون لە شار |
|---|---|
| ١٩٤٧ | ١١.٣ |
| ١٩٥٧ | ١٤.٦ |
| ١٩٦٥ | ٥.٢ |
| ١٩٧٠ | ٢٥.٨ |
| ١٩٧٧ | ٣٥.٨ |
| ١٩٨٥ | ٣٥.٨ |
| ١٩٨٧ | ٤١.٠ |

خشتەی ژمارە (٣) ئەوە نیشان دەدا، کە زیادەی قەبارەی دانیشتوان، لە ماوەی (١٩٥٧-١٩٦٥) هەڵکشاوە، ئەو ماوەیەش لەهەموو ماوەکانی دیکە سەبارەت بەگەشەی دانیشتوانی خێراتر بووە، بەشێوەیەک رێژەی دانیشتوانی شاری هەولێر لەو ماوەیەدا لە (١٤.٦-٢٥.٥) بەرز بۆتەوە، رێژەی گەشەکردنیش سالآنە گەیشتۆتە (١٦٪)، کەچی (٣٪) لە پارێزگای هەولێر کەم بۆتەوە[١٣].

هەروەها ماوەی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابردوو، بەماوەیەکی نایاب لە گەشەی دانیشتوان دادەنرێت، بەجۆرێ رێژەی دانیشتوانی شار (٣٦٪) هەڵکشاوە لەکۆی دانیشتوانی پارێزگاو هەروەها سالآنە گەیشتۆتە (١٣٪)، کەچی لە تەواوی پارێزگادا (٥٠٪)یە.

**خشتەی ژمارە (٣)**

گۆڕانکاری سالآنەی دانیشتوانی شاری هەولێر و پارێزگاکەی لە ماوەی (١٩٤٧-١٩٨٧)[١٤]

| ماوە | شاری هەولێر | پارێزگای هەولێر |
|---|---|---|
| ١٩٤٧- ١٩٥٧ | ٤.٨٠ | ١.٤ |
| ١٩٥٧- ١٩٦٥ | ١٦.٠ | ٢.٨ |
| ١٩٦٥- ١٩٧٠ | ٢.٤ | ٢.٦ |
| ١٩٧٠- ١٩٧٧ | ١٢.٩ | ٥.٠ |
| ١٩٧٧- ١٩٨٧ | ٤.٦ | ٤.٦ |

**ئەو هۆکارانەی کاریان لە گەشەی دانیشتوانی شار کردووە:**

گەشەی خێرای شارنشینی دانیشتوانی شاری هەولێر، گەلێ هۆکاری بەدواوەیە، گرنگترین ئەم هۆکارانەش بریتین لەمانە:-

١- هۆکارە سروشتییەکان:

توێژینەوە لەو شوێنەی کە شار لێی دامەزراوە، لەو هەنگاوە گرنگانەیە کە پێویستە جەختی لەسەر بکرێتەوە، لەوکاتە کە پلان بۆدامەزراندنی هەرشارێک دادەنرێت.

لەبەرئەوە هۆکاری سروشتی رۆڵی مەزنی هەیە لە دامەزراندنی شارو پەرەسەندنی، مرۆڤیش گرنگی شوێنی مەرکەزیی لێ دەرکەوتووە، کە شار بەهەردوو رەگەزی دانان و دامەزراندن لەلایەک و شوێنی و جێگەی لەلایەکی دیکە خۆی دەردەخا، جا تایبەتمەندی هەریەک لەمانە:- دانان و دامەزراندنی (*)ی شاری هەولێر، بەو پێیەی لەلایەک دەکەوێتە ناوچەی ئەو زەوییە هەڵکشاوانەی هاوسێی ناوچەی باکووری رۆژهەڵاتی چیایی و لەلایەکی دیکەوە کەوتۆتە ناوچەی باشووری رۆژئاوای دەشتایی، گەرەکی قەڵاتیش بەرزترین شوێنی هەولێرە لەسەر رووی دەریا کە (٤١٤) مەتربەرزە[١٥].

ئەم دامەزراندنەش لەرووی سروشتییەوە لەناوەڕاستی هەرێمێکی دەشتایی دەوڵەمەندو پڕ بەپیتدایە، کە کەوتۆتە

سەر تەپۆلەیەکی لەسەر رووی (٣٩٠) مەتر بەرزە، ئەم دەشتاییەش لەشێوەدا سێگۆشەو لە دەشتایی کەرکوک دەچێ و بەوێدا درێژ دەبێتەوەو بەرەو خوار دەکشێ و قوڕو چەو و گڵ و زیخ کەوتۆتە سەریەک، هەروا ئەم دەشتاییە هەندێ دۆڵی نیشتووەو ئاوەکەی دەچێتە هەردوو زێکەدە[١٦].

بوونی ئەم دەشتاییە وایکردووە لەرووی ئاوەدانییەوە شاری هەولێر فرەوان بێت، بەبێ ئەوە لەپەرەسەندنیدا گرفتی تۆپۆگرافی لەبەردەمیدا ببێتە کۆسپ لەبەردەم پرۆسەی گەشەسەندنیدا، هەروەها بوونی تایبەتمەندیی سروشتی دیکە وەکو خاک و زۆریی باران و ئاوی ژێرزەوی و سەرزەوی، یارمەتی زۆری کشتوکاڵ کردنیان داوە، بەجۆرێ شاری هەولێر پشت بەخۆی دەبەستێ لەئازووقەو بگرە ناردنی ئەوەی لەخۆی زیادە بۆ شارەکانی هاوسێی.

سەبارەت بەشوێنی شارەکەش، روونە کە دەکەوێتە سنووری پارێزگای هەولێر، ئەمیش دەکەوێتە گۆشەی باکووری رۆژهەڵاتی عێراق (سەیری نەخشەی ژمارە -١ بکە)، تورکیا لە باکووریەتی و ئێرانیش لە رۆژهەڵاتی، وهەردوو پارێزگای سلێمانی و کەرکوک کەوتوونەتە باشووری و لەلای رۆژئاوای پارێزگای نەینەوا و دهۆک هەڵکەوتووە، ئەم شوێنە جوگرافییەش گرنگی خۆی هەیە، لەلایەکەوە بەئاسانییەوە رێ بەوڵاتانی دراوسێوە لکاوەو بە ئاسانییەوە بە شارەکانی کوردستانی عێراق و شارەکانی دیکەی عێراق لکاوە لەلایەکی دیکەوە، ئەمە جگە لەوەی گرنگترین هاوینەهەوارەکانی وڵات لەباکووری شارەکەن، گەشتیار بەئاسانی بەرێگای قیرتاو دەیان گاتێ، لەبەرئەوە ئەم شوێنە رۆڵی خۆی هەبووە لەپەرەسەندنی ئاوەدانیی شار، چونکە کەوتۆتە سەر رێگای سەرەکی هاوینەهەوارەکان لەباکوورەوە و شاری کەرکوک لەباشوور، سەرباری ئەوەی زیادەی قەبارەی دانیشتوانی هەبووە.

شوێنیی جوگرافیی هەروەها کاریگەری لەسەر پەرەسەندن و گەشەسەندنی شار هەیە بەشێوەیەک دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی پلە لە باکوورەوە و هەروەها لەرۆژهەڵاتەوەش دەکەوێتە بازنەی ئاسۆیی (١٢-٣٦)[١٧].

بەواتا هەولێر کەوتۆتە ناوچەی مام ناوەندی فێنک و پلەی گەرمای مام ناوەند و زۆری باران کە کاریگەری زۆری بەسەر ئابووری شارەکەوە هەیە، بەتایبەتی کەرتی کشتوکاڵ و خزمەتگوزاری گەشتیاری.

لە مانەی سەرەوە ئەوە هەڵدەهێنجین کە ئەو شوێنە جێگەیەکی نایابی شارە، وایکردووە شار لەرووی دانیشتوان و ئابووری و ئاوەدانییەوە گەشەسەندنی، هەروەها ئەم شوێنە بەردەوامی شاریش دەپارێزێ، کە پایتەختی هەرێمێکی فرەوانی کوردستانە، رووبەرەکەی (١٤٤٧١)کم و رێژەی (٣.٣٪) لەکۆی رووبەری عێراق پێکدێنێ[١٨]، هەروەها ئەم شوێنەش یارمەتی بووژانەوەی ئابووری شار دەدا کەبەهۆی پەیوەندی بازرگانی و ئاڵوگۆڕ لەنێوان هەولێرو هەرێمی کوردستاندا و هەرێمەکانی دراوسێی زیاتر ببووژێتەوە.

## وەزیفەی ئیداری

وەزیفەی ئیداری- سیاسی رۆڵی گرنگ لە پەرەسەندنی شارو گەشەسەندنی بەپێی قۆناغە جوداجوداکان دەگێڕێ، هەرلە دێر زەمانەوە هەولێر مەڵبەندی حوکمڕانی بووە، وەزیفەکانی دیکەی بازرگانی و پیشەسازی و رۆشەنبیری هەمان رۆڵیان گێڕاوە، جاری وا هەبووە هەولێر یەکەیەکی ئیداری بوو، جاری واش مەڵبەندی زیاتر لە هەرێمێک بووە، لە هەندێ ماوەی مێژوویدا پایتەختی دەوڵەتێک بووە، لە سەردەمی (فرسییەکان ١٩) پایتەختی مەملەکەتێک بووە کە ناوی (حدیاب) بووە، کە لە سەردەمی سەنحاریبی ئیمپراتۆری ئاشووری مەڵبەندێکی سیاسی و ئیداری گرنگ بووە.

شارەکە بە درێژایی سەردەمە جوداجودا مێژووییەکان لەبارودۆخێکی ناجێگری دابەزین و پەرەسەندنی بەخۆوە دیوە، لەسەرەتای دامەزراندنی فەرمانڕەوایی نیشتیمانی لەعێراق، بەواتا لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق لە سەردەمی شا فەیسەڵی یەکەم، عێراق بۆ چواردە لیوا (پارێزگا) دابەش کراوە، لەوکاتەوە هەولێر پارێزگایەک بووە، راستەوخۆ بەبەغدای پایتەختەوە بەستراوە[٢٠].

لەم دوایەدا لەبەرئەوەی هەولێر دانیشتوانێکی زۆری لێیە و ژمارەی دانیشتوانی شارەکە زیاتر لە نیو ملیۆنە لەلایەک و هەروەها پایتەختی هەرێمایەتی (ئیداری) هەرێمی کوردستانە، بۆیە بەگرنگترین شاری کوردستانی عێراق دەژمێردرێت، هەرێمی کوردستان ئێستا لە هەر سێ پارێزگای هەولێر خۆی و سلێمانی و دهۆک پێکدێت، سەرباری ئەم گرنگییانە، پرۆژەی نوێی پیشەسازی بەرچاو دەکەوێت و هەروەها شارەکەش بەسروشتی گەشتوگوزارو شوێنەوار دەناسرێتەوە، بەم جۆرە وەزیفەی ئیداریی سیاسی کاری لە پەرەسەندنی شار لە هەموو بوارێکەوە کردووە، ئەمەش وایکردووە ببێتە مەڵبەندێکی فرەوان هەم لە ناوخۆیدا و هەروەها لەهەرێمەکانی دەوروبەریش رووی تێ بکەن.

**٣- هۆکارە دیمۆگرافییەکان:**

هەر گۆڕانکارییەک لە قەبارەی دانیشتوان، جا چ بەئاراستەی زیادبوون یاخود بە ئاراستەی کەمبوون بێت، ناودەنرێت پەرەسەندن (GROUTH) تەنها لە سێ سەرچاوەوە دێت، کە ئەمانەن لەدایکبوون و مردووان و کۆچ، کە ئەمانەش لایەنێکی دابڕاو نین لەبوونی مرۆڤایەتی، بەڵکو ئەنجامی ئەم هۆکارانە کە راستەوخۆ کار لە گەشەسەندنی دانیشتوان دەکەن، بۆ زیادبوونیش لەتێکڕای پەرەسەندنی دانیشتوانی شارەکە دەگەڕێتەوە بۆ:

أ- زیادبوونی سروشتی دانیشتوان:

مەبەست لەزیادبوونی سروشتی ئەو جیاوازیەی نێوان لەدایکبوون و مردووانە، ئەو زیادبوونەش یائەوەتا بەژمارە یاخود بەرێژە دەپێورێت، ئەگەر بە رێژەییش بێت، ئەوا رێژەکە لە تێکڕای دانیشتوانی شارەکە یاخود کۆمەڵگاکە لەسەر بنەمای سەدی یاخود هەزاری وەردەگیرێت[21].

**١- لەدایکبوون:**

لەدایکبوون لە کۆمەڵگا بە گرینگترین رووکاری جوولەی دانیشتوان دەژمێردرێت، بەشێوەیەک کە لێیەوە ژمارەی دانیشتوان بەسروشتی زیاد دەبێت، لەمەوە دەردەکەوێ لەدایکبوون لەشارەکە لە ساڵی (١٩٨٠) بۆ ساڵی(١٩٨٩) لە (١١٥٩٦) کەسەوە بۆ (١٠٩٨٤)، کەسەوە لە دایکبوون زیادی کردووە، ئەم هەڵکشانەش بۆ بڕیاردانی هاندان و رێگەدان و دیاری دەگەرێتەوە، بەتایبەتی هاندانی هاوسەرگیری و ژنهێنان و بڕیاری منداڵبوون، ئەمەش وایکردووە هاوڵاتیان بەرەوپیری ئەم بڕیارانە بچن، ئەمەش وایکردووە بەسەر ژمارەی لەدایکبوون دەنگ بداتەوە (سەیری خشتەی ژمارە (٤) کە).

**٢- مردووان:**

لەدایکبوون گرنگترین هۆکارە کار لە ئایندەی دانیشتوانی هەر وڵاتێک لەوڵاتان یان هەر شارێک لە شارەکان دەکا، ئەگەر هاتوو هۆکاری دەرەکی وەک کۆچکردن و راکردن نەهێتە ناوەوە. بەم شێوەیە لەدایکبوون بەرپرسیارێتی سروشتی زۆربوونی دانیشتوان لەئەستۆ دەگرێ.

دانیشتوان بەشێوەیەکی سروشتی بەهۆی لەدایکبوون زۆر دەبن و بەهۆی مردنەوە کەم دەبن، گرنگی مردووان تەنها لەسەر خەملاندنی ژمارەی ئاخیری دانیشتوان نەوەستاوە، بەڵکو لەسەر پێکهاتەی خودی دانیشتوان لەرووی هەردوو فیئەی تەمەن و رەگەز وەستاوە[22].

لەبەر ئەوە دەبینین مردووان لەشاری هەولێر لەبارێکی هەڵبەز و دابەزدان، لە ساڵی (١٩٨٠) ژمارەی مردووان گەیشتە (١٠٢٩) کەس و لە ساڵی (١٩٨١) ئەم ژمارەیە هەڵکشا بۆ (٢١٢٥) کەس. کەچی لە ساڵی (١٩٨٦) ژمارەی مردووان هاتە خوارەوە و بووە (٧٨٦) کەس. لەساڵی (١٩٨٩) جارێکی دیکە بەرزبۆوە، ژمارەکە گەیشتە (٢٣٦٩) کەس.

لەگەڵ ئەوەی ئەم هەڵکشانە بۆ بارودۆخێکی جەنگی

عێراق_ئێران دەگەڕێتەوە، کەچی بەشێوەیەکی گشتی مردووان بەهۆی باشی باری تەندروستی و چاودێری تەندروستی کەم بۆتەوە.

هەروەها ئەگەر بەراورد لە نێوان مردووان و لەدایکبوون بکەین، ئەوە سەرنج دەدەین، کە مردووان کەم بوونەتەوە، لەهەمان کاتدا سەرنجی ئەوەش دەدەین لەدایکبوون لەشارەکە، لەکۆی زۆربوونی سروشتی دانیشتوان هەڵکشاوە، هەروەک لە خشتەی ژمارە (٤) هاتووە، ئەمەش وایکردووە پەرەی دانیشتوانی شار بچەسپێ و خێراتر بێت.

**خشتەی ژمارە(٤)**

| ساڵ | لەدایکبوون | مردووان | زۆربوونی سروشتی |
|---|---|---|---|
| ١٩٨٠ | ١١٥٩٦ | ١٠٢٦ | ١٠٥٦٧ |
| ١٩٨١ | ٨٤٤٢ | ٢١٢٥ | ٠٦٣١٧ |
| ١٩٨٢ | ٥٨٣٨ | ١٢١٨ | ٤٦٧٢ |
| ١٩٨٣ | ٥٠٢٣ | ٠٨٥١ | ٤١٧٢ |
| ١٩٨٤ | ٧٠٤٧ | ٠٨٤٣ | ٦٢٠٤ |
| ١٩٨٥ | ٦٣٦٣ | ١٣٢٥ | ٥٠٣٨ |
| ١٩٨٦ | ٦٦٨٠ | ٠٧٨٦ | ٥٨٩٤ |
| ١٩٨٧ | ١٠٨٠٦ | ١٦٦٤ | ٩١٤٢ |
| ١٩٨٨ | ١٣٩٤٧ | ١٣٤٠ | ١٢٦٠٧ |
| ١٩٨٩ | ١٥٩٨٤ | ٢٣٦٩ | ١٣٦١٥ |
| تێکڕا | ٩١٧١٦ | ١٣٥٥٠ | ٧٨١٧٦ |

### ب/کۆچ (زۆربوونی غەیرە سروشتی)

کۆچ بریتییە لە جوولەی گواستنەوەی دانیشتوان لەشوێنی بنەڕەتی خۆیانەوە بۆ شوێنی گەیشتنیان، ئەم جوولەیەش لەرووی رادەی ماوەو زەمەنەوە جیاوازە[٢٤].

کۆچ یەکێکە لە رەگەزە سەرەکییەکانی پەرەسەندنی دانیشتوان، کار لە قەبارە و پێکهاتەی دانیشتوان و بەگشتی لەتوانای پەرەسەندنیان دەکا.

هەرچەندە ئەم جوولە گواستنەوەش لەسەرخۆیە رۆڵ ناگێڕێ، هەروەک لەدایکبوون و مردووان بەرچاو دەکەوێ، کۆچ راستەوخۆ لە دانیشتوان یا لەدایکبوونیان، بەشداری ناکا، بەڵکوگرینگی گەوهەریی لەوەدایە، دانیشتوان دابەش دەکاتەوە، جیاوازی پەرەسەندنی هەرێمی لەپێکهاتەی رۆنانە جوداکان دەردەخا، کەئەمانە شوێنەواری کۆمەڵایەتی و دیمۆگرافیی مەزنیان لێ دەکەوێتەوە.

ئامارەکانی دانیشتوان ئاماژە بەوە دەکەن، کە کۆچێکی ناوەوە لە پارێزگاکانی کوردستانی عێراق و هەرێمەکەی بۆ ناوەند، بوونی هەبووە.

سەبارەت بەشاری هەولێر داتاکان روونی دەکەنەوە، لەماوەی (١٩٤٧-١٩٧٧) لەرێژەی کۆچ بۆشارەکە پەرەسەندن روویداوە، تێکرای کۆچ بەتەواوی بۆ شارەکە لە ماوەی (١٩٤٧-١٩٥٧) گەیشتۆتە (٥٣٧٥) کۆچبەر، هەروەها لە ماوەی (١٩٥٧-١٩٦٥) بۆ (٤٠١٣٢) کۆچبەر هەڵکشاوە، تا لە ساڵی (١٩٧٧) گەیشتۆتە (٦٥٨٣٩) کۆچبەر[٢٥].

لەئەنجامی سیاسەتی راگواستن و کۆچپێکردن کە حکومەتی بەغدا لەماوەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو لە دژی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق پەیڕەوی کرد، ژمارەی کۆچبەران زیادی کرد، حکومەت گەلێ کۆمەڵگەی زۆرەملێی لەدەوروبەری شار دروست کرد، بەبێ ئەوەی هیچ بنەمایەکی ئابووریی بۆ دانیشتوانەکەی هەبێت، ئەمەش وایکرد ژمارەیەکیان کۆچ بکەنە شار و لێی دانیشن، دواجار ئەمە بووە هۆی زۆربوونی گەشەی دانیشتوان لەلایەک، هەروەها بەهۆی ناکۆکیی عەشایەری لە هەرێم وایکرد جووتیار روو لە شار بکەن و لێی نیشتەجێ بن. لەلایەکی دیکەوە، کە لەشاردا هەلی کار و خزمەتگوزاری و ئاسایش زیاتر بوو، ئەم هۆکارانەش وایانکرد بەشێوەیەکی ناسروشتی دانیشتوان زۆربێت.

## ج/ پێكهاتەی جۆری و تەمەنی دانیشتوان:

پێكهاتەی جۆری و تەمەن پەیوەندی راستەوخۆی بەدابەشكردنی دانیشتوان و گەشەسەندنیانەوە هەیە، ئەو پێكهاتەیە خەریكە دەبێتە گرینگترین ئەو هۆكارانەی كار لە گۆرانكاریی دیمۆگرافی دەكەن، دابەشبوونی دانیشتوان بەپێی فیئەی تەمەن و جۆر پەرەسەندنیان دیار دەكا.

لەلایەكەوە كار لەپێكهاتەی لەدایكبوون و مردووان دەكاو، لەلایەكی دیكەوە كار لە رووگەی بەپیتی و رادەی زۆربوونی سروشتی و هەروەها كار لەكۆچ دەكا، چونكە بەهێزی بەرهەمهێنانی دانیشتوان و رادەی كارایی ئابوورییەوە پابەندە، كەدواتر كار لە قەبارەی كۆچ و ئاراستەكانی دەكا[٢٦].

### ١- پێكهاتەی جۆری:

پێكهاتەی جۆری دانیشتوان بەئاسانی دەپێورێ و دەتوانرێ سەرنجەكانی تۆمار بكەین، لە تایبەتمەندەكانی دیمۆگرافیەكانی دیكە گرنگترە، چونكە راستەوخۆ كاریگەری بەسەر لەدایكبوون و مردووان و هاوسەرگیری، هەروەها كاریگەری بەسەركۆچ دابەشبوونی پیشەییەوەش هەیە، بەواتا پێكهاتەی جۆری كار لەتەواوی شێوە رێكخستنە كۆمەلایەتیەكان دەكات[٢٧].

جێگەی سەرنجە رێژەی جۆر لە شاری هەولێر بەپێی ئاماری (١٩٧٧) و راپۆرتەكانی (١٩٨٥) دەردەكەوێ رێژەی رەگەزی نێر زیاتر بەشێوەیەك گەیشتۆتە (١١٠-١١١)ی لەسەدا هەر رەگەزێكی مێ[٢٨].

لەمەی سەرەوە بۆمان دەردەكەوێ ژمارەی نێر لە شارەكە لە سەرژمێری (١٩٧٧) و راپۆرتەكانی (١٩٨٥) لە ژمارەی زیاترە، هەروەها كۆچ رۆلێكی گرنگی هەبووە لە جیاوازی رێژەی نێر و مێ دەردەكەوێ ژمارەی كۆچبەرە نێرەكان لەژمارەی كۆچبەرە مێیەكان زیاترە، ئەمەش لەبەرئەوەیە زۆربەی نێرەكان بۆ شار كۆچ دەكەن تا لەوێ كاربكەرن.

### ٢- پێكهاتەی تەمەنی:

پێكهاتەی تەمەنی دانیشتوان گەلێ لەجیهانی دیموگرافی دەردەخا، كاتێ كە لەگەڵ گروپی دانیشتوانی جوداجودا بەراوردیان دەكەین، ئەوا بۆ سێ گروپی سەرەكی دابەش دەكرێ، گروپی منداڵ و هەرزەكار واتە فیئەی (٠-١٤) ساڵ و گروپی لاو واتە فیئەی (١٥-٦٤) ساڵ و گروپی پیر واتە فیئەی (٦٥) ساڵ و بەردو سەرەوە.

لە شیكردنەوەی خشتەی ژمارە (٥) سەرنج دەدەین رێژەی منداڵ لەشار دابەزیوە ولەگوندیش هەڵكشاوە، لەشار رێژەیان گەیشتۆتە (٤٤.٩ ٪) كەچی لە گوند (٥١.٥ ٪)ە.

كەچی ئەو فیئەیەی لەرووی ئابوورییەوە بەرهەم هێنن واتە فیئەی (١٥-٦٤) ساڵ بەپێچەوانەوە، بەواتا لەشار رێژەی وان بەرزە كە گەیشتۆتە (٥١.٨ ٪)، كەچی لە گوندنشین بۆ (٤٤.٢ ٪) كەم بۆتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە كە دانیشتوان لەناوچەی گوندنشین بۆ ناوەندی شار كۆچیان كردووە، ئەمەش دەریدەخا كە فیئەی بەرهەمهێن، ئەو فیئەیە كە لە رووی ئابوورییەوە كارایە، هەروەها فیئەی پیر لە شار كەمترە وەك ئەوەی لەگوند، لەشار رێژەیان (٤.٣ ٪).

خشتەی ژمارە (٥)
دانیشتوانی پارێزگای هەولێر بەپێی دەوروبەرو فیئەی تەمەنی بە گوێرەی سەرژمێری (١٩٧٧)[٢٩].

| تەمەن | دانیشتوانی شار | دانیشتوانی گوند | رێژەی ٪ |
|---|---|---|---|
| ١٤ساڵ | ٤٤,٩ | ٥١,٥ | ٤٨,٠ |
| ١٥-٦٤ساڵ | ٥١,٨ | ٤٤,٢ | ٤٨,٣ |
| ٦٥ و بەسەرەوە | ٣,٣ . | ٤,٣ . | ٣,٧ . |
| كۆ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

### ٤- هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان:

زۆربەی پسپۆڕانی کاروباری شار پێیان وایە، گەشەی دانیشتوان تەنها هۆکارە سروشتییەکان دیاری ناکا، بەڵکو پشت بە کاریگەری ئەو هۆکارانە لەسەر جۆری چالاکی ئابووری دەبەستێ، کە مرۆڤ و شێوەی بەرهەمهێنان و شێوازەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و شارستانی مومارەسەی دەکەن، لەبەرئەوەی مرۆڤ لەژینگەی سروشتی خۆی بوونەوەرێکی نێگەتیڤ نییە، بەڵکو مومارەسەی ئەو چالاکییانە دەکا کە لەگەڵ تواناي عەقلی بگونجێ، توێژینەوەکانی دانیشتوان جەخت لەسەر دوو جۆر چالاکی ئابووریی شار دەکەنەوە کە بەفیعلی کار لەفرەوان بوون و گەشەسەندنی شار دەکەنەوە، ئەوانیش ئەمانەن:-



### أ- چالاکییە سەرەکییەکان:

ئەو چالاکییانە لەدەرەوەی سنووری شاردا، داهات بەدەست دێنێ، چالاکییەکی ئابووریی پێکهاتووی شارە (cityformimy)، یارمەتی پەرەسەندن و گەشەسەندنی شا ردەدات.

### ب- چالاکییە ناسەرەکییەکان:

چالاکییەکی ئابوورییە خزمەتی خواستی ناوخۆ دەکات و پێویستییەکانی خودی شار بەدی دێنێ، دەتوانین ئەم بەشەی بەرهەمهێنان ناو بنێین کە چالاکی ئابووری خزمەتکاری شارە (citysevving).

لەتوێژینەوەمان بۆ شاری هەولێر دەردەکەوێ کە چالاکی ئابووریی شارەکە ڕۆڵێکی گرینگی لەگەشەی دانیشتوان لەماوەی توێژینەوەکە هەیە، جا چ لەبەر شوێنی بێت کە نزیکە لە چیاکانی کوردستان کە هەرچی لێ دەکەوێتەوە لە گۆڕینەوەی نێوان چیاودەشت لەڕووی ئابوورییەوە، وەکو ناوچەیەکی تێپەڕین بۆ هاوینەهەوار لە باکووری شارەکە سەیر دەکرێت، سەرباری ئەو وەبەرهێنان و خزمەتگوزارییەی لێیەتی، لەلایەکی دیکەوە.

نائارامی و باری سیاسی باو لە شارەکە و دەسەڵاتدارێتی دەرەبەگ بەسەر زەویدا و بەرهەمهێنانی جووتیار وایکردووە بژێوی جووتیاران خراپ هەڵسووڕێ و بەدەست دەرەبەگەوە لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوو گەلێ ئەشکەنجەیان دی، ئەمەش وایکرد زۆربەی جووتیاران لەبەرئەوەی هەلی کارکردن و ئارامییان دەست دەکەوت بۆ شار کۆچبکەن، بە تێپەڕینی کاتیش ئەمە لە سەر پەرەسەندنی شار لەڕووی دانیشتوانەوە ڕەنگی داوەتەوە.

وەرگێڕانی: رابیعە خۆشناو




نەخشەی چاخە (سەردەمە) جیۆلۆجیەکان لە پارێزگای هەولێر

# زەویناسیی هەولێر

رەفعەت ئەحمەد مەجید

زەویناسی (جیۆلۆجی) (geology)، یەکێکە لە زانستە هەرە بەچێژو بایەخ پێدراوەکانی نێستامان، چونکە بەردەوام لەگەڵ دیاردە سروشتەکان لەکارتێکردنە و وەڵامی زۆر لە پرسیارە سەرسامەکان دەداتەوە کە هەتا سادەترین مرۆڤ بەردەوام لە سروشتی دەوروبەری دەگات، وەک چۆنییەتی دروست بوون و تەمەنی گەردوون و زەوی و شاخەکان و رووبارەکان و سەرچاوە نەوتی و ئاوییەکان.... هتد.

خاکی هەولێر کە سنووری لەسەر شارەکانی (کەرکوک، سولەیمانی، دهۆک)ە، باسی زەویناسییەکەی دەکەین وەک نموونەیەک و بەنزیکی زەویناسی هەموو کوردستانی عێراق دەگرێتەوە. شاری هەولێر دەکەوێتە باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی عێراق و لەلایەنی زەویناسییەوە خاکەکەی بە گوێرەی عێراق بەشێکی دەکەوێتە ناوچەی شەپۆلە بەردییە بەرزەکان، کە ئەویش ناوچە شاخاوییەکانە و بەشەکەی تری بەگوێرەی عێراق دەکەوێتە ناوچەی شەپۆلە بەردییە نزمەکان، کە ناوچەی زوورگ و گردۆلکە و دەشتاییەکان دەگرێتەوە..

**١-ناوچەی شەپۆلە**
**بەردییە بەرزەکان:**

ئەم ناوچەیە لە شاخە سەختەکان و دۆڵە قووڵەکان پێکهاتووە، تا بەرەو باکوور برۆین سەختتر و تەسکتر دەبێتەوە، وەک شاخەکانی (سەفین، زۆزک، هەندرێن، کۆرەک، حەسەن بەگ، هەڵگورد... هتد) تا دێ پر تر دەبێ لەپێکهاتووە جیۆلۆجییە ئاڵۆزەکانی وەک گەلییە قووڵەکان، خزینی تاتە بەردەکان بەسەر یەکتر و دەرکەوتنی چینە بەردە هەرە دێرینەکان، کە ٩٥ ٪ لە بەردە نیشتووەکان پێک دێ rocks sedimentary بە درێژایی هێڵێک، کە لە پێنجوێن دەست پێ دەکات و خۆی لە سنووری ئێران دەخشێنێ، بە ماوات و رایات و گەلاڵەدا تێدەپەڕێ و بەرەو باکووری رۆژئاوا دەڕواو بەدرێژایی ئەم هێڵە (بەردە ئاگرینەکان) لە قووڵایی دەیان کیلۆمەتر لەژێر توێکڵی زەوییەوە بەشێوەی شلە (بەردی تواوە) لە ئەنجامی تێکشکانێکی بەهێزی چینە بەردییەکانی توێکڵی زەوی و لەبەر زۆری پلەی گەرمی و پاڵەپەستۆ و شێبوونەوەیان بوونەتە هۆی گۆڕینی بەردە نیشتووەکان. (بەردە گۆڕاوەکان) و دروستکردنی کانزا خاوە ئابوورییەکان، وەک ئاسن و کرۆم و هەندێ بەردی بەنرخی وەک مەڕمەڕ کە بۆ رازاندنەوە و جوانی بەکاردێن، بەڵام بەشە هەرە فراوانەکەی ناوچە شاخاوییەکان لە بەردە نیشتووەکان پێکهاتووە، کە تێکڕایی ئەستوورییان لە (٢٠٠٠)کم زیاترە، بەهۆی تێکشکاندنە بەهێزەکەی چینەکانی توێکڵی زەوی earth crust و دروستبوونی پاڵەپەستۆیەکی بەهێز لە سەر هەردوو تەنیشتی چینەکانی بەردە نیشتووەکان شەپۆلی فراوان لە چینەکانی بەردە نیشتووەکان دروست دەبێ... شاخ و زنجیرە چیا بەرزەکان لە شەپۆلە بەردییە قۆقزییەکان دروست دەبن و دۆڵەکانیشی لە شەپۆلە بەردییە چاڵەکان، لە هەمان کاتیشدا بەشێک لە بەردەکان تێک دەشکێنێ و، گەلییە قووڵەکان پێک دێن، کە دەبنە شوێنی تێپەڕبوونی رووبارەکان و شۆڕبوونەوەیان بۆ ناو دۆڵەکان، وەک گەلی عەلی بەگ، لە هەمان کاتیشدا کۆنترین پێکهاتووە بەردییەکان (التكاوين الصخرية) (Rock formations) یان تێدا دەردەکەوێت. وا لە خوارەوە پێکهاتووە بەردییەکان لە کۆنترینەوە بۆ نوێترینیان باس دەکەین، لە ناوچە شاخاوییەکانەوە بەرەو باشوور واتە بەرەو هەولێر.

**ا- پێکهاتووی قەمچۆغە (Qamchuqa formation):**

کۆنترین پێکهاتووە کە لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەرکەوتووە، بە شێوەیەکی فراوان بڵاو بۆتەوە و لەسەر شێوەی زنجیرە چیاو لووتکەی بەرز و بەشێوەیەکی سەرەکی لە بارستەی بەردە کلس. (LIMESTONE، COCO) پێکهاتووە، نموونەی ئەم پێکهاتووە بەردییەکانی چیای (سەفین، زۆزک، هەندرێن...)، تەمەنیشی بۆ چاخی تەباشیری خواروو (Lower cretaceous) دەگەڕێتەوە، کە دەگاتە نزیکەی ١٢٠ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر.

**ب- پێکهاتووی شیرانش( shiranish FORMATION):**

ئەم پێکهاتووە لە بەردە قوڕێکی مەیلە و شین، کە بەماددەی کلس دەوڵەمەندە و خاسییەتی هەڵوەرینی تێدایە یەکسەر دوای پێکهاتووی قەمچۆغە دێت، تەمەنی بۆ چاخی تەباشیری سەروو (upper cretaceous) دەگەڕێتەوە، کە نزیکەی ١٠٠ ملیۆن ساڵ لەمەوبەرە.

**ج- پێکهاتووی تانجەرۆ (tanjero formation):**

پێکهاتووە لە چەند چینی یەک لە دوای یەکی جۆرێک لە بەردە قوڕ و بەردە زیخی رەق و بەردەلم و رەنگەکەشی بەرەو سەوزی دەڕوات و یەکسەر دوای شیرانش دێت، کە تەمەنی بۆ چاخی تەباشیری سەروو دەگەڕێتەوە (upper cretaceous)، کە (٩٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بووە.

**د- پێکهاتووی کولوش (kolosh FORMATION):**

رەنگی بۆرێکی تاریکە کە خۆی بە ڕەشیش دەنوێنێ، لە بەردە زیخ و بەردە لم پێکهاتووە و تەمەنی بۆ چاخی (پالیۆسینی ناوەڕاست) (middle Paleocene) دەگەڕێتەوە، کە نزیکەی ٨٢ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بووە.

**هـ- پێکهاتووی جێرکسی چینە سوورەکان :(gercus red beds FORMATION)**

رەنگێکی سووری ژەنگاوی هەیە بۆ چاخی ئیۆسینی خواروو، واتە (lower Eocene) دەگەڕێتەوە، کە نزیکەی ٧٠ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بووە.

**و- پێکهاتووی پیلاسپی (pilaspi FORMATION):**

لە بەردە کلسیکی تەباشیری پێکهاتووە، بۆ نموونە چیای پیرمام لەم جۆرە پێکهاتووە، تەمەنی بۆ چاخی ئیۆسینی ناوەڕاست و سەروو، واتە نزیکەی (٦٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

**٢- ناوچەی شەپۆلە بەردییە نزمەکان**
**(Low flded zone):**

بەشەکەی تری خاکی هەولێر دەکەوێتە ئەو ناوچەیە، کە سنووری باکووری لە زنجیرە شاخی پیرمام و هەیبەت سوڵتان

پێکدێت، سنووری باشووری تا (پردێ و گۆمی مەخمووریش) دەگرێتەوە، ئەو ناوچەیە لە دەشتێکی فراوانی گردۆلکەیی پێک دێ، کە شاری هەولێر و دەوروپشتی دەگرێتەوە، ئەم دەشتەش بە زوورگ دەور دراوە، وەک زوورگەکانی ناوچەی دەو بەستۆڕە و خانزاد و دیبەگە... هتد. ئەمانەش کە لە خوارەوە باسیان دەکەین پێکهاتە بەردییەکانی ئەم بەشەن لە کۆنەوە بۆ نوێ..

**ا- پێکهاتووی فارس (Fars formation):**

یەکسەر دوای پێکهاتنی پیلاسپی دێت، واتە بە تەمەن لەو نوێترە و ئەم پێکهاتە یەکەم جار لە خاکی ئێران دۆزرایەوە و بریتییە لە قوڕ و لم و وردە زیخ و خوێی جبس، ئەم پێکهاتە دەکرێتە دوو بەش: یەکەمیان فارسی خواروو (Lower fars formation) و دووەمیان فارسی سەروو (Upper fars formation) ئەم دوو بەشەش بەخوێی جبس لە یەکتر جیا دەبنەوە، کە رادەکەی لە فارسی خواروو زیاترە و لە فارسی سەروو کەم دەبێتەوە بەزۆری ئەم پێکهاتەش لە بەستۆڕە و تەق تەق و دیبەگە و مەخموور دەردەکەوێ، تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی مایۆسین (Miocene) واتە نزیکەی ٣٠ ملیۆن ساڵ لەمەوبەرە.

**ب- پێکهاتووی بەختیاری (Bakhtiari Formation):**

بۆ یەکەمجار لە ناوچەی بەختیاری لەخاکی ئێراندا دۆزراوەتەوە و لە قوڕ و (Clay) و لم (Silt) و زیخ و چەو (Gravel) پێک هاتووە و ئەم پێکهاتەش دەکرێت بەدوو بەشەوە: بەختیاری خواروو، کە رادەی ماددە وردەکانی زۆر تێدایە، وەک قوڕ و لم. بەختیاری سەروو، کە ماددە درشتەکانی زیاتر تێدایە وەک چەو و قەبارەی دەنکە چەوەکان گەورەترە لەوەی بەختیاری خواروو، تەمەنی ئەم پێکهاتووە بۆ پلایوسین (Ploicene)، کە بۆ نزیکەی ١٥ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

**ج- پێکهاتی رووبارە نیشتەکان**
**(الترسبات النهرية) (Alluvium depoits)**

ئەمەش پێکهاتووە لە لم و قوڕ و چەو و زیخ، کە بەهۆی رووبارەکان شەپۆلە بەردییە چاڵەکەی (گۆمی هەولێر)یان پڕ کردۆتەوە، کە لە بەختیاری داماڵیوە و دەشتی هەولێری پێ داپۆشیوە، تەمەنی ئەم پێکهاتوودش نزیکەی (١) ملیۆن ساڵە، کە بۆ چاخی چواری، واتە (Quaterney) دەگەڕێتەوە.

**١- بەردە نیشتووەکان:**

ماددەکان وەک تۆز و لم و زیخ و وردە بەردە، کە بەهۆی




داماڵینی خاک، ئەو بارستە سەهۆڵییەکان دەگوێزرێتەوە و لەبەر کەمبوونی خێرای ناوەندی گواستنەوە دەبێتە هۆی نیشتنەوەی ئەم ماددە گواستراوانە یان لە دۆخێکی ئاویدا، وەک دەریا و رووبار و دەریاچەکان و ئۆقیانووسەکان یان لە دۆخێکی سەر خاکیدا بە تایبەتی لە بیابان و نیمچە بیابانەکاندا، بەڵام ئەم جۆرە نیشتەییە بیابانییە بەرێگەیەکی فیزیکی دەنیشێتەوە، هیچ گۆڕانێکی کیمیاوی بەسەر ماددەکانیدا نایەن، واتە گۆڕانێکی توخمەکان، بەڵکە هەر ماددەکان لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر دەگوازرێتەوە و کەڵەکە دەبن و لەسەر یەک کۆدەبنەوە، بەڵام لە دۆخی ئاویدا گۆڕانکاری روودەدات لە توخمە کیمیاوییەکان و دەبێتە هۆی دروستبوونی ماددەی نوێ، وەک بەردی کلس (Line stone)، کە $CACO_2$ دەگەیەنێ، سیفەتی جیاکەرەوەی بەردە نیشتەنییەکان لە بەردە ئاگرینە و بەردە گۆڕاوەکان ئەوەیە، کە بەردە نیشتەنییەکان چین چین دەبن.

**٢- پێکهاتە بەردییەکان (Rock Formation):**

کاتێک کە کۆمەڵە چینێک لە چینەکانی بەردە نیشتووەکان بەردەکانیان لەیەک دەچن لەپێکهاتن و ڕەنگ و سیفەتە کیمیاوییەکان ئەم چینانە لەیەک کۆمەڵە کۆدەکرێنەوە و لەژێر ناوی یەک پێکهاتوو ناو دەبرێن، بۆ نموونە پێکهاتنی پیلاسپی، کە ئەستوورییەکەی نزیکەی ۱۰۰م و لەنزیکەی ۱٤۸ چینی بەردی کلس پێک هاتوون:

ا- پێکهاتووی بەختیاری سەرەوە. Upper bakhtiari Formation

ب- پێکهاتووی بەختیاری خوارەوە Lower Upper Bakhtiari

ج- پێکهاتووی فارسی سەرەوە Upper fars Formation

د- پێکهاتووی فارسی خوارەوە Lower fars Formation

هـ- پێکهاتووی پیلاسپی (چیای پیرمام) Pilaspi Formation

و- پێکهاتووی جەرکەسی سوور Jurcus red bed Formation

ی- پێکهاتووی کۆلۆس Kolosh Formation

ن- پێکهاتووی تانجەرۆ Tanjero Formation

**پەیوەندیی ئاوی ژێرزەوی و ناسینەوەی:**

ئاوی ژێر زەوی بریتییە لە بەشێک لە سووری هایدرۆلۆجیا لە سروشتدا، زۆربەی ئاوی ژێرزەوی لە ئاوی باران پەیدا دەبێت، دوایی دەچێتە ژێر زەوییەوە و بۆ ناو چینە بەردییەکان و بەشەکانی تریش لە سەرچاوەی جیاوازەوە پەیدا دەبێت، وەکو ئەو ئاوەی لە پێکهاتنی بەردەکان پەیدا دەبێت و ئەو ئاوەی ژێر زەوی، کە لەنێو چینە بەردەکان کۆدەبێتەوە و ئەو بۆشاییانە پڕ دەکاتەوە، کە لەنێوان بەردەکان و کانزاکاندا هەن، کۆبوونەوەی ئاو لەناو ئەم چینە بەردانەدا پێی دەوترێ عەنبار Aquifer کەم و زۆری ئاو لە پێکهاتوویەکەوە Formation بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ و پشت بەو بۆشاییانە دەبەستێ کە لەنێوان وردە بەردەکاندا هەن.

**دابەشکردنی ستوونی ئاوی ژێر زەوی بەم جۆرەیە:**

۱- ناوچەی هەوایی (zone of aeration)

ئەم ناوچەیە زۆر گرنگە بۆ کشتوکاڵ، چونکە بۆشاییەکانی بە تەواوی بە ئاو پڕ نەبوونەتەوە.

۲- ناوچەی تێر بوو (zone of saturation)

ئەم ناوچەیە تێر ئاوە و ڕووی ئاوی (water table) لە سنووری هەوایی جیادەکاتەوە، ئەم ڕووەش خەیاڵییە، کە پاڵەپەستۆی ئاو و هەوای تێدا هاوسەنگ دەبێت، ئەم سنوورە بەدرێژایی ساڵ پڕ ئاوە.

**کۆبوونەوەی ئاو لەناو چینە بەردەکاندا**

کۆبوونەوەی ئاو لەناو چینە بەردەکان پشت بەو بۆشاییانە دەبەستێ، کە لەنێوانیاندا هەیە و پێکەوە بەستانی ئەم بۆشاییانە بەشێوەی کەناڵی بچووک بۆ گواستنەوەی ئاو تیایاندا، ئەم بۆشاییانە پێیان دەگوترێ (porosity)، واتە بۆشایی نێوان وردە بەردەکان (rock grains)، ئەم بۆشاییانەش لەناو چینە بەردەکاندا لە بەردێکەوە بۆ بەردێکی تر دەگۆڕێن، بۆ نموونە زیخ sanol بۆشایی زۆری تێدایە و ئاوی زۆری تێدا کۆدەبێتەوە و بەستانی ئەم بۆشاییانە بەیەکەوە پێی دەوترێ (permea bility)، واتە ماوەدان بەتێپەڕبوونی ئاو تیایاندا، ئەمەش بریتییە لە توانای ئاو بەردان، کە ماوە دەدات ئاو پیایدا تێپەڕ بێت، بەبێ ئەوەی کار لە بەردە وردەکان بکات و لایان بدات و جێگایان بگۆڕێت.

ئەم دوو خاسیەتەش بەیەکەوە بەستراون، بۆیە ئەگەر بەرد بۆشایی (Porosity) زۆربێت، وەکو قوڕ (Clay)، ئەمەش ئاوی کەم تێدایە، چونکە ئەم بۆشاییانە بەیەکەوە نەبەستراون، واتە (Permeahility) زۆر کەمە، کە ماوە نادات ئاو پیایاندا بڕوات یا تێپەڕ بێت.

بەڵام وەکو زیخ (Sand) کە بۆشایی (Porosity) زۆرە و هەروەها بۆشاییەکانیش بەیەکەوە بەستراون، واتە زۆرە، بۆیە ئاوی زۆر تیا کۆدەبێتەوە و بۆ ئاو باشترین عەنبارە (Aquifer).

**عەنباری ئاویش دەکرێتە دوو بەشی سەرەکی:**

۱- عەنباری بەر بەرەڵڵا (Unconfind a quifer)

۲- عەنباری بەند بوو (confied a quifer)

۱- عەنباری بەر بەرەڵڵا (Unconfined aquifer):

ئەوەش بریتییە لەو عەنبارانە، کە لە سەرەوە بەچینە بەردێک دانەپۆشراون، کە ماوە نەدات ئاو پیایدا تێپەڕ بێت، ئەمەش لەکاتی باران بارین ئاو دەگاتە قۆناخی تێربوون بە ئاو (Zone of saturation) و ڕووی ئاوی Water table ئەمەش لەکاتی بیرهەڵکەندندا، زۆربەی عەنباری ناو چینە بەردەکان و پێکهاتووەکانی (Formation) دەوروو پشتی هەولێر لەم جۆرەن:

۲- عەنباری بەند بوو (Confied a quifer):

لەم جۆرەشدا چینە بەردێک، کە ماوە نادات ئاو پیایدا تێپەڕبێت، واتە (PERMEABILITY) زۆر کەمە وەکو قوڕ (Clay) و، کە دەکەوێتە سەر چینێکی دیکە، کە ئاو تیایدا کۆدەبێتەوە، وەک چەو (Gravel) و زیخ (Sand) و لە

ژێرەوەش بە هەمان جۆر چینێکی تر هەیە، کە ماوە نادات ئاو پ‌یایدا تێپەڕبێت، لەبەر ئەوە ئەو چینەی، کە ئاوی تیا کۆبێتەوە دەکەوێتە ژێر پاڵەپەستۆی زۆر، کە لە پاڵەپەستۆی هەوا زۆرترە و لێرە ڕووی ئاوی (Water-Table) ناتوانێت ڕووی خۆی وەرگرێت، بۆیە لەکاتی بیرهەڵکەندندا، کە چینە بەردەکە دەبڕێت کە ماوە نادات ئاو پیایدا بڕوات ئاوەکە بەشێوەی نافوورە دەردەچێت، تا ئەگاتە ڕووی خۆی و پاڵەپەستۆی یەکسان دەبێت بە پاڵە پەستۆی هەوا، ئەم جۆرە عەنبارەش لە پێکهاتوودکانی (Formation) دەوروپشتی شاری هەولێر هەیە.

**پێکهاتە جیۆلۆجییەکانی هەولێر و ئاوی ژێر زەوی:**

**(Erbil geological FORMATION and grond Water)**

١- پێکهاتووی بەختیاری سەرەوە. (Apper ari :FORMATION)

وەک لەسەرەوە باس کراوە بەشی زۆری ئەم پێکهاتووە (FORMATION) لە چەو (Gravel) پێکهاتووە، ئەم چەوەش بۆشایی زۆرە (Porosity) هەروەها (Permeabiljty) و ئاوی زۆر تیا کۆدەبێتەوە و جۆری ئاوەکەشی زۆر باشە و شیرینە و خوێی زۆر کەمە، بۆ خواردنەوە بەکاردێت و بۆ هەموو جۆرە کشتوکاڵییەکیش بەکاردێت.

٢- بەختیاری خوارەوە (Lower Bakhtiari FORMATION)

ئەم پێکهاتووەش لە زیخ (Sand) و چەو (Gravel) و قوڕ (Clay) دروست دەبێ، ئەم زیخ و چەوەش ئاوێکی زۆری تیا کۆدەبێتەوە و باشترین عەنباری ئاوەکەش جۆری ئاوی بەختیاری سەرەوەیە.

ئەم پێکهاتەش بەختیاری سەرەوە و خوارەوە (Upper lower Bakhtiari) باشترین ئاویان لێ دەردەهێنرێت و هەردوو جۆر عەنباری لێ بەدی دەکرێ، عەنباری گیراو (بەستراو) و نەگیراو. (Confined& UN Confied A (Quifer

بەگوێرەی عەنباری گیراو (Confined aquifer)) زۆر بیر هەڵکەندراوە، کە ئاوەکە خۆی دەرچووە و سوودی لێ وەرگیراوە، وەکو بیرەکانی دێی (مەلا ئۆمەر) لەسەر شەقامی هاوینە هەواری سەلاحەدین و دێی (شەرەبۆت) و لەزۆر شوێنی تر ئەو بیرانە بەدی دەکرێن، کە لەم جۆرە عەنبارانە هەڵکەنراون.

٣- پێکهاتووی فارسی سەرەوە (Upper fars :(FORMATION)

ئەمەش چەوی (Gravel) تیادا نامێنێ، لە زیخێکی ورد (FINE-SZND) و قوڕ و لم (CLENY&SILT) پێکهاتووە، ئەم پێکهاتووەش ئاوی تیایە، بەڵام ئاوەکەی زۆر نییە، سوودی کەم لێ وەردەگیرێ.

٤- پێکهاتووی فارسی خوارەوە (Lower fers :(FORMATION)

ئەم پێکهاتووەش لە قوڕ و CLAY و زیخSAND (CaCo2, Listone) و (Cao2, 2H2O- Gypsum) دروست بووە، ئەم پێکهاتووەش بە عەنبارێکی باش دادەنرێت و ئاوی زۆر تیایە، بەشی هەرە زۆری ئاوەکەش بە عەنبارێکی باش دادەنرێت و ئاوی زۆر تیایە، بەڵام بەشی هەرەزۆری ئاوەکەش بۆ خواردنەوەی ئادەمیزاد و ئاژەڵ بە کەڵک نایەت، تەنانەت بەشێکی کەمی بۆ کشتوکاڵ نەبێت سوودی لێ وەرناگیردرێت، ئەمەش لەبەر زۆری ئەو خوێیەی کە تیایەتی، ئەم خوێیەش بریتییە لە خوێ نتریتەکان Na, So4, MgSo4, CaSO4) ئەم خوێیەش لە لەنجامی توانەوەی خوێیەکان پەیدا دەبێت. چونکە ئەم پێکهاتووە (2H2O, CASO)ی تیایە، کە لە (GYPSUM) دروست بووە، ئەمەش بۆتە گیروگرفتێکی گەورە بە تایبەت لە دەشتی مەخموور، کە زۆربەی لەم پێکهاتووەیە، بەڵام بەگوێرەی ناوچە شاخاوییەکانی نزیک هەولێر و چیای پیرمام و چیای سەفین. چیای پیرمام لە پیلاسپی (PILASPI FORMA) پێکهاتووە و هاوینە هەوارەکانی سەلاحەدین لەسەر ئەمەش لە (Caco2, IIMSTONE) پێکهاتووە و ئاو لەنێو دەرزەکانی ئەم بەردانە کۆدەبێتەوە، بە گوێرەی چیای سەفین، کە لەQUMQN GALIMSTONE پێکهاتووە ئاوی زۆری تێدایە و لەنێو دەرزەکانیشدا هەر ئاو هەیە delomu limenu , lime ، کە لە بەردی LIMSTONE, LIMSTONE, DELOMSTIE دروست بووە.

**سەرچاوەکان:**

1- TIBOR BUDCIY: REGIONAL GEOLOGY OF IRAQ PART-1-1979.

2-THE RALPH M. PARSONS COMPANY: PEPORTON GROUND WATER PRESPEATS OF THE ERBIL LIWER 1956.

٣- ئەندازیارانی جیۆلۆجی، مامۆستایان: دڵنیا محەمەد عەلی و محەمەد عەزیز.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (هەولێر) یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی (١٨٨٥-١٩٨٥) وەرگیراوە.




نەخشەی توانستی بەرهەمهێنانی خاک لە پارێزگای هەولێر

# توانستی زەوی پارێزگای هەولێر بۆ کشتوکاڵ

دکتۆر هاشم یاسین حەداد

**پێشەکی**

بەکارهێنانی زەوی کشتوکاڵی بەشێوەیەکی بەردەوام بوارێکی نوێی زانستی جوگرافیایە، ئامانجەکانی تەواوکارییە لەنێوان گرنگی پێدانی ژینگە لەگەڵ بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و جێبەجێ کردنی جیاوازو جۆراوجۆر، لەوانە پارێزگاری کردنی ژێرخانی دەرامەتە سروشتییەکانی ناوچەکەیەو تێکچوونی خاک (تدهور التربة)، و جۆری ئاو، رووەکە بەمەبەستی سوود بەخشین

بەنەوەکانی ئێستاو داهاتوو.

دەستنیشان کردن و خەملاندنی باری ژینگەی پارێزگای هەولێر، هۆکارێکە بۆ ڕەخساندن و پێشکەش کردنی بەرزترین بەرهەم بەجوتیارانی پارێزگاکە بەپێی بەڕێوەبردنی بەردەوامی خاک.

گومان لەمەدا نییە پێویستییەکانی مرۆڤ بۆ خواردن، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ چ لەڕووی بڕەوە یاخود جۆرەوە لە زیادبووندایە، ئەویش بەندە بە زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و بەرز بوونەوەی ئاستی بژێوی، دابینکردنی ئەم پێویستییانە پێویستی بەڕێکخستن و بەڕێوەبردنی دەرامەتە سروشتییەکان هەیە، بەتایبەتی زەویوزاری کشتوکاڵی.

زەوی و مرۆڤ دوو هۆکاری سەرەکی و بنەڕەتی ئەم هاوکێشەیەن. هۆکاری یەکەم (زەوی) جێگیرو دیاری کراوە، بەڵام هۆکاری دووەم (مرۆڤ) گۆڕاوە، ئەویش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر زیادکردنی پاڵەپەستۆی لەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکان لەزۆربەی وڵاتانی جیهان. بەمەبەستی دابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ.

پەیوەندی نێوان زەوی و مرۆڤ ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر بڕی بەرهەم هێنان لەلایەک و خراپ بەکارهاتنی زەوییە کشتوکاڵییەکان و کۆچکردنی دانیشتووان و هەندێ لایەنی تری (کۆمەڵایەتی- ئابووری- ململانێی ڕامیاری)، لەلایەکی دیکە.

ئەنجامدانی ئەم جۆرە توێژینەوانە چارەسەری گرفتەکانی دانیشتووانی لادێ ناکات. بەڵکو پێویستی هەیە بەجێبەجێ کردنی سیستەمە کارگێڕییە پێویستییەکان لەسەر ئاستی ناوەوە و نەتەوەیی.

لێکۆڵینەوەکە هەوڵ دەدات وەڵامی چەند پرسیارێک بداتەوە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە بەڕێوەبردنی زەوی **Land mangment** لە پارێزگای هەولێر.

چی ڕوودەدات ئەگەر بەکارهاتنەکە بەشێوەی ئێستای بمێنێتەوە، و ئەو چاکسازییانە چین کە پێویستە ئەنجام بدرێن.

**١-٢- ناساندنی ناوچەی لێکۆڵینەوە:**

دەستنیشان کردنی پارێزگای هەولێر وەک ناوچەی لێکۆڵینەوە، بەخۆڕایی نەبووە، بەڵکو پشت بەچەند بنەمایەکی زانستی بەستراوە، لەوانە شوێن - ڕووبەری زەوییە کشتوکاڵییەکان، بەکارهاتنی زەوی و...هتد.

پارێزگای هەولێر یەکێکە لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان، پایەتەختی هەرێمەکەیە و یەکێکە لە گرنگترین و کۆنترین شارەکانی جیهان. پارێزگای سلێمانی سنووری ڕۆژهەڵاتی پارێزگاکە پێک دەهێنێت و سنووری نێودەوڵەتی ئێران-تورکیا دەکەوێتە باکووری پارێزگاکە و زێی گەورە پارێزگاکە جیا دەکاتەوە لەگەڵ پارێزگای دهۆک و نەینەوا لەڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوا و زێی بچووک هەولێر لە پارێزگای کەرکووک جیا دەکاتەوە لە باشوورەوە. بەم شێوەیە ڕووبەری پارێزگاکە دەگاتە نزیکەی (١٥٣٩٦)کم٢، کە دەکاتە نزیکەی (٦١٥٨٤٠٠) دۆنم.

لەڕووی فەلەکییەوە پارێزگاکە دەکەوێتە نێوان بازنەکانی پانی (٣٥٣٠-٣٧١٥)ی باکووری گۆی زەوی، هێڵەکانی درێژی (٤٣٢٢-٤٥٠٥)ی ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوی.

لەڕووی کارگێڕییەوە پارێزگاکە لەم قەزایانەی خوارەوە پێک هاتووە (مەخمور - دەشتی هەولێر (بنەسڵاوە) سەنتەری هەولێر - کۆیە- خەبات- شەقڵاوە- سۆران- چۆمان- مێرگەسوور).

**١-٣- هەڵسەنگاندنی زەوی کشتوکاڵی پارێزگاکە:**

لێکۆڵینەوەکە ئاستی هەڵسەنگاندنی زەوی بەشێوەی جۆری **qualitative** ئەنجام داوە، وەک پێشکەش کردنی ئاسانکاری بۆ پیاوانی پلان دانەرو بڕیار دەران **Decsion Makers**، بەمەبەستی نیشانکردنی ئەو ناوچانەی پێویستییان بە بووژاندنەوە هەیە،

| | پرووبەری کم٢ | پۆلی زەوی | | پرووبەر کم٢ | پۆلی زەوی | | پرووبەر کم٢ | پۆلینی زەوی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [illegible] | 478 | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | 4.5 | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | 15.25 | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
| | | | | | | [illegible] | 550 | [illegible] |
| | [illegible] | [illegible] | | [illegible] | [illegible] | | [illegible] | [illegible] |
| 11.41 | 500 | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | 9.1 | [illegible] | [illegible] |
| 4.65 | 716 | [illegible] | 3.15 | 485 | [illegible] | | | |

سەرەڕای پۆلینکردنی ناوچەکان یەک لەدوای یەک، یاخود ناوچەیەک پێش ناوچەیەکی تر بە مەبەستی بووژاندنەوەی گەڕاندنەوەی هاوسەنگی لەنێوان پێداویستی بەکارهێنەرانی زەوی و توانستی زەوییەکە لەلایەک و جێبەجێ کردنی ڕووپێوی خاک (Soil-Survey) هەڵسەنگانی زەوی Land Eualuation، و جێبەجێ کردنی تۆڕی ئاودێری و چاککردنی زەوی..هتد، لەلایەکی تر.

ئەنجامدانی ئەم کارانەی ئاماژەی پێ کراوە، پێویستی بەهەڵسەنگاندنی زەوی هەیە بەپێی توانستی خاکەکەی بۆ کشتوکاڵ. سەرەڕای دانانی پەیوەندی لەنێوان دەرامەتە سروشتییەکان و نموونەی پلان دانان، بۆ بەکارهاتنی زەوی لادێکان، بەنیازی بەڕێوەبردنی بەردەوام.

بەکارهاتنی زەوی و زاری کشتوکاڵی هەنووکەیی، لەپارێزگاکە ئامانجی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکەیە، سەرەڕای بەکارهاتنی تر لە دوارۆژدا، لەژێر باری سروشتی، کە بەهێزکەری پەیوەندییە لەنێوان باری کۆمەڵایەتی و ئابووری ناوچەکە و هەر بەکارهێنانێکی زەوی لە پارێزگاکە پێویستی هەیە بەئەنجامدانی کرداری هەڵسەنگاندنی زەوی بەپێی توانستی زەوییەکە.

کەواتە مەبەست لە هەڵسەنگاندنی زەوی: کرداری خەمڵاندن و توانستی زەوییە، کاتێک کە بەکاردەهێنرێت بۆ ئامانجی جۆراوجۆر، کە ئەم کردارانە دەگرێتەوە:

جێبەجێ کردن و شیکردنەوەی ڕووپێوەکان و توێژینەوە پەیوەندارەکانە بەشێوەکانی ڕووی زەوی - خاک- ڕووەک- ئاو و هەوا... و هەندێ لایەنی تری زەوی بەمەبەستی دەستنیشان کردن و ئەنجامدانی بەراورد لەنێوان بەکارهاتنەکانی زەوی، بەمەرجێ توانای جێبەجێ کردنی هەبێت بەپێی بنەماکانی هەڵسەنگاندن.

### ١-٤- بەڕێوەبردنی زەوی بە بەردەوامی

**Sustain able Land Mangement**

ئەم بوارە نوێیەی جوگرافیا چەندین پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە، ئەمەش بەندە بە بوارە زانستییەکان. لەگەڵ ئەوەش زۆربەی پێناسەکان لەم لایەنانەی خوارەوە یەک دەگرنەوە:

١- بەڕێوەبردن بە بەردەوامی سیستەمێکە لایەنی تەکنەلۆژی و پلان دانان دەگرێتەوە.

٢- هەوڵ دەدات بۆ تەواوکردن و هاوسەنگی لەنێوان بنەماکانی ژینگە (ئابووری- کۆمەڵایەتی-رامیاری) لەلایەک و بەڕێوەبردنی زەوی بۆ کشتوکاڵ لەلایەکی تر.

٣- دابینکردنی هاوسەنگی دادوەری لەنێوان نەوەکانی ئێستا و داهاتوو.

٤- دابینکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی (ئابووری) دانیشتووان بەتایبەتی دانیشتووانی لادێ نشین (جووتیارەکان).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم بوارەی جوگرافیا هەوڵ دەدات بۆ دەستەبەر کردنی هاوسەنگی لەنێوان تەکنەلۆژیاو لایەنی ڕامیاری و چالاکییەکان لە کەرتی کشتوکاڵی، بە مەرجێک پارێزگاری بکات لەسامانە سروشتییەکان و کارەکانی ژینگە و، لەهەمان کاتدا هەوڵ بدات بۆ چاککردنی و پێشکەش کردنی باشترین لایەنی ئابووری.

یەکێک لە گرنگترین پێناسەکانی بەڕێوەبردنی زەوی بە بەردەوامی زانا (H. Hurni) کردوویەتی کە دەڵێت بەڕێوەبردنی زەوی بەردەوامی سیستەمێکە بوارەکانی تەکنەلۆژیاو پلان دانان دەگرێتەوە، و تەواوکاری لەنێوان بنچینەکانی ژینگە، و (کۆمەڵایەتی- ئابووری)، و ڕامیاری بەڕێوەبردنی زەوی لەپێناو بەکارهاتنی کشتوکاڵی مەبەستییەتی، و هەندێ مەبەستی تر بۆ جێبەجێ کردنی ڕاستی و دادپەروەری لەنێوان نەوەکاندا.

لەهەمان کاتدا زانایان ئاماژەیان کردووە بە چەندین پێوەری جیا جیا کە بەڕێوەبردنی زەوی پشتی پێ دەبەستێت. گرنگترینیان زانا (Hurni) دەستنیشانی کردووە. کە ئەمانەن:

١- پێویستە بەڕێوەبردنەکە پارێزراو بێت، یاخود لەگەڵ ژینگەی ناوچەکە بگونجێت.

٢- بەکارهێنەرانی زەوییە کشتوکاڵییەکان پەسەندی بکەن.

٣- توانای گەشەکردنی ئابووری هەبێت.

٤- مەترسیدار نەبێت.

٥- پێویستە بەروبوومی زەوی بەپێی بنەمای دەستپاکی بێت.

بێ گومان لە دەوڵەتە دواکەوتووەکان، بەرەوپێش چوونی بەکار هاتنی زەوی بەندە بە دابینکردنی ئاسایشی خۆراک (الامن الغذائي)، و کەمکردنەوەی فەقیری و نەداری، سەرەڕای پارێزگاری کردن لە ژینگە، سوود بەخش بێت بەجووتیارانی ناوچەکە.

تێکچوونی خاک (تدهور التربة) بە گەورەترین کێشەی ئەم وڵاتانە و لەوانەش پارێزگای هەولێر دادەنرێت. ئەمەش دژایەتی کردنی گەشەکردنی بەردەوامی دەرامەتەکانە.

بووژاندنەوەی هەر ناوچەیەک یان هەرێمێک یان پارێزگایەک وەک هەولێر لەڕووی ئابوورییەوە پێویستی بە کۆنترۆڵکردنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و تێکچوونی ژینگەی ناوچەکە هەیە، بەجێبەجێ کردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- بەکارهێنانی ئەو ناوچانەی کە ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵی تێدا بەرزە.

٢- بەهێزکردنی ئاستی کشتوکاڵی لەو ناوچانەی کە قەبارەی بەروبوومەکانی بەردەوامە، بەجێبەجێ کردنی ڕێبازو تەکنیکی گونجاو لەگەڵ بەڕێوەبردنی زەوی ناوچەکە.

٣- ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە بەکارهێنانی زەوی، بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە هەلی چاککردنیان نییە، یاخود ناتوانرێت پارێزگاری لە سروشتی ناوچەکە بکرێت و کرداری نوێکردنەوەی تێدا ئەنجام نادرێت.

بە پراکتیک کردنی ئەم خاڵانەی سەرەوە دەتوانرێت چارەسەر بۆ کێشەکانی زەوی، بەتایبەتی خاک لە پارێزگای هەولێر بدۆزرێتەوە، لە سەرووی هەموویان کێشەی ڕامالینی خاکی پارێزگاکە و تێکچوونی لەوەرگاکان و بڕینی دارستانەکان...هتد.

لەپاشان ئەنجامدانی هەڵسەنگاندنی بەردەوام بەپێی ئەم پێوەرە ژینگەییانە کە پەیوەندی بەجۆری زەویوزار هەیە لە پارێزگاکە. پێوەرەکانیش ئەمانەن:

(جۆری خاک - تێکچوونی زەوی- جۆراوجۆری بەروبوومەکان- جۆری ئاو- دارستان- لەوەڕگا- جۆراوجۆری بەکارهاتنی زەوی- پۆشەری خاک، و مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم پێوەرو نیشانانە تەنها بووژانەوەی پرۆژە کشتوکاڵییەکان نییە، بەڵکو چاودێری کردن و بەڕێوەبردنی زەوی پارێزگاکەیە بەشێوەیەکی بەردەوام.

گومان لەوەدا نییە کە بەڕێوەبردنی زەوی لەپارێزگای هەولێر بەگشتی پێچەوانەیە لەگەڵ بنەماکانی کشتوکاڵی بەردەوام (Sustainbl agricaltur). کەواتە جێبەجێ کردنی بنەماکانی بەڕێوەبردنی بەردەوام وەک بەشێک لەبووژانەوەی بەردەوام پارێزگاری لەدەرامەتە سروشتییەکانی پارێزگاکە دەکات. کە دەبێتە پاراستنی خاک و تێک نەدانی زەوییە کشتوکاڵییەکان و پیس نەبوونی ژینگە. بەڵام بەپێچەوانە ئاکامی خراپی دەبێت لە سەر زەوی ناوچەی لێکۆڵینەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زیادکردنی پاڵەپەستۆ لەسەر زەویوزاری کشتوکاڵی پارێزگاکە، بەمەبەستی دابینکردنی خۆراک و بەروبوومە کشتوکاڵییەکان.

ڕامالینی خاک، گەورەترین گرفتی پارێزگاکەیە، بەتایبەتی لە زەوییە کشتوکاڵییەکان. کە ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکان و پیس بوونی ئاوی ناوچەکە. ساڵانە بڕێکی زۆر لە ڕووپۆشی خاک لەپارێزگاکە لەشوێنی خۆی نامێنێ و دەگوازرێتەوە بۆ شوێنی تر لە ڕێگەی ئاوەوە، کەمێکیشی دەگوازرێتەوە لەڕێگەی هەواوە. بە بەردەوامی ئەم گرفتە هۆکارێکی بنەڕەتی لەدەستدانی ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی خۆراکی ڕووەکەکانە. لەپاشان دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی بەپیتیی خاکەکان.

دەرکەوتنی کەندڕی (آخادید) جۆراو جۆر دیارترین دەرئەنجامی ڕامالینی خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوەیە. وێنە ژمارە (١)، کە ڕێگرێکی تەواوی بەکارهاتنی ئامێرە کشتوکاڵییەکانە، سەرەڕای گۆڕانی زەوی شیاو بۆ کشتوکاڵ بۆ زەوی نەشیاو و نیشتەنییە گوازراوەکان بەڕێگەی جیاواز، دەبێتە هۆی پیس بوونی ئاوەکان، لەگەڵ ئەوەش یاریدەدەرە بۆ شین بوونی قەوزە.

ئەمەش کرداری پاڵاوتنی ئاوەکان قورستر دەکات، و پارەی تێچوو زیاتر دەکات. ئەم مەترسییانەی لەپێشەوە ئاماژەی پێ کراوە زۆر زیاترە لەو پارچە زەوییانەی بۆ کشتوکاڵ بە بەردەوامی بەکار دەهێنرێن. و گرنگترین رێگە چارە بۆ ئەم جۆرە گرفتە، ئەنجامدانی خولی کشتوکاڵییە (الدورة الزراعية)، سەرەڕای جێبەجێ کردنی رێگەی زانستی بۆ کەمکردنەوەی ئاکامە خراپەکانی کرداری راماڵین کە تووشی خاکی پارێزگای هەولێر بووە. رێگە چارەکان ئەمانەن:

١- چاندنی گژوگیا: بەشێوەی پشتێنەی Gross strips

جێبەجێ کردنی ئەم رێگە چارەیە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی راماڵینی رووپۆشی زەوی، لە هەمان کاتدا یارمەتیدەرە بۆ چوونە خوارەوەی ئاو بۆ چینەکانی ژێرەوەی زەوی، ئینجا هۆکارە بۆ زیادبوونی چڕی گژوگیا، و بەستنەوەی دەنکۆڵەکانی خاک.

٢- دروست کردنی دیواری کەنتۆری Contour barriers

ئەنجامدانی ئەم رێگەچارەیە دەبێتە هۆی دروستبوونی کەندڕ، و لەوانەیە دیوارە کەنتۆرییەکان یاخود بەربەستەکان خۆڵی بێت.

### ١-٥- هەڵسەنگاندن و توانستی زەوی بۆ کشتوکاڵ

**Land and eualuation Land capability For agricwtur**

هەڵسەنگاندنی زەوی بەندە بەتوانستی زەوییەکە بۆ کشتوکاڵ لە ژێر باری ئێستا و شاراوەی Potentian، کاتێ زەوی بەکاردێت بۆ مەبەستی جۆراوجۆر وەک بە کارهاتنی کشتوکاڵی (دێمی- ئاودێر)، لەوەڕگا- دارستان...هتد. کە ئەویش بەندە بە باری ژینگەی سروشتی رەگەزەکانی (ئاوو هەوا- خاک-رووەکی سروشتی-دەرامەتی ئاو- بەرزی و نزمی....هتد)، کەواتە، پێویستە کرداری هەڵسەنگاندنی زەویوزاری هەر ناوچەیەک گونجاو بێت لەگەڵ باری سروشتی گۆڕاوی ناوچەکە، سەرەڕای پێداویستییەکانی پارێزگاکە، لەگەڵ ئەوەش دەبێت ناوچەکە توانای گۆڕانکاری هەبێت. وەک یارمەتیدەرێک بۆ پلان دانەران، بە مەبەستی دۆزینەوە و دەستنیشان کردنی بەکارهاتنی جۆراو جۆری زەوی. کە راستەوخۆ کار دەکاتە زیادبوونی سوودەکانی زەوی لەکاتی بەکارهێنانی.

سەرژمێرکردنی بەکارهێنانی زەوی، یارمەتیدەرێکی گرنگی کرداری هەڵسەنگاندنی زەوییە، کە پەیوەندی بەهێزی هەیە لەگەڵ سیماکانی سروشتی، و لایەنی کۆمەڵایەتی، ئابووری ناوچەکە.

کرداری هەڵسەنگاندنی زەوی گرنگی دەدات بە گۆڕانکاریی بەکارهاتنی زەوی، و جێبەجێ کردنی ئەم کردارە بەشێوەیەکی زانستی، کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر کەمکردنەوەی لەدەستدانی دەرامەتی سروشتیی، کاتێ بە شێوەیەکی خراپ بەکار دەهێنرێت.

### ١-٦- ئامادەکردن و شیکردنەوەی نەخشەی توانستی زەوی پارێزگای هەولێر:

١-٦-١- ئامادەکردنی نەخشەی توانستی زەوی نەخشەی توانستی زەوی و پارێزگای هەولێر کردارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بەپشت بەستن هەیە بە سیستەمێک کە پەیوەندیدار بێت بەم کردارە. بۆ ئامادەکردنی نەخشەی توانستی زەوی هەولێر پشت بەستراوە بە سیستەمێکی ئەمریکی بۆ ئامادەکردنی نەخشەی توانستی خاک لەپارێزگاکە. ئەم سیستەمە مۆدێرنە جۆرییە، بەشێوەیەکی بنەڕەتی بۆ مەبەستی کشتوکاڵی بەکاردێت. وەک لە نەخشەی داهاتوو پشتی پێ بەستراوە.

هەڵسەنگاندنی یەکەکانی زەوی بەپێی پێوەری جیاواز دەبێت کە گرنگترینیان ئەمانەن: (جۆری زەوی- رێگر Limitatians)، و رێگرەکانیش هۆکارن بۆ گەشە نەکردنی رووەک. جا ئەو خاکانەی بەرزترین توانستیان هەیە، بە مەبەستی بەرێوەبردن رێگریان کەمە، ئەم جۆرە خاکانە بەپۆلی یەکەم دادەنرێت (پۆلی(-1- Class) بەپێی سیستەمە ئەمریکییەکە، و بەپێچەوانە، ئەو خاکانەی توانستیان کەمە، کەواتە رێگریان زۆرە بەپۆلی (-8-Class) دەژمێردرێن.

وەک ئاماژەی پێ کراوە، بۆ ئامادەکردنی نەخشەی توانستی زەوی پارێزگاکە، بە سیستەمی ئەمریکی پشت بەستراوە، کە زەویوزاری کشتوکاڵی بەپێی توانستیان و رێگرەکانیان پۆلێن دەکات، و سیستەمەکە لە (٨) هەشت پۆل

پێکهاتووە، لەم هەشت پۆلە (٤) چواریان بەکەڵکی کشتوکاڵ دێن، سەرەڕای جۆراو جۆری ڕێگرەکانیان. بەڵام (٤) چوار جۆرەکەی تر بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەن، و ڕێگرەکانیان زۆرن، بەڵکو دەتوانرێت سوودی لێ وەربگرێت بۆ مەبەسەتی (لەوەڕگا- دارستان- بەخێوکردنی گیانەوەری کێوی-گەشت و گوزار- بەڕێوەبردنی حەوزی رووبارەکان...هتد). لە خوارەوە ئاماژە بە پۆلینی ئەم سیستەمە دەکەین:

## ١- زەوی شیاو بۆ کشتوکاڵ
**Arable**

پۆلی یەکەم **-1- Class:**

زەوی شیاوە بۆ کشتوکاڵ بە بەردەوام، و هیچ ڕێگرێکی نییە.

پۆلی دووەم **-2-Class :**

زەوی شیاوە بۆ کشتوکاڵ بە بەردەوامی، بەڵام هەندێ ڕێگری سادە هەیە، وەک (لێژی زەوی **E** کە ڕێگرە لەبەردەم خولی کشتوکاڵی، بەرهەم لەم پۆلە کەمترە بە بەراورد کردن لەگەڵ پۆلی یەکەم **-1- Class**.

پۆلی سێیەم **-3- Class :**

زەوی شیاوە بۆ کشتوکاڵ بە بەردەوام، بەمەرجێ چاکسازی کشتوکاڵی بەشێوەیەکی ڕاست بۆ ئەنجام بدرێ، وەک کشتوکاڵ کردن بەشێوەی کەنتۆری، خولی کشتوکاڵی گونجاو. ئەم پۆلە ڕێگری زیاترە لە پۆلی دووەم، کە بەندە بەخاک و بەرزی و نزمی..هتد.

پۆلی چوارەم **-4- Class :**

زەوی شیاوە بۆ کشتوکاڵ، بەڵام توانستی کشتوکاڵی لاوازە، چونکە ڕێگرەکانی بەهێزو جۆراوجۆرن، و باشتر وایە بۆ لەوەڕگا بە کاربهێنرێن، و بەر (خاکی بەردی) بەگرنگترین ڕێگر دادەنرێت.

## ٢- زەوی نەشیاو بۆ کشتوکاڵ
**Nom0 Arable**

پۆلی پێنجەم **-5- Class :**

زەوییەکەی بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەکەڵکە بۆ لەوەڕگا - دارستان.

پۆلی شەشەم **-6-Class :**

زەوی شیاوە بۆ لەوەڕگا و دارستان، لەگەڵ بوونی هەندێ ڕێگری مام ناوەندی.

پۆلی حەوتەم **-7- Class :**

زەوی لەم پۆلە شیاوە بۆ دارستان، و بەکەڵکی لەوەڕگا نایەت، و ڕێگرەکانی بەکارهاتنی زۆرە.

پۆلی هەشتەم **-8- Class :**

زەویوزاری ئەم پۆلە خراپە **Badlamel**، نە بەکەڵکی لەوەڕگاو نە دارستان دێت. بەڵکو دەتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ بەخێوکردنی گیانلەبەری کێوی و بەڕێوەبردنی حەوزی رووبارەکان و..هتد.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم (٤) چوار پۆلەی سەرەوە، بەبوونی بنەماو توانستەکانی سروشتی- مرۆیی دەتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ گەشت و گوزار (زستانە-هاوینە).

لە هەمان کاتدا ئەم سیستەمە هەندێ ڕێگری جیاوازی هەیە بۆ بەکارهێنان. وەک (قوولی خاک- بەرزی و نزمی- لێژی رووی زەوی...هتد). سەرەڕای ئەمانەش جۆری زەوی بۆ دەستنیشان کردنی سنووری پۆلەکانی توانستی زەوی بەکارهاتووە، کە بەندە بە بەرهەمهێنانی بەروبوومی کشتوکاڵی و گەشەکردنی رووەک.

بەم شێوەیە، بەجێبەجێ کردنی سیستەمی پۆلینکردنی توانستی زەویوزاری پارێزگای هەولێر، بەمەستی ئامادەکردنی نەخشەی توانستی زەوی خاکی پارێزگاکە، بەجێبەجێ کردنی سیستەمە ئەمریکییەکە، دەرکەوت کە خاکی پارێزگای هەولێر لە حەوت پۆل (seven calsses) پێک هاتووە. وەک یەکەی سەربەخۆ لە نەخشەی (ژمارە ٢١) دەردەکەوێت. لەهەمان کاتدا لەپارێزگاکە (٥) پێنج ڕێگر لەکۆی (١٠) دە ڕێگر لە سیستەمەکەدا ئاماژەی پێ کراوە، کە ئەمانەی خوارەوەن:

- لێژی زەوی **I**
- ڕامالین **e**
- نزمی پلەی گەرماو بەفر **c**
- قورسی چینی خاک **t**
- بەرزی ڕێژەی گەچ **g**

وەک لەنەخشەی توانستی زەوی دەردەکەوێت، خاکی پارێزگاکە بۆ چەندین کۆمەڵە یاخود یەکەی سەربەخۆ دابەش کراوە، بەپێی بەکارهاتنی زەوی و ڕێگرەکانی و هەندێ لەم یەکە سەربەخۆیانە ڕێگرەکانیان هاوشێوەیە و هەندێکی تر جیاوازە. و لەم (٧) حەوت یەکەیە (٣) یەکەیان بەکەڵکە بۆ کشتوکاڵ و (٤) چوارەکەی تر بە

کەڵکی کشتوکاڵ نایەن، بەڵکو دەتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ بەکارهاتنی تر.

**١-٦-٢- شیکردنەوەی نەخشەی توانستی زەوی پارێزگاکە:**

نەخشەی ژمارە (١) ئاماژە بەتوانستی زەوی پارێزگای هەولێر دەکات و لە ئامادەکردنی پشت بەستراوە بە سیستەمی پۆلینکردنی زەویوزاری کشتوکاڵی لە پارێزگاکە، بەم شێوەیە خاکی ناوچەکە دابەش کراوە بۆ (٧) حەوت یەکەی سەربەخۆی بنەڕەتی، و هەریەک لەم یەکە سەربەخۆیانەش بۆ چەند یەکەیەکی لاوەکی کۆکراوە دابەش کراوە (متجمعة Associties)، کە هەر کۆکراوێک لە دوو پۆلی لێکدراو پێک هاتووە، و دەتوانرێت لەسەر نەخشەکە جیا بکرێنەوە، ئەویش بەپێودری نەخشەکە بەندە (نەخشەی پێوەر بچووک)، وەک: لە نەخشەکەشدا دیارە خاکی پارێزگاکە (٥) پێنج ڕێگری جۆراوجۆری هەیە (g-t-c-e-l).

بێگومان کرداری شیکردنەوەی نەخشەی توانستی زەوی، کردارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بەکۆکردنەوەی زانیاری و داتای زۆر هەیە لەسەر خاکی ناوچەکە و، سەرەڕای زانیاری دەربارەی بەکارهاتنی جۆری خاکی پارێزگاکەو شارەزای پەیوەندار بە ناوچەکە.

پاش پشت بەستن بە نەخشەی ئاماژە پێکراو و خشتەی ژمارە (٢)، توانرا نەخشەکە بەم شێوەیە شی بکرێتەوە:

١- خاکی پارێزگاکە لەدوو بەشی سەرەکی پێک هاتووە، زیاتر لە سێیەکی خاکی پارێزگاکە بەکەڵکی کشتوکاڵ دێت، کە لە سێ یەکەی بنەڕەتی پێک دێت (پۆلی ١-٢-٣) (Class-1-2-3)، و ئەوەی تری بەشی دووەم پێک دەهێنێت کە نزیکەی دوو لە سێی خاکەکەیەتی و بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت، کە پۆلەکانی (٨-٧-٦-٥) (Class-5-6-7-8).

٢- پۆلی دووەم Class 2

بەگرنگترین یەکەی خاک دادەنرێت لەگەڵ کۆکراوەکانی و بەکەڵکی کشتوکاڵ دێت، و ڕووبەرەکەی نزیکەی (٢٥٧١ کم٢) یە. کە دەکاتە نزیکەی ١٦/٧٪ خاکی پارێزگاکە و ئەم یەکەیە لە چەندین شوێن هەیە لەپارێزگاکە وەک (دەشتی هەولێر- دەشتی کەندیناوە- دەشتی قەراج). لەگەڵ ئەوە ڕێگری جۆراو جۆری هەیە لە دەشتی هەولێر ڕێگرەکەی قورسیی چینی خاکە، بەڵام لە دەشتی کەندیناوە و قەراج بەرزی ڕێژەی گەچ ڕێگرە، وە لەهەندێ شوێنی تر ڕامالینی ئاوی ڕێگرەکەیەتی و خاکی ئەم دەشتانە لەجۆری قاوەیی قوڵە، بەکارهاتووە بۆ چاندنی دانەوێڵە (گەنم و جۆ).

٣- پۆلی سێیەم Class 3

یەکەیەکی بنەڕەتی تری خاکی پارێزگاکەیە لەگەڵ کۆکراوەکانی و شیاوە بۆ کشتوکاڵ. ڕووبەرەکەی دەگاتە نزیکەی (٢٣١٣کم٢)، دەکاتە (١٥٪) خاکەکەی لەجۆری قاوەیی قوڵە، ڕێگری جیاوازی هەیە، ئەم یەکەیە لە باکووری ڕۆژئاوای شاری هەولێر و باکووری قەزای خەبات و دەشتی هەریرو دەشتی دیاناو بەشێک لە دەشتی کەندیناوە و دەشتی قەراج دەبینرێت و ڕێگرەکانی ئەمانەن (قورسی چینی خاک و ڕامالینی خاک و بەرزی ڕێژەی گەچ) و خاکی ئەم پۆلەش بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهێنرێت بەتایبەتی دانەوێڵە (گەنم و جۆ).

٤- پۆلی چوارەم Class 4

بەپلەی سێیەم دێت لەو زەوییانەی بەکەڵکن بۆ کشتوکاڵ، بەڵام ڕێگری زیاترە لە پۆلەکانی تر، ڕووبەرەکەی دەگاتە (١٠٥٠ کم٢)، کە دەکاتە نزیکەی ٦/٨٪ لەخاکی پارێزگاکە. ئەم یەکەیە کۆکراوەکانی لەچەندین ناوچەی جیاوازی پارێزگاکە هەن، بەتایبەتی بەرزاییەکانی شەرەبۆت و ڕۆژئاوای شاری هەولێرو دەوروبەری بەرزاییەکانی قەرەچووغ، و خاکی ئەم یەکەیە وەک لەوەڕگا بەکاردێت لەزۆربەی ناوچەکان و گرنگترین ڕێگری ئەم پۆلە قوری چینی خاک و ڕامالین و بەرزی ڕێژەی گەچ.

٥- پۆلی پێنجەم Class 5

لەڕووی ڕووبەرەوە بەپلەی دووەم دێت لە پارێزگاکە، و بەکەڵکی چاندن نایەت، بەڵام بۆ لەوەڕگا و دار چاندن (دارستان) بەکەڵکە، ڕووبەرەکەی دەگاتە نزیکەی (٢٨٩٥کم٢)، دەکاتە ١٨/٨٪ خاکی پارێزگای هەولێر. لێژی ڕووی زەوی دیارترین ڕێگرە لەم یەکە و کۆکراوەکانی. ئەم پۆلە وەک

یەکەیەکی توانستی زەوی سەربەخۆ ڕووبەرەکەی کەمترە لە (٢١٦کم٢)، لە باشووری قەزای مەخموور دەردەکەوێت، و ڕێگرەکەی بەرزی ڕێژەی گەچ. بەڵام وەک یەکەیەکی کۆکراو ڕووبەرەکەی دەگاتە نزیکەی (٢٦٨٠کم٢)، زۆربەی هەرە زۆری قەزای کۆیە و باشوور و باکووری ڕۆژئاوای قەزای شەقڵاوە و باشووری قەزای مێرگەسوور هەیە، خاکەکەی لە جۆری قاوەییە ئەستوورایی ناوەندە و تەنکە و وردە بەردی بەختیاری ڕووی خاکەکەی داپۆشیوە.

٦- پۆلی شەشەم Class 6

ئەم یەکە کۆکراوەی فراوانترین ڕووبەری لە خاکی پارێزگاکە هەیە، لە ڕووی بەکارهاتنەوە بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت، بەڵکو دەتوانرێت بۆ لەوەڕگاو دارستان سوودی لێ وەربگیرێت و ڕێگرەکانی جیاوازن. ڕووبەرەکەی نزیکەی (٥٢٢٥٤کم٢) دەبێت، کە دەکاتە (٢٧٪) خاکی پارێزگای هەولێر. بەکار نەهاتنی بۆ کشتوکاڵ دەگەڕێتەوە بۆ جۆری خاکەکەی لەخاکی لیشۆسۆڵی تێکەڵ بە بەردی قومی و گەچە، و ڕێگری ڕاماڵین گەورەترین کێشەی ئەم یەکە و کۆکراوەکانییەتی. لەگەڵ ئەمەش لەناوچە چیاییەکان ڕێگری لێژی کاریگەریی زۆری هەیە لەسەر بەکارهاتنی. پۆلی شەشەم لە هەموو بەشێکی پارێزگاکە دەبینرێت. وەک بەرزاییەکانی قەرەچووغ و زوورگەزراو لە بەشی باشووری پارێزگاکە، و بەشی هەرە زۆری قەزاکانی شەقڵاوە و سۆران و چۆمان، و مێرگەسوور پێک دەهێنێت. سەرەڕای بوونی لە هەندێ ناوچەی قەزای کۆیە.

٧- پۆلی حەوتەم Class 7 :

توانستی ئەم یەکە و کۆکراوەکانی لاوازە و بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت، ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە بەندن و پێچاو پێچیان زۆرە، بەتایبەتی ئەو بەرزاییانەی لە سنووری نێودەوڵەتی پارێزگای هەولێر لەگەڵ ئێران و تورکیا نزیکن. لەڕووی توانستەوە بۆ کشتوکاڵ بێ هێزە، لە هەمان کاتدا بۆ لەوەڕگا و دارستان مام ناوەندە، ئەویش بۆ زۆری ڕێگرەکانی دەگەڕێتەوە بەتایبەتی ڕاماڵین و لێژی زەوی، ڕووبەری ئەم یەکە بنەڕەتییە و کۆکراوەکانی (١٩٤٢کم٢)یە، کە زیاتر لە (١٦٪) خاکی پارێزگاکە دەگرێتەوە.

٨- پۆلی هەشتەم Class 8:

لەڕووی ڕووبەرەوە بچووکترین یەکەی توانستی زەوی پارێزگاکەیە. لە هەمان کاتدا لە ڕووی توانستەوە زۆر بێ هێزە، بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت. ئەو ناوچانە دەگرێتەوە بەرزییان (زیاتر لە ٢٥٠٠ کم٢) لە ئاستی ڕووی دەریا زۆرە. لەڕووی بەکارهاتنەوە دیاری کراوە، ئەویش بەندە بە نزمبوونەوەی پلەی گەرمی و داپۆشرانی بە بەفر زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ، و لە پارێزگاکە چیاکانی شاکیف و سەرمەیدان و حەسارۆست و بندۆراس و سەری سەکران دەگرێتەوە. کەواتە نزمبوونەوەی پلەی گەرما ڕێگری بەکارهێنانە لەم یەکەیە، ئەمەش وای کردووە کە بەکەڵکی کشتوکاڵ نەبێت، بەڵکو دەتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ بەڕێوەبردنی حەوزی ڕووبارەکان و بەخێوکردنی ئاژەڵی کێوی و گەشت و گوزار...هتد. ڕووبەری ئەم یەکەیە لە (٤٠٠کم٢) تێپەڕ ناکات، کە (٢/٥٪) خاکی پارێزگاکە پێک دەهێنێت.

٩- ڕێگری ڕاماڵینی خاک لە پارێزگاکە بەدیارترین ڕێگر دادەنرێت، کە ڕاستەوخۆ کاری کردۆتە سەر توانستی خاکی پارێزگاکە، لەڕووی بەکارهێنانەوە، ڕووبەری ئەو زەوییانەی کە گرفتی ڕاماڵینی خاکیان هەیە، دەگاتە نزیکەی (٩٣٢٢کم٢)، کە نزیکەی (٦١٪) خاکەکەی تووشی ڕاماڵین هاتووە. و (٣٩٪) زەوی پارێزگاکە گرفتیان ڕێگرەکانی ترە لەڕووی بەکارهاتنەوە.

گومان لەوەدا نییە یەکەکانی نەخشەی توانستی زەوی کشتوکاڵی لەپارێزگای هەولێر کە شیکردنەوەمان بۆ ئەنجام دا، دەتوانرێت بۆ مەبەستی جیاواز بەکاربهێنرێت و سوودی لێ وەربگیرێت، چ لەڕووی ئابووری یا پلاندانانی هەرێمی و نەتەوەیی. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پەیوەندییەکی ڕاستەوانە و بەهێز هەیە لەنێوان یەکەکانی توانستی زەوی کشتوکاڵی و جۆرەکانی بەکارهێنانی زەوی لە پارێزگاکە، و لە هەمان کاتدا پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە باری سروشتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بلاو لەناوچەی لێکۆڵینەوە کە ئەویش سوود بەخشە بۆ کرداری هەڵسەنگاندنی زەوی لە پارێزگای هەولێر.




# ئەتنۆگرافیای دەشتی هەولێر

جەلال مەولود ئەحمەد سنجاوی

ئەتنۆگرافیا بریتییە لە زانستی وەسفکردنی میللەت و نەتەوەکان، بەیەکداچوونی زاراوە زانستییەکان، واتە ئەو زاراوەی ناوخۆی پیشان دەدات.

لە ئەڵمانیا و هۆڵەندا زاراوەی ڤولکسندە (VOLKSUNDA) کە بە واتای (زانستی کەلەپووری میللی) دێت بەکاری دەهێنن. ئەتنۆگرافیا وەسفی شارستانیەتی گەلێکی دیاریکراو دەکات بەکێشانی وێنەیەکی ورد لەبارەی ڕێگای ژیانیان و سیستەم و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەمەش لەڕێگای چەند توێژینەوەیەکی بەدوای یەکداهاتوو لە چوارچێوەی زەمەنێکی دیاریکراودا ئەنجام دەدرێت. دیارە توێژینەوەی ئەنتۆگرافی توێژینەوەیەکی وەسفی بەراوردکارییە لە شوێن بە شێوەیەکی ئاسۆیی ئەنجام دەدرێ و ڕەهەندە ڕەسەنەکانی کلتووری میللەت دەگرێتەوە و چەمکەکانی شیتەڵ دەکات و گرێ کوێرەکانی دەکاتەوە لەسەر ئاستێکی کارا و شایان، دەکرێ ئەم زانستە لە پانتایی دەشتی هەولێر ئەکادیمییانە توێژینەوەکانی ئەنجام بدات و سەرکەوتنێکی بەرچاو بەدەست بهێنێ، چونکە دەشتی هەولێر جیا لە زۆربەی دەڤەرەکانی دیکەی کوردستان تایبەتمەندێتی خۆی هەیە لە ڕەوتی ژیان و پەیوەندییە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگای کوردەواریدا بە تایبەتی عورف و عادەت و ئەمن و ئەمانەت و ڕێزگرتن و گەورە و بچووکی و دڵفراوانی خەڵکەکەی و میوان دۆست و ناندەر و یارمەتیدانی یەکتر لەکاتی لێقەومان و کارەساتی لەناکاو، تارادەیەک



کۆک و یەکدەنگن هەر هەموویان خۆیان بەیەک بەردباب دادەنێن.
ئەتنۆگرافیای دەشتی هەولێر هەموو جموجۆڵێکی ژیانی رۆژانە لە کشتکاری و ئاژەڵداری و پیشەی دەستی و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و کلتوور و کەلچەر و هۆنراوە فۆلکلۆرییەکان و بەیت و بالۆرە و مەقامە رەسەنەکان و هونەری تەلارسازی و نەخش و نیگار و هێڵکاری ئەندازەیی و زەخرەفەیی دەگرێتەوە.
لە گوندەکانی دەشتی هەولێر دیوەخانی ئاغا و کوێخاکان هەیە و چەشنی قوتابخانەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ گوندەکان وابوون، لە دانیشتنی شەو و رۆژ ژمارەیەکی گونجاو لە ریش سپی و دنیا دیتەکان و میوانان ئامادە دەبوون و مرۆڤی زیرەک و هۆشمەند لەوێ سەنگی تایبەتی هەبوو لە لایەن کوێخاو گەورەی دیوەخان، چونکە ئەوانە کانگەی قسەی نەستەق و بەیتی فۆلکلۆری و ئامۆژگاری خەڵک و گێرانەوەی حەقایەت و بەسەرهاتە ئەفسانەییەکان بوون.
هەروەها دیوەخانەکان شوێنی چارەسەرکردنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان بوون، بە تایبەتی کێشەی زەویوزار و مەرداری و پاوانەکان و ژن و ژنخوازی و سولح و مەسرەتی و لێبووردەیی و ئاشنا بوونەوە، کە ئەمانە هەمووی لەلایەن کوێخاو مەلای گوندی و ریش سپییەکان ئەنجام دەدرا وەک یاسایەکی کۆمەڵایەتی پەیرەو دەکرا، بەرێکوپێکی گرفتەکان چارەسەر دەکران، تا رادەیەک کەس لاری و گازاندەی نەدەبوو.
لێرەدا دەگەینە بەو قەناعەتەی بڵێین، دەشتی هەولێر ملوانکەی ئەڵماسی گەردەنی کوردستانە و لانکەی شارستانییەت و مەملەکەتی حەیران و ئەفسانە و بەیتە فۆلکلۆرییەکانە و مرۆڤی پاک و خاوێن و ژیر و دنیا دیتەو عەگیدی مەیدانی لێ نیشتەجێیە و پیاوەکانی ئازاو قارەمانن و ئافرەتانیشی لەئیشکردن وەک پیاو وانە. کوێخا سێوێ لە دەشتی هەولێر زۆرە کە ئازاو دەست رەنگینن، تەنانەت زۆر لە گەڕیدەو رۆژهەڵاتناسان لە دووتوێی کتێبەکانیاندا باسیان لە خانمانی دەشتی هەولێر کردووە. بۆ نموونە (هامیلتۆن) لە کتێبەکەی (رێگایەک لە کوردستاندا) باسی لە ئازایەتی و دەست رەنگینی ئافرەتی دەڤەری مەخموور و دەشتی قەراج دەکات.
خۆشەویستی دەشتی هەولێر لەگەڵ خوێنی خەڵکەکەیدا تێکەڵ بووە و تێکرا ئومێدەوارین جارێکی دیکە بگەڕێینەوە گوندەکانمان و تێر بۆنی بەهاری دەشتەکە بکەین و خۆڵەکەی ماچ بکەین.




نەخشەی هەرێمەکانی ئاوو هەوا بەپێی پۆلینی (کۆپن) لە پارێزگای هەولێر

# ئاووهەوای پارێزگای هەولێر

## دکتۆر هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد

ئاووهەوای ناوچەکانی پارێزگای هەولێر جیاوازە، ئەویش بەندە بە بەرزی و نزمی زەوییەکەی و شوێنە فەلەکییەکەی، ئەمەش وای کردووە ئاووهەوای پارێزگاک بۆ دوو هەرێمی ئاو

بەپێی پۆلینی کۆپن KOPPEN.

ئەم دوو هەرێمە بنەڕەتییەش دابەش دەکرێت بۆ هەرێمی ئاووهەوای لاوەکی، دوو هەرێمەکەش ئەمانەن: هەرێمی ئاووهەوای دەریای ناوەڕاست (Cs)، کە ناوچە شاخاوییەکانی پارێزگاکە دەگرێتەوە، هەرێمی دووەم بە هەرێمی ئاووهەوای گەرمەسێر (ئەستەبس) (Bs) دەناسرێت.

جێگای ئاماژە پێکردنە ئاووهەوای پارێزگاکە بە شێوەیەکی گشتی زستانی باراناوییە و ساردە، هاوینی وشک و گەرمە، بڕی باران بارینی جیاوازە، هەرچەندە لە باشووری پارێزگاکە بەرەو باکوور بڕۆین بڕی باران بارینەکە زیاتر دەبێت و جۆرەکەی دەگۆڕێت بۆ بەفر، وێستگەی کەشناسی مەخموور بڕی باران بارینی لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر جیاوازە، بەڵام تێکڕای باران بارینی ساڵانەی دەگاتە (٣٨٠)ملم.

وەک ئاماژەی پێ کرا، هەرچەند بەرەو باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی پارێزگا بڕۆین ئەم بڕە زیاد دەکات، بۆ نموونە ئەم بڕە لە وێستگەی هەولێر دەگاتە (٤٦٠) ملم و، لە ناوچە شاخاوییە سەختەکانی پارێزگاکە دەگاتە زیاتر لە (١٠٠٠)ملم، سەرەڕای بارینی بڕێکی زۆر لە بەفر.

بە هەمان شێوە پلەکانی گەرما، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لە پارێزگاکە جیاوازە. هەرچەند لە باشووری



نەخشەی دابەشبوونی ئاوی سەرزەوی لە پارێزگای هەولێر

پارێزگاکە بەرەو باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی بڕۆین پلەکانی گەرما نزم دەبێتەوە. بۆ نموونە تێکڕای پلەی گەرمی لە کانوونی دووەم کە وەرزی زستان دەنوێنێت لە وێستگەی مەخموور (٨.٧) پلەی سەدییە و لە وێستگەی هەولێر (٧.٨) پلەی سەدییە و، لە وێستگەی ڕەواندز (١.٦) پلەی سەدییە، بەڵام لە مانگی تەمووز لە وەرزی هاوین پلەکانی پلەی گەرما بە گشتی بەرز دەبێتەوە، لە وێستگەی مەخموور دەگاتە (٣٥.٤) پلەی سەدی، وێستگەی هەولێر (٣٢.٣) پلەی سەدی، وێستگەی ڕەواندز (٢٦.٧) پلەی سەدی تۆمار کراوە.

گومان لەوەدانییە ئەم جیاوازییەی لە بڕی باران بارین و پلەکانی گەرما کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر چالاکییەکانی مرۆڤ لە پارێزگاکەدا هەیە.

# بەردەسێرەو گەیاندنی باری کەش و هەوا

## نافیع سمایل قادر دیبەگەیی

ئاو و هەوای کوردستان، ئاو و هەوای دەریای سپی نێوەڕاستی هەیە، سەبارەت بە هەڵکەوتنی شوێنی جوگرافیایی لە گۆی زەمیندا، هاوینی گەرم و برینگێنە و زستانی ساردو دژە، داهات و گوزەرانی دانیشتووان، کشتوکاڵی و بەخێوکردنی ماڵات و پەلەوەرە سەرەڕای بازرگانی نێودخۆیی.. بۆیە هەر زوو لە بەرایێی مێژوودوە، کورد کەش و هەوای ناسیوە و کەشناس و باخەوەردی پسپۆڕی هەبووە، یەکەمین نشینگەی بنیادەم لە کوردستان بووە، کەوا مرۆ دەستی داوەتە کشتوکاڵی و بەندبوونی بە خاکەوە[1]. ئەوەش وای لە کورد کردووە توێژینەوەی کشتوکاڵی بکات لە بواری کەشناسی و چاندنەوە بەر لە هەموو کەسێک، ئەوەتە ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکری کلدانی نەبەتی ساڵی (٤٢١)ی کۆچی لە پەڕتووکەکەیدا باسی ئەوە دەکات، کە خۆی دوو پەرتووکی لە زمانی کوردی گۆڕیوەتە سەر زمانی عەرەبی، کە یەکێکیان باسی کەشناسی و دۆزینەوەی ئاوی ژێرزەوییە و ئەویدیکەش باسی چاندنی دارخورما دەکات و دەڵێ: ئەو نووسینانە دەگەڕێنەوە هەزارەی سێیەمی پێش زایینی[2] لێرانەدا مەبەستمە باسی نەریتێکی کۆنی کوردەواری بکەم، کەوا چەشنی کەناڵێکی ڕاگەیاندن بووە بۆ ئەو حەیامی، ئەویش بەردە سێرەیە... هەروەکو لە ناوەکەی ڕا دیارە مەبەست سێکوچکەی ئاگردانی نانییە... لە بەرایێی پێش وەدەرکەوتنی سۆبای دوکەڵکێش و تەنانەت پێش پەیدابوون و زۆر بوونی نەفت، لە کوردەواریدا بۆ مەبەستی گەرمبوونەوە، ئاگری بەردەسێرەیان دەکردەوە، کەوا سووتەمەنییەکەی بە پێی ناوچەکان دەگۆڕا، دارو کۆڵکەدار بووە لە چیاکان و لە ناوچە دەشتاییەکانیش کوزر، پاشماوەی ئالیک و زبڵ، کشپڵ، تەپاڵە (سەرگین)، تەنانەت پووش و کاوکۆتیش... ئەوە تەنها لە شەوانی ساردی زستاندا کە هەموو شەوێک لە ماڵاندا خەڵک خڕدەبوونەوە لە دەوردی بەردەسێر بە مەبەستی بەسەربردنی شەوانی درێژی زستان و بە ئاگابوونیان لە دەنگ و باس و ڕووداوەکانی ڕۆژانەیان... بێگومان هەرچەندی ساردی زستان توندتر بایە، ئەوا ئاگری بەردەسێرە خۆشترو بەجۆشتر دەبوو... گەورە و گچکە ژن و پیاو کوڕو کیژان، یەکتر دەبوون، جا بەپێی بەرنامە یان بێ بەرنامە جۆرەها گەمەو گاڵتەیان دەکرد، چیرۆک و سەربردە دەگێڕدرانەوە، حەیران و لاوک دەبێژران، پەند و قسەی نەستەق دەگۆتران

و تەنانەت شایی و شمشاڵ و دووزدلە دەکەوتنە بزووتن و ژەنین... زۆر جاران هەقایەتی ئەوتۆ دەگێڕدراوە بەچەند شەوان تەواو نەدەبوو... سەرەڕای هەموو ئەوانە باخۆردو کەشناسان سەری مەجلیسیان دەگرت[٣] بەتایبەتی لە شەوەکانی چلەی زستاندا، بەگوێرەی تاقیکردنەوەی ئەزموونی خۆیان هەواڵی کەش و هەوایان بە دانیشتوان رادەگەیاند، زۆر جاران و بگرە هەموو شەو و رۆژێکیش پێشبینی کەشیان دەکرد... ئایا؟.. ئاو و هەوا. باران، بەفر، با، شەختە... چۆن دەبێ؟ خەڵکەکەش هەریەکە بەش بەکارو پیشەکانیان سوودیان لێ دەبینی، کاروانچی، شوان، جووتیار، خاوەن پیشە، وەرزێرو شوانکارە بە پێی بۆچوونەکانی باخۆرە و کەشناس هەڵسوکەوتیان دەکرد.! بێگومان خانەخۆیش مەبەست ئەو ماڵەی بەردەستێری لێ دەکراوە، دەبوو شەوچەرەیەکیش ئامادە بکات، کەوا بەپێی ناوچەکان ئەویش دەگۆڕا، کە بریتی بوو لە گوێز، مێوژ، ئەستووکە هەنجیر، میوەی وشککراوە، باوی، بەلەچەک (گندۆرە، یاخود کاڵەکی وشککراوە) یان، برێشکەو قەلەخەرمان، برمان، داندۆک، خۆشاو بەتایبەتی هی سرکەی ترێ و هەنار، و دۆشاو لەگەڵ شتی دی... زۆر جارانیش برژاندنی یان کوڵاندنی سوێسکەو کەو، یان رەشۆڵەو کۆترو تەنانەت کێشکەش... زۆر جاریش برژاندن و پەروەردەکردنی هەندێ گیاو گوڵ هەر بەهۆی سێڵی (سێر) نانکردن کە بەراوگێڕ لەسەر سێکوچکەکەیان دادەنا... لێرەدا من مەبەستمە تەنیا قوژبنێکی یاخود لایەنێکی بەردەستێرە باس بکەم، ئەویش کەشناسی و حیسابەکانی ساڵژمێری کوردییە، کەوا هەمیشە لە هەموو دانیشتنێکدا کەشناسێک یا کۆلکە کەشناسێک هەر بەتاقیکردنەوەی خۆیان یان لە یەکێکی دییەوە زانیارییان دەستگیر دەبوو و لێی دەبوونە پسپۆڕو وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە... باخورە بە تێڕامان و سێردگرتن لەجێگای هەڵاتن و ئاوابوونی خۆر یان ئەستێران حیسابی خۆی رادەگرت، بەرزی خۆرو ئەستێران و بڵند بوونیانی بە باری (باڵ) خۆی دەپێوا[٤] شوێنی هەڵاتن و یاخود ئاوابوونی بەقووچەک یان دیاردە سروشتییەکانەوە نیشان دەکرد[٥] لەوەش وردتر، تێبینی کۆچ و رەوکردنی پۆل پۆلی باڵندە کێوییەکان و وەدەرکەوتنی جروجانەوەرو خشۆکەکانی دەکرد، چۆتە دەشت و دەرو تێبینی گیاو گوڵ و رووەکی خۆرسکی کردووە، سەرنجی داوەتە پەڵە کەوتن و (پەردان) و خاکی هەڵکۆڵیوەو قوڕتی لێداوە تا بزانێ بە چ ئەندازەیەک ئاوی باران لە نەرمایی یان لە چەقێندا خاکی پاڵاو کردووە، سەرنجی داوەتە ئاراستەی هەڵکردنی با و چرپی و رەنگی هەور!! هەموو ئەوانە رێنمایی کەشناس لەبریتی ئامرازی تازە بابەتی تەکنۆلۆژی لەلایەن باخورەوە حیسابی بۆ کراوە... سەبارەت بەوەی کوردستان خاکێکی لێکدابڕاوی هەیە بەپێی باری تۆپۆگرافیاوە کە شاخ و چیای ئەستەم و عاسێ و دەشتی کاکی بەکاکی هەیە، بۆیە جیاوازییەکی زۆری پلەکانی ئاو و هەوای جۆراو جۆری هەیە، لۆیێ دەبینین لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان حیساب و ساڵنامەی خۆجێیی هەیە، تەنانەت لە زۆر جێگادا روانگەی کەشناسی و ئەستێرەشوناسی وردو گرنگ هەیە... لەوانە: کێڵەشێن یاخود کەلیخان، گراو، گڵەزەردە، بارێ، دۆڵپەمۆ، کانی توو، کانی کەوان، کەناروێ، چەمپاراو، گەرماوان، گردەسوور، لاجێن، دێنەودر، دەشتی هەولێرو بناری چیای قەرەچووغ.. بێگومان ئەوانە دابەش بوونەتە سەر سێ پارچەی کوردستان، ساڵنامە، ئاسایی لە کوردەواری بەحیساب ناوی دێت، ئەگەرچی هەندێک لەو حیسابانە لەگەڵ هەندێکی دیکەیان یەکتر دەگرنەوە[٦] ئەوانەی پتریش گرنگن و باسیان لێوە دەکرێ، بریتین لەحیسابی گەرمیان، حیسابی کوێستان (لەیلاخ)، حیسابی سێ مانگە، یان بەهاری هەروەها حیسابی کەلیخان و حیسابی رۆمی... رۆمی لەناوەکەی دیارە هەروەکو حیسابی زایینییە تەنانەت ناوی مانگەکانیشی، تەنیا یەک جیاوازی هەیە کەوا (١٥) پازدە رۆژ لەپێشترە، ئەوە ئێستا بەتەنیا لە باکووری کوردستان باوی ماوە[٧] بێگومان هەر یەکی لەو حیسابانە، لەدەست پێکردنەدا لەیەکتر جودان، ئەویش سەبارەت بەوەیە لەناوچە کوێستانییەکاندا زووتر زستان دێت و درەنگتریش کۆتایی دێت، واتە بەهاریش درەنگتر دەست پێدەکات لەچاو گەرمیان و دەشتاییەکانەوە.

حیسابی دەشتاییەکان حیسابی سێ مانگی

بەهارییەو لەیەکەم ڕۆژی نەورۆزەوە سەری ساڵە.. بەڵام بەپێی حیسابی گەرمیان شەش حەوت (٦-٧) ڕۆژ لەپێشترە و بە پێچەوانەش حیسابی کوێستان شەش حەوت (٦-٧) ڕۆژ لەپاش دەشتاییەکانە، بۆیە جیاوازی نێوان کوێستان و گەرمیان (١٢-١٤) ڕۆژە، بەڵام حیسابی کەلیخان تەنیا ڕۆژێک لەپاش حیسابی دەشتاییەکانەوەیە، بەتایبەتی حیسابی دەشتی هەولێر.

شایانی باسە حیسابی گڵەزەردەش هەروەکو حیسابی گراوو دەشتی هەولێرەو هاوکاتە لەگەڵ ساڵنامەی جەلالیی فارسی، ئەویش سەبارەت بەوەیە سەری ساڵی کوردیان بەگوێرەی سووڕانەوەی خۆرو ئەستێرانەوە دەستنیشان کراوەو ساڵنامەی فارسیش بە گوێرەی ڕێکەوتن لەگەڵ ئەستێرەی کەلووەکانی زۆدیاکەوەو سەرەتاکەی لەو ڕۆژەیە، کە خۆر دەچێتە کەلووی شەک، هاوکات لەگەڵ ئاوابوونی خۆر لەنێوەندی جێگاکانی ئاوابوونی کۆمەڵە ئەستێرەی تەرازوو و ئەستێرەی گەلاوێژ! ئەوە بەپێی حیسابی کانی کەوانیی دەو بەستۆڕەی، بە قسەی مام عەزیزی عەولاغای گەردی کەوا بنەدارەکەی دارەشەکرانییان قووچەکی جێگای ئاوابوونی[8] تەرازوو لە باکوور و گەلاوێژ لە باشووری دارەکە، ئیدی هەر ناوچەیەک بەپێی حیساب و ڕوانگەکانی خۆیان دەست دەکەن بە ساڵژمێری، هەفتەیەک زووتر یان هەفتەیەک درەنگتر، بۆیە دەشتاییەکان دەبنە خاڵی هاوسەنگ و تێکڕایی ئەو حیسابانەو ڕۆژی یەکەمی مانگی بەفرانبار یەکەم ڕۆژی زستانەو هەروەکو لە ڕوانگەی گراویدا قووچەکی تایبەت بەو حیسابە هەیە بەناوی دەشتی قەراجی و دەشتی هەولێر... بەو جۆرە لە یەکەم شەوی زستاندا بەردەسێرە بەئاگری بەردەستێ دەکراوەو ئەو ئاگرەی ناو ئەو ئاگردانە کوژ نەدەبووەوەو وایان دەکرد هەر بمێنێ لەبەر نەبوونی شقاتەو چەرخ وەکو ئێستا، تەنها بەردەستێ هەبوو بۆ ئاگردان، ئەویش هەموو ماڵێک نەیانبوو! بۆیە خەڵکی ئەو حەیامی بۆ ئاگر وەرگرتن دەچوونە ماڵی یەکترو مشکی (خۆڵە مێش)ی ناو ئاگردانیان دەبرد، فوویان لێ دەکردو گەش دەبووەوەو ئاگری لە سووتەمەنی ئەو کاتی بەردەدا... بەوکارە دەگوترا (ئاگردان کوژ نەبوونەوە)، واتە ئاگردانەکە خۆڵەمێشەکەی تینی گەرمی ئەوەندە مابێت بتوانرێ ئاگری دیکەی پێ داگیرسێت و ئەو کارەش ئێستا وەکو زاراوەیەک بەکاردێت، وەک بڵێین (ئاگردانیان کوژ نەبۆتەوە..) ئیدی ئەوە بەردەسێرەو لە شەوانی زستاندا خەڵک لە دەوری خڕ دەبوونەوەو کێ لە هەموویان ماقووڵتربایە، ئەوا ئەو لە هەمووان نزیکتر لە بەردەسێرە دادەنیشت... ئەنجا هەستی خۆیان لە باخۆرە ڕادەگرت و ئەویش دەیگوت:

یەک جار بە زستان دەڵێن سارده[9] ئیدی (بەرەی فەقیری دەدڕاو) و خەڵک تەواو دەکەوتنە ئامادەباشی و خۆیان خڕ دەکردەوە، حازرو تەیار بەرامبەر پێشوازی سارد و سڕی، ئەگەرچی ساڵ هەیە زستانی لەبەراییێ توند و دژە، بەڵام دواییەکەی خۆشی دەکات، یاخود بە پێچەوانەوە بەراییێ خۆش و دواییەکەی دژە. بۆیە دەڵێن: زستان یان سەروەشێنە، یان دواوەشێنە[10].

کەشناسی و باخۆرەکان سەبارەت بە ئاراستەی جوولەی هەورو خێراییەکەی زانیویانە، داخوا باران دەبارێ یان نا؟ گوتییان:

**هەور ڕۆیی لۆ بادینان، مێگەلان بیننەوە کادینان**[11].

واتە باران دەبارێت و ماڵاتان بێننەوە ماڵێ و ئالیکیان بدەن، یان گوتراوە:

**هەور ڕۆیی بۆ شارەزوور، کاروان بڕۆ بۆ ڕێگەی دوور**[12].

واتە بێ ترس بە باران نابارێت. هەر دەرهەق بە بارانەوە دەڵێن:

**زستانان خۆ تاخیر مەکە، بواران خۆ تەڕ مەکە**[13].

واتە زستان ئاسایی باران دەبارێت، کە باریش مەرج نییە زوو لێی بکاتەوە! بۆیە ئەگەر ئیشتان هەبوو ئەوا بیکەن و ڕاگیری مەکەن!، بەڵام بواران باران گەوارەیە دێ و دەڕوا، بۆیە کە لێی کردەوە ئەنجا بڕۆن... کە دوو هەفتە بەسەر زستان ڕابرد، واتە لە (١٥)ی بەفرانباری بە حیسابی دەشتاییەکان، کە بەرامبەر (٥)ی کانوونی دووەمی زایینییە، ئاگری بەردەسێرە کرفەی دەکا.. بەفر دەبارێ سارد و دژی دەکا، لەو شەوانەڕا باخۆرە لە مەجلیساندا هەر ئەو برا گەورەیە!! لەو ڕۆژەدا هەفتەکانی (بێرو بێنردە) دەست پێدەکەن، بە گوێرەی هەندێ

حیسابگەریش بە هەردووكیان هەفتەیەک دەبن و درەنگتریش دەست پێدەكات.. هەر چۆنێک بێ، تاكو (٢٨)ی بەفرانبارێ (١٨ ی كانوونی دووەم) درێژەی هەیە، كەوا سەرەتای دەستكردنە بە رامالێنی بەفری سەربانان و نێو حەوشەو تەویلان، بێڵە بەفر (بێر) بەكاردێت و رۆژ لە رۆژ ساردتری دەكات، بە جۆرێكی ئەوتۆ ئەگەر بێڵەكە زوو هەڵنەگیرێتەوە بە بەفرەكەوە بەند دەبێ.. بۆیە بەو حەفتانە دەڵێن بێرندە یاخود بێڵندە، چلەی زستانیش لە (٢٦)ی بەفرانبارێ دەست پێ دەكات، چونكە چلە چل رۆژەو مانگەكی رێبەندانەو هەربەكە لە مانگەكانی پێش و پاشیشی (٥) رۆژی وەردەگرێ.

بەند و بەندرخە لە (٢٩)ی بەفرانبار (١٩/ی كانونی دووەم) تاكو (١٢)ی رێبەندانێ (١/ی شوبات)، ئەو دوو حەفتانەو حەفتەی پێشتریش سەرەتای گیران و بەندبوونی رێگاكانی هاتووچۆیە و ئیدی هاتوچۆ نامێنێ و كاروانچی رێگایان لێ دەگیرێت، بۆیە ناویش لەو مانگە نراوە رێبەندان، بەندرخەش راستییەكەی بەرخندەیە، چونكە كەش ئەوەندە سارد دەبێ و كار لە بەرخی ناو سكی مەڕی ئاوس دەكات و دەیكوژێت مەڕەكە بەرداوێ.. واتە بەرخەكە لە ساردییان بەندبوو... لە باكووری كوردستان، بە گوێرەی ساڵنامەی رۆمی حیسابێكیان هەیە، بەناوی (خاچ)، كەوا لە (٧)ی كانوونا پاشین (٢١/كانوونی دووەمی زایینی) و یەكەم رۆژی مانگی رێبەندانە لە حەفتەی بەندا، خاچان داوێنە ناو ئاوێ و بەختی خۆیان پێ تاقی دەكەنەوە، تاكو بزانن زستانەكەیان داخوا چۆن دەبێ؟ ئیدی لە رۆژی خاچەوە تا (٢١)ی كانوونا پاشینی رۆمی بەرامبەر (٤/شوباتێ) و (١٥)ی رێبەندانێ بە (خدر نەبی) ناو دەبەن.

**خاچ و خدر نەبی وای ل حالێ وی ل مالا خوە نەبی.**
**شەڤ هەبی، تاشتێ توو نەبی[١٤].**

ماوەی نێوان خاچ و خدر نەبی دوو هەفتەیە و زۆر ساردو دژە و شەوانیش ئەگەر بەفرو باران نەبێ، ئەوا دەیكاتە سایەقە، كەوا بای باكوورە و زۆر ساردە و ئاو و قوڕ لە دەرەوە شەختە دەگرێ و دەیبەستێ. مەبەستیش لەو بەندەی سەرەوە ئەوەیە، هاوار لە حاڵی ئەو كەسەی لە شەوی وەهادا لەماڵی خۆی نەبێ و خواردنی هێوارتێ هەبێت و هی سبەینێ نەبێ..

واتە سەرما ردقی دەكاتەوە!. هەروەها لە باكووری كوردستان لە دەڤەری هەكاریدا لە (٣٠)ی كانوونی دووەمی زایینی شەوێكیان هەیە بە ناوی (شەڤزەنگل) كەوا بێشک هەموو ساڵێ لەو شەوەدا بەفرێكی یەكجار زۆر دەبارێ و لە بەرایییدا پێش ئەوەی ناوی لێنێن شەڤزەنگل و ئەو تاقیكردنەوەیان لەسەر هەبێ، سەربردەیەكی لێ دەگێرنەوە، كەوا باخۆرەیەكی پیر زانییەتی كە شەوی ساڵێ ئەوێ ساڵێ چی روودەدات!! بۆیە هەر زوو خۆی بۆ ئامادە دەكات و سووتەمەنی دار و كوڵكەدار دادەگرێ و بۆ ئەو شەوە (گایەک) رادەگرێ!! دیارە كابرا سێ كوڕی بە ژنی دەبێت و سەر لە هێوارتێی ئەو شەوە گایەكە دەكوژێتەوە و بووكەكانی لە مەنجەڵی گەورە گەورە ئاگری دەدەنە بنێ... كابراش زەنگوڵەكی بەسەری دارەكی دوو بست درێژەوە دەبەخێ، بەنیازی ئەوەی لەسەربانی بیچەقێنێ و زەنگوڵ بە با و زریان بلەرێتەوە، ئەوانیش لە ژوورەوە گوێیان لە زرینگانەوەی بێت، هەركاتێكیش بەفر دوو بست باری ئەوا دەگاتە زەنگوڵەكەو دەیگرێ، بەوەوە زرینگەی زەنگوڵ دەوەستێ و ئەوانیش لە ژوورەوە تێدەگەن ئەوە بەفر دوو بست باریوەو گەیشتۆتە زەنگوڵەكە، تومەز ئەوە تەگبیری پیرەمێرد بووە، ئیدی شەو دادەكاتە بەفر بارین و ئەوانیش لە ژوورەوە لەبەر ئاگر بە بەردەوامی خەریكی گۆشت خواردن و خۆ گەرمكردنەوە دەبن... لەگەڵ وەستانی دەنگی زەنگوڵ كابرا، یەک لە كوڕەكانی دەنێرێ بەفرماڵی بكەن... ئەنجا بەو جۆرە تا سبەینێ و بەفر لێدەكاتەوە بەنۆرە بەفرماڵی دەكەن و گۆشت دەخۆن... و بڕەكیش خۆ دەحەسێننەوە... كە بەیانی دێنە دەرەوە دەبینن گوند هیچ دیار نییەو بەفر دایپۆشیوە، تەنها ئەوان بەخۆیان بەساغ و سەلامەتی ماونەتەوە، ئیدی لەو رۆژەوە، ناویان لەو حیساب و رووداوە ناوە شەڤزەنگل[١٥].

شەوی پاش ئەو شەوەش، واتە (٣١)ی كانوونی دووەم بەرامبەر بە (١١)ی رێبەندانێ، هەر توندو دژو سامناكە هەر لە دەڤەرەكانی باكوورو هەكاری دایەو بە

(هەیهۆت) ناسراوە:

**هەیهۆت و هەیهۆت**
**سەرمە ڤەچوون**
**هەرچار هەیڤێت جوت**
**بابێ ئێکێ چوو کوڕ فرۆت**
**دا ب کەزوانەک و کەڤۆت**

یاخۆ دەڵێن:

**هەیهۆت هەیهۆت**
**هاتن هەردوو هەیڤێت جوت**
**بابێ کوڕ فرۆت، دا ب دارو سۆت**
**دایێ کچ فرۆت، دا ب کەزوان و کەلۆت**(١٦).

هەیڤ جـوت مـەبەست هەردوو (چریا پێـشین، چریا پاشین) و هەردوو (کـانوونا پێـشین، کـانوونا پاشین)ن. (چریا پێـشیێ-تشـرین الأول) و (چریا پاشین تـشـرین الآخرە)یە... کە لە رەسەندا مانگەکانی رۆمی و سریانییە، چونکە لە زمانی عەرەبیدا دەنگی (چ) هێمای نییە، بۆیە هەر بە (تش) نووسراوەو بووەتە (تشرین) کە لەراستیشدا نەدەنگی (ت)و نە دەنگی (ش)ی تیـــادا هەیە...و عەرەبیش هەر لە رۆمی و سریانی وەرگرتووە، سەرچاوەکەی (چری) (تشـرین)و ئەنجـا (ین)ی دووانەی عـاردبی پێ لکاوە.(کـانوون الأول والآخـرة)ش هەر وەکـو خـۆیان ماونەتەوە.. با لەبیر نەکەین هێشتا هەر لەسەر حیسابی حەفتەکانی بەندو بەندرخە داینەو لێرەش لای خۆمان کەش زۆر دژو زەیقەتە، ئەگەر چی ساڵ هەیە خۆشە.. بەڵام ئەو حەفتانەو مانگی کانوون هەر حیسابی خۆیان دەکەن، ئەگەر تەنیـا لۆ یەک رۆژیش بێ!! بەندەک هەیە لەسـەر زمـانی گیسکە نێری دەبێژرێ و دەڵێ:

**ترن ترن... کانوونێ**
**ئەورۆم خۆشترە لە دوونێ**
**هێشتا بەزم مانە لەقوونێ**(١٧).

بەو قسانەی گیـسکە نێرێ، مـانگی کـانوون حێـدزو توورە دەبێ، بۆیە لە حـەژمـەتان داوای رۆژەکێ دەکـا لە مانگی شوباتێ، بەڵکو بەقەرد بیداتێ و حەقەسای خۆی لە گیـسکێ بکاتەوە.!! بۆیە دەبینین، بەندرخـەش رۆژێکی دەکـەوێتـە بەر (١)ی شـوباتێ.. ئەنجـا زۆر دژی دەکـات و گیـسک خۆی لەبەر ساردی ئەو رۆژە ناگرێ و پەشیـمـان دەبێـتـەوە لەو قـســانەی بەکـانوونێی گـوتبـوو و داوا لە کانوونێ دەکات وازی لێ بێنێ. مێردم و ئۆغەن لە (١٣)ی رێبەندان (٢-شـوباتی زایینـی) تاکـو (٢٦)ی رێبەندان و (١٥)ی شـوبات، ژن و مـێردێکن و سـەربردەکەیان بووەتە کاتی ناسینەوەی ئەوسەرودەختە، کە کەش و هەوا بێن بێنە، واتە خۆش دەبێ و دەبێـتـەوە باران و ساردی لە حەفـتـەی یەکـەمـدا (مـێـردم) سـاردی و زەیقـەتی توندترە.. لە دەڤەرەکانی سلیڤا و مووشێدا لە باکووری کوردستان بەپێی حیـسـابی رۆمی، واتە (١٧)ی ئاداری رۆمی بەرامبـەر (٤)ی شـوباتی زایینی، حـیـسـابەکـیـان هەیە بەناوی (هڤدە)و دەڵێن:

**هڤدە خەرجی، عەیش نەدەرچی**
**جەژنا هڤدە دەرباز بوو، دیسا عەیشێ دماڵ د ما**
**قسمەتێ وێ ڤەنەبوو...**(١٨).

پیت و پارۆسـیش لە (٢٧)ی رێبـەندان (١٦)ی شوبات تاکو (١٠)ی رەشەمێ (١)ی ئاداری زایینی...

**پارۆس یان پالۆز، دەگوترێ:**
**پیت و پالۆز، ساڵ بوو ئالۆز**
**پیت لە خۆی ڕیت، ئەگەرنا بەکەرتک دەبیت.**

مـەبەست ئەوەیە زۆر سـاردە، چللەش بەرەو دواهاتنە، ئەنجا هەوا خۆشتر دەبێ و دەڵێن:

**پیت ساڵی کرد فیت.**

لەو حـەفـتـەیە هەوا دەبزوێ یاخـود دەجـمێ و تێنی سـاردی دەشکێ، کـەوا لە رۆژی (١)ی رەشـەمێ (پەنگری هەوا) دەکەوێ...

بەتێپەڕینی حەفتەی پیت چللەی زستانیش لە (٥)ی رەشـەمـەدا کۆتایی دێ و ئەو رۆژەش دەسـپێکی حەفـتـەی پالۆسە.

**پاڵ دەپاڵێنێ**
**یان پالۆز ساڵی کرد ئالۆز.**

لێرە بەدواوە ساردو سڕی بەیەکجارەکی نامێنێ، مەگەر بەرێکەوت! لەو حەفـتـەیە لە (٨)ی رەشـەمـەدا (پەنگری ئاو) دەکەوێ و ئاو تەزی ساردی دەشکێ.

لە دەڤەری هەکاری حیسابەک هەیە لە (٢٠)ی شوباتدا،[١٩] کە لە پیت و پارۆس دایە، ئەویش کۆچ و رەوکردنی پۆل پۆلی باڵندەی کێوییە، کە بەسەر ئاواییەکاندا رەت دەبن.

هەروەها لە (١٤)ی شوباتی رۆمی بەرامبەر (٢٧)ی شوباتی زایینی، دەکەوێتە کۆتایی حەفتەی پالۆس و پێی دەڵێن (رۆژا ئاگر) لە دەڤەری بەدلیسێ خەڵک (ئێزنگێ هیشکی داران) کۆدەکەنەوە، کە پێی دەڵێن (خترە)، لەو رۆژەدا ئاگری دەکەنەوە و کەیف و سەیفێ دەکەن بەپێی داب و نەریتی خۆیان، خۆیان لە گوناحان پاگژ دەکەنەوە[٢٠]. هەر لە هەکاریدا حیسابەکی دیش هەیە بەناوی (زیپ) یان (زیپک)، کەوا دوو (زیپک)ن، زیپێ شوباتێ و چوار رۆژ دوای مانگی شوباتە، زیپێ ئادارێ، ئەویش چوار رۆژی بەرایی مانگی ئادارە[٢١] ئیدی لەو ماوەیەدا هەموو خەڵک کیژ و کوڕ، ژن و پیاو، گەورە و گچکە، دەچنە زیارەتان لە شێوەی کەرنەڤاڵێکی، شتی کۆنە فڕێ دەدەن بە مرازی وەی دەردو بەڵاو خەفەت لەگەڵیان بڕوات[٢٢].

ئەنجا نۆرەی خدرو ئەلیاسی دێ لە (١١)ی رەشەمێ (٢)ی ئادارێ تاکو (٢٤)ی رەشەمێ (١٥)ی ئادارێ. لۆ ئەوەی ئەو ماوەیەی ئاخرو ئۆخری زستانێ بەو ناوە دەبەن، وەکو ئەوەی کو حەزرەتی خدرو ئەلیاس بە هانای خەڵکەوە دێن... ئەوا لێرەشدا دیسان بەهانای خەڵکەوە دێن و لە ساردوسڕی و مەترسی زستانێ رزگاریان دەکات، و سەرما خەلاس دەبێ و زستان تەواو و ئەوە هاتنی بەهارێیە، لە حەفتەی یەکەم (خدر) پەنگری عارد یان (خاک) دەکەوێ لە (١٥)ی رەشەمەدا کەوا تەزیی ساردی خاک نامێنێ و لەرۆژانی هەتاودا سەگ لەبەر هەتاو لەبەر گەرمی خۆی راناگرێ و دەچێتە بەر سێبەرێ..

خاک نێر دەبێ.. کە لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا دۆمبەڵان و کوارگ و (قارچک) و فسۆس پەیدا دەبێ، فسۆس بابەتێکی رووەکە لە چەشنی دۆمبەڵانی بچووکە... لەکوردەواریدا بە حیسابی دەشتاییەکانی، ئەوە حیسابێکی هەیە کە عارد (نێر) دەبێ یاخود دەڵێن (عارد بە فاڵ) دێ... مەبەستمان لەو چەند رۆژانەیە، کەوا دوو کەشناسی گرەو دەکەن داخوا لە چ رۆژێک (عارد بە فاڵ) دێت؟... بێگومان هەردووک زۆر شارەزاو پسپۆر بوونە، یەکێکیان رۆژێک لەو ماوەیە دیاری دەکات کە، دۆمبەڵان پەیدا ببێ، ئەویدیکەش لە دڵی خۆی هەمان رۆژ دیاری دەکات، بەڵام ئەوەیان سوور دەزانێ لەو ماوەیەدا باران نابارێ!!... ئەوەی یەکەمیان لە دیاریکردنی رۆژەکەی خۆی مکوڕو دڵنیایە، بەڵام چاوەڕوانی تاوە بارانێکە... کەچی باران نابارێ!! بۆیە بەشەو یەک دوو کوندە ئاو دەباتە ئەو جێگایەی کە دەزانێ دۆمبەڵان دێنێ و بەقەد راتەوراندنی ولاغێک ئەو ئاوە دەرشێنێ و هەر بەو شەوە دێتەوە ماڵ... بۆ بەیانی لەخەو هەڵدەستێ و پاشان لەگەڵ چەند کەسێکی دی و کابرای رکەبەری دەچنە ئاقار، کەوا ئەو رۆژە رۆژی دیاریکراوە و هەردەبێ دۆمبەڵان ببێ، کەوا (عارد بە فاڵ) هاتووە! کابرای دیش دڵنیایە هەمان رۆژە، بەڵام ئەو دڵنیایە دۆمبەڵان نەبووە، چونکە تاوە بارانێک عاردی لەو شەو و رۆژەدا نەڕشاندووە، بۆیە هەر زۆر مکوڕە... بەو جۆرە هەردووکیان پسپۆڕ و زانان، هەریەکەشیان لەسەر بۆچوونی خۆی سوور و مکوڕن....

وردە وردەو پێ بەپێ ئاقار و هەردی ئاواییەکەی خۆیان بەسەر دەکەنەوە و کابرای یەکەم پێ بەپێ جڵەوکێشیان دەکاتە ئەو جێگایەی شەو ئاوڕشێنی کردووە! دەبینن دۆمبەڵان هەڵی داوە، هەندێکیان دەڵێن ئەوە چووزەرەی کاردی و گلێخەیە!! کە دەستی دەگەینێ دەبینن هەوە!! دۆمبەڵانە! کابرای دووەم سەری سوڕدەمێنێ و دەڵێ: کاکە ! ئەتوو گرەوی خۆت بردەوە..! ئەنجا دەڵێ، ئەمن تەنیا یەک پرسیارت لێ دەکەم ئەتوو چت کردییە؟! چونکە ئەمن وەکی توو باش دەزانم ئەوشۆی چووی عارد بە فاڵ بوو!! بەڵام بەبێ ئاو!! بەبێ نمە بارانەکی، زۆر زەحمەتە!! ئیدی لێرەدا کابرای یەکەم راستییەکەی پێدەڵێ! کەوا کاکی من ئەتووش زۆر راست دەکەی! دۆمبەڵان نەدەبوو!.. بەڵام لە بارەکی شەوێوە ئەمن یەک دوو کوندە ئاوم هێناو ئەلێرانەم رشاند!!![٢٣]

ئیدی لەو ماوەیەدا زۆربەی زۆری رووەکە خۆڕسکەکان شین دەبن، کوردەواری زۆریان بۆ خواردن یان بۆ چێشت و داو و دەرمان بەکار دەهێنێ، لەوانە (کاردی و کەنگر)..

کورد دەڵێ:
**کە هات خدر**
**عارد دەبێ پەنگر**
**پەیدا دەبێ کەنگر.**

یان دەڵێن:
**خدر ساڵ ما پتر**

مەبەست لەوەیە جار بەجار شەپۆلی ساردی هەڵدەکات و جاریش وایە بەفر دەبارێ، بەڵام مەترسی نییە، چونکە ئەو بەفرەی لەو دەمە دەبارێ زۆر نامێنێتەوە و دەتاوێتەوە، لەناو کۆچەرییەکانی (کیکان) لە باکووری کوردستان دەڵێن:

**ئاداری، بەرف هات گولیێ داری**
**سبە لێ نەبوو ئێڤارێ**

یان دەڵێن:
**ئاداری بەرفێ دا گولیێ داری**
**نەما هەتا ئێڤاری[٢٤]**

لە (٩)ی ئاداری هەر لەو دەڤەرانەدا، ئەگەرچی زۆر ساردیش نییە ئاگر دەکەنەوە و دەڵێن: (ئاگر خوەشی)و لە دەڤەری ماردین دا لە (١٣)ی ئاداری بەپاشەوە حیسابێکیان هەیە بەناوی (گیسک فەتسین) یان (گیسکۆ گورێ) کە لە رۆژانی دوایی حەفتەی ئەلیاس دایە... گژوگیا تەواو پێدەگات و مەڕو ماڵات تێر لەوەڕ دەبن کژ خۆش دەبێ... کوردەواری لە زمانی کار (کارژیلە) قسە دەکات.. کەوا کارو گیسک لەسەر کەندەڵان و جێگای بڵندو لات و تەلاندا گەمان و بازدانێ دەکەن... و تەشقەڵە بەمانگی شوباتێ دەکاو دەڵێ:

**ترت و ترت سباتۆکێ**
**دەرکەتم ئادارۆکێ**
**من خواری کانگلۆکێ**

بەو جۆرە مانگی شوبات بەقسە دێت و دەڵێ:
**خوەهێ منێ ئاداری**
**بدە من دوو رۆژێن خەداری**
**دا ئەز کاریکێ**
**ژسەر لاتێ بینم خواری[٢٥]**

دوو رۆژان پێش ئەو حیسابەش لە (١١)ی رەشەمێدا، بەتاقیکردنەوە هەموو ساڵێ نەرمە بایەک هەڵدەکات، کە (١٨) رۆژی بمێنێ بۆ رۆژی نەورۆز، کە بەبای وادە (وەعدە) ناسراوە و پێشی دەگوترێ (بای وەشت) ئەوەش وەکو نیشانەی هاتنی نەورۆزییە، بۆیە مەولەوی شاعیر دەڵێ:

**نیشانەی نەورۆز وادەی وەهارەن**
**یا نەشئەی ئامای نامەی نیگاران[٢٦]**

ئەو بایە بەفر دەتاوێنێتەوە و شەختە دەکاتەوەو لەو کاتانەدا پەنگرەکانی دەبزوون، هەروەکو حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

**بای وەعدە بەفری بردەوە**
**یەخبەندی کردەوە**
**خەملیوە گوڵ**
**شەراراتی جەمرە مردەوە[٢٧]**

شەراراتی جەمرە مەبەستی پەنگرەکانە (هەوا، ئاو، خاک) گیاوگوڵ و پاوان و لەوەڕگە دەرسکێن، ماڵات و گیانەوەران تێر دەخۆن:

**لە (١٨)ی ئاداری**
**مەلەک ئیزن دەدەن گیای بەهاری**

یاخود دەڵێن:
**(٢١)ی ئادار**
**سەری دارو بنی دار**
**تێر خواردنی بزن و کار[٢٨]**

بەو جۆرە بە رۆیشتنی حەفتەی ئەلیاس ساڵیش خلاس دەبێ و دەڵێن:
**ئەلیاس، ساڵی کر خلاس.**

خدر و ئەلیاسیش بەر چلە ناکەون، لە ئاخرو ئۆخری مانگی رەشەمەدا خەڵک دەچنە بەر بەرۆچکە (بەرهەتاو)و رەنگی دەم و چاو مەیلەو رەش هەڵدەگەرێ. بەتایبەتی

ئافـرەت، پتـریش لە ناوچەی هەورامـاندا بۆیە دەڵێن: (رەشـەمێ)، سـەبارەت بەرەش داگـەرانی سـەروچاوی ئافرەتان، لە دەشتی هەولێریش دەڵێن: (رەشەمە)، کەوا کاتی بەفاڵ هاتنی یان بە با هاتنی پۆلی پشیلەو ڕێوی، کە پشیلە لە ئاوایـیدا وارە وارو شەڕە پۆپەیەکی وادەکەن و بەشەڕدێن، ئەوەش وای کردووە هەندێ کەس بۆ ئەوە بچن بڵـێن: رەشـەمێ لە (شـەڕەمێ)وە هاتبێ... ئیدی بە کـۆتا هاتنی حەفـتەی ئەلیاسیش لە (٢٤)ی رەشـەمێ، تەنیا (٥) رۆژمان دەمـێنێ ساڵ تەواو بێ و سەرەتای سـاڵێکی دیکە بە رۆژی نەورۆز دەست پێـبکاتەوە، ئەگـەرچی لە سـاڵی پێردا (٦) رۆژمـان دەمـێنێ... لە کـوردەواریدا بەو مـاوەیە دەگـوترێ بازەبەران، کـەوا هەمـوو رۆژێک خـۆر بەبڕێکی پتـر لە جـاران جـێگای ئاوابوونی خـۆی دەبەزێنێ..[29] بە گوێرەی حیسابی فەلەکناسان، ئەو پێنج رۆژە بەدەرە لە ساڵنامەدا سەبارەت بەوەی پلەکانی دائیرەی زۆدیاک (کەلودکان) (٣٦٠) پلەنەو بەرامبەر بە (٣٦٠) رۆژی ساڵنامەو ئەو پێنج رۆژەیان ئایاغ کردووە، تەنانەت نەیانخستۆتە ناو کاروباری کارگێڕی و یاساییەوە، بەڵکو هەر بە ئاهەنگ بەسەریان بردووە.

کـوردیش[30] ئەو (٥) پێنج رۆژەی بە (تار) ناو بردووە، سـەرەڕای بازەبەران و خـراوەتە دوا رۆژەکـانی سـاڵنامەوە... ئەگەرچی هەن دەیخەنە پێشـتر، بەڵام هەر دەکەوێتە دواییەوە... هەروەکو مەولەوی شـاعیریش ئەو رۆژانەی خستۆتە دواوە، کە دەڵێ:

**وەی من دیارەن پەنجەی تارمەن**
**سەرومخت ها من نەو وەهارمەن[31]**

لەو چەند رۆژانەش خـۆر لە هەوڵی ئەوەدایە بگاتەوە ئەسـتێرەکـانی تەرازوو و گەلاوێژو لە جێگای ئاوابوونی واندا ئاوابێت، وەک بڵـێی پێشـبڕکێ بکەن، ئەوەش بە (شەڕی خۆرو تەرازوو) ناسراوە، کەوا لەو رۆژانە خۆر لە جێگای ئاوابوونی ئەسـتێرەکانی تەرازوو دەترازێ و تاکو لەدوا رۆژی مـانگی رەشـەمـێدا سەر لە هێـوارێ کـە خۆر ئاوادەبێ، ئەوا لە جێگەیەکدایە بە پێوان دەکەوێتە نێوەندی جێگای ئاوابوونی ئەسـتێـرەکـانی تەرازوو و ئەسـتێرەی گەلاوێژ، کە لەهەمان شەودا ئاوادەبن، ئەوەش ساڵێ تەنها یەک جـار روو دەدات و هەر ئەو شەوەش سـەر لەئێـوارێوە ئاگـری نەورۆز دەکرێتـەوە... کە شـەوو رۆژ بەرامـبەرن و هەریەکەیان شـەش بارن، واتە شەو و رۆژ دوازدە بارەو هەر بارەکی بەرزایی ئاسمانیش بەرامبەر بەگۆشەیەکی (٣٠) سی پلەکییە و یەکسانە بەدوو کاتژمێری ئێستا.

بەوەوە رۆژی نەورۆز یەکەم رۆژی ساڵنامەکەمانە، کە خۆی تەنیا تاکە رۆژێکە و چەند جیاکەرەوەیەکی تایبەتی هەیە لەگـەڵ هەمـوو رۆژەکـانی دی سـاڵنامـەو هەر ئەو فاکتەرەشە وای کردووە سەری ساڵی کوردی و ساڵنامەکەی بێت... لەدەڤەری هەکاری بەندێک هەیە دەڵێ:

**نەورۆز نەورۆزا کالانی**
**دار گۆپالێ خوە هلانی**
**زڤستان و بهار ژ هەڤ دەرانی**

هەروەها سەبارەت بە مانگی ئاداریش دەڵێن:

**ئادارە دەول دارە**
**نە ل ڤرل کەوکەب و سنجارە**
**ل باشڤانێ خومال**
**ل کەبانیا بکارو بارە[32].**

### پەراوێزەکان

(١) یەکـەمین گـوندێک کـشـتـوکـاڵی لێک رابێ لەسـەرەتای شـارسـتـانیـیـەتەوە گـوندی (قـەڵا چەرمـو) بووە لەنزیک چەمچەماڵی ئێستا لەنێوان کەرکوک و سلێمانیدا.

(٢) ئەحمەد کوڕی ئەبوبەکری وەحشیەی نەبەتی کلدانی سـاڵی (٤٢١)ی کـۆچی پەرتووکـێکی داناوە بەناوی (شـوق المستهام في معرفة رموز الاقلام)، کە تێیدا باسی نووسینی مـاسی سۆزاتی کوردی لە هەزارەی سێیەمی بەر لەزاینی و دەڵێ: سی دانە پەرتووکم لە گـۆڕسـتـانێکی شاری بەغدا دیوە، کە بە زمان و رێنووسی کوردی نووسرابوون و ئێستا من لەشام وا دوو لەو پەرتووکانەم وەرگێـڕاوەتە سـەر زمـانی عەرەبی، یەکێکیان باسی کەشناسی و دۆزینەوەی ئاوی ژێر زەوییەو ئەوەی دیکەش باسی چاندنی دار خورمایە... بۆ پتر

شارەزایی بڕوانە گۆڤاری ڕەنگین ژمارە (١١٧)ی ١٩٩٨ ناونیشانی (کوردیش کاتی خۆی پیتی پێنووسینی خۆی هەبووە) محەمەدی مەلا کەریم.

(٣) باخۆرە: کەشناس: حیسابگر ئەو کەسەیە شارەزایی لە گۆڕانکارییەکانی کەش و هەوا بێت و حیسابەکانی کوردەواری شارەزا بێت، دەربارەی ناوی (باخۆرە) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٦).

(٤) گۆڤاری کاروان ژمارە (١٠٩) ساڵی ١٩٩٧ لە نووسینێکمدا /نەورۆز لەڕوانگەی فەلەک شوناسییەوە... ل: (٧).

(٥) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٨) ساڵی ١٩٨٥، دۆزینەوەی ڕوانگەیەکی ستێرناسی کوردی لە گوندی گراو/عبدالرقیب یوسف ل٢٤٢.

(٦) سەرچاوەی پێشوو.

(٧) بە بەراوردی نێوان مانگی ساڵنامەی زایینی و ڕۆمی کە لە دوو نووسینی ڕۆژنامەی کرمانجدا هاتووە کە ڕۆژنامەی ئەنستیتوی کوردییە لە پاریس و بەڕێنووسی لاتینی و کرمانجی ژووروەوە....

. Kurmanci j: 19 hawini 1996 la: 203, la: 204

دەربارەی ساڵنامە بنوارە نووسراوێکم لە گۆڤاری کاروان ژمارە (١٧) مێژووی ساڵنامەو ڕۆژمێری کوردی/ بەشی یەکەم.

(٨) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٤) و ژمارە (٣٠).

(٩) پەندی پێشینانی کوردی /شێخ محەمەدی خاڵ ل:١١٥.

(١٠) پەندی کوردی /عومەر شێخ الله دەشتەکی ل: ٥٤. هەروەها گۆڤاری کەلەپووری کورد ژمارە (١٢) ١٩٩٩ وەرزگر ئەحمەد کورە جوتیار ل: ٥٨.

(١١) لەساڵەکانی (١٩٧٠) ئەوەم لە پیرەکانی دیبەگەش گوێ لێ بووە.

(١٢) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١١٧). ١٩٨٨، وەرزو ساڵنامەی کوردی لە پەندو قسەی ئەستەق/ دکتۆرە شوکریە ڕەسول/ ل: ١١٣.

(١٣) لە پیرەژنێکی خەڵکی ڕواندزم گوێ لێبووە.

(١٤) ڕۆژنامەی کرمانجی کۆکراوەی ئەنستیتوی کورد/ پاریس.

Kurmanci j: 19 hawini 1996

Dem u rojen bi nav u nisana/ Elser la: 204

xv Kurmanci j: 19 hawin :1996

Cend gotin liser nisanen demen sale

Ariya /Rojan Hazim la :204

(١٥) بڕوانە پەراوێزی پێشوو. (Heyhot)

(١٦) ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان هەولێر ژمارە (٨٩) لە١٧/٢/١٩٩٧. بابەتێکم بەناوی (بەردەسێرد)..ل ١١، بۆ پتر شارەزایی ئەو حیسابانە بڕوانە : گۆڤاری کاروان ژمارە (١٨) مێژووی ساڵنامە و ڕۆژمێری کوردی/بەشی دووەم.

(١٧) ڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٥).. (Hivde)

(١٨) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٦)..((٢٠)e sibate)

(١٩) بڕوانە پەراوێزی (١٥) (Roja Agir)

(٢٠) بڕوانە پەراوێزی (١٦). (Zipe Zipik) هەروەها پەراوێزی (١٥). (Zip)

(٢١) پەراوێزی (١٥) (Zip).

(٢٢) ئەو سەربردەیەم لە خوالێخۆشبوو ئەحمەدی مەحمود مەلا لە دیبەگەی گوێ لێبووە لە حەفتاکان.

(٢٣) بڕوانە پەراوێزی (١٥). (Newroz)

(٢٤) بڕوانە پەراوێزی (١٥). (Gisk fetisin)

(٢٥) بڕوانە دیوانی مەولەوی / عبدالکریم مدرس ل :٥١٤. هەروەها بڕوانە گۆڤاری کەلەپووری کوردی ژمارە (١٢) ١٩٩٩ ل : ٦٤.

(٢٦) قاموسی زمانی کوردی بەرگی دووەم عبدالرحمن محەمەددەمین زەبیحی ل : ٨.

(٢٧) پەندی پێشینانی کوردی / ١٩٨١ عەلی مەعروف شارەزووری ل : ٢٩.

(٢٨) گۆڤاری کەلەپووری کورد ژمارە (١٢) ١٩٩٩. چلەی زستان و بازدیەران لە ساڵژمێری کوردیدا ل: ٦٥. هەروەها بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٤)، ل : ١٠.

(٢٩) هەردوو سەرچاوەی پەراوێزی ژمارە (٣٠).

(٣٠) دیوانی مەولەوی / عبدالکریم المدرس ل : ٤٧٦.

(٣١) هەروەها پەراوێزی (٣٠) گۆڤاری کەلەپوور ل: ٦٥.

(٣٢) پەراوێزی ژمارە (١٥). (Newroz)

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە (٤)ی/ ٢٠٠١ بڵاوبۆتەوە.**



# کەشناسیی کوردەواری

## یاسین حەسەن گۆران-بەردەڕەشی

لە کوردەواریدا مانگەکانی وەرزی زستانیان دابەش کردۆتە سەر (٨) هەشت رۆژان، ناوێکی تایبەتیان بۆ داناوە، کە لەگەڵ کات و ساتی سڕەو شەختەکە دەگونجێت، یان ڕووداوێکی تێدا ڕوویداوە، بەتایبەتی لە ناوچە کوێستانییەکان، دانیشتووانی چیاکانی کوردستان هەر لە سەرەتای وەرزی بەهار دەست بە کارو کاسبی دەکەن بۆ دابینکردنی ئازووقەی وەرزی زستان. کەش و هەواناسی ناوچە کوێستانییەکان جیاوازی هەیە لەگەڵ ناوچەی گەرمەسێر لەو هەردوو خشتەیە بەدیار دەکەوێت:

### ژمێرکاری زستانی کوێستان

سەیری خشتەی ژمارە (١) بکە

### راڤە کردنی زاراوەکان

**بێـدڵخـە، بێـڵندە = بێڵ+ بەندە یان:** بێڵ لەئاخی بەندەیە، واتە: بێڵ (بەفرماڵ) لەکاتی بەفر راداندا -نزیکە لە ساردییان ببەستێ، هەروەها لەبەر زێدە بارینی بەفر دەوی بێڵ بەئاخێ ناکەوێت.

**بەرخندە، بەندرخە = بەرخ بەندەیە.** واتە لەو کاتی هێندە سارد دەبێت، نزیکە بەرخ لەناو زگی دایکی (مەڕ) ببەسترێ.

مێرەم = خێزانی ئۆغەن بووە، لەو هەفتەیەدا چووبووە سەرکانی بۆ مەبەستی کوڵ و قەسارکردن، لەبەر سەرما و سەهۆڵ مێرەم خێزانی ئۆغەن لەسەر کانی بەند ببوو و گیانی لەدەست دابوو. ئۆغەن لەدوای تەواو بوونی سڕەو سەقەمی هەفتەی مێرەم، ئۆغەنی مێردی مریەم لەکاروانی دەگەڕێتەوە و پرسیار دەکات مێرەمی خێزانی لەماڵ نییە دەپرسێ: دەڵێن چوویتە سەر کانی، ئۆغەن بەدوایدا دەچێت تیشکی رۆژ سەقەمی زەوی شکاندووە، دەبینێ خێزانی-مێرەم- مردووەو تازە وا سڕەو شەختە گیانی بەردەدات. واتە: هەفتەی دوای مێرەم کە بە ئۆغەن ناو دەبرێت کەش و هەوای زستان بەرەو خۆشی دەڕوات.

**پیت و پاڵۆز =** پێشینان گوتوویانە:

"کە هات پیت و پاڵۆز، ساڵ دەبێ ئاڵۆز"، واتە زستان بەرەو نەمان و کۆتایی دێت. "پیت ئەگەر لەخۆ نەڕێت بەکەرت نەبێت"، واتە لە هەفتەی رۆژانی پیت زۆربەی جاران هەڵدەکاتە بەفرو با و باران.

...پیتی پیت کرد، ساڵی فیت کرد»

واتە وەرزی زستان بەرەو تەواو بوون دەچێت.

**خدرو ئەلیاس** = دوو هەفتەی کۆتایی وەرزی زستانە. چۆن کەسێک بەتەنیایی لێی بقەومێت و خدری زندە بە هانای دێت و ڕزگاری دەکات، ئەو دوو هەفتەیە کۆتایی بێت ڕزگارمان دەبێت لەساردی و سەهۆڵی وەرزی زستان.

پێشینان دەربارەی خدرو ئەلیاس دەڵێن:

-...کە هات خدر، عەرد ئەبێ پندر»

-...کە هات خدر، سەر دێنێتە دەر کەنگر»

واتە سەرەتای پەیدا بوونی کەنگرە.

دەڵێن: ...کە هات ئەلیاس، سەر دێنێتە دەر ڕێواس»

کە حەسێباتی هەفتەی ئەلیاس ڕێواس پەیدا دەبێت یان دەڵێن:

...خدرو ئەلیاس، ساڵ بوو خلاس».

لەزۆربەی ناوچەکانی کوردەواریدا حسێبداری کەش و هەوا ناسی دەڵێن: گەرمی ڕۆژەکانی وەرزی هاوین پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژەکانی وەرزی زستان هەیە، گوایە وەرزی هاوین چەند گەرم بێت وەرزی زستان بە پێچەوانەوە هەند سارد دەبێت، چونکە چلەی هاوین و چلەی زستان بەرامبەرن.

### ناوی مانگەکانی ساڵی کوردی

| | |
|---|---|
| ١- نەوروز (خاکە لێوە) | ٣١ ڕۆژە |
| ٢- گوڵان (بانەمەڕ) | ٣١ ڕۆژە |
| ٣- جۆزەردان | ٣١ ڕۆژە |
| ٤- پووشپەڕ | ٣١ ڕۆژە |
| ٥- گەلاوێژ | ٣١ ڕۆژە |
| ٦- خەرمانان | ٣١ ڕۆژە |
| ٧- ڕەزبەر | ٣٠ ڕۆژە |
| ٨- گەڵاڕێزان (خەزەڵوەر) | ٣٠ ڕۆژە |
| ٩- سەرماوەز | ٣٠ ڕۆژە |
| ١٠- بەفرانبار | ٣٠ ڕۆژە |
| ١١- ڕێبەندان | ٣٠ ڕۆژە |
| ١٢- ڕەشەمێ | ٢٩ ڕۆژە |

ساڵی کوردی وەکو ساڵەکانی نەتەوەکانی دی لە (١٢) دوازدە مانگ پێکهاتووە، ئەگەر بتەوێ بزانی ساڵی کوردی چەندە و کەی دەست پێدەکات، (٧٠٠) حەفت سەد ساڵان



هەولێر لە ئاسمانەوە

دەخەیتە سەر ساڵی زایینی بۆ نموونە ٢٠٠١ + ٧٠٠= ٢٧٠١ ساڵی کوردی

**گرنگی ساڵی کوردی بەو چەند خاڵانە بەدیار دەکەوێت:-**

١- ساڵەکانی سادە (بسیطە) ساڵی کوردی دەبێتە ٣٦٥ ڕۆژ مانگی ڕەشەمێ ٢٩ ڕۆژ دەبێت.

٢- ساڵی پڕ (کەبیسە) لە ساڵی کوردی دەبێتە ٣٦٦ ڕۆژ مانگی ڕەشەمێ ٣٠ ڕۆژ دەبێت.

٣- مانگی کۆتایی ساڵی کوردی (ڕەشەمێ) دەبێتە ٢٩ ڕۆژ / ٣٠ ڕۆژ.

٤- وەرزەکانی ساڵ لە سەرەتای مانگەکان دەست پێ دەکات، هەر سێ مانگ وەرزێکە بە پێچەوانەی ساڵی زایینی.

٥- کەلوو(بورج)ەکان لە سەرەتای مانگەکانی ساڵی کوردی دەست پێدەکات.

٦- ساڵی زایینی هەر بە (٣٣٣٠) ساڵ ڕۆژێک جیاواز دەبێت، بەلام لەساڵی کوردی بە (٥٠٠٠) ساڵ ڕۆژێک جیاواز دەبێت.

٧- ناوی مانگەکانی کوردی لەگەڵ کات و ساتی ساڵ دەگونجێت.

٨- شەش مانگی یەکەمی ساڵی کوردی هەمووی ٣١ ڕۆژن، شەشەکەی دوایی ٣٠ ڕۆژن جگە لەمانگی

کـۆتایی-ڕەشـەمێ-لە سـاڵانی سـادە ٢٩ ڕۆژە لەساڵانی پڕ ٣٠ ڕۆژ دەبێت.

٩- دەسـپـێـکی سـاڵی کـوردی لەیەکـەم ڕۆژی نەوڕۆز دەست پێدەکـات و نوێ دەبێـتـەوە، کـە لەو ڕۆژەدا شـەو و ڕۆژ یەکـسـان دەبن، هەروەها ڕۆژی نەوڕۆز یەکەم ڕۆژە لە وەرزی بەهار. سڕەو ساردی سەقەم نامێنێت، نەوڕۆز واتە ڕۆژی نوێ.

### کەش و هەوا ناسی لە ناوچەی گۆزانەتی

سەیری خشتەی ژمارە (٢) بکە

دەڵێن چلەی گەورە حەمامێ زستانییە، چلەی گچکە لەدوای دێت، عـەنتـەرو قـەرەسـپـات، ئاخرسـپـات دەکـەوتە تێـدا، زۆر دژوارو بەفەرتەنەیە، هەروەکو دەڵێن: «...چلەی گچکە، بەفرێ دەکـاتە کوچکە»، عـەنتـەر = لە سـەرەتای چلەی دەست پێـدەکـات ١٢ ڕۆژە، کـوشندەی سـەرمـای زسـتـانە هێندە دژوارو بەپەلەیە ٢ ڕۆژان لە چلەی گـچـکە گـەورە دەگـرێت و دەبێـتـە ١٤ ڕۆژ. بەسـەرهاتی عـەنتـەر بەکورتی دەگـێـڕمـەوە، دەڵێـن: ڕۆژانی عـەنتـەر لەزۆربەی سـاڵانی وەرزی زسـتـانی کـوردسـتـان زێدە بەفـر دەبارێت، ڕێگاوبان دێتـە گرتن، گوایە پیـاوێک ناوی عـەنتـەر بوو، دوژمنداربوو لەشەوێکی زستان دنیا ساماڵ دەبێت، سواری مـایێـنی خـۆی بووە، بەرەو مـاڵی دوژمنەکـەی ڕۆیشـتـبوو بۆ تۆڵەسەندنەوەی، بەسواری لەبەر دەرگای ماڵی دوژمنەکەی ڕاوەسـتـابوو، بەڵکو دەرفـەتێک بۆی هەڵبکەوێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لەهەمان شەودا بەفرو کرێوە دەستی پێکرد، سێ گەزو نیو بەفر باری، عەنتەر لەسەر مایێنەکەی لەپێش ماڵی دوژمنەکەی لەسەرمان ڕەق ببۆوە.

سوبێدە داهات، خودان ماڵ هەستاوە دەرگای حەوشەی کردەوە، دەبینێ وا سوارێک لەپێش دەرگایان لەساردییان لەسەر مایێنەکەی ڕەق بوویەتەوە، خودان ماڵ یەکسەر بانگی هەردوو خێزانەکەی کرد، عەنتەریان چاردەستە هەڵگرت و بردیانە بەر ئاگـردانی خـۆیان، دەڵێـن لەنێـوان هەردوو خێزانەکەی خۆی عەنتەری درێژ کردبوو بۆ خاتری ساردی دڵی بەربدات، عـەنتـەر بەخۆی هاتەوە و بووژایەوە، خۆی لەنێـوان دوو ئافـرەت دیتـەوە، خزمـەتێکی زۆریان کـردبوو، بەسەلامەتی ڕەوانەی ماڵی خۆیان کردەوە. پەند:

«عـەنتـەرە قـەلەندەرە، سێ گـەزو نیـو بەفـری لەسـەرە، هێشتا دەڵێن قەلەندەرە».

**قەرەسپات و ئاخرسپات:**

قەرە: وشەیەکی تورکییە بەمانای = ڕەش، سپات: مت بوون لە وشەی سوباتی عەرەبی وەرگـیراوە، کـەش و هەوا سـاردە، زیندەوەرە مـتـبـوودەکـان ناتوانن لەشـوێـنی خـۆیان دەربکەون، ماوەکەی ١٤ ڕۆژە لەدوای عـەنتـەر دێت. ئاخر سـپـات: مـاوەکـەی ١١ ڕۆژە لەدوای قـەرەسـپـات دێت، عەنتەرو قـەرەسپات و ئاخرسپات هەرسێک دەکەونە ناو چلەی گچکە و چل ڕۆژان تەواو دەکەن. ئاخرسپات لەڕۆژی ئاداری سـاڵی زایینی کـۆتایی پێ دێت ڕۆژی ١١ی ئاداری مـانگی زایینی، یەکەم ڕۆژی مـانگی ئاداری کوردییە، کە حسـێـبی ڕۆمی یان شـەرقی (ڕۆژهەڵاتی) پێـدەگـوترێت، چونکە ١٠ ڕۆژان جیـاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆژەکانی مـانگی سـاڵی زایینی، جووتیـارانی دەشـتی ناوکوڕ سەر بەناوچەی گۆزانەتی، دەڵێن: یەکـەم ڕۆژی ئاخرسـپـاتی دانێ سوبانێ دەغڵ و دانی بچێـنن دان دەگـرێت، بەڵام لەهەمـان ڕۆژ بۆ دانی هێواری بچێنن دان ناگرێت.

زێـپـک: ٩ نۆ ڕۆژە لە ١٤ی ڕەشـەمێ دەست پێـدەکـات، پەند دەڵێـن:

«سێ زیپـە، سێ بەر زیپـە، سێ گـونێ کـەنگری دەکـاتە گـیـپـە» دەڵێـن: «زیپـک گـونێ کـەنگری دەکـاتە گـیـپـک».

زیپـک دەڵێ: «بەشـەو دەکـەمـە سـامـار، بەڕۆژ دەکـەمـە بەفروبا، بەزی لەسەرێ کلکێ گیسکێ دەکەمە کا».

گیسـک بە زیپکێ دەڵێت:

«تێـرم خـوارد لە سـورکێ، پێـچکم بەقـوونێ زیپکێ»

دیسان زیپک دێتە وەڵام و دەڵێت:

«خـوشـکە ئادارە، سێ ڕۆژم بدێ لەو ڕۆژە غـەدارە، دا گـیـسـک و کاوران بکەم سەرەخوارە»، واتە زیپـک ٣ سێ ڕۆژان لەمانگی ئاداری کوردی دەگرێت ئەنجا خدرو ئەلیاس دێن باس کرا.

تاکـو دەبێـتـە ڕۆژی نەوڕۆز ئەویش ژەهرێ خـۆی دادەڕێژێ، گوترایە: «نەوروزێ سولتانی، گـای دەکوژی لە خانی، خودانی پێ نزانی».

خـودان گـاجـۆت، هەتا هێـواری جـووتێ بەگـایەکـانی دەکات تێر ئالف و خواردنیان ناکات بەهیوای گیا و گوڵ و شینکەی بەهارێ لێدەگەڕێت هێواران هەناویان بەتاڵە وەتێ سـاردی نەوروزێ لەگـای زگ بەتاڵ دەدات تووشی دەبن و

خاوەنی پێ نازانێ.

کەش و هەوا ناسی و پەندی پێشینانی کوردەواری «قەرە سپات و ئاخرسپات، بەناو وڵاتی داهات کەتردو مەتردی هەڵبژارد».

واتە: هێندە ساردە هەرچی ئاژەڵی دەردەدارو لەغەرو نەخۆش هەبێت، لەناویان دەبات و دەیانکوژێت «ئاخرسپات خۆڵ لەدوێ مەڕ دەبتە نەبات». «بەفری شوباتێ، وەکی ترێ پیرە فاتێ» لە سەرەتای ئاخرسپاتی دەڵێن:

"نەچێنە تەرەکاڵە، بیخۆی ماڵە، لەساڵان ساڵە"

لەبارەی مانگی رەشەمێ دەڵێن:

"رەشەمە رەشکێ رووِیا، بەتاڵ دەکا چاڵ و کەندوویا، بەشەڕ دێنی بووک و خەسوویا"، "رۆژ دەبتە ساڵ، نان دەبتە ناڵ، ژن دەبتە بەقاڵ"، واتە لەمانگی رەشەمێ رۆژ درێژ دەبن، ئەرزاق و زەخیرە کەم دەبێت، بۆیە نان بچووک دەبێتەوە، دانەوێڵەی ناومال گەنم و داناش و هاڕدراوەکان کۆتاییان دێت، چونکە دوا ساڵە، بۆیە کابانی ماڵێ وەکو بەقاڵ لەماڵان دەگەڕێت بۆ پەیداکردنی هەندێ خواردەمەنی.

دەڵێن: "نیوەی چلەی زستانێ، کەرێ گاڕانێ دەزانی رۆژ درێژبیە". "بەفرێ ئاداریَ، پارەک نامینێ هەتا هێواریَ" "ئاداریَ مەشکەی دەگرن لەداریَ، لێرە نا لە شەنگاریَ". "ئادار ناچی بێ دۆ، نیسان ناچی بێ جۆ، گوڵان ناچی بێ هۆ"، واتە لەمانگی ئاداری ماست و دۆ پەیدا دەبێت. لەمانگی نیسانێ جۆ دێتە دروونەوە. لەمانگی گوڵانی خەرمان دێتە کوتان بەگێرەکردن (١٧-١٨)ی ئاداریَ، نەگرە بە بۆهاریَ، رۆژەکە لەرۆژی زستانێ بگرە دەرکێ کۆدانێ".

«٢٤ بیست و چاری ئاداریَ مەلکەزدن دێنە خواریَ، دەنگ دەکەن لەبوهاریَ، سەرێ داریَ و بنێ داریَ"، "چل چلە، چل پاش چلە، جلێ خۆ هەڵگرە هەرو ئەو ملە چلی دیکە جۆی ببڕە و دانێ سەر ملە".

- "باسکە قەلوونە گولی بکەفتە عەردێ، هیچ حیساب نامێنێ" یان دەڵێن:

"تەیری سیسارکە کەچەڵ بەرچاو بکەوێت هیچ حیساب نامێنێت"

"دەنگێ قوریژەی بێت بەهارە".

**خشتەی ژمارە (١)**

| ناوی شەختەوساردییەکان | دەسپێکی لەمانگەکانی کوردی | دەسپێکی لەمانگەکانی ساڵی زایینی |
|---|---|---|
| بێڵ، بێدڵخە | ١٥ بەفرانبار | ٥ کانوونی دووەم |
| بێڵندە | ٢٢ بەفرانبار | ١٢ کانوونی دووەم |
| بەند | ٣٠ بەفرانبار | ٢٠ کانوونی دووەم |
| بەندرخە | ٦ رێبەندان | ٢٦ کانوونی دووەم |
| مێردم | ١٣ رێبەندان | ٢ شوبات |
| ئۆغەن | ٢٠ رێبەندان | ٩ شوبات |
| پیت | ٢٧ رێبەندان | ١٦ شوبات |
| پالۆز | ٤ رەشەمێ | ٢٣ شوبات |
| خدر | ١١ رەشەمێ | ١ ئازار |
| ئەلیاس | ٨ رەشەمێ | ٨ ئازار |

| ناوی شەختەو ساردییەکان | دەسپێکی لەمانگەکانی ساڵی کوردی | بەرامبەر بەمانگەکانی ساڵی زایینی |
|---|---|---|
| بەرخندە | ١٤ بەفرانبار | ٤ کانوونی دووەم |
| بێلندە | ٢١ بەفرانبار | ١١ کانوونی دووەم |
| مێردم | ٢٨ بەفرانبار | ١٨ کانوونی دووەم |
| ئۆغەن | ٥ رێبەندان | ٢٥ کانوونی دووەم |
| پیت | ١٢ رێبەندان | ١ شوبات |
| پاڵ | ١٩ رێبەندان | ٨ شوبات |
| خدر | ٢٥ رێبەندان | ١٤ شوبات |
| ئەلیاس | ٣ رەشەمێ | ٢٢ شوبات |

**خشتەی ژمارە (٢)**

**کەش و هەوا ناسی لە ناوچەی گۆرانەتی**

| ناوی سرەو ساردییەکان | دەسپێکی لەساڵی زایینی | لەساڵی کوردی | ماوەی |
|---|---|---|---|
| چلەی گەورە | ٢٥ کانوونی دووەم | ٤ بەفرانبار | ٤٠ رۆژە |
| چلەی گچکە | ٣ شوبات | ١٤ رێبەندان | ٤٠ رۆژە |
| عەنتەر | ٣ شوبات | ١٤ رێبەندان | ١٢ رۆژە |
| قەرەسپات | ١٥ شوبات | ٢٦ رێبەندان | ١٤ رۆژە |
| ئاخرسپات | ١ ئادار | ١٠ رەشەمێ | ١١ رۆژە |
| زیپک | ٥ ئادار | ١٤ رەشەمێ | ٣ رۆژە لەهەندە شوێن ٩ رۆژە |
| تەلیاس | ١٤ ئادار | ٢٣ رەشەمێ | |
| نەورۆز | ٢١ ئادار | ١ نەورۆز | شەختەو سردی تێدا هەیە |

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر. ژمارە (٤). ٢٠٠١ بڵاوبۆتەوە.**

# ژینگەی هەولێر

**هیوا سادق سەلیم**
**کۆلیژی ئاداب- زانکۆی کۆیە**

مەبەست لێرەدا دابەشبوونی دانیشتوانە بەپێی شار و گوند. ئەم جۆرە دابەشکردنە لە لێکۆڵینەوەکانی دانیشتوان بایەخی زۆری پێدەدرێت. چونکە جۆری ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوان مرۆڤ و زەویدا دروست دەبن بە پێی ئەوە دەردەکەون. جگە لەوە ئەو راستییانەش دەخرێنە روو، کە پەیوەستن بە سروشتی شێوازەکانی کۆبوونەوەی دانیشتوان و شێوەی نشینگەکان و جۆری دابەشبوونیان. هەموو ئەمانەش کاردەکەنە سەر لایەنە دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و ئابووری دانیشتوان.

پێش ئەوەی لێکۆڵینەوە لەم جۆرە دابەشبوونە بکەین، چاکتر وایە هەردوو چەمکی (شار و گوند) دیاری بکەین، لەگەڵ ئەوەی (شار) دیاردەیەکە و بە یەکێک لەو روخسارە گەورانە دادەندرێت، کە ئادەمیزاد لەسەر رووی زەوی بونیادی ناوە، کەچی دەوڵەتان و توێژەران تاوەکو ئێستا نەکراوە پێناسەیەکی پڕ بە پێستی خۆی بۆ بکەن[1]. لە ئەمڕۆی دنیاشدا لە ئەنجامی کەمبوونەوەی جیاوازییەکانی نێوان شار و گوند ئەم کارە بە گرانتر کەوتووە.

لێرەشدا بە بە پشت بەستن بە یەکێک لەو لێکۆڵینەوانەی، وەزارەتی پلاندانانی عێراق ئەنجامیداوە هەوڵدەدەین پێناسەی شار بکەین. (کۆبوونەوەیەکی چڕەو دانیشتووانەکەی بە کار و چالاکی ئابووری جۆراوجۆری ناکشتوکاڵی خەریکن و لە رووی کۆمەڵایەتیشەوە کۆمەڵێکی ناوێکچوون. لە پاڵ ئەم پێناسەیەشدا لەلایەن دەوڵەتەوە سیفەیەکی یاسایی کارگێڕی پێدەدرێت)[2]. بەم پێیە گوند پێچەوانەی شار چڕی دانیشتوانی تێدا نزمە و لە رووی کۆمەڵایەتیشەوە دانیشتوانی کۆمەڵێکی هاوشێوەن و چالاکی کشتوکاڵیش بە چالاکی سەرەکی خەڵکەکەی دادەنرێت.

شایانی باسە ئەو بنەمایانەی، کە توێژەران بۆ جیاکردنەوەی (شار و گوند) پشتیان پێدەبەستن گەلێکن لەوانە بنەماکانی (کارگێڕی، وەزیفی، مێژوویی، کۆمەڵایەتی، دیمۆگرافی)...هتد[3].

هێندێک وڵات چەند بنەمایەک لەمانە بەکاردەهێنن، کەچی هێندێکی تریان تەنها یەک بنەما دەکەنە پێوەر، وەک لە عێراقدا دەبیندرێت، کە ئەویش بنەمای (کارگێڕی)یە[4]، بە جۆرێک هەر ئاواییەک ئەنجومەنی شارەوانی تێدابێت بە شار دادەنرێت. ئەمەش یەکەی (ناحیە) و لەویش گەورەتر دەگرێتەوە. هەر ئاواییەکیش ئەم ئەنجومەنەی تێدا نەبێت بە یەکەیەکی کارگێڕی داناندرێت و خەڵکەکەش بە گوندنشین

دەژمێردرێن[٥]. بەبێ ڕەچاوکردنی سیمای دەرەوە و قەبارەی دانیشتوان و چالاکییە ئابوورییەکان؟.

لێرەشدا بە بە پشت بەستن بەو بنەمایەی، کە لە عێراقدا بەکاردەهێنرێت هەوڵدەدەین لێکۆڵینەوە لە دابەشبوونی ژینگەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بکەین لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٥٧ -٢٠٠٢) بە ئامانجی دەرخستنی هەموو ئەو گۆڕان و پەیوەندییانەی بەسەر ڕێژەی هەریەک لە شارنشین و گوندنشینی ناوچەکەدا هاتووە، بە مەبەستی خستنە رووی زیاتری ئەم دابەشبوونەش، بە پێویستی دەزانین سەرەتا لەسەر ئاستی قەزا و دواتریش لەسەر ئاستی یەکەکان ئەم بابەتە تاوتوێ بکەین.

**أ- دابەشبوونی ژینگەیی لەسەر**

**ئاستی قەزا:**

دانیشتوانی قەزای کۆیە وەک تەواوی دانیشتوانی ناوچەکانی تر لە نێوان (شار و گوند) دابەشبوون، لە سەیرکردنی خشتەی ژمارە (٦)یشدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە جیاوازی زۆر لە ڕێژەی هەر یەک لە شارنشین و گوندنشیندا هەیە. جگە لەوە گۆڕانێکی زۆریش بەدی دەکرێت، کە بەسەر ڕێژەکاندا هاتووە لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٥٧ -٢٠٠٢) بڕوانە خشتەی ژمارە (١).

**یەکەم/ دانیشتوانی شارنشین:**

شارنشینی قەزای کۆیە لە سالی (٢٠٠٢) زیاتر لە (٦١٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکەیان پێکهێناوە، ئەمەش ڕێژەیەکی بەرزە بە بەراورد لەگەڵ سالانی تری ماوەی لێکۆڵینەوە. بە جۆرێک لە سالی ١٩٥٧ نزیکەی (٢٥٪)ی کۆی دانیشتوانیان پێکهێناوە. بەلام لە سالی ١٩٧٧ ڕێژەکە هەلدەکشێ و دەگاتە زیاتر لە (٣٥٪)، واتە لەم ماوەیەدا بە ڕێژەی گەشەی سالانەی (٣.٣٪) زیادیان کردووە (بڕوانە خشتەی ژمارە -١-) ئەم زیادبوونەش لە ڕێژەی شارنشینان لەم ماوەیەدا (١٩٥٧ -١٩٧٧) دەرئەنجامی چەند هۆکارێکە لەوانە:

١- دەرکەوتنی ناحیەیەکی تازە بە نێوی ناحیەی (شۆڕش)، کە سەنتەرەکەی شارۆچکەی (دێگەلە)یە.

٢- زیادبوونی دیاردەی کۆچکردن لە گوندەکانەوە بۆ شارەکان لە ئەنجامی هۆکارە رامیاری و ئابووری و خزمەتگوزارییەکان. وەک ئاشکرایە ڕەوشی رامیاری شارەکان تا رادەیەک ئارامتر و ئاستی بژێویش باشتر و بەرزتر بووە لە گوندەکان.

**خشتەی ژمارە(١)**
**ڕێژەی ژینگەی دانیشتوان لە قەزای کۆیە**
**(١٩٥٧ -٢٠٠٢)**

| سال | شارنشین (٪) | گوندنشین(٪) |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ٢٤,٧ | ٧٥,٣ |
| ١٩٧٧ | ٣٥,٥ | ٦٤,٥ |
| ١٩٨٧ | ٩٦,٩ | ٣١ |
| ٢٠٠٢ | ٦١,٣ | ٣٨,٧ |

بە پشتبەستن بەم سەرچاوانە ڕێژەکان دەرهێندراون:

١- وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي الموصل وأربيل، المصدر السابق، جدول رقم (٤)، ص ٢١٠.

٢- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، المصدر السابق، جدول رقم (٢٢)، ص ٢٩- ٣٠.

٣- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، المصدر السابق، جدول رقم (٢٢)، ص ٨١- ٨٢.

٤-أ/ JHIC,Op.CIT,P. (No).

ب/ مديرية احصاء السليمانية، المصدر السابق، ص ٢٢٦.

وێرای ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری دامودەزگا خزمەتگوزارییەکان لە شارەکان کۆبوونەتەوە. هەمموو ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر جووڵەی شوێنجێیی دانیشتوان لە گوندەوە بۆ شار هەبووە.

کەچی لە ساڵی (١٩٨٧)دا وەک لە ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوان لەم ساڵەدا دەردەکەوێت، شارنشینان بە شێوەیەکی سەرنج راکێش و ناسروشتی زیادیان کردووە و نزیکەی (٩٧٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکەیان پێکهێناوە. واتە لەم ماوەیەدا (١٩٧٧ -١٩٨٧) بە رێژەی گەشەی ساڵانەی (٨.٧٪) زیادیان کردووە، ئەمەش گۆڕانێکی زۆر گەورەیە، کە بەسەر دابەشبوونی ژینگەیی دانیشتوانی قەزاکەدا هاتووە، بەڵام ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە ئەم رێژەیە بە هیچ کلۆجێک رێژەی راستەقینەی ئەم دابەشبوونە نانوێنێت، چونکە لەم ماوەیەدا بە هۆی ناسەقامگیری رەوشی رامیاری ناوچەکە و سەپاندنی بڕیاری قەدەغەکردنی کارگێڕی بەسەر زۆربەی هەرە زۆری گوندەکانی قەزاکە نشینەکانیان سەرژمێری نەکراون و هەر بە خەمڵاندن لەسەر ناحیەی سەنتەری هەژمار کراون. بڕوانە خشتەی ژمارە (٢).

**دووەم/ دانیشتوانی گوندنشین:**

گوندنشینانی قەزای کۆیە لە ساڵی ٢٠٠٢ نزیکەی (٣٩٪)ی کۆی دانیشتوانیان پێکهێناوە. (بڕوانە خشتەی ژمارە -١-) لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوەکەشدا ئەم رێژەیە هەڵکشان و داکشانێکی زۆر بەخۆوە دەبینێت، بە جۆرێک لە ساڵی (١٩٥٧)دا نزیکەی (٧٥٪) واتە (٣/٤)ی دانیشتوانیان پێکهێناوە. ئەمەش بۆ سروشتی ناوچەکە گەڕاوەتەوە، کە تا رادەیەکی زۆر ناوچەیەکی کشتوکاڵی بووە، سەرەڕای ئارامی رەوشی رامیاری و خراپی باری ئابووری و نەبوونی هەلی کارکردن لە شارەکان، کە ئەمانەش هەمموی هۆکاری پاڵنەر بوون لە نیشتەجێ بوونی زیاتری دانیشتوان لە گوندەکان. بەڵام لە ساڵی (١٩٧٧) رێژەکە بۆ (٦٤.٥٪) دادەکشێت، ئەویش بۆ نزمی تێکڕای گەشەی دانیشتوانی گوندەکان دەگەڕێتەوە، کە لەم ماوەیەدا (١٩٥٧ -١٩٧٧) بە رێژەی ساڵانەی (٠.٦٪) گەشەیان کردووە (بڕوانە خشتەی ژمارە -٢ -). نزمی ئەم رێژەیە لەم ماوەیەدا زادەی ئەم کۆچە بەردەوامە بووە، کە

**خشتەی ژمارە (٢)**
**رێژەی گەشەی ژینگەیی ساڵانەی دانیشتوان لە قەزای کۆیە**
**(١٩٥٧ -٢٠٠٢)**

| ماوە | شارنشین | گوندنشین |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ — ١٩٧٧ | ٣,٣ | ٠,٦ |
| ١٩٧٧ — ١٩٨٧ | ٨,٧ | ٣٧,٣ |
| ١٩٨٧ — ٢٠٠٢ | ١,٩ | ٢٤,٣ |

سەرچاوە/ بە پشتبەستن بە هەمان سەرچاوەکانی خشتەی ژمارە (١) رێژەکان دەرهێندراون.

بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٧ -٢٠٠٢) شارنشینانی قەزاکە بە رێژەی گەشەی ساڵانەی نزیکەی (٢٪) زیاد دەکەن، ئەم زیادبوونەش زادەی چەند هۆکارێک بووە لەوانە:

١- گێڕانەوەی هەمموو ئەو یەکە کارگێڕییانەی، کە لەسەردەمی دەسەڵاتی ناوەند بڕیاری رەتکردنەوەیان درابوو، بە پێی بڕیارێکی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٢، لە نێویشیاندا هەریەک لە تەقتەق و دێگەڵە سیفەتی کارگێڕییان پێدراوەتەوە و لە گوندەوە کراونەتەوە شار.

٢- دامەزراندنی ناحیەیەکی تازە بەناوی ناحیەی ئاشتی، کە سەنتەرەکەی شارۆچکەی (خەرابە)یە.

٣- کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی هەردوو ناوچەی هەولێر و کەرکووک بۆ نێو سنووری کارگێڕی قەزاکە، لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆی کوردستان و سیاسەتی بە عەرەبکردن و دەرکردنی خەڵکی کوردنشینی کەرکووک لەلایەن حکومەتی ناوەندەوە، ئەوەی جێگای ئاماژەشە زۆربەی هەرە زۆری ئەم کۆچکەرانە لە شارەکاندا نیشتەجێ بوون.

دانیشتوانی گوندەکان لە ئەنجامی کەم دەرامەتی و خراپی رەوشی رامیاری و پشتگوێ خستنی گوندەکانەوە بەرەو ناوەندە شارستانییەکان کردوویانە. بەڵام لە ساڵی (١٩٨٧) بە پشتبەستن بە ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوان، لەم ساڵەدا گوندنشینان تەنها (٣٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکە پێکدەهێنن. ئەمەش گۆڕانێکی گەورەیە، کە بەسەر ڕێژەکەیاندا هاتووە. بە جۆرێک لەم ماوەیەدا (١٩٧٧ -١٩٨٧) گوندنشینان بە ڕێژەی (-٢٧٪)، کەمیان کردووە. ئەمەش -وەک لەپێشدا ئاماژەمان پێدا- بۆ سەرژمێرنەکردنی دانیشتوانی گوندەکانی قەزاکە دەگەڕێتەوە لە سەرژمێری ساڵی (١٩٨٧). وێڕای کۆچپێکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەم گوندانە لەم ماوەیەدا لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندەوە. بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٧ - ٢٠٠٢) گوندنشینان بە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی (٢٤.٣٪) زیادیان کردووە، ئەوەش بۆ ئاسایی بوونەوەی رەوشی رامیاری ناوچەکە دەگەڕێتەوە.، کە دوابەدوای ساڵی (١٩٩١) ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کۆچپێکراوی گوندەکانی قەزاکە بۆ سەر زێدی خۆیان گەڕاونەتەوە.

**ب- دابەشبوونی ژینگەیی لەسەر ئاستی یەکە کارگێڕییەکان:**

ئەم دابەشبوونە لەنێو یەکە کارگێڕییەکانی قەزاکە لە یەکەیەکەوە بۆ یەکەیەکی تر و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاواز بووە. بە جۆرێک لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧ - ٢٠٠٢) گۆڕانی گەورە بەسەر ڕێژەی شارنشین و گوندنشینی هەریەک لەم یەکانەدا هاتووە. وەک لە خوارەوە دەردەکەوێت:

**یەکەم/ دانیشتوانی شارنشین:**

لە سەیرکردنی خشتەی ژمارە (٣) و نەخشەکانی ژمارە (٤، ٥، ٦، ٧)دا بۆمان دەردەکەوێت کە:

١- شارنشینانی ناحیەی سەنتەر لە ساڵی (٢٠٠٢)دا نزیکەی لە (٧٨٪)ی کۆی دانیشتوانی ناحیەی ناوبراویان پێکهێناوە، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٨٧) لە نێوان (٣٧٪) و (٩٧٪) بووە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٣)

ئەم گۆڕانە گەورەیەش، کە بەسەر ڕێژەی دانیشتوانی شارنشیندا هاتووە لە تەواوی ئەم ماوەیەدا دەرئەنجامی زیادبوونێکی سروشتی نییە، بەڵکو زادەی ئەو کۆچە بەردەوامە بووە، کە دانیشتوانی گوندنشینی قەزاکە بە هۆکاری جیاجیاوە بەرەو شاری کۆیە کردوویانە. بەو پێیە شاری کۆیە سەنتەری کارگێڕی قەزاکەیە و زۆربەی هەرەزۆری دامودەزگا حکومی و بازرگانی و دارایی و خزمەتگوزارییەکانی لەم شارەدا کۆبوونەتەوە. ئەمەش بۆتە هۆی ڕاکێشانی دانیشتوانی یەکە کارگێڕییەکانی تری قەزاکە بۆ سوود وەرگرتن لەم خزمەتگوزارییانە. جگە لەوە تێکدان و کاولکردنی گوندەکانی قەزاکە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو بۆتە مایەی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ئەم ناوچانە بەرەو شاری کۆیە. لە ساڵی (١٩٩٦)یش بەهۆی ئاڵۆزبوونی رەوشی رامیاری و هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆی کوردستان ژمارەیەکی زۆری خەڵکی شاری هەولێر و ناوچەکانی تر بەرەو ئەم شارە کۆچیان کردووە.

٢- شارنشینانی ناحیەی تەقتەق لە ساڵی (٢٠٠٢) زیاتر لە (٦٢٪)ی کۆی دانیشتوانی ناحیەکەیان پێکهێناوە. ئەمەش بەرزترین ڕێژەیە، کە ناحیەی ناوبراو لە تەواوی ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوە بە خۆوەی دەبینێت. بە جۆرێک ئەم ڕێژەیە لە ساڵانی (١٩٥٧ و ١٩٧٧ لە (٣.٥٪ و ٩.٥٪) پتر نەبووە، لە ساڵی (١٩٨٧)یشدا دوای کردنەوەی بە گوند لە سەرژمێری ئەم ساڵەدا وەک یەکەیەکی کارگێڕی ناوی نەهاتووە. کەچی دوابەدوای پێدانەوەی سیفەتی کارگێڕی و کردنەوەی بە ناحیە لە ساڵی (١٩٩٢) و لە ئەنجامی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکانی هەولێر و کەرکوک، بۆ نێو سنووری ئەم یەکەیە و نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی زۆریشیان لە شارۆچکەی تەقتەق، ڕێژەکە بەم شێوەیە رووی لە بەرزی کردووە.

٣- شارنشینانی ناحیەی شۆڕش (٤.٣٪)ی کۆی ژمارەی دانیشتوانی ناحیەکەیان لە ساڵی (٢٠٠٢) پێکهێناوە، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٧٧ لە (٣.٨٪) زیاتر نەبووە، ئەو گۆڕانە کەمەی لەم ماوەیەشدا بەسەر ڕێژەی شارنشینانندا هاتووە. لە ئەنجامی زۆر بوونی ژمارەی شارنشینانی ناحیەی ناوبراو نییە، بەڵکو زادەی کەمبوونەوەی ژمارەیەکی گوندنشینانی ناحیەکەیە.

کەمی ڕێژەی شارنشینان لەم یەکەیە لە تەواوی ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوە دەرئەنجامی پشتگوێ خستن و گرنگی پێ نەدانی شارۆچکەی (دێگەڵە) بووە، کە سەنتەری کارگێری ناحیەکەیە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە.

٤- شارنشینانی ناحیەی ئاشتی لە (٦.٣٪)ی کۆی دانیشتوانی ناحیەی ناوبراویان لە ساڵی (٢٠٠٢)دا پێکهاتووە. کەمی ئەم یەکەیە دەگەڕێتەوە وەک لە پێشدا ئاماژەمان پێدا، ئەم یەکەیە ماوەی چەند ساڵێکە دامەزراوە و شارۆچکەی (خەرابە)ش، کە سەنتەری کارگێری ئەم ناحیەیە، تاوەکو ئێستا دەزگا حکومی و کارگێری و بازرگانی و خزمەتگوزارییەکان وەک پێویست تێدا دانەمەزراوە.

**دووەم/ دانیشتوانی گوندنشین**

هەر لە خشتەی ژمارە (٨) و نەخشەکانی ژمارە (٤، ٥، ٦، ٧)دا تێبینی دەکرێت، کە گۆڕانێکی زۆر لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧ - ٢٠٠٢) بەسەر ڕێژەی دانیشتوانی گوندنشینی یەکە کارگێڕییەکانی قەزاکەدا هاتووە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- گوندنشینانی ناحیەی سەنتەری (٢٢٪)ی کۆی دانیشتوانی ناحیەکەیان لە ساڵی (٢٠٠٢)دا پێکهێناوە، لە کاتێکدا لە ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٨٧) ئەم ڕێژەیە لە نێوان (٦٣٪ و ٣٪) بووە دابەزینی ڕێژەی گوندنشینان لە تەواوی ئەم ماوەیەدا لەلایەکەوە بۆ زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی شارنشین و لەلایەکی تریشەوە بۆ ڕاگواستن و کۆچپێکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەم گوندانە

**خشتەی ژمارە (٣)**
**ڕێژەی ژینگەیی دانیشتوان لەسەر ئاستی یەکە کارگێڕییەکانی قەزای کۆیە**
**(١٩٥٧ -٢٠٠٢)**

| یەکە | ١٩٥٧ [1] | | ١٩٧٧ [2] | | ١٩٨٧ [3] | | ٢٠٠٢ [4] | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کارگێڕییەکان | شارنشین | گوندنشین | شارنشین | گوندنشین | شارنشین | گوندنشین | شارنشین | گوندنشین |
| ناحیەی سەنتەر | ٣٧،٤ | ٦٢،٦ | ٦٦،٤ | ٣٣،٦ | ٩٦،٩ | ٣،١ | ٧٧،٩ | ٢٢،١ |
| ناحیەی تەقتەق | ٣،٤ | ٩٦،٦ | ٩،٥ | ٩٠،٥ | - | | ٦٢،١ | ٣٧،٩ |
| ناحیەی شۆرش | | | ٣،٨ | ٩٦،٢ | - | | ٤،٣ | ٩٥،٧ |
| ناحیەی ئاشتی | | | | | | | ٦،٣ | ٩٣،٧ |

(١) وزارة الداخلية مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، المصدر السابق، جدول رقم (٨) ص (٢٢٤ -٢٢٥). والمجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، سكان القرى لألوية الموصل والسليمانية وأربيل وكركوك وديالى، مطبعة دار التضامن، بغداد، ١٩٦١، ص ٢٥٠ -٢٥٦.

(٢) وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، المصدر السابق، جدول رقم (٢٢)، ص ٢٩ - ٣٠.

(٣) وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، المصدر السابق، جدول رقم (٢٢)، ص ٨١ -٨٢.

(٤) أ. JHIC,OP.CIT,P.(No)

ب. مديرية احصاء السليمانية، المصدر السابق، ص ٢٦٦.

دەگەڕێتەوە، کە دەکەونە سنووری کارگێڕی ئەم یەکەیە بۆ دەرەوەی سنووری قەزاکە، بەتایبەتیش لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو وێڕای نادروستی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوان لە ساڵی (١٩٨٧)دا.

٢- گوندنشینانی ناحیەی تەقتەق لە ساڵی (٢٠٠٢) نزیکەی (٣٨٪)ی کۆی دانیشتوانی ئەو یەکەیان پێکهێناوە، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٧٧)دا یەک بە دوای یەک نزیکەی (٩٧٪ و ٩٠.٥٪) بووە، کەمبوونەوەی ڕێژەی گوندنشینان لە ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوە دەرئەنجامی چەند هۆکارێکە:

أ- زۆربوونی ڕێژەی شارنشینی ئەم یەکەیە.

ب- شالاوی بەدناوی ئەنفالی چواردەم، کە لە ساڵی (١٩٨٨)دا گوندەکانی ئەم یەکەیەی گرتەوە و بوو بە مایەی بێ سەروشوێن کردنی هەزاران کەس لە دانیشتوانەکەی.

ج- دامەزراندنی ناحیەی ئاشتی لە ساڵی (١٩٨٨)، کە (٢٠) کەرتی ڕۆژهەڵاتی ناحیەی تەقتەق دابڕاوە و ئەم یەکە تازەیەی لێ دروست کراوە، کە کۆی ژمارەی دانیشتوانی گوندنشینی نزیکەی (٥٩٣٢) بووە لە ساڵی ٢٠٠٢.

٣- گوندنشینانی ناحیەی شۆڕش (٩٥.٧٪)ی کۆی ژمارەی دانیشتوانی ئەو یەکەیەیان لە ساڵی ٢٠٠٢ پێکهێناوە، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە (٩٦.٢٪) بووە لە ساڵی (١٩٧٧) واتە لەم ماوەیەدا گۆڕانێکی ئەوتۆ بەسەر ڕێژەکاندا نەهاتووە. ئەمەش بۆ کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری نشینەی ناوچەکە دەگەڕێتەوە بۆ دەرەوەی سنووری ئەم یەکەیە بەهۆی سنووورداری توانای ئابووری ناوچەکە.

٤- گوندنشینانی ناحیەی ئاشتی نزیکەی (٩٤٪)ی کۆی دانیشتوانی ناحیەی ناوبراویان لە ساڵی ٢٠٠٢ پێکهێناوە. زۆری ڕێژەی گوندنشینان لەم یەکەیە لەلایەک بۆ کەمی ژمارەی شارنشین و لەلایەکی تر بۆ سروشتی ناوچەکە دەگەڕێتەوە، کە بە پلەی یەکەم ناوچەیەکی کشتوکاڵییە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی پێشوو، دەگەینە ئەو پوختەیەی کە شارنشینان لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە لە زۆربوون و گوندنشینان لە کەمبوونی بەردەوامدا بووە. ئەم زیادبوونەش لە ڕێژەی شارنشینان لەم ماوەیەدا دەرئەنجامی زیادبوونی سروشتی نەبووە. بەڵکو زادەی ئەو کۆچە بەردەوامە بووە، کە دانیشتوانی گوندنشین لە ژێر کاریگەری هۆکاری جیاجیا بەرەو ناوەندە شارستانییەکانی قەزاکە کردوویانە. وێڕای کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی هەردوو ناوچەی هەولێر و کەرکوک بۆ نێو سنووری کارگێڕی قەزاکە و نیشتەجێ بوونیان لە ناوەندە شارستانییەکان.

**دابەشبوونی قەبارەی دانیشتوان**

مەبەست لێرەدا دابەشبوونی دانیشتوانە بەپێی ژمارەیان. گرنگی ئەم جۆرە دابەشبوونە لەوەدایە، کە وێنەیەکی روون سەبارەت بە جیاوازی کۆبوونەوەی دانیشتوان دەخاتە ڕوو. جگە لەوە، پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ئەو زەوییە لەسەری دەژی و توانا ئابوورییەکانی ئەم ناوچانەش لە فەراهەمکردنی پێداویستییەکانی دانیشتوانەکەی پیشان دەدات.

قەزای کۆیە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧-٢٠٠٢) لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە دیمۆگرافی و کارگێڕییانەی بە خۆوەی بینیوە، گۆڕانی گەورەش بەسەر قەبارەی نشینگەکانیاندا هاتووە. بە مەبەستی خستنە رووی زیاتری ئەم گۆڕانانە هەوڵدەدەین لەم باسەدا لێکۆڵینەوە بکەین لە هەریەک لە:

أ- دابەشبوونی نشینگە شارستانییەکان (بەپێی ڕیزبەندی قەبارەیان).

ب- دابەشبوونی نشینگە گوندییەکان (بەپێی تێکڕای قەبارەی گوند).

ج- دابەشبوونی نشینگە گوندییەکان (بەپێی ڕیزبەندی قەبارەیان).

**أ- دابەشبوونی نشینگە شارستانییەکان (بەپێی ڕیزبەندی قەبارەیان):**

نشینگە شارستانییەکانی قەزاکە لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە گۆڕانی بەرچاو بەسەر قەبارەکانیاندا هاتووە. بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەو گۆڕانانەی بە شێوەیەکی چوونیەک نەبووە، بەڵکو لە نشینگەیەکەوە بۆ نشینگەیەکی دیکە جیاواز بووە، ئەمەش بە روونی لە

نەخشـەکـانی ژمـارە (٨، ٩، ١٠، ١١)دا دەردەکەوێت و لە سـەیرکردنی (خـشـتـەی ژمـارە -٤ - و شـێـوەی ژمـارە -٣ - )شـدا دەکرێت تێبینی ئەمانە بکەین. بڕوانە خشتەی ژمارە (٤).

لێرەدا دەکرێت بڵێین لەگەڵ ئەو گۆڕانانەی، کە لەم ماوەیەدا بەسەر قـەبارەی دانیـشـتـوانی نشـینگە شارستانییەکانی قەزاکەدا هاتووە، کەچی پلەی ریزبەندی قەبارەییان تا رادەیەکی زۆر وەک خـۆی مـاوەتەوە لەم سـۆنگەوە دەکـرێت نشـینگە شارستانییەکانی قەزای کۆیە بەپێی ریزبەندی قـەبارەییـان لە سـاڵی (٢٠٠٢) پـۆلـێن بـکـەیـن بـۆ سـێ دەستەی جیاواز بەم شێوەیە:

**دەستەی یەکەم/ نشینگەی قەبارە گەورە:**

سـەنتـەری قـەزا (شـاری کـۆیە) کەوتۆتە نێو ئەم دەستـەیە و قەبارەی دانیـشـتـوانی لەم سـاڵەدا نزیکەی (٣٤٥١٨) کـەس بووە و (٦٦٪)ی کۆی دانیشتوانی شارنشینی قەزاکەی پێکهێناوە. بەم جۆرە بە گـەورەترین نشـینگەی شـارسـتـانی قـەزاکـە دادەنـدرێت و لـە تـەواوی مــاوەی سـاڵانی لێکۆڵینەوەدا ریزبەندی یەکەمی وەرگرتووە.

**دەستەی دووەم/ نشینگەی قەبارە نێوەنج:**

شارۆچکەی (تەقتەق) دەکەوێتە نێـو ئەم دەسـتـەیە و قـەبارەی دانیـشـتـوانی لەم سـاڵەدا نزیکەی (١٧،٠٠٠) کەس بووە، کە نزیکەی (٣٢،٥٪) کـۆی دانیـشـتـوانی شارنشینی قەزاکەی پێکهێناوە، لە تەواوی مـاوەی سـاڵانی لێکۆڵینەوەشـدا لە رووی قـەبارەی دانیشتوانەوە دوابەدوای شاری کۆیە هاتووە.

**دەسـتـەی سـێـیـەم/ نشـینگەی قەبارە بچووک:**

هەردوو شـارۆچکەی (خـەرابە و دێگەڵە) دەکەونە نێو ئەم دەستـەیە،

**خشتەی ژمارە (٤)**

**قەبارە و رێژەی دانیشتوانی نشینگە شارستانییەکانی قەزای کۆیە**

**(١٩٥٧ -٢٠٠٢)**

| یەکەی کارگێری | ١٩٥٧ | | | ١٩٧٧ | | | ١٩٨٧ | | | ٢٠٠٢ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | قەبارەی موڵکە شارستانییەکان/ کەس | ٪ لە کۆی دانیشتوانی قەزا | ٪ لە کۆی شارنشینی قەزا | قەبارەی موڵکە شارستانییەکان/ کەس | ٪ لە کۆی دانیشتوانی قەزا | ٪ لە کۆی شارنشینی قەزا | قەبارەی موڵکە شارستانییەکان/ کەس | ٪ لە کۆی دانیشتوانی قەزا | ٪ لە کۆی شارنشینی قەزا | قەبارەی موڵکە شارستانییەکان/ کەس | ٪ لە کۆی دانیشتوانی قەزا | ٪لە کۆی شارنشینی قەزا |
| ناحیەی سەنتەر | ٨٤٨٤ | ٢٣,٥ | ٩٥ | ١٥٣١٩ | ٣١,٨ | ٨٩,٦ | ٣٩٤٨٤ | ٩٦,٩ | ١٠٠ | ٣٤٥١٨ | ٤٠,٤ | ٦٦ |
| ناحیەی تەقتەق | ٤٥٠ | ١,٢ | ٥ | ١٤٧٧ | ٣,٠٦ | ٨,٦ | - | | | ١٧٠٠٠ | ١٩,٩ | ٣٢,٥ |
| ناحیەی شۆڕش | | | | ٢١٣ | ٠,٦٥ | ١,٨ | | | | ٣٢٠ | ٠,٣٧ | ٠,٦١ |
| ناحیەی ئاشتی | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٤٠٠ | ٠.٤٦ | ٠.٧٦ |
| کۆی گشتی | ٨٩٣٤ | ٢٤.٧ | ١٠٠ | ١٧١٠٩ | ٣٥.٥ | ١٠٠ | ٣٩٤٨٤ | ٩٦.٦ | ١٠٠ | ٥٢٢٣٨ | ٦١ | ١٠٠ |

***** شێوەی ژمارە ٢

١- شاری (کۆیە)، کە سەنتەری کارگێڕی قەزاکەیە لە ساڵی (٢٠٠٢)دا نزیکەی (٤٠٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکەی بەخۆوە گرتووە، لە کاتێکدا ئەم رێژەیە لە ساڵانی (١٩٥٧ و ١٩٧٧ یەک بەدوای یەک لە (٢٣.٥٪ ٣٢٪) بووە. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧ لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە کارگێڕی و دیمۆگرافیانەی بەسەر قەزاکەدا هاتووە قەبارەی دانیشتوانی ئەم نشینگەیە هەڵدەکشێ و نزیکەی (٩٧٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکە پێکدەهێنێت بەم جۆرە لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٧ -٢٠٠٢) قەبارەی دانیشتوانەکەی بە رێژەی گەشەی ساڵانەی (٣.١٪) زیادی کردووە (بڕوانە خشتەی ژمارە -٥-).

٢- شارۆچکەی تەقتەق، کە سەنتەری ناحیەی (تەقتەق)ە لە ساڵی (٢٠٠٢)دا نزیکەی لە (٢٠٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکەی بەخۆوە گرتووە. لە کاتێکدا ئەم رێژەیە لە ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٧٧) یەک بەدوای یەک (١.٢٪ و ٣٪) زیاتر نەبووە. واتە لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوەدا قەبارەی دانیشتوانی ئەم نشینگەیە بە رێژەی گەشەی ساڵانەی (٨.٤٪) زیادی کردووە.

**خشتەی ژمارە (٥)**
**ناوەندە شارستانییەکانی قەزای کۆیە بە گوێرەی شاری یەکەم(*)**
**(١٩٥٧ -٢٠٠٢)**

| یەکە کارگێڕییەکان | ١٩٥٧ – ١٩٧٧ | ١٩٧٧ – ٢٠٠٢ | ١٩٥٧ – ٢٠٠٢ |
|---|---|---|---|
| ناحیەی سەنتەر | ٠,٤- | ١,٧ | ٠,٨ |
| ناحیەی تەقتەق | ٣,١ | ٢,٤ | ٢,٧ |
| ناحیەی شۆڕش | - | ١,٤ | - |
| ناحیەی ئاشتی | | | |
| قەزا | ١,٥ | ٠,٩ | ١,١٤ |

سەرچاوە/ بە پشتبەستن بە خشتەی ژمارە (٤) ڕێژەکان دەرهێنراون.
(*) (ناحیەی شۆڕش) وەک یەکەیەکی کارگێڕی لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ دەردەکەوێت و لە ساڵی ١٩٨٧ دەکرێتەوە بە گوند.
(**) (ناحیەی ئاشتی) وەک یەکەیەکی کارگێڕی لە ساڵی ١٩٩٨ دەردەکەوێت.

٣- شارۆچکەی (دێگەڵە)، کە سەنتەری ناحیەی (شۆڕش)ە لە ساڵی ٢٠٠٢دا نزیکەی (٠.٤٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکەی لەخۆ گرتووە، ئەم ڕێژەیەش لە ساڵی (١٩٧٧)دا لە (٠.٦٪) بووە، واتە لەم ماوەیەدا گۆڕانێکی ئەوتۆ بەسەر قەبارەی ئەم نشینگەیەدا نەهاتووە بەهۆی پشتگوێ خستنی لەلایەن کاربەدەستانەوە.
٤- شارۆچکەی (خەرابە)، کە سەنتەری کارگێڕی (ناحیەی ئاشتی) یە لە ساڵی (٢٠٠٢)دا نزیکەی (٠.٥٪)ی کۆی دانیشتوانی قەزاکە لەخۆ دەگرێت، ئەمەش بۆ تازەیی ئەم نشینگە شارستانییە دەگەڕێتەوە، وەک لە پێشدا ئاماژەمان پێدا.

قەبارەی دانیشتوانیان یەک لەدوای یەک (٤٠٠ و ٣٢٠) کەس بووە، کە نزیکەی (٠.٨٪ و ٠.٦٪)ی کۆی دانیشتوانی شارنشینی قەزاکەیان پێکهێناوە و بە بچووکترین دوو نشینگەی شارستانی قەزاکە هەژمار دەکرێن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەمەی پێشوودا دەردەکەوێت، کە جیاوازییەکی زۆر لە قەبارەی دانیشتوانی نشینگە شارستانییەکانی قەزاکەدا هەیە لە سەیر کردنی (خشتەی ژمارە ٦)دا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە قەبارەی دانیشتوانی نشینگەکان لە تەواوی ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو بنەما و پێوەرانە ناگونجێن، کە لەلایەن لێکۆڵەرانەوە داندراون بۆ ڕیزبەندی قەبارەیی نشینگە شارستانییەکان؟(*). چونکە نە قەبارەی دانیشتوانی شاری دووەم یەکسان دەبێت بە (٢/١) کۆی دانیشتوانی شاری یەکەم وەک (زیف) دەڵێت، نە شاری دووەمیش (٣/١)ی کۆی دانیشتوانی شاری یەکەم بەخۆوە دەگرێت، وەک (کریستالر) بۆی دەچێت. بڕوانە خشتەی ژمارە (٦)

لە ساڵی (١٩٥٧) شاری دووەم تەنها لە (٣.٥٪)ی کۆی دانیشتوانی شاری یەکەمی لەخۆگرتووە، لە ساڵی (١٩٧٧)یشدا ئەم ڕێژەیە دەگاتە نزیکەی لە (١٠٪)، کەچی لە ساڵی (٢٠٠٢) ڕێژەی شاری دووەم بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش زیاد دەکات و نزیک دەبێتەوە لە نیوەی کۆی دانیشتوانی شاری یەکەم، هەرچی شاری سێیەمیشە لە ساڵی (١٩٧٧)دا نزیکەی (٥/١)ی کۆی دانیشتوانی شاری دووەمی لەخۆوە گرتووە. لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە لە ساڵی (٢٠٠٢)دا داکشاوە بۆ (٢.٣٪)، بەڵام شاری چوارەم لە هەمان ساڵدا نزیکەی (٥/٤)ی کۆی دانیشتوانی شاری سێیەمی پێکهێناوە. ئەم جیاوازییە زۆرەش لە قەبارەی دانیشتوانی نشینگە شارستانییەکانی قەزاکە، لەلایەکەوە: پەیوەندی بە جیاوازی گەشەی ساڵانەی دانیشتوانی نشینگەکان و لەلایەکی تریشەوە: پەیوەندی بەو بنەما و پێوەرەوە هەیە، کە لە عێراقدا بۆ دیاریکردنی ناوەندە شارستانییەکان بەکاردەهێندرێت، ئەویش بنەمای (کارگێڕی)یە. وەک ئاشکرایە لە بەکارهێنانی ئەم پێوەرەدا هیچ ژمارێک بۆ قەبارەی دانیشتوان ناکرێت.

**ب- دابەشبوونی نشینگە**

**خشتەی ژمارە (٦)**

**ڕێژەی گەشەی ساڵانەی شارنشینان بەپێی یەكە كارگێڕییەكانی قەزای كۆیە (١٩٥٧ -٢٠٠٢) (٪)**

| ڕیزبەندی | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ٢٠٠٢ |
|---|---|---|---|
| شاری یەكەم | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |
| شاری دووەم | ٥,٣ | ٩,٦ | ٤٩,٢ |
| شاری سێیەم | | ٢١,١ | ٢,٣ |
| شاری چوارەم | | | ٨٠ |

سەرچاوە/ ڕێژەكان دەرهێندراون بە پشتبەستن بە خشتەی ژمارە (٤)

(*) بە مەبەستی زانینی ڕیزبەندی قەبارەیی ناوەندە شارستانییەكان لە ماوەی ساڵانی لێكۆڵینەوە بڕوانە (خشتەی ژمارە -٩).

**گوندییەكان (بەپێی تێكڕای قەبارەی گوند)**

نشینگە گوندییەكانی قەزای كۆیە لە ماوەی نێوان ساڵانی لێكۆڵینەوەدا گۆڕانی بەرچاو بەسەر ژمارە و قەبارەكانیدا هاتووە. لە سەیر كردنی (خشتەی ژمارە -٧)شدا دەردەكەوێت، كە ژمارەی نشینگەكانی لە (١٤٩) نشینگەوە لە ساڵی (١٩٥٧)دا كەمی كردووە بۆ (١٤٢) نشینگە لە ساڵی (٢٠٠٢). لە بەرامبەریشدا قەبارەیان لەم ماوەیەدا لە زۆربوونی بەردەوامدا بووە، ئەم گۆڕانەش، كە بەسەر ژمارە و قەبارەی ئەم نشینگانەدا هاتووە. كاریگەری زۆریان لەسەر تێكڕای قەبارەی گوند جێهێشتووە.

بە جۆرێك لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٧٧) تێكڕای قەبارەی گوند لە قەزاكە لە (١٨٣كەس/ گوند)ەوە هەڵكشاوە بۆ (٢١٢كەس/ گوند) واتە لەم ماوەیەدا قەبارەی نشینگەكان بە تێكڕایی گۆڕانی ساڵانەی (١.٥ كەس/ گوند) ڕوویان لە زیاد بوون بووە،

***** جدول ژمارە ٧

وەك لە خشتەی ژمارە (٨) بەرچاو دەكەوێت. لە ساڵی (٢٠٠٢)ش تێكڕای ئەم قەبارەیە گەیشتۆتە (٢٣٤ كەس/ گوند)، واتە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (١٩٧٧)دا جارێكی تر بە تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی (١كەس/ گوند) ڕووی لە زیادبوون بووە، ئەمەش لەلایەكەوە بۆ كەمبوونی ژمارەی نشینگەكان و لەلایەكی تریشدا بۆ زۆربوونی ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانیشتوانی ئەم نشینگانە دەگەڕێتەوە.

هەر لە (خشتەی ژمارە -٧-)دا تێبینی دەكرێت، كە ئەم نشینگانە بە شێوەیەكی چونیەك بەسەر یەكە كارگێڕییەكانی قەزاكە دابەش نەبوونە. بەڵكو جیاوازییەكی زۆر لە ژمارە و قەبارەیاندا لە یەكەیەكەوە بۆ یەكەیەكی تر و لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تردا هەیە. لێرەشدا بە مەبەستی زانینی تێكڕای قەبارەی دانیشتوانی ئەم نشینگانە. بە پشتبەستن بە خشتەی ناوبراو دەكرێت نشینگەكان لەسەر ئاستی یەكە كارگێڕییەكاندا بەم شێوەیە دابەش بكەین:

١- ناحیەی سەنتەر: ئەو یەكەیە لە ساڵی (١٩٥٧)دا نزیكەی (٨٤) نشینگەی گوندی قەزاكەی لەخۆگرتووە.، كە ئەوانیش نزیكەی (٥٢ ٪)ی كۆی ژمارەی گوندنشینانی قەزاكەیان پێكهێناوە. بەم جۆرە تێكڕای قەبارەی گوند لەم ساڵەدا (١٦٩ كەس/ گوند) بووە. بەڵام لە ساڵی (١٩٧٧)دا لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە كارگێڕی و دیمۆگرافیانەی، كە بەسەر قەزاكەدا هاتووە ژمارەی نشینگەكان كەمی كردووە بۆ (٤٨) نشینگە و ئەوانیش (٢٥,٤ ٪)ی كۆی ژمارەی گوندنشینی قەزاكەیان پێكهێناوە. ئەم گۆڕانەش، كە بەسەر ژمارە و دانیشتوانی نشینگەكاندا هاتووە كاریگەری هەبووە لەسەر كەمبوونی تێكڕای قەبارەی گوند بۆ نزیكەی (١٦٢كەس/ گوند) بەم جۆرە تێكڕای قەبارەی گوند لەم یەكەیە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧ - ١٩٧٧) بە تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی زیاتر لە (-٠.٤ كەس/ گوند) كەمی كردووە. كەچی لە ساڵی (٢٠٠٢)دا ئەم تێكڕاییە هەڵدەكشێ

**خشتەی ژمارە (٨)**

**تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی قەبارەی گوند لەسەر ئاستی یەكە كارگێڕییەكانی قەزای كۆیە (١٩٥٧-٢٠٠٢)**

| یەكە كارگێڕییەكان | ١٩٥٧ – ١٩٧٧ | ١٩٧٧ – ٢٠٠٢ | ١٩٥٧ – ٢٠٠٢ |
|---|---|---|---|
| ناحیەی سەنتەر | ٠,٤ | ١,٧ | ٠,٨ |
| ناحیەی تەقتەق | ٣,١ | ٢,٤ | ٢,٧ |
| ناحیەی شۆڕش | | ١,٤- | - |
| ناحیەی ئاشتی | - | | - |
| قەزا | ١,٥ | ٠,٩ | ١,١٤ |

سەرچاوە: بە پشتبەستن بە خشتەی ژمارە (٧) ڕێژەكان دەرهێندراون.

و دەگاتە (٢٠٤ كەس/ گوند) واتە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (١٩٧٧)دا بە تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی (١.٧ كەس/ گوند) زیادی كردووە، ئەوەش لە ئەنجامی ئاسایی بوونەوەی ڕەوشی رامیاری ناوچەكە و گەڕانەوەی خەڵكی كۆچپێكراو بۆ سەر زێدی خۆیانەوە دێت، لە سەیركردنی نەخشەكانی ژمارە (١٢، ١٣، ١٤)شدا ئەم گۆڕانانە روونتر دەردەكەون.

٢- ناحیەی تەقتەق: ئەو یەكەیە لە ساڵی (١٩٥٧)دا نزیكەی (٦٥) نشینگەی گوندیی قەزاكەی لەخۆ گرتووە، ئەوانیش زیاتر لە (٤٨٪)ی دانیشتوانی گوندنشینی قەزاكەیان پێكهێناوە. بەم جۆرە تێكڕای قەبارەی گوند لەم ساڵەدا نزیكەی (٢.٢ كەس/ گوند) بووە، كەچی لە ساڵی (١٩٧٧) لەبەر هەمان ئەو هۆكارانەی، كە پێشتر ئاماژەمان پێدا ژمارەی نشینگەكان بۆ (٥٤) نشینگە كەم دەكەن، چونكە ژمارەیەك لەو نشینگانەی كەوتبوونە بەشەكانی باكووری ناحیەی ناوبراو، كە چڕی دانیشتوانیان بە بەراورد لەگەڵ نشینگەكانی باشووری ئەم یەكەیە كەمتر بووە و خراونەتە سەر ناحیەی (شۆڕش) وێڕای بەرزی ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانیشتوان لەم ماوەیەدا. كە كاریگەرییان بووە لەسەر بەرزبوونەوەی تێكڕای قەبارەی گوند بۆ (٢٦٣ كەس/ گوند). واتە لەم ماوەیەدا (١٩٥٧ -١٩٧٧) بە تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی (٣.١ كەس/ گوند) بە ئاراستەی زۆربوون چووە. بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٢) تێكڕای قەبارەی گوند بە شێوەیەكی سەرنجڕكێش هەڵدەكشێ و دەگاتە زیاتر لە (٣٢٤ كەس/ گوند)، واتە بە بەراورد لەگەڵ (١٩٧٧)دا جارێكی تر بە تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی (٢.٤ كەس/ گوند) زیادی كردووە. ئەو گۆڕانە گەورەیەش، كە لەم ماوەیەدا بەسەر تێكڕای قەبارەی گوندی ئەم یەكەیەدا هاتووە و دەرئەنجامی چەند هۆكارێك بووە، لەوانە كەمبوونەوەی ژمارەی نشینگەكانی بۆ (٣٢) نشینگە لە ئەنجامی دابڕانی زیاتر لە (٢٠) نشینگەی رۆژهەڵاتی ئەم ناحیەیە و دروستكردنی ناحیەی ئاشتی لێیان، وێڕای ئاسایی بوونەوەی ڕەوشی رامیاری ناوچەكە و گەڕانەوەی ژمارەیەكی زۆری خەڵكی كۆچپێكراو بۆ سەر زێدی خۆیان دوابەدوای ساڵی ١٩٩١.

٣- ناحیەی شۆڕش: وەك یەكەیەكی تازە لە سەرژمێری گشتی دانیشتوان لە ساڵی (١٩٧٧)دا دەركەوتووە و (٤٢) نشینگەی گوندی قەزاكەی لەخۆوە گرتووە، ئەوانیش نزیكەی (٢٨٪)ی دانیشتوانی گوندنشینی قەزاكەیان پێكهێناوە. بەم جۆرە تێكڕای قەبارەی گوند لە ناحیەی ناوبراودا زیاتر لە (٢,٥ كەس/ گوند) بووە. بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٢) بە پێچەوانەی یەكە كارگێڕییەكانی تری قەزاكە ئەم تێكڕایە دادەكشێ و دەگاتە (١٦٥ كەس/ گوند) واتە بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٧٧دا بە تێكڕای گۆڕانی ساڵانەی (- ١.٤ كەس/ گوند) كەمیان كردووە. ئەمەش لە ئەنجامی ئەم جووڵە شوێنجێییەوە دێت، كە دانیشتوانی ناوچەكە بۆ دەرەوەی سنووری ئەم یەكەیە كردوویانە بە هۆی سنوورداری

توانا ئابوورییەكانی ناوچەكە.

٤- ناحیەی ئاشتی: لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە كارگێڕییانەی لەم ساڵانەی دواییدا قەزای كۆیە بەخۆوەی بینیوە وەک یەكەیەكی نوێ دەركەوتووە و (٢٠) نشینگەی گوندیی قەزاكەی بەخۆوە گرتووە، لە ساڵی (٢٠٠٢)شدا نزیكەی (١٨٪)ی دانیشتوانی گوندنشینی قەزاكەی پێكهێناوە. بەم جۆرە تێكڕای قەبارەی گوند گەیشتۆتە نزیكەی (٢٩٧ كەس/ گوند). بەرزی ئەم تێكڕاییە لەم بەشەدا بە پلەی یەكەم بۆ سروشتی كشتوكاڵی ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە. لێرەشدا دەكرێت بگوترێت تێكڕای قەبارەی گوند لە قەزای كۆیە لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تر و لە یەكەیەكی كارگێڕی بۆ یەكەیەكی تر جیاوازە. بە شێوەیەكی گشتیش ئەم تێكڕاییە لە ساڵی (٢٠٠٢) زیاتر دەبێت لە ساڵانی تری لێكۆڵینەوە، ناحیەی (تەقتەق)یش لە رووی ئەم تێكڕاییە لە تەواوی ماوەی نێوان ساڵانی لێكۆڵینەوەدا لە پێشەنگی یەكەكانی قەزاكەدا هاتووە. دوابەدوای ئەویش لە ساڵی (٢٠٠٢) ناحیەی ئاشتی هاتووە. ئەوەی جێگای تێبینییە هەردوو یەكەی (تەقتەق و ئاشتی) دەكەونە بەشەكانی باشووری قەزاكە. لەمەشەوە دەردەكەوێت تا بەرەو بەشەكانی باشوور بڕۆین قەبارەی مۆڵگەكان گەورەتر دەبن، كەچی هەردوو ناحیەی (سەنتەر و شۆڕش)، كە بەشەكانی ناوەڕاست و باكووری قەزاكە داگیر دەكەن، ئەم تێكڕاییە تیایاندا كەم دەبێت. لێرەشدا فاكتەرە سروشتی و مرۆییەكان، كە خۆیان لە

باروودۆخی ئاووهەوادا بەرزی و نزمی و جۆری خاک و سەرچاوەكانی ئاو، جگە لە قەبارە و جۆری مڵكداریەتی زەوییە كشتوكاڵییەكان و جۆری كشتوكاڵ و وەبەرهێنانی زەوی و رێگاكانی ئاودێری دەبینێتەوە كاریگەری زۆریان لەسەر قەبارە و دابەشبوونی نشینگەكان داناوە.

### ج- دابەشبوونی نشینگە گوندییەكان (بەپێی ریزبەندی قەبارەیان)

مەبەست لەم جۆرە دابەشكردنە ریزبەندكردنی نشینگە گوندییەكانە بەپێی دەستەی قەبارەییان. لە رێگای ئەم جۆرە لێكۆڵینەوەدیە هەموو ئەو گۆڕانانەی بەسەر قەبارەی دانیشتوانی ئەم نشینگانەدا هاتووە، لە ماوەی نێوان ساڵانی لێكۆڵینەوەدكە دەردەكەون. بە جۆرێک هەندێک نشینگە قەبارەیان زیادی كردووە لە بەرامبەریشدا هێندێكی تر كەمیان كردووە. جیاوازی باروودۆخە سروشتی و مرۆییەكان لە بەشێكەوە بۆ بەشێكی تری قەزاكە كاریگەرییان لەسەر جیاوازی قەبارەی نشینگەكانی جێهێشتووە وەک لە (نەخشەی ژمارە -١٠- و شێوەی ژمارە -٣-)دا بەرچاو دەكەوێت.

لێرەدا بە مەبەستی روونكردنەوە و خستنە رووی زیاتری ئەم دابەشبوونە هەوڵدەدەین نشینگە گوندییەكانی قەزاكە بەپێی قەبارەیان بە پشتبەستن بە خشتەی ژمارە (٩)، بۆ چەند دەستەیەكی جیاواز لە یەكتری دابەش بكەین بەم شێوەیەی خوارەوە:

**دەستەی یەكەم/ (كەمتر لە ٢٠٠ كەس)**

ئەو نشینگانەی كەوتوونەتە نێو ئەم دەستەیە زۆرترین رێژە لە كۆی نشینگە گوندییەكانی قەزاكە لە تەواوی ماوەی نێوان ساڵانی لێكۆڵینەوە پێكدەهێنن. بە جۆرێک لە ساڵی (٢٠٠٢) نزیكەی (٥٣٪)ی كۆی نشینگە و (٢٢٪)ی كۆی ژمارەی گوندنشینانی قەزاكەیان پێكهێناوە. ئەم رێژانەش بە بەراورد لەگەڵ ماوەی تری ساڵانی لێكۆڵینەوە بە رێژەیەكی نزم دادەنرێت. لە سەیركردنی (خشتەی ژمارە -١٥-)شدا تێبینی دەكرێت لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٧ - ١٩٧٧) هەریەک لە ژمارەی نشینگە و دانیشتوانی نێو ئەم دەستەیە یەک بەدوای یەک بە رێژەی گەشەی ساڵانەی (-٠.٨٪ و -٠.٩٪) كەمیان كردووە و لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٧ -٢٠٠٢) جارێكی تر بە رێژەی (-٠.٣٪ و -٠.٩٪) روویان لە كەمبوونەوە بووە.

ئەمەش تارادەیەكی زۆر پەیوەندی بە ئاسایی بوونەوەی رەوشی رامیاری ناوچەكەوە هەیە لە ساڵانی (١٩٧٧ و ٢٠٠٢)، كە بووە بە مایەی گەڕانەوەی ژمارەیەكی زۆری گوندنشینانی ناوچەكە بۆ سەر زێدی پێشووی خۆیان. لەمیانەی ئەمەشدا ژمارەیەک لەو مۆڵگانەی، كە پێشتر لەنێو ئەم دەستەیەدا بوونە بەرەو دەستەیەكی گەورەتر هەڵكشاون.

**دەستەی دووەم/ (٢٠٠ -٢٩٩ كەس)**

ئەو نشینگانەی كوتوونەتە نێو ئەم دەستەیە، لە ساڵی (٢٠٠٢)

نزیکەی (٢٢ ٪)ی کۆی نشینگە گوندییەکان و زیاتر لە (٢٦ ٪)ی کۆی ژمارەی گوندنشینانی قەزاکەیان پێکهێناوە. ئەم ڕێژانەش بە بەراورد لەگەڵ ماوەی سالانی تری لێکۆڵینەوە جارێکی تر بە ڕێژەیەکی نزم دادەنرێن، بە جۆرێک ئەو نشینگانەی کەوتوونەتە نێو ئەم دەستەیە، لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٥٧ -١٩٧٧) بە ڕێژەی گەشەی سالانەی زیاتر لە (٠.٥ ٪) نشینگە و کەمتر لە (٤ ٪)ی دانیشتوان زیادیان کردووە. کەچی لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٧٧ -٢٠٠٢)دا هەریەک لە نشینگە و دانیشتوانی نێو ئەم دەستەیە بە ڕێژەی (- ١ ٪ و -٩ ٪) کەمیان کردووە، ئەمەش لەلایەکەوە پەیوەندی بە ژمارەی دانیشتوانی ئەم نشینگانەوە هەیە، کە دەستەی قەبارەیی پێشوویان بەزاندووە هاتوونەتە نێو ئەم دەستەیە و تارادەیەکیش ژمارەی دانیشتوانیان هەر لە دەستەی یەکەم نزیک بووە، لەلایەکی تریشەوە ژمارەیەکی زۆرتری نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە بەرەو دەستەیەکی قەبارەیی گەورەتر هەڵکشاون.

**دەستەی سێیەم (٤٠٠ -٥٩٩ کەس)**

ئەو نشینگانەی کەوتوونەتە نێو ئەم دەستەیەش لە ساڵی (٢٠٠٢) نزیکەی (١٣ ٪)ی کۆی نشینگە گوندییەکان و (٢٥ ٪)ی کۆی ژمارەی گوندنشینانی قەزاکەیان پێکهێناوە. ئەوەش بە بەرزترین ڕێژە دادەندرێت بە بەراورد لەگەڵ ماوەی سالانی تری لێکۆڵینەوە. هەر لە سەیرکردنی (خشتەی ژمارە -٩)دا تێبینی دەکرێت لە ساڵی ١٩٧٧ نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە کەمترین ڕێژەیان پێکهێناوە، بە جۆرێک لە ماوەی سالانی (١٩٥٧ -١٩٧٧) هەریەک لە نشینگە و دانیشتوانیان بە ڕێژەی گەشەی سالانەی (- ٤.٠ ٪ و -٠.٦ ٪) کەمیان کردووە، چونکە ژمارەیەکی بەرچاو لە نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە لە ساڵی (١٩٧٧) بەرەو دەستەیەکی قەبارەیی گەورەتر هەڵکشاون. کەچی لە ماوەی سالانی (١٩٧٧ -٢٠٠٢)دا هەریەک لە نشینگە و دانیشتوانی نێو ئەم دەستەیە بە ڕێژەی گەشەی سالانەی (+ ١.٣ ٪) زیادیان کردووە.

**خشتەی ژمارە (٩)**
**دابەشبوونی قەبارەیی نشینگە گوندییەکانی قەزای کۆیە لەماوەی سالانی (١٩٥٧ -٢٠٠٢) (٪)ی کۆی هەمووی**

| دەستەی قەبارەیی | ١٩٥٧ | | ١٩٧٧ | | ٢٠٠٢ | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ڕێژەی گوند | ڕێژەی دانیشتوان | ڕێژەی گوند | ڕێژەی دانیشتوان | ڕێژەی گوند | ڕێژەی دانیشتوان |
| کەمتر لە ٢٠٠ | ٦٥,١ | ٣٣ | ٥٦,٩ | ٢٤,٥ | ٥٢.٨ | ٢٢ |
| ٢٠٠ – ٣٩٩ | ٢٤,١ | ٣٧,٦ | ٢٧,٨ | ٣٦ | ٢١,٨ | ٢٦.٣ |
| ٤٠٠ – ٥٩٩ | ٩,٤ | ٢٤,٨ | ٩ | ١٩,٦ | ١٢.٧ | ٢٥ |
| ٦٠٠و زیاتر | ١,٤ | ٤,٦ | ٥,٦ | ١٩,٩ | ٧.٨ | ٢٦.٧ |
| نەزانداوە | | | ٠,٧ | | ٤.٩ | |
| | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

سەرچاوەکان:
١- وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، سكان القرى لألوية الموصل والسليمانية وأربيل وكركوك وديالى، المصدر السابق، ص ٢٥٠ -٢٥٦.
٢- مديرية تخطيط محافظة أربيل، المجموعة الاحصائية لريف محافظة أربيل حسب تعداد ١٩٧٧، جداول رقم (١٢، ١٣، ١٤)، ص ٢٩ -٣٤.
٣- JHIC,OPC.IT,P.(No)

ئەمەش بۆ ئاسایی بوونەوەی رەوشی رامیاری ناوچەکەوە دێت، کە بووە مایەی گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کۆچپێکراوی ناوچەکە بۆ سەر زێدی خۆیان دوابەدوای ساڵی (١٩٩١). لە میانەی ئەمەشەوە ژمارەیەک لەو نشینگانەی، کە پێشتر لەنێو دەستەی قەبارەیی بچووکتر بوون دەستەی پێشوویان بەزاندووە و هاتوونەتە نێو ئەم دەستەیە.

**دەستەی چوارەم (٦٠٠ کەس و زیاتر):**

ئەو نشینگانەی کەوتوونەتە نێو ئەم دەستەیە رێژەیەکی کەم لە کۆی نشینگە گوندییەکانی قەزاکە لە تەواوی ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە پێکدەهێنن. بە جۆرێک لە ساڵی (٢٠٠٢)دا نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە کەمتر لە (٨٪)ی کۆی نشینگە گوندییەکانی قەزاکەیان پێکهێناوە. بەڵام زیاتر لە (٢٦٪)ی کۆی ژمارەی گوندنشیانی قەزاکەیان بەخۆوە گرتووە. ئەوەی جێگای تێبینی بێت ئەوەیە، کە رێژەی نشینگە و دانیشتوانی نێو ئەم دەستەیە لە ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوە بە بەراورد لەگەڵ دەستەکانی تردا بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان کردووە، بە جۆرێک لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٧٧)دا بە رێژەی گەشەی ساڵانەی زیاتر لە (٧٪)ە نشینگە و (٨٪)ی دانیشتوان روویان لە زۆربوون بووە. لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٧ - ٢٠٠٢) بە نزیکەی (٢.٣٪)ی نشینگە و زیاتر لە (١.٥٪)ی دانیشتوان جارێکی تر زیادیان کردووە. ئەمەش لە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی گوندنشینەکانەوە هاتووە: لە ئەنجامی ئاسایی بوونەوەی رەوشی رامیاری دەڤەرەکە لەم ماوەیەدا و لە ساڵانی (١٩٧٧ و ٢٠٠٢) وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا.

بەڵام سەبارەت بە دابەشبوونی نشینگە گوندییەکانی بەپێی ریزبەندی قەبارەییان لەسەر ئاستی یەکە کارگێڕییەکان لەماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوەدا گۆڕانێکی گەورە بەدی دەکرێت، کە بەسەر ژمارە و قەبارەی نشینگەکاندا هاتووە. لە سەیرکردنی خشتەی ژمارە (١٦) و نەخشەی ژمارە (١٦، ١٧، ١٨)دا دەکرێت تێبینی ئەمانە بکەین:

١- ئەو نشینگە گوندییانەی کەوتوونەتە نێو دەستەی قەبارەیی (٢٠٠ کەس کەمتر) زۆرترین رێژە لە کۆی نشینگە گوندییەکانی هەردوو ناحیەی (شۆڕش و سەنتەر) لە تەواوی ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە پێکدەهێنن. بە جۆرێک لە ساڵی ٢٠٠٢ یەک بەدوای یەک (٦٢٪ و ٥٨٪)ی نشینگە و لە (٣٧.٥٪ و ٢٧٪)ی کۆی ژمارەی گوندنشینانی هەردوو یەکەی ناوبراویان پێکهێناوە لە بەرامبەریشدا هەردوو ناحیەی (ئاشتی و تەقتەق) یەک بەدوای یەک (٤٠٪ و ٤٠.٦٪)ی کۆی نشینگە و (١٤٪ و ١١٪)ی کۆی ژمارەی گوندنشینانیان بەخۆوە گرتووە، ئەم رێژانەش لە ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەدا لە هەردوو ناحیەی (سەنتەر و تەقتەق) بە ئاراستەی داکشان و لە (ناحیەی شۆڕش)یشدا بە ئاراستەی هەڵکشان چوون.

٢- ئەو نشینگە گوندییانەی

**خشتەی ژمارە (١٠)**

**رێژەی گەشەی ساڵانەی نشینگە و دانیشتوانی گوندەکان لە قەزای کۆیە (١٩٥٧ -٢٠٠٢)**

| دەستەی قەبارەیی | ١٩٥٧ – ١٩٧٧ | | ١٩٧٧ – ٢٠٠٢ | |
|---|---|---|---|---|
| | گوند | دانیشتوان | گوند | دانیشتوان |
| کەمتر لە ٢٠٠ | ٠،٨٣ | -٠،٩٢ | ٠،٢٥ | ٠،٠٩ |
| ٢٠٠ – ٣٩٩ | ٠،٥٢ | ٠،٣٦ | ١ | -٠،٩٣ |
| ٤٠٠ – ٥٩٩ | ٠،٣٦ | -٠،٦ | ١،٢ | ١،٢ |
| ٦٠٠ و زیاتر | ٧،١ | ٨،١ | ٢،٢٦ | ١،٥٤ |

سەرچاوە/ رێژەکان بە پشتبەستن بە سەرچاوەکانی خشتەی ژمارە (٩) دەرهێندراون.

قەبارەیان لە نێوان (٢٠٠ -٣٩٩ کەس) دابە ڕێژەیەکی زۆر لە نشینگەکانی هەردوو ناحیەی (ئاشتی و تەقتەق) پێکدەهێنن. بە جۆرێک لە ساڵی (٢٠٠٢) یەک بەدوای یەک نزیکەی (٣٥٪ و ٢٢٪)ی کۆی نشینگە و (٣٤٪ و ١٩٪)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی هەردوو ناحیەی ناوبراویان پێکهێناوە. لە بەرامبەردا ڕێژەی نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە لە هەردوو ناحیەی (شۆڕش و سەنتەر) یەک بەدوای یەک نزیکەی (٢١٪ و ١٧٪)ی کۆی نشینگە و لە (٣٥٪ و ٢٣٪)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینیان لە خۆوە گرتووە. لەماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەشدا ئەم ڕێژانە هەڵکشان و داکشانێکی بەرچاویان بەخۆوە بینیوە.

٣- ئەو نشینگانەی قەبارەیان لە نێوان (٤٠٠ -٥٩٩) کەسدایە ڕێژەیەکی کەمی نشینگە گوندییەکانی هەردوو ناحیەی (شۆڕش و سەنتەر) پێکدەهێنن، بەجۆرێک لە ساڵی (٢٠٠٢)دا یەک بەدوای یەک (٧٪ و ١٠٪)ی نشینگە زیاتر نەبوو، کە ئەوانیش نزیکەی (١٨٪ و ٢٤٪)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی هەردوو یەکەی ناوبراویان لەخۆ گرتووە.

بە جۆرێک لە ساڵی (٢٠٠٢)دا یەک بەدوای یەک (٧٪ و ١٠٪)ی کۆی نشینگە زیاتر نەبوو، کە ئەوانیش نزیکەی (١٨٪ و ٢٤٪)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی هەردوو یەکەی ناوبراویان لەخۆ گرتووە. لە بەرامبەردا ڕێژەی نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە لە هەردوو ناحیەی (ئاشتی و تەقتەق) یەک بەدوای یەک نزیکەی (٣٥٪ و ٢٢٪)ی کۆی نشینگەی گوندەکەیان و (٣٧٪ و ٣١٪)ی کۆی دانیشتوانی هەردوو یەکەی ناوبراویان لەخۆگرتووە. ئەوەی جێگای ئاماژەشە ئەوەیە: ئەو نشینگە گوندییانەی کەوتوونەتە نێو ئەم دەستەیە لە ناحیەی سەنتەر گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتووە لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە، کەچی لە ناحیەی شۆڕش ڕێژەکان بەرەو کەمبوون و لە ناحیەی تەقتەق بەرەو بەرزی چوون.

٤- ئەو نشینگە گوندییانەی قەبارەیان لە (٦٠٠ کەس و زیاتر)ە لە هەردوو ناحیەی (تەقتەق و ئاشتی) لە ساڵی (٢٠٠٢)دا یەک بەدوای یەک نزیکەی (١٦٪ و ١٠٪)ی کۆی نشینگە گوندییەکانی و (٣٨.٥٪ ٢٨٪)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی هەردوو یەکەی ناوبراویان لەخۆ گرتووە. ئەمەش ڕێژەیەکی بەرزە بە بەراورد لەگەڵ هەردوو ناحیەی (سەنتەر و شۆڕش)، کە یەک بەدوای یەک نزیکەی (٦٪ و ٥.٢٪)ی کۆی نشینگە و (٢٦٪ و ١٠٪)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی ئەم دوو یەکەیە بەخۆوە دەگرن. جێگای ئاماژە بۆ کردنە ئەو نشینگانەی کەوتوونەتە نێو ئەم دەستەیە ڕێژەیەکی کەمیان لە کۆی نشینگە و دانیشتوانی یەکەکانی قەزاکە لە ساڵانی (١٩٥٧ -١٩٧٧) پێکهێناوە. کەچی لە ساڵی (٢٠٠٢) بەهۆی ئاسایی بوونەوەی ڕەوشی رامیاری ناوچەکە ڕێژەی نشینگەکانی نێو ئەم دەستەیە لە تەواوی یەکەکان روویان لە زیادبوون بووە.

لێرەشدا ئەگەر ئەو نشینگە گوندییانەی کەوتوونەتە نێو دەستەی قەبارەیی (٢٠٠ کەس و کەمتر) بە نشینگەی قەبارە بچووک و ئەوانەی نێو دەستەی (٢٠٠ -٥٩٩ کەس) بە نشینگەی قەبارەی نێوەند و (٦٠٠ کەس و زیاتر)یش بە بەراورد لەگەڵ دەستەکانی تر بە نشینگەی قەبارە گەورە هەژمار بکەین، بەو دەرئەنجامە دەگەین، کە نشینگە قەبارە بچووکەکان، لە ساڵی (٢٠٠٢) زیاتر لە (٢/١)ی کۆی نشینگە و کەمتر لە (٤/١)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی قەزاکەیان بەخۆوە گرتووە، هەردوو ناحیەی (سەنتەر و شۆڕش) ڕێژەیەکی زۆری ئەم نشینگانە پێکدەهێنن. لە کاتێکدا نشینگە قەبارە نێوەنجەکان زیاتر لە (٣/١)ی کۆی نشینگە و (٢/١)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی قەزاکەیان لەخۆوەگرتووە ئەم نشینگانەش ڕێژەیەکی زۆر لە هەردوو یەکەی (تەقتەق و ئاشتی) پێکدەهێنن. بەڵام نشینگە قەبارە گەورەکان کەمتر لە (٨٪)ی نشینگە و زیاتر لە (٤/١)ی کۆی دانیشتوانی گوندنشینی قەزاکە پێکدەهێنن و هەردوو یەکەی (تەقتەق و ئاشتی) ڕێژەیەکی بەرزی ئەم نشینگانە بەخۆوە دەگرن. لە هەموو ئەمانەشدا دەگەینە ئەو ڕاستییەی، کە پەیوەندییەکی پێچەوانە لە نێوان ژمارە و قەبارەی نشینگەکان هەیە. بە جۆرێک تا قەبارەی نشینگەکان گەورەترین،

ژمارەیان کەمتر دەبێت. هەروەها پەیوەندییەکی راستەوانەش لە نێوان قەبارەی نشینگە و رێژەی دانیشتواندا هەیە: بە جۆرێک تا قەبارەی نشینگەکان گەورەترین رێژەیان لە کۆی ژمارەی دانیشتوان زۆرتر دەبێت.

لەبەر رۆشنایی ئەم بەشەی لێکۆڵینەوەدا دەگەینە ئەو پوختەیەی، کە رێژەی دانیشتوانی شارنشین لە ماوەی نێوان سالآنی (١٩٥٧ - ٢٠٠٢)دا لە زۆربوون و هەڵکشان و گوندنشینان لە داکشان و کەمبوونەوەدا بووە، جگە لەوە قەبارە و رێژەی شارنشینان لە ناوەندێکی شارستانی بۆ نێوەندێکی تر جیاوازبووە لە تەواوی ئەم ماوەیەدا، بە جۆرێک شاری (کۆیە) کە سەنتەری کارگێری قەزاکەیە، زۆرترین قەبارەی دانیشتوانی شارنشینی لەخۆ گرتووە، دوابەدوای ئەویش شارۆچکەی (تەقتەق) هاتووە. هەروەها ژمارە و قەبارەی نشینگە گوندییەکانی قەزاکەش لەم ماوەیەدا گۆڕانی گەورەیان بەخۆوە بینیوە. ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر تێکڕای قەبارەی گوند داناوە. بە جۆرێک ئەم تێکڕاییە لەو یەکە کارگێرییانەی کەتوونەتە باشووری قەزاکە (تەقتەق و ئاشتی)، زۆر زیاترە بە بەراورد لەگەڵ یەکەکانی (سەنتەر و شۆڕش)، کە بەشەکانی ناوەڕاست و باکووری قەزاکە داگیردەکەن، چونکە بەشەکانی باشووری قەزاکە بەهۆی سروشتی کشتوکاڵی ناوچەکە و بوونی سەرچاوەی ئاوی سەر زەوی، کە خۆی لە زێی بچووک دەبینێتەوە و ژمارەیەکی زۆری نشینگەی قەبارە گەورە لەخۆ دەگرن، کەچی لە بەشەکانی ناوەڕاست و باکووری قەزاکە بەهۆی سروشتی تۆپۆگرافی ناوچەکە و کەمی سەرچاوەکانی ئاو، نشینگە قەبارە بچووکەکان و رێژەیەکی زۆر لە نشینگەکانی ئەم ناوچانە پێکدێنن. ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێ، کە ژمارە و چڕی دانیشتوان زۆر دەبێت تا بەرەو بەشەکانی باشووری قەزاکە دابکشێنین، بە پێچەوانەشەوە راستە.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان

١- صبري فارس الهيتي وصالح فليح حسن، جغرافية المدن، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٦، لا ٢٣.
٢- وليد عباس حلمي وآخرون، التصحر في العراق، وزارة التخطيط، هيئة التخطيط الأقليمي، دراسة رقم (١٥١)، ١٩٨٥، لا ٨.
٣- عادل عبدالله خطاب، جغرافية المدن، مطبعة التعليم العالي جامعة الموصل، الموصل، ١٩٩٠، لا ٩ - ١٣.
٤- عبدالرزاق عباس حسن، جغرافية المدن، مطبعة أسعد، ١٩٧٧، لا ٢.
٥- رياض ابراهيم السعدي، الهجرة من الريف إلى الحضر في العراق، دوافعها، انماطها، اتجاهاتها، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، المجلد العاشر، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٨، لا ٣٩٤.

* هێندێک نشینگە لە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەپێی ئەم پێوەرەی لە عێراقدا بەکاردەهێنرێت بە (شار) هەژمار کراون: وەک (تەقتەق و دێگەڵە و خەرابە). کەچی هیچ سیمایەکی شاریان پێوە نابینرێت نە لە رووی روخساری دەرەوە نە لە رووی قەبارەی دانیشتوان و جۆری چالاکییە ئابوورییەکان، بۆیە وای بەباش دەزانین ئەم نشینگە شارستانییە لە لێکۆڵینەوەدا بە شارۆچکە و لە بەرامبەریشدا سەنتەری قەزا (کۆیە) بە شار هەژمار بکەین.

** لەوانە: زیف (GK. Zepi) پێیوایە قەبارەی دانشتوانی شاری دووەم یەکسان دەبێت بە نیوەی کۆی دانیشتوانی شاری یەکەم و شاری سێیەمیش (٣/١)ی کۆی دانیشتوانی شاری یەکەم دەبێت. هەرچی (کریستالەر W. Chiristalter)ە وای بۆ دەچێت شاری دووەم ٣/١ شاری یەکەم و شاری سێیەمیش (٣/١)ی کۆی دانیشتوانی شاری دووەم بەخۆوە دەگرێت.... هتد، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (عبدالرزاق عباس حسین، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤١ - ٢٥٧).

# گژوگیای کێویی ناوچەی هەولێر

**دکتۆر ئازاد حەمە شەریف**
**کۆلیژی زمان - زانکۆی سەلاحەددین**

**سەرەتا**

کوردستان بەلای کەمەوە دە هەزار جۆرە گژوگیا و ڕووەکی کێوی تێدایە. ئێمەی کورد ناوی هەندێکیان دەزانین و ناوی زۆربەشیان نەزانراوە.

ناوچەی هەولێر بەحوکمی ئەوەی پانتاییەکی فراوان دەیگرێتەوە، چەندین جۆر ئاو و هەوا و دەشت و دەر و کەژ و کێو و بەرز و بڵندی کەوتۆتە ناوچەکەوە - هەر لە چیا و گرد و تا دەگاتە تەختایی و بان، کە ئەمانەش زۆر پێویستن بۆ گەشەکردنی ڕووەک. هەر بۆیەشە هەولێر زۆر جۆرە گژوگیای بەرکەوتووە.

هەرچەندە من وەکو پیشەکارێک دەستم نەداوەتە لێکۆڵینەوە لەسەر دابەشبوونی ڕووەک لە هەولێردا، بەڵام لە ئەنجامی تێکەڵاوی زۆرم لەگەڵ ڕووەکناس و پسپۆر و ناپسپۆرەکاندا و حەزی زۆرم بۆ دونیای سیحراوی ڕووەک و گوڵ و گیای کوردستان، توانیم زانیارییەکی فراوان لەسەر ئەم بابەتە هەستیارە پەیدا بکەم، کەوا بەشێکیان لەم نووسینەمدا دەخەمە بەر دید و چاوی ئێوەی ئازیز.

ڕووەک و گژوگیا و گوڵ لە هەموو دنیادا بە سەرچاوەیەکی گەورەی ئابووری دادەندرێت، چ وەکو خۆراک و چ وەکو داو و دەرمان یاخود بۆ ڕازاندنەوە و جوانکاری و بۆن و بەرامەکاری.

لە خۆشبەختی کوردستان و خەڵکی هەولێر، ئەم چەشنە گژوگیا و ڕووەکە ئابووری و دەرمانی و جوانکارییانە گەلێ زۆرن منیش وا بەپێی جۆرەکان دابەشیان دەکەم:

**یەکەم: ئەو ڕووەکانەی کە وەکو خۆراک لەناوچەی هەولێر بەکاردێن.**

**أ- خۆراکی مرۆیی.**

١- کەنگر (سیماق و دەندەڵۆشک کە لەهەمان بەردن).
٢- تۆڵکە
٣- کاردی،کاردوو (بە هەموو جۆرەکانییەوە)
٤- پیفۆک، پیشۆک
٥- ڕێواس
٦- شنگ، هەڵەکۆک (ئاڵەکۆک)، ئالیقۆک، مەرجاپیلک
٧- ئەسرێلک، خوژە
٨- کووزەڵە
٩- پەڵپینە
١٠- تووڕۆکە
١١- سێڤەلۆک (سێفەلوکە)، سێودرۆک
١٢- زەرگەزەوی، سەلکەزەوی
١٣- سمرکە
١٤- گۆرمزە، کولزوانە
١٥- شەفەلە
١٦- بەلەک، مێکووک
١٧- قەلەندۆر، گنۆڕ، بەنی، خەلەندۆر(بادینی)





١٨- کەرتەشی
١٩- خەرتەلە
٢٠- دەرزیلۆکە
٢١- قەلاَس، زەنگوڵە
٢٢- قیزبەلە، سێ بسکۆڵە
٢٣- قوڕادە(کورادە)، کنێواڵ
٢٤- هەندرێشە
٢٥- مەندۆک
٢٦- دۆمبەلاَن
٢٧- شویت، دۆراخ
٢٨- گژنیژ
٢٩- شیرمشاق، شێلمشاق
٣٠- کوارگ
٣١- تووترک

**ب- ئەو گژوگیایانەی وەکو ئالیک یان خۆراکی باڵندە بەکاردێن:**

١- جۆداس
٢- کەرخنکێنە
٣- کەردڕ
٤- تالیشک (کەو دەیخوات)
٥- قنجیلە (قجیلە)
٦- سێ کوچکە، کەرپوچۆکە
٧- زیوان
٨- گلێرە
٩- قەمام
١٠- وێنجە
١١- شەودر
١٢- گونە پشیلە
١٣- کەرکۆڵ
١٤- کاڕووش
١٥- حوشترالووک
١٦- گاڵ، گاگوز
١٧- پەڕشە، پەڕشت
١٨- گێوژۆکە
١٩- پەلکەدراوە
٢٠- شاوێر
٢١- دانە قەتێ
٢٢- بنیشتۆکە
٢٣- داڕووجان
٢٤- کاوسێنە
٢٥- پێلەقە
٢٦- خڕنووک
٢٧- هەمبانۆکە
٢٨- گیائالۆزە
٢٩- ئالۆ

**دووەم: ئەو گژوگیایانەی کە لە داو و دەرماندا بەکار دەهێنرێن.**

١- رەکێشە
٢- گیابرینە
٣- گیازەرتک
٤- بارێزە
٥- پسکە
٦- رەشکە
٧- بەیبوون، حاجیلە
٨- بوژانە
٩- پونگ
١٠- رازیانە
١١- سۆتکە
١٢- گەرچەگ
١٣- گوژاڵک
١٤- دمکانە
١٥- گوڵاڵە سوورە، بووکۆکە
١٦- رۆنیاس
١٧- گەزگەزۆک، گیاگەزنە
١٨- برایم بۆگەنی، ئەسپەندەر
١٩- غەریەنگ
٢٠- کولیک جوانەمەرگ
٢١- ترنجۆک
٢٢- دۆبەسەرە
٢٣- چەقچەقە
٢٤- کالۆس، تەونۆکە
٢٥- سوڕناتک
٢٦- گێبەلە
٢٧- تێروو، تەوری
٢٨- شیرکتکە، کوچیلک



گوڵە بەرێزە

٢٩- سەپان ترێنکە
٣٠- دارگەز

**سێیەم: ئەو گژوگیایانەی کە مرۆڤ بۆ پاکوخاوێنی ناوماڵ یان پێداویستی دیکە بەکاریان دێنن.**

١- سابونۆکە، گولۆکە (بۆ شۆرین)
٢- چۆغان
٣- تۆسی
٤- کرتی
٥- بردسوورە
٦- دڕکەزی
٧- لیلک
٨- گۆگەم
٩- مووسەنەک، نووسەنەک، نووسەنەکە
١٠- هەڵپاچان
١١- سواردڕە، سواڵەدڕە
١٢- گیاپیزۆک
١٣- پەلۆشە
١٤- چەورۆکە

**چوارەم: ئەو رووەکانەی کە تەنها بۆ جوانکاری و رازاندنەوەو بۆن و بەرامەکاری بەکارهاتوون و تائێستا لەلایەنی خۆراکی/دەرمانی/یان پێداویستی دیکەوە سوودیان لێ نەبینراوە.**


ریواس


شنک

١- هەڵاڵە
٢- گاگرۆ
٣- شلێر
٤- کنێر
٥- مێلاقە
٦- سوێسنە
٧- لاولاوە کێویلە
٨- کولێک جوانەمەرگ
٩- هێرۆ
١٠- گیامامزە
١١- وەنەوشە
١٢- بۆنخۆشکە
١٣- سمڵ
١٤- بەرکەمەر
١٥- بەرزلنگ


کەنگر


گوڵاڵە سوورە

١٦- چنوور
١٧- گوولەک
١٨- گیا زەنگوڵە
١٩- گوڵە پەرێزە
٢٠- کلاوقۆزە
٢١- گیا پراوە
٢٢- گلێخە (گێلاخە)

جگە لەو سەدو بیست و شەش گژوگیایەی، کە لێرەدا ناوم بردوون بەهەزاران گژوگیای دیکە لە ناوچەی هەولێردا لە وەرزە جۆربەجۆرەکانی ساڵدا دەڕوێن و دەمرن بەبێ ئەوەی کەس هیچیان دەربارە بزانێت. جا ئەگەر گیاخانەیەکمان هەبێت و رووەکناسانی پسپۆر ئەو گژوگیایانە کۆبکەنەوە و بە شێوەیەکی زانستییانە پۆلینیان بکەن و لە سوودو زیان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان بکۆڵنەوە، هیچ گومان لەوەدانییە سامانێکی بێشوماری رووەک و گژوگیای کێوی دەکەوێتە بەردەستیان و دەتوانین وەک وڵاتە پێشکەوتووەکانی دنیا پەرە بە دەرمانخانەی رووەکی بدەین و بەمەش هەم خزمەتێکی گەورە بە وڵاتەکەمان و هەم خزمەتێکی گەورەی مرۆڤایەتی دەکەین.



# مێش و مەگەزی ناوچەی هەولێر

**د.ئازاد حەمە شەریف**
**کۆلێژی زمان- زانکۆی سەلاحەدین**

ناوچەی هەولێر چونکە لە رووی جوگرافییەوە بەرزایی و نزمایی و دۆڵ و کێو و چیا و دەشت و دەری زۆرە، بۆیە لە رووی مێش و مەگەز و گەزندە جۆربەجۆرەکانەوە دەوڵەمەندە. بەڵام لەبەرئەوەی تا ئێستا کەس کاری نووسینەوە و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیانەی ئەو بابەتەی نەخستۆتە ئەستۆی خۆی، بۆیە وا خەریکە لەگەڵ چۆلکردنی گوندەکان ناوی ئەو سەدەها مەگەزانە، جا زیان بەخش بن یان سوود بەخش، لە بیری خەڵک دەچنەوە.

هەڵبەتە جاران تێکڕای خەڵکی ناو و جۆر و شێوە و قەبارەی ئەو مەگەزانەیان زۆر باش دەزانی، ئێستاش کەم کەمە خەڵکی گوندەکان ئەو مەگەزانەیان لەبیر ماوە، بەڵام کار وا بڕوات دوای نەوەیەکی تر ناوی زۆربەی ئەو مەگەزانە لە بیر دەکەن و نازانن کامەیان کامەیانە و تێکەڵ و پێکەڵیان دەکەن.

جا وەکو ئەرکێکی پەلە و دەستوبرد، نووسەری ئەم بابەتە ناو و شێوە و جۆری ئەو مەگەزانە دەخاتە بەرچاوی خوێنەر تا بەتەواوی لەبیر نەکراون لە پۆلین کردنی ئەو مەگەزانە، نووسەر ئەو مەگەزانەی دابەشی سەر ئەو دوو جۆرە کردووە:

أ- مەگەزە باڵدارەکان
ب- مەگەزە بێ باڵەکان

**أ- مەگەزە باڵدارەکانی ناوچەی هەولێر ئەمانەن:**

١- قازی بازاڕ: جۆرە مەگەزێکە بەقەد دەنکە خورمایەکە، هاوین و پایزان لەناو دەغڵان پەیدا دەبێت. سەرباڵەکانی سەوز و رەش و تووکنە.

٢- زەنگە سۆرە / زەردەواڵە: جۆرە مەگەزێکی مەیلەو سووری چزوودارە، لەناو کونە دیواران شانە دادەنێت و مێملی شانەی هەنگوینە.

٣- گوڵە ستێرە /گۆسارە: جۆرە مەگەزێکی بچووکە بەقەد مێشێکە، سەرباڵەکانی سەوزێکی نەوتییە و بەشەو کە دەفڕێت لەلای قنگیەوە تیشکێکی سەوزی لێوە دەردەچێت.



٤- بەدرەمە/ هەنگی کێوی: جۆرە هەنگێکی کێوییە، لە هەنگی ماڵی گەورەتر و باریکترە.

له کـونه‌شاخ و کلۆرایی داران شـانه دادەنێت، جۆرە هەنگوینێکی نایاب دروست دەکـات پێی دەگـوترێت (شەمەترێنکە).

٥- مێشەنگوین: جۆرە مەگەزێکی بچووکی ماڵییە، لە شانەدا دەژیت و هەنگوین بەرهەم دەهێنێت.

٦- پەپوولە: لە هەولێردا چەندین جۆرە پەپوولە هەن -پەپوولەی سپی، پەپوولەی رەش، پەپوولەی رەنگاورەنگ و هتد.

٧- تەپۆ: جۆرە مێشوولەیەکی گەرەیە و پێوەدانی بەئازارە.

٨- پێشکە /مێشوولە: جۆرە مەگەزێکی بۆرکەڵەیە، بەزۆری لە هاویناندا پەیدا دەبێت. خوێن دەمژێت و نەخۆشی لەرزوتا دەگوازێتەوە.

٩- سیسرکە: جۆرە مەگەزێکی قاوەییە و بەزۆری لە شوێنی پیسدا دەژیت.

١٠- خاڵخاڵۆکە: جۆرە مەگەزێکی خڕی سوورە بەقەد دەنکە مێرووییەکە و خاڵی رەش لەسەر باڵەکانی هەن.

١١- مێشە سەوزە: جۆرە مێشێکی سەوزە و لە مێشی ئاسایی گەورەترە و بەزۆری لقی مێو دەمژێت و لەکاتی فڕیندا گیزەی دێت.

١٢- سن و کیسەڵە: جۆرە مەگەزێکی پشت قۆقزی بۆرەقنەیە و نزیکەی ١سم دەبێت، بەزۆری لە گەنم و جۆ دەدات و بێهێزی دەکات.

١٣- قالۆچە: جۆرە مەگەزێکی خڕکەڵانەیە، گەلێ جۆری



هەیە و بەزۆری لە شوێنی پیسدا هەیە.

١٤- گوخلێتکە: جۆرە قالۆچەیەکی رەشی زلە و بەزۆری لە دەشت و دەردا دەبینرێت کە دەنکە قشپل خل دەکاتەوە.

١٥- جۆبرکە /قوزبرکە: جۆرە مەگەزێکی رەنگ خاکییە و بەقەد پەنجەیەک باریکە و ٣-٥ سم درێژە. بەزۆری لە دەم جۆگەلان کون هەڵدەکەنێت و لەژێر زەوی دەروات.

١٦- مێش: جۆرە مەگەزێکی رەشە، بەزۆری لەناو ماڵاندا هەیە و نەخۆشی دەگوازێتەوە.

١٧- قرقرە / تەختە کالۆس: جۆرە مەگەزێکی رەشی بچووکی مەیلەو بۆری وەکو قالۆچەیە، بەڵام نزیکەی ١ سم درێژە و لاشەی درێژووکانیە. بەزۆری تەختە و کاریتە کون دەکات و هەمیشە دەنگێکی وەک قرەقری لێوە دێت.

١٨- مێشە کەرانە: جۆرە مێشێکی رەشی سەر زلە و سێ ئەوەندەی مێشی خۆماڵی دەبێت.

١٩- کلۆ / کوللە: جۆرە مەگەزێکە بەزۆری لە هاوینان و پاییزاندا لەناو دەغڵ و پەرێزدا پەیدا دەبێت. گەلێ جۆری هەیە -زەرد، سوور، خاکی و هتد.

٢٠- جیک جیکە / زیکزیکە: جۆرە مەگەزێکی بچووکە نزیکەی ١ سم دەبێت و بەزۆری لە هاوینان و پاییزاندا لەناو دەغڵ و پەرێزدا پەیدا دەبێت و بەدەنگێکی یەکجار تیژ دەزیکێنێت.

٢١- زەرگەتە /زەردەزیرە: جۆرە مەگەزێکی ناوقەد باریکە و زۆر لە مێشەنگوین و زەنگەسۆرە دەچێت،



بەڵام لە زەنگەسۆرە بچووک و باریکترە و رەنگی زەردە و بە تووێڵ شانەکەی بە بنمیچەوە هەڵدەواسێت و پێوەدانی زۆر بەئازارە.

٢٢- مێشە سەگانە: جۆرە مێشێکی سەوزی بریقەدارە و لەکاتی فڕیندا گڕزەی لێوە دێت و گەزتنی بەئازارە.

٢٣- مەشکە درە: جۆرە کوللەیەکی ژێر باڵ سوورە.

٢٤- قرتقرتە: جۆرە مەگەزێکی باریکی مەیلەو قاوەییە و نزیکەی ١سم درێژە و هەرکە کەوتە سەرپشت بەقرتەیەک خۆی وەردەگێرێت.

٢٥- پەروانە: جۆرە پەپوولەیەکی قاوەییە بەشەو بەدەور چرادا خول دەخوات و زۆرجار بەئاگری چراکە دەسووتێت.

٢٦- تەشیلۆکە:



جۆرە مەگەزێکە دوو جووت باڵی بەدوای یەکەوەی هەیە و بە زۆری لەسەر جێگای بەئاو هەڵدەفڕێت و کلکێکی درێژی وەکو تەشی پێوەیە.

**ب - مێش و مەگەزە بێ باڵەکانی ناوچەی هەولێر ئەمانەن:**

١. پند: زیندەوەرێکی سووری بچووکە لەناو پەڕی باڵندەدا دەژیت و خوێنی دەمژێت.

٢- خۆرە: جۆرە زیندەوەرێکی بچووکە لە هەر شتێک بدات دایدەفەتێنێت.

٣- فسفسۆكە: زیندەوەرێكی بۆركەڵەی بچووكە نزیكەی نیو سانتیم دەبێت و لەناو خۆڵەپۆتدا دەچێتە خوار و قورتێكی بازنەیی دروست دەكات.

٤- داپیرۆچكە / جاڵجاڵۆكە: جۆرە زیندەوەرێكە چەند قاچێكی درێژی هەیە و لە گۆشە و بنمیچدا تەون دروست دەكات بۆ راوكردنی مەگەزی بچووكتر.

٥- تەتڵەمیران: جۆرە كرمێكی كوڵكنی بازەڵەی بەهارییە و لە بن سكیەوە دووریز قاچی هەیە.

٦- مۆرانە / بیێۆكە: جۆرە زیندەوەرێكی بۆركەڵەیە، بەزۆری لەخانووی قوڕدا دەژیت و لە تەختە و قوماش دەدات و دایدەفەتێنێت.

٧- قرنە /قرنوو: جۆرە زیندەوەرێكی مەیلەو شینی تۆخە، بەزۆری لەسەر لاشەی كەر و ئێستر و مانگادا دەژیت و پێستەكەی كوون دەكات و خوێنیان دەمژێت.

٨- مارە زیو / هەزارپێ: جۆرە زیندەوەرێكی رەنگ زیوینی بریقەدارە و ٧-١٢ سم درێژە و لەهەردوولای سكیەوە ژمارەیەكی زۆر پێی هەیە و زۆر بەخێرایی دەڕوات.

٩- گێركە: جۆرە مێروولەیەكی سووری یەگجار وردە.

١٠- مێرووستان / مێرووڵە: جۆرە زیندەوەرێكە بەكۆمەڵ دەژیت. بەزۆری رەشە و سووریشی هەیە.

١١- ئەسپێ: جۆرە زیندەوەرێكی قاوەییە، بەقەد دەنكە كونجییەكە و بەزۆری لەسەر پێست و ناو قژی مرۆڤدا دەژیت و خوێنی دەمژێت. (بە ئەسپێی ورد دەوترێت مێتوڵكە و بانگژد)

١٢- كێچ /قێچ: جۆرە زیندەوەرێكی قاوەیی تۆخە و لەدەنكە كونجییەك بچووكترە و بە باز دەڕوات و كە مرۆڤ دەگەزێت زۆر بەسۆیە.

١٣- گڵخۆركە / كرمی زەوی: جۆرە كرمێكی باریكی بێ چاوی قەفقەفە، رەنگی سووری گڵییە و بەزۆری لەناو گڵی تەڕدا دەژیت.

١٤- بالیفۆكە: جۆرە كرمێكی كوڵكنی خەپەیە، نزیكەی ١ -٣سم درێژە و وەكو مۆروو خۆی لوول دەدات و لە هەردوو لای سكیەوە ژمارەیەك پێی هەیە.

١٥- دووپشك: گیانەوەرێكی زەردباو یان مەیلەو قاوەییە، لەلای دەمیەوە دوو چڕنووك هەیە و سەری كلكی چزوویەكی تیژی پێوەیە. بەهەرشتێك وەبدات ژاراوی دەكات. (سۆلۆلە: بەچكە دووپشكە)

١٦- مافەتە: كرمێكە لە ناو پۆرگێكدایە و مەڕ دەیخوات و تووشی نەخۆشی دەكات.

١٧- مرە: ئەسپێی سووری ناو جۆو گەنمە.

١٨- زێروو / زاروو: جۆرە زیندەوەرێكی بۆرە و لەناو ئاواندا دەژیت. هەر كەسێك زێروو قووت بدات زوو فریای نەكەون دەخنكێت چونكە زێرووەكە بەقورگی وەدەنووسێت و خوێنی دەمژێت و دەیخنكێنێت.



١٩- كرمی بەفر: جۆرە كرمێكی سپیە بەقەد مەچەكێك نەستوورە و چاوی رەشە و لە بن بەفری كۆنی چەند ساڵەی بەسەریەكدا كەوتوودا دەژیت. لەسەر بەردا بنرێت وشك دەبێت و تۆزێكی سپی لێ بەجێ دەمێنێت و ئەو تۆزە بكرێتە ناو هەر شتێكەوە ساردی دەكات.

٢٠- دوو كلكە: دەعبایەكی رەشی سووری درێژكۆڵەی شاخدارە لە قالۆنچە دەچێ و كلكی دوو فاقە.

٢١- بژەبژە: دەعبایەكی زەردی چنگ چنگاوییە وەكو جاڵجاڵۆكە وایە.

٢٢- بڵقەدەرە: جۆرە قالۆنچەیەكی ژەهراوییە، بەهەركەس وەبدات لەشی دەبێتە بڵق و دەیكوژێت.

٢٣- كوللە حاجی: جۆرە كوللەیەكی رەنگ سەوزی گیاییە، قاچەكانی زۆر درێژن و لەشی یەگجار باریكە و شێوەی ئەسپی هەیە.

٢٤- ئاورۆنكەرەوە: زیندەوەرێكی بچووكە لەشی بەقەد دەنكە جۆیەكە و چەند قاچێكی درێژی هەن. بەسەر ئاوی كانیاوی ڕووندا هاتوچۆ دەكات.

٢٥- قوزەڵقورت: جۆرە زیندەوەرێكە ٢ -٣ سم درێژە و وەكو كرمە، ماددەیەكی چەوری لینج دەردەدات ن پاشان كا و پووش و پەلاشی پێوە دەنووسێت. گیانەوەر بیخوات دەیكوژێت.

جگە لەو ٥١ دانە مێش و مەگەزانەی لێرەدا ناویان هاتوون، سەدانی تریش لە ناوچەی هەولێر هەن، بەڵام لەبەر ئەوەی دەزگا و رێكخراوێكی فەرمیمان بۆ بەدواداچوونی ئەم بابەتە تەرخان نەكراوە، نووسەر وەكو تاكە كەس لەم دەرفەتەدا تەنها توانی ئەوەندە ناوە بخاتە بەردەست و بەهیوام هەنگاوی تری بە دوادا بێت.

# گیانەوەری کێوی ناوچەی هەولێر

دکتۆر ئازاد حەمە شەریف
کۆلیژی زمان - زانکۆی سەلاحەدین

ناوچەی هەولێر رووبەرێکی بەرفراوانی هەیە و پڕە لە دەشت و بان و رووبار و چیا و دۆڵ و نهێڵ. هەربۆیەش ئاووهەوا و ژینگەکەیەکی زۆر لەبار و گونجاوی هەیە بۆ چەندان جۆرە گیانەوەر و جانەوەری کێوی کە هەندێکیان لەسەر رووبەرێکی فراوانی ناوچەکە دەبینرێن و هەشن تەنیا لە هەندێک ناوچەی بەرتەسکی لابەلادا دەژین.

بەمەبەستی تۆمارکردن و بەدواداچوونێکی تێروتەسەلتر بۆ سەرجەم گیانەوەرانی ناوچەی هەولێر، وا من لێرە بەدواوە زۆر بەکورتی ناو و جۆر و ژینگەی زۆربەی ئەو گیانەوەر و جانەوەرە کێوییانەی ناوچەی هەولێر لەگەڵ وەسفێکی وردی دەرەکی یەکە بەیەکەیان دەخەمە بەردەست و هیوادارم لە ئایینددا دەزگایەکی ئەکادیمی و زانستی پەرە بەو ئەرکەی من بدات و لێکۆڵینەوەی وردتر لەو بارەیەوە بکات.

بۆ ئەوەی لە لێکۆڵینەوەکەماندا وردتر بین، دەتوانین بەگشتی گیانەوەر دابەش بکەین بۆ گیانەوەری دڕندە و گیانەوەری بێ وەی.

### أ- گیانەوەرە دڕندەکان:

**١- گورگ:** گیانەوەرێکە زۆر لە سەگ دەچێت و هەر بەقەد سەگێکیش دەبێت. بەڵام جیاوازی گورگ لەگەڵ سەگ لەوەدایە، گورگ زۆر تووکنە و لە پەلاماردا زۆر خێرایە و لووره لوور دەکات و چاوەکانی زۆر تیژن و چرنووک و کەڵبەکانی بەتێنە. بەزۆری لەشوێنی چڕەڵان و شاخاویدا دەژی و کە پەلاماری گیانەوەر دەدات کەم گیانەوەر خۆی لەبەرامبەردا رادەگرێت.

**٢- ورچ:** گیانەوەرێکە لە کەژ و کێوەکانی ناوچە کوێستانیەکانی کوردستاندا دەژێت. گیانەوەرێکی خڕینی زلی زۆر کوڵکنە، کلکی قووتە و سەری زلە و چاوەکانی کزن و زۆرخۆرە و دەست و پێی وەکو هی ئادەمیزاد وایە و نینۆکەکانی دەست و پێی زۆر تیژن. هێزێکی لەرادەبەدەری هەیە. بەئاسانی بەسەر دارودرەختەکاندا هەڵدەگەرێت بۆ میوەخواردن و ناو داری کلۆریش دەگەرێت بۆ خواردنی هەنگوینی هەنگەکێوی. ورچ

دەتوانێت وەکو مرۆڤ هەڵسێتە سەرپێ و بەرێدا بڕوات. لە دۆڵی روستێ ورچ زۆرە.

٣- **بەراز:** گیانەوەرێکی چوارپەلی دووسمە و بەقەد جاشکە کەرێک دەبێت. زۆر خڕو خۆڵە و سەری بە ملیەوە نووساوە. نێرەکەی شفرەیەکی پێوەیە زەوی پێ هەڵدەدرێت و بەوەش هێرش دەکاتە سەر مرۆڤ و گیانەوەرانی ترەوە. بەزۆری شەوانە لە ناوچەی شاخاوی و چۆلەوانی دا بەرەوە دەردەکەون و هێرش دەکەنە سەر کێڵگە و دەغڵ و دان و تێکوپێکی دەدەن. لەناوچەی هیران و نازەنین و دۆڵی سماقوولی زۆرە.

٤- **گـۆڕهەڵکەنە:** جانەوەرێکی کێوی رەشە لە پشیلە بچووکترە و بەزۆری لەو شوێنانەدا زۆرە کە زەویەکەی نەرم و رفۆکە چونکە ژیانی ئەو بەندە لەسەر چوونە ناو گۆری مردوو و خواردنی جەستەکەی.

٥- **سەگاو، سەگلاو:** گیانەوەرێکی شیردەری درێژی ئاوی ماسیخۆرە کە بەزۆری لەناو ئاوی چەم و رووباراندا دەبینرێت. چوارپێی هەیە و لە گوێرەکەی ساوا دەچێت و چنگی وەکو چنگی سەگە و ناوپەنجەکانی بە پەردە داپۆشراوە و کلکی پان و راستە و رەنگی کەوڵەکەی قاوەیی یە و زۆر ئەستوور و گرانبەهایە.

٦- **کەمتیار:** جۆرە گیانەوەرێکی یەکسمە، دەم و قەپۆزی وەکو هی کەرە بەڵام لە کەر بچووکترە و بژو یالی هەیە. گۆشتی بۆگەن دەخوات و زۆر دڕندە و تووندوتیژە. بەشەوان لە شوێنی چەم و چخورددا بەتاک و بەکۆمەڵ بەدوای خۆراکدا دەگەرێن.

٧- **رێوی:** گیانەوەرێکی کێوییە و شێوەکەی زۆر لە سەگ و چەقەل دەچێت. دەم و لمووزی باریکە و گوێی قووتە و کلکی ئەستوورە و بەزۆری مریشک و جووجەڵە دەخوات و کوڵانەی لە ناو شاخ و کەلێنە بەردان دەکات.

٨- **چەقەل:** جانەوەرێکە لەسەر شێوەی سەگە و کلکی ئەستوورە و قەپۆزی لە هی سەگ باریکترە و بە زۆری رەنگی سوورە و لەوە دەکات جۆرێک بێت لە رێوی. ئەویش وەکو رێوی مریشک و جووجەڵە دەخوات.

٩- **کـورەبەشـە:** جانەوەرێکی شەوگەڕی خرپنی کەژو کێوانە. دەست و پێی کورتە و زۆر قەڵە و و گۆشتنە. کەوڵەکەی بۆرە و هێڵی رەش و سپی بەسەر و نێوچەوانی داهاتووە. سەری لەچاو لاشەکەی زۆر بچووکە و گۆشتی دەخورێت و کولانەکەی لەژێر زەویدایە.

١٠- **جورجە کوێرە:** جانەوەرێکی بۆرکەڵەی تۆخە و لە مشک گەورەترە. کولانەکەی لە ژێر زەویدا هەڵدەکەنێت و بە قۆمەت خۆڵ لەبەردەم کونەکەیدا هەڵدەداتەوە. بەزۆری لەناو وەرد و ناوچە دەشتاییەکانی هەولێردا دەبینرێت.

١١- **دەڵەک:** جانەوەرێکی بچووکە و رەنگی کەوڵەکەی سوورێکی تۆخە و لاشەی درێژووکانییە و لاقەکانی کورتن و بە زۆری لە شوێنی چڕەڵاندا دەژیت و گیانەوەری بچووکتر دەخوات. هەر کاتێک مەترسی پێ بگات بۆ خۆپاراستن فسی بۆگەن دەکات.

١٢- **بزن مـژک، بزن مـژە:** جانەوەرێکە چوارپەلی هەیە و پەنجەکانی درێژن، دەستی لەدەستی منداڵی ساوا دەچێت و کاوێژ دەکات. لەشی بەقەد پشیلەیەکی گەورەیە و کلکی بەقەد مەترێکە و لە دەشت و دەراندا گوانی بزنان دەمژێت و ناودەکەشی هەر لەوەوە هاتووە. هەر بزنێک ئەو جانەوەرە بیمژێت ئیتر وشک

دەکات.

**١٣- سیخوڕ:** جانەوەرێکی قرتێنەری جورج ئاسای بەڵەکە و هەموو لەشی بەتووک و پەڕاموو چەی نووک تیژی سپی و رەش داپۆشراوە و بەقەد پشیلەیەکی بچووکە و بەزۆری هێلانە لەناو شینایی و شوێنی بژوێندا دەژیت. لەکاتی بەرگری لەخۆکردندا پەڕاموو چە تیژەکانی دەچەقێنێتە ئەوانەی پەلاماری دەدەن و برینداریان دەکات.

**١٤- پشیلە کێوی:** جۆرە پشیلەیەکی جینجڕە و لە پشیلەی خۆماڵی گەورەتر و تووکنترە. هەر لە پشیلەی خۆماڵی دەکات بەڵام لەو دڕتر و بەتاوتر و چاوتیژترە. بە زۆری لە دەشت و دەردا شەوان دەبینرێت.

**ب- گیانەوەرە بێ وەیەکان:**

**١٥- سمۆرە:** گیانەوەرێکی بچووکی تووکنە و نزیکەی ١٥ سانتیمەتر درێژە و بەقەد بێچووە پشیلەیەک دەبێت. رەنگی تووکەکەی بەزۆری سوورێکی مەرەزدیی یە و تووکی سەرکلکی درێژ و گڤە و بەزۆری لە شوێنی پڕ داروباردا دەبینرێت و بەسەر درەختەکاندا هەڵدەگەڕێت، بەتایبەتی دارگوێز چونکە زۆر حەزی لە گوێزە. ئەم گیانەوەرە لەناوچە شاخاوییەکانی هەولێردا دەژیت.

**١٦- مامز، ئاسک:** جۆرە گیانەوەرێکی زۆر ناسک و جوانە بەقەد بزنێک دەبێت و قاچەکانی درێژ و باریکن و رەنگی کوڵکەکەی بەزۆری بۆرێکی زەردباوە و چاوەکانی گەورە و گەشن و قۆچی قنج و باریکە. بەزۆری لە دەشتی قەراج و ناوچە شاخاوی و کوێستانییەکانی هەولێر دەژیت.

**١٧- بزنە کێوی، کەڵە کێوی:** جۆرە بزنێکی زۆر چالاکی شاخدارە و لەناو رەوەدزە شاخە سەختەکاندا ژیان بەسەر دەبات و ساڵانە لە شاخەی سەری چڵێک دەردەکات. گۆشتی زۆر خۆش و بەتامە.

**١٨- مەڕە کێوی:** جۆرە مەڕێکە وەکو مەڕی خۆماڵییە بەڵام خوری نییە و دونگیشی نییە. لەناو شاخ و هەردا دەژیت. جاران لە ناوچە سەختەکاندا بە رەوە هەبوون، ئێستا قڕیان تێ کەوتووە.

**١٩- کەروێشکە کێوی:** جۆرە کەروێشکێکی بۆر یان قاوەیی یە. دوو بەقەد کەروێشکی خۆماڵی دەبێت و لە راکردندا زۆر بەغارە و کوڵکی لە هی خۆماڵی درێژترە و گۆشتیشی خۆشترە و هاوینان لەناو پەرێز و رەزاندا دەبینرێت.

**٢٠- کیسەڵ:** گیانەوەرێکی گیاخۆری خڕە بە قەد تۆپێکە و لەناو قەپێلکێکی زۆر رەقدا دەژیت. سەرومل و کلک و لاقەکانی لەناو قاوغەکەدا دێنە دەرەوە. سەر پشتی نەخشی رێ رێ یە و کووڕە. لەدەم چۆم و رووبارانداا دەژیت و لەناو ئاویش مەلە دەکات. لە رۆیشتنا زۆر خاو و سستە.

**٢١- ژووژک، ژیژک:** گیانەوەرێکە بەقەد تۆپێکی بچووکە و هەموو لەشی بە درک داپۆشراوە و رەنگی بۆرێکی تۆخە و کاتێک ترسی پێ بگات خۆی لوول دەدات و دەبێتە تۆپە درکێک. بەزۆری لە لارێ و دەشت و دەردا دەبینرێت. دەڵێن گۆشتی ژووژک بۆ باداری باشە.

ئەمانە تەنیا گیانەوەرە کێوییە هەرە باوەکانی ناوچەی هەولێر بوون و ئەگەر لێکۆڵینەوەی مەیدانی لەو بارەیەوە بکرێت بۆ گەران و گیانەوەرانی دیکە، هیچ گومانم لەوەدا نییە کە لەو ناوچە بەرفراوانەی رووبەری هەولێر دەیگرێتەوە دەیان گیانەوەری دیکەی کێوی هەن. جا ئەگەر لە دەرفەتێکی تردا دەستم پێیان بگات ئەوا ئەوانیش دەخەمە پاڵ ئەوانەی کە لێرەدا توانیومە کۆیان بکەمەوە.



# باڵندەی کێوی ناوچەی هەولێر

**دکتۆر ئازاد حەمە شەریف**
**کۆلیژی زمان - زانکۆی سەلاحەددین**

کوردستان بە دەشت و دەر و چیا و دۆڵ و بـــاغ و رەز و رووبـــار و چۆمـەکـانیـەوە پڕاو پڕە لە باڵندەی کێوی و دەگمەن و جوان. ئەم باڵندە نازدارانە هەر لە زووەوە ســەرنجی خەڵکیان بۆخۆیان راکێشاوە، بە دەنگی خـۆشی پڕ ئاوازیان بووبێت یان بە رەنگی جوان و دڵفڕێنیان، بە هێرشی لە ناکاویان بووبێت بۆ سەر کێڵگە و رەز و خەڵەو خەرمانیان یاخود بەپڕگوشتی و خرینیـیان کە ئارەزووی راوکردنیان لە لای مرۆڤی کورد جووڵاندووە لە رۆژانی قات و قڕی و برسێتیدا.

هەرچەندە تا ئێستا نە ئامارێکی سەرتاسەری بۆ باڵندە کێوییەکانی کوردستان کراوە و نە کەسێکیش پســپـۆرانە هەوڵی ئەوەی داوە لەو باڵندانە بکۆڵێتەوە. چونکە بار و دۆخی ناهەمواری کوردستان بەگشتی رێگر بووە لەبەردەم کـــاری وا پڕ بایەخدا. بەڵام خۆ دەکرا لە هەر شارێکی کوردستان چەند کەسێک زانیـاریـیان لەسەر ئەم بابەتە کۆ بکردایەتەوە و دواتر بڵاویان بکردایەتەوە. بەڵام کـــە وایان نەکردووە، ئەمە بە کەمتەرخەمی و تەمبەڵی دادەنرێت، چونکە زۆربەی مرۆڤی کورد بەگشتی و خەڵکی دەشت و دەرو دێهاتەکانی کوردستان

بە تایبەتی ناوی زۆربەی ئەو باڵندانە بەشێوەی زارەکی زۆر بەباشی دەزانن.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە هەندێک لەو باڵندانە سەرچاوەی خۆراک بوون بۆ خەڵک و هەندێکی تریان زیانبەخش بووینە بۆ کشتوکاڵ و بەروبوومەکانیان. منیش بە حوکمی ئەوەی کە هەر لە منداڵییەوە حەز و ئارەزووی باڵندەم لە مێشکدا هەبووە، بۆیە بەوردی ناو و شوێن و جۆر و کاتی دەرکەوتن و شوێنی ئەو باڵندانەی کوردستان بەگشتی و باڵندەکانی ناوچەی هەولێرم لای خۆم تۆمار کردووە. هەرچەندەش باڵندەکان لە شوێنێک بۆ شوێنێک ناویان دەگۆڕێت، بەڵام من لێرەدا هەوڵدەدەم پتر ناوە باوەکانیان بخەمە بەردەست بەتایبەتیش ئەو ناوانەی کە لە ناوچەی هەولێر ئەو باڵندانەی پێ ناسراون.

باڵندە بەگشتی دەکرێت دابەش بکرێتە سەر (باڵندەی وشکانی)و (باڵندەی ئاوی). جا لەبەرئەوەی ناوچەی هەولێر لە ڕووی سەرچاوەی ئاوییەوە هەژارە و سەرچاوەی ئاوی وەکو دەریا و دەریاچە و ڕووباری زۆر نی یە بۆیە باڵندەی ئاویش لە ناوچەی هەولێر لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکەن، بەڵام باڵندەی وشکانی ناوچەی هەولێر یەکجار زۆرن و لێرە بەدوا هەوڵدەدەم هەرە دیار و ناسراو و باوەکانیان باس بکەم.

بۆ ئەوەی وردتر بین لە لێکۆڵینەوەکەماندا دیسان دەتوانین باڵندە دابەش بکەینەوە بۆ باڵندەی ڕاوکەر/ گۆشتخۆر و باڵندەی دانەوێڵە و کرم و مەگەزخۆر. جا چونکە باڵندەی ڕاوکەر گۆشتی نەخوراوە، کورد بە گشتی کەمتر بایەخی بەم باڵندانە داوە مەگەر بۆ مەبەستی ڕاو پێکردنیان بووبێت.

**A- باڵندە وشکانییەکان:**

**أ- باڵندەی وشکانی ڕاوکەر:**

١- هەڵۆ: باڵندەیەکی ڕاوکەری دڕی تیژباڵە و سەردەنووکی خوارە و چاوەکانی گەش و بەبریسکەن و لە زۆربەی ناوچەکانی هەولێر بەرچاو دەکەوێت و کەم کەس هەیە ئەم باڵندەیەی نەدیبێت.

٢- باز: باڵندەیەکی ڕاوکەرە و بە نێرەی باز دەوترێ (جوڕە): بە مێیەکەی دەگوترێت: تەوار یان تەڕلان.

٣- باشووکە: جۆرە باڵندەیەکی جینجڕی گۆشتخۆرە و بەقەد کۆترێکە بەزۆری ڕاوی چۆلەکە و باڵندەی بچووک دەکات.

٤- شمقاڕ: جۆرە باڵندەیەکی گۆشتخۆرە لە تیرەی هەڵۆیە.



٥- شاهین/شەهێن: باڵندەیەکی گەورەی بۆری گۆشتخۆرە و لە باز گەورەترە.

٦- دوو برا/دووبراڵە: باڵندەیەکی ڕاوکەرە وەک هەڵۆ هەمیشە دوو دوو لە ئاسماندا دەگەڕێن و دەفڕن.

٧- سیسارکە کەچەڵ: باڵندەیەکی زلی سەر ڕووتاوەیە بەزۆری کەلاک دەخوات.

٨- خەرتەل: جۆرە داڵێکی زلە و کاتێک باڵەکانی لێک دەکاتەوە نزیکەی مەترێک دەبێت.

٩- کوندە بەبۆ: جۆرە باڵندەیەکە سەری زلە و دوو چاوی گەورە و گەشی هەن. بەشەو دەخوێنێت و بەڕۆژ کەم دەبینرێت. خواردنی باڵندەی بچووک و مشکە.

١٠- کۆلارە: باڵندەیەکی ڕاوکەری گۆشتخۆرە و لە تیرەی داڵە.

**ب- باڵندەی وشکانی ڕاونەکەر:**

١- کێشکە/چۆلەکە: باڵندەیەکی بچووکە و لە هەموو وەرزەکانی ساڵ دا هەیە، مێیەکەی مەیلەوبۆرە وە نێرەکەشی بۆرە بەڵام خەتخەتی ڕەشی بەسەر باڵەکانی داهاتووە. درێژییەکەی ٧سم دەبێت و لەبن سواندەی ماڵان هێلانە دەکات و خواردنی دانەوێڵە و مێش و مەگەز و کلۆیە.

٢- ڕەشۆڵە: باڵندەیەکی سەرتاپا ڕەشە کە پنتک پنتکی وردی سپی تێدایە. زستانان دەردەکەوێت و درێژییەکەی ١١سم دەبێت و خواردنی

دانەوێڵە و مێش و مەگەزە.

٣- کوکوختی: باڵندەیەکی بۆری بەقەد کۆترێکە، لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا هەیە. کاتێک دەخوێنێت دەنگی زۆر خەمبارو خۆشە.

٤- قەتێ: باڵندەیەکی پەڕ بۆر و زەردی بەقەد کۆترێکە. نێرەکەی چەند خەتێکی رەش لە کلکیدا هەیە و بەزۆری لە وەرزی دروێنەدا لەناو دەغڵان هێلانە دەکات.

٥- کەو: باڵندەیەکی پەڕ بۆرە و خڕینە و دوو بەقەد کۆتر دەبێت. بەزۆری لە ناوچەی ساردو کوێستاندا هەیە.

٦- پەڕەسێلکە: باڵندەیەکی باریکی رەشی سەروکلک سپییە. بەزۆری لەکۆتایی زستان و سەرەتای بەهاردا دەردەکەوێت.

٧- هەوێردە: باڵندەیەکی خڕینی زۆر قەڵەوە و کەمێک لە کۆتر بچووکترە و گۆشتی دەخورێت.

٨- سوێسکە/سووسکە: باڵندەیەکی بۆرکارە و لە کەو بچووکترە و زۆر خێرایە لە رۆیشتندا و لەناوچەی شاخاوی زێتر دەبینرێت.

٩- پۆڕ: باڵندەیەکی بۆرە لە کەو بچووکترە و گۆشتی خۆشترە.

١٠- چرگ: باڵندەیەکە لە قاز گەورەترە و قاچ و ملی درێژە و لە قەلەمەوون دەچێت و گۆشتی دەخورێت.

١١- سیخوڕ: باڵندەیەکە نافڕێت و هەموو لەشی بەپەڕی نووک تیژی شووژناوی داپۆشراوە لەکاتی



هەستکردن بەمەترسی ئەو پەڕانە داوێت و بەر هەر جێگایەکی لەش بکەوێت کونیان دەکات.

١٢- باران بڕکە: جۆرە باڵندەیەکی رەشی دەنووک کورتی قاچ کورتی چڕنووکدارە و هەرکە کەوتە سەر زەوی ناتوانێت بفڕێتەوە. لە زستانان و سەرەتای بەهاردا دەردەکەوێت. کەمێک لە چۆلەکە گەورەترە. هێلانە لە بنمیچی ماڵان دروستدەکات و دەنگی سیکەسیکی دێت.

١٣- قەل/قەلەڕەش: باڵندەیەکی گەورەی رەشی دەشتییە و دەنووکی تیژ و ئەستوورە. بە رەوە دەفڕن.

١٤- قەلە باچکە: باڵندەیەکی رەش و سپی کلک درێژە و لە کۆتر کەمێک باریکترە و تەپڵی سەری رەشە و دەنووکی ئەستوور و راست و رەشە، سەربالی سپییە، شابالی رەشێکی نەوتیی و سپییە، کلکی نەوتییە و بنزگی سپییە، بەرسینگی رەشە، قاچی رەش و لووسە و چاوی مەیلەو شینە و دەنگی (بەچیکە چیکە). لەکاتی فڕیندا بە لاخواری دەفڕێت و بەقوونە دەڕوات.

١٥- دار کلۆرە: باڵندەیەکی دەنووک درێژ و تیژە. سەری سوورە و بەرسینگی زەردە و سەربالی رەش و سپی یە و بەقەد ڕیشۆڵەیەک دەبێت.

١٦-کلک هەڵتەکێنە/کلک هەڵەنگێنە/ کلک مەقلێ: جۆرە باڵندەیەکە بەقەد ڕیشۆڵەیەکە و کلکێکی مەیلەو پانی هەیە و لەکاتی نیشتنەوەدا کلکی هەڵدەتەکێنێت.

١٧- سۆفە، سۆفیلکە، سۆفە قیتە: جۆرە باڵندەیەکی مەیلە و زەردی پۆپیتەدارە بەقەد ڕیشۆڵەیەکە، بەزۆری لەناو وەردو دەغڵاندا لە پاییزان و سەرەتای بەهاردا دەردەکەوێت و خواردنی دانەوێڵە و کرمی زەوییە.

١٨- فیسقەگوللە، فیرنەگوللە، فیچقەگوللە: جۆرە باڵندەیەکی زۆر بچووکە و بۆرێکی مەیلەو شینە.

١٩- کۆترە باریکە/قومری: جۆرە کۆترێکی بۆرکەڵەی باریکە پەڵەپەڵەیە و دەنگی زۆر خۆشە.

٢٠- جقە- جوقە: چۆلەکەیەکی

بۆرکەلەیە لە پاساری کەمێک گەورەترە.

٢١- جوڕە: باڵندەیەکی بۆرە لە چۆلەکە بچووکترە.

٢٢- جۆخۆرکە: باڵندەیەکی بچووکە وەکو جوقەیە.

٢٣- کۆترە شینکە: کۆترە کێویلکە: جۆرە کۆترێکی شینی کێوی دەنووک و لاق سوورە.

٢٤. کرکاک: جۆرە باڵندەیەکە لەناوچەی شەقڵاوە دەبینرێت.

٢٥- زەرد و شامی: جۆرە باڵندەیەکی زەردی جوانە لەناو رەزەکانی شەقڵاوە دەبینرێت.

٢٦- پۆپیتە سلێمانە: پەپوو سلێمانە: جۆرە باڵندەیەکی زۆر جوانی پۆپیتەداری لەش باریکە کەمێک لە کۆتر بچووکترە و دەنووکی زۆر درێژ و باریکە و سەرباڵەکانی سپی و بۆرن.

٢٧- گێرزوولە: چۆلەکەیەکی زۆر بچووکە لە شەقڵاوە هەیە.

٢٨- رەنگاڵە: مەلێکی رەنگاورەنگی سەوز و شین و قاوەیی زۆر جوانە بەقەد ریشۆڵەیەکە.

٢٩- قورینگ: هەروەها پێشی دەگوترێ قازو قورینگ. جۆرە قازێکی کێوی زۆر جوانی رەنگاو رەنگە بە رەوە دەفڕن.

٣٠- تفتیلک: جۆرێکە لە کوکوختی ناو دارستانان بەڵام ئەو بۆرێکی پەڵە پەڵەیە و دەنگی زۆر خۆشە.

٣١- لەق لەق: حاجی لەق لەق: باڵندەیەکی زلە بەقەد عەلەشیشێک دەبێت. قاچ و دندووکی زۆر درێژە و رەنگی رەش و سپییە. بەزۆری هێلانە لەسەر منارەی مزگەوتان دەکات، خواردنی مار و مێرووە و لە وەرزی زستانان دێتە هەولێر.

٣٢- چەوڕۆکە: جۆرێکە لە پەڕەسێلکە بەڵام لەو بچووکترە و کلکیشی سپی نییە.

٣٣- شوان هەڵخەڵەتێنە: باڵندەیەکی بۆرەقنەیە لە چۆلەکە گەورەترە و تا لێی نزیک نەکەویتەوە نافڕێت.

٣٤- شالوور: جۆرە بولبولێکی زۆر دەنگخۆشە.

٣٥- کەودەری: جۆرە کەوێکی گەورەیە زۆر حەزی لە بەفرە.

٣٦- بوغاز: باڵندەیەکە لە سۆفە و جورە گەورەترە، بەڵام پۆپەی نییە وەکو سۆفە و سەروچاوی مەیلەو زەردە و باڵندەیەکی پنتکاوی ڕەش بەڵەکە.

**B- باڵندە ئاوییەکان**

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەبەر ئەوەی ناوچەی هەولێر لە لایەنی دەریا و دەریاچە و گۆلاو و رووبارەوە هەژارە، بۆیە ژمارەی باڵندەی ئاویش لە هەولێردا زۆر کەمە. هەرەباوەکان ئەمانەن:

١- ماسیگرە: باڵندەیەکی قاچ و مل درێژە و لە ریشۆڵە گەورەترە و رەنگی رەش و سپییە و دەنگی بە قاژەیە و لەسەر ئاوان دەوەستێ و راوی ماسی دەکات.

٢- تیتراوسک: جۆرە باڵندەیەکی ئاوی قاچ درێژە و بەقەد کۆترێکە و سپییە و سەرباڵی رەشە و ملی باریک و هەمیشە لەکاتی تاریکایی بەیانیان و ئێواران دەنگی (تیتی تیتی) لێوە دێت.

٣- شاهۆ /شینەشاهۆ: مەلێکی مەیلەو شینی قاچ و مل درێژە.

٤- مریشکە رەشەی ئاوی: جۆرە مراوییەکی رەشە و هێلانە لە شوێنی زۆنگاو و بە ئاو دادەنێت.

٥- قازە کێوی: جۆرە قازێکە کەمێک لە قازی ئاسایی باڵ درێژترە.

جگە لەو پەنجا و یەک باڵندە کێوییەی کە لێرەدا دەستنیشانم کردوون سەدان جۆرە باڵندەی تر لە شار و ناوچەکانی کوردستان دەژین و چەندین جۆری تریش بە کوردستاندا تێپەڕ دەبن لەکاتی کۆچ و رەوی ساڵانەیاندا بەبێ ئەوەی هیچ دەربارەیان بزانرێت. لە راستیدا نەبوونی دەزگایەکی تایبەت بە باڵندەناسی وای کردووە بەرە بەرە ناو و زانیاری دەربارەی ئەو باڵندانە لەبیر خەڵکی بچێتەوە و بەمەش بەشێکی زۆر لە سامانی سروشتی کوردستان بە فیڕۆ دەچێت. بەتێپەڕبوونی کات لە ئەنجامی راوکردنی هەڕەمەکی ئەو باڵندانە لەلایەن خەڵکی نابەرپرسیارەوە بەرە بەرە بەرەو نەمان دەچن و تا وای لێ دێت قڕیان تێ دەکەوێت و زۆربەیان لەناو دەچن و تەنها ناوەکانیان دەمێنێتەوە بەبێ ئەوەی هیچیان لەبارەوە بزانرێت، بەمەش زیانێکی گەورەمان لێ دەکەوێت کە پڕبوونەوەی ئەستەمە.

# گیانەوەری ئاوی ناوچەی هەولێر

دکتۆر ئازاد حەمە شەریف
کۆلیژی زمان- زانکۆی سەلاحەددین

ناوچەی هەولێر رووبەر و پانتاییەکی فراوانی هەیە. لەپاڵ چیا و دۆڵ و دەشت و دەری گەورە و فراوان، چەندین رووبار و زێ و چەم کەوتوونەتە ئەم ناوچەیە. هەڵبەتە ئەمەش وادەکات چەندین گیانەوەری جۆراوجۆر لەناو ئەم رووبار و چۆمانە بژین کە هەندێکیان بوونەتە سەرچاوەیەکی گرنگی خۆراک بۆ ناوچەکە و خەڵکێکی زۆر بژێویان لەسەریان وەستاوە، لەمانەش ماسی. وێڕای ئەمانەش چەندەها گیانەوەری ئاوی تر لەناو ئاوەکاندا دەبینرێن، هەرچەندەش لەناو کورددا نەبۆتە داب و نەریت کە ئەم گیانەوەرانە گۆشتیان بخورێت، لەمانەش قرژاڵ و کیسەڵ و سەگلاو و هتد.

والێرە بەدوا گیانەوەرە ئاوییەکان دەکەینە دوو جۆر کە ئەوانیش:

(أ) ماسی و جۆرەکانی ماسی.
(ب) گیانەوەری دیکەی ئاوی.

**(أ) ماسی و جۆرەکانی ماسی**

لەناوچەی هەولێر هەردوو زێی بادینان و سەر زێی سۆران سەرچاوەی گرنگی ئاوین بۆ گیانەوەرە ئاوییەکان بەتایبەتیش ماسی. لەناو ئەو دوو زێیەدا چەندین جۆرە ماسی دەژین لەمانەش:

(١) **بن بەردە:** جۆرە ماسییەکی بۆرکەڵەی سست و تەمبەڵە و هەمیشە خۆی لەبن بەردان مات دەکات و کرم و گیا دەخوات و بەئاسانیش راو دەکرێت.

(٢) **گورگە:** جۆرە ماسییەکی درە و شێوەیەکی ناشیرینی هەیە و زۆر بەزیانە بۆ گیانەوەرانی دیکەی ئاوی و بەساوایی یان بەگەورەیی لەناویان دەبات.

(٣) **مارماسی:** جۆرە ماسییەکی درێژووکانییە و شێوەکەی زۆر لە مار دەچێت، بەڵام بێ زیانە چونکە پێوە نادات و کەم کەسیش هەن گۆشتی ئەم جۆرە ماسییە بخۆن.

(٤) **جووری/ زووری:** جۆرە ماسییەکی زلی بێ پوولەکەی بێ درکی لووس و پووسە. دەمی لە لاشەی زلترە و جووتە سمێڵێکی تاک داوی لەهەر لا دەمێکییەوە بە درێژایی (١٠) سانتیمەتر درێژ بوونەتەوە.

(٥) **سپیلکە:** جۆرە ماسییەکی رەنگ سپیکەڵانەیە و کەمێک درێژکۆڵە و باریکەڵانەیە.

(٦) **پانکە:** جۆرە ماسییەکی پانکەڵەیە و پێستی زگی ئەستوورە و گۆشتێکی باشی

بەسەر لاشەیەوەیە.

(٧) **گویەدە:** جۆرە ماسییەکی ورگ زلی لەڕی گۆشت ناخۆشی پێست تەنکە.

(٨) **رەشەماسی:** جۆرە ماسییەکە رەنگی پوولەکە و پێستی خۆی بەلای تاریکی و رەشیدا دەنوێنێت .

(٩) **قورەماسی:** جۆرە ماسییەکە زۆربەی جاران لە جێگای قوڕاوی و ناو ئاوی لیخندا دەبینرێت و تامی گۆشتەکەی ناخۆشە و تامی خۆڵ دەدات.

(١٠) **زەردەماسی:** جۆرە ماسییەکە وەکو قاشنە ماسییە و رەنگی پێست و پوولەکەکانی زێتر مەیلەو زەردە، بەڵام پوولەکەکانی رەق و زل نییە و لەکاتی لێناندا بەپێستەکەیەوە دەنووسێت و لەگەڵ خواردندا دەخورێت.

(١١) **سوورەماسی:** جۆرە ماسییەکی سوورکارە و کەمێک پانکەڵەیە و گۆشتەکەی زۆر بەتامە.

(١٢) **هوڵە:** جۆرە ماسییەکی گێژۆکەیە و وەکو گێژ بە شێوەیەکی نارێک دەسوورێتەوە.

(١٣) **دەم بەخەندە:** جۆرە ماسییەکە دەمی کەمێک لەوانی تر کراوەترە و گۆشتی دەخورێت.

(١٤) **ماسییە شینکە:** جۆرە ماسییەکی بچووکە لە (٢٠) سانتیمەتر درێژتر نابێت . رەنگی مەیلەو شینە و لەناو ئاوی رووباراندا دەبینرێت.

(١٥) **قەزاخ:** جۆرە ماسییەکە لەناو ئاوەکانی کوردستاندا راو دەکرێت.

**(ب) گیانەوەری دیکەی ئاوی**

لەپاڵ ماسی و جۆرەکانی ماسیدا چەندین جۆرە گیانەوەری ئاوی دیکە هەن، ئەگەرچی لە وڵاتانی دەرەوە زۆربەیان وەکو سەرچاوەی خواردن بەکاردێن، بەڵام لە کوردستاندا ئەمانە ناخورێن بۆیەش پەروەردە نەکراون و چۆن لەسروشتدا هەن هەر ئاوا ماونەتەوە و ئێمەش لێرەدا چەندین جۆریان باس دەکەین:

(١) **رەقە:** جۆرە کیسەڵێکی ئاوییە و لە کیسەڵی وشکانی جیایە.

(٢) **سەگلاو:** جۆرە گیانەوەرێکی چوار پێی درێژکۆڵەی ئاوییە و لە گوێرەکەی ئاوی دەچێت و پێستی زۆر بەنرخە و چنگی وەکو چنگی سەگە.

(٣) **قرژاڵ:** جۆرە گیانەوەرێکە قەپێلکداری هەشت پێیە و دوو گیرەی نووکتیژ لەلای دەمیەوە هەن کە شتی پێ دەگرێت و لەسەر وشکانی بەشێوەیەکی لابەلا رێدەکات.

(٤) **بۆق:** جۆرە گیانەوەرێکی تەڕو وشکانییە. لەبەرئەوەی بۆقی کوردستان لەناو ئاودا گەرا دادەنێت و سەرەمێکووتەکانی لەناو ئاودا گەورە دەبن بەلای منەوە پتر گیانەوەرێکی ئاوییە لەوەی هی وشکانی بێت . ئەم گیانەوەرە کلکی نییە و لەسەر قوون دادەنیشێت و دەسەکانی درێژن و بە فڕتکە و بازدان دەڕوات.

(٥) **شەیتانۆکە:** گیانەوەرێکی قەپێلکدارە بەزۆری لەشوێنی تەڕ و دەم ئاوان دەبینرێت و قەپێلکەکە سپی پێچ پێچ هەڵپێچە و وەکو کوژەکە کەرانەیە و کرمێکی لیقنی لەناودایە .

(٦) **کیسەڵ:** هەروەکو رەقەیە بەڵام لە وشکانیدا دەژیت و لە هەموو شتێک وەکو رەقە وایە ئەوە نەبێت کیسەڵ کەمێک رەنگی تاریکتر و زلترە.

(٧) **قورناویلکە:** گیانەوەرێکی درێژی بچکۆڵەی ئاوییە و لەکاتی بەهاران لەناو ئاوان پەیدا دەبێت و دەنگێکی تیژ و زلی هەیە.

هەرچەندە لەم نووسینەمدا پتر لایەنی وەسفی دەرەکی ئەم گیانەوەرانەم پەیڕەو کردووە چونکە تا ئێستاش ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی چوست و چالاک بۆ سامانی سروشتی لە کوردستان نییە تاوەکو بەشێوەیەکی ئەکادیمی ورد لەو هەموو سامانە بەنرخانە بکۆڵێتەوە و بیانخاتە ناو بەرنامەی ئەکادیمی خۆیەوە . هیوادارم لە دوارۆژدا خەڵکانی تر بتوانن ئەم کارەی من فراوانتر بکەن.




نەخشەی ژمارە (١)

# پێکهاتەی ئیداریی پارێزگای هەولێر لەسەدەی بیستدا

**پ. دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین**

پارێزگای هەولێر لە نەخشەی پێکهاتەی ئیداری بۆ عێراق بەگشتی و بۆ هەرێمی کوردستان بەتایبەتی لەرووی بایەخدانەوە پێگەیەکی جیاوازی هەیە. ئەم بایەخدانە بەوەی کە شاری هەولێر ئەمڕۆ پایتەختی هەرێمە، پێشتریش لەپێش راپەرینی ئازاری ساڵی ١٩٩١دا بنکەیەک بوو بۆ ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستان. ئەم پارێزگایە هەردوو وڵاتی تورکیاو ئێران دراوسێیەتی. لەبایەخدانە ستراتیژییەکەدا ئەمەش رەنگدانەوەی هەبووە، بەوەی کە پارێزگای دهۆک و پشتێنەی سنووری عێراق-تورکیا لەباکوور، ئێران لەرۆژهەڵات، سنووری هەردوو پارێزگای سلێمانی و کەرکوک لەباشوور، پارێزگای نەینەوا لەرۆژئاوا سنووردکەی دیاری دەکات. بڕوانە نەخشەی ژمارە

(١). پارێزگای هەولێر لەپاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی، بەناوی (لیوا)، لەقەزاکانی (کۆیە-رانیە-مەخمور-رەواندز-قەزای ناوەند) پێکهێنرا. بەر لەوەی پەکی بکەوێت لەو گۆڕانکارییە بەرفراوانییە بەردەوامەی لەماوەی سەدەی رابردوودا بەسەر پێکهاتە ئیدارییەکەیدا هات.

دیاردە سروشتییەکان بوونەتە دیاردەی سەرەکی سنوورە ئیدارییەکەی لەگەڵ پارێزگا دراوسێکانی و تەنانەت زۆربەی سنوورە ئیدارییە ناوخۆکەشی... هەردوو فاکتەری سیاسی و سەربازی رۆڵی کاریگەریان هەبووە لەو سەدان گوندەی رووبەرووی سووتان و کاولبوون بوونەتەوەو دانیشتوانەکەیان دووچاری هەڵمەتەکانی راگوێزان و کۆچ پێکردن بوونەتەوەو لە ماڵ و حاڵی خۆیان دوور خراونەتەوە... لەپاڵ ئەوەشەوە پرۆسەی ئەنفالی بەدناو.

لەژێر ئەو گۆڕانکارییەدا شارە سەرەکییەکانی سەر بەپارێزگا، لەهەڵچوون و بزاوتی کۆچکردنی گوندنشینەکان بۆیان، کۆژانێکی زۆریان چەشتووە. بەتایبەت شاری هەولێر کە ژمارەیەکی زۆری کۆچبەران روویان تێکردووە. ئەمەش بۆتە هۆکارێک بۆ گۆڕانی دابەشکردنی جوگرافیای دانیشتوان.

**هەولێر لەنێو لیوا دابەشکراوەکانی عێراقدا**

ناوی عێراق بەخاکێک دەوترێت، کە لەتکریت یان لە شارێک لەسەر رووباری دیجلە، یان هیت لەسەر رووباری فورات درێژ دەبێتەوە[١]. لەژێر ئەم رۆشناییە دەوڵەتی عێراق دوای جەنگی یەکەمی جیهان لەهەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە پێکهات، پێش ئەوەی ویلایەتی موسڵ لەساڵی ١٩٢٥ پێیەوە بلکێندرێت. ئەم ویلایەتانە (لیوا)و قەزاو ناحیەیان هەیە. ئەمەو ئەو دابەشکردنە تارادەیەکی گەورە تا رۆژگاری ئەمرۆش هەرماوە. بۆ نموونە ویلایەتی موسڵ ئەو لیوایانەی لەخۆ دەگرت: موسڵ-سلێمانی- شارەزوور. شارەزووریش پێکهاتبوو لەقەزای: هەولێر- رانیە- کفری- کۆیە- رەواندز. هەروەها ناوەندی (کەرکوک)یش[٢].

پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، نەخشەی پێکهاتەی ئیداری لەسەر بنەمای دابەشکردنی عێراقی تازە بۆ (١٤) لیوا دابەش کرا، هەر لیوایەک ژمارەیەک قەزاو ناحیەی درانە پاڵ، هەر ناحیەیەکیش ژمارەیەک گوندو کۆمەڵگەی پێوە لکێنرا. هەر یەکەیەکی ئیداریش رووبەرو سنوورە جوگرافیەکەی دیارکرا. لەساڵی ١٩٢٢ عێراق بۆ سێ بازنەی هەڵبژاردن دابەش کرا.

بازنەی یەکەم: لیوای موسڵ و سلێمانی و کەرکوکی لەخۆ گرت، پاشان (هەولێر)یشی بۆ زیادکرا، پاش ئەوەی لەهەمان ساڵ پێکهێنرا[٣].

**خشتەی ژمارە (١)**، ئاماژە بەپێکهاتە ئیدارییەکانی یەکەم بۆ (لیوای هەولێر) بەقەزاکانییەوە. (کۆیە-رانیە-رەواندز- مەخمور- قەزای ناوەندی (هەولێر) دەکات.

**خشتەی ژمارە (١)**
**نەخشەی پێکهاتەی ئیداری یەکەم لەلیوای هەولێر**

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | قوشتەپە - شەقلاوە - هەریر |
| مەخمور | گوێر - کەندێناوە |
| کۆیە | تەق تەق |
| رەواندز | باڵەک - برادۆست |
| رانیە | ناودەشت - چناران |

گەر سەرنج بدەین، ئەو دابەشکردنەی نەخشەی ئیداری عێراق لەسەر بنەمای دیاریکراو ئەنجامدراوە، لەسەرووی هەموویانەوە سروشتی جوگرافیاو هۆکاری ئابووری و مێژوویە. راپۆرتەکانی بەریتانیا ئاماژە بەو دابەشکردنە ئیدارییە دەدەن، کە ئەوسا کاری پێدەکرا، لەسەر بنەمای جوگرافی بنیات نرابوو[٥]. موسڵ -کەرکوک- هەولێر دەشتە بەرزەکان چیاکان (هەردوو زێ)ی لەخۆگرت. هەروەک چۆن دابەشکردنی ئیداری لەباشوور لەسەر هەندێ بنەمای جوگرافی بووە. هەروا دابەش نەکراوە[٦].

لێکۆڵینەوەکانی پلاندانان کە ئەو دابەشکردنە ئیدارییەی لەعێراق لەخۆگرتووە جەخت دەکاتەوە، کەزۆری سنووری ئیداری پارێزگاکان دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوونی دیاردە سروشتییەکان، بەو گوزارشتەی کاریگەرە لەسەر بزاوتی راکێشانی خەڵک بەرەو بنکە هەرێمییەکەی. لەگەڵ ئەوەش لەبەر هۆکاری جیا جیا گۆڕانکاری بەردەوام بوو، تا وای لێهات لەزۆر دیاردەی جوگرافی دەرچوو، بەبێ ئەوەی رەچاوی کتومتی سنوورە ئیدارییەکەو پێوەدانگەی

راکێشانی دانیشتوانەکەی بکرێت[٧]. پارێزگای هەولێر، یەکێکە لەو ناوچانەی ئەو گۆڕانکارییە ئیدارییەی بەدرێژایی سەدەی رابردوو بەخۆوەی بینی. سەرەڕای ئەوەی هەر لەسەرەتاوە بەپێی باری جوگرافی جیاواز پێکهێنرابوو، لەوانەیە لەپارێزگاکانی دیکەش جیاوازتر بووبێ، چونکە سنوورەکەی نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووک لەلایەک و، نێوان رووباری دیجلەو سنووری عێراق- ئێران- تورکیا لەلایەکی دیکەوە دیاری دەکات، بڕوانە نەخشەی ژمارە(١).

شتێکی زانراوە ک دهەر جۆرە گۆڕانکارییەک لەژێر رۆشنایی گۆڕانکارییە دیمۆگرافییەکان یان خواستی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەنجام بدرێ لەهەر ناوچەیەک یان هەرێمێک شتێکی ئاساییەو دروستەو خوازراوە. نەخوازەڵا مەبەست لەگۆڕانکارییەکە پێکهاتە ئیدارییەکە بێت. بەسانایی هاوولاتییەکان دەکەونە ژێر ئەو پێکهاتەیەوە، لەسەر داواکارییەکانیان سانا کردنی کارو گوزەرانیان بەزوویی و بەباشترین رێگە.. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمبوونی رووبەری یەکەی ئیدارییەکە لەژێر کاریگەری زۆربوون و گەشەسەندنی دانیشتوان و بەجێگەیاندنی پێداویستییەکانیان لەفراوانکردنی خزمەتگوزاری گشتی بۆ هاوولاتیان. بەڕێوەبردنی ئیدارەیەکی دیاریکراو زۆر ساناترە لەوەی ئیدارەی رووبەرێکی بەرفروان لەزەوی و مرۆڤدا بکرێت... جا لە شیکردنەوەی ئەو گۆڕانکارییەی پارێزگای هەولێر بەخۆیەوە بینی لەبەیەک بەستنەوەو پێودانگەی راکێشانی دانیشتوانی دەرکەوت، کتومتی سنوورە بەرچاوەکەی نییەو لەگەڵ واقیعی دابەشکردنە ئیدارییەکەی ئێستاکەدا هەڵناکات[٨].

### پێشکەوتنی مێژووی گۆڕانکاریی پێکهاتەی هەولێر:

پێشتر ئاماژەمان بەو ناوچەیەکرد، کە لەچوار قەزاو وێڕای قەزای ناوەند پێکهاتووە، (١٢) ناحیە لەخۆ دەگرێت. دەرەنجامی ئاماری دانیشتوانی عێراق ساڵی ١٩٤٧ ئاماژە بەوە دەدات، کە ناوچەکە لەپێکهاتەی ئیداری گۆڕانکاری بەخۆوە بینی. ناحیەی (قوشتەپە) لە قەزای ناوەندی (هەولێر) هەڵوەشایەوە، لەبری ئەوە ناحیەی (حەریر) بەقەزای رەواندز لکێنرا، قەزای زێبارو ناحیەکانی هاتنە سەر لیوای هەولێر: بارزان-مزوری باڵا-ناوەند. لەلیوای موسڵ بچڕێندران. ناحیەی مێرگەسۆریش بەنوێیی هاتە سەر قەزای رەواندز. بڕوانە خشتەی (٢).

**خشتەی ژمارە (٢)**
**پێکهاتەی ئیداری لەلیوای هەولێردا ساڵی ١٩٤٧[٩]**

| قەزا | ناحیە |
| --- | --- |
| هەولێر | شەقلاوە |
| مەخمور | گوێر - کەندێناوە |
| کۆیە | تەق تەق |
| رانیە | ناودەشت- چناران |
| رەواندز | باڵەک - برادۆست- حەریر- مێرگەسۆر |
| زێبار | بارزان (بلە) - مزوری باڵا |

ساڵی ١٩٥٧ لەژێر رۆشنایی دەرەنجامی ئاماری دانیشتوانی عێراق، هەولێر لە نەخشەی پێکهاتە ئیدارییەکەیدا گۆڕانکاری نوێی بەخۆوە بینی. بەوەی قەزای شەقلاوە بەناحیەکانییەوە دووبارە پێکهێنرایەوە: حەریر لەقەزای رەواندز. هەردوو ناحیەی سەلاحەدین و خۆشناو کە تازە بوون. هەروەها پێکهاتەی ناحیەی عینکاوە لەقەزای هەولێرو، ناحیەی قەراج لەقەزای مەخمور، دووبارە پێکهێنراوە. ناحیەی مێرگەسۆر بەقەزای زێبار لکێنرا. سەرباری ئەوەی قەزای رانیە بەناحیەکانییەوە: ناودەشت و چناران و ناوەند لەلیوای هەولێر پچڕێندران و بەلیوای سلێمانییەوە لکێنران. بڕوانە خشتەی ژمارە (٣)

**خشتەی ژمارە (٣)**
**پێکهاتەی ئیداری لەلیوای هەولێردا ساڵی ١٩٥٧[١٠]**

| قەزا | ناحیە |
| --- | --- |
| هەولێر | عینکاوە |
| مەخمور | گوێر - کەندێناوە - قەراج |
| کۆیە | تەق تەق |
| شەقلاوە | حەریر - خۆشناو - سەلاحەدین |
| رەواندز | باڵەک - بردۆست |
| زێبار | مێرگەسۆر - بارزان - مزوری باڵا |

لەپاش شۆڕشی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨، لەسەر ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری گۆڕانکارییەکی گشتگری کرا. گۆڕانکاری لەسەر نەخشەی پێکهاتەی ئیداری لە ناوچەکە کێشرایەوە. لە هەمان ساڵدا ئەو ناحیانە هەڵوەشێندرانەوە: عەنکاوە لەقەزای هەولێر- قەراج لەقەزای مەخمور- خۆشناو لەقەزای شەقڵاوە. جارێکی دیکە سەرلەنوێ ناحیەی قوشتەپە گەڕێندرایەوە سەری، هەروەک ناحیەی حەریرو میرگەسۆر گەڕێندرانەوە سەر قەزای ڕەواندز. هەروەها قەزای زێباریش گەڕێندرایەوە سەر لیوای موسڵ. بڕوانە خشتەی ژمارە (٤)

**خشتەی ژمارە (٤)**

**پێکهاتەی ئیداری لەلیوای هەولێر ساڵی ١٩٥٨** [١١]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | قوشتەپە |
| مەخمور | گوێر - کەندێناوە |
| کۆیە | تەق تەق |
| شەقڵاوە | سەلاحەدین |
| ڕەواندز | حەریر- باڵەک- برادۆست-میرگەسۆر |

ئەوە بوو کاتێکی زۆر نەخایاند لەساڵی ١٩٥٩ گۆڕانکاری دیکە ڕوویدا، قەزای زێبار لەلیوای موسڵ سەرلەنوێ گەڕێندرایەوە سەر لیوای هەولێر. هەروەها ناحیەی حەریریش گەڕێندرایەوە سەر قەزای شەقڵاوە. هەروەها پێکهاتەی هەردوو ناحیەی قەراج و خۆشناویش گەڕێندرانەوە سەر شوێنی پێشتری خۆیان. بڕوانە خشتەی ژمارە (٥)

**خشتەی ژمارە (٥)**

**پێکهاتەی ئیداری لەلیوای هەولێر ساڵی ١٩٥٩** [١٢]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | قوشتەپە |
| مەخمور | گوێر - کەندێناوە- قەراج |
| کۆیە | تەق تەق |
| شەقڵاوە | حەریر - سەلاحەدین- خۆشناو |
| ڕەواندز | باڵەک - برادۆست |
| زێبار | میرگەسۆر - بارزان - مزوری باڵا |

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە لیوای هەولێر گەڕایەوەو، سەرلەنوێ لە شەش قەزا پێکهێنرایەوە، هەروەکو لەچلەکانی سەدەی ڕابردوو پێکهێنرابوو. هەروەها لەنێوان هەردوو ساڵی ١٩٥٨-١٩٥٩ لە (٩) ناحیە زێدەکرابوو بە (١٣) ناحیە.

**پێکهاتەی ئیداری لە ماوەی پاش شۆڕشی ئەیلول:**

پاش شۆڕشی تەمووزی ساڵی ١٩٥٩ دەسەڵاتداریتی عێراقی لەو بەڵێن و پەیمانانەی کە بەگەلی کوردی دابوون پاشگەز بۆوە، سوپای عێراق بەرەو ناو جەرگەی خاکی هەرێمی کوردستانی عێراق بزاوتی کرد. نەتەوەی کوردیش ناچار بوو بەرگری لەمافە ڕەواکانی نەتەوەیی خۆی بکات، ئەوە بوو لەساڵی ١٩٦١ شۆڕشی ئەیلولی مەزن بەرپا بوو، کە تاساڵی ١٩٧٠ بەردەوامی کێشا. ئەوەبوو ڕێککەوتنێک لەنێوان شۆڕشی کورد لە عێراق و سەرکردایەتی عێراقی ئەوسا پەسندکرا، دەبوو نەتەوەی کورد (مافی ئۆتۆنۆمی پێ بدرێ لەناوچەی کوردستان)دا.

لەو ماوەیەدا ناوچەکە گۆڕانکارییەکی نوێی لەنەخشەی پێکهاتەی ئیداری بەخۆوە بینی لەوانە:

١- هەڵوەشاندنەوەی هەردوو ناحیەی خۆشناوو قەراج.

٢- دووبارە پێکهێنانەوەی ناحیەی عەنکاوە.

٣- گواستنەوەی ناحیەی حەریر بۆ سەر قەزای ڕەواندز، لە قەزای شەقڵاوە تەنیا ناحیەی سەلاحەدین مایەوە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٦)

**خشتەی ژمارە (٦)**

**پێکهاتەی ئیداری لیوای هەولێر ساڵی ١٩٦٥** [١٣]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | عەنکاوە - قوشتەپە |
| مەخمور | گوێر- کەندێناوە |
| کۆیە | تەق تەق |
| شەقڵاوە | سەلاحەدین |
| ڕەواندز | باڵەک - برادۆست - حەریر |
| زێبار | میرگەسۆر - بارزان - مزوری باڵا |

لەپاش ئەوەی لەساڵی ١٩٧٤ جەنگی نێوان عێراق و کورد روویدا، لەهەمان ساڵدا گۆڕانکارییەکی تازە لەپێکهاتەی ئیداری لیواکە روویدا گرنگەکەیان:

١- دروستبوونی دوو ناحیەی دیاناو خەلیفان و خرانە سەر قەزای رەواندز.

٢- هەردوو ناحیـەی قـەراج و خـۆشناو دووبارە پێکهێنرانەوە.

٣- گواستنەوەی ناحیەی حەریر سەرلەنوێ بۆ سەر قەزای شەقلاوە. ناحیەی باڵەکیش گواسترایەوە سەر قەزای (چۆمان) کە لەنوێ پێکهێنراوە.

بەواتایەکی دیکە لیـوای هەولێـر بۆ یەکەم جـار (٧) قـەزای لەخۆ گرت، ژمارەی ناحیە ئیدارییەکانیش بووە (١٥) ناحیە. خشتەی ژمارە (٧). کاریگەری ئەو رەهەندە سیاسییە لەسەر ئەو گۆڕانکارییە لەخۆ دەگرێت.

**پێکهاتەی ئیداری پاش رێککەوتنی ١٩٧٥**

رێککەوتننامەی جەزایر کە لەساڵی ١٩٧٥ لەنێوان عێـراق و ئێـران مـۆرکرا، ناسەوارێکی نێگەتیڤی لەسەر تێکڕای ناوچەکە دروست کرد، جا چ پەیوەندار بێ بەباری دیمۆگرافی دانیشتوان، یان باری کۆمەڵایەتی- ئابووری.. هەروەها بەسیاسیشەوە. ئەمەو لە ئاسەواری ئەو گۆڕانکارییانەی لەنەخشەی ئیدارەی ناوچە کرا:

١- دروستبوونی ناحیەی تازە: خەبات-شۆڕش-حاجی ئۆمەران.

٢- هەڵوەشاندنەوەی ناحیەی بارزان لەقەزای زێبار.

سـەرەڕای ئەو گـۆڕانکارییـە لەپێکهـاتەی ئیـدارەی هەولێردا، رووبەرەکەی گۆڕانکاری زۆری بەسەردا نەهات. لە (١٦٦٠٠)کم٢ بۆ (١٤٢٠٦)کم٢ لەمـاوەی پێنج دەیەکـانی رابردوو کـە مـبـۆوە. لەگەڵ ئەوەش ژمـارەی ناحیـەکـانی لیـوا لە (١٠ بوو بە ١٧) ناحیـە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٨)

**خشتەی ژمارە (٧)**

**پێکهاتەی ئیداری لە پارێزگای هەولێر ساڵی ١٩٧٠**[١٤]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | عەنکاوە - قوشتەپە |
| مەخمور | گوێڕ - کەندێناوە - قەراج |
| کۆیە | تەق تەق |
| شەقلاوە | خۆشناو - حەریر - سەلاحەدین |
| رەواندز | برادۆست - دیانا - خەلیفان |
| زێبار | بارزان - مزوری باڵا |
| چۆمان | باڵەک |

**خشتەی ژمارە (٨)**

**پێکهاتەی ئیداری لەپارێزگای هەولێر ساڵی ١٩٧٧**[١٥]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | عەنکاوە -قوشتەپە - خەبات |
| مەخمور | گوێڕ - کەندێناوە - قەراج |
| کۆیە | تەق تەق - شۆڕش |
| شەقلاوە | خۆشناو- حەریر- سەلاحەدین |
| رەواندوز | برادۆست - دیانا- خەلیفان |
| زێبار | مزوری باڵا |
| چۆمان | باڵەک - حاجی ئۆمەران |

**پێکهاتەی ئیداری لەپاش جەنگی عێراق-ئێران:**

عێراق لەنێوان ساڵانی (١٩٨٠-١٩٨٨) جەنگێکی گشتگری لەگەڵ ئێران بەخۆوە بینی. کوردستانی عێراق یەکێک بوو لەگەوردترین گۆڕەپانی ئەو جەنگە. دووبارە موعاناتی چەشتەوە، سەرەڕای دەرەنجامی ئەو هەڵمەتە سەربازیانەی عێراق، کە پێشتر لەو ناوچانە ئەنجامی دابوو. لەماوەی ئەو ساڵانەدا گۆڕانکارییەکی گشتگری لە نەخشەی ئیداری ئەو ناوچانە کرا.

خشتەی ژمارە (٩) بۆمان روون دەکاتەوە، کە ژمارەی قـەزاکـانی هەولێـر لە (٧ بۆ ٤) کـەم بۆوە. ژمـارەی ناحیـەکـانیش لە (١٧ بۆ ١٠) ئەوەش ئەوە دەگـەیەنێت

لەماوەی جەنگی عێراق-ئێراندا بەرفراوانترین گۆڕانکاری بەڕووە خراپەکەی لەپێکهاتەی ئیداری ئەو پارێزگایە کراوە. ئەو راستییەش لەو خشتەیەدا دەبینرێ.

**خشتەی ژمارە (٩)**
**پێکهاتەی ئیداری پارێزگای هەولێر لەسالی ١٩٨٧**[١٦]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | خەبات - کۆیە- زێبار- چۆمان |
| مەخمور | گوێڕ- قەراج |
| شەقلاوە | سەلاحەدین- حەریر |
| سدیق | خەلیفان-رەواندوز (سدیق: حکومەت |

لە گۆڕینی یەکەی ئیداریەکان ناوە ناوچەییەکانیشی دەگۆڕی هەر بۆیە ناوی سدیقی لەو قەزایە نا)

١- هەلوەشاندنەوەی (١٢) یەکەی ئیداری: ناحیەکان (عەنکاوە-قوشتەپە-کەندێناوە-شۆڕش-تەق تەق-دیانا-خۆشناو-برادۆست-حەریر-بالەک-حاجی ئۆمەران-مزوری بالا).

٢- بەم پێیە، ئەم قەزایانە هەلوەشانەوە: (رەواندز-چۆمان-کۆیە-زێبار، بوون بەناحیە. (سدیق)یش بوو بەقەزای تازە، بێگومان ئەو گۆڕانکارییە ئیدارییە، ئاوەژوو بۆوە، لایەک دەرەنجامی ئیفرازاتی جەنگی عێراق-ئێران، لەلایەکی دیکە هەوڵ و تەقەلای دەسەلاتداریێتی عێراق و سەپاندنی دەسەلاتەکەی بەسەر هەرێمی کوردستانی عێراقدا. لێرە پێویست ناکات هەموو هۆکارێک بۆ ئەو لێکۆلینەوە بەکاربهێنین لەوەی کە لەسووتاندن و کاولکردنی گوندو شارەکان و راگوێزانی دانیشتوانەکەیان روویدا بۆ کۆمەلگاکان کە بەدرێژایی رێگا سەرەکییەکان یان لەنزیک شارە گەورەکان دروستی کردبوون. بۆ کۆنترۆڵ کردنیان و تەحەکومکردن بەتواناکانیان.. هەروەکو ئەو ناوچەیە رووبەڕووی پرۆسەی ئەنفال بۆوەو تەواوی ناوچەکانی لێ چۆل کردن و راگوێزرانەوە بۆ شوێنی نادیار، هاوکات لەدوای رووخانی رژێم لەسالی ٢٠٠٣، لەرێگای دۆزینەوەی گۆڕە بەکۆمەلەکان کە بەپاشماوەکانیان ناسراونەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت فاکتەری سیاسی و سەربازی لەتاکە فاکتەرەکان بوونە لە وێنەکێشکردنی دوا

نەخشەی یەکەکانی ئیداری لە پارێزگاکەدا.

**پێکهاتەی ئیداری لەپاش سالی ١٩٩١دا:**

پێش راپەڕینەکەی سالی ١٩٩١ لە هەرێمی کوردستان، ناحیەی پردێ لە پارێزگای کەرکوک پچڕاو بەپارێزگای هەولێر لکێنرا. هەردوو ناحیەی چۆمان و زێبار هەلوەشێنرایەوەو ناحیەی حەریر دووبارە پێکهاتەوەو بەقەزای سدیق لکێنرا. گەر سەرنج بدەینە خشتەی ژمارە (١٠)، کە لەپاش ئازادکردنی بەشێکی بەرفراوان لەهەرێمی کوردستانی عێراق لەسالی ١٩٩١ دەبینین:

١- دووبارە قەزای کۆیە بەهەر سێ ناحیەکانییەوە پێکهێنرایەوە: تەق تەق و شۆڕش و ناحیەی ناوەند.

٢- دووبارە ناحیەکان پێکهێنرانەوە: عەنکاوە-قوشتەپە - هیران- کەندێناوە- دیانا- برادۆست.

٣- ناوی قەزای سدیق گۆڕا بوو بەقەزای (سۆران) بەناحیەکانییەوە: رەواندز-خەلیفان-دیانا-برادۆست-ناحیەی ناوەند.

**خشتەی ژمارە (١٠)**
**پێکهاتەی ئیداری پارێزگای هەولێر پاش سالی (١٩٩٣)**[١٧]

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | عەنکاوە- قوشتەپە- خەبات |
| مەخمور | گوێڕ- کەندێناوە- قەراج |
| کۆیە | تەق تەق-شۆڕش |
| شەقلاوە | سەلاحەدین- حەریر- هیران |
| سۆران | دیانا- رەواندز- خەلیفان - برادۆست |
| زێبار | بارزان - مزوری بالا |
| چۆمان | بالەک - حاجی ئۆمەران. |

بەلام لەو ساتوکاتەدا پارێزگای هەولێر بۆ یەکەم جارە (٢٤) ناحیە لەخۆ بگرێت و بەسەر حەوت قەزادا دابەش کراون، پاش ئەوەی قەزای مەخمور بەپارێزگای نەینەوا لکێنرا.

**ئەمەش لەبەر چەند دەرەنجامێک:**

١- ناسەقامگیری بارودۆخی هەرێم، لەلایەک وایکرد

کە هانی پرۆسەی دووبارە نۆژەنکردنەوەی ژێرخان بدەن و لەلایەکی ترەوە، بەپەلە پلانی پێشخستن و گەشەسەندن جێبەجێ بکەن.

٢- پەلەکردن لە گەشەسەندنی پارێزگاو، زیادبوونی قەوارەی دانیشتوان، وایکرد کە پێداویستییەکانی جۆراو جۆری ژیان چ لەرووی تەندروستی ء رۆشنبیری و فێرکردن، یان لەرووی ئیداری و خزمەتگوزارییە گشتییەکان زێدە بکات..

٣- زیادبوونی داهاتی دارایی تایبەتکراو بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق، لەپاش رووخانی رژێمی پێشوو لەساڵی ٢٠٠٣ دا و لەپاش کردنەوەی ئیدارەی حکومەتی ناوەندیی، لەوەبەرهەمهێنان لە بونیاتنانەوەو ئاوەدانکردنەوەدا بەشداربوو.

٤- باشکردن لە تۆڕەکانی گواستنەوەو گەیاندندا، بووە هۆی ئاسانکاریکردن لە بەیەک بەستنەوەی بنکە نیشتەجێیەکان بەیەکتری و، بەهەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان.

بێگومان ئەو هۆکارانەی باس کران، دەرفەتێکی لەبەردەم حکومەتی هەرێمی کوردستان هێنایە ئاراوە بەدووبارە چاوخشاندنەوە بەو کار راپەڕاندنەی وەرگیراون و تایبەتن بەپێکهاتەی ئیداری لەپارێزگای هەولێردا، کە شیاو بێت لەگەڵ داواکارییەکانی قۆناغی نوێدا، بەمەبەستی گەیاندنی خزمەتگوزاری بەسانایی بۆ هاووڵاتیان. لەو کار راپەڕاندنانەش:

١- دروستکردنی قەزای نوێ (دەشتی هەولێر) و ناحیەکانی: کەسنەزان-دارەتوو، کە نوێ بوون، لەگەڵ ناحیەی قوشتەپەی لەخۆگرت.

٢- دروستبوونی ناحیەی نوێی (بەحرکە) لەقەزای ناوەند (هەولێر) لەپاڵ هەردوو ناحیەی عەنکاوەو خەبات.

٣- دروستبوونی ناحیەی نوێ: ئاشتی- سیدەکان- گەڵاڵە- دۆڵی روستێ- پیران- ناحیەی مەزن. بروانە خشتەی ژمارە (١١).

لەو ماوەیەدا هەردوو ناحیەی خەبات و دارەتوو بوون بەقەزا.

**خشتەی ژمارە (١١)**

**پێکهاتەی ئیداری لەپارێزگای هەولێری ئێستاکە[١٨]**

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| ناوەندی قەزا | عەنکاوە-خەبات-بەحرکە |
| دەشتی هەولێر | قوشتەپە-کەسنەزان-دارەتوو |
| کۆیە | تەق تەق-شۆڕش-ئاشتی |
| شەقڵاوە | سەلاحەدین-حەریر-هیران |
| سۆران | دیانا-رەواندز-خەلیفان-سیدەکان |
| چۆمان | گەڵاڵە-حاجی ئۆمەران-دۆڵی روستێ |
| مێرگەسۆر | مێرگەسۆر-بارزان-شێروان مەزن-پیران |

**پەراوێز و سەرچاوەکان (هوامش الدراسة):**

١-تقرير لجنة عصبة الامم حول الحدود العراقية-التركية، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٢٤.
٢- لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر خياط مطبعة اركان، بغداد، ص١٧٦. علي شاكر علي، نظم الحكم والادارة، موسوعة الموصل الحضارية، ج٤، الموصل، ص١٦٨.
٣- وزارة التخطيط، هيئة التخطيط الاقليمي، تحديد المناطق التخطيطية في العراق، بغداد، ١٩٨٤ (دراسة رقم ١٥٥)، ص٢٧.
٤- طه الهاشمي، مفصل جغرافية العراق، مطبعة دارالسلام، بغداد ١٩٣٠، ص٥٥٤.
٥- وزارة التخطيط، المصدر السابق، ص٣٣.
٦- المصدر نفسه، ص٣٢.
٧- فتشا شفيلي، العراق تحت الانتداب البريطاني، ترجمة هاشم التكريتي، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص١٢.
٨- وزارة التخطيط، المصدر السابق، ص٤٦.
٩- وزارة الشؤون الاجتماعية، احصاء السكان لسنة ١٩٤٧-لواء اربيل- مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٤.
١٠- وزارة الداخلية، المجموعة الاحصائية لسجل السكان لسنة ١٩٥٧. لواء اربيل- مبطعة رشاد، بغداد، ١٩٦٣.
١١- وزارة التخطيط، المجموعة الاحصائية السنوية لسنة ١٩٥٨.
١٢- وزارة التخطيط، المجموعة الاحصائية السنوية لسنة ١٩٥٩.
١٣- وزارة التخطيط، مديرية الاحوال المدنية العامة، نتائج احصاء السكان لسنة ١٩٦٥، مطبعة الوزارة، بغداد، ١٩٧٣.
١٤- وزارة التخطيط، الحصر الاولي للسكان لسنة ١٩٧٠. مطبعة الجهاز المركزي، بغداد، ١٩٧٣.
١٥- وزارة التخطيط، نتائج احصاء السكان لسنة ١٩٧٧، مطبعة الجهاز المركزي، بغداد، ١٩٧٨-محافظة آربيل.
١٦- وزارة التخطيط، نتائج احصاء السكان لسنة ١٩٨٧، مبطعة الجهاز المركزي، بغداد ١٩٨٨، محافظة آربيل.
١٧- هەرێمی کوردستان، وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە، پلانی پارێزگای هەولێر، هەولێر، ١٩٩٤.
١٨- پارێزگای هەولێر، هەیکەلی رێکخستنی پارێزگای هەولێر-کارگێری گشتی.



# هەولێر
# بەزمانی ژمارەکان

**دکتۆر محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسور**
**کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین**

تاکو ئێستا وەکو پێویست لەسەر هەولێر نەنووسراوە، ئەوەی جێگای داخیشە زۆرجار نووسینەکان بریتین لە دووبارەکردنەوەی نووسینەکانی پێشوو. بێگومان سەبارەت بە هەولێر و هەموو شارێکی دیکەش سەرژمێرییەکان گرنگییەکی زۆریان هەیە. لەم رووەوە و لەبەر گرنگی بابەتی سەرژمێریی سەبارەت بەشاری هەولێر، کە بەداخەوە لەهەندێ نووسینە ئەکادیمییەکانیش گرنگی پێویستی پێنەدراوە. ئێمە لێرەدا چەند زانیارییەکی گرنگی تایبەت بەشاری هەولێر لە سەرچاوەیەکی گرنگ دەخەینە روو. ناونیشانی کتێبەکە بەزمانی عەرەبی بەم شێوەیەیە (الحكومة العراقية- وزارة الاقتصاد- الدائرة الرئيسية للاحصاء - المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٤٩- مطبعة الحكومة - بغداد١٩٥١). واتە، (حکومەتی عێراقی- وەزارەتی ئابووری-بەڕێوەبەرایەتی سەرژمێری سەرەکی-کۆمەڵەی سەرژمێری گشتی ساڵانە بۆ ساڵی ١٩٤٩، چاپخانەی حکومەت - بەغداد١٩٥١). ئێمەش چەند زانیارییەکی تایبەت بەهەولێرمان دەرهێناوە، لاپەڕەکەیشیمان بەرامبەری نووسییەوە.

بۆزیاتر ئاسانکاریش زانیارییەکان لە چەند خاڵێکدا دەخەینەڕوو.

ئەو کردەوانەی بەڕێوەبەری خۆجێییەتی لە هەولێر ئەنجامیداوە

| | |
|---|---|
| قوتابخانەی سەرەتایی | ١٩ |
| پەیمانگا | – |
| باخچەی منداڵان | – |
| کتێبخانە | ١ |
| شوورەی قوتابخانە | ٣ |
| تەواوکردنی کاری پێشوو و نۆژەنکردنەوەی قوتابخانەکان | ٢ |
| کردنەوەی خولی پیشەیی | – |
| دروستکردنی بەشی ناوخۆ | ١ |
| یاریگایی وەرزشی | ١ |
| دروست کردنی مودەرەجات | – |
| هۆڵی گشتی | – |
| نەخۆشخانە | – |
| بنکەی تەندروستی | ٣ |
| بنکەی تەندروستی بەیتەری | ١ |
| بنکەی تەندروستی گەڕۆك | – |
| دروستکردنی حەوزی بەیتەری | ٦ |
| تەواوکردنی بنکەی تەندروستی | ٢ |
| خانوو بۆ فەرمانبەرانی تەندروستی و بەیتەری | ٤ |
| خانوو بۆ فەرمانبەران | ٦ |
| خانوو بۆ کرێکاران | ١٥ |
| خانەی میوانداریکردن | ١ |
| خانوو بۆ مامۆستایان | ٦ |
| خۆشکردنی ڕێگا | ١ |
| دروستکردنی پردو قەنات | ٧ |



# شارەوانی و ٤٢ ساڵ

ئا: باوکی کاژڤان

بە دوای تەمەنداریکی شارەوانیدا دەگەڕام، لە یەکێکی وا دەگەڕام تەمەنێکی زۆری لەم بەڕێوەبەرایەتییە بردبێتە سەر و ئاگاداری ئیش و کاری شـارەوانی بێت و لەباسکردنی شت هێـمن و ورد و لەسـەرخـۆ بێت، پرسـیـار.. پرسـیـار.. لیـسـتـەی خانەنشینەکانی شارەوانیم پشکنی و مـام (زۆراب حەسەن)م دۆزییەوە و بڕیارم دا بچم بیـــبـــینم و هەندێ زانیـــاری لە بارەی شـــارەوانی لێ وەربگرم.

لەگـەڵ کـاک (نافع خۆشناو)ی خانەنشین چوومە خزمەت مام زۆراب و خۆم پێ ناساند و نیاز و مەبەستی خۆم تێگەیاند، مـام زۆراب لە خەنی خۆشییان شاگەشکە بوو.

چەند خـۆشـە مـرۆڤ مـاوەیەکی زۆری لە شوێنێک بردبێتـە سەر و بە خـزمـەتەکـەی خـۆی سـەربەرز بێت و خەڵک بە چاکە باسی بکەن و ڕێزی بگرن.

مام زۆراب لە شارەوانی کرێکار و چاودێر (مـراقب) و نووسـەر (کـاتب) بووە و بە پیـــاوێکی دەست پاک و ئیش جـــوان و چاکـــەویـست ناوی ڕۆیشتووە.

مـــام زۆراب پیـــاوێکی زۆر بە تەمـــەن و ســـوورە و نەختـێ کـــورتە باڵایە، چاوەکـــانی هێـــشـــتـــا باش و تاقـــەتی بینین و خـــوێندنەوەی هەیە، ڕەفـتـــاری جـــوانە و قـــســـەی ڕەوانە. تورکی و عـەرەبی و فـارسی دەزانێ، سـەرباری ئەمـەش کـوردییـەکـەی نەشێواوە، لە گفتوگۆدا زۆر ڕەوانە.

مـام زۆراب بەشکڵ نووس فـێری خوێندەواری بووە. لەبەر دەستکورتی و بێ دەرامـــەتی دایکی ڕێی نەداوە بچێتە قوتابخانە، بەڵام ئەوەندە حەز و ئارەزووی لە خوێندەواری بووە، هەر لە خـۆیەوە، بە چاولێکەری فـێـری خـوێندنەوە و نووسین بووە و خەت و قەڵەمێکی باشی پەیدا کردووە.

پاشان، مام زۆراب لەگەڵ دایکی ڕێککەوت، کـە هەم ئیش بکات و ئەوان بژێنێت، هەم بچـــێـــتـــە قوتابخانە. جا لە ئاقاری دەوروبەری قـەڵات، وڵـسـات و ئاژەڵی بە (٢٠)

فلس دەلەوەڕاند و لە قـــەلات و ماڵەکانی خوارەوە بە سەبەتە نانی بۆ بازاڕ و چێشتخانەکان دەبرد، بەمە دەرامەتی ماڵەوەی پەیدا دەکرد و دەچووە قوتابخانەش.

مام زۆراب بەهێمنی دەستی بە گێڕانەوەی سەربردەی خۆی کرد و گوتی:

(لە قوتابخانە، هەر مامۆستایەک بە ئارەزووی خـــۆی دەرسی پێ دەگوتین. جا ئەگەر مامۆستا فەندی کوردپەروەر بووایە، بە کوردی دەرسی دەگوتەوە و زمانەکانی تری پشتگوێ دەخست. ئەگەر مامۆستا حەزی لە زمـــانێکی تر بکردبایە، ئەوە بەو زمـــانە دەرسی دەگـوتەوە. بەمـــەش زۆرجـار سەریان لێ دەشێـواندین، وایان لێ دەکردین ئەوەی دەشمانزانی لەبیری بکەین....).

مام زۆراب بەردەوام بوو، گوتی: (سەرباری چەرمەسەری ژیان و بێ کەسیم هەر کۆڵم نەدا و بەردەوام بووم تا لە هەر سێ زمـــاندا (کـــوردی و تورکی و عـەرەبی) بە چاکی فـێـری خوێندنەوە و نووسین بووم... پاشان پەنام بردە قوتابخانەی شەو......).

کە تازە جادەی رواندز دەکرا، مام زۆراب کرێکاری لەو جادەیە کردووە و بەپشت بەردی گـواسـتـۆتەوە و بە کـولێنگ رێگای شـەق کـردووە. تا سـاڵی ١٩٢٨ لەسـەر قـەلات و لە خوارەوەی قەلات قوڕکاری کردووە.

جـەنگی یەکـەمی جـیـهـانی گەنجەکانی بە رەشبگیری بۆ بەرەکانی شەڕ راپێچا، بۆیە ئافرەتەکانی شار ناچاربوون کـرێکاری بکەن، مـــام زۆراب ئەم دیاردە جەرگبڕەی زۆرباش بەبیر دێ.

مـــام زۆراب ســاڵی ١٩٢٨ بە کـرێکاری لە شـارەوانی دامـەزراو سەبارەت بە هوشیـاری خۆی و ئەو کەمە خوێندەوارییەی هەیبوو، بوو بە (کشاف)، واتە چاودێر.. مام زۆراب بەدەم گفتوگۆیەکی قـووڵەوە گوتی: (ئای عـوسـمـانییـەکان، ئەم شـارە جـوانەیان چەند پیس و پۆخڵ و بێ تەمیز کردبوو. خۆ هەرگیز بە بیریاندا نەدەهات پاکی بکەنەوە، کـــوێرە رێگایەکی بۆ بکەنەوە، بە خەیاڵیاندا نەدەهات دوو هەژاری دەست کـورت دامەزرێنن.).

دەم نادەم دەیگوت: (مـامۆسـتـا، چەندی بیری لێ دەکەیتەوە پیسی و بۆگەنی و چڵپاوی گەورە و گۆمی پڕ لە نەخۆشییان جێ هێشت).

مـام زۆراب گوتی: (لە سەرەتای دامـەزرانم، ئێـمـە چوار (کـشـاف) بووین، بەلام ئەو حـەلە کـەشـشـاف گـەورەیی و ئیـعـتـیـبـاری هەبوو. بە بەرگی تایبەتی و سیدارەی سەری و دار عـەسـای دەسـتـی کـاری لەبەر دەڕۆیشت. هەوڵـمـــان دەدا هەندێ کـــووچە و کـــۆڵان پاک کـــەینەوە و بەردرێژی کـــەین، بەلام بڕین و فراوانکردنی جادە زەحمەت بوو. ئەم باخچەیە مولکی فلان کەسە نابێ ببڕێت. ئەم حـەسـارە خـاوەنی رازی نابێت، ئەم جۆرە شتانە تەگەرە بوون. بەلام هەر چۆنێک بوو شـــارەوانی هەورە چڵکنەکەی کۆنی لەسەر رووی شار لاداو کەوتە کـار. بەیانیـان، کە هەر سێ دەرگـای قـەیسـەرییـان دەکـرانەوە، ئێـمـە پێش هاتنی دوکاندارەکان ئیشی خۆمان ئەنجام دەدا. خـــاوێنکەر و کـــەردار و گـەسکەدەرەکـان بە کـۆلانەکـانی تەعجیل و خانەقا و تەیراوە و هەر سێ گـەڕەکـەکـەی قـەلا و دەوروبەری قاوەخانەکەی (مام ئینشتەی جوو) و حەوزەکـەی ئاوی شـار و شـوێنی تر بلاودەبوونەوە. هەر کـەسێ شـەڵتەی پڕ زبڵ و پیسـایی دەکرد و دەیبـرد لە شـــوێنێـکی دوور فـــڕێی دەدا و کەشافەکانیش ناوی ئەو ماڵانەیان دەنووسی، کە بەردەرگایان پیس بوو، زۆر جـــار مـــاڵی ئاغـــا و دەوڵەمەندەکانیان نەدەنووسی. بەلام من وەک دڕک دەچوومە ناو چاویان و بەم رەفـتـارەی ئەوان رازی نەبووم و هەمیشە داوای یەکسانیم دەکرد لە سـزادانی ئەو مـاڵانەی داوای شـارەوانیـیـان بەجێ نەدەهێنا، جارێکیان ناوی ماڵە دەوڵەمەندێکم نووسی، پێویست ناکا ناوی بێنم، لە شارەوانی قسەیان بۆ هەڵبەستم و ویـسـتـیـان نانم ببڕن، بەوەندەش بەرۆکیان بەرنەدام تەقدیمی حاجی رەفعەتی سەرنووس و باش کاتبیان کردم، خودای گەورەی لێ رازی بێ، پیاوێکی چاک بوو، وای لێ هاتبوو بە هوشـیـاری خۆی لە هەمـوو کـاروبارێکی شارەوانی دەستی بە باشی دەڕۆیشت. قسە هەر قسەی ئەو بوو. جا لەجیاتی ئەوەی سزام بدا و نانم ببڕێ یەکسەر منی کرد بە

نووسەر لە شارەوانی. زۆری پێ نەچوو هەموو کەلەن و قوژبنێکی ئیش و فایلەکان و کاری ڕۆژانەی شارەوانی فێربووم و بە یەکجاری لە شارەوانی مامەوە، چونکە سەرم لە ئیشەکە دەردەچوو، دەستخەتم خۆش بوو، دە قات لەوانیتر باشتر بووم. پۆستەی ڕۆژانەم بە دەفتەر زیمە دەبردە دایەرەکان. سەرم باش لە کتاب و کلێشەی نووسین دەردەچوو، بۆیە بوومە نووسەر و هەموو کارێکم دەکرد.).

مام زۆراب لە قسەکانی بەردەوام بوو، گوتی: (مووچەکەم یەک دیناری ئێستا بوو، بەڵام بەچاکی بەڕێوە دەچووم، خۆ زیادەی مانگانەمان بە هەوەنتە نەدەهات! پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا ئەگەر بۆیان بنووسیباین ئەویش هەزار تەگەرەی دەهاتە پێش....

هاتنی مامۆستا حوزنی موکریانی، مێژوونووسی گەورەی کورد، بەخۆی و بە چاپخانەکەیەوە بۆ هەولێر هاندەرێک بوو بۆ من، بۆ زیاتر فێربوونی کوردی. زۆر کتێبی کوردیم دەستکەوت. هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، زۆر هاوڕێم بوو، منیش لەزۆر کار بە کەڵکی دەهاتم.

ئەوکاتە کە میری فەرمانی دا لە هەموو شارەکانی عیراق، لە کاروباری دایەرەکان زمانی مەحەللی بەکاربێت، بە نەبەردی موحسین ئاغای سەرۆک شارەوانی، کە زۆری هەوەس بە نووسینی کوردی دەهات و بەهاوکاری نازمی سلێمان ئاغای نووسەری شارەوانی و برادەرانی تر دەستمان کرد بە رایی کردنی کاروباری ڕۆژانەی شارەوانی بەزمانی کوردی و ئەم کارە لە سییەکانەوە تا کۆتایی پەنجاکان دەوامی کرد. من نووسینی کوردییەکەم باش بوو، کوردییەکی پەتیم دەزانی، بەڵام وامدەزانی ئەگەر هەندێ وشەی عەرەبی تێدا بەکاربێنم نووسینەکەم جوانتر و بەهێزتر دەبێ. بە کوردی بۆ ئەو دایەرانەمان دەنووسی، کە کوردی زانییان تێدابوو، بەڵام ئەو دایەرانەی کوردی زانییان تێدا نەبوو بەزمانی تر بۆمان دەنووسین. لەناو شارەوانی لە هۆبەیەکەوە بۆ هۆبەیەکی دی، بۆ نموونە لەهۆبەی ژمێریاری بۆ هۆبەی ئەندازیاری، هەر بە کوردیمان دەنووسی).

مام زۆراب زۆر بە جوانی و هێمنی قسەی دەکرد، منیش داوای مۆڵەتم لێ کرد بۆ ئەوەی هەندێ نەخشەی سالانی زووی پێ نیشان بدەم تا دەستخەتی خۆی بناسێتەوە. چەند نەخشەیەکم دەرهێنا و یەک یەک نیشانم دا، ئەویش لە چاوی نزیک کردەوە و گوتی: (ئەم قەرارەی لەسەر ئەم نەخشەیە نووسراوە و ئەوانی تریش دەستخەتی منن). بڕیاری ئەنجوومەنی شارەوانی ژمارە (٥٧٧)ی ٧/١٢/١٩٤٤ بە پێنووسێکی تایبەتی و بەخەتێکی جوان لەسەر کاغەزی کلۆزی تایبەتی نەخشە تۆمارکراوە، کە دەربارەی فراوان کردنی کۆڵانێکی گەڕەکی عارەبانە و جەنابی موتەسەریف و سەرۆکی شارەوانی و هەموو ئەندامەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی لە ٨/١/١٩٤٥ ئیمزای ڕەزامەندییان لەسەر کردووە. ئەم قەرارە زۆر بەڕێکوپێکی باسی کۆڵانەکەی کردووە و بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە هێڵی ڕەنگدارییان لەسەر نەخشەکە بەکارهێناوە.

هەڵبەت ئەم نەخشەیە، قەرار و تۆمارکردنی ژمارەی نەخشە و پێوەر و نیشانەکانی تری بە تەواوی تێدایە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شارەوانی هەر لە کۆنەوە ئیش و کاری ئەندازیاری خۆی بەڕێک و جوانی ئەنجامداوە.

قەرارەکە کوردییەکەی چاکە، بەڵام ئەوەندە هەیە وشەی عەرەبی تێدایە، ئەمەش دەقی قەرارەکەیە:

**«قرار المجلس البلدی ٧٧٥**

**خریطەی تخطیطی بقربی طریق** عام رقم (٣) لە محەلەی عرب کە لە طرف ملاحظ فنی تنظیم و بەشرحی رۆژ ١٠/١٢/١٩٤٤ ژێر عریضەی السید شیخ محی الدین شیخ صالح تقدیم و لە طرف بە مجلیسمان تودیع کراوە تامل کرا. عرضی بقیەی طریقی عام مذکور اشارە (١) کە بە مرکبی سوور محبرە (٦) و طریقی عام اشارە (ف) (٥) و طریقی خاص اشارە (ب) (٤) و طریقەکانی خاص اشارە (ج و د) هریک (٣) مترە بونیان موافق دیتراو ایجاب قرار درا».

هەروەها بڕیاری ئەنجوومەنی

شارەوانی ژمارە ٦١٨ بە نووسینێكی جوان و بەكوردی لەسەر نەخشەی پارچە زەوی ژمارە ٣٧٧، ٤٤٧ خانەقا، تۆمار كراوە بۆ كردنیان بەدوو بەش و لە ١٩٤٥/٧/١٦ جەنابی موتەسەریف و سەرۆكی شارەوانی و ئەندامەكانی ئەنجوومەنی شارەوانی ئیمزای رەزامەندییان لەسەر كردووە. چۆنیەتی كێشانی نەخشەكە و لایەنی تری ئەندازیاری ئەم نەخشەیە نیشانەی رێك و پێكییە.

ئەمەش دەقی بڕیارەكەیە:

**«رقم القرار ٦١٨**

**قرار المجلس البلدی**

پاش اطلاع بە شرحی ملاحظی فنی ژمارە ٢٢٧ و رۆژ ١٩٤٥/٧/١٢ و كتابی وزارەتی داخلیە ژمارە ٣١٧ و رۆژ ١٩٤٥/٧/٤ و طلبی محامی تحسین دوغرمەچی و عیسی حاجی حسن بە استدعای رۆژ ١٩٤٥/٦/١١ ارض تسلسل ٣٥٧، ٤٤٧ خانقاه وەكو اشارە كراو لەم خارطە بە دو قسم تقسیم و افراز كرانی موافق دیترا».

ئینجا مام زۆراب بەردەوام بوو، گوتی: (ئێمە هەر چەندی لە دەستمان هاتبایە كاروباری رۆژانەمان بەكوردی دەنووسی. بێ شك ئەم مەسەلەیە زۆری دەگەڕێتەوە سەر سەرۆكی شارەوانی جەنابی موحسین ئاغای مەحموود ئاغا، كە سەردەمی سەرۆكایەتی شارەوانی ئەو لە ٩٢٨ تا ١٩٥٨ بووە و بەڕای من و بەڕای مامۆستای پارێزەر محەمەد شەهاب دەباغ، كە لە ٩٦٣ تا ٩٦٨ سەرۆكی شارەوانی بووە و بەڕای مامۆستای گەورە رەشاد موفتی تەمەنی سەرۆكی شارەوانی جەنابی موحسین ئاغا درێژترین تەمەنە لە هەموو عیراقدا. مامۆستا دەباغ بۆی گێڕامەوە، كە موحسین ئاغا لە قوتابخانەی روشدییە دەرچووە و دەڵێن لەكاتی دامەزرانی زۆر منداڵ بوو، هێشتا مووی لێ نەهاتبوو. رۆژێكیان پشكێنەرێك دێتە شارەوانی هەولێر و دەچێ دەبینێ موحسین ئاغا لەسەر كورسییەكەی دانیشتووە و پێی دەڵێ: (كاكە كوانێ باوكت؟) ئەویش دەزانێ پشكێنەر بە هەڵە چووە، زوو دەڵێ: (جەناب، من سەرۆكی شارەوانیم، باوكم هەونییە، فەرموو.).

مام زۆراب دەستخەتی نازمی سلێمان ئاغایشی ناسییەوە، كە لەسەر نەخشەی پارچە زەوی ژمارە ٤٩٢ عەرب لە ١٩٤٢/٩/٢١ نووسیویە. هەروەها دەستخەتی نازمی سلێمان ئاغا لەسەر نەخشەی شەقامی ژمارەی ٤ی گەڕەكی عارەبان نووسراوە. ئەمەش دەقی بڕیارەكەی ئەنجوومەنی شارەوانییە كە لە ٩٣٨/٤/١٤ بڕیاری لەسەر دراوە:

«قرار

خریطەی تخطیطی طریق عام رقم ٤ لە محلەی عرب كە لەطرف ملاحظ فنی تنظیم و بەهامشی ژمارە ١٨٣ و رۆژ ٩٣٨/٤/١٠ ژێر عەریضەی حاجی عبداللە حسین تقدیم و بە مجلیسمان تودیع كراوە تاملكرا. بنایە موافق دیترانی تخطیطی مذكور عرضی مقرری طریق رقم ٤ لە محلەی عرب».

لە ١٩٤٩/٢/٧ بە نووسینێكی جوان لەسەر نەخشەی دابەشكردنی پارچە زەوییەكی بەرامبەری سەرای ئێستا ئیمزا كراوە.

شایەنی باسە ئەو نەخشانەی پێویستییان بە رەزامەندی وەزیری ناوخۆ هەبووایە بە نووسراوی رەسمی رەوانە دەكران و ئیمزایان لەسەر دەكرا. مام زۆراب گوتی: (ئەو بڕیارانەی دەناردرانە پێتەخت بە عەرەبی دەنووسران)، بەڵام دیارە جاروبار نووسین بۆ پێتەختیش چووە و هەر بەكوردیش بووە، بۆ نموونە بڕیاری رۆژی ١٩٤٩/٢/٧، كە لەسەرەوە باسمان كرد، بۆ رەزامەندی وەزیریش چووە و وەزیر ئیمزای لەسەر كردووە، بەڵام بەكوردیش نووسراوە.

دوای پشكنینی فایلە كۆنەكانی شارەوانی، بەتایبەتی هۆبەی ئەنجوومەن و ئەملاك بۆم دەركەوت، كە نووسینی كۆنی ساڵانی سی و چلەكان و تا كۆتایی پەنجاكانیش هەر بە كوردی بووە، بە تایبەتی پەراوێزەكان و ئەو نووسینانەی لە هۆبەیەكەوە بۆ هۆبەیەكی تر ناردراون. وێنەی زۆرم لەم جۆرە نووسینە چاپكراوە دۆزییەوە، وەك مزایەدەی مقاولات و (انذار)ی سزادان و زۆر كاری تایبەتی شارەوانی، بەڵام

وادیارە، کە ئەنجوومەنی شارەوانی لە هەمـــوو هۆیەکـــان زیاتر کـــوردی بەکارهێناوە و هەموو نووسینەکانیش لە فایلەکانی ئەم هۆیەیە پارێزراون.

ئەو چەند نموونەیەی کە لێرەدا بە وێنەوە بلاومـان کـردنەوە نووســینی ســەر نەخشــەکـان بوون، بۆیەش ئەوانەمــان بلاوکــردەوە و ئەوانەی ترمـــان بلاو نەکـــردەوە، چونکە وێنەگرتن و دەرچوونی نووسینی سەر ئەو نەخشـانە جوانتـر بوو، ئەگـەرنا نووسـراوەکـانی تر لە رووی ئـیـمـلاو دارشتنەوە کوردییـەکـەیان باشـتـر و پاکترە.

وا دیارە کـە لەگـەڵ دەرکــرانی موحسین ئاغا لە وەزیفەکەی نووسینی کوردی کۆتایی پێ هاتووە. راستە لە پەنجاکـان و حـەفـتـاکـانیش هەندێ هەوڵدان هەبووە، بەڵام نەک وەکو ئەو سەردەمەی، کە بەدرێژی باسمان کرد.

مــــام زۆراب لە ســــەرەتـای دامــەزرانیـــــەوە لەگـەڵ ئەم چوار کەشـشـافـە ئیـشی کـردووە: خەلیلە فـەندی، سـابیـرە فـەندی، تۆفـان، رەفعەت. مام زۆراب تەنیا ناوی ئەم سێ ئەفـەندییـەی لەبیـر مـابوو. لەوانەی لە شارەوانی کاری هونەری و ئەندازیـارییـــان بەرێوە دەبرد، مــام زۆراب ناوی (جەلال یاوەر)ی هێنا و گــوتی: (مـنەتی کــەسی نەدەزانی، ئەوەی خـۆی بەراسـتی بزانیــبـایە و خـزمـەتی خـەڵکی تێـدابایە ئەوی دەکرد). لەپاش جەلال یاوەر محەمەد ســادق و مــام مــەتنی دەوریان لە راپـەراندنی کـــــاری ئەندازیـاری شــــارەوانی هەبـوو تا پەیدابـوونی ئەندازیاری گەنج و دەرچووی کۆلیژی ئەندازیاری. فـەخـری ئەمـــینیش لەو فـەرمـانبـەرانە بوو، کـە لە سـەرەتاوە دەوریان لە بەرێوەبردنی کــاروبـاری شارەوانی هەبوو، ئەویش لە نووسینی کــــوردی لـە کـــــاروبـاری رۆژانەی شارەوانی دەوری هەبوو.

دانانی ئەندامـانی ئەنجـوومـەنی شــارەوانی بە هەڵبــژاردن بوو. هەر چوار ســـاڵ هەشت کـــەسی تازە دەردەچوون. زۆرجــار هەمـــان ئەندام دەمانەوە یاخود هەندێکیـان دەمانەوە و هەندێکیــان دەگــۆڕان. زۆرجـار بۆ کۆکردنەوەی دەنگی هەڵبژاردن لەماڵ و مـزگـەوتان دەگـەڕان. جـاری وایش هەبوو یەکـسـەر لە پێتەخـتەوە یان لە موتەسەرفیـەتەوە لیسـتەی بە کەیفی خۆیان دەردەکرد.

ئەمــانە مـاوەیەکی زۆر ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر بوون:

(مـەلا ئەمینی بەقاڵ، مـسـتـەفـا حەسەن ئاغـای بەقاڵ، خەلیل چیچۆ، مەلا محەمەد، مەلا محەمەد ئیمام ئەترەقـــچی، مـــەلا ســـەلیم مـــەلا ئیـبــراهیم، نازم ســەعـــیــد ئاغــا، عـەبدولوەهاب حـیکـمەت، عـەبدوڵلا رووبین، ئیبراهیم چیچۆ).

لە کـۆتاییــدا دەڵێن مـام زۆراب لەساڵی (١٩٧٠)وە خانەنشین کراوە و قــســە و بابەت و سـەربردەی زۆری لایە و هیـواداریـن تەمەنی درێژ بێت و وێنەی هەر زۆر بێت.

**تێبینی:**

١- مامۆستا مەتی عەقراوی لە کتێبی (العراق الحدیث)دا، کە لەگەڵ مـامـۆسـتـا مـەجـیـد خـەدوری بە ئینگلیزی نووسیـویانە و پاشان هەر خۆی کردوویە بە عـەرەبی و لە ساڵی ١٩٣٦ بلاوبۆتەوە، نـووســـــراوی (مناقـشـة لجنة الانتـداب الدائمـة، الجلسة ١٩، سنة ١٩٣٠، ص١٩١) دەگـەرێتەوە و دەڵێ: جەعفـەر پاشا عـــەسكەری هاوینی ١٩٣٠ هاتۆتە هەولێر و سلێـمـانی و کـەرکـووک و قسـەی بۆ خەڵک کردووە و بەقسـەی ئەوەوە لە ســاڵی ١٩٣١ نووســینی مەحەللی، واتە کوردی و تورکمانی و عەرەبی لە عێراق بەکارهاتووە. ئیدی لەو رۆژەوە، لە شاری هەولێر، دایەرە و دەزگــاکـــانی مـــیـــری و دادگــا و قـوتابخـانەکـان نووسـینی کـوردییـان بەکـارهێناوە. هەڵبـەت شـارەوانـیش وەک دەزگــایەکی مـــیـــری پەیرەوی نووســـینی کـــوردی کـــردووە و زۆر نموونەی نووســـینی ئەوســـا مـــاون، بێجگە لەمانە وەک من بیـســتوومـە هەندێ نووســـــینی پەروەردەیی لە قوتابخانی یەکەمی هەولێر ماون.

٢- بلاوکردنەوەی هەندێ نموونەی ئەم نووســــینانە دەبێ بە هاندەر و رێخۆشکەر بۆ نووسەر و شارەزاکانمان تا لە هەمـوو لایەکەوە لەو نووسـینانە بکۆڵنەوە و لەرووی زمان و رێزمان و دەســتــخـەت و هەمـــوو روویەکی تر شـیــتــەڵی بکەن و لە چوارچێـوەی مێژوویی خۆی دابنێن.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (هەولێر)، ساڵی ١٩٨٥ وەرگیراوە.



# پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر

حەلاو حوسێن کەریم

گەشەکردنی ئابووری لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهاندا ، ئاماژە بە گرنگی زیاتری بە پیشەسازی دەدات. بەشدارییەکی کاریگەر لە بەئاکام گەیشتنی پەرەپێدانی نیشتمانی و جێگیریی سەربەخۆیی و بەرزبوونەوەی ڕێژەی گەشانەوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەکات. هیچ بوارێک لە بوارەکان ناتوانی پێشبڕکێی پیشەسازی بکات بۆ لە باوەشگرتنی زۆربوونی بەرفراوانی ژمارەی دانیشتووان.

پیشەسازی چالاکییەکی مرۆیی گرنگەو ئەم گرنگییەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە گەشەکردنی پیشەسازی کۆڵەگەی سەربەخۆیی سیاسییە، هەروەها دەوڵەمەندی و سامانێکی ئابوورییەو ئاوێنەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و گەشەکردنی کۆمەڵایەتییە.

پیشەسازی پەیوەستییەکی پتەوی بەگۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانەوە هەیە. جێبەجێکردنی پیشەسازی لە دەوڵەتە ساواکان، هۆکارێکی گرنگە بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری و ژیاری دانیشتووان و هەروەها یارمەتی گەشەکردنی کەرتە ئابوورییەکانی دیکەش دەدات. کەواتە پیشەسازی گۆڕانکاری لە بونیەی ئابووری دەکات و ئەو ڕێڕەوە دروستەیە، کە لە پرۆسەی گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیریدا نەشونمایەکی خێرا مسۆگەر دەکات.

تێبینی ئەوە دەکرێت لەکۆنەوە پارێزگای هەولێر چالاکی ئابووری دیاری بەخۆوە دیوە تاوەکو ئێستا. لەنێویاندا پیشەسازی لایەنە ئابوورییەکە دۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی باو لەناوچەکە کاریگەری لەسەریدا هەبووەو شوێن پەنجەی لەسەر جێهێشتووەو شوێنەوارەکانی بەسەر تەواوی پرۆسە پیشەسازییەکانی پارێزگاکە ماوەتەوە.

کارێکی زۆر سەختە سەرەتای کاری پیشەسازی لەم پارێزگایە دەستنیشان بکەیت، بەڵام پیشەسازی لەوێنە سەرەتاییەکانیدا ئەو کاتە سەری هەڵداوە کە مرۆڤ نیشتەجێ بووە، لێرەدا دەتوانین بڵێین کە چالاکی

پیشەسازی کۆنە بەپێی کۆنی و دێرینی ناوچەکە. لەکاتێکدا کە هەرێمی کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی گشتی و پارێزگای هەولێر بەشێوەیەکی تایبەتی لەو شوێنانە دەژمێردرێن، کە مرۆڤ هەر لەکۆنەوە تیایدا نیشتەجێ بووە، لەبەر رووناکی پشکنینە شوێنەوارییەکاندا ئامێری بەردینی سەردەمی چاخی بەردینی کۆن لەچەندین شوێنی جیا جیا وەک ئەشکەوتی شانەدەرو کیوانان دۆزراوەتەوە[1].

کەواتە، پیشەسازی بەگۆڕانکاری ناهاوتا لە گەشەکردنی پیشەسازیدا رۆیشتووە، بەپێی ئەو دۆخەی لە ماوە مێژووییە درێژەکاندا پیایدا تێپەڕیوە. لێرەدا بەباشتری دەزانین، کە لێکۆڵینەوە لە پیشەسازی و گەشەکردنیدا لەقۆناغە جیا جیاکانیدا لە گەشەکردن و نەشونماکردنیدا لەرێگای پێدانی کورتە مێژوویەک لە پیشەسازی و قۆناغەکانی گەشەکردنی بەم پێیەی خوارەوە تۆمار بکەین:

١- گەشەکردنی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر پێش ساڵی ١٩٥٨.
٢- گەشەکردنی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر لە ساڵی ١٩٥٨ تا ١٩٩٠.
٣- گەشەکردنی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر لە ساڵی ١٩٩٠ تا ٢٠٠٥.

## یەکەم: گەشەکردنی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر پێش ساڵی ١٩٥٨:

لە هەرێمی کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی گشتی و لە پارێزگای هەولێر بەشێوەیەکی تایبەتی، هیچ شوێنەوارێکی پیشەسازی بە واتا سەردەمییەکەی لەم ماوەیەدا نەدۆزراوەتەوە. پیشەسازیی ئەوسا سەرەتایی و ساکار بووە. تاوەکو پیشەسازی بەئامێری نوێی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم تێکەڵ بوو.

ئەو پیشەسازییانەی لەسنووری ئەم پارێزگایەدا هەبوو لەژمارەیەکی دیاریکراو لەپیشەسازی کاری دەستی سادە، پێکهاتبوو. تاوەکو ساڵانی پەنجاکان بەدواکەوتوویی و سەرەتایی دەناسران. ئەویش لەشێوازە بڵاوەکانی دووکان و شوێنی کاری بچووک، لێرەو لەوێ، لەنێوان گەڕەکەکانی شار تاکە کەسێک خاوەنیان بوون.

ئەم پیشەسازییانە چالاکییەکانی بەردەوام بوو تاوەکو حکومەتی عێراقیش لەدابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵکی شارەکانی پارێزگاکە دامەزراو پشتی بەخۆی بەست. وەک ئاشی گەنم هاڕین و برنج لێکردن و پیشەسازی نان و ماست و پەنیرو، ئەو پیشەسازییانەی بەژیانی راستەوخۆی هاووڵاتیانەوە پەیوەستە هەر لەکۆنەوە. لەپیشەسازییەکانی دیکە دروستکردنی دۆشاوی تەماتە بەوشککردنەوەی و وشککردنەوەی میوەو سەوزەوات و هەنجیرو زەردەلوو و مێوژو پیشەسازی قاورمەو باسترمەی گۆشت و پیشەسازی توتن و جگارە. حاجی سەلیم خۆشناو بەیەکەم کەس دەژمێردرێت کە کارگەی قەمیشی جگەرەی لە هەولێر دامەزراند و شوێنێکی بۆ کردەوە[2].

هەروەها دانیشتووانی شار لەزۆر کۆنەوە بەدروستکەری تورشیات و سرکە و شیرنەمەنی ناسراون. لەگەڵ ئەوەشدا خێزانە کریستانەکان، تاوەکو ئێستاش کحولییەکان دروست دەکەن.

هەروەها ئەم پارێزگایە بەناوبانگە بە، ئاسنجاوی و تایبەتمەند، بەسپیکردنەوەی قاپ و قاجاغی ناوماڵ، کە لە ئاسن و مس دروست کراون لە هەرە بەناوبانگەکانیان کاک سەعیدو کاک تەهاو کاک وەهاب سەماوەرچییە[3].

سەبارەت بەئاسنگەرەکانیان، ئامێری کشتوکاڵی وەک (داس) و (بیور) و (پەنجەرە) و (دەزگای ئاسن)یان دروست دەکرد. ئەویش بەهۆی (کوورە) و ئەوکوورانەش لە کەرپووچ دروست کرابوون و ئاسنیان لەنێودا دادەناو دوای گەرمبوونیان بەهۆی چەکوچی دەست دەکوتران و ئەو کەرەستانەی مەبەستیان بوو دروستیان دەکرد. لە هەرە بەناوبانگەکانیان (سادقی ئاسنگەر) و (سەعیدی ئاسنگەر) و (حاجی محەممەدی ئاسنگەر) و...[4].

دەباغچی و کەوشدرووەکان پێستەیان لە پیشەسازییەکانیاندا بەکاردەهێناو کەرەستەی هەڵێنجانی ئاو و (زین) و پشتی ئەسپ و بەرگی چەک و تفەنگ و فیشەکدان و جانتای جۆراوجۆرو پێڵاوی هەمەچەشن و

کەوشی تایبەت بەجووتیارو کرێکارو کاسبکارانیان بەرهەم دێنا.

زێڕنگرانیش کاری زێڕنگەرییان دەکرد و زۆربەیان جوولەکە بوون. کەسی زۆر شارەزاو ناوداریان تێدا بوو لەدروستکردنی ئەڵقەو ئەنگوستیلەو ملوانکەو کەرەستەی دیکەی ئەم بوارە، لە بەناوبانگەکانیان سلێمان بەکرو شەریف ئەلیاس و جەمیل ساڵح و...هتد[٥].

سەرەڕای ئەمانە بەرگدرووی بەناوبانگ هەبوو، کە بەدەست جلوبەرگی نایابیان بۆ دانیشتووانی شاری هەولێر و دەوروبەری دەدروو. لە بەناوبانگەکانیان زەکی شاکر و عەبدولڕەحمان و میساک ولیەم[٦]. لەگەڵ ئەوەی، کە داهاتی نەوت لەعێراقدا رووی لەزیادبوون کرد،، لەداهاتی نەوتی دەرهێنراو بەدەست دەکەوت، لەساڵانی پەنجاکاندا ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە پرۆگرامی گەشەکردنی چالاکی پیشەسازی لەشوێنە جۆراوجۆرەکان لە سەرانسەری عێراق دانا، بەڵام هەولێر هەر وەکو تەواوی شوێنەکانی دیکەی کوردستان، لەرووی دامەزراندنی پرۆژەی پیشەسازی لەم ماوەیەدا بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدرا.

تاکە سەرچاوەی کە دەستمان دەکەوێت و دەتوانین پشتی پێ ببەستین، بەمەبەستی تۆمارکردنی جۆری ئەو پیشەسازییانەی لەپارێزگای هەولێر لەسەرەتای پەنجاکان برەویان هەبووە، ئەو ئامارە پیشەسازییەیە، کە لەساڵی ١٩٥٤ تۆمار کراوە. هەر وەکو لە خشتەی ژمارە (١-١)[٧] بەدیار دەکەوێت.

خشتەی ژمارە (١-١) جۆری پیشەسازییەکان و ژمارەی دەزگاکانی و ژمارەی ئەو کەسانەی کاریان تێدا دەکەن بەدیار دەکەوێت لە پارێزگای هەولێر (ساڵی ١٩٥٨)

١- پیشەسازی بەرگدروویی پلەی یەکەم بەدەست دەهێنێت لە بواری ژمارەی شوێنی کارو ژمارەی ئەو کەسانەی کاری تێدەکەن. بەرامبەر بەرێژەی ٢٤.٧٪ و ١٨.١٪ لەدوای یەک بەرامبەر، بەکۆی رێژەی کارگە و ئەو کەسانەی کاریان تێدا دەکەن بەرامبەر بە پیشەسازییەکانی دیکە لەم پارێزگایە.

٢- پیشەسازی ئاشی گەنم هاڕین بەپلەی دووەم، بەرێژەی ١٨.٥٪ و ١٧.٤٪ بەرامبەر بەرێژەی ژمارەی کارگەکان و کرێکارەکان دێت و دواتر پیشەسازی ئاسنگەری و...هتد.

٣- وا دیار دەکەوێت، ئەو پیشەسازییانەی، کە ئەوکات لە کاردا بوون، پتر پیشەسازیی بەکارهێنانی سادە بوون و مەبەست لێی دابینکردنی پێداویستییە خۆجێییەکان بۆ دانیشتووانی پارێزگا بووە.

## دووەم: گەشەکردنی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر لە ساڵی ١٩٥٨ز تا ساڵی ١٩٩٠ز

ئەم قۆناغە کە تارادەیەک بەماوەیەکی درێژ دەژمێردرێت، لە رووی سیاسی و ئابوورییەوە، کە عێراق بەخۆیەوە دیوە، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دۆخی هەرێمی کوردستان لەنێویدا پارێزگای هەولێر بەجێهێشتووە. ئەم گۆڕانکارییە ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوەو وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو دامەزراندنی وەزارەتی پیشەسازی و بازرگانی گرتەوە، بەئامانجی ئەوەی بنکەیەکی پیشەسازی دابمەزرێنێت، کەرتی گشتی و تیکەڵاو و تایبەت بەشداری تێدا بکات[٨].

یەکەم سەرەتای رووکردنە گەشەی هەرێمایەتی لەعێراقدا، لەپلانی گەشەی نەتەوەیی (١٩٦٥-١٩٦٩) بەدیار دەکەوێت. بەڵام بایەخدان بەپیشەسازی، سنوور بەند بوو. بایەخدان بەپیشەسازی لەپارێزگا کوردییەکان زۆر سنووردار بوو، (لەنێوانیاندا پارێزگای هەولێر). بەشی پارێزگای هەولێر لەنێو تەواوی پارێزگاکاندا لەم پلانەدا تەنیا ٣٧٪ بوو، بەرامبەر بەتەواوی ئەو پارەیەی کە بۆ سەرجەم پارێزگاکان لە کەرتی پیشەسازیدا تەرخان کرابوو[٩].

هۆکارەکەشی بۆ ئەم هەلومەرجە دەگەڕێتەوە، کە ناوچەکە پێیدا تێپەڕ دەبوو. هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و داننەنانی حکومەتی ناوەندی بەمافە رەواکانی گەلی کورد، دەرئەنجامەکەی ئەوە بوو، کە گەشەکردنێکی هەستپێکراو لە بواری پیشەسازی لە هەرێمەکە بەدی نەدەکرا.

**خشتەی ژمارە (١-١)**

| جۆری پیشەسازی | ژمارەی دەزگاكان | ژمارەی كاركەرەكان |
|---|---|---|
| ئاشی گەنم | ٢٧٢ | ٣٨٩ |
| نانەواخانەكان | ٣٤ | ١٤٠ |
| رستن و چنین | ٢٠٦ | ٢٤٥ |
| دروستكردن و پینەچی پێڵاو | ١٣٧ | ١٧٥ |
| بەرگدروو | ٣٥٥ | ٤١٥ |
| پەرەچی و چنین | ٧ | ١٤ |
| دارتاشی | ١٠٩ | ١٥٧ |
| كاری پێستە | ٩ | ١١ |
| كوورەچی | ٢٣ | ٦٨ |
| كاری ئاسن و ئاسنگەری و ئاسنجاوی | ١٩٧ | ٣٨٤ |
| كەلوپەلی كارەبایی | ٣ | ٤ |
| چاككردنی ئۆتۆمبێل | ٤١ | ١٠٧ |
| زێرنگەری | ٧ | ٨ |
| سەعاتچی | ١٤ | ٢٧ |
| ئاوو كارەبا | ٤ | ٥٣ |
| بەفر دروستكردن و حەسیر | ٤١ | ٦٤ |
| پیشەسازی دیكە | ٥ | ١١ |
| كۆی گشتی | ١٤٦٤ | ٢٢٧٢ |

بارودۆخی پیشەسازی لە پارێزگا بەم هەلومەرجانە بەسترایەوە. هیچ گەشەكردنێک بەكەرتی پیشەسازییەوە نەدیترا، لەگەڵ ئەوەی كە یەكەم پیشەسازیی ئامێری لە سەرەتای شەستەكانی سەدەی بیستەوە لەم پارێزگایە دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٥٩ حكومەتی ناوەندی دەستی بەدامەزراندنی پرۆژەی ژمارەیەكی زۆر لەپرۆژەی پیشەسازی گەورە كرد لەعێراقدا و ئەم پارێزگایە بەشێكی بەركەوت.

كەواتە پیشەسازییە نوێیەكان ژمارەیان زۆر كەمەو لەبارەی پارێزگای هەولێر خۆی لە چوار كارگەی نوێ دەدۆزێتەوە، كە ئەوانیش كارگەی جگەرەو كارگەی مافووری دەستی و كارگەی شیرو كارگەی رستن بوون[١٠].

لەنێو خشتەی ژمارە (١-٢) كە لەنێویدا ژمارەی كارگەو كرێكار لەپارێزگای هەولێر بۆ ساڵەكانی (١٩٧٠-١٩٧٨-١٩٨٧) بەدیار دەخات، تێبینی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەكەین:

١- ساڵی ١٩٧٠ ژمارەی كارگەكان لەم پارێزگایەدا بە (١٠٢٨) كرێكار گەیشت. كە لەنێویاندا (١٥)

کارگەی گەورە بوون و ژمارەی کرێکارەکانی (٣٤١٠) کرێکار بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٧٨ ژمارەی کارگە پیشەسازییەکان بە (١٥٧١) کارکە گەیشت و لەنێوانیاندا (٤٣) کارگەی گەورە دەبینراو ژمارەی کرێکارەکانی (٩٩٠٩) کرێکار بوو.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین لە ساڵی ١٩٧١ ژمارەی کارگە گەورەکان لە (١٥) بۆ (٤٣) کارگە زیادی کرد. ئەمەش بۆ پلانی گەشەکردنی نەتەوەیی (١٩٧٠-١٩٧٤) دەگەڕێتەوە. چەند ئامانجێک یارمەتی گەشەکردنی کەرتی پیشەسازی دا بەگشتی و لە پێکهاتەی ئابووری عێراقی تووشی گۆڕان کرد. (ئەوەش لەنێو دابەشکردنی جوگرافی پرۆژە پیشەسازییە نوێیەکان لەسەر ئاستی عێراق و لەنێویدا پارێزگای هەولێر). ڕێژەی پشکی پارێزگای هەولێر بۆ ٣٪ بەرز بۆوە لەنێو تەرخانکراوەکانی کەرتی پیشەسازی لە عێراق[١٢].

سەرەڕای ئەوە بەیاننامەی ئاداری (١٩٧٠) شوێنەواری خۆی لەسەر بووژاندنەوەی ناوچەکە جێهێشت. لەو کارگە پیشەسازییە گەورانە، کارگەی جگارەی هەولێر و کارگەی دۆشاوی تەماتە لە هەریرو کارگەی رستن و مافووری دەستکرد دەکرێ ناوببرێن. هەولێر و هەروەها بەرقەراری ئاسایش و جێگیری لە ناوچەکەدا بوو، ئەوەبوو کە تەخشینەی پتر لە "٣٥٠" ملیۆن دینار بۆ گەشەکردنی پیشەسازی لە هەرێمی ئۆتۆنۆمی تەرخانکرا[١٣].

سەرەڕای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٢ لقێکی تایبەت بۆ بانکی پیشەسازی لەپارێزگای هەولێر کرایەوە. ئەویش بەمەبەستی ئاسانکاریکردن بۆ کاروباری هاوڵاتیان سەبارەت بەکارەکانی وەبەرهێنان و نزمکردنەوەی نرخی سوودەکان و بەخشینی قەردو دامەزراندنی پرۆژەی پیشەسازی[١٤].

بەپێی ئەم دۆخە لە سەرەتای حەفتاکانەوە ئاراستەی دامەزراندنی پرۆژە پیشەسازییەکان لەناوچەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق و لەنێویدا پارێزگای هەولێر هەروەها لەبارەی ناوچە جیا جیاکانی عێراق بەم جۆرە بووە.

٢- لە ساڵی ١٩٧٨ ژمارەی کارگەکان بۆ ٢٣٢٤ کارگە بەرز بۆتەوە. کە لەنێوانیاندا ٣٧ کارگەی گەورە و ٢٢٨٧ کارگەی بچووک بووە. بەڵام ژمارەی کرێکارەکانی کارکردوو لەناو ئەم کارگانە، بەبەراورد لەگەڵ بەرزبوونەوەی ژمارەی کارگەکان لەچاو ساڵی ١٩٧٨، بۆ (٩٣٧١) کرێکار نزم بۆتەوە. ئەمەش چونکە لەسەرەتای هەشتاکاندا بزاڤی پیشەسازی گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە دیت و دەوڵەت هاوکاری کرد لە گەشەکردنی بانکی پیشەسازی، ئەویش بەپێشکەشکردنی پێشکەشکاری گرانبەهاو بەسوودێکی سادە، کە لە ڕێژەی ٤٪ بۆ هاووڵاتیان تێپەڕی نەدەکرد ڕاستەوخۆ دوای دامەزراندنی هەر پرۆژەیەکی پیشەسازی پێشکەش کرا[١٥].

بەڵام ئەم گەشە ڕێژەییە بەردەوامی بەخۆوە نەدیت، ئەویش هۆکارەکەی بۆ شەڕی عێراق- ئێران دەگەڕێتەوە، کە بەهەزاران لە کرێکاران بۆ یەکە سەربازییەکان رەوانە کران و قەرزەکانی بانکی پیشەسازی کەم کرانەوەو هاوردنی (الاستیراد)ی کەلوپەلە سەرەتاییەکان و یەدەگییەکان کەمکرانەوە. هەندێ هۆکاری دیکەش بوون بەهۆی گەیشتن بەئەنجامێک کە چالاکی پیشەسازی بکشێتە دواوە[١٦].

بەزۆربوونی ژمارەی کارگە گەورەکان لە لایەک و دابەزینی ژمارەکانی لە لایەکی دیکە. پیشەسازی لەم ماوەیەدا بە لەسەرخۆیی گەشەی کرد. بەبێ ئەوەی بەرنامەیەکی پلان بۆ داڕێژراو بۆ گەشەکردنی پیشەسازی بەخۆوە ببینێت لە ناوچەکەدا سستی بەخۆوە دیت.

## سێیەم: گەشەکردنی پیشەسازی لە پارێزگای هەولێر ١٩٩٠-٢٠٠٥

ئەم قۆناغە چەندین ڕووداوی سیاسی لەخۆوە گرتووە، کە کاری لەدۆخی ئابووری ناوچەکە کردووە وەک: جەنگی دووەمی کەنداو و سزا سەپێنراوەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی و سەپاندنی پچڕاندنی پەیوەندی بەعێراق. ئەم بڕیارە ڕێگای لەکارکردنی لەگەڵ عێراق گرت. بڕیاری لەسەر چارەنووسی ئابووری عێراق بۆ ساڵانی ئایندە دا[١٧]. دارمانی ئابووری عێراق و سیستمی توندو پتەوی سزاکان لەو هۆکارە کاریگەرانە بوو، کە هاوکاری لە تێکشکان و تەواوبوونی کەلوپەلەکان لەبازاڕ کرد. ئەم بارودۆخەو هۆکاری دیکە وەک دەرئەنجامەکانی جەنگی دووەمی

کەنداو و ئەو کاردانەوەی، کە کاری لەسەر دۆخی سیاسی و ئابووری لەناوچەکە کردو نزمبوونەوەی ئاستی بژێوی دانیشتووان و بەدەگمەن بوونی کەرەستە سەرەتاییەکان بۆ کەرتی پیشەسازی، کاری لە سەر گەشەکردنی پیشەسازی لەم پارێزگایە کرد. ئەم دۆخە درێژەی کێشا تاوەکو بڕیاری (٩٨٦) جێبەجێ کرا. کە بە بڕیاری نەوت بەرامبەر بەخۆراک لەساڵی ١٩٩٦ ناسرابوو. ئەم بڕیارە ڕۆڵی خۆی هەبوو لەبواری چاککردنی باری ئابووری هاوولاتیان لە ناوچەکەدا و دۆخێکی وای دروست کرد، کە چالاکی پیشەسازی لە پارێزگاکەدا بجوولێ. چونکە لە ماوەی (١٩٩٠-١٩٩٥) کارگە پیشەسازییەکان ژمارەیان کەم بۆوە بەهۆی گەمارۆی ئابووری کە عێراقی گەمارۆ دابوو و پیشەسازی کارگەی بچووک باڵی بەسەر بازارەکاندا کێشابوو و دەرئەنجام ژمارەی کرێکاران کەم بۆوە لەم کەرتەداو ٩٠٪ی کارگە پیشەسازییەکان لە کار وەستان.

لە ماوەی (١٩٩٥-٢٠٠٠) جێبەجێکردنی بڕیاری نەوت بەرامبەر بەخۆراک (٩٨٦)، ڕەوتی بازرگانی و پیشەسازی لە ناوچەکە چالاک کرد، لەم ڕووەوە ژمارەی کارگەکان زیادی کرد و بەرهەمی زۆربەی کارگەکان بەرز بووەوە و چەندین کارگە و دامەزراو لە نوێوە دروست کرانەوە و لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە بووژانەوە. ئەویش بۆ ئەم جێگیرییە ڕێژەییە دەگەڕێتەوە، کە باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا بوو. هەروەها دۆخی ئابووری و کۆمەلایەتی ناوچەکەش یاریدەدەر بوون لەم بارەیەوەو پێویستی دانیشتووان بۆ چەندین جۆر کەلوپەلی پیشەسازی کە بەستراوبۆوە بەبارودۆخی ناوچەکە.

لە ڕووی پتربوونی ژمارەی کارگەکان لە ساڵانی (١٩٩٥-٢٠٠٠) ژمارەی کارگە پیشەسازییەکان لە (٢٠) کارگەوە گەیشت بە (٥٤٢) کارگە[١٨]. ئەمەش لەژێر کاریگەریی بڕیاری نەوت بەرامبەر بەخۆراک و ڕۆڵی لە چالاکبوونی ژیانی ئابووری و بەتایبەتی پیشەسازی لە پارێزگاکەدا بوو. دامەزراندنی ئەو کارگانەی کە پێشتر نەبوون، وەک پیشەسازی بەفرو خواردنەوە گازییەکان و پیشەسازی ئەلەمنیۆم و ئاسنگەری و پیشەسازی دیکە.

لە ماوەی نێوان (٢٠٠٠-٢٠٠٥) ، بەتایبەتی لە (٢٠٠٣-٢٠٠٥) ژمارەی کارگەکان لەم پارێزگایەدا بەرز بووەوە. ئەو دۆخەی کە عێراقی پێیدا تێپەڕی، کاری کردە سەر هەرێمی کوردستان و لە نێوانیاندا پارێزگای هەولێر. کە ئەمەش خۆی لە ئەنجامی تێکشکانی سیستمی سەدام لەبەغدا و ڕووخانی حکومەتی ناوەندییەوە هاتبوو. ئەو دۆخەی بەدوای خۆیدا هێنای، هەلگرتنی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق و کرانەوەی دەرگای هاوردنی شتومەک، لە کەلوپەلی سەرەتایی و بلاوبوونەوەی لە بازارەکان و کردنەوەی کارگەی نوێ، سەرەڕای جێگیری ئاسایش لە ناوچەکەداو ئارەزووی خاوەن سەرمایەکان لە بەگەڕهێنانی سامانەکانیان لە ناوچەکەدا، هانی زۆربوونی ژمارەی کارگەکان و بەرز بوونەوەیانی دا بۆ ١٠٥٣ کارگە لە کارگە پیشەسازییەکانی پارێزگای هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٥[١٩].

لەبارەی جۆر و پۆلە پیشەسازییەکان لەم پارێزگایەدا چەندین جۆرو لقی پیشەسازی جۆراوجۆر لەخۆوە دەگرێت:

**یەکەم: پیشەسازی خۆراک و خواردنەوەو توتن:**

ئەم لقە لقێکی پیشەسازی خۆراکە، کە پیشەسازی بەرهەمەکانی شیرو خواردنەوەو ئاردو پسکویت و کوورە ئۆتۆماتیکییەکان و شیرنەمەنی و پیشەسازی بەفرو خواردنەوە گازییەکان و کارگەی خوێ و توتن و جگارەو...دەگرێتەوە.

ئەو کارگانەی بەپێویستی دەزانین لەسەری بدوێین بریتین لە:

**١- کارگەی جگەرەی هەولێر:**

ئەم کارگەیە، لە ساڵی ١٩٧٣ دامەزراوە. بەرهەمی سەرەتایی ئەم کارگەیە لە مانگی نیسانی هەمان ساڵ بەتوانای ١٠ ملیۆن جگەرە لەڕۆژێکدا بەرهەم هاتووە[٢٠]. ئەم کارگەیە لە ماوەی ٩ مانگی تاقیکردنەوەی یەکەمیدا دوو جۆر لەجگەرەی بەرهەم هێناوە. ئەوانیش بریتین لەجگەرەی (غازی) بەفلتەرو جگەرەی (بەغدا). بەلام دوای ئەم ماوەیە، کارگەکە پچڕ پچڕ بەرهەمی دەهێنا کایەوە. دوای ڕاپەڕین و بەهۆی ئەو گەمارۆ دوولایەنییەی بەسەر کوردستاندا سەپابوو، بەرهەمەکەی دابەزی بۆ نزمترین ئاست لەساڵی ١٩٩٦. لەساڵی ٢٠٠٠ بەتەواوی

لە بەرهەمهێنان وەستا. ئێستاش کارگەکە کەوتۆتە بەردەست کەرتی تایبەت و لە بەرهەمهێنانی جگەرە وەستاوە. تەنیا تووتنی تێدا چاک دەکرێت[21].

**٢- کارگەی قتوبەندی هەریر:**

ئەم کارگەیە لە ساڵی ١٩٧٩ دامەزراوەو بەرهەمی کارایی لە ساڵی ١٩٨٠ هاتۆتە کایەوە. هێڵی دروست و تەواوکەری بۆ بەرهەمی وەک (مورەبا) و میوە پارێزراوەکان (کەمبوت) و گوشراوی میوە و سرکە تێدایە. ئەم کارگەیە بۆ چەندین ساڵ لەکار وەستاوە و دواتر کەوتەوە سەر بەرهەمهێنان. ئامێرو کەرەستەی نوێی بۆ دابین کرا لە چوارچێوەی بڕیاری (٩٨٦) لەلایەن رێکخراوی (FAO) بەبڕە پارەی (٢) ملیۆن دۆلار، ئەویش بەمەبەستی کردنەوەی هێڵێکی نوێی تایبەت بە بەرهەمهێنانی میوەی گوشراو[22].

**٣- کارگەی دۆشاوی تەماتە لەکۆیە:**

ئەم کارگەیە، لە ساڵی ١٩٩٦ بەمەبەستی بەرهەمهێنانی دۆشاوی تەماتە، سەرەڕای هەندێ بەرهەمی دیکەی وەک دۆشاو و مورەبا لەشاری کۆیە دامەزراوە. توانای گشتی دەگات بە ٦٠٠ تەن لە ساڵێکدا. بەرهەمەکەی لەنێوان مانگەکانی حوزەیران تاوەکو ئەیلول دەگاتە ٢٠٠ تەن لە ساڵێکدا[23]. ئەمە سەرەڕای کارگە پیشەسازییە خۆراکییەکانی دیکە، کە لەم پارێزگایەدا هەیە و دەگاتە ١٦٨ کارگە. ئەم کارگانە بچووکن بەقەوارەو پەیوەستن بەکەرتی تایبەت و کارگەکانی بەفرو کوورە ئۆتۆماتیکییەکان و شیرنەمەنی و سرکەو بەستەنی و خوێ و....هیتر[24].

**دووەم: کەرتی پیشەسازی چنین و جلوبەرگ:**

ئەم لقە پیشەسازی چنینی خوری و حەریر و پیشەسازی مافوور و چنین دەگرێتەوە. جل و بەرگ و پیشەسازی بەرگ دوورین و چنینەوەو پیشەسازی کاری پێستە و پێڵاو دەگرێتەوە. ئەو کارگانەی لەم لقەدا بەدی دەکرێن، بریتین لە:

١- کارگەی رستن و چنینی خوری لە هەولێر: ئەم کارگەیە لە ساڵی ١٩٧٦، بەناوی دامەزراندنی گشتی رستن و چنینی خوری لە هەولێر دامەزراوە. بەرهەمی بازرگانی لەساڵی ١٩٨٠ دەستی پێکردووە و توانای گشتی گەیشتووە بە (١٦١٨٠٠) مەتری دووجا لە کوتاڵ، بەهەردوو جۆری هاوینە و زستانی. ئەم کارگەیە بەکارگەی رستنی دهۆکەوە بەستراوە و دواتر لە ساڵی ١٩٨٧ ئەم بەیەک بەستنەوەیە دووبارە جودا کرایەوە. لەساڵی ١٩٩٧ بەشێوەیەکی یەکجاری پەیوەستی هەر یەک لەکارگەی مافووری دەستی لەگەڵ کارگەی رستن و چنینی خوری لە هەولێر لێک جیا کرانەوە[26].

کارگەکەش ئێستا بەهۆی کێشەی نەبوونی کەرەستەی یەدەگی سەرەتایی و کێشەی وزە و کۆن بوونی ئامێرەکانی و هیتر لە بەرهەم وەستاوە.

٢- چەندین کارگەی دیکەش هەیە، وەک کارگەی بەرگ دوورین و چنینەوە و کارگە بۆ دروستکردنی پێڵاو. بەڵام گشتیان پەیوەستن بەکەرتی تایبەت و قەبارە بچووکن. لەبارەی پیشەسازی مافوور، چەندین مەڵبەندی دروستکردنی مافوور لەشوێنە جۆراو جۆرەکانی پارێزگای هەولێر بوونی هەیە. لەوانە مەڵبەندی هەولێرو کەسنەزان و رواندزو بەحرکەو...هیتر.

**سێیەم: کەرتی پیشەسازی خانووبەرە:**

پیشەسازییەکانی خانووبەرە لەپیشەسازییە دێرینەکان دەژمێردرێت کە لەم پارێزگایەدا لەکۆنەوە گەشەی کردووەو لەپیشەسازییە گرنگەکان دەژمێردرێت. گرنگییەکەی لەوەدایە کە پیشەسازییەکی بنچینەییە و بەرهەمێکی خێراو باشی ئابووری دەست دەخات. ئەم کەرتە پیشەسازی چیمەنتۆو روخام و کاشی بلۆک و ئەلمنیۆم و...هیتر دەگرێتەوە.

١- کارگەی روخامی هەولێر: ئەم کارگەیە لەناوچەی باکووری شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٧٤ دامەزراوە. بەرهەمی تاقیکراوەیی لە ساڵی ١٩٧٦ بەتوانای ١٠٠٠٠٠٠ مەتری دووجا لەساڵێکدا کەوتە کار. باڵاترین توانای کارگەکە لە ساڵی ١٩٨٩ بە بەرهەمهات بۆ ماوەی جیا جیا، ئەم کارگەیە ، زۆرجار بەهۆی نەبوونی بیر (منشار)ی بەردبڕین لەکار وەستاوە یان نەبوونی

کەرەستەی یەدەگ یان نەبوونی بەردی (لووسکردنی بەرد) و ... بووە بەهۆکاری لەکار وەستانی کارگەکە. ئێستاش ئەم کارگە کەوتۆتە دەست کەرتی تایبەت.

**چوارەم: کەرتی پیشەسازی چاپ و بڵاوکردنەوە:**

ئەم کەرتە چاپخانەی تایبەت بەچاپکردن و بڵاوکردنەوە دەگرێتە خۆی. سێ چاپخانەی پەیوەست بەکەرتی گشتی دەگرێتە خۆ. ئەوانیش بریتین لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین کە لە ساڵی ١٩٦٧ دامەزراوە بەناوی چاپخانەی سلێمانی و دواتر بۆ هەولێر گوازراوەتەوە و بەچاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین ناونراوە. ئەم چاپخانەیە کتێب و گۆڤاری ئەکادیمی و...هیتر چاپ دەکات[٢٨].

چاپخانەی پەروەردەش لە ساڵی ١٩٧٤ دامەزراوەو ناسراوە بەچاپخانەی کوردی و ئامانجی دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە ئەوە بووە کە کتێبی پرۆگرامی خوێندن لەچاپ بدات. چاپخانەی رۆشنبیری لە ساڵی ١٩٨٢ دامەزراوەو ئامانجی ئەم چاپخانەیە چاپکردنی گۆڤارو رۆژنامەو بڵاوکراوەی سیاسی و کتێبی تایبەت بەحزبە سیاسییەکانە[٢٩].

**پێنجەم: کەرتی پیشەسازییە کیمیاوی و نەوت و نیسفەلجیییەکان:**

ئەم کەرتە لەم پارێزگایەدا خۆی لە کارگەکانی گاز، بەتایبەتی کارگەی گازی هەولێر و کارگەکانی دیکەی پەیوەست بەکەرتی تایبەتدا دەبینرێ.

کەواتە دەتوانین بڵێین کە پیشەسازی لە هەولێر پیشەسازییەکی سادەو سەرەتایی بووەو خۆی لە دوکان و شوێنی کاری سادەو بەشێوازو کەرەستەی سەرەتایی دەبینرێ و ئامانج و بازاڕەکەی بەمەبەستی جێبەجێکردنی داخوازییەکانی دانیشتووانی شارەکە بووە. لەناوەڕاستی سەدەی بیستەم پیشەسازی گەشەکردنێکی رێژەیی بەخۆوە دیوە و هەنگاو بەهەنگاو لەنێو سوود وەرگرتن لەپلانی گەشەی نەتەوەیی و رێککەوتننامەی ئادار و رووداوەکان و دۆخەکانی دیکە کە بەسەر ئەم پارێزگایەدا هاتووە، کاری لە چالاکی پیشەسازیی پارێزگاکە کردووە.

گەشەکردنی کارگەکان لەرووی ژمارەو قەبارە جێگیر نەبووە. بەڵکو بەپێی ئەو هەلومەرجەی بەسەر ناوچەکە و شارەکەدا هاتووە، لەکاتێک بۆ کاتێکی دیکە لەگۆڕاندا بووە. بەتایبەتی لەساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانداو ئەم هەڵچوون و داچوونەش کاری لەسەر چالاکی پیشەسازیی کردووە.

بەڵام بەدەرچوونی بڕیاری نەوت بەرامبەر بەخۆراک (٩٨٦) ژیانی ئابووری گەشایەوەو کاریگەریی خۆی لەسەر پیشەسازی و پرۆژە پیشەسازییەکان جێهێشت. ئەمەش لەبواری دامەزراندنی ئەو پرۆژە پیشەسازییانەی، کە پێشتر بوونی نەبووە، وەک ئەو کارگەو دامەزراوانەی لەکەرتە جیا جیاکاندا ئاماژەمان بۆ کردووە.

کزبوونەوەی رۆڵی کەرتی گشتی لە بواری موڵکایەتی و خاوەندارێتی کارگەکان و لەپێشەوە بوونی کەرتی تایبەت، بۆ کارگە پیشەسازییەکان لە پارێزگاکەدا بەدیار دەکەوێت.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

* شانەدەر: ئەشکەوتێکە دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای زنجیرە چیاکانی زاگرۆس.

** کیوانان: ئەشکەوتێکە دەکەوێتە نزیک شاری رواندز.

١- هاشم خضير الجنابي: مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر، دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، الموصل، سنة الطبع بلا، ص١٤.
٢- مەلوود بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە، چاپخانەی دەزگای کاروباری رۆشنبیری گشتی، بەغدا، ١٩٩١، ل١٦٥.
٣- مەولوود بێخاڵی. سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤.
٤- مەولوود بێخاڵی. سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦-١٠٨.
٥- مەولوود بێخاڵی. سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.
٦- مەولوود بێخاڵی. سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣-٩٥.
٧- نوزاد محمد حسن. واقع وآفاق التنمية الصناعية في منطقة كردستان الحكم الذاتي، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الادارة والاقتصاد. جامعة صلاح الدين-

اربيل، ١٩٩٢، ص٦، رسالة غير منشورة.
٨- نوزاد محمد حسن، مصدر السابق، ص٦٣.
٩- سلمي عبدالرزاق الشبلاوي، الصناعات الغذائية في محافظات الفرات الاوسط دراسة في الجغرافية الصناعية، اطروحة دكتوراه مقدمة الى كلية الاداب، جامعة بغداد، بغداد، ١٩٩٨، ص١١٠.
١٠- سەلاحەددین حەفید، ئابووری کوردستان ١٩٧٧-١٩٩٠، لە بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٤٣.
١١- سەلاحەددین حەفید، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٥-١٥٧.
١٢- سلمی عبدالعزیز الشبلاوی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٢.
١٣- نزار جرجیس، واقعی پیشەسازی لەکوردستانداو ئاسۆی گەشەکردنی، پاشکۆی گۆڤاری ئابووری، کۆمەڵەی ئابووری زانانی عێراق، لقی هەولێر دەری دەکات، چاپخانەی حوداث، بەغدا، ١٩٨١، ص١٠.
١٤- سەلاحەددین حەفید، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣-١٤٤.
١٥- صلاح الدين حفيد، الوضع الاقتصادي في كردستان العراق واهم مشاكله (اقتصاديات محافظة اربيل)، الجزء الثاني، مكان الطبع بلا، ١٩٩٣، ص١٤٣.
١٦- ئازاد حەمەدەمین نەقشبەندی و ئەوانی دیکە، بیۆگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨، ل٢٠٠.
١٧- عباس النصراوي، الاقتصاد العراقي، النفط- التنمية- الحروب- التدمير- الآفاق، ١٩٥٠-٢٠١٠، ترجمة محمد سعيد عبدالعزيز- الطبعة الاولى، دار الكنوز الادبية، لبنان، ١٩٩٥، ص١٣٣.
١٨- وزارة الصناعة والطاقة، مديرية الصناعة في اربيل، بيانات عن مسح المعامل لعام ٢٠٠٠ غير منشورة.
١٩- وزارة الصناعة والطاقة، هەمان سەرچاوەی پێشوو، بيانات عام ٢٠٠٥.
٢٠- اربيل بين الماضي والحاضر، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٨٦، ص١٢٣.
٢١- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ بەڕێز زەکەریا ئەڵلاویردی، بەڕێوەبەری گشتی کەرتی تایبەت، بەڕێوەبەرایەتی پیشەسازی هەولێر.
٢٢- حلاو حسين كريم، الصناعات الغذائية في محافظة اربيل- دراسة في الجغرافية الصناعية، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية الآداب جامعة صلاح الدين- اربيل، ٢٠٠١، غير منشورة، ص٨٣.
٢٣- حلاو حسين كريم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٥.
٢٤- حلاو حسين كريم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٥.
٢٥- ماريه محمد عمر، تحليل وتقييم كفاءة الاداء لعمل الغزل والنسيج الصوفي في اربيل للفترة ١٩٨٩-١٩٩٠، رسالة ماجستير مقدمة الي كلية الادارة والاقتصاد، جامعة صلاح الدين اربيل، اربيل، ٢٠٠٠، رسالة غير منشورة، ص٦٠.
٢٦- نسرين سليمان حسين، النشاط الصناعي للمنشآت الصناعية الكبيرة للقطاع العام في محافظة اربيل، دراسة تحليلية للفترة (١٩٩٧-٢٠٠٠)، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الادارة والاقتصاد- جامعة صلاح الدين، اربيل، اربيل، ٢٠٠٢، رسالة غير منشورة، ص٦٧.
٢٧- نسرين سليمان حسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٢.
٢٨- نسرين سليمان حسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١١٩.
٢٩- نسرين سليمان حسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٠-٧١.

و: قاسم محەمەد مستەفا



# ئاوی سەر زەوی لە هەولێر

دکتۆر هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد

ئاوی سەر زەوی لە پارێزگاکە و دەرامەتێکی سروشتی پشت دەبەستێت بە سەرچاوەکانی (بەفر و باران و ئاوی کانیاوەکانی). پاش کۆبوونەوەیان لە ناخی زەویدا. پارێزگای هەولێر یەکێکە لە پارێزگا دەوڵەمەندەکان بەئاوی سەر زەوی، بەڵام بە ڕێژەیەکی کەم سوودی لێ وەرگیراوە.

بڕ و جۆری ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو لە ڕووبارەکانی تێپەڕبوو بە پارێزگاکە بەندە بە بڕ و جۆری سەرچاوەکانی ئاو تیایدا. لەبەرئەوە ئەم بڕە ئاوە لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر جیاوازە.

گرنگترین ئەو ڕووبارانەی بەزەوی پارێزگاکە تێپەڕدەبن ئەمانەن: (زێی گەورە، زێی بچووک، ڕووباری شەمدینان، ڕووباری ڕێزان، ڕووباری ڕواندز، ڕووباری ئالانە (خەلیفان)، ڕووباری باڵەکیان) و سەرەڕای ئەم ڕووبارانە ژمارەیەکی زۆر لە چەمی وەرزی هەن لە پارێزگاکە و گرنگترینیان ئەمانەن: (چەمی کوردەدرە، چەمی شەڵغە، چەمی کۆیە، چەمی بەستۆڕە، چەمی ڕەزگە، چەمی بەربیان، چەمی چەمەکە، چەمی مەمی خەلان، چەمی ڕووسارک... هتد).

جێگای ئاماژە پێکردنە بەرزترین ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو لەم ڕووبار و چەمانەی سەرەوە لە ساڵی (١٩٦٩) بووە، بۆ نموونە بەرزترین ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو لەزێی گەورە لەهەمان ساڵدا گەیشتۆتە (٧٥٣ م/ چرکە)، لە زێی بچووک (٥٤٤م/٣ چرکە)، بەڵام کەمترین تێکڕای ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو لە زێی گەورە لەنێوان ساڵانی ١٩٦٠-٢٠٠٥ لە ساڵی (١٩٧٠) بوو، بەڵام لەزێی بچووک لە (١٩٦٠) بووە.

لە خوارەوە بە کورتی ئاماژە بە گرنگترین زێیەکانی پارێزگاکە دەکەین:

### ١- زێی گەورە Greaterzab:

بە لقی گرنگی ڕووباری دیجلە دەژمێردرێت، لە بەرزاییەکانی باکووری کوردستان- هەکاری دەریاچەی وان و بەشی ڕۆژئاوای دەریاچەی ئورمییە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەڵدەقوڵێت. بە

شێوەیەکی پێچاوپێچ درێژ دەبێتەوە تا بەشاری جۆلەمێرگ تێدەپەڕێت لەپاشان لە گوندی (چال)ی باکووری قەزای عەمادیە، لە پاشان لەباشووری (بالندە) لە ناوچەی بەیەک گەیشتنی لەگەڵ رووباری شەمدینان دێتە ناو زەوی پارێزگاکە. لە پاشان لەلای راست و چەپی چەندین لقی تری دەڕژێتە ناوی. ئینجا درێژ دەبێتەوە وەک سنوورێک کە هەردوو پارێزگای دهۆک و نەینەوا لە هەولێر جیادەکاتەوە لەلای رۆژئاوا لە پاشان بە شارۆچکەی کەلەک تێپەڕ دەبێت، بەردەوام دەبێت بەرەو باشووری پارێزگاکە تا بە شارۆچکەی گوێر تێدەپەڕێت تا لە باشووری گوندی نەمرووود دەڕژێتە رووباری دیجلە.

بەم شێوەیە زێی گەورە درێژییەکەی لە سەرچاوەکانی تاکو خاڵ رێژگەکەی (٣٩٢) کیلۆمەترە و رووبەری ئاوێزڵکەی (٢٥٨١٠)کم٢، کە نزیکەی (٩٥٣٠)کم٢ دەکەوێتە ناو پارێزگاکە، کە نزیکەی (٣٧٪) پێکدێنێت. تێکرای ئاوی لەبەر رۆیشتووی ساڵانەی (٤٢٩م٣/چرکە)یە. تێکرای داهاتی ساڵانەی (٨٣.١٣ ملیار م٣)یە. کە نزیکەی (٣٣٪ تا ٤٥٪) ئاوی رووباری دیجلە پێکدەهێنێت. وەک پێشتر ئاماژەم پێکرد بەرزترین ئاوی لەبەر رۆیشتوو لەساڵی ١٩٦٩ بووە و کەمترین ئاوی لەبەر رۆیشتوو لەزێی گەورە ساڵی ١٩٧٠ بووە لە نێوان ساڵانی (١٩٦٠- ٢٠٠٥).

**٢- زێی بچووک:**

زێی بچووک یەکێکە لە زێیە گرنگەکانی هەرێمی کوردستان و هەولێر بە سنووری باشووری رۆژهەڵات و باشووری پارێزگاکە تێپەڕ دەبێت وەک دیاردەیەکی جوگرافی سروشتی لە هەردوو پارێزگای سلێمانی و کەرکووکی جیا دەکاتەوە.

زێی بچووک لە زنجیرە چیاکانی رۆژهەڵاتی کوردستان هەڵدەقوڵێت بە تایبەتی چیاکانی لاهیجان رۆژئاوای شاری مەهاباد. لەنزیک گوندی هەزینە دێتە ناو خاکی هەرێمی کوردستان لە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی قەڵادزێ، لە پاشان بە دەربەندی رانیە تێپەڕ دەبێت و لە دەربەندی دوکان بەنداوی دوکانی لەسەر دروست کراوە لە پاشان لە باشووری رۆژهەڵاتی گوندی کلیسە وەک سنووری پارێزگاکە دەبێتە بەشێک لە خاکی پارێزگای هەولێر.

لە پاش تێپەڕبوونی بەنێوان بەرزاییەکانی قەرەچووغ و بانێوە لە پاشان لەنزیک گوندی سازکی سەر بە قەزای مەخموور لەخاکی پارێزگاکە دەچێتە دەرەوە و دەڕژێتە رووباری دیجلە لە باشووری شەرگات.

بەم شێوەیە درێژی زێی بچووک (٤٠٠) کیلۆمەترە و تێکرای ئاوی لەبەر رۆیشتووی دەگاتە ٢٢٤م٣/چرکە و داهاتی ساڵانەی دەگاتە نزیکەی (٨.٧) ملیار مەتر سێجا کە نزیکەی (١٥-٢٠٪) داهاتی رووباری دیجلە پێکدەهێنێت.

**٣- رووباری شەمزینان (شین):**

یەکێکە لە لقەکانی زێی گەورە لە بەرزاییەکانی ناوچەی شەمدینان و چیاکانی سەرمەیدان و پۆتین هەڵدەقوڵێت لەوپەڕی باکوور و رۆژئاوای پارێزگاکە دێتە ناوخاکی پارێزگای هەولێر لە پاشان بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە و لە باشووری شارۆچکەی باڵندە دەڕژێتە ناو زێی گەورە، درێژی رووبارەکە نزیکەی (٥٢کم) دەبێت.

**٤- رووباری رێزان:**

لقێکە لە لقەکانی زێی گەورە لە ناوچەی سێگۆشەی نێوان باکوور و رۆژهەڵاتی و باشووری کوردستانی دایک هەڵدەقوڵێت لە چەند لقێکی بچووک پێکدێت بەناوبانگترینیان رووباری بەرازگرە لە پاشان درێژ دەبێتەوە تا لە باشووری رۆژهەڵاتی گوندی رێزان دەڕژێتە زێی گەورە.

درێژی رووباری رێزان لەگەڵ بەرازگر دەگاتە نزیکەی (٦٤کم).

**٥- رووباری رواندز:**

بە گرنگترین لقی زێی گەورە دەژمێردرێت لە بەشی باکووری رۆژهەڵاتی پارێزگاکە زنجیرە چیاکانی رۆژئاوای شارۆچکەی خانەی رۆژهەڵاتی کوردستان هەڵدەقوڵێت لە پاشان بەناوچەی باڵەکایەتی تێپەڕ دەبێت ئاوی زنجیرە چیاکانی حەساروست و کۆشینەبندوراز و سەری سەکران و گردەگۆ و چیاکانی تری ئەم ناوچەیە کۆدەکاتەوە. لە پاشان بە سەنتەری قەزای چۆمان تێپەڕدەبێت، چەندین لقی بچووکی دەڕژێتە ناو، درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە خەرەندی رواندز و لە پاشان بەناو گەلی عەلی بەگ تێپەڕ دەبێت و لقەکانی باڵەکان و ئالانە (خەلیفان)ی دەڕژێتە ناو، لە پاشان بەرەو رۆژئاوا دەڕوات تا لە نزیک گوندی (مالەموسی) دەڕژێتە زێی گەورە.

بەم شێوەیە درێژی رووبارەکە دەگاتە نزیکەی ٩٣کم و تێکرای داهاتی ساڵانەی ..گاتە نزیکەی ٣.١ ملیار/م٣، لەگەڵ لقەکانی باڵەکیان و ئالانە و تێکرای ئاوی لەبەر رۆیشتووی دەگاتە نزیکەی ٤٢ م/٣چرکە.

# ئاوی ژێر زەوی لە هەولێر

دكتۆر هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد
كۆلیژی ئاداب- زانكۆی سەلاحەدین

ئاوی ژێر زەوی بە سەرچاوەیەكی بنەڕەتی ئاو دەژمێردرێت لە پارێزگاكە، مەبەست لە ئاوی ژێر زەوی ئەو بڕە ئاوەیە كە لە چینەكانی زەوی دەچێتە خوارەوە لە پاشان لە چینەكانی ژێر زەوی دەجوولێت یاخود جێگیر دەبێت. لە پاشان بەشێوەی جیاواز لە سەر رووی زەوی بە دیار دەكەوێت بەشێوەی كانی یاخود بەشێوەی بیر و كارێزی دەستكرد.

ئاستی ئاوی ژێر زەوی لە پارێزگاكە بەگشتی لە قوولایی كەم تاكو ناوەند هەیە و جۆری ئاوەكەی بەگشتی بە كەڵكە بۆ خواردنەوە و پێداویستییەكانی دیكەی ژیان.

بڕی ئاوی ژێر زەوی لە ناوچە شاخاوییەكانی پارێزگاكە باشترە لەڕووی جۆر و بڕەوە و، گۆڕانكاری بەسەردا دێت هەرچەند بەرەو باشوور و باشووری رۆژئاوای پارێزگاكە بڕۆین كەواتە بڕەكەی كەم دەبێتەوە و جۆرەكەشی دەگۆڕێت.

زۆربەی ئاوی ژێر زەوی ناوچە شاخاوییەكان بەشێوەی سروشتی (كانیاو) دەردەچێت، بەڵام لەناوچەی زوورگەكانی هەولێر و دەشتی هەولێر سوود لە ئاوەكە وەردەگیرێت بە شێوەی بیر یاخود كارێز، جێگای ئاماژە پێكردنە دەشتی هەولێر زۆربەی بە كارێز ئاوبانگی دەركردووە، وەك سەرچاوە مێژووییەكان ئاماژەی پێ دەكەن كە نزیكەی (٣٦٥) كارێز لە سەردەمی ئەتابەگییەكان هەبووە، لە پاشان لەنێوان سالانی ١٩١٨-١٩٢٠ ژمارەی كارێزەكان گەیشتۆتە (٦٠) كارێز، لە پاشان ژمارەكە كەم بۆتەوە تا لە ناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی بیستەم تەنها (٢٥) كارێز ماوەتەوە.

گرنگترین كارێزەكانی ئەم دەشتە ئەمانەن: (كارێزی جەژنیكان، گرد عارەق، داود ئاغا، كەسنەزان، هەڵەجە، بنەسلاوە، توورەق، عارەبكەند، قوڕیتان، دالداغان، قەتەوی، موورتكە، گردمەلا، قوشتەپە، ئاوی میری) بەلام لەڕووی دابەشبوونی حەوزەكان ئاوی ژێر زەوی لە پارێزگاكە بەم شێوەی خوارەوەیە:

١- حەوزی ناوچەی شاخاوی.

٢- حەوزی ناوچە زوورگەكان (حەوزی تەق تەق- كۆیە).

٣- حەوزی دەشتی هەولێر، كە ئەم حەوزانە دەگرێتەوە (كەپران، باشتەپە، سەنتەری هەولێر).

٤- حەوزی دەشتی دیبەگە- كەندیناوە.

٥- حەوزی دەشتی مەخموور (مەخموور+ قەراج).

بە شێوەیەكی گشتی ئەم حەوزە ئاوییانەی سەرەوە بڕ و جۆری ئاوەكانیان جیاوازە. هەرچەند لە حەوزەكانی باشووری هەولێر وەك پارێزگان حەوزی مەخموور، بەرەو حەوزەكانی باكوور بڕۆین بڕی ئاوەكانیان زیاد دەكات و جۆری ئاوەكانیش باشتر دەبێت. پێچەوانەكەشی راستە.

شێوازی سوود وەرگرتن لە ئاوی ژێر زەوی پارێزگاكە تارادەیەكی زۆر جیاوازە. حەوزی ناوچەی شاخاوی شێوازی دەرچوونی ئاوی ژێر زەوی تیایدا بەشێوەی كانیاوە، بەڵام شێوازی بیر لێدان تا رادەیەكی زۆر كەمە، بەڵام حەوزەكانی تری پارێزگاكە شێوازی دەرچوونی ئاوەكانی ژێر زەوی بەشێوەی لێدانی بیرە یاخود كارێزە. سەرەڕای ئەمەش ئاستی ئاوەكان قووڵترە. جۆرەكەش وەك ئاوی ناوچە شاخاوییەكان نییە، تەنانەت لە هەندێ ناوچەی حەوزی باشوور (مەخموور- شەمامك) جۆری ئاوەكان بە كەڵكی خواردنەوە نایەن، هەرچەندە ئەمەش بەندە بەپێكهاتەی جیۆلۆجی ناوچەكە و هەندێ هۆكاری تر.



# ئاوی میری لە هەولێر

**دکتۆر شەهلە بورهان عەبدوڵڵا**
**کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین**

هەولێر هەر لەکۆنەوە بەدەست نەبوونی ئاوی خواردنەوە ناڵاندوویەتی. یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی بەردەوامبوونی ژیان لەم شارە دێرینە، پشتبەستنی خەڵکی شارەکە بووە بەئاوی بیر و کارێز (کارێز وشەیەکی فارسییە بەمانای نۆکەندە ئاوێک دێت کە لەژێر زەوی هەڵدەکەنرێت بۆ تێپەڕبوونی ئاو بەناویدا لەدواییشدا بەمەبەستی ئاودان دەهێندرێتە سەر زەوی)[1].

کارێز شتێکی گرنگ بووە بۆ خەڵکی شاری هەولێر، بەتایبەتی کە ڕووبارێکی سروشتی نەبووە بەناو شارەکەدا بڕوات، ژمارەی ئەو کارێزانەی کە لە شاری هەولێرو دەوروپشتی هەڵکەندرابوون نزیکەی (٣٥٠) کارێز دەبوون[2]، کە زۆربەشیان لەبەر وشکبوون و کەمکردنی ئاویان، پشتگوێ خرابوون، خەڵکی هەولێر لە سەردەمی (مەلیک فەیسەڵی یەکەم) بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی دێرینی شارەکەیان چەند جارێک داوایان لە بەرپرسان کردبوو کە ئاوی زێی گەورە بگەیەنێتە شارەکەیان، بەڵام پرۆژەکە جێبەجێ نەکرابوو[3].

کارێزی میریش یەکێک بوو لەکارێزە هەرە کۆنەکانی شاری هەولێر کە ماوەیەکی درێژ خایەن توانیویەتی پێداویستی خەڵکانی ئەم شارە دابین بکات.

کارێزی میری یان ئاوی میری، لەوانەیە هەمان کارێزی (سوڵتان موزەفەرەدینی گوگبری) بووبێت هەروەکو لە کتێبی (العراق الشمالي) باسی لێوە دەکات[4].

بیرەکانی ئەم کارێزە بەدوو لق بە شێوەی زنجیرە بیرێک لەناو زەوی و زاری گوندی (حەسارۆک) کە بەحەوت کیلۆمەتر دووری کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر لێدراون، هەردوو لقەکەش لەسەر ڕێگای زنجیرە بیرێک لەژێرەوەش تووننێلەکەی بەرەو شاری هەولێر هێنراوە، لەنزیک

بەستی سیتاقانی پێشوو، بەناو گوندی (خاتووناوا)دا ژمارەی پارچە زەوییەکەی (١٢٤)ە، تێپەڕیودو گەیشتۆتە شوێنی گەڕەکی بەلاشاوە[٥].

لەدواییدا ڕێگای کۆنی (هەولێر- باداوە- گەڕەسۆر)ی بڕیوە تا گەیشتۆتە شوێنی هاتنە سەر زەوی -واتا دەم-زارەکەی، کە کەوتبووە شوێنی ئێستاکەی بەشی پاراستن و دابەشکردنی ئاوی ناو شاری هەولێر، ڕۆخ یانەی مامۆستایانی هەولێر، نزیک گۆڕەپانی ئاوی کەسک و سۆری جاران (نافورە)ی ئێستا، کە دەکاتە نزیک شارەوانیی هەولێر[٦].

ئاوی میری ئەوەندە زۆر بوو نیمچە ڕووبارێکی پێکهێناوە، کە دەڵێن نزیکەی دوو مەترێک بووە، شارەکە بۆ خواردنەوە بەکاریان هێناوە، هەروەها چەند ئاشێکیش لەبەری گەڕاوە و شینایییەکی زۆریشی لە ڕۆژئاوای شارەکە ئاو داوە.

ئاوی میری ئەوەندە گەورە بووە، کە خەڵک توانیویەتی ماسی تێدا ڕاو بکەن، جگە لەمە خەڵکی کاروباری خۆی بەهۆی ئەم ئاوە جێبەجێ کردووە، وەکو شوشتنی (مافوور و جل و بەرگ و....هتد)[٧].

لە ئاوەکە خۆشیان دەشوشت و هەندێ جار دەیانکرد بەسەیرانێکی خۆش، لەگەڵ خۆیان خواردنیشیان دەبرد، وەک (دۆڵمە) (کە چێشتێکی کۆنی هەولێرییەکانە، هەولێریش پێی بەناوبانگە) جگە لە دۆڵمە هەندێ جار ساوار بە تۆڵکەیان لێ دەنا، بەم شێوەیە دەبوو بەسەیرانگەیەکی خۆش[٨].

بۆ یەکەم جاریش کە ئێستگەی شەمەندەفەر لەهەولێر دامەزرا، بەڵێندەرەکانی و هەڵسووڕێنەرانی کاروباری پرۆژەکە، کە ئاوی ئەم کاریزەیان لە میری، بۆ پێویستی و ڕاپەڕاندنی ئیشوکاریان بەکرێ وەرگرتبوو، جگە لەوە، کوورەچییەکانیش بۆ مەبەستی جێبەجێکردنی کارەکانیان، چەند لقیان لێ ڕاکێشابوو و سوودیان لێ وەردەگرت[٩].

دەڵێن، کاتی خۆی ئەم ئاوە (وەستا فەتاح عەلی) ناوێک کە وەستای کاریز هەڵکەندن بووە، توانیویەتی جۆگەیەکی ئاوی میری بگەیەنێتە نزیک مەرقەدی سوڵتان (موزەفەرەدین گۆگبری) دیوی ڕۆژئاوای قەڵای هەولێر، خەڵکی قەڵاش هەندێ جار لەوێوە ئاویان بۆ قەڵا بردووە[١٠].

بردنی ئاو لەلایەن خەڵکی هەولێر لەئاوی میری چەند شێوازێکی بەخۆوە گرتبوو:

**شێوازی یەکەم:**

خەڵکی خۆیان دەهاتن و پێداویستی خۆیان لەئاوەکە دەبرد، بەڵام دەبایە بەکۆمەڵ بێن، چونکە هێشتا هەولێر وا فراوان نەبوو، ناوچەی ئاوی میریش ناوچەیەکی چۆڵ بووە، خەڵکی دەترسان بەتەنیا بهاتبانایە، بەتایبەتی ئافرەتان.

**شێوازی دووەم:**

هەندێ کەس هەبوون کاری (ساقی-ئاوگێڕ)یان دەکرد، کە پێیان دەگوتن (سەقا: ئەوانەی کە ئاویان بەسەر خەڵک دابەش دەکرد) ئەوانە دوو گۆزەیان هەبوو لەسەر شانیان دادەنا بەهۆی دارێکەوە، بەرامبەر هەندێ پارە ئاویان دەگواستەوە بۆ ماڵەکان.

**شێوازی سێیەم:**

گواستنەوەی ئاو بوو بەهۆی گوێدرێژ، گۆزەیان لەسەر پشتی گوێدرێژەکە بار دەکردو ئاویان پێ دەگواستەوە بۆ گەڕەک و ماڵەکان لە بەرامبەردا کرێیان وەردەگرت[١١].

لە ساڵی ١٩٢٤ لە سەردەمی سەرۆکایەتی (داود ئاغای یەعقوبی) بۆ شارەوانی هەولێر پەرە بەپرۆژەکە دراو توانراوە بەمزەخە بەرزی بکەنەوە بۆ عەمبارێکی کۆنکرێتی لەسەر قەڵا و پڕی بکەن لەئاو، بۆ ئەوەی خەڵکی قەڵا بەئاسانی بتوانن سوود لەم ئاوە ببینن. لەدواییشدا بەهۆی تۆڕە بۆرییەکەوە بەرێگایەکی سەرەتایی بەسەر شارەکە دابەش کراوە[١٢].

هەندێ بۆری ئاویش لە گەڕەکەکانی قەراخ شار بۆ بەرژەوەندی گشتی دامەزرێن، ئەم کارەش بەیەکەم پرۆژەی هاوچەرخ

دادەندرێت بۆ ئاوی شاری هەولێرو دووەمین هەوڵی شارەوانی شارەکە لە رووی دابەشکردنی ئاوی خواردنەوە، بەسەر دانیشتووانداا[13].

شایەنی باسە ئەم ناوچەیە وەک وێستگەیەک بووە بۆ بەرێکردن و پێشوازی کردن لە کاروانی حاجییەکان، چونکە حاجییەکان لەم شوێنەوە بۆ حەج وەڕێ دەکەوتن، هەر لەم شوێنەشەوە لەدوای گەڕانەوەیان لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان لەلایەن کەس و کاریان پێشوازییان لێ دەکراو، بەسواری پشتی گوێدرێژ دەگەڕانەوە ماڵەکانیان[14].

ئاوی میری یەکێکە لە سامانە نیشتمانییەکان، کە پێویستە گرنگییەکی زۆری پێ بدرێت. بەڵام بەداخەوە خەڵکی بەتەمەنی ئەم شارە دێرینە زانیاری زۆریان لەلا نەماوە، بۆیە پێویستە لەسەر ئەم نەوەیە لێکۆڵینەوە لەسەر شوێنە کۆنەکانی شارەکەیان بکەن، بۆ ئەوەی ئەم لاپەڕە رەنگین و ئەم مێژووەی شار لەبیر نەچێتەوە.

سەبارەت بەدوارۆژی ئەم کارێزە دێرینە، چەند بیروڕایەک هەیە لەسەر نەمانی ئاوەکەی، کە بریتین لە:

١- رای یەکەم: بەهۆی کەمبوونی ئاوەکە بەرە بەرە تا وشکی کردووە[15].

٢- رای دووەم: لەبەر خاوێن نەکردنەوە و پشتگوێ خستنی کارێزەکە، کە ئاوای کردووە سوودی خۆی لەدەست داوە[16].

٣- رای سێیەم: (مەلیک فەیسەڵی دووەم) مەلیکی عێراق لە پەنجاکاندا ئاوەکەی تێکداوە، چونکە پێشمەرگە سوودیان لێ دەدیت و بەکاریان دەهێنا بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانیان، جگە لەوەی کە خۆیان تێدا حەشار دەدا[17].

هەر چۆنێک بێت ئەم ئاوە ئێستا بوونی وەکو شوێنێکی کە سوودبەخش بێت نەماوە، بەڵام هاندانی خەڵک و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم جۆرە پرۆژەو رابردووە کارێکی گرنگە بۆ ناسینی بست بە بستی شارە مەزنەکەیان.

**سەرچاوەکان:**

١- عبدالرحمن احمد گەزنەیی/ اربیل ومـاء الشرب في الماضي والحاضر، هەولێر ص٣٣.
٢- عبدالرزاق الهلالي، معجم العراق، بغداد، ١٩٥٣/ ل٦٩.
٣- اسماعیل شکر رسول، اربیل دراسة تاریخیة في دورها الفكري والسیاسي (١٩٣٩-١٩٥٨) رسالة دكتورا، غیر منشور، اربیل/ ١٩٩٩م. ل٩٧- ٩٨.
٤- بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە/ عبدالرحمن احمد گەزنەیی/ اربیل وماء الشرب/ ص٣٦.
٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦- چاوپێکەوتن، مەدحی شەریف، فەرمانبەری خانەنشین لە فەرمانگەی ئاو و ئاوەڕۆکانی شاری هەولێر لە رێکەوتی٥/٦/٢٠٠٦.
٧- چاوپێکەوتن، مەهدیە ئیسماعیل محەمەد، لە رێکەوتی ٧/٦/٢٠٠٢.
٨- چاوپێکەوتن، شوکریە ئەحمەد سلێمان، لە رێکەوتی ٧/٦/٢٠٠٢.
٩- چاوپێکەوتن، ئەدیبە عەبدولرەحمان، لە رێکەوتی ١٠/٦/٢٠٠٢.
١٠- شوکریە ئەحمەد، هەمان چاوپێکەوتن.
١١- مەهدیە ئیسماعیل، هەمان چاوپێکەوتن.
١٢- بڕوانە عەبدولڕەحمان ئەحمەد گەزنەیی، اربیل، ص٣٦.
١٣- چاوپێکەوتن، بورهان عەبدوڵڵا شاکر، لە رێکەوتی ١/٧/٢٠٠٢.
١٤- چاوپێکەوتن، سەعدیە عەلی مەندان، لە رێکەوتی ١/٧/٢٠٠٢.
١٥- عبدالرحمن احمد، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٣٦.
١٦- عبدالرحمن احمد، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٣٦.
١٧- شوکریە ئەحمەد، هەمان چاوپێکەوتن.

# بەرزی و نزمیی زەویی پارێزگای هەولێر

دکتۆر هاشم یاسین حەمەدەمین حەداد
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین




دروستبوونی یەکەکانی بەرزی و نزمی بەندە بە پێکهاتە جیۆلۆجییەکانی ناوچەکە و جوولە تەکتۆنییەکانی و ئاووهەوا. ئەم هۆکارانەش کاریگەری راستەوخۆی لەسەر بەدیارکەوتنی یەکە بەرزی و نزمییەکان لە پارێزگاکەدا هەیە. لەبەر ئەوە بەرزی و نزمی جۆراو جۆر بەدی دەکرێت وەک (چیاکان، دۆڵەکان، دەشتاییەکان، بانەکان). لەرووی جوگرافیای سروشتییەوە بەرزی و نزمی پارێزگاکە بۆ (٥) پێنج یەکەی بەرزی و نزمی دابەش دەکرێت، کە ئەمانەن:

١- ناوچە دەشتە بەرز و نزمەکان، بەرزاییەکانیان دەگاتە (٣٠٠) مەتر لە ئاستی رووی دەریا.

٢- ناوچەی بانەکان کە بەرزییان لەنێوان (٣٠٠-١٠٠٠) مەترە.

٣- ناوچەی شاخاوییە پێچاوپێچە سادەکان، کە بەرزییان لەنێوان (١٠٠٠-٢٠٠٠) مەترە.

٤- ناوچەی دەشتە شاخاوییەکان، کە بەرزییان لە نێوان (٤٠٠-٨٠٠) مەترە.

٥- ناوچە شاخاوییە پێچاو پێچە ئاڵۆزەکان، بەرزاییەکانیان لە (٢٠٠٠) مەتر زیاترە.

لەو نووسینەی خوارەوەدا ئاماژە بە هەر یەکێک لەم یەکانە دەکەین بە کورتی:

١- ناوچە دەشتە بەرز و نزمەکان، کە بەرزییان دەگاتە (٣٠٠) مەتر لە ئاستی رووی دەریا:

ئەم یەکەیە، بەرزی و نزمی بەشی باشوور و باشووری رۆژئاوای پارێزگاکە پێک دەهێنێت. کە بەرزییان دەگاتە ٣٠٠ مەتر و، هەرچەند بە باشوور و باشووری رۆژئاوا بەرەو باکوور برۆین بەرزاییەکانیان زیاد دەکات، گرنگترین دەشتەکانی ئەم ناوچەیە دەشتی قەراج و دەشتی مەخموورە، کە شارۆچکەی مەخموور دەکەوێتە نێو ئەم دەشتە و بەرزییەکەی (٢٧٠م)ە، گرنگترین بەرزایی لەم ناوچەیە زنجیرەی قەرەچووغە، کە بەرزترین خاڵ تیایدا دەگاتە ٨٢١ مەتر لە ئاستی رووی دەریا.

٢- ناوچەی بانەکان کە بەرزییان (٣٠٠-١٠٠٠) مەترە:

ئەم یەکە بەرزی و نزمییە بەشی زۆری پارێزگاکە پێک دەهێنێت، کە دەکەوێتە نێوان زنجیرەی پیرمام (١١٨٠م) و بابەجیجیک (٩٨٧م)، چێشکە (١٢٣٩م) و هەیبەت سوڵتان (١٢٦٠) مەتر. لە باکوور و باکووری رۆژهەڵات و بەرزاییەکانی قەرەچووغ (٨٢١م) لە باشوور و باشووری رۆژئاوا و بەگشتی بەرزی ئەم ناوچەیە لە نێوان (٣٠٠-١٠٠٠) مەترە. ناوچەکانی بەشی رۆژئاوای بەرزییەکەی لەنێوان (٢٥٠-٣٠٠) مەترە، هەرچەند بەرەو باکوور و باکووری رۆژهەڵات برۆین بەرزییەکەی زیاد دەکات، تا دەگاتە (٧٨٠) مەتر لە بناری زوورگەکانی شەرەبۆت و خانزاد و بەرزترین خاڵ لەم یەکە بەرزی و نزمییە لە بەرزاییەکانی شەرەبۆتە، کە دەگاتە (١١٠٠) مەتر، سەرەرای بوونی هەندێ بەرزایی تر وەک زوورگەزراو (٥٠٧) مەتر، (دمیرداغ ٥٠٢١) مەتر و، کۆنترین شاری جیهان کە ژیانی تیادا بەردەوامە تاکو ئێستا دەکەوێتە ئەم ناوچەیە، ئەویش شاری هەولێرە کە تێکرای بەرزییەکەی (٤١٠) مەترە. گرنگترین دەشتەکانی ئەم ناوچەیە ئەمانەن: (دەشتی کەندێناوە، دەشتی شەمامک، دەشتی هەولێر و ناوچەی دەشتی بەرانەتی و دەشتی کۆیە).

٣- ناوچەی شاخاوییە پێچاوپێچە سادەکان (١٠٠٠-٢٠٠٠) مەتر:

ئەم یەکە بەرزی و نزمییە دەکەوێتە نێوان ناوچە بانە شەپۆلاوییەکان لە باشوور و ناوچەی شاخە بەرزەکان (پێچاوپێچی ئاڵۆز) لە باکوور و باکووری رۆژهەڵات و، چیاکانی ئەم یەکەیە پێچاوپێچییان کەمە (سادە) و بەرزاییەکان مام ناوەندە و لەگەڵ یەک تا رادەیەک هاوتەریبن، گرنگترین زنجیرە چیاکانی ئەم ناوچەیە ئەمانەن:

چیای پیرمام (١١٨٠م)، کێشکە (١٢٣٩م)- باواجی و هەیبەت سوڵتان (١٢٦٠م) سەری رەش (١٤٢٩م)- بنەباوی (١٣٢٩م)- سەفین (١٩٨٧م) - کلاوقاسم (١٧٤٤م)- سەری پێرس (١٥٩٩م)- بەرات (١٦٤٣م)- بەنی هەریر (١٤٣٤م) شەکرۆک (١٢٤٦م).

٤- ناوچەی دەشتە شاخاوییەکان (٤٠٠-٨٠٠م):

ئەم یەکە بەرزی و نزمییەیە دەکەوێتە ناوچە شاخاوییەکان بە هەردوو جۆرییەوە.

هەرچەندە ئەم دەشتانە لە رواڵەتدا شەپۆلاوین، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لە شێوە و رووبەردا دەشتی بچووک لەنێوان زنجیرە چیاکان بەدیار دەکەون، کە بەرزاییەکانیان لەنێوان (٤٠٠-٨٠٠) مەتر دەبێت. گرنگترین دەشتەکان ئەمانەن: (دەشتی هەریر، دەشتی سماقوولی، دەشتی دیانا، دەشتی بەرازگر).

ئەم دەشتانە لەرووی ئابوورییەوە گرنگیی تایبەتییان هەیە بە تایبەتی لەرووی کشتوکاڵییەوە. چونکە کەوتوونەتە ناوچەی باراناوی کە بە هەرێمی دەریای ناوەراست دەناسرێت.

٥- ناوچەی شاخاوییە پێچاوپێچە ئاڵۆزەکان (زیاتر لە ٢٠٠٠) مەتر.

ئەم یەکە بەرزی و نزمییە بەشی باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی پارێزگا دەگرێتەوە، کە سنووری نێودەوڵەتی (تورکیا-ئێران) لە باکوور و باکووری رۆژهەڵات لە باکوور و رۆژهەڵاتی کوردستان جیایان دەکاتەوە، کە چیاکانی بەشێکن لە زنجیرەی (زاگرۆس-تۆرۆس) و زنجیرە چیاکانی ئەم یەکەیە بەرزن و پێچاوپێچن و ئاراستەکانیان جیاوازە و لەگەڵ یەکتر هاوتەریب نین، بەرزییەکانیان جیاوازە و زۆربەی چیاکانیان بەرزییان لە (٢٠٠٠) مەتر لە ئاستی رووی دەریا زیاترە، گرنگترین چیاکانی ئەم یەکەیە ئەمانەن: (شیرین (٢٢٨٠م)-پیرەخان (٢٠١٩م) - برادۆست (٢٠٥٨م)- کۆرەک (٢١١٥م)-ئاراس (٢٥٢٣م) - کاروخ (٢٦٤٦م) - هندرین (٢٥٨٤م) زۆزک (١٩١٠م)- حەسەن بەگ (٢١١٠م) - قەلەندەر (١٩١٢م)-سەری پیران (٢٠٦٩م) - سەرمەیدان (٣٥٠٠م)- بۆتین (٢٤٧٩م) - سەرخەزنە (٢٧٣٦م) - سەرکلاوە (٢٦٩٠م) - شاکێن (٣٠٦٨م)- کۆشینە (٢٢٧٠م) - حەساروست (هەڵگورد) (٣٦٠٧م) رەشی گوزان (٢٣٢٤م) - کێلەشین (٢٣٠٠م)- سەری سەکران (٢٤٣٤م) - گردەمەند (٢٢٣٨م) - کۆدۆ (٢٥٢١م) - بندۆراز (٢٦٤٠م) -کونەکۆتر (٢٧٥١م).

ئەم زنجیرە پێچاوپێچانە دۆڵی جۆراو جۆر لێکیان جیا دەکاتەوە، کە هەندێکیان قووڵاییەکەی دەگاتە نزیکەی (١٠٠٠) مەتر، گرنگترین دۆڵەکانی ئەم یەکەیە ئەمانەن: (دۆڵی ئالانە، دۆڵی رێزان، دۆڵی گەلی عەلی بەگ، دۆڵی رۆستێ.... هتد).

نووسینی سەنحاریب لەسەر بەردێکی پرۆژەکەدا



من سەنحاریبم ، شای جیهان و وڵاتی
ئاشوور ، سێ رووبارم لە چیاکانی خانی
هەڵکەندوون ، ئەو چیایانەی کە وتوونەتە
هەوراز شاری هەولێرەوە ئاوی کانیاوەکانی
لای دەستە چەپ و راستی رووبارەکانیشم
کردۆتە ناویانەوە ، ئینجا جۆگە زێکم تا ناوەراستی
شاری هەولێر نیشتمانی خواوەندی گەورەوە...
ئەشتار هەڵکەندووە و ئاوەکەیشم راستی هێناوە .

# جۆگەی بەستۆرە و پرۆژەی سەنحاریب

**باوکی سلێوە**

گرفتی ئاوی هەولێر بۆ چاخە کۆنەکان دەگەرێتەوە. سەدەی حەوتەمی پێش زایین جێگای سەرنج و بایەخی (سەنحاریب)ی پاشای ئاشوورییەکان بووە و پرۆژەیەکی ئاودێری دروست کردووە و بە هۆی جۆگەیەکەوە، کە لە گوندی (قەلەمورتکەی)ی باشووری دۆڵی بەستۆرەوە دەستی پێکردووە، ئاوی بۆ هەولێر هێناوە. ئەم جۆگەیەش سالی ١٩٤٧ لە لایەن بەرێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراقی دۆزراوەتەوە، کە لە کونێکی دیواری بەردینی ئەم جۆگەیەدا نووسینێکی کۆن هەیە و نووسراوە. (من سەنحاریبی پاشای ئاشوورم، سێ رووبارم لە شاخەکانی خانی لای بەرزاییەکانی شاری هەولێر -شوێنی خانمی پایەبەرز خوداوەندی عەشتار- هەڵکەندووە). شاخەکانی (خانی)یش دەروانە سەر دۆڵی بەستۆرە و هەردوو زنجیرە چیای خانزاد و سەلاحەدین لێکدی جیا دەکەنەوە. لەم پرۆژەیەدا هونەرێکی ئەندازیاری بەکارهاتووە، چونکە ئاستی بەستۆرە (٢٥) مەتر لە ئاستی ئەو زەوییە نزمترە کە

جۆگەکەی پێدا دەڕوا، بۆیە جۆگەکە لە شێوەی بنکۆڵ (تونێل) هەڵکەندراوە، هەروەها چەندین بیری یەک لە دوای یەکدی هەڵکەندراون و ئەو بیرانە لە سەر شێوەی کارێزن و دووری نێوانیان (٤٢) مەترە، کاتێ کە بناغەی (قوتابخانەی خانەقا) لە هەولێر دادەندرا شوێنەواری ئەم جۆگەیە دۆزرایەوە[١].

مامۆستا (زوبێر بیلال)یش دەفەرمووێ، پرۆژەی ئاودێری سەنحاریب -کە پاشای ئاشوور (٧٠٤ - ٦٨١ پێش زایین) بۆ ئاودانی ناوچەی هەولێر دروست کردووە - لە شێوەی چەند کارێزێک هەڵکەندراوە و ئاوی رووبار لە بەستووڕەوە بە درێژایی (٢٠) کیلۆمەتر بۆ دەشتی هەولێر دەبات و لەوێ کۆتایی پێدێت.

ئەو رووبارەی بەستووڕەش لە شاخەکانی سەفین و پیرمام و بانی باوەداغ هەڵدەقوڵێ، کە ئەو شاخە لای ئاشوورییەکان بە شاخەکانی خانی دەناسران. کونی جۆگەکەش دەکەوێتە نزیک گوندی مورتکە، کە نزیکەی (١٥٠) پێ لە ئاستی دەشتی هەولێر بەرزترە و ئەم کونە بریتییە لە دیوارێکی بەرز، درێژییەکەی (١٥) مەترە. ئەو کارێزەش، کە سەنحاریب هەڵیکەندووە لە کارێزە ئاساییەکان جیاوازی هەیە، چونکە کارێزی سەنحاریب لە شێوەی جۆگەیەک بوو بە ناو تونێلێکدا دەڕۆیشت و بە بەردەوامی ئاوی دەدایە بیرەکان. کارێزەکانی هەولێر لە کتێبی (معجم البلدان) ی (یاقووتی حەمەوی) باسیان کراوە.

(تاڤرنیە)ش لە گەشتەکەی خۆیدا لە سەدەی حەڤدەهەم سەلماندوویەتی، کە چەندین کارێز هەبووە و شینایییەکانی هەولێر پشتیان پێبەستووە، هەروەها کاپتن (های)، پشکێنەری کارگێڕی لە هەولێر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بەریتانیا، باسی ئەو کارێزانەی کردووە[٢].

بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەکان لە ساڵی (١٩٣٤) زانیاری لەسەر شوێنەوارە کۆنەکانی پرۆژەی سەنحاریب پەیدا کردبوو، بەڵام - ئەوکات - لە ساڵی ١٩٤٦ بایەخی بە بابەتەکە نەدا، واتە تا ئەوکاتەی بەردی سەنحاریب دۆزرایەوە. دوای ئەوە بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەکان لە ساڵی (١٩٤٧) بەڕێز (ئەحمەد حەققی) ناردە هەولێر بو ئەوەی وێنەی شوێنەواردکە بگرێ و راپۆرتێک لەبارەی ئەم شوێنەوارە بنووسێ، هەروەها دکتۆر (بوردان) ی راوێژکاری بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارە کۆنەکان توانی ناوی سەنحاریب لە نێوان ئەو هێمایانە بخوێنێتەوە، کە لەسەر بەرد هەڵکەندرابوو.

هەروەها دەستەیەکی دیکە لە شوێنەوارناسان، کە لە بەڕێزان فوئاد سەفەر و دکتۆر فەرەج بەعمەجی پێکهاتبوو، لە ساڵی ١٩٤٦ پارچە بەردێکیان دۆزییەوە بە خەتی بزماری لە سەری نووسرابوو، ئەو پارچە بەردە نووسراوەی پاشای سەنحاریب لە سەر رووباری بەستووڕە، نزیک گوندی مورتکەی هەولێر لەدوای خۆی بەجێهێشتبوو، بۆیەش ئەو دەستە شوێنەوارناسە راپۆرتێکیان سەبارەت بەو دۆزینەوەیان پێشکەش کرد[٣].

ئەو پارچە بەردەی دۆزرایەوە، بە چینێکی کلسی داپۆشرابوو. دوای پاککردنەوەو روونووسکردنی، دەرکەوت، کە (سەنحاریب)ی پاشای ئاشوورییەکان لە ساڵی (٧٥٠ - ٦٨١)ی پێش زایین فەرمانڕەوایی کردووە و ئەم جۆگەیەی دروست کردووە و ئاوی چیاکانی کۆکردووتەوە و بەرەو هەولێری هێناوە، هەروەها دەرکەوت کە، قەبارەی ئەو بەردەی بۆ دروستکردنی جۆگەکە بە کار هاتووە (٦٢- ٤٣ - ٨٠)سم بووە و درێژیشی نزیکەی (١٥) مەتر بووە.

لە سەر یەکێ لەو بەردانەش هەشت دێڕ نووسینی بزماری هەیە. ئاماژە بەوە دەکات: سەنحاریب ئەو پرۆژەیەی دروست کردووە و ئاوی گوندەکانی (سوسە) و (زیاردت) و (قیرژە)ی لە تەنگەبەری (دەربەند) کۆکردۆتەوە و ئەو ناوچانەش ئاو و کانی زۆر بووە و چەندین کێڵگەی فراوانی تاکە گوندی (دۆنگزاوە)ی ئاوداوە، کە هەندێ لەو ئاوە بۆ دۆڵی

بەستۆڕە دەڕوات، پرۆژەی (سەنحاریب)یش لە شێوەی چەندین کاریزدا بووە و هەولێر بۆ دەستکەوتنی ئاو پشتی پێبەستووە.

بەڵام جۆگەی بەستۆڕە پشتی بە چەندین کانی و ئاوی چیاکان دەبەست کە لە گوندی مورتکەوە بەرەو هەولێر دەهاتن، کە ئەم کانییانە لە شێوەی تونێلی ژێر زەویدا بوون و هەندێکیشیان لە سەر زەوی دیاربوون، ئەوەش لە بەر ئەوەی ئەو ڕێگایەی جۆگەکەی پێدا دەڕۆیشت بەرزی و نزمی و پێچاوپێچی هەبوو.

لە باشووری ڕۆژهەڵاتی گوندی (بەحرکە)ش واتە نێوان هەولێر و مورتکە - شوێنەواری دیکەی پرۆژەی سەنحاریب هەیە، چونکە گوندی مورتکە لە ئاستی دەشتی دەوروبەری هەولێر نزیکەی (١٥٠) پێ بەرزترە. ئەو بەرزی و نزمییەش بەسە بۆ ئەوەی جۆگەکە بەرەو هەولێر بڕوات. پانی جۆگەکەش بە گوێرەی ئاستی ئاوەکە دەگۆڕێ، ئەوەش بەڵگەیە لە سەر کارامەیی ئەندازیاری ئاشووری بۆ ئەوەی تیژی ئاوەکە جۆگەکە تێکنەدات و هەروەها لە هەردوولای جۆگەکە بەنداوی خۆڵ دروست کراوە، ئەوەش بۆ ئەوەی جۆگەکە لە ڕامالین و تێکچوون و ڕووتانەوە بپارێزرێ.

بۆ کۆکردنەوەی ئاوەکانیش لە جۆگەکەدا، لە دۆڵی بەستۆڕە بەنداوێکی نزم هەیە کەمی ئەو بەنداوە هیچ شوێنەوارێکی نەماوە، بەڵام (٢٠٠) بەردی گچکە لە بەستۆڕە لە دووری کیلۆمەترێک لە جۆگەکە هەر ماوە[٤].

جۆگەی بەستۆڕە یەکێکە لەو شوێنەوارانەی بەڵگەیە لە سەر چەندێتی بایەخدانی پاشای ئاشوورییەکان بە شاری هەولێر، بەتایبەتیش بایەخدانیان بەلایەنەکانی تەلارسازی و ئاوەدانکردنەوە و پێویستییەکانی ئاو بۆ ئەم شارە...

پرۆژەی (سەنحاریب)یش لە ساڵی ٦٩١ - ٦٩٠ پێش زایین لە هەولێر تەواو کردووە، ئەو ساڵەش هەمان ساڵە، کە پاشا (سەنحاریب) پرۆژەیەکی دیکەی لە (نەینەوا)ی پایتەخت ئەنجامداوە، کە لە زێی گەورە ئاوی ڕووباری کومل - خازەری ڕاکێشاوە، پاشان جۆگەی بەعشیقە و شێخانی دروست کردووە، کە درێژایی (٥٠) میلە. هەروەها هەر سەبارەت بە پرۆژەی بەستۆڕە، چەند گوندێکی بەناوبانگی وەک (بەحرکە، مورتکە)ی دەکەوێتە سەر، لە گوندی بەحرکەش کانییەکی ئاو هەیە ئاوەکەی لە شێوەی دەریاچەیەکی بچووک کۆ دەبێتەوە... تۆژەری ناسراوی عێراقی (گۆرگیس عەواد) لەبارەی (بەحرکە) دەڵێ: ناوی ئەو گوندە لە بچووککردنەوەی (بەحر) هاتووە، چونکە (کە) لە زمانی کوردیدا نیشانەی بچووککردنەوەیە[٥].

کاریزو جۆگەکان لە کۆنەوە ڕۆڵێکی باڵایان لە ژیانی گوندو شارەکاندا هەبووە هەروەک ئەمە لە شاری هەولێر بە ڕوونی دەردەکەوێ، چونکە ئەم کاریزانە وەک سەرچاوەیەکی سەرەکی ئاو لە لایەن دانیشتووان بە کارهێنراون.. هەندێ لە تۆژەرەوەکانیش باسی ئەوە دەکەن، کە هێشتا نزیکەی (٢٠) کاریز لە دەشتی هەولێر هەیە، هەر ئەو کاریزانەش بوونەتە هۆی ئەوەی هەولێر لە چاخە جیاجیاکاندا هەر پڕ دانیشتووان بێت و دوژمن و داگیرکاران نەیانتوانیوە ئەو شارە وێران بکەن، هەروەک شارەکانی دیکەی عێراقیان وێرانکردووە[٦].

## سەرچاوەکان

١- حدياب اربلا... عشتار اربلا بقلم فؤاد جميل، مجلة سومر، الجزء الأول لسنة ١٩٦٩
٢- زبير بلال اسماعيل. كهاريز اربيل. مجلة الحكم الذاتي، العدد ٣ لسنة ١٩٨٢
٣- مجلة سومر، العدد الاول، الجزء الثاني ١٩٤٦.
٤- مجلة سومر، المجلد الاول، لسنة ١٩٤٩.
٥- كوركيس عواد. نبذة تاريخية حول اسماء الامكنة العراقية، مجلة سومر، الجزء الثامن ١٩٥٣
٦- زبير بلال اسماعيل. قناة باستورة، مجلة كاروان العدد ١٧ لسنة ١٩٨٤

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر - ژمارە ١٦ی پایزی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.**



# پڕۆژەی ئاوی هەولێر

مەغدید حاجی

**پێشەکی**

یەکێک لە مەرجە بنەڕەتییەکانی بەردەوامبوونی ژیان و ئاوەدانی بۆ نزیک حەوت هەزار ساڵ لە شارێکی وەکو هەولێردا بێ شک بوونی ئاوە. ئیتر بۆ خواردنەوە بووبێ یان بۆ پێویستییەکانی تری ژیان و ژیانی ئاژەڵ.

نە رووبارێک یان ئاوێکی تری سروشتی سەر زەوی بەلای شاری هەولێردا تێناپەڕێ و رەت نابێ[1]. بەڵام ئەم شارە - قەڵایە لە سەرەتای بونیادنانییەوە دەوروبەری پێنج هەزار ساڵی پێش زایینی تاکو ئێستا هەمیشە هەر بە ئاوەدانی ماوەتەوە، لەم رووەوەش بەکۆنترین شار لە گێتیدا دادەنرێت و لە گەلێک چەرخی مێژوویی و سەردەمدا بۆتە پایتەخت و شاری گەورەو گرنگ و سەرەکی هەرێمەکە.

جا دەبێ گیروگرفتی نەبوونی ئاو و کەم ئاوی لە گشت کات و سەردەمێکدا بەهەر جۆرو شێوە چارەسەر کرابێت و پڕۆژەی ئاودێری بۆ شارەکە دروست کرابێت و بیری تایبەتی ئاو خواردنەوە لەسەر قەڵاکە و دەشتەکەی دەوروبەریدا بەتایبەتی لە شوێنی ئاوەدانی هەڵکەندرابێت و پشت بە ئاوی کارێزەکانەوە بەسترابێت و بەهۆی تایبەتییەوە ئاوی خواردنەوە و بەکارهێنان بۆ قەڵاو شارەکە گوازرابێتەوە.

ئێمە لەم باسەماندا لە رووی مێژووییەوە لەبارەی ئاوی شاری هەولێرو پڕۆژەکانی ئاوی شارەکە لە چوارچێوەی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەدوێین:

١- یەکەم پڕۆژەی ئاوی هەولێر لە مێژوودا (مەبەست لەپڕۆژەکەی سەنحاریب)ە.
٢- بیرە ئاوەکانی شاری هەولێر.
٣- کارێزەکان وەک سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئاوی شارەکە.
٤- هەردوو پڕۆژەی ئیفراز بۆ ئاوی هەولێر، یەکەم و دووەم.

بەڵام بەر لەوەی بچینە سەر ئەم خاڵانەی سەرەوە، پێویستە

هەڵوەستەیەک بەلای شوێن و ئاو و هەوای شارەکەدا بکەین و چەند راستییەک لەم دوو رووەدا بخەینە بەر چاو.

**شوێنی شارەکەو چەند راستییەک**

شاری هەولێر دەکەوێتە نێوان هێڵی پانی (٤٥,٣٥-٣٧) و هێڵی درێژی (٤٣-٤٥) لە باکووری عێراقداو شارێکی گەورەو سەرەکی ناوەراستی هەرێمی کوردستانە..

هەروا شارەکە دەکەوێتە ناوەندی ناوچەیەکی بەپیت کە لەسەر رووی بانێکی[٢] پان و بەرین هەڵکەوتووە و ئەم بانەیش دەوروبەری (١٣٠٠) پێ لەئاستی رووی دەریا بەرزترە و هێڵی دابەشکردنی ئاو بەسەر هەردوو رووباری زێی گەورەو زێی بچووک لە ناوچەکەدا پێک دەهێنی.

دەشتاییەکەی دەوری قەلای هەولێریش بە (١٣٣٢) پێ لەئاستی رووی دەریا بەرزترە[٣] بەرزی قەلاکەش جگە لەبەرزی خانووەکانی دەوروبەری ٢٥ مەتر دەبێت.

شاری هەولێر لەکۆنەوە وەکو مەلبەندێکی ستراتیژی گرنگ لە بوارەکانی رامیاری و سەربازی و بازرگانیدا بایەخی خۆی پاراستووە و ناوی بە گەلێک هەرێم و ناوچەی جیهانی کۆن و نوێدا بلاوبۆتەوە و لەیاد نەکراوە.

ئێستاکەش هەولێر مەلبەندی هەرێمی کوردستانی عێراقە و شارێکی نیمچە پێشکەوتووی فرە ئاوەدان و بەرفراوانەو زانکۆیەک و بە دەیان دامودەزگای گەورەی دەوڵەت و دامەزراوەی پیشەسازی و قوتابخانەی هەمە جۆرو بەدەیان گەرماوی گشتی و بە سەدان مزگەوت و شوێنی حەسانەوەو خەوتن و چێشتخانەی تێدا کراونەتەوە.

ژمارەی دانیشتووانی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٨٤ دا بەگوێرەی زانیاری ئاماری پارێزگای هەولێر(٣٠١٣٢٥) کەس بووە، کە دەوروبەری (٥٤٨٤٧) خێزان پێک دەهێنن[٤].

لە هەمان کاتدا ژمارەی هەموو پارێزگای هەولێر(٦٧١٤٠٥) کەس دەرچووە! رووبەری شارەکەش (٤٤)کم٢ ئێستاکە، لە ١٩٨٤ دا بەرێوەبەرایەتی ئاو و زێرابەکانی پارێزگای هەولێر ئاوی خواردنەوە و بەکارهێنان (پاک کراوە) بەهۆی:

١- دوو پرۆژەی ئاو کە تێکرای بەرهەمیان (٢٣٠٠٠) گالۆنە لە رۆژێکدا.

٢- (١٢٧) بیر کە تێکرای بەرهەمیان (١٥٦٠٠) گالۆنە لە دەقیقەیەکدا (٥) بەسەر (٥٥١٦٥) بەشداربوودا لە شاری هەولێر دابەش دەکات.

**ئاووهەوا**

وڵاتی عێراق بە تێکرایی ئاو و هەوایەکی قارەیی نیمچە مەداری هەیە (٧)، هاوینی گەرم وشکەو زستانیشی سارد و باراناوییە. رژێمی باران بارینیشی لە ئاوو هەوای ناوچەی دەریای سپی ناوەراست دەچێت. بەڵام لە ئەنجامی:

١- جیاوازیی دووری شوێنەکانی وڵات لە کار تێکردنی دەریا.

٢- جیاوازیی رووی ناوچەکانی وڵاتەکەمان لە بەرزی و نزمیدا.

٣- جیاوازیی شوێنەکانی عێراق بەگوێرەی هێڵی ئیستیواوە.. ئاووهەوای عێراق بۆ سەر سێ ناوچەی جیاواز دابەش کراوە:

ا- ئاووهەوای ناوچەی چیا (دەریای سپی ناوەراست).

ب- ئاووهەوای ناوچەی زوورگ.

ج- ناوچەی باشوورو بیابان.

ئاووهەوای شاری هەولێر و دەورو بەرەکەی لە چوارچێوەی ئاووهەوای گەرمەسێر و ناوچەی زوورگدا خۆی دەنوێنێت، کە دیاردەکانی ئەمانەن[٨]:

١- ئاووهەوایەکی تێکەڵە لە نێوان ئاووهەوای ناوچەی دەریای ناوەراست و ئاووهەوای ناوچەی باشوور.

٢- رادەی ئەو بارانەی لێی دەبارێت لە نێوان (٢٠٠-٤٠٠)ملم دایە.

٣- پلەی گەرمی مام ناوەندییە.

لە باشووری عێراقەوە چەند بەرەو باکوور هەوراز بینەوە، باران پتر دەبارێت و گەرمیش نزمتر دەبێتەوە..

لەکاتێکدا ناوچەکانی باشوور لە زستاندا کەمتر لە (٢٥٠)ملم بارانیان تێدا دەبارێت، لە هەرێمی باکوور رادەکە. دەگاتە نێوانی (٢٥٠-١٠٠٠) ملم.

سەرەرای ئەم جیاوازییەی سەرەوە دیاردەیەکی تریش سەر هەڵدەدا، ئەویش ئەمەیە باران بارین لە هەموو ساڵێکدا وەک یەک نییە،

هەندێ ساڵ بە بارانەو بەفری زۆریش لە ناوچەی چیا دەبارێ. ساڵی واش هەیە دەبێتە وشکەتی و گەلێک کەم باران دەبارێت. ئەم جۆرە جیاوازییە کارێکی راستەوخۆ دەکاتە سەر شاری هەولێر کە یەکەم: لە کشتوکاڵدا پشت بە ئاوی باران دەبەستێ (دێم). دووەم: دانیشتووانەکەشی بۆ خواردنەوەو بەکارهێنان و سەوزە چاندندا پشت بەئاوی ژێر زەوی دەبەستن. ئەم جۆرە ئاوەش لەئەنجامی ساڵی بە بەفرو باران زۆر دەبێت، ساڵی کەم باران و وشکەتیش لە کەمی دەدات وەکو ساڵی ١٩٨٤.

ئاشکرایە کە ناوچە شاخاوییەکانی هەورازی شاری هەولێر تا چیا بەرزەکانی سەر سنوور وەبەر ئاووهەوای ناوچەی دەریای ناوەراست دەکەون کە لە زستان و بەهاراندا بەفرو بارانیان بەچڕی و زۆری لێ دەبارێت و ئەمەش هەروەکو لە خاڵەکانی تری باسەکەماندا روونی دەکەینەوە دەبێتە هۆی زۆربوونی ئاوی ژێر زەوی شاری هەولێر و دەشتەکەی دەوروبەری.

### یەکەم پرۆژەی ئاوی هەولێر لە مێژوودا

کۆنترین پرۆژەیەکی مەزنی گەیاندنی ئاو بۆ قەڵای هەولێر بۆ سەردەمی ئاشوورییەکان (٢٥٠٠-٦١٢ پ ز) دەگەڕێتەوە. شا سەنحاریب کە یەکێک بووە لە شایە بە دەسەڵاتەکانی دووەمین ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان و لە ماوەی نێوان (٧٠٥-٦٨١ پ ز) فەرمانڕەوا بووە. ئەم پرۆژەیەی دروست کردووە، بۆیە لە مێژوودا بەپرۆژەی سەنحاریب بۆ ئاودانی شاری هەولێر ناسراوە[٩].

### دەوڵەتی ئاشوورییەکان و شا سەنحاریب

ناوی ئاشوورییەکان لە وشەی (ئاشوور) دوە وەرگیراوە، (ئاشوور)یش خواوەندێکی نەتەوەیی ئاشوورییەکان بووە.

هەروەها ئەم ناوە لەکۆنترین شارێکی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەوە نراوە کە ئێستاکەش کەلاوەکانی ئەم شارە لە (قەڵای شەرقات)ەوە ماون.[١٠]

نیشتمانی ئاشوورییەکان کەوتبووە هەردوو لای راست و چەپی رووباری دیجلە، لەباکوورەوە لەهێڵی پانی (٣٧)ەوە دەستی پێدەکرد تا کۆتایی رووباری عزێم لەباشوور، چیا بەرزەکانیش سنووری باکوورو رۆژهەڵاتی دەوڵەتەکەیان پێک دەهێنا و لە باشوور و رۆژئاواش تخووبێکی سروشتی نەبووە بە گوێرەی هێز و توانای رامیاری و سەربازییان لە گۆڕاندا بووە!.

ئاشوورییەکان هەر لە کۆنەوە لەم ناوچەیە ژیاون و شارستانییەتییەکەشیان لە سۆمەرییەکانەوە وەرگرتووەو دەورو بەری دوو هەزار ساڵیش بەر لە زایین بەدواوە دەوڵەتێکی سەربازییان پێک هێناوە. ئەم دەوڵەتەش هەندێک کاتی بێ هێزی لێ دەرچێ پەردی سەندووەو وای لێ هاتووە ببێتە ئیمپراتۆریەتێکی مەزن و بەدەستەڵات لە رۆژهەڵاتدا[١١].

بەڵام لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی بەر لە زاین ئەستێرەی دوا ئیمپراتۆری ئاشوورییەکان کەوتۆتە لێژی و لە باشوور بابلییەکان و لە رۆژهەڵاتیش دەوڵەتی مادیەکان - میدیا- تەنگیان پێ هەڵچنیوە و بۆ لەناوبردنی و دەستبەسەراگرتنی هەرێمەکە یەکیان گرتووە.

لە ساڵی ٦١٢پ. ز دا هەردوو دەوڵەتە هاوپەیمانەکە هێرشێکی توندیان کردۆتە سەر پایتەختی سەرەکی ئاشوورییەکان کە شاری نەینەوا بووە و توانیویانە سەنگەرەکانی بەرگری ئاشوورییەکان تێک بشکێنن و پایتەختەکە داگیر بکەن و وێرانی بکەن..

لە هەمان کاتیشدا شاری هەولێر کەوتووتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی میدیاوە لەوێرانکردنیش رزگاری بوو. لەوانەیە شوێنە ئاینییە پیرۆزەکەی ئەم شارە لەلایەن لەشکری بەهێزی میدیاوە رێزی لێوە گیرابێت و لە وێران کردنیان پاراستبێت[١٢].

بەم شێوەیە ناوچەکانی باکووری ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری لە ناوچوو، بەردەوڵەتی میدیا کەوتووەو سووریا و فەلەستین و باشووری دۆڵی رافدێن و وڵاتی عیلامیش کەوتوونەتە ژێر رکێف و دەسەڵاتی بابلییەکان.

شەمس ئەدەدی پێنجەم یەکێک بووە لە شایەکانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری و لە ساڵانی (٨٢٣-٨١١ پ ز) فەرمانڕەوا بووە، لە نووسینەکانیدا هاتووە (کە هەولێر شارێکی ئاوەدان و پێشکەوتووە)[١٣].

سەردەرای پێشکەوتنی ئەم شارە

لە رووی شارستانی بیناسازییەوە، بنکەیەکی سەربازیی گرنگی ئاشوورییەکان بووەو لێرەوە هێرشیان بردۆتە سەر ناوچەکانی تری رۆژهەلآت.

هەروەها ئاشکرایە کە هەولێر مەلبەندێکی گرنگ بووە بۆ پەرستنی خواوەندی گەورە و بەناوبانگ (عەشتار) و بە (عەشتار ئەربیلا) ناسراوە تاکو لەگەلّ (عەشتار نەینەوا) جودا بکرێتەوە.

لە نووسینە بزمارییەکانیشدا پەرستگای عەشتار لە شاری هەولێر بە ...ئای - کشان - کلاما- ناسراوە، کە ماناکەی بەزمانی سۆمەری کۆن (مالّی گەورەی ناوچەکە دەگەیەنێت). سەرەرای ئەم بۆچوونانەی سەرەوە گەلێک بەلّگەی تریش کە لێردا بواری باسکردنیانمان نییە، پرۆژەکەی سەنحاریب بۆ ئاوی شارەکە بەلّگەیەکی نەمرو یەکلاکەرەوەیە بۆ دەرخستنی بایەخ و گەشانەوەی شاری هەولێر لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا.

شا سەنحاریب لە مێژوودا بە کردەوە مەزنەکانییەوە لە بوارەکانی جەنگ و پەرەپێدانی زانست و شارستانێتیدا ناسراوە.

کە سەرجونی دووەمی باوکی لە سالّی ٧٠٥ پ. ز کۆچی دوایی کرد، زۆربەی ناوچەکانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری تووشی شۆرش و هەلّگەرانەوە بوون لەدژی دەولّەتی ناوبراودا و هەندێ لاشیان لەگەلّ دوژمنی شای ئاشوور رێککەوتبوون بۆ بێ هێزکردنی دەسەلآتی ئاشوورییەکان وەکو هەردوو دەولّەتی (عیلام) و (میسر).

بۆیە سەنحاریب ناچار بووە سالّەکانی یەکەمی دەسەلآتداریتییەکەی بۆ کاروباری جەنگ تەرخان بکات و سەرپێچیکەران بگێرێتەوە ژێر دەسەلآتی ئیمپراتۆرییەتەکەی.

هێرشەکانی سەنحاریب گەیشتۆتە دۆلّی نیل لە رۆژئاواو ولآتی عیلام لە رۆژهەلآت و (ترشوس)، شارەکانی دیکەی ئاسیای بچووک لەباکوورو نۆکەندی بەسرەو شارەکانی دیکەی کەنداوی عەرەب لە باشوور.. شای سەبەئیش کە ناوی (کریبی - ئیلو) بووە دانی بەدەسەلآتی بەرفراوانی سەنحاریب ناوە و بەنرخترین دیاری بۆ ناردووە[١٥].

بەلآم وێرانکردنی شاری بابل و هێرشە توندەکانی بۆ سەر فەلەستین کە ترس و مردنی بەسەر هەردوو ناوچەکە باراند، بەلّگەیەکە، مێژوو لەدژی سەنحاریبی تۆمار کردووە. ئەگەرچی هەندێک لە مێژوونووسان پاکانەی بۆ دەکەن و سەرزەنشتی دانیشتووانی ئەو کاتی بابل و فەلەستین دەکەن کە بەتوندی بەرووی هێرشەکانی سەنحاریب وەستاونەتەوە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەم شایە توندییان لە بەرامبەردا بنوێنێت، چونکە وەکو هەر داگیرکەرێکی بەدەسەلآتی سەردەمەکانی دێرین ویستوویەتی بەهەر شێوەیەک بێت لەسەر حیسابی سەربەخۆیی هەرێم و دەولّەتە بچووکەکانی دەوروبەری ئیمپراتۆرییەتەکەی بەهێزو فراوان بکات.

سەنحاریب بایەخێکی تایبەتی بە پەرەپێدانی شارە سەرەکییەکانی دەولّەتەکەی داوە، وەکو شاری نەینەوا کە کردوویەتی بە پایتەختی یەکەمی دەولّەتە مەزنەکەی. بەر لەم شارە، شاری (دور شروکین) کە ئێستا بە خرساباد ناسراوە، پایتەختی ئیمپراتۆرییەتە گەورەکەی ئاشوورییەکان بووە، بەلآم لەدوای مردنی شا سەرجونی دووەم (باوکی سەنحاریب) شاری نەینەوای بینا کردووەو پایتەختی بۆ گواستۆتەوە.

لەم سەردەمەدا (٧٠٥- ٦٨١پ. ز) نەینەوا بەخانوو، کۆشکی نایاب، پەرستگاو شەقامی چاککراو و باخچەی رازاوە ئاوەدان کراوەتەوە، بە دووری (٥٠) میل لە رووباری (کومل)ەوە بەهۆی پرۆژەیەکی ئاوەدانی مەزنەوە ئاوی بۆ راکێشراوە.[١٦]

## دۆزینەوەی پرۆژەکەی سەنحاریب لەدەم بەستورەدا

لە سالّی ١٩٣٢ دا بۆ یەکەم جار بەرێوەبەرایەتی شوێنەواری موسلّ بەنیازی بەرزکردنەوەی راپۆرتێک لەبارەی شوێنەواری نۆکەندەکەی سەنحاریب بۆ وەرگرتنی چەند وێنەیەکی نێردراوێکیان ناردۆتە هەولێر[١٧].

دکتۆر یوردان کە راوێژکاری دەزگای شوێنەوارە گشتییەکان بووەو لەگەلّ ئەو نێردراوەدا چوونەتە سەردانی شوێنەکە و توانیویەتی ناوی سەنحاریب لەناو ئەو هێمایانە جیا بکاتەوە کە لەسەر بەردێکی پرۆژەکەدا نەخشێنراون.[١٨] بەلآم لەئەنجامی داپۆشرانی رووی بەردە

لەسەر نووسراوەکە بە گەچ و خڵت و لیتە هەموو هێما نەخشێنراوەکانیان بۆ نەخوێندراوەتەوە، ئەمەش لەلایەکی دیکە دەسەلمێنێ کە بەر لەو کاتە کەسی دیکە یا هیچ دەزگاو شوێنەوارناسێکی دیکە بەم شوێنەوارەیان نەزانیوەو لێیان نەکۆڵیوەتەوە. یەکەم دەستەی شوێنەوارناسیش لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦ دا ئەم بەردەیان خاوێن کردۆتەوەو نووسینەکەیان کۆپی کردووە(١٩).

لە ساڵی ١٩٤٦ لە دوای ڕاگەیاندنی تەسویەی زەوی و زاری دێهاتەکانی قەزای مەڵبەندی هەولێر، پشکێنەرەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەکان هەڵساون بەسەردانێکی تایبەتی شوێنەواری پرۆژە مەزنەکەی سەنحاریب بۆ ئاودانی شاری هەولێر. ریزە دیوارە بەردینە پشتگرەکە - مسناە- و کوناوەدەر- نفق- ە کەیان لە نزیک گوندی قەلەمورتکە(٢٠) لە دەم ڕووباری بەستۆڕەدا بینیون. بۆیە لە ڕێکەوتی ١٩٤٦/٥/١٤ دا ڕاپۆرتێکیان لە بارەیەوە بەرز کردۆتەوە.

لەدوای دیراسەکردنی ڕاپۆرتەکە کە هەمان دەزگای ناوبراو دەستەیەکی پسپۆری تایبەتی ناردۆتە شوێنەکە و بەرێکوپێکی و دروستی لەم شوێنەوارە دێرینە بەنرخەیان کۆڵیوەتەوەو بۆ یەکەم جاریش مامۆستای شوێنەوارناس (فوئاد سەفەر) لە هەردوو بەرگی دووەم و سێیەمی گۆڤاری (سومر) ڕاپۆرتێک و لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی بە هەردوو زمانی ئینگلیزی و عەرەبی لە سالانی (١٩٤٦- ١٩٤٧) دا لە بارەیەوە بڵاو کردوونەتەوە و بابەتەکانیشی کە پێشەنگن لەم ڕووەوە بە چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی پاشماوەی دیوار و کوناوەدەری پرۆژەکە لەگەڵ نەخشەیەکی گەورەو فراوانی ناوچەی نۆکەندەکە دەولەمەند کردوون.



وێنەی ژمارە (٩)

## چۆنییەتی دروستکردنی پرۆژەکە:

لە هەردوو لای نۆکەندە ژێرزەمینییەکەی دەم ڕووباری - دۆلی- بەستۆڕە بەلای شاری هەولێرەوە (ڕۆژئاوای) لە نزیک گوندی قەلەمورتکە باکووری شاری هەولێر دیوارێکی بەردین دروست کراوە. ئەم دیوارە شەش ریزەو بە بەردی حەلان ڕێک و جوان داتاشراو و دروست کراوەو تێکڕای قەوارەی هەر بەردێکیش (٦٢×٤٣×٨٠سم) دەبێت.

ئەم دیوارە پشتگرە - مسناە- کە بەرەو ڕووی ڕێڕەوی ئاوی ڕووبارەکە دروست کراوە بۆتە هۆی پاراستن و ڕاگرتنی لای گردەکەو سەر دەرگای نۆکەندەکە لە ڕووخان و دارمان و نەگیرانی بەردەم پرۆژەکە. وەنەبێ ئەم دیوارەش سەرلەبەر یەک ریز درێژ بووبێتەوە بەڵکو کوناوەدەرێک(٢١) لە ناوەڕاستدا لای دەستە ڕاستی لەلای دەستە چەپی جیا دەکاتەوە.

هەروا وا پێدەچێ ئەم دیوارە شۆستەیەکی لە بەرد دروستکراوی لە بەردەمدا هەبووبێت. بەڵام دیارە ئاوی بەستۆڕە بە درێژایی ڕۆژگار بەردەکانی ئەم شۆستەیەی مالیون و تەنیا کەمێک شوێنەواری ماوەتەوە.

شوێنەوار ناسەکان وای بۆ دەچن



کە لە بەرامبەر دەرگای نۆکەندەکە لەناو رووباری بەستۆڕە بەربەستێک بۆ گلدانەوەی ئاو بە تایبەتی بۆ کەژی هاوین دروست کرابێت. تاکو ئاوە گلدراوەکە بە ئاسانی ڕژابێتە ناو نۆکەندەکەو ئەوەی زیادیش بووبێت بەسەر بەربەستەکە تێپەڕیوە.

دروستکردنی ئەم جۆرە بەربەستانەش لە سەردەمی ئاشوورییەکان باو بووە و نموونەی دیکەیش بەستەکەی ناو رووباری (کرمل)، لای دەرگای نۆکەندەکەی دیکەی سەنحاریب بۆ ئاوەدانی شاری نەینەوا[٢٢]. شوێنەوارێکی ئەوتۆی ئەم بەستەی ناو بەستۆڕەمان بۆ بەجێ نەماوە، بەڵام دووسەد بەردێک بە پەرتوبڵاوی لە شوێنەکەداو هەندێکشیان لەدووری کیلۆمەترێک لە دووری دیوارەکە دەبینرێن. دیارە ئەم بەربەستەش لەسەرووی رۆژئاوای دیوارەکە دروست کراوە چونکە بەردەکان هەموویان کەوتوونەتە ئەملایەوەو هیچ کۆمەڵە بەردێک بەم شێوەیە لەلایەکی دیکەدا بەدی ناکرێت.

شوێنی دەرگای نۆکەندەکە بەناو بەستۆڕەدا بە (٢٠)م لەئاستی زەوی لای رۆژئاوای نزمترە، جا نۆکەندەکە لەنێوان بەستۆڕە و شاری هەولێر - کە شاریش لەو کاتەدا تەنیا بریتی بووە لە قەڵاو قەڵاکەش ئەوەندەی ئێستا بەرز نەبووە[٢٣] بەشێوەی کارێزەکان دروست کراوە. تاکو چلەکانی ئەم سەدەیەش کە لە شوێنەوارەکە کۆڵراوەتەوە شوێنەواری بیرەکانی ئەم پرۆژەیە لەنێوان سەرەتاکەیدا لە دەم بەستۆڕەو گوندی بەحرکەدا بەدی کراون، نێوان هەردوو بیریش (٤٢-٥٠) مەتر بووە، بێ گومان ئەم بیرانەش بۆ خاوێن کردنەوەی لەغەمەکەو هەوا هەڵمژین بەوێنەی کارێزەکان لێدراون.

بەڵام ئەوەی شێوەی راکێشانی نۆکەندەکەی سەنحاریب لەکارێزەکان جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە سەرچاوەی ئاوی نۆکەندەکە ئاوی رووباری بەستۆڕەیە، کەچی ئاوی کارێزەکان بریتییە لە ئاوی ژێر زەوی.

نۆکەندەکە تا سەر بەگوێرەی سیستەمی کارێز هەڵکەندن دروست نەکراوە، بەڵکو لەدۆڵایی و شوێنە نزمەکاندا وەکو جۆگەلە ئاوێکی سەر زەوی بەسەر زەویدا تێپەڕیوە، بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەش شوێنەوارناسەکان لە چلەکانی ئەم سەدەیەدا لە خوارووی رۆژهەڵاتی گوندی بەحرکە کەکەوتۆتە، نێوان هەولێر و قەلەمورتکە شوێنەواری جۆگەیەکی بەرینی دێرینیان دۆزیوەتەوە.

ئاشکرایە کە زەوی ناوچەی پارێزگای هەولێر لە باکووری رۆژهەڵاتەوە بەرەو خوارووی رۆژئاوا بەرەبەرە نزمتر دەبێتەوە راستی گوندی قەلەمورتکەش بە ١٥٠ پێ لە دەشتەکەی دەوری شاری هەولێر بەرزترە، جا ئەم سەرەولێژییە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئاوی نۆکەندەکە لەناوچەی هەڵقولانیدا بێ گرێ بەرەو شاری هەولێر شۆڕبێتەوە و بگاتە ناوەڕاستی شارەکە واتە سەر قەڵا هەر وەکو سەنحاریب لە نووسینەکەیدا دەڵێ ئاوەکەم گەیاندۆتە ناوەڕاستی شاری ئەربائیللۆ.

ناو دەرگای نۆکەندەکە (کوناوەدەرەکە)، بەبەرد ولم و قوڕ و زیخ پڕبۆتەوە کە رووباری بەستۆڕە بەدرێژایی زەمانە لەگەڵ ئاوەکەیدا رایماڵیون. بەڵام شوێنەوارناسەکان لە کاتی لێکۆڵینەوە و پشکنینەکانیاندا خاوێنیان کردۆتەوە، دەرکەوتووە لەشێوەی چوارگۆشەیەوە نزیکەو بەرزی ١٢٠ سم ب ١١٢ سم بەرینە و تا شەش مەتر قووڵایی هەردوولا دیوار و سابیتەکەی (سقف) بەبەرد دروست کراوە. زەوییەکەشی بە تاتە بەرد تەخت و رێک کراوە. لەدوای ئەم شەش مەتردا بەرینییەکەی

فراوانتر دەبێت تاکو دەگاتە ٢٧٠سم. بەڵام جگە لەبەرزی ٥٠سم چیدیکە دیوارەکانی بەبەرد هەڵنەنراون و سابیتەکەش بەشێوەی سروشتی ماوەتەوە.

بەرەبەرە فراوانکردنی ناو جۆگە ژێرزەمینییەکە شارەزایی ئەندازیاری ئاشووری دەسەلمێنێت کە ویستوویەتی لە ئەنجامی تەوژمی ئاودا لا دیوارەکانی ناو نۆکەندەکە نەڕووخێن و بەری ئاوەکەش نەگیرێت.[٢٤] لە هەردوولای دەرەوەی نۆکەندەکەشدا دوو کون هەن کە جێگای ڕاگرتنی دەرگای ڕێکخەری ئاوەکە دەنوێنن.

لێرەدا ئەمە ماوە کە بڵێین، ئەگەر بێتو بەراوردێ لە نێوان درێژی پرۆژەکەی سەنحاریب و کارێزەکانی ناوچەی هەولێردا بکەین، مەزنی پرۆژەکەمان بۆ دەردەکەوێت.

**نووسینەکەی سەنحاریب**

لە سێیەمین ریزی دیواری پرۆژەکەداو لەسەر شەشەمین بەرد، بەلای دەستەچەپی دەرگای نۆکەندەکە شا سەنحاریب، بە هەشت دێڕ نووسینی بزماری ناوی پرۆژەکەی خستۆتە مێژووەوە و بۆ نەوەکانی دوارۆژی پاراستووە.[٢٥]

سەنحاریب بەهۆی نووسینەوە ئاگەدارمان دەکاتەوە کە ڕێڕەوی سێ ڕووباری لە چیاکانی خانی[٢٦] هەڵکەندووە ئاوەکەیانی لە دۆڵی بەستوورەدا کۆ کردۆتەوە لەویشەوە نۆکەندێکی[٢٧] ڕاکێشاوەتە ناو شاری هەولێر.

نووسینی سەنحاریب لەسەر بەردێکی پرۆژەکەدا



من سەنحاریبم، شای جیهان و وڵاتی ئاشوور، سێ ڕووبارم لە چیاکانی خانی هەڵکەندوون، ئەو چیایانەی کەوتوونەتە هەورازی شاری هەولێرەوە ئاوی کانیاوەکانی لای دەستە چەپ و ڕاستی ڕووبارەکانیشم کردۆتە ناویانەوە. ئینجا نۆکەندێکم تا ناوەڕاستی شاری هەولێر نیشتمانی خواوەندی گەورەو مەزنان ئەشتار هەڵکەندووە و ئاوەکەیشم ڕاست هێناوە.

ماموستای شوێنەوارناس (فوئاد سەفەر) لەکاتی خۆی نووسینەکەی سەنحاریبی کۆپی کردووەو وەری گێڕاوەتە سەر هەردوو زمانی ئینگلیزی و عەرەبی.[٢٨] وا ئێمەش لێرەدا بۆ یەکەمین جار دەقی ئەم نووسینە وەردەگێڕینە سەر زمانی کوردی: «من سەنحاریبم، شای جیهان و وڵاتی ئاشوور، سێ ڕووبارم لە چیاکانی خانی هەڵکەندووە، ئەو چیایانەی کەوتوونەتە هەورازی شاری هەولێرەوە، ئاوی کانیاوەکانی لای دەستە چەپ و ڕاستی ڕووبارەکانیشم کردۆتە ناویانەوە. ئینجا نۆکەندێکم تا ناوەڕاستی شاری هەولێر: «نیشتمانی خواوەندی گەورەو مەزنان ئەشتار هەڵکەندووە و ئاوەکەیشم ڕاست هێناوە». - شایەنی باسە ئەم بەردە لە سەر



تابلۆی پرۆژەی سەنحاریب

نووسراوە دێرینە لە ساڵی ١٩٩٦ دزراوە-

دیارە مەبەستی سەنحاریب لە چیاکانی خانی شاخەکانی هەوراز دەشتی هەولێرە، ئەو شاخانەی کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی رووباری بەستۆرە و بریتین لە چیاکانی سەفین و پیرمام و بنەباوی.

ئەو رووبارانەیش کە هەڵی کەندوون ئاوی سەرچاوە و کانیاوەکانی لای راست و چەپیانی تێ کردوونە بریتین لە لقە رووبارەکانی سووسێ و زیارەت و قیرژە ئەم سێ لقە رووبارە بەر لەدەربەند یەک دەگرنەوە رووباری دەربەند پێک دەهێنن و ئینجا ئەم رووبارە دەرژێتە ناو دۆڵی بەستۆرە و رووباری بەستۆرە پێکدێت کە ئەمیش لە کۆتاییدا لە زێی گەورە دەکاتەوە.

ئەم رووبارانەی ناومان بردن لە زستان و بەهاراندا ئاویان زۆرە بەڵام لەهاویندا لەکورتی دەدەن. گوندەکانی ئەم ناوچەیەش وەکو (سووسە، زیارەت، خۆران، قیرژە، هەنارە) ئێستاکە لە کشتوکاڵدا پشت بەناوی ئەم رووبارانە و کانی و سەرچاوەکانی دیکە دەبەستن. واتە، لەم سەردەمانەی دواییدا ئەم رووبارانە لەئەنجامی بەکارهێنانی فراوانیان لە هەردوو کەرتی هاوین و پاییزدا هیچی وایان لێ زیاد نامێنێتەوە، بۆیە دەبینین بەستۆرە لە هاویناندا بەتایبەتی لەمانگی تەمووز بە دواوە وشک دەکات. دیارە کە لەسەردەمەکانی کۆنیشدا بەفرو باران پتر لە ئێستاکە دەبارین.

بەڵام دەبێ لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا ئاوی رووبارو کانیاوەکان لەناوچەی هەڵقولان و پێکهاتنیاندا بەوێنەی ئێستا بەکارنەهێنرابن و ناوچەکەش وەکو ئێستا ئاوەدان نەبووبێت. هەروەها لەنووسینەکەی سەنحاریبیشدا هاتووە کە لقە رووبارە ناوبراوەکان، سەنحاریب خۆی بەمەبەستی پرۆژەکەی ئاوی هەولێر هەڵی کەندوون. جا لەم بۆچوونەدا دوو شتمان دەستگیر دەبێ: یەکەم، رووبارەکان بەر لە سەردەمی سەنحاریب بە شێوەی ئێستایان لە ناوچەکە هەڵنەکەوتوون، دیارە ئاوەدانییەکی زۆریش لەم ناوچەیەدا نەبووە. دووەم، شایەکی بەدەسەڵات و زەبروزەنگی وەکو سەنحاریب کە سێ رووباری بۆ پرۆژەکەی ئاوەدانی شارە پیرۆزەکەی هەڵکەندبێت چۆن رێگای داوە بۆ غەیری ئەم مەبەستە دەست بۆ ئاوی ئەم رووبارانە درێژ بکرێت؟!

بۆیە زۆربەی ئاودکە ماوەتەوە و رژاوەتە ناو بەستۆرە و ئەم رووبارەش هەمیشە پڕ ئاو بووە سەنحاریب لەنزیک گوندی قەڵەمورتکە پرۆژەکەی لە بەرد دروست کردووە.

دیارە شارێکی ناو دەشتی وشکەسێری وەکو هەولێریش لەهاوین پێویستی بەئاو هەبووە و هەیە و مەبەستی پرۆژەکەش زیاتر بۆ ئەم کەمژە بووە.

### گرنگیی پرۆژەکەی سەنحاریب

جێبەجێکردنی پرۆژەی گەیاندنی ئاو بۆ شاری هەولێر لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا، سەدەی حەوتەمی بەر لە زایین[٢٩] لەلایەک رووی پێشکەوتن و شارستانێتی ئەم ئیمپراتۆرییەتە گەورەیەمان بۆ دەنوێنێت، لەلایەکی دیکەیشەوە شوێن و رۆڵە گرینگەکەی قەڵای هەولێرمان بۆ دەردەخات لە قۆناغێکی گەشاوەی مێژووە دێرینەکەیدا.

هەڵکەندنی ئەم نۆکەندە بۆ قەڵای هەولێر کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە گیرۆدەی گیروگرفتی کەم ئاوی و پەیداکردنی سەرچاوەی سەرەکی ژیان، (ئاو هاتووە)،

بایەخێکی گەلێک گەورەی هەبووە و بۆتە هۆی پێشکەوتنی شارەکەو بەردەوام بوونی ئاوەدانی تێیدا و بەخۆوە گرتنی پەرستگای خواوەندی مەزن و پیرۆزی ئاشوورییەکان (ئەشتار) و گەلێک خانوو دامەزراوەی دیکەی نایاب.

بێگومان دەبێ لە رووی ئابووریشەوە کەڵک لەئاوی پرۆژەکە وەرگیرابێت و کشتوکاڵی لەبەر کرابێت و وەکو رازانەوەی شاری نەینەوا لەئەنجامی ئاوی پرۆژەکەی سەنحاریب بۆ ئاوەدانی شارەکە.[٣٠] قەڵای هەولێریش بە هەمان شێوە بە باخچەو باخی جوان رازابێتەوە و لە هەمان کاتیشدا تا رادەیەک بووبێتە هۆی چاکبوونی باری گوزەرانی دانیشتووانی.

سەرەرای ئەمەش هەمووی هەڵکەندنی سێ رووبار لەبەر ئاوی کانی و سەرچاوەکانی چیاکانی هەوراز شاری هەولێر و هەڵبەستانی ئەم پرۆژەیە بەدرێژی (٢٠)کم بەشێوەی کاریز و جۆگەلە ئاوی سەرزەوی و راکێشانی بەراستی و بادانەوە بەگوێرەی نەخشەیەکی سەرکەوتووانە تا ناوەراستی قەڵای هەولێر شارەزایی و کارامەیی ئەندازیار و وەستای ئاشوورییەکان و چالاکی و بازووی پۆلاین و ورە بەرنەدانی دانیشتووانی ناوچەکە دەنوێنێت لە سەردەمێکی کۆنی ئەم هەرێمەدا.

تاکو ئێستاش کۆمەڵە دێیەک کەوتوونەتە سەر ئەو راستە شەقامەی کە نۆکەندەکە بەلایەوە یان لە نزیکییەوە رەت بووە: وەک گوندی قەلەمورتکە و هەردوو گوندە گەورەو دێرینەکەی (بەحرکە)و (عەنکاوە).[٣١]

### بیرە ئاوەکانی شاری هەولێر

ناوچەکانی نیمچە چیایی و زوورگ و پێدەشتەکانی خوار چیاکان لە ولاتەکەماندا کە شاری هەولێر و دەوروبەری دەکەونە چوارچێوەی ئەم ناوچانە، هەر لە کۆنەوە تا رادەیەکی زۆر لە کشتوکاڵی هاوینەیاندا سەرەرای کاریزەکان پشتیان بە ئاوی بیرەکان بەستووە.

دانیشتووانی ئەم ناوچانە بە ئاسانی توانیویانە بیری ئاو لە ناو زەوی وزارو شارو گوندەکانیان لێ بدەن و بیرەکانیش زوو گەییوونەتە ئاو، جا بۆ خواردنەوەو ژیانی ئاژەڵ و کشتوکاڵ کەڵکیان لێ بینیوە[٣٢].

دانیشتووان و جووتیارەکان ئاویان بە چەرخ و دۆڵاب لەم جۆرە بیرانە دەرهێناوە و پارچە زەوی بچووک بچووکیان لە بەر بە سەوزە و پەمۆ و توتن داچاندوون.

رووی زەوی پاریزگای هەولێر لە رووی چینەکانی جیۆلۆجییەوە بۆ سێ ناوچە دابەش دەکرێت:

بەشی یەکەم/ ناوچەی چیا کە لە کەلێنی بەردەکانییەوە ئاوێکی بێگەرد دەردەچێت.

بەشی دووەم/ ناوچەی دەشتی هەولێر کە شارەکەش (هەولێر) دەگرێتەوە.

بەشی سێیەم/ دەشتی مەخمور.

ژێرزەوی دەشتی هەولێر کە لە دۆڵی بەستۆرەوە دەست پێدەکات و تا زوورگەکانی دیبەگەو چیای مەخمور شۆر دەبێتەوە ئاوی یەکجار زۆرەو وەکو کۆگایەکی گەورەی پڕ ئاو وایە.

لە رووی جیۆلۆجیشەوە بە ئاوی ژێرزەوی دەشتی هەولێر واتە، شاری هەولێر و دەوروبەرەکەی دەگوترێ (بەختێداری) کە ئاوێکی زۆر سوک و شیرینە.

بەلام بە چینی ژێرزەوی دەشتی مەخمور دەگوترێ (فارس)و ئاوەکەشی سوێرە.

سەرەرای ئەوەی کە ژێرزەوی دەشتی هەولێر بە ئاو دەوڵەمەندە، بەلام هەموو شوێنێکی وەک یەک نییە، چونکە ئەگەر زانیمان کە رژانی ئاوی ژێرزەوی ناوچەکە لە سەرەوە بۆ خوارەوەیە: واتە، لەلای باکووری رۆژهەلاتی بەرەو خوارووی رۆژئاوای ئاوەکە لە ژێرزەوی سەرەولێژ دەبێتەوە. بۆ نموونە لە گوندی (مەلا ئۆمەر) کە کەوتۆتە نێوان بەستۆرە و شاری هەولێر مەنسوبی ئاوەکەی بڵندە و لەسەر زەوی نزیکەی چەند مەترێک لێ بدرێ ئاوی دەردەچێت، بەلام شوێنی دیکەی هەیە: دەبێ (٢٠٠) مەتر لێ بدرێ، ئینجا ئاوی دەردەچێت و ئاوەکەشی کەمە وەکو ناوچەی قوشتەپە چونکە مەنسوبی ئاوەکەی لەخوارەوەیە.

سەبارەت بەقووڵی بیرەکانی ناو شاری هەولێریش لەهەموو شوێنێک وەک یەک نییەو ناوچەی بیرە ئیرتوازییەکان قووڵییان کەمە لەنێوان (٦٠-٩٠) مەتر دایە بەلام ئەم ناوچانە کەم و سنووردارن.

تێکرای قووڵی بیرە ئاوەکانی ناو شاری هەولێر (١٥٠) مەتر دەبێت و بە موزەخەش کار دەکەن[٣٣].

بەشێوەیەکی گشتی هەولێر شوێنەکەی پەسندو چاکە لەرووی بیر لێدانەوە. ئاووهەوایش بەتایبەتی بەفروباران کار دەکەنە سەر کەمی و زۆری سالی کەم باران و وشکەتیش و بیرەکان ئاویان کەم دەبێت[٣٤].

یاقووتی حەمەوی کە لە سەردەمی دەولەتی ئەتابەکیدا (١١٢٨-١٢٣٣) زاینی دوو جاران سەردانی شاری هەولێری کردووە، لە دانراوە بەنرخەکەیدا (موعجەم ئەلبولدان) باسی شارەکەمان بۆ دەکات و لەبارەی ئاوی شاری هەولێرەوە نووسیویەتی و دەلێ: ..... چ رووبارێک لە شارەکەدا نییە و لە کشتوکالدا پشت بەئاوی ژێر زەوی دەبەستێت - لێرەدا پەنجەی بۆ کارێزەکان راکێشاوە - خواردنەوەی شارەکەیش لەسەر ئاوی بیرەکانە، لە خۆشی و سووکیشدا هیچ جیاوازییەک لەنێوان ئاوی بیرەکانی ئەم شارەو رووباری دیجلەدا نییە.[٣٥]

زانیمان کە شاری هەولێر لە زۆربەی سەردەمەکانی مێژووی کۆنیدا تەنیا بریتی بووە لە ئاوەدانی سەر قەلاکەی، ئەم قەلایەش لە سەرەتای بنیادنان و پێکهاتن و ئاوەدان بوونەوەیدا ئەوەندی ئێستاکە بەرز نەبووە. بگرە لەوانەیە هەر چەند مەترێک لەئاستی زەوی دەوروبەریدا بەرز کرابێتەوە. جا ئەم شوێنەش کە ئاوەدان کراوەتەوە زۆربەی کاتیش بە شوورەی مەحکەم و بەرز بۆ پاراستنی لە پەلاماردانی دوژمنە دەستدرێژکارەکان دەوری گیراوە و دەرگای قوللەی تایبەتی بۆ دروست کراوە.

دەبێ دانیشتووانی ئەم شارە قەلایە بەر لە هەموو شتێک هەولی ئاو پەیداکردنیان دابێت، چونکە ژیان بێ ئاو نابێت و ئاو و ئاوەدانیشیان گوتووە، خۆ حەشاردانیش لە کاتی تەنگانەدا بێ مسۆگەر کردنی ئاو ناچێتە سەر.

ئەوەیشمان زانی کە قەلاکە کەوتۆتە ناوەراستی دەشتێکی وشک و فراوان و چ رووبارێکی بە لادا ناروات. جا دەبێ هەر لە سەرەتاوە جگە لە پرۆژەکەی سەنحاریب و سەردەمەکەی و ئاوی کارێزەکان، دانیشتووانی شارە قەلاکە بیریان لێ دابێت و کۆگا ئاوە گەورەکەی ژێرزەوی شارەکە بە کەلکیان هاتبێ، کە قەلاکەش لە سەرەتادا ئەوەندەی ئێستا بەرز نەبووبێت دەبێ بیر لێدانیش گەلێک بە ئەرک نەبووبێت و دانیشتووان ئاویان لە بیرەکانی سەر قەلا دەرهێناوەو هەر چوار لای بیرەکانیان بە چاکی بەکەرپووچ هەلێناوەو لە رووخان و کوربوونەوەیان پاراستووە.

بە درێژایی مێژووش کە ئەم قەلایە توورەگە رێژە لە ئەنجامی کەلەکە بوونی پاشماوەی قورو خۆلی کەلاوەی خانووە قورینەکانی لەمەوبەر تا هاتووە بەرزتر بۆتەوە[٣٦]. بێ شک پێویستی دانیشتووانیش بە ئاوی بیرەکان زێتر و بەردەوام بووە بەتایبەتی لەو کات و سەردەمانەی کە شارەکە گەلێک ئاوەدان بووە یان تووشی شالاو و گەمارۆدان هاتووە. لە حالەتی دووەمیشدا دانیشتووانی سەر قەلاو بەرگریکەرانی، رێگای هاتوچۆی دەرەوەیان براوە[٣٧] و خۆیان لە دیوی ژوورەوەی شوورە بەرزو مەحکەمەکەی شار حەشار داوەو بۆ ماوەی دوورو درێژ مەردانە بەرگرییان لە خۆیان و شارە گەمارۆدراوەکەیان کردووە.

## بەلگەی مێژوویی
## بۆ بوونی بیر لەسەر قەلاکەدا

ئەگەر بێتوو لە روانگەی ئەو رووداوە مێژووییانە کە بەسەر شاری هەولێردا تێپەریون، بیر لە سەختی و خۆراگری شارە قەلاکە بکەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم قەلایە بە ئاسانی نەکەوتۆتە دەست هیچ داگیرکەرێکەوە[٣٨].

جا هەر وەکو لەمەوبەریش گوتوومانە دەبێ دانیشتووانی قەلاکە لە کاتی گەمارۆدانە دوور ودرێژەکانی شارەکەیاندا کە ئێستا چەند نموونەیەک لەم بارەیەوە باس دەکەین، پشتیان بە ئاوی بیرەکان بەستبێت.

ئیبنی واسل کە مێژوونووسێکی چەرخی حەوتەمی کۆچی - سێنزەهەمی زاینی بووە رووداوێکمان لەبارەی خۆراگری قەلاکەو دانیشتووانی لە سەردەمی دەولەتی هەزبانی کورد (٣٣٤-٥٢٢ک) بۆ دەگێرێتەوە[٣٩].

ئیبنی واسل بەوردی باسی خوراگری و بەرگری توندو بەهێزی شەرکەرە کوردەکانی دەولەتی هەزبانی بەرووی لەشکری دەولەتی ئەتابەکی مووسل، بە سەرکردایەتی زینەددین علی کچک دەکات و دەلێ: "لەشکری ئەتابەکی بەشەرو گەمارۆدان هیچی بۆ نەکراوە، چونکە

بەرگریکەرانی قەڵاکە خۆیان لەدیوی ژوورەوەی قەڵا حەشارداوە و ئامادەیی خۆیان بۆ شەڕ و بەرگرییەکی دوورو درێژ پیشان داوە. بۆیە کە سەرلەشکری ئەتابەکی زانیویەتی بە شەڕ قەڵاکەی بۆ داگیرناکرێت پەنای بردۆتە بەر رێگای دیبلۆماسی تا بە مەرام گەیشتووە..."

لەدوای ئەم رووداوەی سەرەوەش هەولێر و دەوروبەری کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی ئەتابەکییەکان و دەوڵەتی ئەتابەکی لە هەولێر دامەزراوە و شارەکەش لە سەردەمی سوڵتان مزەفەرەدینی کوکبری کە (٤٤) ساڵ فەرمانڕەوایی لەم دەوڵەتەدا کردووە زۆر گەشاوەتەوە و پێش کەوتووە.[٤٠]

لەدوای کۆچی دوایی سوڵتان موزەفەر لە رێکەوتی ١٨ رەمەزانی ساڵی ٦٣٠ کۆچیدا (١٢٣٣ز) دانیشتووانی قەڵاکە ویستوویانە سەربەخۆ بمێننەوە و لەپێناو ئەمەدا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەرەنگاری لەشکری خەلیفەی عەباسی (ئەلموستەنسەر) بوونەتەوە و خەلیفە ناچار بووە سوپایەکی گەورە بەسەرکردایەتی باڵاترین سەرکردەی سوپایی دەوڵەتی عەبباسی (جەمالەددین قەشتەمەر) بۆ داگیرکردنی شارە سەختەکە رەوانە بکات و لەئەنجامی کوشتارێکی زۆر لەهەر دوولادا ئینجا قەڵای هەولێر کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی عەبباسییەکان[٤١].

هەروا شاری هەولێر چەند جارێک تووشی پەلاماری باڵا و تەتەرەکان هاتووە. سبت ئیبنی جوزی کە مێژوونووسێکی سەردەمەکە بووەو لە ساڵی ٦٥٤ کۆچی ١٢٥٦ زاینی کۆچی دوایی کردووە، لەبارەی پەلاماردانی هێرشە دڕندانەکەی مەغۆل بۆ سەر قەڵای هەولێر لە ساڵی ٦٣٤ی کۆچیدا نووسیویەتی و دەڵێ: "مەغۆلەکان لەم ساڵەدا بەسوارە و پیادە دابەزیبونەتە سەر شاری هەولێر و گەمارۆیان داوە و مەنجەنیقیان لەدەرەوە دامەزراندوون. کە لەسەرەتا شارەکەیان بۆ داگیر نەکراوە، شوورەکەیان کوڵیوە و بەزەبر چوونەتە ناوییەوە و کوشتارێکی بێ ژمارەیان لەدانیشتووانی کردووە و خانوو و بیرەکانی شارەکە[٤٢] بوونەتە گۆڕی کوژراوان و بەهۆی کەوتنە سەر یەکی ژمارەیەکی زۆری لاشەی کوژراوانیش شارەکە بۆگەن بووە.[٤٣] لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆریش لەدانیشتووانی شاردکە(خوار قەڵا)، توانیویانە خۆیان بگەیەننە سەر قەڵاو لەگەڵ شەرکەرانی قەڵاکەدا بۆ ماوەی چل رۆژ بەرووی هێرشەکەدا بوەستن و قەڵاکەیان نەداوەتە دەست.

هەروا لەشکری مەغۆل بەسەرکردایەتی (ئەرقیونیان) لەهێرشەکەی ساڵی ٦٥٦ی کۆچیدا شەش مانگ گەمارۆی قەڵای هەولێریان داوە، بۆیان داگیر نەکراوە، ناچار ئەرکی داگیرکردنەکەیان بۆ بەدرددین لولو فەرمانداری مووسڵ جێهێشتووە.

لە کاتی فەرمانڕەوای دەوڵەتی قەرەقۆینلۆ (خاوەن بەرخە رەشەکە ١٤١١- ١٤٧٠ز). هەروەک مێژوونووس عەبدوڵڵای کوڕی فەتحوڵڵای غەیائی (لە ١٤٨٦ز وەفاتی کردوە) لە مێژووی غەیائیدا بۆمانی دەگێڕێتەوە: سوڵتان ئەسپان کوڕی قەرە یوسف ویستوویەتی لە ساڵی (٨٣٩ک/١٤٣٥ز) شاری هەولێر داگیر بکات. بەڵام هەر کە حاکمی شارەکە "میرزا عەلی" بەمەی زانیوە، بڕیاری داوەتە سەربازەکانی کە هەر شتێک لە شارەکە - خوار قەڵا- دا هەیەو لەوانەیە کەڵکی بۆ دوژمن هەبێت نەیهێڵن و بیڕووخێنن.

جا کە ئەسپان بە خۆی و لەشکرە پەلاماردەرەکەیەوە گەیشتۆتە شارەکە، دیویەتی هیچی تێدا نەماوە خاپوور بووە: بۆیە بڕیاری داوە مل بدەنە گەمارۆدانی قەڵاکەو ئەم گەمارۆدانەش ساڵێکی خایاندووەو لەم بەینەدا شەڕو کوشتارێکی زۆر کەوتۆتە نێوانیانەوە لە ئەنجامدا سوڵتان بۆی دەرکەوتووە کە بەشەڕ قەڵاکەی بۆ داگیر ناکرێ بۆیە پەنای بردۆتە بەر هەڵخەڵەتاندن و فێڵبازی.

سوڵتانی دەست درێژکەر هەڵساوە تاخمێکی لە ریزی لەشکرەکەی بە فێڵ ناردۆتە قەڵاو داوای لێ کردوون کە خۆ- بەدەستەوە بدەن و خۆیان بناسێنن و بڵێن لە بەر دەستی سوڵتان هەڵاتووین و پەنامان بۆ ئێوە هێناوە و ئامادەین لەگەڵتان لەدژی لەشکری سوڵتان بجەنگین. لەهەمان کاتدا ژەهری لەگەڵدا رەوانە کردوون تا بیخەنە ناو بیرەکانی قەڵا بە تایبەتی ناو بیرە ناوی تایبەتی میرزا عەلی.

ئەم تاخمە خۆ بەدەستەوەدەرە بەم فێڵە لە سەرەتادا توانیویانە باوەڕ بە



بەرگریکەرانی سەر قەڵاکە بهێنن و مەرامە بۆگەنەکەیان جێبەجێ بکەن، بەڵام تەنیا توانیویانە زدفەر بە بیردکەی میرزا عەلی بەرن. لە ئەنجامی ئەم رووداوەدا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی قەڵاکە لە دوای شین هەڵگەڕانی پێست و گەنی بوونی دەم و زاریان بە ژەهراوی مردوون و گیانیان بەخشیوە.

دوای درێژە کێشانی ماوەی گەمارۆدانەکە بۆ ساڵ و چەند مانگێک فەرمانڕەوای شارەکە لەبەر بێ ئاوی و مردنی بەشێکی زۆر لە شەڕکەرانی ناچار بوود دوای وەرگرتنی بەڵێنی سوڵتان بە نەکوشتنی شارەکە خۆی بەدەستەوە بدات و کچەکەی لە ئەسپان مارە بکات[٤٤].

دیسان ئەم رووداوە دوو راستیمان بۆ دەسەلمێنێت: یەکەم، سەختی و قایمی قەڵاکەو توانای دانیشتووانی لەسەر شەڕو بەرگری بەردەوام و دوورو درێژ لە پێناو کەرامەت و ژیان و سەربەخۆیی شارەکەیان. چونکە سوڵتانی ناوبراو بە شەڕ و لەشکری زۆرو گەمارۆدان شارەکەی بۆ داگیر نەکراوە، بەڵکو لە رێگای فێڵێکی نامرۆڤانە بەم ئەنجامە گەیشتووە. دووەم، لەلایەکی تریشەوە دەیسەلمێنێ کە لە قەڵادا ژمارەیەک بیری ئاو هەبووە. ئاوی ئەم بیرانەش بۆتە هۆی سەرەکی ژیان و بەردەوام بوونی خۆڕاگری دانیشتووانی قەڵاکە بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێک بەرووی داگیرکەراندا.

**بیرە نوێیەکانی شاری هەولێر**

لەپاشماوەی بیرە کۆنەکانی قەڵای هەولێر بیری حەمامی قەڵایە[٤٥] کە تا سەرەتای پەنجاکان ئاوی تێدا دەرهێنراوە.

قووڵی ئەم بیرە (٦٠) م دەبێت و تیرەکەشەی (٥)م، دەڵێن لەسەری ئاوی کارێزێک هەڵنراوە. ئەم بیرە تا ئێستاکەش لەناو حەمامی قەڵا ماوەو لەگەڵ حەمامەکە لەلایەن بەڕێوەبەرێتی کەلەپوور و شوێنەوارەکانی هەولێر پارێزراوە.

شوێنەواری دوو بیری تریش لەسەر قەڵاکە ماون یەکێکیان کەوتبووە پێش ماڵی موحسین ئاغای کۆنە سەرەک شاردوانی،[٤٦] سەریان چاتی کردبوو، دووەمیشیان کەوتبووە تەنیشت ماڵی پیرباڵ ئاغا نزیک دەرگای گچکەی قەڵا (گچک قاپ)،[٤٧] بەڵام کەس لەتەمەن درێژەکانی شارەکە نایەتە بیریان ئەم دوو بیرە ئاوەیان هەڵگوێزرابێت.

لە ساڵی ١٩٣٦ یەکەم بیری ئیرتوازی لەلایەن کۆمپانیایەکی یوگسلاڤی لەشاری هەولێر، لەشوێنی سەربازگەی شارەکە لێدراوە. لەهەمان ساڵدا بیرێکی تر لەگوندی (قازی خانە) نزیک قوشتەپە لێدراوە[٤٨].

لە ساڵی ١٩٣٧ دا شارەوانی هەولێر بۆچارەسەرکردنی گرفتی کەم ئاوی لە شاردا دەستی کردووە بە کەڵک وەرگرتن لە ئاوی ژێرزەوی. لایەنی ناوبراو لە سەردەمی سەرۆکایەتی موحسین ئاغا دوو بیری لێداوە. بەمەش ئاوی خواردنەوە لەشارەکە پتر بووە و گیروگرفتەکەی نەختێک کەمتر بۆتەوە[٤٩].

هەروەها شارەوانی لە پەنجاکاندا بیرێکی لەجێگای مفتاحی کارێزی میری نزیک شوێنی ئێستای یانەی مامۆستایانی هەولێر لێداوە و ئاوەکەی بۆ گەڕەکەکانی نزیک ئەم شوێنە دابەش کردووە شایانی باسە کە ئاوی ئەم بیرە هیچ پەیوەندییەکی بەئاوی کارێزی میرییەوە نییە بەڵکو کە بیرەکە لێدرا کارێزەکە وشکی کردبوو و پشتگوێ خرابوو.

لە ساڵی ١٩٥٩ بیری ترومپا

ژمـارە (٩) لە گـەڕەکی سـەیداوە لێدراوە کە قـوولیـیـەکـەی تەنیـا (٢٠٠) پێـیـە و بەرهەمی ئاویشی لەکاتی خۆی (٧٠٥) گالۆن بووە لە دەقـیـقـەیەکـدا. ئاوی ئەم بیـرە و بیـرەکەی خانزاد کە هەردووکـیـان لەلایەن کۆمپانیـایەکی بیانی لێدراون ئاوێکی باشیان هەبووە[٥٠].

لە ساڵی ١٩٥٨ دا دوو بیری تر لەلایەن بەشی ئاو لە شـارەوانی هەولێـردا لەسـەر ڕێگای شـەقـلاوە شوێنی گەراجی گواستنەوەی ئێستاکە لێدراون کە یەکێکیان ترومپاکەی خـۆی کـەوتۆتە ناوی پشـتـگوێ خراوە[٥١].

لەکاتی خۆی ئەم شوێنە گردێکی هەندێک بەرز بوو: خـانزادیان پێ دەگوت. دووره شار هەڵکەوتبوو لە بەهاراندا بەهەندێک دارستان و گیا و گـوڵ دەڕازایەوە خـەڵکی لە چوار شەموان و ڕۆژانی هەینی بۆ سەیران روویان تێدەکرد.

لە سـەرەتادا تۆڕی ئاو دابەش کـردن لە شـارەکـەدا سـاکـارو فـراوان نەبووە، بۆیە زۆربەی خـەڵکی بە کوندە و جەڕە و تەنەکە و بەرمیل و کەرەستەی دیکە ئاویان لە بیرەکانەوە بۆ ماڵەکانیان گواستۆتەوە.

کار بەم شێوەیە ڕۆیشتووەو لەگەڵ فراوانبوونی شارەکە بیرێک لێرە و یەکـێکی دیکە لەوێ لێـدراوە تا سـاڵی ١٩٦٣ ژمـارەی بیـرەکـان گەیشتوتە (١٥) بیر کە بەرهەمیان نیـوەی پێـویـستی دانیـشـتـووانی شارەکەی زامن کردووە[٥٢].

ژمـارەی بیـرەکـان لە سـەرەتای ساڵی ١٩٦٨ گەیشتووتە (٢٧) بیر کە بەرهەمیان لەمانگێکدا گەیشتۆتە (٤٧٦٨٣٦) مـەتری شـەش پاڵوو ئاوی پاکی خـواردنەوە. ئاوی ئەم بیـرانە لە پێنج عـەمـباراوی گـەورە (تانکی) کۆ دەکرایەوە ئینجا بەهۆی تۆڕی دابەشکردنی ئاوەوە بەسـەر (٩٠٠٠) بەشداربوودا لە شارەکـە دابەش کراوە[٥٣].

شـاری هەولێـر لە حـەفـتـاکـان بەدواوە بەردەوام بێ ئەندازە فـراوان بووە و ساڵ لە دوای ساڵیش ژمارەی دانیشـتووانی پتر بووە، ڕادەی بژێوی و گوزەران و هۆشـیـاری تەندروسـتی هاولاتـیـان پەرەی سـەندووە زۆربەی خانووە نوێیەکانی ئێستا باخچەی تایبـەتیـیـان هەیە و بۆ ئاودان ئاوی زۆریان دەوێت ئێـسـتـاکـە سـەبارەت بەجاران ئاو بەئاسانی لە مـاڵەکـان دەستگیر دەبێت و بەکاردەهێنرێت..

بۆیە سـەرەڕای زیادکردنی ژمارەی بیـرەکـان و جێبەجێ کـردنی پرۆژەی ئیـفـراز گـیـروگـرفـتی کـەم ئاوی لە سەرەتای حەفتاکان بە دواوە بەتوندی بەردەوام بووە و سـەرۆکی شـارەوانی هەولێـر لەسـاڵی ١٩٧٢دا خـۆی بەئاشکرا دانی بەم گیروگرفتە ناوە و وتارێکی زانستیـیانەی بەنرخی لەژێر ناونیشانی (کەم ئاوی و هۆیەکانی) لە شـاری هەولێـردا لە یەکێ لە ژمارەکانی ساڵی ١٩٧٢ی گۆڤاری (هەولێر)دا بڵاو کردۆتەوە[٥٤].

ئێـستـاکـەش لە سـاڵی ١٩٨٤دا سـەرەڕای جـێـبـەجێ کـردن و کەوتنەکاری هەردوو پرۆژەی ئیفرازی کۆن و نوێ بوونی (١٢٧) بیرو تەنیا (٩) عـەمـباراو (٥٥) لە شـارەکـە گـیـروگـرفـتی کـەم ئاوی بەتایبـەتی لەهاویندا لەگـەڵێک گـەڕەکی شـاری هەولێـر بەردەوام و پێـویـسـتی بە چارەسەرکردن هەیە[٥٦].

لەبارەی مـەرجەکانی بیـرلێدان و گیروگرفتی ئاو دابەشکردن و پاک و خاوێنی ئاوی ژێر زەوی شاری هەولێر کـاک مـوعـتـەسـەم ئەکـرەم حـەسـەن جیـۆلۆجی لە بەڕێوەبەرێتی ئاوی ژێر زەوی پارێزگاکە چەند ڕاستییەکی بۆ خستینە ڕوو.

کـاک مـوعـتـەسـەم لەبارەی مـەرجـەکـانی بیـرلێدان و چۆنێـتی چارەسەرکردنی گیروگرفتی کەم ئاوی لە شارەکەدا گوتی: (گیروگرفتی کەم ئاوی لەشاری هەولێردا بەبیـرلێدان چارەسەر ناکرێت چونکە تاکو ئێستا ژمارەیەکی زۆر بیر لێدراون و هەولێر وەکو بێژنگێکی لێ هاتووە!).

بۆ نموونە ئێـسـتـا لە گـەڕەکی ڕاپەڕین حـەوت بیـرمـان لێـداوە و جـێگا نەمـاوە بیـری نوێی تێـدا لێبدرێت چونکە لەرووی زانستییەوە دەبێ نێـوانی هەر دوو بیـر (٥٠٠)م کـەمـتـر نەبێت هەروا دەبێ بیـر لە شوێنی خاوێن لەناوەڕاستی باخچەی گشـتی و دوور لە ئاوەدانی لێبدرێت جا ئەم مـەرجانەشمان لەم گەڕەکەو گـەلێک شـوێنی تر بۆ ناچنە سـەر سەرەڕای ئەمەش داوامان لێ دەکرێت کە گیروگرفتی کەم ئاوی لە گەڕەکی ناوبراو هەیە (بۆ نموونە) دەبێ بیـری تریان بۆ لێبدرێت.. ئەمـە هەڵەیەو گیـروگرفـتەکە بەم شێوەیە چارەسەر ناکرێت[٥٧] چونکە پێـویسـتـە بیـر بەشێوەیەکی زانستـیـانە لێبدرێت پاشەڕۆژی بەردەوامی و خاوێنی ئاوی بیـرەکـان ڕەچاو بکرێت و بیـریش لە

پاشەڕۆژی ئاوی ژێر زەوی شارەکە بکرێتەوە[٥٨].

بۆچارەسەرکردنی گیروگرفتی کەم ئاویش لە شارەکەدا کاک موعتەسەم دەڵێ: (بە ڕای ئێمە بۆچارەسەرکردنی گیروگرفتی کەم ئاوی لە گەڕەکێکی وەک ڕاپەڕین بەوە دەبێت کە عەمباراوێکی گەورەی لێ دابنرێت لەم کاتەدا لەوانەیە ئاوی دوو سێ بیر بەش بکات.. چونکە بوونی عەمباراوی گەورە بۆ ئاو تێدا کۆکردنەوە لەلایەک تێچوونی بیر لێدان دەگێڕێتەوە ئاویش زۆر بەفیڕۆ ناچێت لەلایەکی تریشەوە دانانی عەمباراو لەهەر گەڕەکێکدا سوودی ئەوەی دەبێ ئەگەر هات بیرێک یان پتر بەهۆی بڕانی کارەبا یا تێکچوونی ترومپاکەی بۆماوەیەکی دیاریکراو وەستا لەم حاڵەتەدا ئاو دابەشکردن بەسەر دانیشتووان ناوەستێت چونکە ئاوە هەڵگیراوەکەی ناو عەمباراوەکە بەردەوام دەبێت لە دابەشبووندا.

هەروەها لەرووی تەندروستیشەوە ئاو لەعەمباراو باشتر پاک دەکرێتەوە چونکە کە لە بیرەکانەوە ماددەی کلۆر لەئاو دەکرێت - پێویستە بەرێژەی (٢ ملغم) کلۆر بۆ لتر ئاوێک بێت یان ٢ گرام کلۆر لە مەترێکی شەش پاڵوو (مکعب) ئاو بکرێت - دەبێ ئەم ماددە پاککەرەوەیە بەلای کەمییەوە (٢٠-٣٠) دەقیقە لەگەڵ ئاوەکە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت کاریگەری خۆی بە تەواوی بنوێنێ، خۆ ئەگەر بۆ ماوەیەکی پتر لە ناو ئاوەکە مایەوە ئەوە ڕۆڵی خۆی لە پاککردنەوەی ئاوەکەدا باشتر دەنوێنێت.

جا ئەگەر عەمباراو نەبێت ئاو یەکسەر لە بیرەکانەوە بەسەر ماڵاندا دابەش بکرێت، ئەوە کلۆرەکە دوای چەند دەقیقەیەکی کەم دەگاتە ماڵەکان، بەتایبەتی ئەو ماڵانەی لە بیرەکانەوە نزیکن، بێ ئەوەی ئاوەکەی بەچاکی پاک کردبێتەوە و ئاوەکەیشی بە کلۆراوی دەگاتە بەردەستی خەڵکی و خواردنەوەیشی دەبێتە هۆی زیادبوونی مادەی کلۆرین لە لەشی ئادەمیزاددا و ئەمەش زیان بە تەندروستی دەگەیەنێ).

لە رووی پاکی و تەندروستی و سازگارییەوە ئاوی خواردنەوە لەدوای یەکتری دێت:

١- ئاوی بیرە ئیرتیوازییەکان.
٢- ئاوی سەرچاوەو کانیاوەکان.
٣- ئاوی بیرە کۆنەکان.
٤- ئاوی رووبارەکان.

تاکو ئێستا بە گوێرەی ئەو پشکنین و تاقیکردنەوە کیمیاوی و بەکترۆلۆجییانەی لە ساڵانی رابردوو دا لەلایەن مەڵبەندی پاراستنی تەندروستی ژینگەی مرۆڤەوە لەشاری هەولێر بۆ ئاوی ژێر زەوی شارەکە کراون، دەرکەوتووە کە ئاوی ژێر زەوی هەولێر بۆ ئاوی خواردنەوە پاکترین ئاوە لە عێراقدا و بە گوێرەی مەرجە پێویستییەکانی تەندروستی دەرچووە.[٥٩]

بەڵام سەرەڕای ئەم بۆچوونانەی سەرەوە ڕاستییەکی مەترسیدار هەیە لەم رووەوە کە پێویستە بخرێتە ڕوو. ئەم ڕاستییەش ئەوەیە کە لەئەنجامی نەبوونی سیستەمی زێرابەکان بۆ ئاوی پیس و پیسایی شارەکە، دەتوانین بڵێین شاری هەولێر ئێستاکە لە سەر دەریایەک ئاوی پیس و پیسایی ماڵەکان و گەرماو و مزگەوت و ئوتێل و دامودەزگاکانی دەوڵەت راوەستاوە، سەرەڕای تێپەڕبوونی دوو کەندی گەورەو قووڵی تایبەت بە چڵکاو و ئاوی پیسی بەشێک لە گەڕەکەکانی شارەکە بە ناوەڕاستی شاردا..

جائەگەر ئەم بارە نالەبارە وا بمێنێتەوە بمانەوێ و نەمانەوێ چ ئێستاکە یان لە دواڕۆژ کار دەکاتە سەر خاوێنی ئاوی ژێرزەوی شارەکەو (نترات) لە ئاوی بیرەکان زۆر دەبێت و دەگاتە پلەیەک کە مەترسی بۆ سەر تەندروستی دانیشتووانی شاری هەولێر پێک دەهێنێت.

### ٣- کارێزەکانی هەولێر

کارێز وشەیەکی فارسییە و بریتییە لەو جۆگە یان نۆکەندەی کە لە ژێرزەمینەوە لێ دەدرێت بۆ ئەوەی ئاوی بە ناودا بڕوات و ئاوەکەیشی لە دواییدا بۆ مەبەستی ئاودان بگەیەنرێتە دەرەوە، واتە، سەرزەوی[٦٠].

هەر لە کۆنەوە عێراقییەکان کارێزیان لێ داوەو بە کارێز هەڵکەندن ناوبانگییان دەرکردووەو بۆ خواردنەوە و ئاودان و ئاش گێڕان پشتیان بە ئاوی زۆری کارێز هەبووە[٦١].

لە عێراقدا کارێزەکان بە زۆری لە شوێنەکانی: دامێنی چیاکان و نیمچە شاخاوی و زوورگ و بان و دەشتەکانی رۆژهەڵات بڵاو بوونەتەوە.. بە تایبەتی لە ناوچەکانی

(هەولێر و سلێمانی و شەنگارو بەدرەو جەسان) ژمارەیەکی زۆر کارێز هەبوون[٦١]. هەر وەکو لە خاڵی ئەم باسەماندا رووغان کردەوە، ئاوی پرۆژەکەی سەنحاریبیش بە گوێرەی سیستەمی کارێز گەیەنراوەتە شاری هەولێر، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا بەملاوە بیرۆکەی کارێز هەڵکەندن و کەڵک وەرگرتن لە ئاوی رووبارەکان و ژێر زەوی بڵاوبۆتەوە.

تاکو سەرەتاکانی ئەم سەدەیە کارێزەکانی هەولێر سەرچاوەی سەرەکی ئاوی شارەکەیان پێک هێناوە و بۆ خواردنەوە و بەکارهێنانی جۆراوجۆر سوودیان لێ بینراوە.

بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی ژیان و شارستانییەت و فراوانبوونی شارەکە، کارێزەکان لە رۆڵی جارانیان کەوتوون و لە توانایاندا نەماوە پێداویستی فراوانی دانیشتووانی شارەکە زامن بکەن، بۆیە هۆی ئامرازی تر کە بیرە ئیرتوازییەکان بەتێچوون و ماندووبوونی کەمتر مەیدانیان بە کارێزەکان چۆڵ کرد. کارێزەکان بریتین لە باشترین ئاوی ژێرزەوی کە بە راوەستاوی یان بە رۆیشتن و جووڵانەوە لە ژێر رووپۆشی زەویدا پارێزراوە. ئاشکراشە کە ئاوی ژێر زەوی یان بە شێوەی سروشتی و لەخۆوە وەکو سەرچاوە و کانیاوەکان دێتە دەرەوەو دەردەبێت، یان بە هۆی دەستکاری و بازووی ئادەمیزادەوە دەردەهێنرێت کە ئەویش شێوەو ئاوی کارێزەکانە.

درێژی جۆری کارێزەکانیش بەندە بەسروشتی رووی زەوی - مسامات-ی ژێرەوەی ئەو بەردو چەگڵ و گڵەی لێی پێک هاتووە. هەروەها بەندە بە قووڵی ئاوی ژێر زەوی ئەو ناوچانەی کە کارێزی تێدا هەڵدەکەنرێت.

چەندایەتی ئاوی کارێزەکانیش لە ناوچەیەکدا بۆ ناوچەیەکی تر، لە وەرزێکەوە بۆ وەرزێکی تر لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر بەگوێرەی چەندایەتی باران بارین و بایەخدان بەخاوێن کردنەوەیان کەمی، زۆری ئاوی سەر زەوی و ژێر زەوی ناوچەکە دەگۆڕێت.

سەرەڕای ئەمەش چۆنێتی سەروو لێژی - انحدار- کەلێنەکانی چین و پێکهاتووەکانی زەوی کاری راستەوخۆ دەکەنە سەر پرۆسەی کارێز هەڵکەندن[٦٢].

سەبارەت بە ناوچەی شاری هەولێریش، ئەو بەفرو بارانە زۆرەی لە زستان و بەهاراندا لە چیاکانی هەوراز شارەکە - رێژەی باران دەگاتە ٤٠-١٠٠ سم - دەبارێت، بێشک لەرێگای چینەکانی ژێرەوەدا بە هۆی سەرەو لێژی زەوی ناوچەکە بەرەو خوارووی رۆژئاوا واتە، بەرەو ناوچەکانی زوورگ و دەشتی هەولێر شۆڕ دەبێتەوەو دەڕژێتە عەمباراوە مەزنە سروشتییەکەی شاری هەولێر و دەوروبەری.

بۆیە بە ئاسانی لە گەلێک شوێنی ناوچەکەدا ئاوی ژێرزەوی دەرهێنراوەو جاری وایش هەبووە کە ئاوەکە بە پاڵە- پەستۆیی رێگای خۆش کردووە و هاتۆتە سەر زەوی.

جا هەر لە دێر زەمانەوە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە بە تایبەتی شاری هەولێر کەڵکیان لەم دیاردە سروشتییە پەسندە وەرگرتووە و لە بواری ئاو دەستگیر کردندا کارامەییان نواندووە و چاویان تەرازووی ئەندازیارییەکی باڵا بووە بۆ کارێز لێدان و دۆزینەوەی شوێنی بە ئاو و بیر هەڵکەندن.

**چۆنیەتی دروستکردنی پرۆژەکە**

پێش هەموو شتێک دەبێ بیرە قووڵەکەی سەرچاوە لێبدرێت و لەوێوە دەست پێ بکرێت، واتە، دەبێت یەکەم جار سەرچاوەکە دەستنیشان بکرێت، ئینجا لەوێوە دەست دەکرێت بە هەڵکۆڵینی تونێل (جۆگەی ژێر زەمینی - نفق) و بە پێی نەخشەیەک دەدرێت بە دەمییەوە. هەڵبەتە مرۆڤ توانایەکی دیاریکراوی هەیەو لەو بترازێ ئیتر ئەرکەکەی گران دەبێ و ناتوانێ خۆڵی تونێلەکە دەربداتە دەرەوە.

ئەوسا چەند کرێکارێک لە پێشترەوە دەست دەکەن بە هەڵکەندنی بیرێک وەستای لەغم لێدەر لە بنەوەی بەگوێرەی دەنگ دەزانێ کەوا نزیک یەکتری بوونەتەوە. کەواتە لەوێ بەیەک دەگەن. بە دوایدا ئەم کارە تا لەغم (جۆگەی ژێر زەمین - نفق) لێدانەکە درێژ بێتەوە یەک بیر لێدەدرێ تا دوا بیر کە ئاوەکە لەوێڕا دێتە سەر زەوی و (مفتاح) ی کارێزەکەی پێ دەڵێن، ئینجا بە جۆگەی سەر زەوی ئاوەکە دەڕواو دابەش دەکرێت.

لەغمی کارێزەکانیش زۆریان بەلەغمێک یان زیاتر لە بەینیاندا پێکەوە دەبەسترانەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بەری ئاوی یەکێکیان گیرا، ئاوەکە

**نەخشەی کارێزێك :**



**تێبینی: ئەم وێنەیە لە بەشی یەکەمی کتێبی (سنتان فی کردستان) بڵاوکراوەتەوە**

نەگەڕێتەوە دواوە بەڵکو بچێتە سەر ئاوی کارێزەکەی تر.

ماوەی نێوان بیرێک و یەکێکی تر (٤٢- ٥٠)مەتر دەبێت و ئەم بیرانەش بۆ دەردانی خۆڵی لەغمەکەو لە دواییدا بۆ خاوێنکردنەوەی جۆگەئاوە ژێر زەمینییەکە کەڵکیان لێوە دەبینرێ. سەرەڕای ئەوەی بۆ هەوا وەرگرتنیش پێویستن، چونکە دوای هەڵکەندنی ماوەیەک بە ژێر زەویدا هەوا کەم دەبێتەوەو ئەوانەی کاری تێدا دەکەن تەنگە نەفەس دەبن، هەناسەیان بۆ نادرێ بەڵام بیرەکان بە فریا دەکەون و هەوایان پێ دەگەیەنن[٦٣].

وایش دەبێ کارێزێک بەرەو سەرچاوەکەی لقی لێ بێتەوە و لە دوو جۆگەی ژێرزەمینی یان پتر پێک بێت تاکو ئاوەکەی لە فراوانترین ناوچەدا کۆبێتەوە.

### کەرستەو زاراوەکانی کارێز هەڵکەندن

ئەو کەرستانەی کە بۆ کارەکە بە کار دەهێنرێن ئەمانەن: (کوتک، قەڵەم، قولنگ، دەولک، چەرخ، کندر، گوریس، شریت، رەژوو- خەڵووز و چرای شیر باق).

خەڵووز بۆ تەنگە نەفەسییەکە سوودی هەبووە، ئەگەر دەرکەوتایە کە لە شوێنێکدا لەگەڵ بیر لێدان هەواکەی بۆ هەناسەدان نییە، ئێواران کە دەست لە ئیش هەڵدەگیرا کەمێ رەژوویی تێدا دادەنرا بۆ بەیانی کە ئیشیان تێدا دەکرد هەناسەیان سوار نەدەبوو.

دیارە ناو لەغمەکەش تاریک بووە و پێویستی بە رووناکی بووە، بۆ ئەمەش جۆرە چرایەک بە کاردەهێنرا کە رۆنی کونجی تێ دەکرا لەجیاتی نەوت بە رۆنی کونجی دەڵێن (شیرباق)و چراکەش بە چرای شیرباق ناودەبرا. هۆی بەکارهێنانی ئەم رۆنەش لەبەر ئەوەبوو چراکە هەم رووناکی زیاتر دەداو دووکەڵیشی کەمتر بووەو نەشدەکوژایەوە.

لە کاتی کارێز هەڵکەندنیش ئەم ناوەو زاراوانە بەکاردەهات: (لەغم - چەمبەرە - تەیان - مەنجەڵ- مفتاح..) لەغم جۆگە ژێر زەمینییەکەیە کە لە دواییدا ئاوی بەناودا دەڕوات و دەگاتە سەر زەوی. چەمبەریش ئەوەیە کە ئەگەر لە بەینێک لەغمەکە تەپی و بەری ئاوەکەی گرت و دوای دۆزینەوەی رێگای ئاوەکەی بە لەغمێکی تر لەو شوێنەدا دەگۆڕێن و بەمەش دەگوترێ چەمبەرە.

تەیان، دەست پێکردنی لەغمەکەیە لە سەرچاوەوەو مەنجەڵیش دوا بیر[٦٤] مفتاحیش ئەو شوێنەیە کە لە پاش دوا بیردا ئاوی جۆگای ژێر زەمینییەکە دێتە سەر زەوی، واتە، شوێنی سەردتایی ئاوی کارێزەکە لە سەر زەویدا.

### ئەو کارێزە گرنگانەی گەیشتوونەتە ناو شاری هەولێر

### ١- کارێزی ئاوی میری

هەر لە کۆنەوە بە یەکەم کارێز گوتراوە (کارێزی میری) لەوانەیە هەمان کارێزی سوڵتان مزەفەرەددینی کۆکبری بووبێت هەروەکو لە کتێبی (العراق الشمالی)دا باسی لێوە کراوە[٦٥].

بیرەکانی ئەم کارێزە بە دوو لق و لەسەر شێوەی زنجیرە بیرێک لە ناو زەویوزاری گوندی (حەسارۆک) کە بە حەوت کم کەوتۆتە رۆژهەڵاتی قەڵای هەولێر لێدراون هەردوو لقەکەیش لەسەر رێگای حەسارۆک- باداوە یەکیان گرتۆتەوە بەشێوەی زنجیرەیەک بیر و ژێرەوەش توونێلەکە - کارێزەکە- بەرەو شاری هەولێر

هێنراوە لە نزیک بەستی سێتاقان بەناو گوندی خاتووناوەدا کە ژمارەی پارچە زەوییەکی (١٢٤) تێپەڕیوە گەیشتۆتە شوێنی گەڕەکی بەلاشاوە، پشت خانووەکانی ئێستای یاسادانان و لەوێدا ڕێگای کۆنی (هەولێر - باداوە - گەڕەسوور)ی بڕیوە تا گەیشتۆتە شوێنی هاتنە سەر زەوی - واتە، مفتاحەکەی، کەوتبووە شوێنی ئێستاکەی بەشی پاراستن و دابەش کردنی ئاوی ناو شاری هەولێر، ڕۆخ یانەی مامۆستایانی هەولێر نزیک گۆڕەپانی ئاوی کەسک و سووری جاران - نافورە-[٦٦].

ئاوی کارێزی میری ئەوەندە زۆر بووە نیمچە رووبارێکی پێکهێناوە و سەرەڕای ئەوەی کە دانیشتووانی شارەکە بۆ خواردنەوە و بەکارهێنان پشتیان پێ بەستووە دەڵێن چەند ئاشێکیشی لەبەر گەڕاوە و ڕەز و شینایێکی زۆریشی لە ڕۆژئاوای شارەکە ئاوداوە. کە بۆ یەکەم جاریش ئێستگەی شەمەندەفەر لە هەولێر دامەزراوە بەڵێندەرەکان و هەڵسووڕێنەرانی کاروباری پرۆژەکە ئاوی ئەم کارێزەیان لە میری بەکرێ وەرگرتووە بۆ پێویستی و راپەڕاندنی ئیش و کاریان.. کوورەچییەکانیش کەڵکیان لە ئاوی میری وەرگرتووە بۆ زامنکردنی پێویستی کارگەکانیان.

لە چاوپێکەوتنێکماندا لەگەڵ نیشتەجێیەکی کۆنینەی شارەکە کە ناوی (حاجی حیلمی عومەر چاوشلییە)و تەمەنی لە(٨٠) ساڵ پتر دەبێت بۆی گێڕاینەوە و گوتی: لە کاتی خۆی وەستا فەتاحی کارێز هەڵکەن[٦٧] توانیویەتی جۆگەی ئاوی میری بگەیەنێتە نزیک مەرقەدی سوڵتان مزەفەرەدین کوکبری دیوی ڕۆژئاوای قەڵاکەو لەوێڕا ئاویان لە بەر بردووە.

لە ساڵی ١٩٢٤ دا و لە سەردەمی سەرۆکایەتی داوود ئاغای یەعقوبی بۆ شارەوانی هەولێر پەرە بە پرۆژەی گەیاندنی ئاوی خواردنەوە بۆ ناو شارەکە دراوەو پیتاکیان کۆکردۆتەوە و عەمبارێکی کۆنکرێتییان لە سەر قەڵا دروست کردووە[٦٨]. لە ئاوی کارێزی میرییەوەش بە هۆی بۆری ئاسنینەوە ئاو گەیەنراوەتە ناو شاری هەولێر و بە هۆی هێزی ترومپاشەوە فڕێدراوەتە ناو عەمبارە کۆنکرێتییەکەی سەر قەڵاو لەوێشەوە بە هۆی تۆڕە بۆڕیەکەوە و بە ڕێگایەکی سەرەتایی بەسەر شارەکەدا دابەش کراوەو هەندێ بۆری ئاویش لە گەڕەکەکانی قەراخ شار بۆ بەرژەوەندی گشتی دامەزرێندراوە.

ئەم کارەش بە یەکەم پرۆژەی هاوچەرخ دادەنرێ بۆ شاری هەولێرو دووەمین هەوڵی شارەوانی شارەکەشە لە رووی دابەشکردنی ئاوی خواردنەوە بەسەر دانیشتووانداا.

لە سەرەتای پەنجاکاندا ئەم کارێزە لە ئەنجامی ئەم دوو هۆیەی خوارەوە وازی لێ هێنراوەو کۆربۆتەوە:

١- خاوێن نەکردنەوەی و پشتگوێ خستنی.

٢- فراوانبوونی شارەکە و زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی و دامەزراندنی پرۆژەی نوێی گەشەسەندن تێدا وایان کرد کە ئاوی کارێزەکە بەشی شارەکە نەکات و بیر لە پەیداکردنی سەرچاوەی نوێ بکرێتەوە کە ئەویش هەڵکەندنی ژمارەیەک زۆری بیری ئیرتوازی بوو لە شارەکەدا لە لایەن حوکمەتەوە[٦٩].

## ٢- کارێزی کەسنەزان

بیرەکانی ئەم کارێزە لە کەسنەزانی عەلی پاشا لێدراون بە دەم ڕێگای کۆیە - هەولێر شۆڕبوتەوەو سێ بیریشیان دۆزراونەتەوە. بەرینی کارێزەکە سێ مەترە، مفتاحەکەیشی کەوتۆتە نزیک گۆڕستانی شێخ محەمەد لە دێی کەسنەزان - ١٥ کیلۆمەتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێرەوە دوورە. ئینجا لە وێڕا جۆگەی کارێزەکە بە سەر زەویدا و بە قەراخ ڕێگای کۆیە - هەولێر بەرەو دێی (حەسارۆک) شۆڕ دەبۆوە و بە ناوەراستی دێیەکەدا تێدەپەڕێ و دوای ئەوەی بەستی ئاوی بارانی لە قەراخ شاردا دەبڕی بە ڕۆخ ڕێگای هەولێر - حەسارۆکدا دەڕۆیشت تا دەگەیشتە ناو شاری هەولێر لە گەڕەکی سێتاقان و پشت - شەقامی کوردستان - شەست مەتری - لەگەڵ جۆگەی کارێز (جووجە محمد)[٧٠]یەکیان گرتووەو جۆگەیەکی گەورەی پڕ ئاویان پێک هێناوە و لە گەڕەکی سێتاقان نزیک گومرگی ئێستاکە، سێ تاق بە کەرپووچ بینا کرابوون و جۆگەکەش بە سەریاندا تێدەپەڕی، (شایانی باسە کە ناوی گەڕەکی سێتاقان لەم سێ تاقە کەوتۆتەوە) تا دەگەیشتە ناوەراستی شارەکە لای خوارووی قەڵاو ئاوی دەدرایە هەردوو مزگەوتی (شێخەڵڵا)و (خانەقا)و جۆگە

سەرەکییەکەش کە بە پوختەیی چاک کرابوو لە نزیک مزگەوتی ئاڵتی بەرماغ راستەوخۆ لە شوێنی ئوتێلی شارەزادی تێکدراو بەرامبەر چێشتخانەی تاجریان نزیک دەرگای سەرەکی قەڵا (دەرگای سەرا) حەوزێکی گەورەی لەبەر دروستکرابوو و ئاوەکەی دەرژایە ناو.

لە ساڵی ١٩١٣ دا دووبارە عەبدوللا پاشای عەباس ئاغا بە سەرۆک شارەوانی هەولێر دامەزراوەتەوە، هەڵساوە ئەم حەوزەی لە نوێ بە قسڵ(٧١) و مشکی حەمامی قەڵاتێ پوخت و رێک بە قەوارەی شەش مەتری چوارگۆشە دروست کردووە.

ئەم کارەش بە دیارترین ئیشێکی ئەم سەرەک شارەوانییە لە قەڵەم دەدرێ و یەکەم چالاکی شارەوانی هەولێرە لە مێژوویداو هەروا بە یەکەم پرۆژەی سەرەتایی زامنکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ شاری هەولێر لەم چەرخی بیستەمدا دەژمێردرێت کە لە سەردەمی عوسمانلییەکان جێبەجێ کراوە.

ئاوی ئەم حەوزە تا ناوەراستی بیستەکان کە دووەم پرۆژەی ساکاری ئاو دابەشکردن بە هۆی تۆری بۆری ئاو و حەوزە کۆنکرێتییە گەورەکەی قەڵا دروست کرا، سەرچاوەی سەرەکی ئاوی دانیشتووانی شارەکەی پێکهێناوە.

دانیشتووانی قەڵا و گەرەکە کۆنەکانی تری شارەکەو سەقایەکان ئاویان لەم حەوزە بۆ خواردنەوەو بەکارهێنان بردووە.

پیاوەکان بە کوندەو ئافرەتەکانیش بە جەرەو تەنەکە و بەرمیل ئاویان بە پارە لە سەقایا و ئاو فرۆشەکان دەکری.

سەقاکان ئاویان لە راویە دەکرد و بە هۆی بارگین و گوێدرێژەکانیانەوە دەیان گواستەوە و بە کۆڵانەکانی قەڵاو گەرەکەکانی تریان دەگێراو راویە ئاوێکیان بە دوو عانە یان عانەیەک دەفرۆشت. هەندێکیشیان دوو کوندە یان شەش جەرەیان بە هۆی مەحمەلەوە لەسەر پشتی گوێدرێژەکانیان قایم دەکردن و بۆ فرۆشتن دەیانگێران. کوندە یان جەرە ئاوێکیان بە عانە - چوار فلوس - دەفرۆشت. هەندێ جاریش هەرزانیان دەکرد و کوندە یان جەرە ئاویان بە عانەیەک دەدا.

لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا ئەم سەقایانەی خوارەوە ئاویان لە قەڵاو گەرەکە کۆنەکانی تری شاری هەولێر دەفرۆشت و بە سەقا ناسرابوون:

(مشکۆ - ساڵح - وەهاب - عەزیز- سەعید و شەهاب)(٧٣).

## ژمارەیەک لە کارێزەکانی تری شاری هەولێر و دەوروبەرەکەی

ژمارەیەک لە کارێزەکانی دیکەی شاری هەولێر و دەوروبەرەکەی: جگە لەو کارێزانەی باسمان کردن لەناو شاری هەولێر و گوندەکانی دەوروبەریشیدا ژمارەیەکی زۆری دیکە کارێز هەبوون و ئاوەکەیان بە ناوچەکەدا دەبەخشی کە ئەمە ناوی بەشێکیانە(٧٤).

١- کارێزی سەعید ئاغا دەکەوێتە لای سەرووی هەولێرەوە.

٢- کارێزی شێخ ئەحمەد سەرچاوەکەی لە گەرەکی بەستە پیازە بوو ئێستا بووە بە ژێر خانووەوە(٧٥).

٣- کارێزی پیرەش سەرچاوەکەی لە گوندی پیرەشە.

٤- کارێزی قاسم ئاغا(٧٦).

٥- کارێزی ئەسعەد ئەفەندی.

٦- کارێزی ئاروەندی.

٧- کارێزی شێخ زادە سەرچاوەکەی لە گوندی عارەب کەندە.

٨- کارێزی سەردار.

٩- کارێزی مەیتەر.

١٠- کارێزی حلێر سەرچاوەکەی گوندی قونیانە.

١١- کارێزی حاجی ئەلیاس.

١٢- کارێزی قەتەوی سەرچاوەکەی گوندی قەتەوییە.

١٣- کارێزی شەهاب سەرچاوەکەی لە گوندی داڵداغانە.

١٤- کارێزی مام رەش سەرچاوەکەی لە گوندی زکاوە.

١٥- کارێزی قوڕیتان سەرچاوەکەی لە قوڕیتانە.

١٦- کارێزی مورتکە لە گوندی مورتکەیە لە نێوان شاری هەولێر و ناحیەی قوشتەپەیە.

١٧- کارێزی قوشتەپە لە ناو گوندی قوشتەپەی گەورەیە.

١٨- کارێزی باغەمنارە بیرەکانی لە شوێنی گەرەکی کورانی ئێستاکە بوون و رێگای هەولێر - قونیانیان بڕیوە تا گەیشتۆتە گوندی باغەمنارە لە رۆژئاوای شاری هەولێر.

١٩- کارێزی تووڕەق لەگەڵ

کارێزی (وەند) یەکیان گرتووە و بە رۆخی رێگای هەولێر - تووزەق دا رۆیشتووە[77] و ئاوەکەی گەیشتۆتە هەولێری ئێستاکە.

کارێزی خرنی بابە[78] بیرەکانی ئەم کارێزە کەوتۆتە هەوراز گوندی بنەسڵاوەی گچکە لەلای باکووری رۆژهەڵاتی شاری هەولێر مفتاحەکەشی کەوتۆتە گوندی بنەسڵاوەی گچکە و لە وێرا بەرەو گوندی بنەسڵاوەی گەورە شۆڕدەبێتەوەو گەیشتۆتە گوندی باداوە باخچەو رەزە گەورەکەی مەلا ئەفەندی (مەلای گچکە)ی ئاوداوە. سەرەرای ئەوەی سەرچاوەی سەرەکی ئاوی خواردنەوەو بەکارهێنانی دانیشتووانی گوندی باداوەی قەراخ شاری هەولێری پێک هێناوە.

**کارێزەکانی هەولێر لە نێو لاپەرەکانی مێژوودا**

لە گەلێک سەرچاوەی مێژوویی کۆن و نوێ باسی کارێزەکانی هەولێر کراوە. یاقووتی حەمەوی کە لەسەردەمی میرنشینی ئەتابەکییەکان لە هەولێردا (١١٢٨-١٢٣٣ز) دوو جاران سەردانی شارەکەی کردووەو لە بەرگی یەکەمی موعجەم بولدانەکەیدا باسی کردووە و لەبارەی ئاوی شارەکە و کارێزەکانیدا دەڵێ: «.. کشتوکاڵی ئەم شارە پشت بە ئاوی باران و کارێزەکانی دەبەستێت. ئاوی ئەم کارێزانەش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئاوی رووباری دیجلەدا نییە...»[79].

یەکەم حاکمی سیاسی ئینگلیز لە شاری هەولێردا لە ماوەی نێوان (١٩١٨-١٩٢٠) کە ناوی کاپتن های بووە یاداشت و سەرنج و تێبینییەکانی ئەم ماوەیەی نووسیوەتەوەو کردوونی بە کتێبێک و کتێبەکەیش کراوەتە عەرەبی و بە دوو بەش بە ناونیشانی: (دوو ساڵ لە کوردستاندا) بڵاو کراوەتەوە.

کاپتن های باسی جوگرافیای شاری هەولێرو باری ئابووری ناوچەکەمان بۆ دەکات و لە بواری ئاوی ژێرزەوی و کارێزەکانی هەولێردا نووسیویەتی و دەڵێ: «بەهەرحاڵ سەرچاوەی سەرەکی ئاوی شاری هەولێر و دەوروبەری بریتییە لە کارێزەکان.. کارێز، وشەیەکی فارسییەو لە زنجیرە بیرێکی یەک لە دوای یەک کە لە ژێردەوەش بە جۆگەیەکی ژێرزەمینی بە یەکتری دەبەسترێنەوە، پێکهاتووە. قووڵی بیرەکانیش چەند سەردولێژ بینەوە کەمتر دەبێ واتە، قووڵی بیری دواتر لە هینی پێشە خۆی کەمترە. جۆگەکەش لە دواییدا ئاو دەگەیەنێتە سەر زەوی کە بە ئاسانی بۆ ئاودان بەکاردەهێنرێت.

ئەوەندە ئاوەش کە بەم شێوەیە دەستگیر دەبێ لە توانایدا هەیە دوو یان سێ ئاش بگێرێ، تەنانەت کارێزی واش هەبووە کە ئاوێکی زۆری هەبووەو لەم ژمارەیە زیاتر ئاشی لەبەر گەڕاوە.

کارێزیش تەنیا لەم جۆرە ناوچەیە دروست دەکرێت کە خاکەکەی لە سەرەوە بەرەو خوار سەرەولێژ دەبێتەوە بە تایبەتی لە ناوچەی زوورگ و پێدەشتی دامێن شاخەکان.

نووسەری ناوبراو لە بارەی ژمارەی کارێزەکانی دەشتی هەولێر لە مێژوودا نووسیویەتی: کە لە سەردەمی عەباسییەکاندا (٣٦٥) کارێز لە ناوچەکەدا هەبوون و تەنانەت رێگای نێوان شاری هەولێرو ئاڵتوون کۆپری بە چەشنێک دارو درەخت و شینایی پۆشیوە کە باڵندەیەک توانیویەتی بێ نیشتنەوە بۆ سەر زەوی بە هەڵفڕین لە سەر چڵی دارێکەوە بۆ سەر چڵی دارێکی تر نێوانەکە ببڕێت..

لەو گومبەتە خۆڵانەی کە گەلێک شوێنی ناوچەکەیان داپۆشیوە بریتین لە پاشماوەی بیرە لێدراوەکانی کارێزەکان. هەروا ئێستاکە (سەرەتاکانی ئەم سەدەیە) (٦٠ کارێز) لە شاری هەولێرو دەشتەکەی دەوروبەریدا بەکاردەهێنرێ و کارێزە کۆنەکانیش دووبارە دەرددەدرێنەوە[80].

کاپتن هایی نووسەرو فەرمانڕەوای ئینگلیزەکان لە شاری هەولێر لەبارەی باشترین کارێز هەڵکەنی ئەوسای شارەکە نووسیویەتی و دەڵێ: (پیرەمێردێک دەژیت ناوی وەستا فەتاحە، ئەم کابرایە لە کاروباری کارێز هەڵکەندندا بە پسپۆر ناسراوە. بۆ نموونە لە توانایدایە ئەو شوێنە دەستنیشان بکات کە ئاوی ژێرزەوی زۆرەو پێویستە کارێز لەوێ لێ بدرێ.. جا چ بۆ دەردانەوەی کارێزێکی کۆربووەوەی کۆن یان هەڵکەندنی کارێزێکی نوێ بێت و بنەماڵەی ئەم وەستا فەتاحە هەر لە کۆنەوە بابەلباب لەم پیشەیە بە پسپۆرو زانا ناسراون.. ئێستاکەش کوڕەکەی وەستا فەتاح ئامادەیە شوێنی باوکی بگرێتەوە).

هەڵکەندنی کارێزیش- های گوتوویەتی - کارێکی ئاسان نییە

بەڵکو پڕ لە مەترسییە، چونکە بنمیچی لەغمەکە هیچ کۆڵەگەیەکی یان پشتگیرێک رایناگرێت، بۆیە جار هەبووە کارێز هەڵکەن کەوتۆتە ژێر لەغمەکەو کارێزەکە بۆتە گۆڕی [81].

مێژوونووسی عێراقی هاوچەرخیشمان مامۆستا عبدالرزاق الحسنی لەلاپەرە (٢٣٩)ی دانراوە بەنرخەکەیدا (العراق قديما وحديثا) لەباسی شاری هەولێردا لە کارێزەکانیش دواوە و دەڵێ: (کارێزەکان، کۆی کارێزە.. کارێزیش بریتییە لەزنجیرە بیرێک کە لەژێر زەوی بەجۆگەیەک بەیەکەوە دەبەسترێنەوە، بەرینی ئەم جۆگەیەش بە بالای پیاوێک دەبێت. بیرەکانیش بەقووڵی (٦٠- ٨٠) پێ لێدەدرێن نێوان هەر بیرێکیش لەگەڵ یەکێکی تر دەوروبەری (١٠٠) پێ دەبێت و دەبێت بیرەکان و جۆگەکەیش بەرێڕەوێکی راستەڕێ لێبدرێن).

مێژوو نووسی ناوبراو لەسەر نووسینەکەی بەردەوام دەبێت و دەڵێ: (کارێزەکان کۆنن و ئێستاکە کەس بەتەواوی سەری لەم کارە دەرناچێت. لە سەردەمە دێرینەکانیشدا هەر ئەم کارێزانە بوونەتە هۆیەکی مانەوەی شاری هەولێر و بەردەوامبوونی ژیان و ئاوەدانی تێیدا. چونکە داگیرکەرەکان زەفەریان پێ نەبردوون نەیانتوانیوە کاولیان بکەن و بیانرووخێنن هەروەکو چۆن نۆکەندەکانی ئاودێری بابل و ئوورو شارەکانی تری باشووری عێراقیان کاول کردوون [82].

**٤- پرۆژەی ئیفراز بۆ ئاوی هەولێر**

لە سەردەمی عوسمانییەکان لە عیراقدا (١٥٤٣-١٩١٨ز) رژێمی ئەو کاتە بیری لە هەڵکەندنی نۆکەندێک لە دەم رووباری زێی گەورە لە نزیک گوندی (گرد مامک) کردۆتەوە تاکو بەهۆیەوە ئاوی رووبارەکە بگەیەنرێتە شاری هەولێر. بەڵام کە زانیویەتی پرۆژەکە زۆری تێ دەچێت وازی لێ هێناوە و پشتگوێ خراوە [83].

جا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە دوای جێبەجێ کردنی پرۆژەکەی سەنحاریب حەفتسەد ساڵ بەر لە زایین تاکو شەستەکانی ئەم سەدەیەی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا و ئەلکترۆنی و چوونە سەر مانگ هیچ پرۆژەیەکی دیکەی ئاودێری تایبەت بە گەیاندنی ئاوی رووبارێک بۆ شاری هەولێری گرنگ و هەمیشە ئاوەدان بە ئەنجام نەگەیەنراوە. بۆیە لە دوای وشکبوونی کارێزەکانی شارەکە پەیتا پەیتا دەست کراوە بە لێدانی بیرە ئیرتیوازییەکان.

بەڵام ئەگەر چی تا دەهات زێتر بیر لێدەدران لە توانایاندا نەبووە پێویستی بەردەوام و فراوانبووی دانیشتووانی شارەکە بۆ ئاو زامن بکەن.

**یەکەم پرۆژەی ئیفراز بۆ هەولێر**

لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٨دا ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە (هەڵوەشاوەتەوە) بیرۆکەی جێبەجێ کردنی پرۆژەیەکی پەسند کردووە کە بەهۆیەوە ئاوی خواردنەوە لە زێی گەورە بۆ شاری هەولێر رابکێشێت. لە رێکەوتی (١٩٦٤/٤/٩)یشدا بە هۆی رۆژنامەکانی ناوخۆوە موناقەشەی پرۆژە پەسند کراوەکە بۆ بەڵێندەرەکان بڵاوکراوەتەوەو لە رۆژی (١٩٦٥/٤/١١) بە (٨٤٢٥٠٠) دینار دراوەتە بەڵێندەرەکان و لە بەرواری (١٩٦٩/٧/٢١)دا دووەمین پرۆژەیەکی گەورە بۆ چارەسەرکردنی گیرو گرفتی کەم ئاوی شاری هەولێر جێبەجێ بووە و ئاوە سازگارەکە گەیشتۆتە شارە تینووەکە [84].

**چەند زانیارییەک لەبارەی پرۆژەکە:**

١- سەرەتاو بنکە سەرەکییەکەی پرۆژەکە لە گوندی ئیفراز، لە قەراخ زێی گەورە کە دەوروبەری (٣٠) کیلۆمەتر لە شاری هەولێر دوور دەبێت. ناوی ئەم گوندەش بە سەر پرۆژەکە دابراوە.

٢- پرۆژەکە بریتییە لە ژمارەیەک ئامێرو جیهازی سەرەکی و چەند خانوو عەمباراوێک.. بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ/ چوار ترومپای ئاو راکێشان و فرێدانی لەسەرخۆ توانای هەر یەکێکیان لە سەعاتێکدا فرێدانی (١٠٤٢٥٠) گالۆن ئاوی خاوێنە بەرەو شاری هەولێر.

ب/ دوو گۆماوی بازنەیی کە بە خەباتەی میکانیکی بزوێن کار دەکەن و ئاو لە خڵت و لیتە و هەر نابەدڵی دیکە پاک دەکەنەوە. تواناشیان لە سەعاتێکدا پاک کردنەوەی (٤٢٤٥٥٠) گالۆن ئاوە.

ج/ئاو پاڵێوەکان دوای نیشتنەوەو پاک کردنەوەی ئاو بەهۆی گۆماوەکەی سەرەوە هەر شتێکی نەشیاوی تێدا مابێت بە هۆی ئەم پاڵاوتن کە ژمارەیان (٢٨) دانەیە خاوێن دەکرێنەوە.

د/ئامـــرازی شـــەب تێكردن و پاككردنەوەی بە كلۆرین.

ه/ ژمـارەیەک قـفـڵ و پێـوەرو ئامرازی تایبەتی رێكخستن و دەست بەسەرداگرتن و پاراستنی تایبەت بە پرۆژەكە.

و/گۆماوی عەمباراوەكە كە ئاوی تێدا كۆ دەكرێتەوە بەرەو هەولێر فڕێی دەدات و تواناشی نیـو ملیـۆن گـاڵۆن ئاوە لە رۆژێكدا.

٣- عـەمـبـاراوێكی تایبـەت بە پرۆژەكە لە گەرەكی سەیداوە دانراوەو بە ٤٥٠ پێ لە ئـاسـتـی پرۆژەكـــە بەرزترە.

٤- بەرینی ئەم بۆریەی كـە ئاوی پرۆژەكە دەگـوازێتـەوە شاری هەولێـر ٧٠ سانتیمەترە[٨٥].

لە سـاڵانی دوایـیـشـدا پەرە بەم پرۆژەیە دراوە و دوو ترومـپـای ئاو فرێدانی لەسەرخۆ و دووانی تر بۆ ئاو بەرز فـرێدانی خـراونەتە سـەر كـە لەلایەن كۆمـپانیـایەكی ئیـتالییـەوە دامەزرێنراون. بە نیازی بە هێزكردنی ئاو فـرێدەرە لەسەرەخۆكـانی پرۆژەكە دوو تـرومـــــپـــــای تر لـەلایـەن بەرێوەبەرایەتی پارێزگـای هەولێـر بۆ دانراون. لە قـــەراخ شـــارۆچكەی عـــەنكاوەشـــدا وێـــستـگەیەكی بەهێزكردن (تقویە)ی بۆ دامەزراوە كە بریتـــیـــیـــە لە چوار ترومـــپـــا و عـەمـبـاراوێک و چەند ئامـێرێكی دەست بەسـەرداگـرتن و رێكخـستن و دابەشكردنی ئاو.

بە كورتی بەرفراوانكردنی پرۆژەكە توانای یەكـجـاری (٥/٨) ملیـۆن گالۆن ئاوە[٨٦].

**پرۆژەیەكی نوێی ئاوی هەولێر**

لە ئەنجـــامی فـــراوانبـــوونی بەردەوامی شـــارەكـــە و زۆربوونی ژمارەی دانیشتـووانی بە شێوەیەكی نا سروشـتی كە ئەمـەش هۆی تایبـەتی خۆی هەیە و لێرەدا بواری باسكردنمان نییە[٧٨].

هەروا لە ئەنجـامی پەرەسـەندنی خـانوو بینا دروسـتـكردن و ژیانی شـارسـتـانیـــمـان و بەرزبوونەوەی هۆشـیـــاری تەندروسـتی و رادەی رۆشنبیـری جـەمـاوەر بەشێـوەیەكی گشتی بەردەوام پێویستیی كۆمەڵانی خەڵک و دانیشـتـووان بۆ ئاو پتر و فراوانتر دەبێ. بۆیە لە بەر رۆشنایی ئەم بارەدا دیاردەی گـیروگرفـتی كـەم ئاوی مـۆركی بەردەوامـیی بەخـۆیەوە گرتووە.

بۆ چارەسەركردنی ئەم گیروگرفتە و كـەلک وەرگـرتنی زێتـر لە ئاوی رووباری زێی گـــەورە دامـــەزراوەی گشتی جێبەجێ كردنی پرۆژەكانی ئاو و زێراب لە سـاڵی ١٩٧٩دا دەسـتی بە جێبەجێكردنی پرۆژەیەكی نوێ كرد كە (٣٤٢٨٥٨٧) دیناری بۆ تەرخان كـراو لە سـاڵی ١٩٨٣ دا لەلایەن بەڵێندەرە جێبـەجێكەرەكـان كـەوتە بەرهەمـهـێنان لە سـاڵی ١٩٨٤ یش بەرێوەبەرایەتی ئاو و زێرابەكـــانی پارێزگای هەولێر پرۆژەكەی بە تەواوی وەرگـرت و ئێـــســتـــاكـــەش لە ژێر ســـەرپەرشـــتی كـــردنی ئەندازیـارو كرێكارە كوردەكـانی خـۆمـان لە كـار دایەو بەشداربیەكی كاریگەر دەكات بۆ چارەسەر كردنی گیروگرفتی ئاو لە شارەكەدا.

لـە رووی هـونـەریـــــــــەوەو ناوەرۆكیشەوە ئەم پرۆژەیە بریتییە لە شـەش ترومـپـــای ئاو فـــرێدانی لەسـەرەخـۆ كە لە ئیـفراز دانراون لە رۆخ پرۆژە كۆنەكە. لەم ترومپایانەش چواریان كار دەكەن و دووان بۆ یەدەک دانراون.

پرۆسێسی نیشتنەوەی ئاو و جودا بوونەوەی شـتـە نابەدڵەكـان و خـاوێن كـردنەوەی ئاو لەم پرۆژەیەدا بە هۆی شەب و ١٢ ئاو پاڵێوەكان بە ئەنجام دەگەیەنرێن و ئاوە پاڵێوراوەكـەش لە عەمباراو دەكرێت و لە ژێر چاودێری بەردەوام بـە مـــــــادەی كـلـۆر پـاک دەكرێتەوە.

لە عـەمـبـاراوەكـەشـەوە بە شـەش ترومـپـا ، كـە چواریان كـار دەكـەن و دووانیـش یـەدەكـن، ئـاو بـۆ هـەردوو عـەمـبـاراوی سـایلۆ و تەیراوە لە ناو شـــــــار فـــــرێ دەدرێ و تـوانـای عـەمـباراوێكیش یەک ملیـۆن گـاڵۆن ئاوە.

توانای تێكڕای ئەم پرۆژەیەش لە رۆژێكدا (١٤-١٥) ملیـۆن گـالۆن ئاوەو ئێـســتـاكـەش - ١٩٨٤ ئاوی پرۆژەی ئیفراز لەگەڵ ئاوی بیرەكان بە سـەر بەشـێكی زۆری گـەرەكـەكـانی شـاری هەولێـر دابەش دەكرێ تەنیـا چەند گـەرەكـێک نەبێت كـە تەنیـا پشت بە ئاوی بیرەكان دەبەستن[٨٨].

لەبارەی خـــاوێنی ئاوی هەردوو پرۆژەكـەشـەوە دكـتـۆر نافع ئاكـرەیی نووسـیـویەتی: (... ئەرێ ئەو ئاوەی دەیخۆینەوە پاكە.. ؟ لێرەدا بە شادی و شانازییەوە خەبەرێكی خۆش دەڵێم كە لە پاش پێشكەشكردنی باسێكی زانستی سەر كانییە ئاوەكانی عێراق كە لە كۆنگرەی ١٧-١٩/٥/١٩٨٣ دا پێـشـكـەش كـراو تایبـەت بوو بۆ «چاككردنەوەی ژینگەی عێراق» و لە وەزارەتی تەختییت بەسترا، وا ئاشكرا كـرا كـە ئاوی هەمـوو رووبارەكـانی

عێراق ئالوودەیە، جگە لە ئاوی زێی بادینان نەبێ کە ئێمە شاری هەولێر دەیخۆینەوە. ئەمەش بە هۆی ئەو تەقینە مەزنەی پیشەسازی لە ولاتدا..

بەڵام ئێمە زیاتر لە ئاوی زێی بادینان ئاوی بیرە ئیرتوازییەکانیش دەخۆینەوەو ئاوی زێ تا دەگاتەماڵەکان بەچەند قۆناغدا تێدەپەڕێ.. گواستنەوە و کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوە بە سەر ماڵەکاندا و تێکەڵاوبوون لەگەڵ ئاوی بیرەکان.. ئایە لەم قۆناغانەدا تووشی ئالوودەیی نابێت..؟ ئەمەش کاری دەزگای ئاوەو وابزانم درێغی کەمە لەم بوارەدا)[89].

د. نافع دەڵێ ئێمە زیاتر لە بیرەکان دەخۆینەوە..

کەچی لە راستیدا و بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی لە بەڕێوەبەرایەتی ئاوی هەولێر دەستمان کەوتوون و بڵاومان کردنەوە دەرکەوت کە بەرهەمی هەردوو پڕۆژەکەی ئیفراز ئێستاکە لە بەرهەمی بیرەکان پترە و بەرهەمی بیرەکانیش لە حاڵەتێکی گۆڕاودایە پتر لە کورتی دەدات.

دکتۆری ناوبراو دەپرسێت و گومان لەمە پەیدا دەکات کە تۆ بڵێی ئاوی زێی بادینان کە سەرچاوەی پڕۆژەی ئاوی هەولێرە، لە ئەنجامی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی و تێکەڵاوبوونی لەگەڵ ئاوی بیرەکانی هەولێر تووشی ئالوودەیی نەبێت؟!.

لە وەڵامدا دەڵێین:

١/ بە گوێرەی پشکنین و تاقیکردنەوەی ئاوی بیرەکانی هەولێر لە رووی کیمیاوی و بەکتریۆلۆجییەوە دەرکەوتووە کە پاکترین ئاوەو لە خاوێنی بە دوو پلە بەر لە ئاوی رووبارەکانەوە دێت. جا ئەگەر کەمتەرخەمی نەبێت و دیارە دکتۆریش هەوڵی نەداوە لە نزیکەوە لە سەر واقعی سەرپەرشتیکردنی سەر پاککردنی ئاوی پڕۆژەکە بوەستێ.. بۆ لە کاتی کۆکردنەوەو کاروباری پالاوتن و پاککردنەوە و گواستنەوەیدا ئالوودە دەبێت؟! خۆ کۆکردنەوەو کاروباری پالاوتن و پاککردنەوە و گواستنەوەی ئاوەکە لە یەک کاتدا بە هۆی نوێترین ئامرازو ئامێری هاوچەرخ و تایبەت بە ئەنجام دەگەیەنرێن.

٢/ ئەگەر ئاوی بیرە ئیرتوازییەکان لە ئەنجامی کارتێکردنی ژینگەی ژێرزەوی شارەکە و کەمتەرخەمی نواندن لە پاککردنەوەیدا ئالودە نەبێت کە دەبوایە کاکی دکتۆر پتر لەم خاڵە مەترسیدارەی بکۆڵیبایەوە و پێشنیاری زانستییانەی بخستایەتە روو چۆن دەبێ گومان لەمە پەیدا بکەین کە ئاوی زێی بادینان بە تیکەڵاو بوونی لەگەڵ ئاوی بیرەکان ئالوودە دەبێت؟. سەرپەرشتی کردنی ئەم کارەش وێڕای دەزگای ئاوی پتر ئەرکی مەڵبەندی تەندروستی پاراستنی ژینگەی مرۆڤە لە هەولێرو کەمتەرخەمی نواندنیش مەترسی بۆ سەر تەندروستی دانیشتووانی شارەکە پەیدا دەکات.

### پەراوێزەکان

(١) ئەگەرچی شاری هەولێر لە رووی جوگرافییەوە کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی گەورەو بچووک (الزاب الاعلی و الزاب الاسفل) بەڵام یەکەمیان بە (٣٠)کم و دووەمیشیان بە (٥٠)کم لە شارەکەوە دوورن تا کۆتایی شەستەکانی ئەم سەدەیە (سەدەی بیستەم) کە پڕۆژەی ئیفراز لەبەر ئاوی (زێی گەورە) دروست کرا، هیچ کام لەم دوو رووبارە گەورەیە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی کەم ئاوی لە شاری هەولێردا کەڵکیان لێ نەبینراوە.

(٢) بان = هضبة- دائرة المعارف الاسلامية، مادة (اربل)

(٣) ئەم ژمارانەمان لە ڕێکەوتی (١٩٨٤/٨/١٥) لە بەڕێوەبەرێتی سەرژمێرگەی پارێزگای هەولێر وەرگرتووە.

(٤) ئەمە ئەگەر بێتو هەردوو پڕۆژەکە و بیرەکان لە کارکردنی بەردەوام دابن..

(٥) ئەم زانیاریانەمان لە بەڕێوەبەرێتی ئاو و زێرابەکانی پارێزگای هەولێر وەرگرتوون.

(٦) موسوعة العراق الحديث، تاليف خالد عبدالمنعم العاني، ل ٤٠.

(٧) جوگرافیای ولاتی عێراق، دانانی (بسام عبدالرحمن، حسين مجيد زلفو، ابراهيم تركي)، چاپی یەکەم، بەغدا ١٩٨٤، ل ٢٧.

(٨) مجلة سومر مجلد(٢)، قسم الثاني تموز ١٩٤٦، ص ٢٧٩.

(٩) اربيل في ادوارها التاريخية، دانانی زبير بلال اسماعيل، چاپخانەی (النعمان) نەجەف ١٩٧١، ل ٧١.

(١٠) حدياب.. اربيل.. وعشتار.. اربيلا نووسینی فؤاد جميل گۆڤاری (سومر) بەرگی (٢٥) ساڵی ١٩٦٩.

(١١) اربيل في ادوارها التاريخية نقلا عن رحلة متنكر لسون ل ١٤٧.

(١٢) بڕوانە: هەمان سەرچاوە ژمارە (١٠) ل٧٤

(١٣) طه باقر، جولات تاريخية بين مواطن الابار في شمالي العراق - گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم بەشی یەکەم ١٩٧٥ بەشی عەرەبی، ل ٦٣٦.

(١٤) فؤاد سفر، اعمال الأرواء التي قام

بها سنحاريب، گۆڤاری (سومر)، بەرگی سێیەم بەشی یەکەم ١٩٤٧.

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٦) گۆڤاری سومر بەرگی دووەم ١٩٤٦.

(١٧) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(١٨) مجلة سومر مجلد (٣٠)، قسم الأول ١٩٤٧.

(١٩) کەوتۆتە نزیک گوندی بەحرکە باکووری رۆژهەڵاتی هەولێرەو بە (٢٠)کم لە هەولێرەوە دوورە.

(٢٠) مەبەستمان لە کوناوەدر (نفق) ە، مامۆستای ئەمر گیو موکریانی لە فەرهەنگی مەهابادا وای لێکداوەتەوە.

(٢١) فؤاد سفر اعمال الأرواء التي قام بها سنحاريب، مجلة سومر مجلد(٣٠)، قسم الأول ١٩٤٧.

(٢٢) ئاشکرایە کە قەڵای هەولێر دەستکردە و تووردەگەڕێژەو بە درێژایی مێژوو رۆژگار وا بەرز بۆتەوە.

(٢٣) مجلة سومر مجلد(٣٠)، قسم الأول ١٩٤٧.

(٢٤) تۆ بڵێی نەریتی لەسەر نووسینی بەردی بناغەی پرۆژە جێبەجێکراوەکانی ئەم سەردەمە بەناوی سەرک دەوڵەت و گەورە لێپرسراوانەوە، لەم جۆرە نووسینانەی سەنحاریبەوە سەری هەڵنەدابێت؟.

(٢٥) رووباری بەستۆرە لەچیاکانی سەفین و پیرمام بانی باوەداغ هەڵدەقوڵێت و دوای رۆیشتنی دەوروبەری (٥٠)کم بەرەو لای باکووری رۆژئاوا لە رووباری زێی گەورە دەکاتەوە.

دیارە ئەم چیایانەی لەسەرەوە ناومان هێنان لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا بەچیاکانی - خانی- یەوە ناسراون. لەوانەشە ناوی بەرزاییەکانی نزیک بەستۆرە سەر رێگای هەولێر - سەلاحەددین، (خانزاد) لەم - خانی - یەی سەردەمی ئاشوورییەکانەوە مابێتەوە ...المرشد الى مواطن الاثار، الرحلة الخامسة.

(٢٦) ئێمە لەم نووسینەماندا بۆ وشەی (قناة)ی عەرەبی هەردوو وشەی (تۆکەند) و جۆگە بەکاردەهێنین لە بەشی کارێزەکان لەغم و توونیل یش بۆ ئەم مەبەستە بەکارهاتوون.

(٢٧) مجلة سومر مجلد (٣٠)، قسم الثالث ١٩٤٧

(٢٨) راستتر وایە کە سەنحاریب پرۆژەی ئاوەدانی هەولێری لە ساڵی (٦٩١-٦٩٠) پ.ز. تەواو کردبێت هەر لەم ساڵەشدا پرۆژەکەی ئاوەدانی نەینەوای پایتەختی جێبەجێ کردووە.. (زبير بلال اسماعيل- قناة باستور، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٧) ل ١٤٠).

(٢٩) فؤاد سفر، اعمال الأرواء التي قام بها سنحاريب، مجلة سومر مجلد (٣٠)، ١٩٤٧.

(٣٠) سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: (موسوعة العراق الحديث) داناني خالد عبدالمنعم العاني، ل.٥٢

(٣١) لەبارەی قووڵی بیرەکان لە عێراقدا لە (موسوعة العراق الحديث) دا هاتووە کە (قووڵی بیرەکان لەناوچە نیمچە شاخاوییەکاندا لەنێوان (٥-٣٠) م دایە. لە دەشتی هەولێر لەنێوان (٦-٢٥) مەترە... هتد) هەروەها لە(معجم البلدان)ی یاقوتی حەمەویشدا هاتووە کە ئاوی ناو بیرەکانی شاری هەولێر بەچاو دەبینرێت. واتە، زۆر قووڵ نین.

جا لەکاتی خۆی کە دانیشتووانی شارەکە لەچاو ئێستا گەلێک کەمتر بوون ژمارەی بیرەکانیش بەگوێرەی پێویست کەم بوون و بەفر و بارانیش جاران پتر دەباری، کەواتە لەژێر زەوی ناوچەکە پڕ ئاوتر بووەو مەنسووبی ئاوەکەش لەزەوی نزیک بووەو چەند بەژنێکیان لێداوە ئاو دەرچووە.

(٣٢) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ زەویناس کاک موعتەسەم نەکردم حەسەن لە بەڕێوەبەرێتی ئاوی ژێر زەوی پارێزگای هەولێر، رێکەوتی (١٩٨٤/٧/٢٦).

(٣٣) ياقوت الحموي، معجم البلدان، المجلد الأول، مادة (اربل) طهران ١٩٦٥، ل١٨٦.

(٣٤) زبير بلال اسماعيل، اربيل في ادوارها التاريخية، ل ٤٠.

(٣٥) هەندێ سەرچاوە و تەمەن درێژی شاری هەولێر باوەڕیان وایە کە لەکاتی خۆی قەڵای هەولێر بەژمارەیەک رێگای ژێر زەمینی (انفاق) نهێنی بە دەرەوە بەتایبەتی بەنزیک کارێزەکانی دەشتەکەی دەوروبەری بەستراوەتەوە کاتی پێویست و شەڕ لێقەومان دانیشتووانی قەڵاکە هاتوچۆیان بەناودا کردوون.

لە دیدەنییەکی زانای پایە بەرز مامۆستا رەشاد موفتی (٧٢) ساڵ لەرێکەوتی (١٩٨٤/٥/١١)دا و بە ئامادەبوونی مامۆستا محەمەد تەیمور و ژمارەیەک لە تەمەن درێژەکانی خەڵکی قەڵای هەولێر گفتوگۆمان لەبارەی بوون و بەکارهێنانی رێگا ژێر زەمینییەکانی قەڵاکە کرد.

مامۆستای ناوبراو لەم رووەوە وای بۆ دەچێ کە لەکاتی گەمارۆدانەکەی قەڵاکە لەلایەن هێرشەکانی مەغۆل هۆڵاکۆ و پەلامارەکانی تری دوژمنان بۆ سەر شارەکەمان، خەڵکی سەر قەڵا رێگا ژێرزەمینییەکانیان بەکار هێناوە..

هەروەها مامۆستا رەشاد گوتی: دەرگای دەرەوەی نەفەقێکیان لەلای گردی قالیچ ئاغا دەرچووە.

واتە، لەنزیک کارێزی ئاوی میری.

هەروەها سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

(اكتشاف انفاق تاريخية في قلعة اربيل) نووسینی زبیر بلال اسماعیل، رۆژنامەی (العراق) ژمارە ٦١٨، لە (٩/ئاداری/ ١٩٧٨).

(٣٦) د. محسن محمد حسين، قلعتان عظيمتان، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١١) ساڵی١٩٨٣، بەشی عەرەبی.

(٣٧) ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم بن واصل (ت ٦٩٧ه/ ١٢٩٧م) مفرج الكروب في اخبار

بني ايوب، لیکۆڵینەوەیەکی دکتور جمال الدين الشيال، چاپخانەی زانکۆی فوئادی یەکەم و بەشی یەکەم، قاهیرە ١٩٥٣.

(٣٨) بۆ پەیداکردنی زانیاری چاک لەبارەی دەوڵەتی ئەتابەکی هەولێر سەیری ئەم سەرچاوەیە بکرێت (اربيل في عهد الأتابكي - دانانی د. محسن محمد حسين)

(٣٩) قلعتان عظيمتان، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١١).

(٤٠) لێرەدا بوونی ژمارەیەک بیری ئاومان لە شارەکەدا بۆ دەسەلمێندرێت.

(٤١) سبط ابن الجوزي، ابو الظفر شمس الدين قز اوغلي التركي، مرآة الزمان في تاريخ الأعيان، مطبعة دار المعارف العثمانية، حيدر اباد، الهند، ١٩٥١- ١٩٥٢، ج٨، ص٦٩٩.

(٤٢) قلعتان عظيمتان، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١١.

(٤٣) لەساڵی ١٧٧٥ ی زاینی حەمامی قەڵای هەولێر دروست کراوە و لەلایەن قاسم ئاغای عەبدوڵلا ئاغاوە نوێ کراوەتەوە. لەم ساڵانەی دواییش دەستەی پەرەپێدانی قەڵای هەولێر حەمامەکەی باش چاک کردۆتەوە ئێستا وەکو نموونەیەکی نایابی کەلەپووری شارەکە پارێزراوە و خەڵکی بۆ سەیرکردنی دەچن.

(٤٤) موحسین کوڕی مەحمود ئاغایە و لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢٨- ١٩٥٨) سەرۆک شارەوانی هەولێر بووە.

(٤٥) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ حاجی حلمی عمر چاوشلی، تەمەنی لە (٨٠) ساڵ پترە و لەشاری هەولێر لەدایک بووەو گەورە بووە ئێستاکەش دوکانی لە ناو بازاڕی گەورەیە نزیک دەرگا نوێیەکەی قەڵا ١٩٤٨.

(٤٦) ئەم زانیاریانەمان لە بەڕێوەبەرێتی ئاوی ژێر زەوی پارێزگای هەولێر وەرگرتوون.

(٤٧) اربيل في اربعة اعوام، دەرکردنی پارێزگای هەولێر، چاپخانەی (المؤسسة العامة للصحافة و الطباعة)، بغداد، ل٤٤.

(٤٨) ئەم زانیاریانەمان لە کاک (ئەحمەد سەعید) فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرێتی ئاو و زێرابەکانی هەولێر دەسکەوتوون.

(٤٩) ئەم زانیاریانەو هەندێ زانیاری تریشمان لەبارەی بابەتەکە لەئەنجامی چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ئەندازیار مەریوان عیززەددین لەرێکەوتی (١٩٨٤/٨/١٣)دا دەست کەوتوون.

(٥٠) اربيل في اربعة اعوام، ل٤٤.
شایانی باسە کە ژمارەی دانیشتوانی شارەکە لەم ساڵەدا دەوروبەری (٩٣) هەزار کەس بووە.

(٥١) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(٥٢) ئەندازیار هاشم عەبدوڵلا، بەڕێوەبەری شارەوانی هەولێر (قلعة الماء واسبابه)، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١) ساڵی سێیەم و بەشی عەرەبی، حوزەیرانی ١٩٧٢.

(٥٣) یەکەمین عەمباراو لەشاری هەولێردا عەمباراوە کۆنکرێتییەکەی قەڵایە کە لە ساڵی ١٩٢٤ دروست کراوە، بەینێکیشە لەکار کەوتووەو بە عەمباراوێکی ئاسنینی هەڵواسراوی گەورەتر گۆڕدراوە.
ئەگەر بێت ژمارەی عەمبارئاوەکان بەگوێرەی پێویست بێت ئەم عەمباراوانەش تانکی لەجێگای گونجاو دابنرێن و بەچاکی بەکار بهێنرێن دەتوانن رۆڵێکی گرنگ بگێرن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئاو لە شارەکەدا. بەڵام ئەم عەمباراوانە سەرەڕای کەمیان دەبینین شوێنیان بەگوێرەی شوێنی زۆربەی گەڕەکە نوێیەکان لەئاستی ئەم عەمباراوانە بەرزترە بەمەش تەنیا لە حاڵەتەکی لاوەکی کەڵک لەم عەمباراوانە وەردەگیرێت، ئەویش ئەگەر بێت و بۆ ماوەیەکی کورتی دیاریکراو لەبەر هەر هۆیەکی هونەری پڕۆژەی ئیفراز لە کار بوەستێت و ئاوی ئەم عەمباراوانە لەبری ئاوی پڕۆژەکە دابەش بکرێت. تێبینی هەردوو ئەندازیاری بەڕێوەبەرێتی ئاو و زێرابەکانی پارێزگای هەولێر کاک نەوزاد مستەفا (سەرۆکی بەشی هونەری)و کاک مەریوان عززەدین زۆربەی ئەم بۆچوونانەی سەرەوەیان لەبارەی عەمباراوەکانی هەولێر بۆ خستینە روو.

(٥٦) بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئاو لە شارەکەدا بۆ ئێستاو دوارۆژ حەز دەکەین ئەم سێ خاڵەی خوارەوە بخەینە روو:

١- جێبەجێ کردنی پڕۆژەیەکی تر بۆ ئاوی شارەکە.

٢- دانانی عەمباراوێکی بڵند لە شوێنێکی بەرزی هەر گەڕەکێکدا تاکو ئاوی بیرەکانی گەڕەکەکەی تێدا کۆبکرێتەوە بەگوێرەی پێویست دابەش بکرێت.. لەم حاڵەتەدا بەشێکی زۆری ئاوی بیرەکان لە بەفیڕۆدان رزگار دەبێت.
یا دروستکرنی عەمباراوێکی کۆنکرێتی ژێر زەوی بۆ هەر هەشت نۆ بیر لەناوچەیەکی سنوور دیاریکراودا. ئاوی بیرەکان یەکەم جار لەم عەمباراوە دەکرێت ئینجا بەگوێرەی نەخشەیەکی زانستییانە لەگەڵ ئاوی پڕۆژەی ئیفراز دا بەسەر ناوچەکەدا دابەش دەکرێت.

٣- هۆشیارکردنەوەی هاوڵاتیان بەوەی کە لەکاتی ئاو بەکارهێناندا بەشێکی زۆری ئاوەکە بەفیڕۆ نەدەن بەتایبەتی لە کاتی باخچە ئاودان و کەلوپەل شووشتن و شەقام و بەر دەرگا شووشتن.
جا ئەگەر بێتو هەروەکو گوتمان لەهەر گەڕەکێکدا عەمباراوێک هەبووایە و ئاوی بیرەکانی تێدا کۆ بکرابوایەوەو لەدواییدا بەگوێرەی پێویست و لەکاتی دیاریکراو بەهێزی ترومپا لەگەڵ ئاوی پڕۆژەی ئیفراز دابەش بکرابووایە ئەوە پەیڕەوکردنی ئاو

بەفیرۆنەدان بایەخی خۆی دەبوو لەوانەش بوو، ئەوەندە ئاوی ئێستاکە لەهەر هەردوو پرۆژەکە تێکڕای بیرەکاندا دەستگیر دەبێت بەشی پێویستی دانیشتووانی شارەکەی بکردایە.

(٥٤) سەرۆکی بەشی هونەری دائیرەی هەولێر ئەندازیار کاک نەوزاد مستەفا ئەم راستییەی دووپات کردەوە، کە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی کەم ئاوی لە شارەکەدا ناتواندرێت پشت بەناوی بیرەکان یان لێدانی بیری نوێ ببەسترێ..

چونکە بیرەکان جێگای متمانە نین لەرووی بەردەوامبوونی بەرهەمی چاک، واتە، ئاوی زۆر، لەبەر ئەوەش ئاوو هەوا بەتایبەتی کەمی و زۆری بەفرو باران لەلایەک کاردەکاتە سەر کەمی زۆری ئاوی ژێرزەوی، لەلایەکی تریشەوە فراوانبوونی شارەکە و زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی لەگەڵ خۆیاندا ژمارەی بیرەکانیشیان زۆر کردووە، بەمەش بەردەوام ئاوێکی زۆری ژێرزەوی شارەکە دەردەهێندرێت، بێشک ئەمەش هەمووی دەبێتە هۆی کەمبوونی ئاوی ژێر زەوی بەتایبەتی لە ساڵی کەم باراندا وەکو ئەمساڵ ١٩٨٤و کە جاری وا هەیە - قسەی ئەندازیار کاک نەوزاد - ئاوی خۆمان (مەبەستی ئاوی پرۆژەی ئیفراز) دەچێتە ناو بیرەکان و (دێور) دەبێتەوە..

چاوپێکەوتنێک لەگەڵ سەرۆکی بەشی هونەری بەرێوەبەرێتی ئاو و زێرابەکانی هەولێر لەرێکەوتی (١٩٨٤/٧/٣٠).

(٥٨) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ کاک موعتەسەم ئەکرەم حەسەن جیۆلۆجی لە بەرێوەبەرێتی ئاوی ژێر زەوی پارێزگای هەولێر، رێکەوتی (١٩٨٤/٧/٢٦).

(٥٩) بورهان قادر، یاریدەدەری وقائی، بەرپرسیاری مەڵبەندی پاراستن ژینگەی مرۆڤ - البیئة البشریة- لە هەولێر، لە چاوپێکەوتنێکی تایبەتدا لە رۆژی (١٩٨٤/٩/٣) لە مەڵبەندەکەوە بەئامادەبوونی بەرپرسیاری تاقیگەکەیان دەرمانساز کاک نازم عەبدوڵلا.

(٦٠) برهان قاتع، قاموس لغوي فارسي بتصحيح محمد عباسي، طبعة مؤسسه، مطبوعاتي امير كبير سنة ١٣٣٦هـ ل ٨٧٢.

(٦١) خالد عبدالمنعم العاني، موسوعة العراق الحديث، بغداد ١٩٧٧، ل٥٢.

(٦٢) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(٦٣) کوردو سیستەمێکی ئاودێری لە رابردوودا، کارێز و کارێز هەڵکەندن، گۆڤاری کشتوکاڵ ژمارە (١) ساڵی ١٩٨٢، بریتییە لە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ یەکێک لە کارێزهەڵکەنەکانی ناوچەی دەشتی هەولێر کە ناوی "دەروێش محەمەد سەلیم"ە و کاک عەبدوڵلا بابە عەلی ئامادەی کردووە.

(٦٤) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(٦٥) اربیل في عهد الأتابكي، ل٢٣٩.

(٦٦) لە رۆژی (١٩٨٤/٧/٢٨) دا شوێنی ئەم کارێزەو هەندێ کارێزی تر لەوانە گەیشتوونەتە ناو شاری هەولێر لەسەر نەخشە کۆنەکەی هەولێر دایرەی (دەستەی بالای کشتوکاڵ و چارەسەرکردنی کشتوکاڵ) ی پارێزگای هەولێر بەیاریدەدەری شێخ نەجمەدین سەرۆکی بەشی رووپێوی زەوی لە دائیرەکە و کاک شێرزاد قادر رووپێوی یەکەم لە شارەوانی هەولێر دەستنیشان کردوون.

(٦٧) لەمەولا دێینە سەر باسی ئەم وەستا فەتاحە.

(٦٨) ماوەیەکە واز لەم عەمباراوە کۆنکرێتییە کۆنە هێنراوە بە عەمبارێکی ئاسنینی هەڵواسراوە گۆڕدراوە کە ئاو بە سەر دانیشتووانی قەڵا دابەش دەکات.

(٦٩) زبیر بلال اسماعیل، الكهاريز في اربيل، گۆڤاری ئۆتۆنومی ـ الحكم الذاتي - ژمارە ٣ ی ساڵی ١٩٨٢، بەشی عەرەبی.

(٧٠) بیرەکانی ئەم کارێزە لە پارچە زەوی ژمارە (١٩٥) پشت گۆڕستانی(شێخ ئەحمەد) سەر رێگای کۆیە بەدەستە چەپ دەردەکەوتن بەرەو شاری هەولێر هاتوون لەگەڵ مفتاحەکەشی کەوتبووە پارچە زەوی ژمارە (١٣٠) گەرەکی ئەفسەرەکانی سێتاقانی ئێستاکەو لەوێرا بۆتە جۆگە ئاوێکی سەر زەوی جۆگەکەیش لەدواییدا بۆتە دوو لق لقێکیان بەقەراخ رێگای کۆیە بەناو گەڕەکی سێتاقاندا بەرەو مەڵبەندی شار هاتووە. لقەکەی تریش چۆتە لای گەڕەکی تەیراوە لەدواییدا کۆربۆتەوە.

ئەم کارێزە کارێزی (شێخ ئەحمەد) سێتاقانیشیان پێ گوتووە.

(٧١) کوورەچییەکان، ئەوانەی خشتی سوورەوە کراویان دروست دەکرد جۆرە بەردێکیان دەهێنا کە بەردە زوورگی پێ دەگوترا، لەناو کوورەیەکدا کۆمەڵیان دەکردن و خشتیشیان دەخستە سەرەوە ئینجا کوورەکەیان گەرم دەکرد تا بەردەکان زۆر باش سوورەوە ئینجا دەریان دەهێنان و ئاوی ساردیان دەرژاندە سەریان لە ئەنجامدا بەردەکان پێکرا دەتەقینەوە، وردو خاش دەبوون وەکو خۆڵەمێشیان لێ دەهات و دەبوونە قسڵ و لە شوێنێکدا کۆدەکرایەوە بەنیازی پاراستنی سەری بە قوڕ سواق دەدرا و ئینجا بەرەبەرە دەیان فرۆشت.. ئەم خۆڵە بەردە، قسڵی پێدەگوترا و لەگەڵ خۆڵەمێشی گەرماوەکان تێکەڵ دەکراو بۆ بینا دروستکردن بەتایبەتی بۆ کاروباری گەرماو دروستکردن بەکار دەهات.

(٧٢) اربیل في اربعة اعوام، ل ٣٨.

(٧٣)ئەم زانیارییانەم لەئەنجامی چەند چاوپێکەوتنێکدا دەست کەوتوون.

(٧٤) گۆڤاری کشتوکاڵ، ژمارە (١) ساڵی ١٩٨٢.

(٧٥) وابزانین ئەم کارێزە هەمان کارێزی (جووجە محمد) کە لە پەراوێزی

(٧٠) باسمان کردووە، شوێنەکەیشمان لەسەر نەخشە کۆنەکانی دەستەی بالای کشتوکاڵ و چارەسەرکردنی کشتوکاڵی هەولێر هەڵگرتووە.

(٧٦) گەڕیدەی بیانی کلۆدیۆس جەیمز ریچ لە گەشتەکەی ساڵی ١٨٢٠ یدا بۆ عێراق سەری لە شاری هەولێر داوە و باسی ئەم کاریزەی کردووە و نووسیویە دەڵێ: کە گەیشتینە هەولێر خێمەکەمان لەلای کاریزی قاسم ئاغا هەڵدا کە کەمێک لە خوارووی رۆژئاوای شارەکەوە دوورە. (رحلة ریج الی العراق ١٨٢٠)، ص ٢٤٢ بەدواوە)

(٧٧) ئەم زانیارییانەم لەبارەی هەردوو کاریزی ژمارە (١٨ و١٩) بە هۆی کاک شێرزاد قادر رووپێوی یەکەم لە شارەوانی هەولێر دەست کەوتوون.

(٧٨) ئەم کاریزە لەلایەن دانیشتووانی گوندەکانی بنەسلاوە و باداوەدا (قولی بابە) و (خوونی بابە) شی پێگوتراوە.

(٧٩) معجم البلدان، مادة اربل.

(٨٠) لە شاری هەولێردا کاریزێک هەبووە کە درێژییەکەی (٨)کم بووە بەرهەمیشی لەرۆژێکدا گەیشتۆتە زیاتر لە دوو ملیۆن و نیو گاڵۆن ئاو (موسوعة العراق الحدیث، ص٥٢ بەدواوە) ( بەلام ئەم سەرچاوەیە ناوی کاریزەکەی بۆ نەنووسیوین ).

(٨١) دبلیو. ئار. ئێچ، سنتان فی کوردستان، (١٩١٨- ١٩٢٠) گۆڕینی بۆ عەرەبی فوئاد جەمیل، چاپخانەی (الجاحظ)، بەغدا ١٩٧٣، ل ٣٧ بەدواوە.

(٨٣) اربیل في اربعة اعوام، ل ٤٣.

(٨٤) ئەندازیاری میکانیکی بیلال غولام جەبار، گۆڤاری هەولێر ساڵی یەکەم ژمارە (١)، ١٩٧٠، ل ٦٠، بەدواوە.

(٨٥) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

(٨٦) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ئەندازیار کاک سەربەست نووری ساڵح سەرپەرشتکاری هونەری پرۆژەی ئاوی ئیفراز.

(٨٧) لە کاتی بڕیار لەسەردان و جێبەجێکردنی یەکەم پرۆژەی ئیفراز بۆئاوی هەولێر ژمارەی دانیشتووانی شارەکە (٩٥٥٩٢) کەس بوو، بەلام ئێستاکە لەساڵی ١٩٨٤ دا دووەمین پرۆژە هاتۆتە بەرهەم و گیروگرفتی کەم ئاوی لەگەڵێک گەڕەکەکانی شار بەردەوامە. بەلام نابێ ئەوەمان لا غەریب بێت ئەگەر هاتوو زانیمان ژمارەی دانیشتووانی شارەکە گەیشتووەتە (٣٠١٣٢٥) کەس و رووبەری شارەکەش بۆتە (٤٤,٠٠٠) م٢ سەرەڕای هۆیە باسکراوەکانی دیکە.

(٨٨) ئەم زانیارییانەمان بەهۆی ئەندازیار کاک سەربەست نووری ساڵح سەرپەرشتکاری پرۆژەی ئاوی ئیفراز دەست کەوتوون.

(٨٩) د. نافع ئاکرەیی، ژینگەو گیروگرفتەکانی لە شاری هەولێر، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٤ ساڵی دووەم ١٩٨٣.

## سەرچاوەکان:

١- سبط ابن الجوزي، ابو المظفر شمس الدین قز اوغلي الترکي، مرآت الزمان في تاریخ الأعیان، حیدرآباد، هندستان ١٩٥١- ١٩٥٢.
٢- ابن واصل، جمال الدین محمد بن سالم بن واصل، مفرج الکروب في اخبار بني ایوب، لێکۆڵینەوەی دکتۆر جەمالەدین شیال، قاهیرە ١٩٥٣.
٣- دائرة المعارف الأسلامیة، بەرگی یەکەم، قاهیرە ١٩٣٣.
٤- یاقوتی حەمەوی، معجم البلدان، بەرگی یەکەم، تاران ١٩٦٥.
٥- برهان قاتع، قاموس لغوي فارسي، بتصحیح واهتمام محمد عباسي، طبعة مؤسسەء مطبوعاتي امیر کبیر ١٣٢٦ ك.
٦- کلودیوس جیمس ریج، رحلة ریج في العراق عام ١٨٢٠، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی، بهاءالدین نوری، بەغدا ١٩٥١.
٧- دبلیو. ار. های، سنتان فی کردستان ١٩١٨- ١٩٢٠، گۆڕینی بۆ عەرەبی فوئاد جمیل، بغدا ١٩٧٣.
٨- اربیل فی اربعە اعوام، دەرکردنی پارێزگای هەولێر، بەغدا ١٩٦٨.
٩- د. محسن محمد حسین، اربیل فی العهد الاتابکي، بغداد ١٩٧٦.
١٠- خالد عبدالمنعم العاني، موسوعة العراق الحدیث، بغداد ١٩٧٧.
١١- عبد الرزاق الحسني، العراق قدیما و حدیثا، چاپی شەشەم بەیروت ١٩٨٠
١٢- زبیر بلال اسماعیل، اربیل في ادوارها التاریخیة، نجف ١٩٧١.
١٣- گۆڤاری (سومر) بەرگی (دووەم، سێیەم، بیست و پێنج) ساڵانی (١٩٦٩، ١٩٤٧، ١٩٤٦).
١٤- گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم ١٩٧٥.
١٥- گۆڤاری کاروان، ژمارەکانی (١١- ١٤- ١٧- ٢١).
١٦- گۆڤاری هەولێر ژمارە (١ساڵی یەک ١٩٧، ژمارە یەک ساڵی سێ١٩٧٢).
١٧- گۆڤاری کشتوکاڵ، ژمارە ١ساڵی١٩٨١.
١٨- گۆڤاری ئۆتۆنۆمی، ژمارە ٣ ساڵی ١٩٨٢.
١٩- هەردوو فەرهەنگی مەهاباد و ئەستێرە گەشە، بۆ لێکدانەوەی مەبەستی چەند ناو و زاراوەیەک.
٢٠- چەند چاوپێکەوتن و لێدوان و گفتوگۆی تایبەتی لە دایەرەو دەزگاکانی پەیوەندیدار بە ناوی شاری هەولێر.
٢١- چەند چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ژمارەیەک لە تەمەن درێژەکانی شاری هەولێر.



# بیرو بیرلێدان لە هەولێر

جەلال مەولود ئەحمەد سنجاوی

**دەستپێک**

هەر لەو رۆژەوە کە مرۆڤ ژیانی لەسەر ئەم زەوییە دەستپێکردووە، تا ئەمڕۆ، سامانی ئاو هۆکاری سەرەکی بەردەوامبوونی ژیانی مرۆڤ و هەموو بوونەوەرەکان بووە بۆ دابینکردنی ژیان و گشت جموجۆڵەکانی بژێوی رۆژانە لە بوارەکانی، کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و پیشەسازی و بازرگانیدا.

زانایانی ئارکیۆلۆژی لە ئەنجامی کنە کردن و پشکنین و بەدواگەڕاندا لە شوێنە جیاجیاکانی باکوور و باشووری میزۆپۆتامیا بۆیان دەرکەوت، کە بنەمای شارستانییەتی عێراق بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی لە نزیک رووبارەکان و سەرچاوە ئاوییەکان گەشەی کردووە.

گوند و شارۆچکەکانیش بە پلەی یەکەم لە ئامێزبەندی کانی و کاریزو کەنار رووبارەکان دامەزراون، بەتایبەتی لە شارستانێتی سۆمەری و گۆتی و لۆلۆیی و میدی و کلدانییەکاندا، و تا رادەیەکی ئەوتۆ چەندان شەڕو پێکدادان لە نێوانیاندا لە سەر دەست بەسەرداگرتنی سەرچاوە ئاوییەکان قەوماوە.

ئەمڕۆش ئاو بایەخی پێشینەی خۆی لە دەست نەداوە و بەگەرمی هاتۆتە نێو گۆڕەپانی سیاسیی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەوە و خەریکە وەک کالایەکی گرانبەها ململانێ و کێشمەکێشی لە سەر دەکرێت، بە جۆرێک کاری کردۆتە سەر دۆستایەتی و پەیوەندیی هاوسێیەتی نێوان دەوڵەتان و هیچ بەدوور نازانرێ لە ئایندەدا ململانێی چەکداریشی لێ بکەوێتەوە، بەتایبەتی لە سالانی کەم بارانی و وشکە سالی دیاردە ناهەمووارەکان سەرهەڵدەدەن و کاردەکاتە سەر ئەمنی خۆراک و بژێوی بەشێکی زۆری دانیشتوان. خۆشبەختانە کوردستان لە رووی سامانی ئاوەوە گرفتی نییە، لە کاتێکدا رێژەی دابارینی (بەفرو باران) ی زۆرە و زۆربەی چەم و رووبارەکانیشی لە ناو خاکی کوردان سەرچاوە دەگرن، بۆیە دانیشتوانی گوندە شاخنشینەکان، لە نزیک رووبارو کانیاوەکان دروستکراون و هیچ گرفتی کەم ئاوییان نییە.

**بیرە ئاوەکانی گوندنشینەکانی دەشتی هەولێر:**

بیر یەکێکە لە شێوازە هەرە دێرینەکانی دەرهێنانی ئاو لە کوردستاندا، بەتایبەتی لە گوندە پێدەشتەکانی دەشتی هەولێر، لەبەر کەمی بوونی چەم و رووبارەکان لەم دەشتەدا باوک و باپیرانمان پەنایان بردۆتە بەر بیرەکان بۆ دابینکردنی ئاوی خواردنەوە و ئاژەڵداری و کشتکاری و پێویستییەکانی ژیانی

ڕۆژانە.

لەم سەرو بەندەدا پارێزگای هەولێر بەتایبەتی گوندنشینەکانی، پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەستن و بەهۆی بیرە بەدەست هەڵکەندراوەکان و بیرەکانی ئیرتیوازی ئاوەکە دەردەهێنن.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا تیشک دەخەینە سەر بیرەکان و بیرلێدەرانی دەشتی هەولێر لەگەڵ کورتەباسێک لەسەر کانیاوەکان و کارێزەکان بەپێی دابەشبوونیان لە حەوزەکانی هەولێر و دەوروبەری لەگەڵ نەخشە و خشتەکانی تایبەت بەم بابەتە.

ئاشکرایە ئاوی ژێر زەوی پارێزگای هەولێر لە ئەنجامی بەفرو باران بارین لە دەرزەکان و قڵەشی شاخەکان و کونیلەکانی خاک بۆ ناخی زەوی دزە دەکات و لە ژێر زەوی پەنگ دەخواتەوە و پاشان بە هۆی کانیاوەکان و کارێز و بیرەکان دەردەهێنرێت و خەڵکەکە بۆ کاروباری ڕۆژانەیان سوودی لێ وەردەگرن.

ڕێژەی باران بارین لە ناوچە شاخاوییەکانی سەر سنوور لە پارێزگای هەولێر دەگاتە (٨٠٠) ملم و بڕی بارانی باریو لە ساڵێکدا (٦٠) ڕۆژە و لە ناوچەکانی زوورگ و نیمچە بەرزەکانیشدا (٥٠) ڕۆژە، ئەمە جگە لە بڕێکی زۆری بەفر لە شاخە سەخت و بەرزەکاندا.

دووری و نزیکی سەرچاوەی ئاو لە خاک لە باکوور و باشووری هەولێر وەک یەک نییە، بۆیە قووڵی بیرەکانیش پشت بە ئاستی ئاوەکە دەبەستن، لە ناوچەی دەشتی هەولێر قووڵایی ئاوی ژێر زەوی دەگاتە نێوان (٢٥ - ٤٠) مەتر و لە حەوزی مەخمووریش لە نێوان (٣٠ - ٣٥) مەتر دەبێت. بەشێوەیەکی گشتی خاکی پارێزگای هەولێر خوێی زۆر کەمە، واتە ئاوەکەی شیرین و سازگارە، تەنها ناوچەی حەوزی مەخموور نەبێ، کە ئاوەکەی سوێرە و ڕێژەی خوێی تواوەی زۆرە، لە ڕووی جیۆلۆجییەوە بە ئاوی ژێر زەوی مەخموور دەگوترێ (فارسی)، کە ئاوەکەی زۆرە، بەڵام سوێرە، کەچی بە ئاوی ژێر زەوی دەشتی هەولێر، واتە (هەولێرو دەوروبەری) دەگوترێ (بەختیاری)، کە ئاوێکی زۆرو سووک و شیرینە. تا ساڵی ١٩٧٣ ژمارەی بیرە لێدراوەکان لە هەولێر (١٦٠) بیر بوو، بەڵام لە ساڵانی هەشتادا ژمارەی بیرە لێدراوەکان گەیشتە (٧٠٩) بیر.

لە خشتەی ژمارە (١) دا کە ژمارەی بیرەکانی پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان دەردەکەوێت بە پێی ئامارە ڕەسمییەکانی عێراق لە ساڵی ١٩٨٠ دا:

سەرچاوەی خشتەکە:
د. وفیق الخشاب وآخرون، الموارد المائیة في العراق ل ١٢٣.

**بیرەکانی ئاو لە دەشتی هەولێر بۆ دوو جۆر پۆلێن دەکرێن:**

**١- بیرە بەدەست هەڵکەندراوەکان:**

ئەم بیرانە لە لایەن خەڵکییەوە لە گوندەکان لێدەدرێن، کە دەگاتە ئاو ئینجا (پاراو) دەکرێت و بەهۆی دەولکێک کە بە پەت (گوریس یان کندر) بەستراوە بۆ ناو بیرەکە شۆڕ دەکرێتەوە پاشان بەدەست ڕادەکێشرێتە دەرەوە، قووڵایی بیرەکان لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی دیکە جیاوازە، زۆربەیان قووڵاییان لە نێوان (٥ - ٣٥) مەتر دەبێت، لە کاتێکدا قووڵی بیری گوندی (سەر بەشاخ) دەگاتە (٦, ٥) مەتر، بەڵام قووڵی بیر لە دارەتوو (٣٥) مەتر دەبێت.

ئەم بیرانە لە لایەن بیرلێدەرە لێزانەکان لێدەدرێن، واتە مەرج نییە هەموو کەسێک بتوانێ بیر لێبدا، بەتایبەتی بیرە قووڵەکان، بۆیە ئەم

| پارێزگا | ژمارەی بیر |
|---|---|
| هەولێر | ٧٠٩ |
| سلێمانی | ٢٩٤ |
| کەرکووک | ٧٣٥ |
| دهۆك | ٣٦٨ |
| سەرجەم | ٢١٠٦ |

خشتەی ژمارە (١)

بیرلێدەرانە ژمارەیان کەمە و لە گوندەکان وەلامیان بەدوادا دەنێرن و ئەوانیش پێویستییەکانی خۆیان لە قازمە و خاکەناس و چەرخ و دۆلاب و دەولک هەلدەگرن و بۆ شوێنی مەبەست بەڕێ دەکەون و بیرەکە لێدەدەن و هەقی ماندوو بوونی خۆیان وەردەگرن یان دەیکەنە پیاوەتی.

**٢- بیرە گشتییەکان (ئیرتیوازی):**

لە کۆتایی سالانی پەنجاکانەوە حکومەت دەستی بە هەلکەندنی بیر بە مەکینەی تایبەتی بیر هەلکەندن کردووە و ژمارەیان کەمەو مەرج نییە هەموو گوندێک بیری ئیرتیوازی لێ هەبێ، تەنیا ئەو گوندانە نەبێت، کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرەو ئاوی بیرە بەدەست هەلکەندراوەکان بەشی پێویستی ژیانی خۆیان و ئاژەل و کشتکارەکانیان ناکات.

ئاوی ئەم جۆرە بیرانە بەهۆی پەستانی هایدرۆلیکییەوە خۆی دەردەپەرێتە دەرەوە و لە حەوزێکی تایبەتی دەکرێت، کە لە تەنیشت بیرەکانەوە دروست کراون، ئەم حەوزانەش سەریان گیراوە تاکو پاک و خاوێن بن و بە بۆرییەکی تایبەتەوە ئاوەکانیان لە کاتی پێویستدا بەهۆی بەلوعەیەکەوە بەرددەدرێتەوە، هەر بیرێکی ئیرتیوازی پاسەوان و ئیشپێکەرێکی تایبەتی هەیە و سالانەش چەند جارێک لێژنەیەکی پسپۆڕ دێت و ئاوەکەی دەپشکنێ و هەندێکی دەبات و لە تاقیگەکان پشکنینی لەسەر دەکات.

قوولایی بیرە ئیرتیوازییەکانی دەشتی هەولێر لە نێوان (٦١ - ٢٢١) مەتر دەبێت و بەرهەمەکەشی لە نێوان (٥, ١ - ٨٥٠) لیتر/ چرکە دەبێت و بری خوێی تواوەی لە نێوان (٢٣٠- ٨٥٠) بەش لە ملیۆن دەبێت.

لە سالی ١٩٣٦ یەکەم بیری ئیرتیوازی لە لایەن کۆمپانیایەکی یۆگسلاڤی لە شاری هەولێر لێدراوە، هەروا لە گوندەکانی دەشتی هەولێر لە هەمان سالدا بیرێکی دی لە گوندی (قازیخانە)ی نزیک قوشتەپە لێدراوە.

بەم جۆرە ژمارەی بیرە ئیرتیوازییەکان لە گوندەکان تا دەهات زیاتر دەبوون، بەتایبەتی لەو گوندانەی کە ژمارەیان زۆر بوو، بەلام ئاوی بیرە بەدەست هەلکەنراوەکان بەشی پێویستی خەلکەکەی نەدەکرد، بەتایبەتی لە سالانی کەم بارانیدا کە بری ئاوی بیرەکان کەم دەبۆوە، چونکە چالاکییەکانی دانیشتوانی گوندەکان بە پلەی یەکەم پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەستن، ئەم ئاوەش لە هەلبەزو دابەز کردندایە بە هۆی بری بارانی باریو لە کاتێکدا بە دەگمەن لە دەشتی هەولێر بەفر دەبارێ و بارانیش بەپێی گۆڕانکارییەکانی باری زەپۆش دەگۆڕێ.

**دابەشبوونی جوگرافیانەی ئاوی ژێرزەوی لە پارێزگای هەولێر:**

پارێزگای هەولێر بەسامانی ئاوی ژێر زەوی دەولەمەندە، بەتایبەتی لەناوچە شاخاوییەکاندا، کە سالانە برێکی زۆری بەفروبارانی لێ دەبارێ و بەهۆی کانیاوەکان سوودی لێ وەردەگیرێ. چەند لە باکوور بەرەو باشووری هەولێر بچین، ڕێژەی ئاوی ژێر زەوی کەم دەبێتەوە، بەتایبەتی لە حەوزی مەخموورو دیبەگە، وێرای ئەمەش ئاوەکەی سوێرە و بۆ خواردنەوە شیرین و سازگار نییە.

جگە لە بیرەکان، لە دەشتی هەولێر کارێزی زۆرە، کە لە سەردەمی حوکمڕانی ئەتابیکییەکان (٣٦٥) کارێز بوو، بەلام ئەم کارێزانە ژمارەیان کەم بوودوە تا لە نێوان سالانی ١٩١٨ - ١٩٢٠ گەیشتە (٦٠) کارێز و لە ناوەراستی حەفتاکان بوو بە (٢٥) کارێز.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین خاکی هەولێر لەرووی ئاوی ژێر زەوییەوە دابەشی ئەم حەوزانەی خوارەوەبکەین:

**یەکەم: حەوزی ناوچەی شاخاوی**

ئەم حەوزە دەکەوێتە نێوان سنووری عێراق -ئێران -تورکیا لە ناوچەکانی باکوور و باکووری ڕۆژهەلاتی پارێزگای هەولێر لەگەل چیاکانی هەیبەت سولتان، باواجی، بنەباوی، پیرمام، باباچیچک، کە ناوچەیەکی دەولەمەندە بە ئاوی ژێر زەوی، بەتایبەتی لە دۆل و نەهالەکان و زەوییە تەختاییەکان. خەلکەکە دەتوانن بەهۆی کانیاوەکان (Springs) سوود لە ئاوەکە وەربگرن، کە زۆر سازگارو بێگەردە وەک کانیاوی: جوندیان، بێخال، شەقلاوە، حەمامۆک و.....تاد.

وێرای ئەمە بیرەکانیش لەم ناوچەیەدا هەن، کە قوولاییان کەمە و ئاوەکەشی سازگارە، قوولایی بیرەکان لە میراوە (٢٢) مەترو لە قەسرێ

(١٧٢) مەتر دەبێت، هەروا بەرهەمی ئاوەکەشی لە بیرێکەوە بۆ بیرێکی دیکە جیاوازە، کە لە نێوان (١ ,٢٥) لیتر/چرکە لە مێرگەسۆرو (١٤ ,٢٥) لیتر/ چرکە لە گوندی کاوانی - شەقلاوە دەبێت.

پێکهاتە کانزاییەکانیش لە ئاوی ئەم ناوچەیە بریتییە لە کاربۆناتی کالیسیۆم و مەگنیسیۆم، بەهۆی جۆری کەڤرەکان کە لە جۆری کەڤری کلسی و قوماوی و دولومیتە و بەردی گرکانی و دۆلۆمایتییەکانە. لە خشتەی ژمارە (٢)دا هەندێ لە سیما گشتییەکانی بیرەکانی حەوزی شاخاوی لە سالانی (١٩٧١ - ١٩٨٨) دەردەکەوێ: هەندێ تایبەتمەندی گشتی بیرەلێدراوەکانی لە ناوچە چیاییەکان، لە ماوەی سالانی (١٩٧١-١٩٨٨) ز.

**سەرچاوە:**

اقليم كوردستان العراق، وزارة الزراعة والري، الشركة العامة لحفر الابار، اربيل، بيانات غير منشورة.

**Todd. D,Keith,Ground water hydrology, op, cit, p.50**

## دووەم: حەوزی ناوچەی چیا نزمەکان:

### أ- حەوزی تەقتەق - کۆیە:

ئەم حەوزانە دەکەونە نێوان زێی بچووک لە باشوورو حەوزی شەلغە لە رۆژئاوا و خوارووی رۆژئاواو بەرزاییەکانی (بنەباوی و باواجی و هەیبەت سولتان) لە باکوورو باکووری رۆژهەلات. ئەم ناوچەیەش زۆر دەولەمەندە بە ئاوی ژێر زەوی و لە جۆری ئاوی سازگار و بێگەردەو پشت بە ئاوی باران و رێژەیەکی کەم لە بەفر دەبەستێت.

خەلکی ئەم ناوچەیەش سوود لە کانی و بیرەکان وەردەگرن، بەتایبەتی کانی (ئالان، تەرجیە، دێگەلە، ئەشکەفت سەقا، باقلان، سماقە شیرین، گۆمەتال، کانی دەربەند) کە پتر لە (٢٠) کانی دەبن و بەرهەمی ئاوەکەیان زۆرە و رێژەی خوێی تیادا کەمە، بیرەکانی ئەم حەوزە قوولاییان

| ناوی شوێنەکە | بازنەی بەریتی | هێلی درێژی | قوولی بیرەکە | وەبەرهێنان لیتر/ چرکە | کۆی خوێی خۆراکی P.P.M | پلەکانی سەرفکردن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| پرۆژەی ئاوی / سەلاحەدین | ٢١ ٣٦ | ١١ ٤٤ | ١٢٤ | ١٤ ,٢ | ٥٧٠ | چوارەم |
| درەش/ سەلاحەدین | ٢٣ ٣٦ | ٤٥ ٤٤ | ١٦٢ | ٩ ,٢ | ٤٥٠ | چوارەم |
| سەرمەیدان / شەقلاوە | ٥ ٢٤ ٣٦ | ١٨ ٤٤ | ٨٨ | ٧ ,٥ | ٣٥٠ | چوارەم |
| ئامۆکان / حەریر | ٨ ٣٦ ٣٦ | ٨ ١٥ ٤٤ | ١٥٠ | ٦ ,٧ | ٥٠٠ | چوارەم |
| کاوانی / شەقلاوە | ٢٤ ٣٦ | ١٨ ٤٤ | ٦٠ | ١٤ ,٢٥ | ٥٦٠ | چوارەم |
| میراوە / حەریر | ٢٦ ٣٦ | ٢١ ٤٤ | ٢٢ | ٧ ,٥ | ٧١٥ | چوارەم |
| پرۆژەی ئاوی / حەریر | ٣٣ ٣٦ | ٠٦ ٤٤ | ٤١ | ١١ ,٢٥ | ٥٠٠ | چوارەم |
| مێرگەسۆر | ٥١ ٣٦ | ١٨ ٤٣ | ١١٣ | ١ ,٢٥ | ٥٤٧ | پێنجەم |
| بارزان / مێرگەسۆر | ٥٤ ٣٦ | ٠٥ ٤٤ | ٣٤ | ٢ ,١ | ٣٠٠ | پێنجەم |
| قەسرێ /چۆمان | ٣٣ ٣٦ | ٤٩ ٤٤ | ١٧٢ | ٢ ,٥ | ٦١٥ | پێنجەم |
| تێکرایی | | | ٩٦ ,٦ | ٧ ,٦٤ | ٥١٤ ,٢ | |

خشتەی ژمارە (٢)

لە حەوزی ناوچەی شاخاوی زیاترە و ڕێژەی خوێتیشیان پترە، چونکە کەڤرەکانی لە جۆری (جیری و دولومیت بەردی قوڕاوییە) وەک بیرەکانی (کۆیە و حەمامۆک و شۆرش و گۆمەتاڵ و تەقتەق).

بە گشتی بیرەکانی حەوزی تەقتەق -کۆیە ڕێژەی خوێتی تواوە و قوولاییان پترە لە حەوزی ناوچەی شاخاوی، هەروا بڕی ئاوی بیرەکانیشی لە حەوزی یەکەم کەمترە، چونکە ڕێژەی ساڵانەی بەفروباران لە سنووری ئەم حەوزە ساڵانە لە دەوروبەری (٥٥٠) ملم ناحیەی تەقتەق و (٧٥٠) ملم لە قەزای کۆیە، بەڵام بە گشتی ئاوی بیرەکانی شیرین و سازگارە و بۆ پێویستییەکانی ڕۆژانە و کاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری سوود بەخشن.

لەم خشتەیەدا هەندێ لە سیما هایدرۆلۆژی و کیمیاوییەکانی کانیاوەکانی بەستی (حەوزی شەلغە -کۆیە) دەردەکەوێ: بڕوانە خشتەی ژمارەی (٣)

**ب - حەوزەکانی دەشتی هەولێر:**

حەوزەکانی دەشتی هەولێر دەکەونە نێوان هێڵی پانی (٣٥,٤٨) و (٤٣,٢٥) لە باکوورو (٤٣,٢٩) و (٤٥,١٦) لە ڕۆژهەڵات.

واتە سنوورەکەی لە باکوور (بەستۆڕە) و لە ڕۆژهەڵات (حەوزی شەلغە) و لە باشووری ڕۆژهەڵات (زێی بچووک) و لە باشوور (زوورگەزراو) و لە ڕۆژئاواو باکووری ڕۆژئاوا (زێی گەورە).

لە ڕووی جیۆلۆجیشەوە خاکی دەشتی هەولێر لە ڕیزبەندی پێکهاتەی (بەختیاری) و نیشتووەکانی چاخە جیۆلۆجییە جۆراوجۆرەکانە و بە دەوڵەمەندیی ئاوی ژێر زەوی ناسراوە و ئاوەکەی لە ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوا ڕێچکە دەگرێ.

دانیشتوانی ئەم حەوزە بەدوو ڕێگا ئاوی ژێر زەوی دەردێنن:

١- بیرەکان:

٢- کارێزەکان:

لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکە باسی هەردوو جۆری بیری دەستکرد و بیرە گشتییەکان (ئیرتیوازی)مان کرد.

کارێزەکانی حەوزی دەشتی هەولێر بەسەر ئەم حەوزانە دابەش دەکرێن:

**١- کارێزەکانی حەوزی کەپران:**

لەم حەوزەدا (٣) کارێز هەیە بەدرێژایی (١٥٥٠ - ٢٠٠٠) مەتر، بەتایبەتی لە گوندەکانی جێژنیکان و

**خشتەی ژمارەی (٣)**

**هەندێ تایبەتمەندی هایدرۆلۆژی و کیمیاوی و تێکڕای کانیاوی هەندێ کانییەکانی حەوزی شەلغە**

| ناوی کانییەکان | ژمارەی سەرچاوەکان | تێکڕای وەبەرهێنان لیتر .چرکە | Na | Ca | Mg | CL | Sat | H(o) | کۆی خوێ | PH | پێکهاتەی بایۆلۆجی | پلەکانی سەرفکردن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئالان | ١ | ٢ | ٠,١٤ | ٣,٤ | | | | | | | | |
| تەرجیە | ٤ | ٢ | ٠.٤٥ | | | | | | | | | |
| دێگەڵە | ٢ | ١٤١- ٣٠ | ٠,٤٥ | | | | | | | | | |
| ئەشکەفت سەقا | ٤ | ١٢ | ٠.٤ | | | | | | | | | |
| باقلان | ١ | ٤ | ٠,٤١ | | | | | | | | | |
| سماقە شیرین | ٢ | ٦ | ٤٥,٠ | | | | | | | | | |
| گۆمەتاڵ | ٢ | ١٤١ | ٩٨,٠ | | | | | | | | | |
| کانی دەربەند | ٢ | ٦٠٤ | ٥٨,٠ | | | | | | | | | |

گردعارەق.

**٢- کارێزەکانی سەنتەری حەوزی دەشتی هەولێر:**

لەم حەوزەدا (١٨) کاریز هەیە بەدرێژایی لە نێوان (٥٠٠) مەتر لە کارێزی کەسنەزان تاکو (٨٢٠٠) مەتر لە کارێزی (داود ئاغا) لە باشووری رۆژئاوای عەنکاوە.

**٣- کارێزەکانی حەوزی قوشتەپە:**

ئەم حەوزە لە (٥) کاریز پێکدێ و درێژی کارێزەکان لە نێوان (٣٠٠) مەتر لە کارێزی ئیبراهیم لەک تاکو (٤٥٠٠) مەتر لە کارێزی قوشتەپەی گەورە دەبێت، کە ئەم کارێزانە: (قوشتەپە، قوشتەپەی گەورە، گردمەلا، مورتکە، برایمە لەک) دەگرێتەوە.

**ج - حەوزی دەشتی دیبەگە:**

دەشتی دیبەگە (کەندێناوە) دەکەوێتە نێوان بەرزاییەکانی زوورگەزراو و چیای قەرەچووغ. درێژی دەشتەکە (٨٠ کم) و پانایییەکەشی (١٦ کم) دەبێت. خاکی دەشتەکە بۆ پێکهاتەی چەرخی ئولیجۆسین و پێکهاتەی بەختیاریی سەردەمی چەرخی پلۆسینە. بەردەکانی شاخ و زوورگەکەی لە جۆری بەردی کلسی و تەمۆخ و قوماوی و کونیلەدارن، ئەم کونیلانەش رێگا بە ئاوی باران دەدەن لە دەرزو قەڵەشەکان بۆ ناخی زەوی برۆن، ئەمەش وای کردووە کە دەشتەکە بە ئاوی ژێر زەوی زۆر دەوڵەمەند بێت. بەهەمان شێوەش دەشتی (شەمامک) ئاوی ژێر زەویی زۆرە. رێژەی دابارینی ساڵانە (٣٥٠-٦٠٠) ملم دەبێت و بە دەگمەن بەفر لەم دەشتە دەبارێ، بۆیە تەنیا پشت بە ئاوی باران دەبەستێ. لە گشت گوندەکانی ئەم دەشتە ژمارەیەک (بیر) هەیە و ئاوەکەی بۆ خواردنەوە و پێویستییەکانی رۆژانە دەشێ. هەروا حکومەت لە دوایی ساڵانی پەنجاکان لە هەندێ گوندی سنووری ئەم حەوزە بیری ئیرتیوازی لێدا، قووڵی بیرەکان جیاوازە بۆ نموونە: بیرە بەدەست هەڵکەندراوەکان قووڵییان بەم جۆرەیە: چەغەمیرە (٢٩,٥) م، سەرگەران (٢٥,٤)م، عالْلا (٩,٩)م، دیبەگە (٧,٧)، شۆڕەزەردکە (٤,٦)م.

هەروەها قووڵایی بیرە ئیرتیوازییەکانی دەشتی دیبەگە بەم جۆرەیە: بڕوانە خشتەی ژمارە (٤).

**د- حەوزی دەشتی مەخموور:**

حەوزی دەشتی مەخموور دەکەوێتە نێوان (چیای قەرەچووغ) لە باکوورو باکووری رۆژهەڵات و (زێی بچووک) لە باشوورو باشووری رۆژهەڵات و (زێی دیجلە) لە باکوورو باکووری رۆژئاوا. ئەم دەشتە لە سەنتەری مەخموورو گوندەکانی و هەردوو ناحیەی (گوێڕ و قەراج) پێکدێ. پێکهاتەی خاکەکەی لە جۆری (بەختیاری و فارسە) و رێژەی خوێ و کانزا تواوەکان لە ئاوەکەیدا زۆرە، بۆیە ئاوەکەی سوێرە و لە هەموو بیرێک بۆ خواردنەوە ناشێ. قووڵایی بیرە بەدەست هەڵکەنراوەکانی لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی دیکە جیایە، بۆ نموونە قووڵی بیری گوندی (رواڵە) ٤,٤ مەتر دەبێت، بەڵام قووڵی بیری گوندی (عەلی رەش ٢٧,٤) مەتر دەبێت. جگە لەمەش هەندێ کانیی دەرماناوە لە حەوزی

| | گوندەکان | قووڵایی بیرەکان بە مەتر |
|---|---|---|
| ١ | سمایلاوەی خواروو | ١٤٧ |
| ٢ | سەید عوبێد | ١٤٣ |
| ٣ | مەلا قەرە | ١٤٨ |
| ٤ | کەندار | ١٢٠ |
| ٥ | دوو شیوان | ١٩٠ |
| ٦ | کوزە پانکە | ١٦٢ |
| ٧ | دیبەگە | ١٨٢ |
| ٨ | سۆفی سمایل | ١٥٣ |
| ٩ | دیمەکار | ٢٠٠ |
| ١٠ | چەغەمیرە | ١٥٠ |
| ١١ | چل هەوێزە | ١٥٣ |
| ١٣ | مەلەك ئاغا | ١٥٠ |
| ١٣ | خورمەڵە | ٩٠ |
| ١٤ | بیرەبات | ١٤٠ |

خشتەی ژمارە (٤)

مەخموور هەیە، کە بۆ نەخۆشییەکانی رۆماتیزم و پێست سوودبەخشە، وەک کانیاوی گوندی (دەرماناوە) و (ئاوی بن بەردی) و (هەوارگە) و (بەلبەلۆک) و (سەید ئەمین) و (مشار).

**پاراوکردنی بیرەکان:**

لەبەر ئەوەی بیرەکانی ئاو بەبێ سەرپۆشن، واتە دەوی بیرەکان کراوەو دانەپۆشراون، بۆیە بەهۆی تۆزو خۆڵ و گەردەلوولی هاوینان، ئاوی بیرەکان لێڵ و تام ناخۆش دەبێت، جاری وا هەیە گیانلەبەری بچووک و گەورە لە (کەرویشک و پشیلە و سەگ) یان پەلەوەر (مریشک و قاز و عەلەشیش) دەکەونە ناو بیرەکەو لە ئاوەکە دەخنکێن و ئاوەکە پیس دەکەن، بۆیە ساڵانە جارێک پێویستە بیرەکان خاوێن بکرێنەوە. هەروا لە ئەنجامی دارمانی ناوەوەی بیرەکە خۆڵێکی زۆر دەکەوێتە ناو ئاوەکە و کونی چاوگەکانی بیرەکە دادەخات و بڕی ئاوەکەی کەم دەکاتەوە، بۆیە کەسێکی شارەزا و لێزان بۆ ناو بیرەکە شۆڕدەکەنەوە و دەست دەکات بە پاککردنەوەی بیرەکەو چاوگەی ئاوەکەش بەهۆی دارێک یان بۆرییەک دەکاتەوە و قوڕو لیتە و شتەکانی ناو بیرەکە دەردەدات و ئاوەکە (پاراو) دەکات، واتە (پالاوتن) و پاککردنەوەی ئاوەکە.

**بیرلێدەرانی دەشتی هەولێر:**

وەک باسمانکرد، پرۆسەی بیرلێدان، مرۆڤی شارەزاو دەسترەنگین و لێزانی پێویستە و مەرج نییە هەموو کەسێک بتوانێ بەشێوەیەکی راست و رەوان بیر لێبدا، چونکە بیرهەڵکەندن، مرۆڤی بەهێزو پشوو درێژی دەوێ، بەتایبەتی ئەو بیرە قووڵانەی لەنێوان (٣٥-٤٠) مەتر دەبێت.

پێوەری قووڵایی بیرەکان بە (بەژن) دەپێورێ واتە درێژی بەژن و باڵای مرۆڤ، بۆ نموونە دەڵێن قووڵایی بیری (کەندارەقەل) ٣٨ بەژن دەبێت.

لە پارێزگای هەولێر بەتایبەتی لە پێدەشتەکان ژمارەیەکی زۆر بیرلێدەر هەیە و ناکرێ لێرەدا ناوی هەموویان بلاوبکەینەوە، بەڵام وەک نموونە ناوی هەندێ بیرلێدەری کارامە و بەناوبانگ دەخەینە بەرچاوان:

١- عەلی ئیسماعیل ناسراو بە (عەلی گاشە) خەڵکی گوندی (برایم باول دەشتی قەراج).
٢- قادر سێباز ناسراو بە قادری بەردسپی قەراجی.
٣- عەبدوڵلا حوسێن ناسراو بە (عیدۆی حوسێنی) خەڵکی گوندی (دینگاوەی قەراج).
٤- حوزێر عیسا ناسراو بە حوزێرۆک (دینگاوە -قەراج).
٥- حاجی قادر خەڵکی گوندی ئێلینجاغ -مولکیە.
٦- جەوهەر جەمیل ناسراو بە (جەوهەر شاروخی) خەڵکی گوندی گردەسۆر.
٧- مام مستەفا ناسراو بە (مچە قەرە) -ناحیەی قوشتەپە.
٨- عەولا سۆری پۆریجەی قوشتەپە.
٩- چەتۆ عەبدولکەریم خەڵکی شیواشۆک.
١٠- وەستا حوسێن نۆغەرانی خەڵکی گوندی نۆغەران.
١١- نادر ئەحمەد سیان خەڵکی گوندی (تیکالۆ - کەندێناوە).
١٢- حاجی عەبدوڵلای سنجاوی ناسراو بە دەروێش عەولای خەزاری - خەڵکی گوندی دەرماناوەی کەندێناوە.
١٣- عوسمان بەلار خەڵکی گوندی لهێبان -کەندێناوە.
١٤- رەحمان قادر بامەندی خەڵکی گوندی قەپلان -کەندێناوە.
١٥- عەولای عەلیوان -خەڵکی گوندی قەپلان -کەندێناوە.

**سەرچاوەکان:**

١-وفيق الخشاب وآخرون - الموارد المائية في العراق - مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٣.
٢- د. شاكر خصباك - العراق الشمالي - مطبعة شفيق، بغداد ١٩٧٣.
٣- هاشم ياسين حمدامين الحداد - اطلس الموارد الطبيعية لمحافظة اربيل - رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٠.
٤- د. ئازاد جەلال شەریف - سەرچاوەی دەرامەتی ئاو -کتێبی سەنتەری برایەتی ١٩٩٨.
٥- د. عەبدوڵلا غەفور - جوگرافیای کوردستان - دەزگای موکریان، ٢٠٠٠.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر/ ژمارە ١٥ ی هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.**



# گرنگیی ئاو لە هەولێر

**پرۆفیسۆر دکتۆر بەهرام خدر مەولود**
**سەرۆکی پێشوی زانکۆی سەلاحەددین**

کوردستان دەوڵەمەندترین وڵاتە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سامانی ئاو. هەروەها زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانی ئاوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کوردستان هەڵدەقوڵێن. ئینجا دەشبێ بزانین شەڕی ئایندە شەڕی ئاوە، بێ نەوت دەژین بەڵام بێ ئاو ناژین.

هەولێر کە کەوتووەتە نێوانی دوو رووباری گەورەی زێی بادینان و رووباری کۆیە (الزاب الاسفل) و ناسراوە بە خاوەنی گەورەترین دەشت لە کوردستان کە پێی دەوترێ دەشتی هەولێر و لە شاخەکانی پیرمامەوە تا دەگاتە لای پردێ بە تەنیشت قەرەچووغ دەڕوات تا دەگاتە دێگەڵە و زوورگەزراو لە رۆژئاوا. ئەم دەشتە بە بەرهەمە (بەرهەمی گەنم و جۆ و نۆک و نیسک و هەروەها جاران برنج) لەدەشتی هەولێر پەرەی ستاند. شاری هەولێر دەشتی کەندێناوە و دەشتی قەراجی بەناوبانگیش هەر لە ئامێزی خۆی دەگرێت، کە هەندێک ساڵ بەرهەمیان یەک بە سەد و بیست زیاتر بووە.

لێرەدا تەنیا باسی ئاو لەشاری هەولێر دەکەم. سەنحاریب بەرێگای کارێزی ئاوی گەیاندووەتە قەڵای هەولێر. هەولێر و دەشتی هەولێر هەروەک زۆربەی هەرەزۆری شارەکانی کوردستان، بەتایبەتی رۆژهەڵاتی کوردستان بەکارێز بەناوبانگن. یەک لە رێگە هەرە زانستییەکان بۆ پاراستنی ئاو، بۆ دابەشکردنی ئاو، بۆ پارێزگاری کردنی ئاو، کارێزە، کە ئاو کۆدەکاتەوە و لەژێر زەوی جۆگەی بۆ دەکات و هەر ١٠-٣٠ کیلۆمەترێک بەسەر زەوی دەکات و دەری دەکات ئینجا دەیخاتە ژێرزەوی، چەند گوندێک و کۆمەڵگایەک سوودی زۆری لێ دەبینن، ئەم کارە تایبەتە بەمێژووی دابەشکردنی ئاو لە کوردستان. هەر لەبەر ئەم هۆیە بەناوی کارێز بەهەموو زمانەکان هەر کارێزە. وەکو

پێشمەرگە بەهەموو زمانێک هەر پێشمەرگەیە. زۆربەی هەرە زۆری کارێزەکانی شاری هەولێر وشک بوون یان خەراپ بوون یان بزر بوون. لەبەر ئەوەی خزمەت نەکراون. ئەو شارەزایانە کە لەئاوی کارێز دەزانن ئێستا نەماون. لەکارێزە هەرە بەناوبانگەکانی هەولێر ئاوی میری بوو، کە هەموو شاری هەولێری ئاو دەدا پێشان و تا سالآنی پەنجاکان مابوو وەک جۆگەیەک لەپێش شیراتۆن بەوبەری شەقامەکە دەڕۆیشت. هەروەها کانی مورتکە و عەلیاوە و قۆریتان. کارێز لەشاری هەولێر خاوەنی هەبوو، وەک کارێزی قاسم ئاغا و کارێزی چەلەبی.

گەر بێتوو دابەشکردنی ئاو لە کوردستان لەگەڵ یۆنان بەراورد بکرێت، دەبینین ئەوان لە سۆلانێکا و ئەسینا ئاویان بەجۆگەی سەربانان دابەش دەکرد، بەڵام لە کوردستان لەژێر زەوی دابەش دەکرا، بۆ کەمکردنەوەی زیانی ئاو بەهەڵم و،



پاراستنی لە پیسی و هەروەها زیادکردنی ئۆکسجین لەناو ئاو. ئەمە گشتیان لەپلانی ئەندازیارانی کورد هەبووە لە پلانی ئەندازیارانی یۆنانی نەبوو!!!

گەیاندنی ئاو لە بەستۆرەوە بۆ مورتکە بەرێگەی کارێز لەلایەن سەنحاریب و ئاشوور پانیپال لە سەردەمی ئاشوورییەکان، بە گرنگترین پرۆژەی دابەشکردنی ئاو لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست دادەنرێت، ئەم پرۆژەیە بەرێگەی کارێزەوە لەهەولێر ئەنجام درا.

ئاوی سەرزەوی لەشاری هەولێر زۆرینەی جۆگە و زێ و رووبار ئەگرێتەوە و هەروەها گۆم و عەمباری ئاودکە، ئەمانە گشتیان دەکەونە بڵندایی (٥٠٠م تا ١١٧٠م) ئاستی رووی سەرزەوی. ئەم ئاوانەی دەکەونە باشووری هەولێر، زۆربەی هەرە زۆریان پلەی گەرمایی ٢٤ تێناپەڕێت، بەڵام لە زستاندا زۆرجار دەبیەستێت. خێرایی شەپۆلی ئاو کەم جار لە ٦م لە چرکەیەک زیاتر دەبێت. زۆربەی هەرە زۆری ئاوی هەولێر بەرەو باشوور تا حاجی ئۆمەران نە تفتە و نەترشە. بەگشتی ئاوەکان لە هەولێردا، سازن و لە ٥٣٠ ملغم $C_2CO_3$ تێناپەڕێت. ئاو لە هەولێر شیرینە و سوێر نییە. چەندین قوتابیانی دکتۆرا بە سەرپەرشتی ئێمە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی سەرەتاییان لەسەر ئاوی هەولێر تا حاجی ئۆمەران جێبەجێکردووە، ئەمانە رووبارەکان و جۆگەکان و کانییەکان و گۆمەکان دەگرێتەوە، کە گرنگییەکانیان ئاوەکانی شەقلاوە و هەریر و باتاس و کۆرێ و خەلیفان و جوندیان و باڵەکایەتی و رایات و حاجی ئۆمەران دەگرێتەوە.

توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئاو لە کەرتە جیاوازەکانی پارێزگای هەولێر ئەنجامدراوە، ئاوی مەخموور زێی گەورە (زێی بادینان) رووباری کۆیە و سماق لووی و قەلاسنج ئەنجامدراوە و لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل لەسەر ٢٢ هۆکار لە هۆکارەکانی فیزیایی و کیمیاوی و بایەلۆجی لەسەر سەدەها نموونەی ئاو



له ٥٧ وێستگەی ئاو له سنووری پارێزگای هەولێر، بەتاقیکردنەوە دیاری کراوە. ئەمە لەلایەن قوتابیانی دکتۆرا و ماجستێر بەسەرپەرشتیاریەتی ئێمە ئەنجامدراوە، ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوە و توێژینەوە زانستییانەی زانکۆکانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک ئەگەر شی کرانەوە و بەراورد کران لەو کەرتانە بەشێوەیەک کە زانیاری زۆر بەدەست دەهێنرێ لەوانەیە سوودی گرنگی لێ وەربگیرێت له توێژینەوە داهاتووەکانی پاشەڕۆژ لەم بواردا.

بەرزترین پلەی گەرمای ئاو گەیشتە (٣١.٥)س، له وێستگەی تەوسکە له کەرتی رۆژهەڵات تۆمارکرا. بەهای (PH) بەرزبوو بەگشتی و بەرزترین (٩.٠٤) له جۆگەی قەتەوی له کەرتی خواروی پارێزگای هەولێر تۆمار کرا.

هەروەها بەهای (PH) له (٧) دانەبەزی تەنها له چەند حاڵەتێک




نەبێت. گەیاندنی ئاستی کارەبایی نموونەکان زۆر جیاواز بوون کە بەرزترین بەهای (١٨.٩) مایکرۆ سایمنس/ سم، له گۆمی نزیک سوسی تۆمار کرا، کە دەکەوێتە کەرتی رۆژهەڵاتی پارێزگای هەولێر. زۆربەی نموونەی ئاوە پیسەکانی وێستگەکانی کەرتی رۆژئاوا و باشوور بە بەرزی ئاستی ئایۆنە سالبەکان ناسران کە بەرزترین ئاستی ($NO_3$)، (٨١.٧٥)




ملگم/ لتر، بوو له وێستگەی ئاوەپیسی عاردبکەند تۆمارکرا. هەروەها ئاستی کلۆر گەیشتە (١٢٠) ملگم/ليتر، کە له وێستگەی ئاوەپیسی له دارەتوو تۆمار کرا. هەمان بار له ئایۆنە سالبەکانی ($No_2$ ،$Nh_3$ ،$po_4$) کە له وێستگە ئاوە پیسەکانی کەرتی رۆژئاوا و باشوور رەچاوکران، کە یەک لەدوای یەک (٢٥.٢٢، ٢٩.٧٥، ١٥٨.٢٨) مایکرۆ گرام- ئەتۆم/ لتر بوو.

بەڵام ئایۆنی ($So_4$) کە بە بەرزی ئاستەکانی خۆی نواند گەیشتە (٣٧١٠.٧٣) ملگم/ ليتر، له وێستگەی (٤)ی دێگەڵە کە دەکەوێتە کەرتی رۆژهەڵاتی پارێزگای هەولێر. زۆربەی نموونە ئاوییەکان بە پاک ناسران له دەرکەوتنی ئەنجامی دوو هۆ: یەکەمین لەبەر نزمی بەهای ($BDD_5$) نموونەکان کە تەنها لەچەند بۆنەیەکی کەمدا بەرزیان نواند و گەیشتە (٣٨.٠) ملگم/ ليتر، له

ویستگەی ئاودرۆی عـاردبکەند لە کەرتی رۆژئاوا تۆمارکرا.

دووەمـیـان لە بەرزی بەهای (Do)ی زۆربەی نموونە ئاوییەکان کە گەیشتە (١١.٣٨) ملگم/ لیتر لە ویستگەی گـردعـارەق لە کـەرتی باکوور تۆمارکرا.

بەهای ئایۆنە موجەبەکان بەزۆری نزم بوون کە بەرزترینی ئەو ئاستانەی سۆدیۆم پێی گەیشت لە زۆربەی کەرتەکان، لە دەوروبەری (٣٥) ملگم/ لیتر، و زۆربەی نموونە ئاوییەکانی کەرتی رۆژهەڵات بەهای سۆدیۆم تێیاندا نزم بوو. تەنها دوو حاڵەتی نا سروشتی نەبێت، ئەوانیش (١١٠ و ٧٩) ملگم/ لیتر بوو، کە دەگەڕێنەوە بۆ گـۆمی نزیک (سـووسێ) و ئەوەی تریان بۆ ویستگەی (گەلی مـیـوزیک).

بەرزترین ئاست کە پۆتاسیـۆم پێی گەیشت (١٢) ملگم/ لیتر بوو کە لە عـەمـباری ئاوی (کەسنەزان)ی کەرتی باکوور تۆمارکرا.

تفتی ئاوەکان بەزۆری بەرزبوون کە گەیشتە (٤١٢) ملگم (caco3)/ لتر، کە لە ویستگەی سـووسێ کـە دەکەوێتە کـەرتی رۆژهەڵاتی تۆمار کـرا. هەمـان ئەم کـەرتە بەهای ناسروشتی (٧٧٧) ملگم (caco3)/ لیتر بەخۆوەگرت کە دەگەڕێتەوە بۆ گـۆمی نزیک (سووسێ).

تفتی فینۆ نەفتالینی لە (٣٩) نموونەی ئاو دەرکـەوت کـە زۆربەیان کـەم بوون، بەهۆی بوونی ئایۆناتی کاربۆنات. سەرەڕای بوونی ئایۆناتی بێ کـاربۆنات کـە زۆربەی نموونە ئاوەکـانی تر هاوبەش بوو. ناسازی ئاوەکـان بەگشتی بەرز بوو. بەهای ئەویش لەبەر پێکهاتەی جیۆلۆجی لەناوچەکە کە گەیشتە (٤٧٢.٢٦) ملگم (caco3)/ لیتر، کە لە سووسێ تۆمارکرا و ناسازی کالسیۆمیش بەرز بوو لە زۆربەی ئاوەکـانی ژێر لێکۆڵینەوەکە گەیشتە (١٠٨.٩) ملگم/ لتر کە لە جۆگەی دەرەوەی دێی (عـاردبکەند) تۆمار کرا، کە دەکەوێتە کەرتی باکوور. بەڵام ئاستی مەگنسیۆم نزم بوو بە بەراوردی لەگەڵ کالسیۆم، کە بەرزترینی گەیشتە (٨٩.٥٩) ملگم/ لیتر. لە ویستگەی ٦ی دێگەڵە کە لە کەرتی رۆژهەڵات تۆمار کرا. لەم کەرتەدا مەگنسیۆم زاڵی پێشاندا لەسەر کالسیۆم و بە پێچەوانەش لە هەرسێ کەرتەکانی تر.

بوونی ماددە کیمیاوییەکان لەناو نموونە ئاوییەکان کاری کردە سەر بەهای گشتی ماددە رەقەکانی ئاوەکە، کە گەیشتە بەرزترین بەها (٢٠٠٨ مایکرۆسایمنس/ سم) کە لە جۆگەی ئاودراستی گوندی گرد عەرەق



لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکان تۆمار کرا.

لایەنی بایەلۆجی لەم لێکۆڵینەوەیە ژماردنی جۆرە قەوزە سەرەکییەکانی گرتەخۆ کە بەرزترین ژمارە گەڕایەوە بۆ جۆری سندرا کە (٤.٠٦.٧٠ × ١٠)$^{٣}$ خانە/ لیتر بوو کە لە جۆگەی کونە دڵۆیە نزیک پرد لە کەرتی باکوور.

بەرزترین ژمارەی جۆری مێتزیا (٨١.١٢)× ١٠$^{٣}$ خانە/ لیتر بوو کە لەکارێزی گرد عەرەقی کەرتی باکوور تۆمار کرا و بەرزترین ژمارەی جۆری سمبێلا (٣٦.٢٣)× ١٠$^{٣}$ خانە/ لیتر کە لە کانیاوی کونە دڵۆیە سێپارە لە کەرتی باکوور تۆمارکرا. بەرزترین جۆری مینۆسێلا (١٥٨)× ١٠$^{٣}$ خانە/ لیتر بوو.

(٢٥٠) جـۆر لە قـەوزە نادایتۆمییەکـان لە هەولێر تۆمار کـراوە. ئەم جـۆرە قـەوزانە کـە لە ئاوەکـان هەبوون دابەش بوونە سـەر کەرتە جیاوازەکانی پارێزگای هەولێر، رۆژهەڵات و باکوور و باشوور کەرتی رۆژئاوا کەمترین جۆری تیابوو.

هەرزە نەبوونی ئاوی شیرین بۆ ئەو پێویستییە جۆراو جۆرانەی مرۆڤ لە بەرهەمهێنان و کشتوکاڵ و پێویستی زۆر بۆ ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەمینە وات لێدەکا کە بیر و خەیاڵ لە ئایندەی دوور و نزیک بکرێتەوە، ئەگەری شەڕی دواڕۆژ لەسەر ئاوبێت لەنێوان میللەتان و دەوڵەتانی دراوسێ و نزیک یەک بەتایبەتی ئەمانەی ژیانیان لە هەمان سەرچاوە ئاوەکانە، شانبەشانی ئەم بۆچوونە سەدەی بیستەم رووبەرووی پیس

بوونی ئاوی شیرینە بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە بەرهەمهێنانی تێدا دیارە. ئەمە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە نەزانی و نەفامی لە چۆنیەتی بەرێوەبردنی و بەکارهێنانی ئاو لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤ. کوردستان کە لەم شوێنانە دادەنرێت کە ئاوی شیرینی گەلەک زۆر هەیە، ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ولاتانی جیهان و هەروەها دراوسێکان. لەبەر ئەمە ئاوی ژێر زەوی لە کوردستان، کە سامانی نەوەکانی ئایندەمانن پێویستە زۆر بەداناییانەو زانایانە بەرێوەببرێت. پێویستە لەسەر لێپرسراوانی کورد، کە بزانن و بیر بکەنەوە لە چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەم سامانە گرنگە، هەتاکو هەردەم پاشەکەوتێکی باش لە سامانی ئاوی ژێرزەوی بپارێزێ و بمێنێ و هەروەها بەکاربێت بفرۆشرێت ئەگەر بێت و رەوتی قەبارەی ئاو لە کوردستان لێکبدەینەوە، ئەبینین نزیکەی ١١٤ ملیار م٣ ئاو لە کوردستاندا هەیە، ئەمە رووبار و گۆم و کانی و بارانیش دەگرێتەوە. ئەگەر بێت، حیسابی ئاوی ونبوو بکەین لە کوردستان لەرێگای هەڵم بوونیش، دەبینین ٩.٤ ملیار م٣ لە ساڵێکدا ئاو گوم دەبێ لە کوردستان و ئەگەر پێداویستی راستی ئاو لە کوردستان بژمێرین دەبینین ٢.١ ملیار م٣ لە ساڵێکدا پێویستی کوردستانی عێراق بە بۆچوونی من ساڵانە ١٠.٢ ملیار م٣ ئاومان زیاد دەبێ. جێی ئاماژەیە، کە ئەو زەوییانەی لەوانەیە بە هاوینە پێویستی بەئاو بێت، رووبەرەکەی دەگاتە ١.٢ ملیۆن هەکتار لەبەر ئەوە پێویستە سەرکردەکانی کورد بیر لەزۆر شت لەسەر ئاو بکەنەوە. باشترە ئەم خاڵانەی خوارەوە رەچاو بکرێت:

١- نەهێشتنی خاک و زەوی بێ بەرهەم لە کوردستان و چارەسەری زانستییانەو هەڵبژاردنی دانەوێڵەی گرنگ بۆ پیشەسازی و خواردن.

٢- دروستکردنی کارگە بۆ ناردنە دەرەوەی ئاو، ئاوی شیرین و ئاوی دەرماناو، وەکو حاجی ئۆمەران.

٣- دەبێ یاسا دابنرێ بۆ بەکارهێنانی ئاو، بەهەڵە ئاو بەکار نەهێنرێ، لەبەر ئەوەی سامانی ئاو سامانێکی ولاتی و میللییە بۆ نەوەکانی ئایندە.

٤- بەکارهێنانی ئاو وەکو بەڵگەیەکی سیاسی براوە دژ بە دەستێوەردانی ولاتانی دراوسێ، ئەمەش پێویستی بە رێکەوتننامە هەیە لەسەر ئەمنی قەومی لەگەڵ ئەم ولاتانە بەپێی یاساکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٥- دروستکردنی بەنداوی زۆر لە کوردستان.

٦- کارکردن لەسەر دۆزینەوەی سیاسەتێکی ئاوی کوردستانی تایبەت، هەموو لایەنە چاک و خەراپەکان رەچاو بکرێ و پەیرەو بکرێت، بە جۆرێک لە خزمەتی کێشەی میللەتی کورددا بێت، سوود لە تاقیکردنەوەی کێشەی خاکی کوردستان لەسەر نەوت و هۆیەکانی وەربگیرێت، کە بووە هۆکاری ئەوەی کە میللەتی کورد مافی خۆی وەرنەگرێت، پێویستە دروستکردنی جۆگە و جۆگەلەکانی ئاودێری لە کوردستان بەو جۆرە بێت، کە بگاتە هەموو جووتیارێک و سوود وەرگرتن لە ئاوی سەرزەوی شانبەشانی و قەدەغەکردنی بیری ئیرتیوازی و سوود وەرگرتن لە ئاوی ژێرزەوی کەم بکرێتەوە.

٧- دروستکردنی بەنداوی بێخمە تەواو بکرێت، کە یەک لە ئامانجی هەرە بنەرەتی دوژمنانی کوردە، کە رێگای لێ بگیرێ، هەروەها دروستکردنی بەنداوی دیکە لە کوردستان تا ئاوی کوردستان بەفیرۆ نەروات.





# مێژووی کارێزەکانی دەشتی هەولێر

عەباس سلێمان سمایل

بەگوێرەی قسەی نووسەر و گەڕیدەکانی ئیسلامی، بەتایبەتی نووسەرانی سەردەمی عەبباسی لە کوردستانی ئەمڕۆی عێراق لە سێ ناوچە کارێز هەبووە، لە ناوچەی شنگارو ناوچەی بەدرەو دەشتی هەولێر و ئاماژەیان بەهەبوونی (٣٦٥) کارێز لە دەشتی هەولێر کردووە، کە سەرچاوەکانیان لەدەوروبەری بەحرکە تا قوشتەپە بڵاو بوونەتەوە. هیچ سەرچاوەیەکیش ئاماژە بە لێدانی ئەم کارێزانە ناکات لە سەردەمی ئەمەوییەکان یا عەباسییەکان، کەچی سەرچاوەکان ئاماژە بە ساسانییەکان دەدات، کە چ گرنگییەکیان بەئاودێری خاکی میزۆپۆتامیا داوە. کەوابێ ئەم کارێزانە ئەگەر بۆ سەردەمی ئەشکانییەکان نەگەڕێتەوە بەتایبەتی فەمانڕەوایی میرنشینی (حدیاب)، ئەوا بۆ سەردەمی ساسانییەکان دەگەڕێتەوە، دیارە ئەم کارێزانەش تا سەردەمی ئەتابەکییەکان هەبوون و شینایی و ڕەزو باغیان لەبەر کردووەو دواتر بەهۆی هێرشە یەک لەدوای یەکەکانی تورک و مەغۆل، دانیشتووانی دەشتی هەولێر ئاوارە بوون و بەدرێژایی ڕۆژگار بەبێ خزمەت ماونەتەوە و کۆربوونەتەوە، یا دەبێ لەئەنجامی هێرشەکانی تورک و مەغۆل ئەم کارێزانە ڕمابێتن و وەک چۆن ڕژێمی بەعس کانیاوەکانی چیمەنتۆ ڕێژ دەکرد یا دەیتەقاندنەوە، ئیتر بێجگە لە کارێزی ئاوی میری ئەگینا ئەوانی دیکە تا دەوروبەری (٢٥٠-٣٥٠) ساڵ لەمەوبەر هەرهەموویان کۆربووبوونەوە، ئەگەر کەسێک کارێزێکی دەربدابایە و پاکی بکردبایەوە، ئاوی کارێزەکە بووەتە موڵکی ئەو، جا کارێز هەیە (٨-١٠) کەس پاکیان کردۆتەوە، بۆیە بووەتە موڵکی هەموویان، ساڵانەش باجی ئاوی کارێز دراوە بەمیری، ژمارەی ئەو کارێزانەی کە ئەم (٢٠-٣٠) ساڵەی بەم دواییە مابوون، ئەمانە بوون: ئاوی میری، مورتکە، برایمەلەک، دووئاوی قوشتەپە، کەسنەزان، قۆڕیتان، قەتەوی،... ئەم ئاوانەش لە زوورگەکانی دێدەوان و کەسنەزان و سێنک بەژێر زەویدا ڕاکێشراون و لەشوێنە نزمەکان هاتوونەتە دەرەوە، هەر کارێزێکیش لەژێرەوە تۆنێلەکەی مرۆڤ بەئاسانی پێیدا دەڕواو نێوان هەردوو بیری تۆنێلەکە دەوروبەری (٥٠) مەتر دەبێت، کە یارمەتی کارێز لێدەری داوە لە هەڵکەندن و هەروەها یارمەتیدەریشە بۆ پاراوکردن و پاککردنەوەی، ئەم بیرانەش بەقووڵایی

(١-١.٥م) دەمێننێ و ڕەفێکی بۆ دروست دەکەن بۆ ئەوەی بە کەرێووچ سەری بیرەکە وێک بێننەوەو سەرەکەی بگرن، ڕەفی هەندێک لە کارێزەکان هەمووی بەکەرێووچی گەورەو هەندێکیش بەکەرێووچی گچکە گیراوە ئەوەش ئاماژەیە بۆ کۆربوونەوەی ئەو بیرانەی کە بەکەرێووچی گەورە سەری گیراوە.

کارێزیش مولکی هەرکەسێک بوایە بەپارە دەبوایە جووتیاران شینایی لەبەر بکەن یا مەڕو ئاژەڵانی دیکەی لێ ئاو بدەن. جا ئەوەی شینایی لەبەر بکردبایە بێ پرسی خاوەن ئاو، ئەوا خاوەن مولک مەڕێکی لێ وەردەگرتن، ئیتر ئەم کارێزانە بەردەوام شینایی لەبەرکراوە، هەمیشە ژمارەیەک لە وەستای کارێزیش هەبووە لەوانە وەستا فەتاح، وەستا قادر، هەر وەستایەکیش (٣-٤) کرێکاری هەبوو بۆ یارمەتی، لەهەر جێگایەکی کارێز رووخابێ، لەنزیکترین بیرەوە قوڕو خۆڵەکە بەهۆی بەکرەو دەولکەوە دەردەدرێتەوە.

تا ساڵی شەستەکان وەستاکان لە نیو دینار تا دینارێکیان وەردەگرت و کرێکاریش (٢٥٠) فلسی وەردەگرت، یەک لەم وەستایانە وەستا غەفور بوو، کە دەڵێت: من لەساڵی ١٩٦٠ تا ١٩٧٠ بەکارێز لێدانەوە خەریک بووم، ڕۆژانەش لە (٥٠٠-٧٥٠) فلس-م وەردەگرت، هەوای ناو تونێلی کارێزیش هەمیشە خۆشە بەهاوینان فێنک و بەزستانان گەرمە. کارێزیش بەردەوام ماسی تێدا بووەو زیاتریش لەنزیک سەرچاوەکان کۆ دەبوونەوە، ئەو شوێنەی ڕۆناکی هەبوایە ماری هەبوو، بەڵام زیانیان نەبوو.



جۆزەلی فەتاح

ئەمڕۆکەش تەنها دوو وەستای کارێز لەژیاندا ماون، ئەوانەش وەستا غەفوورە، کە لە هۆزی (بابان)ە و لە گوندی "مورتکەی گچکە" نیشتەجێیە، وەستا (خدر)یش لەهۆزی (بلباس)ە و لە گوندی "برایمەلەک" نیشتەجێیە.

شینایی کردن لەبەر ئاوی کارێز: ئەگەر سەرچاوەی ئاوی کارێز لەناو زەوی خاوەنەکەی بێت لەهەر گوندێکی، ئەوا خەڵکی گوندەکە بۆیان نییە شینایی لەبەر بکەن یا ئاژەڵی لەبەر ئاوبدەن بەبێ رەزامەندی خاوەن ئاو، ئەگینا کاوڕیان لێ وەردەگرێ، بەڵام ئەگەر خاوەن کارێز سەرچاوەکەی کەوتە زەوی گوندێک و گوندەکە مولکی نەبوو، ئەوا خەڵکەکە دەتوانن مەڕی لێ ئاو بدەن و تا ئەندازەیەکیش دەتوانن شینایی لەبەر بکەن، بۆ نموونە ئاوی مورتکەو برایمەلەک لەگوندی "گۆسکە" ئاشیان لەسەر دامەزراندبوو. لە "پیرداود"و "دووسەرە"ش شیناییان لەبەردەکرد، بەتایبەتی برنج، ساڵانە (٢٠٠-٣٠٠) عەربە برنج دەهات و دەیانفرۆشتە بازرگانەکان.

### کەل و پەلەکانیکارێز لێدان و دەردانەوە

**چەرخ و پێکهاتەکانی:** چەرخەکان دوانن کە بەدارێکەوە بەیەکەوە بەستراون کە بەناوتیرە ناسراوەو خراونەتە سەر دارێکی دوولک و بەدارەکانی چەرخەکەش دەگوترێت دەستەمست، بەدارە دوولکە یا دوو گوێیەکەش دەگوترێت گێچەرخ.

**دەولک:** دەولک لە چەرمی ڕەشەوڵاخ دروست دەکرێت، دەورەکەی تێلەکیان لێ دەبەست کە پێیان دەگوت چەمبەرە. بەدەسکی دەولکەکەش دەگوترێت باغە، کە لە چەرم دروست دەکرا، کەرستەکانی دیکەش بریتی بوون لە کولێنگ، بێلچە (خاکەناسی گچکە) پێمەڕە، قوڵاب.

### دەردانەوەو پاراوکردنی کارێز

ساڵانە لە مانگی (٢-٥) دەست دەکرا بەپاراوکردنی کارێزەکان و پێیان دەوت پاکلەمە، لەم کارە وەستایەک لەگەڵ (٤-٥) کرێکار کاریان تێدا دەکرد، دووان لەمانە لەژێرەوە کاریان دەکردو دووانیش لەبانەوە گڵ و قوڕیان ڕادەکێشا. بەتونێلەکەی کارێزیش دەگوترا (شاقۆر) و بە لقەکانی شاقوریش دەگوترێت چەتارە، پاککردنەوەش زیاتر لە شاقۆر ئەنجام دەدرا.

### پەراوێزەکان

* کارێزەکانی دەشتی هەولێر پەیوەندییان بە ئاشورییانەوە نییە، چونکە ئاشورییەکان تەنها ئاویان بەشێوەی رووبار لە چیاکان بۆ دەشتەکان راکێشاوە، هەروەک لە

بەڵگەنامەکانی ئاشووری ناوی ئەم ئاوانە هاتووە، وەک: پرۆژەی خانی کە لە بەستۆڕەوە هاتووەو راکێشراوە بۆ شاری هەولێرو رووباری خۆسەر لەگەڵی باڤیان لە شێخان بۆ موسڵ راکێشراوە.

* بەڕێز جەلال سنجاوی دەڵێت ساڵانی نێوان ١٩١٨-١٩٢٠ (١٨) کارێز لە دەشتی هەولێر ئاویان لەبەر دەڕۆیی، بەڵام ئەمڕۆکە ژمارەیان زۆر کەمتری کردووە.

* ئەگەر بیانویستبا ماسی راوبکەن سەرە کارێزەکانی نزیک سەرچاوەیان دەکردەوەو دەرمانیان تێ دەکرد بۆ ئەوەی ماسییەکان بەرەو سەرچاوە بڕۆن، بەو کارێزەی کە دەرمانیان تێ دەکرد (بەند)یان پێدەوت، هەمیشە بەڕۆژ دەرمانیان تێ دەکردو بەر لەخۆرئاوابوون دەستیان بەڕاوە ماسی دەکرد.

* گەڕۆکی فەرەنسی تاڤرینە لە ساڵی ١٦٣٨-١٦٤٢ ئاماژە بە باخاتی نێوان پردێ و هەولێر دەکات، ئەمەش هەڵبەتە بەئاوی کارێزەکان ئاودراون، هەروەها کاپتن (های) لە ساڵی ١٩٢٠ دەڵێت لە ساڵی ١٩١٨ ژمارەی کارێزەکانی دەشتی هەولێر دەگاتە (٢٠) کارێز.

* کارێز لە (کانی ریز) هاتووە کە لەزمانانی فارسی و تورکی و عەرەبی بەشێوەی (کهریز) بەکاردێت، هەندێکیش لایان وایە کارێز لە کهریز واتا ریزی کا هاتووە وەک (کهربا) دیارە کاتی خۆی (کا)یان بەکارهێناوە بۆ زانینی رێڕەوی ئاوەکە.

* لەگەڕەکی پۆلیسان یەکێک بەناوی کەمال، بیرێک بۆ ئاودەستی تەندروستی لێدەدات و دەگاتە تونێلی



حاجی فەتاح عەلی کارێزچی

کارێزێکی پڕ لەئاو، جا ئەم برادەرە بیرێکی دیکەی لێداو نەیویست ئاوی ئەم بیرە پیس بکات.

* لە ناوەڕاستی ئەم مانگە وەزارەتی ئاودێری و سامانە ئاوییەکانی عێراق داوای لەوەزارەتی شارەوانی هەرێمی کوردستان کرد، کە کارێزەکانی دەشتی هەولێر لەسەر ئەرکی وەزارەتی ئاودێری و سامانە ئاوییەکانی عێراق نۆژەن بکاتەوە، جا بۆ ئەم مەبەستە وەزارەتی شارەوانی هەرێمی کوردستان ئەم کارەی بە تیمێکی جیۆلۆجی سپارد، ئەوانیش بۆ ماوەی هەفتەیەک رووپێوێکی دەشتی هەولێریان کردو ژمارەیەک کارێزی هەڕفتی و کۆربووەویان لەگوندەکانی (گردمەلا، مورتکەی گچکە، قوشتەپە، عارەبکەند، سوێرە، حەزە، باغلومنارەو حەزەو پیرداود بەهۆی ئامێری تایبەت دۆزییەوە، هەشت کارێز لەم کارێزانە شوێنەواریان نەماوە لەسەر زەوی، هەندێک لە بەتەمەنەکانی ئەم ناوچەیە

کۆربوونەوەی ئەم کارێزە کۆربووەوانە بۆ ساڵانی (١٠٠-٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر گەڕاندەوە.

لەهەموو کارێزەکانی دەشتی ئەمڕۆکە تەنها ئەم کارێزانە وشکیان نەکردووە، ئاوی میری، کارێزی کەسنەزان، کارێزی گرد عارەق، کارێزی قاسماغا.

بەقسەی ئەندازیارێکی ئەم تیمە گرنگییەکی ئەوتۆ بەم رووپێوە نەدراوە، گوایە نۆژەنکردنەوەی کارێزەکان پارەیەکی زۆر و ماندووبوونێکی زۆرو ماوەیەکی زۆریشی دەوێ، ئەگەر لەجیاتی نۆژەنکردنەوەی ئەم کارێزانە بیر لێبدرێت پارەیەکی کەمی تێدەچێت و بەماوەیەکی کەم کارەکە تەواو دەبێت، کەچی مەبەستی وەزارەتی عێراقی لەنۆژەنکردنەوەی ئەم کارێزانە زیاتر پاراستنی کلتوورە نەک مەبەستی ئابووری.

*** تێبینی:**

کارێز لەزۆر ناوچەی دیکەی کوردستان هەبووە، کە بەچەند بیرێک تەواو بووەو بەڵگەشمان ڕەنگدانەوەی وشەی کارێز لەژمارەیەک ناوی ئەو گوندانە وەک: کارێزە وشکە، بان کارێز...

(بان کارێز)یش کارێزێکە نزیک گوندی جێگلاوەی شۆریجەی کەرکووک، بەڵام گوندەکە لەمێژە نەماوەو کارێزەکەش تا سەرەتای هەشتاکان ئاوی لەبەر دەڕۆیشت.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (ئاستی فۆلکلۆر). ژمارە (١٦) ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوبۆتەوە.**




**نەخشەی دابەشبوونی کێڵگە نەوتیەکان لە پارێزگای هەولێر**

# نەوتی هەولێر

## نافیع دیبەگەیی

پارێزگای هەولێر لە باکوورەوە لە سنووری ئێـران و تورکیـاوە بەرەو خوارەوە بەنێوان هەردوو زێی گەورە و گـچکە شۆڕ دەبێتـەوە دەو رووباری دیجلە و سـەبارەت بە سیاسـەتەکانی بەعـــەرەبکردن لە زووەوە وردە وردە حکومـــەتی ناوەند لە سنووری لای رووباری دیجلە دزەی کردووە و تاکو سـالانی شـەست و حـەفتـا نیـوەی ناحیـەی کـەندێناوەشی لە هەولێـر دابڕی و بە قـــەزای دوبزی لکاند. قـــەزای مـــەخـــموور لە بەرایی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەر ســەر بە پارێزگــای هەولێــر بووە، دەکـەوێتـە نێـوان زێی گـەورە و زێی گـچکە و دەو رووباری دیجلە کــە سنووری پارێزگای مـوسـڵـە. قـەزای مەخموور، کە بەشێکی زۆر دەشتایی

هەولێر پێکدەهێنێ باشترین دەشتی کوردستان و هەموو عێراقە لە بەرهەمهێنانی گەنم و جۆ، هەروەها ژێرزەمینییەکەشی بە نەوت دەوڵەمەندە و بە یەکێک لە ناوچەکانی جیهان دادەنرێ سەبارەت بە یەدەگی نەوت و باشترین جۆری نەوت. هەردوو ناحیەی گوێر و کەندێناوە، کە لەزێی گەورەوە درێژ دەبنەوە سەر زێی گچکە بە درێژایی پتر لە (٦٠کم) لە نێوان چیای قەرەچووغ و زوورگەزراو، کە تەریب بە یەکن و دەشتە شێوە لاکێشەییەکە لەنێوخۆ دەگرێت، کە هەر لە دێر زەمانەوە ئەو ناوەندە پێگەیەکی بایەخداری هەبووە لە رووی سەربازی و ئابوورییەوە، بەتایبەت کە گوێر و دیبەگە کەوتوونەتە سەر رێگای سەردکی موسڵ- کەرکووک بەغدا و لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بەشێک بووە لە رێگای سوڵتانی، کە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەو رێگایە بە ئاسایش کرابوو بۆ هاتوچۆی کاروانەکانی نێوان دەوڵەت و ویلایەتەکانی. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و سەروەختی وێڵبوونی رۆژاوا بە دوای کانە نەوتەکانی رۆژهەڵات ئەو ناوەندەی هەولێر بووە جێگای بایەخی وڵاتانی داگیرکەر، بەر لە هەموو کەس ئەڵمانەکان هەوڵی گلدانەوەی نەوتی ویلایەتی موسڵیان دا، کە هێشتا ئینگلیز هەستی بە بایەخی نەوت نەکردبوو، کەوا پاپۆرە جەنگییەکانی بە رەژوو دەکەوتنە گەڕ تاکو سەرکردەی دەریاوانی ئینگلیز (فیشەر) بایەخی نەوتی بۆ پاپۆڕەکان بە گرنگ زانی، ئەوەبوو ئەڵمانیا توانی لەگەڵ سوڵتانی عوسمانلی رێکبکەوێ بەراکێشانی هێڵی ئاسنینی بەرلین- بەغدا و بەشێکی ئەو هێڵەش بە خوارووی هەولێردا گوزەری دەکرد بە درێژایی پتر لە (٦٠کم) بە هەردوو شارۆچکەی گوێر و دیبەگە و لە هەردوو زێی گەورە و گچکە دەپەڕییەوە، ئیدی ئیمتیازی رێگای ئاسنین و ئیمتیازی گەڕان و پشکنینی لەو ناوەندەی پارێزگای هەولێر مایەی بایەخ پێدانی دەوڵەتانی داگیرکەر بوو، ئەو دەشتەی هەولێر کە نەوتی تیادا دۆزراوە، هەرزوو وەکو زۆر ناوچەی دیکەی نەوتدار سەرنجی سوڵتان عەبدولحەمیدی راکێشا کە موڵکیەتی کەندێناوە و قەراجی دەشتی هەولێر بخاتە سەر موڵکیەتی تایبەتی خۆی و لە موڵکیەتی دەوڵەت بیانسرێتەوە، ئەوەبوو کەندێناوە و قەراج خرانە سەر ناوی (سەنیە)ی خێزانی سوڵتان و هەندێک لە ناوچەکانی دیکەش بۆ سەر ناوی کەسە نزیکەکانی سوڵتان ئیدی ناوی سەنیە تاکو ئێستاش بۆ کەندێناوە و قەراج ماوەتەوە، کەوا سالی ١٨٨٢ز. سوڵتان بە فیتی ئەندازیار و وەزیری مالیەی ئەوکاتی سەرکیس کالۆست گولبەنگیان ئەم بڕیارەی دەرکرد بەنیازی ئەوەی ئەو ناوچە نەوتیانە بایەخی تایبەتی خۆیان هەیە.

ئەوەبوو سالی ١٨٨١ زانایانی ئەڵمانی لە بەدوادا گەڕانی نەوت لە ویلایەتی موسڵ و بەغدا توێژینەوەکیان ئەنجام دا بە شێوەیەکی بەرایی چەندین پشکنینیان کرد دەربارەی دۆزینەوەی نەوت و سالی



بڕە برگەیەکی جۆلۆجی نەوتی کەرکوک

١٩٠١ گەیشتنە ئەوەی، کە ئەو ناوەندانە نەوتێکی زۆری هەیە و دەتوانرێ لە بواری بازرگانی بەکاری بهێنن و توانییان رەزامەندی سولتان عەبدولحەمید وەربگرن و فەرمانی سولتانی بۆ دەربچێت، کە مافی ئیمتیاز وەربگرن بۆ کارکردن لە نەوتی ویلایەتی موسڵ و بەغدا و لەگەڵ سولتان رێککەوتن، هێڵی ئاسنینی بەرلین- بەغدا رابکێشن و بەپێی پرۆتۆکۆڵی تایبەت چەندان مەرجی لەخۆ گرتبوو، یەک لە مەرجەکان گلدانەوەی سامانی ژێرزەوی ئەمبەر و ئەوبەری هێڵەکە و ئەم ئیمتیازەش ململانێ و کێشەیەکی دوور و درێژی لەنێوان وڵاتانی رۆژئاوا و کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان نایەوە و چەندان فەرمانی دیکەی سولتانی بەدوادا هات، کەوا سولتان دەیویست سەرمایەی وڵاتانی رۆژاوا بخاتەگەڕ و پەیوەندی کردبوو بە بانکی ئەڵمانی و کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی بەرلین- بەغدا و ساڵی ١٩٠٦ بانکی ئەڵمانی سەبارەت بە سەرقاڵییان بە راکێشانی هێڵەکە نەیتوانی کاری بەرهەمهێنانی نەوت ئەنجام بدات، شایانی باسە ساڵی ١٩٠٨ کاری هێڵی ئاسنین وەستا سەبارەت بە کودەتای دەستووری تورکیا و ئەگەرەکانی هەڵگیرسانی جەنگی گێتی یەکەم ئەوەبوو هێڵەکە زۆربەی زۆری کرابوو رێگاکە راست و چەورێژ کرابوو تەنیا کاری بەستنی شێلمانە ئاسنینەکەی مابوو کە پاشان کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات کە بەریتانی بوو بەرێوەبەرەکەی سێر پێرسی کۆکس بوو بەو کارە هەڵسا لەنێو دوو زێیان لە گوێر و کەندیناوە ئێستاش ئاسەواری ماوەو بە (جادەی بەردێ) بەناوبانگە و کرێکاری کورد لەو مەڵبەندەی هەولێر کاریان تێدا دەکرد و پێیان دەگوترا کولی و شان بەشانی هیندەکان کاریان دەکرد، کە ئەوان سیخ و جۆرجی بوون و تاکو ئێستاش ناوی (سیکەو گورگە) لە لایەن کەسانی بەساڵاچوو دووبارە دەبێتەوە.

ساڵانی ١٩٠٤-١٩١١ بەریتانیا کەوتە سەر رای فیشەری سەرکردەی دەریاوانی، بەتایبەتی وینستۆن چەرچەڵ زۆر بایەخی بەمە دا، کەوا پاپۆرە جەنگییەکانیان بە نەوت کاربکات لە جیاتی رەژوو، بۆیە کەوتە خۆ بەدوای مسۆگەر کردنی نەوت و گەڕان بەدوای سەرچاوەکانی نەوت لە هەر جێگایەک و بەهەر نرخێک، ئیدی بەریتانیا لەرێگای وەزارەتی دەریایی خۆی هاوکاری دارسی کرد، کە خەریکی بە ئیمتیازبوونی نەوتی ئێران بوو، بەمەوە کۆمپانیای نەوتی بۆرمای بەریتانی لەگەڵ دارسی رێککەوتن و کۆمپانیای نەوتی بۆرمای سنووردار دامەزراو دارسی بوو بە بەرێوەبەری و بەمە دارسی توانی کاری پشکنین و دۆزینەوە ئەنجام بدات، کە پێشتر خەریک بوو هەردەس بهێنێ.

ساڵی ١٩٠٩ دیسان وەزارەتی دەریاوانی بەریتانیا، کە چەرچڵ لێی بەرپرس بوو پێشنیازی دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ- ساکسۆنی کرد بۆ بەرهەمهێنانی ئیمتیازی دارسی، ئەوەبوو دامەزراو توانی دەست بگرێت بەسەر زۆر لە پشکە نەوتەکانی ئێران و عێراق و لەنێوانیاندا کوردستان، ساڵی ١٩١٠ بانکی ئەهلی تورکی بە سەرمایەی ئینگلیز دامەزرابوو و پشکێکی زۆری نەوتی بەرکەوت و لەو کاتانەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش لە هەوڵی ئەوەدا بوو خۆی بخاتە نێو هاوکێشەکان و ململانێ بۆ گلدانەوەی نەوت و توانی رەزامەندی سولتان مسۆگەر بکات و مافی ئیمتیازی نەوت وەربگرێ و لە بەندەکانی رێککەوتننامەکەدا واهاتووە، بۆی هەیە ئەویش لەم بەر و ئەوبەری هێڵە ئاسنینەکە بە پانی (٢٠کم) لە خاکی نێوان موسڵ و کەرکووکی بۆ دیاری کرا، کە بەشێکی لەو بەشەی هێڵەکە بوو و بەخاکی هەولێر گوزەری دەکرد لە گوێر و کەندیناوە. دیارە ئەمەریکا لە رێگای نوێنەری خۆی چیستەر کارەکانی ئەنجام دەدا، بەمەوە تەواوی ویلایەتی موسڵ یاخود کوردستان بووە مەیدانی ململانێی سیاسی و کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانی رۆژئاوا،

ئینگلیز و ئەڵمانیا دژ بە سیاسەتی ئەمەریکا لە بواری نەوت ڕێککەوتن، کەوا بانکی ئەڵمانی و بانکی ئەهلی تورکی، کە سەرمایەکەی بەریتانیایی بوو ساڵی ١٩١١ لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کۆمپانیایەک دابمەزرێنن بەناوی کۆمپانیای ئیمتیازی ئەفەریقای ڕۆژهەڵاتی سنووردار و پاشان ساڵی ١٩١٢ لەڕێگای پارێزەری بانکی ئینگلتەرە (کۆڵبی) کۆمپانیایەکی هاوبەش هاتە مەیدان، کەوا بنکەکەی لە ئینگلتەرە بوو بەناوی کۆمپانیای نەوتی تورکی سنووردار و پشکەکانی بەم جۆرە بوون: ٢٥٪ بانکی ئەڵمانی، ٢٥٪ کۆمپانیای ئەنگلۆ-ساکسۆنی (کۆمپانیای ڕۆیالی بەریتانی+ کۆمپانیای شێڵی هۆڵەندی)، ٣٥٪ بانکی ئەهلی تورکی، واتە ئینگلیز خۆی)، ١٥٪ بۆ ئەندازیاری ئەرمەنی و ناسنامەی عوسمانلی کالۆست گولبەنگیان، ئیدی ئەوە بەرایی بە کۆلۆنیالبوونی کوردستان بوو لەبەر بوونی نەوتی زۆری کورد چارەنووسەکەی ڕەنگی ڕەشی نەوتی وەرگرت. لێرە بەدواوە چەندان پرۆتۆکۆل و ڕێککەوتن نامە دەبەستران و هەڵدەوەشانەوە بە جۆرێک لە گەرمەی دانوستانی گەورە بەرپرسانی وڵاتانی داگیرکەر بێتەل و تەلەفۆنەکان بەردەوام لە پەیوەندیدا بوون لەگەڵ کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانی نەوت و تێروانینی شارەزایانی بازرگانی نەوت لە جیهاندا، کەوا کرژی و خاوی دانوستانەکان بەپێی بازاڕی نەوت بەرز و نزم دەبوو، بەم جۆرە دابڕینی خاکی وڵاتێک و هەڵنانی بە وڵاتێکی دیکە بەپێی خاکی ئیمتیازیان و ئەنجا ئەمجارە لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسا کۆمپانیای نەوتی تورکی دامەزراو ویلایەتی موسڵ بەپێی مەرج بە وڵاتێک لکێنرا، کە هێشتا ناوی لێ



عەمبارەکانی نەوتی کوردستان



دابەشبوونی بەرهەمی نەوت
لە هەموو عێراق بە بەراوردی
نەوتی کەرکوک و هەولێر

نەنرابوو (عێراق)، بەڵكو رۆژئاوا بە هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرای دەگوت میزۆپۆتامیا، كە سنووری لای باكووری چیای حەمرین بوو، بەڵام لە سەرچاوەكانی مێژوو ناوی (عراق العجم) و (عراق العرب)یان بەرچاو كەوتبوو، لەو روانگەوە ناویان لەوڵاتی تازە پەیدا نا (عێراق)، پاش لكانی موسڵ هەرسێ لایەنی ئینگلیز و فەرەنسا و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لەسەر وەرگرتنی پشكە نەفتەكەیان رێككەوتن و كۆمپانیای نەوتی توركی، كە بنكەكەی لە ئینگلتەرە بوو لەگەڵ حكومەتی تازە لەدایكبووی عێراق رێككەوت لە ١٤/ئازار/ ١٩٢٥ بەو پێیە كۆمپانیا مافی بەرهەمهێنانی هەبێت لەخاكی عێراق و ویلایەتی موسڵ جگە لە ویلایەتی بەسرا و ناوچە راگوێزراوەكانی خانەقین و بۆ ماوەی (٧٥) ساڵ و هەرسێ لا رەزامەند بوون بە لكانی موسڵ بە ویلایەتی بەغدا و بەسرا، كە لە ١٩٢٥/١٦/١٢ كۆمەڵەی گەلان بڕیاری پێداو بۆ ماوەی (٢٥) ساڵیش (١٠ ٪)ی نەوت بدرێت بە توركیا.

ئەمەریكاش پاش داگیركردنی عێراق و كوردستان لەلایەن ئینگلیز هەر لە ساڵی ١٩١٩ دەستی بە پشكنین كرد و ئەی. ئیچ. پاسكۆ چەند راپۆرتێكی نووسی لە چیاكانی مشراق و گەیارە و ناوچەی موسڵ، گوێر، دەشتی گوێر، كە دەشتی كەندێناوەشی دەگرتەوە، واتە نێوان دوو زێیان لە پارێزگای هەولێر.

ئەمەریكاش بە بەردەوامی خەریكی پیلانەكانی بوو و سیاسەتێكی نوێی پەیڕەوكرد بەناوی (دەرگای كراوە) بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە نەوتییەكانی تاكو لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٨ پاش دەمەقاڵییەكی دوور و درێژ گرووپی كۆمپانیا نەوتییەكانی لەگەڵ كۆمپانیای نەوتی توركی (ئینگلیز و فەرەنسا) رێككەوتن. پاش ساڵێكی تەواو لە ٨/حوزەیران/١٩٢٩ كۆمپانیای نەوتی توركی ناوەكەی گۆڕا بۆ كۆمپانیای نەوتی عێراقی سنووردار، كە هەموو نەوتی كوردستان (ویلایەتی موسڵ) و عێراقی لەخۆ گرتبوو، بەم جۆرەش لەسەر پشكە نەوتییەكانی رێككەوتبوون، كە هەریەكە لەچوار كۆمپانیاكە ٢٣.٧٥ ٪ نەوت وەربگرن تەنیا كالۆست گوڵبەنگیان نەبێ بەبێ رەزامەندی خۆی كەم كراوە بۆ ٥ ٪. چوار كۆمپانیاكانیش ئەمانە بوون:

- كۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ فارسیان (كۆمپانیای دارسی).
- كۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ ساكسۆنی (كۆمپانیای رۆیاڵ+ كۆمپانیای شێڵ).
- كۆمپانیای بەرهەمهێنانی رۆژهەڵاتی نزیك (گرووپە ئەمەریكییەكان).
- كۆمپانیای نەوتی فەرەنسی.

بەم جۆرە كۆمپانیای نەوتی عێراقی سنووردار دامەزرا، كە چەند ساڵ خەریكی بوون و پێشتر ساڵی ١٩٢٥ رێككەوتنێكی لەمەڕ كرابوو، كە لەگەڵ خاكی خانەقین سنووری ئێران- عێراق بەناوی ناوچە راگوێزكراوەكان مایەوە، هەرچەندە كێشەی سنووری نێوان عێراق- ئێران ئەنجامی بەدەست نەهێنابوو، بەڵام بۆخواردنی نەوتەكەی لەنێو خۆیان ناوی ناوچە راگوێزكراوەكانیان پێ بڕی (المناطق المحولة)..

### نەوتی عێراق

نەوتی عێراق لەسەر نەخشەدا وا دابەش بووە لە باكووری رۆژئاوای وڵات دەست پێدەكات و شۆڕ دەبێتەوە باشووری رۆژهەڵات، وەكو هێڵێكی راست لەگەڵ نەوتی بەسرا بەپێی یەدەگی نەوت دەكرێت بە سێ ناوچەوە:

- ناوچەی نەوتی یەكەم

ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، كە كاری بەرهەمهێنانی لێ دەكرێت و نەوتە یەدەگەكەشی بە شێوەیەكی زانستی و كرداری بە تەواوی زانراوە.

- ناوچەی نەوتی دووەم:

ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، كە نەوتەكەی بە دۆزینەوە و هەڵكەندنی

بیرێک یان پتر خەملێنراوە.

- ناوچەی نەوتی سێیەم:

ئەو ناوچانەن کە یەدەگی نەوتی تیایاندا مەزەندەی لێ گیراوە، کە نەوت هەبێت و هێندەکەی و بوونی لە هەموو جێگاکاندا ئاشکرا نییە.

- نەوتی یەدەگی ناوچەی یەکەم

کە کاری بەرهەمهێنانی لێ دەکرێت و هێندی نەوتی یەدەگ بەشێوەیەکی زانستی زانراوە و عەمبارەکانی لە باکووری رۆژاوا دەست پێدەکات بەرەو خوارووی رۆژهەڵات لە هەردوولای رووباری دیجلە و بەرینایی تاکو بەرەو خوار شۆڕ بێتەوە رووبەرەکەی فراوانتر دەبێتەوە وەکو کەرکووک، بای حەسەن، چەمی بۆر (جەمبور)، نەفتخانە، ئەوانەی باکووری رۆژاوا بریتین لە عێنزالە، بەتمە، گەیارە، ئەوانەی خوارووش بریتین لە زوبێر، رومێلە.

ناوچەی دووەم:

ئەم ناوچانەن یەدەگی نەوتیان بەهۆی هەڵکەندنی بیری نەوت دیاری کراوە، بوونی یەدەگی نەوتی وەکو ناوچەی یەکەم مسۆگەر نییە، ئەو ناوچەیە تەریب بە ناوچەی یەکەم لای رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە شۆڕ دەبێتەوە لە شێوەی لاکێشەیەکدا، کە فراوانییەکەی لە (٧٠کم) پتر نابێت لەنێوان ناوچە شاخاوییەکان و ناوچە زوورگاوییەکاندایە و زۆر جۆرە پێکهاتەی جیۆلۆجییان هەیە، وەکو نەوتی گوڵاباد، چیاسورخ، ئینجانە، باڵاخانە، دوو مێرداغ، قەرەچووغ، لە لایەکەی دیکەشدا نەوتی مەکحول، فەلووجە، سەماوە- کفل.

- ناوچەی نەوتی سێیەم:

وەکو ناوچەی دووەم دەبێت لە شێوەو فراوانیدا و ئەمەش دەبێتە دووبەر، بەرێکیان باکووری رۆژهەڵات دەگرێتەوە و بەرەکەی دیکە رۆژئاوای رووباری فورات دەگرێتەوە تاکو دەگاتە سنووری سووریا و ئەردەن و سعوودیە.

**نەوتی هەولێر**

بێگومان بەناو بەهیچ جۆرێک ناوی نەوتی هەولێر لەهیچ کات و شوێن و سەردەمێک نەهاتووە، بەڵکو دەکەوێتە نێو ئەو نەوتەی بە نەوتی کەرکووک ناوی هاتووە، کەوا نەوتی کەرکووک بریتییە لە سێ عەمباری گومبەزی، کە دووانیان لە خاکی هەولێرن (زوورگەزراو (ئاڤانا)، خورمەڵە، بابەگورگور) شایانی باسە زوورگەزراو و خورمەڵە لە خاکی دەشتی هەولێرن لەنێوان دوو زێیانی گەورە و گچکە لە ناحیەی کەندێناوەی نێوان زوورگەزراو و چیای قەرەچووغ و ناوچەی نەوتەکەی، کە فراوان دەبێتەوە بە ناوچەی شوان و تەقتەقدا دەکشێ و بیرەکانی شیواشۆک دەگرێتەوە لە دەشتی کۆیە لە سنووری پارێزگای هەولێر، بەمەوە یەدەگێکی یەکجار زۆری نەوت لەبن خاکی هەولێر هەیە، کە نیوەی نەوتی کەرکووک دەبێت لە حەوزێکی گەورە بە حەوزی باکوور ناسراوە لە حەوت عەمباری نەوتی گەورە پێکدێت، کە چواریان دەکەونە رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە و بەسەرەوە.

سێ بیرەکەی دیکەش دەکەونە بەری خۆراوای رووباری دیجلە، عەمباری نەوتی کەرکووک گەورەترین عەمبارە لەم حەوتەو لە هەموویان گرنگترە، کە پێکهاتەیەکی شێوە گومبەزی درێژی هەیە لە باکووری خۆراوا بەرەو باشووری خۆرهەڵات دەکشێ، هەروەک گوتمان لە سێ عەمباری دیکەی گومبەزی پێکدێت (زوورگەزراو، خورمەڵە، بابەگورگور)، کەوا عەمباری خورمەڵە گومبەزێکی غازی گەورەیە، کەوا ئێستا نزیکەی (٦٠) بیری تیادا هەڵکەنراوە لە گوندەکانی ئێدقوو، شۆریجە، خورمەڵە، چل هەوێزە، حەسارۆک، بەرزەوار، سەیدەمین، سمایلاوە، کاریتان، دیبەگە، کێڵگەی ئاڤانا (زوورگەزراو)یش بریتییە لە بیری گوندەکانی بناری زوورگەزراو بەلای کەندێناوە و دەوزێی گچکە (١١٥) بیری تیادا لێدراوە و بەرهەمیان هەیە لە گوندەکانی جاستان، دەربەند، سارەلوو، سەربەشاخ، بیرەبات، پەلکانە.. شایانی باسە کێڵگەی داودگورگە لە کلکەی چیای قەرەچووغ و دەو زێی گچکە نزیکەی (٦٠) بیری دیکەی لێ هەڵکەنراوە

و بەرهەمیان هەیە، بەو پێیە تێکڕای بیرەکانی کەندێناوە (٢٣٥) بیری نەوت دەبن و لەگەڵ بیرەکانی سنووری شیواشۆک نەوتی هەولێر پێکدەهێنن، ئەوە سەرەڕای بوونی نەوت و چەند بیرێکی دیکە لە دەشتی قەراج تەنانەت ساڵانی هەشتا لەسەر چیای قەرەچووغ بیرێکی نەوت لێدراوە، بەمەوە ژمارەی بیرەکانی هەولێر دەگەنە (٢٥٠) بیر، هەروەها سێ وێستگەش لە دەڤەرەکە هەیە لە جاستان و درکە و وێستگەی پارزنگی غازی ئاڤانا، حەقە لایەنی بەرپرس هەڵوەستەیەک بکات و ئەگەر کۆمپانیای نەوتی هەولێر دابمەزرێت ئەوا زۆر کێشەش چارەسەر دەکات، چونکە ئەوە نەوتی هەولێر دیارە و نیوەکەی دیکە بۆ کەرکووک دەمێنێتەوە.

دیارە لە سەردەمی رژێمەکان سەرزەمینی کەندێناوە سەر بە پارێزگای هەولێرە بەڵام ژێرزەمینەکەی بۆچی سەر بە کەرکووک بێت و لەو پێناوەش مافی دانیشتوانی دەڤەرەکە لە بواری تەعویزی خاکی نەوت تێ بزر بوو.

لە بەرایی نەوتی هەولێر لەژێر ئیمتیازی کۆمپانیای نەوتی تورکی بوو، کە بنکەکەی لە بەریتانیا بوو بۆ سەرمایەی ئینگلیز خۆی و پاشان ناوی گۆڕا بە کۆمپانیای نەوتی عێراق و نەوتی کەرکووک ئیدی ناوی نەوتی هەولێر لە نێوانان نەبوو و پاشان رژێمی بەعسی عێراق ناوی کۆمپانیاکانی گۆڕی بە نەوتی باکوور، نەوتی ناوەند، نەوتی باشوور بەمەوە بۆ مەبەستی تێبزرکردنی نەوتی پارێزگاکان و نەهێشتنی ناوی نەوتی کەرکووکیش شاردنەوەی راستییەکان بوو، کەوا کورد هیچ کاتێک دەستبەرداری شاری کەرکووک نەبووە، لەبەرئەوەی رژێم خۆی بەدوای نەوتەکەی کەرکووک وێڵ بوو بەو حیسابە لای ئەو کوردیش بەدوای نەوتەکەیە نەوەک شارەکە، بۆیە بە هەمیشەیی نەیویستووە کورد لە نهێنییە نەوتییەکان بگات و هەمیشەش لە هەوڵی دانەمەزراندن و کەمکردنەوەی کرێکار و فەرمانبەری کورد بووە لە کارەکانی نەوت، بەڵکو دەرکردنی کورد لەسەر خاکی خۆی...

بەرهەمی نەوتی کەرکووک بە هەرسێ عەمبارەکانی (زوورگەزراو، خورمەڵە، بابەگوڕگوڕ) هەمیشە بە تەنیا پتر بووە لەنیوەی بەرهەمهێنانی هەموو نەوتی عێراق بۆ نموونە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١ بەرهەمی نەوتی کەرکووک ٧٣٦.٩ ملیۆن تەن نەوت بوو واتە ٦٨.٧٪ی نەوتی هەموو عێراق، کە ئەوکات ژمارەی بیرەکانی تەنیا (٤٤) بیرە نەوت بوو، بە تێکڕایی بەرهەمی (٣٢٤٠) تەن نەوت بۆ هەر بیرێک، ئیدی ساڵانی دوای هەشتاکان و نۆهەد، کە ژمارەی بیرەکانی نەوتی هەولێر و کەرکووک زۆر زیاتری کرد دەبێ بەرهەمی چەند بووبێت؟

ئەو عەمبارانەی نەوتی هەولێر، نەوتیان زۆرە لە پێکهاتەی چەرخی ئۆلیجیسین و ئایۆسین (سەردەمی سێیەم) و چەرخی کریتاسی (سەردەمی دووەم)، کەوا چینەکانی جیۆلۆجی کونیلەداری جۆراوجۆرن لە جێگایەک بۆ جێگایەکی دیکە دەگۆڕێن، بەڵام بەگشتی درزدارن و چینێکی گازی نەوت لە عەمبارەکانیاندا هەیە لە نێو چینی بەردە کلسییەکانیدا نەوت هەیە، کە هەتا درزەکەیان زۆرتر بێ کونیلەداریەکەیان پتر دەبێ... وارە جودا جوداکانی جیۆلۆجی وای کردووە نەوتەکەیان لەو دەریا نەوتەدا کۆ ببێتەوە کە ئەستووری چینەکانی (١٢٠٠) پێ و پلەی کونیلەداری (٢٥) پلە و لە قووڵایی (٨٠٠-٣٥٠٠) پێ بێت..

بایەخی بەرهەمهێنانی نەوتی (کەرکووک، ئاڤانا «زوورگەزراو» خورمەڵە، بابەگوڕگوڕ) بۆ چەند فاکتەرێک دەگەڕێتەوە لەوانە، زۆری بوونی نەوتی یەدەگ بە دڵنیاییی کە بە (٢١٥٠) ملیۆن تەن خەملێنراوە، کەمی قووڵایی بیرەکان، لە باری پێکهاتە جیۆلۆجییەکان، ئاسانی دۆزینەوە و کەم تێچوونی بودجە سەرەڕای گرفتێک، کەوا رێژەیەکی زۆری سەلفەریدی هایدرۆجینی تێدایە، کە ئەوەش پێویستی بە بودجەیەک هەیە بۆ چارەسەرکردنی.

# دارستان
# لە پارێزگای هەولێر

دکتۆر هاشم یاسین حەداد
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

پێناسەی جۆراوجۆر هەیە بۆ دارستان، بەڵام دارستانەکان وەک دەرامەتێکی سروشتی بریتییە لە کۆمەڵە دار و دەوەنێک کە گەشە دەکات لە ژینگەیەکی سروشتی گونجاو بەبێ دەستکاری کردنی مرۆڤ. بەڵام لەهەمان کاتدا دارسنانی مرۆییشمان هەیە کە ئەو دارستانە مرۆڤ دارەکانی دەڕوێنێت و پارێزگاری لێدەکات، ئەم جۆرە دارستانەش بە دارستانی مرۆیی دەناسرێت و دارستان بەهەردوو جۆری (سروشتی-مرۆیی) گرنگی تایبەتی هەیە بۆ مرۆڤ و گیانلەبەران و ژینگەی ناوچەکە.

پارێزگای هەولێر یەکێکە لەو پارێزگایانەی کە زیاتر لە (٤٠٪) لەڕووی پارێزگاکە بە دارستان داپۆشرابوو لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابردوو. بەڵام بەتێپەڕبوونی کات ئەم ڕێژەیە کەمی کرد لە ئەنجامی چەندین هۆکار لەوانە (رامیاری-سەربازی، مرۆیی، ئابووری).

جێگای ئاماژە پێکردنە دارستان لە پارێزگای هەولێر لەڕووی سەرچاوەی رواندنیەوە دابەش دەکرێت بۆ دوو جۆر (دارستانی سروشتی-دارستانی مرۆیی) رووبەری دارستانی سروشتی لە پارێزگاکە نزیکەی (٥٧٨٠کم٢)یە.

بەڵام لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوو کەمی کرد، تاکو گەیشتە (٢٧٩١کم٢) بەڵام رووبەری دارستانە مرۆییەکان (دەستکردەکان) لە (٤٣کم٢) تێپەڕی نەکردووە.

شایانی باسە دارستانەکانی بەشی باکووری رۆژهەڵاتی پارێزگاکە پێکدەهێنن، سەرەڕای بوونی هەندێ ناوچەی تری دارستان لە ناوچە جیاجیاکانی پارێزگاکە دەکرێت بوترێت چیاکانی هەیبەت سوڵتان، باواجی، کێشکە، پیرمام، باباجیجیک، سنووری باشووری ناوچەی دارستانەکان پێکدەهێنن. چڕی و جۆری دارستانەکان لە پارێزگای هەولێر جیاوازە، ئەویش بەندە بە هۆکارەکان ئاووهەوا و بەرزونزمی خاک.

بەم شێوەیە ناوچەی دارستانەکان دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی باران بارینی یەکسان ٥٠٠- زیاتر لە ١٠٠٠ ملیمەتر.

بە تایبەتی ئەو ناوچانەی بەرزییان لە نێوان (٥٠٠-٢٠٠٠) مەتر لە ئاستی رووی دەریایە.

بەپشت بەستن بە پۆلینی شارەزا چاپمان (G.champan) دارستان لە پارێزگای هەولێر دابەش کراوە بۆ دوو جۆر (دارستانی بەڕوو و دارستانی لێوار رووبارەکان) و دارستانی بەڕووشی لەسەر بنەمای چڕی دابەشی کردووە بۆ دارستانی چڕی (زۆر، مامناوەندی، کەم) و دارەکانی بەڕووش سێ جۆرن (بەڕووئاسای وشک، بەڕووی مازوو، بەڕووی دینداری لوبنانی) و دارستانەکانی ئەم ناوچانە سەرەڕای داری بەڕوو کە نزیکەی (٩٩٪) دارەکانی ناوچەکە پێکدەهێنن، چەند داری سروشتی دیکە هەن وەک (سماق، گێوژ، قەزوان، کرۆسک ... هتد) بەڵام زۆربەی دارەکانی لێوار رووبارەکانی لە جۆری (بی، چنار، گوێز ... هتد)ن. پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە دارستانەکان چەند سوودی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەیە بۆ ژینگە و مرۆی ناوچەکە.

■



# عەنکاوە

نوری پەترۆس

عەنکاوە ناوی گوندێکە، کە بۆ سەردەمانێکی کۆن دەگەڕێتەوە و لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامی لە بابەتی (ئەربل) ناوەکەی بە (ئینکارۆ) هاتووە، لەم دەڤەرە بەردێکی کۆن لەسەر گۆڕێک دۆزراوەتەوە، مێژووەکەی بۆ سالّی (٩٢٧ ز) دەگەڕێتەوە، کە باس و هەوالّی گوندی (عەمکۆ)ی تێدا تۆمارکراوە، وەک لەسەر زاری (ئیبن ئەلعیبری) وشەی (عەمکاباد) هاتووە، کە بۆ سەردەمی (فرثی) و ساسانییەکان، سالّی (١٤٨ پ. ز، دەگەڕێتەوە ناوەکە، لە دووبەش پێکهاتووە: (عەمکا: کەسێکە و ئابادیش شوێنە)، هەروەها لە (معجم البلدان) بە شێوازی (عم کە اباد) دەبیندرێت، دوای فەتحی ئیسلامیش ناوەکە گۆڕاوە بە (عەمکاوە) پاشان لە سەرەتای سەدەی چواردەهەم (١٣١٠ ز) بووە بە (عەنکاوە)، لە سەردەمی موزەفەرەدین گۆگبری، کاتێ لەشکری خەلیفە دەچێتە قەلاّوە، سەرچاوەکان دەلّێن: لە دەرگای (عەمکا)وە هاتوونەتە ژوورەوە، کە گەورەترین دەرگا بووە، روو لە (عەمکاباد). دابڕینی ناوی (عەمکا) بەسەر گەورەترین دەرگای شار بەلّگەی ئەوەیە، کە خاوەنەکەی کەسێکی پلە و پایە مەزن بووبێ، لە یاداشتی گەڕیدەکانیشدا ناوەکەی هاتووە، وەک لە گەشتی ئۆلیڤەی گەڕیدەدا لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بە ناوی (ئەنکونا) و لەلای بنکهام بە (ئەنیکورا) تۆمار کراون، هەروەها لە دەستنووس و مەختوتاتی کەنیسەی عەنکاوەش لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بە (عەمکاوە) دەبیندرێت، تا دەگاتە ئەمڕۆ کە لەنێو خەلّکەکەی بە (عینکاوە) گۆ دەکرێت.

**شوێنەوار**

دوو شوێنی شوێنەواری بەم ناوە لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی لە هەڵکەوتە شوێنەوارییەکان تۆمار کراون، یەکەمیان: (گردمسینا) بە ژمارە (٢٢٠) و دەکەوێتە دوروبەری عەنکاوە، لە رۆژهەڵاتی گوندی گەزنە بە دووری هەشت کیلۆمەتر لە گوندەکە، گردێک لەسەر بەرزایی چوار مەتر، کە پاشماوەی تاسولقە (فخار)ی لێ دۆزراوەتەوە، بۆ سەردەمانی بابلی/ کلدانی کۆن (٦٢٥ -٥٣٩ پ. ز) دەگەڕێتەوە.

هەروەها (گردی یەلدا)یش کەوتۆتە سنووری عەنکاوەوە، کە گردێکە لە خۆڵ دروست بووە و بەرزییەکەی (١٠) مەترە، تێیدا چەندین پارچە فەخفوری دۆزراوەتەوە و مێژووەکەی بۆ چاخی ئاشووری (١٦٠٠- ٩٠٠ پ. ز) دەگەڕێتەوە لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی بە ژمارە (٢١١) لەنێو پێگە شوێنەوارییەکان تۆمارکراوە. شوێنی سێیەم (قەسرا)یە، ئەمەش گردێکی شوێنەوارییە لە نێو عەنکاوە، تا ماوەیەکی نزیکیش وەکو گۆڕستانێک بەکارهاتووە و شوێنەواری چەند گۆڕێکیشی تێیدا دەبینرێت. ئێستا دەکەوێتە بەرامبەر کەنیسەی (مار گۆرگیس)ی کۆن، لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی بە ژمارە (٢١٨) لە پێگە شوێنەوارییەکان تۆمارکراوە.

مارسنیقاش، کە ماناکەی بە سریانی واتە (موحتاج) ئەو کەسەی پێویستی بە شتە، گردێکی پاشماوەی کەنیسەیە و پێی دەڵێن (دیرک) و کەوتۆتە ناوڕاستی ڕێگای هەولێر - عەنکاوە، ١٠٠ مەترێک لە شەقامی گشتی دوورە. مێژووەکەی بۆ سەرەتای چاخی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، ئەمەش بەپێی ئەوەی لە دۆسیەکانی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتیدا هاتووە.

لەو گۆڕ و مەزارانەی لە عەنکاوەدا هەن: مەزاری (مریم العذراء)، کە بە دووری پێنج کیلۆمەتر کەوتۆتە رۆژئاوای عەنکاوە، ئەو مەزارە لە ساڵی (١٩٦٥ ز)دا تەنیا دوو گومەزی بازنەیی بوو، بەڵام ئەو زەوییانەی کەوتوونەتە چوار دەوری گومەزەکە، زۆربەیان زەوی کشتوکاڵین، پێی دەگوترێت (زەرگاباد) و هی دانیشتووانی عەنکاوەن.

هەروەها گردی (مارعۆدا) لە باکووری رۆژئاوای عەنکاوە بە دووری چوار کیلۆمەتر لەلای چەپی گوندی (شێخ گەزنە)یە و ئەو شوێنەوارە کۆنەش لە ساڵی ١٩٤٥ لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی تۆمارکراوە. هەندێک پارچە تاسولقەی لێ دۆزراوەتەوە، کە مێژووەکەی بۆ سەرەتای مەسیحیەتی دەگەڕێتەوە.

**هاتنی مەسیحیەت بۆ عەنکاوە**

گەیشتنی ئایینی مەسیحیەت بۆ عەنکاوە بۆ سەدەکانی زایینی سەرەتا دەگەڕێتەوە، لە سەرچاوە کۆنەکانی وڵاتی (حەدیاب) هاتووە، کە تۆمای پەیامبەر لە میانی تێپەڕبوون و لە ڕێگاکەی بۆ هیندستان مەسیحیەتی لە حەدیاب و وڵاتی (فرثی)یەکان بڵاوکردۆتەوە، ئەو سەردەم هەولێر پایتەختی دووەمی (فرثی)یەکان بوو. مێژوونووسی هەولێری (مشیخازەخا) لە کتێبەکەی (کرۆنۆلۆژیای ئەربل)دا دەڵێ: گەیشتنی ئایینی مەسیحیەت بۆ هەولێر لەسەردەمی (مارئەدی) و (مارماری)ی هەردوو قوتابی مەسیح درووەی خوای لەسەربێت بووە، یەکەم کەسیش، کە لە وڵاتی حەدیاب بۆتە مەسیحی، (بەقیدا) بووە، باوکی رۆحی راستەقینەی کەنیسەی هەولێر. لە چیاکانی حەدیاب لە ساڵانی (١٠٤ -١١٤ ز) دەستی کرد بە گەیاندنی پەیامی ئینجیل.

هەولێر یەکەم بنکەی بڵاوکردنەوەی تەبشیری بوو لەسەر دەستی (مار ئەدی)، کە قوتابی (مارماری) بوو و لە رۆژهەڵاتەوە هاتبوون.

بەپێی کتێبی شەهیدانی رۆژهەڵاتی (الاب ئەلبیر ئەبونا) دەوڵەتی حەدیاب و بنکەکەی، کە لە هەولێر بوو لەدوای ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی زایینی ئایینی مەسیحیان ناسیوە.

**کەنیسەکان**

١- کەنیسەی مارگۆرگیس: ئەم کەنیسەیە شەهید مارگۆرگیس لەسەر بەرزترین گردێک لە بەشی باکووری شارۆچکەی عەنکاوە دروست کراوە، کۆنترین دەقی نووسراو لەم شوێنەوارە کۆنە بەردێکی پاشماوەیە (کۆتەڵی شەهیدان)، کە لە ساڵی ١٨٩٤ دۆزراوەتەوە و دەستەواژەیەکی لەسەر هەڵکۆڵراوە، کە ئەوەماڵی شەهیدانە لە گوندی عەنکاوە. لە چەند

دەستنووسێکی کۆن کە بۆ ساڵی (١٧٠١ز) دەگەڕێتەوە، ناوی ئەو شوێنەوارە لەوێش هاتووە، کە تا هەنووکەش لە کتێبخانەی کەنیسەدا پارێزراوە.

٢- پەیکەری ماریوحەننا: کەوتۆتە سەر درێژایی دیواری رۆژئاوای کەنیسەی مارگۆرگیس، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لەسەر پاشماوەی بەشێکی ئەو گۆڕستانەی بە کەنیسە دەوری دراوە و لە ساڵی (١٨٥٥ز)یش هەر بەو ناوە ناوزەد کراوە، سەرچاوەکان دەڵێن ئەمە لەسەردەمی پەتریارک (یۆحەننا تمرز) بنیاتنراوە.

٣- مەزاری مارت شمونی: کەوتۆتە باکووری عەنکاوە، جاران گۆڕستانێک بوو سەر بە کەنیسەی عەنکاوە. یەکەم دەقی نووسراویش لەم بارەیەوە بۆ فەرمانڕەوای سیاسی رۆژانی ئینتیدابی (های W.R.) لە کتێبی (دوو ساڵ لە کوردستان)ە. لەوکاتەی عەریفێکی بەریتانی، کە لە ساڵی(١٩١٩ز) لە هەولێر کوژراوە و دەنێژرێ، باس لەو مەزارە دەکات، کەوا کەوتۆتە سەرگردێک نزیک گۆڕی پیاوچاکێک و نیشانەی خاچی بەسەرەوەیە و بەلای دانیشتووانی عەنکاوە، جێگای بایەخە و بە پیرۆزی دەزانن. لە جەنگی عێراق - ئێرانیشدا ژمارەی شەهیدانی، کە لەو سنووری شاراونەتەوە زیادی کرد و بووە هۆی فراوانبوونی گۆڕستان و بیناکە، جێگایەکی تەواوی بۆ نوێژکردن لێ دروست کرا، ئەمەش بۆ شکۆمەندی شەهیدانی عەنکاوە لە شەڕدا.

٤- کەنیسەی مار یوسف: دروستکردنەکەی نوێیە، لە ماوەی سێ ساڵی (١٩٧٨-١٩٨٠ز) بە هەوڵ و کۆششی دانیشتووانی عەنکاوە و پەتریارک (ئەستیڤان بابەکە) کارەکانی ئەنجامدرا، لە رۆژی ١٩٨١/٤/٧ بە ئامادەبوونی زۆربەی بەرپرس و بەڕێوەبەری فەرمانگەکانی حکومەت و پیاوانی ئایینی لە موسڵ و کەرکووک و دهۆک، بە فەرمی کرایەوە.

## چۆن عەنکاوە بووە کاسۆلیکی کلدانی؟

مێژووی هاتنە ناوەوەی کاسۆلیکی بۆ عەنکاوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم، کە لەسەر دەستی ماریوحەننا هورمز بووە، ئەوکاتەش بەڕێوەبردنی شاری کەرکووک و هەولێر و شارەزوور سەر بە ویلایەتی موسڵ بوو، بەڵام بەڕێوەبردنی ئایینی سەر بە (ئەلقوش)ی بنکەی سەرەکی پەتریارکی کەنیسەی رۆژهەڵات بوو، بەڵام بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی شار هەر لە سەدەی پازدەهەمی زایینییەوە سەر بە میرنشینی بادینان لە (ئامێدی) بوو، یوحەننا هورمز هەوڵی دا کۆنترۆڵی کەنیسەی رۆژهەڵات بکات، نەوەک هەر لە موسڵ، بەڵکو لە شارەزوور و کەرکووک و هەولێریش، ئەمەش بە پشتیوانی (ئال جەلیلی) فەرمانڕەوای موسڵ، بەڵام پەتریارک (ئیلیای دووەم) بەربەرەکانێی کرد و ناکۆکی لەنێوانیاندا رووی دا، دواتر یوحەننا هورمز بە پاڵپشتی فەرمانڕەوا (والی) یاخیبوونی لەسەر شەرعیەت راگەیاند، رووی لە عەنکاوە کرد و دەستی دایە بڵاوکردنەوەی کاسۆلیکیەت، هەروەها بەهۆی نامەیەکەوە داوای لە دانیشتووانی شەقڵاوە و هەرمۆتە کرد بۆ بە دەنگەوەهاتنی رێبازەکەی، ئیدی مەسیحییەکانی عەنکاوە لە



سالّی (١٧٧٩ز) لەسەر دەستی یوحەننا هورمز بوونە کاسۆلیکی، پەتریارک (ئیلیا) نارەزایی لەسەر ئەم کارە گەیاندە (ئیسماعیل پاشا)ی فەرمانڕەوای ئامێدی، بەلاّم یوحەننا بەیارمەتی فەرمانڕەوای موسلّ فەرمانی عوسمانی بە دەست هێنا، رووی کردە گوندەکانی هەولێر، ئەمە هەتا سالّی ١٧٩١ز دەخایەنێ، کە دواجار دەگاتە ناوچەی هیران و بارزان بۆ کاسۆلیکیەت لە سالّی (١٩٦٨)یش بۆ یەکەم جار تەختی (مەترانیەت) (المطرافولیکی) بۆ حەدیابی ئەربیل بگێڕدرێتەوە، ئەو پلە و پایەش (مەتران ئەستیڤان بابەکە) وەری گرت و بووە سەرەکی ئەسقەفەکانی هەولێر، لە هەولێر و دەوروبەری بۆ ماوەی بیست و پێنج (٢٥) سالّ هەتا لە سالّی ١٩٩٤ز. دەستی لە کار کێشایەوە، خزمەتی کرد، لەدوای ئەویش (مەتران یوحەنا مرخۆ) لە هەمان سالّ هەتا لە سالّی ١٩٩٦ کۆچی دوایی کرد، بووە جێنشینی ئەو کورسییە، لە سالّی ١٩٩٧ (باوکی رۆحی جاک ئیسحاق) بووە مەتران و سەرەکی ئەسقەفەکانی هەولێر لە عەنکاوە هەتا لە سالّی ١٩٩٩ دەستی لەکار کێشایەوە. پاش ئەویش (مەتران یەعقووب شێر) ئەم پلە و پایەی وەرگرت، بەلاّم مالّئاوایی کردنی بووە هۆی ئەوەی مەتران (ربان القس) لەو شوێنەدا دابنیشێت و هەتا ئێستاش بەردەوامە.

## قوتابخانەکانی عەنکاوە

یەکەم سەرچاوەیەک، کە ناوی



قوتابخانەی لە عەنکاوە هێناوە، دەستنووسی (یاقوت الکهنة)ی یوسفی عەنکاوەییە، کە لە سەدەی هەژدەهەمدایە، قوتابخانەکەش سەر بە کەنیسەی (مارگۆرگیس)ە و زانست و فێرکردنەکەش هەر پەیوەندە بەوێوە، یەکەم بەڕێوەبەری خوێندنگاکەش لە سالّی (١٨٦٥ز)دا (بوترس شابۆ شینا) بووە. هەروەها لە دەستنووسێکی کۆن کە تا ئێستا لە کەنیسەی عەنکاوەی کۆن پارێزراوە، ناوی یەکەم ئافرەت، کە لە سالّی ١٩٠٥ لە عەنکاوە دەرسی گوتبێتەوە (ئەشعیا چەپلا) بووە، هەریەکە لە (ئەبلەحەد و فەتاح) کوڕانی مەنسوور عەزوز لە سالّی ١٨٧١ لە موسلّەوە بۆ وانە گوتنەوە هاتوونەتە عەنکاوە.

بادجەر لە گەشتەکەی سالّی (١٨٥٨ ز)دا دانیشتووانی عەنکاوە لەم سالّەدا بە (٥٥) خێزان دادەنێت. بەڕێوەبردنی قوتابخانەی عەنکاوەش لە سالّی ١٩٠٤ (باسیل ئەنتوان) بووە و قەشە پۆلس عەجمایاش هاوکاری کردووە. خوێندن و فێرکردنیش لە قوتابخانەی کەنیسە تا سالّی ١٩٢١ بەردەوام بووە، هەتا لەو سالّەدا یەکەم قوتابخانەی فەرمی لەلایەن حکومەت دەکرێتەوە.

لە سالّی ١٩٢١ ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکاران دەرچوون، ئەمەش ناوی ئەو بەڕێوەبەرانەیە، کە لەو قوتابخانەیە بوون:

١- قەشە عەبدولئەحەد/ ١٩٢١-١٩٢٦.
٢- بوترس یووسف نەعامە/ ١٩٢٦ - ١٩٢٨.
٣- کامل داوود مستەفا/ ١٩٢٨-١٩٣٢.
٤- ئەنودر حەسەن قەساب/ ١٩٣٢ - ١٩٣٧.
٥- ئەحمەد کەمال/ ١٩٣٧-١٩٤١.
٦- لۆقا دمیانوس کاکا/ ١٩٤١-١٩٤٧.

٧- عەبدولئەحەد ئوغستین/ ١٩٤٧-١٩٤٩.
٨- عومەر ئەمین/ ١٩٥٢-١٩٥٥.
٩- لوقا دمیانوس/ ١٩٥٥-١٩٥٩.
١٠- رەفعەت عیزەت ساقی/ ١٩٥٩-١٩٥٩.
١١- عومەر ئەمین/ ١٩٥٩-١٩٦٢.
١٢- ئەحمەد حەویز/ ١٩٦٢-١٩٦٢.
١٣- نازم شاکر/ ١٩٦٢-١٩٦٤.
١٤- کەمال تەیب/ ١٩٦٤-١٩٦٨.
١٥- عەبدولئەحەد عودیش/ ١٩٦٨-١٩٧٩.
١٦- حەبیب مەنسوور/ ١٩٧٩-١٩٨١.
١٧- بۆیا تۆما/ ١٩٨١-١٩٨٦.
١٨- سەخریا شعیا/ ١٩٨٦-١٩٨٩.
١٩- غازی شابۆ/ ١٩٨٩-١٩٩١.
٢٠- حەبیب حەنا/ ١٩٩١-١٩٩٨.
٢١- جەمیل عەبدولئەحەد/ ١٩٩٨-هەتا ئێستا.

**ئێستا قوتابخانەکانی عەنکاوە بەم شێوەیە دابەش بوون:**

یەکەم: قوتابخانەی کچانەی عەنکاوەی: یەکەم قوتابخانەی کچانە لە عەنکاوە لە ساڵی (١٩٢٤ز) کراوەتەوە و خاتوو (فلم عەبدولئەحەد کرندی) کراوەتە بەڕێوەبەری و چەندین بەڕێوەبەری دیکەش قوتابخانەکەیان لە ئەستۆ گرتووە:
١- حەنوش حوسێن خەلەف/ ١٩٢٩ - ١٩٤٣.
٢- فەوزیە عەبدوللەتیف/ ١٩٤٥ - ١٩٤٧.
٣- کەریمە فەتوحی مەنسوور/ ١٩٤٧ -١٩٤٩.
٤- ریاح سەلیم ئەحمەد/ ١٩٤٩ - ١٩٥٠.
٥- سارە فەرەنسیس/ ١٩٥٠ - ١٩٥٦.
٦- زەهیە ساڵح/ ١٩٥٦ -١٩٥٧.
٧- بەدریە عەبدولرەحمان/ ١٩٥٧ - ١٩٥٩.
٨- مریەم صعجە/ ١٩٧٦ -١٩٧٦.
٩- مەریەم عاشوور/ ١٩٧٦ - ١٩٨٧.
١٠- نەجات عەبدولمەسیح/ ١٩٨٧ -١٩٩٥.
١١- نەجیبە بۆیا/ ١٩٩٥ -١٩٩٧.

دووەم: ناوەندی کوڕانەی عەنکاوە، لە ساڵی ١٩٦٨ کراوەتەوە.
سێیەم: باخچەی ساوایانی (الجنائن).
چوارەم: قوتابخانەی سەرەتایی حەمورابی.
پێنجەم: قوتابخانەی سەرەتایی خەندە.
شەشەم: قوتابخانەی سەرەتایی عەشتار.
حەوتەم: قوتابخانەی سەرەتایی سەرکەوتن.
هەشتەم: قوتابخانەی سەرەتایی حەدیاب.
نۆیەم: قوتابخانەی سەرەتایی ئەربائیلۆ.
دەیەم: قوتابخانەی سەرەتایی هێژا.
یازدەم: دواناوەندی کچانەی عەنکاوە.
دوازدەهەم: دواناوەندی کوڕانەی عەنکاوە.
سێزدەهەم: دواناوەندی کوڕانەی وڵات
چواردەهەم: دواناوەندی کچانەی نەوورۆز.
پازدەهەم: ناوەندی کوڕانەی بابل
شانزەهەم: ئامادەیی پیشەیی (١١)ی ئەیلوولی.

**ئەدیبەکانی عەنکاوە**

یەکەم: یووسف عەنکاوەیی: لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەم لە رواندز لەدایک بووە و لە ساڵی ١٧٧٩ هاتۆتە عەنکاوە، مەتران یوحەنا تمرز لە ساڵی ١٧٩٧ رەوانەی هیندی کردووە، دواتر لە ساڵی ١٧٩٩ گەڕاوەتەوە کەرکووک و پاشان بۆ بەغدا. لە ساڵی ١٨٣٢ کۆچی دوایی کردووە. بەرهەمەکانی ئەمانەن:
فەرهەنگی سریانی -یونانی، ساڵی ١٨٠٧ دایناوە.
فەرهەنگی سریانی بە شێوەزاری نووسین و زاری خەڵک.
رێزمانی زمانی سریانی.
وەرگێڕانی کتێبی (یاقوت الكهنة) لە عەرەبییەوە بۆ سریانی.
نووسین لە تەقسی کلدانی.
دووەم: داوود قەرەداخی بارزانی: لە بارزان لەدایک بووە هەتا ساڵی ١٨٣٢ لەوێ ماوەتەوە، دواتر هاتۆتە عەنکاوە. بەرهەمەکانی: (قصائد في حب العذراء)، چەندین قەسیدە بە سریانی، نووسینی بەزمانی کوردیش هەیە.
سێیەم: ئەرمیا شامیر: لە ساڵی(١٨٢١ ز.) لە عەنکاوە

لەدایک بووە، نووسینی بە زمانی سریانی و کوردی و تورکی و عەرەبی هەیە، چیرۆک و حەکایەتی بە شێوازی عەنکاوە لە ساڵی(١٨٨٢ ز.) نووسیوە.

فەرهەنگێکی ئینگلیزی -سورپ -کوردی بە شێوازی عەنکاوە لە ساڵی(١٨٨٢ز) نووسیوە. ئەم بەرهەمانەشی هەیە:

- قصيدة في عذاب جهنم.
- قصيدة في الملكوت.
- قصيدة الوزراء العشرة.
- قصيدة في غزو القوش.
- قصيدة في اغاني الزواج.
- قصيدة في التوبة.

چوارەم: ئەنسلمۆسی رەبەن: لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم لە عەنکاوە لەدایک بووە. لە قوتابخانەی کەنیسە دەرسی خوێندووە و فێری نووسین و خوێندنەوەی زانستی ئایینی بووە. لە موسڵ چۆتە دێر مارگۆرگیس دواتر لە دێری (ربان هرمز) لە ئەلقوش خوێندوویەتی و ئینجا پاشماوەی ژیانی لە عەنکاوە بەسەردەبات.

پێنجەم: هاویل مربینا شلای رەبەن: لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم لە عەنکاوە لەدایک بووە. لە قوتابخانەی کەنیسە خوێندوویەتی فێرە سریانی و(طقوس) و زانستی ئایینی بووە. لە ساڵی(١٩١٩ز.) لە عەنکاوە کۆچی دوایی کردووە. شیعرێکی زۆری بە شێوەزاری عەنکاوە هەیە. دەستنووسێکی سەبارەت بە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی مریەمی پاکیزە لە عەرەبییەوە کردۆتە سریانی.

**رێنسانسی نوێ**

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی نوێ، ژمارەی خوێندەوارەکان لە عەنکاوە زیادی کرد و قوتابخانەی تازە دامەزران. زۆربەی ئەوانەش بایەخیان بە زانست و ئەدەب و رۆژنامەگەری و هونەر دا، ئەوانەش کە خوێندنی زانکۆیان لە دەرەوەی عێراق تەواوکرد. ئیدی ئەم رێنسانسە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هەتا ئێستا سەری هەڵداوە:

١- لۆقا دمیانوس کاکا: لە ساڵی(١٩٠٩ ز.) لە عەنکاوە لەدایک بووە. دەرچووی خانەی مامۆستایانی یەکەمینە بۆ ماوەی ٣٦ ساڵ مامۆستا بووە، گرنگترین بەرهەمەکانی ئەو نووسینانەیەتی، کە لە ساڵی ١٩٧٨ -١٩٧٩ لە گۆڤاری (ڤالا سوریایا) لە بەغدا سەبارەت بە زمانی سریانی و ئەدەبەکەی بڵاوی کردوونەتەوە.

٢- حەننا عەبدولئەحەد رۆفۆ: لە ساڵی ١٩٢٥ لە عەنکاوە لەدایک بووە. دەرچووی خانەی مامۆستایانی سەرەتاییە لە بەغدا. سەبارەت بە رێزمانی سریانی چەند بەرهەمی هەیە، هەروەها شیعری بە عەرەبی و سریانی نووسیوە. دیارترین بەرهەمیشی کتێبی (لمحة عن تاريخ عنكاوه)یە.

٣- یوسف عەبدولمەسیح: دەرچووی ئامادەیی پیشەسازییە لە ساڵی ١٩٤٣، لە بواری رۆژنامەگەریدا کاری کردووە و لە ساڵی ١٩٤٥ رۆژنامەی (الغد)ی دەرکردووە، وتار و بابەتی زۆری لە بواری رۆژنامەگەری بڵاوکردۆتەوە.

٤- ناسر یوسف مەنسوور: لە دایکبووی ١٩٣٩ عەنکاوەیە. دەرچووی بەشی وەرزشی کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی بەغدایە. چەندین کتێبی چاپکراوی هەیە، لەوانە: (التحولات)، کتێبێکی دیکە لە بواری رەخنە و جگە لە دەیان وتار و لێکۆڵینەوە لە رۆژنامەکانی: (طريق الشعب، خبات، المواطن، التآخي) بڵاوکردۆتەوە.

٥- یەعقووب فرنسیس ئیلیا قەساب: لە ساڵی ١٩٤٠ لە هەرمۆتە لە دایک بووە، خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٥٩ لە بەعقووبە تەواو کردووە. چەندین لێکۆڵینەوە و بابەتی لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی: (کاروان، بهرا، المواطن، هاوکاری، بەیان، رەنگین، رۆشنبیری نوێ) بڵاو کردۆتەوە.

٦- عەبدولحەمید یەعقووب: لە خێزانێکی عەنکاوەیی لە دایکبووی شەقڵاوەیە، لە زانکۆی بەغدا بەشی زمانی ئینگلیزی تەواو کردووە. دواتر لە زانکۆی (نورث وێلز) لە ساڵی ١٩٨٠ ماستەری ئینگلیزی وەدەست دێنێت، لە ساڵی ١٩٩٦ لە زانکۆی سەلاحەدین دکتۆرا وەردەگرێت. لە زانکۆ بە پلەی پرۆفیسۆر گەیشت، لە ساڵی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کردووە، چەند دانراو و نووسین و کاری وەرگێڕانی کردووە:

- قاموس المصطلحات والاقوال المأثورة -عربي -انكليزي، ١٩٩١.
- قاموس المصطلحات انكليزي -كوردي ١٩٩٣.

- ترجمة كتاب الشخصية والتربية من الانكليزية إلى العربية، ١٩٨٩ بالاشتراك.

٧. سیدا هرمز سیدا: لە ساڵی ١٩٤٣ لە عەنكاوە لە دایک بووە، دەرچووی بەشی زمانی عەرەبی كۆلیژی پەروەردەی زانكۆی موستەنسریەیە، لە ساڵی ١٩٦٧ لە بەغدا كار دەكات و پاشان بەرەو ئەمریكا كۆچ دەكات. نووسین و بابەتی لە بواری زمانی سریانی هەیە.

٨- قەرەداغ مەجید ئیسحاق: لە بەرهەمەكانی:

- معجم بحري انگلیزي -عربي، ١٩٨٨، بغداد.

٩- سەباح هرمز بابەكە: لە ساڵی ١٩٤٨ لە كەركووک لە دایک بووە و دەرچووی خانەی مامۆستایانی سەرەتاییە لە هەولێر، نووسەر و رەخنەگری شانۆییە و لەم بوارەدا ئەو كتێبانەی هەیە:

- التقلیدي واللاتقلیدي في المسرح الكوردي.
- المسرح الكوردي في ثلاثة عقود.
- قراءة في المسرح السریاني.

١٠- لەتیف نوعمان تۆما: دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەكانە لە ساڵی ١٩٧٠. رەخنەگر و دەرهێنەری شانۆییە، لە بواری شانۆی منداڵان هەتا ساڵی ١٩٨٢ كاری كردووە و دواتر گەڕاوەتەوە عەنكاوە و درێژەی بەو بوارە داوە و چەندین شانۆگەری لە عەنكاوە دەرهێناوە و تا ئێستاش بەردەوامە. لە بواری نووسینیش وتار و نووسینی لە (خبات، هاوكاری - بهرا، گولان العربي، نجم بیت النهرین و).....تاد بڵاوكردۆتەوە.

١١- نووری بوترس عەگو: نووسەر و رۆژنامەنووس و ئەندام پەرلەمانی عێراقی لە ماوەی گواستنەوە (٢٠٠٥). لە بەرهەمەكانی:

- بارزان تلوح في الافق/ قصص وقصائد.
- مسارات في القصة والروایة الكوردیة.
- تجربة في الجمعیة الوطنیة.
- الكورد رؤیا ثقافیة وحضاریة.

١٢- فازڵ نووری: چیرۆكنووس و نووسەر. گرنگترین بەرهەمەكانی:

-عیناك والحزن في السماء.
-السعادة السوداء

١٣- دكتور سەعدی مالح: لە ساڵی ١٩٥١ لە عەنكاوە لە دایک بووە. دكتۆرای لە ئەدەبی عەرەبی لە ئەكادیمیای زانستگای سۆڤیەتی وەرگرتووە، ئێستا مامۆستایە لە زانكۆی سەلاحەدین. دەیان وتار و نووسینی لە رۆژنامە و گۆڤارەكان بڵاوكردۆتەوە. لە كەنەدا رۆژنامەی (المرأة) و گۆڤاری (عشتار)ی دەركردووە. لە بەرهەمەكانی:

- الظل الآخر لانسان اخر، قصص، ١٩٧١.
- مدائن الشوق والغربة، قصص، ١٩٧٣.
- مدن وحقائب، كندا، قصص، ١٩٩٣.

١٤- جۆرج مەنسور: خوێندنی لە یەكێتی سۆڤیەت تەواو كردووە و دواتر ماستەری لە ئەندازەی چاپ بەدەست هێناوە، ئیدی روو دەكاتە كەنەدا و لە بواری رۆژنامەگەری كار دەكات، ئێستا وەزیری هەرێمە بۆ كاروباری كۆمەڵگای شارستانی لە كوردستان، وتارەكانی لە زۆربەی رۆژنامە ناوخۆكان و رۆژنامەی (المرأة) لە كەنەدا بڵاوكردۆتەوە.

١٥- بوترس هرمز نەباتی: لە دایكبووی عەنكاوەیە و دەرچووی پەیمانگای ئامادەیی مامۆستایانە لە هەولێر، نووسین و بابەتی لە زۆربەی بوارە ئەدەبی و رۆشنبیرییەكان لە (رێگای كوردستان، بهرا، نجم بیت نهرین) بڵاو كردۆتەوە، ئێستا بەڕێوەبەری رۆشنبیری ئاشوورییە لە عەنكاوە، سەر بەوەزارەتی رۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستانە.

١٦- گورگیس یوسف نەباتی: شاعیرێكی ناسراوە لە ناوەندی ئەدەبی و رۆشنبیری لە عەنكاوە و كوردستان، زیاتر لە (٣٠) دیوانی شیعری بە زمانی سریانی هەیە، داهێنانی لە بواری شیعری سریانی هاوچەرخدا كردووە: ئەمەش بەشێک لە دیوانە چاپكراوەكانیەتی:

- مدینتي الجمیلة - شعر، أربیل، ١٩٩٤.
- نور الحق - شعر، ١٩٩٥.
- سحابة البركة - شعر، ١٩٩٦.
- ثمار عمكو - ١٩٩٧.

جگە لەو قەسیدانەی لە رۆژنامە و گۆڤارەكانی (بهرا، بیت عنكاوا، رویا كلدایا، الصوت السریاني، الصوت الكلداني) و.... تاد بڵاوكردۆتەوە.

١٧- رەفیق نوری: ساڵی ١٩٥٧

لە عەنكاوە لە دایک بووە، بەشی دەروونناسی لە كۆلیژی ئادابی زانكۆی سەلاحەدین تەواو كردووە، هەروەها دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەكانە لە بەغدا، زۆر شانۆگەری بە زمانی (سوپ) و سریانی و عەرەبی و كوردی دەرهێناوە، نووسین و وتاریشی زۆرە. لە بەرهەمەكانی فیلمی نیشتمان و نامۆیی و شانۆگەریی (ألم سهرا) و شانۆگەریی (جحی الكذاب) و هی دیكەش.

١٨- د. سەمیر خۆرانی: دكتۆرای لە ئەدەبی عەرەبی لە زانكۆی سەلاحەدین هەیە و چەندین دیوانە شیعری هەیە:

- الرحيل عبر المدارات - شعر، ٢٠٠٣.
- صوت الملكوت تطير العصافير - شعر، ٢٠٠٥.
- حفنة من ثلوج الجبال - شعر، ٢٠٠٦.

١٩- جەمال شمون: نووسەر و رۆژنامەنووس، ئێستا ئەندام پەرلەمانی هەرێمی كوردستانی عێراقە.

٢٠- جەلال مەرقەس: شاعیر و نووسەر، بە عەرەبی چەندین بەرهەمی هەیە:

- كلمات تحترق، ديوان شعر، ٢٠٠٢.
- في الصميم، مقالات، ٢٠٠٣.
- الوصية القاتلة، قصص، ٢٠٠٥.
- ترانيم بين الضحك والبكاء، ٢٠٠٧.

٢١- خوالێخۆشبوو عەزیز عەبدولئەحەد نەباتی: مێژوونووس و وەرگێڕ، كۆمەڵێک بەرهەمی هەیە، لەوانە: مێژووی عەنكاوە و كرۆنۆلۆژیای ئەربیل و وتار و نووسینیش.

٢٢- جنان پولس: شاعیر و نووسەر بە زمانی عەرەبی. ئێستا بەڕێوەبەری نووسینی رۆژنامەی (بيت عنكاوا)یە.

٢٣- رەوەند پولس: شاعیر و نووسەر، بە عەرەبی دەنووسێت، بەرهەمی چاپكراوی لە رۆژنامە و گۆڤارەكان هەیە.

٢٤- فەلاح نەجیب: شاعیرە و بە زمانی عەرەبی دەنووسێت.

٢٥- سەعدون نەجیب: شاعیر.

٢٦- دەلال سلێوە: شاعیر، بە زمانی كوردی دەنووسێت.

٢٧- ئەفرام مەتی: نووسەرە و لێكۆڵینەوەی سەبارەت كەلەپووری عەنكاوە هەیە. كتێبێكیشی لە مەسەلەی میللی عەنكاوە چاپ كراوە.

٢٨- كەمال لازار: نووسەرە و وتار و نووسینی لە راگەیاندنەكان بڵاوكردۆتەوە.

٢٩- نەها لازار: شاعیرە، بە زمانی عەرەبی دەنووسێت و لە كەناڵی عەشتاری ئاسمانی پێشكەشكاری بەرنامەی رۆشنبیرییە.

٣٠- سنوور خۆرانی: نووسەر، بە عەرەبی دەنووسێت.

٣١- عامر خۆرانی: شاعیر، بە عەرەبی دەنووسێت.

٣٢- خوالێخۆشبوو خەلیل خۆرانی: شاعیر، بە كوردی دەینووسی.

٣٣- باوكی روحی سەبری مەقدسی: نووسەر، چاپكراوی هەیە.

٣٤- رەمزی یوسف: شاعیر و نووسەر، بە عەرەبی دەنووسێت.

٣٥- یەلدا برادۆستی: شاعیری كلدانی، بە عەرەبی دەنووسێت بە هەردوو شێوەی زمانی نووسین و زمانی میللی (شیعر شعبی).

## سەرچاوەكان

١- تأريخ عنكاوة: عزيز عبدالاحد نباتي ٢٠٠٠، أربيل.
٢- لمحة عن تأريخ عنكاوة: حنا عبدالاحد روفو، ٢٠٠٣، أربيل.
٣- كورنولوجيا أربيل، ترجمة عزيز نباتي، ٢٠٠١، دار آراس، أربيل.
٤- مخطوطات عينكاوا. المطران جاك اسحاق.
٥- تأريخ كنيسة المشرق، الاب الدكتور يوسف حبي.
٦- شهداء المشرق، البير أبونا.
٧- مجلة بين النهرين، بغداد.
٨- مجلة نجم المشرق، بغداد.
٩- جريدة بيت عنكاوة.
١٠- مجلة المثقف الكلداني.
١١- الرؤساء، توما المرجي.
١٢- تأريخ نصارى العراق، روفائيل بابو اسحق.
١٣- جريدة الصباح، ملف أربيل الثقافي، العدد (٩٠٢) في ٢/اب/٢٠٠٦.

# ناوچەی بەڕانەتی

عەباس سلێمان سمایل

ناوچەی بەڕانەتی کەوتۆتە نێوان ڕێگای (هەولێر -کەلەک) و (هەولێر - پیرمام) لە باکووریش بەستۆڕە و لە ڕۆژئاواش رووباری بادینان.

ئەم ناوچەیە بەهۆی ئەوەی هەرگیز ئەهاتی نەبینیوە، ساڵانە بەرهەمێکی باشی لە دانەوێڵە بەرهەم هێناوە و لەوەڕێکی باشیشی هەیە، بۆیە بەردەوام هەر ساڵێکی ئەهات بووایە، مەڕدارانی قەراج و کەندێناوە و مولکیە بە مەڕ و ماڵاتەوە روویان لەم ناوچەیە کردووە، جار بووە مەڕداری عەرەب مەڕی بردۆتە بەڕانەتی، جا بۆ ئاودانی مەڕ و ماڵاتان خەڵکی ناوچەکە گۆمێکی زۆریان دروست کردووە، بۆ ئەوەی لە زستان ئاوی تێدا کۆبێتەوە و لە بەهار مەڕ و ماڵاتی لێ ئاو بدەن، گۆمی وا هەبوو تا وەرزی هاوین ئاوی تێدا دەمایەوە، زۆربەی گۆمەکانیش لە دەوروپشتی گوندی بەحرکەدا بوو، لەم بابەتەوە لە چەند گوندێکی ئەم ناوچەیە و ناوچەی دیکەی دەشتەکە دەدوێین.

**بەحرکە:** بەحرکە گەورەترین گوندی ناوچەی بەڕانەتییە و هۆزی گەردی تێدا جێوارە، ئەمڕۆ دەوروبەری (٥٠٠) ماڵ دەبن جگە لە کۆمەڵگاکەی، کە ئەویش لە (٦٠٠) ماڵ زیاتر دەبێت، کە لە هۆزەکانی ناوچەی بارزانن.

حاجی مستەفا ئیسماعیل محەمەد کە دانیشتووی بەحرکەیە و لەدایکبووی ساڵی ١٩١٥ دەڵێ زیاتر لە (٢٥٠) ساڵ لەمەوبەر پیاوێکی مەڕداری گەردی بەناوی (هەباسە شەل) زستانان لەسەر ئاوی کانی بەحرکە هەڵیدەدا و بەهارانیش دەچووە دەم بەستۆڕەی، پاشان هەباس خانووی لێ دروست کرد، کە بە یەکەمین کەس دادەنرێت، کە گوندی بەحرکەی ئاوەدان کردووە، گۆڕەکەی هەباسە شەلیش لە گوندی تەلوسەکی نزیک بەستۆڕدیە، مام حاجی دەڵێ ساڵ هەبوو ئاوی ئەم کانییە زۆر زیادی دەکرد و پەنگاوەی دەداوە و وەک بەحرێکی گچکەی لێدەهات، بۆیە ناوی گوندەکە بەناوی کانییەکە، واتە بەحرۆکە (بەحرکە) ناوی دەرکرد، کەچی مام سلێمان دەڵێت: ناوی گوندی بەحرکە لە (بەحری کا) هاتییە، چونکە جاران (کا)ی شاری هەولێر لە بەحرکە دابین دەکرا، جا لەبەر ئەوەی کای زۆر بوو، بۆیە پێی دەگوترا بەحرکە واتا (بەحری کا).

**دانیشتوانی ئەم گوندەش زۆربەیان لەم دوو بەرەبابەن:**

بەرەبابی قادراغە و بەرەبابی شێخ محەمەد ئاغا، ئەم دوو ئاغایەش کاتی پاشای گەورە، واتا لەسەردەتای ساڵانی ١٨٣٠ هەبوون.

بەحرکە چەند چاکێکی تێدایە لەوانە: چاکی شێخ وەیس و مەزاری مام خدرۆکەی.

چەند گۆڕستانێکی تێدایە، لەوانە: گۆڕستانی کێلە سپیل، ئەمەش بەناوی ئەو گۆڕە کۆنە کراوە، کە کێلەکەی کێلێکی سپی بلند بووە، هەروەها گۆڕستانێکی جوولەکانیشی تێدایە.

**چەند ناوێکی جوگرافی گوندی بەحرکە**

**قۆچان:** ناوی شوێنێکە کاتی خۆی گوند بووە و پیاوێکی بەناوی (هەیبی) شوانکارە بووە، تەنیا پایزان لەم کەونە گوندە جێوار دەبوو و کورتانی دروست دەکرد، ناوی قۆچانیش هەر لە کورتانەوە هاتووە.

**شایی کەنگران:** زەویێکە جاران ئەوەندە کەنگری لێ دەڕوا کە هەموو شانیان بە شانی یەکتری دابوو هاوینانیش بە تەنەکە دەندەرۆشکی لێ کۆ دەکرایەوە، بەلام بە داخەوە ئەمڕۆ تاک و لۆک کەنگری تێدا دەڕوێ.

**تاریجا:** شوێنێکە تاریشک و پەرۆشەی زۆر لێ دەڕوێ.

**کەرەکان (کەلەکان):** کاولە گوندێکە تەنها بەردەکان ماون، قووچەکێک نزیک ئەم گوندە هەیە بەناوی قووچی عارەبان، دەڵێن کاتی خۆی عارەبێکی مەردار لێرە هەڵیداوە.

**زەوی وش:** ئەم زەوییە غەرابێکی تێدایە. دەڵێن کاتی خۆی ئەم غەرابە قەلاتێک بووە، دیواریشی لە دەوری کراوە و کافری تێدا بووە، لەگەڵ ئیسلامان جەنگاون، دوای ئەوەی شکست دێن ئیسلامەکان قەلات و دیوارەکە دەڕوخێنن.

**بیرە جمک:** ئاقارێکە دوو بیری تێدایە، بەلام ئەمڕۆکە بیرەکان کوێر بوونەتەوە.

**قەلە موورتک:** قەلە موورتک گوندێکە لەسەرەوەی بەحرکە لە دەم بەستۆرەی، ئاوێکی لێیە پێی دەڵێن ئاوی قولیلان، دەڵێن کاتی خۆی ئەو ناوە بووە راکێشراوە بۆ شاری هەولێر، بەردەکانی ئەم پرۆژەیەش هەر ماون، تەنها بەردە نووسراوەکانیان بردووە، ئەم پرۆژەیەش پرۆژەی سەنحاریبی ئاشووری بووە.

ناوی ئەم گوندە هەندێک وای بۆ دەچن، کە لە رووەکی قەڕەم (قامیش) و موورتک هاتبێت، کە لەم ئاوە بەزۆری دەڕوێت، هەندێکیش وای بۆ دەچن کە لە قەلا موورتک = قەلای موورتکان هاتبێت، چونکە جاران موورتک لەم شوێنە ئەوەندە زۆر بوو وەکو قەلات وابوو، هەندێکیش دەڵێن کاتی خۆی قەلاتێک هەبووە لەم شوێنە بەلام ئەمڕۆ نەماوە.

**پەریبیتان:** پەریبیتان گوندێکە نزیک گوندی بەحرکە، یەک لە ئاقارەکانی ناوی (رەخە شۆڕان)ە، چاکێکی تێدایە بەناوی چاکی شێرە سوار، ناوی پیاو چاکەکەی (سوارە) بووە، خەلک بۆ مراز دەچنە سەری.

**جێژنیکان:** ناوی سێ گوندانە لە سەرەوەی بەحرکە، (جێژنیکان باپیر، جێژنیکان ئەفەندی، جێژنیکان نەجم)

جاران یەک گوند بووە و ناوەکەشی لە گێژەنی کانی هاتووە، غەرابەکیش نزیک ئەم گوندانە هەیە بەناوی خارانیان.

**گردەچاڵ:** گردەچاڵ ناوی گوندێکە و گردێکی لە ناوەڕاستی هەڵکەوتووە، لەبەر ئەوەی خۆڵی گردەکە خۆڵە مردەیە و توورەگەڕێژە، جاران لەسەر گردەکە چاڵیان بۆ گەنم لێدەدا، چونکە چاڵ ئەگەر لە زەوی خۆڵە مردە یا زیڵ لێبدرێ گەنمەکە مۆرانەی لێ نادات، جا بۆیە ناوی گوندەکە بەناوی ئەم گردە ناوی دەرکردووە، گردێکیش بەناوی گردە زەرد لە نزیکی ئەم گوندە هەڵکەوتووە، بەهاران بە کووریکی تۆرکە زەرد دەچێتەوە، بۆیە پێی دەڵێن گردە زەرد، کاولە گوندێکیش بەناوی (شەوزار) لە نزیک ئەم گوندانەیە.

**گرد ئارەق:** گردئارەق گوندێکە گردێکی بلندی تێدا هەڵکەوتووە، جاران دیانەکانی عەنکاوە لەسەر ئەم گردە ئارەقیان دەخواردەوە، کەندێکی گەورە بەناوی (دێدگە) بەم گوندەدا تێدەپەڕێت، غەرابێکی کونیش نزیک ئەم گوندە هەیە.

هەندێکیش دەڵێن لە کاتی بەسەرکەوتنی گردەکە، بەهۆی بلندی مرۆڤ ئارەقەی دەکات، ناوی گوندەکەش بەم ناوە ناسراوە.

**گردجوتیار:** ناوی گوندێکە لە باکووری بەحرکە، جاران گوند نەبووە و جوتیاران پشوویان لەسەر ئەم گردە داوە، بۆیە (گرد)ەکە بە گردجوتیار ناوی دەرکردووە و دوای ئەوەی گوندێکیش لەم شوێنە دروست دەکرێت بە هەمان ناو ناو دەردەکات.

بەستێک بەناوی بەستی (ساکە)ی بەنێوان عەنکاوە و گردجوتیاردا دەڕوات، ناوەکەشی لە ناوی دیانێک بەناوی ساکە هاتووە، کە لەم بەستە کوژراوە، ساکە مەردار بووە و لە سەردەمی کاکل ئاغای گەردی کوژراوە.

گردێکی دیکەی بەناوی گردە مەسینە لێیە، کە شێوەکەی لە شێوەی مەسینە دەچێت هەروەها کەندەلانێکیشی لێیە بەناوی ئۆرمەشینە، غەرابەی کاولە گوندێک لەسەر کەندالەکە هەیە (ملە چرکە)ش ئاقارێکە نزیک بەم گوندە هەڵکەوتووە، ئاسەوارێکی زۆری تێدایە.

کەندارێکیش بەناوی کەندار شامی نزیک گوند هەڵکەوتووە.

**براخ:** گوندێکە ناوەکەی لە وشەی (برا) هاتووە، دوو بەستی پێدا تێدەپەڕێ بەناوی بەستی چێورمە و بەستی مەسوری، زنجیرە زوورگێک بەناوی تیرێژ لە نزیک ئەم گوندەوەیە.

**کوندەک:** کوندەک ناوی گوندێکە لەبەر ئەوەی ئاوی کەم بووە و بە کوندە ئاویان بۆ بردووە، بۆیە بەناوی کوندەک ناوی دەرکردووە.

**شێخە شەل:** گوندێکی نزیک بەحرکەیە و ناوی ئەم گوندە بەناوی

پیاوێکی سیاسی کراوە بەناوی شێخە شەل، کە کاتی خۆی واتا لە چلەکان و پەنجاکان چالاکی دەنواند لەم گوندە.

**شێخ گەزنە:** ناوی گوندێکە لە باکووری سەربازگەی پێشوو، لەسەر گردەکەی دوو مەزاری تێدایە بەناوی شێخ محەمەد و شێخ ستی، زۆربەی دانیشتوانی لە هۆزی کارۆشن. ئەوی دیکەش سورچی و هۆزی دیکەن.

**کەرەک:** گوندێکی گچکەیە لە ئاقاری گوندی بەحرکە هەڵکەوتووە و ناوی ئەم گوندە لە (رک) واتا سەخت هاتووە، شاخێکی لە نزیکەوەیە بەناوی شاخی بەگە.

**شێوەڕەش:** ناوی گوندێکە لە باشووری گوندی ئیفراز هەڵکەوتووە، ئاسەوارێکی تێدایە بەناوی ئاسەواری خەلیفە هارونە ڕەشید ناوی دەرکردووە یا بە دیوانی خەلیف دەناسرێت.

گوایە هارونە ڕەشید لەم شوێنە دانیشتووە و خەڵکەکەش دەوروەی لێداوە و گوێیان لە قسەکانی گرتووە، مەزارێکی تێدایە بەناوی شێرە سوار، نزیک دیوانی خەلیفە چەمێک هەیە بەناوی کانی شێوەڕەشی، گردێکی ئاساریشی لێیە بەناوی گرد میرالی.

**ئاغولان:** ناوی گوندێکە نزیک بە گوندی شێوەڕەش و کانییەکی تێدایە، دوور نییە ناوی گوندەکە لە کانی ئاغان هاتبێت.

ئەم گوندەش کاتی خۆی گوندی بنەماڵەی شێخی چۆلی بووە، زۆربەی دانیشتوانی لە هۆزی شێخ بزێنییە و ئەوی دیکەش هەرکین.

**گرمامک:** گوندی گرمامک کەوتۆتە نزیک گوندی ئیفراز لەسەر رووباری بادینان و ئاقارەکەی کەوتۆتە ئەوبەر و ئەوبەری بەستۆرە، پسپۆرانی عێراقی و بیانی توێژینەوەیەکی زۆریان لە گردی گرمامک کردووە و جێماوێکی زۆری سەردەمانی بەر لە زایینییان تێدا دۆزیوەتەوە.

تاکو ئەمڕۆ ئاسەوارێکی زۆر لە دەوروبەری گوند دەبینرێت، وا پێدەچێت ئەم گوندە کاتی خۆی شار بووبێت و لە سەردەمی عوسمانییەکانیش تا دەگاتە ساڵی ١٩٦٣ سەرەڕێی بازرگانی بووە لە نێوان ئێران و سوریا و لەم شوێنە کەلوپەلیان بە کەلەک دەرباز کردووە، بۆیە عوسمانی کەلەکی خۆی هەبووە و بەکرێ یەکێکی لەسەر داناوە تا خەڵکان و کەلوپەل و ئەمبەر و ئەوبەر پێبکات، بەڵام لە سەردەمی حکومەتی عێراقی هەرکەس دەیتوانی لە مەزاد ئەم شوێنە ساڵانە بەکرێ بگرێت و بە کەلەکی خۆی کەلوپەل ئەوبەر ئەوبەر پێبکات.

لە دوای ساڵانی ١٩٢٠ سێ شوێن لەسەر رووباری بادینان بە کرێ دراوە ئەوانیش گرمامک و بلێ و کەلەک بووە، بەڵام کەلەک بەهۆی ئەوەی پردەکەی عوسمانییان تەواو کرا کەلەکی لێ بەکار نەهات.

گرێبەندەکەش لە ئاکرێ ئەنجام دەدرا و زۆر جار موسڵاویش بەشدارییان لە مەزاد و بەکرێگرتنی ئەم کەلەکانە دەکرد.

ودسمان خەلیل خورشید بەگ دەڵێت هەر لە ئاخر و ئۆخری عوسمانییەکان باوکم بەکرێ لە کەلەکی گرمامک کاری کردووە، پاشانیش خۆم ئەم شوێنەم لە حکومەتی عێراقی بەکرێ دەگرت جا دوای ئەوەی باوکم کۆچی دوایی کرد من بەردەوام ساڵانە ئەم شوێنەم بەکرێ دەگرت تا ساڵی ١٩٦٣ و هەڵوەشانەوەی بەکرێدانی ئەم شوێنە، کرێی ساڵانەش لە ساڵی ١٩٦٠ تا ساڵی ١٩٦٣ (٢١) دینار بوو.

**ناوی گوندی گرمامک لە دوو برگە پێکهاتووە:**

گر (گرد) مامک (ناوی کێخوای گوندەکە بووە) لەبەر ئەوەی مامک خانووەکەی لەسەر گردەکە دروست کردووە، بۆیە ناوی بە (گرمامک) دەرکردووە.

گرمامک هەر لە کۆنەوە هۆزی میران یا میرانبەگی تێدا جێوار بووە، پاشان ئەم هۆزە بەشێکیان بە سەرۆکایەتی سلێمان بەگ هاوکاری میر محەمەدی ڕەواندزیان کردووە دژی ئێزیدییەکان، کە گۆڕەکەشی لە گوندی ئیفرازە.

سلێمان بەگ سەرلەشکرێکی میری بووە و قەڵاتێکی لە ئیفراز دروست کردووە، بەڵام بەداخەوە قەڵاتەکە کەوتە بەر پرۆژەی ئاوی ئیفراز و تێکدرا.

بەشێکیش لەم هۆزە هاوکاری میریان نەکرد لە لێدانی ئێزیدییان، بۆیە پاشای کۆرە ژمارەیەکی لێ گرتن و گواستنییەوە بۆ ڕەواندز و ژمارەیەکیش رایان کرد بۆ کۆیە و لەیلان، ئەمڕۆ میرانەکانی ڕەواندز دەوروبەری (١٠٠) ساڵ دەبێت زۆربەیان گەڕانەوە ناوچەکەیان.

ئەم گوندە بێجگە لە هۆزی میران بەردەوام چەند ماڵێکی جوولەکەشی تێدا بووە لەگەڵ چەند ماڵە ڕەمەکییەک هەروەها (١٠) ماڵ عەرەبیشی تێدا بوو، کە بوونە کورد و بە زمانی کوردی قسەیان دەکرد، ئەمڕۆکەش ئەم بنەماڵەیە لە گوندی خاروک جێوارن. هەر چوار ماڵە جوولەکەکەش گەڕانەوە فەلەستین.

*** ئەم بابەتە لە کتێبی مێژووی دەشتی هەولێر لاپەڕە (١٠٧-١١٣) وەرگیراوە.**

# سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧

جەلال مەولوود ئەحمەد سنجاوی

مەبەستی سەرەکی ئەنجامدانی سەرژمێری دانیشتووان لە دەوڵەتانی جیهان بۆ نەخشەدانان و پرۆسەی پەرەپێدان و بەدەستهێنانی هەموو زانیارییەکە لە رووی دیمۆگرافی و پیشەیی و هێزی دەوڵەت لە لایەنی ئابووری و کۆمەلایەتی و سەربازی و جموجوڵی دانیشتووان لەهەر قۆناغێکی ژیان کە ئەنجام دەدرێ، جاران لە عیراق تا ساڵی ١٩٤٧ مەبەستی سەرەکی لە سەرژمێریکردنی دانیشتووان تەنیا بۆ زانینی ژمارەی دانیشتوان بوو لە رووی رەگەز (نێر و مێ) بە گوێرەی تەمەن بۆ مەبەستی سەربازی و نیشاندانی هێزی دەوڵەت و پرۆسەی کۆکردنەوەی باج و سەرانە و کارگێڕی.

بەلام ئەو سەرژمێرانەی پێش ساڵی ١٩٥٧ لە عیراق ئەنجامدران ئەو ئەنجام و ئامانجە ستراتیژییەیان نەپێکا، کە دەوڵەت لە باری خزمەتگوزارییەوە پێویستی پێیان هەبوو، بۆیە زانیارییەکان بەشێوەیەکی نەکامڵ و دوور لە راستگۆیی لە قەڵەمدران.

لەگەڵ زیادبوونی پێویستی دەوڵەت بەم زانیارییانە و هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنیان، ئامانجەکانی سەرژمێریش پەرەیان سەند، دابەشبوونی دانیشتووانیش بەپێی سیمای دیمۆگرافی، کۆمەلایەتی، ئابووری هۆکاری سەرەکی هاندانی دەوڵەت بوون، تاکو لە رێگایانەوە بتوانێ ئامانجە سەرەکییەکانی بپێکێ و نەخشە و پلانی نەتەوەیی بهێنێتە ئاراوە و پتریش زانیاری لەسەر دامودەزگا ئیداری و سیاسییەکان و پرۆژە خزمەتگوزارییەکان لە (فێربوون و تەندروستی و ئاو و کارەبا و گواستنەوە و هاتوچۆ... هتد) دەستەبەر بکات.

لە راستیدا سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، کە لە رۆژی ١٩/١٠/١٩٤٧ دەستی پێکرد، بە سەرژمێرێکی تا رادەیەک سەرکەوتوو لە کۆکردنەوەی زانیارییەکان و پۆلین کردنیان دادەنرێت، رێ و شوێنی مۆدێرنی تیادا بەکار هاتووە، بەلام مخابن زانیارییە وردەکارییەکان تەنیا سەنتەری شار و شارۆچکەکانی گرتەوە، کەچی لە گوند و شوێنە دوورە دەستەکان و رەوەند و چادرنشینەکان، بەتایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان پشت بە ژمارەی خەملێنراو بەسترا، بۆیە تا رادەیەک متمانە و بڕوای پێناکرێ و بە سەرژمێرێکی سەرکەوتوو لە رووی زانیارییەوە لە قەڵەم نادرێ.

سەرجەمی ژمارەی دانیشتووانی عیراق لە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ گەیشتە ٤/٨١٦/١٨٥ ملیۆن کەس، ئەمەش تا رادەیەک ژمارەیەکی کەمە بۆ ولاتێکی پان و پۆڕ و خاوەن سامان و خێراتی وەک عیراق، بۆیە شەپۆلێک بێ ئومێدی و دڵەڕاوکێی لە نێوەندی حکومی و ئیداری دروست کرد.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێ، کە

ڕێژەی سەدی دانیشتووانی کورد بەرامبەر سەرجەمی دانیشتووانی عیراق لە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ گەیشتە ٣٠.٤٪، کە ئەمەش ڕێژەیەکی مژدەبەخشە بۆ کورد و لە هەموو سەرژمێرەکانی دیکە زیاترە، کە پاشان لە ساڵانی ١٩٥٧ - ١٩٦٥ -١٩٧٧ -١٩٨٧ -١٩٩٧ ئەنجامدران کە بە هۆی سیاسەتی بە عەرەبکردن و ڕاگوێزان و پەرتەوازە کردن و وێرانکردنی گوندەکان ڕێژەی کورد تا دەهات کەمتر دەبووەوە تا لە سەرژمێری ساڵی ١٩٩٧ گەیشتە ١٩.٥٦٪.

لە سۆنگەی ئەمەوە پرۆفیسۆر د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد لە باسکردنی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ و هۆکاری ئەنجامدانی دەڵێ:

"لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامدانی سەرژمێری پێشوو، واتە ١٩٤٧ کۆمیسیۆنی بانکی نێودەوڵەتی بیناسازی و ئاوەدانکردنەوە، کە حکومەتی عیراق لە ساڵی ١٩٥٢ بانگهێشتی کردبوو، داوای لە حکومەتی عیراق کرد بایەخێکی زۆرتر بەسەر ژماردن بدات، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بەڵێنی دا کە ئامادەیە لە قۆناغە جیاجیاکانی سەرژماردندا یارمەتی عیراق بدا"، بەم شێوەیە بڕیاردرا لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٧ سەرتاپای عیراق بەپێی ١٨ ناوچە سەرژمێر بکرێ، بۆیەش مانگی تشرینی یەکەم بۆ سەرژمێرکردن هەڵبژێردرا، چونکە ئەم مانگە کەش و هەواکەی فێنک و لەبارە و دەتوانرێ سوود لە مامۆستا و قوتابیانیش وەربگیرێ، جگە لەوەش جووتیار و کۆچەرەکان پتر لەم مانگەدا لەشوێنی خۆیان جێگیرن.

مانکێتی سەرژمێر بەسێ ڕەنگ سازکرا و بۆ ناونووس کردنی خەڵکی شار و شارۆچکەکان و گوند و خێڵەساتە کۆچەرەکان دابەش کرا.

سەرژمێری ١٩٥٧ لە کاتژمێر پێنجی بەرەبەیانی ١٢/ ١٩٥٧/١٠ دەستی پێکرد تا پێنجی ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەڕێوەچوو، بەڵام لە دەرەوەی ئەم ناوچانە ٤٥ ڕۆژی خایاند.

پرۆفیسۆر د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد، لە درێژەی ڕاو بۆچوونەکانی سەبارەت بەم سەرژمێرە و ڕادەی سەرکەوتنی و هەڵوێستی کورد بەرامبەر دەرەنجامەکانی دەڵێ: "زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان لەم سەرژمێرە ڕازین و بەچاوی ڕێزەوە دەڕواننە ئەم سەرژمێرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەرژمێرە کاتی پڕکردنەوەی مانکێت و ئامادەکردنی زانیارییەکان هەڵەی تێکەوت، ئەگەرچی پرۆسەی بەڕێوەبردنی سەرژمێرەکە وەک کردارێکی سەرژماردن بە ڕێژەی ٩٥٪ سەرکەوتوو بوو، بەڵام لە رووی قەیدییەوە یەکجار ژێرکەوتوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی کورد پێی وابووە ئەم سەرژمێرە لەچاو سەرژمێرەکانی تر لە هەموویان ڕاستگۆتر و جێی بڕواترە، لەبەر ئەوە لەو مەسەلانەی، کە پەیوەندییان بەخاک و دانیشتووانەوە هەیە، هەمیشە لە ڕێکەوتنەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتەکانی عیراق هانا براوەتە بەر ئەم سەرژمێرە...".

**ئامانجەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە**

مەبەستی سەرەکی بڵاوکردنەوەی تەواوی ئەم زانیارییانە لەم لێکۆڵینەوەدا ئەم خاڵانە دەپێکێ:

١- زانینی ژمارەی دانیشتووانی ڕاستەقینەی شار و شارۆچکەکان و هەموو گوندەکانی پارێزگای هەولێر لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، کە کورد بە سەرژمێرێکی ڕاستگۆ و زانستییانەی لە قەڵەم دەدات و بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشە ڕەواکەی پشتی پێ دەبەستێ.

٢- ئەم لێکۆڵینەوەیە لە هەمان کاتدا جوگرافی ئامێزە و دەکرێ وەک فەرهەنگی ناوی گوندەکانی پارێزگای هەولێر بناسرێ و بۆ ئەو کەسانەش جێی بایەخە، کە دەیانەوێ ژمارەی گوندەکانیان لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ بزانن.

٣- پێویستە خوێنەر لەوە ئاگادار بێت، کە ئەم دابەشبوونە ئیدارییە بە گوێرەی ساڵی ١٩٥٧ەوە مەرج نییە ئێستاکە هەمان گوند لەسەر دابەشکردنە کۆنەکە مابێتەوە، جگە لەوەش سیاسەتی بە عەرەبکردن و بەزۆر کۆچپێکردنی کوردان لە زێدی باب و باپیرانیان و وێرانکردنی ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکان نەخشەی گوندەکانی گۆڕیوە.

٤- زۆر لە گوندەکان کە ناویان لێرە هاتووە ئێستاکە نەماون، زۆریشیان لە سەرژمێرەکە ناویان بە هەڵە نووسراوە، منیش ئەوانی ئەسڵەکەیم نەزانی ناچار وەک خۆی

تۆمارم كردن.

٥- شاری هەولێر كە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ بە لیوای هەولێر ناوی هاتووە، بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشی سەر قەزا و ناحیەكان و مەڵبەندەكانی سەرژماردن كراوە و بەرامبەر هەر ناوچەیەكی سەرژماردنیش ژمارەی گوندەكان نووسراوە، ئەم خشتەیەی خوارەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات:

**سەرچاوەكان:**

١- اقليم كردستان العراق: دراسات في التكوين القومي للسكان، الدكتور خليل اسماعيل محمد.

٢- سەرژمێری دانیشتووانی عیراق - فەرهەنگی شار و شارۆچكە و گوندەكان - لە ساڵی ١٩٥٧ بە سوپاسەوە لە بەڕێز (فوئاد سەعید) بەڕێوەبەری سەرژمێری لە پارێزگای هەولێر وەرمگرت.

٣- نەخشەی پارێزگای هەولێر - دابەشبوونی ئیداری شارۆچكە و گەشەپێدان -حكومەتی هەرێمی كوردستان -كێشراوە

-زۆر سوپاسی مامۆستا پیرداود مەخمووری دەكەم، كە نەخشەكەی بۆ هێنام.

٤- زۆر سوپاسی ئەو بەڕێزانە دەكەم كە لە خوێندنەوەی ناوی گوندەكانی ناوچەكانی خۆیان یارمەتییان دام. (مامۆستا جەلال ئەلیاس، كاك فاخیر عەبدوڵلا هەمەوەند، كاك ناجی بارزان)ی لە دەزگای گوڵان و مامۆستا نوری بێخاڵی لە نووسینگەی گوڵان لە سۆران و كاك رەوا بلباس لە گۆڤاری قەرەچووغ.

| ناوی قەزا | ناوی ناحیە | ژمارەی گوندەكان لە سەرژمێری ١٩٥٧ | كۆی گشتی گوندەكان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|
| هەولێر | عەنكاوە | ١٢٥ | ٢٣٢ |
| | قوشتەپە | ١٠٧ | |
| شەقڵاوە | حەریر | ٧٦ | ١٨٢ |
| | خۆشناو | ٤٣ | |
| | سەلاحەدین | ٦٣ | |
| مەخموور | سەنتەری مەخموور | ٣١ | ٢٣٤ |
| | كەندێناوە | ٧١ | |
| | گوێر | ٤٩ | |
| | قەراج | ٨٣ | |
| كۆیسنجق | سەنتەری كۆیە | ٨٤ | ١٤٩ |
| | تەق تەق | ٦٥ | |
| رەواندز | سەنتەری رەواندز | ٤٩ | ٢٩٠ |
| | باڵەك | ٧٧ | |
| | برادۆست | ١٠٩ | |
| | دیانە | ٥٥ | |
| زێبار | بارزان | ٢٠ | ١٢٦ |
| | مزووری باڵا | ٥١ | |
| | مێرگەسوور | ٥٥ | |
| كۆی گشتی | | | ١٢١٣ |

**خشتەی ژمارە(١)**

ناحیە: عەنکاوە | قەزای سەنتەر: هەولێر

ژمارەی گوندەکان: ١٢٥ | کۆی گشتی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧: ٢٠٤٠١ کەس

| ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ | ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئیفراز | ٨٣ | ٦٤ | مەملوک شێخ محەمەد | ٢٧ |
| ٢ | ئاشۆکان عەباس | ١٢٢ | ٦٥ | مەموندیان | ٤١ |
| ٣ | ئاشۆکان رەسول | ٩٦ | ٦٦ | نازماوە | ٣١ |
| ٤ | ئاغۆلان | ٦٠ | ٦٧ | سیراوە | ٥٤ |
| ٥ | سەرکەورە نۆمەراوە | ١٤٢ | ٦٨ | سێبیرانی گەورە | ٥٠٦ |
| ٦ | باداوە | ٤٦١ | ٦٩ | سێبیرانی گچکە | ١٣٣ |
| ٧ | باخچە | ١٦٦ | ٧٠ | سێبیران قوشتەپە | ١٦٦ |
| ٨ | باغەمرە شەهاب | ٨٦ | ٧١ | سەیدان | ٣٣٧ |
| ٩ | بنەسلاوەی گەورە | ٣٣٠ | ٧٢ | ساتوور | ٢٠٦ |
| ١٠ | بنەسلاوەی گچکە | ٧١ | ٧٣ | سێ بیری | ٤٣ |
| ١١ | پیر رەش | ٤٤٦ | ٧٤ | سوریژە | ١٥٤ |
| ١٢ | بولاغ | ٣١٠ | ٧٥ | عارەبکەند | ٢١٤ |
| ١٣ | بێرکۆت | ١٢٥ | ٧٦ | خەزنە | ٢٦٥ |
| ١٤ | پیرزین | ٣٥٤ | ٧٧ | خەرابەدراو | ٣٨١ |
| ١٥ | باترتوف | ٤٩ | ٧٨ | خاتووناوە | ٢٦ |
| ١٦ | بن بیز | ١٢٧ | ٧٩ | قەلەمورتک | ٢٠٤ |
| ١٧ | پونگینە | ٣٧١ | ٨٠ | قەلاتکە | ٢٣٦ |
| ١٨ | بەرحوشتر عەبدولرەزاق ئاغا | ١٠٤ | ٨١ | قوینان نادر | ١٣٣ |
| ١٩ | بەرحوشتر رەفعەت ئاغا | ٩٢١ | ٨٢ | قەتەوی | ٤٤٠ |
| ٢٠ | بەحرکە | ١١٥٨ | ٨٣ | قەلاچۆغان | ٣٢٢ |
| ٢١ | بیرەبات | ٢٦ | ٨٤ | رەشکین مەردان | ٢٣ |
| ٢٢ | بێومکە | ٣٨ | ٨٥ | رەشکین مزەفەر | ١١٧ |
| ٢٣ | جێژنیکان باپیر | ١٩٨ | ٨٦ | رەشکین رەشید | ٦١ |
| ٢٤ | جێژنیکان ئەفەندی | ١٢ | ٨٧ | کەرک | ٧٠ |
| ٢٥ | جێژنیکان نەجم | ١٨٧ | ٨٨ | شێخ ئەحمەد | ٢١ |
| ٢٦ | چاروک گەورە | ٢٤٢ | ٨٩ | شەرمبۆت | ٢٦٦ |
| ٢٧ | چاروک گچکە | ٢١٦ | ٩٠ | شۆک | ١٠٣ |
| ٢٨ | جمکە | ٩٧ | ٩١ | شاوێس | ٢٧٦ |
| ٢٩ | جدیدەزاب | ٣٦٠ | ٩٢ | سۆریەش | ٢٣٩ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٠ | چەمە دویس | ٢٠٨ | ٩٣ | شەوزاڵ | ٢٢٥ |
| ٣١ | دارەتوو | ١٨٣ | ٩٤ | شاخۆران | ١٨١ |
| ٣٢ | دارەبەن | ٤٤٠ | ٩٥ | کەرمکێن | ٧٤ |
| ٣٣ | دەلو گوڵ | ٦٤ | ٩٦ | کولەک | ٣٣ |
| ٣٤ | داڵداغان | ٢٠٣ | ٩٧ | گردجوتیار | ١٦٦ |
| ٣٥ | دوزتەپە | ٢٢١ | ٩٨ | کێلەکان | ٨٤ |
| ٣٦ | هەنجیرۆک | ١٧ | ٩٩ | گرد عارف | ١٧٧ |
| ٣٧ | هەمزە بەگ | ١١٢ | ١٠٠ | گردەچاڵ | ٣٠٠ |
| ٣٨ | زەمزین | ١٠١ | ١٠١ | گەزنەی عەبۆ ئاغا | ٣٦٤ |
| ٣٩ | حەسارۆک | ١٦٢ | ١٠٢ | گەزنە مەولود | ٧٤ |
| ٤٠ | پلینگەی نادر ئاغا | ١١٤ | ١٠٣ | گەزنە حاجی خدر | ٤٤ |
| ٤١ | حەسار شێخ محەمەد قازی | ٤٩ | ١٠٤ | شێخ عەلی | ٢٨٧ |
| ٤٢ | حزە (عەزە) | ١٦٨ | ١٠٥ | تیماری گەورە و بچووک | ١٢٩ |
| ٤٣ | تووڕەق | ١٢٣ | ١٠٦ | چەمرگە | ١٣٠ |
| ٤٤ | یارمجە | ٨٥ | ١٠٧ | شانەشیی | ٦٩ |
| ٤٥ | گردە رەشەی ئەسعەد | ١٦١ | ١٠٨ | کلەکیشی | ٧٦ |
| ٤٦ | گردەتە رەفیق | ٧٦ | ١٠٩ | قلمان | ١٩ |
| ٤٧ | گردەتەزاب | ٢٥١ | ١١٠ | سمایلاوە | ١٦٧ |
| ٤٨ | کونە گورگ | ١٥٠ | ١١١ | خانووەکانی پشت نەخۆشخانە | ٢٤٦ |
| ٤٩ | کانی گەنی | ٨٥ | ١١٢ | مەلەکان | ٢٧ |
| ٥٠ | کەسنەزان ئیسماعیل | ٥٣ | ١١٣ | باخوزرای وەلی حەسەن | ٥٥ |
| ٥١ | کەسنەزان پاشا | ١١٨ | ١١٤ | سیلاوە | ٨١ |
| ٥٢ | کۆرەکی گەورە | ١٤٧ | ١١٥ | گەزنە | ٥ |
| ٥٣ | کۆرەکی گچکە | ٥٦ | ١١٦ | تەرجان | ٥ |
| ٥٤ | کەوڕەبەن | ١٢٩ | ١١٧ | تەکیە | ٥ |
| ٥٥ | کانی قزڵە | ١٦٠ | ١١٨ | هەرەجە | ١٠ |
| ٥٦ | تاوغ | ٢٢١ | ١١٩ | گاینج | ٦٤٠ |
| ٥٧ | کەورگۆسك | ١٨٦ | ١٢٠ | زورگەپال | ٤٥ |
| ٥٨ | گردیش | ١٦٦ | ١٢١ | سەرەدەشتی تازە | ١٧ |
| ٥٩ | گردەسۆر عەنبەر | ٣٠٦ | ١٢٢ | فرەشەوك | ٢٢ |
| ٦٠ | گردی فەقێ ئیسماعیل | ٣٩١ | ١٢٣ | سێوەکە | ١٠٥ |
| ٦١ | مەلا ئۆمەر | ١٠٠ | ١٢٤ | شەمعون ئاوا | ٨٣ |
| ٦٢ | مزەحمەد | ٥٤ | ١٢٥ | مەلا ئەمەر زاب | ٨٠ |
| ٦٣ | مەملوك حاج سمایل | ٢٤ | | | |

ناحیەی: قوشتەپە
قەزای سەنتەر: هەولێر
ژمارەی گوندەکان: ١٠٧
کۆی گشتی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧: ٢١٠٥٩ کەس

| ژ | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ | ژ | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قۆپەقران | ٩٦ | ٥٥ | هەمزە کۆر | ٣٣٧ |
| ٢ | رەختاوە | ٧٤ | ٥٦ | دۆڵە بەکرە | ٤٥٣ |
| ٣ | سیراوە | ١١٥ | ٥٧ | گردە شینە | ٣١٠ |
| ٤ | ماستاوە | ٥١٢ | ٥٨ | گۆمەگراو | ٩٠ |
| ٥ | تەندوورە | ٣٠٦ | ٥٩ | کەرە شێخان | ٣٩٤ |
| ٦ | چیمەن | ٥٥ | ٦٠ | سێنارە | ١٤٦ |
| ٧ | قۆڕیتان مەلا مەحمود | ٢٢ | ٦١ | دۆڵەسزەی گەورە | ٣٧٥ |
| ٨ | قۆڕیتان جوکل | ٤٤٠ | ٦٢ | دۆڵەسزەی گچکە | ٩٥ |
| ٩ | شێراوە قوشتەپە | ١٠٥ | ٦٣ | دۆڵەسزەی مستەفا | – |
| ١٠ | قوورچە بڵباس | ١٢٨ | ٦٤ | نۆمەراوە | ٣٩١ |
| ١١ | شێخ شێروان | ٢٨٩ | ٦٥ | پۆریجەی بابا | ٢٩٢ |
| ١٢ | باغەمرە ئەفەندی | ١٧٣ | ٦٦ | میرەکانی گەورە | ١٨١ |
| ١٣ | سیاو | ٣٣٩ | ٦٧ | میرەکانی گچکە | ٦٣ |
| ١٤ | قوشتەپە -ناحیە- | ١٧٥ | ٦٨ | دووشیوان | ١٧٩ |
| ١٥ | قوشتەپەی گەورە | ٣٠ | ٦٩ | کانی بزرە | ١٣٢ |
| ١٦ | قوشتەپەی گچکە | ١٨ | ٧٠ | هەرەجەی گەورە | ١٥١ |
| ١٧ | برایمە لەك | ٨٣ | ٧١ | هەرەجەی گچکە | ١٣٣ |
| ١٨ | گۆسکە | ٩٩ | ٧٢ | بێستانەی گەورە | ١٩٣ |
| ١٩ | مێرخوزار | ١٥٠ | ٧٣ | سەرمەزرە | ٤٨ |
| ٢٠ | پیرداود | ٤٣٨ | ٧٤ | لوڕکە | ٩٨ |
| ٢١ | دوسەرەی جەبار | ٤٢ | ٧٥ | حەسەن موتریب | ١٠٤ |
| ٢٢ | دوسەرەی فەتاح | ٣٠٣ | ٧٦ | سۆفی برایم | ١٢٦ |
| ٢٣ | پلینگە | ٧٧ | ٧٧ | چاڵە گردەڵە | ١٣٦ |
| ٢٤ | دوگرتکان عەبدولرەحمان | ١٤٢ | ٧٨ | ئازیانە | ١٦٦ |
| ٢٥ | دوگرتکان ئەحمەد ئاغا | ٤٧٣ | ٧٩ | گردە سۆر | ٩٣ |
| ٢٦ | دوکەڵە | ٤٠٥ | ٨٠ | سەردەشت موسا ئاغا | ٧١ |
| ٢٧ | قازیخانە | ٤٥٠ | ٨١ | سابلاغ | ١٠٧ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٨ | سۆربەش خدر ئاغا | ٣٥٥ | ٨٢ | بیستانەی گچکە | ٦٠ |
| ٢٩ | قورشاغلوو | ٤٢١ | ٨٣ | تەتەراوە | ٢٥٠ |
| ٣٠ | باقرتە | ٢٤١ | ٨٤ | ئۆمەرە سوور | ١٠٠ |
| ٣١ | منارە | ٢٤٠ | ٨٥ | ئۆمەر مامکە | ٩٥ |
| ٣٢ | جدیدە لەك | ٢٨٥ | ٨٦ | ئێلنجاغی گچکە | ١٥٠ |
| ٣٣ | ئاوەلۆك | ١٠٤ | ٨٧ | قوڵتەپە بابە | ٤٢ |
| ٣٤ | هێلاوە | ٤٤٩ | ٨٨ | سێقوچان | ١٦٥ |
| ٣٥ | کەسنەزان قوشتەپە | ٤٨ | ٨٩ | شێخان | ٤٠ |
| ٣٦ | عەلیاوە | ٥٢٥ | ٩٠ | تۆپزاوە | ٣٧٣ |
| ٣٧ | گردعازەبان | ٦٥٩ | ٩١ | شێراوە | ٢٩٥ |
| ٣٨ | دۆغان | ٣٨ | ٩٢ | قەشقە | ٦٦٩ |
| ٣٩ | سۆربەش کاکەڵڵا | ١٢٩ | ٩٣ | خورخور | ٢٠٥ |
| ٤٠ | پۆریجەی سەعدی | ٧٧ | ٩٤ | پەرکانە | ١٢ |
| ٤١ | ترپە سپیان | ٣٨٩ | ٩٥ | ساری جەم گەورە | ٢٥١ |
| ٤٢ | یەدی قزلەر | ٢٣٤ | ٩٦ | ساری جەم گچکە | ١٤٥ |
| ٤٣ | قەرە چناغە | ١٤٤ | ٩٧ | لاجان | ٤٢ |
| ٤٤ | مورتکەی گەورە | ٣١٠ | ٩٨ | بیرەجنە | ٢٢ |
| ٤٥ | مورتکەی گچکە | ١٣٤ | ٩٩ | باشتەپە | ٤٥١ |
| ٤٦ | میرزا ئاغا | ٩٧ | ١٠٠ | گرد لانکەی سەعید | ١١٤ |
| ٤٧ | گرد مەلا | ٢١٢ | ١٠١ | گرد لانکەی مەجید | ١٢٦ |
| ٤٨ | قوڵتەپە رەشید | ١٦٢ | ١٠٢ | مەلحەوالی | ٥٣٥ |
| ٤٩ | بیرەعارەبانی گەورە | ١٠٦ | ١٠٣ | پرکانی | ١٠٥ |
| ٥٠ | بیرەعارەبانی گچکە | ١٢٠ | ١٠٤ | قوڵتەپە عەزیز | ١٢١ |
| ٥١ | پالانی | ١٥٢ | ١٠٥ | سێبیران ئاغا | ٣٢٦ |
| ٥٢ | کەردز | ٣٦٩ | ١٠٦ | سۆربەش حەوێز | – |
| ٥٣ | کەرزۆر | ٣٧ | ١٠٧ | مەخشومە | – |
| ٥٤ | چێڵەبەشە | ٦١ | | | |

قەزای مەخموور (سەنتەر)

ژمارەی گوندەکان: ٣١ کۆی گشتی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧: ٥٠٤٦ کەس

| ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|
| ١ | گەرە سۆر | ٣٣٥ |
| ٢ | عەلیاوە | ١٨٤ |
| ٣ | گرون ئەلحمر | ١٥٣ |
| ٤ | عین ئەیوب | ١٢٦ |
| ٥ | کێلەشین (سەروو و خواروو) | ٥٩ |
| ٦ | بەشار | ٣٠٣ |
| ٧ | هەوارغەر | ١٣٧ |
| ٨ | وادی عەزاب | ٧٨ |
| ٩ | پالآنی | ١١٧ |
| ١٠ | قەلاّتە سۆری سەعید | ١٣٢ |
| ١١ | گبیبە | ٩٥ |
| ١٢ | جدیدە | ١٧٤ |
| ١٣ | گردە رەشە رەحمان | ٢٠٤ |
| ١٤ | تل الریم | ٢٤٥ |
| ١٥ | خربە جاراللە | ٢١٩ |
| ١٦ | عین ابو هدلان | ٢١٩ |
| ١٧ | نەعناعە | ١٧١ |
| ١٨ | کەپرۆك | ١٩٩ |
| ١٩ | سەیداوە | ٧٣ |
| ٢٠ | عەین مۆزان | ١٥١ |
| ٢١ | عەین شەهاب | ٢٤ |
| ٢٢ | مەهانە | ٢٠٩ |
| ٢٣ | ئۆمەراوە | ١٩٦ |
| ٢٤ | دوگرتکان حوسێن | ٣١٩ |
| ٢٥ | سیرمە | ١٦٥ |
| ٢٦ | خالّندییە | ١٨٧ |
| ٢٧ | سلاحییە | ٢٠٣ |
| ٢٨ | کودیلە | ٢٢٣ |
| ٢٩ | عەین مەریەمە | ٨٢ |
| ٣٠ | (القریة العصریة) | ١٦٥ |
| ٣١ | (الصباح) | ٣٩ |

ناحیەی: گوێڕ
ژمارەی گوندەکان: ٤٩

قەزای مەخموور
کۆی گشتی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧: ١٤٠١٠ کەس

| ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ | ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | زمارە جاسم | ٢٢٧ | ٢٦ | حەویجگە | ١٢١ |
| ٢ | زمارە عەبدوڵڵا | ١٢٣ | ٢٧ | زمعیبە | ١١٨ |
| ٣ | خاڵند | ٥٥٨ | ٢٨ | عەباسییە | ١٢ |
| ٤ | ئەبو شیتە | ٥٥٦ | ٢٩ | قادرییە | ١٧٣ |
| ٥ | (مطراد شرابي) | ٦٤ | ٣٠ | زمارەی گەورە | ٣١٠ |
| ٦ | کوشاف تحتاني | ٢٢٨ | ٣١ | قەڵاتە سۆران | ٩٥ |
| ٧ | کوشاف فوقاني | ٢٨٦ | ٣٢ | زارکە | ٢٠٤ |
| ٨ | گامێش تەپە | ٣٤٨ | ٣٣ | چارووك | ١٤٨ |
| ٩ | سەید ئەمین | ١٦٠ | ٣٤ | هەوێرە | ٣٥٠ |
| ١٠ | ساقیە | ٢٤٧ | ٣٥ | زەمزەمۆك عەرەب | ٤٩ |
| ١١ | کەور | ٤٨٩ | ٣٦ | زەمزەمۆك کورد | ١٩٣ |
| ١٢ | کلاوڕەش | ١٧٣ | ٣٧ | ئوم رمگیبە | ٢٦٥ |
| ١٣ | چێرە بەشە | ٢٧٢ | ٣٨ | کەیران | ٣٠ |
| ١٤ | گمێتل | ٥٦٣ | ٣٩ | (تل الخیم) | ٩٥١ |
| ١٥ | بیرە کەپران | ٨٢ | ٤٠ | شەمشولە | ٣٩٨ |
| ١٦ | سوفەییە | ٥٨٠ | ٤١ | دهیمات | ٧٣ |
| ١٧ | (مطراد) سارەلوو | ١٣٨ | ٤٢ | تل البعرور | ٤٥٦ |
| ١٨ | زمارە | ٣٢٥ | ٤٣ | سەعداوە | ٩٠ |
| ١٩ | سێ چالە | ١٤٨ | ٤٤ | ماجداوە | ٥٤٧ |
| ٢٠ | دەرماناوە | ١٠٨ | ٤٥ | میل عەبدولکەریم | ٥٥ |
| ٢١ | عەلی مەلا داود | ٢٤٣ | ٤٦ | قاوغ | ١٤٢ |
| ٢٢ | تەڕاش | ١٥٤ | ٤٧ | عەوێنە | ٧٩٢ |
| ٢٣ | شرائع | ٤٢٣ | ٤٨ | نۆغەران | ٤٥٢ |
| ٢٤ | مەچلویە | ٣٩٥ | ٤٩ | تەرجان | ٥٦١ |
| ٢٥ | ئەبو جەردە | ٤٣٦ | | | |

ناحیەی: کەندیناوە | قەزای مەخموور

ژمارەی گوندەکان: ٧١ | کۆی گشتی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧: ١٧٧٦٦ کەس

| ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ | ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | بیرەبات | ٢٦١ | ٣٧ | حەسەن پلپاس | ١٣٩ |
| ٢ | جاستان | ٥٣٣ | ٣٨ | لاوەرە | ٢٢٩ |
| ٣ | دەربەندگۆم | ٥١٧ | ٣٩ | دارە خورما | ٢٩٢ |
| ٤ | سەربەشاخ | ٣٤٦ | ٤٠ | سۆفی سمایل | ٩١ |
| ٥ | دەربەند سارەلوو | ١٨٤ | ٤١ | دوو شیوان | ٢٨٧ |
| ٦ | عەولافات | ١٣٦ | ٤٢ | کۆزەپانکە | ٤٢٢ |
| ٧ | پەلکانە | ٢٢٦ | ٤٣ | چل هەوێزە | ٢٩٤ |
| ٨ | غەرابە | ٦٣٦ | ٤٤ | خورمەلە | ٣٣٢ |
| ٩ | گابەرەکە | ٢٠٥ | ٤٥ | خەزنە | ١٠٩ |
| ١٠ | دڕکەی گەورە | ١٢٥ | ٤٦ | کەندار یارمچە | ٣٠٩ |
| ١١ | دڕکەی گچکە | ١٠٢ | ٤٧ | گاوەرە | ٣١٨ |
| ١٢ | شەنافە | ٤٨٥ | ٤٨ | گربەشینە | ٢٨٥ |
| ١٣ | چەرت | ٩٧ | ٤٩ | گردی گۆم | ١٠٠ |
| ١٤ | تەل هەلالە | ٤٥ | ٥٠ | حەسەن بەگ | ١٥٣ |
| ١٥ | گەزوەشان | ٢٢٩ | ٥١ | مەلا قەرە | ٤٨٨ |
| ١٦ | شەعەل | ٣٠٧ | ٥٢ | ماجید | ٢٥٧ |
| ١٧ | سێبیران | ٢٣٥ | ٥٣ | سەید عوبێد | ٣٢٣ |
| ١٨ | سەرگەڕان | ٥٣٩ | ٥٤ | شۆڕە زەرتکە | ٤٠٢ |
| ١٩ | داود گورگە | ١٨٣ | ٥٥ | سمایلاوەی سەروو | ١٢٢ |
| ٢٠ | سێقوچان | ٢٣٢ | ٥٦ | سمایلاوەی خواروو | ٦٥ |
| ٢١ | قوچ | ٧٦ | ٥٧ | ملیهورت حەمە سەعید | ٢١٣ |
| ٢٢ | لهێبان | ٤٣٨ | ٥٨ | ملیهورت قەرەنی | ٢٤٩ |
| ٢٣ | گێسمە | ٩٥ | ٥٩ | مەلا کاغا | ٢٨٥ |
| ٢٤ | قەپلان | ٤١٧ | ٦٠ | کەپەنگە رەش | ١٥٩ |
| ٢٥ | کاریتان | ٤٣٩ | ٦١ | شێخە لاس | ١٣٩ |
| ٢٦ | تیکالۆ | ٣٠٥ | ٦٢ | بیرە بەرازە | ١٠٣ |
| ٢٧ | جانە | ٢١٠ | ٦٣ | ناسر کوژرای | ٣٢ |
| ٢٨ | عەولا کوجیلان | ٦٨٢ | ٦٤ | کورتاندروو | ٣٣٩ |
| ٢٩ | سلێمان بەخشیان | ١٢٥ | ٦٥ | شۆریجە | ٢٥٧ |
| ٣٠ | چەلتووك | ١٧٩ | ٦٦ | حەساروك | ١٣٦ |
| ٣١ | چەغەمیرە | ٣٩٤ | ٦٧ | یەدی قوو | ١٥٦ |
| ٣٢ | کەندارەقەل | ٢٦٤ | ٦٨ | بەرزەوار | ٢٤٠ |
| ٣٣ | دێمەکار | ٣٣٥ | ٦٩ | خۆشاو | ١٢٣ |
| ٣٤ | چیغلۆك | ١٥٢ | ٧٠ | دەرماناوە | ٤٩ |
| ٣٥ | حاجی شێخان | ١٦٠ | ٧١ | سەیدۆکە | ٣١ |
| ٣٦ | خدر جیجە | ٤٠٢ | | | |

ناحیەی: قەراج
ژمارەی گوندەکان: ٨٣

قەزای مەخموور
کۆی گشتی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧: ٩٨٨٨ کەس

| ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ | ز | گوندەکان | ژمارەی دانیشتووان لە سەرژمێری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | لاکەچە | ١٦٨ | ٤٣ | قەبری سەیدی | ١٠٠ |
| ٢ | شۆڕە پەنکە | ٢٠٣ | ٤٤ | گردەچار | ٩٧ |
| ٣ | کەر مردی | ٢٠٦ | ٤٥ | گردەبۆر | ٤١ |
| ٤ | خڕە بەردان | ٢١٩ | ٤٦ | قوچە سپیلکە | ١١٤ |
| ٥ | کودیلە | ١٤٢ | ٤٧ | گردە ڕەشە | ٣٩ |
| ٦ | شیالە | ١٥٢ | ٤٨ | گۆپ تەپە | ١١٥ |
| ٧ | خربە حرچان | ٦٥ | ٤٩ | دووسەرە بالا | ١١٩ |
| ٨ | عەنکاوە قەراج | ٢٠٨ | ٥٠ | مەعمەر ئۆمەران | ٣٢٥ |
| ٩ | حوشترلووک | ١٠١ | ٥١ | گول گامێشە | ٢٥ |
| ١٠ | حەساڕۆک | ٥٦ | ٥٢ | زوڕنا | ١٧٤ |
| ١١ | قوج | ٨٦ | ٥٣ | شندر فوقانی | ١٣٤ |
| ١٢ | دۆرمنگێو | ١٦٧ | ٥٤ | خرابە زەرد | ٤٦ |
| ١٣ | کەلەشخان | ٤٩ | ٥٥ | عەدلە | ٩٤ |
| ١٤ | بیر مهێدی | ١٤١ | ٥٦ | ماروانشان | ١٤٤ |
| ١٥ | دووسەرە ژێری | ١٢٥ | ٥٧ | عەزیز عەبدە | ٩٨ |
| ١٦ | چوار بەردە | ٢١٩ | ٥٨ | خربە جوالە | ٧٦ |
| ١٧ | دوازدە هەوار | ١١٦ | ٥٩ | ئەگەرەح | ٩٠ |
| ١٨ | هەمزە ئاغا | ٧٦ | ٦٠ | خربە خلف | ٨٢ |
| ١٩ | هەمین مردی | ٣٠ | ٦١ | خربە بندیان | ١٣١ |
| ٢٠ | گڕاو | ١٧٧ | ٦٢ | شناوە | ٦٤ |
| ٢١ | سارتک | ١١٢ | ٦٣ | گردی دۆم ئیدریس | ١٨٣ |
| ٢٢ | ئازیکەند | ٣٢٠ | ٦٤ | (تل الغزال) | ٦٧ |
| ٢٣ | قەڵاتە سۆری مەرزان | ١٨٣ | ٦٥ | گردی دۆم عەزیز | ٣٧ |
| ٢٤ | عەلیە رەش | ٥٠ | ٦٦ | گردە دیوانە | ٩١ |
| ٢٥ | بەردە سپی | ٣٧ | ٦٧ | زلگە | ٤٧ |
| ٢٦ | گردگڕاو | ٢٦٤ | ٦٨ | عارەبۆک | ٢٢٦ |
| ٢٧ | چار گۆمان | ١٦ | ٦٩ | پونگینە | ١٣٧ |
| ٢٨ | سەلماس | ١٢٦ | ٧٠ | دینگاوە | ٩٧ |
| ٢٩ | کونە سیخوڕ | ١١٠ | ٧١ | برایم باوڵ | ٢٧٠ |
| ٣٠ | گرد قۆشمە | ٩٠ | ٧٢ | (تل المطر) | ٨١ |
| ٣١ | خەزنە | ٤٥ | ٧٣ | گرد گلێخە | ٦٠ |
| ٣٢ | (خرائب جبر) | ١٥٩ | ٧٤ | خەندەقی گەورە | ٦٨ |
| ٣٣ | گۆمەشین | ٨٢ | ٧٥ | خەندەقی گچکە | ٢٤ |
| ٣٤ | گردەپان | ١٥٥ | ٧٦ | پاشبەند | ١٢٨ |
| ٣٥ | گەزۆک | ١١٨ | ٧٧ | خازر | ٢٠٠ |
| ٣٦ | موحسین ئاوە | ١٠١ | ٧٨ | عنیزو | ١٨٣ |
| ٣٧ | گردی گۆم | ١٧٠ | ٧٩ | کەندی بەکرە | ٤٣ |
| ٣٨ | گردە هارە | ١٣٥ | ٨٠ | گردی رەوە | ١٣٨ |
| ٣٩ | خربە مەحمودیە | ١٤٦ | ٨١ | خرابەسیاو | ٤٠ |
| ٤٠ | خەربانی | ٩٩ | ٨٢ | جوکوژ | ٨٢ |
| ٤١ | روالە | ٢٢٤ | ٨٣ | لاسۆر | ٧٢ |
| ٤٢ | سێگرتکان | ٥٨ | | | |

ساڵدا بڕیاری دۆزینەوەی شوێنێکی باش و ڕێکی لە کوردستاندا بۆ دروستکردنی هاوینەهەوارێک دا. بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەکی تایبەتی لە چەند وەزیر و موتەسەریف و پسپۆڕ پێکهێنا. پاش گەڕان و سووڕانێکی دوور و درێژ لە کوردستاندا، سەربەنی چیای پیرمام بۆ هاوینەهەوار هەڵبژێردرا و پەسەند کرا. لیژنەکە ڕاپۆرتی خۆی بۆ وەزارەتی کاروگەیاندن (الاشغال والمواصلات) ڕەوانە کرد، کە (سەربەن) چاکترین و باشترین جێگایە بۆ هاوینەهەوارێکی بێ وێنە، وەزارەت ئەم پێشنیازەی بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران بەرز کردەوە، پاش خەملاندنی پێشنیازەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەرچوو. ئینجا پەرلەمان یاسای هاوینەهەوار (قانون المصايف)ی دەرکرد. هەروەها پارەیەکی زۆر بۆ پرۆژەکە تەرخان کرا، ئەنجومەنی وەزیران بڕیاری دا دەست بەکار بکات، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانی بە وەزارەتی کاروگەیاندن دا، وەزارەتیش لیژنەیەکی لە (تەها هاشمی، وەزیری بەرگری) و (موتەسەریفی هەولێر، ساڵح زەکی ساحێبقران)و چەند فەرمانبەرێکی دیکە لە وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی کاری لیوای هەولێر بۆ سەرپەرشتی کارەکە پێکهێنا.... بەم جۆرە دەست بە دروستکردنی هاوینەهەواری سەلاحەدین کرا.

هۆی پەسەند کردنی (سەربەن)یش بۆ هاوینەهەوار ئەمانەن:

١- پانی و بەرینی سەر کێوەکە بۆ ئاوەدانی بەش دەکات.
٢- بوونی داروبارێکی زۆر وەکو داری بەڕوو، مازوو، داری میوە و ڕەزی ترێ، کە بە ئاوی باران شین دەبن.
٣- هاتوچۆی بۆ ئاسانە و لە هەولێر نزیکە.
٤- زۆربەی زەوییەکان هی میرین، واتە هی حکومەتە و کەمێکی موڵکی هاوولاتیانە. ئەوە کارەکەی ئاسان کرد و بودجەی پرۆژەکەی کەم کردەوە.
٥- پاکی شوێنەکە لە نەخۆشی لەرز و تا (مەلاریا)، کە ئەو کاتە لە کوردستاندا بلاوبۆوە.
٦- بەرزی شوێنەکە، کە لە هەزار مەتر بڵندترە و شنەبایەکی هەمیشەیی هەیە و پانتاییەکی دوور و خۆشی هەیە و چواردەورەی پانۆرامێکی دڵگیرە.

کەموکوری سەربەن ئەوە بوو، کە ئاوی لێ نەبوو، بۆ چارەسەرکردنی ئەمەش، بڕیاردرا ئاو لە کانی گوندی (ماولۆ) دابین بکەن، بۆ ئەم مەبەستە لە کۆمپانیایێکی ئینگلیزی ترۆمپای ئاو خواسترا، ئەو کات ئەم جۆرە ترۆمپایە لە عێراق وەدەست نەدەکەوت، بەم جۆرە بە بۆری شەش گرێ (ئینج) ئاو لە کانی گوندی ماولۆ بۆ سەربەن ڕاکێشرا و گیروگرفتەکە چارەسەرکرا.

لە کۆتایی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٤٠) دەست بە پرۆژەکە کرا، پێش هەموو شتێک شەقامێک بە پانایی بەنی پیرمام کرا تاکو تووشی هیچ هەڵەیەک لە پلانەکانیان نەبن، بە تایبەتی جێگای خانووەکان، پاشان دەست بە دروستکردنی خانووەکان کران، قەسرێک بۆ مەلیک و خانوویێک بۆ (وەسی) ئەمیر عەبدولئیلاه، هەروەها بۆ وەزیرەکان و دامودەزگای مەلیک، لەلایەکی تریشەوە بنکەی پۆلیس و خەستەخانە و پۆستە دروست کران، لەدواییدا ئوتێلێک لە سەنتەری سەربەن لەسەر ڕێگای هەولێر - شەقلاوە دروست کرا و ناوی نرا پیرمام، پاشان خانوو بۆ تەها هاشمی وەزیری بەرگری و سەرۆکی لیژنەی سەرپەرشتی پرۆژەکە و عومەر نەزمی وەزیری ناوخۆ و چەند کەسایەتی تر دروست کران، ئینجا شەقامەکانی ناو هاوینەهەوار بە پێی پلان ڕێکخران و قیرتاوکران و تێلی کارەبا ڕاکێشرا و پرۆژەی هێنانی ئاو لە گوندی ماولۆ سەرکەوت. لە کاتی ئیشکردن لە دروستکردنی هاوینەهەوارەکە، لیژنەی سەرپەرشتی لە بەغدا و هەولێر دەهاتنە سەربەن بۆ چاودێری و سەرپەرشتی، هەروەها ئەمیر (عەبدولئیلاه)یش بە فڕۆکە لە

بەغدا دەهاتە هەولێر، لەوێش بە ئۆتۆمبێل دەچووە سەربەن، بۆ سەرلێدان و چۆنیەتی کارکردن لە پرۆژەکە. لە مانگی تەمووزی (١٩٤٠) مەلیک (فەیسەڵی دووەم)یش هاتە سەربەن، سەیری قەسرەکەی خۆی کرد.

ئەوەی بە پێی پلان نەکرا و دواکەوت، سەرفکردنی پارەکان بوو لەکاتی خۆیدا، ئەو پارانەی تەرخان کرابوون بۆ خاوەن زەوییەکان، کە حکومەت بۆ پرۆژەکە دەستی بەسەردا گرتبوو. ئەمە ئاژاوەیەکی پەیدا کرد، خاوەن زەوییەکان داوای مافی خۆیان کرد و بێزارییان دەربڕی، هەتا وای لێهات، کە (جەلال بابان) لە ئەنجومەنی ماقووڵان (مجلس الاعیان) باسی ئەم گیروگرفتە بکات و داوا لە حکومەت بکات بە زووترین کات پارەکان خەرج بکرێت. پاش چەند مانگێک پارەکان سەرف کران، کە چەند هەزار دینارێک بوو. ئەوەی شایانی باسە خوالێخۆشبوو حاجی مەجید ئاغای کوڕی ڕۆڵێکی گەورەی لە وەرگرتنی پارەکان لە حکومەت هەبوو لەبەر ئەوەی توانی گیروگرفتەکە بگەیەنێتە بەغدا و وازیشی لێ نەهێنا تاکو داواکەیان جێبەجێ کرا.

بەم جۆرە دروستکردنی هاوینەهەواری سەلاحەدین تەواو بوو. لەو کاتەی کە ئیشی لێ دەکرا و پاش تەواوبوونی زۆر قسە و پروپاگەندە دژی کارمەندان و ئەوانەی پەیوەندییان هەبوو بە پرۆژەکە لەناو خەڵک دەکرا، لەمانە گوایە، ناوی (سەلاحەدین) بۆ هاوینەهەوارەکە لەلایەن ساڵح زەکی ساحێبقران ئیختیار کراوە لەبەر ئەوەی کوڕە گەورەکەی ناوی (سەلاحەدین)ە و هاوینەهەوارەکەی بەناوی کوڕی خۆی کردووە!!!

هەروەها باسی دزی دەکرا، کە پارەیەکی زۆر دزراوە، هۆی ئەو دزییەش ئەوەیە، کە لیژنەکانی سەرەکی و سەرپەرشتی کارەکە بەرێکی چاودێری پرۆژەکەیان نەکردووە، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەندامانی لیژنەکان لە بەغداوە دەهاتن و بە جوانی چاودێرییان نەدەکرد، هەر چاولێخشاندنێک دەکرا و دەگەڕانەوە بەغدا. بەزۆری ناوی دوو فەرمانبەر دەهات کە دزن، یەکەمیان عەبدولجەبار ناوێک، ئەوەی تر ژمێریاری پرۆژەکە بەدری قەداح کە خەڵکی سوریا بووە.

هەروەها ئەو پروپاگەندەیەش هەبوو، کە خانووەکەی تەها هاشمی، بۆیە ئەوەندە گەورە و جوان دروست کرابوو تاکو چاو لە دزەکان داپۆشێ (ئەم خانووە ئێستاش ماوە، لە شەستەکان خوالێخۆشبوو کەریم ئاغای کوڕی مەجید ئاغا لە نەوەکانی تەها هاشمی کڕییەوە.... ئەم خانووە لەچاو خانووەکانی لوبنان یان ئەورووپا نە بە جوان نە بە گەورە دەژمێردرێ!!!.

وادیارە قسە لەسەر دزی کردن لە پرۆژەکە زۆر بووە، تا وای لێ هات لە پەرلەمان (مجلس النواب) و ئەنجومەنی ماقووڵان (مجلس الاعیان) باسی بکرێت، لەبەر ئەوە حکومەت ناچار بوو دەست بە لێکۆڵینەوە بکات، بۆ ئەم مەبەستە فەرماندرا پۆلیسی هەولێر ئەم کارە بکات. پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر هیچ دەرنەچوو و کەسیش تاوانبار نەکرا و قسەکانیش بۆش دەرچوون، بەڵام پروپاگەندە هەر مایەوە ئەمجارە دەگوترا بۆیە پۆلیس لێکۆڵینەوەی راگرتووە، چونکە بۆیان دەرکەوتووە کە وەزیر و کاربەدەستی گەورە لە دزییەکە بەشدارن، بۆیە لێکۆڵینەوەکە داخرا!!!.

ڕۆژ بە ڕۆژ پروپاگەندە کەم بۆوە و نەما، هاوینەهەواری سەلاحەدین ماوە و پەرەی سەند و گەشەی کرد و بووە شارێکی جوان. هەر کوردێک پێی دڵشاد دەبێت.

**سەرچاوەکان:**

١- بیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبوو باوکم حەمید بەگ (دەستنووسە).
٢- پرسیارکردن و بیرەوەرییەکانی هاووڵاتیان.
٣- دلیل السائح - بغداد.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر ژمارە (٤) پایزی (١٩٩٩) وەرگیراوە.**



# گۆم و گۆماوەکانی دەشتی قەراج

هوشیار عەبدوڵڵا

**گـۆمی گـەورە:** لە گـوندی برایم باولیدا دوو گۆم هەیە، یەکێکیان گۆمی گەورەیە، کـە گـۆمـێکی گـەورە بوو، کـەوتبـووە سـەرەوەی گـوندی لە نزیک تەکـیـەکـەی شـێخ عـەبدولکەریمی دارەخورما بوو، نزیکەی بەژنێک قـوڵ بوو، ئاوەکەی شیرناو بوو، هەتا دەرەنگی ساڵی دەما، خەڵکەکە ئاوەکەیان لێ دەهێنا بۆ چا و چێشت لێنان و خواردنەوە بەکاریان دەهێنا، پاشان وردە وردە ئاوەکە هیشک دەبوو نەدەما، هەتا ئەو ئاوە بمابایە کەس ئاوی بیرێی بەکار نەدەهێنا، ژمارەیەکیش بیری ئاوی لێ بوو، لەو گـوندی ئاوی دوو بـیـران دەخورایەوە، ئاوەکەیان تاڵ نەبوو ئەگینا هەموو بیرەکانی دیکە ئاویان تاڵ بوو.

**گۆمی کفران:** ناوی گۆمێکە کەوتۆتە ناو ئاقـاری گـوندی برایم باولی، لە رۆژهەڵاتی گوندەکەدا هەڵکەوتووە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە، چونکە دەوروبەرەکەی داری کفری لێیە، ئاوەکەی هەتا نیوەی مانگی نیـسانی دەما.

**گۆمی بەرازکوژی:** ئەو گۆمە لەنێوان ئاقاری گوندی مەحمەر نۆمەران و قەراتە سۆرانی مەرزان هەڵکەوتووە، کاتی خۆی لەسـەر ئەو گـۆمـەیدا بەرازێک کوژراوە، بۆیە بەو ناوە نـاسـراوە و ناونراوە، ئەو گـۆمـە گـۆمـێکی گـەورە بوو، لە رۆژاوای قەراتە سۆراندایە، شیرناو بوو، ئاوەکەی هەتا دەرەنگی سـاڵی دەمـا، خـەڵکی ئاویان لێ دەبردا بۆ خـواردنەوە و چا و چێشت لێنان بەکاریان دەهێنا.

**گۆمی ماروباشان:** ئەو گۆمە یەکێکە لە گـۆمـە بە ناوبانگەکـانی دەشـتی قەراجی، لەناو ئاقاری گوندی مارواباشان هەڵکەوتووە، گـۆمـێکی گـەورە بووە، زسـتـانان و بەهاران ئەو گـۆمـە پڕی ئاو دەبوو، شـوانکارەو مـەڕدارانی دەڤـەری دزەییـاتی دەشـتی هەولێری لە ئاقـاری مـارواشـان و دەوروبەری ئەو گـۆمـەی رەشماڵیان هەڵدەدا، ئەو ئاقارە گژوگیای زۆر بووە، ناوی ئەو گـۆمـەی تێکەڵ بە ئەدەب و حـەیران و فۆلکلۆری دەڤەرەکە بووە، زۆربەی حەیرانبێژانی دەڤەرەکە لە حەیرانەکـانیـاندا ناوی گۆمی ماروباشان دەهێنن.

**گۆمی ئەسحابەی:** ناوی گۆماوێکە دەکـەوێتـە ناو ئاقـاری گـوندی قـەراتە سۆرانی مەرزان، لە خوار گۆڕستانەکەی ئەسـحـابەیە لە رۆژهەڵاتی گـوندەکـە هەڵکەوتووە، ئاوەکـەی هەتا دەرەنگی ساڵی دەما.

**گۆمی سـێقـولینچک:** لە دەشـتی قـەراجـێدا دوو گـۆم بەو ناوەی هەیە، یەکـێکیـان دەکـەوێتـە بەینی ئاقـاری گوندی مشار و محێجیلەی، ئەوی دیکە لە ئاقـاری گـوندی "گـەڕەسـۆر"ی هەڵـکەوتـووە، بـۆیـە پـێـی دەڵـێـن سـێـقـولینچک، چونکە لە شـێـوەی سـێگۆشـەدایە، سێ قـولینچکی هەیە، ئاوەکەی شیرناوە هەتا دەرەنگی سـاڵێ دەمـا، لەبەرئەوەی خـاکی گـەڕەسـۆری گـڵـێکی سـۆری هەیە ئاوی کـەم هەڵدەمژێت.

# بایەخی جوگرافیایی دەشتی دیبەگە

## (Geography of Dibaga Plain)

جەلال مەولود حەمەد سنجاوی

شارۆچکەی (ناحیەی دیبەگە) لە رووی ئیدارییەوە سەر بە قەزای مەخموورە، ئەم شارۆچکەیە بە (٤٢) کیلۆمەتر لە باشووری پارێزگای هەولێر جێگیرە و سەرپەرشتی هەموو گوندەکانی دەشتی کەندیناوە و بەشێک لە گوندەکانی دەشتی شەمامک دەکات...سنووری لە باکوور بەرزاییەکانی زوورگەزراو (ئاقانە داغ) و لە باشووری چیای قەرەچووغ و لە رۆژهەلاتی زابی بچووک و لە رۆژئاوای زابی گەورەیە، هەرچەندە حاڵی حازر ئەم شارۆچکەیە دەسەڵاتی یاسایی وەک بنکەیەک (ناحیەیەک) هەڵوەشێنراوەتەوە و وێرای گوندەکانی دەشتی کەندیناوە و ناوچەی شەمامکی پشت زوورگەزراو تەعریب کراوە[*].

وێرای ئەمەش زۆر لە خشتە و زانیاری هەن کە لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیەدا خراونەتە روو، بۆ یەکەمین جارە بڵاودەکرێنەوە.

### سنووری پێکهاتەی خاک:

سنووری جوگرافیایی دەشتی دیبەگە لە بەرزاییەکانی زوورگەزراو (ئاقانە داغ ٥٠٧م) لە باکوور دەستپێدەکات تا دەگاتە بەرزاییەکانی چیای قەرەچووغ (٨٢١م) لە باشوور، لە رۆژهەلاتەوە زێی بچووک (زابی بچووک) و لە رۆژئاواوە زێی گەورە (زابی گەورە)یە..



دەشتی دیبەگە لە رووی جوگرافیاوە تەواوی دەشتی کەندیناوە و بەشێک لە گوندەکانی شەمامک دەگرێتەوە، درێژی دەشتەکە (٨٠کم) و پانایییەکەشی (١٦کم) دەبێت.

(دیبەگە) بنکەی ناحیەی کەندیناوەیە و (٤٢کم) لە باشووری شاری هەولێر دوورە و لە رووی ئیدارییەوە سەر



بە قەزای مەخموورە.

جیۆلۆجیستەکان وای بۆ دەچن کە ئەم هەرێمەی دەشتی دیبەگە لە چاخی سێیەندا دووچاری پاڵەپەستۆی جوولەی تەکتۆنی مەزن بووە و گەلێک ئاسەواری فیزۆگرافی ئاشکرا و بەرچاوی لە رووی خاکەکەیدا بەجێ هێشتووە، روخساری تۆپۆگرافی ناوچەکە لە رەنگدانەوەی جوولەی پلێتی خاکەکەی و ستراکتۆرەکەی، زانایان دەگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم ناوچەیەش تەبای هەرێمەکانی دیکەی کوردستان بە هەمان بارودۆخی جیۆلۆجی شاخەکاندا تێپەڕ بووە و دووچاری هەمان گۆڕانکاری مۆرفۆلۆژی لە چینەکانی خاک بووە.

پێکهاتەی زۆربەی کەڤرەکانی گردۆڵکەکانی زوورگەزراو و بەرزاییەکانی قەرەچووغ دەگەرێتەوە بۆ پێکهاتەی چەرخی ئولیجۆسین و پێکهاتەی بەختیاری سەردەمی چەرخی پلیۆسین -Plleocene- .

بەردەکانی شاخ و زوورگەکە لە جۆری بەردی کلسی و تەمۆخ و قوماوی و کونیلەدارن، ئەم کونیلانەش بایەخێکی گرنگیان بۆ گلدانەوەی ئاوی ژێر زەوی هەیە و رێگا بە ئاوی باران دەدەن لە درز و قلیشەکانی شاخ و چینەکانی ناوەوەی زەوی بۆ ناخ بڕۆن، ئەمەش وای کردووە کە دەشتەکە زۆر دەوڵەمەند بێت بە ئاوی ژێر زەوی و بۆ خواردنەوە و ئاژەڵداریش سوودبەخشن.

ستراکتۆری ناوچەکە بریتییە لە نیشتەنییەکی ئەستوور داپۆشراو و بایەخێکی گرنگیان لە رووی ئابوورییەوە هەیە و بۆ جۆرەها کشتوکاڵ بەهەرمێن و بەبرشتە، رەنگی خاکەکەی لە جۆری قاوەیی تۆخە و رێک بۆ دانەوێڵە بە تایبەتی گەنم و جۆ دەست دەدات و رێژەیەکی زۆری زیندە مادەی تێدایە، قووڵایی خاکەکەی ٢ -٤ مەتر دەبێت لە هەموو شوێنێکدا، تەنیا لە بناری چیای قەرەچووغ نەبێت، کە داڕووتانی خاک بەهۆی کردەی باران و هەڵکردنی (با) کاری کردۆتە سەر توێکڵەکەی.

رێژگەی ئاوی دەشتەکە لە ناوڕاستدایە و بەهۆی چەندین کەند و چۆمی بچووک ئاوی باران لە کەندی کەندێناوە کۆدەبێتەوە و لە رۆژهەڵات و خوارووی رۆژهەڵات بەرەو زێی بچووک و لە بەشی رۆژئاوا و باکووری رۆژئاواش بەرەو زێی گەورە ئاوەکەی لە دەشتەکە دوور دەکاتەوە. ئاوی کەندێناوەش سەبارەت بەو کەندە هاتووە کە لە ناوەڕاستی دەشتەکەدایە، واتە کەندی ناوەند یان کەندی ناوەڕاست. تەنیا رووبەری دەشتی کەندێناوە بە هەموو گوندەکانییەوە دەگاتە ١٢٨٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە.

لە خشتەی ژمارە (١)دا بەراوردێک لە نێوان دەشتی دیبەگە و دەشتە کشتوکاڵییەکانی دیکەی هەرێمی کوردستانی عێراق دیار دەخات:

## ئاو و هەوای دەشتی دیبەگە

ئاو و هەوای دەشتەکە لە ژێر کۆمەڵێک هۆکاردایە، کە راستەوخۆ کار دەکەنە سەر ئاو و هەواکەی بە درێژایی

| شوێن | بازنەی پانی | هێڵی درێژی | قوڵایی /مەتر | ئاستی ئاو /مەتر |
|---|---|---|---|---|
| دیبەگە | ٣٥° ٢٥´ | ٤٣° ٤٩´ | ٧ر٧ | ٦ر٠ |
| عەبدوڵلا | ٣٥° ٤٥´ | ٤٣° ٣٩´ | ٩ر١ | ٧ر٢ |
| چەغەمیرە | ٣٥° ٤٦´ | ٤٣° ٤٦´ | ٣٩ر٥ | ٣٧ر٧ |
| سەرگەران | ٣٥° ٤١´ | ٤٣° ٥١´ | ٢٥ر٤ | ٢٤ر٨ |
| شۆرە زەرتكە | ٣٥° ٥٦´ | ٤٣° ٣٦´ | ٤ر٦ | ٤ر٣ |

خشتەی ژمارە (١)

کەژەکانی ساڵ... پێناچێ چیای قەرەچووغ لە باشوور و بەرزاییەکانی زوورگەزراو لە باکووری دیبەگە چ جۆرە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر گۆڕانکاری کەش و هەوای دەشتەکە هەبێت، بەڵکو پتر رەنگدانەوەی گۆڕانکارییەکانی زەپۆشی دەشتی هەولێری بەسەردا زاڵە.

بە هۆی پۆلێنکردنی (کوپن Koppen) دەشتی دیبەگە دەچێتە نێو بازنەی سیستەمی ئاو و هەوای دەشتی هەولێر و رێژەی دابارینی ساڵانەی لە نێوان ٣٥٠ - ٦٠٠ ملم دەبێت، ئەم بازنەیە کاریگەری گۆڕانکارییەکانی شاخە زەلامەکانی باکووری هەولێری لەسەرە و دەکشێ تا باشووری هەردوو ناوچەی قەراج و حەوزی مەخموریش دەگرێتەوە، هاوینی دەشتەکە گەرم و وشکە و زستانی سارد و باراناوییە، لە هەندێک وەرزی ساڵدا پایزە بارانەشی لێ دەبارێ، پلەی گەرمی -Temperature- دەشتەکە لە وەرزەکانی ساڵدا جیاوازییەکی زۆری هەیە و تووشی هەڵبەز و دابەزین دەبێت، لە کاتێکدا لە مانگی کانوونی دووەم دەگاتە ٨,٧ پلەی سەدی، کەچی لە هاویندا (تەمووز) بەرزترین پلەی دەگاتە ٢٦,٧ پلە، کە ئەمەش رێژەیەکی زۆرە لە جیاوازی نێوان پلەی گەرمی و ساردی دەشتەکە لە هاوین و زستاندا.

**(کوپن) دەشتی هەولێر بۆ دوو ناوچەی سەرەکی پۆلێن دەکات:**

١- ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاست (S) ناوچە شاخاوییە ساردەکانی سەر سنوور دەگرێتەوە تا دەگاتە خاڵی کۆتایی لە بەرزاییەکانی (هەیبەت سوڵتان و بنەباوی و بابا جیجیک) کە بەرزترین پلەی گەرمی ٢٢ پلەیە و رێژەی دابارینیش لە نێوان ٦٠٠ - ٨٠٠ ملم دەبێت.

٢- ناوچەی کورتە گیا (ئیستیپس): کە دەشتی دیبەگە تاکو باشووری حەوزی مەخموور دەگرێتەوە و لە جۆری ئاو و هەوای گەرمەسێرە و هاوینی گەرم و زستانی ساردە و رێژەی باران بارینی لە نێوان ٣٥٠ - ٦٠٠ ملم دەبێت و رادەی شێی ناوچەکە مامناوەندییە و لە زستاندا برێکی باش لە تەمومژ (الضباب) دەبینرێت و بای باکوور و رۆژئاوا کاریگەرییان بەسەر دەشتەکەدا هەیە.

**بایەخی جیۆپۆلەتیکی دەشتی دیبەگە:**

دەشتی دیبەگە بایەخێکی جیۆپۆلەتیکی گرنگی بۆ کوردستان هەیە وەک ناوچەیەکی دەوڵەمەند بە کانزاکان، بە تایبەتی نەوت و گۆگرد جگە لەوەش بە ئەمباری لەبن نەهاتووی دانەوێڵە (گەنم و جۆ)ی هەولێر ناودەبرێت، وێڕای سامانی ئاژەڵ و ئاوی ژێر زەوی. ئەم دەشتە وەک پشتێنەیەکی تۆکمینی دەوری کەمەری هەولێری گرتووە و قووڵایی ستراتیژی بۆ دەخەملێنێ و بڕوای مانەوە و هێزی بەرگری لەخۆکردنی پێدەبەخشێ.

**رووەکی سروشتی (خۆڕسک):**

ئەو رووەکەیە بە شێوەیەکی سروشتی و بەبێ دەستکاری مرۆڤ دەڕوێ، جۆری خاک و بەرزی و نزمی کار دەکاتە سەر نەشونماکردنی لە رووی چۆنیەتی و جۆرێتی بە شێوازی هەمە جۆر کاری لێ دەکات، وێڕای ئەمانەش کاریگەرێتی گەرمی و ساردی و رێژەی باران بارینیان بەسەردا هەیە.

پێکهاتە سەرەکییەکانی خاک لە مادەی کانزایی و

مـادەی ئۆرگـانی و زیندە مـادەکـان هۆکـاری سـەرەکی پەیدابوونی رووەکی سروشتین. دەشـتی دیبـەگـە بە پێی پۆلینکردنی ناوچەکانی رووەکی سروشتی دەکەوێتە بازنەی رووەکـەکـانی گـەرمەسـێری شـێدار و بە هەزاران جـۆر لە رووەکی گـژوگـیـا: (کـەنگر، کـاردی، پیـفـۆک، قـێـزبەلە، گـیـامـامزە، مـقەسـە، شـمـریشـاق، بزنتـرێنە، گلێـخـە، خورماچیچە، دانەقەتێ، زەرگەزەوی...تاد) لەگەڵ جۆرەها گـوڵ و رووەکی دڕکـاوی لە بەهاران سـەر دەردەهێنن و ناوچەکە دەکەن بە پاوانێکی باش بۆ لەوەڕگای ئاژەڵان. لە هاوینانیش رووەکە دڕکاوییەکانی وەک: (حوشتـرالووک، خڕنووک، کەبەر، نووسەنەک، قەلۆغان، شەکرۆکە...تاد) دەبینرێن، بە شێوەیەکی گشتی ستراکتۆری ناوچەکە و جـۆری کـەش و هەواکـەی رێگا خـۆشکەرن بۆ رووەکی سروشتی لە دەشتەکە، بەڵام لە بەرزاییەکانی قەرەچووغ و هەڵدێرە رکـەکـانی زوورگـەزراو، کـە هۆکـاری دامـاڵین و داڕووتانی خاک بە درێژایی چاخە جیۆلۆجییەکان بۆتە هۆی پەیدا کردنی چەندین کەندڕ (الاخدود) لە ئەنجامی بەخوڕ هاتنە خـوارەوەی ئاوی باران لە زەوییـە لێـژەکـاندا، بۆیە رووەکی سروشتی کەمە و هەندێک جۆر لە دار و درەختی سروشتی لە کەلێنی شاخەکانی قەرەچووغـدا هەیە وەک: جنەهەنار، بەڕالووک، هەنجیرەکێوی،...تاد، کە خەڵکەکە بۆ سووتەمەنی و خانوو دروستکردن بەکاریان دەهێنن.

رووەکی سروشتی بایەخێکی زۆری بۆ ناوچەکە هەیە و کردوویەتییە لەوەڕگـایەکی باش بۆ بەخێـوکـردنی مەڕ و مـاڵات، بەتایبـەتی لە کەژی بەهاران بە پانایی دەشـتـەکـە رەشمـاڵی مـەڕداران دەبینرێت، کـە ئەمـەش کـۆڵەگـەیەکی مـەحکەمی بووژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری وڵاتە و بژێوی ژیانی هاووڵاتیانی ناوچەکە دابین دەکات.

**سەرچاوەکانی ئاو لە دەشتی دیبەگە:**

سەرچاوەی سەرەکی ئاو لە دەشتی دیبەگە ئاوی بارانە، بە دەگـمەن بەفر لەو هەرێمە دەبارێ، وەرزی راستـەقـینەی باران بارین لە دەشتی دیبەگە لە مانگی تشرینی دووەمەوە دەست پێدەکـات تا سـەرەتای مـانگی ئایار، بەڵام بە زۆری لە نێوان مانگی کانوونی یەکەم و ئاداردا دەبارێ.

باران سـەرچاوەی سـەرەکی و پشت پێبـەسـتـراوی کشـتوکاڵ و ئاژەڵدارییە لەو دەشتـەدا وێڕای دابینکردنی ئاوی خـواردنەوەش سـەرانسـەری دەشتی دیبـەگە پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەسـتـێ، کـە بەهۆی بیـرە بە دەست هەڵکەندراوەکـان (Hand Dug) یان بیـرە گـشـتـیـیـەکـان (Drilled Wells) ئاوەکە دەردەهێنن و بۆ کشتوکاڵ و ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ بەکاردێت.

پێکهاتووە جیۆلۆجییـەکانی خاکی دەشتەکە، رۆڵی خۆیان لە مـەودا و ئاست و قـوولایی بیـرەکـان دەگـێـڕن، تێکرای رێژەی قوولایی بیرەکان لە نێوان ٥.٤-٢٨مەتر دەبێت و مام ناوەندی قوولاییەکە دەگاتە ٥.١٣ مەتر، بیرەکانی دەشتی دیبەگە دوو جۆرن:

١- ئەو بیـرانەی خـەڵکی ناوچەکـە بە دەست هەڵیانکەندووە و هەر گـوندێک بە گـوێرەی ژمـارەی دانیشـتوان و رادەی پێویستییان لە ئاو بۆ ئاژەڵداری و باخچەکان چەند بیرێکیان بەدەست لێداوە (Hand Dug)، وەک خشـتـەی ژمـارە (٢) کە بەراوردێکە لە نێوان چەند بیـرێکی دەشـتی دیبـەگـە لە قـوولایی و بەرهەم و رێژەی ئاوەکە:

٢- بیـرە گشـتـیـیـەکـان: (Drilled Wells) هەموو ئەو بیرانە دەگرێتەوە، کە بە هۆی ترومپا یان مـوەلیدەی ئاو لە قوولاییەکی زۆرەوە دەردەهێنن، ئاستی قوولایی بیرەکان لە هەموو شوێنێکی دەشتی دیبەگە وەک یەک نین، بۆ نموونە بیـری گـوندی خـورمـەڵە ٩٠ مـەتر قـووڵە و گـوندی دێمـەکـاریش ٢٠٠ مـەتر دەبێت، بەڵام لە گـوندی شۆڕەژەرتکە قوولاییەکە تەنیا ٤.٤ مەتر دەبێت، کەچی لە

| ناوی دەشت | درێژی کم | پانی کم | بەرزی مەتر | شوێن |
|---|---|---|---|---|
| دەشتی دیبەگە | ٨٠ کم | ١ کم | ٣٠٠م | پارێزگای هەولێر |
| دەشتی حەمرین | ٧٥ کم | ٣٢ کم | ١٨٠ - ٢٥٠م | پارێزگای کەرکووک |
| دەشتی هەولێر | ٨٥ کم | ٣٥ کم | ٣٠٠ - ٤٥٠م | پارێزگای هەولێر |
| دەشتی ژەنگار | ٦٠ کم | ٥٠ کم | ٣٠٠م | پارێزگای دهۆک |

خشتەی ژمارە (٢)

| شوێن | بازنەی پانی | هێڵی درێژی | قوڵایی /مەتر | ئاستی ئاو /مەتر |
|---|---|---|---|---|
| دیبەگە | ٣٥° ٢٥′ | ٤٣° ٤٩′ | ٧ر٧ | ٦ر٠ |
| عەبدوڵلا | ٣٥° ٤٥′ | ٤٣° ٣٩′ | ٩ر٩ | ٧ر٧ |
| چەغەمیرە | ٣٥° ٤٦′ | ٤٣° ٤٦′ | ٢٩ر٥ | ٣٧ر٧ |
| سەرگەران | ٣٥° ٤١′ | ٤٣° ٥١′ | ٢٥ر٤ | ٢٤ر٨ |
| شۆرە زەرتکە | ٣٥° ٥٦′ | ٤٣° ٣٦′ | ٤ر٦ | ٤ر٣ |

خشتەی ژمارە (٣)

سەنتەری دیبەگە ٧.٧ مەتر دەبێت، بەڵام بۆ بیری ئیرتیوازی قووڵاییەکە زۆر لەوە پتر دەبێت، تاکو چاوگەکانی ئاوی ژێر زەوی زۆر ببڕێت و ئاوێکی باش بەرهەم بهێنێت، بەشی پێویستییەکانی خەڵکەکە بکات. وەک خشتەی ژمارە (٣)ی خوارەوە بەراوردێکە لە نێوان بیرە گشتییەکانی شارۆچکەی دیبەگەو هەندێ گوندی کەندیناوە:

**راگوێزان و کۆچپێکردنی دانیشتوانی دەشتی دیبەگە:**

دەشتی دیبەگە هەروەک هەرێمەکانی دیکەی کوردستان تاکو ئێستا سەرژمێرێکی جێگیر و وردی بۆ ئەنجام نەدراوە، کە لە توێژینەوەکان پشتی پێ ببەسترێ. زۆربەی سەرژمێرەکان لە هەلومەرجی دژوار ئەنجام دراون و بۆ شوێنە دوورە دەستەکان و ڕەوەندەکان پەنایان بردۆتە بەر مەزندە و ژمارەی خەملێنراو. سەرەڕای ئەمانەش خەڵکەکە لە ترسی ڕەشبگیری و سەربازی زۆربەی نێرینەکانیان بە مێینە تۆمار دەکرد، تەنانەت هەندێ خێزان زیندووشیان بە مردوو ناونووس کردووە. جگە لە سەرژمێریساڵی ١٩٥٧ ئەوانی دیکە لە بارودۆخێکی نائاسایی ئەنجام دراون، هەر بۆیە سەرژمێرەکانی ١٩٤٧، ١٩٦٥، ١٩٧٧، ١٩٨٧ جێگای بڕوا و متمانە نین.

دەشتی دیبەگە ساڵانێکی زۆر لەمێژە دووچاری

| ز | ناوی شارۆچکە | ڕووبەر بە کم٢ |
|---|---|---|
| ١ | سەنتەری مەخموور | ٤٧٤ |
| ٢ | گوێر | ٥٨٦ |
| ٣ | کەندیناوە | ٧٤٠ |
| ٤ | قەراج | ٩٨٣ |

خشتەی ژمارە(٤)

ڕاگوێزان و بەعەرەبکردن و وێرانکاری هاتوون، بۆیە دانیشتوانە ڕەسەنەکەی پەرتەوازە و دەربەدەر بوون و ژمارەیان بە نەکاملی خەملێنراوە، بە تایبەتی لە نێوان ساڵانی ١٩٦١-١٩٩١ گوندەکانی ئەم دەشتە (کەندیناوە -شەمامک) دووچاری زنجیرەیەک ڕاگوێزان و کۆچاندنی زۆرەملێ هاتن، ئەمەش خۆی لە چەند قۆناغێک دۆزییەوە.

پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول، ڕێک لە ساڵی ١٩٦٣ حکومەت بە بیانووی ئاسایشی ناوچەکە و دانانی کەمەرەی ئەمنی (الحزام الامني) تەواوی گوندەکانی بناری قەرەچووغی سووتاند و وێرانی کردن کە ئەمانە بوون: (گوندی خدرجیجە، گاوەرە، کەندالّ، دارەخورما، حاجی شێخان، لاوەر، دەرماناوە، خۆشاو، حەسەن بلباس)، بەڵام دوای سەرنەکەوتنی کودەتا شوومەکەی ١٩٦٣ی حەرەس قەومیان، ناوچەکە تۆزێک ئارامی بە خۆیەوە دیت و خەڵکی ئەم گوندانە گەڕانەوە شوێنی خۆیان و سەرلەنوێ خانووەکانیان دروست کردەوە.

نەخشەی حکومەت بۆ تەعریبکردنی کەندیناوە رەگێکی قووڵی مێژوویی هەیە، چونکە ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندە بە نەوت و کانزاکانی دیکە.

لە ساڵی ١٩٧٦ گوندی سەرگەڕان کرا بە ناحیە و ناوەکەی گۆڕدرا بە ناحیەی قودس بە شێوەیەک لە ناحیەی دیبەگە کرایەوە و لە ڕووی ئیدارییەوە بەسترایەوە بە قەزای دوبز -دبس، خەڵکی ناوچەکەیان دەرپەڕاند و عەشیرەتی جبووریان لەوێ نیشتەجێ کرد، ئەم گوندانەشی خرانە پاڵ: (گوندی جاستان، دەربەند، سەربەشاخ، پەرکانە، ساردلوو، شەناغە، گێسمە، چەرت، تل هەلالە، گەزودشان).

پاش ئەوەی لە ١٩٧٤/٣/١١ حکومەت بە زۆری

یاسای ئۆتۆنۆمی چەسپاند و شەڕ لە کوردستان دەستی پێکردەوە، ئیتر حکومەت ئەمەی بە هەل زانی سەر لەنوێ نەخشەیەکی بۆ حەوزی مەخموور دارشت و رووبەرێکی زۆری لێ قرتاند، دابەش کردنەکەش بەم جۆرە بوو: بروانە خشتەی ژمارە (٤).

سەیری خشتەکە بکە رووبەری کەندێناوە کراوە بە ٧٤٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە. لە کاتێکدا پێش ئەم گۆڕانکارییە رووبەرەکەی دەشتی کەندێناوە بە تەنیا ١٢٨٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو، بەم پێیە ١٢٨٠ - ٧٤٠=٥٤٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەیی تەنیا لە ساڵی ١٩٧٤ لێ فرێدراوە، کە بەگوێرەی بڕیاری بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ حکومەت خۆی ئیمزای لەسەر کردبوو، ئەم دابڕانە بوو بە پەرتەوازە کردنی هەزاران کەس لە خەڵکی ناوچەکە و دەربەدەربوونیان.

لە ساڵی ١٩٧٩ رژێم بڕیاری فراوانکردنی سنووری ناحیەی سەرگەڕان (قودس)ی دەرکرد لەسەر حیسابی گوندەکانی دیکەی کەندێناوە، کە بە ناوچەی (چاڵە نەوتییەکان) دادەنرێن، بۆیە (٢٧) بیست و حەوت گوندی دەشتی کەندێناوە کە جاران سەر بە ناحیەی (دیبەگە) بوون بەسترانەوە بە ناحیەی (قودس)و لە پارێزگای هەولێر جیاکرانەوە، گوندەکانیش ئەمانەن:

گوندی (سێقوچان، خۆشاو، مەلحەوالی، حەسەن بەگ، دەربەند، پەرکانە، سارەلوو، دڕکەی گەورە، چەرت، تل هەلالە، گەڕاو، شەعەل، جاستان، سەربەشاخ، عەولافات، شەناغە، دڕکەی گچکە، قووچ، گێسمە، لهێبان، گەزوەشان، قەبری عەلی، هەمین مردی، سێبیران، مەلا وەیس، قەپران، دەرماناو).

لەگەڵ بەردەوامبوونی شۆڕشی کورد و ناسەقامگیربوونی نارامی و ئاسایش لە کوردستان بە گشتی و دەشتی دیبەگە بە تایبەتی و، هاوکات لە ئەنجامی شەڕی هەشت ساڵەی عێراق -ئێران، ئیتر حکومەت هەموو نەخشە و پیلانەکانی لە بەعەرەبکردن و راگوێزان و داپچڕاندنی دەشتی دیبەگە بە ئەنجام گەیاند و ژمارەیەکی زۆری لەو گوندانەی، کە مابوون بە ناحیەی (دیبەگە)شەوە، لە پارێزگای هەولێر ترازاند و هێنایە پاڵ قەزای (مەخموور)و تا سنووری بەرزاییەکانی (زووزگەزراو)ی گرتەوە. ئەمانەی خوارەوەش ناوی گوندەکانن:

گوندی: (چەڵتووک، دارەخورما، حاجی شێخان، مەلا کاغا، شێخەلاس، ناسر کوژرای، مەلا قەرە، چەغە میرە، ملیهۆرت، خدر جیجە، کەنداڵ، عەبدوللا گوجیلان، حەسەن بلباس، لاوەر، کەپەنەک رەش، بیرە بەرازە، کورتاندروو، سۆفی سمایل، کەندارە قەل، تەلەرخێم، گاوەرە).

لێرەدا بە پێی سەرژمێرەکان تێبینی ئەوە دەکرێ کە ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە ساڵ بە ساڵ بە هۆی راگوێزان و بە عەرەبکردن کەم دەبێتەوە، وا لە خوارەوە بەراوردێک لە نێوان هەردوو سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ و ساڵی ١٩٨٧ لە قەزای مەخموور و ناحیەکانی دەخەینە روو تەنیا بۆ بەراوردکردن: بروانە هەردوو خشتەی ژمارە(٥-٦)

سەرچاوە:

بەڕێوەبەرایەتی ئاماری دانیشتوانی پارێزگای هەولێر. لە بەراورد کردنی ژمارەکانی هەردوو سەرژمێرەکە تێبینی ئەوە دەکەین:

١- کۆی گشتی دانیشتوانی کەندێناوە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ (١٤٠٨١) کەس بوو، کەچی لە سەرژمێری ١٩٨٧ ژمارەکە کەم بۆوە گەیشتە (٣٢٧٣)کەس. هەروەها لە سەرژمێری ١٩٨٧ کەس لە گوندەکان نەماون، بۆیە لە خانەی دێ نشین کەس تۆمارنەکراوە.

٢- بەهەمان ئاراستە کۆی گشتی قەزای مەخموووریش کەم بۆتەوە لە (٥٧٣٦١) کەس لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ بۆ (٤٢١٨٧) کەس کە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٨٧، لێرەدا بۆمان بە دیار دەکەوێت خەڵکەکە رووی لە هەرێمی کوردستان کردووە، پتر لەوەی کە لە مەخموور نیشتەجێ بێ.

## دەرامەتی کانزاییەکان لە دەشتی دیبەگە:

دەشتی دیبەگە ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بە کانزاکان، بەتایبەتی (نەوت) لە گوندەکانی بناری زوورگەزراو، بە تایبەتی لە گوندەکانی: سەربەشاخ و پەرکانە و جاستان، کە تەنیا لە ئاقاری گوندی سەربەشاخ (٢٠) چاڵە نەوت هەیە و لە ژێر زوورگەزراویش (ئاڤانە) (١٨) چاڵی دیکە هەیە. سەرجەمی توێژینەوەی جیۆلۆجیستان و ئەندازیار و

**سەرژمێری سالی ١٩٧٧**

| شوێن | نێر | مێ | کۆی گشتی | شارنشین | دێنشین |
|---|---|---|---|---|---|
| سەنتەری مەخموور | ٥١٩٤ | ٥٤١٢ | ١٠٦٠٦ | ٥١٣٧ | ٥٤٦٩ |
| کەندێناوە | ٦٨٦٣ | ٧٢١٨ | ١٤٠٨١ | ٢٦١٩ | ١١٤٦ |
| قەراج | ٤٦٨٦ | ٥٠٢٦ | ٩٧١٢ | – | ٩٧١٢ |
| گوێر | ١١٠٦٨ | ١١٨٩٤ | ٢٦٦٢ | ٢٠٦٩ | ٢٠٨٩٣ |
| کۆی گشتی | ٢٧٨١١ | ٢٩٥٥٠ | ٥٧٣٦١ | ٩٨٢٥ | ٤٧٥٣ |

**خشتەی ژمارە (٥)**

**سەرژمێری سالی ١٩٨٧**

| شوێن | نێر | مێ | کۆی گشتی | شارنشین | دێنشین |
|---|---|---|---|---|---|
| سەنتەری مەخموور | ٦٨٧٣ | ٧٠٧٦ | ١٣٩٤٩ | ٩٥٢٨ | ٤٤٢١ |
| کەندێناوە | ١٦٣٣ | ١٦٤٠ | ٣٢٧٣ | ٣٢٧٣ | – |
| قەراج | ٣٧٧١ | ٣٩٨٧ | ٧٧٥٨ | ١٤٦٦ | ٦٢٩٢ |
| گوێر | ٨٣٤٧ | ٨٧٨٠ | ١٧١٢٧ | ٣١٠٢ | ١٤٠٢٥ |
| کۆی گشتی | ٢٠٦٢٤ | ٢١٤٨٣ | ٤٢١٨٧ | ١٧٣٦٩ | ٢٤٧٣٨ |

**خشتەی ژمارە (٦)**

پسپۆرانی نەوت گەیشتنە ئەو ئەنجامەی ژێر چیای قەرەچووغ دەریایەکە لە نەوت، لەوانەیە یەدەگی ئەم نەوتە هیچی لە (باباگوڕگوڕ) کەمتر نەبێت و بەرهەمی رۆژانەی هەر چاڵێک بە (٧٠٠٠) بەرمیل خەملێنراوە.

لە گوندی (شەناغە)ی نزیک پەلکانە و گوندی (داوود گورگە)ی نزیک سەرگەڕان. (٤٠) چاڵ نەوت هەیە، جگە لەمانەش لەم ساڵانەی دواییدا چەند بیرە نەوتێک لە ئاقاری گوندی (لهێبان) و (سێقوچان) دۆزراونەتەوە و زۆربەی ئەو بیرە نەوتانەش سەریان داپۆشراوە و هەر هەموشیان بە گوێرەی نەخشەی کۆمپانیای نەوتی کەرکووک بە بۆڕیگەلی (بای حەسەن) لە ئایندە دەبەسترێتەوە.

جگە لە نەوت، زۆر کانزای فلزی و نافلزیش لە دەشتی دیبەگە هەیە، کە بایەخێکی گرنگیان لە رووی ئابوورییەوە هەیە بۆ نموونە (مەرمەڕ)و گۆگرد لە چیای قەرەچووغ و گەچ لە زوورگەزراو جگە لە بوونی چەند کانیاوێکی دەرماناو، کە بۆ نەخۆشی پێست و خورشت بەکاردێن، وەک کانیاوی (دەرماناوە)و ئاوی بن بەردی.

هەرچەندە حاڵی حازر(**) ئەم ناوچەیە لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی کوردستاندا نییە و کورد لە سوود و خێری بێبەشە، بەڵام دەشتی دیبەگە ناوچەیەکی دانەبڕاوی دەشتی هەولێرە و بۆ ئایندەی ئابووری کوردستان زۆر سوودبەخشە. بۆ پتر شارەزا بوون لە کانزاکانی دەشتی دیبەگە، بڕوانە نەخشەی دابەشکردنی کانزا (فلزی و نافلزییەکان) لەسەر نەخشەی هەولێر لەم توێژینەوەیە.

### کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵ لە دەشتی دیبەگە:

دەشتی دیبەگە دەشتێکی زۆر بە پیت و بە هەرمێن و برشتە بۆ هەمەجۆر لە بەروبوومی کشتوکاڵی، ئەم هۆکارەش دەگەڕێتەوە بۆ لەباری خاک و رێژەی بارانی ساڵانە، کە دەگاتە نێوان (٣٥٠ - ٦٠٠) ملم. بەرهەمی سەرەکی ناوچەکە دانەوێڵەیە، بەتایبەتی (گەنم و جۆ).

برین و برشتی گەنم لە دەشتی دیبەگە ساڵانە لە زیاد بوون و کەم بووندایە، بە هۆی رێژەی باران بارین و جۆری خاکی کێڵراو و رووبەری تەرخانکراو، هەروا کەمی زانیاری جووتیاران لە بەکارهێنانی زەوی بە ئامێری تازە و

نەبوونی پەینی کیمیاوی و تۆی چاک، جگە لەو هەموو زوڵم و زۆردارییەی لێیان دەکرێ، کاردەکاتە سەر بەرهەمی ساڵانەی دانەوێڵە لە دەشتەکەدا.

جووتیارانی دەشتی دیبەگە تەبای گشت شوێنەکانی دیکەی کوردستان هەمەجۆر گەنم دەچێنن، وەک: (زەردکە، سپیکە، سێپەڕە، رزاو، یەخەدڕاو، قەندەهاری، بەهارە) جگە لە گەنمی (مەکسیباک) کە جۆرێکی بیانییە و دوای ساڵی ١٩٦٤ هێنراوەتە عێراق و لە ساڵی ١٩٦٧ دەست بە چاندنی کراوە و بەرهەمێکی باشی هەیە، لە نێو خەڵکدا بە گەنمە سۆرە بەناوبانگە و بە ماددەیەکی کیمیاوی دەرمان کراوە. تاکو کرم و زیندەوەرە زیانبەخشەکانی ژێر خاک کاری لێ نەکەن. رووبەری زەوی چاندراو بە جۆ لە دەشتی دیبەگە کەمترە لە گەنم، چونکە گەنم سەرچاوەی خۆراکی مرۆڤە بە پێچەوانەوە جۆ پتر بۆ خۆراکی ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت، بەرهەمی ساڵانەی جۆ لەم دەشتەدا زۆرە و چونکە جۆ بەرگەی کەم ئاوی و شۆرکاتی زەوی و بەرزی پلەی گەرمی دەگرێت، کەم ساڵ هەیە جووتیار لە چاندنی جۆ زەرەرمەند بێت.

کشتوکاڵی گوندەکانی دەشتی دیبەگە پشت بە ئاوی باران دەبەستن، ساڵانە رووبەرێکی زۆریان لێ دەچێنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شوێنی زەوییەکە بە کەڵکی کشتوکاڵ نایەت.

### زەوی ناوچەکە بە گوێرەی موڵکیەت دوو جۆرە:

١- زەوی موڵکدارەکان

٢- زەوی میری

رووبەری زەوی گوندەکانی دەشتی دیبەگە بە دۆنم دەردەخات، جگە لەوەی دەستنیشانی زەوییە میرییەکان و موڵکدارەکان دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو رووبەرە زەوییانە دەردەخات، کە لە هەندێ گوند بە کەڵکی کشتوکاڵ نایەت: بڕوانە خشتەی ژمارە (٧) کە بۆ یەکەم جار بڵاودەکرێتەوە.

جگە لە کشتوکاڵ دەشتی دیبەگە بە سامانی ئاژەڵ بەناوبانگە و هەموو جووتیارێک بۆ بژێوی ژیانی منداڵەکانی چەند مەڕ و بزنێک بەخێو دەکات، هەروا مانگا (چێڵ)یش بە ژمارەیەکی کەم بەخێو دەکرێ، جگە لە پەلەوەر، بەتایبەتی مریشک و عەلەشیش و قاز و مراوی، ئاژەڵی بارهەڵگریش، وەک: گوێدرێژ و ئەسپ بەخێو دەکرێن.

**پەراوێز:**

* ئەم توێژینەوە (٣) ساڵ بەر لە رووخانی رژێمی بەعس و سەدام نووسراوە، چونکە دوای (٢٠٠٣) ناحیەکە ئاوەدان بۆتەوە.

** مەبەستی بەر لە ئازادکردنی عێراقە.

**سەرچاوەکان:**

١- جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق -کتێبی سەنتەری برایەتی.

٢- أطلس الموارد الطبيعية لمحافظة أربيل -رسالة ماجستير للطالب هاشم ياسين حمدامين الحداد - جامعة صلاح الدين ٢٠٠٠.

٣- الاسس الطبيعية لجغرافية العراق -كوردن هستد -تعريب: جاسم محمد الخلف -الطبعة الاولى - مطبعة الغربية، بغداد ١٩٤٨.

٤- العراق الشمالي - د. شاكر خصباك - مطبعة شفيق - بغداد ١٩٧٣.

٥- أسماء المدن والمواقع العراقية - المحامي جمال بابان.

٦- زۆر سوپاسی بەڕێوەبەری سەرژمێریی لە پارێزگای هەولێر بەڕێز فوئاد سەعید دەکەم کە چەند زانیارییەکی گرنگی دەشتی دیبەگەی پێدام.

٧- زۆر سوپاسی بەڕێز رەوا بلباس لە گۆڤاری قەرەچووغ دەکەم، کە لیستی ناوی گوندەکان و رووبەری زەوییەکانی دەشتەکەی پێدام.

٨- سوپاس بۆ حاجی مەولودی بایز، کە خەڵکی گوندی دەرماناوەی بناری چیای قەرەچووغە و تەمەنی ئێستاکە ١١٥ ساڵە و لەدایکبووی ساڵی ١٨٨٥، کە زۆر زانیاری سوودبەخشی بۆ گێرامەوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٦)، بەهاری (٢٠٠٠) بڵاوبۆتەوە.**

**خشتەی ژمارە(٧)**

خشتەی یەکەی بەڕێوەبردن لە دەشتی دیبەگە و رووبەری زەوی موڵکداران و میری بە دۆنم

| ز | ناوی کەرت | سەرجەم رووبەر بەدۆنم | زەوی موڵکدارەکان | زەوی میری | شایانی چاندن نییە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دیبەگەی حەسەن ئاغا | ٣٤١٨ | ٣٣٥٨ | - | ٦٠ |
| ٢ | دیبەگەی سلێمان ئاغا | ٨٦٨٢ | ٦٦٣٨ | ١٨٤٤ | - |
| ٣ | هەوێرەی ژوورور | ١٥٩١ | ١٥٣١ | - | ٦٠ |
| ٤ | چل هەوێزە | ٤٥٨١ | ٤٠٢٢ | ٣٧٩ | ١٨٠ |
| ٥ | خورمەلە | ١١٢٠٢ | ١٦٦٠ | ٧٠٠٠ | ٥٤٢ |
| ٦ | کۆزەپانکە | ٧٩٧٨ | ٤٨٠٧ | ٢٩٧١ | ٢٠٠ |
| ٧ | گردی گۆم | ٢٨٤٨ | ١٣٦٨ | ١٤٨٠ | - |
| ٨ | خەزنە | ٢٢١٠ | ١١٤٠ | ١٠٧٠ | - |
| ٩ | شۆڕیجە | ٩٤٨٠ | ٤١١٠ | ٥٣٧٠ | - |
| ١٠ | حەساڕۆك | ١٩٩٥ | ١٧١٥ | ٢٨٠ | - |
| ١١ | یەدی قوو | ٦٦٦١ | ١٠٨١ | ٥٥٤٢ | ٣٨ |
| ١٢ | بەرزە هەولر | ٦٥٧٥ | ٢٣٨٠ | ٣٨٦٧ | ٣٢٨ |
| ١٣ | سمایلاوەی خوارور | ٢٨٨٥ | ٢٢٨٥ | - | ٦٠٠ |
| ١٤ | سمایلاوەی ژوورور | ٢٤٩٤ | ٢٠٢٦ | - | ٤٦٨ |
| ١٥ | سەید عوبێد | ٦٠٧٢ | ٢٠٠٠ | ٣٩٣١ | ١٤١ |
| ١٦ | شۆڕە زەرتکە | ٩٥٧١ | ٢٠٠٠ | ٧٠٥٦ | ٥١٥ |
| ١٧ | ملی هۆرت | ٤٠٣٦ | ٤٠٢٦ | - | ١٠ |
| ١٨ | ملی هۆرت قەرەنی | ٣٤٤٠ | ٣٢٨٦ | - | ١٥٤ |
| ١٩ | کورتاندروو | ٤٥٧٥ | ٣١٣٠ | ١٦٣ | ١٢٤٢ |
| ٢٠ | ناسر کوژراو | ١٠٣٥ | ٨١٤ | - | ٢٢١ |
| ٢١ | بیرە بەرازە | ٣٧٠١ | - | ١٥٩٠ | ٢١١١ |
| ٢٢ | مەلا قەرە حەسەن بەگ | ٣١٠٩٤ | ٦٠٠ | ٢٢٨٧١ | ٧٦٢٣ |
| ٢٣ | مەلا کاغا | ٦٦٤١ | ١٠٦٨ | ٥٥٧٣ | - |
| ٢٤ | گردەشینە | ٦٦٤٦ | ١٩٠٢ | ٣٩٣٢ | ٨١٢ |
| ٢٥ | دووشیوان | ٣٠٢٢ | ٢٧٩٠ | ١٦٠ | ٧٢ |
| ٢٦ | گاوەر | ٤٠٢٠ | ٢٤٤٩ | ١٥٠ | ١٤٢١ |
| ٢٧ | خدرجیجە | ٧٢٥٧ | ١٩٨٨ | ٥٢٦٩ | - |
| ٢٨ | چیفلۆك | ٢٨٥٩ | ٢٠٠٠ | ٨٥٩ | - |
| ٢٩ | کەنداڵ یارمجە | ٥٦٨٤ | ٥٠١٤ | ٣٣٨ | ٣٣٢ |
| ٣٠ | دێمەکار | ٥٩٨٧ | ٣٤٦٩ | ٢٥١٨ | - |
| ٣١ | سۆفی سمایل | ٢٥٤٢ | ٢٤٠٢ | - | ١٤٠ |
| ٣٢ | کاریتانی خوارور | ٤٢١٥ | ٤١٨٩ | ٢٦ | - |
| ٣٣ | کاریتانی ژوورور | ١٢٩٧ | ١٢٢١ | ٧٦ | - |
| ٣٤ | جانە | ٦٣٧٥ | ٧٥ | ٤٠٠٠ | ٣٠٠ |
| ٣٥ | تیکاڵۆ | ٤٣٥٧ | ٤٣٥٧ | - | - |
| ٣٦ | بیرەبات | ٤١٦٤ | ٤١٦٤ | - | - |
| ٣٧ | چەڵتووك | ٥٨٨٩ | ١٣٤٧ | ٤٤١٢ | ١٥٠ |
| ٣٨ | عەبدوڵڵا گوجیلان | ٧٤٠٤ | ٥١٥ | ٦٣٥٩ | ٥٣٠ |
| ٣٩ | کەندارە قەل | ٣٦٨٦ | ١٩١٦ | ١٦٧٥ | ٩٥ |
| ٤٠ | چەغەمیرە | ٧٦٠٠ | ٣٠٠ | ٧١٥٣ | ١٤٧٠ |
| ٤١ | دارە خورما | ٩٢٦٩ | ٧٢٥ | ٤٩٦٨ | ٣٥٧٦ |
| ٤٢ | حەسەن بلباس | ٥٣٩٤ | ١٥٥٥ | ٣٨٣٩ | - |
| ٤٣ | حاجی شێخان | ٣٢٨٧ | ٣٠٠ | ٢٩٨٧ | - |
| ٤٤ | لاوەر | ٣٠٤٩ | ٢٥٦٧ | - | ٤٨٢ |



# کانی و کانیاوەکانی "چیای قەرەچوخ"ی

هوشیار عەبدوڵڵا

چیای قەرەچوخ تاکە چیایە لە دەشتی هەولێر هەڵکەوتووە، "دەشتی قەراج" لە دەشتی کەندێناوە جودا دەکاتە واتە کەوتۆتە نێوان ئەو "٢" دوو دەشتە، ئەو زنجیرە چیایە درێژ دەبێتەوە لە کلکە زوورگی "قەرەبۆتک قەرە بۆتکان" و کلکەی دارە بزماران لە رۆژهەڵاتەوە تا دەگاتە کلکەی "بێجیان"ی لەنزیک گوندی "زمارەی مەرزان" لە رۆژاوادا نزم دەبێتەوە و دوایی دێت و دەبێتە دەشت، درێژییەکەی "٢٢"کم بەرزاییەکەی "٧٩٨" مەترە، بە دووری "٦٧"کم لە خوارووی رۆژ ئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، ئەو چیایە هیشک و دیمە کارو کەم داروبارە، بەفریشی کەم لێ دەباری، لەبەر ئەوە ئەو دەشتە ئاو و کانی و کانیاوی کەمە جگە لە چەند کانییەک نەبێت ئەوانیش بە پێچەوانەی دەشتی دەژمێردرێت و ئاویان کەمە، ئەمانەی خوارەوەش هەندەک لە ناوی کانی و کانیاوەکانیەتی.

**ناوی کانیاوەکان**

١- ئاوی سەیدەمین، ناوی کانییەکە لە بن چیای قەرەچوغی لە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی مەخمور دەردەبوو، ئاوێکی شیرینی هەبوو، جاران شینایی لەبەر دەکرا.

٢- کانیە بە روونە، ناوی کانیاوێکە لە بن شاخەکییە لە چیای قەرەچوغی لە رۆژهەڵاتی شارۆچکەی مەخموری هەڵکەوتووە، کاتی خۆی شوانکارە و مەڕدارەکان لە دەوروبەری ئەو کانییەی رەشماڵیان هەڵدەدا.

٣- ئاوی ترشاوکێ: ناوی کانییەکە لە "گەلی پارانیان"ی چیای قەرەچوغی هەڵدەقولێت، لەگەلییەکەوە دێ، جۆگەلەیە، ئاوێکی کانزاییە، تامێکی ترشی ناخۆشی هەیە، کەفی دەکا تەنانەت ئاژەڵیش نایخواتەوە، دەڵێن بۆ ئەوکەسانە باشە تووشی نەخۆشی پێست بوونە.

٤- ئاوی دەرماناوی "ئاوی شێخی چۆلی"، "ئاوی ئاشان"یشیان پێدەگوت، لە زەمانی بەرێ "٣" سێ ئاشی ئاوایی لەبەریدا گەڕا، سەردەمەک ئاش وەستاکەی ناوی "شەمسەدین" بوو کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو "حاجی مامەند شەمسەدین"، ئەو سەرکار بوو سەرپەرشتی دەکرد، ٣-٤ ماڵ لەوێ بوون، هەموویان لەسەر ئاشەکان کاریان دەکرد، "ئاوی جۆتە ئاشان" یشیان پێدەگوت، ئەو ئاوێکی زۆر بوو، کانییەکە لەبناری چیای قەرەچوغی دەردەبوو، ئاوەکە دەهاتە خوارێ دەهاتەوە ناو گوندی "قەسران" لەوێ شیناوی لە بەر دەکراو دار و باردەکانیان پێ ئاو دەدا، سەرەڕای ئەوەی ئەو ئاشانەی پێدەگەڕا "٤" چار قەد برنجی لەبەر دەکرا.

٥- ئاوی بن بەردی ناو کانیاوێکە، ئاوەکەی لەبن بەردێکەوە لە بناری چیای قەرەچوغی هەڵدەقولێت و دێتە دەرەوە، بۆیە ئەو کانیاوە بە ئاوی بن بەردی نانراوە و ناسراوە.

٦- ئاوی شەحادەی ئەمەش ناوی کانیاوێکە بە ناوی کابرایەک ناسراوە کە ناوی "ئەحمەد شەحادە" بووە.

٧- کانی تاریکە.

٨- کانی کۆتکە.
٩- کانی دێواری.
١٠- کانی چکە.
١١- کانی وەکازەی.
١٢- کانی مامزان.

١٣- کانی عارەب کوژرای: ناوی کانیاوێکە لە بناری کلکەی رۆژئاوای چیای قەرەچوغی هەڵکەوتووە، سەروچاوەکەی لەناو ئاقاری گوندی میلی هۆرتدایە، بە جۆگەلەیەکدا دێتە خوارەوە بەرەو ئاقاری گوندی تەلەرخێمی گەورە، ئەو کانییە ئاوەکەی کانزاییە، بۆن و تامێکی ناخۆشی هەیە، بە کەڵک خواردنەوە نایەت، کەم ساڵ هەیە ئاوەکەی هیشک بووبێت، هەردەم ئاوی لەبەر دەڕوات، سوودێکی زۆری هەیە بۆ شوانکارەو مەڕدارانی دەڤەرەکە، مێگەلەکانیان لێ ئاو دەدەن، هەروەها بەکاردێت بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی خورشت و پێست بوونە، قوڕ و لیتەکەی لە لەشی خۆیان هەڵدەسوون.

١٤- کانی غەزەران

کانی غەزەران یان خەزەران یەکێکە لەو کانیاوانەی کە دەکەوێتە چیای قەرەچوغی بەدیوی "دەشتی قەراج"ێ هەڵکەوتووە، لە کەرخی گوندی "قەراتە سۆرانی مەرزان" دایە، سەر بە ئاقاری ئەو گوندەیە، ئەو کانییە کەوتۆتە ناو ئەشکەوتێکی گەورەوە، شێوەی کانییەکە بازنەییە، بستێک قوڵ دەبێت، ئاوەکەی لەبن شاخەکەوە هەڵدەقوڵێ، جگە لەوەش تک تک ئاوەکە لە بنمیچی سەرەوەی ئەشکەوتەکە و لا دیوارەکانی ناوەوەی لە گیا خەزەرەکان دێتە خوارەوە، چونکە بنمیچی سەرەوە و لا دیوارەکانی ئەشکەوتەکە بەو گیا "خەزەرە- غەزەرە" داپۆشراوە، ئەو گیایەش جۆرە گیایەکی خۆڕسکی هەمیشە سەوزە، لە شێوەی تەڕە توولەیەکی ناسک دایە، ساڵ دوازدەی مانگێ کەسکە، گیایەکی زۆر جوانە، ئەو جۆرە گیایەم لە کانی دڵۆپەی سەرەوەی گوندی کەسنەزان و





گوندی گوڵەک بن چیای هەریرم دیوە، ئەو گیایە گەلەک جاران خەڵکی دەیکەن و دەیبەنەوە لەبەر رۆژێ هیشکی دەکەنەوە و پاشان دەیکوتن و دەیکوڵێنن، دەدرێت بەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی گورچیلە بوونە یا ئەوەتە بە تەڕی دەیکوڵێنن ئاوەکەی دەخۆنەوە، ئەو کانییە ئاوێکی سارد و شیرین و سازگاری هەیە، جاران خەڵکی گوندی "قەراتە سۆرانی مەرزان" چەند کیلۆمەترێکیان دەبڕی، بەرمیلیان لە کەران بار دەکرد دەچوونە سەر ئەو کانییەی و ئەو ئاوە شیرین و سازگارەیان دەینا بۆ خواردنەوە و چا و شیو لێنان بەکاریان دەهێنا، چونکە ئاوی ئەو گوندە و ئاوی زۆربەی هەرە زۆری گوندەکانی دەشتی قەراجێ تاڵ و سوور بووە، گەلەک جاران دیومە ئافرەت لەو کانییەدا چەند بەرمیلێکی لە گوێدرێژان بار کردووە و خۆشی کوندەی ئاوێی لە پشتی خۆی هەڵداوە و لە چیاکە هاتۆتە خوارەوە، ئەوجا لە بناری شاخەکەدا کوندەکەی لەسەر پشتی گوێدرێژەکەدا قایم کردووە، گەلەک جاران ژنان دوو دوو سێ سێ رێککەوتوونە و بۆ کۆر کردنێ چوونەتە سەر ئەو کانییەی، لەم بارەیەوە یەکێک لە ژنانی دەڤەرەکە بۆی گێڕامەوە کە ٥٠ ساڵێک لەمەوبەر کە چۆن لەپێش مەلا بانگدانی بەیانییان لەگەڵ تاقە ژنێکی دیکەی گوندەکەدا کەوتوونەتە رێ بۆ کانی غەزەران، لەوێ کۆریان دامەزراندووە، ئاخر بەو شەوەی بەبێ پیاو چۆن نەترساون لە دەعبایەک، پیاو خراپێک؟! ژنەکە لە درێژەی قسەکانیدا دەیگوت: نان و ماست و چامان لەگەڵ خۆمان دەبرد، لەوێ خۆمان دەشووشت و جلوبەرگمان لێ دەشووشت، ئیسراحەتێکمان دەکرد، ئەوجا هێدی هێدی شۆڕ دەبووینەوە و دەگەڕاینەوە گوندی، لە حەیران و بەیت و باڵۆرە و ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری دەڤەرەکەدا زۆر ناوی ئەو کانییەی هاتووە وەک لەم بەیتەی خوارەوەدا هاتووە:

**دەچمە کانییَ غەزەران لەمن بە چک چکەیە**
**کێندەر غەزەلی لێیە؟ کانییَ بیرە فتیلەیە**

# جوگرافیای کۆیە

هیوا سادق سەلیم

قەزای کۆیە یان (کویسنجق)(*) یەکێکە لە قەزا کۆنەکانی سەر بە لیوای (پارێزگا)ی هەولێر و کەوتۆتە بەشی باشووری رۆژهەڵاتییەوە (بڕوانە خشتەی ژمارە -١-).

زنجیرە شاخەکانی (هەیبەت سوڵتان) لە بەشی رۆژهەڵاتییەوە وەک سنوورێکی سروشتی ئەم قەزایە لە پارێزگای سلێمانی جیا دەکاتەوە، زێی بچووکیش سنووری باشووری لەگەڵ پارێزگای کەرکووک و بەشێک لە پارێزگای سلێمانی پێکدێنێت، بەم جۆرە (ناوچەی لێکۆڵینەوە) ناوەراستی هەرێمی کوردستانی عێراق داگیر دەکات، وەک لە (خشتەی ژمارە -٢-) بەرچاو دەکەوێت.

لە رووی پێگەی ئەسترۆنۆمییەوە قەزای کۆیە دەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی (٤٩ و ٣٥و ١٦ و ٣٦) ی باکوور و هەردوو هێڵی درێژی (١٥ و ٤٤ و ٥٧ و ٤٤)ی رۆژهەڵات.

لە رووی کارگێڕیشەوە ئەم قەزایە لەگەڵ (١٠) یەکەی کارگێڕی جیاوازدا هاوسنوورە، وەک لە (خشتەی ژمارە -٣-)دا دەردەکەوێت، کە هەندێکیان سەر بە پارێزگای هەولێر و هەندێکیشیان سەر بە پارێزگای (سلێمانی و کەرکووک)ن. هەریەک لە ناحیەکانی (هێران و سەلاحەدین)ی سەر بە قەزای شەقڵاوە لە بەشی باکووریدا و ناحیەکانی (خەلەکان)ی سەر بە قەزای دوکان و چوارقورنە و بێتواتە سەر بە قەزای رانیە لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتیدا هەڵکەوتوون، لە بەشی باشووریشدا لەگەڵ ناحیەی (ئاغجەلەر)ی سەر بە قەزای چەمچەماڵ و ناحیەی (شوان)ی سەر بە پارێزگای کەرکووک، و لە رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوایشدا لەگەڵ ناحیەکانی (کەسنەزان و دارەتوو و قوشتەپە)ی سەر بە قەزای دەشتی هەولێر هاوسنوورە.

سەبارەت بە رووبەرەکەشی ئەم قەزایە لە پێشدا پانتاییەکی فراوانی هەبووە، بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەوسا هەر یەک لە رانیە و شەقڵاوە دوو ناحیەی سەر بە قەزای کۆیە بوون[1]، بەڵام دوای ئەوەی لە کۆیە دەسێندرێنەوە، رووبەرەکەی بچووک دەبێتەوە. لە ماوەی نێوان ساڵانی ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا رووبەری قەزاکە لەباری گەورەبوون و بچووکبوونەوە هەڵکشان و داکشانێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە (بڕوانە خشتەی ژمارە -١-) بە جۆرێک قەزای ناوبراو لە ساڵانی (١٩٥٧ و ١٩٦٥) نزیکەی (١٣٪)ی کۆی رووبەری پارێزگای هەولێری پێکهێناوە و لە رووی قەبارەی رووبەرەوە لە دوای هەر یەک لە (رەواندز و مەخموور و قەزای سەنتەری هەولێر) هاتووە و ریزبەندی چوارەمی وەرگرتووە، بەڵام لە ساڵی (١٩٧٧) رووبەرەکەی فراوان بووە و زیاتر لە (١٤٪)ی کۆی رووبەری پارێزگای پێکهێناوە، واتە بە رێژەی (١,٦٪) بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٦٥ زیادی کردووە. کەچی وەک

**(خشتەی ژمارە (١)**

**ڕووبەری یەکە کارگێڕییەکان (قەزاکانی پارێزگای هەولێر)**

**١٩٥٧ – ٢٠٠٢**

| یەکە کارگێڕییەکان | ١٩٥٧ (١) | | ١٩٦٥ (٢) | | ١٩٧٧ (٣) | | ١٩٨٧ (٤) | | ٢٠٠٢ (٥) | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر | ٪ | ڕووبەر (*) | ٪ | ڕووبەر () | ٪ |
| قەزای هەولێر | ٣٠٢٦ | ١٩,٣ | ٢٩٥٥ | ١٩,٣ | ٢٧٠٦ | ١٨,٦ | ٧١٦٢ | ٤٩,٥ | ٧٦١ | ٤,٩ |
| قەزای مەخمور | ٣٥١١ | ٢٢,٤ | ٣٤٢٨ | ٢٢,٤ | ٢٧٨٣ | ١٩,٢ | ٢٧٥٩ | ١٩,١ | ٢٧٨٣ | ١٨ |
| قەزای شەقلاوە | ١٧١٣ | ١٠,٩ | ١٦٧٤ | ١٠,٩ | ١٨٣٤ | ١٢,٦ | ١٧٨٧ | ١٢,٣ | ١٨٣٤ | ١١,٩ |
| قەزای کۆیە | ١٩٨٤ | ١٢,٦ | ١٩٣٧ | ١٢,٦ | ٢٠٦٤ | ١٤,٢ | کراونەتەوە بە ناحیە | | ٢٠٥٢ | ١٣,٤ |
| قەزای ڕواندز | ٣٧٢٩ | ٢٣,٨ | ٣٦٤١ | ٢٣,٨ | ٢٨٥٢ | ١٩,٧ | | | | - |
| قەزای زێبار | ١٧٢٠ | ١١ | ١٦٨٠ | ١١ | ١٣٥٣ | ٩,٣ | | | | - |
| قەزای چۆمان | | - | - | | ٨٧٩ | ٦,٤ | ڕاگوێزراوە | | ٨٧٩ | ٥,٧ |
| قەزای صدیق (سۆران) | - | - | - | | | - | ٢٧٦٣ | ١٩,١ | ٢٨٥٢ | ١٨,٥ |
| قەزای دەشتی هەولێر (***) | | | | - | - | | - | | ٢٢٨٠ | ١٤,٨ |
| قەزای مێرگەسۆر | - | | | | - | | - | | ١٩٦٧ | ١٢,٨ |
| کۆی پارێزگا | ١٩٦٨٣ | ١٠٠ | ١٥٣١٥ | ١٠٠ | ١٤٤٧١ | ١٠٠ | ١٤٤٧١ | ١٠٠ | ١٥٤٠٨ | ١٠٠ |

**سەرچاوە:**

١- وزارة الداخلية: مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي موصل واربيل، مطبعة الارشاد، بغداد، الجدول الثاني، ص٢٠٢.

٢- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، ١٩٧٣، جدول رقم (٢)، ص٣٢.

٣- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية، ١٩٨٢، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، جدول رقم (٥/١)، ص ٣٢- ٣٣.

٤- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، المجموعة الاحصائية السنوية، ١٩٨٧، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، جدول رقم (٥/١)، ص٢٨.

٥- نادية طلعت سعيد، طرق السيارات في محافظة اربيل، دراسة في جغرافية النقل، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاحدين، اربيل، ٢٠٠٣، ص١٠.

(*) لە ساڵی ١٩٨٧ قەزای کۆیە دەکرێتە ناحیە و دەخرێتە سەر سەنتەری قەزای هەولێر ڕووبەری ئەوکاتە (١٩٩٤)کم بووە کە (١٣.٧٪)ی کۆی ڕووبەری پارێزگای پێکهێناوە.

(**) ڕووبەری قەزاکە بە پشت بەستن بە ڕووبەری کەرتەکان دەرهێندراوە.

(***) بە پێی فەرمانێکی وزاری سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران ژمارە ٣٧٢ لە ٢٠٠٢/٤/٢٠ بڕیار بە دامەزراندنی ئەم قەزایە دراوە بڕوانە: (پارێزگای هەولێر، بەڕێوەبەرایەتی خۆیەتی، ژمارە ٢١٢٠، ٢٠٠٢/٥/١٢) فەرمانی کارگێڕی.

پێشتر هەر لە ریزبەندی چواردەم ماوەتەوە، لە ساڵی (١٩٨٧)یشدا دوای ئەوەی دەکرێت بە ناحیە و دەخرێتە سەر قەزای سەنتەری هەولێر رووبەرەکەی بە بەراورد لەگەڵ ساڵی (١٩٧٧) بە رێژەی (٣,٠٪) کەم دەکات و لە رووی ریزبەندی رووبەریشەوە دەچێتە پلەی پێنجەم و لە ساڵی (٢٠٠٢)شدا لە ئەنجامی ئەم گۆڕانە کارگێرییانەی لەم ماوەیەدا بەسەر پارێزگای هەولێردا هاتووە، کە لە میانەیدا ژمارەی قەزاکانی بووە بە (٨) قەزا و رووبەری پارێزگاش بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٨٧ بە نزیکەی (٩٣٧) کم ٢ فراوان بووە، قەزای کۆیەش زیاتر لە (١٣٪)ی کۆی رووبەری پارێزگاکەی لەم ساڵەدا پێکهێناوە، بەم جۆرە لە رووی قەبارەی رووبەرەوە دوابەدوای هەر یەک لە قەزاکانی (سۆران و مەخموور و دەشتی هەولێر) هاتووە.

سەبارەت بە رووبەری یەکە کارگێرییەکانی کەوتوونەتە نێو سنووری قەزای کۆیەش لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە (١٩٥٧-٢٠٠٢) گۆڕانی گەورە بەسەر رووبەرەکانیاندا هاتووە، ئەویش لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە کارگێرییانەوە هاتووە، کە قەزاکە لەم ماوەیەدا بەخۆوەی بینیوە، وەک لە خشتەی ژمارە (٢) و پاشکۆی ژمارە (١)دا دەردەکەوێت. بە جۆرێک قەزای کۆیە لە ساڵانی (١٩٥٧- ١٩٦٥) تەنها لە دوو یەکەی کارگێڕی پێکهاتووە، کە ئەوانیش ناحیەکانی (سەنتەر و تەق تەق) بوون، کە یەک بە دوای یەک (٥٣٪ و ٤٧٪)ی رووبەری قەزاکەیان پێکهێناوە، کەچی لە ساڵی ١٩٧٧ ژمارەی یەکەکانی دەبێتە سێ یەکە ئەوانیش بریتی بوون لە ناحیەکانی (سەنتەر و تەق تەق و شۆڕش) کە یەک بە دوای یەک (٢٧٪ و ٣٥,٥٪ و ٣٧,٥٪)ی رووبەرەکەیان پێکهێناوە..

لە ساڵی (١٩٨٧)یش بە هۆی کردنەوەی هەردوو ناحیەی (تەق تەق و شۆڕش) بە گوند ناحیەی سەنتەر (١٠٠٪) کۆی رووبەری قەزاکەی پێکهێناوە(**).

بەڵام دوابەدوای گێڕانەوەی ئەو یەکە کارگێڕییانەی، کە لەسەردەمی دەسەڵاتی ناوەند بڕیاری رەتکردنەوەیان درابوو، بە پێی بڕیارێکی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان (پەرلەمان)(***) کە لە ساڵی ١٩٩٢ دەرچووە، کۆیە لە ناحیەوە دەکرێتەوە قەزا و هەر یەک

**خشتەی ژمارە (٢)**

**یەکە کارگێرییەکانی قەزای کۆیە لە نێوان ساڵانی**

**(١٩٥٧-٢٠٠٢)**

| ساڵ | یەکە کارگێڕییەکان |
|---|---|
| ١٩٥٧ | ناحیەی سەنتەر – ناحیەی تەق تەق |
| ١٩٦٥ | ناحیەی سەنتەر - ناحیەی تەق تەق |
| ١٩٧٧ | ناحیەی سەنتەر – ناحیەی تەق تەق – ناحیەی شۆڕش |
| ١٩٨٧ | ناحیەی سەنتەر |
| ٢٠٠٢ | ناحیەی سەنتەر ناحیەی تەق تەق – ناحیەی شۆڕش – ناحیەی ئاشتی |

**سەرچاوە:**

أ- نتائج التعدادات السكانية لسنوات (١٩٥٧، ١٩٦٥، ١٩٧٧، ١٩٨٧).

ب – مديرية احصاء السليمانية، خلاصة النتائج الاحصاء عن عدد السكان حسب الوحدات الادارية في محافظة اربيل قضاء كويسنجق ٢٠٠٢، مطبوعة بالكومبيوتر (غير منشورة).

لە (تەق تەق و شـــــــۆڕش)یش دەکرێنەوە بە دوو یەکەی کارگێڕی[٢]، و لـــــە رێـــــكـــــەوتـــــی (١٩٩٨/١٢/١٢)یش بـە پێـی فـەرمـانێکی وەزاری، کـە لەلایەن حکومـەتی هەرێمی کـوردسـتـان (سلێـمـانی) دەرچووە بڕیار بە دامەزراندنی یەکەیەکی کارگێڕی تازە دراوە بە نێوی (ناحیەی ئاشتی)[٣]. بەم جۆرە ژمارەی یەکەکانی قەزاکە لە ساڵی (٢٠٠٢) دەبێتە چوار یەکە، ئەوانیش بریتین لە ناحیـەکـانی (سـەنتـەر و تەق تەق و شـۆڕش و ئاشـتـی) کـە یەک بە دوای یەک(٢٦.٤٪ و ٢٧.٢٪ و ٣٧٪ و ٩.٤)ی کـۆی رووبەری قـەزاکـە پێکدێن. ئەوەی جێگای تێبینییە ئەوەیە، کـە ناحیـەی سـەنتـەر لە ساڵانی(١٩٥٧ و ١٩٦٥ و ١٩٨٧) زۆرترین رووبەری قـەزاکـەی پێکهـێناوە، کـەچی لە سـاڵانی (١٩٧٧ و ٢٠٠٢) ناحیـەی شۆڕش زۆرتـرین رووبەری قـەزاکـە پێکدەهێنێت.

ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ئەنجـامی هەڵکەوتەی پێگە جوگرافییەکەی و فراوانی رووبەرەکەی هەردوو ناوچەی شاخاوی و زوورگان بە خۆوە دەگرێت. ئەمەش بۆتە هۆی دەرکەوتنی بەرزی و نزمی جـۆربەجـۆر لەسـەر رووی زەوییەکەی، بە جۆرێک لە بەشەکانی باکـوور و باکـووری رۆژهەڵاتیـدا مـۆرکی شـاخـاوی و لە بەشـەکـانی تریشـدا مـۆرکی زوورگـان بەسـەر رووەکـــەی زاڵ دەبێـت، ئـەم

جیاوازییەش لە تۆپۆگرافیای ناوچەکە کاریگەری لەسەر جیاوازی بارودۆخی ئاو و هەوا و جۆری خاک و رووەکی سروشـتی و سـەرچاوەکـانی ئاو جێهێشتووە. کە ئەمانەش هەمووی بەیەکەوە ئاوێتەی یەکتری دەبن و بە شـێـوەیەکی کـارا لە پاڵ هۆکـارە مرۆییەکان کاریگەری زۆریان لەسەر شێوازی دابەشبوونی دانیشـتوان و جیـاوازی چڕییـان لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تری قەزاکە دەبێت.

**رەهەندی مێژوویی**

دوابەدوای جـەنگی چاڵدێران لە سـالی ١٥١٤ بـە پێـی ئـەو رێککەوتنەی لە نێـوان دەوڵەتی عوسمانی و میرنشینە کوردییەکان بەسترا ناوچەی کۆیەش وەک تەواوی بەشەکانی تری باشووری کوردستان کـەوتە ژێر قـەڵەمـڕەوی دەوڵەتی عوسمانی، لەم رۆژگارەدا هەر یەک لە مـیرنشـینەکـانی (بابان، سۆران، ئەردەڵان) لە کـایە دابوون و دەوڵەتی عوسمانیش بە پێی رێککەوتنەکە تا رادەیەک دانی بە سـەربەخـۆییـان دانابوو، ئەم مـیرنشـینانە هەندێک جار هەوڵیـان دەدا پەراوێزی سنووری دەسەڵاتیان فراوان بکەن و ناوچەی کـۆیەش بخـەنە ژێر قـەڵەمـڕەوی خـۆیانەوە، لەو کـاتـەش کـە ئەردەڵانییەکان دەسەڵاتیان گەیشتە ناوچەکـە، (کـۆیە) و دەوروبەری فـیـوداڵێکی سـەربەخـۆ بووە و شـان بەشانی هەریەک لە (هەریر و رەواندز و ئاکـرێ) و هەریەکـەشـیـان

دەوڵەتۆکەیەکی بەهێزبوون و قوللە و قەڵای تایبەت بە خۆیان هەبوو[٤]، دواتریش ناوچەکە مـیرنشینێکی سەربەخۆی تێدا دامەزراوە بە ناوی مـیـرنشـینی (کـۆ) و تا سـالی (١٧٣٠) بە سەربەخۆیی ماوەتەوە. تا ئەو کاتەی (خالید پاشای بابان) دەستی بەسەر داگـرت و کـردی بە بەشـێک لە سنووری مـیـرنشـینی بابان[٥]. لەو سـەردەمـەش کـە (عوسمان پاشا) میری ناوچەکە بوو (١٧٥١) کـۆیە باشـالقـێک (متصرفیە)بووە سەربە بەغداد بووە و هەر یەک لە (هەولێر) و (ئاڵتوون کۆپری)ش سەر بە باشالقی کۆیە بوون.

لە سـالی (١٨٤٣ تا ١٩١٨) ناوچەی کۆیە راستەوخۆ لەلایەن عوسمانییەکانەوە بەڕێوەبراوە. لە سـالی (١٨٧٩)ش دوای ئەوەی مـوسڵ وەک ویلایەتێکی نوێ لە عـێراق دەستنیشـان کـرا هەردوو ناوچەی کەرکووک و سلێمانی خرانە سـەر ئەم ویلایەتە تازەیەوە و قەزاکانی (کۆیە و هەولێر و رواندز و کفری)یش خرانە سەر کەرکووک[٦]. لە فەرهەنگی ئیعلامدا کە لە سالی (١٨٨٩)دا بلاوکـراوەتەوە هاتووە ویلایەتی موسڵ لە سێ سنجەق پێک هاتووە: (مـوسڵ، شـارەزوور، سلێمانی) لەو کاتەدا هەریەک لە قەزاکانی (کۆیە، کەرکوک، رواندز، هەولێر، سەلاحیە، رانیە) سەربە ویلایەتی شارەزوور بوون، هەر لەم فەرهەنگەدا هاتووە سەنتەری قەزاکە

شاری (کۆیە)یە و ژمارەی دانیشتوانیشی نزیکەی (١٠٠٠٠) کەس بووە، لەگەڵ ناحیەی شەقلاوە، کە ئەو سەردەمە ناحیەیەک بووە سەربە قەزای کۆیە (٢٥٢) گوندیان لە خۆ گرتووە و ژمارەی دانیشتوانیشیان (١٨٠٠٠) هەزار کەس بووە[٧]. هەروەها لە ساڵی (١٨٩٤) لە ساڵنامەدا (کە چاپکراوێک بووە لەلایەن ویلایەتەکانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی) دەرچووە هاتووە: قەزای کۆیە سەر بە کەرکووک بووە و کەرکوکیش سەر بە ویلایەتی موسڵ بووە[٨]. لە کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانیشدا هەر یەک لە قەزاکانی (کۆیە و کەرکووک و رانیە و کفری و هەولێر و رەواندز) سەر بە ویلایەتی شارەزوور بوون[٩]. دوای نەمانی دەسەڵاتی عوسمانیش لە ساڵی (١٩١٨) ناوچەکە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی ئینگلیزەوە، کاپتن (های) کە ئەفسەرێکی ئینگلیز بووە دەبێتە حاکمی سیاسی ناوچەکە و (حەمە ئاغای) غەفووریش دەکات بە قایمقامی قەزاکە. کاتێک (شێخ مەحموود)یش لە ناوەراستی تشرینی دووەمی (١٩١٨)دا حکومەتێکی کوردی لە سلێمانی دامەزراند، دەستی کرد بە رێکخستنی کاروباری کارگێری و (شێخ عوسمان سەرگەڵۆیی) کرد بە قایمقامی ناوچەی کۆیە، بەم جۆرە کۆیە دەبێتە قەزایەکی سەر بە سلێمانی تا ١٩١٩/٦/١٩[١٠].

دوا بە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیش لە ساڵی ١٩٢١ و دانانی نەخشە کارگێرییەکەی قەزای (کۆیە) شان بە شانی هەریەک لە قەزاکانی (سەتنەر و رەواندز و رانیە و مەخموور) دەخرێتە سەر لیوای هەولێر[١١]. بەم جۆرە ئەم قەزایە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆ. لەسەر (لیوا) و پارێزگای هەولێر ماوەتەوە.

**رەهەندی دیموگرافی**

لەم باسەدا هەوڵدەدەین توێژینەوە و شیکردنەوەی گونجاو بۆ هەموو ئەو گۆڕانانە بکەین، کە بەسەر قەبارەی دانیشتوانی قەزای کۆیەدا هاتووە لە ماوەی نێوان ساڵانی لێکۆڵینەوە و ساڵانی تریش، بە ئامانجی سوودگەیاندنی زیاتر بە لێکۆڵینەوەکەمان، چونکە وەک ئاشکرایە هەر گۆڕانێک، کە بەسەر قەبارەی دانیشتوانی هەر ناوچەیەکدا دێت کاریگەری زۆری لەسەر شێوازی دابەشبوون و چڕی دانیشتوانەکەیدا دەبێت.

وەک دەزانرێت دانیشتوان جەستەیەکی زیندووە و لە گۆڕانی بەردەوامدایە، هەموو رۆژێک ژمارەیەکیان دێتە سەر لە رێگای لەدایکبوون و ژمارەیەکی تریشیان لێ کەم دەبێتەوە بەهۆی مردن[١٢]. کاتێک باس لە دانیشتوانی هەر هەرێم و ناوچەیەک دەکەین، واتە باس لە ژمارەی هەموو ئەو خەڵکانە دەکەین، کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا لەم شوێنە نیشتەجێن، ئەم ژمارەیەش لە بارێکدا جێگیر نابێت، بەڵکو لە زیادبوون یان کەمبووندا دەبێت.

بە مەبەستی زانینی ئەو گۆڕانانەی بەسەر قەبارەی دانیشتواندا دێت لەماوەیەکی دیاریکراودا توێژەران چەندین پێوەری جیاواز بەکار دەهێنن، بلاوترینیان (رێژەی گەشەی دانیشتوان)ە (نسبة نمو السكان) ئەم رێژەیەش بە دوو شێواز ئاماژەی بۆ دەکرێت: یەکەم/پاڵپشت بە داتای هەردوو جوولەی (سروشتی و شوێنجێیی)[***]. دووەم/ پشت بەستنە بە ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوان، کە لە ئێستای دنیادا بە سەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ زانینی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر قەبارەی دانیشتواندا دێت لە ماوەی نێوان دوو ئاماردا[١٣].

لای ئێمە ناتواندرێت پشت بە شێوازی یەکەم ببەسترێت، چونکە لە وڵاتی ئێمە وەک تەواوی وڵاتانی تری تازە پێگەیشتوو وەک پێویست بایەخ بە تۆماری ئامارە ژیارییەکان (الاحصاءات الحيوية) نەدراوە. بە جۆرێک تا ئەم ساڵانەی دوایش ژمارەی لەدایکبووان و مردووان بە شێوەیەکی دروست تۆمار نەدەکران و زۆربەی ئەو ئامارانەی، کە لەلایەن دەزگا و دامەزراوە فەرمییەکان بلاودەکرانەوە و ورد و سەرتاپاگیر نەبوون. لە ناوچەی لێکۆڵینەوەشدا ئەم داتایانە هیچ بایەخێکیان پێنەدراوە. هەر ئەمەشە پاڵمان پێوە

دەنێت پەنا ببەینە بەر بەکارهێنانی شێوازی دووەم. واتە ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوان بکەینە بنەمایەک بۆ زانینی تێکڕای ئەو گۆڕانانەی بەسەر قەبارەی دانیشتوانی ناوچەکەدا هاتووە. لەگەڵ ئەوەی ئەم سەرژمێرییانە کەموکورتی زۆریشیان تێدایە[١٤]. بەڵام ئەمە هیچ لە نرخ و بایەخی خستنە ڕووی بابەتەکە کەم ناکەنەوە، چونکە تا رادەیەکی زۆر وێنەیەکمان لە بارەی شێوە و جۆری گۆڕانەکان لە قەبارەی دانیشتوان لە ماوەی نێوان سالانی سەرژمێرەکان بۆ روون دەکەنەوە.

قەبارەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ماوەی نێوان سالانی سەرژمێرەکاندا گۆڕانی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، وەک لە (خشتەی ژمارە -٣-)شدا دەردەکەوێت، لە سالی (١٩٤٧) کۆی ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە لە (١، ٢، ٣) کەسەوە هەلکشاوە گەیشتۆتە (٨٥٤٥٦) کەس لە سالی (٢٠٠٢). واتە لەم ماوەیەدا قەبارەی دانیشوانەکەی بە جیاوازی (٥٥٢٥٥) کەس رووی لە زیادبوون کردووە.

**خشتەی ژمارە (٣)**
**ژمارەی دانیشتوانی قەزای کۆیە و پارێزگای هەولێر**
**(١٩٤٧- ٢٠٠٢)**

| ساڵ | ژمارەی دانیشتووانی قەزا | ژمارەی دانیشتووانی پارێزگا | ڕێژەی قەزا لە کۆی پارێزگا (٪) |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٧[١] | ٣٠٢٠١ | ٢٣٩٧٧٦ | ١٢,٦ |
| ١٩٥٧[٢] | ٣٦١٤٧ | ٢٧٢٣٨٣ | ١٣,٢ |
| ١٩٦٥[٣] | ٤٥٢٢١ | ٣٦٥٢٩٣ | ١٢,٤ |
| ١٩٧٠[٤] | ٤٢٤٧٦ | ٤٠١٦٩٧ | ١٠,٦ |
| ١٩٧٧[٥] | ٤٨١٤٧ | ٥٤١٤٥٦ | ٨,٩ |
| ١٩٨٧[٦] | ٤٠٧٤٧ | ٧٧٠٤٣٩ | ٥,٣ |
| ٢٠٠٢[٧] | ٨٥٤٥٦ | ١,٣١٣,٧١٩ | ٦,٥ |

**سەرچاوە:**

١- وزارة الشؤون الاجتماعية، مديرية النفوس العامة، إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، ج١، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٤، (جدول الاول)، ص٢٤٥.

٢- وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة، المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، المجلد الثاني، ج٣، لواء اربيل، ١٩٦٣، جدول رقم (٢٤)، ص٤٧.

٣- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، المصدر السابق، (جدول رقم ١)، ص٩-١٠.

٤- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، خلاصة النتائج الاولية لحصر السكان لسنة ١٩٧٠، بغداد، ١٩٧٠، محافظة أربيل، قضاء كويسنجق، جدول رقم (١).

٥- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، محافظة اربيل، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، ١٩٧٨، جدول رقم (٢٢)، ص٢٩- ٣٠.

٦- وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧، محافظة اربيل، مطبعة الجهاز المركزي للاحصاء، بغداد، ١٩٨٨، جدول رقم (٢٢)، ص ٨١- ٨٢.

٧-أ- مديرية إحصاء السليمانية، المصدر السابق، ص٢٦٦.

ب- **JHIC, Data sata section, villages survey, FAO, 2002**

پ- **WFP, IRAQ, Populatio Data, verification exercise, July 2002, p. (17)**

هەر لە خشتەکەدا تێبینی دەکرێت، کە رێژەی دانیشتوانی قەزاکە لە کۆی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٥٧- ٢٠٠٢) گۆرانی گەورەی بەسەردا هاتووە، بە جۆرێک لە سالی ١٩٥٧ دانیشتوانی قەزای کۆیە زیاتر (١٣٪)ی کۆی دانیشتوانی پارێزگای هەولێری پێکهێناوە. کەچی ئەم رێژەیە لە ماوەی سالانی تری لێکۆلینەوە بە ئاراستەی کەمبوون چووە تا لە سالی ١٩٨٧ گەیشتۆتە (٥٪). کەمبوونەوەی رێژەی دانیشتوانی قەزاکە لە کۆی دانیشتوانی پارێزگا لە تەواوی ئەم ماوانەدا دەرئەنجامی ئەو رەوشە نائاساییە بووە، کە بەسەر ناوچەکەدا هاتووە. بۆیە دەکرێت بلێین فاکتەرە رامیارییەکان بەرپرسی یەکەمن و کاریگەری راستەوخۆیان لەسەر کەمی رێژەی گەشەی سالانەی دانیشتوانی قەزاکەدا هەبووە، بە بەراورد لەگەل رێژەی گەشەی دانیشتوانی پارێزگاکە. بەجۆرێک لەم سالانەی، کە رەوشی رامیاری ناوچەکە تا رادەیەک سەقامگیر و ئارام بووە رێژەی گەشەی دانیشتوانی قەزا و پارێزگاکە تا ئەندازەیەکی زۆر لە یەکتری نزیک دەبن. لە سەیرکردنی (خشتەی ژمارە -٤- و شێوەی ژمارە -١-)یشدا، دەردەکەویت لەماوەی نێوان سالانی (١٩٤٧-١٩٥٧) رێژەی گەشەی سالانەی

**خشتەی ژمارە (٤)**

**رێژەی گەشەی سالانەی دانیشتووان لە قەزای کۆیە و پارێزگای هەولێر**

**١٩٥٧ — ٢٠٠٢***

| ماوە | رێژەی گەشەی سالانە لە قەزا | رێژەی گەشەی سالانە لە پارێزگا |
|---|---|---|
| ١٩٤٧ — ١٩٥٧ | ١,٨ | ١,٣ |
| ١٩٥٧ — ١٩٦٥ | ٢,٨ | ٣,٣ |
| ١٩٦٥ — ١٩٧٠ | ١,٢- | ٢,٤ |
| ١٩٧٠ — ١٩٧٧ | ١,٨ | ٤,٣ |
| ١٩٧٧ — ١٩٨٧ | ١,٦- | ٣,٥ |
| ١٩٨٧ — ٢٠٠٢ | ٥,١ | ٣,٦ |

**سەرچاوە:**

رێژەکان دەرهێندراون پشت بەست بە خشتەی ژمارە (٣).

* رێژەی گەشەی سالانەی دانیشتووان بە بەکارهێنانی ئەم هاوکێشەیە دەرهێندراوە:

$$r = \left[ \sqrt[T]{\frac{P_1}{P_0}} - 1 \right] \times 100$$

r رێژەی گەشەی سالانە.

T - ژمارەی سالانی نێوان دوو سەر ژمێر.

$P_1$ - ژمارەی دانیشتوان لە دوایین سەر ژمێر.

$P_0$ - ژمارەی دانیشتوان لەسەر ژمێری یەکەم.

**سەرچاوە:**

John I. Clark, Population Geography, OP.CIT. P.146

دانیشتوان لە قەزای کۆیە (١،٨ ٪) و لە پارێزگای هەولێر (١،٣ ٪) بووە. کەچی لە ماوەی سالانی (١٩٥٧- ١٩٦٥) ئەم ڕێژەیە لە هەریەک لە قەزا و پارێزگا بە جیاوازی ڕێژەی گەشەی سالانەی (١٪ و ٢٪) بە بەراورد لەگەڵ ماوەی پێشوو زیادیان کردووە. ئەم جیاوازییەش لە ڕێژەی گەشەی دانیشتوانی قەزاکە بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی گەشەی پارێزگای هەولێر لە ئەنجامی چەندین هۆکاری جیاواز بووە لەوانە:

١- نادروستی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوانی سالی ١٩٦٥ وەک دەزانرێت ئەم سەرژمێرە لە (٤/ ١٠/ ١٩٦٥)[١٥] دا واتە دوو سال پێش وادەی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجام دراوە و ژمارەکانیش تا رادەیەکی زۆر بە خەملاندن داندراون، بە تایبەتی لە ناوچەی لێکۆلینەوە بەهۆی نا سەقامگیری رەوشی رامیاری ناوچەکە[*****].

٢- کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکە بۆ دەرەوەی سنووری قەزاکە بەرەو شارەکانی تری کوردستان و عێراق بە تایبەتیش شاری هەولێر بە هۆی ناجێگیری رەوشە رامیارییەکە و فەرامۆش کردنی ناوچەکە لەلایەن دەسەلاتدارانەوە.

هەروەها لە ماوەی سالانی ١٩٦٥ - ١٩٧٠ ڕێژەی سالانەی دانیشتوان لە قەزاکە بۆ -١،٢ ٪ و لە پارێزگای هەولێریش بۆ ٢،٤ ٪ دادەکشێت، هۆکارەکەشی جارێکی تر بۆ نادروستی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری سالی ١٩٦٥ دەگەڕێتەوە.

کەچی لە ماوەی سالانی ١٩٧٠ -١٩٧٧ قەبارەی دانیشتووانی هەر یەک لە قەزا و پارێزگا یەک بەدوای یەک بە ڕێژەی گەشەی سالانەی ١،٨ ٪ و ٤،٣ ٪ زیاد دەکەن، واتە دانیشتووانی قەزا و پارێزگا لەم ماوەیەدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو گەشەیان کردووە بە بەراورد لەگەڵ ماوەی پێشوو. ئەمەش تا رادەیەکی زۆر پەیوەندی بە ئارامبوونەوەی رەوشی رامیاری ناوچەکە هەیە، کە لەم ماوەیەدا بوو بە هاندەرێک بۆ گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بۆ سەر زێدی باب و باپیرانی خۆیان، جگە لەوەی سەرژمێری گشتی دانیشتوان لە سالی ١٩٧٧ تەواوی بەشەکانی قەزاکەی گرتۆتەوە.

بەلام لە ماوەی سالانی (١٩٧٧- ١٩٨٧) قەبارەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش بە ئاراستەی کەمبوونەوە چووە، بە جۆرێک دانیشتوانی قەزاکە لەم ماوەیەدا بە ڕێژەی سالانەی (-١،٦ ٪) کەمی کردووە، لە بەرامبەردا ئەم ڕێژەیە لە پارێزگای هەولێر لەهەمان ماوەدا (٣،٥ ٪) بووە. ئەم کەمبوونەوەش لە

شێوەی ژمارە
ڕێژەی گەشەی سالانەی دانیشتوان لە قەزای کۆیە و پارێزگای هەولێر
١٩٤٧- ٢٠٠٢



سەرچاوە/ پشت بەست بە خشتەی ژمارە

ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانیشتوانی قەزاکە لەم ماوەیەدا دەرئەنجامی ژمارەیەک هۆکاری جیاواز بووە لەوانە:

١- نادروستی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٧ وەک دەزانرێت ئەم سەرژمێرە لە کاتێکدا ئەنجامدراوە کە جەنگی (عێراق- ئێران) لەکایەدا بووە، لە ئەنجامی بێهێزی دەسەڵاتی سەربازی حکومەتیش لەم کاتانەدا، زۆربەی هەرە زۆری بەشەکانی قەزاکە جگە لە مەڵبەندی شارەکان لە ژێر دەسەڵات و کۆنتڕۆڵی راستەوخۆی هێزی پێشمەرگەدا بووە، بۆیە فەرمانبەرانی ئاونووسکار نەیانتوانیوە سەردانی ئەم ناوچانە بکەن بۆ سەرژمێرکردنی دانیشتوانەکانیان، وێڕای ئەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی لاوانیش لەم کاتانەدا هەڵاتووی سەربازی (فرار) بوون لە شار و گوندەکانی قەزاکە خۆیان پەنادابوو، کەس و کارەکانیشیان لە ترسی گرتن و لێپرسینەوە ناوەکانیان تۆمار نەکردوون.

٢- زۆربوونی ژمارەی کۆچکەران بۆ دەرەوەی سنووری قەزاکە، بەتایبەتیش بۆ شاری هەولێر بە جۆرێک ئەم کۆچکردنە لەم ماوەیەدا ببووە دیاردەیەکی رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووری گەورە.

دوابەدوای ساڵی (١٩٨٧)یش لەگەڵ ئەوەی، کە هیچ سەرژمێرێکی گشتی و فەرمی ئەنجام نەدراوە بە مەبەستی زانینی کۆی ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە. بەڵام تەواوی بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە بە ئاراستەی کەم بوون چووە، چونکە بەشێکی فراوانی ناوچەکە لە سەرەتای مانگی مایسی ساڵی (١٩٨٨)دا کەوتۆتە بەر شاڵاوی تێکدان و کاولکردن و ژمارەیەکی زۆر خەڵکی ناوچەکەش بێ سەر و شوێن کراون[١٦].

بەڵام دوای راپەڕینە مەزنەکەی گەلی کوردستان لە بەهاری (١٩٩١) و نەمانی دەسەڵاتی داگیرکار و تاڕادەیەک ئاسایی بوونەوەی بارودۆخی رامیاری ناوچەکە قەبارەی دانیشتوانی قەزاکە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش رووی لە زۆربوون کردووە، بە جۆرێک لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٧- ٢٠٠٢ دانیشتوانی قەزاکە

**خشتەی ژمارە (٥)**

**ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانیشتووانی یەکە کارگێرییەکانی قەزای کۆیە**

**١٩٥٧ – ٢٠٠٢ (٪)**

| یەکە کارگێرییەکان | ١٩٥٧ - ١٩٦٥ | ١٩٦٥ – ١٩٧٠ | ١٩٧٠ - ١٩٧٧ | ١٩٧٧ - ١٩٨٧ | ١٩٨٧ – ٢٠٠٢ |
|---|---|---|---|---|---|
| ناحیەی سەنتەر | ٢,٢ | ٣,٣- | ٠,١- | ٥,٢ | ٠,٥٦ |
| ناحیەی تەق تەق(*) | ٢,٢ | ٢,٢ | ١,٩- | | |
| ناحیەی شۆڕش(**) | | | | - | |
| ناحیەی ئاشتی(***) | - | | | - | - |
| قەزا | ٢,٨ | ١,٢ | ١,٨ | ١,٦- | ٥,٠٦ |

**سەرچاوە:**

پشت بەست بە پاشکۆی ژمارە (١) ڕێژەکان دەرهێندراون.

(*) لە ساڵی ١٩٨٧ پلەی کارگێری لێ دەسەندرێتەوە دەکرێت بە گوند.

(**) وەک یەکەیەکی کارگێری نوێ لە سەرژمێری گشتی دانیشتووانی ساڵی ١٩٧٧ دەرکەوتووە و لە ساڵی (١٩٨٧)یش پلەی کارگێری لێ سەندراوەتەوە کراوەتە گوند.

(***) وەک یەکەیەکی کارگێری نوێ لە ساڵی ١٩٩٨ دەردەکەوێت.

بە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی زیاتر لە (٥٪) زیادیان کردووە، ئەمەش بە زۆرترین ڕێژەی گەشەی دانیشتوان دادەندرێت، کە قەزای کۆیە لە تەواوی ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٧- ٢٠٠٢) بە خۆوەی بینیوە.

ئەوەی لێرەشدا جێگای ئاماژە بۆ کردنە ئەوەیە ئەو گۆڕانانەی بەسەر قەبارەی دانیشتوانی قەزای کۆیە داهاتووە لە تەواوی ئەو ماوانەدا لە هەموو بەشەکانی وەک یەک نەبووە، بەڵکو جیاوازییەکی زۆر بەدی دەکرێت لە یەکەیەکی کارگێڕی بۆ یەکەیەکی تر. لە سەیرکردنی (خشتەی ژمارەی-٥-)یشدا ئەم راستییە روونتر دەردەکەوێت، بە جۆرێک لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٦٥) دانیشتوانی ناحیەی سەنتەر بە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی (٣.٢٪) زیادیان کردووە. کەچی لە ناحیەی تەق تەق لە هەمان ئەم ماوەیەدا ڕێژەکە (٢.٢٪) بووە. ئەم جیاوازییەش لە نێوان یەکە کارگێڕییەکانی قەزاکە لەم ماوەیەدا بۆ زۆربوونی ژمارەی کۆچکەرانی ناحیەی تەق تەق دەگەڕێتەوە، کە بەهۆی ناسەقامگیری ڕەوشی رامیاری و سەربازی و پشتگوێ خستنی ناوچەکە لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندەوە بۆ دەرەوەی سنووری ئەم یەکە کردوویانە، وێڕای نادروستی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوانی ساڵی ١٩٦٥. کەچی لە ماوەی ساڵانی (١٩٦٥- ١٩٧٠) دانیشتوانی ناحیەی سەنتەر بە ڕێژەی گەشەی (-٣٪) کەمی کردووە، کەچی ئەم ڕێژەیە لە ناحیەی تەق تەق (٢.٢٪) بووە. واتە وەک ماوەی پێشووی ماوەتەوە، ئەمەش جیاوازییەکی زۆرە و هۆکارەکەشی جارێکی تر بۆ نادروستی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥ دەگەڕێتەوە. بەڵام لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٧) دانیشتوانی هەریەک لە ناحیەکانی (سەنتەر و تەق تەق) بە ڕێژەی (-١.٠٪ و -١.٩٪) ڕوویان لە کەمبوون بووە، هۆکاری سەرەکی ئەم کەمبوونەش لەم ماوەیەدا دامەزراندنی یەکەی کارگێڕی تازەیە بە نێوی ناحیەی (شۆڕش)، کە ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی ڕۆژئاوای ناحیەی سەنتەر و بەشێک لە گوندەکانی باکووری ڕۆژئاوای ناحیەی (تەق تەق)ی خراونەتە نێو سنووری کارگێڕی ئەم یەکە تازەیە.

بەڵام لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٧) دانیشتووانی ناحیەی سەنتەر بە ڕێژەی زیاتر لە (٥٪) زیادی کردووە، ئەمەش لە لایەک لە ئەنجامی لێ سەندنەوەی پلەی کارگێڕی لە هەردوو ناحیەی شۆڕش و تەق تەقەوە دێت، کە لە ساڵی (١٩٨٧)، بە پێی مەرسومێکی کۆماری دەکرێنەوە بەگوند و دەخرێنە سەر ناحیەی سەنتەر، لە لایەکی تریشدا لەم ماوەیەدا زۆربەی هەرە زۆری گوندەکانی سەر بە قەزاکە بڕیاری دابڕانی کارگێڕی (محظور اداري)یان بەسەر سەپێندرابوو، ئەوەش وای کردووە لە ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری ساڵی ١٩٨٧ ژمارەی دانیشتوانەکانیان بە خەمڵاندن لەسەر ناحیەی سەنتەر هەژمار بکرێن. ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر بەرزبوونەوەی ڕێژەکە هەبووە بەم شێوەیە، کەچی لە ماوەی ساڵانی (١٩٨٧- ٢٠٠٢) لەگەڵ ئەوەی دانیشتوانی ناحیەی سەنتەر بە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی (٠.٦٪) زیادیان کردووە لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێت ئەم ڕێژەیە بە ڕێژەیەکی زۆر بەرز لە قەڵەم بدرێت، چونکە سەرجەم دانیشتوانی قەزاکە لە ساڵی (١٩٨٧)دا لەسەر ناحیەی ناوبراودا هەژمار کرابوون، کەچی لە ساڵی (٢٠٠٢) دوای کردنەوەی هەردوو ناحیەی (تەق تەق و شۆڕش) بە دوو یەکەی کارگێڕی و دامەزراندنی یەکەیەکی تری تازەش بە نێوی ناحیەی (ئاشتی)، کەچی هێشتا کۆی ژمارەی دانیشتوانی ناحیەی سەنتەر لەم ساڵەدا بە ڕێژەی زیاتر لە (٨٪) پتر بووە بە بەراورد لەگەڵ کۆی ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە لە ساڵی ١٩٨٧. ئەم گەشەیەش لە قەبارەی دانیشتوانی قەزاکە کاریگەری لەسەر سروشت و شێوازی دابەشبوونی دانیشتوانەکەیدا هەبووە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەدا دەگەینە ئەو کورتەیەی بڵێین قەزای کۆیە شوێنێکی جوگرافی گرنگی لە نێو

سنووری هەرێمی کوردستاندا داگیر کردووە وەک ئەڵقەیەکی پەیوەندی گرنگیش وایە، کە پارێزگای هەولێر بە هەردوو پارێزگای کەرکووک و سلێمانییەوە گرێدەدات. جگە لەوە قەزای ناوبراو دیرۆکێکی لە مێژینەی هەیە و بایەخ و گرنگی خۆی هەبووە لە قۆناغە مێژووییەکاندا و لە رووی کارگێڕیشەوە پلەی کارگێڕی جۆر بە جۆری هەبووە و بەیەکێک لە کۆنترین قەزاکانی (لیوا) و پارێزگای هەولێر دادەندرێت، لە ماوەی ساڵانی لێکۆڵینەوەش ئەم قەزایە کۆمەڵێک گۆڕانی گەورە بەسەر قەبارەی دانیشتوانەکەیدا هاتووە و ئەم گۆڕانانەش لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر و لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تریدا جیاوازبووە لە ئەنجامی هەردوو جوولەی سروشتی شوێنجێیی دانیشتوانەکەی، کە کاریگەری گەورەیان لەسەر دابەشبوونی جوگرافی دانیشتوانی ناوچەکەدا جێهێشتووە، کە لە بەشی داهاتوودا باسیان لێوە دەکەین.

## سەرچاوە و پەراوێز

(*) لەنێو کورد خۆیاندا بە (کۆیە) و لە نووسراوە رەسمییەکان بە زمانی عەرەبی بە (کویسنجق) ناودەبرێت، سنجەق وشەیەکی تورکییە لە رووی زمانەوانییەوە واتای (ئاڵا) دەگەیەنێت لە رووی کارگێڕیشەوە ناوچەیەکە لەلایەن (سنجق بەگ) حوکمڕانی دەکرێت دواتریش بۆتە بەڕێوەبەرایەتییەکی سەر بە ویلایەت و لەلایەن (موتەسەریف)ەوە بەڕێوەبراوە، بڕوانە (زبير بلال اسماعيل، أربيل في أدوارها التاريخية، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٣، ص٢٦٦).

لەبارەی بنچینەی ناوی کۆیە بیروبۆچوونی جیاواز هەیە، کەریم شارەزا دەڵێت ئەم ناوە لە بنەڕەتدا لە (کۆ)وە هاتووە بەبێ هیچ پاشکۆیەک کە بە واتای کۆبوونەوەی کۆمەڵێک خەڵک دێت لە ناوچەیەکدا، شاری کۆیەش کە سەنتەری کارگێڕی قەزاکەیە لە دامێنی زنجیرە شاخەکانی هەیبەت سوڵتان و باواجیدا هەڵکەوتووە، (كريم شارە زا، لمحة عن تاريخ كويسنجق وأنحاءها، مجلة زاكروس، العدد (١)، وزارة الثقافة، مطبعة وزارة الثقافة، أربيل، ١٩٩٧، ص٣٣).

هەندێکی تر پێیان وایە عەرەبە موسڵمانەکان یان عوسمانییەکان (ئاڵا - سنجق)ی پێغەمبەریان (د.خ) لەگەڵ خۆیان هێناوەتە کۆیە و لەسەر قەڵای (قووچ پاشا) چەقاندوویانە لەپێشدا ناوی (کوپار) بووە، لە لەبەر بەیداغەکە ناویان ناوە کۆیسنجق (تاهیر ئەحمەد حەویزی، مێژووی کۆیە، بەرگی یەکەم چاپخانەی (الوفا)، بەغداد، ١٩٦٢، ل٢٢. کەسانێکی تر رایان وایە لەکاتی هاتنی مەغۆلەکان بۆ ناوچەکە شاری کۆیە لەجێگای گوندی (قەیسەری یان نەسکی کۆیە)ی ئێستادا بووە، دوای ئەوەی لەلایەن سوپای مەغۆلەوە وێران دەکرێت خەڵکەکە لە شاری (کۆیە)ی ئێستا جارێکی تر کۆبوونەتەوە، بۆیە ناویان ناوە (کۆ) یان (کۆیە).

(سەلاح شێخ شەرەف، لە ئاوێنەی مێژووی کوردەواریدا، گۆڤاری کۆسار، ژمارە(٢، ٣)، چاپخانەی زامەوا، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٥). غالب تاڵەبانیش بڕوای وایە ناوی کۆیسنجق لە بنچینەدا (کۆی -سان -جا) بووە بەمانای (چیای بارەگای سوڵتان). ژمارەیەکی تریش ئەم ناوە دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی عوسمانییەکان، هەرچی (مەسعود محەمەد)یشە بڕوای وایە وشەی (سنجق) مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی عوسمانییەکان بۆ پشت راست کردنەوەی بۆچوونەکەشی کتێبی (ئەزکاری) ئیمامی نەوەوی کە پێش هاتنی عوسمانییەکان بۆ ناوچەکە لەلایەن یەکێک بە نێوی (خضر بن عمر كويسنجقلي) کۆپی کراوە و لە کۆتایی ناوی خۆی نووسیوە، بۆیە بە دووری نازانێت ئەم ناوە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هۆلاکۆ یان تەیمور لەنگ (جمال بابان، أصول أسماء المدن والمواقع العراقية، مطبعة الاجيال، بغداد، ١٩٨٩، ص٢٦٧).

١- محمد هادي الدفتر وعبدالله حسن، العراقي الشمالي، مطبعة النهار، بغداد، ١٩٥٨، ص٥٨١.

(**) بە پێی مەرسوومێکی کۆماری ژمارە (٣٢١) کە لەم ساڵەدا دەرچووە هەردوو یەکە سیفەی کارگێڕییان لێ دەسەندرێتەوە و دەکرێنەوە بە گوند و دەخرێنە سەر ناحیەی سەنتەر (سەرچاوە: قائمقامية قضاء كويسنجق، التحرير، العدد ١٧٤٠، (١٩٨٧/٧/١٣)، الموضوع الغاء النواحي، (كتاب رسمي).

(***) دوابەدوای راپەڕینە مەزنەکەی گەلی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١

و نەمانی دەسەڵاتی داگیرکار لە ناوچەکەدا لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا لە بەرواری ١٩٩٢/٥/١٩ ئەم پەرلەمانە هەڵبژێردرا و لە (١٩٩٢/٦/٤) یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی سازدا، بڕوانە:

أ- كوردستانی نوێ، ژمارە ٩٦، ساڵی یەکەم، ١٩٩٢/٥/١٩، ل ١.

ب- کوردستانی نوێ، ژمارە ١٠٩، ساڵی یەکەم، ١٩٩٢/٦/٤، ل ١.

٢- محافظة اربيل، مديرية الافراد والشؤون المالية الافراد، العدد ١٦٤٥/١/١، تاريخ ١٩٩٢/٧/١٠، اعادة تشكيلات الوحدات الادارية، (امر اداري).

٣- وەزارەتی ناوخۆ، بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان، بەڕێوەبەرایەتی خۆیەتی، ژمارە ٣٣٨، ١٩٩٩/٢/٤ (نووسراوی فەرمی).

٤- ستيڤن همسلي لونگريك، اربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط٦، المطبعة (بلا)، بغداد، ١٩٨٥، ص١٩.

٥- زبير بلال اسماعيل، المصدر السابق، ص٣٣١.

٦- المصدر نفسه، ص٣٣٩.

٧- وەرگیراوە لە : فەیسەڵ دەباغ، شار و شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێر لە قاموسی ئیعلامی شەمسەددین سامیدا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٩٤- ٩٩.

٨- علي شاكر علي، التشكيلات الادارية العثمانية، موسوعة الموصل الحضارية، المجلد الرابع، دار الكتب، جامعة الموصل، الموصل، ١٩٩٢، ص١٦٨.

٩- خليل اسماعيل محمد، اربيل دراسة ديموغرافية اقتصادية، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٣، ص٢١٢.

١٠- كريم شاره زا، تطور الحركة الادارية والسياسية في كويسنجق، مجلة زاكروس، العدد (٣)، وزارة الثقافة، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ١٩٩٧، ص٤٠

١١- خليل اسماعيل محمد، اربيل دراسة ديموغرافية اقتصادية، المصدر السابق، ص٢٢٠

١٢- محمد سيد غلاب و محمد صبحي عبدالحكيم، السكان ديموغرافيا وجغرافيا، المطبعة الانجلو المصرية القاهرة، ط٣، ١٩٧٤، ص٣٥

(****) مەبەست لە جووڵەی سروشتی: گۆڕانی سروشتی دانیشتوانە کە لە ئەنجامی جیاوازی نێوان تێکڕای لە دایکبوون و مردن دەردەچێت، بەڵام جووڵەی شوێنجێیی (الحركة المكانية): مەبەست لە کۆچکردن یان گواستنەوەی دانیشتوانە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر، بڕوانە: (فاضل الانصاري، جغرافية السكان، المصدر السابق، ص١٦١).

١٣- جەزا تۆفیق تالب، بایەخی جیۆپۆلەتیکی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عیراق، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپخانەی دلێر، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٣٨.

١٤- خلیل اسماعیل محمد، سەرژمێری دانیشتوان لە عیراق، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە (٤)، ساڵی چوارەم، هەولێر، ١٩٩٦، ل٥٣.

١٥- خەلیل ئیسماعیل محەمەد، سەرژمێری دانیشتووان لە عێراق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩.

(*****) لەسەیرکردنی ئەنجامە گشتییەکانی سەرژمێری دانیشتوان لە ساڵی ١٩٦٥ ئەم ڕاستییە ڕوونتر دەردەکەوێت بە جۆرێک لە خشتەی تایبەت بەناوچەی لێکۆڵینەوە ئەو خانانەی تەرخان کراون بۆ ژمارەی دانیشتوانی گوندنشین بە بەتاڵی جێهێڵدراون ئەوەش ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ سەرژمێرکردنی خەڵکی ئەم ناوچانە (بروانە: وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٦٥، المصدر السابق، جدول رقم -١- ص٩).

١٦- خەلیل ئیسماعیل محەمەد، لێک جیا کردنەوەی شوێنی شاڵاوەکانی ئەنفال لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٤)، ٢٠٠٢، ل٢٧٤.

# کۆیە و ناوی شوێنەکان

**تاهیر ئەحمەد حەوێزی**

**١- دایاوەکان:** کانی پیرۆتی، بن شاخان، کانی قەرەی، غەریبان، جلیت، کانیلە، گەرمووک، پلووسک، کاریزی کونە گێچەڵان، حەمە بایزان، حەمامۆک، کاریزی مام خدری مام یەحیای، شۆرجە، کاریزی حەمە ئاغا، کانیاوی ئەحمەد تەهای، کانی مامە رەزاقی لە چەمبەرەی کانی کاکەڵلا، کاریزی مزگەفتی کونە جومعەی، کاریزی مزگەفتی حاجی مەلا سەعد، کاریزی مزگەفتی گەرمووک، کاریزی مزگەفتی حاجی مەلا ئۆمەری، کاریزی بیرۆکەی، کاریزی مزگەفتی خادمی.

**٢- کانییە بوهاری:** کانی شاخی مشکەی، ئۆمەر خوچان، قەرسیل، کەونە پرد، رەزی میران، مەقریلە، برایمەتیمی، کانیی سەیدی، کانیی بسکان.

**گردەکان:** ئۆمەرمەندان، ئۆمەر خوچان، شاخی مشکەی، گردی رۆمی، باویان، شوخی، شێخ مستەفا، ئاشی ساغەی، کێلە خوار، کەکۆن، مەلا مەحموود، ئاشی پیسکان، قۆنگر، گردی گۆمی، گامێشان، کەندی غەریبان، هەمزەی مام جەردیسی، گردی غەیبەتان، خەرمان سووتای، سێوکە، کۆنە قەلات، گردی بوزی، باسکی عارەبیان، گردی مزگەوتۆکەی.

**حەمامەکان:** ١- حەسەن ئاغا ٢- پیسکان ٣- ناوەند ٤- حەمامی بەلەدیە (جمهوریەت).

**دوکان و بازار:** چوار پێنج جادە و دوو قەیسەری و چوار خان و پێنج سەد دوکان و دوو هەزار ماڵ و دوو ئاشی ئاگری و مەکینەیەکی بەفری و ئاوی بە بۆرییە و هێزی کارەبای (دی. سی) هەیە.

**پیاوچاکەکان:** لە قەزای کۆیە پیاوچاک یەکجار زۆرە و خەڵق بەتایبەتی ژنان دەچنە زیارەتیان، هەریەکە بۆ چەشنە ئومێدێک و چەشنە خێرێکیان (حەق دەست) لە خۆیان گرتووە دەڵێن، هەندێکیان (ئەصحابە)ن و هەندێکیان خۆجێین، لە ژیاندا زیانیان بۆ کەس نەبووە، پیاوی بە دین و زانا بوون، کە مردوون خەڵک زۆر بۆیان بە پەرۆش بووە. بەزۆری ناویان (شێمحەمەد، شێخ محەمەد)ە، زیارەتگاکانیان بەشی زۆری بڵند و سەر ئاو و کانیاو و دارستان و جێگای خۆشە، جێی زۆریان دەرماناوە، دوور نییە کە گۆگرد و نەوتی تێدا بێ، هەژاری و نەخوێندەواری و نەبوونی دختۆر و دەرمانی چاک، وایان لە دڵی میللەت کردووە، کە ئەمانەیان بەلاوە زۆر پیرۆز بێ، لە بەهاران گەلێکیان سەیرانیان لێ دەکرێ.

**١- پیاوچاکەکانی کۆیە:** باپیر فەقێ ئەحمەد، مەلا وسوو، چاکە فەقیرە، سەید جامی، چاکی سەر قازیلان، چاکی بە قامیش، (شێخ محەمەد - لە ماڵی حاجی سەعید نەجیبی)، (حاجی حەسەن شێخ نوری) لەپشت ماڵی حاجی سەعیدی نەجیبی، شێخی شێخ موسا، مەلا مەحمود، دایە خەجێ، دەرویش خدر، مەلا ژنە عەنبەر، شێخ محەمەدی مزگەفتی کۆنە جومعەی، شێخ کەریمی شێخ سەلامی، شێخ رەسولی شێخەڵلای، سەیدی سبیلچی، شێخ محەمەدی غەریبان، چاکی مزگەوتۆکەی، چاکی قەرەی، میر

کەسیر، چاکی زایەری، دەرماناوی بنەی، پورتاوس، دەرماناوی ئاشان، جێ نزرگەی ئۆمەرمەندان، هەیبەت سوڵتان، کەندە کوخ، شێمحەمەدی دیری - دیانەکانیش پێیان وایە ئەمە مەربین قەیدیشەی دیانانە.

**٢- پیاوچاکی گوندەکان:** ئۆمەر گونبەت لە گوندی (ئۆمەر گونبەت)، شێم حەمەد لە (شەوگێر)، میر سەید لە (میر سەیدی)، ئەسحابەی (کرۆژی)، شێم حەمەدی گردی قەبران، چاکی عاردی غەیبی، چاکی داری مام ئاودەلی، ئەسحابە درێژی چەقڕەی، ئەسحابە داری سەلکی، ئەسحابە سێ دارانی لە (دۆڵی ئەسحابان)، مەلا مراد و مەلەک رەیحان لە (چنارۆکی)، مام جافر و شێمحەمەد لە (سماقولی سەروچاو)، شێخ رەسول و جبرائیل لە (میکووکاو)، شێخ زەینەدین لە (بایزبەگ)، شێمحەمەد لە (الا الله)، حاجی رەسول لە (قازبەگیان)، پرکانە لە (ناسر ئاغا)، شێم حەمەد میرابی، شێمحەمەد کێلە کونتی، ئەسحابەی داری بوردبانی، شێم حەمەدی گرد جاسوسان، ئەسحابەی مام جەمالی، ئەسحابەی دارە خڕکێ، ئەسحابەی داری دەرگەی، ئەسحابەی تاقەداری، ئەسحابەی خرابە، قەبرستانی خزینەی لە (سکتان)، چاکی کانی بۆگەی لە (جەلی)، شێخ خدر لە (کانی هەنجیری سەیدان)، شێخ زەردی سەربەنی لە (کەرکی کودەلەی)، شێخ ئوفای لە رەنی، شێمحەمەدی کوران، مەرقەدی کێلە بۆری، ئەسحابەی سەرقەڵاتی لە (گرد گۆران)، مەلا زادەی سەرگردی لە (سناوە)، ئەسحابە شێمحەمەد لە (تاڵەبان)، شێمحەمەد لە (گەرمک)، شێخ رەسول لە (کونە گورگ)، چاکی کونجییان، چاکی غەریبان، شێمحەمەد لە (سماقولی گرتک)، شێمحەمەد لە (شیلە)، شێخ مەولان لە (سویردرە)، شێخ رەش لە (باوەقوب)، سەر رووت لە (حەوشی قەسابان)، (عەبدولعەزیز و دەروێش خدر لە (گۆکتەپە)، شێخ هەلوان لە (شێخەلوان)، باپیر کلاورەش، شێمحەمەد بەرگەری، باپیر غەزایی لە (نازەنین)، چاکی سناوی، مام وسوی لاسی (باواجی)، حاجی رەسولی داوداوی لە (کانی کوردە)ی، ئەسحابەی (فەقێیانی)، ئەسحابەی قەبرستانی گرتکی.

**ئاشە ئاوییەکان:** هەموویان پەکیان کەوتووە و بەشی زۆریان وێران بوون. لە (تۆیزاوای) و تا (شیلە)ی نزیکی (١٥) ئاش هەبووە، لە زەوی (شەمە)یەوە تا (چەمبەرەی) (١٠) ئاشی پتر لێ بووە و هەریەکە ناوی خۆی هەبووە.

ناوی ئاشەکانی کە لە حەمامۆکێوە بەرەو خوار دێن و هاوینە گەڕ بوون: ١- ئاشی حەمامۆکی ٢- گێوژۆکی ٣- ئاغەلی ٤- قادری حوسێنی ٥- شان شکای ٦- ساغە ٧- ئاشی مەلا بەکری ٨- خنە ٩- سی توان ١٠- ئاشی دەرگەی ١١- ئاشی مەحموود ئاغا ١٢- ئاشی تەمتەمان.

ئاشی بوهاری کە هیچیان نەماون: ١- ئاشە بوهارە ٢- ئاشی دەباخان ٣- ئاشیماڵی شێخ کەریم ٤- ئاشیلکە ٥- ئاشی پیسکان.

**گەمەکانی کۆیە:** هەر دەستەیە بە نێر و مێ - بە تایبەتی کوڕ و پیاو - لە کاتی بێ ئیشیدا بەم یارییانەی خوارەوە خۆیان غافڵاندووە، هەر کەژ و ئاووهەوایەک یاری جیای خۆی هەبووە، بە زۆری یارییەکان شێوەیەکی جەنگییان هەبووە:

تەندوورە سووری، سێ لۆقی، عەنزەل، جغزی، قاشویانێ، پەلیکانێ، نان نانانێ، هوولەملانێ، گورزگورزانێ، کێلەبەردانێ، کلاوفڕینکێ، هەدارهەدارانێ، یەکباز، چارکەوشەک، پەستەکولە، بازبازانێ، تەڵەو ریویانێ، کەلە مستانێ، سینی و زولفانێ، فەنەی بێدەنگ، فتفتانێ، مەلەکردن، راوکردن، مەزراحانێ، چاوشیلکانێ، خواجە روی، بەردە گەرمووکێ، چەق چەقۆکێ، چاوبەستەکێ، سووتام برژام، کونج کونجانێ، ساپ ساپانێ، رگ رگانێ، تیروکەوانێ، جگانێ، کەلایانێ، کۆلارە هەڵدان، رمبازی، جلیتانێ، قۆشمە، قەلەوە، گوریس کێشەکی، شەق گوکێ، گومبەتۆکە، مۆری مۆریانێ، خڕیلە خڕیلانێ، زۆرەبانی، شان شانانێ، شەڕ (سەگ، کەڵەباب، کەو)، ئەلوول بلوول تکانێ، حەل و حەلانێ، کەری میری ئەسکەندەر (گەمەی عەوالله جەیدی)، وت وت، پینەدۆزی، مێش برینەوە و گەلێکی تر و شای گەمان.

*** ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی، تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٨٤ وەرگیراوە.**



# تەقتەق

**ئاراس ئێلنجاغی**

١- بۆچوونێکی بەربڵاو هەیە دەڵێ: تەقتەق لە (تاق تاق) ماڵەوە هاتووە[١]، یەک لێرە و لەوێ یان هەرماڵەی لە شوێنێکەوە هاتووە، گریمان ئەمە دروستە، بەڵام تاق لە هەمبانە بۆرینەی هەژار لاپەڕە ١٤٢-١٤٣، هەشت مانای هەیە (تاک بەرامبەری جووت، بێ هاوتا، بێ وێنە، دەلاقە، گونبەز، میچی بە کەوانە، نیوەی ڕۆژێک، بەشێ لە بیست و چوار بەشی ئاو، کەوڵی مەڕو بزن) ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تۆمارەکانی سەردەمی عوسمانی بڵێین بە (تاق تاق) ناوی تەقتەق هاتووە، ئەوا لە لایەک عوسمانییەکان زمانی کوردییان نەزانیوە و لە لایەکی تر شێواندوویانە، وەک (داقوق کە کردوویانە بە تاوغ واتا مریشکی سوورەوەکراو) کاتێ دێ گەورەو دێ کۆک بکرێتە مریشک، بەهیچ جۆرێ ناچێتە ئەقڵەوە، (تاق تاق) ی تۆماری عوسمانییەکان بە دروست (تەقتەق) بێ.

٢- چیرۆکێکی کۆن لە تەقتەق هەیە، باس لە لافاوێکی زێی بچووک دەکات، کە چۆن ئاوایی (کەلەکچن)ی بردووە، خەڵکەکەی ئاوارە بوون بۆ (قەرەناو و جگیلە و کانی ڕەش و تەقتەقی ئەمڕۆ)، دیارترین کەسایەتی نێو چیرۆکەکە (نەنە حەلۆمەیە)، پیرەژنێکی بەساڵاچوو و ئازا بووە، ناو هێناویەتی لە نێوان ئۆرزییەکە و فەرمانگەی لقی کشتوکاڵی تەقتەق لە کەندرێک گیرساوەتەوە، تا ئەمڕۆش کەندری (نەنە حەلۆمە)و بەسەرهاتەکەی جێگای باسی گەورانە بۆ منداڵان ئینجا لێرەدا دەڵێن (نەنە حەلۆمە) وتوویەتی: "ئەوە چی بوو تەقە تەقی بەرد کاسی کردین" گوایە (تەقتەق) لەمەوە هاتووە. (جەمال بابانیش) دەڵێ: (تەقتەق، لە ئەنجامی بەریەککەوتنی بەرد بە یەکتری و دەنگەکەی تەقتەقی

دروست کردووه.

٣- ئەسپ سواریێ، بەناو بەستی زێی بچووک، گوزەری کردووه، ئەسپەکە ئەسپێکی نالکراو بووه، دەنگی تەقە تەقی نێوان بەرکەوتنی نالچەکە و بەردەکان، هەر لەگەڵ ئەمەش تەکە تەک و تەقە تەقی تەنەکەی کاروانچییان بە نێو بەستەکەدا.

٤- بەهۆی زێی بچووکەوه چەند ئاشێکی ئاو لە هەردوو بەری زێی بچووک هەبووه، ئەو دەنگەی لە کاتی کارکردنی ئاشەکان بەرگوێی خەڵک کەوتووه (چەقە چەق و چەقەنەو تەق و تۆق) بووه وەک چۆن هەنبانە بۆرینە ل١٦٥ تەقتەقۆک بە مانای چەقەنەی ئاش لێکدەداتەوه.

٥- تەقتەق، واتای زەوی بەردینە، زەوییەکی بن بەرد و ڕەقە (هەنبانە بۆرینە ل١٦٥) ئەمەش دەچێتە ئەقڵەوه، چونکە لە چەمی کوێخا ڕەشیدەوه تا وەکو گۆمی مام تەها لە خوارووی تەقتەق، زەوییەکان تێکڕا بەردینن، کە ئاوی زێی بچووک لە کاتی لافاوی بەهار هێناویەتی، ئەمەی ئەم بۆچوونە پەسەندتر دەکات ئەوەیە ناوە کۆنەکانی تەقتەق (کوچک نەخشینە و کەڵەکچن) هەر پەیوەستن بە بەردەوه، کوچک واتە خرکە بەرد، کوچکە واتا بەردی بچووک، نەخشینەش بە واتای ڕەنگاوڕەنگ وەک نەوزاد کاکەڕەشیش دەڵێ: "کوچک نەخشینە لە قوچکی نیشانەوه هاتووه"، لە کوردەواریشدا وتراوه کوچک چن واتە دیواری وشکە بەرد (کەڵەکچن)یش دیواری وشکە بەردە یا بە مانای (کۆمەڵە بەردی بەسەر یەکدا دراو) دێت، وتراویشە کوچکوکەڵەک واتە قەڵاقوچکە بوونی بەرد لەسەر یەک (هەنبانە بۆرینە ل٦٢٤)، ئەمەش لەگەڵ قسەکەی نەنە حەلۆمە (تەقە تەقی بەرد کاسی کردین) یەک دەگرێتەوه، لەگەڵ لێکدانەوەکەی ناوی (تەقتەق) لە لایەن (جەمال بابان)ەوه لەسەر یەک بۆچوونە، جگە لەمانە خزمانی (ئۆمەر گومبەت زاراوەی تەقتەقە شاخ و بناری کۆسرەت)یش (تەقتەقە خاک) بەکاردێنن. بە گوێرەی ئەم واتایانەی سەرەوه هەموو بیر و بۆچوونەکانی تر بەلاوه دەنێم و ئەمەیان پەسند دەکەم، کە ناوی تەقتەق لە سروشتەوه وەرگیراوه و پەیوەستە بە خاک و بەردەکانی بەستی کەنار زێی بچووک.

### هەڵکەوتەی جوگرافیایی شارۆچکەی تەقتەق

تەقتەق، کەوتۆتە باشووری خۆرهەڵاتی شاری هەولێری پایتەختی هەرێم، بە دووری (٥٨)کم، هەروەها بە ڕێگای قیرتاو نێوان (هەولێر - کۆیە- تەقتەق) (٩٨کم)ە، سەر بە قەزای (کۆیە)یەو بە دووری (٢٣)کم بە ڕێگای قیرتاو لە باشووریدایە[٢].

سنووری لەگەڵ ناحیەی (ئاشتی) لە خۆرهەڵات و ناحیەی (سێگردکان) لە خۆرئاواو ناحیەی (شۆڕش) لە باکووری خۆرئاواو ناحیەی(شوان) لە باشووردا یەک دەگرێتەوه هەروەها (٤٥)کم لە سەرووی شاری کەرکوک هەڵکەوتووه[٣].

لە کەناری خۆرئاوای زێی بچووک، خاڵی یەکتربڕین و تێکەڵ بوونی شێوە ئاخاوتنەکانی (هەولێری و کەرکووکی و سلێمانی و کۆیی و لورییەکانی خۆرئاوای تەقتەق)ە(٤) هەر بۆیە ئەگەر تەقتەقییەک لە یەکێک لە شارەکانی تری کوردستان بێت و قسە بکات هەندێ جار بە کۆیی و هەندێ جاری تر بە هەولێری و جارجاریش بە کەرکووکی دەچێت: جگە لەمانە ڕایەڵی بەیەکگەیاندنی نێوان بانی کەرکووک و کۆیەو پشدەرو بیتوێن و قەڵادزەی سەر سنوورە، بە تایبەت بە هۆی پردە ناودارەکەی کە لە ساڵی (١٩٥٤-١٩٥٨) دروست کراوە[٥].

### هەڵکەوتەی ئەسترۆنومی (گەردوونی)

دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی (٣٥-٣٦) پلەی باکوور، نێوان هێڵی درێژی (٤٤-٤٥) پلەی خۆرهەڵات[٦]و شوێنە گەردوونییە ئاووهەوایەکی ڕاگوێزراوی (ئینتقالی) نێوان گەرمێن و کوێستانی پێ بەخشیوه، لە ناوچەی بارانی نیمچە مسۆگەردایە، باران بارینی ساڵانەی لە نێوان (٢٠٠-٥٠٠)ملم دایە، لە خوارووی وێستگەی ئاووهەوای (کۆیە)یە، کە بەرزترین پلەی داباریینی ناوچەی بارانی نیمچە مسۆگەری تێدا تۆمار دەکرێت[٧].

### تۆپۆگرافیای تەقتەق

لە دامێنی چیای هەیبەت سوڵتان بەرەو باشووری خۆرئاوای، ناوچەی نیمچە شاخاوییە لە هەرێمی کوردستاندا، کە بریتییە لە بانۆکە و گردۆڵکە و سۆرک و ڕەوەزە شاخ و بەردەڵان، بەرزیی سنووری ناحیەکە بە هێڵی کەنتوی لە نێوان (٣٥٠-٧٥٠)م دایە[٨]، لە کۆنەوە لە کوردەواری وتراوە (گەرمێن و کوێستان)، ئەمانیش بەرامبەر هەردوو زاراوەی ناوچەی شاخاوییە کوێستان و ناوچەی نیمچە شاخاوی (گەرمێن)ە[٩]، لە سنووری ئەم ناحیەیە چەند دیاردەیەکی بەرچاوی بەرزی و نزمی هەیە وەک (بانۆکەی تاڵەبان و نێلنجاغ)و ڕووباری کۆیە و داربەسەر لە باکووری خۆرئاوا، هەروەها زێی بچووک و بەرزایی تەکەڵتوو لە خۆرهەڵات و بەرزایی گۆڕقەرەج لە خۆرئاوایدا، هەرچەندە چیای خاڵخاڵان لە سنووری ناحیەی (شوان)ە، بەڵام لە شارۆچکەکە نزیکە و لە بەری خۆرهەڵاتی زێی بچووکدایە، لە بەفرانبار دا مەندیلێکی سپی لەسەر دەکات و لە بەهاریشدا بە گوڵ و گوڵزار و سەوزایی دڵی دانیشتوانی شارۆچکەی تەقتەق خۆش دەکات[١٠].

### زێی بچووک

سەرچاوەی ئەم ڕووبارە لە دەشتی (لاهیجانی) ڕۆژئاوای شاری مەهاباد پێک دێت[١١] سەرەتا ئاراستەی بەرەو باشووری خۆرهەڵات بە خۆرهەڵاتی چیای قەندیل و لە بەرزایی (٣٠٦٠)م لە ئاستی ڕووی دەریاوە گوزەر دەکات.

ئینجا دواتر ئاراستەکەی خۆی دەگۆڕێت بۆ باشووری خۆرئاوا، تێکڕای گۆمی ڕووبارەکە (٢٢٢٥٠)کم چوار گۆشەیە[١٢] هەر لە خۆرهەڵاتی کوردستان ڕووبارۆچکەکانی (ئەحمەد ئابادو شاهۆ و دڵ هەرزن و چەمی کانی گوێزە) لقی (بانە) پێک دێن، کە گەورەترین لقی ڕووباری (زێی بچووک)ە[١٣]. هەروەها چۆمەکانی (بناوە سووتەو قزڵجەو ژاراوە)ی دەڕژێتە نێویەوە، لە ناوچەی (سەردەشت)، (١٠٠٠) گەز بەرزە، نشێوی (کەڵوێ) زۆر خوڕە لە مەودای (١٦) فرسەق، (٥٦٠) گەز دادەکەوێ هەر لەبەر ئەم خوڕییەی لەو مەڵبەندە بە (گاڤرێن) ناو دەبرێت[١٤]. دواتر دێتە هەرێمی کوردستانی عێراق و چۆمەکانی (سیوەیل و کوکەسوور) لقی (ماوەت) یا قەڵاچوڵانیشی پێ دەڵێن، دەڕژێتە نێویەوە و بە پشدەردا تێدەپەڕێ، لە خوار (قەڵادزە) ڕووبارەکە فراوان دەبێ و چوار چۆمی بەرزاییەکانی قەندیلی دەڕژێنە ناویەوە و لەوێوە بە دەربەندی ڕانیە گوزەر دەکات بۆ پێدەشتی میرزا ڕۆستەم و دووکان(١٥). دوای بەنداوی (دوکان) بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات و لە گوندی (کانی سوورو کلێسە)ی دەشتی کۆیە دێتە سنووری ناحیەی (تەقتەق)، بە نێو گردۆڵکەکانی دەشتی کۆیە و خۆرهەڵاتی تەقتەق ڕێدەکات و ئینجا لە خوار تەقتەق هەر سێ لقە ڕووباری وەرزی (کۆیە و داربەسەر و شەرغە)ی دەڕژێتە ناو، دواتر دەچێتە شارۆچکەی (پردێ) و لە خوار (پردێ)وە لقە ڕووبارۆچکەی (کەندیناوەی) دەچێتە ناو ئینجا شارۆچکەی (دوبز) دەبڕێ و لە فەتحە (یەکانە)و خوار (شەرگات)ەوە دەڕژێتە ڕووباری دیجلەوە، لە سەرچاوەوە تا ڕێژگەکەی (٤٠٠)کم[١٦]وە(١٧٦٦)کم لە کوردستانی عێراقدایە و[١٧] داهاتی ئاوی ساڵانەی (٧) ملیار م٣)یە و[١٨] لە یەک چرکەدا (٢٢٢.٢)م٣ ئاوی پێدا دەڕوات[١٩] ساڵانە (١٧٪)ی داهاتی ئاوی ڕووباری دیجلە پێک دێنێت ئەم زێیە خراوەتە ریزی ڕووبارە هەمیشەییەکانەوە، چونکە بڕی داهاتی ئاوی لە چاو بڕی داهاتی ئاوی چۆمە وەرزییەکان بڕێکی زۆرە، ئەگینا ئەگەر ئەم ڕووبارە بە تەرازووی چۆمە وەرزییەکان کێشانە بکرێ دەبێ بخرێتە ریزی چۆمە وەرزییەکانەوە[٢٠].

### کێڵگەی نەوتی
### گەشەپێدانی تەقتەق

شوێنی کێڵگە: بە دووری (١٥)کم لە باکووری خۆرئاوای شارۆچکەی تەقتەقە، لەکۆتایی هێڵی پانی(٣٥)ی باکوورو لە نێو

هێڵی درێژی (٤٤.٣٠-٤٤.٣٥)ی رۆژهەڵاتە لە بەرزایی (٥٥٠م) لە ئاستی رووی دەریاوەیە[٢١].

**سەرنجی مێژوویی:** لە ماوەی (٤٤) ساڵدا (١٩٥٨-٢٠٠٦) چوار جار لەبەر بارودۆخی سیاسی کوردستان و عێراق لە کار خراوە، شۆرشی ئەیلوولی (١٩٦١)، جەنگی (عێراق - ئێران) (١٩٨٠)، جەنگی کوێت و راپەرینی کوردستان (١٩٩٠-١٩٩١)، دێوەزمەی شەری ناوخۆ (١٩٩٦-١٩٩٧).

**ئەو کۆمپانیانەی کاریان تێدا کردووە:** کۆمپانیای نەوتی عێراق لەلایەن شەریکەی ئەمریکی، بەریتانی، فەرەنسی، هۆڵەندی لە سەردەمی مەلیک فەیسەڵ کوری غازی، دوای خۆماڵی کردنی نەوت لەلایەن کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانی عێراق بەرێوە چووە (١٩٧١)[٢٢]. لە ١٩٩٣/٨/٥ کۆمیتەی باڵای پرۆژە تایبەتییەکانی دووەم کابینەی حکومەتی هەرێم بە کرێکار و ئەندازیاری کورد، لە ساڵی ٢٠٠٢-٢٠٠٦ کۆمپانیای فرە رەگەزی (ئەگینلو- ئەداکس) تورکی سویسری.

**پێکهاتەی چینەکانی:** ئەم کێڵگەیە ٢٩کم درێژە و ١٢کم پانییەکەیەتی، ئەو چینانەی کە نەوتی تێدایە سێ چینە، ئەوانیش شیرانیش و کۆمیتان و قەمچوغە و فۆرمەیەشنە، نەوتی قورس و سووک لە پێکهاتەی نەوتەکەدا هەیە، نەوتی سووک رێژەی بەنزینی زۆرە و لە بۆرسەو بازاری نەوت گرانترە، هەرچی نەوتی قورسیشە قیر و شەمێ و رۆنی تێدایە[٢٣].

**پێویستی بۆ ئاو:** لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی رابردوو لە رووباری کۆیە لە ناوچەی تاراوی ئێلنجاغی گەورە بە هۆی بۆرییەوە ئاو گەیەنراوەتە پرۆژەکە، لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا لە گوندی (تۆبزاوە)وە ئاوی بۆ دابین کراوە تا رۆژانی ئەمرۆ.

**کاریگەری ئابووری:** د.عەبدوڵلا غەفور دەڵێ: "بەرهەمی ساڵانەی بە دەیان ملیۆن بەرمیل دادەنرێت[٢٤]". ئەمە لە کاتێ دەبێ، کە بیرەکان تەواو لێبدرێن و پاڵێوگەی نەوتی کۆیەش بکەوێتە کار، هەروەها دەتوانرێت دوای پێداویستییەکانی سووتەمەنی گەرمە کارەبای لێ بەرهەم بهێنرێت.

**کاریگەری بەسەر ناوچەکە:** رووبەری ١٣٥کم٢ لە گوندەکانی دەوروبەری دەگرێتەوە[٢٥] کە لە کۆندا بە کرێکاری و ئەمرۆش بە پۆلیسیەتی سوودمەند بوون، لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٩) ئەم رووبەرە دانیشتوانەکەی دەربەدەر کران و قەرەبوویەکی رەمزی کران، تەنها لە بری رەز و باغەکانیان، لەوانەیە لە داهاتووش لەگەڵ گەشە کردنی پرۆژەکە بکەونە بەر هەرەشەی راگواستن.

**ناوەکانی پرۆژەکە:** لە کۆنەوە تا ئەمرۆ پێنج ناوی هەبووە، نەوتی کەیوان، بێژنگ بەسەر، نەوتی شیواشۆک، نەوتی چوار جووتیار، کێڵگەی نەوتی تەقتەق، کە لە سەرەتاوە ئەم ناوەی هەبووە[٢٦].

**شەش بیرە نەوت:** ئەگەر چی وا چاوەروان دەکرێت ئەم کێڵگەیە زۆر زیاتر لە شەش بیرە نەوتی لێ هەڵ بکەنرێت، بەڵام تا ئەمرۆ شەش بیرە نەوت شوێنیان دیارە، کە کەوتوونە نێو زەوی، ئەم گوندانە وەک لە خشتەی ژمارە (١)دا دیارە:

بیری ژمارە (٤) لە ٢٠٠٦/٥/١٤ لە لایەن کۆمپانیای نامۆسی دوبەی دەستکرا بە هەڵکەندنی و هەردوو بیرەکەی تر (هەرفتە و سەید قوری) ئامادەن بۆ هەڵکەندن.

ساڵی ١٩٧٩ - ١٩٨٠ گوندەکانی سنوورەکە راگوێزران، (٥٣٣) خێزان بوون لە (١٠) گوندی ناحیەی (تەقتەق و شۆرش)، وەک لە خشتەی ژمارە (٢)دا دیارە[٢٧]:

دوای ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان لە دوای راپەرین ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە (١٤٧٢) کەس و (٢٤١) خێزانی گەراونەتەوە، وەک لە خشتەکەی ژمارە (٣)دا دیارە[٢٨]:

**پەراوێزەکان**

(١) فاتح بێلان تاڵەبانی: لە ژمارەی (٣١١)ی کوردستانی نوێ، ساڵی ١٩٩٣ بە (تاک تاک)ی نووسیوە، هەروەها کاک نەوزاد کاکەرەش لە کتێبی کۆیەی مامۆستا جەمال فەتحوڵلا بە تاک تاک باسی کردووە، لە چاوپێکەوتنێکی مامۆستا

**خشتەی ژمارە (١)**

| ژمارەی بیر | ناوی پارچە زەوی | گوند | یەکەی کارگێڕی |
|---|---|---|---|
| ١ | چوار جۆتیار | ئێلنجاغی گەورە | تەقتەق |
| ٢ | چوار جۆتیار | ئێلنجاغی گەورە | تەقتەق |
| ٣ | گەرماوە | ئێلنجاغی گەورە | تەقتەق |
| ٤ | بورەی مامز | ئێلنجاغی گچکە (مەرزان) | تەقتەق |
| ٥ | هەرفتە | ئێلنجاغی گچکە (مەرزان) | تەقتەق |
| ٦ | سەید قوری | داربەسەری گچکە | شۆڕش |

**خشتەی ژمارە (٢)**

| ژمارە | گوند | ژمارەی ماڵ | ناحیە |
|---|---|---|---|
| ١ | تاڵەبانی گچکە | ٣٣ | تەقتەق |
| ٢ | مەرزانی خواریێ | ١٦ | تەقتەق |
| ٣ | ئێلنجاغی گەورە | ١٣٥ | تەقتەق |
| ٤ | تاڵەبانی گەورە | ٩٠ | تەقتەق |
| ٥ | مەرزانی کانی قەمبران | ١٧ | تەقتەق |
| ٦ | شیواشۆکی گەورە | ١٢٠ | تەقتەق |
| ٧ | دار بەسەری خواریێ | ٣٠ | شۆڕش |
| ٨ | داربەسەری سەریێ | ٢٥ | شۆڕش |
| ٩ | شیواشۆکی کوردان | ١٢ | شۆڕش |
| ١٠ | سماقە | ٥٥ | شۆڕش |
| | سەرجەم | ٥٣٣ | |

فەیسەڵ تەللوب لە زاری (مام عەبد جاسم)ەوە بە تاک تاک باسی کردووە.

(٢) خەبات عەبدوڵڵا، بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشوور، چاپی دووەم، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٥ز، ل٣١٥.

(٣) ئاراس ئێلنجاغی، تەقتەق بژوێنی هەرێمی کوردستانە، تاک، ژمارە (٦)ی حوزەیرانی ٢٠٠٥.

(٤) دیدەوانی یەعقوب، تەقتەق سوود و هەڵکەوتەکەی، تەقتەق، ژمارە (٦)ی حوزەیرانی ٢٠٠٥.

(٥) ئاراس ئێلنجاغی،... هەمان سەرچاوە.

(٦) نەخشەی هێزە چەکدارییەکانی عێراق، رووپێوی سەربازی، ساڵی ١٩٨٦.

(٧) د. سلێمان عەبدوڵڵا ئیسماعیل، تایبەتمەندییەکانی باران لە هەرێمی کوردستان، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، ٢٠٠٦، ل٥١ -٥٢.

(٨) ئاراس ئێلنجاغی، جوگرافیای تەقتەق، تەقتەق، ژمارە (١)ی سەرماوەرزی ٢٧٠٠ی کوردی.

(٩) د. سلێمان عەبدوڵڵا ئیسماعیل،... هەمان سەرچاوە ل ١٧٨.

(١٠) ئاراس ئێلنجاغی،... هەمان سەرچاوە.

(١١) د. عەبدوڵڵا غەفور، جوگرافیای

**خشتەی ژمارە (٣)**

| ژمارە | گوند | خێزان | دانیشتوان |
|---|---|---|---|
| ١ | ئێلنجاغی گەورە | ١١٠ | ٦٨٧ |
| ٢ | ئێلنجاغی گچکە (مەرزانی خواریٚ) | ٦ | ٢٩ |
| ٣ | تاڵەبانی گەورە | ٩ | ٦٣ |
| ٤ | تاڵەبانی گچکە | ١٤ | ٧١ |
| ٥ | شیواشۆکی گەورە | ٣٤ | ٢٣١ |
| ٦ | شیواشۆکی گچکە | ١٧ | ٩٤ |
| ٧ | داربە سەری گچکە | ٢٤ | ١٥١ |
| ٨ | دار بەسەری گەورە | ٩ | ٤٨ |
| ٩ | مەرزانی سەریٚ | ١٨ | ٩٨ |
| | سەرجەم | ٢٤١ | ١٤٧٢ |

کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، سلێمانی، ٢٠٠٥ ز، ل ٩٠.

(١٢) موحەممەد عەبدوڵلا عومەر، رۆڵی ئاو لە بەعەرەبکردنی کەرکوک، باسێک لە سەنتەری برایەتی ژمارە (٢٠)ی هاوینی ٢٠٠٠ز، ل١٤٢.

(١٣) د. عەبدوڵلا غەفور... هەمان سەرچاوە، ل ٩١.

(١٤) عەلی ئەسغەری شەمیمی هەمەدان، جوگرافیای کوردستانی ئێران، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ساڵی ١٩٨٠، ل١٥.

(١٥) سەرپەرشتیاران (فەرید ئەسەسەرد و ئومێد نوری)، گیر و گرفتی ئاو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، کتێبی یەکەم، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٣ ز، ل ١٠١.

(١٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

(١٧) موحەممەد عەبدوڵلا عومەر... هەمان سەرچاوە، ل ١٤٢.

(١٨) عەبدوڵلا غەفور... هەمان سەرچاوە، ل ١٩.

(١٩) د. ئازاد جەلال شەریف، ئاسایشی ئاوی هەرێمی کوردستانی عێراق، باسێک لە سەنتەری برایەتی، ژمارە (١٣)ی ئەیلولی ١٩٩٩.

(٢٠) سەرپەرشتیاران (فەرید ئەسەسەرد، د. ئومێد نوری)... هەمان سەرچاوە، ل ١٠٢.

(٢١) نەخشەی تەقتەق، هێزە چەکدارەکانی عێراق، ١٩٨٦.

(٢٢) د. عەبدوڵلا غەفور، جوگرافیای کوردستان، ٢٠٠٥.

(٢٣) گڕی نەوتی شیواشۆک و وەجاغی ئێلنجاغ، رەهبەر سەید برایم، کوردستانی نوێ، ژ (٢٧٦٧).

(٢٤) د. عەبدوڵلا غەفور، سەرچاوەی پێشوو.

(٢٥) هەنگاو، ٢٠٠١، ژمارە (٩).

(٢٦) رزگاری، ژمارە (١١٥).

(٢٧) ئەمینی قادری مینە، ئەمنی ستراتیجی عێراق سێکوچکەی بەعسییان، ل ٣٠٨.

(٢٨) ئاراس ئێلنجاغی، سەرنجێکی مێژوویی پرۆژەی نەوتی شیواشۆک، رێگای کوردستان، ژمارە (٤٥٧)ی ٢٠٠١/٦/١١.

# قەزای مەخموور

دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد
کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەددین

پێشەکی:

قەزای مەخموور کەوتۆتە بەشی باشووری رۆژئاوای پارێزگای هەولێر. بەیەکێ لە دەرگا سەرەکییەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق دەژمێردرێت بۆ پارێزگاکانی ناوەراست و باشووری عێراق و دەشتایی باشووری شاری هەولێر لەخۆ دەگرێت. لایەک کەوتۆتە نێوان هەردوو زێی گەورە و بچووک، لایەکی دیکە رووباری دیجلە.

قەزای مەخمور بەیەکێ لە یەکە ئیدارییە هەرە گرنگەکان دادەنرێت کە لیوا (پارێزگا)ی هەولێر لەپاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق پێکی هێناوە. ناحیەکانی گوێرو کەندێناوەو قەراج و ناحیەی ناوەند لەخۆ دەگرێت. بروانە خشتەی ژمارە (١) رووبەرەکەشی دەگاتە (١٩.١ ٪) لە تێکرای رووبەری پارێزگای هەولێر.

قەوارەی دانیشتوانەکەشی (٥.٥ ٪) دانیشتوانی هەولێرە[٢].

ناوچەکە مێژوویەکی کۆنی هەیە و بۆ چاخەکانی پێش زایین دەگەرێتەوە، تائێستاشی لەگەڵدا بێت شوێنەواری کۆنی هەر پێوە دیارە. بەتایبەت لە بەرزاییەکانی قەرەچوغ، کە لەم دواییانە لەپاڵ شوێنەواری سەردەمی عوسمانییەکان، پاشماوەی شوێنەواری ئاشوورییەکان لەو ناوچەیە دۆزرایەوە[٣]. رووبەرێکی زۆری کە لە نێوان هەردوو زێ و رووباری دیجلە درێژ دەبێتەوە دەکرێتە کشتوکاڵ، دانەوێڵەیەکی زۆری تێدا دەچێندرێت و دادەکرێت بۆ خۆراکی پارێزگاکانی عێراق. بۆیە لەساڵی ١٩٨٤ سایلۆیەکی گەورە بۆ داکردنی دانەوێڵە دروست کرا. هەروەها بایەخێکی نەوتیشی هەیەو زێتر لە (١٥٧) چاڵی نەوت لەخۆ دەگرێت و بەسەر ناوچە جیا جیاکانی قەزاکە دابەش بووە. سەرەرای ئەوە پێگە جوگرافییەکەش لە ناوچەکە بایەخی خۆی هەیە. بنکەیەکی کۆکردنەوەو بازاری بەرهەمی هەردوو ناوچەکانی شاخاوی و نیمچە شاخاوییە لەلایەک و، دەشتی بەپیت و بەرەکەت لەلایەکی دیکەوە. هەر بۆیە شوێنێکی زۆر شیاوە بۆ

**خشتەی ژمارە (١)**

**پێکهاتە ئیدارییەکانی "لیوا"ی هەولێر (سەرەکییەکان)[١]**

| قەزا | ناحیە |
|---|---|
| هەولێر | ناوەند- قوشتەپە- شەقلاوە- حەریر |
| مەخمور | ناوەند- گوێر- کەندێناوە |
| کۆیە | ناوەند- تەقتەق |
| رەواندز | ناوەند- باڵەک- برادۆست |
| رانیە | ناوەند- ناودەشت- چناران |

نیشتەجێبوونی مرۆڤ و بۆ کشتوکاڵیکردن[٤].

**رەهەندی دیمۆگرافی دانیشتوان:**

ئەو بەیاننامانەی پەیوەندداران بەدانیشتوانی قەزای مەخمور، ئاماژە بەوە دەدەن قەوارەی دانیشتوان لەماوەی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٨٧) بەرێژەی (٠.٦٪) ساڵانە رووی لە کەمی کردووە، لەکاتێکدا رێژەی دانیشتوان لە تەواوی پارێزگای هەولێردا لە رێژەی (٦٪) زیدەی کردووە. ئەو ناوچەیە لە هەردوو دەیەی حەوتەم و هەشتەمی سەدەی رابردوودا لێکۆڵینەوەی لەسەر سازدراو تێیدا دابەزینێکی نائاسایی لەقەوارەی دانیشتوان لەنێوان ساڵانی(١٩٧٠- ١٩٧٧) رووی داو رێژەکەی گەیشتە (٢٪). لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٧) رێژەکە گەیشتە نزیکەی (٣٪)، بروانە خشتەی ژمارە (٢). لە کاتێکدا گەشەسەندنی دانیشتوانی قەزا لە ماوەی ساڵانی پێشتر ١٩٥٧- ١٩٦٥ بەرێژەی (١٪) ساڵانە زیادی دەکرد. پاشان لەنێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٧٠) ساڵانە بەرز بۆوە بۆ (٤.٥٪).

ئەو زێدەبوون و کەمبوونەی ناوچەکە لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا بەخۆیەوە بینی، بۆتە هۆی ئەوەی قەوارەی دانیشتوان لەساڵی ١٩٥٧ کە ١٩٪ بووە بۆ ساڵی ١٩٨٧ روو لەدابەزین بەرێژەی کەمتر لە ٦٪ بکات. بروانە خشتەی ژمارە (٣).

بەتایبەت لەماوەی ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٧)دا، بەوەی رێژەی کەمبوونی ساڵانە گەیشتە نزیکەی (٥٪). لەکاتێکدا رێژەی کەمبوون، ساڵانە گەیشتە کەمتر لە (١٪) لەنێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٧٠)دا.

بێگومان کەمبوونی دانیشتوان کە لە بەیاننامەکاندا ئاشکرا کراوە، هۆکارە سەرەکییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵمەتەکانی راگواستن و کۆچ پێکردنی بەردەوام. بەتایبەت لەماوەی هەردوو دەیەی حەوتەم و هەشتەمی سەدەی رابردوودا بەدانیشتوانی قەزای مەخمور، جا چ لەسەر ئاستی بنکە و کۆمەڵەی گوندنشینەکان یان دانیشتوانی بنکە ئیدارییەکە بوایە. ئەمەو دەرەنجامی ئەو هەڵمەتانە نەک لەسەر ژمارەو قەوارەی ئەو بنکانە، بەڵکو لەسەر دابەشکردنی جوگرافی و رێکخستنی قەوارەیی، هەروەها لەسەر پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوانەکەش رەنگی دایەوە، هەروەکو ئێستا راستییەکان دەبیندرێ.

**ناراستەی گەشەسەندنی گوندەکان**

پێشتر ئاماژەمان بەقەزای مەخمور دا، کە لەرووی گەشەسەندن لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٨٧) کەمبوونێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، ئەمەش لەخشتەی ژمارە (٤)دا روون دەبێتەوە، کە خەڵکی گوندەکان زێتر رووی لە کەمبوون کردووە تا ئەو ئاستەی رێژەکەی ساڵانە گەیشتۆتە (١.٦٪). لە کاتێکدا لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٠-١٩٨٧) بەرێژەی زێتر لە (٣.٥٪) ساڵانە زیادی کردووە.

بەڵام دانیشتوانی شار روو لە زیادبوون بوو تا رێژەکەی ساڵانە گەیشتە نزیکەی (١٠٪) لەو ماوەیەی دیارکراوە. ئەمەش ئەوە

**خشتەی ژمارە (٢)**
**دانیشتوانی قەزای مەخمور بەپێی رێژەی زێدە لە نێوان (١٩٥٧-١٩٨٧)[٥]**

| ماوە | زێدەی ساڵانە ٪ |
|---|---|
| ١٩٥٧- ١٩٦٥ | ١ - |
| ١٩٦٥- ١٩٧٠ | ٤٥ + |
| ١٩٧٠- ١٩٧٧ | ٢٠ - |
| ١٩٧٧- ١٩٨٧ | ٢٧ - |
| ١٩٥٧- ١٩٨٧ | ٠٦ - |

**خشتەی ژمارە (٣)**
**دانیشتوانی قەزای مەخمور بەرێژەی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر لەنێوان (١٩٥٧-١٩٨٧)[٦]**

| ساڵ | ٪ لە دانیشتوانی پارێزگا |
|---|---|
| ١٩٥٧ | ١٨.٦ |
| ١٩٦٥ | ١٥.٣ |
| ١٩٧٠ | ١٦.٦ |
| ١٩٧٧ | ١٠.٦ |
| ١٩٨٧ | ٥.٥ |

دەردەخات، کە هەڵمەتەکانی ڕاگوێزان و کۆچ پێکردن لەنێو دانیشتوانی گوندنشینەکان چڕ بۆتەوە. کە وای کردووە چڕی دانیشتوانی گوندەکان لەساڵی (١٩٥٧)، کە ڕێژەکەی (٩٢٪)، دابەزێت بۆ کەمتر لەڕێژەی (٥٩٪) لەساڵی ١٩٨٧ دا. بڕوانە خشتەی ژمارە (٥).

ڕێژەی زێدەبوونی دانیشتوانی قەزای مەخمور لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، لە نێوان گوندو شاردا لەیەک نەچوونێکی شوێن هەبووە. هەروەها لەسەر ئاستی یەکەی ئیداریش بووە. گەر لە سەرچاوەی یەکەم (١٩٥٧-١٩٧٠) تێپەڕمان کرد، سەرنج دەدەین گەشەسەندنی دانیشتوانی گوندەکان بەرز بۆتەوە نەخوازەڵا لە ناحیەی گوێڕ، کە ساڵانە بەڕێژەی (٣٪)ی تێپەڕاندووە. بەڵام لەو ماوەیەدا (١٩٧٠-١٩٨٧) کەمبوونێکی گشتگری بەخۆوە بینیوە، هەتا لەسەر ئاستی تەواوی یەکە ئیدارییەکانیش لە قەزادا. بەڕێژەی نزیکەی (٣٪) لە ناحیەی قەراج و، نزیکەی (٢٪) لە هەردوو ناحیەی ناوەندی مەخمورو کەندێناوە. بڕوانە خشتەی ژمارە(٦).

هەڵمەتەکانی ڕاگوێزان و کۆچ پێکردن، کە دانیشتوانی ناوچەکە ڕووبەڕووی بوود، بووە هۆی ئەوەی قەوارەی دانیشتوان نەخوازەڵا لە گوندکان روو لە کەمی بکات. دەرئەنجامی ئەو کارەش بەسەر ژمارەیەک گوندو ڕێژەی قەوارەی دانیشتوانەکەیان شکایەوە، هەروەکو چۆن کاری لە دابەشکردنی قەوارەکانی کردبوو.

لەژێر ڕۆشنایی دەرئەنجامی ژمارەی دانیشتوانی عێراق ساڵی ١٩٥٧، بە بەراوردکردن لەگەڵ دەرەنجامی ژمارەی دانیشتوان ساڵی ١٩٨٧، تەماشا دەکەین ژمارەی گوندەکان و کۆمەڵگە نیشتەجێبووەکان لە قەزای مەخمور بەڕێژەی (٢.٥٪) ساڵانە دابەزی لەکاتێکدا لە هەمان ماوەدا ڕێژەی قەوارەی گوند ساڵانە بەڕێژەی (٣.٤٪) بەرز بۆتەوە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٧).

ڕەهەندی دیمۆگرافی بەسەر هەڵمەتی کۆکردنەوەی دانیشتوانی گوندەکان شکایەوە، کە پێیان بەجێهێشتن یان ڕایانگوازتن بۆ (کۆمەڵگای تایبەت) بۆ ئەو مەبەستە. ماوەی ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٧) ژمارەیەکی زۆر لەگوندەکان کەمبوونێکی زۆری بەخۆوە بینی، تا ئەو ئاستەی ساڵانە گەیشتە (٧٪). لەکاتێکدا ڕێژەی قەوارەی گوندەکان بەڕێژەی نزیکەی (٨٪) بەرز بۆوە بۆ هەر گوندێک.

گەر سەرنج بدەین ڕێژەی کەمبوونی ژمارەی گوندەکان لە هەردوو ناحیەی گوێڕو قەراج بەئاشکرا دیارە. ساڵانە، لە یەکەم گەیشتە (١,٧٪)، لە دووەمیش گەیشتە (١,٩٪). لە کاتێکدا ڕێژەی قەوارەی دانیشتوانی گوند ساڵانە (٣,٤٪) لە هەر گوندێک بەرز بۆوە لە یەکەمدا، لە دووەمیش (١,٥٪) بەرز بۆوە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٨).

**خشتەی ژمارە (٤)**

**دانیشتوانی قەزای مەخمور بەپێی زیادەو ژێنگە (١٩٥٧-١٩٨٧)[٧]**

| ماوە | دانیشتوانی گوندەکان (ساڵانە ٪) | دانیشتوانی شار (ساڵانە ٪) |
|---|---|---|
| ١٩٥٧- ١٩٧٠ | ٢٫٢ + | ٤٫٧ + |
| ١٩٧٠- ١٩٨٧ | ٣٫٥ - | ٩٫٧ + |
| ١٩٥٧- ١٩٨٧ | ١٦ - | ١٠٫٩ + |

**خشتەی ژمارە (٥)**

**دانیشتوانی قەزای مەخمور، بەپێی دابەشکردنی ژینگە لەنێوان (١٩٥٧-١٩٨٧)[٨]**

| ساڵ | دانیشتوانی گوندەکان (٪) | دانیشتوانی شار (٪) |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ٩٢ | ٨ |
| ١٩٦٥ | ٨٩٫٢ | ١٠٫٢ |
| ١٩٧٠ | ٩٠٫٢ | ٩٫٨ |
| ١٩٧٧ | ٨٢٫٨ | ١٧٫٢ |
| ١٩٨٧ | ٥٨٫٧ | ٤١٫٣ |

**خشتەی ژمارە (٦)**
**دانیشتوانی گوندەکانی قەزای مەخمور**
**بەپێی زێدەکردنی سالانەو یەکەی ئیداری (١٩٥٧-١٩٨٧)**

| یەکەی ئیداری | ١٩٥٧- ١٩٧٠ | ١٩٧٠- ١٩٨٧ |
|---|---|---|
| ناحیەی ناوەندی مەخمور | ٢.٠ + | ١.٨ - |
| ناحیەی گوێڕ | ٣.١ + | ١.٧ - |
| ناحیەی کەندێناوە | ١.٨ + | -- |
| ناحیەی قەراج | ٢.٠ + | ٢.٩ - |

**خشتەی ژمارە (٧)**
**دانیشتوانی گوند لە قەزای مەخمور (١٩٥٧-١٩٨٧)[٩]**

| ساڵ | ژمارەی گوند | قەواری دانیشتوان | ڕێژەی قەوارەی گوند |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ٢٣٤ | ٤٦٧١٠ | ١٩٩.٦ |
| ١٩٧٧ | ٢٠٦ | ٤٧٤٦ | ٢٣٠.٤ |
| ١٩٨٧ | ٦١ | ٢٤٦٧٥ | ٤٠٤.٥ |

لەلایەکی دیکە، دەرەنجامی کەمبوونی ژمارەی گوندەکان لەو ناوچەیەدا و بەرز بوونەوەی ڕێژەی قەوارەی دانیشتوانیان، لە دابەشکردنی قەوارەیی ئەو گوندانە گۆڕاوە جا چ لەسەر ئاستی سالانی لێکۆڵینەوە بێ یان لەسەر ئاستی یەکەی ئیدارییەکان بووبێ. خشتەی ژمارە (٩) ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. کاتێ ڕێژەی قەوارەی گوندە بچووکەکان (کەمتر لە ٥٠٠ کەس) لە (٩٤٪) لەتێکڕای گوندەکانی قەزا لە ساڵی ١٩٥٧ کەم بۆوە بۆ کەمتر لە (٨٨٪) لەساڵی (١٩٧٧)دا، لەکاتێکدا قەزا قەوارەی گوندە گەورەکانی لە ساڵی (١٩٥٧) نەدرابوونە پاڵ.

دەرەنجامی ژمارەی دانیشتوان ساڵی ١٩٧٧، ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵگای نیشتەجێی گەورەی ئاشکرا کرد لە ڕووی قەوارەوە لە ناوچەکە، بەوەی کە ڕێژەی قەوارەی گوندە مامناوەندییەکان گەیشتە (٥٠٠ -١٠٠٠) کەس. نزیکەی "١٠٪" لە کۆی گشتی. بەرامبەر کەمتر لە (٦٪) ساڵی ١٩٥٧دا، بەوەی ڕێژەی گوندەکان گەیشتە نزیکەی ٣٪ لە تێکڕای گوندەکانی قەزادا.

ئاماژە دەرەکان ئەمە زیاتر لە ناحیەی گوێڕ ئاشکرا دەکەن، لەکاتێکدا ڕێژەی گوندی مامناوەندی بەنزیکەی دوو هەندی خۆی بەرز بۆوە. ڕێژەی گوندەکان گەیشتە (١٠٪) لە کۆی گشتیدا. هەروەها ڕێژەی گوندەکان (قەوارەی بچووک) لە ناحیەی کەندێناوە کەم بۆوە، ئەمەش لە بەرژەوەندی گوندە قەوارە مام ناوەندی و بچووکەکاندا بوو. هەڵمەتەکانی حکومەتی عێراقیش جەختی لەسەر هەڵوەشاندنەوەی گوندە بچووکەکان دەکردەوە، بەوەی دانیشتوانە (ڕاگوێزراوەکان) لە کۆمەڵگاکانی (قەوارە گەورە)دا کۆیکاتەوە، کە نزیکن لەسەر ڕێگای گشتی یان لەنزیک شارە سەرەکییەکان بن بە مەبەستی ئاسانبوونی چاودێرییان و کۆنترۆڵکردنیان.

**خشتەی ژمارە (٨)**
**ژمارەی گوندەکان لەقەزای مەخمورو ڕێژەی قەوارەی گوندەکان لەنێوان (١٩٥٧-١٩٨٧)[١٠]**

| یەکە | ژمارەی گوند | | | ڕێژەی قەوارەی دانیشتوان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ |
| ب. قەزای مەخمور | ٣١ | ٣٣ | - | ١٦٢.٨ | ١٦٠.٦ | - |
| ناحیەی گوێڕ | ٤٩ | ٥٠ | ٢٤ | ٢٨٦ | ٤١٩.١ | ٥٨٠.٧ |
| ناحیەی کەندێناوە | ٧١ | ٤٥ | - | ٢٥٠/٢ | ٢٥٥.٦ | - |
| ناحیەی قەراج | ٨٣ | ٧٨ | ٣٧ | ١١٩.١ | ١٢٤.٥ | ١٧١.٤ |

**خشتەی ژمارە (٩)**

**دانیشتوانی گوند لە قەزای مەخمور بەپێی پلەی قەوارەیی یەکە ئیدارییەکان (٪)[١١]**

| یەکەی ئیداری | کەمتر لە ٥٠٠ کەس | | ٥٠٠–١٠٠٠ کەس | | زیاتر لە ١٠٠٠ کەس | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ | ١٩٥٧ | ١٩٧٧ |
| ب. قەزای مەخمور | ١٠٠ | ١٠٠ | – | – | – | – |
| ناحیەی گوێر | ٨٣٫٧ | ٦٠ | ١٦٫٣ | ٣٠ | – | ١٠ |
| ناحیەی کەندێناوە | ٩٣ | ٨٧ | ٧ | ١١ | – | ٢ |
| ناحیەی قەراج | ١٠٠ | ١٠٠ | – | – | – | – |
| قەزا | ٩٤٫٤ | ٨٧٫٥ | ٥٫٦ | ٩٫٦ | – | ٢٫٩ |

**کاریگەریی سیاسەتی بەعەرەبکردن**

پێشتر ئاماژەمان بەوەدا کە قەزای مەخمور بایەخێکی زۆری هەیە، جا چ لەرووی پێگە جوگرافییەکەی، کە وەک دەرگایەکی بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق سەبارەت بەپارێزگاکانی ناوەڕاست و باشوور، یان لە رووی ئەوەی، کە بنکەیەکی بازرگانی بووە بۆ بەرهەمهێنانی هەردوو ناوچە شاخاوی و دەشتاییەکان. سەرەڕای ئەوەی کە بایەخێکی باشی هەبووە لە رووی کشتوکاڵ و نەوتیشەوە. بۆیە حکومەتەکانی عێراقی هەوڵ و تەقەلایان بۆ داوە هەر لە سەردەمە زووەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقدا لە ساڵی ١٩٢١دا، بەجێبەجێکردنی نەخشەو پلانی بەعەرەبکردنی ناوچەکە.

سەرەڕای ئەوەی ئەو بەیاننامانە، کە بەپێکهاتەی نەتەوەیی ناوچەکەوە پەیوەندییان هەیە کەمن، بەڵام ئەو راپۆرتەی، کە لیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکان ساڵی ١٩٢٥ پێشکەشی کردووە بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ، ئاشکرا دەکات، کە کوردەکان زۆرینەی دانیشتوانی شارەکەن و سەر بە (لیوا)ی هەولێرن. لەرووی پێکهاتە ئیدارییەکەشییەوە لەتێکڕای دانیشتوانی شارەکە رێژەی کوردەکان ٨٩٪ کەمتر نەبووە، بەڵام عەرەبەکان تەنیا "٦٪"یان پێکدەهێنا[١٢].

لەلایەکی تر لە بەیاننامەکانی حکومەتی عێراقی کە لە ساڵی ١٩٤٧ دەرکراوە، ئاماژە بەرێژەی دانیشتوانی کوردەکان دەکات لە قەزای مەخموردا، کە "٨٠٪"ی تێکڕای دانیشتوانەکە زیاتر بوون. ئەو رێژەیەش لە هەردوو ناحیەی ناوەندو کەندێناوە بەرز بۆتەوە بۆ (٩٥٪). هەروەها لە دەرەنجامی ژمارەی دانیشتوانی ساڵی ١٩٥٧ دەرکەوت، کە رێژەی کوردەکان لە قەزای مەخمور لە ٦٤٪ تێپەڕ ناکات و لە هەردوو ناحیەی کەندێناوەو قەراجیش گەیشتۆتە ٨٥٪. بڕوانە خشتەی ژمارە (١٠)

مێژووی نوێی قەزای مەخمور، ئاماژە بەوە دەدات، کە (ئیبراهیم ئاغا دزەیی) لە بیستەکانی سەدەی رابردوو، هەوڵ و تەقەلایەکی بێ وچانی لەپێناو پاراستنی سەقامگیری و ئاسایشی ناوچەکە داوە، بەڵام شێخەکانی عەرەب لە هۆزەکانی "جبور و لەهێب و شلیلە" هۆشدارییان دا، کە زێدەڕۆیی لەسەر خاکی قەزای مەخموردا نەکات[١٤] لەگەڵ ئەوەش حکومەتە عێراقییەکان هانی ئەو هۆزە عەرەبانەیان دەدا، کە

**خشتەی ژمارە (١٠)**

**دانیشتوانی کورد لە قەزای مەخمور بەپێی یەکەی ئیداری[١٣]**

| یەکە | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ |
|---|---|---|
| ب. قەزای مەخمور | ٩٥ | ٧٥ |
| ناحیەی گوێر | ٥٠ | ٢٥ |
| ناحیەی کەندێناوە | ٩٥ | ٨٥ |
| ناحیەی قەراج | -- | ٨٥ |
| قەزا | ٨٠٫٣ | ٦٤٫١ |

له ناوچەکه نیشتەجێ بن، دەشیپاراستن، سەرجەم پێداویستییه سەرەکییەکانی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ، لەوانه دابەشکردنی زەوی کشتوکاڵی و لێدانی بیری ئاوی پێشکەش دەکردن[١٥]. هەڵبەتە ئەم کارەش هاناو سەنگی خستە نێو دانیشتوانی ناوچەکه له رووی نەتەوەییەوە، نەخوازەڵا هەڵمەتەکانی راگوێزان و کۆچ پێکردن، بەتایبەتی له نیوەی دووەمی سەدەی رابردوو، که دانیشتوانی ناوچەکه بەخۆیانەوە بینی. هەروەکو ئێستاش دەبینرێ.

دەشێ بڵێین دەیەی شەشەم له سەدەی رابردوو، راگەیاندنی کردەکی جێبەجێکردنی هەڵمەتەکانی بەعەرەبکردنی ناوچەی مەخموره. له ساڵی ١٩٦٣ هۆزەکانی لەهێبی له ناوچەی مەخمور نیشتەجێکرد. له لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی ئەو بابەته دەرکەوتووه که (٣٠) گوند له قەزاکه بەر له ساڵی ١٩٦٣دا بەزۆر راگوێزراون و لەشوێن ئەوان عەرەبیان نیشتەجێ کردوون [١٦].

گەر سەرنج بدەین تا ساڵی (١٩٧٠) هیچ خێزانێکی عەرەب لەخودی قەزای مەخمور نیشتەجێ نەبوون، جگە له بازرگانه گەڕۆکەکان نەبێ. له ساڵی (١٩٧١) خێزانی هادی عەرەب نیشتەجێ بوون. له ساڵی (١٩٧٢) خێزانی دووەم بەناوی (مەلا مەحمود) نیشتەجێ دەبن. له ساڵی (١٩٧٤) ئەحمەد مەحمود نیشتەجێ بوو..(*). (دکتۆر شاکر خەسباک) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، که (کورد) له قەزاو ناحیەکانی قەراج و گوێڕ و ناحیەی ناودند نیشتەجێ بوون. لەکاتێکدا هۆزە عەرەبەکان ڕێژەیەکی زۆر زۆر کەمیان لەو ناوچەیه پێکدەهێنا[١٧].

حکومەتی عێراقیش رێککەوتننامەی جەزایری ساڵی ١٩٧٥ی قۆزتەوەو دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەکەدا سەپاندو بەئەنقەست ژمارەیەک گوندی چۆڵ کرد، کۆمەڵه هۆزێکی عەرەبی (سنیان) و کۆمەڵەی (شێخ نایف و شێخ مونیف)ی که سەر بەهۆزی شەمەری بوون تێیدا نیشتەجێ کردن. بەهەمان شێوە هۆزی (جبور)ی له ناوچەکانی (قەراج و شەمامک) نیشتەجێ کردن و فەرمانبەری عەرەبی بۆ گواستنەوە. هەروەها هەمان کاریشی له ناحیەی گوێڕ ئەنجام دا[١٨] بۆیه لەبەیاننامەکانی ژمارەی دانیشتوانی عێراق ساڵی ١٩٧٧ بەئاشکرا ڕێژەی عەرەب له ناوچەکه جیاوازییەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی. بۆ نموونه له قەزای مەخمور له تێکڕای دانیشتوان ژمارەیان گەیشته ٣٤٪ له ناحیەی گوێڕ گەیشته ٣٥٪ و له ناحیەی قەراجیش گەیشته نزیکەی ٥٣٪[١٩].

لەلایەکی دیکه دەیەی هەشتەم بەناخۆشترین سات دادەنرێت لەژیانی دانیشتوانی قەزای مەخموردا. له لێکۆڵینەوەیەکی وردو گشتگریدا، که بۆ گوندو شارەکانی ڕووبەڕووی کاولکردن و راگوێزان بوونەتەوە له هەرێمی کوردستان، دەرکەوت، که ئەو کاره پەرەی سەندو، جەنگی عێراق و ئێرانیش لەنێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨ کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بووە.

زیاتر له (١٤٠) گوند و کۆمەڵگه کاول کراون و دانیشتوانەکانیان راگوێزراون، که ژمارەیان لەژێر رۆشنایی ئەو لێکۆڵینەوەدا گەیشتۆته (٣١٣٦٩) کەس. بروانه خشتەی ژمارە (١١).

وا دیاره دانیشتوانه کوردە راگوێزراوەکان بەسەر کۆمەڵگەکان دابەش کراون، لەوانه (دارەتوو- بنەسڵاوە- کونه گورک- سێبیران- کەورگۆسک)) له ساڵی ١٩٩٢ ژمارەی راگوێزراوەکان گەیشته (٣٨) هەزار کەس[٢٠].

وا دیاره لەپاش راپەڕینەکەی ئازاری ساڵی ١٩٩١، ناوچەکه هەر لەژێر کۆنتڕۆڵی حکومەتی عێراقی مایەوەو تەواوی هەوڵ و تەقەلاکانی چڕتر کرد، بۆ چاندنی تۆی هۆز و خێزانه عەرەبەکان له ناوچەکەو

**خشتەی ژمارە (١١)**

**دانیشتوانی گوندە راگوێزراوەکان له قەزای مەخمور (١٩٦٣-١٩٨٨)[٢١]**

| یەکە | ژمارەی گوند | ژمارەی خێزان |
|---|---|---|
| ب. قەزای مەخمور | ٥٢ | ٩٠٦ |
| ناحیەی گوێڕ | ٤٠ | ٢٦٣٧ |
| ناحیەی کەندێناوە | ٤٩ | ٢٤٣٢ |
| کۆی قەزا | ١٤١ | ٥٩٧٥ |

ئاسانکردنی کاروبارەکانیان و دابەشکردنی زەوەی کشتوکالی بەسەریاندا و کردنەوەی ئۆردووگا بۆیان، لەوانە" رساله- سەرگەران- تەل جبال- عەدنانیە- وەحدە". شایانی باسە ئەو هۆزانەی تێیدا نیشتەجێ کردن: "جبور، لەهێب، شەلیلە، تەی، سیاوی شەممەر سەدید" بوون[22]. ئەو هەلمەتانەش هەر بەردەوام بوو، بەتایبەت پاش ئەوەی قەزای مەخمور بەپارێزگای نەینەواوە لکێنرا. تا وای لێ هات بازنەی بەعەرەبکردن هێلی (36)ی لەناو خاکی هەرێمی کوردستانی ئازادکراودا بەزاند..

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:


١- طه الهاشمي، مفصل جغرافية العراق، مطبعة دار السلام، بغداد ١٩٣٠، ص٥٥٤.
٢- وزارة التخطيط، المجموعة الاحصائية السنوية لسنة ١٩٨٧، واحصاء السكان لسنة ١٩٨٧، محافظة اربيل، جدول (٢٢)، بغداد، مطبعة الجهاز المركزي/ ١٩٨٨.
٣- جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، مطبعة الاجيال، بغداد ص٢٧٤.
٤- شاكر خصباك، العراق الشمالي، مطبعة شفيق، بغداد، ص ١٩ وا ٤
٥- سەرژمێری دانیشتوانی عێراق، سالانی: (١٩٥٧) و (١٩٦٥) و (١٩٧٧) و (١٩٨٧* والحصر الاولي للسكان لسنة (١٩٧٠).
٦- هەمان سەرژمێرەکانی رابردوو.
٧- سەرژمێری دانیشتوانی عێراق بۆ سالانی ١٩٥٧) و (١٩٨٧) و (الحصر الاولي لسنة ١٩٧٠).
٨- سەرژمێری دانیشتوانی عێراق بۆ سالانی ئاماژەپێکراو لە خشتەکاندا.
٩- سەرژمێری دانیشتوانی عێراق بۆ سالانی (١٩٥٧ و ١٩٨٧ و ١٩٧٠).
١٠- سەرچاوەی پێشوو.
١١- سەرژمێری دانیشتوانی عێراق بۆ سالانی (١٩٥٧) و (١٩٧٧).
١٢- تقرير لجنة عصبة الامم لحل مشكلة ولاية الموصل "مسألة الحدود بين تركية والعراق" مطبعة الحكومة بغداد، ١٩٢٤، ص٩٤، وايضاً فاضل حسين، مشكلة ولاية الموصل، مطبعة اسيلة بغداد، ١٩٧٧، ص١٢١.
١٣- احمد فوزي، خناجر وجبال (قاسم والاكراد). بيروت، ١٩٦١، ص٣٨، هەروەها بروانە: محمود الدرة، القضية الكردية، منشورات دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٣، ص٢٠٧.
١٤- (برایەتی) رۆژنامەی پارتی دیموکراتی کوردستان، ژ. (٢٧١٠) لە ١٩٩٨/١١/٢ و گۆڤاری (قەرەچوغ)، یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی دەری دەکا، ژ. (٦ و ٧)، ل ٣٢، سالی (٢٠٠٠) هەولێر.
١٥- (کوردستانی نوێ)، رۆژنامەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ژ.(١٧٢٥) لە ١٩٩٨/١٠/٢٢.
١٦- محمد سعید صوفی، فایلی تەعریبی دەشتی هەولێر، کوردستانی نوێ ژ. (١٩٨٢) لە ١٩٩٩/١٠/٢٤.
١٧- کوردستانی نوێ، سەرچاوەی پێشوو، لە ١٩٩٨/١٠/٢٢.
١٨- شاکر خصباک، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٢.
١٩- قەرەچوغ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.
٢٠- فەیسەل دەباغ، کوردو کەمە نەتەوەیەکانی تر لە سالی ١٩٧٧دا، بەشی دووەم، هەولێر، ل٣٩.
٢١- **Shars M.R statistion of Atrnoeites in Iraq Kurdistan, U.S.A 199 P.P 70.**
٢٢- کوردستانی نوێ، ژمارەی پێشوو لە ١٩٩٨/١٠/٢٢.

# دەشتی قەراج

جەلال مەولود ئەحمەد سنجاوی

**قەراج قەراجە، قەراج لە غێمێ**
**لە نەوییانم بۆ وەرە لە برندانت دێمێ**
**رەبی گوارەت پیرۆز بێ لەگەر خەزێمێ**

دەشتی قەراج دەشتێکی پان و بەرین و ناوچەیەکی کشتوکاڵی بە بڕشت و بەهەرمێنە، بە پێی دابەشبوونی ئیداری ناحیەکە سەر بەقەزای مەخموورە، مەڵبەندی ناحیەکەش شارە دێی (باقرت) ە . بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ قەراج لە (٨٣) گوند پێکهاتبوو، کە سەرجەمی ژمارەی دانیشتوانی دەگەیشتە (٩٨٨٨) کەس، ئەو ژمارەیە بەشێکی کەمی لێ بترازێ، ئەوانی دیکە هەر هەمووی کوردن، تەنیا لە بەشی باشووری سنووری قەراج هەندێ عەشایەری کۆچەرو دەوارنشینی عارەب تێکەڵ بە کوردەکان دەژیان، بەرامبەر بەم ژمارەیەش، بەشێکی زۆر لە کوردەکان وەک پوازی پەلهاویشتە تێکەڵ بە عارەبەکان بوون.

دەشتی قەراج نزیکەی (٧٠) کیلۆمەتر لە سەنتەری شاری هەولێر دوورەو لە رووی جیۆپۆلەتیکەوە قووڵایی ستراتیژی بۆ باشووری هەولێری پایتەخت دەسازێنێ و بەئەمباری لەبن نەهاتووی دانەوێڵە، بەتایبەتی (گەنم و جۆ) دادەنرێت و بەشدارییەکی باشی بژێوی هاووڵاتیان و دەستەبەرکردنی ئەمنی خۆراک دەکات. دەشتی قەراج ملوانکەی ئەڵماسی گەردەنی کوردستانەو هەوارگەی مەڕدارانی کوڕانی سۆرانی و شوێنگەی ڕاووشکارو کۆچ و کۆچباری خێڵەساتی دزەییان و مەملەکەتی حەیران و ئەفسانەو حەکایەتی خوڕافی و پەندو قسەی نەستەق و سوارچاک و عەگیدانی مەیدان و هەگبەی گرانبەهای کلتوورو کەلچەر و ئەتنۆگرافیای دەشتی هەولێرە.

لەبارەی ناوی قەراج ڕای جیاواز هەن، پارێزەر، (جەمال بابان) لە کتێبی (ڕیشەی ناوی شارو شوێنگەکان) دەڵێ: ناوی قەراج لە (قرە چوخلق) هاتووە، بەمانای (پێدەشتێکی رەش) دێت، هەروا مامۆستا هوشیار عەبدوڵڵا دەڵێ: قەراج لە دوو برگە پێکهاتووە، وشەی (قەرە) بەمانای رەش و (ئاج) بەمانای برسی دێت، واتە(ڕەشی برسی) یان (ڕەشێکی برسی) لەوانەشە ناوی (قەراج) لە (قەرە قاچ)ەوە هاتبێت، ئەمەش ناوی دارێکە لە "کلکەی قەرەچووغ و زوورگی قەرەبۆتک " و بە تێپەڕبوونی کات و سات وشەکە سواوەو بووە بە (قەراج)[٢] ڕەنگە ناوی قەراج لە زەوی ڕەش یان ناوچەیەکی چۆڵەوە هاتبێت. بۆ نموونە لە دەشتی هەولێر پەندێکی پێشینان هەیە، دەڵێ "دەرێی دەشتی قەراجە"، واتە ناوچەیەکی چۆڵە و کەسی لێ نییە، ئەمەش بۆ ئەو ڕۆژگارانە دەگەڕێتەوە کە قەراج دەشتێکی کەم ئاوەدان بووە و بەگوێرەی قسەی دنیادیتەکان و بەتەمەنەکان، ئەم دەشتە نزیکەی ١٥٠ ساڵێک بەر لەئێستا چۆڵ بووە و تەنیا لەبەهاران مەڕداران هەوار و هەوارگەیان لێ دامەزراند، بە هاتنی گەرمای هاوین دەشتەکەیان بەجێ دەهێشت، لە دیمانەیەکی تایبەتدا (حاجی مەولودی بایزی) کە لەدایکبووی ساڵی (١٨٨٥) ە و تەمەنی ١١٥ ساڵە و لە عەشیرەتی بڵباسە و ئێستاش لەژیاندا ماوە، پێی گوتم:

لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا ، واتە سەرەتای ساڵی ١٩٠٠ ، لەگەڵ باوکیدا لە کلکەی دارە بزماران مەڕ و

مالاتیان ئاودیوی دەشتی قەراج کردووە بۆ ئاقاری گوندی (چارگۆمان)و دەشتەکەی بە چۆلی دیوە، تەنانەت ئەم دەشتە زۆر ترسناک و بە سام بووە و مەڵبەندی دزی و ڕێگری بووە[٣].

**سنوور و پێکهاتەی خاک:**

دەشتی قەراج درێژییەکەی (١١٠) کیلۆمەتر و پانییەکەی (٦٢) کیلۆمەتر دەبێت، جگە لە هەندێ گردی بەرز، بەشێوەیەکی گشتی ڕووی خاکەکەی پێدەشتە و مامناوەندی بەرزایی (٢٠٠- ٢٥٠) مەتر (لە ئاستی ڕووی دەریاوە) دەبێت.

ئەم خشتەیەی خوارەوە هەندێ لە دەشتەکانی هەولێر دیار دەخات:

| ت | دەشتەکان | درێژی/ کم | پانی/ کم | بەرزی/م |
|---|---|---|---|---|
| ١ | دەشتی هەولێر | ٨٥ | ٣٥ | ٤٥٠ -٣٠٠ |
| ٢ | کەندیناوە | ٨٠ | ١٦ | ٣٥٠ -٣٠٠ |
| ٣ | قەراج | ١١٠ | ٣٢ | ٢٠٠ -٢٥٠ |
| ٤ | هەریر | ٢٠ | ١٥ | ٦٠٠ -٥٠٠ |

سنووری دەشتەکە، لە باکوور زنجیرە چیای قەرەچووغ، لە باشوور زێی گەورەی بادینان، لە ڕۆژهەڵات زێی بچووک، لە ڕۆژئاوا زێی گەورە- بادینان.

پێکهاتەی خاکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی چاخە جیۆلۆجییە ئالۆزەکان و ناوچەکە لە نیشەنیەکی ئەستوور داپۆشراو پێکهاتووە و قووڵایی خاکەکەی لە نێوان (٣- ٥) مەتر دەبێت لە هەموو شوێنێکدا، تەنیا لە بناری چیای قەرەچووغ نەبێت، کە بە هۆکاری داڕووتانی خاک و کردەی باران بارین و تۆز و با خاکەکەی داماڵراوە و کەڤرەکانی بە زەقی دیار کەوتوون.

ڕووبەری زەوییە کشتوکاڵییەکانی دەشتی قەراج بەهەموو گوندەکانییەوە دەگاتە (؟) کیلۆمەتری چوارگۆشە و تەنیا هەندێ شوێنی کەند و گردایییەکانی لێ بترازێ ئەوانی دیکەی بۆ کشتوکاڵی دانەوێڵە بەسوودن و لە ساڵانی هاتدا، واتە ئەو ساڵانەی باران زۆر دەبارێ، ئەوەندە گەنم و جۆ لە قەراج دێتە بەرهەم کە ئەمبارەکان پڕ دەبن و (سایلۆ)کان زیادەکەی بۆ شارەکانی دیکە بار دەکرێت.

**ئاو و هەوای دەشتی قەراج**

بەشێوەیەکی گشتی ئاو و هەوای دەشتی قەراج لە زستان ساردە و لە هاوینان گەرم و وشکە و، پێ ناچێ ڕووباری بادینان لە ڕۆژئاوا و زێی بچووک لە ڕۆژهەڵات کاریگەرییەکی ئەوتۆ بکەنە سەر گۆڕانکارییەکانی زەوپۆش لەم دەشتە، تەنانەت چیای قەرەچووغیش لە باکوور کە (٨٢١) مەتر بەرزە کاریگەرییەکی ئەوتۆ ناکاتە سەر گۆڕانکارییەکانی ئاو و هەوای دەشتی قەراج.

بە هۆی پۆلینکردنی (کوپن-koppen)، دەشتی قەراج دەچێتە نێو بازنەی سیستەمی ئاو هەوای دەشتی هەولێر، ئەوەش لەبەر دووری دەشتەکە لە چیا بەرزەکان، بۆیە بەدەگمەن بەفری لێ دەبارێت و ڕێژەی باران بارینیشی زۆر لە باکووری هەولێر کەمترە[٤].

**ڕێژەی داباریی ساڵانەی باران لە قەراج بەم جۆرەیە:**

کۆی گشتی باران، لە پاییزان ٥٢/٩ ملم و لە زستانان ١٩٥/٨ ملم و لە بەهارانیش /١٣٤ ملم دەبێت و لە هاوینانیش بارانی لێ نابارێ و گەرمەسێرە.

کۆی گشتی باران لە هەموو کەژەکانی ساڵ لە دەشتەکە دەگاتە (٣٨٣) ملم بە گشتی، سەرچاوەکانی ئاو لەم دەشتە ئاوی بارانە و کشتوکاڵەکەی پشت بە ئاوی باران دەبەستێت، تەنیا لەو گوندانە نەبێت، کە دەکەونە ڕۆخانی هەردوو ڕووباری (گەورە و بچووک) شینایی و بێستانەکانیان لە سەر ڕووبارەکە کراوە و بەهۆی ئاوی ڕووبارەوە ئاو دەدرێن جگە لەمە دەشتەکە بەشێوەیەکی گشتی وشک و بێ ئاوە، بەڵام لەهەندێ شوێندا بەتایبەتی لە بەهاران گۆمی گەورەی هەیە کە سەرچاوەی ئاودانی مەڕو ماڵاتە، وەک:

(گۆمی قورینگان- گۆمی عەقدالێ- گۆمی مارواشان- گۆمی شەمێ- گۆمی ئۆمەر کوژرای، گۆمی بەراز کوژرای، گۆمی بازنان، گۆمی سێ قولینچک، خەندەکی بابە خەلیفەی...) لە چیای قەرەچووغیش لەو دیوەی دەڕوانێتە قەراج چەند کانییەک هەن، بەڵام ئاویان کەمە و ئاوەکەیان تاڵە و بۆ خواردنەوە دەست نادەن، وەک کانی (خەزران، تاریکە، کۆتکە، چک چکە، کانی مامزان) و هەردوو جۆگە ئاوی (ئاوی بن بەردی) و (ئاوی ئاشان). سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە لە قەراج ئەو بیرانەن، کە خەڵکەکە بەدەست هەڵیان کەندووە و هەر گوندێک

بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان و مەڕومالآت و باخچەکانیان چەند بیرێکیان هەلکەندووە و بەدەست لێیان داون (hand dug) قوولآیی بیرەکان لە نێوان (٢٠- ٤٠) مەتر دەبێت، لە دوایی سالآنی حەفتاکانەوە حکومەت ژمارەیەکی زۆری بیری ئیرتیوازی (drilled wells) لە گوندەکان لێدا و قوولآیی ئەم بیرانەش لە نێوان (١٠٠- ٢٠٠) مەتر دەبێت، بەلآم ئاویان زۆرە و بەشی پێویستییەکانی خەلکەکەی دەکرد(٥).

**ڕووەکی سروشتی و سامانی ئاژەل:**

ڕووەکی سروشتی، دەشتی قەراج لە جۆری ڕووەکی گەرمەسێرە، واتە ڕووەکی دڕکاوی و بیابانییە، لە بەهاران بەهۆی باران بارین بە هەزاران جۆر لە ڕووەک ئەم دەشتە دادەپۆشێ، یەک پارچە دەبێتە ئەتلەسێکی سەوزی نەرمەگیای درێژ و کورت، بۆیە بەباشترین لەوەڕگا و پاوانی باشووری دەشتی هەولێر دەژمێردرێ، بەلآم لە هاویناندا پاوانەکە وشک دەبێ و لەوەڕگاکە ئەو نرخەی بەهارانی نامێنێ، بۆیە کۆچ و کۆچباری مەڕداران ڕوو لە چیای قەرەچووغ و کەندێناوە دەکەن. شاخی قەرەچووغیش بەهەمان شێوە وشک و کەم ڕووەکە، تەنیا لەهەندێ شوێنی نەبێت کە "دار قەزوان"، "بەرالووک"، "دارەبەن" و "شەواشینک" و "هەنجیرە کێوی"- جنەنار- ی لێ دەڕوێ، کە خەلکەکە بۆ سوودتەمەنی بەکاری دێنن، جگە لەمانەش لە دەشتەکە هەندێ گژوگیای دیکە هەیە، وەک. "پیفۆک، قێزبەلە، کەنگر، کاردی، گیامامزە، دانەقەتێ، شمرشاق، مقەسە، بزن تڕێنە، گلێخە، خورماچیچە، زەرگەزەوی، گونە پشیلە، غەدارە، چەورۆکە، قوڕادە، خرنووک، شەفەلە، ترشۆکە، دۆمبەلآن، کوارگ". لەبارەی سامانی ئاژەل لە دەشتی قەراج بە شێوەیەکی سەرەکی خەلکەکە (مەڕ و بزن) بەخێو دەکەن کە پێی دەلێن مێگەل، ژمارەی مەڕ و بزنی هەندێ مێگەل لەنێوان (٣٠٠-٥٠٠) سەر دەبوو، هەندێ لە مەڕدارە دەولەمەندەکان ژمارەی مێگەلەکەیان دەگەیشتە ١٥٠٠-٢٥٠٠ سەرمەڕ و بزن، بۆیە ناچار دەبوون کە ژمارەیەکی زۆر لە شوان بەکرێ بگرن بۆ لەوەڕاندنیان، سالآنە سوودێکی زۆریان لە ماست و پەنیر و خوری و ڕۆنی ئاژەل دەکرد، جگە لەو پارە زۆرەی کە لە ئەنجامی فرۆشتنی بەشێک لە مێگەلەکە بە دەستیان دەکەوت، لەکاتی وشکە سالی و بێ بارانیدا مێگەل بەرەو باکووری هەولێر بەڕێ دەکەوت و لە دەشتی بیتوێن و دەشتی کۆیە ڕەشمالیان هەلدەدا، لە کۆتایی کەژی پایزاندا دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان. جگە لەمانە خەلکی ئەم دەشتە ژمارەیەکی زۆر لە چێل و گوێدرێژ و ئەسپ بۆ کاری کشتوکالی بەخێودەکەن و ڕۆژانە سوودیان لێ دەبینن.

**کشتوکال لە دەشتی قەراج:**

بەشێوەیەکی گشتی قەراج دەشتێکی کشتوکالییە و دانیشتوانەکەی بەپلەی یەکەم پشت بە کشتوکال و ئاژەلداری دەبەستن، ئەوەش بۆ ئەو هۆکارە سروشتییانە دەگەڕێتەوە کە لەزۆری بەرهەمی سالآنەی دانەوێلەی (گەنم و جۆ) یارمەتی جووتیاران دەدات.

بڕشتی زەوی و لەباری ئاوو هەواو دابارینی بارانێکی زۆر، لەو هۆکارە سەرەکییانەن کە کشتوکالی دەشتەکە پێش دەخەن، بەلآم بە هۆی هەلکشان و داکشانی ڕێژەی باران بارین لە سالێکەوە بۆ سالێکی دیکە، بۆتە هۆی ئەوەی خەلکێکی زۆر تووشی برسێتی و دەربەدەری بکات، جاری وا هەیە وشکە سالی لەم دەشتە چەند سالێک دەخایەنێ و جووتیاران ناچار دەکات ئومێدبڕ بن و دێهاتەکان بەجێ بهێلن، کەچی سالی وا هەیە بارانێکی زۆر دەبارێ و دەبێتە هات، کە لەوانەیە جێی یەک عەلبە گەنم چل عەلبە بەرهەم بهێنێ، بۆیە لەنێو خەلکی دەشتی هەولێر بووە بەپەند و دەلێن:"دەرێی هاتی قەراجییە".

جووتیارانی دەشتی قەراج، تاکو سالآنی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ژێر دەستەی دەرەبەگ و کوێخاکانی گوندەکان بوون و هەموو ماندووبوونیان بە خۆڕایی دەچوو، ئەمەش لە دەشتی هەولێر بۆتە پەند و دەلێن (مارداری کەرێ ڕەنج بە خەساری)، بەلآم دوای بوونی عێراق بەکۆماری و دەرچوونی یاساکانی چارەسەرکرنی کشتوکالی، بەتایبەتی یاسای بەمولکیەت کردنی زەوی جووتیاران، ئەم دەشتە تەبای خەلکانی دیکە هەستیان بە ئارامی و هێمنی کردو تۆزێک لە مەینەت و ناخۆشی ژیان حەسانەوە، بەلآم لەگەل ئەوەشدا سەد دەرسەد نەبوون بەخاوەنی هەموو زەوییەکان. ئەم خشتەیەی خوارەوە زەوییەکانی میری و مولکدارەکانی گوندەکانی قەراج دیاردەخات(٦).

**یەکـــەی بەڕێوەبردن/ قەراج (قەزای مەخموور)، دابەشکردنی زەوییەکـانی میری و موڵکدارەکان**

| ت | گوندەکان | سەرجەمی رووبەر بە (دۆنم) | زەوی موڵکدارەکان بە (دۆنم) | زەوی میری بە (دۆنم) | شیاوی چاندن نییە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | کونە سیخوڕە | ٤٧٤٤ | ٢٤٣٥ | ٢٣٠٠ | ٩ |
| ٢ | سەلماس | ٢٨٨٠ | ١٦٠١ | ١٢٧١ | ٨ |
| ٣ | گرد قۆشەنە | ٦٦٦٦ | ٤٠٧٦ | ٢٥٦١ | ٢٩ |
| ٤ | سێگردکان | ٢٩٥٦ | ٢٠٠٠ | ٩٠٠ | ٥٦ |
| ٥ | باقرتە | ١٢٠٥٦ | ---------- | ١١٩٦٤ | ٩٢ |
| ٦ | گۆمە شین | ٥٩٨٩ | ١٧٧٦ | ٤١٩٦ | ١٧ |
| ٧ | گەزۆك | ٢٩٢٦ | ٩٣٠ | ١٩٨٣ | ١٣ |
| ٨ | موحسین ئاوا | ٣١١٨ | ١٩٣٢ | ١١٧٦ | ١٠ |
| ٩ | خەزنە | ٢٤٨١ | ١٣٤١ | ١١٣١ | ٩ |
| ١٠ | گردی گۆم | ٤٧٧١ | ٤٥٤٨ | ١٨٩ | ٣٤ |
| ١١ | شۆرە پەلکە | ٦٥٥١ | ٤٦٧٦ | ٢٠٤١ | ٣٤ |
| ١٢ | کەر مردی | ٥٤٢٦ | ٢٥١٤ | ٢٩٠٩ | ٣ |
| ١٣ | خڕە بەردان | ٦٦٦٩ | ٥٢٥٧ | ٩٥٣ | ٣٥٩ |
| ١٤ | عین شەهاب | ٢٦٠٨ | ١٣٦٣ | ١٩٨ | ١٠٤٧ |
| ١٥ | خڕبەجیل | ٦٨٠٨ | ٥٤٤٥ | ١٢٨٤ | ٧٩ |
| ١٦ | قۆبیلە | ٦٥٤٥ | ٤٣٧٨ | ١٦٦٧ | ٥٠٠ |
| ١٧ | عینکاوا | ٥١٦٣ | ٣٣٨٩ | ١٦٩٩ | ٧٥ |
| ١٨ | شیالە | ٣٦٨٥ | -------- | ٣٦٨٣ | ٢ |
| ١٩ | شێراوە | ١٧٤١ | ١٧٣٤ | ------- | ٧ |
| ٢٠ | شندر تحتانی | ٥٠٦١ | ١٨٥٠ | ٣١١٠ | ٦٤١ |
| ٢١ | خەرابە زەرد | ٣٧٨٨ | ٣٠٠ | ٣٤٢٥ | ٦٣ |
| ٢٢ | شندر فوقانی | ٤٩٢٣ | ٣٥٤ | ٤٥٣٩ | ٣٠ |
| ٢٣ | سرتاج بچووك | ٦١٩٠ | ٤٥١١ | ١٦٦١ | ١٨ |
| ٢٤ | حەسارۆك | ٢٦٣٩ | ١١٨٠ | ١٤٣٧ | ٢٢ |
| ٢٥ | حوشترالووك | ٥٩٠٤ | ١٤٩١ | ٤٣٨٢ | ٣١ |
| ٢٦ | قووچ | ٣٠٩٨ | ١٦٧٠ | ١٣٩٦ | ٣٢ |
| ٢٧ | گردە پان | ٤٥١٨ | ٢١٤٥ | ٢٣٥٩ | ١٤ |
| ٢٨ | سوتاج گەورە | ٩٨٥٠ | ٢١٤٩ | ٧٦٦١ | ٤٠ |
| ٢٩ | عەدلە | ٥٥٣٥ | ١٠٩٠ | ٤٣٩٨ | ٤٧ |
| ٣٠ | عەزیز عەبدە | ٤٤٠٧ | ٨٦١ | ٣٥٤٩ | ٣ |
| ٣١ | خەرابە جوالە | ١٨١٢ | ٣٦٠ | ١٤٤٤ | ٨ |
| ٣٢ | ئەگرەح فوقانی | ٦٤٩١ | ٩٤٢ | ٥٥٣٤ | ١٥ |
| ٣٣ | خربە خلف | ٣٩٤٠ | ٢٤٢ | ٣٦٨٥ | ١٣ |
| ٣٤ | گۆمی ماروانشان | ١٠٩٩١ | ٩٢٠ | ١٠٠٥٤ | ١٧ |
| ٣٥ | خەرابە بندیان | ٦٢٤٠ | ٥٥١ | ٥٦٧٢ | ١٧ |
| ٣٦ | شیناوە | ٤٩١٦ | ١٨٩ | ٤٦٠٠ | ١٢٧ |
| ٣٧ | گردی گۆم | ٨٥٩٨ | ٢٤٥ | ٨١٣٣ | ٢٢٠ |

**تێبینی: ئەم زانیاریانە بۆ یەکـــەم جـــارە بڵاو دەکرێنەوە.**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٨ | تل غزال | ٤٩٧٧ | ٤٦٧ | ٣٤٩٣ | ١٠١٧ |
| ٣٩ | عربۆك | ٣٩٨٧ | ٣٧٥ | ٣٦٠٢ | ١٠ |
| ٤٠ | لزاكە – گورە رەش | ٣١٩٧ | ٣٨٣ | ٢٨٠٤ | ١٠ |
| ٤١ | خەرابە گردە دوم | ١٧١٩ | ------ | ١٧١٩ | ----- |
| ٤٢ | گردە دیوانە | ٤٩٨٠ | ٦٢٤ | ٤٣٤٦ | ١٠ |
| ٤٣ | رواله | ١٥١٠٦ | ١١٨٣٢ | ٣١٤٩ | ١٢٥ |
| ٤٤ | گردە هارە | ٤٦٨٠ | ١٢٣١ | ٣٤١٠ | ٣٩ |
| ٤٥ | لاكەچە | ٥١٠٣ | ٢٣٢١ | ٢٧٦١ | ٢١ |
| ٤٦ | خەندەقی گەورە | ١٩٦١ | ٤٦٧ | ٣٤٩٣ | ١٠٠١ |
| ٤٧ | باشتەپە | ٢٧٢٧ | ١٤٥٨ | ١١٨٩ | ٨٠ |
| ٤٨ | خەندەقی گچكە | ٧٦٩٢ | ٦٦٤ | ٣٠٠٨ | ٢٠ |
| ٤٩ | گردە گلێخە | ٤٩١١ | ٢١٥٥ | ٢٧١٣ | ٤٣ |
| ٥٠ | قەبری سەیدی | ٢٩٧٤ | ١٠٠٠ | ١٩١١ | ٦٣ |
| ٥١ | دینگاوە | ٦١٣٦ | ٣١١٤ | ٢٩٤٣ | ٧٩ |
| ٥٢ | تل المطر | ٥٥٦٨ | ٣٥٢٤ | ١٩٨٢ | ٦٢ |
| ٥٣ | جوكۆژ | ٥٤٥٩ | ------- | ٤٦٠٥ | ١٤٦ |
| ٥٤ | دوسەرەی ژێری | ٩٤٨٦ | ١٨١١ | ٧٦٢٥ | ٥٠ |
| ٥٥ | لاسۆر | ٣٦٣٥ | ------- | ٣٥٦٥ | ٧٠ |
| ٥٦ | پونگینە | ٤٢٥٠ | ١٨٨٠ | ٢٣٣٠ | ٤٠ |
| ٥٧ | برایم باول | ٥٥٩٩ | ١٦٨٤ | ٣٧٩٥ | ١٢٠ |
| ٥٨ | گردە بۆر | ١٥٤١ | ١٢٥١ | ٢٧٩ | ١١ |
| ٥٩ | گردە چال | ٢٦٥٨ | ٢٠٠٠ | ٦٤٦ | ١٢ |
| ٦٠ | گول گامێشە | ٤٩٧٩ | ٢١٧٥ | ٢٧٦٢ | ٤٢ |
| ٦١ | گوكتەپە | ٣٧٩١ | ٢٢٢٧ | ١٥٦٠ | ٤ |
| ٦٢ | قوچە سپیلكە | ٢٧١٢ | ٢٦٣٨ | ٦٤ | ١٠ |
| ٦٣ | گردە رەشە | ٢٤٤٩ | ------ | ٢٤١٣ | ٣٦ |
| ٦٤ | دوسەرە بالا | ٥٨٧٤ | ٤٤٥٣ | ١٣٢٤ | ٩٧ |
| ٦٥ | گردە گراوی | ٨٤٠٣ | ------ | ٨١٧٦ | ٢٢٧ |
| ٦٦ | كەلەشخان | ٧٥٤٦ | ٢٧٨٤ | ٢٦٨٤ | ٢٠٧٨ |
| ٦٧ | چارگۆمان – بەردە سپی | ١٤١٨٥ | ------- | ٧٥٦٧ | ٦٦١٨ |
| ٦٨ | عەلیە رەش | ١٠٣٨٦ | ------- | ٥١٩٦ | ٥١٩٠ |
| ٦٩ | قەڵاتە سۆر | ١٤٩٨٧ | ٢٠٧٧ | ٣٨١٢ | ٩٠٩٨ |
| ٧٠ | مەعمەر ئۆمەران | ١٠٣٣٦ | ٥٠٤٤ | ٥٢٣٠ | ٦٢ |
| ٧١ | ئازی كەند | ١٤٣٠٢ | ٢٠٠٠ | ٤٨٤٢ | ٧٤٦٠ |

**راگوێزان و کۆچ پێکردنی دانیشتوانی دەشتی قەراج**

راگوێزان و کۆچ پێکردنی کوردەکان لە دەشتی قەراج، بۆ رۆژگارێکی دوور دەگەڕێتەوە، هەر دوای دامەزراندنی رژێمی پاشایەتی لە عێراق و هاتنە سەر تەختی شافەیسەڵی یەکەم، ئیتر بەرنامەیەکی نەتەوەیی ستراتیژی بۆ تەسک کردنەوەی سنووری ناوچە کوردنشینەکان دارێژرا و بۆ هێنانەدی ئەو خەونە نەزۆکەش عەشایری بەدووی عەرەبیان هاندا کۆچ بۆ ناوچە کشتوکاڵییەکان و پاوان و لەوەڕگاکانی کوردستان بکەن، بەمەش حکومەت بۆ تەعریبکردنی دەشتی قەراج رەگێکی مێژوویی قووڵی هەیە، چونکە بەهەرمێنترین ناوچە کشتوکاڵییەکانی دەشتی هەولێرە و بە ئەمباری لەبن نەهاتووی دانەوێڵە (گەنم و جۆ) ناوزەد دەکرێت، جگە لەو هەموو کانزا گرنگەی لە چیای قەرەچووغدا هەیە، بە تایبەتی (نەوت) کە بە گوێرەی لێتوێژینەوەی پسپۆرانی نەوت، ژێر چیای قەرەچووغ دەریایەکە لە نەوت و لەوانەیە یەددگی ئەم نەوتە هیچی لە (بابە گوڕگوڕ) کەمتر نەبێت، بەرهەمی خەمڵێنراوی هەر چاڵێکی (٧٠٠٠) حەوت هەزار بەرمیل دەبێت. سەرجەمی دانیشتوانی گوندەکانی دەشتی قەراج لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ گەیشتە (٩٨٨٨) کەس و لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ دابەزییە سەر (٩٧١٢) کەس، کە ژمارەی نێر (٤٦٨٦) و مێ (٥٠٢٦) کەسن، کەچی لە سەرژمێری ساڵی ١٩٨٧ پتر دابەزی بۆ (٧٧٥٨) کەس، کە (٣٧٧١) نێر و (٣٩٨٧) مێ بوون.

دوای کودەتا شوومەکەی (١٩٦٣)ی حەرەس قەومییانی عەشایەری (شێخ حەواس) و (شێخ حەنەش)، کە بەدوو بوون بە هێزێکی زۆری عەشایەر و پشتگیری حکومەت بەشێکی زۆری گوندەکانی باشووری قەراجیان داگیر کرد. دوایی ساڵی ١٩٧٤ و دەست پێکردنەوەی شەڕ، بەشێکی دیکەی گوندەکانی قەراج کاول کران و بە گەیشتنی ساڵی (١٩٨٧) هەموو گوندەکانی دەشتی قەراج کاول کران و بوون بە پاوان و لەوەڕگای دەشتی عەشایەری (جبور، لهێب، شەمەر، البوحمدان، بەدوو....هتد)، لە کاتێکدا لە کۆی (١٨) عەشیرەت و بنەماڵە، کە لە سەرژمێری (١٩٥٧) لە قەراج تۆمار کراون (١٣)یان کوردن، لەوانە: بەرەبابی فارس، بەرەبایی بایز، بەرەبابی مام خولە، بندیان، پالانی، مامەسێنی، سیان، فەقێ مەلکی، ئالی کوتکی، ئۆمەر بل، وەتمان، سارمەمی، باجەلان)، تەنها لە باشووری قەراج هەندێ ماڵە عارەب لەگەڵ کوردەکان دەژیان، کە ژمارەیان زۆر کەم بوو.

**ئەتنۆگرافیای دەشتی قەراج**

دەشتی قەراج بە پێی هەڵکەوتنی شوێنە جوگرافییەکەی، کە دەکەوێتە دوا هەرێمی باشووری پارێزگای هەولێر و خەڵکەکەی ساڵانێکی زۆرە هامۆشۆ و پەیوەندی دۆستایەتی و خزمایەتییان لەگەڵ عەشایەری عارەب پەیدا کردووە، بە هۆی ژن بە ژنی و کچ لێ خواستن، بۆیە هەندێک لە دانیشتووانەکەی بوونەتە خاڵ و خوارزای یەکتر و داب و نەریتیان تێکەڵ بە یەکتر بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیویانە داب و نەریتی کوردەواری و فۆلکلۆرەکەی خۆیان بپارێزن و بە بەرگی رەسەنایەتی بیرازێننەوە.

ئەتنۆگرافیای دەشتی قەراج هەموو جموجۆڵێکی ژیانی رۆژانە و کشتکاری و ئاژەڵداری و پیشەی دەستکرد و نەریتی کۆمەڵایەتی ناوچەکە لە جل و بەرگ و ئاهەنگ گێڕان و مەراسیمی پرسە و دانیشتنی دیوەخان و تەکیەی دەروێشان و ئەفسانەکان و حەیران و حەکایەتی خورافی و بەیتی دروێنە و شایی و ژیانی رەشماڵان و راووشکار و شەوین و شیوەخوار و پیشەی جۆلایی و تەونکەری و بەیتاری و نوشتە و جادووگەری دەگرێتەوە. بە گشتی خەڵکی قەراج مرۆڤی ژیر و دنیا دیتە و میوان راگر و قسە خۆش و ئازا و بوێرن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پاک و خاوێن و دڵتەڕن، ئافرەتیان لە کاری کشتکاری و مەڕداری، وەک پیاو وانە، ئافرەتی وایان تیادا هەڵکەوتووە شوانی کردووە و بۆ شەوینیش دەرچووە، (هاملتۆن) لە کتێبەکەی (رێگایەک لە کوردستاندا) باس لە ئافرەتی مەخموور و دەشتی قەراج دەکات و بە خانمانی دەست رەنگین ناویان دەبات. حەیران بێژەکانیش لە دەقەکانی حەیراندا، بە جوانی و دڵڕفێنی دەشتی قەراجییان هەڵداوەو شاعیرانیشمان لەم بارەیەوە درێخییان نەکردووە، ئەمانە گشتی بەشێکی دانەبڕاوە لە کلتوور و کەلچەری ناوچەکە و بە تێکڕا ئەتنۆ گرافیای دەشتەکە پێک دەهێنن.

**حەیران و کۆچ و کۆچبار لە قەراج**

دەشتی قەراج وەک پارچەیەکی گرانبەهای کوردستان، لە بەهاران دەبێتە بەهەشتێکی رازاوە بە گوڵ و گوڵزار و ناسکە گیا هەموو گوند و کەند و جۆم و گۆم و هەردت و لێرەوار و هەڵدێر و کەندر و کەندارەکانی بەرگی سەوزی بەهار دەپۆشن و وەک بووک دەرازێنەوە.

بۆیە هەموو ساڵان لە کۆتایی مانگی شوبات (رەشەمێ) عەشیرەتە مەرِدارەکانی کەندیناوە بارگەیان دەپێچایەوە و لە چیای قەرەچووغ ئاوا دەبوون بۆ دەشتی قەراجی رەنگین و بۆ ماوەی هەر دوو مانگی (نەورۆز و گوڵان) لەوێ دەمانەوە و رەشماڵیان تێکەڵ بە رەشماڵی مەرِدارانی قەراج لە سەر گۆمەکانی لەم بابەتە ناومان بردن هەڵدەدا. جا کاکی حەیرانبێژ بە کەیفی دڵی خۆی حەیرانی بە سەر کۆچ و کۆچبار و ماری بابی نازدار حەیرانێ هەڵدەدا.

ئاودیو بوونی مەڕ و مالات و خێڵەسات لە چیای قەرەچووغ بەرەو دەشتی قەراجی رەنگین بە دوو رێگا بوو:

**یەکەم:**

رێگای خۆرهەڵاتی قەرەچووغ (کلکەی دارە بزماران)، کە دەبوو بە دوو رێگا:

أ- رێگای دەستە چەپ: گوندی (کەلەشخان - مهێدی - چاربەردە - گردی رەوە) رێگاکە دەڕۆیی تا سەر زێی گەورە.

ب- رێگای دەستە راست: لە خێراتی شێخ محێدین دەست پێ دەکات و دەبێتە دوو رێگا:

١- دەستە راست: (ئاقاری چار گۆمان - گرد گراو - گردە بۆر - گردە رِەشە - قووچە سپیلکە - گۆپ تەپە) لە گوندی گرد گراو رێگایەکی دیکە هەبوو بەم شێوەیە (گرد گراو - دوو سەرە - مەعمەر ئۆمەران - گرد قۆشەنە - بەردی سپی - عەلبە رِەش - قەراتە سۆری مەرزان).

٢- دەستە چەپ: (خێراتی شێخ محێدین - ئاقاری پونگینە - لاسۆر - برایم باول - قەبری سەیدی).

**دووەم:**

رێگای خۆرئاوای قەرەچووغ (کەرکی حوسێنی غازی)، ئەم رێگایە لە گۆرِستانی حوسێنی غازی دەستی پێ دەکرد بۆ بازارگە و شۆرِ دەبۆوە بۆ رۆژهەڵاتی شارۆچکەی مەخموور و بە نزیک گومبەتەکەی برایماغای رەت دەبوو بۆ دەشتی قەراج. یان بۆ باشووری مەخموور بەرەو گوندەکانی معێجیلە و مشار بەرەو سوڵتان عەولای عارەبی دەچوو.

***(حەیران، براینە برادەرینە، ئەورۆ بەوێ سبیانێ دەرێم قەراجووک دوورە چەند لێژە، بەوێ سبیانێ ماری بابی نازدار حەیرانێ باردەکا، ئاوا دەبوو لە زوورگە زراوی خۆمان لە کەندی کەندیناوێ ئەمانە ئێوارە گەلە درەنگە شۆرِ دەبوونەوە لە کەرکی حوسێنی غازی...).***

هەموو ساڵان لە بەهاران، لە گەرمەی پشکووتنی گوڵان، لە گرمە گرمی گەوارەی لە ناکاوان، لە شریخەی برووسک و کوتان و دارژانی پر لە تۆفی تەزرە و باران، لەوان دەمان، لەوان کاتان، لە لێوی ناسکی کولۆکان، لە بالایێ شەنگ و شۆخی شەنگەبییان، لە لافاوی کەند و چۆمان، لە تەقینی کانییان، لە پر بوونی هەر کەوان، لە چیایێ قەرەچووغی بلبلباسان، هەر لە دەربەندی بازارگەی بگرە تا دەگاتە نەورایی قەرەبۆتک و قەرەبێتکان، لە پانایی دەشتی قەراجی رەنگین، تا چاو بر دەکا دەغومرێ دەشت لە رەشماڵی سێ ستوونی مەرِداران، لەبەر مێگەلی مەرِ و بزنان لەگەڵ بەرخۆڵە و کارۆکان، کە دەگەنەوە دەوروبەری رەشماڵ و چیغان، لە بەر بێری و جامان لێو رێژ دەکەن لە شیران:

***"حەیران... کیژ دەرێ، عەزیزێ بە دری خۆم، دە توو وەرە دەستەکی لە بۆ خۆ باوێ سەر مل و کەزی، بە دەستی دی بترازێنە کلیلی سنجاقان، دەربینە جۆتە شەمامان، شەمامەی بەندێ باغەران، هەرمژە خاری گەردەنان، بۆن کە گەرِی خەناوکان، بەینی مۆری و مەرجانان، گەلەک عاشق سەری خۆیان نایەوە بن گرێ، گەلە مەترسیم هەیە لەسەری درمان بیتە کۆڵە لەگە ئاخرەتێ".***

خۆشەویستی دەشتی قەراج لەگەڵ خوێنی ئەو کەسانە تێکەڵ بووە کە ساڵانێکی تەمەنیان لە ئامێزی ئەم دەشتە بردە سەر و ئێستاش هەرچەندی عەیامێکی لێی دابراون، بەلام هەرگیز لە یادی ناکەن و خۆزگە بۆ ئەو رۆژە دەخوازن جارێکی دیکە بگەرێنەوە گوندەکانیان و تێر بۆنی بەهاری دەشتەکە بکەن و خۆڵەکەی ماچ بکەن، تەنانەت ئەو کەسانەش کە ساڵانێکە لە کوردستان دوور کەوتوونەتەوە و لە وڵاتە هەرە خۆشەکانی ئەوروپا ژیان بەسەر دەبەن، ئێستاش لە ئەوروپاوە لە نامەکانیاندا حەیران بۆ بەژن و

باڵای قەراج دەنووسن.

ئەمەی خوارەوە دەقی حەیرانێکی هونەرمەندی دەنگ خۆشی کورد مامۆستا (عومەر دزەیی)یە کە لە ١٩٨٨/٦/٢٢ لە شاری (ڤیەننا)ی پایتەختی (نەمسا) بۆ برادەرێکی فۆلکلۆر پەروەری ناردووە و تیایدا سۆز و هەستی ناسکی خۆی بۆ دەشتی هەولێر دەردەبڕی و هەردوو دەشتی قەراج و کەندێناوە و خۆی دەشوبهێنێ بە گلۆرە دڕکێک و خوازیارە گەردەلوولێکی گەلێ بڵند بیهاوێتە سەر پشتی خۆی و لە وڵاتی غەریبان رزگاری بکات و بەرەو ئامێزی دەشتی قەراج و مەخمووره گچکەلەکەی ببات، ئەمەش دەقی حەیرانەکەی مامۆستا (عومەر دزەیی)یە:

**"حەیران... ئەنگۆ لۆم بڕێنە گەردەلوولەکی گەلە بڕند دەبا لەگەرم یار بی...**
**ئەمن خۆمی لێ دەکەمە گلۆرە دڕکە زەردەکی پەڕێزە جۆیان،**
**دەبا بمهاوێتە سەر تۆقەرەی پشتی خۆی**
**بمشکو دەشتەکەی کاولە قەراج و کەندێناوەم لێ دیار بی..**
**ئەوجا ئەمن دەرێم دەستی خۆم سەد جاران دامێنی ئەوی گەردەلوولێ دەکەم،**
**ئەگەر بێت و بەگەر خۆیم بدا،**
**غلۆرم کاتەوە، بدا لە کەند و لەندان، بمگێڕی بەسەر هەموو ئاقاری دەشتەکەی پیرە هەولێرێ،**
**شۆرم کاتەوە لۆ هەرەتەکانی مەخمووره گچکەلەکەی خۆمان،**
**وەرم دا لە تەپ و تۆز و خۆرەپۆکی کاولە گوندێ کیژ جوانان،**
**ئاخ چیبکەم دەنا حەیرانۆک، چەند خۆش دەبوو،**
**ئەمن موومی لێ نەهاتبی و ئەتووش هێشتا مندارێی...".**

- دەشتی قەراج لە شیعرەکانی مەلا خەلیلی موخلیسدا - جگە لە حەیرانەکان، زۆربەی بەیتە فۆلکلۆرییەکان و حەکایەت و پەند و قسەی نەستەقی ناوچەکە باس لە دڵگیری و جوانی دەشتی قەراج دەکەن، هەروا شاعیرانی دەشتی هەولێریش زۆر هۆنراوەیان لەسەر گوندەکانی قەراج و دەشتەکەی داناوە، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدا بێت شاعیرێک نەیتوانیوە بە چەشنی (موخلیس)(٧) تەعبیر لە دڵڕفێنی قەراج و خانەدانی ئەهلەکەی بکات، هۆی سەرەکی ئەو متووبوونەی (موخلیس) بە دەشتی قەراج لەوەدایە، کە خۆی لە ساڵی ١٩١٠ لە یەکێک لە هەوارە دڵگیرەکانی قەراج و لە رەشماڵان لە دایک بووە، ئەو کاتی فەقێ رەسووڵی باوکی لە گوندی (شۆرە زەرتکە)ی کەندێناوە لەگەڵ خێڵەساتی مەرداران، مێگەل لە چیای قەرەچووغ بەرەو دەشتی قەراج ئاودیو بکات:

**کوردان لە هەر لا بۆ (قەراج) دەچوون**
**تا دەمی دروونە لەوێ گیر دەبوون**
**هەر وەکو ئەوان ساڵێک لە ساڵان**
**باوکم ماڵ دەبا دەچێتە رەشماڵان**
**بووار خۆش بووە، لەو بووارەدا**
**منی دەرخست خوا لەم هەوارەدا**

(موخلیس) دوو قەسیدەی زۆر درێژی لەسەر دەشتی قەراج داناوە، هەردووکیان بە ناوی (بەهاری دەشتی قەراج)ن، یەکێکیان لەسەر شێوەی پێنج خشتەکییە و شازدە پارچەیە ئەوی دیکەیان لەسەر سەرەوای ستوونییە و (٧١) بەیتە شیعرە و لە بەحری رەمەلە، کە تێیاندا جوانترین وەسفی بەهاری دەشتی قەراج و ژیانی رەشماڵان و ئافرەت و شوان و تەنانەت باڵندە و ئاژەڵی دەشتەکەشی لە بیر نەچۆتەوە، کە بەحەق ئەم دوو قەسیدەیە بەگەوهەرێکی دانسقەی ئەدەبی کوردی هەژمار دەکرێت، ئەمەش بەشێکە لە قەسیدە ستوونییەکە:

**با بڕۆین دەو ئاوو، رووبەرووی (دەشتی قەراج)**
**دڵگرە وەقتی بەهاران، خۆشە بۆ دەفعی غەمان**

**سەیری رێگایان بکە، هەر کۆچ و کۆچباران ئەڕۆن**
**چەند شل و خاون تەماشا خانم و خاتوونەکان**

**هەر دەڵێی رۆژن لەسەر کێوان ئەوا پرشنگ دەدەن**
**ئەو کچانەی بارگە بەستراون لە هێستری بارەبان**

**زۆر لەمێژە وا لە رێگا دەرۆین ماندوو بووین**
**با لە گردی (گردە شێر) ئەوشۆ بخەین بارخانەمان**

جگە لەمانەش (موخلیس) پێنج خشتەکییەکی درێژی هەیە بە ناونیشانی (کە قارە قارِی مەرِ هات)، وەک دەگێرِنەوە وەرزی بەهار بووە، مامۆستا مەلا خەلیلی موخلیس و کۆمەڵێک لە فەقێیەکانی بە نیازی چوونە (قەراج) بەسەر چیای (قەرەچووغ) دەکەون و لە تۆقەرەی چیا بۆ حەسانەوە و پشوودان کەمێک دادەنیشن، دیمەنی دەشتی قەراج لەو شوێنە بەرزە زۆر جوان بووە، کات نیوەرِۆ دەبێ و مێگەلی مەرِ و ماڵات بەرەو رەشماڵەکان دەبنەوە و خانم و خاتوونەکان بە مەبەستی دۆشین و ئاودانی مەرِ و بزنەکان هەنگاوی ناسک بەرەو شوانەکان دەنێن، لە هەندێک لە رەشماڵەکانیش کار و بەرخ تێبەر دەدەن و دووکەڵی چێشت لێنانیش بەرەو کەشکەڵانی فەلەک هەڵدەستێ، کۆمەڵی فەقێیان تکا لە مامۆستا دەکەن شیعرێک لەسەر ئەم دیمەنە جوانەی دەشتی قەراج بهۆنێتەوە، ئەویش یادگارە خۆشەکانی زەمانی منداڵی وەک شریتی سینەمایی دێتەوە بەر چاوان و کارێزی شیعری لافاو دەکات، قەڵەم و کاغەز دەردێنێ و ناوی خوای لێ دێنێ و ئەم شیعرە لە دایک دەبێ، کە لێرەدا تەنیا دوو کۆپلەی دەنووسین:

**کە قارە قارِی مەرِ هات، وەکو هەوری بەهاری**
**هێنایە خوار لەسەر سەر، ئەو شۆخە کۆفی لاری**
**بەهەوری سۆری پۆشی، زولف و کەزی رەشماری**
**پشت بەستی بەستە پشتی، لە ژێر مەمکی هەناری**
**ناوی خوای خستە زاری، دەچێتە بێر شەنگەبێری**
**(دەشتی قەراج) بەهەشتە، ئەو حۆرییە بە تەنیا**
**بۆ دڵ گوشادی جار جار، مەیلی دەکاتە هەر لا**
**قازو قولینگ و سینە، هاتوونە بۆ تەمەننا**
**بنوارە کار غەزالان، چۆن بوونە شێت و شەیدا**
**کەوتوونە چۆل و سەحرا، دەچێتە بێر شەنگەبێری**

مامۆستا موخلیس، مەست دەبێ بەهەوای قەراج و دیدەی غەزالان، وەک راوچییەکی کارامەو زیرەک بازی خۆی لەبنار و بناری قەرەچووغ و لەنێو رەشماڵان بەرەڵڵا دەکات و بەختی دڵێکی زامدار لە نیگاری چاو مەست تاقی دەکاتەوە، وەک "نالی" بۆ "حەبیبە"و "دیوانە" بۆ "شەم" دەبێتە شەمعی شەبوستان، بەڵام تازە زەمەن بەسەر چووەو شەمەندەفەری ژیان ئەم وێستگەیەی بەجێ هێشتووە، بۆیە، هێوری هەنگاو دەنێ و نشێو و بەرزاییەکانی دەشتی قەراج پەی دەکات و بەدەم چریکەی غەزەلخوانییەوە لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

**قەت لەبیر ناکەم بەهاران بۆ (قەراج) وەک دەچووم**
**ئارەزووی راوی قولینگ و کارغەزالانم هەبوو**
**رۆژ لە نێو مێرگ و کوڵێک و سەیری ئاوانم دەکرد**
**شەو لە دیوانی هەوەسدا لافی سوڵتانم هەبوو**
**تا دەمام لەو هۆبە رەشماڵانە هەر کەیفم دەکرد**
**بۆ هەموو تەرزە غەمێکیش بەزم و سەیرانم هەبوو**
**هەروەکو ئێستا کە دەمبینی لە پێشان وا نەبووم**
**هەیهوو هەیهوو چەندە شەوقی شەنگەبێریانم هەبوو**
**پێم لەسەر پێ دادەنا بادە بەدەست و یار لەرۆخ**
**کەوسەری ئاوی حەیات و حۆری و غیلمانم هەبوو**
**شەو لە مەجلیس یار کە زولفی خۆی لەسەر روو لادەدا**
**مانگە شەو پێویست نەبوو شەمعی شەبوستانم هەبوو**

**پەراوێزەکان**

١- المحامي جمال بابان- اصول اسماء المدن والمواقع العراقية - بغداد/١٩٨٩.
٢- هوشیار عەبدوڵڵا- دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر- گۆڤاری هەولێر ژمارە (٧).
٣- ئەم زانیارییەم لە حاجی مەولودی بایزی دەرماناوەی وەرگرت لە کۆمەڵگای داردتوو لەو دانیشتنەی کە رۆژی ٢٠٠٠/٣/١٥ لەگەڵ خالّم پیرداود مەخمووری ئەنجامان دا.
٤- هاشم یاسین حەمەددەمین حەداد - اطلس الموارد الطبيعية لمحافظة اربيل - رسالة ماجستير- جامعة صلاح الدين/٢٠٠٠
٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦- ئەو زانیارییانە لەسەر زەوی و زاری قەراج، کە بۆ یەکەمین جارە بلاو دەکرێتەوە، بە سوپاسەوە لە کاک (رەوا بلباس)م وەرگرت.
٧- موخلیس: ناوی مەلاخەلیل، کوری فەقێ رەسول کوری حاجی مستەفا سنجاوییە. لە ساڵی ١٩١٠ لە رەشماڵانی قەراج لە دایک بووە و، لە ساڵی ١٩٨٥ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە و لە گۆرِستانی پیرداودی لە تەنیشت هاورێی دڵسۆزی (فەتاح ئاغای دووسەرد) بەخاک سپێردراوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٨) پایزی (٢٠٠٠) بلاوبۆتەوە.**



# شەقڵاوە

زرار عەبدوڵڵا حەمەد سەرتاش

ئەگەر چاوێک بە مێژووی ئەو زێدەدا بخشێنین، کە بە کوردستان ناسراوە تاکو ئێستا دەربارەی مێژووی ئەو دەڤەرە زانیاری تەواومان لەبەر دەستدا نییە، تاکو بەدروستی راستیی مێژووی ئەو ناوچەیە بسەلمێنێ، بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێ گرنگترە زۆربەی ئەو کەسانەی کە بەکاری مێژووەوە سەرقاڵن بۆمان دەسەلمێنن، کە کوردستان بەر لە زۆربەی شوێنەکان لانکەی مرۆڤایەتی بووە و هەزاران ساڵ بەر لە زایین مرۆڤی لێ ژیاوە و زۆربەی مێژوونووسان لەسەر ئەو هەڵوێستەیان کۆکن، زۆربەی مێژووی ئێمە بەدەستی مێژوونووسە بیانییەکان نووسراوەتەوە، زۆرێک لەو مێژوونووسانەش نەک هەروەک راستییەکان چۆن بوون وای بگێڕنەوە یان بنووسن، بەڵکو گەلێک جاران بەچاوێکی دوژمنانەوە هەوڵیان داوە چۆن مەبەستیان بووە یان بەرژەوەندی میر و پاشاکانیان چییان خواستووە وایان نووسیوە، کاتێک ویستم کورتەک لەسەر مێژووی شەقڵاوەی بنووسم هەر زوو هەستم کرد کە ئەم کارە کارێکی زۆر قورسە و لەوانەیە بەمن ئەنجام نەدرێ و "ئەم هەویرە ئاوی زۆری بوێ"، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەم راستییەم لا دروست بوو نابێ کۆڵبدەم هەرچەندە ئەوە کاری تاکە کەسی نییە، بەتایبەتی کابرایەکی وەک من کە شتێکی ئەوتۆ لەبارەی مێژوو نازانم، بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی کە هەمە یان بیستوومە و لە کتێبانم خوێندۆتەوە، هەوڵم دا هەرچۆنێ بێ هەندێک زانیاری لەسەر مێژووی شارەکەم بنووسمەوە، چاکیش دەزانم لەوانەیە گۆمەکەم نەشڵەقاندبێ، بەڵکو بەم نووسینەم بتوانم دەروازەیەک واڵا بکەم بۆ ئەو کەسانەی کە زانیاری زیاتریان پێیە و لە هەمان کاتیشدا لە داهاتوو دەتوانن بە سەرنج و پێشنیار، بە زانیاری زۆرتر لەو بابەتەی من کاری باشتر بکەن، بە هەرحاڵ ئەوەی تاکو ئێستا وەک نووسراو لە بەردەستماندایە و یان زۆربەی ئەم شوێنەوار و پاشماوانەی کە ماون دیاری دەکەن، کە مێژووی ئەو دەڤەرە زۆر لەو مێژووە کۆنترە،

کە مێژوونووسی گەورەی کورد شەرەفخانی بەدلیسی لە "شەرەفنامە" و یاقوتی حەمەوی لە کتێبەکەی (معجم البلدان) و... هتد باسی دەکەن.

بۆ نموونە هەر نووسینەکەی مێژوونووسی گەورە (ئەمین زەکی بەگ) بە نموونە دەهێنینەوە کە باس لە مەزارگەی (رەبەن بویا) دەکات و دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەدەی سێیەم و چوارەمی زایینی ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەیسەلمێنێ، کە مێژووی ئەم شارە زۆر کۆنە.

**ناوی شەقلاوە لە چی هاتووە؟**

لەبارەی ناوی شەقلاوە زۆر بیروڕای جیاواز هەیە و زۆر لە مێژوونووسان هەریەکەو بەجۆرێ باس لەناوی شەقلاوەیان کردووە، وەک شەرەفخان و یاقوتی حەمەوی و جەمال بابان و حوزنی موکریانی و شاکر فەتاح و ئەمین زەکی بەگ و.... هتد.

شەرەفخانی بەدلیسی لە شەرەفنامەدا دەنووسێ، کە شەقلاوە سەردەمانێکی زۆر هاوینەهەواری میرانی سۆران بووە و یەکێک لە میرانی سۆران بەناوی شا قولی بەگ لەم دەڤەرە ژیاوە، تاکو ئێستاش زۆر شوێن و رەز و باخ لەناو شەقلاوە هەر بەناوی شا قولییەوە ناوزەد دەکرێن. وای نووسیوە کە شاقولی بەگ ئەم شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە بەناوی ئەو کراوە، کە لە سەرەتا شاقولئاوا یان شاقولْ ئاباد بووە، بەپێی تێپەڕبوونی رۆژگار گۆڕان بەسەر ناوەکەدا هاتووە و بووە بە شەقلاوە -یان شەقراوە.

بەڕای من شەقلاوە زۆر زۆر بەر لەو مێژووە هەبووە، بەڵام دووچاری وێران کردن هاتووە، هەڵگری ئەم ناوەش نەبووە لەوانەیە ناوی تری هەبووبێ، کە دەڵێن شەقلاوە کە چەند گوندێکی بچووک بووە بەناوی میرەسەن (میر حەسەن) و قەڵات، کە شوێنەوارەکەی تاکو ئەمڕۆ بەقەڵاتی کاولان و گوند پێکهاتووە، بەڵام لە سەردەمی میرانی سۆران بووە بە شاقولئاوە، دوایی گۆڕان بەسەر ئەم وشەیە هاتووە بووە بە شەقلاوە.

بەڵام هەروەک لە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان وای



دەردەخەن، کە ناوی شەقلاوە زیاتر لە دوای سەدەی دوازدەمی زایینی ناوی هاتووە:

* یاقوتی حەمەوی لە کتێبی (معجم البلدان) بە (شەقلاباذ) ناوی دەبات.

* لە کتێبی (شهداء الفرس) لە لاپەڕە ٢٢١ لە ساڵی ١٨٤٧ بە (شقلابند) ناوی دێنێ.

* بەپێی ئەو دەستنووسانەی، کە لە کنیسەی شەقلاوە پارێزراون لە ساڵی ١٩٥٩ بە (شقلاباد) ناوی دەبات.

* مێژوونووسی کورد حوزنی موکریانی لە مێژووی میرانی سۆران لاپەڕە ٧ ساڵی ١٩١٠ بە (شقاباد) ناوی دەبات.

* مەلا جەمیلی رۆژبەیانی وەرگێڕی شەرەفنامە لە لاپەڕە ٢٧٨، ٢٩٠ بە (شەق شەقڵ) ناوی دەبات.

* محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبی مێژووی کورد و کوردستان لە لاپەڕە ٣٩٥ ساڵی ١٩٦١ بە (شاقلی ئاوا) باسی لێوە دەکات.

* لە دەستنووسەکانی ئەرمەنەکان بە (شتلاڤی) بە مانای زۆر جوانی بە زمانی ئەرمەنی باسی لێوە دەکەن.

گەلێک ناوی جۆراوجۆری دیکەش بەسەر ئەم شارە دابڕاوە، بەڵام دوا ناویان ئەمڕۆ (شەقلاوە)یە. شاری شەقلاوە -هەر لە دێر زەمانەوە -شوێنێکی ستراتیژی تایبەت و دەڤەرێکی دڵگیر بووە، هەڵکەوتەی جوگرافی ئەم شارە و ئاو و هەوا و زۆری رەز و باخەکانی بوونەتە هاندەر کە رۆژگارێکی زۆر ببێتە هاوینەهەواری میرانی سۆران، جگە لەوەی شاری فرە ئایینی و فرە نەتەوەیی بووە، دانیشتووانی ئەم شارە لە موسڵمان و مەسیحی (دیان) پێکهاتوون، سەردەمانێکیش پەیڕەوکەرانی ئایینی یەهودی (جوولەکە)شی تێدا نیشتەجێ بوون.

### مێژووی شاری شەقلاوە

ئەگەر بەقووڵایی دیرۆکی ئەم شارە بچینە خوارێ، زۆر شتی جیا و بیروباوەڕی جیاوازمان لەمەڕ ناوی شارەکە و دروست بوون و گەشەسەندنی ئەم شارەمان بەرچاو دەکەوێ. مێژوونووسان هەریەکە و بەجۆرێ لەسەر شەقلاوە دەپەیڤن.

هەندێک بە (شاقولئاوا) یان (شاقوللاوە) و هەندێکی تر بە (شاقولئاباد) یان (شەقراباد) (شەقلاباد) ناوزەدی دەکەن.

سەرەتای ناوی وشەکە کە بە شاقوڵ هاتووە، گوایە شاقوڵ بەگ ئاوەدانی کردۆتەوە، بەڵام بەپێی ئەم شوێنەوارە کۆنانەی کە لە شوێنەکە دۆزراونەتەوە مێژووی دروستبوونی ئەم شارە بۆ زۆر کۆنتر لەم مێژووە دەگێڕنەوە، بەڵام لەوانەیە شارەکە وێران بووبێ و بۆ دواجار لەلایەن یەکێک لە فەرمانڕەوا یان سەرکردەکانی میری سۆران بەناوی شاقوڵ بەگ سەرلەنوێ ئاوەدان کرابێتەوە، چ کۆتایی برگەی (ئاوا) یان (ئاباد) بەمانای ئاوەدان کردنەوە دێت بەدەستی (شاقوڵ).

یاقوتی حەمەوی لە کتێبەکەیدا بەناوی (معجم البلدان) شەقلاوە بە (شەقلاباد) ناو دەبات، هەروەها (قلقشقندی) لە کتێبی (صبح الاعشی)، کە لە ساڵی ٨١٤ نووسیویەتی بە (بلاد شقلاباد) ناوی دەبات، دانیشتووانی شارەکەش بە سەرجەم نەتەوە و ئایینەکانەوە بە شەقراوە ناوی دەبەن، ئەوەش بەهۆی ئەوەی سەرجەم پیتی (ڵ) لای دانیشتووانی دەڤەرەکە دەکرێ بە (ر) رێی سووک. مێژوونووسی گەورەی کورد شەهید (مەلا جەمیلی رۆژبەیانی) بەم شێوەیە یان بە بیروبۆچوونی ئەم بەڕێزە وشەی شەقلاوە یان شەقراوە (الشجر والماء) (دار و ئاو) پێکهاتووە، بۆیە مێژوونووسانی کۆن بە (شق ئاباد) یان (شقا اباد) ناویان بردووە، بەڵام هەندێک وای بۆ دەچن، کە ناوەکە لەمەوە هاتووە، کە ئەم شارە کەوتۆتە نێوان هەردوو چیای سەفین و سۆرک. گوایە پڕ لە ئاو بووە، لە ئاکامدا چیای سۆرک شەقی بردووە و ئەم ناوە لەوەوە هاتووە، مامۆستا جەمال بابان لە گۆڤاری سۆمەر بەشی دووەم دەڵێت:

شەقلاوە گوندێکە سەر بە پارێزگای هەولێر، (٥٠کم) لە باکووری هەولێرەوە دوورە، خۆشترین هاوینەهەواری دەڤەرەکەیە، بەڵام ئەوەی ئەم بەڕێزەی دووچاری هەڵەیەکی بچووک کردووە، کە لەم رێکەوتەی کە ئەو نووسیویەتی، شەقلاوە گوند نەبووە، دەکرا بڵێ شارۆچکەیەکە، چونکە هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەوە ناحیە بووە سەر بەقەزای کۆیە، هەروەها هەمان بۆچوونی (یاقووتی حەمەوی و مامۆستا بەشیر فەرەنسیس، گۆرگیس عەواد) هەبووە لە بارەی

ناوی شەقلابادی، کە لە بناری چیای سەفین بووە.

مامۆستا شەماشە میخائیل شەقلاوەیی دەڵێت: لە سەدەی ١٢ی زایینییەوە بەدواوە مێژوونووس و گەڕیدەکان بەم شێوەیە ناوی شەقلاوەیان هێناوە. شەقلاباد، شەقشەقڵ، شاقوڵی ئاوا، شقاباد، شقلاقێ، شقڵ ئاباد، شەقئاوا، کە ئەمڕۆکەش بۆتە شەقلاوە، بەپێی بیروبۆچوونی ئەم بەڕێزەش وای بۆ دەچێ کە ئەم ناوە لە ئاوی زۆر و بوونی ڕەز و باغ و دار و درەختی زۆرەوە هاتبێ، شەق لە شەقەشەقی ئاوەوە هاتووە، بێ شک شەقلاوە ئاوی زۆرە، داریشی زۆرە، ئەگەر شەقڵیش لە شەقەوە یان شەقبوونەوە هاتبێ. کەواتە شەقلاوە واتە مەڵبەندی شەقڵە، هەروەها بەدووریشی نازانێ، کە شەق لە سەکایی گەلی کۆنی کوردستان هاتبێ، چونکە زۆر جاران پیتی (س) گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بووە بە (ش) بۆ نموونە پیتی (ک) بۆ پیتی (ق) گۆڕاوە، سکاک بووە بە شکاک و سەکز بووە بە سەقز، بەم جۆرەش دەبێ سەکلاوە بووبێ بە شەقلاوە... هەروەها شەماشە میخائیل دەفەرموێ: لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینی ئایینی مەسیحی گەیشتۆتە ئەو دەڤەرە. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی دەڤەرەکە هاتوونەتە سەر ئەم ئایینە نوێیە... لە سەرەتای سەدەی حەفتەم ئایینی ئیسلام گەیشتۆتە ئەم دەڤەرە، هەروەها دەڵێ: ژمارەیەکی زۆر لە کوردە ئێزیدییەکان لەم دەڤەرە ژیاون کە مێژووی بوونی کوردە ئێزیدییەکان لە دەڤەرەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەدەی چواردەمی زایینی. کە لە ساڵی (١٤٠٢ی) زایینی لە سەردەمی سلێمانی قانوونی ئاماژە بە ٤٠٠ ماڵە کوردە ئێزیدییەکان دەکرێ، کە لە دەربەندی شەقلاوە ژیاون، هەروەها دەفەرموێ: لە بیستەکانی سەدەی بیستەم نزیکەی ٣٠ ماڵە جوولەکەیەک لە شەقلاوە نیشتەجێ بوون. مێژووی بوونی جوولەکەش لە دەڤەرەکە بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە ئەم جوولەکانە لەم کەسانە بوون، کە (سەرجۆن) و (سەنحاریب) کوڕەکەی لە فەلەستینەوە هێناویانن بەسەر شار و شارۆچکە و دەڤەرەکانی سنووری وڵاتی ئاشووردا دابەشیان کردوون.

بۆ جاری دووەمیش (نەبوخەز نەسری بابلی) ٣٠٠٠ جوولەکەی گواستۆتەوە وڵاتی بابل، جاری سێیەم ٤٠٠٠ جوولەکە دێنێتەوە وڵاتی بابل و بڵاو دەبنەوە بە ئێران و میزۆپۆتامیا، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لەم جوولەکانە دەچنە سەر ئایینی ئیسلام و کەمێکیان لە کوردستان هەر لەسەر ئایینی خۆیان (جوولەکە) دەمێننەوە، تا ساڵانی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەم. هەر لێرە دەمێننەوە تا دەگەڕێنەوە وڵاتی فەلەستین.

(فیتال کۆینی) فەرەنسی لە ساڵی (١٨٨٠ز) بەم جۆرە باس لە شەقلاوە دەکات:

### گوندی شەقلاوە

١٠٥٠ ماڵ موسڵمان، ٤٠٠ ماڵ مەسیحی، ٥٠ ماڵ جوولەکە.

### مێژوونووسی گەورەی کورد (ئەمین زەکی بەگ) لەبارەی شاری شەقلاوە دەڵێت:

شەقلاوە لەلایەن (شا قوڵی بەگەوە) دروست کراوە. هاوینە هەواری میری سۆران بووە. لە سەرەتای دروستکردنییەوە بە شاقووڵئاوە ناوزەد کراوە، لە دواییدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە تا (شاقووڵئاوە) بووە بە (شەقلاوە) بۆ





سەلماندنی ئەم بۆچوونەش چەندین شوێن بەناوی میرانی سۆران کراون و تا رۆژگاری ئەمڕۆش خەڵکی دەڤەرەکە هەر بەو ناوانە ناویان دەبەن. بۆ نموونە (گۆڕی خانزاد) لەسەر چیای سەفین، کە بە هەواری خانزادیش ناوی دەبەن. (کەپکی کایسان) باغی (شا قوڵی) و گەلێک شوێنی تر.

بەڵام مەسیحییەکان بۆچوونێکی تریان هەیە لەسەر ناوی شەقڵاوە. ئەو وشەیە دەگەڕێننەوە بۆ ناوێکی سریانی کە بە مانای ئاشتی دێ.

میری مێژوونووسان (میر شەرەفخانی بەدلیسی) بەم شێوەیە لە شەرەفنامەدا باس لەم شارە دەکات، دەڵێ:

شەقڵاوە رەنگە ناوەکەی لە (شەقل= دار)و ئاوەوە پێکهاتبێ.

شەقڵاوە لە ساڵی ١٩٥٢ بووە بە قەزا یەکەم قایمقامی شەهیدی وشە (شاکر فەتاح) بووە.

یەکەم قوتابخانە لە ساڵی ١٩٢٢ دامەزراوە. بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە مامۆستا (زوهدی سلێمان) بووە.

یەکەم قوتابخانەی کچان لە ساڵی ١٩٣٥ دامەزراوە. یەکەم بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیەش ناوی ست (حەمدیە) بووە.

### مزگەوتەکانی شەقڵاوە

بێگومان شەقڵاوەش وەکو هەر شار و شارۆچکەیەکی دیکەی کوردستان و دەڤەرەکەی کۆمەڵێک مزگەوتی تێدایە، لەوانە:

١- مزگەوتی گەورە. ٢- مزگەوتی حاجی برایم. ٣- مزگەوتی خانزاد. ٤- مزگەوتی خانەقا. ٥- مزگەوتی ئازادی. ٦- مزگەوتی بێترمە. ٧-مزگەوتی سابیراوە. ٨- مزگەوتی خەجە گۆج/ مام رەشید. ٩-مزگەوتی حاجی رەشید. ١٠- مزگەوتی حاجی عەزیز. ١١- مزگەوتی سەفین. ١٢-مزگەوتی خێرخوازان. ١٣-مزگەوتی (صبغة الله الحیدري).

### کلێساکانی شەقڵاوە

بە حوکمی ئەوەی شەقڵاوە کۆمەڵێک ماڵ و دانیشتوانی لەسەر

ئایینی مەسیحین، ئیدی چەند کلێسەیەکیش دەبیندرێن:
١-کلێسەی مار یوحەنا. ٢-کلێسەی مار یوکۆما. ٣-کلێسەی ماریو ئەورەها. ٤-کلێسەی گردی دێرە. ٥-کلێسەی انتقال العذراء.

### زانا بەناوبانگەکانی شەقلاوە

چەند زانایەکی ناودار لەم شارەدا هەڵکەوتوون:
(محمد بن ابی الشافعی شقلاوە (الکردی) لە دیمەشق دانیشتووە. ٢- مەلا تەها. ٣- مەلا ئەحمەدی ئەمین (کەرە). ٤- خەلیفە مەلا مەحمودی رەش. ٥- مەلا محەمەد کاکۆک. ٦- مەلا سادق.

### هەڵبەتە لە دیانەکانیش ناودارهەن:

١- شەمعون شەقلاوەیی، لە کۆتایی سەدەی هەژدەم ژیاوە، شارەزاییەکی زۆری دەربارەی فەلەکناسی هەبووە، رۆژژمێرێکی زۆر رێکی داناوە، جگە لەوەی دەیان دەستنووسی ئایینی لەدو بەجێماوە، گرنگترین کتێبی بە ناوی (الآباء)ە.

٢- مەتران ئەدای شێر، ناوی تەواوی سلێوە کوڕی قەشە یوحەنان کوڕی قەشە یەیقوب کوڕی قەشە ئیبراهیم لە بنەماڵەی (شێرە) لە مانگی شوباتی ١٨٦٨ لە دایک بووە لە ساڵی ١٨٧٩ چۆتە (معهد مار یوحنا الاکلیریکي) لە موسڵ، گەلێک شوێنان گەڕاوە، وەک بەیروت، ئەستەنبوڵ، رۆما، فەرەنسا، لە دواییدا گەڕاوەتەوە سیرتێ لە باکووری کوردستان، لە شەڕی یەکەمی جیهانی بە دەستی جەندرمەکانی تورک گوللە باران کراوە، کە لە رێکەوتی ٢٠ی تەمووزی ١٩١٥ ئەم تاوانە ئەنجامدراوە، گەلێک کتێب و دەستنووسی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە، وەک:

الصلوان -بە زمانی کلدانی

مدرسة نصیبین الشهیرة -بە زمانی عەرەبی

جدول المخطوطات -السریانیة والعربیة، في مکتبة مطرانیة، ساڵی ١٩٠٥.

... عن المخطوطات السریانیة المخطوطة -بەزمانی فەرەنسی

تاریخ (سعرت) -بەزمانی عەرەبی و فەرەنسی

حوادث من تاریخ الکردستان - الجریدة الأسبوعیة

کتاب سیره آشهر شهداء المشرق القدیسین - دوو بەرگ

وەرگێرانی حیاة داود یشوع قطریا ومؤلفاتە -زمانی فەرەنسی ساڵی ١٩٠٦.

ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ (مفکرة ولایة الموصل مخصوص ١٣١٢هـ)

ساڵنامەی دەوڵەتی عوسمانی ساڵی ١٣١٥ی کۆچی

### شوێنە پیرۆزەکانی شەقلاوە

مەزارگەی رەبەن بویا (شێخ وسو رەحمان) ئەم مەزارگەیە کەوتۆتە قەد پاڵی چیای سەفین، بە دۆڵێکی سەخت بۆی سەردەکەوی، کە بریتییە لە ئەشکەوتێکی گەورە کە لە چەند بەشی جیاجیا پێکهاتووە، لە خوار ئەشکەوتەکە بیرێکی لە بەرد داتاشراوی بازنەیی ٢مەتر بەرین و ٥ مەتر قووڵە، موسڵمانەکان بە شێخ وسو رەحمان ناوی دەبەن و مەسیحییەکان بە رەبەن بویا - مێژووی ئەم ئەشکەوتە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ٤ی زایینی.

**مار گۆرگیس:** لە ئەشکەوتێکی قەد پاڵی چیای سەفینە، کە لە شوێنێکی زۆر سەختە بۆ چوونە ناو ئەم ئەشکەوتە دەبێ زۆر ماندوو و هیلاک بیت.

**مار ئەوراها:** کە بە چاکی سەرگرد ناوزەد دەکرێت، لە خوار بینایەی قایمقامیەتە.

**مار یوحەنا:** کەوتۆتە لای کۆتایی شەقلاوە لە رێگای خۆشناو.

**دەرمان ئاوا:** کەوتۆتە رۆژئاوای شەقلاوە لە گەڕەکی سیمۆن کانییەکی لێیە، کە ئاوەکەی یەکجار تاڵە، خەڵک وەک دەرمان بەکاری دێنن.

**کانی گروو:** کەوتۆتە ناو باخچەکانی شەقلاوە، بەرامبەر بە هەوارگەی سەفین، ئاوەکەی کانزاییە بۆ نەخۆشی پێست بەکاری دێنن.

**مەحمە گوڵ:** کەوتۆتە سەر رێگای سەرەکی (هاملتۆن)، واتە سەر شەقامی سۆرک.

**باب و باپیران:** بریتییە لە چەندین مەزارگەی جیا، کەوتۆتە سەر شەقامی سەرەکی شەقلاوەی سەرەوە بۆ خۆشناو.

**خەج و لاس:** بەرامبەر بە مزگەوتی گەورەیە.

**شێخ سەید:** کەوتۆتە گەڕەکی بێترمە، کانیاوێکی گەورە و سازگاری لێیە.

### مێژووی بزاڤی شانۆ لە شەقلاوە

لە دیرۆکی بزاڤی شانۆ یاخود هونەری لەم دەڤەرەدا، وەک سەرجەم شارەکانی تری کوردستان، لەم هونەرە بێبەش نەبووە و لەم بوارەدا رۆڵی دیارە، دەتوانین مێژووی شانۆ بەسەر چەند قۆناغێکدا دابەش بکەین، هەرچەندە لە هەندێک قۆناغیشدا سستی لە رادەبەدەر و یاخود نەبوونی پێوە دیارە، کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی شانۆ لە شەقلاوە پێویستی بە گەڕان و ماندوو بوونێکی زۆر هەیە، چونکە زۆربەی کارە شانۆگەرییەکان و کارە هونەرییەکان نادیار و بزرن، لە هیچ سەرچاوەیەک ئاماژەی پێ نەکراوە، بۆ وەدەست هێنانی زانیاری زیاتر پشتمان بەزانیاری ئەو کەسانە بەستووە، کە راستەوخۆ لەم بوارەدا بەشدار بوون یان لێی نزیک بوون.

#### قۆناغی یەکەم...

بیرۆکەی دامەزراندنی یان ئەنجامدانی کاری هونەری شانۆ لەم شارەدا بۆ یەکەمجار دەگەڕێتەوە بۆ حوجرەی مزگەوتی شەقلاوە، مێژووی ئەم کارەش بۆ ساڵی ١٩٢٠ دەگەڕێننەوە، هەرچەندە کارەکە زۆر سادە و ساکارانە بووە، بەشێوەیەکی زۆر ساکار شانۆگەرییەکە پێشکەش کراوە، بەڵام بە یەکەم بەردی بناغەی ئەم بوارە دادەنرێ و لەوێوە سەرچاوە دەگرێ، پێشکەش کردنی ئەم شانۆگەرییە بەبۆنەی دەرچوونی ئەم خوێندکارە ئایینییانە بووە کە لە حوجرە خوێندنیان تەواو کرد و مۆڵەتی مەلایەتییان وەرگرتووە، ئاهەنگی دەرچوونیان بۆ ساز دەکرا.

ناوی شانۆگەرییەکە (پاشا و فەقێ)، لە نووسین و دەرهێنانی (میرزا قادر) ئەکتەرەکان (خوالێخۆشبوو میرزا قادر) خۆی دەوری سەرەکی تیادا بینیوە، کە دەوری پاشا بووە، بەڵام بەداخەوە ناوی ئەم فەقێیانە نەزانراوە کە دەوریان تیادا بینیوە.

#### قۆناغی دووەم...

ئەم قۆناغە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رۆژگارەی کە ئینگلیزەکان حوکمی عێراقیان دەکرد بە گشتی و لە کوردستان بە تایبەتی، سەربازگەیەکی بەریتانییەکان لە شەقلاوە هەبووە.

بۆ کات بەسەربردن و پشوودانی سەربازان زۆر جاران ئاهەنگی گەورە گەورە ساز دەکرا، لەم ئاهەنگانە کە شوێنەکەی لە گەڕەکی سەرمەیدان بووە، چەندین گۆرانی و ئاواز و هەڵپەرکێ پێشکەش دەکران، جگە لەوەی چەندین کاری شانۆیی کۆمیدی نمایش دەکران، ئەم ئەکتەرانەی لەم کارە هونەرییانە بەشدارییان دەکرد.

١- مام سلێمان، ناسراو بە قرۆپ -کە ئێستا لە ژیان ماوە. ٢- خوالێخۆشبوو یاسین محەممەد نەجار.

ئەم قۆناغەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکان.

#### قۆناغی سێیەم...

بۆ یەکەم جار لە دیرۆکی ئەم شارەدا ئاهەنگێکی گەورە و رێکوپێک بەم جۆرە ئەنجام بدرێ، ئەویش لە یادی جەژنی نەورۆز، کە خوالێخۆشبوو (جەلال رەشید بەگ) ناسراو بە جەلال خۆشناو، ئەوکات مامۆستا بووە لە شەقلاوە، کە لە ساڵانی حەفتاکان بوو بە پارێزگاری هەولێر، مۆڵەتی ئاهەنگی نەورۆزی لە متەسەرفی هەولێر وەردەگرێ، ئاهەنگێکی گەورە ساز دەکەن، شوێنی گێرانی ئاهەنگەکە لە گازینۆی (سیمۆن) بوو، خاوەنی ئەم گازینۆیە کابرایەکی ئەرمەنی بووە، کە ئێستا گەڕەکەکە بەناوی ئەوەوە کراوە. لەم ئاهەنگەدا شانۆگەرییەک نمایش کرا، ئەکتەرەکانی ئەم کارە هونەرییە بەشدار بوون. خوالێخۆشبوو باپیرە فەندی و کابرایەکی ئەرمەنی بەناوی بەلەدرۆز کە خەڵکی بە (مستۆ) ناویان دەبرد، لەگەڵ مام تەها کاوانی.

#### قۆناغی چوارەم...

ئەم قۆناغە بە سەردەمێکی زێڕینی بزاڤی شانۆیی دادەنرێ لەم شارەدا، چونکە بۆ سەردەمانێک دەگەڕێتەوە، کە شەهیدی وشە (شاکر فەتاح) لەم شارەدا لە سەرەتا بەڕێوەبەری ناحیە و لە دواییدا بووە بە قائمقام، ساڵی ١٩٥١ -١٩٥٢. ئەمەش راستییەکی بەڵگەنەویستە (شاکر فەتاح) لەهەر شوێنێ کاربەدەست بووبێ گرنگی لە رادەبەدەری بە بواری هونەری و رۆشنبیری داوە. یەکەم کاری شانۆیی کە لەو سەردەمە ئەنجامدراوە. شانۆگەری (کاژی تکلیڤ) کە شەهیدی نەمر شاکر فەتاح خۆی دەرهێنەری بووە. ئەم بەڕێزانەش دەوریان تێدابینیوە.

خوالێخۆشبوو (ئەحمەد کاوێس) کوڕی گەورەی هونەرمەندی گەورەی کورد (کاوێس ئاغا).

عەبدوڵلا سانع.

ئەم کـارانەش زۆربەی شـەوانی هەینی لە یانەی فـەرمانبـەران نمایش دەکران.

لە ساڵی ١٩٥٣ شانۆگەرییەک لە شـێـوەی ئۆپەرێت کـە بە ناوی (لاوان) لـە نـووسـین و دەرهـێـنـانـی شاکر فەتاح نمایش کراوە.

**ئەکتەرەکان:**

خوالێخۆشبوو -یوسف تەها بافۆ. ٢- م. عەبدوڵلا - حەمەد عەولا. ٣- عەبدوڵلا عەزیز -تریانکەر. ٤- جەبار سالح مەیتەر -لە دەوری ژن. ٥- ئەنوەر سلێمان -ئەنوەر فاتۆک. ٦- محەمەد فەقێ عەولا -محەمەد گورگ. ٧- شێرکۆ شاکر فەتاح. ٨- مەجید یەقوبی.

ساڵی ١٩٥٤ شانۆگەری (ئاغا و جووتیار) لە نووسینی رۆماننووس و چیرۆکنووسی گەورەی کورد (محەمەد مەولود مەم) نمایش کرا. ئەکتەرەکان:

خوالێخۆشبوو باپیرەفەندی ٢- م.بێجان عوسمان. ٣- م.عەبدوڵلا حەمەد عەولا. ٤-عەبدوڵلا عەزیز تریانکەر. ٥- جەبار ساڵح مەیتەر. ٦- یوسف تەها باقۆ.

سـاڵی ١٩٥٦ شـانۆگـەری (وافق شن وطبقه) لە دەرهێنانی (ئەحمەد ئاکۆ). ئەکتەرەکان:

عەبدوڵلا حەمەد عەولا لە دەوری ژن. ٢- محەمەد نووری.

**قۆناغی پێنجەم...**

دوای ئەوەی شـــۆرشی ١٤ی تەمووز هەڵگیرسا، زۆربەی گەلانی عـێـراق لە دوای نەمـانی حـوکـمی پاشـایەتی ئازاد بوون، نیـمـچـە ئازادییەک لە وڵات هاتە کایەوە، لەم مـاوەیەدا دەیان کـاری شـانۆیی و هونەری ئەنجامدران.

**قۆناغی شەشەم...**

لـەم قــــۆنـاغـــــەدا بـەهـۆی هەڵگـیـرسـاندنی شـۆڕشی ئەیلول، زۆربەی خەڵکی کـوردسـتـان یا ئەوەتا روویان لە شاخ کـرد یان پەراگەندەی شـاران بوون، ژمـاردیەکی زۆریش خـزانە کـونجی زیندانەکـان، ئەوەی مـابووەوەش هەر ئەوەندەی لە دەسـتی دەهات "کڵاوی خۆی بگرێ با نەیبا"، دەتوانین بڵـێین لەم قـۆناغـەدا بە تەواوی ئەم بزاڤە روو لە ئیفلیج بوون یان نەمـان بوو، هیچ چالاکـیـیـەکی هونەری و رۆشنبـیـری لەم شـارەدا پێشکەش نەدەکرا، جگە لەوەی کە دوای ئەوەی هونەرمـەندی گـەورەی کـــورد (فـــەرەیدون دارتـاش) لە ناوەڕاستی شەستەکـان لە شەقڵاوە بوو بەمامـۆستا، توانی خزمەتی زۆر بە بواری رۆشنبیری بکا لەم شارەدا، بەتایبـەتی لە بواری مـۆسـیـقـا، تا ساڵانی ١٩٦٨ و سەرەتای بیرۆکەی دانانی تـیـپی سـەفـینی هونەری و لە دواییـدا مـۆژدەی دامـەزراندنی ئەو تیپە بووە هەوێنی لەدایکبوونی دەیان کاری هونەری و رۆشنبیری.

**قۆناغی حەفتەم...**

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ لەسەر دەسـتی چەند کـەسـێکی دڵسـۆز بە بزاڤی شانۆ و هونەر و رۆشنبـیـریی بە سەرجەم بوارەکانییەوە کەوتنە جووڵە، بە هەر شـێـوەیەک بێ، هەر رۆژەی لە سووچی چایخانەیەکدا یان لەماڵێک لە پەنا و پەسـێوان کەوتنە خۆ، تا لە ئاکـامـدا گـەیشـتـنە ئەو ئەنجـامـەی تیپێکی هونەری دابمەزرێنن، مەبەست لە دامـــەزراندنی ئەم تـیـــپـــەش کۆکـردنەوەی سـەرجـەم خـەمـخـۆرانی بواری رۆشنبـیـری و هونەری لە ژێر چەترێکدا، بە ئایدۆلۆژیای جـیـاواز، ئەوەبوو لە ئاکامدا لەدوای پەیوەندی کـردنیـان بە هێـزی پێـشـمـەرگـەی کوردسـتـان لە ناوچە رزگـار کراوەکان کە نوێنەری خۆیان رەوانەی ناحیـەی هیـران (خۆشناو) کرد، بۆ مەبەسـتی گـفـتـوگـۆ کـردن لەسـەر دامـەزراندنی تیـپی سـەفـینی هونەری و وەرگـرتنی هاریکاری و پشـتـیـوانی ئەوان لە رووی مـاددی و مـەعنەوییـەوە بۆ تیپەکە. کە شۆڕشی ئەو کاتی کورد بەڵێنی تەواوی پێـــدان، کـــە هاریکارییان بکەن.

ئەو کـەسـانی ئەم کـارەیان راپەڕاند:

خوالێخۆشبوو حەمید قەساب.

٢- فاروق عوسمان.

**ئەو کەسانەی کە بەشدارییان لە بیرۆکەی دامەزراندنی تیپی سەفین کرد:**

شەهیـد مسـتـەفـا بەربەر. ٢- مـسـتـەفـا مـەلا سـمـایل. ٣- خـوالێخۆشـبـوو ئەحـمـەد مەحـمـود، ناسـراو بە ئەحـمـەد باقۆ. ٤- قـادر مەلا حوتان. ٥-محـەمـەد مسـەوەر. ٦-مستەفا مسەوەر. ٧-کەمال مەلا حوتان. ٨- حەیدەر سلێـمـان بەگ. ٩- خـوالێـخۆشـبـوو ئەمین نەجـار. ١٠-خوالێخۆشبوو حەمید قەساب. ١١-م.عـەبدوڵلا حـەسـەن. ١٢- فـاروق سـالح کـۆیی. ١٣-رزگـار

خۆشناو.

**قۆناغی هەشتەم...**

دامەزراندنی تیپی سەفینی هونەری و قۆناغی پرشنگدار لە براقی هونەری لە شەقلاوە، لە پێشدا ئاماژەمان بە چۆنیەتی بیرۆکەی دامەزراندنی تیپی سەفین کرد، دیسان پێویست ناکات لێرەوە ئاماژە بەچۆنیەتی دامەزراندنی بکەینەوە، تەنیا ئەوەی مەبەستمانە کارە هونەری و رۆشنبیرەکانی ئەم تیپەیە.

بە هەوڵی ئەم دڵسۆزانە تیپی سەفینی هونەری لە دایک بوو، یەکەم چالاکی، کە ئەنجامی دا ئاهەنگی نەورۆزی سالی ١٩٦٨ لە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەی کوردستان و لە ناوچە رزگارکراوەکان بوو، جگە لە پێشکەش کردنی چەندین چالاکی جۆراوجۆر، شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) نمایش کرا، شانبەشانی هونەری شانۆ گەشە بە بواری مۆسیقاش دەدرا، مامۆستا عەبدوڵلا حەسەن وەک هەواداریکی ئەم بوارە توانیبووی خۆی فێری ئالەتی کەمان بکات، هەروەها حەمید قەسابی خوالێخۆشبووش بوو بە هۆی مامۆستای هونەرمەند (فەرەیدون دارتاش) جگە لە فێربوونی ژەنینی ئامێری (عود و کەمان) توانی سەرەڕای ئەم تەمەنە گەورەیەی کە هەیبوو خۆی فێری نۆتەی مۆسیقا بکات. هونەرمەندە هونەردۆستەکانی دیکەش دەستیان لە ئامێرە جۆراوجۆرەکانی دەدا وەک رزگار خۆشناو، ئەمین سەرسپی، رەنجبەر خۆشناو، فاروق سالح، مەجید خۆشناو، سابیر سابیر، نەجات جەردیس و کەمال مەلا حوتان.....هتد.

شەوانە لە مالی مامۆستای خوالێخۆشبوو حەمید قەساب مەشقیان دەکرد، ئەم ئامادەبوونەش بۆ ئەوان بووبوو بە خولێکی مۆسیقی... رۆژبەرۆژ ئەندامان روو لە زیاد بوون دابوون، پەیوەندییان بە تیپەوە دەکرد، ئەم تیپە بووبوو بە مالێکی هونەری رێکوپێک و توانی بۆ ماوەیەکی زۆر کەم زۆربەی هونەرمەندەکان لە سەرجەم بوارە هونەرییەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، دوای بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ هەلێکی زێرین بۆ هونەرمەندانی کورد لە سەرجەم کوردستان رەخسا، تیپی سەفین گەشەسەندنێکی بەرفراوانی لە بوارە جیاجیاکانی هونەری بە خۆوە بینی، بەتایبەتی لە بواری شانۆ و مۆسیقا توانی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بە کارە هونەرییەکانی خۆی بەسەرجەم جەماوەری کوردستان بناسێنێ، ئاهەنگی گەورە گەورە لە شوێنە جیاجیاکانی کوردستان سازبکات، بە تایبەتی گەیشتنە ئەوەی، کە مەکتەبی سیاسی (پ. د. ک) بۆ گێرانی ئاهەنگەکانی بۆنە نەتەوایەتییەکان بانگێشتی ئەم تیپە بکات.

**ئەوەبوو تیپ فراوانییەکی بەربلاوی بەخۆوە گرت و ئەندامێکی زۆری بۆ پەیدابوو:**

خوالێخۆشبوو حەمید قەساب/ ئامێری عود. ٢- م. عەبدوڵلا حەسەن/ کەمان. ٣- رزگار خۆشناو/ عود. ٤- رەنجبەر خۆشناو/ کەمان. ٥- مەجید خۆشناو/ کەمان -چەلۆ. ٦- فاروق سالح/ کەمان. ٧- کامەران تەها، -برای هونەرمەند تەحسین تەها/ کەمان. ٨- محەمەد شێخ محەمەد/ ئیقاع. ٩- شەماڵ خۆرانی/ گۆرانیبێژ. ١٠- جەبار عەبدوڵلا حەلاق/ گۆرانیبێژ. ١١- شوان عەبدولرەحمان کۆیی/ گۆرانیبێژ. ١٢- فریاد حەسەن چاوەش/ گۆرانیبێژ. ١٣- لەیلا مستەفا/ گۆرانیبێژ. ١٤- م. حەسەن خۆشناو/ ئیداری -ئەکتەر - بێژەر. ١٥- م. پێشەنگ خەلیل حەمەد/ ئیداری -ئەکتەر. ١٦- کەمال مەلا حوتان/ ئەکتەر -ئامێری عود. ١٧- سەربەست میران/ دەرهێنەر -ئەکتەر -نووسەر. ١٨- محەمەد مسەوەر/ ئەکتەر. ١٩- عومەر حەمەدەمین/ عومەر بانک/ ئەکتەر. ٢٠- یوسف مەربێن/ ئەکتەر. ٢١- مستەفا سمایل/ ئەکتەر. ٢٢- حەیدەر سلێمان بەگ/ ئەکتەر -هونەرمەندی تەشکیلی. ٢٣- خەلیل بندیان/ ئەکتەر. ٢٤- مستەفا سەلیم/ ئەکتەر. ٢٥. ئیسحاق پەتۆ/ ئەکتەر -گۆرانیبێژ. ٢٦- نەجات یوسف رەسام/ ئەکتەر. ٢٧- نێرگز بیائێلیا/ گۆرانیبێژ. ٢٨- مریەم بیا/ گۆرانیبێژ. ٢٩- وریا تەها باقۆ/ ئەکتەر -کاری دیکۆر. ٣٠- رەمزی مەهدی/ گۆرانیبێژ. ٣١- سابیر سابیر/ کەمان. ٣٢- خوالێخۆشبوو مەلا گچکە/ ئەکتەر -نووسەر. ٣٣- ئەحمەد مەحمود -ئەحمەد بانق/ ئەکتەر. ٣٤- ئەمین سەر سپی/ ئەکتەر -مۆسیقی. ٣٥- مستەفا

بەربەر/ ئەکتەر. ٣٦- بەترس حەنا/ ئەکتەر. ٣٧- فریاد خالید مەدحەت/ ئەکتەر. ٣٨- وریا شێخە/ ئەکتەر. ٣٩- رووناک رەسول کاکۆ/ کۆرس. ٤٠- سەعدیە حەمەدەمین/ کۆرس. ٤١- شلێر عەبدوڵڵا مستەفا/ کۆرس. ٤٢- زریان عەبدوڵڵا/ کۆرس. ٤٣- شوکریە مستەفا/ کۆرس. ٤٤- سەبریە مستەفا/ کۆرس. ٤٥- سوهام. عەبدوڵڵا زوبێر/ کۆرس. ٤٦- گولیزار سالح/ کۆرس. ٤٧- شۆڕش سالح کاوانی / کۆرس. ٤٨- شەهرەزاد عەبدوڵڵا/ کۆرس. ٤٩- چەمچەم باپیر ئەفەندی/ کۆرس. ٥٠- پەرژین حەمید/ کۆرس. ٥١- شلێر ئیسماعیل/ کۆرس. ٥٢- م. قەیتەران موتەلیب/ ئەکتەر. ٥٣- مام مستەفا -ناسراو بە خار بیبیلە/ ئەکتەر. ٥٤- شێخ کەریم هیرانی/ ئەکتەر. ٥٥- نەجات جەرجیس/ ئەکتەر و مۆسیقا ژەن. ٥٦- جەلال شێخ ونس/ ئەکتەر. ٥٧- ئەندراوسن میخائیل/ مۆسیقا ژەن. ٥٨- ئازاد ماودرانی/ گۆرانیبێژ -کۆرس -ئەکتەر. ٥٩- ئیسماعیل ماودرانی/ نووسەر - گۆرانیبێژ -کۆرس. ٦٠- خوالێخۆشبوو سەباح ماودرانی/ ئەکتەر. ٦١- خوالێخۆشبوو محەمەد رەشید/ ئەکتەر. ٦٢- زرار سەرتاش/ کۆرس. ٦٣- ئازاد حەمەدەمین (حاکم ئازاد)/ ئەکتەر - شاعیر. ٦٤- سالح عەولاشێن/ کۆرس. ٦٥- تەحسین حەمەدەمین/ کۆرس. ٦٦- قادر مەلا حوتان/ ئەکتەر. ٦٧- محەمەد ئەسعەد/ ئەکتەر. ٦٨- رەبیع حەسەن/ ئەکتەر. ٦٩- جەمیل یەحیا/ ئەکتەر. ٧٠- جەلال یەحیا/ ئەکتەر. ٧١- حەمەدەمین قەراسنجی/ ئەکتەر. ٧٢- فایق قادر بندیان/ ئەکتەر. ٧٣- جەمال ئەحمەد/ ئەکتەر. ٧٤- فەرەیدون عەزیز تۆما/ ئەکتەر. ٧٥- ئەکرەم عەزیز تۆما/ ئەکتەر. ٧٦- خوالێخۆشبوو موحسین عەبدولقادر/ ئەکتەر. ٧٧- عەمید عەبدولجەبار سەبری/ ئەکتەر. ٧٨- خوالێخۆشبوو رەسول کاکۆ. ٧٩- خوالێخۆشبوو حەمەدەمین شێخ ونس. ٨٠- خوالێخۆشبوو عەلی ئۆمەر. ٨١- حاجی عەزیز دەربەندی. ٨٢- رازیە عەبدولرەحیم/ کۆرس. ٨٣- حەکیم عەبدولرەحیم/ مۆسیقاژەن. ٨٤- ئەنوەر حەمەدەمین/ کۆرس. ٨٥- خالید عەبدوڵڵا/ کۆرس. ٨٦- مستەفا یەحیا/ کۆرس. ٨٧- شێرزاد مستەفا/ کۆرس. ٨٨- حەیدەر سلێمان بەگ/ هونەرمەندی تەشکیلی -ئەکتەر. ٨٩- جەمیل ئەحمەد بەگ/ پەیکەرتاش -ئەکتەر. ٩٠- ئیسحاق پەتۆ/ ئەکتەر. ٩١- محەمەد شێخ محەمەد/ مۆسیقاژەن. ٩٢- م. رەسول خالید/ ئەکتەر - بێژەر.

**دەستەی کارگێڕی بەم شێوەیە کارەکانیان دابەش کردبوو.**

| | |
|---|---|
| حەمید قەساب | بەشی گۆرانی و مۆسیقا |
| سەربەست میران | بەشی شانۆ و نواندن |
| حەسەن خۆشناو | بەشی هەڵپەڕکێ |
| خوالێخۆشبوو مەلا گچکە | بەشی ئیدارە |

دوای ئەوەی دەستەی کارگێڕی تیپ داندرا، تواندرا بارەگایەک بۆ تیپ دابین بکرێ، کە کرێی بارەگاکە لەلایەن ناوچەی شەقڵاوەی (پ.د.ک) دەدرا. رۆژانە زۆربەی ئەندامانی تیپ لە بارەگاکەیان کۆدەبوونەوە، هەر بەشەو سەرقاڵی کاری تایبەت بە ئەو بوارەی خۆی بوو، کە بۆیان تەرخان کرابوو.

کارەکانی تیپ رۆژ بەرۆژ بەرەو پێشڤەچوون دەچوو، هەر بۆنەیەکی نیشتمانی هاتبا پێشەوە، بەرێک و پێکی ئەنجامیان دەدا، لە ماوەیەکی کەم توانییان بە چالاکییە جۆراوجۆرە هونەرییەکانیان بوونی خۆیان لەسەر ئاستی کوردستان بچەسپێنن. هەر ئەم کارە دیار و بەرچاوانەی تیپی سەفین بوو، وای کرد کە لەو سەردەمانی لە شۆڕشی ئەیلول مەکتەبی سیاسی هەر ئاهەنگێکی ئەنجامی دابا میوانداری ئەو تیپەی دەکرد. چالاکییە هونەرییەکانی تیپ هەر لە شەقڵاوە نەبوو، بەڵکو زۆربەی ئاهەنگەکانی شارۆچکەی پیرمام و حەریر و خۆشناو لەلایەن ئەندامانی ئەو تیپە ئەنجام دەدران.

بە تایبەتی هاوینان گەشتیارێکی زۆر رووی لە شەقڵاوە دەکرد، تیپی هونەری سەفین توانی چەندین چالاکی جۆراوجۆر بە تایبەتی هەوڵی دەدا کەلتوور و فۆلکلۆری کوردی بە میللەتانی تر بناسێنێ، کارە هونەرییەکانی ئەو تیپە بووە مایەی سەرسوڕمانی (الفرقة القومیة العراقیة)و دەستخۆشییان لە ئەندامانی تیپ کرد.

تیپی سەفین جگە لە پێشکێشکردنی دەیان شانۆگەری

گرنگی لە رادەبەدەری بە هونەری هەڵپەڕکێ و بەشی مۆسیقا و گۆرانی ئەوەبوو هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (حەمید قەساب) توانی ئاواز بۆ چەند سروود و گۆرانییەک دابنێ، کە بە دەنگی هونەرمەندانی تیپ دەگوترا، نموونە:

سروودی، کوردێکم پێشمەرگەمە. ٢- سروودی، پێشمەرگەی سەنگەر. ٣- سروودی، هەڵیکەن ئالا. ٤- سروودی، بارزانی پێشەوایە. ٥- سروودی، جەژنە. ٦- گۆرانی، تێکە تێکە - نەشمیلە. ٧- گۆرانی، نەگوڵ و نەرەیحانە. ٨- گۆرانی، بەخێر بێیتەوە. ٩- گۆرانی، مەستی چاو بە خومار.

جگە لەوەی چەندین هونەرمەندی گەورەی کورد لە دەرەوەی شارەکە هاتن بەشدارییان لەگەڵ ئەم تیپە دەکرد، وەک هونەرمەندانی خوالێخۆشبوو (محەمەد عارفی جەزیری و تەحسین تەها) و هونەرمەندان (فوئاد ئەحمەد و عەبدوڵڵا دڵسۆز و حەسەن سیساوەیی و.... هتد).

نابێ دەوری هونەرمەندان خوالێخۆشبوو مەلا گچکە و سەربەست میران و حەسەن خۆشناو لەبیر بکەین، کە دەورێکی یەکجار گەورەیان هەبوو لە نووسین و دەرهێنانی شانۆگەرییەکان، کە ناوی هەندێک شانۆگەری وەک نموونە دەهێنینەوە:

١-شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر. ٢- شانۆگەری ماڵی نەخۆری بۆ چەکمە سۆری. ٣- شانۆگەری حەمەی کادیر. ٤- شانۆگەری ترحێو جەنابی حاکم. ٥- شانۆگەری دکتۆری لاسار.

بەشی هەڵپەڕکێ و تابلۆش توانییان چەندین تابلۆی جوان جوان پێشکەش بکەن، کە ژمارەیەکی بەرچاو لە کچان بەشدارییان تێدا دەکرد.

**ناوی تابلۆکان:**

تابلۆی دزراو. ٢- تابلۆی خەرمانان. ٣- تابلۆی بووک گواستنەوە.

**هەڵپەڕکێکان:**

سوسکەیی. ٢- گوڵستێنی. ٣- شێخانی. ٤- بادینی. ٥- چۆپەیی. ٦- عەرەبی.

ئیکسسوار و مکیاجی سەرجەم کارە هونەرییەکان لەلایەن هونەرمەند (سەربەست میران) ئەنجامدەدران.

### هونەری شێوەکاری لە شەقڵاوە شەقڵاوە مەڵبەندی هونەری خۆرسکی شێوەکارییە

پەیوەندی توند و تۆڵ لە نێوان سروشت و ژینگە لەلایەک و هونەر و داهێنان لەلایەکی ترەوە، فۆرم و پێکهات و سەرجەم ئەو شتە گیاندار و بێ گیانانەی لە دەوری هونەرمەندە شێوەکارەکان و لەناو بیر و پەردەی خەیاڵی هونەرمەندانداا جێگیر دەبن، لە هەمان کاتدا دەبنە هەوێنی دارشتنی کارە هونەرییەکانیان، ئەگەر چاوێک بە ژمارەی ئەو هونەرمەندە خۆرسکانەی ئەم شارەدا بخشێنین لەچاو شارەکانی تردا گەلێک ژمارەی زۆرمان بەرچاو دەکەون، ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری سروشتی ئەم شارە، بۆ نموونە ئەم هونەرمەندانەی، کە لێرە ناویان وەک نموونە دێنین زۆربەیان خۆرسک بوون، وەک:

هونەرمەندی پەیکەرتاش، نەزیر خەیلانی. ٢- هونەرمەندی پەیکەرتاش، فاتیمە شەقڵاوەیی. ٣- هونەرمەندی پەیکەرتاش، حەمید جەمال. ٤- هونەرمەندی پەیکەرتاش، سابیر سەبری. ٥- هونەرمەندی پەیکەرتاش، عەلی وادی. ٦- هونەرمەندی پەیکەرتاش، سیروان تۆما. ٧- هونەرمەندی، پەیکەرتاش، سەرباز خۆشناو. ٨- هونەرمەندی پەیکەرتاش، کازم بەرەکەتیی. ٩- هونەرمەندی، پەیکەرتاش، م. ئیبراهیم سولا.

**هونەرمەند نەزیر خەیلانی:** ئەم هونەرمەندە لە ساڵی ١٩٥٣ لە شاری شەقڵاوە لەدایک بووە، لە سەرەتای حەفتاکان پەنای بۆ سروشتی دەڤەرەکە بردووە، بە تایبەتی دار گوێزەکان و تاشە بەردەکانی دەوروبەری، بەچەقۆ کەوتۆتە داتاشینی دارەکان و باڵا و قەدی دارەکان سەرنجی خەیلانییان بۆ لای خۆیان راکێشاوە، سۆفی ئاسا شەیدای کاری هونەری پەیکەرتاشی بووە، لە ناوەراستی حەفتاکان تا ئەوکاتەی رووی لە شاخ کرد، بەشداری چەندین پێشانگای هاوبەشی و شەخسی کرد، ساڵی ١٩٨٦ روو لە شاخ دەکات، دەبێت بە پێشمەرگە و لەناو سەنگەری پێشمەرگەدا پاشماوەی دارە سووتاو و سارووخە تەقیوەکان دەکاتە کەرەستەی کارە هونەرییەکانی، تا

لەدوای ئەنفالەکان هەگبە دەکاتە شان و روو لە تاراوگە دەکات، سەرەتا لە دیمەشقی پایتەختی سوریا خۆی دەدۆزێتەوە، لەم وڵاتە بە کارە هونەرییەکانی و بە کردنەوەی چەندین پێشانگا بەرپەرچی ئەنفالچییان دەداتەوە، تا بەتەواوی بارگەی دەپێچێتەوە و خۆی لە وڵاتی نەرویج دەدۆزێتەوە، لە زۆربەی وڵاتانی جیهان کارە هونەرییەکانی نیشان دەدا:

بەر لەوەی روو لە شاخ بکات شەش پێشانگای لە بەغدا و شارە جیاجیاکانی تری کوردستان و عێراق کردۆتەوە.

پێشانگای هونەرمەندانی کورد لە سوریا -لە شاری دیمەشق لە مۆزەخانەی نیشتمانی.

پێشانگای هونەرمەندانی نەرویج ساڵی ١٩٨٩.

پێشەنگایەک بۆ هونەرمەندانی گەلان، زانکۆی ئۆسلۆ -نەرویج ساڵی ١٩٩١.

پێشانگایەک بۆ هونەری پەیکەرسازی -یابان لە ساڵی ١٩٩٣.

پێشانگای شێوەکاری نەرویجی لە خولی یارییەکانی ئۆلمپی زستانە - ١٩٩٤.

پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندانی یوڤیک.

پێشانگای جیهانی هونەرە جوانەکان

پێشانگای پایزی هونەرمەندانی -ئۆبلاند.

پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندان - ئۆبلاند.

پێشانگای ساڵانەی هونەرمەندان - ئۆبلاند.

پێشانگای هونەری پەیکەرسازی - یابان

پێشەنگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەندی نەرویجی خاتوو راگنهیلدا -هۆڵی هونەر -هامر.

پێشەنگای هاوبەشی لەگەڵ هونەرمەندانی نەرویجی بەناوی نا بۆ رەگەزپەرستی.

وەنەبێ بەتەنیا هەر ئەم پێشانگایانەی کە لە رێوە ئاماژەمان پێکرد هەر ئەوەبێ، بەڵکو هونەرمەند خەیلانی تاکو ئێستا زیاتر لە ٣٤ پێشانگەی تایبەتی کردۆتەوە، جگە لە پێشانگەی هاوبەش.

### شەقڵاوە لە رووی پێگەی کۆمەڵایەتی و ئایینی

هەروەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، هەر لەدێر زەمانەوە ئەم شارە بە شاری فرە ئایینی و یەکتر قبوڵ کردن و پێکەوە ژیان ناسراوە، ئەم شارە لە رووی ئایینییەوە موسڵمانەکان رێژەیەکی زۆری ئەم شارە پێکدێنن، بەڵام ناکرێ ئەوە بکەینە پێوەر بۆ رابردووی ئەم شارە، چونکە هەموومان ئەم راستییە دەزانین، کە لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوو کۆچێکی لە رادەبەدەر لە دێهاتەکان دەستی پێکرد و تا ئەمڕۆش ئەم کۆچە هەر بەردەوامە، شەقڵاوەش لەم کۆچ کردنەی خەڵکی دێهاتەکان بەدەر نەبووە، بەڵام بەبۆچوونی من و زۆربەی خەڵکانی تر لەوانەیە لە سەرەتادا جیاوازییەکی ئەوتۆ نەبووبێ لەنێوان ژمارەی موسڵمان و مەسیحیانی نیشتەجێی شەقڵاوە، لەوانەیە ژمارەی موسڵمانان هەردوو بەرامبەر بووبێ بەرامبەر بە مەسیحییەکان، جگە لە موسڵمان و مەسیحی نزیکەی سی خێزانی جوولەکەش لەم شارەدا ژیاون تا ناوەڕاستی سەدەی رابردوو کۆچیان کرد بۆ فەلەستین کە تاکو ئەمڕۆ شوێنەواری گەڕەکەکە و گۆڕستانێک لە شەقڵاوە هەیە بەناوی جوولەکەکان ناوزەد دەکرێ. لە رووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش بێ دەنگ بوەستین و قسەی لەسەر نەکەین، شاری شەقڵاوە لە دێر زەمانەوە سەرەتا لەدوو چینی لەیەک جیاواز پێکهاتبوو، کە بریتی بوون لە بەگزادەکان و کرمانجەکان، بەڵام لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بنەماڵەی میرەکانیش هاتنە شەقڵاوە و لە شەقڵاوە نیشتەجێ بوون، بە هاتنی بنەماڵەی میرانی شەقڵاوە بۆ ئەم شارە دەتوانین بڵێین راستە بنەماڵەی بەگزادەکان زۆربەی رەز و باغی شەقڵاوە ئەوان خاوەنی بوون، بەڵام میرەکان لە رووی ئیداری و بەڕێوەبردنەوە دەسەڵاتی تەواویان کەوتە دەست و هەمموو دەسەڵاتێک لەم شارە کەوتە دەست میرەکان، کرمانجەکان بەشێکی زۆری دانیشتوانی شارەکەیان پێکهێنابوو، بەڵام زۆربەیان خەڵکی هەژار بوون.

### کەسایەتییە ئەدەبییەکانی شەقڵاوە

محەمەد مەولود (مەم): مەم زۆر لەوە ناسراوترە کە من لێرەوە باسی لێوە بکەم. چونکە ئەوەی مەبەستی بێ ئەم مرۆڤە بناسێ با چیرۆکەکانی (پەنجا فلس) و (برسیەتی بەهێزترە)

و نۆڤایتی (یازدە خەون) و رۆمانی (رێگا) بخوێنێتەوە، ئینجا دەزانێ ئەم مرۆڤە چ مرۆڤێکی مەزن و چ داهێنەرێک بووە، مەم خەڵکی ئەم شارە بووە، تەمەنی منداڵی و هەرزەیی و لاوی لەم شارە بەسەر بردووە، بۆ یەکەمجاریش هەر لەم شوێنە دەستی داوەتە قەڵەم و لە فێرگە سەرەتاییەکەی ئەم شارە فێری ئەلف و بێی کوردی بووە، بۆیە لامان سەیر نییە شوێن لە زۆربەی شارەکانی شەقڵاوەیە و لە کۆڵانەکانی ئەم شارەدا گوزەر دەکەن، دوا ماڵیش بۆ مەم گردی زەیتوون بووە، کە مەم لە زۆربەی چیرۆک و نووسینەکانی ئاماژەی پێکردووە.

**مەلا گچکە:** لە ساڵی ١٩٢٤ لە شەقڵاوە، لە دایک بووە، ناوی تەواوی مەلا گچکە عەبدوڵڵا موفتییە، باوکی ئیمام تابووری عەسکەری بووە، خوێندنی سەرەتایی لەم شارە تەواو کردووە، لەبەر بەشداری کردنی لە کۆماری کوردستان نەیتوانیوە درێژە بە خوێندن بدات.

مەلا گچکەی شاعیر و رۆژنامەنووس و هونەرمەند، جگە لە زمانی عەرەبی، روسی و تورکی و سریانی و ئینگلیزی زانیوە، لە سەرەتای لاوییەتی چۆتە ناو ریزەکانی حزبی شیوعی عێراق و لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلول وەک کارمەندێکی تەندروستی بەشداری لە شۆرش کردووە و بۆتە پێشمەرگە و بە دکتۆر مەلا ناوبانگی دەرکردووە، مەلای شاعیر مرۆڤێکی ئێسک سووک، زیرەک، قسە خۆش، خودان هەڵوێست و نیشتمانپەروەر و مرۆڤ دۆست، لای زۆربەی سەرانی سیاسی کورد ناسراوە. ئێستا دیوانێکی شیعری ئامادەیە بۆ چاپ، بەڵام بەداخەوە بە هۆی شەڕی نەگریسی خۆکوژی لە ئاوارەیی لە هەولێر رێکەوتی لە شەوی ١٦/١٠/١٩٩٥ بۆ دواجار ماڵئاوایی لێ کردین و دوای ساڵێک تەرمەکەی گواسترایەوە بۆ گردی زەیتوون لە شەقڵاوە.

**حەمید جەمال:** لەدایکبووی شەقڵاوە (١٩٥٤)، ئەو هونەرمەندە نیگارکێشە بە هێمنی و لەسەرخۆ کەوتۆتە سەر کار و خەریکی کاری ئەفراندنە، دوو پێشانگای تایبەتی لە هەولێر و دانیمارک لە ساڵی ١٩٩٢ -١٩٩٣ کردۆتەوە، جگە لە چەندین پێشانگای جۆراوجۆری هاوبەش.

کاک حەمیدی هونەرمەند کەلتووری نەتەوەکەی بە شێوەیەکی دیار و بەرچاو ئاوێتەی کارە هونەرییەکانی دەکات، توانیویەتی لە کاری هونەریدا سوود لە رەنگ و ئەو وێنانەی سەر دۆڵاب و باول و نەخشەی کۆنەکانی رایەخەکان ببینێ و زۆر شارەزایانە، هەڵسوکەوت لەگەڵ رەنگ دەکات.

**فاتە شەقڵاوەیی:** لەدایکبووی ١٩٧٣، گەورەترین گرفتی ئەو خاتوونە ئەوەیە، کە خۆی دەڵێ گەورەترین کێشە بۆ ئەو نەبوونی مامۆستایەک بووە، کە بەشێوەیەکی زانستی پەروەردەی بکات، بەڵکو خۆی خۆی پێگەیاندووە، واتە خۆڕسک بووە، هەر خۆی مامۆستاو رێنیشاندەری خۆی بووە، تاکو ئێستا لە چەندین پێشانگای هاوبەش و تاک بەشداری کردووە.

**حەمید قەساب:** ئەم هونەرمەندە مەزنە لە ساڵی ١٩٢٤ لە شەقڵاوە چاوی بە دونیا هەڵێناوە، کاری قەسابی بووە، بە گەورەیی هاتۆتە ناو دنیای هونەر و لە ساڵی ١٩٦٥ خۆی فێری ئامێری مۆسیقا کردووە، توانیویەتی بە ماوەیەکی کەم هەریەک لە ئامێری عود و کەمان و ساز بەباشی بژەنێ و هەر لە شەستەکان هونەرمەندی ناسراوی کورد فەرەیدون دارتاش لە شەقڵاوە مامۆستای هونەر دەبێت، خوالێخۆشبوو حەمید قەساب خۆی فێری نۆتەی مۆسیقا دەکات و لە دواییدا دەبێتە یەکێک لە مامۆستا هەرە زیرەکەکانی ئەم بوارە و دەیان قوتابی پێدەگەیەنێ، کە (م.رزگار خۆشناو، م.رەنجبەر خۆشناو، م.مەجید خۆشناو) قوتابی ئەم بەرێزە دەبن، لە ساڵی ١٩٦٨ لەگەڵ چەند هونەردۆستێ بە نهێنی تیپی سەفینی هونەری دادەمەزرێنن، بەڵام بەداخەوە لە ساڵی ١٩٧٤ لەلایەن رژێمی گۆڕبەگۆڕ زیندانی دەکرێت و ئازار و ئەشکەنجەی زۆر دەبینێ، هەر کە لە زیندان ئازاد دەبێت یەکسەر روو لە شاخ دەکات و دەبێتە پێشمەرگە، بەڵام بەو ئازارەی کە کاتی ئەشکەنجەدان بینیبووی بە مەبەستی چارەسەرکردنی رەوانەی ئێران دەکرێت. لە ساڵی ١٩٧٥ لەسەر سنوور لە حاجی ئۆمەران ماڵئاوایی لە هونەر و لە گەلەکەی دەکات.

لێرەدا نامانەوێ یەکەیەکە ناوی سەرجەم ئەم کەسایەتییە سیاسی و

هونەری و رۆشنبیرییانە باس بکەین، چونکە، رەنگە دەرەقەتی هەموو کەس و شتەکان نەیەین تەنیا لێرەدا چەند ناوێک بە نموونە دێنینەوە.

د. کەمال خۆشناوی خوالێخۆشبوو. ٢- ئەبو سیروانی خوالێخۆشبوو. ٣- شەهید رەشید باوەکر. ٤- شەهید عەبدوللا ئۆمەر. ٥-زەعیم روکن بەکر سامی. ٦- هونەرمەند رزگار خۆشناو. ٧- هونەرمەند رەنجبەر خۆشناو. ٨- هونەرمەند مەجید خۆشناو. ٩- هونەرمەند ئەمین سەرسپی. ١٠- م.ئیسماعیل حوسێن خۆشناو. ١١- م.بەگوکە فەندی خوالێخۆشبوو.

تیپی سەفین دوای پاشگەزبوونەوەی رژێمی عێراق لە بەیاننامەی ١١ی ئازار -دەست پێکردنەوەی شۆڕشی چەکداری لە کوردستان-زۆربەی هونەرمەندان پەراگەندە بوون و ژمارەیەکی زۆر روویان لە شاخ کرد، ئەم تیپە هەڵوەشایەوە، زۆربەی کەرستە و ئامێرە مۆسیقییەکانی تالان کران، کاری ئەم تیپەش بەتەواوی ئیفلیج بوو، دوای نسکۆ، کۆمەڵە ئەندامێکی کۆنی ئەم تیپە و دوای ئەوەی پەیوەندییان بە کۆمەڵە گەنجێک کرد، کە سەر لەنوێ ئەو تیپە نۆژەن بکەنەوە، بە تایبەتی مامۆستا مەجید خۆشناو دوای ئەوەی کە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی لە بەغداد تەواو کرد، گەڕایەوە شارەکە و زۆر دڵسۆزانە قۆڵی لێ هەڵماڵی، توانی چەندین خولی فێربوونی مۆسیقا بۆ چەندین منداڵی بەهرەمەند بکاتەوە، بەماوەیەکی کەم فێری ژەنینی ئامێرەکانی مۆسیقایان بکات، بەشداری لە سەرجەم ئەو پێشبرکێیانە بکات کە لە شارەکانی تری کوردستان ئەنجام دەدران.

لە ئاکامدا توانییان لەسەر ئاستی کوردستان پلەی یەکەم وەدەست بێنن، بەڵام وەک کاری هەمیشەیی بەعسییەکان هەولیان دەدا هونەرمەندان بۆ بەرژەوەندی ویستی گڵاوی خۆیان بەکاربێنن، بەڵام ئەوان نەچوونە ژێر باری رژێم بەناچاری بڵاوەیان لێکرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی (م. مەجید خۆشناو) رووی لە شاخ کرد، ئەو مێردمنداڵە هونەرمەندانەش لەو رۆژگارەدا، کە خاوەنی بەهرەی هونەری بەرز بوون، ئەم بەرێزانە بوون. (وشیار تۆما، فەرهاد کەریم، شێروان عوسمان، محەمەد عەبدوللا).

ئەوانەی شان بەشانی مامۆستا مەجید بەشدارییان لە کارە هونەرییەکان دەکرد.

١- م. حەکیم عەبدولرەحیم. ٢- سەردار ئەحمەد. ٣- کەیفی حەمەد. ٤- وریا خالد مەدحەت. ٥- هۆشەنگ خالد مدحەت. ٦- مەجید کەریم. ٧- سەربەست عوسمان. ٨- روڤائیل باسا. ٩- شەماڵ مەجید. ١٠- سۆران عوسمان..... هتد.

بەشی شانۆش دیسان کەوتنەوەخۆ توانییان چەندین شانۆگەری پێشکەش بکەن، وەک: شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر)، شانۆگەری (حاجی برایم و حوب حوبانێ)، شانۆگەری (داسەکەی شاسوار)، ئەوەی شایانی باس بێ ئەم شانۆگەرییە پرۆڤەی تەواوی بۆ کرا و ئەکتەرەکان لە پشتی شانۆ ئامادەبون کە بێنە سەر شانۆ پێشکەشی بکەن، بەڵام پیاوانی رژێم رێگایان پێنەدان.

ئەو بەرێزانە بوون کە دەوریان هەبوو لە نۆژەنکردنەوەی تیپی شانۆ

م. حەسەن مستەفا خۆشناو. ٢- م. مەجید رەحمان. ٣- ئەسعەد حەمەد (د. هیوا). ٤- سوار عەولا. ٥- هێمن ئیسماعیل. ٦- فەردیدون عەزیز تۆما. ٧- بەترس ئیسحاق. ٨- سروود حەسەن. ٩- ئەنوەر حەمەدەمین. ١٠- شێرزاد حەمەدەمین شینە. ١١- فریاد خالد مدحەت. ١٢- رەشاد رەشید. ١٣- ئیسماعیل ماوەرانی. ١٤- بوخاری عەبدوللا.

**پەراوێزەکان**

* ئەوەی لێرەدا شەماشە میخائیل ئاماژەی پێداوە، دەتوانین بە گەورەترین بەڵگەی دابنێین، کە کوردستان وڵاتی یەکتر قبوڵ کردن و فرە ئایینی بووە.

* سەردەمێ بێژەری دەنگی ئەمریکا (بەشی کوردی) بوو ئێستا بەڕێوەبەری گشتییە لە وەزارەتی مرۆڤایەتی.

**سەرچاوەکان**

- کتێبی (معجم البلدان)، یاقوتی حەمەوی.
- (شهداء الفرس)، ناوی دانەرەکەی دیار نییە.
- دەستنووسەکانی کەنیسەی شەقلاوە.
- مێژووی میرانی سۆران، حوسێن حوزنی موکریانی.
- شەرەفنامە، و: مەلا جەمیلی رۆژبەیانی.
- شەرەفنامە، شەرەفخانی بەدلیسی، و: هەژار.
- ئەمین زەکی، مێژووی کورد و کوردستان.
- نووسی کەنیسەی ئەرمەنییەکان.
- (تاریخ المدن العراقية)، جمال بابان.
- (تاريخ شقلاوه، شماشه ميخا.)

# مەزاری قەشە بۆیا

هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایینەکان و خوداپەرستییەوە، کەسانێک هەبوون بۆ خواپەرستی و خۆ خاوێن کردنەوە و گەیشتن بە ڕەهای ڕۆحی خۆیان، پەنایان بردۆتە ناو ئەشکەوتەکان و چیا بەرزەکان.

ئەشکەوتەکانیش یان ئەوەتا گۆڕانکارییە سروشتییەکان دروستیان کردوون یان ئەوەتا مرۆڤ دەستکاری تێدا کردووە و کردوویەتی بە شوێنێکی شیاو بۆ ژیان و مانەوە.

مەزاری قەشە بۆیا، یان ئەشکەوتی قەشە بۆیا یان ئەشکەوتی (وسو ڕەحمان)، کە موسڵمانەکان بەو ناوە ناوی دەبەن. مەسیحییەکان وەک شوێنێکی پیرۆز و داواکاری و مراز و منداڵبوون سەردانی ئەم مەزارە دەکەن، ئێمە زۆر گەڕاین بە دوای مێژوویەکی دروستی ئەو مەزارە و کاتی دروستکردنی و ئایا زیاتر مەزارێکی مەسیحییە، یان موسڵمانە، بەڵام لە چەند لاپەرەیەک زیاتر، کە ئەویش لە پەرتووکی مەزارەکانی شەقڵاوە داهاتووە، زیاترمان دەست نەکەوت، ئەمەش وای کردووە کە مێژوویەکی نادیاری هەبێت و هەندێ کەس بڵێن ئەشکەوتی وسو ڕەحمان و هەندێ بڵێن ئەشکەوتی قەشە بۆیا. بەڵام لە لایەکی دیکە (فرانسیس شیر) لە تۆما حەنا لە ساڵی ١٩٨٥ پارچە قوماشێکی دەستکەوتووە، کە وێنەی سەلیبێکی بچووکی لەسەر نەخش کرابوو، بە گوێرەی ئەو پارچە قوماشە، وا دەردەکەوێت کە مێژووەکەی بۆ (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر بگەڕێتەوە.

مەزاری قەشە بۆیا، بەناوبانگترین مەزارە لە شەقڵاوە و دەوروبەری، ئەم مەزارە دەکەوێتە دۆڵێک نزیک کەنیسەی (مریەم عەزرا)، کە کۆمەڵێک لە پیاوە ئایینییەکان وەک شوێنێکی ئایینی سەیری دەکەن.

بەرامبەر دەرگای ئەم مەزارە پانتاییەک هەیە و لەلای چەپی بەردێکی گەورە بە درێژی (٣٨٥) سانتیمەتر و پانی (١٢٥) سانیمەتر، ئەم بەردە وەک بەردی مراز خەڵک مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و لەسەر زگ لەسەری دەخلیسکێن، کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە و سێ جار دووبارەی دەکەنەوە و دەبێ سەریان بگاتە سەر زەوی. ئەوەی خەڵک باسی لێوە دەکەن ئەو بەردە بۆ مرازی منداڵ بوون، ژنان خلیسکانێ لەسەر دەکەن. هەرچەندە ئێمە زۆر پیاویشمان بینی، وەک پیرۆزییەک و مرازێکی خۆیان هەمان خلیسکانێ دەکەن.

هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ خاتوو

(نەجیبە گۆرگیس) قسەمان کرد، کە لەگەڵ چەند کەسێکدا هاتبوون بۆ سەردانی ئەم مەزارە. خاتوو نەجیبە وەک بینیمان لە دەرەوەی مەزارەکە پێڵاوەکانی دانابوو و بە پێخواسی هاتبووە ناو مەزارەکە و لە بەرزاییەکەوە تەسبیحاتی دەکرد. لە بارەی ئەو بەردەوە بۆمان دوا.

برایەکەم دە ساڵ منداڵیان نەدەبوو، منیش بە پێخواسی ڕۆژێک هاتم و هانام بۆ ئەم مەزارە هێنا، ئامانجەکەم هاتەدی و برایەکەم بوو بە باوک.

خێرەکە و نزایەکەت زووتر وەردەگیرێ.

هەروەها خاتوو (نەجیبە) ئەوەشی بۆ باس کردین، کە جاران بە لێشاو دەهاتن و ئەو بیرەی بەردەمی مەزارەکەیان خاوێن دەکردەوە و ئامادەیان دەکرد بۆ ڕۆژانی جەژن. ئەو بیرەش دەکەوێتە نێوان هەردوو ئەشکەتەوکەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات، کە لەبەرد تاشراوە، پانتایی لە سەرەوە دەگاتە (٣) مەتر و قووڵی (٧) مەتر. ئەو بیرەش بێگومان تاکو ئێستا پڕ نەبۆتەوە بە خۆڵ و بەرد، بەڵام ئاویشی لێ ناخورێتەوە، لەناو ئەشکەوتەکەش لەلای ڕاست ژوورێک هەیە، وا پێ دەچێ کاتی خۆی بۆ کاری درووومانی بەکارهاتبێ، وەک لە پەرتووکی مەزارەکان باسی لێوە کراوە، لە ناوەڕاستی ئەم مەزارەشدا ژوورێک هەیە چەند گۆڕێکی تێدایە و دەرگایەکی هەیە بۆ ژووری سێیەم و ژوورێکی تریش هەیە، کە دەبێ گۆڕی (قەشە بۆیا) پێشتر لەوێ بووبێ، بەڵام ئەم ژوورانە ئێستا نابینرێن و بە بەرد هەڵچنراون. هەروەها خەڵک بۆ مەزارەکانیان لە دەلاقەیەکەوە، کە پشتاوپشت حەوت بەرد حەوت جار فڕێ دەدەن، لەناو مەزارەکەش جێگای داگیرسانی مۆمێکی زۆر دەبیندرێت. بەتایبەتی لە ڕۆژی جەژندا، هەموو خەڵک دێن مۆم لەو مەزارە دادەگیرسێنن، کە ئەم ڕۆژەش دەکەوێتە دووشەممەی سێیەمی مانگی چوار، کە بە دووشەممەی سێیەمی قیامەت ناودەبرێت. ئەم ڕۆژەش لە ساڵی ١٩٩٤ (ماریۆ حەنا مرخۆ) لە هەینی دووەمی قیام وەکو جەژنی (ئەبرەشی)دانیاوە تا هەموو خەڵک بتوانن بەشداری ئەو کۆبوونەوە پیرۆزە بکەن. بۆیە ساڵانە خەڵکێکی زۆر ڕوو لەم مەزارە دەکەن و مۆمی خۆیان دادەگیرسێنن، زۆر کەسیش وای بۆ دەچن، کە (قەشە بۆیا) ئەو قەشەیەیە بە ناوی (بیرێ)، کە لە چیرۆکی (قەرەداغ) ناوی براوە، وەک دەڵێن (قەشە بۆیا) خوشکێکی هەبووە (راهیبە) بووە و قەبری ئەو خوشکەی لە باخچەکان لە نزیک کانییەکە، کە بە (دەرمان ئاو) ناو دەبرێ، کە خەڵکی تووشبوو بە نەخۆشی ڕۆماتیزم ڕووی تێ دەکەن، پێشتر گەیشتن بەم شوێنە زۆر زەحمەت بوو، بەڵام بەم دواییە لە ڕێگای حکومەتی هەرێمەوە ڕێگایەکەیان بۆخۆش کردووە و ئاسانتر خەڵک دەتوانێ سەردانی ئەم مەزارە بکات.

هەتاکو ئێستاش تۆزێک گیروگرفتی ئاوی هەیە، بەڵام وا دیارە دەیانەوێ لەوێ بیر لێدەن زیاتر ببێتە مەزارێک و شوێنێکی گەشتیاری پیرۆزی ئایینی.

هەتاکو بەرزاییەکی زۆر ڕێگا خۆش کراوە، بۆ ئۆتۆمبێل و دواتر خەڵک بەپێ بەسەر دەکەوێت.

خەڵکی مەسیحی و موسڵمان سەردانی ئەم مەزارە وەک شوێنێکی پیرۆز دەکەن، بە بێ ئەوەی گیروگرفتی (هی من و هی تۆ)ی تێ بکەوێت. ئەمەش خۆشحاڵییەکە لە ئێمەی کوردەوە، کە بە پیرۆزی سەیری شوێنە ئایینییەکان و گەورەی سروشتی بکەین.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٥)ی حوزەیرانی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.

# مەزارگەی وسو رەحمان (رەبەن بۆیا) شەقلاوە

زرار سەرتاش

لە شەقلاوەی بناری سەفین، لە سەرەوەی ... کانی خومان " لە شاری فرە ئایینی، ئەو کانییەی، کە لە رۆژگارێکدا هەرچی کیژۆڵەی شۆخ و شەنگی جوولەکەکان هەبوو لەو دەڤەرە، لە سەر ئەو ئاوە سازگارە کۆدەبوونەوە، خوربیان لەوێ رەنگ دەکردو لە ناو خەمیان دەنا، مەزارگەیەک لە ناو دۆڵێکی درێژ، بەلام سەخت، کە نزیکەی کاتژمێرێ بە پێ دوورە، کەوتۆتە ناو قەدی سەفینەوە، لە سەرەوەی ... گردی دێرێ ... وە، کە کەنیسەیەکی کۆن و شوێنەوارێکی مێژوویی بوو، بەلام بە داخەوە لە سەردەمانی رژێم فەرامۆش کراو داتەپی. تا لە دوای راپەرین بە شێوەیەکی نوێ نۆژدن کرایەوە و، سیما کۆنەکەی لە دەست دا. ئەو مەزارگەیە لای موسڵمانان بە ... شێخ وسو ردحمان... و لای دیانەکان (مەسیحییەکان) بە (رەبەن بۆیا) ناسراوە. چەندین بیرو بۆچوونی جیاواز لە سەر کۆنی، یان دروستکردنی ئەم مەزاره هەیە.

هەریەکە و یان هەر ئایینە بە جۆرێک باسی لێوە دەکەن و دیرۆکی ئەم مەزارگەیە دەگەرێتەوە، سەردەمانێک بە پێی نووسینەکانی مێژوونووسی گەورەی کورد (تۆفیق وەهبی)، ئەم مەزارگەیە لە سەدەی پێنجەمی زایینی لە لایەن (رەبەن بۆیا) و هاورێیازەکانی ئاوەدان کراوەتەوە، لەم شوێنە خوا پەرستییان کردووە و خۆیان حەشار داوە، لای موسڵمانانەکایش دەڵێن گوایە پێنج سەدە بەر لە ئەمرۆ، لە دوای شەڕی چالدێران لە ساڵی(١٥١٤ز) شێخێک بە ناوی "یووسف" لە باکووری کوردستانەوە لە بەر زوڵم و زۆریی دەسەلاتدارانی عوسمانی رایکردووە، لەم شوێنە گیرساوەتەوە و کردوویەتی بە شوێنی داڵدەی خۆی بۆ هاورێکانی. لەوانەیە ئەو دوو کەسەی باسی لێوە دەکەن، هەر دووکیان لەوێ ژیابن. بەلام هەریەکە و لە رۆژگارێ. بە پێی بیرو بۆچوونی هەندێ کەسی دیکە، دەڵێن: لەوانەیە ئەمانە لە سەردەمی میرانی سۆران لەوێ ژیابن و، لە کاتی راو و شکار لە ناو ئەو ئەشکەوتە حەسابنەوە، کە سەردەمانێک ئەم ئەشکەوتە

دەڤەری هاوینەهەواری میرانی سۆران بووە. هەرچی دەڵێن لە بارەی ئەو مەزارەوە بیرورای ئازادە و كاری ئێمە مانان نییە بۆ سەلماندنی راستییەكان: بەڵكو پێویستە لە رۆژگارێكی وەكو ئەمرۆ، كە خاوەنی بەرێوەبەرایەتییەكی سەربەخۆین بۆ شوێنەوار، خەڵكانی پسپۆر بێن و یان شوێنەوار ناسان، راستییەكان بسەلمێنن بە شێوەیەكی زانستییانە لێكۆڵینەوەی لە سەر بكەن، چونكە ئەو پاشماوەی لەوێ ماوە چ وەك ئەو قسڵ و گێچە، یان ئەو هەیكەلەی ئێسكانەی ئەو مرۆڤانە بە هۆی تاقیگاوە كارەكە یەكلا دەكاتەوە و، مێژووی ئەم شوێنەوارە، دیاری دەكرێ. ئەم شوێنە لە رووی جوگرافییەوە شوێنێكی سەخت و دۆڵێكی چڕو پڕبووە. لە رووی سەربازییەوە ناوچەیەكی یەكجار ستراتیژییە. لە ناو دۆڵێكەوە بە تاقی شاخێكی سەختەوەدیە. رێگای چوونە سەرەوەی زۆر ئاستەمە. تەنیا تولەرێیەك هەیە، كە یەك مرۆڤ زیاتر ناتوانێ پیایدا بروا بۆ چوونە ناو ئەشكەوتەوە. لە لای رۆژئاوای دۆڵەكە تاقێكی یەكجار بەرزو سەخت هەیە، كە بە هیچ شێوەیەك رێگای سەركەوتنی نییە. لە دامێنی شاخەكەوە ئەشكەوتێكی بچووك هەیە، كە لای خەڵكی دەڤەرەكە بە ئەشكەوتی كافران ناوی دەبەن: لە نێوانی هەردوو ئەشكەوتەكە گۆرایییەك هەیە بیرێك بە قووڵایی ٣م و بە پانایی ٢م لە شێوەی بازنەیی لە بەردێكی گەورە هەڵكەنداوە و، لە ناو زەوی دایە، كە بە ئاوی باران پڕ دەكرێت. ریش سپیانی ناوچەكە دەڵێن: گوایە لە كاتی خۆیدا لەو ساڵانەی، كە بەفرو باران كەم بووە لە كانی ناوەنجی ئاوی بۆ بردراوە. لە لای باكووری دۆڵەكە تاقێكی بەرز هەیە تەنیا رێگایەكی باریك بەرچاودەكەوێ. رووبەری ئەشكەوتەكە یەكجار فراوانە و جێگای قەڵەم و چەكووچ بە ئاشكرا بە لای شاخەكانی ئەشكەوتەكەوە دیارە، كە بۆ مەبەستی فراوان بوونی رووبەری ئەشكەوتەكە تراشاوە. ناو ئەشكەوتەكە بە بەردو قسڵ و گێچ كراوەتە چوار بەش یان چوار ژووری لە یەكتر جیاواز، لە لای سەرەوەی ئەشكەوتەكە لە بنمیچی ئەشكەوتەكە كونێك هەیە لە شێوەی پەنجەرە، لەوانەیە بۆ مەبەستی رووناكی دروست كرابێ. ئافرەتان دەسماڵ و چارۆگەی سەریانی تێداوێن، ئەگەر ئاودیو بوو شاد دەبن، كە گوایە نزاكانیان لای چاكەكە وەرگیراوە و بە مراز دەگەن. لە دەرگای ئەشكەوتەكە و لە سەر هەڵدێر بەردێكی پان بە درێژایی (٢.٥م و بە پانایی ١.٥م)، هەیە ئەو ئافرەتانەی، كە منداڵیان نابێ خۆی پێدا شۆڕ دەكەنەوە و سكیان لەم بەردە دەخشێنن، بەو نیازەی كە منداڵیان ببێ. هەر چوار لای ئەشكەوتەكە پاشماوەی مۆمی داگیرساوە، كە سیمایەكی یەكجار جوانی بە ئەشكەوتەكە داوە. ساڵانە خەڵكانێكی یەكجار زۆر لە ناوچە جیا جیاكانی كوردستان سەردانی ئەو مەزارگەیە دەكەن، بەتایبەتی برا مەسیحییەكانی كوردستان رۆژێكی تایبەتییان هەیە لە وەرزی بەهاردا، كە ژمارەیەكی یەكجار زۆر بەسەر ئەو شاخەدا هەڵدەزنێن، ئەو دیمەنە خۆی لە خۆیدا لە كەرنەڤاڵێك دەچێ.

* گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر / ژمارە (٥) / تەمووزی ساڵی (٢٠٠١) وەرگیراوە.



# گەلاڵە

جەلال مەولود حەمەد سنجاوی

لەم تۆژینەوەیەدا پتر تیشک دەخرێتە سەر شارۆچکەی گەلاڵە و دەوروبەری و زیاتریش ئەو زانیارییانە دەخەمە روو، کە خۆم لە نێو واقیعەکەیدا ژیاوم، بە تایبەتی سالانی (١٩٧٧- ١٩٨٠) کە ئەو کاتی بەرێوەبەر و مامۆستای قوتابخانەی (ناوەندی گەلاڵەی تێکەڵاو) بووم و قوتابییەکانم جگە لە هاووڵاتیانی گەلاڵە، زۆربەیان خەڵکی (قەسرێ، رێزان، رەشدوور، رێژوکەربان، وەرتێ، دەرگەڵە، روستێ، گیزان، دیلزە، مێرگە) بوون و خەڵکی شارۆچکەکەش کوردپەروەر و زانست دۆست بوون، زانیاری دانسقەو نوێباویان لە دڵەوە بۆ مامۆستایان و فەرمانبەران هەڵدەرشت و سوودیان لێ وەردەگیرا. زۆربەی ئەو وێنانەش کە لە دووتوێی ئەم تۆژینەوەیەدا دەبینرێن و بۆ یەکەم جارە بڵاویان دەکەمەوە، گوزارشت لەهەمان ساتە وەخت دەکەن، جگە لە چەند وێنەیەک بۆ سالانی (١٩٤٣- ١٩٤٧) دەگەرێتەوە، کە لە ئەرشیفی مامۆستا (سەید کەمال محەمەد عەلی)م وەرگرتووە کە بەرێزیان لە نێوان سالانی ئاماژە پێکراو بەرێوەبەری قوتابخانەی گەلاڵەی سەرەتایی بوو.

پێشەکی بە پێویستی دەزانم کورتە باسێکی جوگرافی -مێژوویی دەڤەری باڵەکایەتی بخەمەروو، بەو پێیەی ئەو دەڤەرە ستراتیژییە بە درێژایی مێژوو لانکەی شۆرش و کوردایەتی و سەنگەری بەرگری و خۆراگری پێشمەرگەکان بووە و ماوەی زیاتر لە (١٤)ساڵیش (بارزانی نەمر) لەو ناوچەیە سەرکردایەتی شۆرشی ئەیلوولی کردووە، خەڵکەکەش بەدڵێکی فراوان و روحێکی کوردانەی لە رادەبەدەر لەپێشەوەی کاروانی خەبات و تێکۆشان بوون و بەسەدان شەهیدیان کردۆتە قوربانی شۆرش و خاکی کوردستان و زمانی پاکی باوان، چەند جارانیش دووچاری راگوێزان و ماڵوێرانی هاتوون، لەگەڵ ئەو هەموو کارەساتە گورچکبرانەشدا لەکاروانی

بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەکەیان دانەبڕان، تا ئێستاش لە تێکۆشان و چاکسازی و هەڵمەتی ئاوەدانکردنەوە و بووژاندنەوەی دەڤەرەکە بەردەوامن، بەتایبەتی دوای راپەڕینە مەزنەکەی بەهاری (١٩٩١) زۆربەیان گەڕانەوە گوندەکانیان و سەر لەنوێ زێدی باب و باپیرانیان ماچ کرد و رەز و باخەکانیشیان رێک خستەوە.
باڵەکایەتی ناوچەیەکی شاخاوی سەختە و رووبەرێکی بەرفراوانی لە باکووری رۆژهەڵاتی هەولێر پێک هێناوە و تا دەگاتە سنووری سیاسی دەستکردی نێوان ئێران -عێراق. ئەم دەڤەرە لەرووی کارگێڕیدا لە قەزای (چۆمان)و هەرسێ ناحیەی (گەڵاڵە و سیدەکان و حاجی ئۆمەران) پێکهاتووە، نزیکەی (١٠٨) گوند دەبێ، جگە لە رەوەندە مەڕدارەکانیش، کە بەردەوام گەرمیان و کوێستان دەکەن و شوێنی نیشتەجێبوونیان وەرزییە.
رێگای ستراتیژی (هاملتۆن) بە ناوەڕاستی دەڤەرەکەی تێدەپەڕێ، لە (حاجی ئۆمەران) بەرێگای خانە و نەغەدە و مەهاباد دەبەستریتەوە. ئەمەش پتر بایەخی ژیئۆپۆلەتیکی دەڤەرەکەی زیاتر کردووە و بۆ کاروباری هاتوچۆی ئۆتۆمبێل و کاروانی کاسبکاران و مەڕداران سوود بەخشە، جگە لەوەش بە پردی پەرینەوەی بازرگانەکان دادەنرێت، کە (هەناردەو هوردە)ی کەلوپەلی بازرگانی بەم رێگایە ستراتیژییە جێبەجێ دەکەن.
رووبەری دەڤەری باڵەکایەتی (٢٥٨٢٤٥) دۆنم دەبێت و چیای بەرز و سەختی لێیە و زۆربەی چیاکانی ئەم بەشە بەپێچی توند و کەوور و رک ناسراون، درزو شکانەوەی خشۆک و گەورەیان زۆرە تا رادەیەک جیۆلۆجیستەکان دەگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە ئەم دەڤەرەش تەبای هەرێمە شاخاوییەکانی دیکەی کوردستان بەهەمان گۆڕانکاری جیۆلۆجی و جیمۆرفۆلۆژی چینەکانی کەڤرەکانی تێپەڕ بووە.
باڵەکایەتی چەندین زنجیرە چیای درێژ و سەخت لە خۆ دەگرێ، دیارترینیان شاخەکانی (حەساروست)ە، کە بەرزترین لووتکە چیای کوردستانی لێیە، ئەویش (هەڵگورد)ە، (٣٦٠٧)م لە ئاستی رووی دەریاوە بەرزە، هەروەها چیای (کاروخ، مامەڕووت، کۆدۆ، حەساری سەکران، مەزرێ شێخ ناسر...هتد) جگە لە دەیان دۆڵی بە پیت، وەک: (دۆڵی خانەقا، ناوچەی حافیز، دۆڵی ناوچەی وەرتێ، ناوچەی مەلا شەرەفیان، دۆڵی رۆستێ، دۆڵی سەکرایەتی، دۆڵی باڵەییان، دۆڵی شیوەزووری.....هتد) کە بۆ کشتوکاڵ و رەزو باخ و ئاژەڵداری سوودبەخشن، جگە لە دەیان گوند، کە لەم دۆڵانە و نزیک کانیاوەکان دروست کراون.
ساڵانە رێژەیەکی زۆر لە بەفرو باران لە دەڤەرەکە دەبارێ، تەنیا رێژەی باران ساڵانە لە نێوان( ٩٥٠ - ١٠٠٠ )ملم دەبارێ و لە سەر ترۆپکی چیایە بەرزەکان بە هاوینانیش بەفر دەمێنێ و دەڤەرەکە فێنک دەکاتەوە.
هەروەها لە زستانان بایەکی ساردو توند هەڵدەکاو پێی دەڵێن (زریان)، هەوەک لە چۆمان و دەربەند رایات و ناو پردان و دەورووبەری هەستی پێ دەکرێ.
خەڵکی دەڤەرەکە بەشێکی بژێوی ژیانیان بە ئاژەڵداری دابین دەکەن، بە تایبەتی (مەڕو بزن و مانگا و وڵاخی بەرزە)و هەندێکیشیان (مێش هەنگوین) بەخێو دەکەن بۆ (هەنگوین)، بە تایبەتی لە نێوان (چۆمان- دەربەند- ئازادی- حاجی ئۆمەران) شانەی مێشەکان لەم بەرو لەوبەری شەقامە سەرەکییەکە دانراون و رێبواران بە چاوی خۆیان دەیانبینن، ئەمەش بۆ خواردن و دەوڵەمەندکردنی ئابووری کوردستان سوودبەخشە.
لە بەر سەختی توبۆگرافیای ناوچەکە و کەمی زەوی پان و تەختانی، خەڵکەکە جگە لە رەزو باخەکان زۆر (توتن) دەچێنن، لەگەڵ ئەوەشدا بایەخ بە چاندنی دانەوێڵە دەدەن وەک: (گەنم و جۆ و چەڵتووک و گوڵەبەڕۆژە و نیسک و نۆک و ماش) هەروەها (پەتاتە)ش دەچێنن، تەنیا لە(چۆمان) رووبەری داچێندراوی(پەتاتە) (١٠) دۆنم دەبێت و بەرهەمداری ساڵانەی دەگاتە (١٢) تەن پەتاتە. هەروا بەرهەمداریی بەروبوومی زستانەی (گەنم و جۆ) لە قەزای چۆمان لە نێوان ساڵانی( ١٩٨٠-١٩٨٦) بەم جۆرە بوو: بڕوانە خشتەی ژمارە (١).
هەروەها بە هۆی بوونی رێژەیەکی زۆر لە سەرچاوە ئاوییەکان لە دەڤەرەکەدا، حکومەتی هەرێمی کوردستان چەند پرۆژەیەکی (کارۆ ئاوی) بۆ گوندەکان دابین کردووە، بەمەش گرفتی بێ کارەبایی تا رادەیەکی زۆر چارەسەر کردووە.
هەروا کانزا گرانبەهاکان بە رێژەیەکی باش لە دەڤەرەکەدا هەیە،

وەک: (مس، مەنگەنیز، نیکل) جگە لە گەچ و چیمەنتۆ، کانە بەردی گەلاڵەش بۆ بەرهەمهێنانی (بەردی مەرمەڕ) لە نێوان (گەلاڵە - ناوپردان) هەیە.

هەروەک باسمان کرد، دەڤەری باڵەکایەتی وەک سەنتەری پۆلی موگناتیسی بزووتنەوەی نەتەوەی کورد هەردەم وەک داینەمۆی شۆڕش بووە و زۆر خزمەتی پێشمەرگەکانی کردووە بەماڵ و سامان و حەوانەوە، خەڵکەکەش هەموو بەگەورە و بچووک لەلایەن رژێمەوە بەپێشمەرگە حیساب کراون، بۆیە رژێمی عێراق بەچەند قۆناغ دەستی کرد بە وێرانکردنی گوندەکان و تەقاندنەوەی کانیاوەکان و گۆڕینی رێڕەوی رووبارەکان و سووتاندنی رەز و باخەکان بەبیانووی دروستکردنی (پشتێنی ئەمنی - الحزام الأمني) ئەم کارە نا مرۆڤانەی رژێم تا رادەیەک کاری کردە سەر باری کۆمەلایەتی و بژێوی خەڵکەکە تاکو ئێستاش شوێنەواری دیارە، بەلام حکومەتی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی لە هەردوو کابینەی (سێیەم و چوارەم)دا بەردەوام خەریکی ئاوەدانکردنەوەی دەڤەرەکەیە و هێشتا زۆر هەنگاوی دیکەی لەپێشە بۆ گەڕاندنەوەی رۆح بۆ ژیان و گوزەرانی خەڵکەکە و بووژاندنەوەی گەنجینەی سروشت.

لە خشتەی ژمارە (٢)دا کە لەنێوان ساڵانی ١٩٧٧ -١٩٨٧

**خشتەی ژمارە (١)**

| قەزای چۆمان | نێومنجی رووبەری داچێندراو (دۆنم) | رێژەی سەدی رووبەری داچێندراو بە بەراورد لەگەڵ رووبەری پارێزگا | نێومنجی بەرهەم (تەن) | رێژەی سەدی بەرهەم بە بەراورد لەگەڵ پارێزگا | پلە |
|---|---|---|---|---|---|
| گەنم | ١٠٩١ | ٠و٣ | ١٦٧ | ٠و٢ | ٦ |
| جۆ | ٤٧٠ | ٠و١ | ٨٣ | ٠و٠١ | ٦ |

**خشتەی ژمارە (٢)**

| ناوی یەکە | ژینگە | ژمارەی دانیشتوان | | ژمارەی خێزانەکان | | ژمارەی خانووبەرە | | ژمارەی گوند | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ | ١٩٧٧ | ١٩٨٧ |
| ناوەندی قەزای چۆمان | شار | ١٦٨٥ | _ | ٣٣٠ | _ | ٣٥٨ | _ | _ | _ |
| | لادێ | _ | _ | _ | _ | _ | _ | _ | _ |
| | کۆ | ١٦٨٥ | _ | ٣٣٠ | _ | ٣٥٨ | _ | _ | _ |
| باڵەک | شار | ١٩٨٢ | _ | ٣٢٠ | _ | ٣٤٢ | _ | _ | _ |
| | لادێ | ١٣٢١٩ | _ | ٢٤٨٨ | _ | ٢٨١٤ | _ | ٧٩ | _ |
| | کۆ | ١٥٢٠١ | _ | ٢٨٠٨ | _ | ٣١٥٧ | _ | ٧٩ | _ |
| حاجی ئۆمەران | شار | _ | _ | _ | _ | _ | _ | _ | _ |
| | لادێ | ٣٤٥٧ | _ | ٦٠٨ | _ | ٧٧٦ | _ | ١٧ | _ |
| | کۆ | ٣٤٥٧ | _ | ٦٠٨ | _ | ٧٧٦ | _ | ١٧ | _ |
| کۆی قەزای چۆمان | شار | ٢٦٦٧ | _ | ٦٦٠ | _ | ٧٠١ | _ | _ | _ |
| | لادێ | ١٦٦٧٦ | _ | ٢٠٩٦ | _ | ٢٥٩٠ | _ | ٩٦ | _ |
| | کۆ | ١٩٣٤٣ | _ | ٢٧٥٦ | _ | ٤٢٩١ | _ | ٩٦ | _ |

تۆمار کراوە، گوزارشت لە گۆڕانکاری ژمارەی دانیشتووان و خێزانەکان و ژمارەی خانووبەرە و گوندەکانی دەڤەری باڵەکایەتی دەکات:-

سەرچاوەی خشتەکە: الجهاز المركزي للاحصاء - نتائج الحصر والترقيم لمحافظة أربيل/ ١٩٧٧ - نتائج التعداد العام للسكان لمحافظة أربيل/ ١٩٧٧.

### شارۆچکەی گەلاڵە/ سنوور و پێکهاتەی خاک

شارۆچکەی گەلاڵە شوێنێکی ستراتیژی گرنگی هەیە وەک سەنتەری بزاڤی نەتەوەیی و مەڵبەندی رۆشنبیری و بووژاندنەوەی ئابووری و نیشتەجێ بوون، هەروا خاکێکی بە برشت و بە بەرهەمی هەیە و لە رووی جیۆپۆلەتیکەوە بەهێزە و قوولایی ستراتیژی هەیە، سەرەرای ئەمەش بەهۆی بوونی پشتێنە چیای تۆکمێن و خۆراگر بروای مانەوە و بەرگری لەخۆکردن دەسازێنێ، بەوەی چیاکان باشترین شوێنی خۆ حەشاردانە لەکاتی لێقەومان و بەرگری لەخۆکردن، چونکە گشت فاکتەرەکانی هێزی جیۆستراتیژی هەیە، جگە لە جموجوڵی ئەتنۆگرافی و دیمۆگرافی دەڤەرەکە و یەک پارچەیی خاک و یەکدەنگی و یەک ریزی هاوولاتیان لە بزاڤی ئازادیخوازی نەتەوەیی و بەردەوام بوونی شۆڕشە گەر بنەوشەییەکان و تیشکە نارنجییەکان.

شارۆچکەی گەلاڵە دەکەوێتە باکووری هەولێر و نزیکەی (٥.١) کیلۆمەتر لە رێگای هاملتۆن دوورە و لەرووی ئیدارییەوە بەستراوەتەوە بەقەزای (چۆمان) و نزیکەی (١٠٧) کیلۆمەتر لە سەنتەری شاری هەولێر دوورە و مێژووی دامەزراندنی وەک ناحیەیەکی ئیداری بۆ ساڵی (١٩٢٣) دەگەرێتەوە و بنچینەی ناوەکەشی لە (گولاڵە)وە هاتووە، بەو پێیەی لە بەهاراندا وەک ئەتڵەسێکی رەنگین بەگوڵ و گوڵزار و نەرمە گیا دەرازێتەوە و ماوەی زیاتر لە (١٤) ساڵیش (مستەفا بارزانی نەمر) لەو ناوچەیە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوولی مەزنی کردووە، خەڵکەکەشی بەدڵ و بەگیان و بەماڵ و بەسامانیان پشتگیری شۆڕش و پێشمەرگەکان بوونە و خۆشیان هەر پێشمەرگە بوونە، بۆیە دوای نسکۆی شۆڕش ساڵی ١٩٧٥ ئەم شارۆچکەیە و دەوروبەری بەچەند قۆناغێک تووشی وێرانکاری و راگوێزان هاتوون، هەر بەبیانووی ئەوەی کە خەڵکی (گەلاڵە) زۆر یارمەتی شۆڕش دەدەن و هەمووشیان بەبۆچوونی رژێم بە پێشمەرگە حیساب کرابوون، بۆیە زووتر راگوێزرا و وەبەر قۆناغی دووەم کەوت.

رژێم لە رێکەوتی ١٩٨١/٨/٨ خەڵکی گەلاڵەی بەزۆر راگوێزا، کە ئەوکات ژمارەی خێزانەکان (٥٣٥) دەبوون، دامودەزگاکانیش (٢) قوتابخانەی سەرەتایی بۆ کچان و کوڕان و (١) قوتابخانەی ناوەندی تێکەڵاو و (٢) مزگەوت و (٢) نەخۆشخانە و (١) بەیتەرە و (١) شارەوانی و (١) دائیرەی بەرید و تەلەفۆن و بەدەیان دوکانی بازرگانی و نانەواخانە و جگە لە گازینۆیەکی گەورەی گەشتوگوزاری و... هتد.

بۆ حەوانەوەی هاوولاتیان ئۆردووگایەکی تایبەتی لە دەشتی (دیانا) بەناوی ئۆردووگای گەلاڵە کرا، کە ژمارەی خانووەکانیان نزیکەی (٥٠٠) خانوو دەبوو.

پاش راپەرینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١ خەڵکی گەلاڵە سەر لە نوێ گەرانەوە شوێنی خۆیان و حکومەتی هەرێمی کوردستان دەستی کرد بەدروستکردنەوەی خانوو و دامودەزگا حکومییەکان. لە ساڵی ١٩٩٧یش گەلاڵە سەر لەنوێ بەناحیەیەکی ئیداری دامەزرایەوە.

شارۆچکەی گەلاڵە کەوتۆتە نێوان گوندەکانی (مێرگە، ناوپردان، دیلزە، وەردە، سرێشمە، دێگە، گیزان، رێزان، رەشدوور، قەسرێ و ماکۆسان) جگە لە کانزا گرانبەهاکانیش (کانەبەرد)ێکی (مقلع)ی لێیە، کە دەکەوێتە نێوان گەلاڵە و ناوپردان، ئەوکاتی من لە گەلاڵە بووم، ئەم (کانەبەردە) جگە لە چەندین کرێکار و فەرمانبەران لەلایەن کاک عەبدولرەحمان کەرکووکی (رۆستەم) لەگەڵ کاک خالید کەرکووکی سەرپەرشتی دەکرا.

### جیۆلۆجیای گەلاڵە و دەوروبەری:

جیۆلۆجیستان وای بۆدەچن خاکی گەلاڵە و دەوروبەری، بەهۆی جوولەی خشکەیی تاویرەکانی لەسەردەمانێکی زۆر کۆن و بەر لە سەدان ملیۆن ساڵ، دروست بووە. بە تایبەتی لەئەنجامی زنجیرەیەک گۆڕانکاری کە لە هەردوو کیشوەری (گۆندوانالاند) و (لۆراسیا) رووی دا و دەریای (تیشی) لێ پەیدابوو.

جگە لە دۆڵ و نەهاڵەکانی، شاخەکانی بە درێژایی سەردەمانی چاخە جیۆلۆجییە ئاڵۆزەکان پێکهاتووە و بە ناوچەی (شەپۆڵە بەرزەکان) ناوزەد دەکرێ و کەڤری

گرکان و لێکترازانی زەوی و پەیدا بوونی قلێشی قووڵ و درزی تەنگەبەر، کە دواتر بوونە شوێنگەی کۆبوونەوەی ئاو و پەیدابوونی رووبار و گۆمەکان و تەقینەوەی کانیاوەکان. هەمووی دیاردەی باون لە گەلاڵەو دەوروبەری، تەمەنی پەیدابوونیان بۆ ماوەی پێش چاخی بەستەڵەک و سەهۆڵ بەندان دەگەڕێتەوە. بەکورتی خاکی گەلاڵەو دەوروبەری سیستەمێکی تەکتۆنی ئاڵۆزی هەیە بە هۆی لێکترازانی پلێتی کەڤرەکان بە ئاراستەی باکووری ڕۆژهەڵات، کە لە ئەنجامدا شەپۆلە بەردییە قۆقزییەکان لە پێکهاتەی چیاکان و شەپۆلە بەردییە چاڵەکان لە پێکهاتەی دۆڵ و نەهاڵەکان دروست بوون، وەک نەخشێکی فوسەیفسائی ئاڵۆز و بەرچاوان دەڤەرەکەی رازاندۆتەوە.

**بواری کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری**

لە بواری کۆمەڵایەتی و پەیوەندی خزمایەتی و دۆستایەتی و ڕێزگرتن لە یەکترو لە میوانان و فەرمانبەرانەوە، خەڵکی گەلاڵە شارستانییانە رەفتاریان دەکرد و بەندیش بوون بە داب و نەریتی کوردەواری، ئەو چەند ساڵەی من لەوێ ئاوێتەی ژیانیان بووم هەستم بەوە نەکرد گرفتێکی گەورە لە نێوان خێزانەکان رووی دابێ.

بەگشتی دانیشتوانی گەلاڵە پەیوەندییەکی کولتووری و خزمایەتییەکی تۆکمەیان بە یەکتریان دەبەستێتەوە و هەموویان بۆ خێر و خۆشی شارۆچکەکەیان کاریان دەکرد، هەروا ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤی رۆشنبیر و سیاسەتمەداری تێدا بوو، کە ئاگاداری گۆڕانکارییە هەرێمەکان و شوێنە دوورە دەستەکانیش بوون و هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتی لەنێو گەنجەکان و بەتەمەنەکان زۆر بەهێز بوو، چونکە پەروەردەی قوتابخانەی (بارزانی نەمر) بوون و لەو کاریزمایە رەسەنە ئاوی ژیانیان خواردبۆوە.

بۆیە پیاوانی رژێم زۆر بەهەستەوە چاودێری هەڵسوکەوت و جووڵانەوەی گەنجەکانیان دەکرد، بەتایبەتی قوتابخانەکان و چایخانەکان و ئاهەنگەکانی بووک گواستنەوە و بۆنە نەتەوەییەکان.

ئێستاش لەیادمە، لە بەهاری ساڵی (١٩٧٩) (مانگ) گیرا، شەو خەڵکی گەلاڵە بەتەپڵ و دەف و تەنەکە لێدان رژانە سەر شەقام و (خەلیفە حوسێن)، کە پیاوێکی زۆر بەدین بوو، بەڵام سەرشێت بوو، لەپێشەوەی ئاپۆڕەی خەڵکەکە دەرۆیشت و سەلاواتی لێدەدا و دوعا و نزای دەکرد، بەڵکو مانگەکە بەربێت و دنیا کاول نەبێت. گەنجەکان کە زۆربەیان قوتابی بوون، ئەم قەرەبالغییەیان بەهەل زانی و دەستیان کرد بەهوتاف لێدان، تا رادەیەک دەنگیان بەرز کردەوە "پێشڕەوی کورد پارتییە - سەرۆکمان بارزانییە".

دەنگی چەند تەقەیەک لە ئۆردی خوار گەرەکی (شکان) هات و زۆربەی تەقەکانیش (حەریق) بوون، بۆیە خەڵکەکە بلاوەیان کرد، بۆ بەیانی چەند کەسێکیان گرت و پاش پرسیار و لێکۆڵینەوە بەریان دان، کە زۆربەیان قوتابی کەمتەمەن بوون.

نەخۆشخانەی گەلاڵە زۆر خزمەتی دانیشتوانی شارۆچکە و دەوروبەری دەکرد، فەرمانبەرانی رۆژانە (بەیانی و عەسران) دەوامیان دەکرد، کە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:

(دکتۆر نەوزاد یەحیا سەعید باجگر- عەباس تەلەعفەری و هانی حەلانی- ئەدیبە لۆقا تۆما- محەمەد سدیق- مەغدید باڵەکی).

هەروا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ئاژەڵان لە گەلاڵە و دەوروبەری (فەرمانگەی بەیتەرە) لە گەلاڵە هەبوو، کە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:

(دکتۆر دلاوەر حەوێزی- جەمال عەزیز فەقێ یوسف - نەوزاد مەحموود رواندزی و چەندانی دیکە).

بە مەبەستی پەیوەندیکردن بە شاری هەولێر و قەزا و ناحیەکانیش، فەرمانگەی بەرید و تەلەفۆنات لە گەرەکی (شکان) نزیک قوتابخانەی ناوەندی گەلاڵە هەبوو، کە لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:

(قادر دەرگەڵەیی- خەیرەدین هەولێری- برایم خان رواندزی و چەندانی دیکە).

جگە لەوانە بنکەی پۆلیس هەبوو، کە ناحیەش بوو، بەڕێوەبەری ناحیەکە ئەو کات (کاک جەمال) بوو کە خەڵکی شاری سلێمانی بوو. جگە لە شارەوانی و چەند قوتابخانەیەک.

**گەلاڵە لە بواری خوێندن و رۆشنبیرییەوە**

لە ساڵی (١٩٧٦-١٩٧٧) بەشی جوگرافیای کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی بەغدام تەواو کرد، دەبوایە بۆ ساڵی ئایندە بە مامۆستا لە یەکێک لە قوتابخانەکانی دەوروبەری هەولێر دابمەزرێم، من زیاتر بە ناوچە

شاخاوییەکان ئاسوودە و خۆشحاڵ بووم، چونکە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاریم لە ئامێزی چیای (قەرەچووغ) بردۆتە سەر.

ئەوە بوو نیاز و مەرامەکانم هاتە دی، کە فەرمانی دامەزراندنمان لە پەروەردەی هەولێر دەرچوو، من لە(دواناوەندی گەڵاڵەی تێکەڵاو) دامەزرام.

لە رۆژی (٢٧/١٠/١٩٧٧) بە دڵفرەوانییەوە بەرەو گەراجی باکوور رۆیشتم و بەئۆتۆمبێلێکی جۆری (ئۆپڵ) هێڵی چۆمان بەرێ کەوتم، گەیشتمە (قوتابخانەی دواناوەندی گەڵاڵە) کە کەوتۆتە گەرەکی (شکان).

قوتابخانەیەکی (١٢) پۆلی بوو، بەڵام تەنها تا پۆلی سێیەمی هەبوو، لە بەردی چیایی دروست کرابوو، لە تەنیشت قوتابخانەکەش بەشی ناوخۆیی بۆ قوتابیانی گوندە دوورەکان هەبوو، کە یارمەتییان لە میری دەدرا.

ئەوکاتە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە مامۆستا (ناسیح عەلی حەسەن نانەکەلی) بوو، کە بە دڵخۆشییەوە فەرمانی دەست بەکاربوونمی (مباشرە)ی لە (٢٧/١٠/١٩٧٧) بۆ نووسیم. تەنها مامۆستایەکی دیکەش بەناوی (کەریم حەسەن رەحمان) پسپۆر لە فیزیا لەوێ بوو.

لە نێوانی ساڵانی (١٩٧٧-١٩٧٩) دەستەی مامۆستایانی قوتابخانەکەمان لە گەڵاڵە بەم جۆرە بوو:

١- ناسیح عەلی حەسەن ٢- کەریم حەسەن رەحمان ٣- جەلال مەولود سنجاوی ٤- جەوهەر فەتاح رواندزی ٥- ئەسعەد قادر خۆشناو ٦-کەمال ئیحسان حەسەن بەزاز ٧- سمایل محەمەد عەلی ٨- ئیسماعیل فەتاح ٩- ئەمین قادر ئەسعەد.

شایانی ئاماژە پێدانە مامۆستا (ئەمین قادر ئەسعەد) لە گەڵاڵە چەکی شەرەفی هەڵگرت و بوو بەپێشمەرگە تاکو پلەی حزبایەتی گەیشتە (ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی) لە پارتی دیموکراتی کوردستان، بەڵام بەداخەوە تووشی نەخۆشییەکی کوشندە هات تاکو ساڵی(١٩٩٧) لە پیرمام کۆچی دوایی کرد.

هەروا لە گەڵاڵە دوو قوتابخانەی سەرەتایی هەبوو، بۆ (کچان و کوڕان)، قوتابخانەی گەڵاڵەی سەرەتایی کچان لەم بەڕێزانە پێک هاتبوو:

١- مامۆستا ئەزهار عەبدوللا- بەڕێوەبەر ٢- سنەوبەر حەمە سالح ٣- شلێر کەمال محەمەد ٤- شلێر عەزیز کۆیی ٥- نیهایەت رەفعەت بەقاڵ ٦- مادلین یوسف ٧- کاترین برایمۆک ٨- شوکریە.

**قوتابخانەی گەڵاڵەی سەرەتایی کوڕانیش لەم مامۆستایانە پێک هاتبوو:**

١- مامۆستا جەبار مەحموود رواندزی-بەڕێوەبەر ٢- مامۆستا حەنا نوری لوقا ٣- مامۆستا مستەفا هەولێری ٤- مامۆستا هادی ٥- مامۆستا نوری ٦- مامۆستا محەمەد ٧- مامۆستا مەلا عەزیز رواندزی.

بەگشتی قوتابییەکان زیرەک و ژیر و بە رەوشت بوون، هیچ گرفتێکیان بەرامبەر بە مامۆستایان و یەکترەوە نەبوو، تەنانەت لە قوتابخانەکەی ئێمە کە تێکەڵاو بوو، هەمووشیان لە تەمەنی هەرزەکاری بوون (کچان و کوڕان) بە خوشک و برایانە بەبێ گرفت دەوامیان دەکرد.

ئێستاش گەڵاڵە خەریکە دەبووژێتەوە و فەرمانگەکانی دامەزراوەتەوە و هەنگاو بەرەو جوانی و سیمای شارستانیەت پتر لە جاران دەنێ و وەک مەڵبەندێکی رۆشنبیری باڵەکایەتی رووەو ئاسۆی ئەرخەوانی هەنگاوی خێرا دەنێ.

**سەرچاوەکان**

١- الاسس الطبيعية لجغرافية العراق - كوردن هستد، تعريب - جاسم محمد الخلف - الطبعة الاولى - بغداد (١٩٤٨).
٢- العراق الشمالي - د.شاكر خصباك - مطبعة شفيق- بغداد (١٩٧٣).
٣- ئەو زانیارییانەی کە خۆم لە یادم ماوە، بەتایبەتی کە ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٠) لە گەڵاڵە مامۆستا بووم.
٤- چەند زانیارییەکم لە مامۆستا (کەمال سەید محەمەد عەلی) وەرگرتووە، کە ساڵانی (١٩٤٣-١٩٤٧) بەڕێوەبەر و مامۆستا بوو لە گەڵاڵە.
٥- بڕوانە نەخشەی گوند و شار و شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێر - کە لەلایەن، وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە و گەشەپێدانی حکومەتی هەرێمی کوردستان- نەخشەی کێشراوە. بە سوپاسەوە نەخشەکەم لە مامۆستا پیرداود مەخمووری وەرگرت.
٦- باڵەکایەتی لە پەراوێزی راگواستندا - خالد ئەحمەد وەرتی- گۆڤاری هەولێر ژمارە (٢) ساڵی (١٩٩٩).

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە ١٢، پایزی ٢٠٠١ بڵاوبۆتەوە.**



# هاوینەهەواری سەلاحەدین ١٩٤٦

## ئەندریۆس ئیسرائیل خەمۆ (باکووری)

باوکم لە سالی (١٩٤٦)، پۆلیس بوو لە کۆیە بۆ هەولێر، لە وێشەوە یەکسەر بۆ بنکەی هاوینەهەواری سەلاحەدین گوێزرایەوە. لەوێ کەپرێکی، لە دار چروو، بۆ رێکخستین و گەرایەوە کۆیە: ئێمەی بەماڵەوە بە پاسێکی لە دار دروستکراو کە ئەو کات هۆیەکی چاکی هاتوچۆکردن بوو، بەرەو سەلاحەدینی بردین.

من ئەو کات لە پۆلی سێیەمی ناوەندیدا بووم و تاقیکردنەوەی بەکەلۆریام لە کۆیە تەواو کرد. ئینجا هاتم بۆ هەولێر. ئەو گەشتەم، کە لە گەڵ خێزانەکەمان هاتین بۆ سەلاحەدین، زۆر لاخۆش بوو، بەتایبەتی لەو کاتەی لە خانزاد تێپەڕین و گەیشتینە بناری ئەو چیا بالابەرزەی، کە چەندان لۆفەی پێچاو پێچی، وەک جێخشکەی مار یەک لە دوای یەک تا تەوقی سەری ریز ببوون و ئۆتۆمبیلە جۆراوجۆرەکانیش دیمەنەکەیان زیاتر رازاندبووەوە، کە هەندێکیان سەر دەکەوتن و هەندێکیشیان دەهاتنە خوارەوە، جوانترین دیمەنیش ئەو کاتە بوو، کە بە سەر دەکەوتین و بەرە بەرە دەشتی هەولێر و قەڵای هەولێر و رووباری بەستۆڕە و سەرجەم دەشتەکە و جۆگەکان دەردەکەوتن و ئاوەکان لە ژێر تیشکی خۆری کۆتایی بەهار دەبریقانەوەو، وردە وردە روونتر دەبوون و دیمەنەکە لە بەر چاومدا دەبووە تابلۆیەکی جوان و دەگمەن، بە تایبەتی من یەکەم جارم بوو بە ئۆتۆمبیل بە سەر چیایەک بکەوم بەو شێوەیە بێ.

کە گەیشتینە هاوینە هەواری سەلاحەدین، باوکم لێخوڕەکەی

تێگەیاند، کە بەرەو لای راستی شەقامی سەرەکی سەربەن (چیای پیرمام) لێخوڕی و، دوای رێنمایی کردنی باوکم بۆ لێخوڕەکەو، رۆیشتنی ئوتۆمبیلەکە بە رێگایەکی پێچ و پەناو چەند کەپرێکی پۆلیس و کرێکاران، گەیشتینە کەپرەکەی خۆمان و دابەزین و کەلوپەلەکان هێنرانە خوارەوە، منیش چوومە ناو تانۆکی کەپرەکە!

بە راستی بۆنەیەکی خۆش بوو، دیمەنێکی دڵڕفێن بوو، کە ئەو لک و گەڵا چروانەی کەپرەکەمان شنەی بای شەماڵ دەیهێنانە سەما! ژیانێکی چەند سادە و بەتام و پڕ چێژ بوو لە هەستی گەنجایەتی دڵی گەرمی هونەرمەندێکی تازە پێگەیشتوو!

کە من چوومە سەلاحەدین ئەوێ (لە ساڵی ١٩٤٦ تا کو ١٩٥٠)، بەو جۆرەی خوارەوە بوو:

ترۆپکی چیاکەو ئەو شوێنەی ئێستا (ترافیک لایت)ی لێ دانراوە و یەکەم گۆڕەپان (خولگە)یە لە سەلاحەدین، ئەو کات چوارڕێیانێکی سادە و ساکار بوو. شەقامی سەرەکی ناو هاوینەهەواری سەلاحەدین، ئەو شەقامە بوو، کە لە هەولێرەوە دەهات و راست و راست، وەک ئێستا بەڵام بە یەک سایدی تەسک، بەرەو کۆڕێ شۆڕ دەبووەوە و ئەو شەقامەش رێگای (هاملتۆن)ە، شەقامێکی دیکە لە رۆژهەڵاتەوە، لەو شوێنەی ئێستا سەری رەشی لێیە، دەهات و لە نزیک پۆلیسخانە شەقامی هاملتۆنی دەبڕی و بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشت، دوای چەند کیلۆمەترێک دەگەیشتە

قەسری (عەبدولئیلا)، کە راسپێردرابوو لە جیاتی مەلیک فەیسەڵی دووەم حوکم بکات، چونکە مەلیک فەیسەڵ هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە (١٨) ساڵ و نەیدەتوانی کاروباری مەلیکایەتی راپەڕێنێ. دوای راپەڕینی گەلی کوردستان لە ئاداری ١٩٩١، ئەو قەسرەی (عەبدولئیلا) کراوە بە بارەگای(KTV). کە لە بنکەیەکی پۆلیسەوە بەرەو رۆژهەڵات بەو شەقامەدا بڕۆیشتبای، لەم دیو و لەو دیویدا چەندین دارو درەخت و کەپری خنجیلانە و خانووی گەشتوگوزاری جوانت بەر چاو دەکەوت، بۆ ئەو خەڵک و گەشتیارانە دروست کراون، کە بۆ رابواردنی مانگە گەرمەکانی هاوین بە کرێیان دەگرتن.

ژمارەی ئەو خانووانەش زۆر کەم بوون، لە سەری یەکتربڕەکەی (تقاطع) بەرامبەر پۆلیسخانە خانوویێک دروست کرابوو بە مەبەستی بەڕێوەبردنی کاروباری پۆستە و تەلەفۆن بە کاردەهێنراو دیوی دواوەشی بۆ بەڕێوەبەری پۆستەو تەلەفۆن تەرخان کرابوو، لەوبەری شەقامەکە و بەرامبەر ئەو فەرمانگەیەی پۆستە، ئوتێلێکی خنجیلانەی لێ دروست کرابوو، کە بە هۆی چەند پێپلیکانێکەوە دەبوایە سەرکەویت و، لە دەستە چەپییەوە مەیخانەیەک هەبوو، کەچی لە دەستە راستییەوە (هۆڵی) زستانان هەبوو، کە لە تەنیشت گڵکۆی پیرمام بوو، ئێستاکەش هەر ماوە و وابزانم بووەتە بنکەی ئاسایش. لە بەرامبەر ئەو

ئوتێلە و لە دەستە راستی یەکتربڕەکەدا، خانوویێک هەبوو کە بۆ نووستنی ئەو میوانانە تەرخان کرابوو، کە دەهاتنە هاوینەهەواری سەلاحەدین، کە بەرەو خۆرئاوا دەڕۆیشت، لە دەستە چەپیدا دوو خانووی دیکەی گەشتیاری هەبوون و لە سەر هەمان نەخشەی خانووەکانی دیکە دروست کرابوون، کە بریتی بوو لە هەیوانێک لە پێشەوە کە دوو سێ (تاقی) پشتەکی لە بەرد دروستکراو رایان گرتبوو، دوای هەیوانەکە دەرگایەکی سەرەکی و چەند پەنجەرەیەکی تێدابوو. لە دوای ئەو دوو خانووە، چۆڵاییەک هەبوو، بەو چۆڵاییەدا رێگایەکی باریک بە ناو دارو درەختی بەڕوو و مازوو و قەزوان و گێوژدا دەڕۆیشت، ئەو رێگایەش پیادە رێ بوو و لە دەستەچەپی شەقامی سەرەکی بەرەو خانووی (قەسری) وەزیرەکان، کە نۆ قەسر بوون، بە کورتترین رێگا لای دەدا. تەختی پاشایەتیش (البلاط الملکي) لە سەر گردێکەوە بوو، کە بەو دواییە کرابووە ئوتێل و میوانخانە و دوای راپەڕینیش کرایە شوێنی کۆبوونەوەی لێپرسراوانی حزبی لەگەڵ ئەو وەفد و خەڵکانەی دەیانەوێ چاویان بە لێپرسراوان بکەوێت.

هاوینان کە زۆر گەرما دادەهات، وەزیرەکان دەهاتنە ئەو هاوینەهەوارە و لەو بارەگایەی پاشایەتی لە گەڵ (عەبدولئیلا)ی راسپێردراو و مەلیکە گچکەلە کۆ دەبوونەوەو باسی کاروباری حکومەتیان دەکرد، لە ریزی

ئەم گردو بارەگایەی مەلیک گردێکی نزمتر هەبوو، کە بەرەو باشوور شۆڕ دەبووەوە و ئەو دیو و ئەو دیوی گەلێ قەشەنگی پڕ دارو درەختی لێبوو، لە سەر ئەو گردە نۆ قەسری لە نەخشەدا وەک یەک دروست کرابوون، ئەو نۆ قەسرەش بۆ وەزیرەکان بوو، چونکە ژمارەیەک لە حکومەتی پاشایەتی ئەو کاتە لە نۆ وەزیر تێنەدەپەڕی، قەسری یەکەمیشیان هەمیشە بۆ سەرۆک وەزیرانی هەمیشەیی تەرخان دەکرا، کە ئەویش (نوری سەعید) بوو، لە بارەگای (کۆشکی) پاشایەتیش هەورازتر، قەسری (تەها ئەلهاشمی) هەبوو، کە ماوەیەک وەزیری بەرگری بوو، زەوییەکانی دیکەی لای راست و چەپی ئەو قەسرانە هەموویان چۆل بوون، بەلام لە تێکرای ئەو زەوییە درێژبووەوەی نێوان کۆشکی پاشایەتی و مالی تەها ئەلهاشمی بنە مێو بە ریزو یەک لە دوای یەک چاندرابوون و ترێی رەش و سپی لق و پۆپی بنە مێوەکانیان رازاندبووەوە و لە هاوینان هەر کەسێ بەو شوێنەدا تێپەڕیبوایە دەیتوانی بچێتە ناو ئەو بەهەشتەوە بە هەوەسی خۆی و تا تێرو پڕ دەبوو ترێی بخواردبوایە و کەسێکیش نەبوو رێی پێ بگرێت یان قەدەغەی بکات.

ئەو دوو شەقامەکەی دیکەش بکەین، واتە، ئەو شەقامەی لە رۆژهەلاتەوە دەهاتە ناو هاوینەهەواری پیرمام و، ئەو شەقامەی بەرەو کوڕێ شۆڕ دەبووەوە.

ئەو شەقامەی لە سەری رەشەوە (لە رۆژهەلاتەوە) دەهات، رێگایەکی چۆل بوو و قیرتاویش نەکرابوو، تەنها بۆ ماوەیەکی کورت دەتواندرا بە ئۆتۆمبیل برۆی، دواتر دەبووە دارو بەردو زستانانیش لە بەر قوڕو پنجە دار بەڕوو و شتی دیکە ئۆتۆمبیل نەیدەتوانی پێیدا بڕوا، بەلکو خەلکی ناوچەکە بە ولاغ لە دۆلەکانی سەرەوە دەهاتن و بە بارو قەرتارە ترێ و هەنارو میوەی دیکەیان بە هاوینان بۆ ئەو هاوینە هەوارە دەهێنا.

لە پشت پۆلیسخانەکە سێ خانوو بۆ فەرمانبەرانی حکومەت، کە لەوێ کاریان دەکرد و فەرمانبەری هەمیشەیی بوون، دروست کرابوون. خانووی یەکەم بۆ چاودێری کشتوکالی تەرخان کرابوو، کە حکومەت بە مەبەستی چاودێری کردنی کشتوکال و کاری چاندن و پەیوەندیدار بە کشتوکال لەوێی دامەزراندبوو، خانووی دووەمیش، کە تەنها چەند مەترێک لە خانووی یەکەم دوور بوو و دەکەوتە رۆژهەلاتییەوە، بۆ چاودێری دارستانەکان تەرخان کرابوو، ئەو فەرمانبەرەش ئەگەرچی حکومەت دایمەزراندبوو، بەلام مووچەی لە فەرمانگەی گەشتیاری وەردەگرت، چونکە ئەو (مصلحة) هەموو هاوینەهەوارەکانی عێراقی بەرێوە دەبردو سەپەرشتی دەکردن، ئەو چاودێرەش ئەندازیار و لێپرسراوی یەکەم بوو و چاودێری ئەو دارستان و درەختانەی دەکرد، کە دەکەوتنە نێوان بانەمان و شەقلاوە و بگرە زیاتریش.

کەچی خانووی سێیەم بۆ چاودێری پیرمام (مراقب المصيف) تەرخان کرابوو، ناوونیشانی کارەکەشی هەر بەو ناوە بوو (وا بزانم لە ناو کاروبارەکانی حکومەت ئەو ناوونیشانە نەبوو)، ئەو کارەش بە (فەتاح ئاغا) سپێردرابوو، کە برای کەریم ئاغای کوڕێ و، کوڕی مەجید ئاغا بوو. ئەو فەتاح ئاغایە لە قوتابخانە خوێندبووی و هەمیشە چاکەت و پانتۆلی لە بەر دەکرد و پیاوێکی رۆشنبیریش بوو، ئیش و کاری ئەوە بوو، کە پاسەوان و پارێزکاران دابمەزرێنێ و دەریشیان بکات، چونکە خۆی لێپرسراوی ئاسایشی پیرمام بوو. هەموو پاسەوانەکانیش لە خزم و کەسانی خۆیان و خەلکی کوڕێ دامەزرێندرابوون. هەروەها (فەتاح ئاغا) کارێکی دیکەیشی پێ سپێردرابوو، بە راستی کارێکی شارستانی بوو، منیش زۆربەی بەیانیان لە کاتی ئەنجامدانی ئەو کارەی بە چاوی خۆم دەمبینی، کارەکەشی ئەوەبوو:

لە ناو باخچەیەکی بچووکی نزیک مالی خۆی، قەفەزێکی ئاسنی سپی لە سەر چوارپایەیەکی نزیک مەترێک بەرز دانابوو، لە ناو ئەو قەفەزەدا گەرمیپێوێکی گەورە بۆ پێوانی پلەی گەرما و سەرمای رۆژانە چەسپێنرابوو، کاک فەتاح ئاغا بەیانیان دەچووە لای قەفەزەکە و پەنجەرە بچووکەکەی دەکردەوە و سەیرێکی ئامێرەکەی دەکرد و لە دەفتەرێکی بچووکی لای خۆی و بە پێنووسی مەرەکەب پلەکانی تۆمار دەکرد، وا بزانم رۆژانە زانیارییەکانی پەیوەست بە کەش و هەوای دەنارده

لای لێپرسراوانی هەولێر، ئەوانیش لە لایەن خۆیانەوە بە بەغدای رابگەیێنن.

دوای باسکردنی شەقامی رۆژهەڵات (لای سەری رەش)، دێینە سەر باسی ئەو شەقامەی بەرەو کۆرێ شۆڕ دەبێتەوە، کە (هەر وەک گومان) پێی دەڵێن رێگای هاملتۆن، لە دوای بنکەی پۆلیس راستەوخۆ بەنزینخانە دەهاتە بەر چاو، کە ئێستاکەش هەرماوە، دوای بەنزینخانە و کەمێک بۆ ژوورەوە و لای دەستە راست مەکینەیەکی کارەبا هەبوو، کە بریتی بوو لە دوو داینەمۆی زۆر گەورە و هەریەکەشیان لە سەر چوار تایە و لە ژێر بەنگەلەیەکی گەورە دانرابوو، کە تایبەتی بۆ ئەو مەکینەیە دروست کرابوو، ماڵی لێپرسراوی ئەو مەکینەیەش دەکەوتە پشت ئەو بەنگەلەیە و، کابرایەکی خەڵکی (تەلکێف) بوو، کە زۆر قسە خۆش و رەزا سووک و قیت و قۆز بوو و ناوی (حەننا بەحری) بوو، لێپرسراوی (چاودێری) ئەو مەکینەیە و کارێکەری بوو، هەموو هاوینان، ئەویش وەک ئێمە و هەموو فەرمانبەرەکانی دیکە، ماڵ و منداڵی خۆی دەهێنایە پیرمام و بە خۆڕایی گەشتمان دەکرد، نەخێر پارەشمان وەردەگرت، چونکە من هەموو هاوینان یا لە پۆستەخانە بە فەرمانبەری بگۆڕی تەلەفۆن یا لە شوێنی دیکە بە رۆژانەی چوار درهەم، واتە (٢٠٠) فلس، کە مانگانە دەیکردە (٦) دینار، دادەمەزرام. (فیلیپ)ی براشم، کە هەمیشە لە گەڵما بوو، کاری پۆستەچیاتی دەکرد و ئەو نامەو تەلەگرافانەی لە هەموو لایەک بۆ پیرمام دەهاتن ئەو هەموویانی بە سەر خاوەنەکانیان دابەش دەکرد. چاک لە بیرمە، کە خوالێخۆشبوو مستەفا بەگ ماوەی سێ هاوین بەرێوەبەری ئەو فەرمانگەیە بوو. خوالێخۆشبوو باوکی کاک موسلیح جەلالی بوو، کە ماوەی چەند ساڵێک بەرێوەبەری دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بوو لە بەغدا، ئەو کات منداڵێکی بچکۆلە بوو لەگەڵ برایەکی لە خۆی بچووکتر، هەمیشە دەهاتنە لای ئێمە و لە ژووری فەرمانگەکە لە گەڵماندا یارییان دەکرد و سەیری بگۆڕی تەلەفۆن و ئامێری برووسکەیان دەکرد.

یەکێک لە هەڤاڵەکانم کە خوالێخۆشبوو (شێخ عەبدولرەحمان) ناوێک بوو، هەموو هاوینان لە فەرمانگەی پۆستەی هەولێرەوە لەگەڵ کاک مستەفا بەگ دەهات و وەک فەرمانبەری بگۆڕی تەلەفۆن پێکەوە کارمان دەکرد، چونکە هاوینان لە بەر خاتری گەشتیارەکان فەرمانگەکەمان (٢٤) کاتژمێر کاری دەکرد، بۆیە ئێمە سێ کەس لە سەر تەلەفۆنەکە کارمان دەکرد و هەر یەکەشمان هەشت کاتژمێر ئێشکی دەگرت، کەسی سێیەمیش کاک عەلی سەعاتچی بوو، کە لە هەولێر دوکانی فرۆشتن و چاککردنەوەی کاتژمێری هەبوو، ئەویش ماوەی دوو ساڵ بوو بە کرێی رۆژانە (٢٠٠) فلس وەک فەرمانبەرێکی بگۆڕی تەلەفۆن دامەزرابوو و لەگەڵ ئێمە کاری دەکرد.

لە پشت خانووی کارێکەری مەکینەی کارەبا (حەننا بەحری) کەپری لێخوری تانکەری ئاوی هاوینەهەواری سەلاحەدین هەبوو، کە ناوی وەستا (قریۆ) بوو، ئەو وەستا (قریۆ)یە ئاشووری بوو و، کوڕێکیشی هەبوو ناوی لێنابوو (هیتلەر)، هەر بۆیەش بە (ئەبو هیتلەر) بانگیان دەکرد، کاری وەستا (قریۆ)ش ئاودانی ئەو دارو درەخت و گوڵ و بێستانانە بوو، کە لە نێوان شەقامەکان و باخچەی ماڵە جۆراوجۆرەکانی ئەو هاوینەهەوارە دەچێنران.

کە بەرەو خوارتر دەرۆیشتی، لە سەر شەقامی سەرەکی و لە لای دەستی راست، چایخانەکەی پیرمامت بەرچاو دەکەوت، کە تاکە چایخانەی ئەو هاوینە هەوارە بوو و، حکومەت بە پێی نەخشەیەکی تایبەت دروستی کردبوو، ئەو چایخانەش هاوینان خەڵکێکی زۆری تێدا کۆدەبووەوە، چونکە لە لایەک سەرە رێی ئەو کاروانچییانە بوو، کە لە هەریر و شەقڵاوە و دەوروبەری ناوچەکە دەهاتن و بەروبوومی کشتوکاڵی و دارو خەڵووزیان بەرەو هەولێر دەبرد، لە لایەکی دیکەشەوە لێخوڕو نەفەرەکانی ئەو ئۆتۆمبێلانەی بەوێدا دەهاتن، لە بەر گەرمای رێگا تاوێک لەو چایخانە دادەنیشتن و کۆکا و پیپسی و ئاوی سارد و چایەیان تێدا دەخواردەوە، سەرەڕای ئەوانەش پاسەوانەکان کە لە ماڵەکان

دەهاتنە دەرەوە روویان دەکردە ئەو چایخانەیە و تێیدا دەحەسانەوە. هەر خانوویێک لەو خانووانەی حکومەت دروستی کردبوون، فەتاح ئاغا پاسەوانێکی بۆ دانابوو، ئەو پاسەوانە دەبوایە زستان و هاوین ئاگاداری ئەو خانووە بکات و چاودێری ئەو ماڵە بێت، کە دەهاتە ناو ئەو خانووە، ئەگەر خانووەکەش ماڵی تێدا نەبوایە، ئەوا چاودێری ئەو کەلوپەلانەی دەکرد، کە حکومەت لەو خانووانەی دانابوو.

پەنجا مەترێک لە خوار چایخانەکەوە (کانتین)ێک هەبوو، دوای ئەویش ئۆفیسی سەرەکی هەبوو، ئەو ئۆفیسە ناوی (فەرمانگەی ئەندازیاری) بوو، پێشیان دەگوت (ئەندازەی هاوینەهەوارەکان)، ئەو فەرمانگەیە کاروباری ئەو هەموو هاوینەهەوارانەی بەڕێوە دەبرد، کە دەکەوتنە سەر هێڵی هەولێر - حاجی ئۆمەران، ئەو کاروبارانەش بریتی بوون لە دروستکردنی خانووبەرە و ئوتێل و گازینۆ و مەلەوانگە و گۆڕەپانی یاریکردن و، دابینکردنی کەلوپەل و شتی پێویست بۆ ئەو هاوینەهەوارانە و، ئامادەکردنی خواردن و خواردنەوە بۆ ئوتێل و گازینۆکان و، نەوت و بەنزین و رۆن بۆ هەموو ئۆتۆمبێلەکانی سەر بەو فەرمانگەیە، هەروەها مووچەدانی کرێکارو فەرمانبەرو پاسەوان و باخچەوان و......هتد.

ئەو فەرمانگەیەش (ئەندازەی هاوینەهەوارەکان)، سەر بە بەڕێوەبەرایەتی هێڵی ئاسنین (مدیریة سكك حديد الحكومة العراقية) بوو، بۆیە لە سەر هەموو ئۆتۆمبێل و ئامێرو، تەنانەت بچووکترین کەلوپەلی ناو ماڵ و ئوتێل و گازینۆکانیش چوار پیت لە ناو ئەڵقەیەکی بچووک نووسرابوون و بە رەنگی سەوزیش دیکۆر کرابوون، پیتەکانیش ئەوانە و بەو شێوەیە نووسرابوون (س ح ح ع)، واتە، هێڵی ئاسنینی حکومەتی عێراق کە بە عەرەبی دەکاتە (سكك حديد الحكومة العراقية)، کە هەمان ئەو پیتانە بوون لە سەر شەمەندەفەرەکانی عێراق نووسرابوون. فەرمانگەی ئەندازەی هاوینەهەوارەکان پێکهاتبوو لە، بەڕێوەبەری هەموو هاوینەهەوارەکان و، ئەندازیارێکی یاریدەدەر و، ئەندازیارێکی سەرپەرشتکارو، چەندین فەرمانبەری دیکەی وەک (تایم کیپەر) واتە، ژمێریار، کە یەکێک لە ئەرکەکانی ئەو ژمێریارە ئەوەبوو، هەموو بەیانیان و ئێواران ناوی هەموو کرێکارەکانی هاوینەهەوارەکەی سەلاحەدین و لێخوڕو یاریدەدەر و پاککەرەوە و باخچەوان و.... هتد دەبوایە لای خۆی ناو نووسیان بکات.

لە ماوەی ١٩٤٦ -١٩٤٨ ئەندازیارێکی جوولەکە، کە ناوی (نەعیم) بوو، سەرۆکی بەرژەوەندی هاوینەهەوارەکان (مصلحة المصايف) بوو، کابرایەکی کەڵەگەتی، روومەت سووری، ناوچەوان پان و، لاق و دەست درێژ و خڕو پڕ بوو و هەمیشە چاویلکەیەکی سپی لە چاو دەکرد، تا بڵێی ئیشکەرو دڵسۆز بوو بۆ کارەکەی و بەوپەڕی چالاکییەوە کاروباری هاوینەهەوارەکانی بەڕێوە دەبرد و هەر کەسێ لە گەشتیارەکان کەموکوڕی هەبوایە یەکسەر بۆی جێبەجێ دەکرد. لەبەرئەوەی کابرایەکی هەوەس دۆست بوو، دەستەیەک لە مۆسیقاژەنە جوولەکەکانی بەغدا و بەسرە و موسڵی هێنابوو، شەوانە لە سەر مەلەوانگەی سەلاحەدین ئاهەنگیان دەگێڕاو ئەو خانەوادانەی لە شارەکانی دیکەی عێراقەوە دەهاتن بە خۆشی و لە سەر ئاوازی بە جۆشی مۆسیقا دەکەوتنە سەماو دانس و گۆرانی گوتن، هەروەها (نەعیم) ی جوولەکە بە ئۆتۆمبێلی هاوینەهەوارەکان یان بە کرێ لە سەیرانگاکانی شەقڵاوە و گەلی و حاجی ئۆمەران تا درەنگی شەو دەیگێڕان، بەڵام کە جوولەکەکان بەرەو دەوڵەتی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ کۆچیان کرد، (نەعیم)یشیان لەگەڵ رۆیشت.

دوای (نەعیم)ی جوولەکە، ئەندازیارێکی دیکەی دیان (مەسیحی) لە شوێنی ئەو دامەزرا بە (یوسف ناسر)، ئەو (یوسف ناسر)ە هەمیشە قاتێکی سپی لە بەر دەکرد و شەپقەیەکی لە سەری دەنا و گۆچانێکی داری جوانی بەدەستەوە دەگرت و لە شەقامەکان دەگەڕاو کەم و کوڕی و گرفتەکانی دەستنیشان دەکردن و ئاگاداری فەرمانبەرەکانی دەکردەوە بۆ ئەوەی چارەیان بکەن.

تا ساڵی (١٩٤٨) لە سەدا

نۆهەدی گەشتیارەکان جوولەکە بوون، لەوانەی تاکو ئێستا لە یادم ماون، وەک (ئەلبێر شوحێت، مادام لاوی، نەسیم) بوون کە هەموو هاوینان دەهاتنە سەلاحەدین و هەریەکە قەسرێکی بە کرێی درێژخایەن گرتبوو و ئەو قەسرە بە ناوی ئەو تۆمار کرابوو ئینجا چ بهاتبوایە یان نەهاتبوایە. (مادام لاوی) ئافرەتێکی زۆر جوان و نازدار، بەژن و بالاّ بەرز، سەرکولّمە ناسک وەک ئارووی تەڕ، سووروسپی و قژ زەرد و چاوشین بوو.... هەمیشە کراسێکی تەنکی گولّڕەنگی پەمەیی لە بەر دەکرد و، زۆر کاتیش لەگەلّ گەنجێکی دەولەمەندی هەولێری دەبینرا، کە تا درەنگی شەو لە ناو دارو درەخت و لە مانگە شەوی هاویندا پێکەوە پیاسەیان دەکرد!.

چاودێری کشتوکالّی ئەوکات، کە ناوی (عەباس ئەفەندی) بوو، پیاوێکی رەقەلّەی درێژ و پرچ لوولی وەک زەنگییەکانی ئەفریقیا بوو، بەلاّم کورێکی باش بوو. هاوینێک لای ئەو پیاوە بە سەرکار و رۆژانەی چوار درهەم کارم کرد، خۆم و کرێکارەکانم لە بەیانییەوە دەبوایە بچینە سەر رێگای سەری رەش و بەڕوو لێبکەینەوە، هەر کرێکارێک قازمە و خاکەناسێکی هەبوو، بەلای دەستەچەپی رێگای سەری رەش و لە دوای مالّی فەتاح ئاغاوە، چالێکی قوولّی لێدەداو، سێ تا چوار بەڕووی دەخستە ناوی و دایدەپۆشییەوە، یانیش لە مانگی شوبات درەختەکانی سەر شەقامی نێوان هەولێر - سەربەن، سەربەن - کۆڕێ و هەموو درەختەکانی دیکەیان دەبڕی و قەلّتیان دەکرد.

چاودێری دارستانەکانیش گەنجێکی (تەلکێف)ی بوو و، ناوی (سەلیم حەننا جابرۆ) بوو، مرۆڤێکی رۆشنبیرو کارامە بوو، لە کارەکەی خۆی زانیاری تەواوی هەبوو، سەیری داربەرووی بکردبوایە، دەیزانی چ جۆرێکە، تالّە، شیرینە، رەسەنە یا پووچە، هەروەها وەک پسپۆرێک شارەزای نەخۆشییەکانی دارودرەخت بوو، شەوانی زستانان زۆر جار لە چواردەوری ئاگری کۆلکەدارو بەڕوو، کە لە ئاگردانەکە (فایەر پلێس)دەکە هەلّدەگیرسێندرا، من و سەلیم و جابرۆ و عەباسە فەندی و حەننا بەحری، کۆدەبووینەوە و من گۆرانی کوردی و عەرەبیم بۆ دەگوتن و بەزمی شەوانی ساردی زستانمان زۆر خۆش دەکرد، ئەوکاتیش زستان زۆر سارد بوو و، بەفرو باران یەک لە دوای یەک دەبارین و هەریەکەیان دەبووە تەواوکەری ئەوی دیکە!.

لە سالّی ١٩٤٦ و ١٩٤٧ دکتۆرێکی ئەرمەنی لە سەلاحەدین بوو ناوی (پێرڤانت) بوو، بە عەرەبی قسەی دەکرد، بەلاّم عەرەبییەکەی تەواو نەبوو، ئەو دکتۆرە جارێکیان بە هەلّە دەرمانی دامێ و هەندەی نەمابوو بمکوژێ!، من ئەوکات زگم دێشا و بەد هەرسیم هەبوو، کە چوومە لای و باسی نەخۆشییەکەی خۆمم بۆ کرد، ئەو هێمایەکی بۆ کارگوزارەکەی خۆی کرد پێی گوت: ... ها لەو شووشەیەی سەر تاخچەکە پەرداخێکی بۆ تێکە با بیخواتەوە. ئەمەی گوت و خۆی نەجوولاّیەوە، هەر خەریکی نووسین بوو، منیش کە دەرمانەکەم خوارد تێکچووم و گوتم: "دختۆر ئەوە چەند تالّ بوو!"، دکتۆرەکەش یەکسەر هەستی بەوە کرد، کە کارگوزارەکەی هەلّەی کردووە، بۆیە یەکسەر لە سەر کورسییەکەی هەلّسایەوە و لە دەستەبەرەکەی پرسی: لە کام شووشەت دایێ؟ کارگوزارەکەش هەمان ئەو شووشەیەی نیشان دا، کە دەرمانەکەی تێدا دابوومێ، دکتۆر کە ئەوەی بینی لە سەری خۆی دا و زۆر تێکچوو و تەلەفۆنی بۆ (یوسف ناسر)ی ئەندازیار و سەرۆکی فەرمانگەی ئەندازەی سەلاحەدین کردو منیشی لە سەر دەستەبەرەکە (سەدییەکە) درێژ کرد و خەریکی شووشتنی گەدەم بوو، لەو کاتەشدا (یوسف ناسر) هاتە ژوورەوە و بە دکتۆر (پێرڤانت)ی گوت: ئەگەر دەزانی باری تەندروستی خراپە، با بینێرینە موسل، دکتۆر بە ئینگلیزی وەلاّمی دایەوە، بەلاّم من تێگەیشتم چونکە هەموو وشەکانی رستەکە ئاسان بوو و دەمزانین و ئەوکاتی پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم، وەلاّمەکەشی بەو شێوەیە بوو ... No, He Will die ... واتە، گوتی: نەخێر ناگاتە موسلّ، دەمرێ!، منیش بە دکتۆرم گوت: دختۆر دەمرم؟ دکتۆر بەم قسەیەی من زیاتر تێکچوو و گوتی: لا ابني لا تخاف، هێسة تصير زين! منیش نووستم و تا ئێوارە ئاگام لە خۆم نەما، دیار بوو

چاک گەدەمی شووشتبوو و چارەی باشی کردبووم، بۆیە منیان بردبووەوە بۆ ماڵەوە، کە چاویشم کردەوە دیم لە ژێر کەپری خۆمان نووستووم! ئیتر دکتۆر هەموو بەیانییەک دەهاتە لام و لەگەڵ خۆیدا سەبەتەیەک میوە و، شووشەیەک شیرو، پەنیری قووتوو و، سەموون و، چوکلێت و شتی دیکەی بۆ دەهێنام، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لە هاوینی داهاتوو دکتۆرەکە نەیێتەوە و لە جیاتی ئەو دکتۆرێکی دی هاتە هاوینەهەواری سەلاحەدین، کە ناوی (کەمال) بوو. ئەو دکتۆر(کەمال)ە کەسایەتییەکی رۆح سووک و دەم بە پێکەنین بوو و، زۆر شتی بە هەند هەڵنەدەگرت و بە پێچەوانەی برنیپێچی خەستەخانەکە (ئەحمەدە فەندی)، کە خەڵکی خانەقین بوو، ئەو (ئەحمەدە فەندی)یە، کابرایەکی ئایین دۆست بوو و رۆژێ پێنج شەش جار نوێژی دەکرد و کتێبی ئایینی دەخوێندەوەو هەمیشە لێوەکانی دەجوولاندەوە و بە تەزبیحێکی درێژ ناوی خوای دەبرد و خواپەرستی پێدەکرد، ئەو پیاوە سیدارەیەکی لە سەر دەنا و دکتۆر (کەمال)یش گەلێک پێی پێدەکەنی.

قادر باشچاوش (رئیس العرفاء)، گەورەترین پلەی پۆلیس بوو لە سەلاحەدین، کابرایەکی زۆر بەسام بوو....

پۆلیس و خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر، هەر لە کۆڕێ تا دەگاتە ئەرمەاوان و بانەمان و کون و کەلەبەرەکانی ناو دۆڵەکانی ئەولاو ئەم لای چیای پیرمام، زۆر لە قادر باشچاوش دەترسان و لەبەری دەلەرزین! ئەو پیاوەش عەسکەرییەکی سەدا سەد یاساپەروەر بوو، بەژنێکی رێکوپێک و شووشەیی هەبوو، جلە خاکییەکانی هەمیشە پاک و خاوێن و ئوتوو کراو بوون، قۆپچەکانی و پارچە کانزا زەردەکەی سەر قایشی پشتی وەک زێڕ دەبریسکانەوە، من یەکێک بووم لەو کەسانەی کە ئەو باشچاوەشم زۆر بە دڵدا چووبوو و، باوکیشم کە پۆلیسێکی پۆلیسخانەکە بوو، زۆر رای لەو باشچاوەشەی بوو، چونکە باوکیشم (بەرەحمەت بێ)زۆر حەزی لە پۆشتەیی و پاک و خاوێنی بوو، قشڵەکە هەمیشە پاک و خاوێن بوو، شەش پۆلیسی پیادەو، سێ چوار پۆلیسی سوارەی تێدابوو، کە لەوانەی دوایی یەکێکیان باوکم بوو.

لە دیوی پشتەوەی قشڵەکە تەویلەیەک هەبوو، کە بە زاراوەی پۆلیسی سواری پێی دەڵێن (تەویلە)، لەو تەویلەیەدا چوار پێنج ئەسپی خورت و چالاک و بالا رێک هەبوون. هاوینێک وەزیری تفاق و بژێو (عەبدولئیلا حافز) بە ماڵەوە هاتە سەلاحەدین، ئەو پیاوە بە خۆی و خێزانەکەی زۆر دنیادیتەو رۆشنبیر و سەر بەرزو دیوکراسیخواز بوون، ژنەکەی وا دیار بوو لە گەنجایەتییەوە خولیای وەرزشی ئەسپ سواری بوو، بۆیە کە هاتنە هاوینەهەواری سەلاحەدین یەکسەر ژنەکەی خۆی بە تەلەفۆن و بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی بە قادر باشچاوەش کرد و بە زارێکی مرۆڤانە و نەرم، نەک بیرۆکراتییانە و خۆ بەزلزانین، بە فەرماندەی پۆلیسی بنکەکەی راگەیاند، کە حەز دەکات هەموو بەیانییەک زوو ئەسپێکی بۆ زین بکرێ و لەگەڵ پۆلیسێکی سوارە، کە ئەویش بە سواری ئەسپی خۆی بێ، بنێردرێتە ماڵیان و بۆ ئەوەی رۆژانە سەعاتێک بە ناو دۆڵ و دارستانەکاندا بگەرێن، لەبەرئەوەی لە بەغدا وا فێر بووە و ناتوانێ واز لەو خووە بهێنێ. قادر باشچاوشیش یەکسەر بە باوکمی راگەیاند و پێی گوت: تۆ سوارێکی کۆن و چاک و بە تەمەنی، ژنی پاشاش یەکێکی وەک تۆی پێ باشە، تۆ دەبێ هەموو بەیانییان ئەسپی خۆت و ئەسپێکیش بۆ مەدام ئامادە بکەیت و بچیتە ماڵیان، لەمەودوا ئەوە ئەرکی تۆیە و لە بنکەی پۆلیس ئەرکت نادەمێ.

ئیتر لە رۆژی دواترەوە و تا کو ماڵی وەزیر گەڕانەوە بەغدا، باوکم هەموو بەیانیان دەچووە ماڵیان و ژنی وەزیری بە سواری ئەسپ دەبردە ئەو چیاو چۆڵە.

لەبەرئەوەی خەڵکی ئەو ناوچەیە باوکمیان دەناسی، بۆیە جارو بار تیرو توانج و پلاریان بۆ دەهاوێشت و پێیان دەگوت: ئەمرۆ بردتە کوێ؟ یان دەیانگوت: ئەرێ مەدام بەر نەبووەوە ناو کۆشت؟، بە منیشیان دەگوت: وا باشتر بوو تۆ لە جیاتی باوکت بچووبای!، هەمووشیان ئەو قسانەیان دەکرد و تێکرا دەیاندایە قاقای پێکەنین و منیش وەک ئەوان

پێکەنین دەیگرتم!.

یەکێک لەو بیرەوەرییانەی، کە هەرگیز لە یادم ناچێ و زۆریشم باس کردووە و تا ئەو ساڵانەی دواییش خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولڕەحمان، کە لە گەڵمدا فەرمانبەری بگۆڕی تەلەفۆن بوو و، یەک دوو کەسی دیکە، هەتا مابوون، شتەکەیان دەزانی و باسیان دەکرد. یادگارەکەش بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

رۆژێک کاتی بەیانی زوو، کە من لە سەر بگۆڕی تەلەفۆن دانیشتبووم، لە بەغداوە یەکێک تەلەفۆنی کرد و پێی گوتم: خذ هاي البرقية مستعجلة و سرية. واتە، ئەو برووسکەیە وەرگرە، کە بە پەلە و نهێنییە، ئێمەی فەرمانبەرەکانی سەر بگۆڕەکانی تەلەفۆن لە هەموو عێراقدا جێگای متمانە بووین، چونکە یەکێک لە مەرجەکانی دامەزراندنمان ئەوەبوو، کە دەبێ هەواڵ و نهێنییەکان ئاشکرا نەکەین.

ئەو کەسەی تەلەفۆنەکەی کرد، دیار بوو سەرۆکی دیوانی (بلاط)ی پاشایەتی بوو لە بەغدا و من نەمدەزانی. ئەو برووسکەیەی بە تەلەفۆنیش پێی راگەیاندم بەو جۆرەی خوارەوە بوو: "احضر بغداد للتباحث في امر الوزارة - علي عجل" پاشان هەرکەسەکە خۆی لە تەلەفۆنەکە گوتی: توصلون هذا البرقية الآن للباشا - للسيد نوري السعيد. انتهت، ئەمەی گوت و تەلەفۆنەکەی داخست. منیش یەکسەر چوومە دەرەوە و لەو دەرگایەم دا، کە دەکەوتە نێوان فەرمانگەکەمان و ماڵی مستەفا بەگ، کە بەڕێوەبەری فەرمانگەکەمان بوو، منداڵێک دەرگای کردەوە، پێم گوت بڕۆ باوکت بانگ بکە! منداڵەکە گوتی باوکم نووستووە، گوتم بەخەبەری بێنە کارم پێیەتی! دوای کەمێک مستەفا بەگی (رەحمەتی) خۆی هات و بە چاوی خەوالووەوە گوتی: ها....چییە؟، گوتم: ئەم برووسکەیەم لە بەغداوە وەرگرتووە، گوتی: باشە، هەر ئێستاکە عەبدولڕەحمان بە ئاگابێنە با لە سەر بگۆڕەکە دابنیشێ و خۆشت برووسکەکە ببە.

برووسکەکەم خستە ناو زەرفێکی رەسمی قاوەیی، کە بە رەنگی سوور لە سەری نووسرابوو (برقية)، دوای ئەوەی زەرفەکەم داخست و ناوی (فخامة السيد نوري سعيد)م لە سەر نووسی، بەرەو ماڵی بەڕێزیان زۆر بە خێرایی بەڕێ کەوتم.

بەڕاستی بەیانییەکی زۆر خۆش بوو، جریوە و چریکەی باڵندەکانی بەیانییانی سەر چڵ و لقە دارەکان و باغەی مەڕو بارەی مانگا شنەبای شەماڵی فێنکی بەیانی لەگەڵ خۆی دەیهێنان و تێکەڵ بە هێمنی و خامۆشی شارۆچکەکە دەبوون و جوانترین دیمەنیان لەبەر چاوم دروست دەکرد و دڵمیان دەگەشاندەوەو هەستمیان ناسکتر دەکرد، لەو کاتەی لە ناو بەهەشتی خۆش و بەتامی ئەو تابلۆ سروشتی و ریالیزمەدا جەستە و هۆش و بیرم دەخولانەوە و خەریک بوو خۆم لە یاد بکەم، لە پشت تەختی پاشایەتی، کە ماڵی خوالێخۆشبوو (نوری سەعید)ی تێدا بوو، ئەو دەرگایەش دەرگای ماڵ نەبوو، بەڵکو دەرگایەکی لە تێل دروستکراو بوو، بۆئەوەی مەڕوماڵات نەتوانن بچنە ناو باخچەکەوە. کە لەو دەرگایە چوومە ژوورەوە، پۆلیسێکی بەرزەفتکار بە پیرمەوە هات و گوتی: تفضل. واتە، فەرموو، گوتم: اني من دائرة البريد، هاي البرقية للباشا. واتە، من لە فەرمانگەی تەلەفۆنم، ئەو برووسکەیەم بۆ پاشا هێناوە، نازانم ئەو بیرۆکەیەم چۆن بە مێشکدا هات، وەک بڵێی یەکێک لە ناخمەوە پێم بڵێ، نەکەی، نەیدەیتە دەستی پۆلیس، خۆت بیدە بە پاشا!، ئەوەی راستیش بێ خۆشم حەزم دەکرد خوالێخۆشبوو نوری سەعید ببینم. پۆلیسەکە چووە ژوورەوە و دوای کەمێک پیاوێکی ورگ زلی سەرو پرچ بۆزی هێشتا شانە نەکراو و دیشداشەیەکی سپی لە بەرو کلاشێکی هەورامی سپی لە پێ هاتە دەرەوە و لێم نزیک بوودوە، منیش زوو گوتم: صباح الخير باشا واتە، بەیانیت باش پاشا، گوتی: هلة ابني تفضل شعندك. واتە، بە خێر بێی رۆڵە، فەرموو چیت لایە، گوتم: آني اشتغل بالبريد، هاي البرقية هسة أخذناها. واتە، من لە پۆستە کاردەکەم، ئەو برووسکەیەش ئێستا وەرمان گرتووە، گوتی: أشكرك. بە مانای سوپاست دەکەم، منیش برووسکەکەم بۆ درێژ کردو ئەویش لێی وەرگرتم و رووی لە

پۆلیسەکە کرد و پێی گوت: مسەوی چای؟ جیب چای للولد واتە، چات لێناوە؟ چایەک بۆ ئەو کورە بێنە. من دەمزانی بەو بەیانییە هێشتا وەختی چا لێنان نییە، بۆیە یەکسەر پێم گوت سوپاس، دەبێ زوو بگەڕێمەوە بۆ فەرمانگەکەم، ئیتر خواحافیزیم لێ کردو ڕۆیشتم.

بەڕاستی سەیرە، ئەو پیاوەی هەموو عێراقی بە یەک پەنجە دەسووڕاندو زۆربەی خەڵکی ئەو وڵاتە خۆشیان نەدەویست و لێشی دەترسان، بەو شێوەیە و لە ناو جەرگەی کوردستانداو لەو خانووە سادە و ساکارە یەک نهۆمییە و لە سەر زاری ئەو گەلییە قووڵە و تەنها یەک پۆلیسی بەرزەفتکار پارێزگاری بکات، وا بە دڵنەواییەوە لێی بخەوێ. خۆ ئەگەر بیانویستبووایە، دووسێ کەسی ئاژاوەچی دەیانتوانی لە ناو گەلییەوە خۆیان، پەنای پنچک و داربەڕوو مێو و مازووان، بشارنەوە و لە ناکاو بۆی دەربچن و بە یەک دەمانچە خۆی و پۆلیسەکە بکوژن!، من لەو بڕوایەدام، کە لە بەغدا قەت نەیتوانیوە لە ژێر پارێزگاری یەک پۆلیس، ئاوا بە دڵنەوایی و متمانەوە لە ماڵی خۆی بخەوێ!.

کابرایەکی موسڵاوی، کە ناوی (داود) بوو، لێپرسراوی هەموو کرێکارەکانی هاوینەهەواری سەلاحەدین بوو، پیاوێکی دەم بە پێکەنین و، پرچ و سمێڵی ڕەش و، قەڵەو بوو، پانتۆڵێکی درێژی خاکی و کراسێکی قۆڵکورتی لە بەر دەکرد لە بەیانییەوە بە ئۆتۆمبیلی فەرمانگە دەچووە گۆڕەپانی کرێکاران، کە لە بەردەم فەرمانگەی ئەندازە کۆدەبوونەوە، چەند کرێکاری بویستبووایە لەوێ هەڵیدەبژاردن و دەیهێنانە سەرکار، کرێکارەکانیش دەچوونە ناو کۆگای فەرمانگەو هەرکەسەو بە گوێرەی ئەو کارەی بۆی دانرابوو، کەرەستەی وەک خاکەنازو پێمەڕە و چەکوچ و قازمەی دەردەهێنا و دەچوونە سەر کارەکەی خۆیان، لەو کرێکارانەش ئەوەی تەمبەڵ و ئیش نەکەر بوایە بۆ بەیانی دەیناسییەوە و جارێکی دیکە نەیدەهێنایەوە بۆ کار کردن.

پاسەوانی ئەو کۆگا گەورەیە دووکەس بوون، زستان و هاوین لە ژوورێکی بچووکی لە بەرد و چیمەنتۆ دروستکراودا بوون، یەکەمیان ناوی (مام قادر) بوو، کە پیاوێکی پیرو باڵا کورت بوو، بەڵام چاوی تیژ بوو. دووەمیشیان ناوی (فەتاح ئاغا) بوو، کوڕێکی گەنج بوو، واش دیار بوو بەچکە ئاغا بوو، بەڵام بۆ مووچە ئاغایەتییەکەی بەلاوە نابوو و پارەکە لای گرنگتر بوو.

لەو کۆگایەشدا هەموو شتێکی پێویست بۆ دروستکردن و نۆژەنکردنەوە و چاککردنەوەی مەکینە و ئۆتۆمبیل و کەرەستەکانی چاندن و.. هتد دانرابوون، هەروەها نەوت و بەنزین و ڕۆنی ئۆتۆمبیلیش لە ناو تەنەکەی سپی سەر مۆر، لە ژوورێکی تایبەتی دانرابوون، بەیانیان هەر لێخوڕێک چی پێویستبایە دەهات لە گزیری کۆگاکەی وەردەگرت، ماوەیەکیش من گزیری ئەو کۆگایە بووم.

بەڵێ، من دوو سێ کارم لەو هاوینەهەوارەی پیرمامە ئەنجام داوە، بۆ یەکەم جار و لە هاوینی ساڵی (١٩٤٦) لە فەرمانگەی پۆستە کارم کرد، زستانی هەمان ساڵ نەچوومە قوتابخانە و بە ڕۆژ لای چاودێری کشتوکاڵی (عەباس ئەفەندی) وەک سەرکارێک دامەزرابووم و شەوانیش لە بنکەی پۆلیس لای باوکم دەخەوتم. بۆ هاوینی ساڵی (١٩٤٧)، وەک (گزیری کۆگا) لە فەرمانگەی ئەندازەی هاوینەهەوارەکان دامەزرام. لە هاوینی ساڵی (١٩٥٠) باوکمیان لە کار وەدەرنا، واتە، لە پۆلیسی نەما، بۆیە تێکڕامان بە ماڵەوە چووینە کەرکووک و لەوێ جێنشین بووین، ئیتر چیدیکە نەچوومەوە سەلاحەدین بۆ کارکردن.

یەکەم ساڵ لە کەرکووک، لە قوتابخانەی ئەهلی ئاشوورییەکان بوومە مامۆستا، پاشان لە کۆمپانیای I.P.C وەک فەرمانبەرێکی کۆگای گشتی کۆمپانیای نەوت Store Department وەرگیرام.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر/ ژمارە ٥ ی زستانی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.**



# دیرۆکی سەربەن (مەسیف سەلاحەدین)

خالید هەرکی

مەسیف... یا هاوینەهەواری سەلاحەدین.. یا پیرمام یا سەربەن ئەم شارۆچکەیە بەم هەموو ناوانە ناو دەبردرێت، مەسیف لە رووی جوغرافییەوە دەکەوێتە باکوری رۆژهەلاتی هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان بە دووری نزیکەی ٢٨ کم، کە دەکاتە خوارووی ریزەچیای سەرکەشی سەفین لەسەر زنجیرە چیایەک لە رۆژهەلاتەوە بۆ رۆژئاوا ئەم شارۆچکەیە دروست کراوە، هەر چەندە مێژووی ئاوەدانکردنی ئەم شارۆچکەیە بۆ ئەوەندە دوور ناگەرێتەوە بەلام لە ئاسەوارەکانەوە ئەوە دەسەلمێنرێ کە ئەم ناوچەیە لە دێرزەمانەوە هەردەم لەلایەن دەسەلاتی زالّ لەو ناوچەیە بایەخی پێدراوە، بۆنموونە وشەی پیر لە چەند مەزارگەیەک نراوە کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە ئەم ناوچەیە لەلایەن ئێزدییەکانەوە رۆژانێک ناوچەیەکی پڕ بایەخ بووە چونکە وشەی پیر کە نازناوی چینێکی ئاینی ئێزدییەکانە وەکو (چینی شێخ و پیر و مرید) کە پیرمام یەکێکیانە و پیر مەروان و پیر ئەبوبەکر یش نموونەی ترن ئەمانە هەموویان مەزارگەن لە مەسیف و دەوروبەری، دیارە دواتر کە دەسەلاتی ناوچەکە دەکەوێتە دەست ئاینخوازانی موسلمان ئەوەتا دەبینین چەندین مەزارگەی پیاوچاکانی ئەوانی لێیە وەکو شێرەسوار و لە گوندی حوجران شێخ جافر لە زیارەت و سەیدی بێسەر لە قیرژەو خەلیل و جەلیل لە شیناوەو شێخ پیرمام لە مەسیف و پیر ئەبوبەکر لە شێخ مەمودیان شێخ مراد و مەلا وەسمان لە ئاژگە و شێخ یونس و دادە رابعە لە گەلیاوە و شێخ حسێن و سەید ئەحمەد لە سێوەکە و حسن مقسود لە زرگوز، هەروەها بۆ سەردەمی دواتر کاتێک نەتەوەخوازەکان دەسەلاتی ناوچەکە دەگرنە دەست ئەوانیش لە گروپەکانی پێشوویان کەمتر بایەخ بەم ناوچەیە نادەن ئەوەتا قەلای دێوین و قەلای

دێرێ و قەلاّی بانەمان نیشانەی ئەوەن کە پادشای کۆرە لە رێگەی ئەم قەلاّیانەوە دەسەلاّت لەو ناوچەیە کۆنترۆلّ دەکا. بۆ سەردەمی دوای ئەوان بگەڕێینەوە دەبینین لە ساڵەکانی سییەکانی سەدەی بیستەم کە بە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی مەسیف دادەنرێ کاتێک رێگای هاملتۆن دروست دەکرێ کە هەولێر بە خالّی سنووری حاجی ئۆمەران دەبەستێتەوە دیارە بەسەر ئەم چیایە تێپەڕدەبێ ئەوسا لە سەردانێکی پادشای ئەو سەردەمی عێراق کە پادشا فەیسەل دەبێ ناوبراو ئارەزووی گەشت وگوزار بووە کاتێک بەم شوێنەدا رەت دەبێ دەبینێ ئاوو هەوای ئەم چیایە لە دەوروبەری جیایە هاوینی فێنک و زستانی پڕ لە بەفرە ئەوەی ئەو کات لە مەسیف بوونی هەبوو تەنها کووپەیەک ئاو بوو کە خێرەومەندێک لە سەر قۆپی ئەو چیایەی بۆ خێری خۆی دانابوو کە دەکاتە تەنیشت گۆڕستانی شێخ پیرمام ی ئێستا دواتر خیوەتێکیان بۆ چەند پۆلیسێکی دارستان هەلّدا تا پاسەوانی لەم رێگایە و دارستانە چڕەکەی بکەن، چونکە خەلّکی کاروانچی کاتێک بۆ کاری کاروانی بەم شوێنەدا تێپەڕیان دەکرد مەترسی رێگریان هەبوو بە تایبەت ئەوکەسانە کە لە خۆشناوەتییەوە ترێ و هەناریان بۆ ناوچەی گەردیایەتی و دەشتی هەولێر دەبرد لەوێش بە گەنم و جۆ ئالّوگۆڕیان پێ دەکردن ئەو خیوەتەش لە شوێن بنکەی پۆلیسی ئێستا بوو نزیک ترافیک لایتی ئێستا، دواتر بنکەی پۆلیس بە فەرمی لە قەلاّی بانەمان دانرا، ئەوکاتە لۆفەکانی مەسیف و لووتکەکەی وەکو دارستانێکی چڕ وابوو بە دار بەڕوو داپۆشرابوو هەربۆیەش کاتێک خەلّکی گوندەکان بەتایبەتیش خەلّکی گەلیاوە دەچوونە مەسیف کە ئەوکات بە سەربەن دەناسرا دەیان وت دەچینە ناوداران ئەم ناوە دواترو تا سەردەمانێکی نزیکیش لەلایەن خەلّکی ناوچەکە هەر بەکار دەهێنرا، بۆ ئەوەی لەم بازنەیە دەرنەچم حەزدەکەم بنچینەی ناوەکانی تریشتان بۆ شی بکەمەوە:

سەربەن کۆنترین ناوی مەسیفە لە بنەڕەتدا بەمانای سەربانی دێت کە دەکاتە سەربانی چیای پیرمام، رزاراوەی سەربانی قورس بووە وگۆڕان لە بەکارهێنانی دا روویداوە تا بووە بە سەربەن، لەلایەن خەلّکانی رەسەنی مەسیف ئەم ناوە تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە.

پیرمام، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ئەو پیاو چاکەی کە ژیانی لە دۆلّێک لە دۆلّەکانی دەوروبەری مەسیف بەسەر بردووە کە ئێستا بە گەلی پیرمام دەناسرێ و دوای مردنیشی لە مەسیف دەنێژرێ و ئەم چیایەش بەناوی ئەو دەکرێ و دەناسرێ.

سەلاحەدین، ئەم ناوە لە سەرەتاوە بە فەرمی بەسەریدا نەسەپێندراوە، دەکرێ بلّێین پادشای عێراق خۆی ئەم ناوەی هەلّبژاردووە هەندێک ئەو ناوە بۆ سەلاحەدینی ئەیوبی دەگەڕێننەوە بەلاّم من بەراستی نازانم.

دیارە دەمێنێتەوە بلّێین مەسیف لەچییەوە هاتووە؟ دوای ئەوەی سەربەن بە فەرمی بە سەلاحەدین دەناسرێ و وەکو شارێکی گەشت و گوزاری دێتە ناسین دەبێتە هاوینەهەواری سەلاحەدین بە عەرەبییەکەش دەکاتە مصيف صلاح الدين، بەهۆی زالّبوونی دەسەلاّتی عەرەبی دیارە وشەی مەسیف کە کورتکراوەی مصيف صلاح الدينە دەبێتە پلە یەکی ناوەکانی.

بەهەرحالّ ئەوەبوو ئیتر پادشا بڕیار دەدا لەم شوێنە کۆشکێکی بۆ دروست بکەن کە تا دوای مردنیشی لە ناو خەلّکی رەسەنی شارەکە هەر بە قەسری مەلیک دەناسرا دواتر بوو بە ئوتێلی سەلاحەدین و ئێستاش کراوەتە بارەگای پارتێکی کوردستانی، دوای ئەوەی کۆشک بۆ پادشا دروست دەکەن بۆ تەها پادشا ش کە سەرۆکی وەزیران بوو خانووێک لە سەرووتر دروست دەکرێ کە لە سالاّنی شەستەکان ئاغایەکی ناوچەکە بەناوی کەریم ئاغا دەستی بەسەردا گرت ئێستاش نەوەکانی تیا نیشتەجێن، بەلاّم ئاسەواری نەماوە، دوائەمە خانووێک بۆ عبدالاله یش دروست دەکەن کە (وصی) بوو بە قەسری وەسی دەناسرا ئەمە ئیتر وای کرد بڕیاری ئەوە بدرێت بکرێتە ناوچەیەکی گەشت و گوزاری. دواتر چەند خانووێک بۆ کرێکارو فەرمانبەران دروست دەکرێ بەدوای ئەمە سینەمایەک و خانوو بۆ گەشتوگوزارو ئوتێلێک بەناوی ئوتێل پیرمام و دوکانێک کە بەناوی دوکانی حاجی پیرە دەناسرا و مزگەوتێک لەلایەن خانەوادەی عەتار

باشی لە ١٩٥٨ دروست دەکرێ و گازینۆیەک بە ناوی گازینۆی پیرمام و چێشتخانەیەک بەناوی چێشتخانەی شەعبی و چایەخانەیەکیش بە چایەخانەی عمر چایچی دەناسرا دوای ئەمە ئوتێلێک بەناوی ئوتێل پیرمام ئیتر هێدی هێدی دەزگاو رابواردگەی وەکو مەلەوانگە و مەیدانی تێنس و شتی لەم بابەتە دروست کراو ئیتر دوای پەنجاکان خەڵکی بۆ کاسبی و کرێکاری بە لێشاو روویان تێ کرد بەتایبەت خەڵکانی گوندی گەلیاوەو کۆڕێ و ئاژگەو زرگوز و دەوروبەری هەروەها چەند خێزانێکی عەرەب لە رێگەی فەرمانگەی گەشتو گوزار وەکو فەرمانبەر و کرێکار لەوێ نیشتەجێ بوون، چونکە ئەوکات گەشتو گوزار سەربە دامەزراوی هێڵی ئاسنین بوو لە وەزارەتی هاتوچۆ.

زۆربەی ئەو خەڵکانەی نیشتەجێی گوندەکان بوون دوای تەواو بوونی کارەکانیان هەر بە پیادەو کەرو بار بۆ ماڵەکانیان دەگەڕانەوە تەنها هەندێک نەبن ئەوانەی کە لە دوور هاتبوون هاوینان کەپریان لە گەڵای بەڕوو و گیا دروست دەکرد تیا دەمانەوەو زستانانیش مەتبەخی خانووەکانی گەشتوگوزاریان پێدەدان هەم چاوێکیان لە خانووەکە دەبوو هەم بۆخۆشیان زستانان لە سەرماکە ستر دەبوون، دوای نەمانی پادشا و دەسەڵاتی کۆماری رژێمەکانی یەک لە دوای یەک بۆ چەند مەرامێک ئەم ناوچەیان بەکار هێناودو گرنگیان پێیداوە لەوانە لەرووی ستراتیژیی


**چیای پیرمام و مەسیف لە دوورەوە**

سەربازی کە لووتکەی سەری رەش یان بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوروبەری بەکار دەهێنا هەروەها بەهۆی جیاوازی کەش و هەوای وەکو ناوچەیەکی گەشت و گوزار خستە گەڕ کە چەندین پرۆژەی گوزارییان لێ بە ئەنجام گەیاند لەوانە کردنەوەی چەندین میوانخانەی گوزاری و خانووی گوزاری بۆ کرێ و مەلەوانگەو گازینۆ هەم لە مەسیف هەم لە سەری رەش وێڕای کارە خزمەتگوزارییەکانیان هەوڵی زۆریان دا سیمای شاردکەمان بگۆڕن لە رێگەی گۆڕین و سەپاندنی ناوەکان لەوانە سەربەن یان لێ کردین بە صلاح الدین سەری رەش یان لێکردبوونە (القمة الجنوبية) بەڵام بەتەقەلای دڵسۆزانی خەڵکی ناوچەکە هەوڵەکانیان نەزۆک بوون. ئیتر دوای راپەڕینیش ئەم شارە قارەمانە باوەشی بۆ خەڵکانی ئاوارەی ئێران کردەوەو بە سەدان خانەوادەی کوردی لێقەوماو روویان تێ کرد و تیای حەوانەوە.

## دەسەڵاتی مەسیف بەر لە راپەڕین ئەم ناوچانەی دەگرتە خۆ

لە باکوورەوە لە بناری چیای سەفینەوە لە گوندی خۆران بەردو خوار بۆ گوندی قەڵاسنج و حوجران و گردەچاڵ تا رۆژئاوا بۆ شێخ مەمودیان و وسوومەلیان لە خوارووشیەوە رووباری بەستۆڕە سنووریەتی تا دەگاتە رۆژهەڵات کە دەربەندی گۆمەسپان و گراون، تا بەر لە راپەڕین کۆی گوندەکانی سەربە مەسیف ٧٦ گوند بوون کە بریتی بوون لەو گوندانەی لە خوارەوە لە تەک نەخشەی سەربەن نووسراون:

١- شێخان ٢- بەربیان ٣- هەرشەم ٤- دێرەسەروکانی ٥- ئەلماوان ٦- زرگوز ٧- درش ٨- پەرێستان ٩- کەپران ١٠- میراخوڕ ١١- ئاژگە ١٢- قەپەکیان ١٣- قەرەقاجین ١٤- زەرواو ١٥- رەشوان نورو ١٦- گردی ماوان ١٧- مام خالان ١٨- رەشوان یوسف ١٩- خالوان ٢٠- گردمامک ٢١-

کەورسۆر ٢٢- گۆپاڵ ٢٣- وسوومليان ٢٤- گەروودەلالان ٢٥- مەنداوە ٢٦- چەمەبەگەز ٢٧- چرە ٢٨- سەرسول ٢٩- هەبابان ٣٠- كودەريان ٣١- جەرگەزەوی ٣٢- شيوەپەلک ٣٣ - باوەخەلان كاوانيان ٣٥- تلبەزدرد ٣٦- پانكان ٣٧- ديوين ٣٨- سولێ ٣٩- شێخ مەموديان ٤٠- زيبارۆک ٤١- زيارەت كۆرێ ٤٢- كۆرێ ٤٣- گردەچاڵ ٤٤- حوجران ٤٥- تەوسکە ٤٦- قەلاسن سەروو ٤٧- گۆڕەشێر سەروو ٤٨- سەنتەری مەسيف ٤٩- بيرێژ ٥٠- سێوەکە ٥١- دۆنگزاوە ٥٢- گراوی سەروو ٥٣- گراوی رۆژئاوا ٥٤- هەنارە ٥٥- بناو ٥٦- گۆمەسپان ٥٧- دەربەند گۆمەسپان ٥٨- سارتکە ٥٩- قەرژەی رۆژهەلات ٦٠- قەرژەی رۆژئاوا ٦١- گراو رۆژهەلات ٦٢- قەرژەی خواروو ٦٣- گۆڕەشێری خواروو ٦٤- قەلاسنجی رۆژئاوا ٦٥- قەلاسنجی رۆژهەلات ٦٦- قەلاسنج خواروو ناوەڕاست ٦٧- خۆران رۆژئاوا ٦٨- خۆران رۆژهەلات ٦٩- حاجی ئەحمەد ٧٠- سۆرەبان ٧١-؟ ٧٢.- گەرياوە ٧٣- حاجی ئۆمەر ٧٤-... ٧٥- بانەمان ٧٦- تووە.

ئەو خانەوادەو كەسايەتييانەی وێڕای خەڵكی گوندەكانی دەوروبەر بەشدارييان لە ئاوەدانكردنەوەی سەربەن كردووە جگە لە خەڵكی گوندەكان كە خێزانيان لەوێ نيشتەجێ نەدەكرد چونكە رۆژانە يا وەرزانە هاتوچۆيان دەكرد بەتايبەتيش خەڵكانی گوندی گەلياوەو ماوەڵۆ كە زەويەكانی ئەو ناوچەيە (مەسيف) يا پاوان يا رەزی ئەوان بوون بۆ خزمەت كردنی رەزەكان و لەوەڕاندنی مەرو ماڵاتەكانيان هامشۆيان دەكرد وەكو نيشتەجێبوون سەرەتا ئەم خێزانانە لەم شارە جێگير بوون و بە پێی زنجيرەبەندييەكە كە لە خوارەوە ئاماژەمان پێداوە: يەكەم خێزان فەتاح مجيد حمدامين ئاغا دەبێ دووەميان: خدر حمد شێخ وەسانی باوكی عبدالخالق سێيەميان: محمود خۆرانی و چوارەميان: عمر ميكائيل عمر ناسراو بە عمێ هەركی و پێنجەميان: ملا عمر سعيد و دواتر مستەفا قەساب و خليفە حمد و دواتر عوسمان وەستا حسن ناسراو بە عوسمان چاوشێن ئيتر لە دوای ساڵەكانی پەنجاوە خەڵک بە مەبەستی كاركردن بە لێشاو رووی تێ دەكەن ئەمە سەرباری ئەوەی خەڵكانی گوندەكانی دەوروبەر بەتايبەتيش گەلياوە هەروەكو پێشتر ئاماژەمان پێداوە بۆكاركردن و بەخێو كردنی مەرومالات و رەزو باخاتەكانيان هاتو چۆيان دەكرد كە تا ئەم دواييەش ئاسەواری رەزەكانيان مابوو.

شياوی باسە بڵێين يەكەم موختاری مەسيف (حسێن كريم سليم) دەبێ يەكەم قوتابخانەش لە ساڵی خوێندنی ١٩٥٦- ١٩٥٧ دەبێ كە خوێندن لە خانووێكی گوزاری بەرێوە دەبرێ كە پێی دەوترا خانووی ژمارە ٤ دواتر ئەم خانووە لە حەفتاكان كرايە بانكی رافدەين ئەپارتمانی خوێندنگا بە فەرمی خوێندنگای سەری رەش بوو دواتر خوێندنگای سەلاحەدين ئەمان لە ساڵەكانی سەرەتای شەستەكان دروست كران، يەكەم ساڵی خوێندنی ناوەندی ساڵی خوێندنی ١٩٦٧ - ١٩٦٨ بوو يەكەم ساڵی خوێندنی دواناوەنديش ساڵی ١٩٧١ - ١٩٧٢ بوو. وزەی كارەبا لە مەسيف لە شەستەكان بۆی هات پێشتريش دوو مووليدەی وەبەرهێنانی كارەبا هەبوون كە لە پەنجاكانەوە داندرابوون.





# خەبات - (کەلەک)

**هەینی قادر**

شارۆچکەی خەبات (کەلەک) یەکێکە لەو (٨) شارۆچکانەی کە پارێزگای هەولێریان لێ پێک هاتووە، جگە لە شارۆچکەی مەخموور کە تاکو ئێستا بە فەرمی نەگەڕاوەتەوە سەر پارێزگای هەولێر، ئەم شارۆچکەیە ناوچەیەکی گرنگە و کەوتۆتە سەر ڕێگای سەرەکی نێوان هەولێر –موسڵ، نزیکەی (٣٢)کم لە هەولێرەوە دوورە، سێ ناحیەی بەسەرەوەیە: (ناحیەی دارە شەکران –ناحیەی ڕزگاری –ناحیەی شەمامک). هەروەها شەش کۆمەڵگای زۆرەملێی سەردەمی ڕژێمی تێدایە: (کۆمەڵگای کانی قرژاڵە –کۆمەڵگای جدیدە –کۆمەڵگای کەورگۆسک –کۆمەڵگای سێبیران –کۆمەڵگای هەنجیرۆک –کۆمەڵگای خەباتی نوێ)، ئەم دوانەی دوایی کەوتوونەتە ناو هەڵبەندی قەزا.

گوندێکی زۆریش دەکەوێتە سنووری ئەم شارۆچکەیە، کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی (١٠١) گوند و ژمارەی گشتی دانیشتووانەکەی خۆی لە حەفتا و پێنج هەزار کەس دەدات، ئەم شارۆچکەیە بە هۆی ڕووبارەکەوە زیاتر بایەخی پەیدا کردووە، سەرچاوەیەکی ئابووری گرنگ بووە بۆ ناوچەکە.

زێی کەلەک کە بەناو خەباتدا دەڕوات سنوورێکی سروشتی جیاکەرەوەی نێوان دەڤەری سۆران و بادینانە و گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە. لە دوا ساڵی جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٨)، عوسمانییەکان دەستیان بە دروستکردنی پردی کەلەک کرد بۆ بەرژەوەندی سەربازی

خۆیان، بەڵام بەهۆی شکستیان لە جەنگدا پردەکەیان پێ تەواو نەکرا تا نیوەیان هێنا بوو، لە دوای ئەوان کە ئینگلیزەکان عێراقیان داگیر کرد، ئەوان هاتن بە هەمان ئامانج واتە بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی سەربازی خۆیان وەکو عوسمانییەکان نیوەکەی دیکەیان بەبەکارهێنانی کەرستەی ئاسن، تەواویان کرد. لە ساڵی ١٩٢٣ بۆ یەکەمین جار ئەم پردە کرایەوە. ئیتر لە سەردەمی رژێمی پاشایەتی و دەسەڵاتی ئینگلیزەکان هەندێ کار و پرۆژە بۆ کەلەک ئەنجام درا، وەکو پرۆژەی دارستانی کەلەک لە ساڵی ١٩٥١ز. لە سەردەمی رژێمی کۆماریش هەندێ پرۆژە بۆ ئەم دەڤەرە ئەنجام درا وەکو پرۆژەی ئاوی کەلەک لە ساڵی ١٩٦٢ز، پرۆژەی پەلەوەری کەلەک لە ساڵی ١٩٦٤ز.

کەلەک لە ساڵی ١٩٧٧ بۆتە ناحیە. یەکەمین بەڕێوەبەری ناحیەش (شێخ رەئوف شێخ فەخری سورچی) بووە، تا بوونی بە قەزا لە کۆتایی ساڵی(٢٠٠٤ز) دوازدە بەڕێوەبەری ناحیە، ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم ناحیەیان گرتۆتە ئەستۆ. دوا بەڕێوەبەری ناحیەش بەڕێز (رزگار مستەفا) بووە. هەر ئەویش دوای بوونی بە مەڵبەندی قەزا بووە بە یەکەم قائیمقامی ئەم قەزایە تا ئێستا لەم ئەرکەیدا بەردەوامە.

قەزای خەبات چەندین شوێنەواری کۆنی تێدایە، کە لە لایەن دەزگای گشتی شوێنەواری عێراقی تۆمار کراون وەکو: (گوندی هەنجیرۆک، گوندی مەلا عومەر، گوندی باستام، چالووک، چەمە دوبس...) چەندان شوێنی دیکە، کە مێژوویەکی زۆر کۆنیان هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ چاخە کۆنەکان، بەتایبەتی سەردەمی ئاشوورییەکان.

### ناوی کەلەک لە چییەوە هاتووە..؟

ناوی کەلەک لە ناوی ئەو بەلەمە ساکارەوە هاتووە، کە خەڵکی ئەم ناوچەیە هەر لە کۆنەوە بە دروستکردنییەوە بەناوبانگ بوونە لە کاری راوەماسی و پەڕینەوە لە زێی گەورە (زێی بادینان) بە کاریان هێناوە، بە رادەیەک تا وای لێهاتووە ئەم زێیە بە ناوی (زێی کەلەک) ناوبانگی دەرکردووە، هەر بەم ناوەش زیاتر لەناو خەڵکدا



ناسراوە.

دروستکردنی (کەلەک) پیشەیەکی سەرەکی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بووە، بە شێوەیەکی سادە و ساکار دروستیان کردووە، لە دروستکردنیدا چەند کەرەستەیەکی خۆماڵی تێدا بەکار هاتووە وەکو پێستەی چێڵ و مانگا کە کوندەی لێ چاک دەکرێت، هەروەها دار و تەختەدار لەگەڵ گوریس، ئەمانە پارچەی سەرەکین لە دروستکردنی کەلەک، جا کەلەکی گەورە هەیە و بچووکیش هەیە، بە شێوەیەکی سەرەکی لە دروستکردنی هەر کەلەکێک (٥ - ١٠) کوندەی لە پێستە دروستکراو بەکاردێت و فووی تێ دەکرێت تا پڕ هەوا دەبێ، هەروەها کەلەک لە کودووی گەورە دروست دەکرێت، ئەم جۆرە کودووە زیاتر لە کاتی مەترسی لە خنکان مەلەوان، بۆ خۆرزگارکردن بەکاری دەهێنێت.

ناوی کەلەک وەکو زێیەکە ریشەیەکی مێژوویی هەیە و لە سەردەمی ئاشوورییەکان بە کەلەک گوتراوە (کەلکۆ)، کە ئامرازێکی سەرەکی پەڕینەوەیان بووە لە ئاو. سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن، کەوا ئاشوورییەکان سەرباز و جەنگاوەریان بە هۆی کەلەک لەم زێیەدا پەڕاندۆتەوە بە هەمان شێوەی سەبارەت بە کۆنی ناوی رووبارەکەش، سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کەوا لە سەدەی (٤ پ.ز)

زەینەفۆنی سەرکردەی یۆنانی ناوی زابی بە (زاباتس) هێناوە. ئێستاش ئەم زێیە بە زابی سەروو ناوی دێت.

**هەنجیرۆک -کەلەک -خەبات**

کورد گوتوویەتی (ئاو و ئاوەدانی)، واتە لە هەر شوێنێک ئاو هەبێت ئاوەدانیشی لێیە. لەم روانگەیەوە دەتوانین بلێین بەردی بناغەی خەباتی ئێستا گوندی (هەنجیرۆک) بووە، ئەم گوندە کتێبی (أطلس المواقع الاثرية في العراق) -چاپی ١٩٧٦، بە یەکێ لە شوێنەوارە کۆنەکانی لە قەڵەم داوە.

هەنجیرۆک، ناوەکەشی لەوەوە هاتووە، وەکو هەندێک لە پیاوە بە تەمەنەکانی ئەم ناوچەیە بۆیان گێڕامەوە، لە کۆنەوە لە لای چەپی زێی بادینان (زێی کەلەک) کانییەکی ئاو هەبووە، سێ بنە هەنجیری لەسەر بووە، خەڵکەکەش وردە وردە روویان تێکردووە و خانوویان لە دەوروبەری دروست کردووە. بە تێپەڕبوونی کات گوندێکی بچووکی لێ ئاوەدان کراوەتەوە. ناوەکەشی لە بنە هەنجیرەکانەوە وەرگرتووە. لەبەر ئەوەی ئەم گوندە نزیک بووە لە زێ، خەڵکەکە بۆ گوزەرانی ژیانیان و پێداویستی واقیعی ناوچەکە پەنایان بردۆتە بەر دروستکردنی کەلەک بۆ راوەماسی و پەڕینەوەی لە زێ. ئیتر ئەم کارە بووە بە پیشەی خەڵکی گوندەکە و رۆژ بە رۆژ ئەم کارە پەرەی سەند و فراوان بوو. ناوی کەلەک بووە بە ناوی گوندەکە و بەری لای هەولێر پێی گوتراوە کەلەکی کۆن. ئەو بەری لای (موسل)یش پێی گوتراوە کەلەکی یاسین ئاغا، یاسین ئاغا پیاوێکی چاو تێر و دەوڵەمەند و دەست رۆیشتوو بووە، خەریکی پیشەی دروستکردنی کەلەک بووە، بۆیە گوندەکەی بەناوی خۆی و پیشەکەی ناسراوە، هەروەکو بەڕێز مامۆستا نوژدار بامەڕنێ ئەم زانیارییانەی بۆ گێڕامەوە. ئەوەی شایەنی باسە لە سەردەمی عوسمانییەکانیش پێی گوتراوە (ئاسکی کەلەک)، واتا کەلەکی کۆن، ئێستاش ئەم ناوە لەسەر زاری هەندێ کەسی بەتەمەن هەر ماوە.

**پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە خەبات**

دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١، گەڕانەوەی خەڵکەکە بۆ سەر گوند و دێهاتەکانیان، هەڵمەتی ئاوەدانکردنەوەی گوندە وێران بووەکانی سەردەمی رژێم دەستی پێکرد. لە سەرانسەری کوردستان شان بە شانی بنیاد نانەوەی گوندەکانی، بواری پەروەردە و فێرکردنیش لە بەرچاو گیراوە. لەبەر رۆشنایی وتە بە نرخەکەی بەڕێز سەرۆک بارزانی کە وتی: "لە هەر گوندێک دوو ماڵ هەبێت سێیەم قوتابخانەیە"، ئەمە بووە هاندەرێک بۆ بووژاندنەوەی کەرتی پەروەردە و فێرکردن لە کوردستان. ئیتر گوند نەما قوتابخانەی بۆ نەکرێتەوە، ئەگەر قوتابخانە بریتی بێت لە یەک ژووریش، بەتایبەتی لە کابینەی سێیەم و چوارەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوار زیاتر رەخساو گرنگی و بایەخی ئەم کەرتە زیاتر بوو.

دەبێ لەم کارەشدا رۆڵی بەرچاوی رێکخراوە خێرخوازی و جیهانییەکان. لەبیر نەکەین، کە کاریگەرییەکی تەواویان هەبوو بەسەر ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی خەڵکی کوردستان، دەڤەری خەباتیش بێ بەش نەبووە لەم بایەخەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و رێکخراوە جیهانییەکان، ئەوەتا ساڵ بە ساڵ ژمارەی قوتابخانەکان زیاتر بووە و پێداویستییەکانی ئەم کەرتە تا رادەیەکی باش دەستەبەر و چارەسەر کراوە، بەتایبەتی دوای کردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی خەبات گۆڕانێکی گرنگی بەسەردا هاتووە. بەشی زۆری ئەو کەم و کورتییانە، لە رووی مەلاک و بینایە و پێداویستییەکانی خوێندن و قوتابخانە هەبووە. تەنها دوو مامۆستای چارەسەر کراون، پێشتر قوتابخانە بووە. بەڵام ئێستا ئەم گرفتەی کەمی مامۆستا نەماوە. هەروەکو بەڕێز بەڕێوەبەری پەروەردەی خەبات (مامۆستا بەکر گەردی) لە دیمانەیەکدا ئاماژەی

پێدا، لە ڕاستیدا ئێستا بە بەراورد لەگەڵ چەند ساڵێک پێش ئێستا، ئەم ناوچەیە بووژانەوەیەکی باشی لەم بوارەدا بەخۆیەوە دیوە ئەگەر بێت و بە زمانی ژمارە ئاماژە بە گۆڕانەکان بکەین، بۆمان دەردەکەوێت ئەم دەڤەرە چ پێشکەوتنێکی بە خۆیەوە دیوە. ئەمڕۆکە لە قەزای خەبات ١٢٧ قوتابخانەی سەرەتایی و ٣٤ قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی و ئامادەیی و ٤ باخچەی ساوایان هەیە و ژمارەی مامۆستایانی سەرەتایی ١٥٩٠ مامۆستایە و ژمارەی مامۆستایانی دواناوەندیش ٤٣٠ مامۆستایە.

ئەوەی شایەنی باسە لە دروست کردن و نووژەنکردنەوەی بینایەی قوتابخانەکان ڕێکخراوی (کۆیکا)ی کۆری بە هاوکاری تیپی زەیتوونی سەربازی کۆری ڕۆڵێکی گرنگیان دیوە و تا ئێستا جگە لە ناو مەڵبەندی خەبات، لەم شەش گوندەی دەڤەری قەزای خەبات شەش قوتابخانەیان دروست کردووە: (گاینج، کەوڕەبەن، بن بێرز، کەورگۆسک، مزە ئەحمەد، سێبیران، کە لەمەیان (١٢) قوتابخانەیەکی دوو نهۆمی (١٢ پۆلی) گەوردیان دروست کردووە، جگە لە هۆڵی تایبەت بە تاقیگەکان دوو هۆڵی گەوردشی تێدایە، هەروەها لە بەرنامەیان دایە بۆ گوندی پیرداودیش قوتابخانەیەکی تازە دروست بکەن).

جێی بیر خستنەوەیە، کە کۆنترین قوتابخانەکانی ناو مەڵبەندی قەزای خەبات قوتابخانەی ئاسکی کەلەکی سەرەتاییە، کە لە ساڵی ١٩٥٧ز. دروست کراوە و تا ئێستاش ماوە.

**پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی قەزای خەبات:**

قەزای خەبات چەند پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری بەخۆیەوە بینیوە، بەتایبەتی لە سەردەمی هەردوو کابینەی سێیەم و چوارەم کە لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەگەر بە کورتیش بێت ئاماژە بە گرنگترین ئەم کار و پرۆژانە بکەم کە لەم ماوەیەدا پێشکەش بەم دەڤەرە کراون:

دروستکردنی ٤٢ قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی.

دروستکردنی دوو بنکەی تەندروستی، یەکەمیان لە خەباتی نوێ و دووەمیان لەسەر گرد.

قیرتاو کردنەوە و بەدووسایدکردنی هێڵی نێوان هەولێر و خەبات.

دروستکردنی دوو پردی گەورە لە نێوان خەباتی نوێ و هەنجیرۆک، کۆنە کەلەک.

دروستکردنی ١٤٦ خانوو بۆ ماڵە شەهید و هەژار و ئاوارەکانی سەردەمی ڕژێم لە گەڕەکەکانی ناو مەڵبەندی قەزا.

فراوانکردنی وێستگەی کارەبا.

دروستکردنی بینایەی تازەی قائیمقامیەت و لقی گولانی بانقی ڕافیدەین.

دروستکردنی بینایەی تازە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی خەبات.

دروستکردنی پاڵاوگەی شەهیدانی یەکی شوبات.

نۆژەنکردنەوەی کۆنە ئامادەیی کشتوکاڵ لە کەلەک.

پەرەپێدان و گەورەکردنی پرۆژەی ئاوی ئیفراز.

دروستکردنی دوو سەنتەری ڕۆشنبیری، یەکێکیان بۆ گەنج و لاوان و ئەوی دیکەیان بۆ ئافرەتان، ئەمەش بە هاوکاری ڕاستەوخۆی ڕێکخراوی (ڤۆکای ئەمریکی) جێبەجێ کراون، سەنتەری گەنج و لاوان کە ناوی سەنتەری (ڕۆشنبیری خەبات)ە لە ١٦/ ٣/ ٢٠٠٥ دامەزراوە، سەنتەرێکی چالاکە و جگە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ڕۆشنبیری بەردەوام، گۆڤارێکی ڕۆشنبیری وەرزانەشیان هەیە بە ناوی (زێ)، کە تا ئێستا سێ ژمارەی لێ دەرچووە.

سەرلەنوێ ژیاندنەوەی دارستانی کەلەک (غابات کلک) بە ڕواندن و چاندنەوەی هەزاران داری یۆکالیپتۆس و سنەوبەر.

کردنەوە و دروستکردنی ژمارەیەک کارگەی گرنگ وەکو کارگەی تواندنەوەی کۆنە کانزا و ئاسن لە کەورگۆسک.

دروستکردنی کۆگایەکی گەورەی سووتەمەنی لە کەورگۆسک.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٧)ی ئاب ٢٠٠٧ وەرگیراوە.**

# ناوی جوگرافی و مێژوویی هەندێ لە گوندەکانی هەولێر

هۆشیار عەبدوللا

**پێشەکی**

* ناوی جوگرافی دەشتی دزەییاتی و دەشتی هەولێر، ناوی گوند و کەند و دۆڵ و گرد و گردۆڵکە و چیا و کانی و بیر و شار و شارۆچکەکانی دەڤەرەکە دەگرێتەوە، ریشەی ناوی زۆربەشیان دەگەرێتەوە سەر زمانی کوردی، هەندێکیشیان ریشەکانیان دەگەرێتەوە سەر زمانی ئەو گەلانەی، کە کاتی خۆی کوردستانیان داگیر کردووە و میللەتی کوردیان کەوتۆتە ژێر دەست. زۆربەی ئەو ناوانەش لێکدراون یا دارێژراون لە ناو + پاشگرێک یان پێشگرێک ناوێک پێکهاتووە، بۆ نموونە پاشگری (ئاوا-اوا-اوە) دەلکێت بەدوای ناوێکەوە، وا پیشان دەدات، کە ئەو کەسە ئەو جێگایەی یا ئەو گوندەی یا ئەو گەرەکەی ئاوەدان کردبێتەوە، کە بەناوی ئەوەوە ناونرابێت نموونەشمان یەکجار زۆرە وەک ئۆمەر -ئۆمەراوە-رەحیم-رەحیماوا.

ئەو گوندانەش بەناوی ئەو کەسانە کراون، کە بۆ یەکەمجار ئەو شوێنەیان ئاوەدان کردۆتەوە، وەکو کورداوە، ئۆمەراوە، عەلیاوە، مەحسوناوا، شێراوا، ئاریاوا، سمایلاوا. هەندێک لەناوی گوند و شوێنە جوگرافییەکان بەناوی سەرۆک هۆز و عەشیرەتەکان کراون، یا ئەو پیاوانە مرۆیەکی بەرچاو و دیار بوون لە هۆزەکەدا، وەکو حەسەن بەگ، هەمزە بەگ، برایمە لەک، حەسەن بلّباس، ئۆمەرە سۆر، میرزاغا، برایم باوڵ.

یا ئەوەتە هەندێکیان بەناوی پیاوانی خواناس کراون لە چاک و پیر و سەید و شێخ و مەلا و حاجی، کاتی خۆی لە زەمانی جیا جیا بە (سەید) یا (شێخ) وتراوە (پیر) وەک پیر داود، پیررەش (پیرەش)، پیرزین، پیرمەم، بابی پیر، سەیدەمین (سەیید ئەمین)، سەید عوبێد، سەیدۆکە، سەید عوزێر، یا بەناوی شێخێک کراوە وەک شێخ شێروان (شەروان) شێخانان، گەرەشێخان، شێخەلاس، شێخ گەزنە، شێخ عەبدولعەزیز، شێخۆمەر، (شێخ ئۆمەر)، شێخ زەرد، شێخ رەش، یا ئەوەتا بەناوی (مەلا) و زانایانی ئایینی کراون، وەکو: مەلا ئۆمەر، مەلا قەرە. یا حاجییەک وەکو حاجی شێخان-حاجی عەلی. یا بەناوی قەبری پیاو چاکان کراون، وەکو قەبری عەلی، قەبری سەییدی، لەبەر ئەوەی ئەو دەشت و بنارە کانی و چەم و رووباری کەمە یا کەمتر بووە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا، ئاوی سەرەکییان ئاوی بیر بووە، بۆیە هەندێ گوند و شوێنە جوگرافییەکان بەناوی ئەو (بیران)ە کراون کە لێیەتی یا بەناوی خاوەن بیرەکان کراون کە هەڵیانکەندوون یا ئەوەتا ئەو ئاژەڵەی ئاوی لەو بیرە خواردۆتەوە، وەک سێبیران. بیرە بەرازە، بیرەجنە، بیری حەمۆکی، بیری رەحمانی عاڵلای، بیرەبات، بیرە قامیشە، بیرە پیران، بیرە دزەیی، یا بەناوی ئەو کانییە کراوە، کە لێیەتی کانییەکەش بەناوی ئەو گیاندار و باڵندە و رووەکە کراوە، کە لەوێدا هەیە وەکو کانی قرژاڵە، کانی سەگان، کانی داودە رەش،

کانی خەزەران، کانی دیواری، کانی هەنجیر، بەناوی ئەو (گردان)ە کراون، کە لێیانەوە نزیکن و شێوە و رەنگی خاکەکەی و جۆری گیا و گوڵ و رووەکەکەی، کە لێی شین دەبن، وەکو گردەسوور، گردەبۆر، گردە رەشە، گردە شینە، گردە زەرد، گردەچاڵ، گردەپان، گرد گێلخە، یا ئەوەتا (گرد)ەکە بەناوی هۆزێک یا پیاوێک کراوە، وەکو گردعازەبان، گرد مەلا. یان هەندێکیان بەناوی تام و بۆ و جۆری ئاوەکە کراون وەک گراو، خۆشاو، سیراوە، ماستاوە، رەختاوە، شۆرەزەردکە، شۆرەپەلکە، شۆراو، شۆریجە، دەرماناوە.

بەشێکیشیان بەناوی ئەو دار و درەخت و گیاو گوڵانە کراون، کە لێی شین دەبن. وەک دارەتوو، دارەخورما، دارەبەن، خورمەڵە، تووڕەق، کەبەرۆک، پونگینە، باغچە، هەنجیرۆک، یا ئەوەتا هەندێک لەو ناوانەش دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کاتی، کە عوسمانییەکان کوردستانیان داگیر کردووە، ئەو ناوانەیان لێناون، وەکو قوڵتەپە، قوشتەپە، باشتەپە، دوزتەپە، گۆگ تەپە، (گۆیتەپە)، قەرەتەپە، قەرەچناغە، قەرەچووغ، قەرەدەرە، قەرەبۆت، قەرەبێتک، مەلاقەرە، قورشاغلو، یەدی قوو، یەدی قزلەر، هەندێ بەناوی هەوارەکە کراون، کە کاتی خۆشی رەشماڵ نشین و مەڕدارەکان هەواریان لێ هەڵداوە، وەکو هەوراغەر، دوازدە هەوار، بەرزەوار، هەوارە قوڕە. ئەو ناوە تورکیانەش لەلایەن کاربەدەستەکانی عوسمانی ناونراون، زیاتر ئەو ناوانەش ئەو خەتە دەگرێتەوە، کە بە تەلەعفەر، موسڵ، هەولێر، پردێ، کەرکووک، دووز، کفری، خانەقین، مەندەلیدا دەڕوات. ئەو هێڵەش خەتی عەسکەری و ستراتیجی بووە، بەڵام ئەو ناوە تورکیانە لە ناوچە و دەڤەرەکانی دیکەی کوردستاندا، وەکو ناوچەی خۆشناوەتی، باڵەکایەتی، سورچیایەتی، دەڤەری بارزان و دەشتی زرارەتی هەر نین، ئەگەر هەشبن زۆر کەمن.

یان هەندێکیان لە ئاوەڵفرمانێک وەک (سەر) لەگەڵ ناوێک پێکهاتوون، وەک سەرمەزرا، سەرگەڕ، (سەرگەڕان)، سەربەشاخ، سەردەریان. یان بەناوی ئەو (شیو) و کەندانە کراون، کە رەنگی ئەو کەند و خاک و رووەک و باڵندەیە وەردەگری، کە تێیدا دەژی، وەکو شیوەسوور، شیوەڕەش، شیوەپیران، شیوەشار، کەندێناوە، کەندەبەکرە، کەندار، کەندارەقەل، کەندارمەم، کەندی خەلیفەی، کەندی کفران. یا ئەوەتە لە وشەی (شا-شە) وەکو پێشگرێک لەگەڵ ناوێک پێکهاتوون: شامامەر، شائۆمەر، شانەشین، شەمامک، جا لێکۆڵینەوە لە ریشەی ناوی جوگرافی گوند و شوێنەوارەکانمان دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی زمان و کلتووری میللەتەکەمان. وا لێرەدا دووبارە ریشەی ناوی جوگرافی و مێژوویی بەشێک لە گوندەکانی دەشتی دزەییاتی دەشتی هەولێرتان بۆ دەخەمە روو:

* هەروەکو پێشتر ئاماژەمان بەناوی (دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر)، هەوڵی ئەوەم دابوو جوگرافیای دەڤەرەکە بخەمە روو و باسی مێژوو و بەسەرهاتی هەندێک لەو رووداوانەمان کردبوو، کە لە دەڤەرەکەدا روویاندابوو. پاشان بەپێی توانا باسی هاتنی ئەو تیرە و هۆزانەی کە ئەمڕۆکە لە دەڤەرەکەدا نیشتەجێن و شوێن و زێدی باب و باپیرانیانم دەستنیشان کردبوو. لێکۆڵینەوەی ئەمجارەمان سەبارەت بە جوگرافیا و مێژوو و ریشەی ناوی گوندەکانی دەڤەرەکەیە، چونکە تۆمارکردن و لێکۆڵینەوە لەناوی جوگرافی و مێژوویی ریشەی ناوی گوندەکان بەشێکی گرنگە لە تۆمارکردنی مێژوو و کلتوور و فەرهەنگی نەتەوایەتیمان. جا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین ناوەکان زۆربەیان کوردین و هەندێک ناو نەبێت، کە (تورک)ین، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سالانی داگیرکردنی کوردستان لەلایەن عوسمانییەکانەوە و ناولێنانیان لەلایەن فەرمانبەرەکانی تورک بە تایبەتی ئەو هێڵەی، کە لە تەلەعفەردوە بەرەو موسڵ و هەولێر و قوشتەپە و پردێ و کەرکووک، دووز، قەرەتەپە، قزرابات، خانەقین، مەندەلی. ئەو ناوە تورکییانە زیاتر دەبینرێن بە تایبەتی لە دەشتی موڵکییەی دەشتی هەولێر وەک ناوی قوشتەپە، قەرەچناغە، باشتەپە، یەعقوب تەپە، یەدی قزلەر، یەدیقوو، دۆغان، سوباش (سۆربەش) باترتوق، قونیان دوزتەپە. کەچی لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا وەکو ناوچەی خۆشناوەتی، بەرانەتی، دەشتی زراری، باڵەکایەتی، دەڤەری بارزان ئەو ناوانە هەر نین و ئەگەر هەشبن زۆر کەمن. بۆچی ئەو ناوە تورکییانە لە ناوچەی دزەییایەتیدا زۆرە؟ لەبەر ئەوەی هەولێر سنجەق بووە و زۆربەی فەرمانبەرە گەورەکانی بەڕێوەبردنی سنجقەکە تورک

بوون و هەولێ ئەوەیان داوە ناوی تورکی لە شوێنەکان بنێن. جا لەوساوە تیرەو هۆزێکی زۆر ئاوای کەندێناوە دەبن و دەڤەرەکە بەرە بەرە ئاوەدان بووەتەوە، چونکە گوندەکانی دەشتی قەراج مێژووی ئاوەدانکردنەوەیان دەگەڕێتەوە بۆ ١٢٥-١٣٠ ساڵێک لەمەوبەر.

* سەبارەت بە جوگرافیا و مێژوو و ریشەی ناوی گوندەکانی ناوچەی کەندێناوە، لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵی ئەوەم داوە جوگرافیای دەڤەرەکە بخەمە روو و باسی مێژوو و بەسەرهاتی ناوچەکە بکەم، پاشان بە پێی توانا باسی هاتنی ئەو تیرەو هۆزانە بکەم کە تا ساڵی ١٩٨٧ ز لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون و ژیاون و شوێن و زێدی باب و باپیرانیان دەستنیشان بکەم. سنووری ناوچەکە لە باکوورەوە زنجیرە زوورگەکانی (زوورگە زراو)ە، لە خوارووییەوە بەرزاییەکانی چیای قەرەچووغە، لە رۆژهەڵاتییەوە زێی بچووک (زێی پردێیە)، لە رۆژئاوای زێی گەورەیە، درێژییەکەشی (٨٠)کم و پانییەکەشی (٢٣)کم دەبێت. مەڵبەندی ئەو ناوچەیەش شارۆچکەی (دیبەگەیە) کە سەر بە قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە. لە دووری (٤٢)کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە. ناوچەکەش تا ڕادەیەک زوورگە دەشتە و ناوچەیەکی نەوتاوییەو زیاتر لە ١٨٠ بیرە نەوتی تێدایە، بەدرێژایی مێژوو کورد نیشتەجێی ئەم ناوچەیەو لە (٧٢) گوند پێک هاتووە، دانیشتووانەکەشی ١٠٠٪ کورد بووە. کاتی خۆی لە زەمانی عوسمانییەکاندا بە ناوچەی کەندێناوەیان دەگوت (سەنیە): دەڵێن ئەو ناوەش نیسبەت بە ناوی دایکی (سوڵتان سەلیمی سێیەمی عوسمانییە ١٧٧٨ز-١٨٠٨ز) ئەو مەملەکەتانەی کە لەژێر دەسەلاتیان بوو زەویوزارێکی زۆریان بە ناو کرابوو، بەتایبەتی لە کوردستاندا. لێرەدا ئێمە باسی مێژووی ٢٢٥ ساڵێک لەمەوبەر دەکەین، ئەگینا پێش ئەو مێژووە من لە باری خۆم هیچ زانیارییەکم لەبارەی ناوچەکە نییە، چونکە ئاوڕدانەوەی ناوچەکە دەگەڕێتەوە (٢٢٠) ساڵێک لەمەو بەر. دەگێرنەوە: (سوڵتان سەلیمی سێیەم) بریاری دەرکردبوو هەرکەسێک بچێت زەوی و زاری (سەنیە) ئاوەدان بکاتەوە، ئەوا لەباج و سەرانەو خزمەتی سەربازی عەفوو دەکرێت، چوونکە ئەو کاتی دانیشتووانی دەشتی مرکییە باج و سەرانەیەکی زۆریان لێ دەستاندن، سەرەڕای ئەوەش دەبوایە پیاویش بۆ خزمەتی سەربازی بچن. جا هەر لەو ساوە واتە لە زەمانی (سوڵتان سەلیمی سێیەمەوە ١٧٧٨ز -١٨٠٨ز) خەڵکەکە بەرە بەرە لە دەشتی مرکییەو شەمامکەوە ئاوارەی ناوچەی کەندێنانەوە بوون و بە مەرداری هەواریان لێ دامەزراند، بەرە بەرە تا وای لێهات ژمارەیەکی زۆر لە هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی دەشتی مرکییە هەندێکیان شوێنی خۆیان بەجێ هێشت و لەو ناوە گیرسانەوە: وەکو هۆزی سیان کە بەزۆری لە گوندەکانی بناری (زوورگە زراوی) بە دیوی دەشتی مرکییەدا لە گوندەکانی -گردلانکە -شێخانان -ئۆمەر مامەکە - باشتەپە -ئۆمەراوە -دەژیان. هەندێکیان ئاوای کەندێناوە بوون گوندەکانی سەر بە شاخ -عولافات -گا بەرەکە - گێسمە -یان ئاوەدان کردنەوە. لە گوندی باشتەپەش هەندێک بنەماڵەی دیکە لە تیرەی (شەمزینی) ئەوانیش بە مەرداری ئاوای ئەو دیو بوون ئەو گوندانەی خوارەوەیان ئاوەدن کردەوە (جەستان -دەربەندی گۆم -قووچ - بیرەبان).

هۆزی لەک هەندێکیان لە گوندەکانی (جدیدە) و (ئاوەدلۆک)دا بە مەرداری کەوتنە ئەو دەشت و بنارە (چل هەوێزە) و (دوو شێوان)یان ئاوەدان کردەوە. پاش ئاوەدان کردنەوەی دەشتی قەراج هەندێکیشیان کەوتنە گوندەکانی -حەسارۆک - قووچ - حوشترالۆک -یان ئاوەدان کردەوە.

(ئۆرمزیار)ەکانی (هێلەوە) و (شێخ شەروان) هەندێک بنەماڵەیان باریان کرد بۆ ئەو دەشتە (سمایلاوا) یان ئاوەدان کردۆتەوە.

هۆزی مامە سێنی لە گوندەکانی دەشتی مرکییەدا دادەنیشتن بەتایبەتی لە گوندی (هەمزە کۆر) و (دوڵە بەکرە) لەوێ هەڵقەنان چوونە - سەرگەڕان - داود گورگە -کەزرار قوتنی - سلێمانی بە خشیان - ئاوەدان کردەوە.

بندیانەکان لە (گردی قالۆرەی مرکییە دابوون بە مەرداری کەوتنە دێمەکار -خدرجیجە -لاوەر -یان ئاوەدان کردەوە (ئاری کوتکی) کاتی خۆی بە مەرداری کەوتنە دەشتی هەولێر لە (مورتکە) هەڵقەنان و کەوتنە ئەو دەشتە لە بناری چیای قەرە چووغی (کەزرار) و (گاوەرە)یان ئاوەدان کردۆتەوە، هەروەها (گەلالییەکان) کەوتنە (مەلا کاغە)، هەروەها خەیلانییەکانی گوندی (کەپەنک رەش).

ئەمانیش بە مەڕداری کەوتوونەتە بناری چیاکە. چەند ماڵێک لە برایماغاییەکانی (مورتکەی گچکە) بە مەڕداری کەوتنە بناری چیای ناسر کوژرای ( میلی هۆرت سەعید کورتاندروو)یان ئاوەدان کردەوە. (هۆزی شێروانی) لە دەشتی مرکییەدا لە گوندەکانی (منارە بێریات - سێبیران -باقرتە) دادەنیشتن ئەوانیش بەرەو بناری چیای قەرەچووغ کۆچیان کرد لە گوندەکانی(دارە خورما، حەسەن بلّباس، حاجی شێخان و چیغلۆک) گیرسانەوە. سەبارەت بە فەقێ مرکییەکانیش هەندێک لە پیرەکانی ناوچەکە دەڵێن ئەمانە لەگەڵ هاتنی لەشکری پاشای گەورە کەوتوونەتە ئەو دەڤەرە لە دەشتی مرکییەدا بەتایبەتی لە گوندی (قازیخانە) نیشتەجێ بوون. هەندێ بنەماڵەیان ئاوای ئەو دیو بوون بە مەڕداری لە گوندەکانی (شەحەل، قەپرانەو، خۆشاو، دەرماناوە)یان ئاوەدان کردۆتەوە، پێش ئەو تیرەو هۆزانە دەڵێن هۆزی گەوردی بلّباس بە کۆچەری ڕەوەندی دەهاتنە ئەو دەڤەرە لە کەندێناوەو بناری چیای قەرەچووغی و دەشتی قەراجێ هەواریان دەگرت. بەڵام حکومەتی عوسمانی لەو ناوەی هەڵقەندوون هەنووکەش لە دەشتی هەولێرێ و دەڤەرەکەدا زۆر ناو و شوێنەواریان ماوە وەکو غەری شا سواری، حەسەن بلّباس، قووچە بلّباس و قووچی باپیراغەی بلّباس. ماوەیەکیش هەندێ لە ناوچەکە کەوتۆتە بن دەستی هەندێ لە هۆزە بەدووەکانی عەرەب وەکو(لهێب و سفووک) بەڵام پاشان پێیان بە جێ هێشتوون. هەنووکەش ئەو ناوچە گەورەو فراوانە بە مەڵبەندی ناحیەی (٧٢) گوندەکەیەوە تەخت و وێران کراون، هۆزانی عەرەبی تێدا نیشتەجێیە. هۆزەکانی ئەم ناوچەیەش ئەمانە بوون:

(سیان، شێروانی، بندیان، ئۆرمزیار، مامە سێنی، لەک، کارەش، پالانی، سنجاوی، ڕۆژ بەیانی، ئاری کوتکی، بلّباس، سالەیی، گەلاڵی، کەمێک خەیلانی، سەییدەکان)

**دارەتوو**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتڕێیێ، لە هەشتاکان نیوەی گوندەکە سەر بە ناحیەی قوشتەپە بووە و نیوەکەی دیکەی سەر بە ناحیەی (عەنکاوە) بووە، ئێستاش سەر بە قەزای (بنەسلاوە)یە و لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی کونەگورگ، گردەڕەشەی ئەفەندی و گردەڕەشەی ئەسعەد- باغەمرەفەندی- باغەمرە شەهاب- لەسەر یەکە-گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ( ٢٢٠ ) ساڵێک لەمەوبەر. وشەی (دارەتوو) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ناو+ ئامرازی ە+ ناو) واتا (دار+ە+ توو) پێکهاتووە. هۆی ناولێنانی ئەو گوندەش بەناوی (دارەتوو) دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی بیرێک، کە کاتی خۆی هی بنەماڵەی (کامەلای برایمە ڕەشی) بووە، ئەوان ئەو بیرەیان هەڵکەندووە و مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان هەبووە. دوو داری توویان لە تەنیشت بیرەکە چاندبوو، کاتێ کە لێرە دامەزران و نیشتەجێ بوون ناونرا (دارەتوو). هەروەها بنەماڵەی (ئیسماعیل نەبی حەمەدی)، کە کاتی خۆی لە گوندی (خرێ و هەڕەش) لەدەشتی هەریری ناوچەی سورچیایەتی بە مەڕداری هاتوونەتە ئێرە و دامەزراون. خەڵک لەملا و لەولا هاتوون نیشتەجێ بوون، زۆربەی دانیشتووانی ئەو گوندەش لەو بەرەبابانە پێکهاتووە. یەکەم بەرەبابی مەلای برایمە ڕەشی کاتی خۆی خاوەن موڵک بوون، لێرە لە خێڵی بلّباسن. دووەم بەرەبابی ئیسماعیل نەبی حەمەد لەهۆزی (سورچی)ن، سێیەم بەرەبابی یا بنەماڵەی (سدیقی کێخوا سابیری ئیسماعیل) ٥-٦ ماڵێک دەبوون لە زووەکەوە کەوتوونەتە ئێرە، کاتی خۆی لە گوندی (بنەسلاوە)وە کەوتووونەتە ئێرە، لە عەشیرەتی (نانەکەلی)ین، چەند ماڵێکیشیان لە گوندی کونەگورگ نیشتەجێن، لەوانە عەلی ساڵح ناسراو بە (عەلی فاتم) دەکاتە برازای کێخوا سابیر. جێگای باسە گوندی (بنەسلاوە) لە کۆندا هی بنەماڵەی (نانەکەلی)یەکان بووە، پاشان کەوتۆتە بن دەستی بنەماڵەی (ڕەشید ئاغای حاجی وەیساغا)ی هەولێری، هەروەها لە کۆنەوەش گوندی (باغەمرە ئەحمەد)یش کە هەنووکە (باغەمرە شەهاب)ی پێدەڵێن هی نانەکەلییەکان بووە. واتە عەشیرەتی نانەکەلی لەو گوندانەی پشترێ بوونیان زۆر بووە هەتا دەگاتە گوندی کورداوە و چەمرگە و پوونگینەو.... هتد، بەڵام وردە وردە لە ناوچەکە پەرتەوازە بوون. چوارەم بەرەبابی کەرکووکییەکان، گوایە کاتی خۆی بنەماڵەی (خدری سلێمان)ی لەناوچەی (یایچی) شاری کەرکووک کەوتوونەتە ئێرە، هەروەها بڕە ماڵێکیشیان لە گوندی

(کونەگورگ) نیشتەجێن. جگە لەو تیرە و بنەماڵانەش چەند تیرە و بنەماڵەیەکی دیکەشی لێیە، لەوانە بنەماڵەی حاجی سەعیدی، کە بەڕەسەن خۆشناون و لە گوندی زیارەتی بناری چیای سەفینەوە لەناوچەی خۆشناوەتی کەوتوونەتە ئێرە، کوڕ و نەوە و نەوازەیەکی زۆری لێ کەوتۆتەوە لەگەڵ بنەماڵەکانی دیکەی گوندەکەدا لەرێی ژن و ژنخوازییەوە تێکەڵاوییان هەیە. بنەماڵەیەکی دیکەش هەن کە بنەماڵەی (قادر هەینی)یان پێ دەڵێن، دەگێڕنەوە کاتی خۆی (حاجی مەلا هیدایەتی پیردابی) هەولێری خاوەنی هەردوو گوندی (کونەگورگ) و (گەڕەسۆر)ی و چەند پارچە زەوییەکی گەورەشی لەناو شاری هەولێردا هەبووە، کاتێ دەچێتە حەج و زیارەتی ماڵی خوا، عەبدێکی قولەڕەش لە وڵاتی حیجازەوە دەکڕێ و دەیهێنێتەوە گوندی (کونەگورگ)، هەندێک لەپیرە بەساڵاچووەکانی ئەو گوندە دەڵێن ئەو عەبدە حەبەشی بووە لە وڵاتی ئەفریقیاو، کەوتۆتە حیجاز، ناوی (مەگرووم) بووە، ئەوەندە رەش بووە تەنیا ددانەکانی سپی دەچۆوە. ئەم پیاوە لەو ناوە ماوەتەوە و نیشتەجێ بووە، لە گوندی (دارەتوو) ژنێکیان داوەتێ، هەنووکەش نەوە و نەوەزای لەو گوندەدا ماون بە یەدەی قوڵان بەناوبانگن. ناو و شوێنەوارە جوگرافییەکانی ئاقاری ئەو گوندە. (عەلی مەولان) ناوی گردێکە و، غەرابەیە و، کاتی خۆی گوند بووە. مام حاجی (مەجید ئیسماعیل نەبی) لەدایکبووی گوندی (دارەتوو)ی ساڵی ١٩٣٠ز. دەڵێت: شوێنەوار و بناغەی خانووەکانم دیتبوو، تەنانەت لە هەندێک جێگا دیواری خانووەکان هەر مابوو لەبەردی دروست کرابوو، جارێکیان دەستاڕێکیان دیتەوە لەسەر دەرکی تەندوورەکی داندرابوو، لەخوار گردی (عەلی مەولان)ێدا (قۆرتەک)ی کەم بوو، وا پێ دەچێت کاتی خۆی کانی بێت. لە خوارەوەی گردی (عەلی مەولان) لەنێوان (باغەمرە شەهاب) و (دارەتوو)یدا چاکێک هەیە بەناوی چاکی (ئارا) بەرامبەری گردێک هەیە پێی دەڵێن (گردی ئارا). هەنووکە دەوروبەری ئەو چاکە بۆتە قەبرستانێکی گەورە، دەڵێن کاتی خۆی (ئارا) گوند بووە. هی باپیری مامۆستا مەلا سەعید مستەفای باغەمرەیی بووە، دەگێڕنەوە ساڵێکیان (بەستی گردیش)ی هەستاوە و ئاو هاتبوو ئەو گوندەی شڕ کردووە، خانووبەردی گوندەکەی رووخاندووە، خەڵکەکە ناچار مان لەوێ باربکەن و بگوازنەوە. هەنووکەش شوێنەوار و کاولە بیری ئەو گوندە هەر ماوە.

(بەستی گردیش)ی ئەو بەستە ئاوی دۆڵە زوورگەکانی چەمرگە و گردیش، کورداوەیە دەبنەوە یەک، بەستێکی گەورەیە دێتە خوارەوە بەنێوان ئاقاری گوندی (باغەمرە نەرمە) باغەمرە رەقەی دادێت، بەرەو ئاقاری گوندی (دارەتوو)ی بەسەرەوەی گوندیدا دەڕواتە خوارێ، لە خوارووی رۆژئاوای بەڕێوەبەرایەتی شورتەی هاتوچۆدا لەگەڵ ئەو بەستەی، کە لە بنەسڵاوەی رادێت بەنێوان گوندی (دارەتوو)، کونەگورگی دەڕواتە خوارێ و لەخوار گوندی (کونە گورگ) لەگەڵ بەستی مزوورانی و بەستی کەسنەزانی هەموویان تێکدی دەکەنەوە، دەبنە یەک بەست و لەگەڵ بەستی گردیش لەبەستی قەتەوی دەکەونەوە و دەڕواتە خوارێ بەرەو (چیمەن) و (داڵداغان) و (تەندووردەی) لە (کۆدەرە)ی دەکاتەوە بەرەو خوار دەبێتەوە لە (زێی گەورە) دەکاتەوە. (گردی ئەحمەد باڵەکی) ناوی گردێکە و غەرابەیە و شوێنەوارە هەنووکەش کەرپووچی گەورە گەورەی لێ دەبیننەوە، ئەو ئەحمەد ناوە رەوەند و مەڕدار بووە (سۆفی ئەحمەد)یشیان پێ گوتووە، کوڕێکی هەبووە ناوی (وەلی) بووە، بەڵام زوو لێرە باری کردووە.

(کەندی کۆران) ناوی کەندێکە لە ئاقاری ئەو گوندەدایە، کاتی خۆی ژنانی ئاوایی لەوێ کۆریان لێ دادەمەزراند و کۆریان لێ دەکرد، بۆیە بەو ناوە ناسراوە.

(قووچی چانداران) ناوی قووچێکە و لەنێوان گوندی (باغەمرە) و (دارەتوو)ی هەڵکەوتووە، لەوبەری قووچەکە چەقێنە و ناچێندرێت.

کەندی عەیشێ حەیدەر، ناوی کەندێکە بەناوی ئەو ئافرەتەوە ناونراوە. (قەبرە غەریبە) گۆڕێکە بەتەنیایە لە سەرەوەی گوندەکە هەڵکەوتووە، دەڵێن کاتی خۆی لە گرانی ساڵی ١٩١٧ز. پیاوێک دێتە گوندی (دارەتوو)ی رانکێکی سۆری لەبەر بوو، خەڵکەکە نانی دەدەنێ لەو گوندە بەبێ کەسی دەمرێ و کەس نەیزانی هی کوێیە، هەر لەوێ دەیشارنەوە هەنووکە کەوتۆتە ناو کۆمەڵگای (دارەتوو).

(بادین) ناوی زەوییەکی تەختە. (کەندێ کەلەش) ناوی کەندێکە. (گۆمی برووسکی) ناوی گۆمێکە لە سەرەوەی زەوی بادینی هەڵکەوتووە کاتی خۆی برووسک

لەوێی داوە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە. ناوی ڕێیەکان: ڕێی ئاشان کاتی خۆی گوندەکانی ڕۆژهەڵاتی دارەتوو بەو ڕێیەدا دەچوونە ئاشی گوندەکانی (قەتەوی) و (عەزە)ی، ئاوی قەتەوی دوو ئاشی لەبەر دەگەڕا، ئاشی قوڵ، ئاشی غەرابەی منارەی ئەو کاولە ئاشانە هەتا ئەم ساڵانەی دوایی کەلاوەکانیان هەر مابوو.

(ڕێی قەراج)ی ئەم ڕێگایەش لە (دارەتوو) دەردەچێت و بەوبەری گوندی (گردەڕەشە)یدا دەڕۆیی بەرەو تیمار و گوندی تۆبزاوەی بەرەو دەشتی کەندێناوە و قەراجی، بۆیە بەو ناوە ناسراوە.

(ڕێی خۆشناوان) ئەم ڕێگایەش لەلای (کەسنەزان)ەوە رادەهات، کاتی خۆی خەڵکی ناوچەی خۆشناوەتی بناری چیای سەفین بە کاروانی بەرەو دەشتی دزەییایەتی دەهاتنە خوارێ بەو گوند و بنارەدا دەڕۆیشتن، دەهاتنە ئاقاری (باغەمرە شەهاب) و دەهاتنەوە ئاقاری دارەتوو-مورتکە و گوندەکانی ئەو ناوە.

(ڕێی گندۆران) ئەو ڕێیە بە بەینی ئاقاری گوندی (دارەتوو) و (گردەڕەشە)ی دادێت، خەڵکی گوندەکانی دەو زێی گچکە بە تایبەتی گوندی (قەشقە و خوڕ خوڕ) هاوینان بە باران کاروانە گندۆرەیان دەهێنایە شاری هەولێرێ.

(ڕێی هەژدنواران) ئەم ڕێیەش بۆ گوندەکانی میرزاغا و سەردەشت و هەڵەجە و بێستانەی دەڕۆیشت.

(پیرەبەست) ناوی بەستێکە و لەزنجیرە زوورگەکانی زوورگی (زەرگەتەن)ی رادێت، دێتەوە خوار بۆ (باغەمرە)ی شەهابی و بەنێوان گوندی (دارەتوو) و (کونە گورگ)یدا دەڕواتە خوارێ و لەخوار ئاقاری گوندی (کونە گورگ)ی لەگەڵ بەستی (مزوورانێ) دەبنەوە یەک و لە کەندی (قەتەوی) دەگەنەوە یەک.

(دارەتوو) لە کۆنەوە قوتابخانەی ئایینی هەبووە، لەم مامۆستایانەی، کە لەوێ بوونە مامۆستا مەلا محەمەدی ڕەش پاشان مامۆستا مەلا عومەر بانەموردی هاتۆتە ئێرە، فەقێ و موستەعیدی هەبووە، هەردەم (٨-٩) موستەعیدی هەبوو، لەوانەی کاتی خۆی لەلای ئەو بەڕێزەیان خوێندووە و لە پاشان بوونەتە زانای باش، وەکو مامۆستا مەلا ڕەسوڵ شاوێس، مەلا واحیدی باوکی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم، مەلا قورشید مەلا ئەسعەد.

دوای ئەو مەلا خدری جانەیی هاتۆتە ئێرە لەپاش و پێش ئەو، مامۆستا مەلا واحید عەبدولقادر ئیسماعیل پاشان مامۆستا مەلا محەمەد سەعید مستەفا باغەمرەیی لێرە بوو. لە هەرێمی کوردستاندا چەند گوندێک بە هەمان ناو هەیە، لەوانە گوندی (دارەتوو)ی خازر سەر بە ناحیەی (شێخان)ە لە پارێزگای نەینەوا هەروەها (دارەتوو)ی ئەمیناغای سەر بە ناحیەی (بەردەڕەشی) قەزای ئاکرێیە، دانیشتوانەکەی لە هۆزی (ڕۆژبەیانی)نە. هەروەها سێ گوندی دیکە بەناوی (دارەتوو مەولانا)، (دارەتوو نەزەر) هەیە لە ناحیەی سەرچنار سەر بە قەزای ناوەندی پارێزگای سلێمانی[1] بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. دانیشتوانی ئەو گوندە (١٨٣) کەس بووە. لە ساڵی ١٩٨٧ز. ئەو گوندە زۆر فراوان و گەورە بوو، بە شێوەیەک (١٠٠) ماڵ دەبوون، لەساڵی (١٩٧٠)ەوە، قوتابخانەی هەبووە و ئەو گوندە هەمیشە پێشمەرگەی زۆر بووە، بە تایبەتی لە شۆڕشی ئەیلوول و گوڵاندا، ژمارەیەکی زۆر لە گەنجەکانیان چەکی پێشمەرگایەتییان لەشان دەکرد و لەم ڕێگایەدا خاوەنی چەندین شەهیدن، ئەمەش هۆکارەکەی زیاتر ئەوەبوو، چونکە هەر گورزێک لەڕژێم بوەشێندرابایە ئەوا هێزی پێشمەرگە، بەو گوندەدا دەهاتن و دەچوون، واتە بۆ ڕێی پێشمەرگە شوێنێکی ستراتیژی بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧دا لەگەڵ هەموو گوندەکانی دەشتی پشترێ و دەشتی ملکیەدا وێران و خاپوور کران. ئاقارەکەی کرا بە کۆمەڵگا و بە (کۆمەڵگای دارەتوو) ناونرا، ڕژێم خەڵکی گوندەکانی دەشتی ملکیە و پشترێ و قەڵادزە و هەندێکیش لە ئاوارەکانی کەرکووکی بە زۆرەملێ هێنایە ئەو گوندە و نیشتەجێیان کردن.

### بیستانەی گەورە

لە دەشتی پشترێدا(٢) دوو گوند بەو ناوە هەنە، هەردووکیشیان سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرن. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی سەر مەزرا- بیستانەی گچکە- لاجان، ئۆمەرە سۆر لەسەر یەکە، گوندێکی زۆر کۆنە، لە بناری زوورگەکەوە هەڵکەوتووە کە بە (زوورگی بیستانە)ی بەناوبانگە، (سەری گیرەی ڕەش) تەوقەسەری ئەو زوورگەیە، جێگایەکی بڵند و دڵگیری هەیە، کە بەسەر

هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێر دەڕوانێ، بە تایبەتی دەشتی ملکیە و پشتڕێ هەروەها هەندێک لە گوندەکانی دەو شەرغەی، چەند کانیاوێکی سارد و سازگاری هەیە، باغچەیەکی زۆری لەبەر دەکرا بەتایبەتی هەنجیر، هەر لەبەر ئەمەشە کاتی خۆی کە ئاوەدان کرایەوە ئەو ناوەی لێنراوە. مستەر ریچ لە گەشتەکەیدا لە ساڵی ۱۸۲۰ز. ناوی هەردوو گوندی بیستانە و هەرەجەی هێناوە، بە موڵک هی بنەماڵەی مەلا فەندی بووە، ئەو بنەماڵەیە زیاتر لە ٤٠ گوندیان لە دەشتی هەولێر لە ملکیە و کەندێناوە و دەشتی شەمامک و بەڕانەتیدا هەبووە، لە دەشتی پشتڕێدا ئەو گوندانەی خوارەوەیان هەبووە (بیستانە، سەرمەزرا، دارەتوو، باغەمرە فەندی، گردەڕەشە فەندی) لە دەشتی ملکیەشدا ئەو گوندانەی خوارەوەیان هەبووە (منارە، جدیدە، ئاوەدلۆک، شێخ شەروان) لە ناوچەی کەندێناوەشدا ئەو پێنج گوندانەی خوارەوەیان هەبووە، کە بە (موقاتەعەی مەلا قەرە) ناسراوە، ئەو گوندانەش ئەمانەن: (مەلا قەرە، کەپەنک ڕەش، شێخەلاس، حەسەن بەگ، ماجید). لە دەشتی شەمامکێ نۆغەران، تەندوورە و چەند دێیەکی دیکەیان لەو ناوە و دەشتی بەڕانەتیدا هەبووە. پاش کۆچی دوایی (مەلافەندی ۱۸٦۳-۱۹٤۲ز) منداڵەکانی زۆربەی گوندەکانیان فرۆشتووە. مەلا فەندیش لە زۆربەی گوندەکانیدا (سەرکار)ی هەبووە، کە ئیش و کار و کاروباری کشتوکاڵ و گوندەکەی بۆ بەڕێوە دەبرد. با بزانین شاعیری کوردایەتی خوالێخۆشبوو (دڵدار ۱۹۱۸-۱۹٤۸ز) چیمان بۆ دەگێڕێتەوە ئەو کاتەی کە ماڵیان لەوێ بووە، باوکی دڵدار فەرمانبەرێکی عوسمانی بووە، لەڕانیە کاتێ ئینگلیزەکان گەیشتنە کوردستان کۆیە و ڕانیە گیرا باوکی وازی لە وەزیفە هێناوە و هاتۆتە لای (مەلافەندی)ی ڕەحمەتی بۆ ئەوەی یارمەتی بدات، ئەویش (گوندی بیستانە)ی پێداوە، کە لەوێ کشتوکاڵ بکات و تێیدا بحەوێتەوە. خوالێخۆشبوو دڵدار لە موزەکەراتەکەیدا نووسیویەتی: (من بێستانەم بەفکر نایەت و نازانم چۆن بووە، بەڵام لەسەر ئەوەی کە ئافرەتێکی هەڵگیراو ئیلتیجای بەماڵی ئێمە کردبوو، پیاوانی شێخ مارفی (هەڵەبجە) ویستبوویان بیکوژن و ئێمەش مودافەعەمان کردبوو، پیاوەکانمان دەستگیر کردبوو، لەمە شێخ مارف کە خەزووری ئەحمەد ئەفەندی موتەسەڕیف بوو عاجز ببوو و ئەحمەد ئەفەندی ئامۆزای مەلافەندی بوو، بەو موناسەبەتە مەلا ئەفەندی دڵگیر ببوو و بیستانەی لەئێمە سەندبۆوە)[٢].

لە ساڵی ۱۹۳۲ ماموستا مەلا (تەها)ی قورشاغلوویی بڕوانامەی زانستی لە مەلافەندی وەردەگرێت و ڕەوانەی دێی بیستانەی دەکات، هەم مەلا بووە هەم سەرپەرشتی گوندەکەی بۆ دەکرد، ماموستا چەند ساڵێک لەوێ بە مەلایەتی مایەوە پاشان باری کرد. لە پاشان حەمەد مستەفا بووە وەکیلی مەلافەندی. با بزانین نووسەر و سیاسەتمەدار و زانای کورد کاک مەسعود محەمەد لە کتێبەکەیدا بەناوی (گەشتی ژیانم) لە لاپەڕە (۱۵۳) چیمان لەبارەی گوندی (بیستانە) و حەمەد مستەفای سەرکار بۆ دەگێڕێتەوە، کاک مەسعود نووسیویەتی (د. سەبری قەبانی) وەک گەلێک لە خوێنەرانی ئەم ڕۆژگارە دەزانن خەڵقی سووریە بوو، لە خەستەخانەی هەولێر ببوو بە دکتۆر، بە ماڵەوە هاتوچۆی (باداوە)ی دەکرد. لە گەشتی بەهاران، کە ڕۆژانی هەینی هەر جارە بەرەو لایەک بۆ ڕابواردن دەچووین، د. سەبری لەگەڵماندا دەبوو، بە زۆریش ئەو کامێرای بەکاردەهێنا و وێنەکانی سەر و بەردەکردن. لە ژمارەیەکی پار، پێڕاری گۆڤاری (الف باء) یەکێک لەو ڕسمە کۆنانە بلاوکرایەوە و چەند و چۆنییەکەی شەرح درابوو. بەڵام زۆر بە سەیری جارێکیان لەو گۆڤاری (طبی)یەی خۆی لە شام دەریدەچوواند ڕەسمێکی لەو ڕەسمانە بلاوکردەوە، کە لە دێی (بیستانە) گیرا بوو. حەمەد مستەفای وەکیلی مەلافەندی و کوێخای دێیەکە مێوانداری دەکردین. ئەو ڕۆژە حەمەد مستەفا کام جلکی قۆزی هەبوو لە سەڵتەی سورمەدار و کەوای تاقە و سەر و شەدەی ئاوریشم لەخۆی ئاڵاندبوو، ڕەسمەکەی هەروەها دەرخستبوو بە یەکەوەمان گرتووە، کەچی زۆر باش دەیزانی حەمەد مستەفای بیستانەییە خوای لێخۆشبێ، دیارە مرۆ دکتۆریش بێ هەر بە مرۆیی و بەو کەم و کەسەرییەی هەیەتی دەمێنێتەوە[٣].

لە پاش کۆچی دوایی مەلافەندی منداڵەکانی گوندەکەیان فرۆشتە (سمایل عەلۆی)، کە یەکێک بوو لە پیاوە ناودارەکانی بنەماڵەی فارساغا، بەڵام بنەماڵەی عەلی مەحموودی کاکە خانی پێیان ناخۆش بوو لەسەر ئەمە گەلێک جاران تووشی ناخۆشی هاتن، ماڵی سمایلی

عەلۆی بە ناچاری پارەکەیان لە عەلی مەحمـوودی وەرگرتەوە و فرۆشتوویانەوە وان. دانیشتووانی ئەو گوندە بە زۆری گەردی (مەلازادەن)، کە برا گەورەی گەردییەکان (حەمەد مستەفا) بوو، ئەویش برا گەورەی کێخوا سمایلی بوو، ژمارەی دانیشتووانی ئەو گوندەش بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (١٩٣) کەس بووە.

گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لە ڕۆژاوای بیستانەی گەورە هەیە بیستانەی گچکەی پێ دەڵێن هاو سنوورن ٦-٧ ماڵێک دەبن. زۆربەیان لە هۆزی (مەنمی)ین، حاجی قادر مستەفا ناسراو بە (حاجی قەدۆ) ئەو گوندەی کڕی.

## سەری گیرەی ڕەش

سەرە زوورگێکە لەو ناوچەیەدا لە هەموو شوێنەکانی دیکەی زوورگەکە، واتا (زوورگی بیستانە)ی بڵندترە. ئەو زوورگەش دەکەوێتە پشتی گوندی هەڵەجە و بیستانەی، پێی دەگوترێت (سەری گیرەی ڕەش) دۆڵەکانی ئەو زوورگە درێژن پێیان دەڵێن (کونە درێژە) و زوورگەکەش خاکەکەی مەیلەو ڕەش خۆی دەنوێنێ. هەندێک لە دانیشتووانی دەڤەرەکە دەڵێن: بۆیە ئەو ناوەی لێندراوە گوایا کاتی خۆی شەڕێکی زۆری لێ کراوە و بە گێچەڵ و گیرە بووە، هەر لە زەمانی عوسمانییەکانەوە ئەو کەسانەی، کە لەمیری عاسێ دەبوون لەو ناوچەیەدا کامە جێگا بڵندتر بووایە خۆیان لەوێ دەنا، بۆ ئەوەی ئاگایان لە هەڵسوکەوتی دوژمن بێت. ئەو سەرە زوورگەش دەڕوانێتە هەموو ناوچە و دەوروبەرەکەی، لە ڕۆژهەڵاتییەوە کەندەڵانە و زۆر ڕکە، مرۆڤ ناتوانێت پێیدا هەڵگەڕێت و دەو شەرغەیە، هەڵەت و هەڵدێرە و هەزار بە هەزارە، تەنیا چەند کوڕە ڕێ و بزنە ڕێیێک هەیە. گرتنی تەوقە سەرەکەشی بە گیرە و گێچەڵ و کوشتن تەواو دەبوو، لەبەر ئەوە گیرەی ڕەش بوو (ڕەش)یش هەر مانای ناخۆشی و بەدی دەبەخشێت هەندێکی دیکە دەڵێن لەبەر ئەوەی جێگاکە بڵندە و کاتێ لە وەرزی زستانە بەفر دەبارێت، ئەو شوێنە بەفرێکی زۆری لێ گیر دەبێت. هەر لەو زنجیرە زوورگەدا جێگایەکی دیکە لە نزیک گیرەی ڕەش هەیە، کە لە بڵندیدا لە دوای گیرەی ڕەش دێت، پێی دەڵێن (بێژینگ بەسەر) شێوەکەی لە بێژینگ دەچێت، بۆیە ئەو ناوەیان لێناوە.

داری سۆفی فەتاحیش تاقە دارێکە، دارەکە دارتووە، لە سەرەوەی گوندی سەر مەزرا هەڵکەوتووە.

## بەستی شەرغە (شەڵغە)

بەستی شەرغەی ناوی بەستێکە سەروچاوەکەی لە گوندی (دێگەڵە)و دەوروبەرییەوە دەست پێدەکات و پێ بەپێ بەرەو زێی خواروو (گچکە) دەڕوات، لە خوارووی گوندی (سارتک) لەزێی گچکە (پردێ) دەکاتەوە. لەم بەر و لەوبەری شەڵغەدا، گوند و دێهات هەیە، زەوییەکانیان بێ برشت و بێ بەرەکەتە لە بەرد و شاخ و سۆرک و زوورگی ڕووتەن و هەڵەت و هەڵدێر پێکهاتووە. دەگێڕنەوە دەڵێن: وەختی خۆی ئەحمەد پاشای بابان گوتوویەتی ئای شەڵغە چیت لێ کردم وڵاتێکی زۆرت لە کیس دام! ئەو گوندانەش کە کەوتوونەتە ئەوبەری بەستەکە، واتە ڕۆژهەڵاتی بەستەکە بەدەشتی کۆیە دەژمێردرێت، ڕۆژئاوای بەستەکەش سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە.

## قوشتەپە

جگە لە شارۆچکەی قوشتەپە، کە مەڵبەندی ناحیەکەیە، دوو گوندی دیکەش بەو ناوە هەیە، قوشتەپەی گەورە و گچکە کە ئاقاریان لەسەر یەکە و هاو سنووری ناحیەکەن. قوشتەپەی گەورە ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی ملکیە، سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە، ئاقاری لەگەڵ شارۆچکەی قوشتەپە و ئاقاری گوندەکانی قوشتەپەی گچکە (پرینگە، برایمەلەک، گۆسکە، سێبیران) لەسەر یەکە. لە پەنجاکان (١٠٠) ماڵێک دەبوون[٤]. دوو کارێزی ئاوی هەبوو، یەکێکیان لەناو گوندی ئاوەکەی دەردەچوو و بەناو گوندیدا دەهات، ئەوی دیکەیان لەبەرەوەی ئاوایی بوو، ئاوێکی زۆری هەبوو، دەغڵ و دانیان پێ ڕەباس دەکرد، تووتن و برنج و شینایییەکی زۆریان لەبەر دەکرد و ڕەز و باغێکی گەورەی لەبەر کرابوو. نزیکەی جێگای ٦-٧ عەلبە گەنمی داگرتبوو جۆرەها داری بەری تێدا بوو، هەر لە هەرمێ و هەنار و هەنجیر و خۆخ بگرە تا قەیسی و ترێ، ئەو ڕەزو باغەش هی سلێماناغای حاجی ئەحمەدی بوو. ئەو تیرەو هۆزانەی لەو گوندە نیشتەجێ بوون ئەمانەن: (بامەند)ەکان بنەماڵەی (قادری عومەر)ی هەر لە کۆنەوە ئەم بنەماڵەیە لەوێ دانیشتوون. کاتی خۆی خوشکێکی ئەو پیاوە لەلای سلێماناغای بوو. (کۆلە)کان ئەمانیش چەند ماڵێک دەبوون، پاشان لەوێ باریان کرد و چوونە دەشتی کەندێناوە و قەراج. هەندە

مالّی سەیدیشی لیّ بوو پاشان ئەوانیش ئەویّیان بەجیّهیّشت و باریان کرد. بنەمالّەی مەلازادان ئەم بنەمالّەیە پشت بە پشت مەلا بوون و کاتی خۆی لە دەشتی کۆبەوە لە گوندی (داربەسەر) کەوتوونەتە ناوچەی دزەییاتی. مەلا سەعدی ناویّکیان بە مەلایەتی دەکەویّتە ناوچەی (دیّلّتاوە -خالص) لە گوندی (هبهب) جیّگیر دەبیّت و هەنووکەش ئەو بنەمالّەیە بەناوی بنەمالّەی (السعدی) لەناو عەرەبان بەناوبانگن، هەندیّکیشیان لەو گوندانە مانەوە و نیشتەجیّ بوون، وەکو بنەمالّەی خوالیّخۆشبوو مامۆستا مەلا ئەمینی دووکەلّەیی لە گوندی (دووکەلّە) نیشتەجیّ بوون، کە دەکاتە باوکی مامۆستا مەلا عەزیزی ئیمام و خوتبە خویّنی مزگەوتی حاجی قادر بلە لە هەولیّر. قوشتەپە ئاشی ئاوی هەبوو تا سەرەتای سالاّنی چلەکان هەر ئیشی دەکرد. بەلاّم لەگەلّ بەدیار کەوتنی (ئاشی ئاگر) ئەو جۆرە ئاشانە لەکار کەوتن.

سلیّماناغە کوڕی حاجی ئەحمەدی کوڕی ئۆمەری کوڕی حوسیّنی فارساغایە. ئەو پیاوە پیاویّکی دلّتەڕ بوو، هەردەم حەزی لەباغ و باخچە و شینایی و سەوزایی دەکرد، زۆر بایەخی بە باخچە و ڕەزەکەی دەدا، شاعیریّکی دلّتەڕ بووە، بە (سلیّماناغەی قەرەچووغی) ناوبانگی دەرکردبوو. زۆربەی شیعرەکانی لەلای فەقیّ و مەلاکانی ناوچەکەماندا بلاّو ببۆوە. لەگەلّ شاعیری بەناوبانگی دەشتی هەولیّر خوالیّخۆشبوو (مەلا هەوایی ١٨٦٤ز-١٩٢٤ز) هاموشۆیان هەبووە، ئەوکاتی مالّی سلیّماناغە لە گوندی (ترپە سپیان) بووە، مالّی باوکی مەلا هەوایی خوالیّخۆشبووش (مەلا ئەحمەدی سائم) لە گوندی میّرغوزار بووە. هەمیشە نامەیان بە شیعر بۆ یەکتری ناردووە. ئەم پیاوە هەردەم حەزی بە هاتوچۆکردنی حوجرە و ناو فەقیّ و مەلایان و کۆڕی ئەدەبی کردووە. ئا ئەوەتا خوالیّخۆشبوو مەلا محەمەدی چروستانی (١٨٩٤-١٩٦٣ز) کە یەکیّک بووە لە زاناکانی ناوچەی سولەیمانی لە کتیّبەکەیدا بەناوی (یاداشتەکانی مندالّی و بەشیّکی سەردەمی فەقیّیەتی) کە کاتی خۆی لەدەشتی هەولیّر لە گوندی (ترپە سپیان)ی دەشتی ملکیەدا لەسالّی (١٩١١-١٩١٢ز) لەلای خوالیّخۆشبوو مامۆستا مەلا شیخ جەلاّلی بەرزنجی فەقیّ بووە خویّندوویەتی باسی ئەو گوندە و سلیّماناغە دەکات کە ئەوکاتی، واتە لەسالّی ١٩١١ز لەویّ دادەنیشت ئەم سەرگوزەشتەیە (٩٠) سالّ لەمەوبەر لە یەکیّک لە گوندەکانی دەشتی هەولیّر بەناوی (ترپە سپیان) لە بەینی ئاغەی دیّیەکە (سلیّماناغا) و فەقیّیەکان رووی داوە.

ئەمەش دەقی نووسینەکەی مامۆستای خوالیّخۆشبوو (مەلا محەمەدی چروستانییە-١٨٩٤-١٩٦٣ز): لە سەرگوزەشتەی ئەو زستانە کە لە ترپەسپیان بووم. ئاغاکەی ئەویّ (سلیّماناغا) ئەغلەب شەوی سیّشەممە و جومعان دەهاتە ناو فەقیّیان، یاری و سوحبەتیان دەکرد، گەلیّ شەو گۆرەوی بازییان دەکرد تا نیوەشەو. شەویّک لەسەر دلّخواز گۆرەوی بازی کرا، سلیّمان ئاغا و دەستەی بردیانەوە، پیاویّکی چەتەولّی لۆق دریّژ بوو هەلّسا فەقیّیەکی کرد بە (پیّچالّ) سەری بە دیوارەوە نووسان، لاقانی پیّ دوور خستەوە، فەقیّ بچکۆلەکەی کرد بە (مەکووک)، خۆی بە (جۆلاّ)، فەقیّ مەکووکەی خستە بەینی دیوار و لاقانی فەقیّ پیّچالّەوە و کۆمانییەوە وەکو ڕکووع، فچکیّکی بۆ دەکرد و یەک ئەژنۆی دەدا بە قنگی مەکووکا، دەیگەیاندە ئەودیو کوتیّکی باشیشی دەدا بە فەقیّ پیّچالّەوە، لەو دیوەوە فەقیّ مەکووکی وەردەگیّڕایەوە، ئەژنۆکەی تری بەهیّزی خۆی دەدا بە سمتی فەقیّکەدا، دەیوت: فچک، بەشیّوەیەکی سەیر و، کوتیّکی قایمی دەدایەوە بە فەقیّی پیّچالّ، مەکووک دەهاتەوە ئەم دیو، دەی دەی تا چەند جار وای لیّ کردن تا ماندوو بوون فەقیّ ڕقیان هەلّگرت. شەوی پاشی هەرچەند شەوی موتالاّو دەرسیش بوو، ئەمما هەر بۆ حەق سەندن ناردیان بەدوای سلیّمان ئاغا، بە دەستەیەوە هاتن، گۆرەوی بازی دامەزرایەوە لەسەر دلّخواز، خودای من و تۆ کردی فەقیّ بردییانەوە، وتیان: بابە چیتان دەویّ؟ ترپە سپیان لە دەشتایە، مزگەوت لە ناوەڕاستی دیّیە، لەسەربان قسەیەک بکە بە قایم، هەموو دیّکە گوێیان لیّیە. فەقیّ حوکمیان کرد لە ئاغا دەبیّ بچیّتە سەربانی مزگەوت، بەدەنگی بەرز بانگ کەیت سیّ جار: کوڕە هۆ ئاوایی ترپە سپیان! ئیمشەو کەس کەر نەگیّت، نۆرە کەرگانی سلیّماناغایە، وتی کوڕە ئامان، دەخیل دەستم دامیّننتان، ئابڕووم ئەچیّت. ڕجاتان لیّ دەکەم هەرچەن دەلّیّن شەکر و چا دەیدەم، ئەم پەندەم پیّ مەدەن، کەلّکی نەبوو، وتیان وەللّا غەیری ئەوە بەهیچ ڕازی نابین. ئەبیّت بیشقڕیّنی. ئەگینا حیسابی ناکەین، چارە چییە.

سلێمان ئاغایان بردە سەربانی مزگەوت. لەگەڵ ئەوەڵ جار بانگی کرد: هۆ ئاوایی تریەسپیان! هەرچی لەماڵان بوو هەمووی هاتە دەرەوە، حیرەت و تەعەجەجوب گرتی. سێ جار بانگی کرد ئیمشەو کەس کەر نەگێت، نۆرە کەرگانی سلێمان ئاغایە. هەر دەمێ نادەمێ سخورمەیان لێ دەدا: دەنگ هەڵبڕە! تا سێ جارەکەی تەواو کرد. لەناو دێدا بوو بەهەرا. کە هاتینە خوارەوە عەرەقی هەڵنەڕشت و سپی هەڵگەڕابوو. بۆ سبەی لە هەموو جێ لە هەموو ماڵ باس باسی ماجەرای ئەو شەوە بوو[٥].

## قوشتەپەی گچکە

ناوی گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە، ئاقاری لەگەڵ شارۆچکەی قوشتەپە، برایملەک، گردمەلا، قوشتەپەی گەورە، قولتەپە، سێبیران لەسەر یەکە. بە موڵک هی بنەماڵەی عەلی مەحموودی کاکە خانی بووە، ٣-٤ ماڵێک دەبوون، لە عەشیرەتی (کۆلە)ن، هەنووکەش زەوییەک هەیە لەوێ پێی دەڵێن زەوی کاکە خانی. بەگوێرەی سەرژمێری گشتی دانیشتوانی ساڵی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە ١٨ کەس بووە.

## تیماری گەورە

دوو گوند لە دەشتی هەولێرێ بەناوی (تیمار) هەیە. نزیکەی بەدووری سێ کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتوون، ئاقاریان لەسەر یەکە، سەر بەناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرن. یەکێکیان (تیماری گەورە)ی پێدەڵێن، کاتی خۆی بە موڵک هی بنەماڵەی (سەیید ئەحمەد نەقیب)ی هەولێری بوو، ئەوی دیکەیان (تیماری گچکە)یە بە موڵک هی بنەماڵەی حەیدەرییەکانە. تیماری گەورە گوندێکی زۆر کۆنە لە زەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە، لە سییەکاندا نزیکەی (١٥٠) ماڵێک دەبوون، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی قەتەوی، قۆیەقران، گردە ڕەشە. لەسەریەکە. لە سییەکاندا خوالێخۆشبوو سەعیدئاغای سەید عومەر ئاغای سەید ئەحمەدی نەقیبی هەولێری لەوێ دادەنیشت، دەڵێن کاتی خۆی ئەو بنەماڵەیە باپیرە گەورەیان (سەیید ئەحمەد) لەوڵاتی حیجازەوە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی تەریقەتی (روفاعی) کەوتوونەتە شاری هەولێر، دانیشتوانی شار و حکومەتی عوسمانی ڕێزێکی زۆریان لێناون و پاش ماوەیەک دەوڵەمەند بوون و بوونەتە خاوەن گوند و دیوەخان، دەوڵەتی عوسمانی ئەو گوند و موڵکانەی لە دەوروبەری شاری هەولێری پێ بەخشیون و لەسەری تاپۆ کردوون، ڕوتبەی (نەقیب)ی بە (سەید ئەحمەد) بەخشیوە و نزیکەی ٢٠ گوندیان لە دەوروبەری شار هەبووە، لەوانە:

(قەتەوی، تیماری گەورە، مزاحمە، مامزاوە، عەلیاوا، شێراوا، قووچە بلباس، تووڕەق، سوێری، قۆیەقران، برایمە لەک. لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ ١٨٩١-١٨٩٢ز واهاتووە:

قائیمقامی قەزای هەولێر (عەبدوڵلا پاشایە) جێگرەکەی (سەید ئەحمەد)ی نەقیبە. ئەو (عەبدوڵلا پاشا)یە کە ناسراو بووە بە عەبدوڵلا سەردار کوڕی ڕەسول پاشای برای محەمەد پاشای گەورەی رواندز پاشای میرنشینی سۆران بووە. هەر لەو بنەماڵەیەی (سەید ئەحمەد)دا پیاوی وەکو سەید عەباساغا و سەید عەبدوڵلای کوڕی کە لەزەمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا پلەی پاشایەتی پێدراوە و بە سەیید عەبدوڵلا پاشا ناسراوە، لە زەمانی عوسمانییەکاندا دوو جاران بە سەرۆکی شارەوانی هەولێر هەڵبژێردراوە، یەکەمیان لە ساڵی ١٩٠٤-١٩٠٧ز بووە. دووەم جار لە ساڵی (١٩١٣-١٩١٨ز)دا بووە. پاش رووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٨ز ئینگلیزەکان وڵاتی عێراق و کوردستانیان داگیر کرد و گەیشتنە هەولێر، کابتن های بووە فەرمانڕەوای سیاسی شاری هەولێر، سەید عەبدوڵلا پاشا پاش ماوەیەک هەستا هەردوو گوندی (تووڕەق -سوێری) فرۆشتە بنەماڵەی حاجی قادری دەباغی هەولێری، دەیگوت: (پیاو لەگەڵ کێ قسان بکات پیاو نەمایە) هەستا هەولێری بەجێهێشت و لێیدا ڕۆیشت چووە تورکیا، لەوێ کە دەیبینی قەدر و ڕووەتی هەولێری نییە، بە پڕە پڕ دەگەڕێتەوە هەولێرێ و گەلێک هەوڵی دا و داوای کرد کە ئەو دوو گوندە وەرگرێتەوە و بیدەنەوە، بەڵام سەری نەگرت و گەلێک پەشیمان بووەوە و دادی نەدا. یەکێکی دیکەیان لە گەورە پیاوانی ئەو بنەماڵەیە سەید مەردانئاغا بووە، لەگەڵ دانیشتوانی شار و دەوروبەرەکەیدا تێکەڵاوییان لەڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە هەبووە: لەوانە، خوشکەکی

مەرداناغای لەلای خوالێخۆشبوو حەسەن شێتەی عەوێنە بووە کە خوالێخۆشبوو (کاک فاروق)ی کوڕی لەو ژنەیە. پیاوێکی دیکەیان سەعیداغای سەید عومەراغای سەید ئەحمەدی نەقیبی هەولێرییە. ئەم پیاوە زاوای شاعیر و نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕی کورد خوالێخۆشبوو (یونس رەئووف دڵدار ١٩١٨-١٩٤٨ز) بووە، ئەو سەعیداغایە لە سییەکاندا لە گوندی تیماری گەورە دادەنیشت، دڵداری رەحمەتی گەلێک جاران سەردانی گوندی تیماری کردووە، دۆستایەتی لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مەلا هەمزە)ی موختاری دێیەکە زۆر خۆش بووە، ئەو مەلا هەمزەیەش دەکاتە باوکی مامۆستای بەڕێز (حەیدەر هەمزە)ی رەحمەتی.

(دڵدار)ی رەحمەتی زۆر شتی لە موزەکەراتەکەیدا لەبارەی گوندی (تیمار) و خووڕەوشت و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری ئەوکاتی کرمانجەتی دەشتی دزەییایەتی و جۆری ژیانیان و شتی دیکەی بۆ باس کردووین، کاتێ کە لە پایزی ساڵی ١٩٣٦ز بۆ ماوەی مانگێک لە گوندی تیمار رایبواردووە. من لێرەدا نامەوێت ئەو نووسینە دووبارە بنووسمەوە، تەنیا ئەو رووداوە خۆشە باس دەکەم کە کاتی خۆی دڵداری نەمر بەچاوی خۆی دیتیتی و لە یادگارەکەیدا بۆی تۆمار کردووین. دڵدار نووسیویەتی:

(رۆژێکیان کابرایەکی هەولێری کە ئاسنگەر بوو، بەهۆی ئەوەی بەقەرز گاسن و ماسنی بۆ فەلاحەکان دروست کردبوو و دەمەزەنی کردبۆوە، بۆ ئەوەی قەرزەکانی بەدەغڵ کۆبکاتەوە رووی کردبووە تیمار، تەبیعی هەموو لایەک زۆر حورمەتی وەستایان گرت، وەستا پیاوێکی زەردەڵەی دەم قووچی را لەخۆ بوو. ئەمەی دەزانی کە ئاغای ئەم گوندە سەعیدە و هەولێرییە و خۆشی هەولێرییە، ئەم حاڵە غرووڕێکی بێ پەروای پێ بەخشیبوو، لەمیانی قسەدا پێیان وت: وەستا خەتاب هەر پیاوە لە شوێنی خۆیدا چاوکراوەیە. وەستا (خەتاب)یش نەیهێناو نەیبرد وتی: وەڵڵا کرمانج قەت عاقڵ نابنەوە، هەر کەرن. ئەم وتەیە منی تاساند مەجلیس قسمێکی وسکت و قسمێکیش بە عەسەبییەوە پێ دەکەنین، مەلا هەمزەم هاتە پاڵ وتی: ئەگەر سەعید ئاغا دەنگ نەکا، من ئەمشەو بەزمێکی وا بە وەستا خەتاب دەکەم کە زۆری پێ پێبکەنن، جوابم دایەوە کە بەزمەکە بکات و مەسئوولییەت لە ملە من بێ، مەلا هەمزە برایەکی هەبوو ناوی حەسەن بوو پۆلیس بوو بە سیلە هاتبۆوە ئەلبیسەی پۆلیسی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوە. برایەکەی ئەلبیسەی پۆلیسی لەبەر کرد و سواری ماینێکیان کرد لەسەر بستەکەی دیار ماڵانەوە تفەنگێکی تەقاند بەتاو رووی کردە ئاوایی، وەخت شەو بوو مانگەشەوێک وەک رۆژ وابوو، ماڵی سەعید ساواریان دەکوتایەوە، ئاوایی بەجارێ بە ژن و پیاوەوە لە ساواری ماڵی ئاغا وەرهاتبوون، کە حەسەن بەسواری لینگی دایە سەر ئاوایی کەم کەس حەسەنیان ناسییەوە، بەڵام خێرا تێیانگەیەندرا کە دەنگ نەکەن. حەسەن بەعارەبی وتی: وەستا خەتابی ئاسنگەری هەولێری لێرەیە؟ ئێمەش وتمان بۆ؟ برایەکی ماڵی دزیاری لا ئاشکرا بووە، لەسەر قسەی برایەکەی زۆرترینی ئەشیا لای وەستا خەتابە کە هیناوێتی لە دەشت بیانفرۆشی، ئێمە مەفرەزەین لە بەیانییەوە بەهیلاک چووین، ئەم دێهاتەمان نەهێشت ئێستا لە (عەزە)، وتیان کە ئەمڕۆ هاتووتە(تیمار) باش چاوەشە، ئەفەندی وا لەسەر رێگا راوەستاوە ئینتیزار دەکا. دەبێ ئێستا تەسلیمم بکەن... ئەحمەد چوو جڵەوی ماینەکەی گرت وتی: فەرموو دابەزە چایێک بخۆرەوە، پۆلیس قۆنداغە تفەنگێکی لێدا، وەستا (خەتاب)یش خۆی لەپشت دوو زەلام ئاخنیبوو، بە کوردییەکی شکستی هەولێریانی دەیوت (جوو بووم لەسەر دەستتان موسڵمان بووم، تەسلیمی ئەم کافرەم نەکەن، هەمن لەرێگا دەمکوژێتەوە). جوابی پۆلیسمان دایەوە کە وەستا خەتاب نەهاتۆتە تیمار، لەم ئانەش خەتابیان بەدوو سێ کەس برد چارۆگێکی ئافرەتانیان پێدادا لەگەڵ ئافرەتەکان هاویشتییانە بەر ساوار کوتانەوە، بەم چەشنە پۆلیسەکە دوو سێ جاریتر هاتەوە هەرجارە بەجۆرێک لە مزگەوت یان لە سەربانەکەی جۆرێکی لە تەویلە ئیتر بەم چەشنە نەیانهێشت تا بەیانی وەستا خەتاب لەترسی پۆلیس بنوێ، لەم مەیانە خۆی بە قوربانی هەموو شتێکی کرمانج دەکرد، بەیانی زوو لەخەو هەڵسا بەرەو هەولێر گەڕایەوە. ئێمەش مەحمودی پیاوی سەعیدمان لەگەڵ نارد و کاغەزێکم بۆ کاکە سەعدی برام نووسی کەوا نیشانی وەستا خەتاب بدات کە پۆلیس بە غەڵەتی ملی ئەویان گرتووە، لەو سەر کە مەحمود گەڕایەوە، وەستا خەتاب گلۆزێک جغارەی غازی بۆ مەلا هەمزە و ئەو کەسانە ناردبوو کە رزگاریان

کردبوو وتبووشی سەلام لە هەموو خزمەکان بکە پێیان بڵێ مەرەق نەکەن (الحمد لله) مەسئەلەکە درۆ بوو، هەر بەمەش ئیکتیفای نەکردبوو، بەڵکو بۆ شەو دەستەیێک مۆمیشی لە قەبری (شێخەڵلا)ی سووتاندبوو، پاش سێ ساڵ زانیبوویەوە کە ئەمە موئامەرە بوو، زۆر تووڕەو سوێندیشی خواردبوو کە ئەمەیان لەسەر ناچێ! ئەم حادیسە بەسیتە شتێکمان نیشان دەدا کە دەشتەکی (مەبەستی دڵدار کرمانجەتی ناوچەی دزەییایەتییە)، ئەگەر ترسیان نەبێ و (توجیە) بکرێن، هەردەم پارێزەری ماف و کەرامەتی خۆیانن(٤).

## تیماری گچکە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێرێ، سەر بەناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، بە سێ (٣)کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە. ئاقاری لەگەڵ تیماری گەورە (قەتەوی، گردەڕەشە فەندی، قوپەقران لەسەر یەکە. بەموڵک هی بنەماڵەی حەیدەرییەکانی هەولێری بووە. ئاقارەکەی زۆر فراوان نییە، بچووکە، چەند بەر جۆتێک دەبێت، کاتی خۆی گوندەکە ئاوەدان بووە پاشان چۆڵ بووە و بوویتە کاولگە، لە ساڵانی سییەکان چەند ماڵێک لەگوندی (باقرتە و کەسنەزان)ی دەشتی مرکییە لەهۆزی (ئۆمەربل) هاتوونەتە ئێرە و لەو شوێنەی کە کاولە گوندی (تیمار) بووە، ئاوەدانیان کردۆتەوە، پاشان گوندەکە بوودتە وەرەسەی بنەماڵەی حەیدەرییەکان لەنێوان خۆیاندا بەشیان کردووە، جووتیارەکانیش بەناچاری گوندەکەیان بەجێهێشتووە و کەسی تێدا نەماوە. بەگوێرەی سەرژمێری گشتی دانیشتوانی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی تیماری گەورە و گچکە (١٢٩) کەس بووە.

## سێبیران

سێبیران ناوی گوندێک بووە لە دەشتی مرکییەی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، ئەو گوندە لە نزیک گوندی (قورشاغلو) بووە، گوندێکی زۆر کۆن بوو، لە زەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە، بەموڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغا)ی قورشاغلووبی بووە، پاشان ئەو گوندە نەماوە و وێران بووە. پاش ئەوەی بنەماڵەی بایزی هاتوونەتە ئەوناوە ئەو ئاقارە کەوتووەتە بندەستی (مەلای حەویزی) و لە ئاقاری ئەو گوندە لە بناری (زوورگەزراو)یدا (کەسنەزان)یان ئاوەدان کردۆتەوە، ئەوکاتی زوورگ و بنارە ئاوی زۆر بووە، پاشان لەبەر بێ بارانی و کەمبوونی ئاو خەڵکەکەی ناچارمان بناری زوورگەکە جێبهێڵن و باریانکردووە و هاتوونەتە دەو (کەندی باقرتەی) لەوێ دامەزراون و گوندەکە هەر بەناوی (کەسنەزان) ئاوەدانکراوەتەوە، باقرتە و کەسنەزان تەنیا کەندەکەیان نێوان بووە (کەندی باقرتە)یان پێدەگوت، ئەو کەندەش ئاوەکەی لە (شیوەسۆر)ی دەکردەوە، (ئاغەی کاخدری مەلای) لەوێ دادەنیشت، پیاوێکی پیاوانە و چاک و لێوەشاوە و مەند بووە، خەڵکی دەڤەرەکە بەگشتی خۆشیان دەویست و رێزیان دەگرت، پاشان (حەسەن و سلێمان کە کورانی سمایلی کاخدری) بوون لە خزمەکانیان جودابوونەوە. (کەسنەزان)یان بەجێهێشت چوون لە ئاقاری گوندەکە (تۆبزاوە)یان ئاوەدان کردەوە، ٥-٦ ماڵێک دەبوون، بەگوێرەی سەرژمێری گشتی لەساڵی ١٩٥٧ز ئەنجامدراوە ژمارەی دانیشتوانی گوندی (کەسنەزان-قوشتەپە) ٤٨ کەس بووە، پاشان ماڵی (ئاغای کاخدری مەلای) ئەوانیش ئەوێیان بەجێهێشت و چوون هەر لەو ئاقارەی گوندی (سێبیران)یان ئاوەدان کردەوە. کەسنەزان چۆڵ بوو، پاش ساڵی ١٩٥٨ز (تۆبزاوە) کەسی تێدا نەما.

(٢) گوند لە دەشتی مرکییەی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بەو ناوە هەیە: یەکێکیان (سێبیران)ی ئاغەی کاخدری مەلایە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی منارا، قورشاغلو، باقرتە، لایەکیشی لەگەڵ زوورگەزراو لەسەر یەکە. ئەویدیکەیان (سێبیران عەدۆ)یە کە ئاقارەکەی لەگەڵ ناحیەی قوشتەپەدا لەسەر یەکە.

ناوی (سێبیران) ناوێکی لێکدراوە کوردییە: لەوشەی (سێ+بیر+ان) واتا (ئاوەڵناو+ ناو+ ئامرازی کۆکردنەوەی ان) پێکهاتووە، بۆیەش بەو ناوە ناونراوە، گوایە کاتی خۆی (٣) بیری ئاوی لێ بووە، هەروەها لە دەشتی بەرانەتیش (٢) دوو گوند بە هەمان ناو هەیە سێبیرانی گەورە و گچکە هەردووکیان ئاقاریان لەسەر یەکە و سەر بەناحیەی عەنکاوەن، هەروەها گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لەناوچەی کەندێناوەدا هەیە سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)یە.

**یەدی قزلەر (ئێدی قزلەر)**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی ملکیەی، سەر بەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە خوارووی رۆژاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە نیزیکەی (٣٥)کم لێیەوە دوورە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی سورێژە، دۆغان، گردعازەبان، ئاودەلۆک، جدیدە، منارا، لەسەریەکە. (یەدی قزلەر) وشەیەکی لێکدراوی تورکییە، لەدوو ناو یا وشە پێکهاتووە لەگەڵ پاشگرێک (یەدی+قز+لەر) واتا (ناو+ناو+ پاشگری لەر). (یەدی) بەمانای حەوت دێت، (قز) بەمانای کچ دێت، (لەر) لەزمانی تورکیدا پاشگرە دەلکێت بە دوای ناوەوە دەیکاتە کۆ، کەواتە (قزلەر) بەمانای کچان دێت. بە کوردییەکەی بەسەریەکەوە بەمانای (حەوت کچان) دێت.

گوندێکە دەکەوێتە بەر رێگای هەولێر- مەخموور، بەدەستە راست چەند کیلۆمەترێک لە جادەکەوە دوورە. خەڵکەکە بە هەڵە (ئێدی قزدەر)ی پێدەڵێن، گوندێکی کۆنە لە زەمانی عوسمانییەکاندا چەند سەدەیەک لەمەوبەر لەلایەن چەند بنەماڵەیەک لە هۆزی (مەرزان) ئاوەدان کراوەتەوە، ئەو هۆزەش کاتی خۆی لە (دۆڵی شاور) هاتوون و کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ و بۆ یەکەمجار لەو گوندە دامەزراون پاشان بەمەرداری هەندێکیان کەوتوونەتە دەشتی قەراجی لەبناری چیای قەرەچووغی گوندی (قەراتەسۆران)یان ئاوەدان کردۆتەوە بووەتە موڵکی خۆیان برا گەورەکەیان (مەلا مستەفا) بووە، هەندێکیشیان کەوتوونەتە دەو زێی ناوچەی گوێر و گوندی (زمارەی مەرزان)یان ئاوەدان کردۆتەوە، برا گەورەیان (حاجی قورشید) بووە. دەڵێن وشەی (مەرزان) لە (میرزان)ەوە هاتووە. ئەو گوندە بە موڵک هی بنەماڵەی (ئەسعەدی)یەکانی هەولێری بووە، ئەو بنەماڵەیەش دەگەڕێنەوە سەر وجاغی پیاوێک بەناوی (ئەسعەد ئەفەندی کوڕی عەبدی فەندی)، ئەم بنەماڵەیە لە کۆنەوە نیشتەجێی شاری هەولێرن، موڵک و زەوی و زارێکی زۆریان لە دەشتی هەولێردا هەیە، بەتایبەتی لە ناوچەی دزەییایەتی و ناوچەی بەرانەتیدا هەبووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە (تەقی دیناغا) بەڕێوەبەری ناحیەی (پردێ) ئاڵتون کۆپری بووە، لە زەمانی عوسمانییەکاندا لەناوچەی دزەییایەتیدا ئەم گوندانەی خوارەوەیان هەبووە: هەمزەکۆر- ئیلینجاغ- یەدی قزلەر، عەزە، دۆڵەبەکرە. لەناوچەی بەرانەتیشدا ئەم گوندانەیان هەبووە مەموندان، شاخۆڵان، قەڵانچوغان. ئەم بنەماڵەیە لە کۆنەوە پیاوی زانا و دانایان لێ هەڵکەوتووە وەکو تەقێ دیناغا-حاجی ئەحمەداغا، یاسیناغا. هەر لەکۆنەوە ئەو گوندە مەدرەسەی ئایینی هەبووە، بنەماڵەی مامۆستا (مەلا محەمەد شەریف رەنگەرەژان)ی مودەریسی قوتابخانەکە بوون، ئەو بنەماڵەیە بەرەسەن خەڵکی گوندی (رەنگەرەژان)ی ناوچەی سەقزی پارێزگای سنە (سەنەندەج)ن لە کوردستانی ئەودیودا بە فەقێیایەتی کەوتوونەتە شاری هەولێر و لەمزگەوتی قەڵا لای مەلا عومەر ئەفەندی باوکی (مەلافەندی) خوێندوویەتی و ئیجازەی زانستی لەلای ئەو وەرگرتووە، سەرەتا لەگوندی (عەزە)ی داناوە، لە هەندێ لە گوندەکانی دەشتی هەولێردا مەلایەتی کردووە وەکو (تەلەرخێم) پاشان کەتیتە گوندی (یەدی قزلەر) هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و لەوێش نێژراوە. هەندێک ناوی جوگرافیایی ئاقاری گوندی (یەدی قزلەر)یش ئەمانەن: (گردی شێمحەمەد)ی ناوی گردێکە لە رۆژاوای گوندی هەڵکەوتووە، لەگردی سورێژی گەورەتر و پانترە، توورەگەرێژە، چاکێکی لێیە، ئەو گردە بەناوی ئەو پیاو چاکە کراوە. لەنزیک ئەوێ بەچەند کیلۆمەترێک پارچە زەوییەک هەیە بەناوی (بەراز کوژرای)، لەنزیک ئەو گردەشەوە شوێنێکی دیکە هەیە پێیدەڵێن (سەلکە گاور).

(دووڕووگە) ناوی ئاقارێکی گوندەکەیە کەوتۆتە نێوان ئاقاری گوندەکانی گردعازەبان و ئاودەلۆک و جدیدە. جیزەلکان، گیزەلک ناوی رووەکێکە لەشێوەی خرنووکدایە، بۆنێکی ناخۆشی لێ دێت بەرەکەی وەکو تەماتە وایە، بەڵام زۆر بچووکە، ئەو ئاقارە گیزەلکی زۆر لێ شین دەبێت بۆیە بەو ناوە ناونراوە.

پارانیان: ناوی پارچە زەوییەکی گوندییە لەسەر ئاقاری گوندی (منارا)ی هەڵکەوتووە.

**تێبینی:** زۆربەی ئەو زانیارییەم لەبارەی ئەو گوندە لە بەڕێز مامۆستا (فائق عەلی حوسێن) وەرگرتووە ئەویش لە باوک و باپیرانی گوێ بیست بووە.

## کەندی (شیوەسۆر)

ئەو کەندە لەنێوان ئاقاری گوندی (ترپەسپیان) و (پیرداود)یدا دێتە خوارێ و دێتە ناو ئاقاری گوندی (یەدی قزلەر)ی بەلای باشووری رۆژهەڵاتییەوە تێدەپەڕێت، بەرەو ئاقاری گوندی (گرد عازەبان) دەڕوات. لەناو ئاقاری گوندی (یەدی قزلەر)یدا لە ئاخیر و نۆخری بواراندا کە ئاوەکەی هیشک دەبێت، چەند گۆمێک هەیە ئاوی تێدا دەمینێت وەکو (گۆمەخرە) نزیکەی سێ بەژن قووڵ دەبێت و گۆمەکەش شێوەکەی خڕاو خڕە، بۆیەش بەو ناوە ناونراوە، گۆمێکی دیکەش هەیە پێی دەڵێن (گۆمی گامردی)، گۆمی قورینگان ئەو ناوە جێگایەکی لاچەپ و لاتەریک بوو هاتوچۆی کەم بە سەرەوە بوو، قولینگی زۆر بوو بۆیەش گۆمی قورینگەکانیان پێدەگوت، تەنانەت قوتابخانەی گوندی (یەدی قزلەر)یش بەناوی (قوتابخانەی شیوەسۆری سەرەتایی) ناونرابوو.

ئەو کەندە لە ئاقاری گوندی (گرد عازەبان) دەڕواتە خوارێ بەرەو ئاقاری (عەلیاوەی شێخان)، لەوێوە بەرەو ئاقاری گوندی (سیاو)ی دەڕواتە خوارێ و لەخوار گوندی (سیاو)ی لەنێزیک گوندی (شێخ شەروان)ی لە (کۆدەرە)ی دەکاتەوە.

## سووریژە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییە، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی ترپەسپییان، پیرداود، دووسەرە فەتاح، سۆربەش کاکەڵلا، دۆغان، یەدی قزلەر لەسەر یەکە، دەگێڕنەوە کاتی خۆی ئەو گوندە هی (کاکەیی)یەکان بووە لەو ناوە دەریان پەڕاندوون و دانیشتوانەکەی چوونەتە ناو خزمەکانیان لە دەوروبەری (سفەییە) گیرساونەتەوە، هەندێ لە موڵکەکانیان بنەماڵەی حاجی ئەمینی لێیان کڕیون، ئەویدیکەیان جێهێشتووە.

چەندین شوێنی جوگرافیایی هەیە، یەکێک لەوانە (غەرابە میران)ە، کە گردێکی بچووکی تووردگە ڕێژە لەنێوان ئاقاری گوندی (یەدی قزلەر) و (سووریژە) هەڵکەوتووە، دەڵێن کاتی خۆی کاولە گوند بووە.

(گردی سووریژە) گردێکی گەورەیە ڕووبەرێکی فراوانی داگرتووە، بەڵام زۆر بڵند نییە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ۱۹۵۷ز (١٥٤) کەس بووە، تیرەی جۆراو جۆری تێدا بووە لەوانە مەرزان.

## قەرەچناغە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێر، سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە ئاقاری لەگەڵ ئاقاری ئەو گوندانەی خوارەوە، گردەڕەشە ئەسعەد، باغەمرە فەندی، مورتکەی گەورە، مورتکەی گچکە، قووچە بڵباس لەسەر یەکە لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە بە (١٥) کیلۆمەتر لێیەوەی دوورە. ناوی (قەرەچناغە) لە بنچینەدا ناوێکی لێکدراوی تورکییە لە وشەی (قەرەچراغ)ەوە هاتووە، وشەی (قەرە) بە مانای (ڕەش) دێت. وشەی (چراغ) بەمانای (چرا) دێت، بەسەر یەکەوە بە کوردییەکەی بە مانای (چرا ڕەشەکە) دێت، چونکە کاتی خۆی لە کوردەواریدا هەر (چرا ڕەشەکە) هەبووە، شەوانە بەکاریان دەهێنا، جا ناوەکە لە (ناو+ناو + پاشگری-ە-)ی کوردی پێک هاتووە. (قەرە+چراغ+ە) (قەرەچراغ) بووە بە قەرەچناغە. کاتی خۆی زۆربەی تورکەکانی دەشتی هەولێر ئەو نووسەر و باجگر و باج ئەستێنە تورکانە ناویان لێناون، کاتێک کە دەچوونە گوندەکان سەرانە و مەڕانە وەربگرن بەو ناوە تورکییانەیان تۆمار دەکردن. ئەو گوندەش بە موڵک هی بنەماڵەی کێخوا لەتیفی هەولێری بووە. دایکی هاشم چەلەبی خوشکی ئەو کێخوا لەتیفە بووە. ژمارەی دانیشتوانی (١٤٤) کەس بووە بە گوێرەی سەرژمێری ساڵی ۱۹۵۷ز، بە زۆری دانیشتوانی لە عەشیرەتی کەلهوڕن.

## پرینگە (پلینگە)

گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییەی، سەر بە ناحیەی قوشتەپە، بە (٢٢)کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە گۆسکە، مێرخوزار، ترپەسپیان، دوو گردکان، سێبیران، قوشتەپە لەسەر یەکە. بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغا) بووە، پاشان کەوتۆتە بن دەستی بنەماڵەی پاشای، ئەحمەد ئاغا حاجی نادری برای ڕەوانەی ئەوێ دەکا، بەشەکەی دیکەش حەساری پێ دەڵێن دەبێتە هی بنەماڵەی (عەلیاغای

دۆغرەمەچی)، دوو حەساری لێ بووە، ئەو (عەلیاغا)یە پاشان بە (عەلی پاشا)ی دۆغرەمەچی ناسرا. پلنگە گوندێکی کۆنە، جێگایەکی خۆش و دڵگیری هەیە، کارێزێکی لە سەرەوەی ماڵان هەیە ئاوێکی زۆری لێ دێتە دەرەوە، لە خوار گوندەکە شینایییەکی زۆری لەبەر دەکرا، بەڵام هەنووکە ئەو (کارێزە) ئاوەکەی نەماوە و هیشکی کردووە، کەسی واش نییە ئەو کارێزانە دەربداتەوە، زۆربەی دانیشتوانی ئەو گوندەش لە هۆزی (ئۆمەر مزیار)ن، ١٠- ١٢ ماڵێک دەبن کاتی خۆی لە گوندی قشاغلوو کەوتوونەتە ئێرە، بەڵام حەسار بنەماڵەی کێخوا سمایلی لێیە کاتی خۆی ئەو پیاوە لە دەشتی کەندێناوەوە کەوتۆتە ئێرە و (شێروان)ین، ئەم کێخوا (سمایلە)ش، دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو کاک (عەلی خەبات). ژمارەی دانیشتوانی (٧٧) کەس بووە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز.

## گۆسکە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییەی دەشتی هەولێر، لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، (٢٢)کم لێیەوەی دوورە، لە باکووری رۆژئاوای قوشتەپەدایە، ئاقاریان لەسەر یەکە هاوسنووری ئەو گوندانەی خوارەوەیە قووچە بلباس، مێرخوزار، پرینگە، برایمەلەک، شارۆچکەی قوشتەپە، گۆسکە کە گوندێکی بچووکە و کە لەکاتی خۆی لە گوندی پرینگە جودا بۆتەوە، یەک دوو ماڵ لەوێ نیشتەجێ دەبن و هەڵدەستن بە کاروباری (گلکار)ی و دروستکردنی گۆسکە و جەرەو شەربە و کوویە بە خەڵکی دەڤەرەکەی دەفرۆشن، جا لەو ساوە ناونراوە (گۆسکە)، جۆگە ئاوێکی پێیدا دەروات پێی دەڵێن جۆگەی گۆسکە ئەوکاتەش برنج و شینایی لەبەر دەکرا ئاشێکی ئاویشی لێ بوو، (ئاشی گۆسکە)یان پێ دەگوت هی ماڵی حەسەنی شێتەی بووە، ئەو گوندە بووە هی بنەماڵەی فارس ئاغا. حەسەنی شێتەی عەوێنەی رەشیدی برازای لەوێ دانابوو، لە پاشان بە رەشید گۆسکە ناسرا. ئەم گوندە (٢٥) ماڵێک دەبوون، دانیشتوانەکەی لەتیرەی جۆراو جۆر پێک هاتبوون بەزۆری (مەنتک)ن کاتی خۆی لەناو مەنتکان کەوتوونەتە ئەوێ، هەروەها لەک و خۆشناوی تێدایە، گۆڕستانێکی لێیە گۆڕی پیاو چاکێکی تێدایە بەناوی (بابەشێتە)ی کەوتۆتە ئاقاری گوندەکە کە لەسەر کەندەکەدایە، گومبەزێکی لەسەر کراوە، خەڵک بۆ زۆر مەبەست سەردان و زیارەتی دەکەن، بەڵام لەبارەی ئەو پیاو چاکە هیچ زانیارییەکمان بەدەستەوە نییە، لە دەوکەندەکە و گۆڕستانەکەدا رووەکی کفری یەکجار زۆرە، شوێنەکە لاچەپە و کەروێشکی زۆرە، بەپێی سەرژمێری گشتی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی (٩٩) کەس بووە.

## گرد عازەبان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێر، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. گوندێکی کۆنە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دۆغان، عەلیاوەی شێخان، ئاودەلۆک، یەدی قزلەر لەسەریەکە، ئاقاری ئەو گوندە تەختایی و دەشتێکی پان و پۆڕ و راستانە، کاتی خۆی بە مولک هی چەند بنەماڵەیەک بووە، پاشان کەوتۆتە بن دەستی (حەمۆک) کە دەکاتە باوکی عەلی بەگی دەستی بەسەردا گرتووە، ئەم پیاوەش یەکێک بووە لە بنەماڵەی (فارس ئاغا)، ئەو گوندە نزیکەی (٢٠٠) ماڵێک دەبوون، تیرە و بنەماڵەی جۆراوجۆری تێدا نیشتەجێ ببوون. لەوانە بنەماڵەی حاجی قادری ٩-١٠ ماڵێک دەبوون، خۆشناو بوون. کاتی خۆی لە (زێوە و هەرتەل) لەناوچەی خۆشناوەتییەوە کەوتبوونە ئەوێ و (٣) پشت لەمەوبەر لێرەنە. بنەماڵەی (قادر وەسمان)ی ئەمانەش ٩- ١٠ ماڵێک دەبوون لە هۆزی لەک بوون، ئۆرمزیار ئەوانیش چەند ماڵێک دەبوون. بنەماڵەی حوسێن گوێرەشی ١٢- ١٣ ماڵێک بوون لەهۆزی شێخ بزێنی بوون، کاتی خۆی لە دەوزێی بچووک لە ناوچەی شێخ بزێنی کەوتوونەتە ئێرە، هەروەها چەند ماڵێکیش لە هۆزی شوانی تێدابوو. بنەماڵەی (سەیدەکان) بنەماڵەی سەید زەمان ئەو بنەماڵەیە لەدێر زەمانەوە لەو ناوە ژیاون، کاتی خۆی لەناوچەی (هەمەدان)ەوە کەوتوونەتە (شاری شنۆ) لە رۆژهەڵاتی کوردستان، لەنەوەی بابا عەلی هەمەدانین، پاشان کەوتوونەتە دەشتی هەولێر. ئەو بنەماڵەیە رۆڵێکی بەرچاو و مەزنیان لەنیشتمان پەروەری و کوردایەتیدا هەبووە، ژمارەیەکی زۆر لە رۆڵەکانیان بە کورد و کوردستان بەخشیوە، لەوانە مولازمی شەهید سەید سەمەدی گردعازەبانی بوو، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٦٥٩) کەس

بووە. ئەو گوندە گردێكی ئاسەواری تووردگە رێژی لێیە، گردی گردعازەبانی پێ دەڵێن گوندەكەش هەر بەو ناوە ناونراوە. (گرد عازەبان) ناوێكی لێكدراوی كوردییە لە (گردی+ عازەب+ ان) واتا لە (ناو+ ناو+ نیشانە كۆكردنەوەی ان) پێك هاتووە. لەوانەشە ناوەكە لە (هازەبان) هەزبان بووبێتە (عازەبان)، چونكە كاتی خۆی خێڵی هەزەبانی كوردی لەو ناوە و شاری هەولێردا ژیاون و فەرمانڕەوای شارەكە و ناوچەكەیان كردووە.

## سۆربەش كاكەڵلا

ناوی گوندێكە دەكەوێتە دەشتی مركییە، سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە ئاقاری لەگەڵ گوندەكانی سوورێژە - دووسەرە جەبار -سۆربەش حەوێز -دۆغان -دووسەرە فەتاح لە سەریەكە، كاتی خۆی بە موڵك هی سێ بنەماڵە بووە: بەشێكی هی بنەماڵەی كاكەڵلا بووە، كە لە هۆزی بلّباس بوون، بەشەكەی دیكە هی بنەماڵەی (مەمان)ەكان بووە، واتە بنەماڵەی (فەرهاد)ییەكانی دەشتی هەولێر، كە دەكاتە باپیرە گەورەی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای فەرهادی، بەشەكەی دیكەش هی بنەماڵەیەكی دیكە بووە لە پاشان حەسەنی كاكە خانی بە كەم شتێكی لەبن دەستی دەرێنان. لەم دواییەدا بە سۆربەشی هەمزەی ناسرا. ئەو زانیارییانەی سەرەدەم لە بەرێز مامۆستا عەلی بایزی كوڕی مەعروفی كوڕی محەمەدی كوڕی كاكەڵلا وەرگرتووە، كە لە نەوەی ئەو (كاكەڵلا)یەیە، ژمارەی دانیشتوانی (١٢٩) كەس بووە بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز.

## كلیسە

ناوی گوندێك بووە لە دەشتی شەمامك، هەندێ لە زانایان و شارەزایانی دەڤەرەكە، گوندەكانی كلیسە - دۆغان -ماستاوا -گردعازەبان و ئەو ناوە بە دەشتی مركییە لە قەڵەم دەدەن، هەندێكی دیكەیان بە شەمامكی دادەنێن، كەچی ئەو گوندانە سەر بە ناحیەی قوشتەپەن، نەك ناحیەی گوێر.

ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەكانی چیمەن - دۆغان تەندوورە -سۆربەش حەوێز -ماستاوا لە سەریەكە زەوی و زارێكی یەكجار باشی هەیە، كاتی خۆی لە خوار گوندی سۆربەشی حەوێزی (كارێز)ێك هەبووە، ئاوەكەی دەهاتەوە ناو ئاقاری كلیسە رەزو باغێكی یەكجار زۆری لەبەر ئاودەدرا، بەتایبەتی ترێ، ترێی كلیسە زۆر بەناوبانگ بووە، مام حاجی عەبدوڵلا وەسمان عەزیز لەدایكبووی گوندی گردعازەبان ١٩٣٠ ز بۆی گێڕامەوەو گوتی: تەمەنم (١٠) ساڵان دەبوو دێتەوە یادم، كاولە حەساری كلیسەی هەر مابوو، باپیرەم دەیگوت: ترێ و میوەی رەزو باغی كلیسەم خواردووە. ئەو گوندە زیاتر لە ١٧٠ ساڵێك دەبێت كاول بووە.

مام حاجی جەمیل سمایلی لەدایكبووی گوندی سۆربەش ١٩١٦ز ئەویش لە زمانی باوباپیرانییەوە بۆی گێڕامەوە گوتی: ئەو گوندە لە بنچینەدا هی كابرایەكی هەولێری بووە، دوو ژنی هەبووە، گەلێك جاران حوسێن ئاغای باوكی ئەحمەد پاشا و عومەر ئاغای باوكی حاجی پیرداوەی دەچوونە سەری و تەقەیان لێ دەكرد بۆ ئەوەی لەو ناوەی دەرپەڕێنن، بەڵام كابرا كابرایەكی رەشید و چاونەترس بوو، هیچیان لەگەڵ پێنەكرا، گەلەک جاران لە زمانی كابرایان دەگێڕایەوە كە گوتوویەتی: یان هەردوو ژنم مارە دەكەنەوە، یان ژنی هەردووكیان مارە دەكەمەوە. وا رێككەوت كابرای هەولێری بە مردنی خۆی مرد، هەردوو ژنەكەشی مێردیان كردەوە، یەكێكیان بە حوسێن ئاغای باوكی ئەحمەد ئاغا، كە لە پاشان بە ئەحمەد پاشا ناسرا لەو ژنە بوو، ئەویدیكەیان عومەر ئاغای باوكی حاجی پیرداوەی مێرخوزاری مارەی كردەوە. ئاقاری ئەو گوندە (٣٦٠٠) دۆنمە لە پاشان حەسەنی كاكەخانی كە دەكاتە باوكی (هەمزە پیرە)ی سۆربەشی لەگەڵ (عەلی بەگی حەمۆكی شێخ وەسمانی)، كە یەكێك بووە لە بنەماڵەی فارس ئاغا، ئەو گوندەیان بە نیوەیی كڕی، ئەمە لە پێش گرانی ساڵی ١٩١٧ز بوو، كلیسە ئێستاش شوێنەوارەكەی هەرماوە، خەرابەیەو گەلێ جار كەرپووچی چوارگۆشەیی و لاكێشەیی گەورە گەورەی لە كاتی جۆتكردن و زەوی هەڵكەندندا لێ بەدیار دەكەوێت، هەندێك لە خەڵكی دەڤەرەكە دەڵێن كاتی خۆی ئێرە (كلیسا) بووە، ئەمەش ئەگەر وابێ دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی (حەدیاب)، بۆیەش هەر بەو ناوە ماوەتەوە. گوایە كاتی خۆی كەنیسەی هەبووە.

## دووگردكان

دووگردكان ناوی گوندێكە دەكەوێتە دەشتی مركییە، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، نزیكەی (٣٠)كم لێیەوەی دوورە. ئاقاری ئەم گوندە لەگەڵ

ئاقاری گوندەکانی تڕپەسپیان -باقرتە -قورشاغلوو -دووکەڵە -قوڵتەپە -سێبیران عەدۆ -پڵنگە، لەسەر یەکە. کاتی خۆی بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای قورشاغلوویی) بووە، پاشان لەبەر گۆڕانی چەرخی زەمانەوە ڕووداو رووی داوەو کەوتۆتە دەستی بنەماڵەی بایزی، حەمەدەمین ئاغای برای براییمی بایزی لەوێ دادەنیشت.

ناوی (دووگردکان) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (دوو + گرد + کان) پێکهاتووە. لە راستیدا ئەو گوندە دووگردی نزمی لێیە، ئەو گوندە لەو شوێنە ئاوەدان کراوەتەوە، بۆیە خەڵک گوتوویانە ماڵەکانی (دووگردەکان) واتە ئەو ماڵانەی لە نزیک (دووگردەکان)ن، پاشان وشەی (دووگردەکان) بۆ سووکی لەسەر زاران بووە بە (دووگردکان). ئەم گوندە گوندێکی کۆنە و مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر، حەمەدەمینی حاجی بایزی لەگەڵ رەحمان ئاغای برای لەوێندەرێ دادەنیشت، حەمەدەمین ئاغا زاوای شێخ مارفی هەڵەجەی بووە، کچی وی خواستبوو، (٥) کوڕی هەبوو، کاک ئەحمەدی رەحمەتی کوڕە گەورەی بووە، کاک ئەحمەد پیاوێکی زانا و لێوەشاوە و لێهاتوو و کوردپەروەر بوو، زۆر حەزی لە چاکەو پیاوەتی دەکرد، یارمەتی هەژارو لێقەوماوانی دەدا، خزمەتکردنی لەلا لە هەموو شتێک پیرۆزتر بوو. کوڕەکانی دیکەی کاک موحسین و ئەنوەرو سەعدی و کاک عومەرە. دووگردکان لە کۆنەوە قوتابخانەی ئایینی هەبووە، حەمەدەمین ئاغا لە ساڵی ١٩٣٠ ز مامۆستا مەلا شێخ حوسێنی هێناوەتە ئەوێ، بۆ ماوەی (١٧) ساڵان لەوێ ماوەتەوە تا ساڵی ١٩٤٧ ز پاشان باری کردووە و هاتۆتەوە شاری هەولێر. پاش ویش مامۆستا مەلا ئەبوبەکری کۆیی لە گوندی (هێلەوە)وە هاتۆتە ئەوێ و تا ساڵی ١٩٥٨ ز لەوێ بووە، کە زانایەکی لێهاتوو بووە، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی ناوچەکەو دەڤەرەکانی دیکەی کوردستان لەسەر دەستی ئەو بڕوانامەی زانستییان وەرگرتووە و بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٦ز. قوتابخانەی میری لێ کراوەتەوە. (دووگردکان) لە دوو گەڕەک پێکهاتبوو، گەڕەکی ئەحمەد ئاغا و گەڕەکی رەحمان ئاغا. ئەو تیرەو هۆزانەی خوارەوەی تێدا نیشتەجێ بوون: ئۆرمزیار -پارانی (پالانی) کاتی خۆی لە دەشتی کۆیەوە کەوتوونەتە دەشتی دزەییان... مام زێندینی.

بە گوێرەی سەرژمێری گشتی دانیشتوانی ساڵی ١٩٥٧ز. بەم جۆرەی خوارەوە تۆمار کراوە، دووگردکانی عەبدولڕەحمان ژمارەی دانیشتوانی (١٤٢) کەسە، دووگردکانی ئەحمەد ئاغا (٤٧٣) کەسە.

هەروەها (٢) دوو گوندی دیکەش لە دەشتی قەراجی، بە هەمان ناو هەن، یەکێکیان دووگردکانی حاجی مستەفایە، ئەوی دیکەیان دووگردکان حاجی حوسێنە و هەردووکیان ئاقاریان لەسەر یەکە.

### گردمەلا

ناوی گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ناحیەی قوشتەپەی دەشتی پشتڕێی، بە ٢ کم لێیەوەی دوورە، ئاقاری لەگەڵ ناحیەکە و ئەو گوندانەی خوارەوە ' برایمە لەک -مورتکەی گچکە -مورتکەی گەورە -سەردەشت -پالانیان -کەردز -چێلەبەشە لەسەریەکە. گوندێکی کۆنە، لە رۆژئاوای گردمەلای ئێستاکەدا گردێکی بچووک هەیە. دەڵێن کاتی خۆی ئەوێ گوند بووە، کۆنە (گرد مەلا)ی پێ دەڵێن. (گردمەلا) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (گرد + مەلا) واتە (ناو + ناو) پێکهاتووە، بە واتای گردی مەلای هاتووە، هەروەها گردێکی بچووکی لێیە گردی (مەلا قاسم)ی پێ دەڵێن، گوندەکە کاتی خۆی بەناوی ئەو (مەلا)یە ناونراوە، گۆڕی مەلایەکەش لەسەر ئەو گردەیە. دەگێڕنەوە دەڵێن کاتی خۆی (قەرەنی ئاغا) باپیرە گەورەی بنەماڵەی ئاغاکانی دەڤەرەکە بۆ یەکەمجار بە خۆی و (٣) کوڕییەوە هاتوونەتە ئەو ناوە بە کۆچەری لەسەرەوەی کەونە (گردمەلا)ی خەرابەیەک هەبووە لەوێ دامەزراون، ئینجا پاشان هەندێکیان هاتوونەتە (قوشتەپە) و پاشان بە تێپەڕبوونی کات وسات و زەمانە لە دەڤەرەکەدا بڵاوبوونەتەوە و پەلوپۆیان هاوێشتووە، مەحمودی کاکە خانی وەختی خۆی لەوێ دادەنیشت، پیاوێکی ئازاو دیارو بەرچاو بووە لە دەشتی پشتڕێی، بەتایبەتی و لە دەڤەرەکەدا بە گشتی، لە ساڵی ١٩١٨ز. کۆچی دوایی کردووە و چوار کوڕی لە پاش بەجێماوە، عەلی - سابیر - تاهیر -شێخ محەمەد. لە هەموویان بەناوبانگتر (عەلی ئاغا) بووە، پیاوێکی ئازاو چاونەترس بوو، بەشداری لە شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر کردووە. لەگەڵ سابیری برایدا گەلێک جاران لە حکومەتی مەلەکی ئەشقیا دەبوو. لە شۆڕشی

بارزانی ساڵی ١٩٤٥ ویستی بەشداری بکات، بەڵام هەندێک لە خزمەکانی پەشیمانیان کردەوە. پاش ئەوەی حکومەتی مەلەکی بە یارمەتی ئینگلیز شۆڕشی بارزانی دامرکاندەوە (عەلی ئاغا) گەلێک لە بنەماڵەی بارزانییەکانی لە گوندەکەی خۆی حەواندەوە، یەکێک لەو ماڵانە (مام شێراغەی شێروانی) بوو، کە خەڵکی گوندی (بێرسیاو)ی ناوچەی شێروان مەزنی مێرگە سۆرێ بوو. هەنووکەش مام شێراغە لەژیاندا ماوە و تەمەنی لە (٩٠) ساڵی بەسەردەوەیە و لە کۆمەڵگای (هەریر) نیشتەجێیە. (ئەو کاتی لە شارۆچکەی هەریر مامۆستا بووم، گەلێک جاران سەردانیم دەکرد)، ئەو پیاوە مرۆیەکی خواناس و پیرۆز بوو.

عەلی مەحموودی کاکە خانی لە ساڵی ١٩٦٦ ز لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووەو لە گردی (گردمەلا)ی نێژراوە. لە گەلێک بەیت و گۆرانی و شیعری فۆلکلۆری دەڤەرەکە ناوی هاتووە. گردمەلا گوندێکی زۆر خۆش و دڵگیر بووە، ئاوێکی زۆر ساردو سازگاری هەبووە، کارێزی (گردمەلا)یان پێ دەگوت، شینایی و برنج و باغ و باغچە و ڕەزێکی یەکجار گەورەی هەبووە. دەڵێن وەختی خۆی مەحمودی کاکە خانی زیاتر لە (٥٠) حوشتری لە پێشترێدا هەبووە.

ئەم پارچە هەڵبەستانەی خوارەوە لە دوای کارەساتەکەی شەڕی (دەربەندی بازیان)، کە لە ڕۆژی ٢١ی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ز. لە نێوان سوپای کورد بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموودی نەمرو سوپای داگیرکەری ئینگلیز رووی دا. ئەم شەڕە شەڕێکی نا بەرامبەر بوو: سوپای کورد لە ژمارەو جۆری چەک سادەو ساکار بوون، بەڵام باوەڕێکی بەهێزیان هەبوو، سوپای ئینگلیز بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر پیادەو تۆپ و فڕۆکە و زرێپۆشەوە هێرشیان کردە سەر دەربەندەکە، بەڵام بەداخەوە هەروەکو کورد گوتوویەتی (دار کرمی لە خۆی نەبێ قەت نارزێ). هەرگیز بەبیری (شێخ) دا نەدەهات دوژمن بتوانن بە دەربەند تێپەڕن. شێخ لە دوو لاوە بریندار دەبێت و دەکشێتەوە بن بەردێک، کە هەنووکەش بە (بەردە قارەمان) بەناوبانگە. ئینگلیزەکان شێخیان بە برینداری بەدیل گرت و بە ئۆتۆمبێل لە ژێر چاودێری هێزێکی گەورە بەرەو بەغدایان نارد. پاش ئەوەی کەمێک لە نەخۆشخانە مایەوە، ئینجا لە (دیوانی عورفی) مەحکەمەیان کرد و فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، بەڵام لە دواییدا ئینگلیزەکان فەرمانەکەیان گۆڕی لە جیاتی ئەوە ئاوارە و دووریان خستەوە بۆ (ئەندامان لە هیندستان). لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٢ز حکومەتی بەریتانی ناچار بوو شێخی نەمر بگەڕێنێتەوە بۆ کوردستان و حکومەتێکی تازەی کوردی دامەزراند و شێخ بووە حاکمداری کوردستان.(٥)

ئەم پارچە هەڵبەستەش لە دوایی ساڵانی ١٩١٩ز. داندراوە، بەڵام خاوەنەکەی نازانین کێیە؟ بۆیە بە شیعری فۆلکلۆری لە قەڵەم دەدرێت.

**باغی گردمەلا، گردمەلای جاران**
**تۆزەک بەدیار کەت، لە گەرووی ماران**
**زەینێ خۆم داین، بۆسەی جانداران**
**(عەلی) تان دەدا، لە خزمەتکاران**
**پاکەتی داڕنن، لە جامبێزاران**
**نیشانەی بکرن، لە قوماندارن**
**باغی گردمەلای، بە بنە هەنجیرە**
**عەلی گاز دەکا، هێ برام سابیرە**
**هەستە لە خەوێ، دەست دە پێنج تیرە**
**ئەحمەد ئەفەندی، وەک سەگی پیرە**
**لە تالعی مە شێخ مەحمود گیرە**
**باغی گردمەلای، بە بنە هەنارە**
**عەلی گاز دەکا، تایەر مندارە**
**ئەحمەد ئەفەندی، وەک سەگی هارە**

لە شوێنێکی دیکەش فۆلکلۆر دەڵێت:

**گردی (گردمەلا)ی کاولە غەرابە**
**ماران گەستیمە، کۆرە وەیبابە**

ساڵی ١٩٥٠ز. قوتابخانەی میری لێ کراوەتەوە، یەکەم مامۆستای گوندەکە ناوی (پەترۆس) بووە، لە ساڵی ١٩٥٤ز بەڕێوەبەری قوتابخانەکە خوالێخۆشبوو (جەودەت تەیموور) بوو لەگەڵ دوو مامۆستای دیکە یەکێکیان بەناوی (فەوزی عومەر) خەڵکی شاری کۆیە بوو، ئەویدی (ئیحسان عەلی مەندەلاوی) کوردێکی خەڵکی شاری (مەندەلی) بوو، وابزانم لەم ساڵانەی دوایی لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.(٦) لەم باردیەوە مامۆستا (فەوزی

عومەر)، کە هەنووکە خانەنشینە، لە شاری هەولێر نیشتەجێیە، بۆی گێڕامەوە گوتی: یەکەم دامەزراندنم لەو گوندە بوو، بەڕاستی گوندێکی خۆش بوو، هەروەکو شەقلاوە وابوو، ئاوێکی زۆر، ڕەزو باغێکی خنجیلانەی تێدابوو، لەبن دارەکانی دیکەیان چاندبوو، لەبەر ساردی لەوێ پۆلی شەشەمان هەبوو، لەو قوتابیانەی کە وانەم پێ گوتوون (کاک فوئاد حەمید زەنوون) بوو، کە یەک دوو ساڵ لەمەوبەر بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی هەولێر بوو، هی دیکەشیان سمکۆ تایەر بوو وابزانم بووە ئەفسەر، غازی سابیر مەحموود، فاروق سادق و گەلێکی دیکە ناویانم لەیاد نەماوە. ئەو گوندە (٢) دوو ماڵە جوولەکەی تێدا بوو، بەناوی (لارۆ) کوڕێکی هەبوو (مشکۆ) بوو، (لارۆ) برایەکی هەبوو موسوڵمان بوو، ناویان لێنا فەقێ عەولا، بەڵام لارۆ بە ماڵ و منداڵەوە ڕۆیشتەوە فەلەستین. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢١٢) کەس بووە.

### شانەشین

ناوی گوندێک بووە لە گوندەکانی دەشتی پشتڕێ، لە ساڵی ١٩٤٨ز شێخمحەمەد ئاغای برای عەلی مەحموودی ئاوەدانی کردەوە، دوای ئەوەی لەگەڵ چەند ماڵێک لە گوندی (گردمەلا)ی جودابوونەوە، ئەو گوندە دەکەوێتە ناو ئاقاری (گردمەلا)ی هەتا ساڵی ١٩٥٧ز هەر ئاوەدان بوو، دوایی بەرەبەرە خەڵکەکەی بۆ کاروکاسبی گوندیان بەجێهێشت و لە شاری هەولێر نیشتەجێ بوون، تا وای لێ هات کەسی تێدا نەماو کاول بوو، ئەو گوندەش سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای هەولێر بوو.

(شانەشین) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (شا + نەشین) پێکهاتووە. ڕاستتر ئەوەیە کە لە (شا+ نشین) پێکهاتووە، بە مانای جێگای ژیان و لێدانیشتنی شایە.

### گردەسۆر

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتڕێی دەشتی هەولێرێ، سەربەناحیەی قوشتەپەیە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی پۆریجە -ئۆمەراوە -لورکە - ئازیانە لەسەریەکە.

گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە (٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر، وەختی خۆی بنەماڵەی (حاجی تاژدین) کە بنەماڵەیەکن لەتیرەی (وەتک)ی سەربە عەشیرەتی سیان ئاوەدانیان کردۆتەوە، ئەو (حاجی تاژدینە)ش دەکاتە باپیرە گەورەی کاک (عەبدولقادر سۆفی و کاک جەباری حاجی عوسمان) هەروەکو باس دەکەن پیاوێکی لێوەشاوەو دەوڵەمەند و نانبدەو چاوتێر بووە، دەگێڕنەوە کابرایەک ناوی (ڕەسووڵ ئاغا) دەکەوێتە (گردەسۆر)ی لە ڕێی ژن و ژنخوازییەوە لەگەڵ بنەماڵەی حاجی تاژدینی تێکەڵ دەبن، ئەو پیاوە دەستی زۆر کورت دەبێت، هەرکاتەکی میوانی بهاتبایە نان و خوان لەماڵی حاجی تاژدینی ئامادە دەکراو بۆیان دەچوو، خەڵکەکە دەیانگوت: (نان نانی حاجی تاژدینییە، ڕەسوراغە ماری ئاوا) لەوساوە بوویتە پەندێکی پێشینان لە دەڤەرەکە. وەختی خۆی (گردەسۆر) ئاوی زۆر بووە، ئاوەکەی هەتا گوندی (ئۆمەراوە)ی دەڕۆیشت، گردەسۆر لەدوو گەڕەک پێکهاتبوو، گەڕەکی بەرەی حاجی تاژدینی و گەڕەکی ڕەسووڵ ئاغا و (رووتەکان)، بەرەی رووتەش هەر دەگەڕێتەوە سەر بنەماڵەی حاجی تاژدینی، ناوی (گردەسۆر)یش لەوەوە هاتووە، گردێکی لێیە پێیان دەگوت (قەلاتە -قەراتە سۆر). گردەکەش ڕەنگی خاکەکەی سۆرە، هەربەناوی ئەو گردەوە ناونراوە (گردەسۆر)، جا وشەی (گردەسۆر) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ناو + ئامرازی ە + ئاوەڵناو) پێکهاتووە، واتا (گرد +ە+ سۆر). چەند گردێکی ئەسەری لە ئاقارەکەیدا هەیە، شوێنە جوگرافیاکانیشی ئەمانەن: " گردی (قەرەبەگ)ی گردی (حوسێنی)، کە شوێنەواری شارۆچکەیەکە گوایە وەختی خۆی شاربووە. بستی شاقازی (شێخ قازی) ناوی بستییەکە (بەرزاییەکە) لەسەر کەندی (شاقازی)یەو گۆڕستانێکە و گۆڕی پیاوچاکێکی لێیە، بەناوی (شێخ قازی)، کەندو بستییەکەش هەر بەو ناوە ناونراوە، فۆلکلۆر دەڵێت:

**بەرگردی (قەرەبەگ)ی ئەوبەر ئەوبەر بیستانە**
**دەراوی (گردەسۆر)ی جێگای چاو بە کلانە**
**بستی (شاقازی)م خۆشە وادیارە لە (بیستانە)**
**وەرە یارێ بابڕۆین لۆ (ئازیانە)ی سەیدانە**

(بانە بۆران) ناوی بانێکی گەورەیە لەناو ئاقاری گردەسۆری دایە. کاتی خۆی هۆزی (بۆری -بۆلی) دەهاتنە

خوارێ هەتا دەشتی قەراج دەڕۆیشتن، لەوبانە هەواریان لێ هەڵدەدا. بۆیە ئەو بانە بەو ناوە ناونراوە.

(قەڵاتە سوران) گردێکی گەورە و باریک و بڵندە، لەلای رۆژاوادا زۆر رکەو کەس توانای بەسەرکەوتنی نییە، کەوتۆتە نێوان ئاقاری گردەسوورو (سۆفی برایم)ی، رەنگی خاکەکەی سوورە وەکو قورمز وایە.

وەختی خۆی بنەماڵەی حاجی تاژدینی مەڕوماڵاتێکی یەکجار زۆریان هەبووە، ماڵودەدران واتە (دەردبوراران) وەکو هەموو خێڵەساتی دزەییاتی کۆچ و کۆچباریان تێکدەناو بەرەو هەوارگەی جارانیان، کە (دەشتی قەراج)ی بووە دەڕۆیشتن و لەو دەشتە رەنگینەدا هۆبەو رەشماڵیان لێ هەڵدەدا. لە گەلێک بەیت و شیعری میللی و فۆلکلۆری دەڤەرەکە ناوی (حاجی تاژدینی) هاتووە. فۆلکلۆر دەڵێت:

**رەشماری رەشی زراو لە (تەپی خاری) هەردراوە**
**مارماری (حاجی تاژدین)ی رەسوراغا مارت ئاوە**

هەر لەبنەماڵەی ئەو (رەسورئاغە) کچێکی جوان و شۆخ و شەنگیان دەبێت بەناوی (شەمێ خالند) دەیدەنە خورشیدی حاجی بایزی، کە برای برایمی بایزی بوو، نەوەی (رەسوراغە) هەنووکەش ماون و لە گوندی (گردەسوور) و لە ناو شاری هەولێر نیشتەجێن، یەکێک لەوانە (حاجی ئیسماعیل کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کوڕی رەسووڵاغە)یە لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠، دانیشتوانی (گردەسوور)ی لە تیرەی (وەتک)ن، کە تیرەیەکە لە سێ تیرە سەرەکییەکەی (عەشیرەتی سیان). پەندێکی پێشینان لە دەڤەرەکەدا هەیە دەڵێن: (وەتک بەعینوانی، شەمزین بە چەتیانی، وسوو ماربەنانی)

عەشیرەتی (سیان)یش لەو سێ تیرە سەرەکییانەی خوارەوە پێکهاتووە:

تیرەی وەتک: دانیشتوانی ئەو گوندانەی خوارەوە دەگرێتەوە، تەتەراوە -ئۆمەرمامەکە -گردەسوور -دۆرەزە - گردبۆر -گراو -دوازدە هەوار -شەنەغە.

تیردی وسوومامەر (وەسمامەر): گوایە دانیشتوانی گوندەکانی سەربەشاخ -عەولافات -گێسمە -گابەرەکە. ئەمانە هەموویان دەگەڕێنەوە سەر وەجاغی پیاوێک بەناوی (وەسوومامەر) واتە هەموویان لەیەک بەرەبابن؟

تیرەی شەمزینی (شەمدینی): دانیشتوانی گوندەکانی بیرەبات -جاستان -قووج -دەربەندی گۆم دەگرێتەوە، تیرەیەکی دیکەش هەیە بەناوی (زەرگە) هەندێک دەڵێن ئەمانەش هەر دەگەڕێنەوە سەر تیرەی وەتک، بەڵام هی وایان هەیە دەڵێن نەخێر ئەمانەش تیرەیەکی سەربەخۆن، کاتی خۆی لەبناری (زوورگەزراو)ی بەدیوی دەشتی مرکییە نیشتەجێ بوون، بەتایبەتی لە گوندەکانی ئۆمەراوە - گەرەشێخان -شێخانان، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٩٣) کەس بووە.

## گردیش

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتڕێی لە خوارووی رۆژهەڵاتی شاری هەولێر لەناو تەپۆلکەو زوورگەکان هەڵکەوتووە، کە زوورگی گردیشی پێدەڵێن. ئەم زنجیرە زوورگە کەسنەزانییە پێ بەپێ دەکشێ و زوورگی زەرگەتەنی پێدەڵێن. گوندەکانی باخچە -پونگینە - کورداوا -باغەمرە کەوتۆتە ناوییەوە، لەکەرخی گوندی گردیشی زوورگی گردیشی پێدەڵێن، لەکەرخی گوندی چەمرگەی زوورگی چەمرگەی پێدەڵێن. هەروەها لە کەرخی بیستانەو سەرمەزرا بەم شێوەیە دروات بەرەو قەشقە و خورخور هەتا دەوزێی گچکە، لەوێوە دووبارە، واتا لەوبەری زێیەوە بەرزدەبێتەوە. ئەو گوندە گوندێکی کۆنە بەمولک هی ماڵی شێخەرەشکەی بووە. هۆزی کوردە بۆ یەکەم جار، کە هاتوونەتە دەشتی هەولێر لەو گوندە دامەزراون. پاشان کورداوا و هەمزەبەگ و چەمرگەیان ئاوەدان کردۆتەوە. وشەی (گردیش) لەوەوە هاتووە (گردئێش)، واتا گردێکی بە ئێش و ئازار، هەڵکەوتی گوندەکە لەشوێنێکی ناخۆش و سۆرک و رووتەنە، تەنیا بۆ مەڕوماڵات بەخێوکردن دەستدەدات، ئەگینا هیچ عەردو زەوییەکی بەدەمەوە نییە کە شایەنی ئەوە بێت بۆ کشتوکاڵ دەستبدات. گردیش هەنووکە (ساڵی ٢٠٠١) (١٥) ماڵێک دەبێت.

### ناو و شوێنە جوگرافییەکانی ئاقاری گردیش

غەرابەرەش: غەرابەیەکە دیارە وەختی خۆی کاولە گوند بووە، کەوتۆتە سەرووی گوندەکە، رەنگی خاکەکەی مەیلەو رەشە، بۆیە ئەو ناوەیان لێناوە. (دەستار)یان لێ دۆزیوەتەوە.

کۆتان سەید: هەواری پیاوێکی مەردار بووە، پاوانی لەوناوە بووە، وادیارە پیاوەکە سەید بووە.

کێلە سپیلکە: زەوییەکەی رەنگی سپی دەدات، بادار ناوی زەوییەکە، زەوی مایی بەناوی پیاوێک کراوە ناوی (مایی) خەڵکی گوندەکە بووە. بیرەکەی شێخی بیرێکی بچووکەو هەر ماوەو بەژنێک قووڵ دەبێت، دەست هەڵێنجە، دەڵێن کاتی خۆی هی بنەماڵەی (شێخە رەشکە)ی بووە، دیارە وەختی خۆی بنەماڵەی شێخی لەوێ بووە و پاشان باریان کردووە و کەوتوونەتە شاری هەولێرو مزگەوت و تەکیەی لە گەڕەکی خانەقای هەولێر لە تەنیشت خانەقا و مزگەوتی هیدایەتوڵلای هەولێری کردۆتەوە و بەناوی مزگەوتی شێخەرەشکە ناسراوە. قەبری مەزنان چەند گۆڕێک بوو بەناوی گۆڕی مەزنان بەڵام نازانین ئەمانە کێ بوون. خەڵکی گوندەکە هەر وای پێ دەڵێن، هەنووکە گۆڕستانە. دارەمراد ناوی زەوییەکە دارێکی لێ بوو بەو ناوە ناسراو بوو. مێکوکاو ئەو ئاقارە رووەکی مێکوکی زۆرە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە. گرڕەز (گرد رەز) ناوی گردێکە لە رۆژهەڵاتی گوندەکەدایە، رەزی لێ چاندراوە، شوێنەکەی نسارە، دار سماقیشی هەیە، بەڵام رەزەکە وانییە چەند بنە مێوێکە.

بیرە دزەیی: ناوی بیرێکە لە ئاقاری گوندەکە هەڵکەوتووە و مەڕی لێ ئاو دەدەن، کاتی خۆی ئەو بیرە هی مەڕدارو شوانکارەکانی دزەییایەتی بووە، بۆیە ئەو ناوەی لێندراوە، ئەو ناوەو زوورگ و تەپۆڵکانە چۆڵ و هۆڵ بوون و پاوان بوون مەڕومالاتیان لێ دەلەوەڕاندو ئەو بیردیان لەوێ لێداوە، بەڵام نازانین هی چ زەمانێکە، پاشان تیرەی کوردەی جاف لەبەری بابان هاتوونەتە بەری سۆران و لەو بنارو ناو ئەو زوورگانە نیشتەجێ بوون.

هەوار پۆخینە: ناوی هەوارێکی پیس و پۆخڵ، بووە بۆیە بەو ناوە ناونراوە.

هەوارە قورە: ناوی هەوارێکە کاتێ دەبووە باران ئەوناوە دەبووە قوڕو قوڕاو، بۆیە ئەو ناوەی لێندراوە.

کۆراو: لە (کۆرئاوە) وە هاتووە ناوێکە لە کەژی هاوین هیشک دەبێت.

فاتەرەبەنان: ناوی ملە زوورگێکە لەودیوی هەوارە پۆخینەیە دۆڵە مەنیج (مەنیجە): دۆڵە زوورگێکی دوورودرێژو گەورەیە لەدیوی قەبری مەزنان دایە، بەناوی ئافرەتێکەوە ناونراوە.

کاولە حاریس: شوێنەواری کەونە گوندێک بووە.

کانی حاجیاغەی: ناوی کانیاوێکە خاکەکەی قەسپۆکە.

شاخ بایز: ناوی شاخێکە لە سەرەوەی زوورگەکە. شاخەکە تەمۆخە.

قۆرتە بەرداوی: ناوی زەوییەکی قۆرتاوییە بەردی زۆرە.

دانیشتوانی ئەو (٤) گوندانە، گردیش - هەمزەبەگ - کورداوە - چەمرگە، هەر هەموویان لە هۆزی کوردەن. بەقسەی خۆیان بە رەسەن دەگەرێنەوە سەر عەشیرەتی گەورەی جاف. براگەورەیان مام حاجی حەمەی کیانی بوو و موختارو براگەورەی هەر چوار دێ بوو. هەڤاڵێکم بۆی گێرامەوە گوتی: لە ساڵانی شەستەکاندا باوکم جوتی لەو گوندە دەکرد، بۆ نان خواردن چووبووە دیوەخانی (حاجی حەمەی کیانی)، خانووبەرەی ئەو گوندانەش وەک لای خۆمان نین بە پووش و پەراش سەری گیراوە، جزیرین و نەوینە، کە چووم لە دیوەخان دابەزیم کوێخا حەمە خەریکی قاوەلێنان بوو، هەر هەندەم زانی دیوەخان ئاگری گرت، کوێخا حەمە هاواری کرد کورە ئاو بێنن ! کورە ئاو بێنن! چونکە دیوەخانەکە سەرەکەی پووش و پەراش بوو زوو ئاگری گرت، هەتا ئاویان هێنا دیوەخان کورو کۆی دامرکا.

## هەرەجەی گەورە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتڕێ، سەر بەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە بناری زنجیرە زوورگەکانی رۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە. گوندێکی زۆر کۆنە، مستەر ریچ لە سەردانەکەیدا لە ساڵی ١٨٢٠ز باسی هەرەجە و بیستانەی کردووە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی بیرەجنە - لاجان - ئۆمەرەسۆر -پالانیان - سابلاغ لەسەریەکە. بە موڵک هی بنەماڵەی شێخ کەریمی بەرزنجی بووە، ئەو بنەماڵەیە کاتی خۆی لە کۆیەوە کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ و لە بناری ئەو زوورگانە دامەزراون. شێخ مارفی کوڕی لەوێ دادەنیشت، پیاوێکی چاونەترس و دیارو خاوەن دەسەڵات بووە لە ناوچەکەدا، لە رێگەی ژن و ژنخوازییەوە خزمایەتی لەگەڵ بنەماڵە گەورەکانی شاری هەولێرو دەوروبەریدا هەبووە. کچێکی لەلای (ئەحمەد عوسمان ئەفەندی) موتەسەریفی لیوای هەولێر بووە، ئەحمەدەفەندیش ئامۆزای مەلا فەندی بوو.

کچێکی دیکەی شێخ مارف ناوی (کافیە خان) بووە لەکن حەمەدەمیناغەی حاجی بایزی بوو، کە دەکاتە دایکی خوالێخۆشبوو کاک (ئەحمەد حەمەدەمین)ی دووگردکان، هەرەجە گوندێکی خۆش و پاک و خاوێن و دڵگیر بووە و کارێزێکی لێبوو ئاوەکەی لە سەرووی گوندی دەهاتە دەرێ و دەهاتەوە ناو گوندی، لەبەرەوەی گوندی شینابیان لەبەر دەکرد، ٨ -٩ دار بنە تووی گەورە گەورە لە خوار گوندی هەبوو، دیمەنێکی جوانی بەخشیبووە گوندەکە. ناوی جوگرافیایی ئەو گوندەش بریتین:

بانی گۆڕە خاڵدارەکە: ناوی بانێکی گەورەیەو بەرزە، کەوتۆتە نێوان ئاقاری گوندەکانی لاجان -بیرەجنە - هەرەجەی گەورە، بەردی خاڵداری رەنگاورەنگی یەکجار زۆرە، بۆیە ئەو بانە بە گۆڕە خاڵدار ناسراوە، لە بوارلندا جێگایەکی خۆش و دڵرفێنی هەیە، سەیرانگەی ئەو ناوەیە. هەرەجە لە کۆنەوە مەدرەسەی ئایینی هەبووە، (مەلا سەعید) ناوێک، کە پاشان بە مەلا سەعید فانۆس ناسراوە، ئەو مرۆڤە زانایەکی بلیمەت بووە لە دەشتی پشترێ و دەڤەرەکەدا، پاشان شێواوەو تێکچووە. دەگێڕنەوە دەڵێن بە نوێژی نیوەڕۆیێ دەستی دەدا فانۆسی و دەگەڕا لەو ئاقارانە دەیگۆت: (لە حەق دەگەڕێم حەقم بزر کردییە دەیبینمەوە) لە سییەکانیش خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ئەبوبەکری کۆیی سەردەمێک لەوێ و ماوەیەکیش لە گوندی ئاخورەی مەلا بووە، پاشان کەوتۆتە گوندی (هێلەوە)ی لەو گوندەدا مەلاو مودەریس بووە، لە ساڵی ١٩٤٧ز هاتۆتە گوندی (دووگردکان) تاساڵی ١٩٥٨ز لەوێ ماوەتەوەو مەدرەسەو فەقێی هەبووە ژمارەیەکی زۆر لە مەلاو زانایانی ناوچەکەو دەڤەرەکانی دیکەی کوردستان لەسەر دەستی وی بروانامەی زانستییان وەرگرتووە، لەوانە مامۆستا مەلا جەوهەری هێلەوەیی، کە هەنووکە ئیمام و خوتبە خوێنی مزگەوتی حاجی بەکر زێڕینگرە لە هەولێر، هەروەها مامۆستا عەبدولرەحمانی ماستاوەیی. مامۆستا مەلا ئەبوبەکر پاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ز گوندی (دووگردکان) بەجێدێلێ و دێتە شاری هەولێرو دەبێتە ئیمام و خوتبەخوێنی مزگەوتی حاجی مەحموود عەلافی دێرەیی، پاشان لە ساڵانی حەفتاکان لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە. ئەو گوندە (٢) دوو هۆزی سەرەکی تێدایە "یەکەمیان بڵباسە، کاتی خۆی لە دەشتی بیتوێنەوە کەوتوونەتە ئێرە، دووەمیشیان هۆزی (شێخان)ە. بنەماڵەی شێخ (مەعروف)ی لە دەشتی هەولێریدا ئەو گوندانەیان هەبوو." هەرەجەی گەورە - هەرەجەی گچکە (بیرەجنە) -میرزاغا - سابلاغ - لاجان، ئەمانە سەربە ناحیەی قوشتەپەن. ئاخورە - رەسووڵ بسکۆل سەربە کۆیەن.

## ئازیانە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێ. سەربە ناحیەی قوشتەپەیە، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە، سۆفی برایم -چاڵە گرددەرە -گردەسۆر -قەشقە -لەسەر یەکە، دەگێڕنەوە وەختی خۆی ئەو گوندە هی بنەماڵەی (شەریفکە) ناوێک بووە سەربەهۆزی سیان بوو (١٠٠) ساڵێک لەمەوبەر فرۆشتوویانەتە بنەماڵەی حاجی تاژدینی گردەسۆری و لەگەڵ هەندێک لە (لەکەکان) بەهاوبەشی ئەو گوندەیان کڕیوە، لەدواییدا گوندەکەیان لێک کردۆتەوەو ئاقاری (بانەبۆران) بەبەر بنەماڵەی حاجی تاژدینی کەتییە و ئەوی دیکە بوویتە هی (لەکەکان)، هەنووکەش بیرێک لە کەندەکەدا هەیە بە ناوی (بیری خۆچێ)، ئەو (شەریفکە)یە بووە، کە باسمان کرد هەندێک دەڵێن لە کۆندا هی بنەماڵەیەک بووە لە (سەیدەکان)، لە پیاوە ناودارەکانیان کوێخا رەزابوو، کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو کاک کەمال، بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی (١٦٦) کەس بووە.

## ئۆمەرە سۆر

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی بیستانەی گەورە و گچکە، هەڵەجەی گەورە، لاجان -پالانیان -کەردز لەسەر یەکە. ئۆمەرەسۆر، ناوێکی لێکدراوی کوردییە. دەڵێن (٣٠) ساڵێک پێش گرانی ساڵی (١٩١٧ ز) ئاوەدان کراودتەوە بەناوی پیاوێک ناوی (ئۆمەر) بووە، کە پیاوێکی سوورسپی بووە، ئەو گوندەی بەتاقە ماڵێک ئاوەدان کردۆتەوەو گوندەکە بە ناوی وی ناونراوە. هەنووکە ئەو تیرەو هۆزانەی تێدایە وەکو کوردە -مەنمی -گەلاڵی - مەنتک. ژمارەی دانیشتوانی (١٠٠) کەس بووە لە سەرژمێری گشتی ساڵی (١٩٥٧ز)دا. ئەو گوندە گەرێکی

زۆر دلڕفێن و خۆشی هەیە (گەڕەبەفراو)ی پێدەڵێن. گەڕێکە، پشتی زوورگە، شوێنێکی دلڕفێنە بەتایبەتی بەهاران، کاتی خۆی ئەو ناوە بەفرێکی زۆری لێ دەکەت، بەهاران ئەو گەڕە بە گوڵی جۆراوجۆر بەتایبەتی گوڵی بەیبوون و هەلاڵە و نیسان رەنگین دەبوو. هەندێک دەڵێن ئەو گەڕە بەناوی ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ کراوە ناوی (بەفراو) بووە، لەو شوێنە مەریان لە بێر داوەو بێریان کردووە، جا بۆیە ئەو گەڕە بەناوی ئەو ئەو ئافرەتەوە ناسراوە، (گەڕی بەفراو)یشی پێدەڵێن کە دەکەوێتە سەرەوەی گوندەکە.

### سەرمەزرا

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای ناوەندی پارێزگای هەولێرە، وەختی خۆی ئەو زوورگ و بنارە پاوان بووە، تیرەو خێڵ و رەوەندەکان لەو ناوە دادەمەزران، لەو زوورگ و هەڵەت و هەڵدێرە مەڕومالاتیان دەلەوەڕاند، کاتی خۆی هۆزی بڵباس لەو ناوە بوون، پاشان بەرەو دەشتی بیتوێن هەڵکشان، ئەو ناوەیان بەجێهێشت تەنیا چەند بنەماڵە و تیرەیەک لەو دەشتە ماونەتەوە، دوای ئەوانیش هۆزی مەنتک بە کۆچەری هاتنە ئەو ناوە و دامەزران و لەو شوێنە ئەو گوندیان ئاوەدان کردەوەو ناونرا (سەرمەزرا)، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری بیستانەی گەورە -کانی بزرە - میرەکانی مەنتک، لەسەریەکە. وشەکەش ناوێکی لێکدراوی کوردییە گوندێکی دیکە بەناوی (مەزرا) لەناوچەی (دەرسیم)ی کوردستانی تورکیا هەیە، ژمارەی دانیشتوانی لە سەرژمێرە گشتییەکەی سالی ١٩٥٧ز. (٤٨) کەس بووە.

### چارە گرددەرە

چارە گرددەرە، ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە. ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی پەلکانە -قەشقە -ئازیانە - سۆفی برایم لەسەریەکە.

وشەی (چاڵە گردەرە) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە خەلکی دەڤەرەکە دەڵێن (چارەگرددەرە). چار بەمانای چاڵ، گر بەمانای گرد، دەرە بەمانای دەوروبەر یا دەوروپشت دێت، گوندەکە خۆی کەوتووەتە ناو نەوراییی و شوێنەکەی چاڵە، دەوروپشتەکەی هەمووی گردو تەپۆڵکەیە، دانیشتوانەکەی زۆربەیان (سەیدن) و خزمی یەکن و خۆیان بەنەوەی (پیرخدری شاهۆیی) دەزانن و لە مێژە کەوتوونەتە ئەو ناوەو ئاوەدانیان کردیتەوە، کردوویانەتە موڵکی خۆیان، لە گوندەکانیان جل بەسەرو چارەگرددەرەیە. ژمارەی دانیشتوانی لەسەر ژمێری گشتی سالی ١٩٥٧ز. (١٣٦) کەس بووە.

### ئۆمەراوە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێ، سەر بەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شێخانان -گردلانکە -سێنارە -پۆریجە -گردەسۆر -سێقوچان -مەخشومە لەسەریەکە. (ئۆمەراوە) ناوێکی دارێژراوی کوردییە. ئەو گوندەش بە ناوی پیاوێکەوە ناونراوە، ناوی (ئۆمەر) بووە. ئەو پیاوە یەکەم کەس بووە لەو گوندە نیشتەجێ بووەو دامەزراوەو ئاوەدانی کردۆتەوە. لە ناوچەی دزەییاتیدا بەناوی (عومەر) دەڵێن ئۆمەر. گوندێکی کۆنە بە موڵک هی بنەماڵەی پاشای بووە، عەلی حەمەداغەی، کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو برایمی عەلی، لەوێ دادەنیشت، زۆربەی دانیشتوانی ئەو گوندە لە بەرەبابی (زەرگەن) کە بنەماڵەیەکن سەر بە تیرەی (وەتک)ی سیانن. هەروەها (دەربەندی)یەکانیشی لێیە، ئەوانیش کاتی خۆی لە گوندی (دەربەندی گۆم)، کە گوندێکە دەکەوێتە دەشتی کەندێناوە، لەوێوە کەوتوونەتە ئێرە و لە تیرەی (شەمدینی) سیانن. بنەماڵەی (حاجی حەمە سالح)یش بنەماڵەیەکن کاتی خۆی لە دەشتی کۆیەوە کەوتوونەتە ئێرە و سەربە هۆزی شێخانن، حاجی حەمە سالح پیاوێکی ماقووڵ و رەندو دنیا دیتە و لێوەشاوە بووە لە ناوچەکەدا، بەکاری گەنم و جۆ کڕین خەریک بووە، لە شارۆچکەی پردێ دوکانی (عەلاف)ی هەبوو. لەگەڵ بەغداو شارەکانی خوارووی عێراق بازرگانی دەکرد. لە سالی ١٩٤٦ز. بۆ یەکەم جار قوتابخانە لەو گوندە کرایەوە، خوالێخۆشبوو مامۆستا یوسف عەبدوڵڵا خۆشناو، کە خەڵکی شەقڵاوە بوو، لەگەڵ مامۆستا کەمال کۆیی لەوێ مامۆستا بوون. بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریمی سەید ئەحمەدی سەید سمایل

له نەوەی شــێخ عــەبدوڵڵای ســوێرەیی، کـه له ســاڵی ١٨٩٤ز. له گوندی (گرده شینەی) بناری زوورگه زراوی سەر به ناحیەی قوشتەپه له دایک بووه و پاشان باریان کردووه بۆ گوندی (ئۆمەراوه) و به شێخ عەبدولکەریمی ئۆمەراوەیی ناسراوه، دەگێرنەوه کاتی خۆی له ساڵی ١٩٢٠ز. خوالێخۆشبووان مەلا شێخ عەبدولکەریم موستەعید دەبێت و تاهیری کوێخا عەلی دۆڵەزەش له شاری کۆیه فەقێ دەبێ له خزمەت مەلا محەمەدی گەورەی جەلی زاده له مزگەوتی گەوره دەیانخوێند. کاتێ ئینگلیزەکان به فرۆکه بوردومانی شاری کۆیه دەکەن ئەو دوو فەقێیه هەردووکیان بەردەکەون، تاهیری کوێخا عەلی دەمودەست دەمرێت و شێخ عەبدولکەریمیش بریندار دەبێت و دەیهێننەوه بۆ گوندی (هەلەجه -هەرەجه) لەوێوه خزمەکانی دەیهێننەوه گوندی (ئۆمەراوه)، ئەم زانایه له ٦/٣/ ١٩٨٤ له شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووه. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش به گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز .(٣٩١) کەس بووه. ئەو سەرگوزشته خۆشەشتان بۆ دەگێرمەوه، که پەیوەندی به باسەکەمانەوه هەیه: رۆژێکیان ئافرەتێ ناوی (زێزه) دەبێ منداڵی نابێ، به خۆو به مێردەوه دێته کن سەید ئەحمەدی ئۆمەراوەی، کـه دەکاته برازای شێخ عەبدولکەریمی ئۆمەراوەیی، دەڵێن قوربان دوعایەکمان لۆ بکه منداڵمان نییه، ئەویش ئەو دوعایەیان بۆ دەنووسێ: (زێزه ئەگەر دەزێیی بزێ، ئەگەر نازێیی قەت مەزێ) ساڵ هات و چوو زێزه لۆ نازێ! رۆژێکیان سەید ئەحمەد دەگەرێتەوه ماڵەوه دەبینی، ئەوا کاورەکی گەوره له حەوشەی بەستراوەتەوه، له دوورەوه ئافرەت و پیاوەکه به پیلییەوەی دەچن، دەستی ماچ دەکەن، قوربان به قوربانت دەبین، ئەوه له سایەی گەورەیی تۆوه خوا منداڵی داینێ! ئەویش سەری سوڕدەمێنێ....منداڵی چی؟ ئەوانیش دەڵێن ئەی قوربان تۆ دوعات لۆ نەکردین. ئەویش دەڵێ: به خوای بابم خوا پێی داون. من چیمه. به خوای دوعای من ئەوەندە بوو[٧] (زێزه ئەگەر دەزێیی بزێ، ئەگەر نازێیی قەت مەزێ) کاورەکەشیان پێ دەنێرێتەوه.

### سێ قوچان

ئەمەش ناوی گوندێکه دەکەوێته دەشتی پشتڕێ، سەر به ناحیەی قوشتەپەیه، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی ئۆمەراوه -شێخانان -تۆبزاوا -مەخشوومه -چەمەزەردەی گەوردو گچکه -گردەسۆر لەسەریەکه.

ئەو گوندە له شارۆچکەی (پردێ)وه نزیکه، ناوێکی لێکدراوی کوردییه. به موڵک هی (مەجیدە کەری حەسەن) پردەیی بووەو به رەسەن خەڵکی شارۆچکەی (پردێ) بووه. حەسەن پردەیی به زۆری ژیانی له گوندی سۆربەشی خدری بەسەر بردووه، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووه. سێ قوچان نزیکەی (٤٠) ماڵێک دەبوون. ئەو تیرەو هۆزو بنەماڵانەی تێدابوو بنەماڵەی حاجی سمایلی له هۆزی سارمەمی بوون، بنەماڵەی عەلی قادری له هۆزی (کەرور -کەلور -کەڵهور)، که کاتی خۆی له گوندی قولتەپەی یابه کەوتوونەته ئەوێ. بنەماڵەی سەعدوون بەیخان له هۆزی ئۆرمزیار بوون و کاتی خۆی له گوندی سۆربەشی خدری کەوتوونەته ئەوێ. هەروەها گوندێکی دیکه به هەمان ناو له دەشتی کەندێناوەی سەر به ناحیەی (دیبەگه)ی قەزای مەخموور هەیه، هی بنەماڵەی بایزی بووه، حوسێنی مەلا نووری کوری لەوێ دانابوو. ژمارەی دانیشتوانی بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (١٦٥) کەس بوو.

### دۆرەزه (دۆڵه سزه)

ناوی گوندێک بووه له دەشتی مرکیبەی سەر به ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێر. ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی قولتەپه -بیرەعارەبان -باشتەپه -گردەشینه -تەتەراوه -گەرەشێخان -دۆڵەبەکره لەسەر یەکه. ئاقارێکی گەوره و فراوانی هەیه، له پاشان بوویته سێ گوند به ناوی:

١- دۆڵەزەی حاجی مستەفای خورشیدی بایزی.

٢- دۆڵەزەی ناوەندێ، موڵکی خۆیان بووه (٤٠) ماڵێک دەبوون له تیرەی (وەتک) سەر به عەشیرەتی سیانن. بنەماڵەی مەلا عوسمان و سادق خدر لەوێ دادەنیشن. کاتی خۆی ئەو بنەماڵەیه له دەشتی قەراج له گوندی (چار گۆمان) موڵکیان هەبوو.

٣- دۆڵەزەی عەلی ئاغا (دۆڵەزەی گردی)یشی پێ دەڵێن گردێکی بڵندی لێیه، بەڵام زۆر پان نییه، (گردی قوت)ی پێ دەڵێن توورەگه رێژە، به موڵک هی حوسێنی

برایمی سۆفی باوەلی بووە. ١٢-١٣ ماڵێک دەبن و هەموویان لە تیرەی (وەتک)ی سیانن، لە پیاوە ناودارەکانیان عەلی ئاغا بوو.

**قازیخانە**

قازیخانە ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییەی، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی بیردعاردبان -باشتەپە -دووکەڵە -سۆربەش لەسەربەکە. کاتی خۆی بە موڵک ئەو گوندە یەکێک بووە لە گوندەکانی بنەماڵەی (سوڵتان ئاغای قورشاغلوویی). بە تێپەڕبوونی زەمانە و کات بۆتە موڵکی هۆزی (فەقێ مەرکی)یەکان، کە کوێخا رەزای برا گەورەیان لەوێ دادەنیشت، پاش ئەوەی (فەقێ مەرکی)یەکان لەگەڵ عەشیرەتی سیان و مامەسێنی لێیان دەقەومێ ناچارمان گوندەکانیان لە ناوچەی کەندێناوە و مرکییە بەجێبێڵن، وەکو قەپران -شەحەل -قازیخانە، بەرەو زێی گەورە و دەشتی شەمامکێ و دەوروبەری گوێڕ رەویان کرد، لە گوندەکانی کوشاف و گامێشتەپە و دەوروبەری گوێڕ گیرسانەوە و (قازیخانە)یان بە کەم شتێکی فرۆشتە بنەماڵەی بایزی.

(مامەندی مەلای) برای حوسێنی مەلای هاتە ئەوێ. وەکو باسی لێوە دەکەن (مامەندی مەلای حەوێزی) پیاوێکی زاناو مەندو لێوەشاوە بووە، مەڕوماڵاتێکی زۆری هەبووە، بواران لەگەڵ مەڕدارانی دەشتی دزەییاتی دەچووە هەواران لە دەشتی قەراجێ، هۆبەو رەشماڵیان هەڵدەدا. ساڵێکیان رەشماڵیان لە دەشتی قەراجێ هەڵدابوو، لەبن رەشماڵەکی چار ئەستوونی دانیشتبوو، قەنەی پێ کردبوو، کاتەک تەماشا دەکەن بە پشتێ وەرگەڕایەو مردووە، ئەمەش لە ساڵی ١٩٢٥ز. بووە. حوسێنی مەلای برای جێگای گرتۆتەوە، پیاوێکی ئازاو چاو نەترس بووە، لە زەمانی مەلیک فەیسەڵی یەکەمدا لە ساڵی ١٩٢٤ز. نائیب و نوێنەری ناوچەی دزەییاتی بووە، کاتێک یەکەم بیری ئیرتیوازی لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٣٤ز. لێدراوە.دووەم بیر لە ساڵی ١٩٣٦ز. لە گوندی قازیخانە لێدراوە. ئەمەش بە هەوڵ و کۆششی ئەم پیاوە بووە، کە نزیک بووە لە نووری سەعید. لە بارەی ئەو بیرە سەرگوزشتەیەکی خۆش و سەیر و سەمەرە هەیە: خەڵکی دەڤەرەکە هەنووکەش بە پێکەنینەوە دەیگێڕنەوە: کاتێ حوسێنی مەلای سەردانی نووری سەعیدی کردووە، نووری پاشا پێی گوتووە: (ئاغا، ئامێرێکی سەیرمان بۆ هاتووە، حەوت تەبەقەی زەوی هەڵدەدڕێ هەتا، دەگاتە بەحرێ ئاو دەردێنی)، حوسێنی مەلای داوای بیرێک دەکات، نووری پاشاش رازی دەبێت، کاتێک دەگەڕێتەوە گوندی و لە (دیوەخان) باسی ئەو ئامێرە و بیرە دەکات و مزگێنییان دەداتێ، مەلای گوندەکە دەڵێت: بیرمان ناوێ لە نیوچەوانی ئێمە با دنیا خراپ نەبێ، چونکە ئەو ئامێرە تیژە ئەگەر بگاتە سەر بەحرێ ئەوە لە پشتی ماسی دەچەقێ و ماسییەکە خۆی دەجوولێنێ و دنیا وێران و نغرۆ دەبێ. حوسێنی مەلای دەڵێ: "بڕۆن دەی هەر هەنووکە لە تێلێ دەن (مەبەستی ئەوە بووە تەلەفۆن بکەن) و برێنە پاشای بیرمان ناوێ". خوالێخۆشبوو حوسێنی مەلای چەند جارێک بە نوێنەری ناوچەی دزەییاتی هەڵبژێردراوە لە ساڵانی ١٩٣٧ز. کاتێک لە (پەرلەمان)ی عێراقی ئەو سەردەم نەوەیان خستبووە روو لەبارەی نیشتەجێکردنی هۆزە بەدووەکانی عەرەب، بەتایبەتی (شەمەر) لە دەشتی قەراجێدا حوسێنی مەلای مەردانە هەڵێدابوویێ و بەریەرچی دابوونەوە و نەیسەلماندبوو، گوتبووی: عەشیرەتی شەممەر سەر شێت و ملهوڕن، خێلانی دزەییاتی لەوان ملهوڕترو سەر شێتترن، کەوابوو ئێمە چۆن پێکەوە ئیدارە دەکەین و دەحەوێینەوە، ئێوە دەتانەوێ گرفتمان بۆ چارەسەر بکەن! یان گرفتمان بۆ دروست بکەن، دەشتی قەراجێ دەرپێی ژنە دزەییانە، کە قەراجمان چوو، ئەمەش چووین ئەگەر هەر (موسیرن) لەسەر هێنانیان، ئەوا ئێمە بار دەکەین دەچینە چیا، با ئەوان جێی ئێمە بگرنەوە. ئەوا من بە خۆم و عەشیرەتەکەمەوە دەست دەدەینە چەک و چەند پێمان بکرێت نایەڵێن. مەبەستی لەو هەڕوگیفە دەستڕاستکردنەوە بوو، ئەگینا خۆی دەیگوت بەخوای ئەو وەختی لە ٣-٤ تفەنگ زیاترمان نەبوو. جا ئەمە هەڵوێستی ئەو کەڵەمێردە نەمرە بووە، کەسی دیکە لە ئەندامانی پەرلەمان نوقەیان لێوە نەهاتووە. تەنانەت هەندێکیان ترساون کە ئەو، ئەو قسانەی کردووە. هەندێ لە نوێنەرە کوردەکانی دیکە پێیان گوتووە وازبێنە تۆ دەتەوێ تووشی گرفتمان بکەیت، بەڵام ئەو گوێی نەداوێ. جا میری کە زانی گرفتەکە گەورەتر دەبێت، وازی لە

جێنشینکردن و بە عەرەبکردنی دەشتی قەراج هێناوە، پاشان هەستاوە ئەمجارە هۆزەکانی عەرەبی لە دەشتی حەویجەی کەرکووک نیشتەجێ کردووە و کەسیش بە جواب نەهاتووە.

بارزانی نەمر، باوکی کورد لە سالّی ١٩٤٥ز. بۆ مەبەستی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش سەردانی گەلێک برا گەورە و سەرۆک هۆزو عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەو دەڤەرە جیاجیاکانی کوردستانی کردووە، یەکێک لەو ناوچەو دەڤەرانە دەشتی دزەییایەتی بووە، کاتێ (بارزانی) هاتۆتە ناوچەی دزەییایەتی سەردانی (خدری پاشا)ی لە گوندی (شێخانان) کردووە، ئینجا چووەتە گوندی (قازیخانە) و میوانی حوسێنی مەلای بووە، ئەو لەوێ ماوەتەوە و هەر بۆ ئەو مەبەستەش بارزانی نەمر سەردانی کردووە، چونکە باسی ئەو کەڵەمێردەیان کردبوو، کە چ هەڵوێستێکی کوردانەو مەردانەی هەبووە. حوسێنی مەلای وەعدەی نەدابوو چونکە بە بارزانی گوتبوو: (من وەعد نادەم، چونکە پیاو ئەگەر پەیمانی دا دەبێ بەجێی بێنێ، من تاقەتم نییە و پیر بووم، منداڵەکانیشم فێری خەوی ناو دۆشەک و لێفەن، پێشیان بڵێم لەگەڵم نایەنە چیا سەر بە بەردی بکەن، ئەمن ڕاستییەکەی دەڵێم بەڵام کەس ڕاستی نالێ).

پاش ئەوەی شۆڕشی ساڵی ١٩٤٥ بەرپابوو، حکومەت توانی شۆڕشگێڕەکان لە سنوور دەرپەڕێنێ، لە مانگی ١٠/١٩٤٥ بارزانی ئاوارەی کوردستانی ئێران بوو، چووە مەهاباد، حکومەتی مەلەکی برا بارزانییەکانی هەندێک نەفی خوارووی عێراق کردو هەندێکیانیش کەوتنە دەشتی هەولێر. (٢١) ماڵ هاتنە گوندی قازیخانە، حوسێنی مەلای حەوت ماڵی ناردە گوندی (باقرتە) و حەوت ماڵی دیکەی ناردە مەلا عومەرو چەمە دوبزی ناوچەی کەڵەک، عەزیزی برای لەوێ بوو و حەوت ماڵیشی لە (قازیخانە) هێشتەوەو لە گوندی بەرەنجبەرو جووتیار دامەزران.

هەر بە یارمەتی و هەوڵ و کۆششی ئەو پیاوە بوو بۆ یەکەم جار قوتابخانە لەو گوندە لە ساڵی ١٩٣٤ز. کراوەتەوە، ئەمەش ناوی هەندێک لەو قوتابیانەیە، کە لە ساڵی ١٩٣٤-١٩٣٥ز. لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی وەرگیراون.

١- ئەحمەد حەمەدەمین (١٩٢٦-١٩٧٦ز) لەبەر ئەوەی قوتابخانە لەو کاتی لە گوندی (دووگردکان) نەبوو حەمەدەمینی حاجی بایزی کاک ئەحمەدی کوڕی دەنێرێتە گوندی قازیخانەی لای حوسێنی مەلای ئامۆزای باوکی لە پاش ئەوەی باوکی لە ساڵی ١٩٣٦ز. کۆچی دوایی دەکات. کاک ئەحمەد واز لە خوێندن دێنێت، چونکە برا گەورەی براکانی بووە، کاک ئەحمەد ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتووی دەشتی هەولێر بووە، پیاوێکی هۆشیارو نیشتمانپەروەرو پێشکەوتنخواز بوو، لە ساڵی ١٩٧٦ز. بە نەخۆشی دڵ لە تەمەنی (٥٠) ساڵی کۆچی دوایی کردووە و لە گوندی (دووگردکان) نێژراوە.

٢- مەولوود ساڵح ئەمین باوکی سەرکاری حوسێنی مەلا و موختاری گوندی بوو، لە خوێندن بەردەوام بووە (خانەی مامۆستایانی) تەواو کردووە، بووە بە مامۆستاو، پاشان بووەتە لێپرسراوی بەشی خۆیەتی مامۆستایان لە پەروەردەی هەولێر. لەم ساڵانەی دواییدا خانەنشین کراوە، لە ژیاندا ماوە و لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

٣- جەوهەر حوسێن مەلا ١٩٢٤ ز. کۆلێجی مافی تەواو کردووە و بووە بە پارێزەر. هەنووکە پیر بووە و خانەنشینە و لە شاری بەغدا نیشتەجێیە.

٤- قادر ئەحمەدی ڕەش لە ژیاندا نەماوە و باوکی ئەحمەدە ڕەش قاوەچی مامەندی مەلای حەوێزی بووە، کاتی خۆی لە گەردییەکانی گوندی حاجی وسووی بووە و کەوتۆتە دەشتی دزەییاتی، پیاوێکی زاناو زیرەک بووە، لە چلەکاندا لە کەرکووک شۆفێری شەریکەی نەوت بووە، عەرەبی و تورکی و کەمێک ئینگلیزیشی دەزانی. لە ساڵی ١٩٦١ز. چۆتە ناو شۆڕشی ئەیلوول، لە گفتوگۆی ساڵی ١٩٦٦ز. گەڕاوەتەوە و پاشان دەستی بە کاسبی کردووە و سەردەمێک لە شاری بەغدا دەژیا و لە ساڵانی هەشتاکان گەڕاوەتەوە کوردستان. لە ساڵی ١٩٨٦ز. کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی شێخ ئەحمەد لە شاری هەولێر نێژراوە.

٥- عوسمان بەکر، لە ژیاندا نەماوە.

٦- ڕەحمان بەکر لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٥ز. لەژیاندا ماوە و هەنووکە شەلەل لێی داوەو لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

٧- عەلی فەتاح دزەیی (١٩٢٨-١٩٩٢ ز.) لە ژیاندا نەماوە، کاک عەلی ڕەحمەتی کوڕی فەتاح ئاغای

دووسەردیە، باوکی لە گوندی (دووسەرە)وە ناردبوویە ئەو گوندە، لە دواییدا کۆلێجی مافی لە وڵاتی سووریا لە شام تەواو کردووە، کاک عەلی نووسەرو شاعیرێکی لێهاتوو بوو، لە گەلێک ناحیەو قەزاکانی وڵات بەڕێوەبەری ناحیەو قائمقام بووە، پاشان خانەنشین بووە و بە کاری کشتوکاڵییەوە خەریک بوو، ناوە ناوە پارێزەرایەتیشی دەکرد، لە ساڵی ١٩٩٢ز. بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کردووە.

٨- رەقیب حوسێن مەلا لە ژیاندا ماوە و کۆلێژی مافی تەواو کردووە و لە گەلێ شوێنی وڵاتدا بەڕێوەبەری ناحیەو قائمقام و جێگری پارێزگار بووە، پاشان خۆی خانەنشین کردووە، هەنووکە ئەندامی پەرلەمانی کوردستانە. پیاوێکی چاک و خواناسە.

٩- سابیر عەزیز خورشید لە گوندی (بیرەعارەبان)ەوە دەهاتە ئەو گوندە بۆ خوێندن، لە ژیاندا ماوە و لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

١٠- کەریم مستەفا مەلا کوڕی مستەفای مەلای گوندی (باقرتە)یە، برازای حوسێن مەلای بووە، بەداخەوە ئەو برایە کاتێ قوتابی بووە لەو گوندە کوژراوە، دایکی تەنیا ئەو کوڕەی هەبووە.

١١- حەوێزی حاجی جوکل ١٩٢٧ز. لە ژیاندا ماوە، کوڕی حاجی جوکلاغەی گوندی (قۆڕیتان)ە، لەبەر ئەوەی لە گوندەکەیاندا قوتابخانە نەبووە، باوکی ناردوویەتییە گوندی (قازیخانە)، تا ساڵی ١٩٣٩ز. لە خوێندن بەردەوام بووە لە شاری هەولێر، لە دواییدا وازی لە خوێندن هێناوەو بەکاری راوچیاتی و کشتوکاڵییەوە لە گوندی (خدرجیجە)ی بناری قەرەچووغ لە دەشتی کەندێناوە خەریک بووە، هەنووکە لە شاری هەولێر نیشتەجێیە، چاوەکانی کزبوون، دەستی نووسینی هەیە، کتێبێکی بە ناوی (راوو شکار) هەیە، کە لە ساڵی ١٩٩٠ز. بەچاپی گەیاندووە، دیوانێکی چاپ نەکراویشی هەیەو ئامادەیە بۆ چاپ.

١٢- ئەنوەر حوسێن مەلا بە داخەوە لە ساڵی ١٩٤٦ز. لەگەڵ برایەکی دیکەی کە ناوی (جەواد) بووە بەکارەساتی ئۆتۆمبێل وەرگەڕاون و مردوون، قوتابی پۆلی یەکەمی کۆلێژی ماف بوود.

قازیخانە تیرە و هۆزی جۆراوجۆری تێدابووە، لەوانە (پالانی)، کە لە دەشتی دزەییاتی (سۆفیان)یان پێدەڵێن، کاتی خۆی لە دەشتی کۆیەوە لە گوندی (کونەگورگ) کەوتوونەتە ئەو ناوە. هەروەها ژمارەیەکی زۆریش سیان و بلباسی لێیەو هەندێک نانەکەلی و گەردیشی لێیە. لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ١٩١٤-١٩١٨ز. لە ئاقاری ئەو گوندەدا لە بناری زوورگەزراودا بە دیوی دەشتی مرکییە حکومەتی تورک کۆگای دانەوێڵەی لەوێ دامەزراندبوو، هەرچی گەنم و جۆو دانەوێڵەی ئەو ناوچەیە هەبوو لە قوشتەپە و لەوێی خڕی کردبۆوە، پاش ئەوەی سوپای عوسمانییەکان ئەو ناوەیان چۆڵ کردو بەجێیان هێشت، خەڵک هەر بابا بوو بۆ خۆی دەیبرد. ئەو گوندە پێش وێرانکردنی لەلایەن میرییەوە لە ساڵی ١٩٧٨ز. نزیکەی (٩٠) ماڵێک دەبوون. ژمارەی دانیشتوانیشی بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٤٥٠) کەس بووە.

### بیرە عارەبان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییەی، سەربە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی قولتەپە رەشید - دووکەڵە -قازیخانە -باشتەپە -دۆرەزە لەسەریەکە. وشەی (بیرە عارەبان) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە، لە دوو وشە پێکهاتووە، (بیر) بەمانای (بئر) دێت. (عارەبان) کۆی وشەی (عارەب)ە، لە بنچینەدا وشەکە (بیری عارەبان) بووە. دەگێڕنەوە کاتی خۆی ئەو ناوە کەمێ چۆڵ بووە، ئاوەدانییەکی کەمی تێدا بووە، هۆزە عارەبەکان لەسەر سنووری رۆژئاوای کوردستان ناوە ناوە لە زێی دیجلە دەپەڕینەوەو دەهاتنە دەشتی قەراج و هەندێ جار ئاودیوی کەندێناوە و زوورگەزراو دەبوون و دەهاتنە دەشتی مرکییە و ئەو بنارە بە کۆچەرایەتی و مەڕ لەوەڕاندن خەریک دەبوون، ئەمەش بە یارمەتی و دۆستایەتی و برایەتی نێوان سەردک هۆزو تیرەکانی ناوچەی دزەییاتی لەگەڵ سەردک هۆزەکانی عەرەبەکان بووە. کە لێیان گەڕاون بێنە ئەو دەشتە و مەڕو ماڵاتیان بلەوەڕێنن. جا لەو جێگایەی کە هەنووکە پێی دەڵێن (بیرە عارەبان) عارەبەکان بیرێکیان هەڵکەندووە بۆ ئاو خواردنەوەو ئاودانی مەڕو ماڵاتەکەیان، چونکە ئەو دەشتە جۆگە و ئاوی کەم بووە، لەناو هۆزە کوردەکانی ئەو

ناوە بوویتە وێردی سەر زمانیان بیری عارەبان..... بیری عارەبان، جا ئەو وشەیە لە (بیری عارەبان) بۆ سووکی لەسەر زاران بووە بە (بیردعاریان) ئەوجا هەر لەو شوێنەدا بنەماڵەیەک کەڵور (کەروڕ -کەڵهوڕ)ی کورد بۆ یەکەم جار لەو شوێنە دامەزراون و لە نزیک ئەو بیرە ئەو گوندەیان ئاوەدان کردەوەو ناویان لێنا (بیرە عارەبان) بەناوی ئەو بیرە ناونراوە. ئەو بنەماڵەیەش بنەماڵەی (عەلی قادر شێخان) بوو، ئەو پیاوە مرۆیەکی ئازاو عەگید و سوارچاک و مێرخاس بووە، کاتی خۆی لە زۆربەی ئەو شەڕو هێرشانەی، کە دەکرایە سەر دەڤەرەکە لەلایەن هۆزەکانی دیکەدا بەشداری کردووە، کەلوڕەکانیش خۆیان دەڵێن ئێمە لە ناوچەی (بانە سیر)ی موکریانەوە کەوتووینەتە دەشتی کۆیە، ئینجا لەوێوە هاتووینەتە دەشتی هەولێر و لەو گوندە دامەزراوین، بەڵام ئەوەی راستی بێت مەڵبەندی سەرەکی ئەو هۆزە کاتی خۆی ناوچەی زەهاو بووە، هەنووکەش مەڵبەندی سەرەکییان شارۆچکەی کرێندو گەیلان غەرب و کرماشانە لە کوردستانی ئەو دیودا.

بە تێپەڕبوونی زەمانە ئەو گوندە بووە موڵکی عەزیزی خورشیدی بایزی. سابیری کوڕیشی سەردەمێک لە گوندی گەڕەبەشە دادەنیشت، پاشان هاتە گوندی بیرەعارەبان، ئەو تیرە و هۆزانەی تێدا نیشتەجێ بووە... کەڵهوڕ (کەروڕ)، هەروتی کە پێکهاتبوون لەو بەرەبابانەی خوارەوە.... بەرەبابی فەقێ ئەحمەدی کە سەرکاری سابیراغا بوون، بەرەبابی یابەی، بەرەبابی حاجی ئەحمەد باتاسی. هەر لەوبەری کەندەکەی کە (کەندی بیرەعارەبان)ی گچکەی پێ دەڵێن ٤-٥ ماڵێک هەنە (بیرەعارەبان)ی گچکەی پێ دەڵێن، بە موڵک هی قادر ئاغای مەحموودی ئۆمەری مام زێندینییە، زۆربەیان لە هۆزی (سنجاوی)ن، سمایل شێرە ناسراو بە سمایل فەلاح لەوێ دادەنیشت.

## شێخانان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییەی، سەربە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە بناری (زوورگە زراو)ی بە دیوی دەشتی مرکییەی هەڵکەوتووەو لە ناحیەی (پردێ)وە نزیکە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی گردلانکە -شەمزیناوا -مەخشوومە - ئۆمەراوە -سێقوچان لەسەر یەکە، لە خەڵکی ناوچەکەم بیستووە دەڵێن ئەو گوندە بە موڵک هی کوێخا قادر ناوێک بووە، کوڕێکی هەبووە بەناوی ئەحمەد، پاشان کەوتۆتە بن دەستی ماڵی پاشای، خدری پاشای سەردەمێک لەوێ دادەنیشت. بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە (٣١٠) کەس بووەو بەناوی (شێخانان) تۆمار کراوە، چەند ماڵە جوولەکەیەکیشی تێدا بوو، لەوانە ماڵی سەلیمۆکی، کە عەتاری دەکرد، وردەواڵەو شتومەکی دەفرۆشت. ماڵێکی دیکەیان ماڵی (فەقێ سلێمانی خێرۆکە)ی کە بووە موسوڵمان و ناویان لێنا (فەقێ سلێمان) پاشان کەوتە شارۆچکەی پردێ. لە ساڵی ١٩٤٤-١٩٤٥ بارزانی نەمر بۆ مەبەستی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٤٥ سەردانێکی دەڤەری دزەییاتی کردبوو، کە ئەو کاتی مامۆستا (مەلا محەمەدی شێروانی) مەلای گوندی دەبێت.

## گردەشینە

ئەو گوندەش دەکەوێتە دەشتی مرکییەی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێر، لە بناری (زوورگەزراو)یدایە بە دیوی دەشتی مرکییە هەڵکەوتووە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی باشتەپە - دۆڵەزە -تەتەراوە -گردلانکە لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگەزراوە. گوندێکی کۆنە، گردێکی ئاسەواری تووردگەرێژی گەورەی لێیە، بەناوی ئەو گردەوە ناو نراوە. (گردە شینە). وشەی (شین) لە کوردەواریدا بە واتای سەوزایی دێت، هەروەکو دەڵێن شینایی. گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لەبن چیای قەرەچووغی بەدیوی دەشتی کەندیناوەدا هەیەو سەربە شارۆچکەی (دیبەگە)یە، دانیشتوانەکەی لە عەشیرەتی (ئۆمەربل)ن، براگەورەکەیان ناوی کوێخا مەولوود بووە.

حەمەدی حوسێن ئاغای برای ئەحمەد پاشا لە زەمانی عوسمانییەکاندا چەند ساڵێک بەڕیوەبەری (ناحیەی دزەیی) بووە، کە دەکاتە ناحیەی قوشتەپەی ئێستاکە، پیاوێکی خوێندەوارو زانا بووە، جەند گوندێکی لەسەر خۆیان تاپۆ کردووە. لەوانە (ئۆمەراوە -گردەشینە). ئێمە نازانین کڕیویەتیان یان حکومەتی ئەو سەردەم پێی بەخشیون. ئەم پیاوە (٢) دوو کوڕی هەبووە "قەرەنی و

عەلی"، قەرەنی لە گوندی گردەشینەی لەگەڵ کوڕەکانیدا دادەنیشت، عەلی ئاغاش لە گوندی ئۆمەراوە دادەنیشت و (٣) کوڕی هەبوو، برایم و ئەحمەد و موحسین. عەلی حەمەداغەی لە ساڵی ١٩٤٠ز. لە سووریا کۆچی دوایی کردووە، برایمی کوڕی لە جێگای دادەنیشێ، پیاوێکی زاناو لێوەشاوەو نیشتمانپەروەر بوو. ڕۆڵێکی دیارو بەرچاوی لە بڵاوکردنەوەی بیری نیشتمانپەروەری و کوردایەتیدا لە دەڤەرەکەدا هەبووە. گردەشینە تیرەو هۆزی جۆراوجۆری تێدابوو، لەوانە: سارمەمی -فەقێ مەرکی -ئۆرمزیار. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە لەسەرژمێری گشتی دانیشتوانی ساڵی ١٩٥٧ز. (١٤٠) کەس بووە.

## شێراوە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێرێ، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، بە (١)کم لە شارۆچکەی (پردێ)وە دوورە، دواسنووری ناوچەی دزەییاتییە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی چەمەزردەرەی خوارێ -مەخشوومە -تۆبزاوە -شارۆچکەی پردێ لەسەر یەکە، کاتی خۆی ئەو ناوە ئاوەدان نەبوو، تەنیا بواران شوێن و هەواری مەڕدارەکان بوو (ڕەشماڵ نشینەکان) لەو ناوەو دەوچەولکی (پردێ -ئاڵتون کۆپری) هەڵیان دەداو مەڕومالاتیان لێ دەلەوەڕاند. لە ساڵی ١٩٣٥-١٩٣٦ز. کابرایەک بەناوی (سلێمان پۆڕێ) مەڕدار بوو بە تاقەماڵە (خدری پاشای) ناردییە ئەوێ. پاشان ماڵی ئەحمەد خاسێ و لە دوایی ئەوانیش حەمەد چاوشینی باوکی ڕۆڵەی هەڵکەوتووی دەشتی هەولێر (مام وسوو حەمەد دزەیی) لە گوندی (نەبیاوا)ی ناوچەی ساڵەیی هاتنە وێ، کە خاوەن مەڕومالاتێکی یەکجار زۆر بوو و زیاتر لە ٧٠٠-٨٠٠ سەر مەڕیان هەبوو، لەگەڵ وڵاخی سواری و هێسترو ماین. لەساڵی ١٩٤٧ز. کە لە دەڤەرەکە بە (ساری کلۆی) ناسراوە لەو ساڵەدا (کلۆ) دەغڵ و دان و کشتوکاڵی ناوچەکەی نەهێشت و ساڵی دواییش بووە نەهات، هەندێ جار ساڵی (جووت نەهات)یشی پێدەڵێن، تا وای لێ هات خەڵکێکی زۆر لە ناوچەکە باریان کردو بۆ ناوچەکانی دیکەی کوردستان ڕۆیشتن پاشان ماڵی عوسمان عەلی چۆغەر ڕەشی ئەویش هاتە ئەوێ، پاشان بنەماڵەی حاجی عەولا سارمەمی لە دەشتی قەراجەوە هاتنە ئێرە و نیشتەجێ بوون، ئەوجا ١-٢ ماڵە گەراری (گەلالی) لە گوندی (سۆربەش)ەوە، کە کاتی خۆی لە گوندی (مەلا کاغە)ی دەشتی کەندێناوە کەوتبوونە ئەوێ، هاتنە شێراوەی. ئەو گوندە بەرە بەرە ئاوەدان بۆوەو نزیکەی بووە ٢٥-٣٠ ماڵێک، لە ساڵی ١٩٨٧ز. لەگەڵ هەموو گوندەکانی دەڤەری دزەییاتیدا وێران و تەختکرا، ئەو تیرەو هۆزانەی لەو گوندە نیشتەجێ بوون ئەمانەن: سارمەمی -گەلالی -چۆغەر ڕەشی، هەروەها گوندێکی بچووکی دیکەش لە دەشتی هەولێرێ بەهەمان ناو هەیە، ئەویش دەکەوێتە خواروی شاری هەولێرو بە (١٧)کم لێیەوە دوورەو هاوسنووری گوندەکانی قۆپەقران -گردەڕەشە ئەسعەد -قووچە بلباسە، کە بە موڵک هی بنەماڵەی سەید ئەحمەدی هەولێری بووە.

ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز .(٢٩٥) کەس بووە.

## ماستاوە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێرێ، سەربەناحیەی قوشتەپەیە، هەندێک بەدەشتی شەمامکی لە قەڵەم دەدەن، هەندێکی دیکە دەڵێن بەدەشتی مرکییەی دەژمێردرێت، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی تەندوورە -کلیسە -دوغان -عەلیاوەی شێخان -سیاو - سیراوە لەسەریەکە، گوندێکی کۆنەو (ماستاوە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ماست + ئاو + ە) واتا (ناو + ناو + ە) پێکهاتووە، بۆیە ئەو ناوەشی لێنراوە، چونکە ئاوێکی خراپی هەیە و لێڵەو لە شێوەی ماستاودایە. لە هێروەی گوندی ماستاوەدا گۆڕستانێک هەیە، گومبەتێکی لێیە دەڵێن، هی شێخی ماستاوەیە، گومبەتەکە ڕووخاوە، خەرابەیەک لە نزیکییەوە هەیە پێیدەڵێن (خەرابە نادر). دەڵێن کاتی خۆی گوایە ئەو گوندە هی ئەو (نادر) ناوەی بووە، لە زەمانێکی زووەوە بنەماڵەی شێخ حاجی کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ، ئەو (٢) دوو گوندە (عەلیاوا -ماستاوە) بوویتە موڵکی وان، گوندی (یەدیقوو) لە ناوچەی کەندێناوەو ساقیە لەدەشتی شەمامکێ هی وانە، ئەو بنەماڵەیە خۆیان بە (خالیدی) دادەنێن. ماستاوە تیرەی جۆراوجۆری تێدایە، وەکو ڕۆژبەیانی - ئۆرمزیار، ژمارەی دانیشتوانی بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز. (٥١٢) کەس بووە.

**سیراوە**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێرێ، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی رەختاوە -تەندوورە -ماستاوە -سیاو -شێخ شەروان -شابان شارە -عەوێنە -سەعداوە، لەسەریەکە. دەڵێن بەمولک هی بنەماڵەی شێخ هیدایەتوڵلای هەولێری بووە، ٨-٩ماڵێک دەبوون، پیاوێک بەناوی (مەولوود بەگی گەردی) سەرکاریان بووە، سیراوە ئاوێکی خراپی هەبووە، لێراو و سوور بوو، بۆن و تامی سیری لێ دەهات، هەربۆیەش بەو ناوە ناونراوە، وشەی (سیراوە) ناوێکی کوردییە لە (سیرئاوە)وە هاتووە (سیر + ئاو + ە) واتا (ناو + ناو + ئامرازی ە). بەواتای ئاوەکەی وەکو ئاوی سیرە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (١١٥) کەس بووە.

**رەختاوە**

ناوی گوندێکی دیکەی دەشتی هەولێرە، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە و ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی تەندوورە -سیراوە -دهێمات -سەعداوە، لەسەریەکە. بەمولک هی بنەماڵەی عەلی پاشای دۆغرەمەچی بووە. کاتی خۆی حکومەتی عوسمانی پێی بەخشیون و لەسەری تاپۆ کردوون، ٥-٦ ماڵێک دەبوون و سەرکاریان لەوێ دانابوو، سەرپەرشتی زەویوزارو کشتوکاڵیان بۆ دەکردن، یەکێکیان لەوانە (شەریف شوان) بووە، ئەو پیاوە وەکو باسی لێوەدەکەن پیاوێکی چاک و سەخی تەبیعەت بووەو لە عەشیرەتی شوان بووە، پاش ئەویش کوێخا مستەفای کوڕی لەجێی دانیشتووەو ئەویش لەسەر هەمان رێوشوێنی بابی رۆیشتووە.

**شابان شارە (شەعبان شارە)**

ناوی گوندێکی کۆن بوو، کەوتبووە دەشتی مرکییەی، لەبناری (زوورگەزراو)یدا هەڵکەوتبوو، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شێخ شەروان -ماستاوە -سیراوە -عەوێنە لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگی (زوورگەزراو)ە. لەوێ ئاودیو بێ گوندی (بەرزەوار)ی کەندێناوەیە. گوندێکی زۆر کۆن بووە، کاتی خۆی هی جوولەکەکان بووە، دەڵێن بەناوی کابرایەکی جوولەکە کراوە ناوی (شابان) بووە و ئەو ئاوەدانی کردۆتەوە، هەندێکیش دەڵێن (شارە)ش هەرناوی گوندێکی دیکەی جوولەکەکان بووە، لە نزیک گوندی (شابان). هەرچۆنێک بێت کاتی خۆی ئەو ناوە، بەتایبەتی دەشتی شەمامکێ جوولەکەی تێدا هەبووە، زۆر لە پیرە بەساڵاچووەکانی دەڤەرەکە شوێنەواری ئەو گوندەیان کاتی خۆی دیوە. ئەو گوندە لەزووەکەوە نەماوەو کاول بووە. وابزانم ئاقارەکەی هەندێکی بەگەڵ ئاقاری (شێخ شەروان)ی کەوتووە. بەشەکەی دیکەشی بەبەر ئاقاری گوندی (عەوێنە)ی کەوتووە. لە دەڤەرەکە ناوی (شابان) دەتوانم بڵێم هەر نییە. ئەگەر هەشبێت ناوی (شەعبان)ە ئەو ناوەش زۆر زۆر کەمە. بەڵام لەناو خێڵی مەنتکان ناوی (شابان) زۆرە.

**منارە**

منارە یەکێکە لە گوندە هەرە کۆنەکانی دەشتی مرکییەی، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی سورێژە -ترپەسپیان -باقرتە -سێبیران -جدیدە لەک -یەدی قزلەر لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگەزراوە. بەمولک هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە، گوندەکانی مەلافەندی لە دەشتی مرکییەدا ئەمانە بوون: منارە -جدیدە -ئاودەلۆک -تەندوورە -شێخ شەروان، ئەوەی ئێمە زانیاریمان لەسەر هەبێ کاتی خۆی زۆر تیرەو بنەماڵە تێیدا نیشتەجێ بوون و پاشان جێیان هێشتووە. وەکو (شێروانی)یەکان کە لەناوچەی (مێرگەسۆر) و (شێروان مەزن)ەوە هاتوون و کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ و لەگوندەکانی (بێریات) و منارە -باقرتە و کەسنەزان -سێبیران بۆ یەکەم جار نیشتەجێ بوونە. پاشان گوندی (بێریات) کە مولکی خۆیان بووە دەیفرۆشنە بنەماڵەی (حەیدەری)یەکانی هەولێرێ، پاشان ئەو ناوەیان جێهێشتووەو ئاودیوی دەشتی کەندێناوە بوونەو لەبناری چیای قەرەچووغ گیرساونەتەوە، لەگوندەکانی دارەخورما -چیغلۆک -حاجی شێخان -حەسەن بلّباس، نیشتەجێ دەبن. ئەو حەسەن بڵباسە کوڕی کاوەیسی کوڕی کانەبی فەقێ وەیسی بووە، ئەو گوندە بەناوی وی ناونراوەو لەگەڵ شێروانییەکاندا لە رێی ژن و ژنخوازیدا خزمایەتییان هەبووە، کاتێ بڵباسەکان لەو ناوە

نەماون و ئەو شوێنەیان جێهێشتووە، گوندەکە بووەتە مولکی شێروانییەکان. دەڵێن لە کۆندا منارە شار بووە. مزگەوت و منارەیەکی بلندی هەبووە، بۆیە بەوناوە ناونراوە، چەند بیرێکی کۆنی تێدایە، هەندێکیان بەبەردو هەندێکی دیکەیان بەکەرپووچ هەڵنراون، شوێنەوارەکەیان هەتا ئەم ساڵانەی دوایی هەر مابوو، لە ساڵی ١٩٤٥ز. برایمی حاجی ئەمینی، کە دەکاتە باوکی دکتۆر خورشیدی ئەو کاتی لەگوندی (گرد عازەبان) دادەنیشت بە (٣٥) هەزار دینار (٦) شەش گوندی لەسەریەک لە (عیزەدینی مەلافەندی) کڕی، یەکێک لەو گوندانە منارە بوو، گوندەکانی دیکەش ئەمانە بوون: جدیدە -ئاودەلۆک -شێخ شەروان -تەندوورە -نۆغەران.

برایماغا ماڵی هێنایە (منارە)و خانوویەکی باشی لێ دروست کردو ئاشی ئاگری دامەزراند، برایەکانی (جەوهەرو ئەنوەرو حاجی عوسمان)ی ناردە گوندی (نۆغەران) و لەوێ دامەزران. منارە لەو ساڵانەی دواییدا گوندێکی زۆر بچووک بوو چەند ماڵێک دەبوون، ئەو تیرەو هۆزانەی تێدا بوو: (داوودی)، کە کاتی خۆی لەناوچەی دووز کەوتوونەتە ئێرەو وەکو بنەماڵەی عەلی منارە سەربەو هۆزەن.

ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٤٠) کەس بووە.

### ئاودەلۆک

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییە و سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەلبەندی هەولێرە، لەبناری (زوورگە زراو)دایە بەدیوی مرکییەی هەڵکەوتووە. دەڵێن کاتی خۆی ئەو گوندە لە گوندی (جدیدە)ی جودا بوویتەوە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی جدیدە -یەدی قزلەر -گردعازەبان -عەلیاوەی شێخان -هێلەوە، لەسەریەکە. (٦-٧) ماڵێک دەبوون، لە (عەشیرەتی لەک)ن، بەمولک هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە. ئەو گوندانەی کاتی خۆی لە دەشتی مرکییەدا هی بنەماڵەی مەلافەندی بوون ئەمانەی خوارەوە بوون: جدیدە -ئاودەلۆک -منارە -ئۆمەرمامەکە -شێخ شەروان -تەندوورە، لە دەشتی شەمامکێدا (نۆغەران)یشی هەبووە، لەساڵی ١٩٤٥ بنەماڵەی فارساغا (٦) شەش گوندیان لەسەریەک لە (عیزەدینی مەلافەندی) بە (٣٥) سی و پێنج هەزار دینار کڕی، کە یەکێک لەوانە ئاودەلۆک بوو. (ئاودەلۆک) بەناوی ئەو پیاوە ناونراوە کە ناوی (ئاودەل) بووە، ئەو بۆ یەکەم جار ئەو گوندەی ئاوەدانکردۆتەوە. ئەم سەرگوزشتەی خوارەوەشتان بۆ دەگێڕمەوە کە پەیوەندی بەباسەکەمانەوە هەیە، لەو وڵاتی دزەییاتییەدا (مام عەلی عەبۆ) هەبوو لە (لەک)ەکانی (جدیدە)و (ئاودەلۆک)ی بوو، پیاوێکی ئازاو سەیرو سەمەرە بووە، تفەنگێکی رەشکەی هەبووە، ناوی لێنابوو (گرمژ گەردان)، تفەنگەکەی قایشی نەبوو، بەدۆخین بەستبووی و لەشانی دەکرد، زۆر کەیفی بە تفەنگەکەی دەهات، جارێکیان مام عەلی کەسی لەلا نابێ و تفەنگەکەی لەشانی دەکاتەوەو بەدەستەوەی دەگرێت، ئەم سەرو ئەوسەر دەکات، هەڕاجی دەکات بەشێوەی (لەکی) دەیگوت: هەڕاج! هەڕاج! من گرمژ گەردانم، مەفرۆشم، هەرچی نەمەکڕی گەوادە، هەرچی نەمەفرۆشی گەوادە.

### ئەسحابە لەک

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکییە، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەلبەندی هەولێرە، گوندێکی کۆن نییە، چەند ماڵێک لە بەرەبابی (جەردیسی) سەربە عەشیرەتی لەک لە خزمەکانیان لە گوندی (جدیدە) لە ساڵی ١٩٧٢ز. جودا بوونەتەوەو هەر لە ئاقاری گوندەکەدا لەناو زەوییەکانیان دادەمەزرێن و ئەو گوندەیان ناولێنا (ئەسحابە لەک)، ٤-٥ ماڵێک دەبوون.

### جدیدە

ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی مرکییە، سەربە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەلبەندی هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی منارە -یەدی قزلەر -ئاودەلۆک، لەسەریەکە، گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر، دەگێڕنەوە کاتی خۆی زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر هەندێک بنەماڵە لە عەشیرەتی لەک لە ناوچەی ساڵەیی و دەوروبەری کەرکووک هاتوونەتە ئەو ناوەو لەو دەشتە پان و پۆڕەدا دامەزراون و گوندی (جدیدە)یان ئاوەدان کردۆتەوەو بە (جدیدەی لەکان) ناسراوە، بەمولک هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە. گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لە دەشتی

بەرانەتیدا هەیە، سەربە ناحیەی (خەبات)ە، (جدیدە زاب)ی پێدەڵێن. پیرە بە ساڵاچووەکانی گوندی (جدیدە) دەڵێن کاتێ باپیرانمان هاتوونەتە ناوچەی دزەییاتی (٤) چوار برا بوونە یەکێک لەو برایانە ناوی (برایم) بووە، ئەو گوندەی بەناوی خۆی (برایمە لەک) لە دەشتی مرکییەی ناوچەی قوشتەپەدا ئاوەدانکردۆتەوە، ئەوەی لە وەچەی ئەو پیاوە بوونەتەوە بەبەرەی یا بەرەبابی (برایمی) ناسراون. برایەکانی دیکەی (برایم) خەمان و جەرجیس و سمایل، هەریەکەیان بەرەبابێکی زۆری لێ کەوتۆتەوەو لەو دەشتەدا بڵاو بوونەتەوە لە گوندەکانی جدیدە -ئاوەدلۆک -ئەسحابە لەک، هەنووکەش ئەو دێیە واتا (برایمە لەک) لە دەشتی هەولێردا بەو ناوە هەر ماوەو دەکەوێتە ناوچەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێرو بووە موڵکی بنەماڵەی بایزی، کاتێک لەکەکان ژمارەیان زۆربووە لەجدیدە و ئاوەدلۆک بەدوای مەڕومالآت و ئاژەڵ بەخێوکردنەوە خەریک بوونەو ئاوای کەندێناوەو دەشتی قەراجی بوون، لەوێ گوندی (چل هەوێزە) و (دووشیوان)یان ئاوەدان کردۆتەوەو لەدەشتی قەراجیش (غەرابە لەکە -قوچ -حەسارۆک -حوشترالوک). دانیشتوانی جدیدە لە بەرەبابی (برایمی)ن. لەو ناوەدا پەندێکی کوردی سەری هەڵداوە دەڵێن: (ئەگەر لەکین هەموو یێکین) ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٨٥) کەس بووە. (فەرحانە کوێر) هەبوو خەڵکی (جدیدە)ی لەکان بوو، حیسابگرەکی باش بوو، سەرەڕای ئەوەی هەردوو چاوەکانی کزبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە کەش و هەواناسیندا وێنەی نەبوو. دەگێڕنەوە جارێکیان لەکەژی زستاندا ڕۆژ لەدەردەوە دەبێت، مام فەرحان دەڵێتە شوانەکانی ئاوایی: ئەوڕۆ کەستان لە گوندی دوورنەکەونەوە نەوەک تووشی زەرەر بێن، پاش سەعاتەکی نەبرد کەش و هەوا گۆڕاو هەوری هێناو کردییە باران و ساردی و سەرماو فەرتەنەیەک هەر مەپرسە.

زۆر شتی دیکەشی لەم بارەیەوە لێ دەگێڕنەوە، لە حیسابگرە بەناوبانگەکانی دەشتی هەولێر، ئەوانەی کە ناوبانگیان هەبووە ئەمانە بوون: کاک عەولا (شێخ عەولای عەلیاوە)، خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدی عەلیاوەیی، فەرحانە کوێر.

## میراوە

میراوە ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری (زوورگەزراو)ی لەدیوی دەشتی مرکییەی ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ هەڵکەوتووە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری قورشاغلوو و سۆربەش لەسەریەکە، گوندێکی کۆنەو مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر، بە موڵک هی بنەماڵەی (عەلی خاسان) بوو، ئەو پیاوەش یەکێک بووە لە خزمانی سوڵتاناغا. ئەم گوندە کارێزێکی ئاوی هەبووە (کارێزی میراوە)یان پێگوتووە، ئەو ناوە رەزوباغ بووە. هەتا ساڵانی پێش گرانی ساڵی ١٩١٧ز. ئاوی هەبووە، لە نەخشەکانی کشتوکاڵیدا بەناوی (میراوە ئەحمەد پەرکان) تۆمارکراوە، ئەو ئەحمەد پەرکانە لەنەوەو خزمەکانی سوڵتاناغایەو لەسەر گوندی سۆربەش کوژراوە. ئەمەش سەرجەلەی ئەو بنەماڵەیەیە: بورهان مەلا عوسمان حاجی پیرداود ئەحمەد پەرکان قادر عوسمان وەلی عەلی خاسان. دەڵێن کاتی خۆی چەند بنەماڵەیەک سەربەهۆزی (کارەش) لەو گوندە دادەنیشتن، پاشان باریان کردووە بۆ دیوی کەندێناوەو گوندی (جانە)یان ئاوەدان کردۆتەوە.

## باشتەپە

ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی مرکییە، لەبناری (زوورگەزراو)ی بەدیوی دەشتی مرکییە هەڵکەوتووە، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی قازیخانە -بیرەعارەبان -دۆڵەزە -گردەشینە، لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگەزراوە، باشتەپە گوندێکی گەورەو کۆن بووەو هەردەم لە (٤٠٠) ماڵ کەمتر نەبووە، وشەی (باشتەپە) ناوێکی لێکدراوی تورکییە، لەدوو برگە یا ناو پێکهاتووە: یەکەم (باش) بەمانای (سەر) دێت، دووەم (تەپە) بەمانای گرد دێت. بەسەریەکەوە بەمانای (سەرگرد) دێت. بەڵێ گردێکی ئەسەری لە نزیکییەوە بەناوی گردی باشتەپە هەیە کە گردێکی گەورەی تووردگەڕێژە، ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندەش دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی عوسمانییەکان، بەموڵک هی عەشیرەتی سیان بووە، تیرەی (کاکی -شەمدینی) سەربە هۆزی سیان کاتی خۆی لەوێ نیشتەجێ بوون. پاشان هەندێکیان بەمەرداری ئاوای دەشتی کەندێناوە

بوون، ئەو گوندەش بە مولک هی بنەماڵەی (کوێخا سادق)ی بووە، چەند ساڵێک پێش گرانی ساڵی ١٩١٧ز. کەوتۆتە بن دەستی بنەماڵەی پاشای، قادری پاشای لەوێ دادەنیشت، باشتەپە تیرەی جۆراوجۆری تێدایە، لەوانە سیان -سارمەمی -جافی تەلان، بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی (٤٥١) کەس بووە.

## پیرداود

ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی مەرکییەی، سەربەناحیەی قوشتەپەیەو لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، نزیکەی (١٨)کم لێیەوە دوورە. ئاقاری لەگەڵ ئەم گوندانەی خوارەوە: قۆریتان -عەلیاوە - مێرخوزار-ترپەسپیان -دووسەرە فەتاح -دووسەرە جەبار - سوریژە، لەسەربەکە. وشەی (پیرداود)یش ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (پیر + داود) واتا (ناو + ناو) پێکهاتووە، گوندێکی زۆر کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نازانین، هەرئەوەندە هەیە ناوی بەناوی پیاوچاکێک کراوە، کە ناوی (سەید داود) بووە، بە (پیرداود)ی گۆچان کەسک ناسراوە. گۆڕەکەی هەنووکە لەسەر ئەو گردەیە کە بە گردی پیرداودی ناسراوەو ئێستاکە بووەتە گۆڕستانێکی گەورە، خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری و تەنانەت هەندێک لە دانیشتوانی شاری هەولێریش مردووەکانیان لەوێ دەشارنەوە، ئەم قەبرستانەش لەسەر رێگای هەولێر - مەخموور هەڵکەوتووە. بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی (٤٣٨) کەس بووە. ئێمە نازانین پێشتر ئەو گوندە هی کێ بووە؟ ئەوەندە هەیە لە پێش ساڵی ١٨٩٩ز. قادر ئەحمەد حاجی بایزی لەوێ دادەنیشت، حاجی بایز (٥) کوری هەبوو، لەوانە برایم بایز لە مەخموور دادەنیشت، خورشید لە گوندی لهێبان دادەنیشت، ئەحمەد لە پیرداود، رەحمان و حەمەدەمین کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبووی نیشتمانپەروەرو کوری هەڵکەوتووی دەشتی هەولێر کاک ئەحمەد حەمەدەمین - موحسین و کاک سەعدی و ئەنودرو عومەری هەیە، قادری ئەحمەدی بایزی لە ساڵی ١٩١١ز. بەدەستی جەندرمەکانی عوسمانی دەکوژرێت، لەم بارەیەوە خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەمەدی چروستانی لە کتێبەکەیدا بەناوی (یاداشتەکانی مناڵی و بەشێکی سەردەمی فەقێیەتی) لە لاپەرە ٨٠-٨١-٨٢ بۆمان دەگێڕێتەوە، چونکە ئەو کاتی ئەو مامۆستا بەرێزە فەقێ بووە لە گوندی (ترپەسپیان)ی سەربەناحیەی قوشتەپە لەدەشتی هەولێردا، لەلای خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ جەلالی بەرزنجی دەیخوێند، ئەو کاتی واتە لە ساڵانی ١٩١٠-١٩١١ز. ئەو رووداوە رووی داوە، ئەمەش دەقی نووسینەکەی بەرێز مامۆستا چروستانی نەمرە: (لە ترپەسپیان مامەوە زۆر رووت بووم پولێکم نەبوو، هەرچۆنێک بوو رامبوارد، ئێوارەیەک (٣) سێ ئێسترسوار هاتن لە حەوشی مزگەوت دابەزین، مامۆستام ناردی بەدواما، مەبەستی (مەلا شێخ جەلالی ترپەسپیان)ە، فەرمووی: کاکە حەمە، ئاغای پیرداود کوژراوە، ناردوویانە کە (٣) سێ فەقێیان بۆ بنێرم ئێمشەو لەسەر جەنازەکەی قورئان بخوێنن، دەچیت یان نا؟ وتم: بەڵێ دەچم، من و دوو فەقێی دیکە سوار بووین، نوێژی مەغریب لایدابوو گەیشتینە پیرداود، تاوڵێکیان (مەبەستی رەشماڵ)ە بۆ هەڵدابووین، جەنازەکە لەوێ داندرابوو، نوێژمان لەسەری کرد، دەستمان کرد بە قورئان خوێندن، چوار کەس بووین من و دوو فەقێیەکەو سەیدێک ئەویش لەگەڵمان لای خۆی وەک موراقیب و ئەمیندارمان، کە ئێمە رانەوەستین. پاش عیشا نانیان بۆ هێناین، شەو دەرەنگێک یەک تەشتی مێوژی زراریان بۆ هێناین، چەند دەقیقەیەک بە خواردنییەوە مەشغوول بووین، شەوێ دەستنوێژم تازە کردەوە، لە شەقە جۆگەیەک، کە بەلای دەوارەکەدا دەڕۆیشت، کاک سەید زۆر سست بوو لە قورئان خوێندن و ئەوەندەش کە دەیخوێند، چونکە زۆر غەڵەت و پەڵەت بوو، هەر بەوەدا رادەگەیشتم کە غەڵەتی پێ بڵێمەوە. ئاخری رجام لێ کرد کە بەدەنگی نزم بخوێنێت، سبەینێ کە رۆژ بۆوەو دۆست و دوژمن لێک ئاشکرابووین و نوێژمان کرد. ئینجا وتم: کورینە چەندتان خوێندووە؟ فەقێیەکیان وتی: من شازدە جزووم خوێندووە، ئەوی دیکەی وتی من دوازدە جزووم خوێندووە، منیش بیست و شەش جزووم خوێندبوو. لەسەر (والذاریات) راوەستابووم، وتم ئینجا خۆ هیچمان خەتمان تەواو نەکردووە، ئەگەر پرسییان بڵێین چی؟ سەیدەکە وتی کورینە بڵێن خەتمی تەواومان کردووە. لەوێش خەتم بە چواردە قرانی ردش بوو، بە سەیدەکەم وت: بەخوا دیارە ئەمینداری چاکی، وتی: کورە لەپاشان بۆی تەواو کەن. وتم باشە، ئێوە چی دەڵێن

بلێن ئەما من دەڵێم چوار جزووم ماوە خەتم تەواو بکەم، وتیان باشە، پاش هەتاوکەوتن برای ئاغا هات لەگەڵ جوولەکەیەک، کە ئەمیندارو کیسە باخەڵیان بوو، وتیان چیتان خوێندووە، سەیدەکە وتی: هەموو خەتمیان تەواو کردووە وتم: من چوار جزووم ماوە، جووەکە پارەی داینێ.

**قورشاغلو**

قورشاغلو ناوی گوندێکە لەگوندە هەرە کۆن و گەورەکانی دەشتی مرکییە (مولکیە)یە، سەربەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، (٣٥) کیلۆمەتر لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە. بە (١٠)کم لە خوارووی رۆژاوای قوشتەپەدایە، گوندێکی کۆنە، وەختی خۆی میرە دێ بووە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی سێبیران - باقرتە -دووگردکان -دووکەڵە -سۆربەش -میراوە، لەسەریەکە، گردێکی ئاسەواری گەورەی لێیە، کەوتۆتە ناو گوندەکەوە، توورەگەرێژە، کاتی خۆی بنەماڵەی (سوڵتانی گورجی زادە) کە یەکێک بووە لە نەوەکانی (حەسەن پاشا) لە کوردستانی تورکیاو دەکەوێتە دەشتی هەولێر، ئاوەدانی کردۆتەوە، سوڵتانی عوسمانی موقاتەعەیەکی گەورەی زەوی و زاریان پێدەبەخشێ بەناوی (موقاتەعەی مولکیە)، ئەو موقاتەعەیەش ئاقاری (١٢) گوندی ئەمڕۆکە دەگرێتەوە لەگەڵ (٣) کارێزی ئاو دەکەوێتە ناوییەوە، ناوی مرکییە (ملکیە) هەر لەمەوە هاتووە، ئەو بنەماڵەیە بۆ یەکەم جار لە گوندی (قورشاغلو -قورشاغلی) دادەمەزرێن، پاشان سۆربەش (صویاش) ئینجا (میراوە) و (دووگردکان) ئاوەدان دەکەنەوە. گوندەکانی ئەو موقاتەعەیەش ئەمانەی خوارەوەن: قورشاغلو - صویاش (سۆربەش) - میراوە -باقرتە - دووگردکان - سێبیران - تەریە سپیان - پڵنگە - دووکەڵە -قازیخانە - میرخوزار......

شوێنەواری کارێزەکانیش ئێستاش هەر ماون، یەکێکیان کەوتۆتە سەرەوەی گوندی سۆربەش، ئەویدیکەیان لە نێوان ئاقاری باقرتە و قورشاغلو، ئەویدیکە لە گوندی میراوەی نزیک قورشاغلووە، قورشاغلو یان قورشاغلی ناوێکی دارێژراوی تورکییە، لە وشەی (قورشاغ)ەوە هاتووە، کە بەمانای (پشدێن) دێت، لەگەڵ پاشگری (لۆ -لی) پێکهاتووە ...قورشاغ + لو (لی). (قورشاغ) هەندێ جاریش بەمانای (تاسلوقە) دێت، ئەمەش بەکەرت و پاچەی گۆزەو دیزەو کووپەو شەربەو جەڵحەو جەرەی شکاو دەگوترێت. بابێینەوە سەر بنەماڵەی سوڵتاناغای، ئەو پیاوە هەروەکو پیاوە بەساڵاچووەکان دەگێڕنەوە پیاوێکی لێوەشاوەو بە رووەت و قسەزان بووە، لەزەمانی عوسمانییەکاندا لەقەڵای قورشاغلوی دادەنیشت، زۆر حەزی لە راوکردن کردووەو هەمیشە تاژی و تولەی هەبووە، ئێستاش لە دەڤەرەکەدا بوویتە پەند دەڵێن: "بوویتە تاژی و تولەی ماری سوڵتاناغەی لەسەر گوفەکێ دەژەنی". ئاقاری ئەو گوندەش گەورەو بەرفراوانە، زەویوزارێکی باش و بەپیتی هەیە، زەوییێکی راستانە وەک سێنی وایە، بەردێکی تێدا نابینییەوە، ئاقارەکەی نزیکەی ١١٠٠٠ دۆنمە، قورشاغلو گوندێکی گەورە بووەو هەردەم لە (٤٠٠) ماڵ کەمتر نەبووە. خەڵکی گوندەکە کاسبن و بەکشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریکن، پەندێکی دیکەش لە دەڤەرەکە سەری هەڵداوەو دەڵێت: (دەرێی جۆخینی قورشاغلوویە !) یان (دەمنی جۆخینی قورشاغلوە !) یان (بوویتە جۆخینی قورشاغلوی).

هەروەکو دەڵێن ئەو دنیایە بێ بەقایە، بێ وەفایە هەردەم وەکو پەشتەماڵی حەمام بەبەر یێکەکێ وەیە، لەبەر گۆڕانی زەمانە و رووداو، ئەو گوندە کەوتۆتە بن دەستی (ئەحمەدئاغا) لە گوندی (عاڵلا)، کە (عەبدوڵلا گوجیلان)یشی پێدەڵێن هاتۆتە ئێرە بەیارمەتی حکومەتی عوسمانی و لەبەر دەوڵەمەندییەکەی لێرە ماوەتەوەو بووەتە موڵکی ئەو، پاشان ئەو (ئەحمەد ئاغایە) بە ئەحمەد پاشا ناسرا، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٤٢١) کەس بووە. بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٧ز. قوتابخانەی میری لێ کراوەتەوە، ئەمەش بەهەوڵ و کۆششی (ئاغای پاشا) بووە، یەکەم مامۆستا کە هاتۆتە ئەوێ (رەفیق عالی) بوو خەڵکی شاری کەرکوک بووە، دەڵێن کاتی خۆی ئەفسەر بووە لە سوپای دەوڵەتی عوسمانی، یەکەم فەراشی قوتابخانەکەش خوالێخۆشبوو (مەلای حەمەدی حەسەنی) بووە، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەو گوندەو گوندەکانی دەوروبەری منداڵەکانیان خستە بەر خوێندن، بۆیە هەنووکە دەبینین ژمارەیەکی زۆر خوێندەواری چاک هەڵکەوتوون، کە

هەڵگری پلەی بەرزن لە کۆلیجەکانی وڵات و دەرەوە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە مامۆستا و ئەفسەرو ئەندازیارو پزیشک و فەرمانبەری جۆراوجۆری لێ هەڵکەوتووە، ئەمەش ناوی هەندێک لەو قوتابیانەی، کە لە ساڵی ۱۹۲۷ز. خراونەتە بەرخوێندن:

١- عەلی عومەر ئەحمەد مرۆت، لەژیاندا ماوەو لە گەڕەکی ماجیداوا نیشتەجێیە، لەدایکبووی ساڵی ۱۹۱۹ز.

٢- رەحمان حوسێن ئەحمەد، دەرچووی کۆلیجی مافە (حاکم) بووە، هەنووکەش خانەنشینە لە شاری بەغدا نیشتەجێیە.

٣- عوسمان پیرداود ئەحمەد لەژیاندا نەماوە.

٤- کا حەسەن کانەبی (خەڵکی گوندی (گولەک) و (رەوانگە)ی دەشتی بیتوێنی بوو، هەنووکە ئەو گوندانە کەوتوونەتە ژێر ئاوی دەریاچەی دوکانەوە، کاک حەسەن برازای ئاغەژنە (مریەم)ی بوو، لەدەشتی بیتوێنەوە هاتبووە قورشاغلو دەیخوێند.

٥- کاکە رەسووڵ کاکەمینە ئەویش لەگەڵ کاک حەسەنی کانەبی بوو.

٦- بابەشێخی کوڕی شێخ سدیقی ماستاوە.

٧- شێخ جەلالی عەلیاوەی، مردووە.

٨- رەئووف مەلا مەعرووف، لەژیاندا ماوە.

٩- حەمە شەریف ئەحمەد برایم، برای دکتۆر پیرۆت ئەحمەد برایە، لە ژیاندا نەماوە.

١٠- کوڕی شێخ شەفیقی میرەکان.

١١- حەسەن عەددسۆر، لەژیاندا ماوە.

١٢- جەبار حەسەن عەولا، مردووە.

١٣- عوسمان سۆفی حوسێن کەنعان، مردووە.

١٤- قادر کەریم جەلال، مردووە.

١٥- حەمەدەمین حەمەد، (ناسراو بە مەلا رەش).

### ناوە جوگرافییەکانی

هەرلە ناو دۆڵە زوورگەکانی (زوورگەزراو)یدا بەدیوی دەشتی مرکییە لە ئاقاری زوورگی قورشاغلویدا ئەو کانییانە هەیە.

دۆڵە بەناو کە بەشێوەی خۆجێیی (دۆرە بەناو)ی پێدەڵێن، دۆڵێکە لە دۆڵەکانی (زوورگەزراو)ی لە ئاقاری زوورگی قورشاغلویدایە، دۆڵەکە ئاوی زۆرە، بۆیە بەو ناوە ناونراوە. کانییەکی لێیە بەناوی کانی (دۆڵە بەئاو)، کانییەکی گەورەیە، ئاوەکەی ساڵ دوازدەی مانگێ وشک نەدەبوو، بەڵام هەنووکە وا نەماوە لەبەرئەوەی بەفروباران کەمە، ئاوەکەی هەتا مانگی جۆزەردان دەمێنێ پاشان وشک دەبێت.

بیرە (لەلە) ناوی کانیاوێکە، کە لە ناو (زوورگەزراو)یدایە لە ئاقاری زوورگی قورشاغلو هەڵکەوتووە، کانییەکی گەورەیە، جاران ئاوی زۆر بوو لەبەری دەڕۆیشت، ئاوی هەردەم هەبوو، بۆیە پێیدەڵێن (بیرە لەلە) چونکە کانییەکی نەختێک قووڵ بوو، لەشێوەی بیردا بوو، بیرە بەرازە.

گۆمەکان: ناوی ئەو گۆمانەی لە ئاقاری گوندی قورشاغلوویدایە ئەمانەن:

گۆمی خەزنەی: لەناو ئاقاری گوندەکەیە، نزیکی ماڵانە، گۆمێکی گەورە بوو، ئاوەکەی هەتا دروونەی گەنمان دەما، مەڕدارەکان مەڕوماڵاتیان لێ ئاودەدا.

گۆمی حەمۆکی: لەناو گوندیدا بوو، گۆمێکی گەورە بوو جاران، خەڵکی گوندەکە ئاوەکەیان بۆ بڕینی خشت بەکار دەهێنا. لە تەنیشت ئەم گۆمە بیرێک هەبوو بەناوی ئەو پیاوە کرابوو، کە خاوەنی ئەو بیرە بوو، ناوی (حەمۆک) بووە، ئاوی میراوەی دەهات لە گۆمی حەمۆکی دەکردەوە.

گۆمی موتربەی: ئاوەکەی لە (کەندی موتربە)ی لە (زوورگەزراو)یەوە رادەهات لە (کەندی باقرتە)ی دەکردەوە، کەندی باقرتەش ئاوەکەی لە ئاقاری گوندی (یەدی قزلەر)یدا لە (شێوەسۆر)ی دەکردەوە. ئەو گۆمەش کەوتبووە نێوان ئاقاری (قورشاغلو)و (باقرتە)ی.

گۆمی قووبە: ناوی گۆمێکە لەنزیک (گومەت قەرەنتوو)ی، ئاوەکەی هەتا دروونەی گەنمان دەما، لەناو ئاقاری گوندی قورشاغلوویدایە، خەڵکی گوندەکە مەڕوماڵاتیان لێ ئاودەدا.

گۆمە قەرەنتوو: لە راستیدا (گومەت قەرەتوو)ە ناوی پیاو چاکێکەو (گۆڕستان)یش بووە، لەنزیک گوندی (میراوە)دایە، بەڵام ئەم گوندە لەپێش گرانی ساڵی (۱۹۱۷)دا چۆڵ بوو و ئاوەدان نەکراوەتەوە، ئاقارەکەی هەندێکی بەبەر گوندی قورشاغلوی کەوتووە، ئەوی

دیکەشی بەبەر ئاقـاری گـوندی سـۆربەشی کـەوتووە، دەگێڕنەوە کاتی خۆی ئەو پیاوچاکە گومەت (گومەزێکی) بەکەرپووچ و گەچ لەسەر کرابوو، دار تووبەکی گەورەی لێ بووە، تووەکـەش رەش بـووە، بۆیە بە (قـەرەتوو)واتا (تووڕەش) ناسراوە. بەڵام خەڵکەکە (قەرەتوو)یان کردووە بە (قـەرەنتـوو) هەنووکـەش شـوێنەوارەکـەی هەرمـاوە، جارجارە لەکاتی کێڵان و جۆتکردندا وردە گەچ و کەرپووچ بەدیاردەکەون، دەڵێن (٣٠٠) ساڵێک لەمەوبەر ئەو ناوە رەزوباغچە بووە، چونکە گوندی (میراوە) کارێزی هەبووە، شوێنەواری کارێزەکان ئێستاش ماون.

بیری تەکیە: (بیری شێخی)شی پێدەڵێن، دەڵێن کاتی خۆی (شێخ ساڵحی کاریتان)، کە بۆ یەکەم جار کەوتۆتە دەشتی دزەییاتی هاتۆتە گوندی قـورشاغلو، پێش ئەوەی بچێتە گوندی (کاریتان)ی ناوچەی کەندێناوە، تەکیەی لەوێ بوو، هەنووکەش بیرەکە هەر ماوەو ئاوێکی شیرین و سـازگـاری هەیە. لەم بارەیەوە دەربارەی (شێخ سـاڵح)ی کـاریتان کاک عـەلی عومـەر ئەحـمەد مرۆت لەدایکبووی ساڵی ١٩١٩ز. دەڵێت: شێخ ساڵح رەبەن بوو بەخۆی و بەدایکی لە گـوندی قـورشـاغلووی بوون، دەڵێن لە سـەیدەکـانی نەعـیم بووەو خـەلیـفـەی شێخ حـەسـەنی قـەرەچێـواری بووە، لەسـاڵی ١٩١٧ز. ئەو گـوندەی بەجێـهێـشـتـووەو چۆتە گـوندی (کـاریـتـان) لە ناوچەی کەندێناوە.

مـام حـەمـەدە کەر هەبوو خەڵکی گوندی قـورشـاغلوی دەشتی مرکییەی ناوچەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ بوو، نەخوێندەوار بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی هۆشمەندو دنیـادیتـە بوو، هەر لەسـەرەتای دامـەزراندنی (پ. د. ک) بـووە ئەندامـێکی چالاکی ئەو حزبە. پیـاوێکی دڵـسـۆزو بەوەفاو کوردێکی بەڕاستی بوو، ماڵەکەی ببووە مۆڵگەی ئەو حزبە، جـارێکیـان دەچێـتـە (سـەرکـەبیکان)و مـیـوانی خـوالێـخۆشـبـوو کاکە هەباسی مـامـەند ئاغـای ئاکۆ دەبێ (پەیڕەو و پرۆگـرامی) حزبی پێدەبێت لە دیوەخـان لەکـاتی گفتوگۆدا لەگەڵ کاکە هەباسدا ناگەنە یەکترو دوو سێ جار مـام حـەمـەد ئەم وتەیە دووبارە دەکـاتەوە دەڵێت (ئەمن واناڕێم "پێڕۆ" وادەرێ) (کاکە هەباس)یش وشەی پێڕۆی زۆر لاسـەیر دەبێت، دەڵێت مـام حـەمـەد ئا بزانم ئەو (پێڕۆ)یەی تۆ چییە؟

(مام حەمەد)یش گورج (پێڕۆ)ی لە تەنگەی باخەڵی دەردێنێ و لەبەردەم هەباسی دادەنێ و دەڵێ فـەرمـوو ئەوە (پێـڕۆ)، کـاکـە هەباس کـە تەمـاشـا دەکـات (پەیڕەو و پرۆگرامی) حزبە، دەڵێت مام حەمەد دەبێ ئەو (پێڕۆ)یەم هەر بدەیتێ، (مـام حـەمـەد)یش دەڵێت بەسـەرچاو پێشکەشت بێت، جا مام حەمەد هەموو جارێک دەیگوت: (لەوەتی ئەو (پێـڕۆ)یەم لـەدەست چووە هەمـووم لێ تێکچووە).

ئەو گـوندە کـاتی خـۆی بنەمـاڵەی (حەسـەن پاشـا)ی دیاربەکـری ئاوەدانیـان کـردۆتەوەو (٩) مـاڵێـک دەبوون، (٧) مـاڵێکی دیکەیان لەگوندی(سـۆربەش) بوون، ٤-٥ مـاڵیـان لە گوندی (دووگردکـان)، ٣-٤ مـاڵێکیـشـیـان لەگوندی (میراوە) نیشتەجێ بوون، پاشان ئەو گوندە بەرە بەرە گەورە بوو و تیرەو هۆزی دیکە هاتوونەتە ئەوێ، وەکو بندیانەکـان لە گـردی قـالۆرەی نیـشـتـەجێ بوون. هەروەها (ئەحمەد ئاغا) لەگوندی عالڵا (عەبدوڵڵا گوجیلان) دێتە ئەوێ. پاشـان بە ئەحـمـەد پاشـا ناسـرا، ژنێکی لە هۆزی گەلاڵی خواستبوو لە گوندی (مەلا کاغە)ی بناری چیای قـەرەچووغی ناوی (عـەیشێ) بوو (عـەیشـە گـەراری)یان پێدەگوت، خدری پاشا لەو ژنە بوو، ژنێکی دیکەی ناوی (مـەریەم) بوو لەهۆزی بڵـبـاس بوو، خـەڵکی گـوندی (وەرانگە)ی دەشتی بیتـوێنێ بوو، ئاغای پاشا -عەزیزی پاشا -حەمەدی پاشا -خوچێ -هەمین لەو ژنەی بوون.

ژنێکی دیکەی ناوی (دایە خـانم) بوو، خـوشـکی مـحـەمـەد عـەلی مـوختـاری بوو، هەولێری بوو، لە هۆزی (ئۆرمزیار) بوو، سەلیمی پاشای لەو ژنەی بوو، هەربەهۆی ئەوە ئەحـمـەد پاشا ژنێکی بڵـباسی لە دەشتی بیتـوێنێ خواستبوو. ١١٥ ساڵێک لەمەوبەر بنەماڵەیەکی بڵـباس لەدەشتی بیتوێنەوە کەوتنە ئەوێ کە لەتیرەی رەمک بوون.

لە ساڵی ١٩١٥ز. بنەماڵەیەک لە (لەک)ەکانی گوندی (دەرماناوە)ی دەو زێی گچکە (پردێ) لەبەر چەند هۆیەکی کۆمەڵایەتی دەکەونە ئێرەو لەو گوندە نیشـتـەجێ دەبن و لەدەشتی دزەییایەتیدا بە (ئەوبەری) دەناسرێن، وەکو ئەو مـاڵانەی، کـە لەوبەری زێیـەوە هاتوون، وەکـو بنەمـاڵەی (مەجی ئەوبەری) باوکی کاک سمکۆ، هەنووکەش پێـیان دەڵێن (ئەوبەری)یەکان.

**پەرکانە (پەڵکانە)**

ناوی گوندێکە سەر بەناحیەی قوشتەپەی مەڵبەندی قەزای هەولێر، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی قەشقە -چاڵە گردەرە -خورخوڕ لەسەریەکە، کەوتۆتە چاڵێکەوە، دەوروبەرەکەی تەپۆڵکەو هەڵەت و هەڵدێرە، زەویوزارێکی کشتوکاڵی وای بەدەمەوە نییە، کە شایانی باس بێت، شوێنەکەی بۆ مەڕ لەوەڕاندن و ئاژەڵداری باشە، کاتی خۆی ئەو گوندە ٤-٥ماڵێک دەبوون، سەربە هۆزی لەک بوون. برا گەورەکەیان ناوی کوێخا عەباس بوو.

بەگوێرەی سەرژمێری گشتی دانیشتوانی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی (١٢) کەس بووە، گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لەناوچەی کەندێناوەدا هەیە، چەند بیرە نەوتێکی تێدایە.

**خورخوڕ**

یەکێکە لەگوندەکانی دەشتی هەولێر، سەر بەناحیەی قوشتەپەیە، دەکەوێتە سەر زێی گچکە (زابی بچووک) دوا سنووری ناحیەی قوشتەپەیەو سنوورەکەی لە رۆژهەڵاتییەوە بەردی سپییە. لەباکوورییەوە گوندی (پەرکانە)یە، لەرۆژاوایدا گوندی (قەشقە)یە، لەخوارووی زێی گچکەیە لەوبەری زێی گوندی (سارتک)ە، کە سەر بەناحیەی (تەق تەق)ی قەزای کۆیەیە (خورخوڕ) وشەیەکی کوردییە، لەوەوە هاتووە شوێنەکەی بڵندو ئاوێکی هەیە، ئاوەکەی بەخوڕدەخوڕە لەزێی دەکاتەوە، لەو شوێنەو لەنزیک ئاوەکەوە کاتی خۆی (هۆزی لەک) دامەزراون، ئاوەدانیان کردۆتەوە، لەپیاوە ناودارەکانیان کوێخا هیدایەت بووە. مام سەید دانیشتووی گوندی دەڵێت: لە سییەکاندا گوندی خورخوڕ ٧-٨ماڵێک دەبوون. بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی (٢٠٥) کەس بووە.

**دێدەوان**

ناوی زنجیرە زوورگێکە لەخوارووی رۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، کەوتۆتە سەرەوەی گوندی (سۆفی برایم)، ئەو زنجیرە زوورگە لە دەشتی کۆیەوە لە ئاقاری گوندی (شێوەپیران)ەوە دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە بەرەو رۆژئاوا لە ئاقاری گوندەکانی (چاڵە گردەرەو ئازیانە)وە کۆتایی دێت، ئەو زنجیرە زوورگە، دەشتی هەولێر لەدەشتی کۆیە جودا دەکاتەوە، ئەو زوورگە هەڵەت و هەڵدێرەو لە هەندێ جێگادا شاخی هەیە.

(داری دێدەوان)ی تاقە دارێکە لە سەرەوەی زوورگی دێدەوانییە، دارەکە دار بەڕووەو، زۆرجاران حەیرانبێژان لە حەیران ناوی دەبەن. وەکو (داری شەکرانێ) ناوبانگی هەیە.

**ئێلینجاغ**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتڕێی، سەر بەناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی گۆمەگروو - دۆڵەبەکرە -پۆریجە -گەڕەشێخان -میرەکانی شێخ عەلی، دووشیوان مەنتک لەسەریەکە، ئێلینجاغ گوندێکی کۆنە لە زەمانی عوسمانییەکاندا ئاوەدان کراوەتەوە. دەڵێن کاتی خۆی هی بنەماڵەی (سیان)ەکان بووە، باپیرە گەورەی (مام سەعید سۆفی) دانیشتووی گوندی (دەربەندی گۆم)ی ناوچەی کەندێناوە کاتی خۆی لەوێ دانیشتووە، پاشان دەستاودەستی کردووەو بووەتە موڵکی (تەقیەدیناغا)، کە یەکێک بووە لە بنەماڵەی ئەسعەدییەکانی هەولێرێ. کاتی خۆی لەبەرەوەی هەتا دەگەیشتە (گردی نیسکان) و هەتا بن گوندی (گەڕەشێخان) دەڕۆیشت، لەخوار گوندی برنج و توتنێکی زۆری لەبەر دەکرا. (گردی نیسکان) گردێکی ئەسەری گەورەیە، تووڕەگەڕێژە، بەقەد گردی قوڵتەپەی دەبێت، ئێستاش ئاسەواری کەرپووچ و کووپەو تاسلووقەی تێدایە، کۆنە خەرابەیە، بۆیەش ناونراوە گردی نیسکان، چونکە کاتی خۆی نیسکێکی زۆری لە دەوروبەری دەچێندرا، نیسکێکی باشی دەهێنا، نیسکەکەش کورەک بوو، شوێنە جوگرافییەکانی (بانی خەلیلی ئاوڕەحمان)ی بانێکی زۆر گەورەیە. ئەو بانە پیاو چاکێکی بەناوی (خەلیل ئاوڕەحمان)ی لێ نێژراوە، گۆڕستانێکی زۆر کۆنە، گەلێ جار حەیرانبێژان ناوی بانی خەلیلێ ئاوڕەحمانی دێنن.

(خاتوون مریەم) ناوی چاکێکە لە سەرەوەی بانی خەلیلێ ئاوڕەحمانی هەڵکەوتووە، قەبرستانێکی زۆر گەورەو کۆنە، دەڕوانێتە سەر رووباری میرەکان (زەوی مامزان)، کەوتۆتە نێوان گەڕەشێخان و ئێلینجاغی، کاتی

خۆی ئەو شوێنە مامزی زۆر بووە، (کەندی کفران)، (دۆرە درێژن) (کەندی خەلیفەی) کەندێکی گەورەیە، کاتی خۆی ئاوی زۆر بووەو گوندیش بوو، لە دەوروبەری خەرابەیەکی زۆر گەورە هەیە جێگای (٥) پێنج عەلبە گەنم دەبێت، هەموو زبڵدانە، دەڵێن هەردووک گوندی ئێلینجاغی گەورە، کە هەنوکە (دۆڵەبەکرە)ی پێدەڵێن لەگەڵ ئێلینجاغی گچکە لەو گوندەی جودابوونەوەو ئەویش کاول بووە. (زوورگی شێخ سمایلی) ناوی زوورگێکە لەسەرەوەی کەندی خەلیفەی هەڵکەوتووە، لەنێوان ئاقاری دۆڵەبەکرەو ئێلینجاغیدایە، گۆڕستانێکی زۆر زۆر گەورەو کۆنی لێیە چاکێکی لێیە بەناوی (شێخ رەش).

ئەو گوندەش لەپێش وێرانکردنیدا لەگەڵ هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێردا لەساڵی ١٩٨٧ز. نزیکەی ٣٠-٤٠ ماڵێک دەبوو و تیرەو هۆزی جۆراوجۆری تێدا نیشتەجێ بوو، لەوانە سۆفیان - سیان - بلباس - شێخان -سەیید. بنەماڵەی سەیدەکان زۆربوون خۆیان بەنەوەی (پیرخدری شاهۆ)یی لەقەڵەم دەدەن، کە کاتی خۆی لە دەشتی کۆیەوە کەوتوونەتە ئەوناوە، لە گوندی (بنەسڵاوە)و (کەسنەزان) دامەزراون و پاشان هەندێکیان کەوتوونەتە باداوە. وەکو خوالێخۆشبوو بنەماڵەی (سەید مەعرووف)، هەندێکیشیان کەوتوونەتە ئێلینجاغ - گەرەشێخان، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش لەساڵی ١٩٥٧ز. (١٥٠) کەس بووە.

(زەوی مامزان) ناوی زەوییەکە کەوتۆتە نێوان گوندی (گەرەشێخان) و (ئێلینجاغ). دەڵێن کاتی خۆی ئەو ئاقارە مامزی زۆر بووە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە.

(قۆرتی مریشکان) ئەمەش ناوی پارچە زەوییەکی دیکەیە، (دۆڵەدرێژەن) دۆڵێکی درێژو قووڵە، درێژ دەبێتەوە لە رێی (پۆریجە)ی هەتا دەگاتە سەرڕێی گوندی (گردەسۆر)ی. (کەندی کفران) ناوی کەندێکە کەوتۆتە نێوان ئاقاری گوندی ئێلینجاغ و (میرەکان)ی شێخ عەلی، کە کەندێکی گەورەیە، دارکفری یەکجار زۆرە، خەڵکەکە سوودیان لێ وەردەگرت، بۆ گێسک بەکاریان دەهێنا، هەویزیان پێدەماڵی، (کفر) رووەکێکی تاڵە ئاژەڵ نایخوات و زیاتر لە مەترێک لە زەوی بلند دەبێت، گەلێک جاران لە کوردەواری ئاوی کفریان بەکاردەهێنا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەسانەی، کە تووشی (هیشکە بیرۆ) بووینە. (گۆڕستانە هووردیلە) ناوی گۆڕستانێکە، کە گۆڕی زۆر وردیلەی تێدایە، بۆیە بەو ناوە ناونراوە، زەوییەکەی سۆرکانە.

### بنەسراوە

بنەسراوە، گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر. گوندێکی کۆنە، لە بنچینەدا بە موڵک هی بنەماڵەی (نانەکەلی)یەکان بووە، لە پاشان دەبێتە موڵکی بنەماڵەی رەشیداغای هەولێری، لە سەرەوەی گوندی، دوو کارێزی ئاوی هەیە، بەوبەر و ئەوبەری ئاواییدا دێن یەکەمیان هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە، بە کارێزی مەلافەندی ناسراوە، ئاوەکەی تا ناو گوندی (باداوە) دەهاتە خوارێ و رەز و باغێکی گەورەی لەبەر کرابوو رەزوباغی مەلافەندییان پێ دەگوت. کارێزی دووەم هی ماڵی رەشید ئاغای بوو، کارێزی نورەدیناغایان پێدەگوت. رەزو باغێکی زۆری لە گوندی بنەسراوەی لەبەر کرابوو، نزیکەی جێگای (١٢) دۆنم عەردی گرتبۆوە، داری بەرداری هەمەجۆری تێدابوو، وەکو (فستق، هەنار، هەنجیر، ترێ، توو، سێو، قەیسی... هتد) قەسرێکی گەورەشی تێدا دروست کرابوو هی ماڵی رەشید ئاغا بوو. بنەسراوە وشەیەکی کوردییە، زۆر بیرورابۆچوون لەبارەی ناولێنانی هەیە، هەندێک لە دانیشتوانی دەڤەرەکە دەڵێن: وایێ دەچێت لەوەوە هاتبێت (سەروبنی هەر ئاوە) هەروەکو لەسەرەوە گوتمان دوو کارێزەکە بەوبەر و ئەوبەری گوندی دادێن. سەروبنی واتە (سەرەوە و بنەوەی) گوندی ئاو دەدەن. بەبیر و بۆچوونی من وشەی (بنەسراوە) وشەیەکی کوردی لێکدراوە لە (بنە+ سراوە)وە پێکهاتووە. (بنە) بە واتای بنەوانی ئاوەکە (کارێزەکە) دێت، (سراوە) کورتکراوەی وشەی (سەرئاوە)، چونکە لە شێوەزاری دەشتی هەولێر بە تایبەتی ناوچەی دزەییایەتی دەڵێن دەچمە سراوێ. واتە دەچمە سەرئاوێ ئەوجا سەرئاوەکە بیر یا کانی یا جۆگە یا کارێز بێت، هەریەکە جا لەو بنەو سەرئاوەدا ئاوەدانی لێ پەیدا بووە، هەروەکو دەڵێن (ئاو و ئاوەدانی) ئەو ناوەی لێنراوە. (٢) دوو بنەسراوە هەیە: گەورە و گچکە یا سەروو و خواروو ئاقاریان لەسەر یەکە، جا وشەی (بنەسەرئاوە). بۆ خۆشی و سووکی لەسەر زاران بووەتە (بنەسراوە) پەندێکی کوردی لە دەڤەرەکەدا هەیە دەڵێن:

(دەرێی فشەی بنەسراوەیە!) یان دەڵێن: (بووەتە فشەی بنەسراوەی!) کاتی خۆی چەند ئاشێکی ئاوی لێ هەبووە، تا ئەم ساڵانەی دواییش شوێنەوارەکەیان هەر مابوو خۆ لە کوردەواریشدا دەڵێن: (سەروبن) واتە سەروچاوە واتە (بنەوان)ەکەی، ئاقارەکەشی لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە حەسارۆک، باداوە، گەرەسۆر، پونگینە، باغچە لەسەر یەکە. ئەم گوندەش سەر بە ناحیەی (عەنکاوە)ی قەزای ناوەندی هەولێرە.

## کانی سەگان

کانی سەگان: ئەو گوندە زۆر کۆن نییە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٨ز.). ئەو ناوە کاتی خۆی پووش و پەراش و پاوان بووە، هی رەشیداغای هەولێری بووە، لە گوندەکانیان لەو ناوەدا (بنەسراوەی گچکە و گەورە، بێوکە، کانی سەگان)ە، کانی سەگان دەکەوێتە ناو (زوورگی کەسنەزان). لە سەرەوەی ئاوی دلۆیە و (کانی گەنی)یە، کاتی خۆی کۆچەر و رەوەندەکان دەهاتنە ئەو ناوە مەڕیان تێدا دەلەوەراند و سەرانە و پووشانەی خۆیان دەدایە خاوەن موڵک. ئەو رەوەندانەش بەزۆری لەهۆزی (بلّباس و مەنتک) بوون، ئەو زوورگە واتە زنجیرە زوورگی کەسنەزان و زەرگەتەن زستانە هەواری ئەو رەوەندانە بووە. جا وشەی (کانی سەگان) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە دوو وشە یا برگە پێکهاتووە یەکەم (کانی)، برگەی دووەم (سەگان) کۆی وشەی (سەگ)ە، هەروەکو گوتمان گوندێکی تازە ئاوەدان بووە هەوارگەی ئەو خێڵانە بووە کە ناومان بردن. لەو شوێنەدا کانییەکی کەم ئاو هەبوو، سەگەکانی رەوەندەکان هەردەم لە دەوروبەری ئەو کانییەدا خڕ دەبوونەوە و وەردەکەوتن خۆیان لە قوڕ و لیتەکەی وەردەدا، بەتایبەتی سەگ کە گەرما دابێت حەز لەجێگای قوڕ و فێنکانی دەکات. جا خەڵکەکە واتە رەوەندەکان بەو کانییەیان دەگوت کانی سەگان، پاش شۆڕشی (١٩٥٨ز.) هەندێک بنەماڵە و کۆچەرەکان وازیان لە رەوەندایەتی هێنا و لەو شوێنە دامەزران و لە دەوروبەری ئەو کانییە خانوو بەرەیان دروست کرد و ناویان لێنا (کانی سەگان) دانیشتوانی لە (هۆزی بلّباس)ن، سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای ناوەندی هەولێرە.

جا وشەکە لەناوی (کانی) لەگەڵ ناوی سەگ لەگەڵ ئامرازی کۆکردنەوەی (ان) پێکهاتووە: (ناو+ ناو+ نیشانەی کۆ)

## حەسارۆک (حەسارۆکان)

حەسارۆک، گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر (٣)کم لێیەوە دوورە، ئەم گوندە و گوندەکانی دەوروبەری سەر بە ناحیەی (عەنکاوە)ی قەزای ناوەندی هەولێرە، دەڵێن کاتی خۆی هی (زێدبەگی)یەکان بووە، لە پاشان بووەتە موڵکی مەحموداغای باوکی عەلیاغای دۆغرەمەچی کە لە دواییدا بە عەلی پاشا دۆغرەمەچی ناسرا. لە خوالێخۆشبوو (بورهان جاهید بەگی هەولێری)م بیستووە کە ئەویش خزمێکی نزیکی عەلیاغا بوو. دەیگێڕایەوە: کاتێ (عەلی ئیحسان) پاشا سەر لەشکری شەشەمی تورک لە عێراق هاتۆتە هەولێر، عەلیاغا میوانداریییەکی شاهانەی کردبوو، هەر لە خوارەوەی قەڵا تاکو پێش ماڵی مافوور ڕێژی کردبوو.

عەلی ئیحسان پاشا کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبۆڵ روتبەی پاشایەتی بۆ عەلیاغا وەرگرتووە و هەر لەو ساوە بە عەلی پاشا ناسراوە. جا بۆیەش عەلی پاشا بۆ وەفاداری و رێزلێنان ناوی لە کوڕەکەی خۆی ناوە ئیحسان.

ئیحسان بەگ دکتۆرە و کاتی خۆی کچی سەرەک وەزیرانی عێراقی (حیکمەت سلێمان)ی خواستبوو، دەمێکە لە شاری ئەنقەرە نیشتەجێیە ئێستاش هەردووکیان لە تەمەنی (٨٥) ساڵ بە سەرەوەن. هەر لە ژیاندا ماون، وابزانم لەو ساڵانەی دوای راپەڕین سەردانێکی کوردستانی کردبوو.

ناوی حەسارۆک وشەیەکی دارێژراوی کوردییە لەدوو وشە یا برگە پێک هاتووە، یەکەم وشەی حەسار، برگەی دووەم پاشگری (ۆک) ئەم پاشگرە لەزمانی کوردیماندا بۆ بچووککردنەوەی ناو بەکاردێت (حەسار+ۆک) بە واتای حەسارێکی گچکە. دەگێڕنەوە دەڵێن ماڵی مەحموداغای باوکی عەلی پاشای دۆغرەمەچی حەسارێکی بچووکیان لەو شوێنەی کە ئێستا ناونراوە (حەسارۆک) لێ دروست کردبوو. حەساریش لە کۆمەڵە ژوورێکی تەواو پێکهاتووە. ئەو ژوورانەش بۆ ئەو خێزان و جوتیار و سەپانانەی خۆیان کە جووت و دورنەو ئیش و کاری کشتوکاڵەکەیانیان بۆ

رادەپەڕاندن و (سەرکار)یان بوونە، هەندێک لە ژوورەکان بۆ دانەوێڵە و گەنم جۆو کاو ولاغی بەرزە بەکارهاتووە. جا لەوساوە بەرە بەرە خەڵکان هاتوون و لە دەوروبەری حەسارەکە نیشتەجێ بوونە و ناویان لێناوە حەسارۆک یان (حەسارۆکان) ئاقاری لەگەڵ شاری هەولێر و بنەسراوە، باداوە، کەسنەزان، یوسف ئاودەل لەسەر یەکە و ئەو گوندانەی دەوروبەری (حەسارۆکان) وەکو کانی گەنی، درۆپە (دلۆپە، حەسارۆک، کەسنەزان) هی ماڵی عەلی پاشای بووە.

حەسارۆک گوندێکی کۆنە لە زەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە، بەڵام گوندێکی بچووک بوو لە ساڵی ١٩٦٣ز. دیتبووم ٦-٧ ماڵێک دەبوون لەوپەڕی هەژاری و نەداریدا بوون، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا حەسارۆک نە (حەسارۆک)ی جارانە، خەریکە لەگەڵ پایتەختی هەرێم تێکەڵاو ببێت. گوندێکی دیکە بە هەمان ناو لە ناوچەی کەندێناوەی سەر بە قەزای مەخموردا هەیە.

## شەرەبۆت

شەرەبۆت: گوندێکە دەکەوێتە ناو دۆڵێکەوە لە دۆڵەکانی زوورگی کەسنەزانیدا ئاقاریان لەگەڵ گوندی (کەسنەزان) لەسەر یەکە، دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر نزیکەی (١٤)کم لە هەولێرەوە دوورە، چەند کانییەکی سازگاری هەیە، باغچە و داری بەرداری زۆرە بە تایبەتی هەنار و هەنجیر، هەنجیری شەرەبۆت زۆر بەناوبانگە، شینایی و تووتنێکی زۆری لەبەر دەکرا، ساڵانی زوو بەفرێکی زۆری لێ دەباری، تەنانەت ئێستاش شوێنەواری ٧-٨ چاڵە بەفری هەرماوە. دانیشتوانی لە عەشیرەتی (زێد بەگی)ن عەشیرەتی (زێدبەگی)یش یەکێکە لە هۆزەکانی کوردەواری بەقسەی خۆیان کاتی خۆی لە کوردستانی تورکیاوە هاتوون و کەوتوونەتە ئەو ناوە، لەو بنارەدا واتە بناری زوورگی کەسنەزان و دۆرا خانێ و شەرەبۆت، پیرڕەش، کۆلەکی گەورە دامەزراون. ناوی (شەرەبۆت) لە وشەیەکی لێکدراو پێکهاتووە (شەر+ە+بۆت) برگەی شەر لەوانەیە لە وشەی (شار)ەوە هاتبێت، (ە) ئاوازە، وشەی (بۆت) ناوی هۆزێکی کوردە کاتی خۆی لە جەزیرەی (بۆتان)ەوە پاش رووخانی (میرنشینی بۆتان) کەوتوونەتە دەڤەری بادینان لە دەشتی (ناڤکور) ناوکور دامەزراون و نەگەڕاونەتەوە ناوچەی بۆتان. مام حاجی محەمەد قادر ١٩٣٠ز... دانیشتووی گوندی (شەرەبۆت) بۆی گێڕامەوە وتی: چل ساڵێک لەمەوبەر لەگەڵ مام ئەحمەد جەمردی شەرەبۆتی بۆ هەولێر دەهاتین ئەوکاتی مام ئەحمەد تەمەنی لە (٩٠) ساڵ پتر بوو لەبەر (دلۆپەی) هەتا دەگاتە پشت خەستەخانەی رزگاری ئێستا شوێنەواری زیاتر لە (٣٠) کاولە ئاشی نیشاندام، شوێنەوارەکەیان بە ئاشکرا دیار بوو لە گەچ و کەرپووچ دروست کرابوو، ئەمەش بەڵگەی ئەوەن کە کاتی خۆی ئەو ناوە ئاوێکی زۆری هەبووە.

## دۆرەخانێ

ئەو دۆڵە دەکەوێتە سەرەوەی گوندی (کەسنەزان)ی، ئاوڕێژەکەی لە (بەردەباز) و هەڵەت و هەڵدێری ناو زوورگەکەوە دێتە خوارێ و لەخوار دلۆپە یەکتر دەگرنەوە واتە تێکەڵ بە بەستێکی دیکە دەبێ لەنزیک (بنەسراوە)ی گچکە دەبێتە یەک بەست پێی دەگوترێت بەستی (مزوورانێ)، جاران ئاوەکەی دەهاتەوە ناو شاری هەولێر و بەدەشتی شەمامکێ دەچووە خوارێ لە زێی گەورەی دەکردەوە، بەڵام هەنووکە ئاوەڕۆکەیان لادایە و لە بەستی قەتەوی دەکاتەوە، ئەم کارەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی حەفتاکان. ئەمەش بۆ ئەوەی شاری هەولێر لە مەترسی لافاو دوور خەنەوە، جاران ئەو بەستە گەلێک زەرەر و زیانی بەخەڵکی ناوشار دەگەیاند، بە تایبەتی ئەو ماڵانەی کە لەسەر بەستەکەدا بوون وەکو گەڕەکی تەعجیل و گەڕەکی عارەبان و سەعدووناوە. کاتێک کە بارانێکی زۆر لە سەرەوە دەباری، ئەو بەستە دەبووە زێیەکی گەورە و جاری وا هەبوو زەرەری دەگەیاند. سەیر لەوەدایە ئەو زنجیرە زوورگەی کە لەخوار گوندی (قەرەمورتکیان) و سەرەوەی بەحرکە و لە تەنیشت خوارووی دۆڵی بەستۆڕەی بەرەو ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەکشێن گوندی شەوەک و براغ و مەلائۆمەر و لۆفەی (خانزاد) کەوتوونەتە ناو زوورگەکە پێی دەگوترێت (سینێک، سێلق، سێلک) بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵدەکشێن گوندی (کۆلەک)ی گەورە و گچکە کەوتۆتە ناوییەوە لە کەرخی (شەرەبۆت) پێی دەگوترێت زوورگی (شەرەبۆت) و ئەنجا ئەو زنجیرە بیستانەی لە سەرەوەی گوندی بیستانەدایە، ئەم زنجیرە زوورگە ناوی لە نووسینی بزماری (سنحاریب)ی پاشای وڵاتی ئاشووریدا هاتووە.

## پیرەش

پیرەش ناوی گوندێکە دەکەوێتە باکووری رۆژهەلاتی شاری هەولێر بەناوی پیاو چاکێکەوە ناونراوە لە کوردەواریدا پیر بە مانای شێخ یا پیاوچاک و خواناس دێت، لە دەشتی هەولێرێ دەڵێن (چاک و پیر). کەواتە ناوی ئەو گوندە لە (پیر رەش)ەوە هاتووە ئەنجا پیتی (ر) لابردراوە بۆ سووکی لەسەر زار بووە بە (پیرەش) ئێستاش قەبری ئەو پیاو چاکە لەوێیە و گۆرستانێکی گەورەیە و خەڵکی بۆ زۆر مەبەست سەردان و زیارەتی دەکەن. دانیشتوانی ئەو گوندەش تیرەی جۆراوجۆری تێدایە وەکو زێدبەگی، بلباس، شێخ مەموندی، گەردی.

## پونگینە

ئەمەش ناوی گوندێکی دیکەیە لە گوندەکانی دەشتی هەولێرێ، لە بناری زوورگی (زەرگەتەن) هەڵکەوتووە، کەوتۆتە رۆژهەلاتی شاری هەولێر سەر بەناحیەی (عەنکاوە)یە، کاتی خۆی ئەو ناوە پاوان و لەوەرگایەکی سروشتی بووە خێڵەکانی (بلباس، گەردی، دزەیی، مەنتک) لەو ئاقار و زوورگانە هەڵیان دەدا، هەواریان بووە، ناوی پونگینە ناوێکی کوردییە لە وشەی پونگ کە گیایەکی بۆن خۆشە لە دەو کانی و جۆگە و دەو ئاوان شین دەبێت پێک هاتووە، کاتی خۆی ئەو شوێنە ئاوی هەبووە و زەوییەکەی پونگێکی زۆری دەینا خەڵکەکە ناویان لەو شوێنە نا (پونگینە) واتە هەر پوونگی دەینی، جا لەو شوێنە هەر لەکۆنەوە چەند بنەماڵەیەکی بلباس دامەزران، بەمولک هی بنەماڵەی عەلی پاشای دۆغرەمەچی بووە بنەماڵەی کاکە خانی لێیان کڕیون.

هۆزی بلباس و گەردی تێدا نیشتەجێن. گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لەدەشتی قەراج هەیە. هەروەها لەدۆڵی هیرانێ گوندێکی دیکەش بەو ناوە هەیە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی باغچە، کورداوە، بنەسراوەی گەورە و گچکە، گەرەسۆر، باغەمرە شەهاب، ئۆمەرە سۆر لەسەر یەکە.

## کونەگورگ

کونە گورگ یەکێکە لەو گوندانەی دەشتی (پشتەرێی) دەشتی هەولێر سەر بەناحیەی (عەنکاوە)ی قەزای ناوەندی هەولێرە، دەکەوێتە خوارووی رۆژهەلاتی شاری هەولێر و بە (٣)کم لێی دوورە. کاتی خۆی لەو ناوە و دەوروبەری هەولێرێ مامز و گورگ و کەروێشکت دەدیت بە تایبەتی لە زوورگی رەشکێن و بێرکۆت و سێنک و ناو ئاقاری هەولێر، لەو شوێنەی کە ئەو گوندەی لێ ئاوەدان کراوەتەوە، چەند کونە گورگێکی لێ بووە، بۆیە بەو ناوە ناونراوە. (کونە گورگ) لە بنچینەدا وشەیەکی لێکدراوی کوردییە، لە وشەی (کون+ە+ گورگ) پێکهاتووە. بەمولک هی بنەماڵەی مەلا هیدایەتی پیرەبابی بووە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی دارەتوو، باداوە، گەرەسۆر، گردەرەشە فەندی، شاری هەولێر، باغەمرە لەسەر یەکە. هەروەها گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لە دەشتی کۆیەی سەر بە ناحیەی (تەقتەق)دا هەیە.

## باغەمرە شەهاب

باغەمرە: یەکێکە لە گوندەکانی دەشتی (پشتەرێی) ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، ئاقاری لەگەڵ ئەم گوندانەی خوارەوە لەسەریەکە: گەرەسۆر، کونەگورگ، دارەتوو، باغەمرەفەندی. دوو گوند بەو ناوە هەیە، کە ئاقاریان لەسەر یەکە، باغەمرە شەهاب، کە هی ماڵی شەهاب چەلەبییە.

بە باغەمرە رەقە بەناوبانگە، بۆیەش وای پێدەڵێن زەوییوزارەکەی رەقەنە و کەوتۆتە ناو زوورگی زەرگەتەن. باغەمرە ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە وشەی (باغ+ە+مرە) واتە (ناو+ ناوگر+ ناو) پێکهاتووە، بەناوی ئافرەتێکەوە ناونراوە کە ناوی (مریەم) بووە. لە کوردەواریدا بەتایبەتی لە شێوەزاری دەشتی هەولێر بە (مریەم) دەڵێن (مرە)، بچووکی دەکەنەوە. باغ بە واتای باغچە (باغەمرە) واتە (باغی مریەمێ) کاتی خۆی بنەماڵەی (نانەکەلی)یەکان کە دەکەونە ئەو دەڤەرە لەو گوندانەی خوارەوە دادەمەزرێن و (بنەسراوە) و (باغەمرە) ئاوەدان دەکەنەوە. لەزۆر کەسم گوێ لێبووە گوتوویانە ئەم گوندە هی باپیری (ئەحمەد تەبیب)ی بووە کە دەکاتە باوکی هونەرمەند و گۆرانیبێژی کورد کاک فوئاد ئەحمەد. کاتی خۆی بە (باغەمرە ئەحمەد) دەناسرا، ئەمەش سەرجەلەی بنەماڵەکەیانە فوئاد ئەحمەد سلێمان ئەحمەدە.

## کورداوە

کورداوە ئەمەش ناوی گوندێکی دیکەیە لە گوندەکانی (پشتەرێ) دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر، کە سەر بە ناحیەی (عەنکاوە)یە ناوی (کورداوە) لە بنچینەدا وشەیەکی دارێژراوی کوردییە لە وشەی (کورد+اوە) واتە (ناو+ پاشگر) هاتووە (ئاوە-اوە-اوا) لە زمانی کوردیدا پیتی (ر) لادەبرێت، ئەگەر لەپاش وی پیتی بزوێنی (ا) بێت. ئەمەش بۆ سووکی و شیرینی زمانەکەیە. بۆ وێنە ئۆمەراوە. (کورداوە) بە مانای ئەوەیە کە کورد ئاوەدانی کردۆتەوە. بەڵێ لە زەمانێکی زووەوە چەند بنەماڵەیەک لە (کوردەکان) واتە لە (هۆزی کوردە) لە بەری بابان و ناوچەی شارەزووری وڵاتی سلێمانی لەبەر هەر هۆیەک بووبێت هاتوونەتە ئەو دەڤەرە و لە هەڵەت و هەڵدێر و ناو ئەو زوورگ و بناردا نیشتەجێ بوون: لە گونددکانی چەمرگە، گردیش، هەمزەبەگ، کورداوە، کەم کەمە لە گوندی بیرەجنە و ئۆمەرە سۆردا هەن، شێوەی قسەکردنی کوردەکان مەبەستم هۆزی (کوردە)یە لەدەشتی هەولێر، تا ئێستاش هەر بەو شێوەیەی شارەزووری سلێمانی قسە دەکەن و شێوەزاری دەشتی هەولێر کارێکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەریان، ئەوەش لەبەر چەند هۆیەک: یەکەمیان شوێنەکەیان لاچەپ بووە. دووەمیان: کەسی بێگانەشیان لەناودا نەبووە. بۆیە بەو شێوەیە ماونەتەوە. ئەو گوندە بەشێکی هی بنەماڵەی شێخەڕەشکەی بووە، بەشەکەی دیکەیان هی بنەماڵەی شێخ مارفی هەرەجەی بووە.

## چەمرگە

گوندێکی بچووکە ٧-٨ ماڵێک دەبن کەوتۆتە ناو دۆڵێک لە دۆڵەکانی زوورگی زەرگەتەن، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی کورداوە، باغچە، پونگینە، گردیش، حاجی وسوو، هەمزەبەگ لەسەر یەکە، کەم کەمە ئاوی هەیە و چەمێکی بچووکی لێیە. لەوانەشە ناوەکەی هەر لەوەوە هاتبێت (چەم+ رێگە) واتە رێگای چەمەکە بە لابردنی پیتی (ێ) بۆ سووکی لەسەر زار بووە بە چەمرگە، ئەم گوندەش هەر کوردەکان واتە (هۆزی کوردە)، ئاوەدانیان کردۆتەوە.

## بیرەجنە (هەڵەجەی گچکە)

ئەو گوندەش دەکەوێتە خوارووی رۆژهەڵاتی شاری هەولێر، بیرەجنە وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لەو بڕگانەی خوارەوە پێک هاتووە (بیر+ە+جن+ ە) واتە (ناو+ ئامرازی (ە)+ ناو+ ئامرازی (ە))، بیرەجن: واتە ئەو بیرەی جنی تێدایە، بیرێکی جناوییە، ئەمەم لەسەر زاری خەڵکی ناوچەکە وەرگرتووە. دەگێڕنەوە دەڵێن: کانییەکی لێیە، ساڵێک ئاوەکەی دەر دەبوو ساڵی دوایی وشک دەبوو، ئا بەم جۆرە خەڵکەکە کە دیتیان ئاوایە ناویان لێنا بیرەجنە واتە بیری جنان، واتە جندۆکەی تێدایە، وەکو ئاوی جوندیان کە جار جارە ئاوەکەی دەبڕێ و نامێنێ پاشان دووبارە سەر هەڵدەداتەوە، خەڵکەکە جاران وای بۆ دەچوون کە (جن) ئەجندان وادەکەن. بیرەجنە جاران ئاوێکی زۆری هەبوو، برنج و شینایییەکی زۆری لەبەر دەکرا، پیاوێکی بەساڵاچووی گوندەکە بۆی گێڕامەوە و وتی: ساڵێکیان ڕبە برنجێکمان چاند چەند عەربە برنجێکی کرد. بیرەجنەکە (هەرەجەی گچکە)شی پێ دەڵێن بە موڵک هی بنەماڵەی شێخ کەریمی بەرزنجییە.

## کانی بزرە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتەرێی ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ. ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی میردکان، کەردز، دووشیوان، سەرمەزرا، بیستانە لەسەر یەکە. ناوی (کانی بزرە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لەناوی (کانی) لەگەڵ ئاوەڵناوی (بزر) بە واتای (ون)، ئامرازی (ە) پێکهاتووە و واتە (ناو+ ئاوەڵناو+ ئامرازی(ە))، کاتی خۆی کانییەکی هەبووە ناوە ناوە ئاوەکەی بزر دەبوو و نەدەما، پاش ماوەیەک ئاوەکە بەدیار دەکەوتەوە و دووبارە بزر دەبۆوە. خەڵکی دەڤەرەکە ناویان لەو کانییە نابوو (کانی بزرە) مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نازانین، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو ناوە کاتی خۆی چۆڵ و هۆڵ بووە، گوند و ئاوەدانی کەم بووە، ئەو بنارە و زوورگ و هەڵەت و هەڵدێرە لەوەڕگاو پاوان بووە. پێشتر خێڵی (بلباس) دەهاتنە ئەو دەڤەرە خێڵی (مەنتک) بە کۆچەری و مەڕ لەوەڕاندن هاتنە ئەو ناوە و دامەزران و بووە زستانە هەواریان، کوێستان و گەرمێنیان دەکرد، لەپاشان لەو ناوە دامەزران، لە دەوروبەری ئەو کانییە جێ نشینبوون و بووە گوند و ناونرا، (کانی بزرە) بەناوی کانییەکەوە ناونرا، ئەو گوندەش بە موڵک هی (سمایلاغای مەنتک) بووە.

### رووڵکە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێر، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی دوو شیوان، حەسەن مترب، سۆفی برایم، گردەسۆر، پۆڕیجە، میرەکان لەسەر یەکە. ناوی رووڵکە لەرووی زمانەوانییەوە لە دوو وشە، یا ناوێک و پاشگرێک، پێکهاتووە، (رووڵک+ە) وشەی رووڵک بە مانای (ژاڵە) دێت کە رووەکێکی هەمیشە کەسکە، تامی تاڵە نزیکەی ٢ مەتر لە زەوی بەرز دەبێتەوە، جۆرە گوڵێکی جوان دەگرێت ئەم شوێنە کاتی خۆی رووەکی (رووڵک)ی زۆر بووە، خەڵکی دەڤەرەکە بەو شوێنەیان گوتووە (رووڵکە) واتە جێگای رووڵک. هەروەکو وشەی مورتکە واتە شوێنی (مورتک). جا ئەو ناوە (هۆزی (مەنتک)ی لێ بووە مەڕ لەوەڕێن بوون لەو دەوروبەرە رەشماڵیان لێ هەڵدەدا تا وای لێهات لەو شوێنە دامەزران و گسوندکە ناونرا بە (رووڵکە) هەندێ جار خەڵک (لورکە)ی پێ دەڵێن جێ گۆڕکێ بەپیتی (ل-ر) دەکەن، ئەو گوندە بە موڵک هی (مەجیداغای مەنتک)ە. لەوانەشە وشەی (رووڵکە) لە (رووڵک-گە)وە هاتبێت. پیتی (گ) لابردرابێت بۆ سووکی لەسەر زار.

### حەسەن موترب (مترب)

ئەمەش یەکێکە لە گوندەکانی (پشترێی) ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێر، لە بناری زوورگی (دێدەوان) هەڵکەوتووە، سنوورەکەشی لە رۆژهەڵات و خواروویدا زنجیرە زوورگی دێدەوانە، لە باکووری گوندی (میرکە)یە، لە رۆژاوایدا گوندی (لورکە) و (دوو شیوان)ە، دانیشتوانەکەی هەموویان لە (هۆزی مەنتک)ن، کاتی خۆی ئەو ناوە لەوەڕگا و پاوانێکی سروشتی بووە. هۆزی بلباس لەو ناوەدا بوون، بەڵام پاش ئەوە خێڵی (مەنتک) بە کۆچەری لە ناوچەی (جۆڵەمێرگ)ی، خەلیفانەوە هاتوونەتە ئەو دەڤەرە و بوودتە زستانە هەواریان و کوێستان و گەرمیانیان دەکرد، پاشان بەرە بەرە هەندێکیان وازیان لە کۆچەرایەتی هێناو لەو ناوە دامەزران، ئەو گوندەش بەناوی کابرایەکەوە ناونراوە کە ناوی (حەسەن) بووە، بەڵام وشەی (موترب) یا (مترب) شتێکی وا لەبارەی نازانین ئەوەندە هەیە لە کوردیدا وشەی (موترب) بەمانای (زۆرگۆ) زۆربڵێ دێت، پەندێکی کوردی لە دەڤەرەکەماندا هەیە دەڵێن: (دەرێی موتربە!). یان (بووەتە موترب).

### میرەکان

ناوی گوندێکە لە گوندەکانی دەشتی پشترێی ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری ئەو گوندانەی خوارەوە دووشیوان، گۆمەگوڕ، لوڕکە، پۆڕیجە، ئێلینجاغ، لەسەر یەکە. بەموڵک هی بنەماڵەی (شێخ عەلی) بووە، کاتی خۆی بنەماڵەکەیان لە گوندەکانی (کانی کەو و دێلژە)ی ناوچەی قەرەداغی وڵاتی سلێمانییەوە بە مەرداری کەوتوونەتە ئەو دەڤەرەو لەو شوێنە ئەو گوندەیان ئاوەدان کردووەتەوە. ئاقارەکەی نزیکەی ٧٠٠٠ دۆنم دەبێت زەوییەکی بێ هێز و بێ پێزی هەیە، تەنیا (دۆرە زێڕین) نەبێت کە دەو رووبارەو زەوییەکەی باشە و ئاوی هەیە و ئاوەکەی تا درەنگی ساڵێ دەمێنێت. هەندێ ساڵان هەتا مانگی ٨-٩ ئاوی هەر دەمێنێت شینایییەکی باشی لەبەر دەکرا. شێخ عەلی بەسەردان دەچێتە شاری کۆیە. سەر لە خزمانی بدات لەوێ نەخۆش دەکەوێت و لە ساڵی ١٨٤٠ز. کۆچی دوایی دەکات و هەر لەوێش دەینێژن. بەیتێکی فۆلکلۆری لە دەڤەرەکەدا هەیە دەڵێت:

**میرەکانی شێخ عەلی قەدیم هەر جێی شێخانە،**
**بەستی (شاقازیم) خۆشە وادیارە لە (بیستانە).**

### ئاریاوە

ئەمەش ناوی گوندێک بووە لە (دەشتی پشترێی) ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، ناوی (ئاریاوا) وشەیەکی دارێژراوی کوردییە لە (ئاری ئاوا)وە هاتووە، (ئاری+ ئاوە) و واتە ناو+پاشگری (ئاوا)، دەگێڕنەوە کاتی خۆی هۆزی گەراری (گەلاڵی) کە لە ناوچەی شارەزوورەوە دەکەونە دەشتی هەولێرێ لە سەرەوەی گوندی (کەردز)ی ئێستاکەدا لە دەشتی پشترێ ئەو گوندە ئاوەدان دەکەنەوە، ناوی لێ دەنێن ئاریاوە، گوایا بەناوی (ئاری) ناوێکییانەوە ناونراوە. هەنووکەش ئاسەواری ئەو گوندە هەرماوە خەڵکی ناوچەکە (کاولگەداری) پێ دەڵێن. پاشان بە تێپەڕبوونی کات و سات و زەمانە لەخوار ئەو

گوندەوە (کەردز) ئاوەدان بووەتەوە، زۆربەی دانیشتوانی ئەو گوندە لە (هۆزی گەراری)ین، گەلالی، لە پیاوە ناودارەکانیان مستەفای فەتاحی بووە، پیاوێکی دیار و لێوەشاوە و میرخاس بووە لە ناوچەکەدا، ئەو گوندەش بەموڵک هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە.

## مورتکەی گەورە

مورتکەی گەورە هەندێ جار مورتکەی سەریی (سەرووی) پێ دەڵێن. ئەم گوندەش دەکەوێتە دەشتی پشترێ، سەر بەناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خواردوە: میرزاغا، باغەمرە ئەفەندی، قەرەچناغە، گردمەلا، مورتکەی گچکە (خوارێ) لەسەریەکە، ناوی ئەو گوندەش لەوەوە هاتووە. کاتی خۆی ئەو ناوە ئاوی زۆر بووە و رووەکی مورتکی لەو دەو چۆم و نەوراییە زۆر بووە، بۆیە بە (مورتکە) ناسراوە، کاتی خۆی دەگێرنەوە تیرەی (ئاری کوتک)ی کە تیرەیەکن لە هۆزی (سورچی) بەمەڕ لەوەڕاندن لە ناوچەی سورچیایەتی دەشتی هەریر لە گوندی (هەرەش و خرێ) دەکەونە ئەو دەقەرە، لەو ناوە نیشتەجێ دەبن پاشان ئەوان ئەو ناوە جێدێڵن و رووەدەکەنە دەشتی کەندیناوە و لەوێ لە بناری چیای قەرەچووغ نیشتەجێ دەبن و ناگەڕێنەوە ئەو ناوە، چونکە بناری قەرەچووغ بۆ مەڕ و ماڵات بەخێوکردن گەلێک باشترە لە دەشتی پشترێ و مرکییە. پاشان چەند بنەماڵەیەک لە تیرەی (مخانە) کە تیرەیەکن لە هۆزی بلباس دەکەونە ئەو ناوە و لێرە نیشتەجێ دەبن. لە شارۆچکەی (پیران شار) لە کوردستانی ئێراندا گوندێکی نزیک بەو شارۆچکەیە هەیە بەناوی (مخانە) هەموویان لە هۆزی بلباسن، وشەی (پیران شار)یش وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە دوو ناو یا وشە پێک هاتووە: (پیران+شار) (پیران) کە تیرەیەکی گەورەیە لە هۆزی بلباس. بەواتای شاری پیرانەکان دێت. لە دواییدا ئەو گوندە بە مورتکەی عەلی مەحموودی ناسرا، کاتی خۆی رەز و باغێکی گەورەی لێ دامەزراندبوو، هەموو جۆرە دارێکی بەرداری تێدابوو.

لە سەرەوەی گوندی کارێزێکی گەورە هەبوو کە کارێزی مورتکەی پێ دەڵێن. ئاوێکی زۆری هەبوو برنج و شینایییەکی زۆری لەبەر دەکرا. هەنووکە گوندی مورتکەی سەرێ ئەو هۆزانەی لێیە مخانە کە تیرەیەکن لە هۆزی بلباس، شێخ مەمووندی.

## مورتکەی گچکە

مورتکەی گچکە: مورتکەی خوارێ (خوارووی) پێ دەڵێن ناوی گوندێکە دەکەوێتە باشووری شاری هەولێر سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خواردوە لەسەر یەکە. قەرەچناغە، مورتکەی گەورە، گردمەلا، برایمەلەک، قووچە بلباس. کاتی خۆی بنەماڵەی حاجی وەسمان حەمەدی کامەلای کە لە گوندی (ئۆمەرە سۆر)ی بووە هاتۆتە گوندی میرزاغا. ئەوجا لەوێوە هاتۆتە (کاولە مورتکە)ی کە غەرابەیەکە و شوێنەواری گوندێکی کۆن بووە لەنزیک گوندی مورتکەی گەورەیە. لەوێ بۆ ماوەیەک نیشتەجێ بوون و پاشان هاتوونەتە خوار مورتکەی گەورە لەو دەو جۆمە و نەوراوییە کە ئاوێزگە بووە واتە ئاوی هەبووە و رووەکی مورتکی زۆر بووە و کاولگە بووە لەو شوێنە دامەزراون. بنەماڵەی حاجی وەسمان ئاوەدانیان کردۆتەوە. ئەمەش لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠ز. بووە، مام سەدیقی کوری حاجی وەسمان کامەلای لەدایکبووی گوندی مورتکەی گچکە (١٩٢٧ز-١٩٢٧ز.) بۆی گێرامەوە، گوتی: ئێستاشی لەگەڵدابێ کاتێ کە باران دەبارێت و ئاو هەڵدەستێت، پاشان عەردەکە ئاوەکەی دەمژێت، لەزۆر شوێنا شوێنەواری (تەندوور) بەدیار دەکەوێت. مام سدیق دەڵێت کاتی خۆی باپیرم ئاشێکی ئاوی لەسەر جۆگەی مورتکەی دامەزراندبوو بەناوی ئاشی مورتکەی بەناوبانگ بوو، ئەو ئاوەش لەسەرەوەی گوندی مورتکەی گەورە کارێزبوو، دەردەبوو. ئاوەکەش ئەوکاتی ئاوێکی زۆر بوو دەهاتە خوارێ بە برایمەلەک و بەو گوندانەدا دەڕۆیشت. شینایی و برنجیان لەبەر دەکرد. مام سدیق دەیگێرایەوە دەیگوت هەندێک لە خزمەکانمان بەشە موڵکی خۆیان فرۆشتە ماڵی حاجی وەلی حاجی قادری دەباغی هەولێری، بۆیە بە مورتکەی شەهابی بەناوبانگە. لە تۆمارگاکانی میری بەناوی وان نووسراوە، ئێستا نیوەی گوندی موڵکی وانە، ئەویدی هی خۆمانە.

## هەمزەکۆر

هەمزەکۆر گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترێی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرییە، لە خوارووی رۆژهەڵاتی ناحیەکە هەڵکەوتووە. ئاقاری لەگەڵ ئەو

گوندانەی خوارەوە کەردز-کەرزۆڕ، گردمەلا، گۆمەگوڕ، دۆڵەبەکرە، قولتەپە، قوشتەپە لەسەر یەکە.

ناوی (هەمزەکۆر) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە، دوو وشە بووە، یەکەمیان (هەمزە) و دووەمیان وشەی (کۆر) بەواتای کوێر دێت، وشەکە لە (ناو+ناو) دروست بووە، بەناوی ئەو پیاوە ناونراوە کە ناوی هەمزە بووە و چاوێکی کۆربووە، بۆیە پێیان وتووە (هەمزەکۆر). کاتی خۆی (هۆزی مامەسێنی) بەقسەی خۆیان کە دەڵێن ئێمە بە رەسەن دەچینەوە سەر عەشیرەتی (مامەش) لەو دەوروبەرەو لە ئاقاری دۆڵەبەکرە و هەمزەکۆر نیشتەجێ ببوون، پاشان مامەسێنییەکان لەو ناوەدا هەڵقەناون و کەوتوونەتە دەشتی کەندێناوە ئەو گوندانەی خوارەوەیان ئاوەدان کردۆتەوە سەر گەڕ-گورگە، پاش ئەوەی دەشتی قەراجێ کەم کەمە ئاوەدان کراوەتەوە: چەند بنەماڵەیەکی مامەسێنی بە مەڕدارییەوە ئاوای قەرەچووغ بوون و لەو گوندانەی دەشتی قەراجێ دامەزراون وەکو هەمین مردی، دوو سەرە.

لە پاشان ئەو ئاقارە بووەتە موڵکی بنەماڵەی ئەسعەدییەکانی هەولێری، تەقێ دیناغای ئەسعەدی باپیری نازماغای کوری سەعید ئاغا بووە، ئەو پیاوە لە زەمانی عوسمانییەکاندا بەڕێوەبەری ناحیەی پردێ بووە، لە گوندەکانیان لەو ناوەدا: ئێلنجاغی گەورە و گچکە، دۆڵەبەکرە، هەمزەکۆر، یەدی قزلەر، عەزەو باترتۆق بووە، لە ناوچەی بەرانەتیشدا ئەو گوندانەیان هەبووە، شاخۆلان، مەموندیان، قەڵاتچۆغان، گوندی هەمزەکۆر و ئێلنجاغ بەر (نازماغا) کەوتووە و، (دۆڵە بەکرە)ش فرۆشراوەتە ماڵی پاشای، ئەحمەد پاشا حەمەداغای کوری نارده ئەوێ، بەزۆری دانیشتوانی ئەم گوندە لەتیرەی (پەرچەم)ن سەر بەهۆزی بلباسن. پەندێکی کوردیش لەو ناوە سەری هەڵداوە دەڵێن (بوارە لە هەمزە کۆری!).

## گۆمەگروو

گۆمەگروو: ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی (پشتڕێی) لە ناوچەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە: کەردز، کەرزۆڕ، هەمزەکۆر، دۆڵەبەکرە، ئێلنجاغ لەسەر یەکە، وشەی گۆمەگروو وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە وشەی (گۆم+ە+ گروو) پێکهاتووە. شوێنەکەی نەورایییە لەکاتی خۆیدا لە چۆمان ئاویان بۆ هێناوەتە ئەو نەورایییە، تا وای لێ هاتووە بووەتە گۆمێکی گەورە، هەتا دەرەنگی ساڵێ ئاوەکەی دەماوە پیس و بۆگەنی دەبوو، مەڕدارەکان مەڕ و ماڵاتەکانیان پێ ئاو دەدا، قسەی خۆمان بێت گەلەک جاران بۆ خواردنەوە بەکاریان دەینا، جا ئەو شوێنە ناونرا گۆمەگروو، جا لەنزیک ئەو گۆمە پیسەوە مەڕدارەکان خانووبەرەیان لێ ئاوەدان کردەوە و تاوای لێ هات بووە گوند و ناونرا گۆمەگرو. ئەو گوندە بە گۆمەکەوە ناسرا، بەموڵک هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە، ماڵی پاشای بە (٥٠٠٠) دینار ئەو گوندەیان کڕی و شێخمحەمەدی پاشای چووە ئەوێ، لەساڵی ١٩٨٥ز. ئەو گوندەش لەگەڵ هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێرێ وێران کرا.

## قونیان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێر، هاوسنوورە لەگەڵ گوندەکانی عەزە، بێریات، قەتەوی، عەرەب کەند، باغەمنارە، نێزیکەی (١٢)کم لە هەولێرەوە دوورە، بە موڵک هی بنەماڵەی نادر ئاغا بووە، لە پاشان بووە موڵکی عەلی پاشای دۆغرەمەچی، مامۆستا و شاعیر و ڕەچەڵەک ناس. خوا لێخۆشبوو (ناسیح حەیدەری) لەبارەی بنەماڵەی نادراغای قونیان دەڵێت: (هەروەکو بیستوومە ئەم بنەماڵەیە لە عەشیرەتی بلباسن) وشەی (قونیان) لە بنچینەدا ناوێکی تورکییە، کاتی خۆی زۆربەی فەرمانبەرەکانی عوسمانی تورک بوون ئەو ناوەیان لێناوە، لەوانەیە بەناوی (قۆنیا-کۆنیا) کە شارێکە لە باکووری رۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆکەدا ناونرابێت، بە تێپەڕبوونی کات و سات و زەمانە وشەکە بووبێتە (قونیان)، وشەی یاقۆی لە تورکیدا بە مانای (بیر) دێت، ئەو ناوەو دەوروبەری گوندی (قونیان) کارێزێکی زۆری لێ هەیە. هەر چۆنێک بێت (قونیان) گوندێکی زۆر کۆنە ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای داگیرکردنی کوردستان لەلایەن تورکە عوسمانییەکانەوە. لێرەدا ئەو پارچە هەڵبەستەی شێخ رەزای تاڵەبانی دێنمەوە کە پەیوەندییەکی بەتینی هەیە لەگەڵ بابەتەکەماندا. شێخ هەجوی (ماڵ مودیری) واتە (مدیر المالیة)ی کردووە کە خەڵکی گوندی (قونیان)ی شاری هەولێر بووە، یەکێک بووە لە ئاغاکانی هەولێرییان. ئەوکاتە لەشاری کەرکووک

لە زەمانی عوسمانییەکاندا فەرمانبەر بووە، بەڵام ناوەکەی نازانین چ بووە و کێ بووە؟ ئەمەش هەڵبەستەکەیە:

**ماڵ مودیری**

**ماڵ مودیری کە خەڵکی هەولێرە**
**هەروەکو مووی خایە بێ خێرە**
**سوورەت و سیرەتی لەپیاو ناچێ**
**ئەو قورمساغە مێیە یا نێرە**
**وتم ئەی بێ حەیا تۆ ناترسی**
**لە خوای، ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە**
**وتی یا شێخ ئەمان مەکە مەنعی**
**ئەهلی (قونیان) بەقوونی ئەو فێرە**
**نییە باکم گەر ئەو خەبیسە بڵێ**
**ئەوە ئەشعاری (لامیعی) کوێرە**

## بێریات و تۆبزاوە

بێریات ناوی گوندێکە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژاوای شاری هەولێر، هاوسنووری گوندەکانی قونیان، عەزە، قەتەوی، باترتۆق یان (باتروخ)ە، نزیکەی (١٥)کم لە هەولێرەوە دوورە، سەر بەناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە، کاتی خۆی بەموڵک هی (شێروان)ییەکان بووە. عەشیرەتی (شێروان)یش هۆزێکی گەورەی کوردن کاتی خۆی لەناوچەی شێروان مەزن و دەوروبەری (مێرگەسۆر)ەوە چەند بنەماڵەیەکیان هاتوون و کەوتوونەتە دەشتی هەولێر لەو دەشتەی مرکییە دامەزراون. پاشان ئەو ناوەیان جێ هێشتووە و کەوتوونەتە دەشتی کەندێناوە و لەبناری چیای (قەرەچووغ)ی بەدیوی کەندێناوەدا ئەو گوندانەیان ئاوەدان کردۆتەوە: وەکو دارەخورما، حاجی شێخان، حەسەن بەگ، چیغلۆک، بەڵام ئێمە لێمان روون نییە نازانین کەی و لە چ زەمانێکدا کەوتوونەتە ئەو دەڤەرە؟ هەرچەندە هەندێکیان دەڵێن لە زەمانی پاشای کوێرەی ڕەواندزی بووە، شێروانییەکان ئەو گوندەیان فرۆشتۆتە بنەماڵەی (حەیدەری)یان و بووەتە موڵکی ئەوان.

لەبارەی وشەی (بێریات)یش تا رادەیەک روون و ئاشکرایە لە چ هاتووە. وشەی (بێر) لەزمانی کوردیماندا زۆر واتای هەیە بۆ نموونە: ئامرازێکە لە دار دروست دەکرێت، دەمەکەی پان و لووسە، بۆ خڕکردنەوە و بێرەباکردن رەوسەی گەنم و جۆ بەکاردێت، دەسکێکی داری درێژی هەیە وەکو (خاکەناس).

دووەم: وشەی (بێر) بە مانای خێر و بێر، فەڕ، بەرەکەت دێت، دەگێڕنەوە کاتی خۆی دانیشتوانی ئەو گوندە بەزۆری مەڕدار بوون، لە سەرەتای بوارانداکە (مالّوددەرانن) یان (دەرەبواران)ی پێ دەڵێن بۆ بنەگە هەواریان بەرەو دەشتی قەراجێ دەکەوتنە رێ، مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار زۆریان هەبووە، لەوێ دەمانەوە تا گیا تەواو نێر دەبوو، ئەنجا دەگەڕانەوە جێگای خۆیان لەدەشتی مرکییە. لەو شوێنە کە گوندەکە ناونراوە (بێریات) مەڕوماڵاتیان لە (بێر) دەدا، بەمەش دەڵێن مەڕ لە (بێردان) گەلەک جاران کە منداڵ بووم لە گوندەکەمان گوێم لێ دەبوو دەیانگۆت ئەرێ مەڕتان لە (بێر) نەدایە؟ ئەگەر مەڕیان لە (بێر) بدایە، ئەوا دەیانگۆت بەرێ مەڕمان لە (بێر) دایە.

ئەگەر لە (بێر)یان نەدابایە دەیانگۆت: نەخێر هێشتا مەڕمان لە (بێر) نەدایە.

لە (بێردان)یش چوار پێنج (٤-٥) کەسی دەویست مێگەلەکەیان خڕ دەکردەوە و شوانێک لەسەر (سەربێر) یاخود لە هەندێ دەڤەری دیکەی کوردستاندا (بەردەبێر)ی پێ دەڵێن، دادەنیشت مەڕەکانیان بەڕیز و یەک لەدوای یەکدا بەرەو شوانەکە دەبرد. شوانەکەش بەم دەست و بەو دەستی هەرجارێ دووانی دەگرت، دوو ئافرەتیش لەمبەر و لەوبەری (بەردەبێر) بەدووری مەترێک دادەنیشتن و مەڕەکانیان دەدۆشی بەو ئافرەتانەش دەگوترا (بێری). کاتێ بێرییەکان مەڕەکە یان بزنەکەیان دەدۆشی دەیانگوت (بەرەکەت). ئەنجا شوانەکە تێدەگەیشت و مەڕەکە یا بزنەکەی بەردەدا و دووانی دیکەی دەگرت. لێرەدا وشەی (بەرەکەت) دوو مانای دەگەیاند یەکەمیان بەمانای بەردە، واتە مەڕەکە یا بزنەکەی (بەربدە). دووەمیان بەمانای (بەرەکەت) بکەوێتە شیرەکەوە.

لێرەدا پەندێکی پێشینان دێنمەوە کە لەو دەڤەرە سەری هەڵداوە دەڵێن:

**دەرێی جاحێری (بێریات)ییە. یان**
**(بووەتە جاحێری (بێریات)ێ**
**یا (دەمی جاحێری (بێریات)ییە.**

مێژووی ئەو پەندەش هەر لەوکات و ساتەوە پەیدابووە وەختێ خەڵکی گوندەکە بە مەڕداری دەچوونە دەشتی قەراجێ، هەندێکیان لەگوندی دەمانەوە. جاحێرێکی (جحێلێکی) خەڕپووشۆکەیان هەبووە، کە کەمێک ناشیرین و نارێک بووە، کەسی پێ رازی نەبووە، کاتێک کەس لە گوندی نەدەما، کچانی گوندی بەناچاری بایاندەداوە سەری. ئەویش بۆ خۆی دەبووە میر کوڕ. هەروەکو دەڵێن (بەخۆی میر کوڕە).

(تۆبزاوا) ناوی گوندێکە. دەکەوێتە خوارووی رۆژاوای شاری هەولێر. ئەم گوندەش لە ئاقاری گوندی (بێریات) دابڕاوە لەلایەن سەلیماغای گورجی زادەی هەولێرییەوە ئاوەدان کراوەتەوە. چەند گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو هەیە، لەناوچەی بەڕانەتی گوندێک بەناوی (تۆبزاوە) هەیە کە (تۆبزاوەی زاب)ی پێ دەڵێن. بە موڵک هی بنەماڵەی (یەعقووبییەکان) بووە، سەر بەناحیەی (کەڵەک)ە لە دەشتی کۆیەش گوندێک بەو ناوە هەیە.

لەناوچەی برادۆستی سیدەکانیش گوندێک بەو ناوە هەبووە کە ئاسەواری (کێلە) مێژوویە بەناوبانگەکەی لێیە، بە (کێلی تۆبزاوە) بەناوبانگە. لەناوچەی (داقوق)ی پارێزگای کەرکووکیش گوندێک بەهەمان ناو هەیە هی هۆزی (کاکەیی)یەکانە.

ناوی (تۆبزاوە)ش وشەیەکی دارێژراو یا دارێژراوی کوردییە لە وشەی (تۆبز+ئاو)ەوە هاتووە.

تۆبز: واتە بەزۆر (ئاوا)ش پاشگرە. بەواتای بەتۆبزی، بەخورتی، بەزۆری، ئاوەدان کراوەتەوە یان تۆبز ئاوەدانی کردۆتەوە. لێرەدا مێژوو و بەسەرهات و ئاوەدانکردنەوەی ئەم دوو گوندەم لە هەڵبەستێکی خوالێخۆشبوو شاعیر و رەچەڵەکناسی کورد مامۆستا (ناسح حەیدەری) وەرگرتووە کە لەژێر ناوی (باسێکی مێژوویی) لە لاپەڕە (٢٥٨)ی دیوانەکەیدا بڵاوکراودتەوە، ئەمەش پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ باسەکەی ئێمەدا هەیە و تارادەیەکی باشیش مێژووی ئاوەدانکردنەوەی هەردوو (٢) گوندی (بێریات) و (تۆبزاوە)ی بۆ روون کردووینەتەوە، بۆیە بەپێویستم زانی لێرەدا بڵاوی بکەمەوە، بەسەرهاتەکەش ئەمەیە:

نادراغا یەکێک بووە لە ئاغاکانی هەولێرییان ماڵ و دیوەخان و حەساری لە هەولێر بووە، خاوەنی گوندی (قونیان) بووە، ئاغایەکی دیکەی هەولێری کە ناوی سەلیماغای گورجی زادە بووە، فەلاحێکی گەورە بووە لە دێی (قونیان) لە رێی ژن و ژنخوازی لەگەڵ بنەماڵەی نادراغا تێکەڵاوییان هەبووە، کاتی خۆی زۆربەی هەرەزۆری گوندەکانی ئاقار و دەوروبەری هەولێری کە پێیان دەگوترا (ناوئاقار) هی بنەماڵە و ئاغاکانی هەولێرییان بووە، وەک بنەماڵەی خوالێخۆشبوو مەلافەندی، ئەسعەدی، یەعقوبی، دەباغەکان، حەیدەری، بنەماڵەی سەید ئەحمەد/ مەحموداغای باوکی عەلی پاشا و گەلێکی دیکەیان. سەلیماغا زەمانە رووی تێ کرد و دەوڵەمەند بوو، دەسەڵاتی پەیدا کرد، هەندێک لە زەویوزاری (بێریات)ی بەزۆر واتا بەتۆبزی دابڕیبوو، ناوی لێنابوو (تۆبزاوە). حەساری لێ دامەزراند و رەزوباغی لێ دەچاند. (بێریات)یش هی بنەماڵەی (حەیدەری)یان بوو. زەمانە زەمانی زانای گەورە (حەیدەری) یان (سەبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عاسیم) بووە کە بە سەبغەتوڵلای سێیەم بەناوبانگ بووە. سەبغەتوڵلا کە بەمەی زانی هەستا لەلای فەرمانڕەوای شاری هەولێر شکاتی لێ کرد، کە ئەوکاتی (یەعقوب ئاغا)ی کوڕی قاسم ئاغا کوڕی عەبدوڵلا ئاغای بەیات بووە.

بەڵام لە هەولێر هیچی بۆ نەکرا، بەناچاری بەسواری وڵاغ چەند قۆناغە رێ رۆیی بۆ بەغدا، سکاڵای خۆی لەلای والی بەغدای ئەو سەردەم، عەلی رەزا پاشا ١٨٣١ز-١٨٤٢ز) کرد، پاش ئەوەی سەبغەتوڵلا دیدەنی والی دەکات و رێزی لێدەندرێت و دەیگەڕێنتەوە هەولێرێ، بەڵام لێرەدا واتە لە هەڵبەستەکەدا ئەوە روون ناکاتەوە ئایا والی فەرمانی وەرگرتنەوەی عەرد و زەوییەکەی دەداتێ یان نا؟

سەبغەتوڵلا کە دەگەڕێتەوە هەولێرێ، بەخێرایی خەبەر دەنێرێتە گوندی (ماوەران) و تێیان دەگەیەنێت کە زوڵمێکی گەورەیان لێ کردووە و داوای ئەوەیان لێ دەکات هەرچۆنێک بێت چەند زەلامێک لە کوڕە ئازاکانی گوندی بۆ بنێرن، خەڵکی (ماوەران)یش هەڵدەستن ٣٠-٤٠ زەلام لە رۆڵە ئازا و بەجەرگەکانی گوندی کە سەر بە عەشیرەتی (میریالی) بوونە دەنێرنە هەولێرێ، شەوێ دەچنە سەر گوندی (تۆبزاوە)، دار و رەز و باغچەکە دەبڕن و حەسارەکەش هەڵدەوەشێنن و وێرانی دەکەن و دەگەڕێنەوە، بۆ بەیانی خەبەر دەگاتە (سەلیماغای گورجی زادە).

ئەویش یەکسەر رووەدەکاتە شاری بەغدا، سکالای خۆی لەکن والی (عەلی پاشا)ی دەکات. ماوەیەک لەو هاتوچۆیەدا دەبێت لەوێ کۆچی دوایی دەکات و هەر لە شاری بەغداش لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەخاک دەسپێردرێت. ئەو رووداوە و بەسەرهاتەش لەنێوان ساڵەکانی (١٨٣٨ز-١٨٤١ز) رووی داوە، چونکە میرنشینی سۆران بە لەناوچوونی میر محەمەد پاشای گەورەی سۆران لە ساڵی (١٨٣٧ز)، ئەویش لەناو چووە و رووخاوە. کاتێ پاشای گەورە لە ساڵی (١٨٢١ز-١٨٢٢ز) شاری هەولێری گرت (یەعقوباغا) فەرمانڕەوای شار بوو، ئەوی لابرد و (خدری کوڕی بایز بەگی) خەزووری لەشوێن دانابوو (یەعقوب) ئاغاش لە دەرفەتێکا شاری بەجێ هێشت و پەنای بردبوو بۆ لای (والی موسڵ) لەوێوە چووبووە شاری بەغدا. کەواتە هەر لەساڵی ١٨١٢ز هەتا ساڵی ١٨٦ز بۆ ماوەی (١٥) ساڵ دەڤەری سۆران و شاری هەولێر لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا نەبووە. لەساڵی ١٨٣٧ز. کە میرنشینی سۆران هەرەسی هێنا دووبارە لەشکری عوسمانی هاتنەوە دەڤەرەکە و شاری هەولێر کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان و والی بەغدا یەعقوب ئاغای کردووە بە فەرمانڕەوای شار و تا لەساڵی ١٨٤٧ز. لابردرا، یەعقوباغاش لەساڵی ١٨٧٤ز لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە و لەگۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژراوە، قەبر و ئارامگاکەی هەتا ئێستاکەش ماوە.

سەبغەتوڵڵای حەیدەری بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی مێژوویی لەساڵی ١٨٣٣ز. تا ساڵی ١٨٣٥ز. قازی شاری کۆیێ بووە، کە لەلایەن پاشای گەورەی رەواندزەوە داندرابوو، چونکە (میر محەمەد) پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ بنەماڵەی (حەیدەری)یان بە تایبەتی مەلا سەبغەتوڵڵای سێیەمدا هەبووە و هەردەم رێزی لێ گرتوون. مامۆستا تایەر ئەحمەد حەوێزی لەمێژووی کۆیە بەرگی یەکەمدا لەلاپەڕە (٩٧)دا دەڵێت: هەندێ کتێب هەن لە مەکتەبەی مەلا محەمەدی جەلی بۆ مەلا سەبغەتوڵڵای کۆیە، کە میر محەمەد پاشای گەورە کردوویەتە قازیی کۆیە. یەکێک لە کتێبەکان لەسەری نووسرابوو: (تەواو بوو بەدەستی فەتحوڵڵا عەزیزی بۆ خاتری مەلا سەبغەتوڵڵا قازی کۆیە لەساڵی (١٢٥٣ک). بەڵام لەبەر رووداوێک مەلا سەبغەتوڵڵا لە میری گەورە (محەمەد پاشا)ی سۆران عادز دەبێت و کۆیە بەجێ دێڵێت و دێتە شاری هەولێر تا لەساڵی ١٨٥٥ز. کۆچی دوایی کردووە. ئەم زانا گەورەیە مامۆستای هەردوو زانا و شاعیری گەورەی کورد مامۆستا عەبدوڵڵای بێتووشی و مەلاخدری شارەزووری ناسراو بە (نالی) بووە.

**باسێکی مێژوویی**

**ئەمە باسێکە دەیکەم بە تەواتر**
**وەکو بیستوومە لەبیست کەس زیاتر**
**سەلیم ئاغا بەگورجی شوهرەتی بوو**
**لە ئاغای هەولێری بەقووەتی بوو**
**نادر ئاغاش هەبووە ئازا و بە دەنگ**
**خاوەنی قونیان، جەلیل و مەیتەر بەگ**
**هەبوو خزماتی لە بەینیان هەر بە ژن**
**سەلیم ئاغا و نادر ئاغای زۆر مەزن**
**هەر لە هەولێر بوو ئەوانە ماڵیان**
**تا دیوان و خانوو و حەساریان**
**سەلیم ئاغا واببوو رووی تێکرد زەمان**
**بوو بە فەللاحەکی گەورە لە قونیان**
**خەبەریان دا سەلیم ئاغا بە سورعەت**
**هەر کە بیستی زوو لەبۆی کرد حەرەکەت**
**بۆ شیکایەت چوو بدا عەرزو حاڵی**
**لەبۆ عەلی رەزا پاشایی والی**
**لە بەغدا مایەوە و کردی هاتوچوو**
**هەتا رۆژەک ئەجەل سواری ملی بوو**
**هەتا نێژرا لە مەقبەرەی گەیلانی**
**ئەوە دنیایە و بە ئەدواری و زەمانی**
**ئێستاکەش زەوییەکە ناوی حەسارە**
**بکەی دیقەت ئاساری لێ دیارە!**
**فەللاحەکی وەها پوخت و بەقووەت**
**بە یاریدەی نادر ئاغای بەهیمەت!**
**موجاویر بوو ئەرازی گوندی قونیان**
**بە ئەرزی (بێریات)ی گوندی حەیدەرییان**
**مولکی حەیدەرییان بوو گوندی بێریات**
**لە شێروانیان کرابوو خۆ بە ئیسپات**
**موسەیتر بوو سەلیم ئاغای گورجی زاد**
**بەسەر مولک و ئەرازی حەیدەری زاد**

**بەشێکی دابڕی بەخورتی و بەزۆر**
**لە ئەرازی بێریاتی جەننەتی زۆر**
**لێی دامەزراند حەسار و ڕەزی ساوا**
**ناویشی نا بەگوندی تۆبزاوا!**
**با بێینە سەر بنەماڵەی ماوەران**
**بۆ سەردەمی سەبغەتوڵلای زەوی شان**
**کە ئەرزی بێریاتی داما داگیرکراو**
**بوو بە موڵکی سەبغەتوڵلای ناوبراو**
**شکاتی کرد سەبغەتوڵلای بەثانی**
**لەلای گەورە و حوکمداری زەمانی**
**چاری نەکرد حوکمداری لە هەولێر**
**سوار بوو ڕۆیی لەبۆ بەغدا وەکو شێر**
**میوان بوو لە عەبدولغەفوور ئەفەندی**
**ڕەئیسی نوسرە بوو ئەوسا بەجیددی**
**لەپاش حەسانەوەیەکی کەم و زۆر**
**قەراری دا ئەوجا بچێ بۆ حوزور**
**چوو بۆ دیدەنی عەلی ڕەزا پاشا**
**عەرزی حاڵی بەیان کرد بەبێ حاشا**
**عەلی ڕەزا پاشا والی بەغدا بوو**
**زۆر موخلیسی عالیم و عولەما بوو**
**والی فەرمووی ئەفەندی بەدیرایەت**
**جەنابت بۆ دەهاتی بۆ شیکایەت**
**سەفەر بکە تۆ ئێستاکە بۆ هەولێر**
**لەپاش ئەوەی ئیستراحەت دەکەی تێر**
**لە کۆنە ماوەران هەیبوو چل ماڵی**
**فەلاح و لە عەشیرەتی میر باڵی**
**خەبەری نارد چل پیادەی بەقووەت**
**لەمیر باڵی بێنە هەولێر بە سورعەت**
**بەشەو بچن بۆ بێریات زوو بەدزی**
**کاول بکەن حەسار و ببڕن ڕەزی**
**بەڕێکەوتن چل پیاوی زۆر بەکار**
**بۆ بڕینی ڕەزو کاول کەن حەسار**
**حەسار وێران بوو نەما ڕەزوداری**
**تا بەیانی نەمابوو چ ئاساری**

## کانی قرژاڵە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژاوای شاری هەولێر، ئاقاری لەگەڵ گونددکانی سێبیران، ساتۆر، شەمعوناوا، سوێری، بن بێرزو قەرێتاغ لەسەر یەکە، ناوی (کانی قرژاڵە) لە بنچینەدا وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (کانی+قرژاڵ+ ە) پێکهاتووە واتە لە (ناو+ناو+ ئامرازی ە) پێک هاتووە، ناوەکەی بەناوی ئەو کانییە ناونراوە کە قرژاڵی تێدا دەبینراو قرژاڵی هەبووە ئەو گوندە دەکەوێتە خوار ڕێگاکەی هەولێر، موسڵ بەدەستە چەپ لەوبەر بازگەی هەولێر، موسڵەوەیە، کاتی خۆی هۆزی (شێخ مەموند)ی ئاوەدانیان کردۆتەوە، ئەو هۆزەش نێزیکەی (١٣٠) ساڵێک لەمەوبەر لەگوندی (شێخ مەموند)یانی بناری چیای (شەکرۆک) و لە سەرەتاوە بە کۆچەری و مەڕ لەوەڕاندن کە کوێستان و گەرمیانیان دەکرد کەوتوونەتە ئەو ناوە و نەگەڕاونەتەوە شوێنی پێشووی خۆیان، لەو ناوە دامەزراون. ئەم زانیارییانەی سەرەوەم لە کاک (عەزیزاغا شێخ مەموندی ١٩٤٢ز.) وەرگرتووە و خۆی لە هۆزی (شێخ مەموندی)یەو خەڵکی گوندی کانی قرژاڵەیە و ئێستا لەشاری هەولێر نیشتەجێیە دەیگوت:

هەر لە تەمەنی مندا ئەو ناوە هەموو پووش و پەراش بوو، هەر لە هەولێر هەتا دەگەیشتە (کەڵەک) زۆر کەم زەوی دەچێندرا هەمووی هەر پاوان بوو گیا لەناو قەدی زەلامی بوو، ئێستاش گوندی (شێخ مەموند)ان هەر ماوەو ئاوەدانە و دەکەوێتە دەشتی (هەریر)ێ بەرامبەر گوندی (سیساوە)یە لە ڕۆژهەڵاتییەوە هەڵکەوتووە لەبناری (چیای شەکرۆک)دایە دانیشتوانەکەی تا بەم دواییەش هەر خەریکی مەڕداری و کۆچەرایەتی بوون، هەنووکە هۆزی شێخ مەموندی لەدەشتی هەولێریدا لەو گوندانە هەنە کانی قرژاڵە، پیرەش، مورتکەی گەورە.

## یەعقوب تەپە

یەعقوب تەپە: ناوی گوندێکە لەدەشتی مرکییەی دەشتی هەولێرێ سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە، ئاقاری لەگەڵ گونددکانی قوشتەپە، سێبیران، هەمزەکۆر، دوکەڵە، بیردعاردبان، دۆڵەسزە، دووگردکان لەسەر یەکە. گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نازانین ئەوەندە هەیە لەزەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە، ناوەکەش لەدوو برگە پێک هاتووە: یەکەم (یەعقوب) دووەم برگەی (تەپە) کە وشەیەکی تورکییە بە مانای (گرد) دێت. بەسەر

یەکەوە بەمانای (گرد یەعقوب) یا گردی یەعقوبی دێت. بەناوی ئەو پیاوەوە ناونراوە کە ناوی (یەعقوب) بووە. لەنزیکییەوە گردێکی ئەسەری گەورە هەیە کە (گردی قولتەپەی)پێ دەڵێن گردەکەش و گوندەکەش هەر بەوناوە ناو نراوە کە گوندەکەی ئاوەدان کردۆتەوە، لە نەخشە کۆنەکاندا بەناوی (یەعقوب تەپە) تۆمار کراوە، (مام سەعدی وەسمان ئۆمەر)... خەڵکی گوندی قولتەپە بۆی گێرامەوە و گوتی: لە ساڵەکانی شەڕی جیهانی دووەمدا پۆلۆنییەکان، واتە سوپای پۆلۆنی، لەترسی لەشکری ئەڵمانی کەوتبوونە ئەو ناوە لەزۆر جێگا لەشکرگا و بارەگایان هەبوو لەسەر ئاوی مورتکە و بناری زوورگەزراو و بناری چیای قەرەچووغ و گەلێ شوێنی دیکەی کوردستاندا ئافرەتێکی زۆریان لەگەڵدا بوو هاتنە گوندەکەمان، نەخشەیان پێ بوو، دەریان دەهێناو تەماشایان دەکرد. دێتە یادم بە (قولتەپە)یان دەگوت (عەلای یەعقوب)، کەواتە ئەو گوندە لەکۆنەوە هی بنەماڵەی (عەلی یەعقوب) ناوێکەوە بووە، وتی کەس لەخەڵکی گوندی نەیدەزانی ئەو بنەماڵەیە کێن و نەودیان کێ بووە و ئەسەریان دیار نەبوو؟ هەر لەکۆنەوە خەڵکەکە بە (یەعقوب تەپە) دەڵێن قولتەپە، مام سەعدی دەڵێت باپیرەم بەمەڕ لەوەڕاندن لەگوندی (سەرکەند) خەیلانییەوە، ئێستاکە گوندێکە سەر بەناحیەی مەسیف سەلاحەدینە و کەوتووەتە ئەو دەڤەرە. پاشان عەولای حەویزی کە یەکێک بووە لە بنەماڵەی بایزی لە قوشتەپەوە هاتۆتە ئەو ناوەو دامەزراوە، لەدواییدا ئاقاری ئەو گوندە بە سێ (٣) بەش (گوند) دابەش کراوە ١- قولتەپەی رەشیدی حەویزی. ٢- قولتەپە یابە. ٣- قولتەپە رەشید عەزیز.

## تربە سپیان

ئەمەش ناوی گوندێکی دیکەیە لەدەشتی مرکییەی سەر بەناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی پیرداود، سوورێژە، منارە، باقرتە، دووگردکان، پڵنگە، مێرخوزار لەسەر یەکە، گوندێکی کۆنە لەزەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە و ناوی (تربە سپیان) ناوێکی لێکدراوە، لەوانەیە وشەی (تربە)، (تەپە)ی تورکی بێت کە بەمانای گرد دێت، چونکە گردێکی ئاسەواری لێیە رەنگێکی سپی هەیە. لەوانەشە وشەی (تربە) لەوشەی (تربە)ی عەرەبییەوە هاتبێت، کە بەمانای (خاک) دێت، چونکە خاکی تربە سپیان بەرەنگی مەیلەو سپی خۆی دەنوێنێ، ئەو گوندەش بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغا) بووە لەپاشان کەوتۆتە بندەستی بنەماڵەی فارساغا. سەردەمێک سلێماناغای قوشتەپەی لەوێ دادەنیشت. جا وشەی تربە سپیان لە (تەپە سپیان)ەوە هاتووە (تەپە+ سپی+ ان) بە واتای (ناو+ ئاوەڵناو+ ان) پێکهاتووە، چونکە لەزمانی کوردیماندا ئەگەر ناوێکی تاک کۆتایی بەیەکێک لەم پیتە بزوێنانە هاتبێت (ا،ۆ،ێ،ی) بە ئامرازێکی (ان) و بە یاریدەدەری پیتە (ی)ی ناوبەندییەوە دەکرێت بەناوێکی کۆ، کەواتە وشەی (سپی) تاکە کە کردمانە کۆیە دەبێتە (سپییان)، هەندێ جار وشەکە بەمانای مەڕ دێت (سپیان) واتە گردی مەڕان.

## دۆغان

دۆغان: ناوی گوندێکە لە دەشتی شەمامکێ سەر بەناحیەی قوشتەپەیە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە سۆربەش، گردعازەبان، ئێدی قزلەر، سوورێژە، عەلیاوە لەسەریەکە، زەوییەکەی تا بڵێی باش و بەپێز و بەبرشتە، گوندێکی کۆنە، لەزەمانی عوسمانییەکاندا ئەو ناوەی لێنراوە، بەموڵک هی بنەماڵەی (زەینەل)ەفەندی بووە، کە کاتی خۆی کاربەدەستێکی عوسمانلی بووە لەو دەڤەرەدا، بەخۆی بەرەسەن خەڵکی شاری کەرکوک بووە، کوڕێکی هەبووە بەناوی رەشیدئەفەندی کە دەکاتە باوکی پارێزەر (بەهائەدین) ئەویش بەزۆری لەشاری کەرکووک دادەنیشت، دەیگوت کەس نەما سەرپەرشتی گوندەکەمان بۆ بکات و خەڵکی ئاواییەکەیان چۆڵ کردبوو، هەر ٦-٧ ماڵێک دەبوون و ئێمەش بە ناچاری فرۆشتمانەتە ئاغاکانی مام خولەیی. ئەم زانیارییانەم لە بەڕێز بەهائەدین کوڕی رەشید کوڕی زەینەل ئەفەندی وەرگرتووە، هەنووکە لەشاری هەولێر لە گەڕەکی رووناکی نیشتەجێیە.

(دۆغان) لە بنچینەدا ناوێکی تورکییە بە مانای (دەزێ)یان (زا) دێت.

دەگێڕنەوە دەڵێن: دۆغان ٦-٧ ماڵێک دەبوون، رۆژێکیان مەلای گوندی (بانگ) دەدات بەڵام زۆر بە بێتاقەتی و کزی و عاجزی، یەکێک لە خەڵکی گوندی لە مامۆستای دەپرسی، ئەرێ مامۆستا ئەوە ئەتوو لۆ هەندە بە

سەبری بانگت دا؟ مامۆستاش لە وەڵامدا دەڵێت:
کوڕم لەقەدەر (دۆغان)ییە؟
ئەم پارچە شیعرە فۆلکلۆرییەی خوارەوەش کە لەسەر گوندی (دۆغان) و رەشیدی زەبنەل ئەفەندی هۆنراوەتەوە بەناوی ئەفەندی بێ سەپان:

**هاتم لەلای هەولێرێ رێم دەکەتە (دۆغان)ێ**
**لە پیرەژنەکم پرسی پیری ئاخری زەمانێ**
**رێی دیوەخانێ کانی دەچووەمە دیوەخانێ**
**ئەفەندییەک دانیشتبوو پیری ئاخری زەمانێ**
**جغارەکی دەدامێ قونک دارێ خاتانێ**
**ئەفەندی لۆ عێجزە دەیگۆ لە بێ سەپانێ**

## هێلەوە

ئەو گوندەش دەکەوێتە دەشتی مرکییە، سەر بەناحیەی قوشتەپەیە. ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی سیاو، عەلیاوە، ئاوەدلۆک، زوورگی زوورگەزراو لەسەر یەکە، گوندێکی کۆنە، لە زەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە. بەموڵک هی بنەماڵەی کوێخا عەزیز بووە لەپاشان بووەتە هی بنەماڵەی کوێخا بیبزی، هەروەکو گوتمان (سوڵتاناغا) هەندێک لە خزمەکانی لەگوندی (قۆریتان) لابرد و رەوانەی بناری زوورگەزراوی کردن بەدیوی مرکییە، لەوێ (هێلەوە)یان ئاوەدان کردەوە، وشەی (هێلەوە)ش لە بنچینەدا ناوێکی داڕێژراوی کوردییە، لە (هێراوە) هاتووە، چونکە وشەی (هێر) بە مانای شەڕ دێت بۆ نموونە لە کوردەواریدا، دەڵێن فلانەکەس هێرەی کرد پەندێکی کوردیش لەو دەڤەرەدا سەری هەڵداوە دەڵێن:
(سەری هێران و بنی گەواران)
لەم بەیتە فۆلکلۆرانەی دەشتی هەولێردا کە وشەی (هێر) بەمانای شەڕ بەکارهاتووە:

**شەڕ لە جۆخینی جۆیە هێر لە جۆخینی جۆیە**
**گوللە دێ وەکی گۆیە بکوژن ئاغە و کەو خۆیە**
**شەڕ لە جۆخینێ ماشان هێر لە جۆخینێ ماشان**
**گوللە دێ وەکی گاشان بکوژن ئاغە و سوباشان**

## سیاو

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری (زوورگەزراو) بەدیوی دەشتی مرکییەوە هەڵکەوتووە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی هێلەوە، عەلیاوە، ماستاوە، سیراوە، شێخ شەروان لەسەر یەکە. سەر بەناحیەی قوشتەپەیە. کاتی خۆی ئەو ناوە چۆڵ و هۆڵ بووە بواران رەوی قازو قورینگ و (قولینگ) و سی لە کوێستانەکانەوە دەهاتنە خوارێ بەرەو دەشتی هەولێرێ، لەو ناوەدا لەدەو گۆم و چەم و جۆگە و کانیاوەکاندا بڵاو دەبوونەوە، لەو ناوەدا دەهاتنە کانی (چارداغ)ی ئەو کانییەش دەکەوێتە ناو ئاقاری گوندی (سیاو)ی، رەوی دیکەیان بەرەو دەشتی قەراجێ و دەوحاوی هەتا دەگاتە (یەکاوێ) (یەک ئاو) دەرۆیشتن، (یەکاو) بەو شوێنە دەگوترا کە ئاوی زێی گچکە لەگەڵ زێی دیجلە دەبۆوە یەک و تێکەڵ بە یەکتری دەبوون، وشەی یەکاو لە (یەک+ئاو)ەوە هاتووە کە ئەو شوێنەش کۆتایی دەشتی قەراجە. جا لە گۆمەکانی دەشتی قەراجێدا بڵاودەبوونەوە، چونکە دەشتی قەراج گۆمی گەورەی یەکجار زۆرە هەتا درەنگی ساڵی ئاوەکەی دەما وەکو گۆمی قورینگان، گۆمی ماروانشان..
جا لەڕووی زمانەوانییەوە وشەی (سیاو) لە (سی ئاوە) سی ئاوێ هاتووە. سی باڵندەیەکی جوانە و دەنگێکی خۆشی هەیە. جا لەو شوێنەدا کە باڵندەی (سی) زۆر بووە، ئەو گوندە ئاوەدان کراوەتەوە بەناوی سیاو (سیی+ئاو)، جا پیتی (ئ) لە کوردەواریدا ئەگەر پیتی بزوێنی (ا)ی بەدوا داهات، ئەوە پیتی (ئ) لادەبردرێت بۆ نموونە ماسئاو دەبێتە (ماستاو)، (عەلی ئاوە) دەبێت بە عەلیاوە، جا وشەی (سیئاو) بووە بە (سیاو) بەڵام نازانین کەی و کێ ئاوەدانی کردۆتەوە، لە ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێردا دەڵێن (قورینگ و سی) لە هەندێ ناوچەی دیکەی کوردستاندا بە تایبەتی لە ناوچەی سەرچیای سورچیاتیدا دەڵێن (سی و قورینگ) وشەکە پاش و پێش کراوە. بە بڕوای من قورینگ و سی هەریەکە ئەو باڵندەیەیە کە لە مراوی دەچێت، بەڵام لەو گەورەترە و دەنگ و ئاوازێکی خۆشی هەیە، بەهاران لە زۆزانەوە بەرەو گەرمیان دێتە خوارێ هەتا کۆتایی دەشتی قەراج و یەکاوێ دەڕۆن بەزۆری لەناو گۆمان دەژین، کاتی خۆی لەدەراوی گردەسۆری، گۆمی قورینگان، چارداغ، دەوحاوی و چەولکی پردێ گەلێک زۆر بوون لە فۆلکلۆری ناوچەکەشماندا گەلێک باسی (سی و قورینگ) هاتووە. فۆلکلۆر دەڵێت:

**کــاکــە ســەرێ من دێشی دەردێ لەدرم بەبرینە**
**گردەسۆری (سیانان) لەمن بە (قورینگ و سینە).**

لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت:
**قــاقــۆلی (ســیــیــە)، کــوڕە ســەیدێمــە**
**بای قــاقۆل کورکە (سیبە). کوڕە سەیدێمە**
**بای قــاقــۆل هەژاندییــە، کــوڕە ســەیدێمــە**

### سۆربەش قادر

سۆربەش: ئەمەش یەکێکە لە گوندە هەرە کۆنەکـانی دەشتی مرکیـیەی، سەر بە ناحیـەی قوشتـەپەی دەشتی هەولێـرێ، نزیکەی سێ سـەدە (٣٠٠ ســاڵ) لەمــەوبەر، لەلایەن بنەماڵەی (عەلی خاس-خاسان) ئاوەدان کراوەتەوە کـە یەکـێـک بووە لە نەوەو خزمـانی عـەلی بەگ (گـورجی زادە). ناوی سـۆربەش لە بنچـینەدا وشـەیەکی لێکدراوی تورکـیـیـە، لە وشـەی (سوپا-سبا) لەگەڵ وشەی (باش) پێک هاتووە. (ســوپا-ســبـا) بەواتای سـوپا یان لەشکر دێت، (باش) بە واتای ســەر دێت، بەســەریەکــەوە بە کوردییەکەی بەمانای (سەرلەشکر) دێت. هەندێک دەڵێن لە وشـەی (سوباش) هاتووە کـە بەمـانای ئەفســەر دێت، یاخود وشەی (سو) کە بەکورتی بەمانای ئاو دێت، وشەی (باش) بەمــانای ســەر دێت بە کــوردییــەکــەی بە واتای (سەرئاو) یان (میراو) دێت. خۆ ئەگەر بە مانای (میراو-سەرئاو) بهاتایە ئەوە (سوباغی) دەبوو کە بە کوردییەکەی بەمــانای (جــۆوان) یان (جــەوان) دێت کــە بەو کــەســانە دەگــوترێت ســەرپەرشــتی جــۆگــە و شــینایی دەکــەن و شارەزاییەکی تەواویان لەبارەی رەزو باغ و شینایی هەیە.

هەندێکی دیکـە ئەڵێـن (ســۆربەش) لە وشــەی (زۆربەش)ەوە هاتووە کــە زۆر بەش بووە. لەگــەڵ گــۆڕانی زەمانە و لەساڵی ١٨٨٩ز. ئەو گوندە دەکەوێتە بن دەستی ئەحمـەداغا کە بە ئەحـمەد پاشا بەناوبانگ بووە، خدری کوڕی ناردە ئەوێ و بە سۆربەشی خدری ناسرا. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری ئەو گوندانە لەسەریەکە. دووکەڵە، قشاغلو، قازیخانە (میراوە). دوو گوندی دیکەش بەهەمان ناو لە هەمـان ناوچە لە دەشتی مرکییـەدا هەیە یەکێکـیان بەناوی سۆربەشی کاکەڵلا، ئەوی دیکەیان بەناوی سۆربەش حەوێز.

### عەلیاوە

یەکێکە لە گوندەکانی دەشتی مرکییەی، سەر بەناحیەی قــوشــتــەپەی دەشــتی هەولێـرێ، لە بناری زوورگـەزراو هەڵکەوتووە، بەدیوی مـرکـیـیـەدا دەکەوێتە نێـوان گوندی باشـتـەپە و گـردەشـینە. ناوەکەی لە بنچـینەدا وشـەیەکی دارێژراوی کـوردییـە، لەناوێـک بەناوی (عـەلی) و لەگـەڵ پاشگری (ئاوا-اوە-اوا)وە هاتووە: (عـــەلی+اوە) واتـە (ناو+ پاشگر). کـاتی خـۆی کـابرایەک بەناوی (عـەلی سەعدون قـادر) ناوێک لە گوندی سۆربەش بار دەکات و دەچێتە گوندی باشتەپەی لەوێ لەگەڵ قادری پاشای پێک نایەت و باشــتــەپەی بەجێ دێڵــێت و دەچێــتــە گــوندی (گـردەشـینە)ی، لەوێ داوا لەمـاڵی قـەردنی دەکـات، کـە خاوەنی گوندەکە بوون، ئەگەر رێگای بدەن لەو بنارە بژی، ئەوانیش رێی دەدەن و لەبناری زوورگـەزراو بە تاقـە مـاڵە ئەو گوندە ئاوەدان دەکـاتەوە و ناوی لێـدەنێن (عـەلیـاوە) بەناوی مامە عەلی، بەرە بەرە خەڵکی گوندی (گردەشینە) روو دەکـەنە ئەو گـوندە تا وای لێ هات گـردەشـینە چۆڵ و هۆڵ بوو و کەسی تێدا نەما. هەموو باریان کرد بۆ عەلیاوە لەبەر ئەوەی ناوی گردەشینە تاڵ و ناساز بوو، بەڵام ناوی عەلیاوە شیرین و سازگار بوو. گوندێکی تریش بە هەمان ناو لەدەشــتی شــەمــامکێ هەیە بەناوی (عــەلیــاوە)ی شێـخان، گوندێکی دیکە هەیە بەناوی (عـەلیـاوە) سـەر بەناحیەی (دێگەڵە)یە.

### گردلانکە

ئەم گوندەش دەکەوێتە دەشتی مرکییەی سەر بەناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، لە بناری لای زوورگەزراوی بەدیوی مــرکــیــیــەی هەڵکەوتووە، ناوی (گــردلانکە) وشـەیەکی لێکدراوی کـوردییە لەو شـەی (گرد+لانک+ە) واتە لە (ناو+ناو+ ئامـرازی ە) پێکهـاتووە، وشـەی گـرد بەواتا گـرد، لانک: لاندک، ئەم گـوندە گردێکی ئاسەواری بە تەنیشتەوەیە کە شێوەکەی لەلانک دەچێت، لەنزیک ئەو گـردەوە ئەو گـونـدە ئاوەدان کـراوەتەوە و بەناوی گـردەکـە ناونراوە، مێژوو و سەردەتای پەیدابوونی و ئاوەدانکردنەوەی تا رادەیەک نەزانراوە، بەڵام ئەوەندە هەیە کــە گــوندێکی کــۆنە و هۆزی ســیــانی تێـدا نیـشــتــەجێ بوون، چەند بنەماڵەیەک بوون، لەوانە بنەماڵەی ئەحمەداغا کە دەکاتە

باوکی هادی ئاغـای سـەربەشـاخ، بنەمـاڵەی چاوسـۆری، بنەماڵەی وسومال، وسو مامەر.

مـام حاجی حامـیدی حاجی عـوسـمـانی (١٩٢٧ز.) دانیشتووی گوندی (گابەرەکە)ی ناوچەی کەندێناوەیە خۆی لەتیرەی (وسومال)ە لە عەشیرەتی سیان ئێسـتا لە گەڕەکی رووناکی شاری هەولێر نیشتەجێیە، بۆی گێڕامەوە گوتی: باپیرم لەگوندی گردلانکەی مرکییەوە لە زەمانی سولـتان سەلیم خانی سێـیەمی عـوسـمـانی (١٧٧٨ز-١٧٨٠ز) کەوتووینەتە ناوچەی کەندێناوە و گوندی (گابەرەکە)مان ئاوەدان کـردووەتەوە و بەمـەرداریـیەوە کـەوتووینەتە ئەو دەشتە.

هەندێ خەڵکی دەڤەرەکە بەگردلانکە دەڵێن گرلانکە پیتی (د) قـوت دەدەن بۆ سووکی، لەشێوەی (کرمانجی ژووروو)ش بە گـرد دەڵێن گـر، بە (چاڵەگـرددەرە)ش دەڵێن چاڵەگردەرە. ئەم گوندەش ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی سێنارە، تەتەراوە، شێخانان، گردەشینە لەسەریەکە.

لە پاشاندا ئەو گوندە بووەتە هی ماڵی پاشای و بووەتە مـوڵکی حـاجی نادری لەدواییـدا بۆتە دووبەش بەناوی گردلانکە سەعید و گردلانکە مەجیداغا.

## تەتەراوە

ئەم گوندەش یەکێکە لە گوندەکانی دەشتی مرکـییە، سەر بەناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە، ئاقاری لەگەڵ ئاقـاری گـوندەکـانی دۆڵەزە، گـەڕەشـێـخـان، سـێنارە، گـردلانکە، گـردەشـینە لەسـەر یەکە. (تەتەراوە) ناوێکی داڕێژراوە کـوردییـە لەناوی (تەتەر+اوە) هاتووە، واتە ناو لەگــەڵ پاشگری (ئاوا-اوا-اوە) پێکهــاتووە، وشــەی (تەتەر) بە مـانای نامـەبەر (سـاعي البـريد) دێت، لە زەمانی عـوسـمـانییەکاندا، تەتەر، نامەبەر بە سواری وڵاغ بوو، قـۆناغ بە قـۆناغ نامـەکەی دەبرد، ئەو کـەسـانەی کە نامەیان دەیناو دەبرد پێیان دەگوتن (تەتەر)، ئەوجا چەند کـەسـانێک لەو تەتەرانە لەنێـزیک پردێ (ئاڵتـون کـۆپری) لەو شـوێنەی کە هەنووکە گـوندی (تەتەراوە)ی پێ دەڵێن جێنشین بـوون و ئەو گوندەیان ئاوەدان کردیـەوە بەو ناوە ناونراوە، هەندێک لە خـەڵکی دەڤـەرەکە دەڵێن پیـاوێک بەناوی (تـەتـەر) ئەو گــــوندەی ئاوەدان کـــــردووەتەوە، هەرچۆنێک بێت ئێستـاش لە ناوچەی دزەییـایەتی دەشتی هەولێـرێدا ئەو رێگا و بانانەی کـە تەتەرەکـان هاتوچۆیان پێدا دەکرد پێیـان دەڵێن (رێی تەتەران)، لە پاشـاندا ئەو گوندە بەمولک بووە هی مـاڵی پاشـای و سـەلیمی پاشـای لەوێ دادەنیشت.

## چۆمە زەردەرە

ئەم گـوندە دەکـەوێتـە باکـووری رۆژهەڵاتی ناحـیـەی (پردێ) ئاڵتـون کـۆپری، دوا گـوندی ناوچەی دزەییـاتیـیە سـەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرە، دوو گوند بەو ناوە هەیە ئاقـاریان لەسـەریەکـە چۆمـەزەردەی سـەروو و خواروو لە تۆمارگاکانی میری بە (صاري چم الكبـير) و (صـاري چم الصـغـير) تۆمـار کـراون. واتە چۆمـەزەردەی گەورە و گچکە.

چەمە زەردەر سەروو (گەورە) هی حەوێزی مامەندییە، کـاتی خۆی ئەو ناوە چەم و چەم دەوچەلکی پردێ دەکرا بە گـەغەشـامی (دەرە) ئەو ناوە سـەرتاپا زەرد هەڵدەگـەڕا. خـەڵکەکـە ناویان لێنا چەمـە زەرددەرە، جـا لە رووی زمانەوانییەوە ئەگەر وشەی (چەمە زەرددەرە) شیبکەینەوە دەبینین ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە وشەی (چەم+ە+ زەرد+ دەرە) پێکهاتووە: واتە (ناو+ ئامرازی ە+ ناو ناو) پێکهاتووە.

کـاتی خۆی دووبرا بەناوی مـەولوود و مەلا خورشـید ئاوەدانیـان کـردۆتەوە، دانیـشـتـوانەکـەی لەتیـرەی (چۆغـەر رەشی)ین کـە تیـرەیەکن لەهۆزی شـێخ بزێنی، ئێسـتـاکـە کوێخـا عـەلی کـوڕی مـەولوودی برا گـەورەیانە، گـوندەکـە زۆربەیان خـزمی یەکن، ئەو گـوندە دەکـەوێتـە سـەر زێی بچووک.

ئاقــاری ئەو گــوندەش لەگــەڵ ئاقــاری گــوندەکــانی چەمــەزەردەی سـەروو، سـێـقـوچان، تۆبزاوە، شـێـراوە، لەسـەریەکـە. خـەڵکەکـە (چەمـەزەر دەرە)ی پێ دەڵێن لە وشـەی (زەرد) پیـتی (د) دەقـرتێنن و دەیکەن بە (زەر) هەروەکو لەشێوەی کرمانجی سەروودا.

## قۆڕیتان

ناوی گـوندێکە دەکـەوێتـە دەشـتی مـرکـیـیـە، سـەر بەناحیـەی قوشتەپەی دەشـتی هەولێرە، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە لەسەریەکە پیرداوێ، دووسەرە، عەلیاوە،

شێراوە. مام حاجی سەعیدی حەسەنە رەشی لەدایکبووی گوندی قشاغلوی (١٩٠٩ز-١٩٩٩ز.) بۆی گێڕامەوە گوتی: خۆی ئەو گوندە لەلایەن بنەماڵەی عەلی بەگی کوڕی حەسەن پاشای گورجی زادەوە کە لەتیرەی (ئۆرمزیار)ن ئاوەدان کراوەتەوە و ئەو ناوەیان لێناوە ئەو بنەماڵەیەش لە کوردستانی تورکیاوە کەوتوونەتە ئەو دەڤەرە، پاشان لەو ناوە خۆیان پێک نایەن و نێوانیان تێک دەچێت، برا گەورەکەیان کە ناوی (سوڵتاناغا) دەبێت هەندێکیانی بردووە لە بناری زوورگە زراویدا دایمەزراندوون و لەوێ گوندی (هێلەوە)یان ئاوەدان کردۆتەوە. هەندێکیشیان هاتوونەتە (شێخ شەروان) و لەوێ دامەزراون.

### جانە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری (زوورگە زراو)ی بەدیوی ناوچەی کەندیناوەدا هەڵکەوتووە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە) ی قەزای مەخموورە لە پارێزگای هەولێر. ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (تیکالۆ، چیغلۆک، کەندارەقەل و کاریتان) لە سەریەکە، لایەکیشی زوورگە زراوە لەوێ ئاوایی ئەو دیو ببین ئاقاری (میراوا) و (سێبیران) ی دەشتی مرکییەیە. دەگێڕنەوە دەڵێن کاتی خۆی لە پێش ساڵی ١٨٠٠ز. دانیشتوانی گوندی جانە لە گوندی (میراوە)ی دەشتی مرکییەدا دادەنیشتن. ئەو گوندەش بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای قشاغلووی) بووە، خزمایەتی لەنێوان بنەماڵەی سوڵتاناغاو بنەماڵەی (کارەش)دکان هەبووە، (کێخوا رەسوولی قشاغلوویی ) کچێکی (ئەحمەدی هۆری) میراوەی، کە ناوی (حەلیم تەڵان) بووە لە ساڵی ١٨٣٤ز خواستبوو. کاتێ لەشکری پاشای گەوردی رەواندز (پاشای کۆرە) لەساڵی ١٨٢٣ز. بەسەرکردایەتی (رەسول بەگ) و (سەید حەسەنی رەشوانی) دەشتی هەولێری گرتووە، خەڵکی دەڤەرەکە بەرە بەرە بەگەڵ لەشکری پاشا کەوتوون، یەکێک لەوانە (کێخوا رەسول) بووە، هاوبەشی لەشکردکانی (خەتاری) لای سنجاری ساڵی ١٨٣٣ز. کردووە. ئەم پیاوە لە حەلیم خانی ئەحمەد هۆری کوڕێکی هەبووە بە ناوی (کێخوا شەریف)ی ئەو کاتەی (برایم حاجی بایزی) گەنج بووە (قوشتەپە)ی بە جێهێشتووە و هاتووە لە (گردی باقرتە)ی ڕەشماڵی هەڵداوە (کێخوا شەریف)یش گەنج بووە لە ژیاندا بووە برایماغا ماوەیێک لە گردی باقرتەی مایەوە ئەنجا بەرەو دەشتی قەراج کەوتە ڕێ و هەستا لە دەشتی قەراجێ قەڵاتی مەخمووری ئاوەدان کردەوە. بە تێپەڕبوونی زەمانە و گۆڕانی باری ناوچەکە بنەماڵەی (کارەش)ەکان گوندی (میراوەیان) بەجێهێشتووەو ئاوای ئەو دیو بوون و لە بناری زوورگەکەدا بە دیوی کەندیناوە لەو شوێنەی ئێستا گوندی (جانە)ی پێ دەڵێن دامەزران و ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە، هەندێکیشیان کەوتوونەتە گوندی سۆربەش وەکو بنەماڵەی (عەزیز کارەش) ناسراو بە عەزە کارەش. هەندێکیشیان کەوتوونەتە شاری هەولێر، چەند ماڵێکیان لە قشاغلووی بوونە تا گرانی ساڵی ١٩١٧ز. پاشان ئەوانیش هەڵقەناون و کەوتوونەتە گوندی (گەزنە)ی ناوچەی بەڕانەتی لەلای خزمەکانیان لەوێ گیرساونەتەوە. هەنووکە گۆڕی ئەو (ئەحمەد هۆری)یە لە گوندی گەزنەی ناوچەی بەڕانەتی دایە، قەبرەکە هەتاکو ئێستاکەش هەر ماوە. بەڕاستی ئەو کارەشانە لە دەڤەرەکەدا بەگشتی پیاوی چاک و خواناس و بێ گرفت بوون، گوندی (جانە) نزیکەی ٢٠ ماڵێک دەبوون بەر لە وێرانکردنی، دانیشتووانەکەی زۆربەیان لە (هۆزی کارەش) بوون، ٣-٤ ماڵە (سیان)یشی تێدا بوو، ژمارەی دانیشتووانی بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢١٠) کەس بووە[1].

(جانە) بە مانای (جوانە) دێت، ناوێکی دارڕێژاوی کوردییە لە (جان+ە) واتە لە (ئاوەڵناو+ پاشگر) پێک هاتووە، مزگەوت و قوتابخانەی هەبووە، لە ساڵی ١٩٦٣ز. ئەو گوندە وەکو زۆربەی گوندەکانی ناوچەکە بەر شاڵاوی سووتان و تاڵان و گرتن کەوتووە. لە پیاوە ناودارەکانی ئەم گوندەش خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەمەد عەزیز مامە شێن جانەیی بوو، لە بنەماڵەیەکی جووتیار لە ساڵی ١٩٠٠ز. لە گوندی جانەی دەشتی کەندیناوەی سەر بەشارۆچکەی دیبەگە لە دایک بووە، لە (هۆزی کارەش)ە. هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن لە گوندەکەی خۆیان بۆ خوێندن چووەتە مەدرەسەی دیبەگە، ئەو کاتی خوالێخۆشبوو (مەلا فەتاحی خەتێ) موودەریس بووە لەوێ. پاشان هاتووەتە شاری هەولێر لە مزگەوتی مەلا فەندی و شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندی خوێندوویەتی و هەروەها لەزۆر شوێنی دیکەی کوردستان خوێندوویەتی.

مامۆستا زۆر حەزی لە ئەدەبیات و شیعری کوردی کردووە، بەتایبەتی ئەو شیعرە کوردییانەی کە مەدحی پێغەمبەر (د.خ)یان کردووە. زۆر مەحەبەتی شێخ نوورەدینی بریفکانی هەبووە، چەند جار لە فەقێیەتی و بەم دواییەش سەردانی مەزاری شێخی دەکرد. مامۆستا خەتێکی زۆر خۆشی هەبووە، دەورێکی بالآی هەبووە لە نووسینی ئەو کتێبانەی، کە لە کاتی خۆی بە دەست دەنووسرانەوە، زۆر لە کتێبە ئایینییەکانی نووسیوەتەوە، بەڵام لە بەر باری ئابووری و کۆمەلآیەتی مامۆستا وازی لە خوێندن هێناوە، لە سالآنی سییەکاندا بووەتە ئیمام لە گوندی (قەپلان)، پاشان ئەوێ جێ دێلێت و دەچێتە گوندی (بیرەبات) لە هەمان ناوچە، هەتا ساڵی ١٩٦٣ لەوێ دەبێت پاشان هاتووەتە گوندی (سێبیرانی عەولآغا) لە دەشتی مرکییەی ناوچەی قوشتەپە بە ئیمام و خەتیب دامەزرا، ماوەیەک مایەوە ئەنجا هاتۆتە شاری هەولێر، زۆربەی ژیانی بە نوێژ و قورئان خوێندن بردۆتە سەر تا لە ساڵی ١٩٨٨ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە. مامۆستا پیاوێکی چاک و خواناس و بەڕێز بووە ئەوکات لە خزمەت (مەلا حوسێنی مەلا عومەری) دەیخوێند، ئەو کتێبەی نووسیوبەتییەوە (شرح خلاصة الوضع) بووە، مامۆستا (مەلا عەبدوڵلای شێخ مەمموندی)دایناوە.

مامۆستا مەلا عەبدوڵلای شێخ مەمموندیش یەکێک بووە لە زانایانی سەدەی سێزدەمی کۆچی، کتێبی (خلاصة الوضع)ی مامۆستاکەی خۆی (مەلا ئەبوبەکری میر رۆستەمی) راقە کردووە و ناوی لێناوە (شرح خلاصة الوضع)، ئەم مامۆستا بەڕێزە خەڵکی گوندی (شێخ مەمموندییان)ی بن چیای شەکرۆک و سەرتایە، دانیشتوانی ئەو گوندە لە خێڵی شێخ مەمموندین، ئەو گوندە سەر بەناحیەی (هەریر)ی قەزای شەقلاوەیە. مامۆستا کاتی خۆی لە گوندەکەدا مەدرەسەیەکی رێکوپێکی هەبووە، یەکێک لەو قوتابییانەی کە لەلای خوێندوویەتی خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدەمینی کوڕی مەلا شێخ محەمەدی بێتواتەیی، کە دەکاتە باپیری خوالێخۆشبووان مامۆستا مەلا عەلی شێخی چۆلی و مەلا فائیزی رەحمەتی بووە.

مامۆستا (مەلا عەبدوڵلای شێخ مەمموند)یش قوتابی (مەلا ئەبوبەکری میر رۆستەمی) بووە، ئەم مامۆستا بەڕێزە خەڵکی گوندی (میر رۆستەم)ە، ئەو گوندەش هەنووکە هەر ماوە و بەهەمان ناویشە، کەوتۆتە بەینی شەقلاوە و هەریر، کە دەچین بۆ (هەریر) بەدەستە چەپی رێگاکەوەیە، لەنزیک گوندی (مامە جەلکە) هەڵکەوتووە. ئەم زانایە لەبەر ناکۆکی نێوان میرەکانی کوردستان و باری ئاڵۆزی دەڤەرەکە ناوچەکەی بەجێهێشتووە و کەوتۆتە شاری بەغدا لە زەمانی داود پاشای والی بەغدا ١٨١٧-١٨٣١ز. لە ژیاندا بووە. دەڵێن هەنووکە نەوە و نەوەزاکانی لە ئەورووپان.

### تیکالۆ

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری (زوورگەزراو) بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموورە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی بیرەبات، جانە، چەڵتووک لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگە زراوە، لەوێ ئاودیو بێ، ئاقاری گوندی قشاغلووی دەشتی مرکییەیە، وشەی (تیکالۆ) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە دوو برگە پێکهاتووە. وشەی (تی) بە مانای خوار و خێچ دێت هەر وەکو دەڵێن گوتی: وشەی (کالۆ) لە دەشتی دزەییایەتی هەولێری بە (بەرجۆت-بەرەجۆت) دەگوترێت بۆ وێنە هەر (بەرەجۆتێک) جێگای ١٢-١٥ عەلبە گەنم یا جۆ دەبێت، بەرە جۆتیش زۆر و کەمی هەیە بە گوێرەی زەوی دەگۆڕێ. وا دیارە زەویوزار و ئاقار و بەرەجۆتی ئەو گوندە گوتی بووە، بۆیە ئەو گوندە بەو ناوە ناسراوە. لەدەشتی هەولێری دەڵێن فلانە گوند ئەوەندە بەرە جۆتە بووە. کاتی خۆی بنەماڵەی (ئەحمەد حاجی محەمەد) ئاوەدانیان کردۆتەوە، پاشان بنەماڵەیەکی دیکە لە (هۆزی پالآنی) کە کاتی خۆی لەدەشتی کۆیەوە لە گوندی (کونە گورگ) هاتوون و کەوتوونەتە ئەو دەشتە، یەکەم جار لە گوندی (گردلانکە) دامەزراون پاشان هەندێکیان کەوتوونەتە گوندی (قازبخانە)، ئەو سەردەم عەشیرەتی فەقێ مرکی لەوێ نیشتەجێ بوون، برا گەورەی فەقێ مرکییەکان کێخوا رەزا بوو. پاشان هەندێک لەو ماڵە پالآنییانە کەوتوونەتە گوندی (تیکالۆ) وەکو بنەماڵەی حاجی مستەفا حەمەد، کوڕ و نەوە و نەوەزایەکی زۆری لێ کەوتۆتەوە، چەند ماڵێکیشیان کەوتوونەتە دەشتی ساڵەیی لە گوندی دزەییان (سەر بیر) دامەزراون. ئەو بنەماڵانە لەدەشتی دزەییان (صوفیان)یان پێ دەڵێن.

وەختی خۆی لەبەر ئەوەی بەفر و بارانێکی زۆر دەباری ئەو بنارە بەدرێژایی زوورگ (زوورگە زراو)ی بەهەردوو دیویەوە چ بەدیوی دەشتی مرکییەدا یان بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا ئاو و کانی و کانیاوێکی زۆری هەبوو، بەڵام هەنووکە لەبەر کەم بەفر و بارانی و کەم ئاوی و وشکە ساڵی و گۆڕانی کەش و هەوا، ئەو کانی و کانیاوانە زۆربەیان نەماون و هیشکیان کردووە. کانییەکانی ئەم گوندەش ئەمانەن:

١- کانی بیرە قامیشە، ئەو کانییە دەکەوێتە سەرەوەی ماڵان لەناو هەڵەت و زوورگەکە هەڵکەوتووە، کاتی خۆی سەرچاوەکەی کانیاو بووە و هەڵدەقوڵا و ئاوی لەبەر دەڕۆیی، پاشان ئاوەکە کەم بووە، خەڵکەکە هەستاون کانییەکەیان قووڵ کردووە وەکو بیری لێهاتووە، دەست هەڵێنجە، قامیشێکی زۆری لە دەوروبەریدا هەبووە، بۆیە بەو ناوە ناوبراوە.

٢- کانی بزن دز، لە هەڵەت و بناری زوورگەکەدایە، لە سەرەوەی ماڵان لە ڕۆژئاوای گوندەکە هەڵکەوتووە، بەهاران ئاوی لەبەر دەڕوا، ئاوەکەی بە کەندی بیرە قامیشەدا دەڕواتە خوارێ بەناو زەوییەکاندا بڵاودەبۆوە. لە سەرەوەی ئەو دوو کانییە لەناو هەڵەتی زوورگەکەدا ئاوێک هەڵدەقوڵێت و دەڕواتە خوارێ، رووباری پێ دەڵێن بەناو ئاقار و زەوییەکە وەردەبێ و کاتی خۆی شینایی و سەوزەیان لەبەر دەچاند، ئاوێکی شیرین و سازگارە، لە هاویندا وشک دەبێت. هەندێک ناوی جوگرافیایی گوندەکەش وەک هەنجیرۆک کە ناوی پارچە زەوییەکە لەناو هەڵەت و هەڵدێری زوورگەکەدایە، دەڵێن کاتی خۆی بنە هەنجیر هەبووە، بۆیە بەو ناوە ناونراوە. کەندی بیرە قامیشە ناوی کەندێکە ئاوی بیرە قامیشەی پێ دەڕواتە خوارێ. گەرە بە تۆرکە ناوی گەرێکە لە هەڵەتەکەدایە، ئەو گەرە تۆڵکەیەکی زۆری دێنا، بۆیە ئەو ناوەیان لێناوە. ئەو گوندەش پێش ئەوەی وێران و کاول بکرێت (٣٥) ماڵێک دەبوون، زۆربەی دانیشتوانەکەی لە (هۆزی پاڵانی)ین، ٣-٤ ماڵە سیان و ٢-٣ ماڵە سەیدی تێدایە ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٣٠٥) کەس بووە، ئەو گوندە دووجار خاپوور و کاول کراوە، جارێکیان لە ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن رژێمی ئەو سەردەم ئەو گوندە سووتێنراوە و تاڵانیش کراوە، خەڵکەکەشی ئاوارە و دەربەدەر بووە بۆ دەشتی مرکییە. لە ساڵی ١٩٦٧ز. بەهۆی ئەو دانووستانەی نێوان سەرکردایەتی کورد و میری لە ئارادا هەبوو، خەڵکەکە گەڕانەوە گوندەکانیان. بەڵام دووبارە لەساڵی ١٩٨٧ز. ئەو گوندە لەگەڵ گوندەکانی دیکەی دەڤەرەکەدا کاول و وێران کرا.

### قووچ

ناوی گوندێکە لەناوچەی کەندێناوە، سەر بە ناحیەی دیبەگەی قەزای مەخموورە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی قەپران، لهێبان، سەرگەڕان، دەربەندی گۆم، جاستان لەسەر یەکە، (قووچ) وشەیەکی سادەی کوردییە بەمانای (قووچەک) دێت، بۆ نموونە دەڵێن قووچەکە بەرد، گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندەش دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (١٦٠) ساڵ لەمەوبەر، دەگێڕنەوە باوکی کێخوا ئۆمەر ناسراو بە (ئۆمەرە خێل) لە گوندی (باشتەپە)ی دەشتی مرکییە دادەنیشت، پاشان باردەکات و دێتە ناو خزمانی گوندی (جاستان) لەناوچەی کەندێناوە، مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان دەبێت و لەوێ جێگایان نابێتەوە دێن لە ئاقاری گوندی (قووچ)ی ئێستاکەدا لەوێ دادەمەزرێن و خەڵک دەڵێن: ئۆمەر ئەو قووچەکە چییە قیتی کردیتەوە؟ هەر ئۆمەر مابوو! جا لەوساوە ئەو گوندە بە (قووچ) ناسرا. هەندێکی دیکەیان بەو جۆرە دەیگێڕنەوە، وەختی خۆی باپیرە گەورەمان دێتە ئەو ناوە لە گوندی جاستان لەلای خزمانی گوندەکە نیشتەجێ دەبن، ئەوکات کەندێناوە ئاوەدانی کەم بووە. پاشان لەوێ باردەکەن و دێن لەو شوێنەی ئێستاکەدا بنەو بارگەیان لێ دێخن و لەوێ دەگیرسێنەوە، پێیان دەڵێن لەو دەوروبەرەدا (قووچەک) هەیە، واتە (قووچەکە بەرد) لەسەر بیرێک کەڵەک کراوە، بیرەکەش بەتەمۆخی هەڵیان نایە هی باپیراغەی بلباسە، ئەوانیش هەڵدەستن قووچەکەکە دەبیننەوە و بەردەکان لادەبەن و بیرەکە دەردەکەوێ، لەو شوێنە ئەو گوندە ئاوەدان دەکەنەوە بەناوی (قووچ)، هەنووکەش لە نەخشەکانی کشتوکاڵیدا بەناوی (قووچ)ی باپیراغەی بلباس تۆمار کراوە، وا دیارە ئێرە هەواری یەکێک لە گەورە پیاوانی بلباسەکان بووە، چونکە کاتی خۆی عەشیرەتی گەورەی بلباسی کورد بەرەو دەشتی هەولێرێ دەهاتنە خوارێ، مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار زۆریان هەبووە لە دەشتی هەولێرێداو لەناوچەی کەندێناوە و بناری

چیای قەرەچووغ و دەشتی قەراجیّ پەرت و بڵاو دەبوونەوە، تەنانەت کلکەی رۆژهەڵاتی چیای قەرەچووغ (کلکەی دارە بزماران) چیای (بلّباسان)ی پێدەڵێن، هەنووکەش لەدەشتی هەولێرێکەدا بەتایبەتی لە دەڤەری دزەییایەتیدا گەلێک شوێنەوار و گوند و هەوار بەناوی وان ماوە، وەکو گوندی (قووچە بلّباس) لەدەشتی مرکییەی سەر بەناحیەی قوشتەپە، لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، بە ١٧ کیلۆمەترێک لێیەوە دوورە. هەروەها گوندی (حەسەن بلّباس) ئەو گوندەش دەکەوێتە بناری چیای قەرەچووغی بەدیوی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، بەناوی پیاوێک کراوە کە ناوی (حەسەن) بووە لە عەشیرەتی بلّباس بووە، هەنووکەش ئەو گوندە هەر بەو ناوە ماوە، پاش ئەوەی بلّباسەکان هەڵکشاون و ئەو ناوەیان جیّ هێشتووە، هەندێک بنەماڵە و تیرەی بلّباسەتی لەو ناوە ماونەتەوە وەک بنەماڵەی (پەرچەم) لە گوندی (هەمزەکۆر) تیرەی ئەحمەد ئارکە لەدەشتی قەراج: لە گوندەکانی لاسۆر، برایم باول، گرد گراوی، تیرەی (مخانە) لە گوندی مورتکەی گەورەدا هەن، هەر بە هەمان ناو گوندێک لە (پیران شار) واتە شارۆچکەی (خانێ) لە کوردستانی ئەو دیوەدا هەیە، هەموو سەر بە عەشیرەتی بلّباسن لەبناری زوورگی زەرگەتەن لەگوندی پونگینە، کانی سەگان، باخچە چەند بنەماڵەیەکی (بلّباس) هەن. هەروەها لە گوندی (گەرەشێخان)ی سەر بەناحیەی قوشتەپەش نزیکەی (٣٠) ماڵێک هەنە، برا گەورەیان کێخوا عەلی قادرە. جا با لە باسەکەمان لانەدەین بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان، کێخوا ئۆمەر ناسراو بە (ئۆمەرەخێل) برا گەورەی تیرەی شەمزینی (شەمدینی) کە تیرەیەکن لە عەشیرەتی سیان لە گوندەکانیان (بیرەبات، جاستان، دەربەندی گۆم و قووچ) بوو. خوالێخۆشبوو مام ئۆمەر پیاوێکی لێوەشاوە و ماقووڵ و چاوتێر و دنیا دیتە و نانبدە بووە، لە گوندی (قووچ)ی ناوچەی کەندێناوەدا دادەنیشت، مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار زۆری هەبووە، گەلێک قسەی بە تولّکل و نەستەق و خۆش هەبوو، ئەگەر بنووسرێتەوە کیتابێکی خۆشی لێ دەردەچێت، هەنووکەش لە دەشتی هەولێریدا ئەو پەندە هەیە دەڵێن:

**(بوویتە گێرەی ئۆمەرە خێلی!).**

**یان: (دەرتێ گێرەی ئۆمەرە خێلییە).**

**یان: (خۆ نەبووینە گێرەی ئۆمەرە خێلی).**

**یان: (دەمنێ گێرەی ئۆمەرە خێلییە).**

ژمارەی دانیشتووانی ئەو گوندەش (٧٦) کەس بووە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز. ئەو گوندەش لەساڵی ١٩٦٣ بەر شاڵاوی رژێم کەوت و سووتێنرا و تاڵان کرا، خەڵکە داماوەکەی دەربەدەر بوون بۆ گوندەکانی دەشتی مرکییە و هەندێکیشیان کەوتنە شاری هەولێر. دەگێرنەوە جارێکیان ماڵی حەسەناغەی حەمە سادقی دیبەگەیی، کە بە (حەسەن یایێ) دەناسرا بە ناوی دایکییەوە هەڵدەدرا، رۆنیان نامێنێ و ساڵ درەنگە ئاخە لێوەیە، هەڵدەستن بیر دەکەنەوە کێ رۆنی هەیە؟ بیریان بۆ ماڵێ (ئۆمەرە خێل)ی قووچی دەچێ، پیاوێکیان بە هیزەوە رەوانەی گوندی (قووچ)ی دەکەن، مام ئۆمەر خۆت بگرە هاتین، کابرا دەچێتە گوندی و هیزەی رۆنی لەگەڵ خۆی دەبا، شەوێ لەوێ دەبێ و سبەینێ مام ئۆمەر بەپیاوەکانی دەڵێت کورە هیزەکی بینن، دەرکی هیزەی دەکاتەوە، هیزەی لۆ پڕ لە رۆن دەکات، پاشان کابرا دەڵێت مام کێخوا حەقت چەندە؟ کوێخا ئۆمەریش هەتا هیزە دەگری لەبنی گوێی کابرا دەدات و پێی دەڵێت: (لۆ سەگباب چما ئەمن رۆن فرۆشم؟!). دەگێرنەوە جارێکیان ماڵی خورشیدی بایزی باراشیان نامێنێ، هەڵدەستن پیاویان دەنێرنە (قووچ)ی بۆلای (کێخوا ئۆمەر)ی، ژنی خورشیدی بایزی (شەمێ) لە سیانەکانی (گردەسۆر)ی بووە، خزمایەتییان لەگەڵ مام ئۆمەری هەبووە، کێخوا ئۆمەر جواڵەکانیان بۆ پڕ لە گەنم دەکات و بە پیاوەکانیان دەڵێت (زۆر سەلامیان لێ بکەن، بەران برێنە شەمێ ئەوی بەمێ" کورە وەبرێن ها)، پیاوەکان دەڵێن: "ئاخر مام کێخوا ئەوە کوو دەبی؟! ئەمە کوو وەبرێین، بابە ئەمە هەقمان نییە، ئەنگۆ خزمی یێکن کەیفی خۆتانە". کە دەگەرێنەوە (ئاغاژن) بەپیاوەکان دەڵێت: وەرن پێم بڵێن ئۆمەر چی نەگۆت؟ چونکە دەیزانی کێخوا قسەیەکی هەر دەکات. پیاوەکان دەڵێن (ئاغاژن) مام کێخوا زۆر سەلامی لێ دەکردن ئەحواڵی دەپرسین. دەڵێ: نا وەرن راستم پێ بڵێن، پیاوەکان دەڵێن وەڵڵا ئەوهای گۆت... دەڵێت نەمگۆ دەزانم ئۆمەر قسەکی هەر دەکات. عەولا کوردە هەبوو لە گوندی (لهێبان)ی سەر بە ناحیەی دیبەگەی ناوچەی کەندێناوە دادەنیشت، رۆژێکیان دەچیتە (پردێ)، رێی دەکەوێتە گوندی (قووچ)ی سیانان، کابرا تیلاکی لێ خوار کردووە و کورد گوتەنی: "شای بە

سەپانی خۆی نەدەزانی"، بەناو گوندی (قووچ)ی دادێت، لەپڕ کابرایەکی گوندی دەبینێ، ئەوا کابرایەک تیلاکی لێ خوار کردووە و بەبێ منەتی ئەوها بەناو گوندیدا دەڕوا، ڕێی لێ دەگرێت و تێی ڕادەخوڕێ و دەڵێت: کورە کابرا لۆ ئەوها تیلاکت خوار کردووە؟ (عەولا کوردە)ش ڕادەوەستێت و کەمێک دادەمێنێت و بیر دەکاتەوە، دەڵێت بڵێم تۆ حەقت چییە؟ هەر لێم دەدەن، بڵێم کەیفی خۆم نییە هەر لێم دەدرێت، لەپڕ ئەوەی بە بیرا دادێت. دەڵێت: (کاکە خوارزای سیانانم) کابرای (قووچ)ی دەڵێ: خوارزای سیانانی؟ دەڵێ بەڵێ، "مادام خوارزای سیانانی تیلاکی خۆت زیاتر خوارکە".

## گاوەرە

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)یە لەبن چیای قەرەچووغی بەرامبەر گوندی (کەندار)ی بەدەستە چەپی ڕێگای گشتی هەولێر-مەخموور هەڵکەوتووە. ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی کەندار، خدرجیجە، لەسەریەکە لایەکیشی چیای قەرەچووغە، کاتی خۆی بنەماڵەیەک لە (ئاری کوتک)ی سەر بە هۆزی سوورچی لە ناوچەی سورچیاتی دەشتی هەریرێ لەگوندی (خرە-هەرەش) بە مەڕداری کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ، لەبناری چیای قەرەچووغ و ئەو دەڤەرە نیشتەجێ بووینە گوندی (کەندار) و (گاوەرە)یان ئاوەدان کردۆتەوە. دانیشتوانی ئەم گوندەش هەموویان خزمی یەکن (ئاری کوتکی)ین، ژمارەی دانیشتوانەکەی لە ساڵی ١٩٥٧ز. (٣١٨) کەس بووە. لە ساڵی ١٩٦٣ بەر شاڵاوەکە کەوت، گوندەکەیان ئاگر تێبەردرا خەڵکێکی زۆریشیان لێ گرتن. خوالێخۆشبوو (مام هەینی) کە خەڵکی ئەو گوندە بوو شەهید کرا.

مام حاجی دەروێش بەکری ئاری کوتکی هەبوو خەڵکی ئەو گوندە بوو، پیاوێکی خواناس و سۆفی مەشرەب بوو، گێڕایەوە گوتی لە (مەخموور)ی سەپانی ماڵی حەمەد ڕەحمانی شێروانی بووم، (٢) دوو جۆت هێستری دەگەڕا، حاڵ و باری خۆش بوو، ڕۆژێکیان حەمەد ڕەحمان پێی گوتم: ئای فەقیری چاو نزا! منیش یەکسەر هاتە سەر زارم وەڵامم دایەوە وتم: ئای دەوڵەمەندی چاو لە قوز!، گوتی: وەڵڵا بابە تۆڵەی خۆت کردەوە.

## لاوەر

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری چیای قەرەچووغ، بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموورە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی خدرجیجە، چیغلۆک، حاجی شێخان لەسەریەکە، لایەکیشی چیای قەرەچووغە. دانیشتوانەکەی لە خێڵی بندیانن زۆربەی خەڵکەکەی بەمەڕداری و کشتوکاڵەوە خەریک بوون، هەندێکیشیان خەریکی ڕاو و شکار بوون لە چیای قەرەچووغی. ئەو گوندە لەم دواییانە ٦-٧ ماڵێک دەبوون. لە ساڵی ١٩٦٣ وەکو زۆربەی گوندەکانی ناوچەی کەندێناوە بەر شاڵاوەکە کەوت، گوندەکە سووتێنراو تاڵانیش کرا خەڵکێکی زۆریشی لێ گیرا ژمارەی دانیشتوانی ئەم گوندە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٢٩) کەس بووە.

## خدرجە (خدرجیجە)

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بەشارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە، لەبناری چیای قەرەچووغ بە دیوی دەشتی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی لاوەر، دێمەکار، کەندار و گاوەرە، لەسەریەکە، لایەکیشی چیای قەرەچووغە. (خدرجە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە ئەسڵدا لەوشەی (خدر خەجە-خەجیج)ەوە هاتووە، بەناوی پیاوێک کراوە، ناوی (خدر) بووە، دایکیشی ناوی (خەجیج) بووە، لە دەشتی هەولێرێ بە (خەجیج) دەڵێن (خەجە)، لەو دەڤەرەدا زۆر کەس هەن بەناوی دایکیان هەڵدەدرێن، جا ناوی (خدر خەجە) بۆ سووکی لەسەر زاران بووە بە (خدرجە) بەلابردنی (خ-ە)، ئەو (خدر خەجە)یە یەکەم کەس بووە لەو ناوە دامەزراوە و گوندەکە بەناوی وی کراوە.

دانیشتوانی ئەو گوندە لە هۆزی بندیان بوون، لە دوو گەڕەک پێک هاتبوو، گەڕەکی (حاجی جوکل)ی دیوەخانی هەبووە، گەڕەکی کێخوا سمایلی برا گەورەی بندییانەکان بوو، ئەویش دیوەخانی هەبوو، ئەم گوندە چەند کانیاوێکی هەبوو لەوانە (کانی هاڕ هاڕە) لەبناری چیاکە دەردەبوو، ئاوێکی سووری هەبوو، بەناو کەندەکەدا دەهاتە خوارێ چەند گۆمێکی تێدا بوو لەوانە (گۆمی حەسەنی) لەنزیک

گوندی بوو، گۆمێکی گەورە بوو، بەری بەخۆڵ و بەرد گیرابوو، لەکاتی باران بارین ئاو لە چیاو دۆڵەکاندا دەهاتەوە ناو ئەو گۆمە، بەهاران ئاویان لێ دێنا بۆ خواردنەوە بەکاریان دێنا، هەتا درەنگی ساڵی ئاوی دەما. لەگەڵ ئەمانەشدا بیریشی زۆر بوو وەکو بیری وەیسی ناوەکەی شیرناو بوو، بیرەگچکە، بیری مەزەری، بیری حاجی جوکلی. ئەم گوندە لەساڵی ١٩٤٥ز. نزیکەی ١٧٠ماڵێک دەبوون. لە ساڵی ١٩٦٣ بەر شاڵاوەکە کەوت و سووتێنراو خەڵکەکەشی تاڵان کران. (حاجی عەولا وەیسی بە خۆی و ژنەکەی و دوو کوڕ و کچێکی شەهید کران. لە ساڵی ١٩٦٧ز. خەڵکەکە هەندێکیان گەڕانەوە گوندەکەیان قوتابخانە و مزگەوتیان هەبوو، دووبارە لەساڵی ١٩٨٧ وەکو زۆربەی گوندەکانی دەڤەرەکە تەخت کراو خەڵکە داماوەکەشی گوێزرانەوە بۆ کۆمەڵگاکانی دارەتوو، کونەگورگ. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز. (٤٠٢) کەس بووە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: (بندیان)ەکانی گوندی (خدرجە) و (لاوەر)ی هەندێکیان دەروێشی (شێخ عەلی تاڵەبانی) دەبن، هاتوچۆی تەکیەی تاڵەبانی کەرکووک دەکەن، پیرە بەساڵاچووەکانیان بە زۆری فەروەیان لەبەر دەکرد و بەسەرشانی خۆیاندا دەدا (شێخ رەزا)ش چاوی پێیان دەکەوێ و دەبینی جار جارە کاوڕ بۆ تەکیە دێنن، ئەویش لەو گۆڕەی بە هەژاری و داماوی ماوەتەوە. هەر کەسێکیش لە کاکی واتا لە (شێخ عەلی ئەفەندی) نزیک ببوایەوە، دەبووە جێی هەجوو پەلاری وی. جا شێخ هەڵدەستێت هەجوویەکی کاکی و بندیانەکان دەکات، ئێمە تەنیا ئەو بەیتەی خوارەوەمان دەست کەوتووە کە دەست پێ دەکات دەڵێت:

کۆنە حیزی شاری کەرکووک، ساحیبی تەخت و رەوان
لەبن هەنگری فەروەکەت بەم کەران باوگای (بن دیان).

## عالّلا (عەبدوڵلا گوجیلان)

ناوی گوندێکە دەکەوێتە کەندێناوە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموورە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی چەڵتووک، خۆشاو سێقوچان، دارەخورما، چەغەمیرە، کەندارە قەل، لەسەریەکە گوندێکی کۆنی دەڤەرەکەیە، ناوەکەش ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (عەبدوڵلا + گوجیلان) واتا (ناو+ ناو+ ئامرازی کۆکردنەوەی ان) پێکهاتووە، (عالّلا)شی پێ دەڵێن. برای بەرێزم کاک (عەباس سلێمان سمایل) لەبارەی ناوی (عەبدوڵلا گوجیلان) دەڵێت: عالّلا ناوی گوندێکە، کاتی خۆی یەکێک بەناوی (عەبدوڵلا) لەوێ هەواری هەڵداوە و گوجیلەیەکی زۆری هەبوو، بۆیە ناوی ئەو هەوارە بە (عەبدوڵلا گوجیلان) دەناسرێت، پاشان ناوەکە سووک دەبێتەوە و دەبێتە (عالّلا)(٢). لە خەڵکی دەڤەرەکەم بیستووە بۆ یەکەم جار بنەماڵەی (حاجی حەسەن)ی، بنەماڵەی (خدری حاجی) لێرە دامەزراون لەسەر کەندەکە، چونکە ئەو گوندە لە رۆخ کەندەکە هەڵکەوتووە، شوێنەکە ئاوی زۆرە و بیری نزیکە ٤-٥ بەژن دەبێت ئاوێکی شیرین و سازگاری هەیە لای سەرەوەی کەندەکە هەموو شیرینە، لایەکەی دیکەی ئاوی تاڵە و بیریشی زۆر قوڵە.

(ئەحمەد ئاغا) کە لە پاشان بە (ئەحمەد پاشا) ناسرا یەکەم جار لە هەولێرەوە هاتۆتە (عالّلا)ی لێرە نیشتەجێ بووە. ناوە جوگرافیاکانی پەلەکی عەتۆتان ئەو رێگایە بەرەو دەشتی قەراجێ دەڕوات بۆ دارە بزماران، جێنە زەرگە، گەری عەبۆی، بیری حاجی رەحمانی عالّلای.

(عالّلا) تیرەو هۆزی جۆراوجۆری تێدابوو، لەوانە گەراری، سنجاوی، گەردی، مامەسێنی، سیان، (جاف)ی تەلان، ئۆرمزیار، بندیان، ئۆمەربل. ئۆمەربلەکان کاتی خۆی لەگوندی (گردەشینە)ی بناری چیای قەرەچووغی کە لە هەمان ناوچەیە کەوتوونەتە ئێرە. ئۆرمزیارەکانیش لە گوندی (قشاغلو)ی دەشتی مرکییەدا کەوتوونەتە وێ.

(جاف)ی تەلان: ئەمانەش ٣-٤ ماڵێک دەبوون کاتی خۆی (٣) سێ پشت لەمەوبەر لە گوندی (تەلان)ی ناوچەی (دوکان)ەوە کەوتوونەتە ئێرە، لەوانە بنەماڵەی (فەقێ برایم). هونەرمەندی کورد کاکە سابیر عەبدولڕەحمان لەو بنەماڵەیەی (سوورچی) ئەمانیش لە ناوچەی سورچیاتی دەشتی هەریرێ بە رەوەندی کەوتوونەتە ئێرە. لەوانە بنەماڵەی (عەدێ)یە. بەرێز کاک عومەری مەولود عەدێ بۆی گێڕامەوە گوتی: تەمەنم ٦-٧ ساڵان دەبوو، پاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لەساڵی ١٩٢٥ز. کابرایەک کەوتە گوندەکەمان ناوی مام سمایل بوو، ژنەکەی ناوی (ئەسمەر) بوو، کوڕێکی هەبوو

ناوی (یونس) بوو، کچێکی هەبوو ناوی (کەزیبان) بوو. خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شاری (ماردین)ێ بوو، مام سمایل پینەچێتی دەکرد. لە ساڵی ١٩٣٤ قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، مەدرەسەی هەبوو مامۆستا مەلا شەریف مەلای گوندی بوو. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٦٨٢) کەس بووە. (عەزیزی پاشا)ی لەو گوندەدا دادەنیشت دەوڵەمەند بوو، مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبوو. نزیکەی ٨-٩ مێگەلە مەڕی هەبوو، هەر مێگەلەی لە ١٠٠٠ مەڕ کەمتر نەبوو.

لەو گوندەدا تەنیا تاقە ماڵێکی جوولەکەی لێ بوو، ئەویش ماڵی (برایمۆک) بوو، ردێنێکی سپی گەورەی بستەک درێژی هەبوو، ئەوکاتی تەمەنی (٧٠) ساڵ دەبوو، ژنەکەی ناوی (لەیلۆک) بوو، کچێکی هەبوو ناوی (سوڵتانە) بوو، (٥) پێنج کوریشی هەبوو بەناوی: حەنۆکە، سەعید (سەعۆکە)، ساڵح (ساڵحۆکە)، جوبرایل، ئیسحاق. حەنۆکە ژنی هەبوو. ژنەکەی ناوی (ئەستێرە) بوو، کچی (خدرۆکە) جووی شارۆچکەی (مەخموور) بوو. برایمۆک هەستا وەکو کرمانجەتی دەشتی دزەییەتی ژن بەژنێی بە (سوڵتانە)ی کچی لەگەڵ ماڵە جوولەکەیەکی گوندی (قشاغلو)ی کرد لە دەشتی مرکییەدا، ماڵەکە ماڵی (مۆشێ) بوو، (سوڵتانە)ی کچی دا بە (سیۆن)ی کوڕی مۆشێ، عەزیزەی کچی (مۆشێ)ی بۆ کوڕەکەی هێنا. بەداخەوە (٧) حەوتەیەک تێپەڕ نەبوو بەسەر (بووک و زاوا)یەتی (سوڵتانە و سیۆن). سیۆنی بەستەزمان لە گوندان دەگەڕا بۆ خڕکردنەوەی ریس و خوری بەکاری جۆڵایی لەنێوان ئاقاری گوندی (باشتەپە) و (قازیخانە)ی بزر بوو، هەنووکەش کەس نەیزانی چی بەسەرهات. بەڕێز کاک (عومەری حاجی مەولود عەدێ) دانیشتووی ئەو گوندە بۆی گێڕامەوە گوتی: تەمەنم ١٠-١٢ ساڵان دەبوو (برایمۆکە) جوولەکەم دەدیت دەهاتە مەجلیسان و ناو خەڵکی لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەک لەخۆشی و ناخۆشی بەشداری دەکرد، بە تایبەتی لە خوێندنەوەی مەولوودی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) گەلێک جاران دەیگوت: ئەمە بەباری تەیران دەچینەوە قدوسێ (قودس)، کتێبمان هەیە وادەڵێ، شەرێکی دەکەین لەگەڵ ئیسلامان لەدوایی شەرەکە رادەوەستی، شەڕی دووەمین دەکەین هەتا (نیل) و (فوراتێ) دێین لەوێ مەحو دەبینەوە. مام عومەر دەڵێت گەلەک جاران لەگەڵ ساڵحۆکی برایە جووی دەچووینە دزی بیستانان.

### گراو

ئەمەش ناوی گوندێکی دیکەیە لەناوچەی کەندێناوەدا، سەر بەناحیەی دیبەگەیە، دەکەوێتە سەر زێی پردێ (زێی گچکە) لە خوارووی رۆژهەڵاتی دەشتەکە و لەبناری چیای قەرەچووغی بەدیوی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، ئاقارەکەشی لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە لەسەریەکە گەزوەشان و شەحەل. سنوورەکەشی لە باکووری گوندی (گەزوەشان)ە لە رۆژهەڵاتییەوە زێی گچکەیە لە رۆژئاوایدا گوندی (شەحەل)ە، لە خوارووشیدا چیای قەرەچووغە.

وشەی (گراو) لە (گەڕ ئاو)ەوە هاتووە، ناوێکی لێکدراوی کوردییە لەدوو برگە پێکهاتووە (گەڕ+ ئاو) (گەڕ)ەکە بووە (بەگڕ)، (ئاو)ەکەش بووە بە (او) چونکە لە زمانی کوردی ئەگەر پیتی (ئ) پیتی (ا)ی بەدوا داهات، ئەوا پیتی (ئ) کە لادەبردرێت، بۆ وێنە ماستئاو دەبێتە ماستاو. زۆربەی دانیشتوانی ئەو گوندەش لەهۆزی سیانن.

گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لەناوچەی خۆشناوەتی هەیە کەوتۆتە بن چیای (سەری رەش) سەر بە ناحیەی (سەلاحەدین)ە یەکێک لە شاعیرانی دەڤەرەکەمان بەناوی (زانا) باسی بەزم و سەیرانی گوندی (گراو)ێ و راووشکاری ئەو ناوە دەکات و دەڵێت:

**درێخە بۆ قەراج و کەندیناوێ**
**چ خۆش بوو بەزم و سەیرانی (گراو)ێ**
**هەتا چۆکان کەتینە ناو قوڕاوێ**
**بە بیرت دێ کە رۆژێ چووینە راوێ**
**هەزار کەومان لەسەریەک گرت بەداوێ**

### دەرماناوە

ناوی گوندێکی دیکەیە لەبناری چیای قەرەچووغی هەڵکەوتووە بەدیوی کەندێناوەدا، سەر بە شارۆچکەی دیبەگەی قەزای مەخموورە لە پارێزگای هەولێردا. ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی خۆشاو، لهێبان، سلێمان بەخشیان لەسەریەکە، لە لایەکیشی چیای قەرەچووغە (دەرماناوە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە،

لەدوو برگــە یا ناو پێکهــاتووە، (دەرمــان+ ئاو+ ە) بۆ خۆشی و سووکی لەسەر زاران بووە بە (دەرماناوە).

گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لە دەشتی شەمامکێدا هەیە، سەر بەناحیەی گوێڕە، دوو گوندی دیکەش بە هەمان ناو لە ناوچەی (تەقــتــەق)ی ســەر بە قــەزای کــۆیە هەیە بەناوی دەرماناوەی گەورە و گچکە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەپێی سەرژمێری گشــتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٤٩) کــەس بووە. کــاتی خــۆی ئەو گــوندە و گــوندەکــانی خۆشاو، سێقوچان، قەپلان (قەپران)، قازیخانە، شەحەل هی (عەشیرەتی فەقێ مەرکی)یەکان بووە، پاشان ڕووداو ڕووی داوە. فەقێ مەرکییەکان ئەو ناوەیان چۆڵ کردووە و ڕەویان کردووە بەرەو کوشاف، گامێش تەپە، گوێڕ لە دەو زێی گەورە گیرساونەتەوە.

### خۆشاو

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناو چیای قەرەچووغی بەدیوی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی (دیبەگە)یە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دەرماناوە، لهێبان، سێقوچان، عالّلا، دارەخورما لەسەریەکە، لایەکیشی چیای قەرەچووغە. (خۆشاو) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لەدوو برگە پێکهاتووە، خۆی وشەکە لە بنچینەدا لە (خۆش+ ئاو)ەوە هاتووە واتە (ئاوەڵناو+ ناو) بۆ خۆشی و سووکی لەسەر زاران بووە بە (خۆشاو). بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە ئاوێکی خۆش و شیرین و سازگاری هەبووە. یەکەم بنکەی پ.م لە شۆرشی ئەیلوولدا کە لە ساڵی ١٩٦٢ لەم گوندە کرایەوە. دانیشتوانی ئەم گوندە لەهۆزی شێروانی، فەقێ مەرکین، بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی (١٢٣) کەس بووە.

### حەسەن برباس (بلّباس)

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)یە، لە بناری شاخی قەرەچووغ هەڵکەوتووە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دارەخورما، حاجی شێخان، چەغەمیرە، لەسەریەکە و لایەکیشی چیای قەرەچووغە. (حەسەن بلّباس) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لەدوو ناو پێکهاتووە (حەسەن+ بلّباس) ئەو گوندە بەناوی کابرایەک کراوە کە ناوی (حەسەن) بووە لەهۆزی بلّباس، ئەو (حەسەن)ەش کوڕی کاوەیسی کوڕی کانەبی فەقێ وەیسی بووە. کاتی خۆی لە زەمانێکی زووەوە عێلی گەورەی بلّباس کوێستان و گەرمێنیان دەکرد بە کۆچەری و ڕەوەندی دەهاتنە خواریّ بەرەو دەشتی کەندێناوە و قەراجێ، لەبناری چیای قەرەچووغی دەژیان، هەواریان دەگرت، تەنانەت کلکەی ڕۆژهەڵاتی چیای قەرەچووغی بەتایبەتی (قەرە بۆتک) و (قەرەبێتک) بەچیای بلّباسان بەناوبانگ بووە. هەواری (کانەبی فەقێ وەیسی) لەو ناوە بووە، هەنووکەش گردێک لەو دەوروبەرە هەیە (گردی کانەبی) پێدەڵێن (کاوەیسی کوڕی کانەبی فەقێ وەیسی) ژنێکی لە شێروانییەکانی گوندی (دارەخورما)ی بناری شاخی قەرەچووغ هێنابوو ئەو تاقە کوڕەی بەناوی (حەسەن)ی لێ هەبوو، (حەسەن)یش تەنیا کچێکی دەبێت دەیداتە خاڵوانی، واتە شێروانییەکان. لەپاش مردنی (حەسەن)ی باوکی گوندەکە دەبێتە هی (شێروانی)یەکان. هەنووکەش ژمارەیەک گوند و شوێنەوار ماونەتەوە بەناوی وان وەکو گوندی حەسەن بلّباس، قووچە بلّباس قووچی باپیرائمان بلّباس غەری شاسواری. پاش ئەوەی بلّباسەکان ئەو ناوەیان بەجێهێشت ژمارەیەک تیرەو بنەماڵەیان لەو ناوە ماونەتەوە وەکو تیرەی ئەحمەد ئارکە، مخانە، مرع بایزە.

لە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان و مقامی دروونە (دروێنە)ی دەشتی هەولێرێ ناوی (کانەبی فەقێ وەیسی) زۆر هاتووە، پیاوێکی عەگیدو سوار و ئازا بووە.

فۆلکلۆر دەڵێت:

**لە شەمزینان هات خەبەر**
**پێنج سەت سوارن بە دەفتەر**
**کانەبی بەسەر عەسکەر**
**یا خوا نەمری کانەبی**
**کانەبی فەقێ وەیسی**
**سمێڵ جووقەی تاوسی**
**لە نەعمانی دەپرسی**
**یا خوا نەمری کانەبی**

ئەو گوندەش لەساڵی ١٩٦٣ بەر شاڵاوەکە کەوتووە و سووتێنراوە و تاڵانیش کراوە و خەڵکە داماوەکەشی ئاوارە و دەربەدەر بوون. ژمارەی دانیشتوانی بەگوێرەی سەرژمێری

گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (١٣٩) کەس بووە. ئەو گوندە لە ساڵی ١٩٨٢ز. دووبارە کاول و وێران کراوە و خەڵکەکەیان گواستۆتەوە بۆ کۆمەڵگای بنەسلاوە و دارەتوو.

## چیغلۆک (چیخلۆک)

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی کەندێناوە سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموورە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دێمەکار، چەغەمیرە، خدرجە، لاوەر، حاجی شێخان لەسەریەکە. دەڵێن کاتی خۆی ٢-٣ ماڵ لە شێروانییەکانی گوندی (دارە خورما) دەچنە ئەو شوێنەی کە پێی دەڵێن (چیخلۆک) لەو هەوارە دادەمەزرێن و دەمێننەوە بە مەڕداری و ئاژەڵ بەخێوکردن خەریک دەبن. یەکێک لەو ماڵانە (چیخێک-چیغێک)ی گچکۆکە بۆ کار و بەرخان دەچەقێنێت، هەر لەو ساوە بووە گوند و بە (چیخلۆک) ناسرا. کەواتە وشەی (چیخلۆک) ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە (چیخ+ لۆک) واتە لە (ناو+ پاشگری لۆک) پێکهاتووە. مەبەست لە (چیخ-چیغ) چیخی رەشماڵە. دانیشتوانی ئەم گوندەش هەموویان خزم و کەس و کاری یەکدین و لە عەشیرەتی شێروانین کاتی خۆی لە ناوچەی شێروانی مەزن کەوتوونەتە دەشتی کۆیە لە گوندی (گۆێتەپە) بوون، پاشان کەوتوونەتە دەشتی مرکییەی دەشتی هەولێرێ لە گوندەکانی بناری زوورگەزراو (منارە، کەسنەزان، باقرتە، بێریات دامەزراون، پاشان کەوتوونەتە بناری چیای قەرەچووغی بەمەڕداری لەوێ بە یەکجاری دامەزران لە گوندەکانی دارەخورما، حاجی شێخان، چیخلۆک، حەسەن بلّباس (شێروانییەکان چونکە بەرەسەن خەڵکی چیا بوون بۆیە ئەو بنارەی چیای قەرەچووغیان زۆر پێ خۆش بووە) هەندێ بنەماڵەشیان کەوتوونەتە دەشتی قەراجێ، لەوێ گوندی (گۆێتەپە) و (لاکەچە)یان ئاوەدان کردۆتەوە، بنەماڵەی (مستەفا چەودەر)یش لەگەڵ برایمی حاجی بایزی کەوتۆتە مەخموور لەوێ دامەزراون. برا گەورەی گوندی (چیخلۆک) کێخوا عەولا بووە ئەو چوار گوندەی سەرەوە هەموویان سەر بە (دارە خورما) بوونە. ئەم گوندەش وەکو زۆربەی گوندەکانی دیکەی بناری چیای قەرەچووغی بەدیوی کەندێناوەدا لە ساڵی ١٩٦٣ز. بەر شالاوی سووتان و تالان و گرتن کەوتووە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (١٥٢) کەس بووە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: ٨٠ ساڵێک لەمەوبەر (مەحمود بایز) هەبوو خەڵکی ئەو گوندە بوو، رەنجبەر بوو، جوتی دەکرد، تفەنگەکی خراپی هەبوو لەگەڵ خۆی دەبرد. لەو گوند و بنارەی چیای قەرەچووغی لە گوندەکانی لاوەر، گاوەرە، حاجی شێخان، دارە خورما، خدرجە، مەڕ و مالاتێکی یەکجار زۆر هەبووە، شوانکارەکان لەو ناوە بوونە. گورگێک پەیدا ببوو مەڕی ئەو ناوەی شڕ کردبوو، هەموو رۆژێک خۆی لە مێگەلێک دەدا، ئا لەوێ ٤ مەڕ ئا لەوێ ١٠ مەڕی قرقرتۆک هەڵدەدڕی، گورگیش گیاندارێکی زۆر حەسوودە. چەندی هەوڵدەدەن گورگەیان بۆ ناکوژرێت، رۆژێکیان مام گورگ بۆ بە سەرسەدەی (مەحمودی بایزی) دانایێت، مەحموودیش لوولەی تفەنگەکەی تێ دەکات و گورگە دەکوژێ. دەنگ بلاوبۆوە مەحمودی بایزی گورگی کوشتووە، خاوەن مەڕەکان خەنی دەبن، هەر بابایە گیسکەک کاوڕەکی بۆ دەبا لە هەندە شوێن کۆنە تفەنگی بۆ دەبەن مەحمودی بایزی دەڵێت:

(هەموو رۆژێ گورگ بە سەرسەدەی مەحمودی بایزی دانایێ).

هەنووکەش لە دەڤەرەکەدا بووێتە پەند و دەگوترێتەوە و دەڵێن:

(خۆ هەموو رۆژێ گورگ بە سەرسەدەی مەحمودی بایزی دانایێ).

یان: (گورگ هەموو رۆژێ بە سەرسەدەی جووتیاری دانایێ).

## درکەی گەورە

لە ناوچەی کەندێناوەدا دوو گوند بەو ناوە هەن، هەر دووکیشیان ئاقاریان لەسەریەکە، یەکیان درکەی گەورەیە، ئەوی دیکەیان درکەی گچکەیە، ئاقاری درکەی گەورە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی درکەی گچکە، گا بەرەکە، شەنەغە، لەسەریەکە لایەکیشی زێی گچکەیە (خواروو). وشەی (درکە) ناوێکی دارژاوی کوردییە لە (درک+ پاشگری د) پێکهاتووە واتە (ناو+ پاشگر) بۆیەش بەو ناوەنراون، چونکە کاتی خۆی ئەو ناوە درک و داڵ و پووش و پەراش و قامیشی یەکجار زۆر بووە، بەلام پاش بەدیار

کەوتنی تراکتۆر لە ساڵانی پەنجاکان ئەو درک و داڵ و پووش و پەراشە زۆر کەم بۆتەوە. دانیشتوانی ئەو گوندەش لە هۆزی (سیان)ن، ئەو گوندەش وەکو زۆربەی گوندەکانی ناوچەی کەندیناوەی بناری چیای قەرەچووغ لە ساڵی ١٩٦٣ز. بەر شاڵاوی رژێم کەوت، گوندەکە سووتێنراو تاڵان کرا، خەڵکێکی زۆریشی لێ گیرا. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەپێی سەرژمێری گشتی دانیشتوان لەساڵی ١٩٥٧ز. (١٢٥) کەس بووە.

### قەپران (قەپڵان)

ئەمەش ناوی گوندێکی دیکەیە لە گوندەکانی ناوچەی کەندیناوە، سەر بەناحیەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموور سەر بە پارێزگای هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی جاستان، چەڵتووک، بیرەهات، سێقوچان، لهێبان، قووچ، دەربەندی گۆم لەسەریەکە، وا پێدەچێت لە بنچینەدا وشەی (قەپلان) ناوێکی تورکی بێت، بە کوردییەکەی بەمانای (پڵنگ) دێت. برای نووسەری بەرێزم کاک (عەباس سلێمان سمایل)یش هەمان بیرورای هەیە لەبارەی ناوی (قەپلان). ئەم گوندە کاتی خۆی هی هۆزی فەقێ مەرکی بووە. هۆزی (فەقێ مەرکی)یش هۆزێکی کوردی کۆنینەی دەشتی هەولێرن لە گوندەکانیان لەناوچەی کەندیناوەدا، قەپران، سێقوچان، خۆشاو، شەحەڵ، بووە لە دەشتی مرکییەش (قازیخانە)یان هەبووە برا گەورەی ئەو هۆزە لەپێش ساڵی گرانی حاجی مستەفا بووە کە دەکاتە برای (کێخوا رەزا)ی، حاجی مستەفا لەگوندی قەپران دادەنیشت و پەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ هەمەوەندەکانی ناوچەی (چەمچەماڵ) هەبووە، لەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی بەشێک لە هەمەوەندەکانی دوور خستەوە بۆ وڵاتی لیبیا بەشێکیشی رەوانەی (ئەستەنبۆڵ) کرد، هەندێک لەوانەی کە لە تورکیا بەنهێنی گەڕابوونەوە لەکاتی گەڕانەوەیاندا بە گوندی (قەپران)دا هاتبوون و میوانی حاجی مستەفای ببوون. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٨٩٧ز. پاش ئەوەی ناکۆکی لەنێوان فەقێ مەرکییەکان و سمایلاغای مەنتک روو دەدات بەداخەوە (سمایلاغای مەنتک) دەکوژرێت و شەڕەکە گەورەتر دەبێت (سیان و مامەسێنی)یش دەگرێتەوە. لە ئەنجامدا (حاجی مستەفا)ش دەکوژرێت، هۆزی فەقێ مەرکی بەناچاری ئەو ناوە بەجێ دێڵن و بەرەو دەوروبەری زێی گەورە رەو دەکەن لە گوندەکانی کوشاف، گامێش تەپە، گوێر دادەمەزرێن و گوندەکانی سێقوچان، قەپران، شەحەل، قازیخانە، خۆشاو دەبنە موڵکی بنەماڵەی بایزی عەلۆی قورشیدی دەچێتە ئەوێ و دەبێتە موڵکی وی. حەیران زانی دەنگخۆش خوالێخۆشبوو کاک حوسێنی عەلۆی خەڵکی ئەو گوندیە. ئەو گوندە لە کۆنەوە مەدرەسەی ئایینی هەبووە. لەساڵی ١٩١٣ز. مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا حوسێنی شێخ سەعدی هەولێری مەلا و مودەریسی ئەو گوندە بووە سەردەمێکیش مامۆستا مەلا محەمەدی جانەیی لەوێ بووە، پاشان لە ساڵانی ١٩٤٦ مامۆستا (مەلا محەمەدی شێروانی) لە گوندی (شێخانان)ی دەشتی مرکییەدا هاتۆتە ئەوێ: زیاتر لە ١٠-١٢ فەقێی هەبووە، لەوانە مەلا سمایلی نانەکەلی، مەلا عوسمان عەولا رەشی، مەلا عومەری شێروانی بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش (٤١٧) کەس بووە. دەگێڕنەوە دەڵێن: (عەلۆی قورشیدی بایزی) کە ئاغای گوندی (قەپلان)ی بووە برادەرایەتی لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەی دیبەگە هەبووە، رۆژێکیان دەچێتە (دیبەگە) و سەردانی بەڕێوەبەر دەکات و دەڵێت: ئەفەندی بەهارە حەزدەکەم رۆژێک خۆت و جەماعەت میواندارییم بکەن. ئەفەندیش دەڵێت زۆر باشە، هەر کاتێک مەجالم بوو، خۆم وەڵامت بۆ دەنێرم، ماوەیەکی پێدەچێت لەناکاو مودیر ناحیە وەڵام رەوان دەکاتە گوندی دەڵێت: بە عەلیاغا بڵێن بەیانی خۆم و جەماعەت میوانی ئەوین، ئاغاش لەو کاتیدا تەنیا یەک (کاوڕ) شک دەبات بە کەمی دەزانێت بۆیە بەدوای (حاجی مەعروفەشەل)دا دەنێرێت، ئەم پیاوە خەڵکی گوندی (قەپران)ی بوو لە تیرەی (کۆلە) بوو، هەتا بڵێی پیاوێکی زیرەک و عاقڵ و هۆشمەند بوو، پیاوێکی سەیر و سەمەرەو رەش و ئاکاری نارێک بوو، بەڵام تەگبیرکەر و لێهاتوو بوو، (مارفەشەل) دەچێتە لای ئاغا و پێی دەڵێت: فەرموو ئاغا چ کارێکت هەیە؟ ئاغاش دەڵێت: مارف بەڕێوەبەری ناحیەی دیبەگە جوابی ناردییە سبەینێ دێتە مێوانداریمان، تەگبیر چییە تەنیا یەک (کاوڕ)مان هەیە؟ ئەویش زۆر کەمە نابێ شەرمەزار بین. مارف دەڵێت ئاسانە هیچ غەمت نەبێت، لەگەڵ گەردی بەیانی (مارفە شەل) بەسواری

ولاغی دەچتە دیبەگەی لە بازاڕی ٤-٥ سەروپێی بەرخان دەکڕی و لەناو تێرەکەیان دەنێ و بەخێرایی دەگەڕێتەوە گوندی و کاوڕەکەش لەگەڵ دەکوژنەوە و لەگەڵ سەروپێی بەرخەکان هەمووی دەکوڵێنن و ئامادەی دەکەن کاتێ نان و خوان لەدیوەخان دادەندرێت، مودیری ناحیە چاوی بەو هەموو سەلکە بەرخانە دەکەوێت دەڵێت: ئاغا شەرمەزارت کردین، ئەم هەموو بەرخانەت بۆ سەر بڕیوە؟ ئاغاش دەڵێت: ئەفەندی زۆر نییە، بەڵکو کەمیشە، ئەدی لۆنگۆی سەر نەبڕم لۆ کێی سەربڕم، ئەتوو هەموو ڕۆژێ میوانی مە نابی.

## گا بەڵەکە (گابەرەکە)

ناوی گوندێکە لە گوندەکانی ناوچەی کەندێناوە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخموورە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی پەرکانە، شەنەغە، دڕکەی گچکە، غەرابە لەسەریەکە. ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندەش دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی سوڵتان سەلیمی سێیەمی عوسمانی (١٧٧٨ز-١٨٠٧ز.) مام حاجی حامیدی عوسمانی حاجی خدر لەدایکبووی گوندی گابەرەکەی ناوچەی کەندێناوە ١٩٣٠ز. بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە دەمی باوک و باپیرانییەوەی بیستووە: دەیگوت باپیرەم لەگەڵ مامەکانی بابم بە مەڕداری لەگوندی (گرد لانکە)ی دەشتی مرکییە باردەکەن و ئاوای دیوی کەندێناوە دەبن و زیاتر لە (١٠٠٠) سەر مەڕ و (٣٠٠) بزن و ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە گا و گۆلک و ولاغیان هەبووە، لەو شوێنەی کە (تا ناو نراوە گوندی (گا بەڵەک) لەوێ کەونە بیری هەبووە، بیرەکانیان دەرداوەتەوە، وا دیارە ئەو شوێنە کاولە گوند و خەرابە بووە. لەوێ نیشتەجێ دەبن، گای بەڵەکیان هەبووە، خەڵکەکە ناویان لێناوە (گا بەڵەکە). مام حاجی دەیگوت گوایا ئەو وەختی واتە لەزەمانی سوڵتان سەلیمی سێیەم، لە دەشتی مرکییەدا دەبایە هەر گوندێک چەند گەنجێک بداتە میری بۆ عەسکەری، بەڵام ئەگەر بهاتایە هەر کەسێکی بچووبایە بۆ دەشتی کەندێناوە ئەوا لە سەربازی عەفوو دەکرا. وشەی (گا بەرەکە-گا بەڵەکە) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (گا+ بەڵەک+ە) واتا (ناو+ ئاوەڵناو+ ئامرازی ە) پێکهاتووە، گوایا گایەکان ڕەنگیان ڕەش و سپی (بەڵەک) بووە. ئەو گوندەش وەکو زۆربەی گوندەکانی دیکەی ناوچەکە بەر شاڵاوەکەی ساڵی ١٩٦٣ کەوتووە و سووتێنراوە و تاڵانیش کراوە زیاتر لە (٢١) کەس لە خەڵکی گوندەکە گیراو ڕەوانەی بەندیخانەکانی خوارووی عێراق کران، خەڵکە داماوەکەش ئاوارە و دەربەدەر بوون، هاوڵاتییەکیش بەناوی (جەمیل) شەهید کرا. لە ئاقاری ئەو گوندەشدا زیاتر لەسێ بیرە نەوت هەیە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٠٥) کەس بووە.

## پەرکانە (پەلکانە)

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دەربەند سارەلو، شەنەغە، گابەرەکە، خەرابە، سەربەشاخ، عەولافات، لەسەریەکە. وشەی (پەرکانە-پەلکانە) ناوێکی داڕژاوی کوردییە لە وشەی (پەرک-پەلک)ەوە هاتووە، (پەرک) ناوی جۆرە دارێکە لە شێوەی داری (بی)یە، بەڵام قەد و لق و پۆپەکانی خوار و خێچە، هیچ بەری نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە دۆشاوێکی لێ دروست دەکرێت کە تامێکی زۆر خۆشی هەیە، بەزۆری ئەو جۆرە دارانە لەدەو زێی گچکە و دەو چەمان شین دەبن بە تایبەتی لە چەمی شەنەغەی زۆرە، کاتی خۆی لەو شوێنەی کە ئێمرۆکە ناونراوە (پەلکانە) ئەو جۆرە دارانە هەبووە، بۆیە کە ئاوەدان کراوەتەوە ناونراوە (پەرکانە-پەلکانە). گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لەدەشتی پشتڕێ سەر بەناحیەی قوشتەپەدا هەیە. ئەو گوندە بەموڵک هی بنەماڵەی بایزی بووە، هی (جەمیل)ی عەلۆی قورشیدی بوو، دەگێڕنەوە دەڵێن: خوالێخۆشبوو شاعیری میللی (تەها مامەر) لەو گوندە دەبێت، جەمیلاغا گوایە داوای ئەوەی لە (مام تەها)ی کردووە ئاوی لۆ مارێیان بە بەرمیلان بینی واتا بیێتە (ئاوکێشیان)، مام تەهاش بەم جۆرە وەڵامی جەمیلاغای دەداتەوە و دەڵێت:

**لۆم برێنە (جەمیلی)**
**ئاوی لۆ نایەنم بە بەرمیلی**
**مەگەر پەتکەکەم بایەتە..........ی**

ئەم گوندەش وەکو زۆربەی گوندەکانی دەڤەرەکە لەساڵی

١٩٦٣ز. بەر شاڵاوەكە كەوتووە و ئاگریان تێبەرداوە و تاڵانیان كردووە و خەڵكەكەش وەكو گوندەكانی دیكە ئاوارە و دەربەدەر بوونە هەتا ساڵی ١٩٦٧، هۆزە عەرەبەكانیان لەو گوندانە دامەزراند، لە ساڵی ١٩٦٧ دووبارە خەڵكەكەیان گەڕاندەوە بۆ گوندەكانیان، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو گوندانە ناوچەیەكی نەوتاوین لەساڵی ١٩٧٥ حكومەت كۆچی پێ كردوون ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٢٦) كەس بووە.

### عەوڵافات

ناوی گوندێكە لە گوندەكانی ناوچەی كەندێناوە، سەر بە شارۆچكەی (دیبەگە)یە، ئاقاری لەگەڵ گوندەكانی سەربەشاخ، پەلكانە، لەسەریەكە. لایەكیشی هەڵەتی زوورگەزراوە. كاتی خۆی كابرایەك بەناوی (عەبدوڵڵا فاتێ-عەوڵافات) لەگوندی (سەربەشاخ)ەوە باردەكات و دێتە ئەو شوێنە، لەوناوە لەناو ئەو هەڵەت و هەڵدێرە دادەمەزرێت و ئەو گوندە بە تاقە ماڵە ئاوەدان دەكاتەوە و بەناوی وی ناونراوە. خەڵكەكە پێیان دەگوت (عەوڵافات). خەڵكی ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر بە (عەبدوڵڵا) دەڵێن (عەوڵا)، بە (فاتیمە) دەڵێن (فاتم) یان (فاتە) یا (فاتێ)، (فات)یش كورتكراوەی ناوی (فاتێ-فاتە-فاتم)ە. جا بۆ سووكی و خۆشی لەسەر زاران بووە بە (فات). ئەم كابرایە بەناوی دایكییەوە هەڵدراوە و ناسراوە، چونكە لە دەڤەرەكەماندا گەلێك كەس بەناوی دایكیانەوە هەڵدەدرێن، ئەمەش نەك تەنیا لە دەڤەرەكەی ئێمەدا، بەڵكو لەزۆربەی دەڤەر و ناوچەكانی دیكەی كوردستانی گەورەدا ئەم شتە باوە، وەكو ناوچەی زرارەتی، خۆشناوەتی، باڵەكایەتی، دەشتی كۆیە، جەزیرەی بۆتان، وڵاتی سەرحەد و وان، بایەزید، گەلێك شوێنی دیكەی كوردستانی گەورە. بۆ وێنە دەڵێن عەوڵا گوستان، عەوڵا فات، عەلی خوشكان، حەسەنی یایێ، هەمزە سێوێ، قادر فاتەكە، ئەحمەدی خەجێ، سمایل عەیشێ، عەمێ گۆزێ قادر ڕێزبار.. هتد.

زانا و مێژوونووسی خوالێخۆشبوو مەلا مەحموودی بایەزیدی لە كتێبەكەیدا بەناوی (داب و نەریتی كوردەكان) كە لە ساڵی ١٨٦١ز. دایناوە لە وەرگێرانی (د. شوكریە ڕەسوڵ)ە لەلاپەڕە (٦٣)دا ئیشارەتی بەمە كردووە، دەڵێت: (زۆربەی كوردەكان بەناوی دایكیانەوە بانگ دەكرێن بۆ نموونە: عەلۆی فاتمێ، سمۆی عەیشێ، ڕەشۆی حەلێ) جا با لە باسەكەمان لانەدەین و ئاقار و زەوی و زاری ئەم گوندە هەڵەت و هەڵدێر و گەچ بەردەڵانە زەوی و زارێكی وای بەدەمەوە نییە بۆ كشتوكاڵ دەست بدات تەنیا ئەوە نەبێت بۆ مەڕومالات بەخێوكردن باشە، پەندێكی كوردی لە دەڤەرەكەدا سەری هەڵداوە، ئەگەر هەر شوێنێك لە دەڤەرەكەماندا ئاقاری باش نەبێت دەڵێن: (دەرێی هەرەتی عەوڵا فاتێ)یە، یان (دەمنی هەرەتی عەوڵافاتە)، یا (بوویتە هەرەتی عەوڵا فاتێ)، یان (خۆ نەبوویتە هەرەتی عەوڵا فاتێ) پەندێكی دیكەش هەیە دەڵێن: (خێر دیتم لە عەوڵا فات).

دانیشتوانی ئەم گوندە هەموویان خزمی یەكن، سەربەتیرەی (وسومامەر -وسمامەر)ی هۆزی سیانن، دانیشتوانی ئەو چوار گوندەی كەندێناوە عەوڵافات، سەربەشاخ، گێسمە، گابەرەكە دەگەڕێنەوە سەر وجاغی پیاوێك بەناوی (وسومامەر) واتا لە یەك بەرەبابن. ئەو گوندەش وەكو زۆربەی گوندەكانی ناوچەكە لە ساڵی ١٩٦٣ز. وەبەر شاڵاوەكە كەوت، سووتێنرا، تاڵان كرا، خەڵكێكی زۆریشیان لێ گیرا و ڕەوانەی بەندیخانەكانی خوارووی عێراق كران، ژمارەی دانیشتوانی لە سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (١٢٦) كەس بووە.

### دەربەندی سارەلو

ناوی گوندێكە دەكەوێتە ناوچەی كەندێناوە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەكانی پەلكانە، شەنەغە، قەبری عەلی، پركانی لەسەریەكە. شوێنەكەی زوورگ و هەڵەتە، نزیكەی ٢٠-٢٥ ماڵێك دەبوون، كێخوا حوسێن برا گەورەیان بوو، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری دانیشتوانی لە ساڵی ١٩٥٧ز. (١٨٤) كەس بووە.

### شەنەغە

ناوی گوندێكە لەسەر زێی پردێ (گچكە-خواروو) هەڵكەوتووە، سەر بەناحیەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموورە،

له شارۆچکەی (دوویز) نزیکه ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی قەبری گەلی، دەربەندی سارەلوو، پەڵکانه، گابەڵەکه، دڕکەی گەورە لەسەر یەکە لایەکیشی زێی پردێیە. گوندێکی کۆنە جێگایەکی زۆر خۆش و دڵگیری هەیە، هەر چوار لای زوورگە، چەمێکی زۆر گەورەی هەیە چەمی شەنەغەی پێ دەڵێن دارستانێکی زۆر گەورە و چڕی هەیە، هەموو کەس ناوێرێت بچێتە ناویەوە، گیانداری کێوی تێدایە، ئەو ناوە جاران بەرازی یەکجار زۆر بووە. لە دەڤەرەکەدا پەندێکی کوردەواری هەیە دەڵێن: (دەمنی چەمی شەنەغەیە) یان (دەرێی چەمی شەنەغەیە) یان دەڵێن: (بوویتە چەمی شەنەغەی) یا (خۆ نەبوویتە چەمی شەنەغەی). دانیشتوانی ئەو گوندەش بەزۆری لەهۆزی سیانن تیرەی جۆراو جۆریشی تێدایەوە وەکو لەک، شوان، هەمبانە زەرد کە کاتی خۆی لە وڵاتی کۆیە لەگوندی (قورە بەرازە)ی کەوتوونەتە ئێرە.

لە ساڵی ١٩٦٣ز. ئەو گوندەش بەر شاڵاوی رژێم کەوتووە، سووتێنراوە و تاڵان کراوە و خەڵکێکی زۆریشی لێ گیراوە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، ژمارەی دانیشتوانی (٤٨٥) کەس بووە. لە ساڵانی بیستەکان مەلا و مودەریسی دێیەکە خوالێخۆشبوو (مەلا عەبدوڵلای شەنەغەیی) بوو کە دەکاتە باوکی شاعیری نیشتمانپەروەری کورد خوالێخۆشبوو (مەلا مەسعود بێ بەش) و نووسەر و رۆژنامەنووس کاک مەحموود زامدار، مامۆستا لە سییەکان هاتۆتە هەولێر و بوویتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی گەورەی ناو بازاڕ، لەساڵی ١٩٣٦ تا ساڵی ١٩٥١ز. مامۆستای خوالێخۆشبوو (مەلا محەمەدی باڵەک) کە بەرەسەن خەڵکی گوندی (قەڵای باڵەییان) بووە لە دۆڵی باڵەییانی ناوچەی باڵەک کەوتۆتە ئێرە، مامۆستا فەقێ بووە لە هەولێر بروانامەی زانستی لەسەردەستی خوالێخۆشبوو مەلا شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی هەولێری وەرگرتووە. بۆ یەکەم جار لەگوندی (شەحل) دامەزراوە، پاشان چوویتە گوندی (قەپلان) ئەنجا (سەرگەڕان) لەهەمان ناوچە پاشان کەوتۆتە (شەنەغە) بۆ ماوەی (١٥) ساڵان وانەی گوتۆتەوە لە ساڵی ١٩٥١ز. کۆچی دوایی کردووە، پاش وی مەلا عەبدوڵلای کوڕی شوێنەکەی گرتۆتەوە بۆ ماوەی (٨) ساڵان مەلای گوندەکە بووە، لەساڵی ١٩٥٩ز. مەلا کەریمی جانەیی هاتۆتە ئێرە، هەتا ساڵی ١٩٧٥ز. ئەو گوندە کاتی خۆی ٥٠ ماڵێک دەبوو. بەو دواییە نزیکەی ٢٠٠ ماڵێک دەبوون خەڵکەکەی بەزۆری بەشینایی کردن و فەلاحەت و مەڕدارییەوە خەریک بوون، قوتابخانەی لە ساڵی ١٩٦٠ لێ کراوەتەوە، یەکەم مامۆستای قوتابخانەکە (مەلا ئەحمەدی نۆغەرانی) بووە. ناوی هەندێک لە شوێنە جوگرافیاییەکانی ئەو گوندەش دار خەجیجە کە ناوی گۆڕێکە کەوتووەتە تەوقە سەری ملە زوورگێک. قەڵات کە گردێکی گەورەیە لەدەو ناوی شەنەغەیە شوێنەواری کۆنی تێدا بەدی دەکرێت لە تاسلوقە کەرت و پارچەی شەربەو گۆزە. خەندەکەکی گەورە و پانیش لەکاتی خۆیدا لەسەر زێیەکەی هەڵکەندراوە شوێنەوارەکەی ئێستاش هەر ماوە.

### قەبری عەلی

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناوچەی کەندیناوە، لەسەر زێی خواروو (گچکە) هەڵکەوتووە، بەرامبەر ئێسگەی کارەبای شارۆچکەی (دوویز)ە، زێیەکەیان نێوانە، سەر بە شارۆچکەی دیبەگەی قەزای مەخموورە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شەنەغە، دەربەند سارەلو، پرکانی لەسەریەکە لایەکیشی زێی پردێیە. گوندێکی زۆر کۆن نییە، لە ساڵی ١٩٦٥ز. (٣٠) سی ماڵێک دەبوون، تیرەی جۆراو جۆری تێدایە وەکو (سیان) ئەمانە کاتی خۆی لە گوندی (گردەسۆر)ی سیانان کەوتوونەتە ئێرە، (عەبدولقادری حەسەناغە)ی برا گەورەیان بوو، ئەم گوندە پاش ساڵی ١٩٥٨ز. ئاوەدان کراوەتەوە. (قەبری عەلی) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ناو+ ئامرازی خستنەسەر+ ناو) پێکهاتووە، (قەبر+ی+ عەلی) لەبەر ئەوەی ئەو گوندەش بیرە نەوتێکی یەکجار زۆری هەیە لە ساڵی ١٩٧٧ی زایینی رژێم دانیشتوانەکەی گواستنەوە و لە ناوچەکەی دوورخستنەوە، ئەم گوندەش بەناوی قەبری پیاوچاکێک کراوە ناوی (عەلی) بووە.

### گەزوەشان

ناوی گوندێکی دیکەیە لە ناوچەی کەندیناوەدا لە دەوزێی گچکە (خواروو) هەڵکەوتووە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە. ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری ئەو گوندانەی خوارەوە لەسەریەکە تەل

هەلاڵە، شەحەل، گراو، لایەکیشی زێی خوارووە. (گەزوەشان) ناوێکی کوردییە لە وشەی (گەز)ەوە هاتووە، لەبەر ئەوەی کەوتۆتە دەو زێی و داری گەزی زۆرەو خەڵکەکە سوودیان لێ وەرگرتووە بۆ گێسک دروستکردن و هەراشی خانووبەرە بەکاریان هێناوە. (گەزوەشان) لە (ناو+ رەگی فرمان) پێکهاتووە.

(وەشاندن) لەزمانی کوردیماندا چاوگە (ن)ی چاوگەکە لابەین دەمێنێتەوە قەد (وەشاند) پیتی (د) لابەین رەگی فرمانی دەمێنێتەوە کە (وەشان)ە. لەو شوێنەی کە ئەو گوندەی لێ ئاوەدان کراوەتەوە خەڵکەکە کاتی خۆی گەزیان لێ دەوەشاند بۆیە ئەو شوێنەیان بە (گەزوەشان) ناونا، دانیشتوانەکەی لە تیرەی (وەتک)ی هۆزی سیانن، ئەم گوندەش وەکو زۆربەی گوندەکانی ناوچەکە لە ساڵی ١٩٦٣ز. بەر شاڵاوی سووتان و کاولکردن کەوتووە. ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٢٩) کەس بووە.

## دێمەکار

دێمەکار ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخموور بوو، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی چەغەمیرە، شارۆچکەی دیبەگە، کۆزەپانکە، کەنداڵ لەسەریەکە، وشەی دێم بەرامبەر ئاوییە، دێمەکار بەو زەوییانە دەگوترێت کە هیشک و بێ ئاوبن پشت بە باران ببەستن، بۆ وێنە دەڵێن گندۆرەی دێمەکار، (دێمی) وشەی دێمەکار پێچەوانەی (بەراو)ییە، واتە (بەرئاو). بۆ وێنە دەڵێن ئەو زەوییانە بەراون، واتا بەئاوێ ئاو دەدرێن و زەویوزارەکە ئاوی هەیە، گەنمی ئاوی گندۆرەی ئاوی، ئەو گەنمەی یا ئەو بیستانەی کە بەئاو ئاو دەدرێت. ئاقاری گوندی (دێمەکار)یش دێمە و ئاوی زۆرکەمە. ئەو گوندە زۆربەیان خزمی یەکترن سەربەهۆزی (بندیان)ن. کاتی خۆی بندیانەکانیش وەکو هۆزەکانی دیکەی ناوچەکە لەدەشتی مرکییەوە بە مەرداری کەوتوونەتە ئەو ناوە، کێخوا وەسمانی محەممەدی کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو (کێخوا دەرویش) بۆ یەکەم جار ئەو گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٦٣ز. ئەو گوندەش وەبەر شاڵاوەکە کەوت، گوندەکەیان ئاگر تێبەرداو سووتێنراو تاڵانیش کرا، خەڵکێکی زۆریشی لێ گیرا، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٧ ئاوەدان کرایەوە.

هەنووکە تاکە گوندە لە دەڤەرەکەدا مایەتەوە ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٣٣٥) کەس بووە.

## مەلا قەرە

موقاتەعەی (مەلا قەرە ئەو موقاتەعەیە کاتی خۆی حکومەتی عوسمانی بەخشیتی بە باپیرە گەورەی (مەلافەندی). کە ئاقاری پێنج گوند دەگرێتەوە، گوندەکانیش ئەمانەن (مەلا قەرە، حەسەن بەگ، کەپەنک رەش، ماجید، شێخەلاس). (مەلاقەرە)ش ناوێکی لێکدراوی کوردی و تورکییە لە (ناو+ ئاوەڵناو) واتە (مەلا+ قەرە) پێکهاتووە، (قەرە) وشەیەکی تورکییە بەمانای (رەش) دێت. بە کوردییەکەی بەسەریەکەوە بەمانای (مەلارەش) یان (مەلای رەش) دێت ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی سەید عوبێد، ماجید، شێخەلاس، حەسەن بەگ، لەسەریەکە، سەر بەناحیەی دیبەگەیە، دانیشتوانی لە هۆزی (ساڵەیی)ن، لە بنەماڵەی (کەواسەوز)ن ودختی خۆی لە دەشتی ساڵەییەوە کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٤٨٨) کەس بووە. ئەو گوندە دوو قوتابخانەی تێدابوو یەکێکیان سەرەتایی بوو، ئەویدی ناوەندی بوو، دوو مزگەوتیشی هەبوو، بنکەیەکی تەندروستی تێدابوو. لە ساڵی ١٩٨٧ز. ئەم گوندەش وێران کرا، خەڵکە داماودەکەیان گواستەوە بۆ کۆمەڵگاکانی دارەتوو، بنەسراوە.

## ماجید

ماجید یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی کەندێناوە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)یە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی حەسەن بەگ، مەلاقەرە، شۆریجە، گردی گۆم، یەدیقوو لەسەریەکە. کاتی خۆی موقاتەعەی (مەلا قەرە) کە ئەو پێنج گوندانەی خوارەوە دەگرێتەوە (ماجید، مەلاقەرە، حەسەن بەگ، شێخەلاس، کەپەنک رەش) بەموڵک هی بنەماڵەی مەلافەندی بووە. دانیشتوانی هەردوو گوندی (مەلا قەرە) و (ماجید) لەتیرەی (کەواسەوز)ی سەر بەهۆزی (ساڵەیی-صالحی)ن، وشەی (صالحی) لە (صالح)ەوە هاتووە، لە گەلێک ناوچە و دەڤەری کوردستاندا بە (سالح) دەڵێن (ساڵە)، کەواتە

سـالەیی لە (سـالە)وە هاتووە، کـاتی خـۆی چەند بنەماڵەیەک لەدەشتی سالەییەوە کەوتوونەتە ئەو دەڤەرە و تێیا نیشتەجێ بوونە. ژمارەی دانیشتوانی بەگوێرەی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٥٧) کـەس بووە. لە سـاڵی ١٩٨٧ وەک دێیەکانی دیکەی ناوچەکە وێران کرا.

## کەپەنک رەش

ناوی گـوندێکە لە بناری چیـای قـەرەچووغی هەڵکەوتووە، بەدیوی کەندێناودایە، سـەر بە شـارۆچکەی (دیبەگە)یە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شێخەلاس، گردەشینە، بیرەبەرازە، لەسەریەکە، وشەی (کەپەنک رەش) ناوێکی لێکدراوی کـوردییـە لەدوو ناو پێکهـاتووە، (کـەپەنـک+ رەش) واتا (نـاو+ ئاوەڵـناو) وشـەی (کـەپەنک) بەمـانای (قـاپوت) دێت، لەهەندێ شـوێنی دیکەی کوردستاندا (فەرەنجی) پێ دەڵێن.

لەوانەیە ناوەکە لەودوە هاتبێت کە کاتی خۆی لەو بنار و زوورگەدا شوانکارە و مەڕدارەکـان بەمەڕ لەوەڕینێ لەو ناوە بوون شوانەکانیان (کەپەنکی) رەشیان لەبەر کردبێت، جا ئاقارەکەی زۆربەی زوورگـە و بەرزی و نزمی تێـدایە، گـێچـەڵانە، دوو کـانی تێـدایە بەناوی (کـانی عـەور) یەکێکیان هی ژنانە ئەویدیکە هی پیاوانە، ئاوێکی زۆری هەبوو لەبەری دەڕۆیشت شێناییـان لەبەر دەکـرد، گـەنم و جۆیان پێ رەباس دەکرد بیرەکانیشی کاتی خۆی، کە بەفر و باران زۆر بوو، دەست هەڵێنج بوون هەندێکیـان ئاویان لەبەر دەڕۆیشت. ئاویان تاڵ بوو، تەنیا بیرێکی شیرناوی (شیرن ئاو) لەدووری گوندی هەبوو، خەڵکی بەکەر و باران ئاویان لێ دێنا بۆ خوارنەوە و چا و چێشت لێنان بەکاریان دێنا، ئەو گـوندە نێزیکەی (٦٠) شەست مـاڵێک دەبوون، تیـرەی جـۆراو جـۆری تێـدابوو لەوانە خـەیلانی، بندیان، سیـان. ئەم گوندە قوتابخـانە و مزگەوتی هەبووە، ژمارەی دانیشـتوانی بەگوێرەی سەرژمێری گشتی سـاڵی ١٩٥٧ز. (١٥٩) کەس بووە. ئەم گـوندەش لە سـاڵی ١٩٨٥ وێران کراوە.

## شێخەلاس

شێخەلاس ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بەشارۆچکەی (دیبـەگە)یە، لەبناری چیای قەرەچووغی هەڵکەوتووە. (شێخەلاس) وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (شـێخ+ ئامـرازی ە+ لاس) پێکهـاتووە (ناو+ ئامـرازی ە+ ناو). وشـەی (لاس) کـورتکراوەی نـاوی (ئەلیـاس)ە، خۆی ئەسـڵی وشـەکە (شێخ ئەلیـاس)ە، بەڵام بۆ سـووکی لەسەر زاران بووە بە (شێخەلاس)، چونکە لەزۆر ناوچە و دەڤەری کـوردسـتـاندا (ئەلیـاس) دەکەنە (لاس). بۆ نموونە لەناو خـێـڵـی هەرکی دەڵێن (خـدر و لاس) لەناوچەی دزەییایەتیدا دەڵێن (خدر و ئەلیاس)، کە دوا دوایی کەژی زسـتـانە، هەروەها لە دەڤـەرەکـەمـاندا پەندێک هەیە دەڵێن (خدر و ئەلیـاس، ساربوو خەلاس). (لاس) لەکۆنەوە لە کوردەواریدا بۆتە ناوی پیـاوان وەک لاسی ئەحـمـەد بەگی. هەروەها (لاس) ناوی بنەماڵەیەکە لەتیـرەی (وسومامەر)ی سەر بەهۆزی سیـانی دەشتی هەولێر. ئەم گوندە گوندێکی بچـووک بـوو نزیکەی ٨-٩ مـاڵێک دەبوون، مـزگـەوت و قوتابخانەیان هەبوو، ژمـارەی دانیشـتـوانی لە سەرژمـێری گـشـتـی سـاڵی ١٩٥٧ز. (١٣٩) کـەس بووە. لەسـاڵی ١٩٨٥ز. وێران کراوە.

## ناسر کوژرای

ناوی گوندێکە دەکـەوێتـە دەشـتی کـەندێناوە، لەبناری چیای قەرەچووغی بەدیوی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، کاتی خۆی پیـاوێک بەناوی (ناسر) لەیەکـێک لە گـەلییـەکـانی چیای قەرەچووغی کوژراوە ئەو گـەلیـیە ئێـسـتـاکەش بەناوی ئەو کـابرایە ناسراوە پێی دەڵێن گـەلی ناسـر کـوژرای. هەر لەدەرکی ئەو گەلییە و لەو بنارەدا ئەو گوندە بەناوی (ناسر کـوژرای) ئاوەدان کـراوەتەوە، لەلایەن چەند بنەمـاڵـەیەک (مـام زێندینیـیـەکـان) کە لە گـوندی (مـورتکەی گـچکە) بەمـەڕداری باردەکـەن و لەبناری چیـای قـەرەچووغ بەدیوی کەندێناوەدا لەو شوێنەدا هەواریان لێ دێخن و دادەمەزرێن، ئەو گوندە لەلایەن (برایە فەندی) ئاوەدان کراوەتەوە ٣-٤ مـاڵ دەبوون، ئەو گـەلیـیە هەنجیـرە کـێوی زۆرە و ئـاویشی هەیە بۆ مەڕداری گەلێک باشە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی کورتاندروو، سـەید عوبێد، بیرە بەرازە لەسـەر یەکـە و لایەکـیـشی چیـای قـەرەچووغـە، ژمـارەی دانیشـتـوانی (٣٢) کەس بووە بەگوێرەی سەرژمێری گـشتی سـاڵی ١٩٥٧ز. ئەو گـوندەش لە سـاڵی ١٩٨٥ وێران کراوە، خـەڵکەکـەیان گواسـتۆتەوە بۆ کۆمـەڵگای دارەتوو،

بنەسلاوە. وشەی (ناسر کوژرای) ئاوەڵناوێکی لێکدراوە لە (ناو+ رەگی فرمان+ پاشگری رای) پێکهاتووە.

وشەی (کوژ) رەگی فرمانە، پاشگری (رای، راو) بەدوای رەگی فرمان دەلکێت و دەیکاتە ئاوەڵناوێکی دارژاو وەک کوژرای = کوژراو

(کوژرای) بەشێوەی دەشتی هەولێر لەشێوەی سولەیمانیدا دەبێتە (کوژراو).

## کورتاندروو

ناوی گوندێکە لە خوارووی رۆژاوای دەشتی کەندێناوە هەڵکەوتووە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخموورە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی میلی هۆرتی گەورە، میلی هۆرتی گچکە، شۆڕە زەرتکە، سەید عوبێد، ناسر کوژرای، بیرە بەرازە لەسەر یەکە، کاتی خۆی بنەماڵەی حاجی عەبۆی کاکەخانی عەلی بە مەڕداری دێنە ئەو زوورگ و هەڵەت و هەڵدێرەو لەو بنارەدا دادەمەزرێن ئەو گوندە ئاوەدان دەکەنەوە بەناوی (کورتاندروو) ناسرا. بەر لە رووخاندنی لە ساڵی ۱۹۸۷ز. (٤٠) ماڵێک دەبوون، چەند تیرە و هۆزێکی تێدا نیشتەجێ بوو، وەک تیرەی موغبایزە و تیرەی (بوزی) کە بەرەسەن دەچنەوە سەر هۆزی گەلاڵی (گەراری)، برایم ئاغای.

ناوی (کورتاندروو) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (کورتان+ درووو) پێکهاتووە (ناو+) ناوی بکەرە بەو کەسە دەگوترێت کە (کورتان) دروست بکات. ژمارەی دانیشتوانی (۳۲۹) کەس بووە بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ۱۹۵۷ز. ئەم گوندەش قوتابخانە و مزگەوتی هەبووە، لەساڵی ۱۹۸۵ کاوڵ کراوە.

## تەلەرخێمی گچکە (میلی هۆرت محەمەد سەعید)

میلی هۆرت ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی کەندێناوە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخموورە، دوو گوند بەو ناوە هەن کە ئاقاریان لەسەریەکە میلی هۆرت محەمەد، میلی هۆرت قەرەنی، (میلی هۆرت محەمەد) تەلەرخێمی گچکەشی پێ دەڵێن، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شۆڕە زەرتکە، تەلەرخێمی گەورە، میلی هۆرتی قەرەنی، کورتاندروو لەسەریەکە.

ژمارەی دانیشتوانی بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ۱۹۵۷ز. (۲۱۳) کەس بووە، قوتابخانە و مزگەوتی هەبوو، گوندێکی بچووک بوو، نزیکەی ۹-۱۰ ماڵێک دەبوون.

## میلی هۆرت قەرەنی

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بەناحیەی دیبەگەیە لە خوارووی رۆژاوای دەشتەکە هەڵکەوتووە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی میلی هۆرتی گچکە، کورتاندروو، تەلەرخێمی گەورە لەسەریەکە و لایەکیشی چیای قەرەچووغە. ئەو گوندە لەبناری چیای قەرەچووغ هەڵکەوتووە بەدیوی کەندێناوە، وەختی خۆی حاجی قەرەنی حەمەدی کامەلای کە لەساڵی ۱۲۹٦ز. کۆچی دوایی کردووە، بە مەڕداری هاتۆتە بناری چیای قەرەچووغی کردوویانەتە پاوانی خۆیان و لێرە ماونەتەوە و دامەزراون ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە، نزیکەی ۳۰ ماڵێک دەبوون، پێش وێرانکردنی لەساڵی ۱۹۸۷ز، ئەم بنەماڵەیەش لە خزمانی (برایم ئاغا)ن. ژمارەی دانیشتوانی (۲٤۹) کەس بووە بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ۱۹۵۷ز، لە دوا ساڵەکانی سییەکاندا خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا وەسمان عەبدوڵلا حاجی عەزیزی سمایلاوەیی مەلای ئەو گوندە بووە.

## سمایلاوا

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی کەندێناوە، سەر بەناحیەی دیبەگەی قەزای مەخموورە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی بەرزەوار، یەدی قو، سەید عوبێد، زەمزەمۆک کورد، شۆڕەزەرتکە، لەسەریەکە. وەختی خۆی بنەماڵەی (کێخوا ئەحمەدی گەورە) لەدەشتی مرکییەوە بە مەڕداری باردەکەن و ئاوای ئەو دیو دەبن، لەوێ لەبناری زوورگەزراوی بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا هەوار دەگرن و دادەمەزرێن و ئەو گوندە بەناوی (سمایلاوا) ئاوەدان دەکەنەوە، خەڵکەکەش هەموو خزم و کەس و کاری یەکترن، گەلەک جاران ئاغاکانی دەڤەرەکە هەوڵی ئەوەیان داوە گوندەکەیان لێ داگیربکەن و دەستی بەسەردا بگرن و پێیان چۆڵ بکەن، بەڵام بۆیان نەچۆتە سەر. (سمایلاوا) ناوێکی دارژاوی کوردییە لە (سمایل+ ئاوا)وە هاتووە، لە (ناو+ پاشگری (ئاوا-ئاوە)پێکهاتووە. بەناوی پیاوێکیان

كردووه، كه ناوى (سمايل) بووه له دهشتى هەولێرێ، به تايبەتى لەناوچەى دزەييێتى به ئيسماعيل دەڵێن: سمايل، سمه، سمكۆ. مێژووى ئاوەدانكردنەوەشى دەگەڕێتەوە بۆ زياتر له ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر، ناوە جوگرافييەكانى گەڕەبەرچيخ، گردەشێر، گەڕەدۆينه، بەم دواييە (سمايلاوە) ببووە دوو گوند (سمايلاوەى گەورە) ژمارەى دانيشتوانى له سەرژمێرى گشتى ساڵى ١٩٥٧ز. (١٢٢) كەس بووە. (سمايلاوەى گچكه) ژمارەى دانيشتوانى (٦٥) كەس بووە. لەساڵى ١٩٧٠ز. قوتابخانەى لێ كراوەتەوە. لەپياوە ناودارەكانيان كێخوا ئەحمەدى گەورە، فەقێ عەولا (كه پياوێكى زۆر هۆشمەند و زيرەك بووە) مەلا وەسمان عەبدوڵلا عەزيز بووە، ئەو مەلا وەسمانە لەساڵى ١٩١١ز. لەدايك بووە خراوەتە بەر خوێندن له حوجرەى فەقێيان زۆربەى خوێندنەكەى له گوندى (قشاغلو) بووە. لەخزمەت مەلا تايەر مەلا مەعروفى ڕەباتى، لەساڵى ١٩٣٥ز بۆ يەكەم جار بۆتە مەلا لەگوندى (دۆغان) پاشان چووەتە گوندى (ميليهۆرت قەرەنى) بۆ دواجاريش هاتۆتەوە گوندەكەى خۆيان هەر لەوێش لەساڵى ١٩٦٨ز. كۆچى دوايى كردووە، مامۆستاى خوالێخۆشبوو دەستى نووسين و شيعر دانانى هەبووە. شيعرى فارسى زۆر لەبەر بووە، زۆربەى شيعرەكانى ئايينى و نيشتمانين. نووسراوێكى هەيە بەناوى (الاوراد الصباحية والمسائية) كه تاكو هەنووكەش چاپ نەكراوە.

## يەديقوو

يەديقوو ناوى گوندێكه دەكەوێتە بنارى زوورگەزراوى بەديوى كەندێناوەدا هەڵكەوتووە، سەر به ناحيەى ديبەگەيە، ئاقارەكەشى لەگەڵ ئاقارى گوندەكانى بەرزەوار، سەيد عوبێد، سمايلاوا، حەسارۆك، لەسەريەكە. (يەديقوو) ناوێكى لێكدراوى توركييە لەدوو بڕگە يا ناو پێكهاتووە، بڕگەى يەكەم (يەدى) بەماناى حەوت دێت، بڕگەى دووەم (قوو) به ماناى (بير) دێت، بەسەريەكەوە به كورديیەكەى به ماناى (حەوت بير) دێت. دەڵێن كاتى خۆى حەوت كانى لێ هەبووە، ناولێنان و ئاوەدانكردنەوەشى دەگەڕێتەوە بۆ داگيركردنى كوردستان لەلايەن عوسمانييەكانەوە، گوندێكى كۆنە، بەموڵك هى بنەماڵەى (شێخ جامى) بووە له پێش گرانى گەورەى ساڵى (١٨٧٩ز-١٨٨٠ز) هەر ئاوەدان بووە، لەم بارەيەوە (مام حاجى عەبدوڵلا وەسمان عەزيز) له دايكبووى ساڵى ١٩٣٠ز. گوندى گردعازەبان بۆى گێڕامەوە گوتوويەتى لەگرانى گەورەدا واتا لەساڵى (١٨٧٩-١٨٨٠ز) ماڵمان له (يەديقوو)ى كەندێناوە بوو، تەمەنم (١٢) دوازدە ساڵان دەبوو، بەسوارى ولاغى لەوێوە هاتمە گوندى (عەلياوە). كەواتە بەگوێرەى قسەكەى (شێخ عەولا) ئەو گوندە گەلەك پێش گرانى گەورەى ساڵى ١٨٨٠ز. هەبووە و ئاوەدان بووە. ژمارەى دانيشتوانى ئەو گوندەش بەگوێرەى سەرژمێرى گشتى ساڵى ١٩٥٧ز. (١٥٧) كەس بووە. ئەم گوندە قوتابخانە و مزگەوتى هەبووە، لەساڵى ١٩٨٧ لەگەڵ گوندەكانى ديكەى ناوچەكە وێران كران.

## شۆڕيجه

ناوى گوندێكه لەبنارى زوورگەزراوى بەديوى دەشتى كەندێناوەدا هەڵكەوتووە، سەر بەشارۆچكەى (ديبەگە)ى قەزاى مەخمورى پارێزگاى هەولێرە، ئاقارى ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقارى گوندەكانى خورمەرە، خەزنە، حەسارۆك، ماجيد، لەسەريەكە. لايەكيشى زوورگەزراوە. (شۆڕيجه) ناوێكى داڕێژراوى كورديیە، وشەى (شۆڕ) به ماناى سوێر دێت، پاشگرى (جه)ى پێوە لكاوە، به ماناى ئەوە دێت ئاوەكەى كەمێك تاڵە. ئەو گوندە ببووە موڵكى (حاجى مستەفاى مام خولەى) براى حەمە سادقى مام خولەى.

ئەم گوندە تيرەو هۆزى جۆراو جۆرى تێدا بوو لەوانە سنجاوى، گۆران، ئۆمەربل، لەك. ژمارەى دانيشتوانەكەى بەپێى سەرژمێرى گشتى ساڵى ١٩٥٧ز. (٢٥٧) كەس بووە. ئەم گوندەش قوتابخانە و مزگەوتى هەبوو لەساڵى ١٩٨٧ز. لەگەڵ گوندەكانى دەوروبەرى تەخت كران.

## چلەوێزە (چل هەوێزە)

ناوى گوندێكه كەوتۆتە بنارى زوورگى (زوورگەزراو)ى، بەديوى دەشتى كەندێناوەدا هەڵكەوتووە، سەر به شارۆچكەى (ديبەگە)ى قەزاى مەخمووره، كەوتۆتە باكوورى ڕۆژئاواى ئەم شارۆچكەيە جێگاكەى هەڵەتە، ئاقارى ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقارى گوندەكانى خورمەلە، كۆزەپانكە، شارۆچكەى ديبەگە لەسەريەكە. كاتى خۆى ئەو ناوە چۆڵ و هۆڵ بووە تيرە و هۆزەكانى دەشتى مركييە

ئاوای ئەودیو دەبوون، واتە لە دەشتی مرکیەوە بە زوورگەزراودا ئاوای دەشتی کەندێناوە دەبوون بە مەڕداری و مەڕ لەوەڕاندن. دەڵێن (مەرزان)ەکانی گوندی (ئێدی قزلەر)ی بۆ یەکەم جار لەو شوێنە بە مەڕداری دامەزران پاشان ئەوان ئەوێیان بەجێ هێشتووە. دوای ئەوان هەندێ بنەماڵە (لەک)ەکانی (جدیدە) و (ئاودەلۆک)ی ئەوانیش بە مەڕداری لەو بنارە هەواریان لێ دێخن و دادەمەزرێن و لەوێ دەمێننەوە. (چل هەوێزە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (چل+ هەوێز+ ە) واتا لە (ئاوەڵناو+ ناو+ ئامرازی ە) پێکهاتووە.

دەڵێن بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە کاتی خۆی مەڕدارانی دەشتی دزەییاتی مێگەلە مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان هەبووە بە شەوان لەو شوێنە کۆدەبوونەوە بە مەڕ و ماڵاتەوە لەترسی دەعبا و تالان، چونکە ئەو زەمانی گورگ یەکجار زۆر بووە، چەکی باشیش وەکو هەنووکە نەبووە، لەبەر ئەوەش نەوەکو مەڕ و ماڵاتەکەیان تالان بکرێت کە ئەوکاتی ئەو جۆرە کارانە باو بووە. جا لەو شوێنەی مێگەلەکانیان مۆڵ دەدا، ئەو جێگایە دەبووە هەوێزێکی گەورە و زۆر، لەوانەشە (٤٠) چل مێگەلە مەڕ بووبێت، بۆیە دەبووە (چل هەوێز)، بۆیە شوێنەکە ئاوەدان کرایەوە ناونراوە (چل هەوێزە) خەڵکی دەڤەرەکە بەزمانی خۆجێی واتە بەشێوە دیالێکتە بچووکە ناوچەییەکەی دەشتی هەولێرێ بۆ سووکی لەسەر زار دەڵێن (چلەوێزە) پیتی (هـ) دەقرتێنن، هەروەکو لەناوی گوندی (بەرزە هەوار) دەڵێن (بەرزەوار) هەندێ بیروڕای دیکەش هەیە دەربارەی ناوی (چل هەوێزە) هەندێ دەڵێن لە (چل هەوزە)وە هاتووە (چل هەوزە-چل حەوزە) گوایە ئەو ناوە لەزەمانی کۆندا ئاوی زۆر بووە. پیرە بەساڵاچووەکانی دەڤەرەکەمان دەگێڕنەوە دەڵێن کاتی خۆی ئەو هەڵەت و زوورگ و بنارەی دەشتی دزەییانی ئاوی یەکجار زۆر بووە، چونکە بەفر و بارانێکی زۆری لێ دەباری، لە ئاقاری گوندی (چل هەوێزە)دا نەختێک زەویت هەڵبکەندبایە ئاوی لێ پەیدا دەبوو.

(ئەحمەدی مام خولەی) لەپاش مردنی (حەمە سادق)ی برای (دیبەگە) بەجێ دێڵێت و دەچنە گوندی (چل هەوێزە) و لەوێ دەمێنێتەوە. ئەو گوندە ٢٠-٢٥ ماڵێک دەبوون، قوتابخانە و مزگەوتی تێدا بوو، دانیشتوانەکەی لەهۆزی (لەک)ن، لە ساڵی ١٩٨٧ وێران کراوە خەڵکەکەیان گواستەوە بۆ کۆمەڵگاکانی دارەتوو، بنەسلاوە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش لە سەرژمێرییە گشتییەکەی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٩٤) کەس بووە. لە نەخشەکانی میریدا بەچلەوێزەی ژووروو، سەروو، چلەوێزەی خواروو، ژێری نووسراوە.

**خورمەرە (خورمەڵە)**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی کەندێناوە، سەر بەشارۆچکەی (دیبەگە)یە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی چلەوێزەی سەروو، شۆریجە، کۆزەپانکە، چلەوێزەی خواروو، ماجید، لەسەریەکە، وشەی (خورمەرە-خورمەڵە) ئەگەر لە رووی زانستی زمانەوە بیدەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە بە ئاسانی بۆمان دەردەکەوێت وشەی (خورمەرە-خورمەڵە) وشەیەکی دارێژراوی کوردییە، لەناوی (خورما-خورمە) لەگەڵ پاشگری (لە) (رە) پێکهاتووە (ناو+ پاشگری). خەڵکی دەڤەری دزەییایەتی بە (خورما) دەڵێن (خورمە) هەروەها دانیشتوانی (جەزیرەی بۆتان و شێوەزاری بۆتان)یش وای پێدەڵێن. جا وشەی (خورمە) لەگەڵ پاشگری (رە-لە) بووە بە (خورمە+ رە = خورمەرە- خورمە+لە= خورمەلە) لەزمانی کوردیدا بۆ بچووککردنەوەی ناو بەکاردێت، نموونەشمان لە کوردیدا لەم بابەتەوە زۆرە وەکو کانی+ لە= کانیلە واتا کانییەکی بچکۆلە. ستی+ لە دەبێتە ستیلە، دەڵێن کاتی خۆی دارێکی (خورمە-خورما)ی گچکەی لێ بووە بۆیە بەو ناوە ناونراوە. وەختی خۆی (گۆران)ی تێدا نیشتەجێ بووە، ئەوان ئاوەدانیان کردۆتەوە، هی وان بووە. پاشان بووەتە موڵکی پیرداوداغەی ئۆمەری کە بە حاجی پیرداود بەناوبانگ بوو کە لەساڵی ١٩٢٢ز. کۆچی دوایی کردووە، ئەو پیاوە یەکێک بووە لە بنەماڵەی فارساغەی. شەش کوڕی هەبووە، مستەفا کەڕی کوڕی لەوێ داناوە. کاتی خۆی لەناو گوندی کانی هەبووە، بەڵام وشک بووە و ئاوەکەی نەماوە، لە سەرەوەی گوندی لە هەڵەتەکانیدا کانییەک هەیە ناوی (کانی پەروەر)ە، ئاوێکی شیرین و سازگاری هەیە، لەبەری دەڕوات، دانیشتوانی گوندی کاتی خۆی بە تایبەتی ژنان دەچوون لەوێ کۆریان دەکرد.
هەندێک ناوی جوگرافی گوندەکە بریتییە لە:

کەندی زیخمار (زیخماڵ) ناوی کەندێکە

سەروچاوەکەی لە هەڵەت و هەڵدێر و کەند و لەند و دۆڵە زوورگەکانی زوورگەزراوی بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا لە ئاقاری گوندی (چلەویژە)دا دێت و تێکەڵ بە یەکتری دەبن و کەندی زیخماڵ پێک دەهێنن، لەبەرئەوەی ئەو زوورگە و بنارە و هەڵەتە شاخی تەمۆخی زۆرە لەکاتی باران باریندا ئاوەکە لەگەڵ خۆی ئەو هووردە زیخانە رادەماڵێت و بەو کەندەی دادەنیت، بۆیە ئەو کەندە بە (کەندی زیخماڵ) ناونراوە، زیخێکی زۆری هەیە. (کەلاکان) ناوی یەکێک لە ئاقاردکەیەتی بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە دەڵێن ئەو ناوە مەڕی یەکجار زۆر بووە نەخۆشی هاتووە و مەڕێکی یەکجار زۆر مردووە لەو شوێنە کەلاکەکانیان خڕ کردۆتەوە و بە کەلاکان ناسراوە.

قووچەکە ئاسن. ئەو قووچەکە هەڵمەتەکانی زوورگەکەی، لەسەر تەپۆڵکەکە، لەنێوان ئاقاری خورمەلە و چل هەویژەدایە، بۆرییەکی لوولەییە وەکو (شاخص) لەسەر ئەو گردە لەزەوی چەقێندراوە، بەرزاییەکەی نزیکەی مەترێک دەبێت، بە قووچەکە ئاسن ناسراوە، دەڵێن کاتی خۆی ئینگلیزەکان بۆ (مەسح) بەکاریان هێناوە.

چاڵە نەوتەکانی خورمەلە و ناوچەی کەندێناوە بەگشتی ناوچەیەکی نەوتاوییە لە ساڵانی سییەکاندا بیرێکیان لە گوندی (خورمەلە)ی لێدا، لەساڵی ١٩٥٧ز. بیرێکی دیکەیان هەڵکەند. پاش خاپوورکردن و وێرانکردنی گوندەکە لەساڵی ١٩٨٧ز میری چەند بیرێکی دیکەی لەناو گوندەکە لێداوە هەنووکە نووسراوە (حقول نفط خورمەلە) لە ئاقاری گوندی (چلەویژە)ش دوو بیرە نەوت هەبووە، دانیشتوانی گوندی خورمەلە بەزۆری لەو هۆزانەی خوارەوە پێکهاتبوون گۆران، گەردی بندیان، ئۆمەربل ژمارەی دانیشتوانی ئەم گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز. (٣٣٢) کەس بووە. قوتابخانە و مزگەوتی هەبوو، لە ساڵی ١٩٨٧ز. وەکو هەموو گوندەکانی دەوروبەری تەخت و وێران کراوە، خەڵکە داماوەکەش گواستراوەتەوە بۆ کۆمەڵگاکانی دارەتوو، بنەسلاوە.

## سەید عوبێد

سەید عوبێد یەکێکە لە گوندە کۆنەکانی دەشتی کەندێناوە سەر بەناحیەی دیبەگەیە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی سمایلاوا، شۆڕەدزەرتکە، یەدی قوو، مەلاقەرە، بیرە بەرازە کورتاندروو لەسەریەکە. لە دەشتی هەولێرێکەدا گەلەک شوێن و گوند هەنە بەناوی هەندێ لەو بنەماڵە سەید و شێخانە کراون، کە لێی ژیاون و تێیدا نیشتەجێ بوون بەتایبەتی لەدەشتی کەندێناوە وەکو سەید عوبێد، سەیدۆکە، لەدەشتی (شەمامکێ)شدا وەکو گوندی سەید ئەمین (سەیدەمین) هەروەها (قەبری سەیدی) لە دەشتی قەراجێ (سەید عوزێر) لە دەشتی پشتڕێی. (سەید عوبێد) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (سەید+ عوبێد) واتا (ناو+ ناو) پێکهاتووە، بەڵام ئەو سەید عوبێدە کێ بووە نایزانین ئەوەندە هەیە ئەو گوندە بەناوی ئەو پیاوە ناونراوە، کە ناوی (عوبێد) بووە و (سەید)یش بووە. ئەو گوندە بەموڵک بوویتە هی حاجی عەلۆی، کە یەکێکە لە بنەماڵەی فارساغا سێ کوڕی هەبوو سمایل، برایم، محەمەد. ئەو گوندە گوندێکی گەورە بوو، تیرە و هۆزی جۆراو جۆری تێدابوو، لەوانە رۆژبەیانی، ئۆرمزیار، چەند بنەماڵەیەکی سەیدیشی تێدابوو. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەگوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٣٢٣) کەس بووە.

## سەربەشاخ

ناوی گوندێکە لە گوندەکانی ناوچەی کەندێناوە سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموورە لە پارێزگای هەولێر، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دەربەندی گۆم، سەرگەڕان، خەرابە، پەڵکانە، عەولافات لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگەزراوە. شوێنەکەی هەڵەتە و دەوروبەری شاخە، بەڵام شاخەکە (تەمۆخە) بەرد نییە هەر بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە. (سەربەشاخ) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (سەر+بە+ شاخ) واتە (ناو+ ئامرازی بە+ ناو) پێکهاتووە کاتی خۆی چەند بنەماڵەیەک لە تیرەی (وسوومامەر-وسمامەر) کە تیرەیەکن لە سێ تیرە سەردکییەکەی هۆزی سیان کە لە گوندەکانی بناری زوورگەزراو بەدیوی دەشتی مرکییەدا لە گوندەکانی گردلانکە، شێخانان، باشتەپەدا نیشتەجێ بوون هەڵقەناون و ئاودیوی (زوورگە زراو) بوونە لە دەشتی کەندێناوەدا نیشتەجێ بوونە و ئەو گوندانەیان تێدا ئاوەدان کردۆتەوە، لە ئاقاری ئەو گوندەش نزیکەی (٢٠) بیرە نەوت هەیە.

## کەندار (کەنداڵ)

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری چیای قەرەچووغی بەدیوی دەشتی کەندێناوەدا هەڵکەوتووە، لەنزیک دەرکی بازاڕگەی دایە، واتا (دەربەندی بازاڕگە) ئەویش گەروویەکی تەنگەبەرە دەکەوێتە نێوان دەشتی قەراج و کەندێناوە لە چیای قەرەچووغدایە.

کەندالّ وشەیەکی دارێژاوی کوردییە لە (ناو+ پاشگری دالّ+ دار) پێکهاتووە، (کەند+ دار)، ئەو ئاقارە کەند و لەند و بەرز و نشێوی یەکجارە زۆرە بۆیە بەو ناوە ناونراوە (کەندالّ) لەسەر شێوەی مەڕدار. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی گاوەرد، خدرجە، دێمەکار، دووشیوان، گردەشینە، لەسەریەکە، لایەکیشی چیای قەرەچووغە. شوێنەواری دێرینی یەکجار زۆرە، بۆ نموونە لە (کاولە کەندالّ)ی، کە دەکەوێتە دەرکی بازاڕگەی لەساڵی ١٩٤٨ز. شوێنەواری کۆشکێکی ئاشووری لێ دۆزراوەتەوە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرجۆن-(٣).

کاتی خۆی ئەو گوندە (خەرابە)، واتە کاولە گوند بووە، تیرەی (ئاری کوتکی) کە تیرەیەکن لە هۆزی سوورچی بە مەڕداری کەوتوونەتە بناری چیای قەرەچووغی لەو شوێنە دامەزراون ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە و ناونراوە (کەندار)، چونکە شوێنەکەی کەند و لەندی زۆر بووە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٣٠٩) کەس بووە.

## بیرەبات

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری (زوورگەزراو)ی بەدیوی دەشتی کەندێناوەیدا هەڵکەوتووە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)یە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی جاستان، تیکالۆ، قەپران، چەڵتووک، لەسەریەکە، لایەکیشی زوورگەزراوە کاتی خۆی شوێنی ئەو گوندە لەناو زوورگەکەدا بووە پاشان ئاو کەم بووە، خەڵکەکە لەوێ گواستوویانەتەوە بۆ پێدەشتەکە، بۆیە هەنووکەش بە شوێنەواری کۆنە گوندەکە دەڵێن (کاولان) دانیشتوانەکەی هەموویان لە تیرەی (شەمدینی) سەر بەهۆزی سیانن، لەپێش ئاوەدان بوونەوەی دەشتی کەندێناوەدا ئەو بنەماڵەیە لە دەشتی مرکییەوە لەبناری زوورگەکەوە دەژیان، بە تایبەتی لە گوندەکانی باشتەپە-گردلانکە. هەنووکەش لەنێوان ئاقاری گوندی باشتەپە و قازیخانەدا شوێنێک هەیە پێیدەڵێن کەڕکی حەسەن سێوێ برای کێخوا حوسێنی بووە، کە دەکاتە باپیری کێخوا (عەولا)ی بیرەبات. ئەو گوندە ٤-٥ بیرە نەوتی تێدایە، قوتابخانە و مزگەوتی هەبوو، ژمارەی دانیشتوانی لە سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز. (٢٦١) کەس بووە. لە ساڵی ١٩٦٣ وەکو زۆربەی گوندەکانی ناوچەکە بەر شاڵاوەکە کەوتووە و سووتێنراو تالانیش کرا. لە ساڵی ١٩٦٧ خەڵکەکە گەڕانەوە شوێنەکەی خۆیان. لە ساڵی ١٩٨٧ دووبارە وەکو گوندەکانی دەوروبەری تەخت و وێران کرا.

## مێرخوزار

(مێرخوزار) ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێر، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە باکووری ڕۆژاوای ناحیەکە هەڵکەوتووە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گۆسکە، پیرداوە، عەلیاوا مەردان، ترپەسپیان، پرینگە) لەسەر یێکە، مێرخوزار گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر، ئەو گوندە بە موڵک کاتی خۆی هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای قورشاغلوویی) بووە، کە یەکێک بووە لە نەوەی (عەلی بەگ) برای (حەسەن پاشای دیاربەکر)ی لەگەڵ گۆڕانی زەمانە ئەو گوندە کەوتۆتە بن دەستی بنەماڵەی فارساغای ئۆمەری حوسێنی فارساغا دەستی بەسەردا دەگرێت، ئەو (ئۆمەرە) دەکاتە باوکی (حاجی پیرداود)ی باپیری (مەعروف ئاغای مێرخوزار)یێ وشەی (مێرخوزار) ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە (مێر+ خوزار) پێکهاتووە، (مێر) کورتکراوەی وشەی (مێرگ)ە، واتە (المرج)، (خوزار یان غوزار) واتە ئەو شوێنە مێرگ و خوزار بووە، لە ڕاستیدا ئەو شوێنە کارێز و جۆگەی ئاوێی هەیە، شوێنێکی خۆش و دڵڕفێنە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە و کراوە. هەر لە کۆنەوە (مێرخوزار) قوتابخانەی ئایینی هەبووە، بنەماڵەی (مەلا ئەحمەدی صائم) لەوێ بوونە و وانەیان دەگوتەوە، لە ساڵی ١٩٠٩ زایینی مامۆستای خوالێخۆشبوو (مەلا سەعیدی کوڕی مەلا ئەحمەد) لەوێ مودەڕیس بووە، ئەو (مەلا سەعید)ە دەکاتە برای مامۆستا (مەلا تەیب و مەلا شەریف)ی ڕەحمەتی، برایەکی دیکەیان ناوی (مەلا محەمەدەمین) بووە، کە بە (مەلا هەوایی) ناوبانگی دەرکردبوو و ناسرابوو، شاعیرێکی دڵتەڕ و بە سەلیقە و هەست ناسک بوو، بە ڕەسەن (بنەماڵەی مەلا ئەحمەدی صائم)ی باوکی خەڵکی گوندی (دوو شیوان)ی مەنتکانی دەشتی هەولێر بوون، کە گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە، (هەوایی) بە شاعیری دەشتی هەولێر دەناسرا، بە فەقێیاتی لە خزمەت (مەلا ئەحمەد)ی باوکی خوێندووە، پاشان زۆر شوێنی دیکەی لە کوردستان کردووە و گەڕاوە، زۆر لە شاری کۆیە ماوەتەوە لە خزمەت (مەلا عەبدوڵڵای جەلی ١٨٣٥- ١٩٠٨) لە پاش مردنی ئەویش لە خزمەت (مەلا محەمەد)ی کوڕی بووە، کە بە

مەلای گەورە ناسرابوو.

(هەوایی) لەنێو هۆنراوەیەکیدا مەدحی (کاکە باوی) برای خوالێخۆشبوو (مەلا محەمەدی جەلیزادە) دەکات، ئەو کاتەی (مەلا هەوایی) لە کۆیە خوێندوویەتی، (بەهائەددین- کاکەباو) زۆر یارمەتی هەوایی داوە، گەنجێکی بەرچاو و خۆشەویست بووە، لە تەمەنی گەنجی جوانەمەرگ بووە، ئەمەش ئەو پارچە هەڵبەستەیە، کە هەوایی گوتوویەتی:

**دراوە کیسەکەم هەند بێ دراوە**
**لە پەنجا جێگە پینەی لێدراوە**
**لە زوبدەی سیلسیلەی ئالی جەلییە**
**جەنابی میری میران کاکە باوە**

(مەلا هەوایی) لە ساڵی ١٩٠٩ز ژنی هێناوە، ئەو کاتەی کە ماڵیان لە گوندی مێرخوزار بووە، لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مەلا شێخ جەلالی کوڕی شێخ حوسێنی بەرزنجی) ژن بە ژنێی کردووە، ئەوکاتە (مەلا شێخ جەلال) مەلا و مودەڕیس بووە لە گوندی (ترپەسپیان)ی دەشتی هەولێر، مامۆستا (مەلا شێخ جەلال) بەڕەسەن خەڵکی گوندی (کانی کوردە)ی دەشتی کۆیە بووە، کەوتۆتە ناو دزەییان بە مەلایەتی هەر لە (ترپەسپیان) کۆچی دوایی کردووە (نووسەر)، بەڵام ژنەکەی (هەوایی) زوو مردووە، مەلا هەوایی لە زۆر لە گوندەکانی دەشتی هەولێرێ مەلایەتی کردووە، لەوانە (گردمەلا، بیرەبات) لە ناوچەی کەندێناوە، ئەوجا لە ساڵی ١٩١٣ گوندی (بیرەبات)ی بەجێهێشتووە و رووی کردۆتە شارۆچکەی (مەخموور) بوویتە مەلای (برایمی بایزی) لەوێ ماوەتەوە تا لە ساڵی ١٩٢٣- ١٩٢٤ز کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

مامۆستا (مەلا هەوایی) چەند کوڕێکی لەپاش بەجێما، یەکێک لەوانە کە گەورە بوو بووە زانایەکی باش ئەویش (مەلا سەعدوڵلا) بوو لە ساڵانی چلەکان لە مزگەوتی (سەید نورەددین) لە گەڕەکی (شۆڕیجە)ی شاری (کەرکوک) مەلا و مودەڕیس بووە، خوالێخۆشبوو زانای گەورەی کورد مامۆستا (شوکور مستەفا) سەردەمێک بە فەقێیاتی لەلای وی خوێندووە.

دانیشتوانی مێرخوزار ئەو تیرانەی تێدا نیشتەجێ بوو:
ئەو گوندە بە زۆری لە بنەماڵەی (گردوان) بوون ئەو بنەماڵەیەش کاتی خۆی لە ناوچەی ئاکۆ کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ، خۆیان بە عەشیرەتی ئاکۆ دادەنێن.

لە زەمانی بەرێ دەڤەری خۆشناوەتی پەیوەندییەکی ئابووری و کۆمەلایەتی بەهێزیان هەبووە لەگەڵ دەشتی دزەییاندا، ئەو کاتەی کە رزقیان پێدەگەیشت لە میوەجات هەر لەترێ، هەرمێ، هەنار، هەنجیر، خۆخ بگرە هەتا تووتن و بەفری خوایی (بەفری چیا) ئەوا بە کاروان دەهاتنە خوارێ هەتا (یەکاوێ- یەک ئاو) دەڕۆیشتن واتە کۆتایی (دەشتی قەراج)ەو، کە دوا سنووری کوردستانە. مام خۆشناو گوند بە گوند دەگەڕا، لە هەر گوندەکی خانەخێی خۆی هەبوو لێی میوان دەبوو، بارەکەی لەوێدێخست، ناوە ناوە کابرای خۆشناو دەچووە سەربانەکی یان شوێنێکی بڵند بانگی دەکردن، دەیگۆت: (دە وەرنە هەناران، دە وەرنە هەرمیان، دە وەرنە هەنجیران، دە وەرنە ترێیان) خەڵکی گوندی ئاگادار دەبوونەوە، دەیانزانی ئەوە مێوە هاتۆتە گوندەکەیان هەر بابا بوو دەستی دەدایە بێژینگ یان پاشۆڵە گەنمەک جۆیەکی دەبرد و دەچووە ئەو ماڵەی کە مام خۆشناوی لێ بوو، ئەوجا ئەو رزقە سەر بەسەر بایە یان یەک و دوو بایە لەگەڵ گەنمەکە یا جۆیەکە دەیانگۆڕییەوە، (مام خۆشناو) تەرازووی پێبوو، گەنمەکە یا جۆیەکەی دەکێشا و میوەکەی دەداتێ. ئەم جۆرە ئالوگۆڕە (مامرەتە) زۆر کۆنە لە زانستی ئابووریدا پێی دەگوترێت (نظام المقایچە) واتە گۆڕینەوەی شتێک بە شتێکی دیکە، شاعیرێکی میللی ئەو دەشتە پان و پۆرە لەسەر زاری پیاوێکی ناوچەی خۆشناوەتیدا دەڵێت:

**هۆی هەنار و هۆی هەنار     دەچمە پرینگە و مێرخوزار**
**بە جۆ دەدەم یێک و چار     بە گەنمیش هەروەکی پار**

### قولتەپە (یەعقووب تەپە)

لە دەشتی ملکیەی دەشتی هەولێرێ (٣) گوند بەناوی (قولتەپە) هەیە، هەر سێکیشیان ئاقاریان لەسەر یێکە، لە بنچینەدا هەریەک گوند بووە بەو ناوە، پاشان لێکدی جودا کرایتەوە و بوویتە ٣ گوند بە ناوەکانی:

١- قولتەپەی رەشیدی حەویزی
٢- قولتەپەی عەزیزی.
٣- قولتەپەی یابەی، لێرەدا مەبەستمان لە گوندی قولتەپەی یابەیە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری

گوندەکانی (دۆلەزەی مستەفا)ی، (قولتەپەی عەزیزی، قولتەپەی رەشید)ی، (هەمزەکۆر، دۆڵە بەکرە) لەسەریەکە. ئەو گوندە بە موڵک هی (مەحموودی ئۆمەری قادری) مام زێندینی بووە، (یابەغا)شیان پێدەگوت لە گوندی قولتەپەی دادەنیشت، پیاوێکی زیرەک و زمانزان بووە، تورکی و عەرەبی باش زانیوە، کابێن های لە کتێبەکەیدا (سنتان فی کردستان)دا، کە ئەوکات حاکمی سیاسی شاری هەولێر بووە لە ساڵی ١٩١٨- ١٩٢٠ ز ناوی هێناوە و شەوێک میوانی بووە لە گوندی (قولتەپە)ی. مەحمودی ئۆمەری قادری حەوت کوڕی هەبووە: (قادر، بایز، مشیر، جەوهەر، عوسمان، سەدیق، نامیق، قادر)یان لە گوندی (بیرە عارەبانی گچکە- خوارێ)شی پێدەرێن دادەنیشت، کوڕێکی هەیە ناوی (حەمەدەمین)ە، بایزی براشی تەنیا یەک کوڕی هەبوو بەناوی (ئیسماعیل- سمکۆ) قوتابی بوو لە کۆلیژی ئاداب، بەداخەوە ئەو برایە لە راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ ز لە بەرگریکردنی شاری قەلا و منارە لە ١٩٩١/٣/٣٠ لەنزیک گوندی شێراوەی نزیک پردێ شەهید کرا، دایکی تەنیا ئەو کورەی هەبوو، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ز، ٤٢ کەس بووە. لە ساڵی ١٩٨٧ وەکو هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێر تەخت و وێران کراوە.

**قەشقە**

(قەشقە) یان (قەشکە) هەروەکو خەڵکی ناوچەکە وای پێدەڵێن ناوی گوندێکە سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەلبەندی هەولێرە، لەسەر زێی بچووک هەڵکەوتووە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گردەسۆر، ئازیانە، چاڵەگردەرە، پەرکانە، خوڕ خوڕ، چۆمەزەردەرەی گەورە) لەسەر یەکە و لایەکیشی زێی گچکەیە (زێی پردێ).

قەشقە گوندێکی کۆنە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر، هۆزی لەک کە بۆ یەکەم جار کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ لێرە دامەزراون و ئاوەدانیان کردۆتەوە، هەندێ ناوی جوگرافیایی ئەو گوندە- (قووچ) ناوی زوورگێکە زەوییەکەی دەچێندرێت، (پووش کفرە) ناوی پارچە زەوییەکە ساڵانە دەیکەنە شینایی، کەندی بیرەکە ناوی کەندێکە بۆ لای گوندی چارە گردەرە دەچێتەوە، (شاخی حەمەحاجی، کەندی نیوە سەرە، سەرچەم) لەنێوان گوندی (خوڕ خوڕ) و (قەشقە) دایە، ئاوی هەبوو، داری بی، داری پەرک، دارگەزی هەبوو، (بەر ئاوی بن شاخ، عارەبەرێ، هەرەسۆرک، تەنیا دار، قووچە برباس) ناوی زەوییەکییە، (بانە بۆران) ناوی بانێکی گەورەیە جاران عەشیرەتی بۆری دەهاتنە خوارێ لەو بانەی رەشماڵیان هەڵدەدا بۆیە بە (بانەبۆران) ناسراوە، (کەلی قەشقەی) کە شوێنی هەرە بڵندی زوورگەکەیە و دەڕوانێتە ناوچەکە و دەوروبەری، (قەشقە) گوندێکی گەورە بووە، (٨) بیری ئاوی تێدابووە، زۆریش لەزێی بچووک دوور نەبووە، ئاشی ئاگری هەبووە، ئەو گوندە ٢٠٠ ماڵێک دەبوون، لە ساڵی ١٩٦٠ قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، یەکەم مامۆستا کە هاتۆتە گوندی مامۆستا (نامق) ناوێک بووە، خەڵکی شاری هەولێر بووە، پاشان مامۆستا (مشیر تاهیر) سەردەمێک مامۆستا (محەمەد حەسەن مەنگوڕی) لەوێ بووە، هەروەها خوالێخۆشبوو شاعیر و نیشتمانپەروەری کورد شەهیدی جوانەمەرگ کاک (ئەحمەد رەشوانی) لە ساڵی ١٩٦٤ لەو گوندە مامۆستا بووە، کە ناوی (قەشقە)ی هات دەبێ ناوی (حەمە شێت)یش بینێن، چونکە حەمە شای شێتان و وەلی زەمانە بووە، خوالێخۆشبوو (حەمەشێت) کە شێتێکی ناسراوی شاری هەولێر بووە، کە زۆر شتی سەیر و سەمەرەی لێ دیتراوە خەڵکی ئەو گوندە بووە، حەمە سەردەمێک شوانی کردووە لەناوچەی شوان و شێخ بزێنیدا، هەروەها جووتیاریشی کردووە، دێتەوە یادم جارێکیان باسی ئەو (حەمەشێتە)یان دەکرد، منداڵ بووم باوکم خوالێی خۆشبێ گێڕایەوە گوتی چەند ساڵێک لە پاش گرانی ساڵی ١٩١٧ز ئەو حەمە شێتەم دیت لە ئاقاری گوندی (قەشقە)ی جۆتی دەکرد، کوڕێکی سوور و سپی موو زەردی لاواز بوو، بەڵام ئەودەم شێت نەبوو، ئەوکاتی ئێمە مەڕدار بووین لە ئاقاری هەڵەت و زوورگی قەشقەی رەشماڵمان هەڵدابوو، (نووسەر).

(قەشقە) گەلەک جاران سووتاوە و شەهیدێکی زۆریشی داوە، هەردەم جێگای حەوانەوەی پێشمەرگە بووە، زیاتر لە ٧٠ شەهیدی داوە، لەوانە کاکە (نادر قەشقە، کاک بەهرۆز، پێشمەرگەی دێرین کاک پیرۆت، شەهید محەمەد جەمیل، شەهید مامۆستا زرار، خاڵە یووسف)، زۆرن زۆر داوای لێبووردن دەکەم ناوەکانیان زۆرن، خوالێخۆشبوو شەهید (نادر سمایل ناسراو بە نادر قەشقە

خەڵکی ئەو گوندە بوو، لە پێشمەرگە دێرینەکانی دەشتی هەولێرێکە بوو، بەشداری لە شۆڕشی ئەیلوولی مەزن و شۆڕشی بەو دواییەی گەلەکەمان کردبوو، پێشمەرگەیەکی ئازاو چاونەترس و وریا و گورج و گۆڵ بوو، سەد حەیف و مخابن لە ساڵی ١٩٨٤ز کەوتە بۆسەیەکەوە لەگەڵ ٤ پێشمەرگەی دیکەی قارەمان شەهید کران، کاکە نادر لە ساڵانی حەفتاکان ئەندامی لیژنەی ناوچەی جووتیارانی دەشتی هەولێرێکە بوو، شاعیری میللی گەلەکەشمان خوالێخۆشبوو (مام تەها مامەر) گوایە جووتیارە و داوای عەرد دەکاتن تەعریفی کاکە نادری لۆ دەکەن، گوایە ئەو بەرپرسە و ئیشەکە بەدەست ئەوە، (مام تەها مامەر) کە دەچێتە لای لە دووردوە دەرێن مام تەها ئەوە کاک نادر قەشقەیە ئەویش بەو پارچە شیعرە بانگی دەکات و دەڵێ:

**ئەرێ ئەتووی نادر قەشقە**
**بەخۆ و بە تفەنگی رەشکە**
**وەرە عەردمان لۆ بەشکە**

ئەو حەیرانەی خوارەوەشم لە مام حوسێن مەولود قادر وەرگرتووە، کە دانیشتووی گوندی قەشقەی بووە، هەنووکە لە گەڕەکی ئازادی شاری هەولێر نیشتەجێیە.

(حەیران قەشقە و دەرماناو لەمن ئەوبەر ئەوبەرە، چاوی نازدار حەیرانێ رەشە دوو برۆی لەسەرە، مرازی هەموو براو برادەران حاسر بوو هی من و نازدار حەیرانێ ماوە لە مابەینی ئاخ و کەسەرە).

لە کۆندا دانیشتوانی ئەو گوندە بەشێوەی لەکی و لوڕی قسەیان کردووە، چونکە مەڵبەندی سەرەکی ئەو هۆزە (لەکستان) بووە، لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا، دوایی بە لەناوچوونی حکومەتی زەند پەرت و بڵاوبوونە، پیرە بە ساڵاچووەکانیان هەتا ٧٠ ساڵێک لەمەوبەر بە (ئەراموشم) قسەیان دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی لەمێژە لێرە نیشتەجێن تێکەڵ بە ناوچەکە بوونە و شێوەی خۆیان لەبیرکردووە، شێوەی دەوزێی بچووک بە ئاشکرا کاری کردۆتە سەریان لە کاتی قسەکردنیان دیارە، ئەم هۆزە لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا هەر هەموویان شیعە مەزهەبن، بەڵام لە کوردستانی عێراقدا هەموویان سونین.

بەگوێرەی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ز دانیشتوانی قەشقە ژمارەیان ٦٦٩ کەس بووە.

### سەلیبەکەی گوندی قەشقەی

لە گوندی (قەشقە)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێرێ، لە ساڵی ١٩٦١ز قوتابخانەیەکیان بە خشتی لێ دروست دەکرد، مامۆستایەکی مەسیحی لەوێ دادەمەزرێ، مامۆستا دەرێتە وەستایەکەی هێمای سەلیبێکم لۆ لە سەربانی مەکتەبێ دروستکە، وەستای چەمبەری پردیی دەبی واتە خەڵکی شارۆچکەی (پردێ- ئاڵتون کۆپری) بووە، هەڵدەستی پوختە و جوان بەخشتی سەلیبێکی لۆ دروست دەکا، جوان مارنجی دەکا، خەڵکی ئەو وەختیش وەکو هەنووکە نەبووە فەقیر بوونە، نەیانزانییە ئەوە سەلیبە! لۆ رۆژێکیان بەرێوەبەری ناحیەی قوشتەپەی سەردانی گوندەکە ناکا؟ دەبینی وا نیشانەی سەلیبێک لەسەر بانەکییە، (مدیر ناحیە)ش لای زۆر سەیر دەبێت، روو لە موختاری گوندی و خەڵکەکە دەکات و دەرێ ئەرێ ئێرە چ مارە دیانی لێ هەیە؟!

کێخوای گوندیش دەرێ ناوەڵڵا ئەفەندی ئێرە هیچ مارە دیانی تێدا نییە، ئەلحەمدولیلا هەموومان موسڵمانین، (مدیر ناحیە)ش دەرێ: کێخوا مادام ئەو سەلیبە چییە لەسەر ئەو بانەی؟ دەرێن کا، لەکێیە؟ کەسیان نەیانزانییە ئەوە هێمای سەلیبە، مام کوێخوا کە تەماشا دەکا دەرێ: هۆ...وە ئەفەندی! هەبی و نەبی ئەوە ئیشی مامۆستا دیانەکەیە.

### دووسەرە

لە دەشتی هەولێرێکەدا دوو گوند بەو ناوەی هەیە، هەردووکیشیان تخووبیان لەسەریەکە و یەکێکیان بەموڵک هی فەتاح ئاغایە بە (دووسەرە فەتاح) ناسراوە، ئەویدیکەیان (دووسەرە جەبار)ە، (کونەقیر)یشی پێدەڵێن، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرن، نزیکەی ١٨کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتوون، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (پیرداود، سورێژە، سۆربەش کاکەڵڵا، دوو سەرە جەبار) لەسەریەکە، گوندێکی بچووک بوو، خەڵکەکەی بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵکردن خەریک بوون، بە تایبەتی شینایی کردن. هەردوو نووسەری خوالێخۆشبوو (عەلی فەتاح)ی نووسەر و شاعیر و دکتۆر (ئەحمەد فەتاح)ی برای خاوەنی وەرگێڕانی کتێبی (دەرسیم لە

مێژوودا) خەڵکی ئەو گوندەن، هەروەها خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا خەلیلی دووسەرە) ناسراو بە (موخلیس) شاعیری گەورەی دەشتی هەولێر تەمەنێکی زۆری ژیانی لەو گوندە بەسەر بردووە. لە ساڵی ١٩٨٧ز وەکو هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێر خاپوور و وێران کرا، لەپاش پرۆسەی ئازادکردنی عێراق دووبارە ئاوەدان کرایەوە و هەندێ ماڵ چوونەوە ئەوێ لەناو ئاقاری ئەو گوندە ناحیەیەک دروست کراوە بەناوی (ناحیەی شەمامک) زۆربەی گوندەکانی دەوروبەری خرانە سەر ئەو ناحیەیە.

## میرەکانی گچکە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناو زوورگ و هەڵەت و هەڵدێری زوورگەکانی (دێدەوان)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە رۆژهەڵاتی ناحیەکە هەڵکەوتووە، دوا سنووریەتی، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سەرمەزرا، کانی بزرە، دوو شیوان، حەسەن موترب، شیوە پیران) لەسەریەکە، ئەو گوندە کەوتۆتە ناو سنووری مەنتکایەتی دانیشتوانی لە هۆزی مەنتکن، بۆیە دەرێن (میرەکانی مەنتکان، گوندێکی بچووک بوو، ژمارەی دانیشتوانی بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٦٣) کەس بووە، گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لە ناوچەکەدا هەیە (میرەکانی گەورە) یان (میرەکانی شێخ عەلی) پێدەڵێن، ئەو گوندەش وەکو هەموو گوندەکانی دەڤەرەکە بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریک بوون تا لە ساڵی ١٩٨٧ز وەکو هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێر تەخت و وێران کرا.

## باقرتە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی مرکیەی دەشتی هەولێرێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، گوندێکی زۆر کۆنە، لە زەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە، بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای) قورشاغلوویی بووە، پاشان کەتیتە بن دەستی بنەماڵەی بایزی بوویتە موڵکی (مەلا حەوێزی)، (مستەفای مەلای) لەوێ دادەنیشت، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (تریە سپیان، دوو گردکان، قشاغلو، سێبیران، منارا) لەسەریەکە، (باقرتە) وشەیەکی ئارامییە لە دوو برگە پێکهاتووە، برگەی یەکەم (با) بە مانای (خاک- نیشتمان) دێت، برگەی دووەم (قرت) بە مانای (کورد) دێت بەسەریەکەوە بە مانای (خاکی کورد) یان (نیشتمانی کورد) دێت. لە باکووری رۆژهەڵاتی گوندەکەدا گردێکی گەورەی بڵند هەیە، توورەگەرێژە (گردی باقرتە)ی پێدەڵێن، کاتی خۆی (برایمی بایزی..... - ١٩٢٠) بۆ یەکەم جار دێت لەسەر ئەو گردە رەشماڵی هەڵداوە، پاشان چووەتە دەشتی قەراجێ ماوەیەک لێرە ماوەتەوە، لە دەشتی قەراجێ گوندێکی دیکە بەناوی (باقرت) هەیە، کە هەنووکە مەڵبەندی (ناحیەی قەراج)ە، سەر بە قەزای مەخموورە ئەویش گردێکی شوێنەواری توورەگەرێژی گەورەی لێیە (گردی باقرتی) پێدەڵێن.

ئەو گوندە هەر لە کۆنەوە قوتابخانەی ئایینی هەبووە، چونکە پێشتر گوندێکی گەورە بووە، لە دەشتی مرکیەی، (عەشیرەتی شێروان)ی کە بۆ یەکەم جار لە ناوچەی (مێرگەسۆر و شێروان مازن)ەوە، کەوتوونەتە دەشتی کۆیێ لە گوندی (گۆیتەپە) دامەزراون پاشان کە لەوێ هەڵقەناون هاتوونەتە دەشتی ملکیەی دەشتی هەولێرێ لە گوندەکانی (منارە، باقرتە، کەسنەزان)ی دەشتی هەولێرێ دامەزراون، پاشان بە تێپەربوونی زەمانە ئاوای دیوی کەندێناوە بوونە و لە بناری چیای قەرەچووغی گیرساونەتەوە. لە ساڵی ١٩٠٩- ١٩١٠ز خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا سەید خدری کوڕی سەید عومەر) مەلاو مودەڕیس بووە، کاتی خۆی (مەلا سەید خدر) فەقێی خوالێخۆشبوو (مەلا عەبدولڕەحمانی چروستانی ١٨٧٧- ١٩١٥ز) بووە، کاتێ کە مامۆستا مەلا رەحیم لە هەولێر لە مزگەوتی (شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی) مودەڕیس دەبێت، مامۆستا (مەلا سەید خدر) لەوێ دەخوێنێ، دەرێن مامۆستا (مەلا سەید خدر) نەختێک توند بووە، بەڵام زۆر زوو سارد دەبۆوە، پاشان ئەوێی بەجێهێشتووە و چووەتە گوندی (مێرخوزار) لە هەمان ناوچە پاشان لەوێش باردەکاتن دەچێتە گوندی (لهێبیان) لە ناوچەی کەندێناوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و لەوێش نێژراوە، نەوە و نەوەزاشی هەر لەوێ ماونەتەوە لەوانە خوالێخۆشبوو (سەید ئیسماعیل)ی کوڕی کە ناسراوبوو بە (مەلا ناسیح) ئەو مرۆبە رۆڵەیەکی هەڵکەوتووی دەشتی هەولێرێکە بووە، کاتی خۆی هەر لە زووەوە ئەندامێکی چالاکی (پ.د.ک) بووە، رۆڵێکی

بەرچاوی هەبووە لە کوردایەتیدا، لە ساڵی ١٩٣٢ز لە گوندی (لهێبان) لە ناوچەی کەندیناوە لەدایک بووە، لە سەرەتای دەستپێکی شۆڕشی ئەیلوول پێشمەرگە بووە تا لە ساڵی ٢٠٠١ کۆچی دوایی کردووە، بە درێژایی تەمەنی پێشمەرگە بووە.

دەبا بزانین مامۆستا (مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدولڕەحیمی چروستانی)چیمان بۆ دەگێڕێتەوە دەربارەی ساڵی بەفری گەورە کە لەناو دزەییان بە ساڵی (بەفری ئەستوور) بەناوبانگە، مامۆستا ئەوکاتی فەقێ بووە لە دەشتی هەولێرێ، لە گوندی (تریەسپیان) لەدەشتی ملکیەی، لەلای خوالێخۆشبوو (مەلا شێخ جەلال بەرزنجی) لە ساڵی ١٩٠٩ز فەقێ بووە و خوێندوویەتی، پاشان ماوەیەک هاتۆتە شاری هەولێر لە مزگەوتی (حاجی قادر دەباغ)ی هەولێری لە خزمەت خوالێخۆشبوو (مەلا محەمەدەمینی بێتواتەیی) خوێندووە لەگەڵ (مەلا مەجید دوولکانی) وابزانم ئەو مەلایە خەڵکی کەرکووک بووە (نووسەر)، پاشان هەردووکیان چوونەتە دیبەگە، ئەوکاتی (دیبەگە) خوێندنگایەکی گەورەی فەقێیانی تێدابووە، مودەڕیسەکەی (مەلا فەتاحی خەتێ) بووە، کە یەکێک بووە لە نەوەکانی (مەلای خەتێ)ی مەلای میری سۆران (محەمەد پاشای گەورە)ی ڕەواندز، کاتی خۆی (مەلا فەتاح) لە ناوچەی خۆشناوەتی لە گوندی (خەتە-خەتێ)ی دۆڵی بالیسانەوە هاتبووە دەشتی هەولێرێ لە دیبەگە بوو، مامۆستا (مەلا محەمەد چروستانی) لە ساڵی بەفری گەورە ١٩١٠- ١٩١١ز لەوێ فەقێ بووە لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مەلا محەمەدەمینی هەوایی)، چروستانی لەگەڵ فەقێ و موستەعیدەکانی دیکەدا بەینیان تێکدەچێت و بەو بەفر و تۆفانە دیبەگە بەجێدێڵێت و لە زوورگەزراوی ئاوا دەبێت بۆ دەشتی ملکیەی بۆ گوندی تریەسپیان دێتەوە. ئەمەش دەقی نووسینەکەی مامۆستا چروستانییە لە لاپەڕە ٧٦ تا ٨٠ لە کتێبەکەیدا بەناوی (یادداشتەکانی منالی و بەشێکی سەردەمی فەقێیاتی) چروستانی دەڵێت: ( لە دیبەگە مامەوە تا زستانە بەفرە گەورەکەی مەشهوور ١٩١٠ زایینی پەیدابوو و ساڵی ١٩١١شی گرتەوە/ کە موتبیق بوو و مانگێک زیاتر دەوامی کرد، ئەوانەی کە زۆر پیربوون نە بەفری وا بەردەوامیان دیبوو و نە بیستبوویان، ئاسک و حەیواناتی دەشت و کێو فەوتان زۆر تەسادوفی کردبوو کە ئاسک بێ پەروا خۆی ئەکرد بەناو دێهاتدا و خۆی ئەکرد بە ماڵاناو، مەشهوور وابوو سێ گەلە گورگ بە دەشتا وەک هار لە برسا ئەگەڕان و ئەوی تووشی ببوونایێت لە ئینسان و حەیوان ئەیانخوارد، هەتا بیستم سواریان لەسەر پشتی وڵاغ هێنابووە خواردوە بە خۆی و وڵاغیەوە خواردبوویان، تفەنگی پێبووە دەستی کۆی نەکردووە دەستۆکەری بکات، ئەنواعی ماجەرا و حیکایات لەو بەفرە ئەستوورە نەقڵ ئەکرا کە جێگای حیرەت بوو و ئایەتێک بوو لە ئایاتی خوای تەعالا. لە (دیبەگە) بووم کە بەفرەکە باری و ددوامی ئەکرد،منیش بە واسیتەی ڕاتبەکردنی ناو دێ لەو بەفرەدا زۆر نارەحەت بووم، گەلێ ڕۆژ سەگ گلاوی ئەکردم و خۆم دائەشوشت هەتا ڕۆژێک چەند سەگێک بۆم هاتن، هەردوو دەستم گیرا بوو بە دوو زەرف چێشتەوە، ناچار زەرفێ لە چێشتەکانم هەڵپڕژان بە دەم و چاویانا. جەنابی (مەلا فەتاح) بە ئەحواڵی منی زانی، فەرمووبووی ئەو کوڕە ئەگەر لە مەدرەسەیەکی تر بێت موستەعیدە ڕاتبەی ناو دێی پێ مەکەن، با ئیشی حوجرە بکات. هەندێکیان ڕازی بوون، بەعزێکیان قەناعەتیان نەکرد، مەخسوس (مەلا ئەسعەد)ناوێکی مەریوانی بە خۆی و سوختەیەوە ئیسراریان کرد لەسەر ئەوە کە ئەبێ ڕاتبە بکات، ئەنجا نازانم لە غەرەزی مامۆستام بوو یان لەبەر خۆم بوو، منیش ڕقم هەڵسا لەو تەنگوچەڵەمەدا، لەو بەفر و شیدەتە دا قەرارم دا بچمەوە بۆ (تریە سپیان) لە داخی ئەو نامەردانە، ئەسپابم پێچایەوە، دامە دەس مامۆستام، کە زانی ئەڕۆم زۆری هەوڵدا، وتی: خۆت ئەفەوتێنی، گورگ ئەتخوا، حیرس گرتمی و بە هەوای موقتەزانی گەنجی کە شوعبەیەکە لە شێتی، بەو فەرتەنەیە عەزمم کرد لەسەر کۆچ و گوێم نەدایە ئامۆژگاری کەس، (٢) دوو دەرپێم پێ بوو هەردووکیانم لە پێ کرد و زۆر چاک خۆم پێچایەوە، لەچکم کرد، سەر و ملم پێچا بە دوو جامانە، فەقیانەکانم لە دەس و باسکم ئاڵاند تەنیا دەموچاو و دەسم بە دەرەوە ما، کەوتمە ڕێگا و بە زوورگا هەڵگەڕام (مەبەستی زوور گەزراوە/نووسەر) سەرە ژوور، تەقریبەن لە عومری حەڤدە ساڵییام و جەنگەی قووەت و تاقەتی گەنجیمە، باکم نییە و ماندووبوون نازانم چییە؟ تا ئەژنۆم بەفرە و دونیا تاریک و تەمە، ئەمما چونکە بای نەبوو هەوا خۆش بوو حیسی سەرسام نەدەکرد (بْعِوزنْ اللهْ و قوتِهْ) زوو گەیشتمە سەر

(زوورگە زراو)، دانیشتم ئیسراحەتم کرد، جگەرەکم کێشا، چەن ئایەت و دوعام خوێند، ئەنجا سەرەو ژێر داگەڕام بە دیوی (باقرتە) دا، ڕێگا دیار نییە، لاپێیە، زۆر جار ئەکەوتم تا پشتێنەم ئەکەوتە بەفرەوە، گەلێ کەڕەت بە لادا ئەکەوتم هەڵئەخلیسکام، ئەمەندەم هەڵسوکەوت کرد تەواو ماندوو بووم. بە مەزدننە نزیک بوومەوە لە بناری زوورگەکە، دانیشتم، تەماشایەکی دوای خۆم کرد بۆ سەر زوورگ، تارماییەکم دی بۆر و قەبە ئەجوولان و بەرەو خوار ئەهاتن، ترسام کە گەلە گورگ بن مووچڕکە بە بەدەما هات، هەناسەم سوار بوو، دیقەتم دا کە نزیک بوونەوە زانیم گورگ نین، (٣) سێ هێستر سواری شوانکارەی (قەراج) بوون ئەچوون بارە کا بێنن بۆ قەراج بۆ مەڕ و حەیوان، هەرسێکیان (کەپەنک - قاپووت) یان بەسەرەوە بوو، من دانیشتبووم لە دوورەوە دەنگیاندام، جوابم دایەوە، زۆر کەوتنە پەکوو پەکوو بۆ حاڵی من و گەلێ بەزەییان پیاما هاتەوە، یەکێکیان لە یەکێکیانی خوڕی وتی: کوڕە خۆ فڕێدە خوارێ، هەڵیبگرە بیخەرە سەر پاشکۆم، کابرا دابەزی و سواری پاشکۆی ئەوی تری کردم، کەپەنکەکەی دا بەسەرما، ئینجا کەوتینە سۆال و جواب، زانییان کە فەقێم، وتی: بۆ کوێ دەچی؟ وتم: بۆ تڕپە سپیان، وتیان ئێمە هەتا (باقرتە) ڕەفیقی تۆین، وتم: بمگەیەننە (باقرتە) باکم نییە، چونکە مەلاکەی ئەوێ (مەلا سەید خدر) فەقێی باوکم بووە.

وتیان: بەسەرچاو لەبەردەمی حوجرەی فەقێ داتئەبەزێنین، بەڕاستی مەردایەتییان کرد و دەلیلێکی خێر بوون بۆ من، ماندووم حەسایەوە، گەیشتینە (باقرتە)ی، لەبەردەمی حوجرە بانگیان کرد: فەقێ وەدەرکەون، میوانێکمان بۆ هێناون، دابەزیم، چوومە حوجرە، هەموو فەقێکان سەریان سوڕما و تەعەجوبیان کرد، ئاویان بۆ گەرم کردم، دەست و قاچیان شۆشتم، چایان لێنا، کە حیکایەتم بۆ ئەکردن هەروا سەرسام ئەبوون، ئەیان وت: خوا بە کەرەم و ڕەحمی خۆی نەجاتی داوی، ماجەرای ئەو سەفەر و فەلاکەتەم کە بەسەراهات و نزیک بوو بە هیلاک بچم تەفسیلی دەوێت، بە کورتی بڕیمەوە، خولاسە شەو لە (باقرتە) مامەوە، سبەینێ بە خۆشی گەیشتمە (تڕپە سپیان)، لام وایە پاش چل (٤٠) شەو زیاتر ناردم بۆ (دیبەگە) بۆ بوخچە و ئەشیاکانم.

**برایمەلەک**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی ملکییەی دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، گوندێکی کۆنە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گۆسکە - قووچەبرباس - مورتکە شەهاب - گرد مەلا - ناحیەی قوشتەپە) لەسەرێکە، (برایمەلەک) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (برایم + ە + لەک) واتە لە (ناو + ئامرازی ە + ناو) پێکهاتووە، کاتی خۆی ئەو گوندە بە ناوی کابرایەک کراوە کە ناوی (برایم) بووە، سەر بە (عەشیرەتی لەک) بووە. لە دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێریکەدا بە (ئیبراهیم) دەڕێن (برایم) یان (برایە) یان (برایۆک) هەندێ جار (بلە)شی پێدەڕێن، لە ناوچەی سولەیمانیش هەر (بلە)ی پێدەڕێن. مێژووی ئاوەدان کردنەوەی ئەو گوندە دەگەڕێتەوە بۆ نێزیکەی (٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر، چونکە مێژووی هاتنی عەشیرەتی لەک بۆ ئەو دەڤەرە دەگەڕێتەوە بۆ لەناوچوونی حکومەتی زەندی بەسەرۆکایەتی (کەریم خانی زەند) و (١٧٤٩ز - ١٧٥٩ز) هاتنی شا (ئەحمەداغای قاجار) بۆ سەر تەختی شاهی لە ئێران، پیرە بە ساڵاچووەکانی (لەک) دەڕێن: کاتی باپیرانمان هاتوونەتە دەشتی هەولێرێ (٤) چار برا بوونە، یەکێک لەو برایانە ناوی (برایم) بووە، ئەو گوندە بە ناوی وی کراوە و ناسراوە (برایمەلەک) لە دەشتی مرکییەی ناوچەی قوشتەپەی ئاوەدانی کردۆتەوە، ئەوەی لەوەچەی ئەو پیاوە بوونەتەوە بە بەرەی یا بەرەبابی (برایمی) ناسراون، برایەکانی دیکەی (فەرمان) و (جەرجیس) و (سمایل) بوونە، هەریەکەیان بەرەبابێکی زۆری لێ کەوتۆتەوە لەو دەشتە پان و پۆرە بڵاو بوونەتەوە، لە گوندەکانی (جدیدە)، (ئاودەلۆک)، (ئەسحابەلەک)، (دوو شیوان)، (حوشترا لووک)، (چل هەوێزە)، پاشان گوندی (برایمەلەک) بوویتە موڵکی بنەماڵەی.

لە قوڕنەی ماڵانی ئەو گوندەدا ئاوێکی لێ هەڵدەقوڵێت و کارێزە لەگەڵ ئاوی کارێزی مورتکەی دەبنەوە یەک ئاو و دەڕواتە خوارێ بۆ گوندەکانی (گۆسکە) و (مێر خوزار) و هەتا دەگاتە گوندی (پیرداود)ی برنج و شینایییەکی زۆریان لەبەر دەکرد، پێش وێرانبوونی لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە لە ساڵی ١٩٨٧ز، (٢٥) ماڵ دەبوون تیرەی جۆراو جۆری تێدا بوو، لەوانە (لەک - گەردی - ) بەکاری

کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریک بوون، لە پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ز چەند ماڵێک چوونەتەوە و گوندەکەیان ئاوەدان کردیتەوە، هەنووکە چەند ماڵێکی تێدایە. شۆڕەسواری دەشتی دزەییان (براییمەلەک) پیاوێکی ئازا و چاونەترس بووە، یەکێک بووە لە ڕۆڵە هەرە ئازاکانی دەشتی هەولێریێ، لە زەمانی پاشای گەورەی ڕەواندز میری سۆران (میر محەمەدی کوڕی مستەفا بەگی ڕەواندزی) (١٧٨٣ز - ١٨٣٧ز) لە ژیاندا بووە، هەردەم لە لەشکرەکەی (کاوێسی مەلا)ی بەخۆو (تەماو) و (شەمزین) و هەڤاڵەکانی دیکەی ئەو دەشتە پان و فراوانەیان لە دوژمنان پاراستووە، پەندێکی کوردی لەو دەڤەردا سەری هەڵداوە دەرێن:

(ئەگەر (لەک)ین، هەموو یێکین)

هەروەها لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێرێکەدا وا هاتووە

**یێکەک گاز دەکا هۆ (براییمەلەک)ە**
**تۆزی مێگەلان وا لە (خەندەک)ە**
**مەر بە تاران چوو نێڕین بەرەکە**

هەروەها لە مەقامی دروونەی دەشتی هەولێر دەرێن:

**عارەب هاتن ڕەش و ڕووت**
**کریان تاقە و گونیان جووت**
**وێنراح، وێنراحیان دەگووت**
**ڕمیان هاتە جۆلانێ**
**هەریر لۆ (قوڕیتان)ێ**
**ڕمیان هاتە بەلەکێ**
**هەریر لۆ (برایمەلەک)ێ**
**ڕمیان هاتە جۆلانێ**
**هەریر لۆ(کاریتان)ێ**

### سابلاخ (سابراغ)

ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی پشتڕێیێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، گوندێکی زۆر کۆن نییە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ (٦٨) ساڵ لەمەوبەر واتا لە سەرەتای چلەکانەوە ئاوەدان کرایتەوە، خوا لێخۆشبوو (شێخ مارفی هەڵەجە)ی ئەو گوندەی لە ئاقاری گوندی (هەڵەجەی گەورە)وە جودا کردیتەوە بۆ یەکێ لە کوڕەکانی ناوی ناوە (سابلاخ) بە ناوی شاری سابلاخی کوردستانی ڕۆژهەڵاتی کردووە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (ئۆمەرە سۆر - باغەمرە فەندی - میرزاغا - سەردەشت - هەرەجەی گەورە - بیرەجنە) لەسەر یێکە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە گوێرەی سەر ژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، (١٠٧) کەس بووە. خەڵکەکەی بە بەخێو کردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵەوە خەریکن، لە ساڵی ١٩٨٧ ئەو گوندەش وەکو هەموو گوندەکانی دەشتی هەولێر تەخت و وێران کراوە، لە پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ چەند ماڵێک چوونەتەوە و ئاوەدانیان کردۆتەوە.

### سەردەشت

(سەردەشت) یەکێکە لە گوندەکانی دەشتی پشتڕێی دەشتی هەولێر، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ناحیەکە هەڵکەوتووە، ئەو گەندە گوندێکی نوێیە، زۆر کەون نییە، لە دەوروبەری ساڵی (١٩٤١-١٩٤٢) ئاوەدان کرایتەوە، لەوبەری بەستەکەی بەرامبەر گوندی (برایم ئاوەدلان) هەر خەڵکی گوندەکە ئەوێیان بە جێ هێشت و چۆڵیان کرد چوون لەوێ دامەزران. ئەو گوندەش ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (میرزاغا - مورتکەی گەورە - گرد مەلا - پالانیان - ئۆمەرە سۆر) لەسەریێکە. (سەردەشت) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (سەر + دەشت) پێکهاتووە، واتە (ئاوەڵکاری شوێنی + ناو) دروست بووە. دەرێن خوا لێخۆشبوو (عەلی مەحمودی کاکە خانی) ئەو ناوەی لێناوە بە ناوی شارۆچکەی (سەردەشت)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی کردووە.

### برایم ئاوەدل

(ئیبراهیم عەودال) ناوی گوندێکی کۆن بووە، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بووە، ئەو گوندە گوندێکی کۆن بووە، تا کۆتایی ساڵانی سییەکان هەر ئاوەدان بووە، نزیکەی (٣٠) ماڵێک دەبوو، بە موڵک هی بنەماڵەی خەڵکەکە (برایم ئاوەدلان)یان پێدەگوت، ئەو گوندە بە ناوی پیاوێکی کراوە ناوی (ئیبراهیم ئاوەدل - عەودال) بووە، لە دەشتی هەولێریش بە (ئیبراهیم) دەرێن (برایم) بۆیە گوندەکە بە (برایم ئاوەدل) ناسراوە، یەکەم کەس کە لێرە دامەزراوە ئەو پیاوە بووە، ناوەکە ناوێکی

لێکدراوی کوردییە لە (ناو + ناو + ئامرازی کۆکردنەوەی (ان» پێکهاتووە، (عەلی مەحمودی کاکە خانی) لە دەوروبەری ساڵی ١٩٤١ - ١٩٤٢ هەستا لەو بەری بەستەکەی بەرامبەر گوندی (برایم ئاوەدلان) ١-٢ ماڵی بردە وێ و لەوێی دامەزراندن ناوی لێنا (سەردەشت)، (تایەراغا)ی برای ناردە وێ، خەڵکی گوندی (برایم ئاوەدلان) هەستان باریان کرد و ئەوێیان چوڵ کرد و هاتنە ئەو گوندە نوێیەی کە ناو نرابوو (سەردەشت)، خوا لێخۆشبوو (مام سەدیق حاجی وەسمان کامەلا) لەدایکبووی گوندی مورتکەی گچکە ١٩٢٧ز دەیگوت: من منداڵ بووم چووینە ئەو گوندە نانم لەوێ خواردووە. ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سابلاغ - مورتکەی گەورە - مورتکەی گچکە - پارانیان - بیستانەی گچکە) لەسەر یێکە.

**پالانیان**

پارانیان ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشتڕێی، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سەردەشت - گرد مەلا - کەردز - ئۆمەرە سۆر) لەسەریێکە، گوندێکی کۆنە، لە زەمانی عوسمانییەکان هەر ئاوەدان بووە، هەندێک دەڵێن ناوی ئەو گوندە لە وشەی (پالان)ەوە هاتووە. وشەی (پالان)یش بە مانای (کورتان) دێت، ئەمە لە ڕاستییەوە زۆر نزیکە چونکە کاتی خۆی ئەو ناوە پووش و پەراشێکی یەکجار زۆری هەبووە، خەڵکەکەی بە دروستکردنی (کورتان) خەریک بوونە بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە، دەرێن بۆ یەکەم جار (سنجاوی)یەکان ئاوەدانیان کردیتەوە، دانیشتوانی بە زۆری لە هۆزی سنجاوی بووە، ئەو تیرە و هۆزانەشی تێدایە لەوانە (مەغی - گەلاڵی) (سنجاوی) هۆزێکی گەورەی کوردە و مەڵبەندی سەرەکییان (ناوچەی مایدەشت) و (کرند)ە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کاتی خۆی بەشی هەرە زۆریان کۆچەر بوون، جیرانی (کەلهوڕ) و (جافەکان)ن.

لە زەمانێکی زووەوە چەند بنەماڵەیەکیان کەوتوونەتە دەشتی هەولێرێ ئەو گوندەیان ئاوەدان کردیتەوە، لەو دەقەرەدا بڵاوبوونەتەوە وەک لە گوندەکانی (چەغە میرە) کە گەڕەکێکی تەواو لەو گوندە بە ناوی (گەڕەکی سنجاوی)یان هەیە، لە گوندی (سەلماس)ی دەشتی قەراجی زۆرن، لە گوندی (قولتەپە و سۆربەش و شۆریجە) هەنە.

(بنەماڵەی شێرە) کە بنەماڵەیەکی دیار و ناسراون لە دەشتی هەولێرێکە دەگەڕێنەوە سەر ئەم عەشیرەتە، لە پیاوە ناودارەکانیان خوا لێخۆشبوو (مام ساڵح شێرە - مام خورشید شێرە - مام ڕەشید) و شەهیدی جوانە مەرگ (خەسرۆ شێرە) بووە.

هەروەها گوندێکی دیکەش لە (دەشتی قەراج)یدا لە بناری چیای قەرەچوغی چەند کیلۆمەترێک لە ڕۆژئاوای قەزای مەخمورەوە هەڵکەوتووە (پالانیان)ی پێدەڕێن کاتی خۆی بنەماڵەی (کێخوا عەلی) و کاکە سمەی برای لە گوندی (دوو گردکان)ی دەشتی مرکییەی بەمەڕداری دەچوونە دەشتی قەراجێ، هاتوونەتە ئێرە و کردوویانەتە هەواری خۆیان و ئاوەدانیان کردۆتەوە، ناویان لێ ناوە (پالانیان) بە ناوی عەشیرەتەکەی خۆیان کردووە کە (پالانی)ن کە کاتی خۆی عەشیرەتی پالانی (پارانی) لە دەشتی کۆیەوە لە گوندی (کونە گورگ) هەڵقەناون و هاتوونەتە دەشتی هەولێرێ لە گوندەکانی (قازیخانە - گرد لانکە - دوو گردکان - تیکالۆ) دامەزراون، ئەو گوندە گوندێکی نوێیە، کەون نییە.

**سۆربەش حەوێز (پووکە سەریان)**

لە دەشتی هەولێرێ (٣) سێ گوند بەو ناوە هەیە هەرسێکیانیش سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای ناوەندی پارێزگای هەولێرن.

١- سۆربەشی پووکە سەریان (حەوێز).

٢- سۆربەش کاکەڵلا لەم دواییەدا بە سۆربەشی هەمزە پیرەی ناسرا.

٣- سۆربەشی مەولود پاشان بە سۆربەشی خدری ناسرا.

ئاقاری ئەم گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی چیمەن - کلیسە - سۆربەش کاکەلا - دوو سەرە جەبار - دۆغان - قۆڕیتان مەحمود لەسەریێکە. دەگێڕنەوە کاتی خۆی بنەماڵەیێک بە ناوی بنەماڵەی (کێخوا محەمەد) لە گوندی (مخۆرس)ی دەشتی کۆیەی ناوچەی تەق تەق دەکەونە دەشتی دزەییان لە شوێنی سۆربەشی ئێستاکە هەواریان لێ دێخن هەر لەو جێیەدا خانووبەرە دروست

دەکەن، سەری خانووەکانیان بە (قامیشی پووک) سەر دەگرن، (پووک) بە مانای (پووچ) یان (پووچەر) دێت. ئافرەتەکانیان جلی ڕەنگاو ڕەنگ و سوریان لەبەر دابووە، بە پێچەوانەی ئافرەتانی دەشتی دزەییاتی چونکە ئافرەتانی ئەو دەشتە بەزۆری هەر جلی ڕەشیان پۆشیوە، بوویتە سەرنجێکی خەڵکی دەڤەرەکە بۆیە ئەو گوندە بە (سۆربەشی پووکە سەریان) ناسرا وشەی (پووکە سەر) لە (پووک + ە + سەر) پێکهاتووە (ناو + ئامرازی ە + ئاوەڵکار).

**تەندوورە**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە (دەشتی شەمامک)ێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە بەڵام هەنووکە سەر بە ناحیەی (شەمامک)ە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دوزتەپە - دەلوگول - دهێمات - ڕەختاوا - سیراوە - ماستاوە - کلێسە - چیمەن) لەسەرییەکە، وشەی (تەندوورە) ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە (تەندوور + ە) پێکهاتووە، واتە لە (ناو + پاشگری ە)، تەندوورە گوندێکە کۆنە، ئاقارێکی گەورە و فراوانی هەیە. بە موڵک هی بنەماڵەی (مەلا فەندی) بووە، پاشان بنەماڵەی (مەلا فەندی) فرۆشتوویانە بنەماڵەی (فارساغا)ی، (برایی ئەمینی) کە دەکاتە باوکی دکتۆر خورشیدی و (سمایلی عەلۆی) بە هاوبەشی کڕیویانە، ئەو گوندەش ئاوێکی باشی هەبوو، ئەو ئاوەش ناوی (کارێزی قاسماغا)ی بوو، لەناو گوندی (عەرەبکەند)ی دەردەبوو بە ئاقاری گوندی (دوزتەپە)یدا دەڕۆیی هەتا دەگەیشتە گوندی (تەندوورە)ی، سەوز و شینابییەکی زۆری لەبەر دەکرا، زیاتر لە جێگای (١) یەک عەربە گەنمی لێ دەکرا بە (تەماتە) بۆ ئەو کاتی زۆر بوو، هەموو (دەشتی قەراج و کەندێناوە)و ئەو ناوە لێیان دەخوارد هێشتا هەر دەمایەوە، حەفت قەد برنجی لەبەر دەکرا، جاری وا هەبووە زیاتر لە (١٠٠٠) هەزار فەردەی داغسۆری ئەو کاتی (چەڵتووک) داهاتی بوو، بۆ ئەو سەردەمی برنجێکی یەکجار زۆر بوو، لە ساڵانی پەنجاکان (٢٠ - ٢٥) ماڵێک دەبوون (کێخوا ڕەزای) مەموند سەرکاریان بوو (٥ - ٦) کەس جۆوان (جەوان) یان بوون ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە گوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ز (٢٠٦) کەس بووە، تەندوورە لە پێش ئەوەی بنەماڵەی (فارساغا) بیکڕن چەند حەسارێکی لێ بوو حەساری مەلا فەندی بوو، حەساری ئەحمەدە فەندی، حەساری مستەفا فەندی بوو.

**چیمەن**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی هەولێرێ، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. گوندێکی کۆنە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (داڵداغان - دوز تەپە - تەندوورە - بەردێنە - کلێسە- سۆر بەش حەوێز - قۆڕێتان مەلا مەحمود ) لەسەرییەکە، (چیمەن) ناوێکی ڕەسەنی کوردییە، لە شاری سولەیمانی بە ڕووەکی (فرێز) دەرێن (چیم). وشەی چیمەن بەو شوێنە دەگوترێت کە زەوییەکەی ڕووەکی چیمی (فریز)ی زۆر بینی، (چیمەن) جێگایەکی زۆر خۆش و بە مێرگ و چیمەن و سەوزاییە بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە، (چیمەن) گوندێکی بچووک بوو، (١٠) دە ماڵێک دەبوو، بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، ژمارەی دانیشتوانی (٥٥) کەس بووە، ئەو گوندە کاتی خۆی بنەماڵەی (حەیدەرییەکان) لەگەڵ بنەماڵەی (دەباغەکان) هاوبەش بوون هی وان بوو، سەردەمێکیش خوێندنگای ئایینی (حەیدەرییەکان) لەو گوندە بووە، بۆ ڕاستی و دروستی قسەکەشمان لەو پارچە هۆنراوەیەی خوا لێخۆشبوو مامۆستا (ناسیح حەیدەری ١٨٩٨ - ١٩٩٦) بە دیار دەکەوێت کە لە دیوانەکیدا لە لاپەرە (٢١٥) باسی خوێندنگای (چیمەن)ی کردووە.

ناسیح حەیدەری دەڵێت:

**هەیان بوو حەیدەری دوو مەدرەسەی تر**
**یەکێ لە شار، لە دێی (چیمەن) ئەوی تر**

**مەعاشی مەدرەسەی هەولێر و چیمەن**
**لە لایەن ماوەرانییان بوو مونەممەن**

زەوی و زار و ئاقاری گوندی چیمەن ماری زۆرە، بۆیە لە دەشتی هەولێرێ بوویتە پەند دەرێن:

**بوویتە کۆرە ماری چیمەنی !.**
**دەرێی کۆرە ماری چیمەنیە !.**
**دەمنی کۆرە ماری چیمەنیە !.**
**خۆ نەبوویتە کۆرە ماری چیمەنی !.**

## دوو کەڵە

(دوو کەڵە) یان (دوو کەرە) ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی ملکییەی دەشتی هەولێر، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٢٥٠) ساڵ لەمەوبەر، بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای قشاغلوویی) بووە، پاشان کەوتۆتە بن دەستی بنەماڵەی (فارساغەی)، (عەدۆی حاجی ئەحمەدی ئۆمەری ) لەوێ دادەنیشت کە دەکاتە باوکی (مشیری عەدۆی) ئەو عەدۆیە لەساڵی ١٩٢٢ ز کۆچی دوایی کردووە، مشیر پیاوێکی کورد پەروەر و نیشتمان پەروەر بوو، کاتی خۆی لە چلەکاندا ئەندامێکی چالاکی حیزبی هیوا بووە، پاش ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا بوویتە ئەندامێکی پارتی. (دووکەڵە) یان (دوو کەرە) هەروەکو خەڵکی دەڤەرەکە وای پێدەڕێن ناوێکی ڕەسەنی کوردییە بەڕای من وشەکە (دوو کەرەیە)، (دوو کەرە) ناوی گیایەکی زیان بەخشە چونکە ئاقاری ئەو گوندە ئەو جۆرە گیایەی زۆرە بۆیە ئەو گوندە بەو ناوەی کراوە و ناسراوە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سۆربەش مولود/خدر)، (قشاغلو)، (قازیخانە)، (بیرە عارەبان)، دوو گردکان) لەسەرییێکە.

دانیشتوانی ئەو گوندە لەو تیرە و هۆزانەی خوارەود پێکهاتبوو: مەموند (بەرەی قڕان)یشیان پێدەڕێن، ٦-٧ ماڵێک دەبوون کە کاتی خۆی لە گوندی (پێمەڕەبڕ) ی (دەشتی شەمامک)یێ هاتوون و کەوتوونەتە دەشتی مرکییەی لە گوندی (دوو کەڵە) و (سۆربەش)ی نیشتەجێ بوونە، یامەند - کەلوڕ (کەروڕ)، باجەلان - ئۆرمزیار- گەردی کە کاتی خۆی لە دەشتی بەڕانەتی کەوتوونەتە ئێرە، شاعیری میللی خوا لێخۆشبوو (سمایل باشە) ناسراو بە (سمایل میرەکانی ١٩٠٧ - ١٩٩٢) بە ڕەسەن خەڵکی ئەو گوندە بووە و لەو گوندەی لە دایک بووە. شوێنە جوگرافییەکانی ئەو گوندە (گردی قالۆرە)ی،(بابی پیر) کە ناوی پیاو چاک و گۆڕستانێکە. گردی قالۆرە ناوی گردێکە، توورەگە ڕێژە، زۆر گەورە و بڵند نییە، لە ئاقاری گوندی (دوو کەڵە) ی هەڵکەوتووە، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی کۆنە غەرابە، کاتی خۆی گوند بووە،

هەنووکەش شوێنەواری چەند گۆڕێکی لێ ماوە، ئەو شوێنە (دوو پشک)ی یەکجار زۆرە، لە دەڤەرەکەدا بوویتە پەند دەڕێن:

**دەڕێی دوو پشکی قالۆرەیە !**
**دەمنی دوو پشکی گردی قالۆرەیە !**

(بابی پیر) ناوی مەزارگە و ئارامگای پیاوچاکێکە، کەوتۆتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی گوندەکە، ئەو بابی پیرە کاتی خۆی لەناو دزەییان ژیاوە، هەر لەو گوندەش کۆچی دوایی کردووە، هەر لە ئاقاری ئەو گوندە بە تەنیا نێژراوە، پاشان خەڵک لەبەر گەورەیی و پیرۆزی ئەو پیاوچاکە مردییەکانیان لێرە دەشاردەود، هەنووکە بوویتە قەبرستانێکی گەورە، بە (قەبرستانی پیر) ناسراوە، دەڕێن ناوی ڕاستەقینەی (سەید مستەفا بووە )، لە سەیدەکانی بەرزنجییە. خزم و کەس و کاری لە گوندی (کێشکێ)ی دەڤەری خۆشناوەتی هەیە، بە تایبەتی بنەماڵەی (سەید غەریبی سێتاقان)ی شاری هەولێر لەو بنەماڵەیەن، جاران وشەی (پیر) لە دەشتی هەولێر و تەنانەت لە کوردستاندا بە واتای پیاوچاک یان (سەید) یان (شێخ) بەکار دەهات، خەڵکی دەڤەرەکە زۆر باوەڕیان پێی هەبووە و هەیە چونکە زۆر شتی سەیر و سەمەرەیان لێ دیتووە، هەنووکەش بۆ زۆر مەبەست زیارەتی دەکەن لە شارەکان دێنە ئێرە، زۆر جاران گوێم لێ بووە خەڵکەکە لە کاتی تەنگانە هاواری بابی پیر دەکەن دەڕێن:

(بابی پیر هاوارە!)

بەڕێز مامۆستا (کاکل شێمحەمەد حەمەد) لە دایکبووی ساڵی ١٩٤٥ گوندی (قورشاغلووی) دەشتی هەولێر بۆی گێڕامەوە گوتی: لە ساڵی ١٩٥٤ ماڵمان لە گوندی (دوو کەڵە)ی بوو تەمەنم (١٠) دە ساڵان دەبوو خوا لێخۆشبوو پارێزەر (عەونی یوسف ١٩٠٨ - ١٩٨٨) لە ساڵانی ١٩٥٤ - ١٩٥٥ زۆر جاران دەهاتە گوندەکانی دەشتی هەولێر یەکێک لەوانە گوندی (دوو کەڵە)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی بوو، ئەو گوندە (٢٥) کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغا)ی بووە پاشان کەوتۆتە دەست بنەماڵەی فارساغای، (ئەحمەد) لەوێ دادەنیشت کە دەکاتە باپیری (مشیری عەدۆی). کاک عەونی کە دەهاتە گوندی مێوانی باوکم دەبوو (شێمحەمەد حەمەد قورشاغلو)ی، ئەو کاتیش

ماڵی (مەلا عەولا)ی ناسراو بە (مەلا ماتۆڕ) لەوێ بوو، ماڵی ئەو هەڤاڵ و ئەندام و کادیرە کۆنەکانی (پارتی) لەوێ بوو، لەوانە خوا لێخۆشبوو (شێمحەمەد مەحمود)، (مەلا ماتۆڕ)، باوکم (شێمحەمەد حەمەد قشاغلوویی) کە ئەو کاتە ئاغای پاشای لە گوندی (قورشاغلو) دەری کردبووین دەیگۆت: «ئەو سەگبابە جۆتیارەکانم لێ هان دەدا»، (مەلا ماتۆڕ) ماڵی هاتبووە ئەوێ چونکە خوا لێخۆشبوو (مشیری عەدۆ)ی ئاغای گوندی مرۆڤێکی کوردپەروەر بوو، سەر بە (پارتی) بوو.

## لاجان

(لاجان) ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی پشترپێی، سەر بە ناحیەی قوشتەپەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە ڕۆژهەڵاتی گوندی (هەڵەجە)ی گەورە و باکووری گوندی (بیستانەی گەورە)، لە ناو زوورگەکان هەڵکەوتووە کە زوورگی هەڵەجەی پێدەڕێن، لاجان گوندێکی کۆن نییە، کاتی خۆی لە ئاقاری گوندی (هەڵەجە)ی جودا بوویەتەوە، خوا لێخۆشبوو (شێخ مارف)ی هەڵەجەی کە دەکاتە باپیری مامۆستا (خالص جواد معروف) ئەو بەشەی بۆ یەکێ لە کوڕەکانی جودا کردەوە و ناردییە وێ و ناوی لێنا (لاجان).

ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (بیستانەی گەورە - ئۆمەرە سۆر - هەڵەجە - بیرەجنە - کورداوە) لەسەریێکە، ٧-٨ ماڵ دەبن، ژمارەی دانیشتوانی بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ز (٤٢) کەس بووە، هەروەها بە هەمان ناو گوندێکی دیکەش هەیە کە سەر بە ناحیەی (خەبات)ە، لەپاش ساڵی ١٩٧٠ ئاوەدان کرایەوە لە ئاقاری (خەزنەی حاجی سادق)یان دابڕیوە، هەنووکە دانیشتوانەکەی لە (خێڵی هەرکی)نە، کاتی خۆی حکومەت ئەو هەرکییانەی هێناوەتە ئێرە و نیشتەجێی کردوون، هەنووکە بوویتە گوندەکی گەورە.

گوندێکی دیکەش بە ناوی (کۆنە لاجان)، (لاجانە کۆن) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا هەیە کەوتۆتە (دەشتی لاجان)ێ، سەر بە شارۆچکەی (پیرانشار - خانە)یە، هەروەها (لاجان) ناوی دەشتێکی گەورە و پان و فراوانە بە ناوی (دەشتی لاجان) لەو دیودا.

## دەلو گول

ناوی گوندێکی کۆنە دەکەوێتە (دەشتی شەمامک)ێ، سەر بە ناحیەی گوێڕی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە، گوندێکی کۆنە لە زەمانی عوسمانییەکان ئاوەدان بووە، نزیکەی (١٥) کم لە خوارووی ڕۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، عەرد و زەوییەکی زۆر بە پیت و بەرەکەتی هەیە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (خەزنە)، (جمکە)، (یارمجە)، (دهێمات)، لەسەریێکە.

زنجیرە (زوورگی دێرێ) ئەو زنجیرە زوورگە لە دەو زێی (کەلەک - خەبات)ەوە دەست پێدەکات بەرەو ڕۆژهەڵات دەکشێت، لە کلکە گوندی (دەلو گول)ی کۆتایی دێت، ئەو زوورگە لە هەندێ جێگا ناوی دیکەی هەیە وەکو (زوورگی ناڵە شکێن)ی کە زوورگێکی زۆر بە بەردە و تیژیشە، بۆیە پێی گوتراوە (ناڵە شکێن) ناوی خۆی بەخۆی وەیە، چونکە بەردەکانی ئەوەندە تیژن (ناڵ)ی ولاغی دەشکێنن، لە ڕۆژهەڵاتی شاری (بۆکان) لە کوردستانی ڕۆژهەڵات چیایەک هەیە زۆر بڵند نییە شاری بۆکان کەوتۆتە بنارەکەی بەو چیایەش دەڕێن (ناڵە شکێن)، گۆڕی هونەرمەند و گۆرانیبێژی ناسراوی کورد (حەسەن زیرەک) لە بناری ناڵە شکێن نێژراوە.

## سێوکە (سێوەکە)

ناوی گوندێکە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر، نێزیکەی (٢٥)کم لێیەوەی دوورە، لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی گوندی (بانەمان) هەڵکەتووە، لەسەرەوەی ڕووباری بەستۆڕەدیدایە، لە بناری چیای (پیر مەم). ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گراو)، (دۆنگزاوا)، (بانەمان)، (شارۆچکەی سەلاحەدین) لەسەریێکە، لایەکیشی ڕووباری بەستۆڕەیە، گوندێکی بچووکە تیرەی جۆراو جۆری تێدایە لەوانە: (خۆشناو - گەردی) بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، ژمارەی دانیشتوانی (١٥١) کەس بووە.

## سەر کەور

(سەر کەور) یەکێکە لە گوندەکانی دەشتی زرارەتی، سەر بە ناحیەی سەلاحەدین لەسەر ڕووباری بەستۆڕەی

هەڵکەوتووە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (قەفەر - گردی ماوان - مەموندان - شاخۆران - قورە بەگ )لەسەر یێکە، لایەکیشی رووباری بەستۆرەیە، هەنووکە (٢) دوو گوند یەکێکیان بە ناوی (سەرکەور زراری) ئەوی دیکەیان بە ناوی (سەرکەور هەرکی)یە، دانیشتوانی (سەر کەور زراری) لە (٣) سێ بەرە باب پێکهاتوون، هەر هەمووشیان لە عەشیرەتی زرارین، کاتی خۆی (٤٠) چل ماڵ دەبوو، هەنووکە سالی (٢٠٠٥)ە (٣٠) ماڵێک دەبێت، شێوە زارەکەشیان ناتوانم بڵێم تەواو شێوەی سۆرانییە، وە نە تەواویش شێوەی بادینانە، ئەو شێوە زارەیە کە لەسەر زێی بادینان لەو بەر و لەمبەری زێیەکە دا قسەی پێدەکەن و بەکاردێت.

## قادرییە

(قادرییە) ناوی گوندێکە دەکەوێتە (دەشتی شەمامک)ێ، سەر بە ناحیەی (گوێر)ە، لە باکووری رۆژهەڵاتی ناحیەکە هەڵکەتووە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (پێمەرە بر - عەلی مەلا داود - زاگە - عەباسیە) لەسەر یێکە، قادریە دەکەوێتە سەر جادە سەرەکییەکەی هەولێر - گوێر، بۆ یەکەم جار ئەو گوندە لە لایەن (٢) دوو بنەماڵە ئاوەدانکرایتەوە، یەکەم بنەماڵەی (حاجی عەولای پیرە بابی) کە لە گوندی (قووچە برباس)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەوە هەڵقەناون و هاتوونەتە ئێرە و نیشتەجێ بوونە، دووەم بنەماڵەی (ئەبابەکر حەمەد) کە بە رەسەن خەڵکی گوندی (بەحرکە)ی دەشتی بەرانەتی بوونە کەوتوونەتە ئەو شوێنە و لەگەڵ بنەماڵەی (پیرە بابی ) پێکەوە لێرە دامەزراون و ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە، پاشان خەڵکی دیکە هاتوون و دەوریان لێداون هەنووکە گوندێکی گەورەیە.

## عارەب کەند

(عەرەب کەند ) یان (عارەب کەند) ناوی گوندێکە کەوتۆتە خوراروی رۆژئاوای شاری هەولێر، سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، گوندێکی کۆنە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (عەزە)، (قەریە تاغ)، (دوز تەپە)، (جمکە)، (قونیان)، (باغە منارا)، (سوێری)، لەسەر یێکە، (عەرەب کەند) ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە دوو وشە یا ناو پێکهاتووە (عەرەب + کەند) واتە (ناو + ناو)، ئەو گوندەش بە موڵک بەشێکی هی بنەماڵەی (یاقووبییەکان)ی هەولێری بووە، بەشەکەی دیکە هی بنەماڵەی (کێخوا رەسوڵ) ناوێک بووە کە یەکێکە لە خزمەکانی خوا لێخۆشبوو (حاجی سادقی خەزنە)ی، کە کاتی خۆی لە بنەماڵەی یەعقووبییەکانیان کڕیوە، ئەو گوندە گوندێکی بە واربدات و خێر و بێرە، چەند کارێزێکی هەیە وەک (ئاوی ئەسعەدە فەندی - ئاوی شێخ زادەی ) کارێزی قاسماغەی، ئەو کارێزە لە ناو گوندی دەردەبی بە ئاقاری گوندی (دوز تەپە)یدا دەرواتە خوارێ هەتا دەگاتە گوندی (تەندوورە)ی، سەوزە و شینایییەکی زۆری لەبەر دەکرێت، کە دەرێن (کارێزی قاسماغای) ئەو قاسماغایەش دەکاتە باوکی (یەعقووباغا)ی باپیرە گەورەی بنەماڵەی یەعقووبییەکانی شاری هەولێرە، قاسماغا کوری عەبدوڵلاغایە لە سالی ١٨٠٥ موتەسەلیمی شاری هەولێر بووە، ئەو (عەبدوڵلاغایە) ماوەیەک فەرمانڕەوای و بەرێوەبەری شاری هەولێر بووە لە زەمانی عوسمانییەکان لە سەردەمی والی بەغدا (داود پاشا) دا، لە پاش مردنی (عەبدوڵلاغا) قاسماغای کوری لە جێگای دانیشتووە، کاتێ کە (میستەر ریچ) موقیمی بەریتانی لە عێراق لە سالێ ١٨٢١ز دێتە هەولێرێ سەردانی مالی قاسماغەی دەکات لە قەلای هەولێر چاوی پێدەکەوێت، پاشان قاسماغە بە ئەندامی بەرێوەبەری ویلایەتی بەغدا هەڵدەبژێردرێت، دەچێتە بەغدایێ، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، لەوێش نێژراوە، (یەعقووباغا)ی کوری موتەسەلیمی شاری هەولێری وەرگرتووە. هەر لەو ساوە زەوی و زار و موڵکێکی زۆریان لەناو شاری هەولێر و دەوروبەریدا هەبووە. وەکو گوندی (عەرەبکەند) و ١-٢ گوندیان لە دەشتی بەرانەتی هەبووە هەروەها زەوییەکانی سەربازگەی هەولێر، لە سالێ ١٨٢٢ز کاتێک (محەمەد پاشای رەواندزی) میری سۆران شاری هەولێری گرت، (یەعقووباغا) فەرمانڕەوای شار بوو، (پاشای سۆران) گرتی بەڵام لەبەر خاتری پیاو ماقوڵانی شار و زانا ئایینییەکان بەری داو لێی خۆش بوو، (یەعقووباغا) هەستا چوو لە گوندەکەی خۆی کە (عەرەب کەند) بوو لێی دانیشت پاشان لە دەرفەتێکدا بە رێی (کەلەک) هەڵات و

پەنای بردە بەر والی موسل، لەوێشەوە چووەتە شاری بەغدا لێی دانیشتووە، هەتاکو میری سۆران لەسەر حوکم بووە (یاعقووباغا) نەگەڕاوەتەوە کوردستان،، لە دوای هەرەسهێنانی فەرمانڕەوایی پاشای گەورە (میر محەمەدی ڕەواندزی) لە ساڵی ١٨٣٧ ئەوجا عوسمانییەکان (یەعقووباغا)یان هێناوەتەوە کوردستان و کردوویانەتەوە فەرمانڕەوایی شاری هەولێر تا لە ساڵی ١٨٤٧ز لە فەرمانڕەوایی لایانداوە و دانیشتووە، (یەعقووباغا) لە ساڵی ١٨٧٤ز کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژراوە و هەنووکەش گۆڕەکەی هەر ماوە.

### سێچاڵە (سێچارە)

ئەو گوندە دەکەوێتە دەشتی (شەمامک)ێ سەر بە ناحیەی گوێڕی قەزای مەخمووری شاری هەولێرە، لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی ناحیەکە هەڵکەوتووە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (تەلەر خێم)، (دەرماناوە)، (مەچلووبە)، (شۆڕە زەردکە)، (ماجیداوە)، (میلیهۆرت) لەسەرێکە، کاتی خۆی بنەماڵەیەک لە (هۆزی شێخان) بە ناوی (عەلی تاوس) ئەو گوندەیان ئاوەدان کردیتەوە، وشەی (سێچاڵە - سێچارە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (سێ + چاڵ + ە) واتە لە (ئاوەڵناو + ناو + ئامرازی ە) پێکهاتووە. کاتی خۆی ئەو ناوە (٣) سێ (چاڵ - چار)ی لێ بووە، بۆیە بەو ناوە نراوە و ناسراوە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە گوێرەی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، (١٤٨) کەس بووە، ئەو گوندەش وەکو هەموو گوندەکانی دەشتی شەمامکێ لە ساڵی ١٩٨٧ تەخت و وێران کراوە بەڵام لە دوای ئازادکردنی پرۆسەی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٤ هەندێ لە دانیشتوانی گوندەکە گەڕاونەتەوە، هەنووکە چەند ماڵێکی لێیە بە کاری کشتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕ ومالات خەریکن.

### دهێمات

(دهێمات) ناوی گوندێکە دەکەوێتە (دەشتی شەمامک)ێ، سەر بە ناحیەی گوێڕی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دەلوگول)، (سەعداوە)، (سیراوە)، (تەندوورە)، (ڕەختاوە)، (داڵداغان)، (خەزنە) لەسەرێکە، مام عەلی کوڕی سمایلی کوڕی ڕەسوڵ لەدایکبووی گوندی (دهێمات) بۆی گێڕامەوە گوتی: باپیرەم (ڕەسول) لەگەڵ (حاجی شێخ سمایل) کە یەکێک بووە لە بنەماڵەی (شێخ جامی عەلیاوە) کاتی خۆی لە گوندی (عەلیاوەی شێخان) هاتوونەتە ئەو ئاقارە لێرە ئەو گوندەیان ئاوەدان کردیتەوە، ئەمەش سەرجەلەکەیەتی (عەلی کوڕی سمایلی کوڕی ڕەسوڵ)ە، خۆشیان لە عەشیرەتی (مەموند)ن، کە یەکێکە لە هۆزەکانی دەشتی شەمامکێ، لە گوندەکانیان (دەلو گول)، (خەزنە)، (دهێمات)، (چالوکی گەورە)، (پێمەڕە بڕ) ە ئەو تیرە و هۆزانەی لەو گوندە نیشتەجێن (مەموند)، (گەردی)، (خەیلانی)، (مەمان)، بنەماڵەی مەجید ناسراو بە (مەچکۆ) خاوەنی چایخانەی مەچکۆی شاری هەولێر بە ڕەسەن خەڵکی ئەو گوندە بوونە و لە (عەشیرەتی مەمان)ن.

### دەرماناوە

دەرماناوە ناوی گوندێکە دەکەوێتە (دەشتی شەمامک)ێ، سەر بە ناحیەی گوێڕی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سێچاڵە)، (ماجیداوە)، (مەچلوبە)، (تەلەر خێم)، (زمارە جاسم)، (کەپران) لەسەرێکە، (دەرماناوە) ناوێکی داڕژاوی کوردییە لە (ناو + ناو+ پاشگری ە ) واتە لە (دەرمان + ئاو + ە) پێکهاتووە، بۆیە بەو ناوە ناو نراوە و ناسراوە چونکە کانییەکی لێ هەیە، ئاوەکەی لەبەر دەڕوات، ئاوەکە ئاوێکی کانزاییە بەکاردێت بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی پێست دەبن وەکو (خورشت) و (گروو - گوری) بوون زۆر چاکە ئەگەر بێتو خۆڵ و گڵی کانیاوەکە لە لەشی خۆیان هەڵبسوون پاشان خۆیان بە ئاوەکە بشۆن، گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لە دەشتی کەندێناوە هەیە لە بناری چیای (قەرەچوغ) هەڵکەوتووە، هەروەها (٢) دوو گوندی دیکەش بە هەمان ناو (دەرماناوەی سەروو) و (دەرماناوەی خواروو) لە دەو زێی (پردێ) زێی گچکە هەیە سەر بە ناحیەی (شوان)ن، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، (١٠٨) کەس بووە.

**نۆغەران**

(نۆغــەران) ناوی گــوندێکە دەکــەوێتــە دەشـــتی (شەمامک)ێ سەر بە ناحیــەی گوێڕی قــەزای مەخـموری پارێزگــای هەولێــرە، ئاقــاری ئەو گــوندە لەگــەڵ ئاقــاری گوندەکانی (شـەمـامـەر)، (تەرجان)، (چالوکی گـەورە)، (چالوکی گـچکە)، (کــەو ڕەبەن)، (قــەراتە ســۆران)، (فـاروق) لەسـەرێیکە، نۆغـەران گوندێکی کۆنە، وشـەی (نۆغـەران) ئەگـەر لە ڕووی زمـانەوانییــەوە بیــدەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێ وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (نۆ + غـەر + ان) واتە لە (ئاوەڵناو + ناو + ئامرازی کۆکردنەوەی ان) وشەی (نۆ) ژمارەیە، (غەران) کـۆی وشــەی (غــەر)ە، واتە غــەرە بەرد، (ان) ئامــرازی کۆکردنەوەیە لە زمانی کوردیمان، لە ئاقارەکەی (نۆ) غەرە بەرد هەبووە و بۆیە ئەو گوندە کە ئاوەدان کرایەتەوە بەو ناوە ناونراوە و ناسـراوە، کـاتی خۆی ئەو گوندە بە مـوڵک هی بنەمـاڵەی (مـەلا فـەندی) بووە، لە سـاڵی ١٩٥٤ز خـوا لێـخـۆشـبـوو (برایمی حـاجی ئەمـینی) هەسـتـا لەگـەڵ مندالەکانی (حاجی سادقی خەزنە)ی (٦) شەش گوندی لەسەرێیک لە منداڵەکانی (مەلا فەندی) بە (٣٥) سی و پێنج هەزار دینار کـڕی یەکێک لەو گوندانە (نۆ غـەران) بوو، (جەوهەر و عـوسمان و ئەنوەر)ی براکانی ناردە وێ، هەنووکە ئەو گوندە هی ئەوانە، دانیشتوانی ئەو گوندە تیرە و هۆزی جۆراو جۆری تێدایە لەوانە بنەماڵەی سەیدەکان، سـەید (عـەولا)ی نۆغـەرانی خـۆشناو کـە کـاتی خـۆی لە ناوچەی خـۆشناوەتی لەبەر چەند هۆیەکی کـۆمـەڵایەتی کەوتوونەتە ئەو دەشتە.

ژمارەی دانیـشـتـوانی بەپێی ئاماری سـاڵی ١٩٥٧ز، (٤٥٢) کـــەس بووە، خـــەڵکەکـــەی بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریک بووە، قوتابخانە و مزگەوتی هەبووە، لە سـاڵی ١٩٨٧ز وەکـو هەمـوو گـوندەکـانی دەشـتی شـەمـامکێ تەخت و وێران کـراوە و خـەڵکەکـەی ئاوارە و دەربەدەر بووە، لە پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ ز چەند ماڵێک چوونەتەوە ئاوەدانیان کردۆتەوە.

**تەلەر خێمی گەورە**

(٢) گوند لە (دەشتی شەمامک)ێ بەو ناوەی هەنە، (تەلەر خێمی گـەورە) و (تەلەرخێمی گچکە) هی گەورە سـەر بە ناحیـەی گوێڕی قـەزای مـەخـمـورە لە پارێزگـای هەولێـر، (تەلەرخـێـمی گـەورە) لە خـوارووی ڕۆژهەڵاتی ناحیەکە هەڵکەوتووە، بە (١٧)کم لێیەوەی دوورە، ئاقاری ئەو گـوندەش لەگـەڵ ئاقـاری گـوندەکـانی (سـێـچـارە، دەرمانـاوە، زمارە جاسم، زمارە عەبدولا، زمارە سمبس) ( میلی هۆرت مەحەمەد سەعید) کە (تەلەر خێمی گچکەی) پێدەڵێن، (میلی هۆرتی قەرەنی)، (هەوار غەر)، (مشار) لەسەرێیکە، ئەو (٢) دوو گوندەی دوایی سەر بە ناحیەی (دیبــەگــە)ن، ئاقـاری ئەو گـوندە زەوی و زارێکی زۆری داگرتییە، هێندەی ئاقاری ٣-٤ گوندی دەوروبەری خۆی دەبێت، دەڕێن ناوی (تەلەر خـێم) لە بنچـینە لە ناوێکی عەرەبییەوە هاتووە لە (تل الخيم الكبير)ەوە هاتووە کاتی خۆی هەندێ لە عـەشـایری عـەرەب مۆڵەت لە کـوردەکـان وەردەگرن بۆ مـەڕ لەوەڕاندن بێنە خـاکی کوردان سـاڵەکەش وشکە سـاڵی بووە، کوردیش لە دڵ سافی خۆی و کـرداری پیاوانەیان ڕێگەیان پێدەدەن لە زێی گەورە بپەڕنەوە و بێنە ئێرە مێگەلەکانیان بلەوەڕێنن، کە عەرەبەکان دێن کوردەکان ڕێزێکی زۆریان لێ دەگــرن، لە ئاقـــاری ئەو گـــوندە (شێخەکەیان) لەسەر بەرزاییەک ڕەشماڵێکی گەورە هەڵ دەدا، بۆیە ئەو شوێنە بە (تل الخيم الكبير) ناسراوە (تەلەر خـێـمی گـەورە). کـاتی خـۆی ئەو ناوە چۆڵ و هۆڵ بووە، پاوانی هۆز و تیـرەکـانی دەشـتی هەولێـر بووە، دەگـێـڕنەوە بنەماڵەی (حاجی سلێمان)ی کە بە ڕەسەن لە عـەشیـرەتی ئاکۆن بە مـەڕداری کـەوتوونەتە ئەو دەشـتـە و لەو شـوێنە دامـەزراون و ئەو گـوندەیان ئاوەدان کـردۆتەوە، قسـە هەیە (مەرزان)ەکـانیش هەر سـەر بە عـەشیـرەتی (ئاکۆ) بـن کە کـاتی خـۆی لە (دۆڵـی شــاوەرێ) هاتوونەتە خــوارێ لە گـوندەکـانی (یەدی قـزلر)، (زمـارە)، (قـەراتە سـۆران) نیـشـتـەجێ بوونە، دانیـشـتـوانی ئەو گوندەش لەو هۆزانەی خـوارەوە پێکهـاتووە (ڕۆژبەیانی - ئۆرمـزیار - ئاکـۆ - گەردی) ژمارەی دانیشـتـوانی ئەو گوندەش بە پێی ئاماری سـاڵی ١٩٥٧ز، (٩٥١) کەس بووە، لە سـاڵی ١٩٦٣ ئەو گـوندە سـووتاوە و تاڵانیش کـراوە و ژمـارەیەکی زۆریشی شـەهیـد داوە، (تەلەر خێـمی گـچکە) سـەر بە ناحیــەی (دیبەگە)یە.

**ماجیداوە**

یەکـێکە لە گـوندەکـانی کـەندێناوە، سـەر بە ناحیــەی

گوێڕی قەزای مەخموورە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی (زەمزەمۆک - سێچارە - مەچلوبە - ئەبو جەردە - شۆڕە زەردکە - دەرماناوە - قادریە) لەسەر یێکە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (٢١٠) ساڵ لەمەوبەر. یەکەم کەس کە ئەو گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە ناوی (ماجید - مەجید) بووە، لە (دەشتی دزەییاتی)ش بە (ماجید)ی دەڵێن (مەجید) مەچکۆ هەندێک دەڵێن ئەو کەسەش (مەجیداغەی عالیم) بووە، بریە گوندەکە بە ناوی وی ناسراوە، (ماجیداوە) وشەیەکی داڕژاوی کوردییە، لە (ناو + پاشگری ئاوا) واتە لە (ماجید + اوا) پێک هاتووە، بنەماڵەی عالم بنەماڵەیەکی کۆن و دیارو بەرچاون لەناو شاری هەولێر و دەشتی شەمامکێ، ئەم بنەماڵەیە بە ڕەسەن خەڵکی گوندی (زیارەت)ن کە بە زیارەتی مەلا زادان بەناوبانگ بووە کەوتۆتە بناری چیای سەرکەشی سەفین نەوەی (مەلا مستەفای عالم)ن، هەنووکەش قەبرەکەی لەوێیە، پاشان ئەو بنەماڵەیە گوندی زیارەت بە جێدێڵن و ڕوودەکەنە شاری هەولێر و هەندێکیان دەکەونە دەشتی کەندێناوە، لە گوندی ماجیداوە نیشتەجێ دەبن کە ئەو گوندە بە موڵک هی خۆیان بووە، محەمەداغای عالم ژنێکی لە هۆزی (تەی - گی - الگائی) هێنابوو، ناوی (زەمزەم صالح) بوو، خوشکی (شێخ حەنەش)ی سەرۆکی عەشیرەتی تەی بوو کە لە گوندی (هەوێرە)ی دەشتی شەمامکێ دادەنیشتن ئەو بنەماڵەیە لە کۆنەوە پەیوەندییان لەگەڵ تیرە و هۆزەکانی دەڤەری دزەییاتی بەهێز بووە، ژن و ژنخوازییان لەگەڵ بنەماڵە و سەرۆک هۆزەکانی دەڤەرەکە هەبووە، شێخ حەنەش کوڕی صالح کوڕی جەلعاو عەلی کوڕی شێخ حمود الهاوار علی بوو، خوشکێکی دیکەی (شێخ حەنەش) لەکن حاجی ڕەشیداغەی ویساغای هەولێر بوو، کە یەکەم هاوسەری ژیانی بووە. خوشکێکی دیکەیان بە ناوی (سەکتە) لەکن برایمی حاجی بایزی بووە، کە برایاغا لە ساڵی ١٩٢٠ز کۆچی دوایی دەکات، عەلۆی قورشیدی برازای ماردی کردووە، (فارس) لەو ژنەیە، محەمەداغا (٣) سێ ژنی هێنا بوو، ژنێکیان خوشکی (عەلی پاشای) دۆغرەمەچی بوو، کە مرد خوشکێکی دیکەیان دانێ، ژنەکەی دیکەی (زەمزەم)ی عەرەب بوو، ئەو گوندە لە کۆنەوە خوێندنگای ئایینی هەبووە، لە ساڵی ١٩٣٨ نزیکەی (٨٠) ماڵێک دەبوون، مودەریسەکەی ناوی (مەلا قادر) بوو. لە ساڵی ١٩٤٨ز بۆ یەکەم جار قوتابخانەی لێ کراوەتەوە بەڵام ئەو ساڵی مامۆستا نەبووە بێتە گوندی بۆیە بۆ ساڵی داهاتوو مامۆستای بۆ دیاری کراوە واتا لە ساڵی ١٩٤٩ دەست بە خوێندن کراوە.

دانیشتوانی ئەو گوندەش لەو تیرە و هۆزانەی خوارەوە پێک هاتوون (شێخان) نزیکەی نیوەی گوندەکە دەبوون، (شێخ مەمووندی)، (گەردی) ئەم گوندە دوو جار بەر شاڵاوی حکومەتی بەعس کەوتووە، جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٦٣ لە لایەن حەرەس قەومییەکان تاڵان کراوە. جاری دووەمیش ساڵی ١٩٨٧ کە لەگەڵ هەموو گوندەکانی دەڤەری دزەییاتی تەخت و وێران کران، لە پێش کاولکردنی نزیکەی (١٥٠) ماڵێک دەبوون قوتابخانە و خەستەخانە و ئاشی ئاگری هەبوو، خەڵکەکەی ئاوارە و سەرگەردان بوون بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێکان لە بنەسراوە و کەلەک و ناو شاری هەولێر بڵاو ببوونەوە، لە پاش ڕووخانی حکومەتی بەعس ئەوە (٢) دوو ساڵە ئاوەدان کراوەتەوە نێزیکەی زیاتر لە (٤٠) ماڵ چوونەتەوە، هەنووکە ئاوەدانە و قوتابخانە و پرۆژەی ئاو و کارەبای هەیە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەو گوندە پێگەیشتوون و خاوەنی بڕوانامەی بەرزن، زیاتر لە (٥) پێنج دکتۆر و (٢٠) پارێزەر کە یەکێکیان ئافرەتە (٣٠) سی مامۆستا و چەند مەهەندیسێکی لێ دەرچوو. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە گوێرەی سەر ژمێری ساڵی ١٩٥٧، (٥٤٧) کەس بووە.

**خەزنە حاجی صادق**

خەزنە ناوی گوندێکە دەکەوێتە (دەشتی شەمامک) ی دەشتی هەولێر، کاتی خۆی سەر بە ناحیەی عەنکاوە بووە بەڵام هەنووکە سەر بە (قەزای خەبات) ی پارێزگای هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دەلو گول)، (ساتۆر)، (تەرجان)، (دهێمات)، (یارمجە)، (سەعداوە) لەسەریێکە. ئەو گوندە گوندێکی کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم واتە لە پاش ساڵانی ١٨٥٠ ئاوەدان کراوەتەوە، کە کاتی خۆی لە لایەن بنەماڵەی (حاجی صادقی مستەفای هەمزەی و سووئامان) ێ ئاوەدان کرایەوە، دەرێن وەختی خۆی ئەو بنەماڵەیە لە (دوڵی زراران)ی دەوروبەری ڕووباری چەمێ (چامە)ی (مێرگە

سۆر) و (شێروان مەزن)ەوە لە گوندی (خەزنە)وە هاتوون و کەوتوونەتە (دەشتی شەمامک)ێ، یەکەم جار لە گوندی (دەلو گول) دامەزراون پاشان ئاقارێکی گەورەیان کڕیوە، لەناو زەوییەکانی خۆیان دامەزراون و ئەو گوندەیان ئاوەدان کردۆتەوە و بە ناوی گوندی (خەزنە)ی پێشوویان کردووە، هەنووکەش گوندێک لە (دۆڵی زرارا)ی بن چیای (ئەلبت) بە ناوی (زرارا) هەیە، دانیشتوانەکەی لە هۆزی شێروانین سەر بە ناحیەی مێرگە سۆرە. ئەو گوندە بە (خەزنە) ی حاجی صادقی ناسراوە کە پیاوێکی دیار و دەوڵەمەند بووە لە دەڤەرەکەدا، بە کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریک بوونە بە تایبەتی مەڕداری، مێگەلە مەڕی حاجی سادقی خەزنەی بەناوبانگ بووە لە دەشتی هەولێرێ بوویتە پەند دەرێن: «دەرێی لە ڕەسەنی مەڕی حاجی سادقی خەزنەیە» مەڕیان زۆر چاک و بەناوبانگ بووە و کاتی خۆی ئەو بنەماڵەیە چەند گوندێکیان لە بنەماڵەی (مەلا فەندی) کڕیوە وەکو (چالوگی گەورە)، (چالوگی گچکە)، (دوزتەپە)، (شیوە ڕەش). ئەو حاجی سادقە دەکاتە باپیری کاک (فاروق جەمیل حاجی سادق)، وەزیری دادی هەرێم، لە عەشیرەتی (مەموند)ن (خەزنە) لە ساڵی ١٩٥١ قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، لە کوردستان زۆر گوند بە ناوی (خەزنە) هەیە، گوندێکی دیکەش بە ناوی (خەزنە) لە ناوچەی برادۆستی سەر بە ناحیەی (سیدەکان) هەیە، هەروەها لە (دەشتی قەراج)یش گوندێک هەیە بە ناوی (خەزنەی سمایلاغا)ی، هەروەها لە دەشتی (کەندێناوە)ش گوندی (خەزنە) هەیە و سەر بە ناحیەی دیبەگەیە، گوندێکی دیکە بە هەمان ناو لە دەوروبەری شاری موسل هەیە دانیشتوانەکەی لە هۆزی شەبەکن.

ژمارەی دانیشتوانی (خەزنە)ی بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ز، (٢٦٥) کەس بووە.

**باغەمنارە**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژئاوای شاری هەولێر، بە چەند کیلۆمەتر لێیەوە دوورە. سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئەو گوندە بە موڵک هی بنەماڵەی (حەسەنی سالحە سۆری) چاوشلی بووە، کە دەکاتە باپیری خوا لێخۆشبوو مامۆستا (هادی ڕەشید چاوشلی) نووسەر و زانا و وڵاتپارێز. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (توو ڕەق)، (سوێری)، (عەرەبکەند)، (قونیان)، (قەتەوی)، (شاری هەولێر) لەسەریێکە، کاتی خۆی بنەماڵەی چاوشلی حەسارێکی گەورەیان لێ دروست کردبوو ئەو حەسارە چەند هۆدەیەکی تێدا بوو بۆ سەپان و جوتیار و شوان و ڕێنجبەرەکان. هەروەها تەویلەی وڵاغان و هۆری مەڕانیشی تێدا بوو، ماڵی (سەرکار)ی گوندیش هەر لەناو حەسارەکە دابوو، لە دەوروبەری حەسارەکەش چەند ماڵێکی دیکەی لێ بوو خەریکی مەڕداری بوون بەڵام خەڵکی ئەو گوندە نەبوون، لە دێیەکانی دیکە هاتبوون، ئاوی میری یا بڵێین جۆگەی میری لەناو شاری هەولێرەوە دەهاتەوە ناو گوندی، سەوزە و شینایییەکی زۆری لەبەر دەکرا وەکو (کونجی، برنج، تەماتە، شفتی، پیاز، گندۆرە) ئەو گوندە (٢) دوو (چاڵ - چار)ی گەورەی گەنمی تێدا بوو کە بە (کەرپووچ)ی سۆرکراوە هەڵنرابوو، ئەو چاڵانەش هەموو ساڵێ پڕ گەنم دەکرا و سەری سواق دەدرا، چاڵەکانیش هی بنەماڵەی چاوشلییەکان بوو، (باغە منارە) وشەیەکی ڕەسەنی لێکدراوی کوردییە لە (باغ + ئامرازی ە + منارە) پێکهاتووە واتە لە (ناو + ئامرازی ە + ناو)، من وای بۆ دەچم ئەو گوندە کاتی خۆی (فەنەر)ی هەبووە وەکو گوندەکانی دەوروبەری و نزیکی لەوانە قونیان، عەزە، قەتەوی، (فەنەر)یش هەروەکو مامۆستای هێژا (عەبدولڕەقیب یوسف) باسی کردووە دەڵێت: (فەنەر هەیە بەردێکی بڵندی سروشتیە یا سەکۆیەکی بەردینی تاشراوە یان بورجێکە یان منارەیە یان شێوەی نێزیکی شێوەی منارەیە) دەڵێت فەنەر ئەو شتەیە ئاگر یان ڕووناکییەکی دیکەی وەک زەیت یان نەوتی لەسەر دەکرێت تاکو ڕێبوار لە دوورەوە بیبینێ و ڕێگاکە بەشەو بزر نەکا و بەرەو ئەو شوێنە بێت یان بۆ ئاگادارکردنەوەی لایەنێکە بە هاتنی دوژمن کە ئەمەیان لە هەموویان گرنگترە، جا لەو گوندە دەبێت کاتی خۆی شوێنی (فەنەر) هەبووبێت کە لە شێوەی منارە بووە، ئەو گوندە کە ئاوەدان کرایەوە باغی لێ چاندراوە بە (باغە منارە) ناسراوە و ئاوی میری دەچۆوە ئەوێ لە ئاقاری گوندی بێریات و مزاحمەدی گردێک هەیە پێی دەرێن (گردی حەسەن بە ئاگای) یان (حەسەن ئاگادار) ئەو (حەسەن)ە ئیش و کارەکەی ئەوە بووە لە کاری (فەنەر) شەوانە ئیشی کردووە، بەڵام کێ بووە نازانین؟

**بەرزە وار (بەرزە هەوار)**

ناوی گـوندێکە کـەوتۆتە بناری (زوورگـە زراو)ی بە دیوی دەشتی کەندیناوەی هەڵکەوتووە، سەر بە شارۆچکەی (دیبەگە)ی قەزای مەخموری پارێزگای هەولێرە، سروشتی زەوییەکەی دێمە، رووبەری زەوییەکەی (٦٥٧٥) دۆنمە، (٢٣٨٠) دۆنمی هی خـاوەن مـوڵکە، زەوی ئەمـیـری (٣٨٦٧) دۆنمە، (٣٢٨) دۆنمیشی شیاوی چاندن نییە، تخـووبەکـەشی لەگـەڵ ئاقـاری گـوندەکـانی (عـەوێنە)، (زەمـزەمـۆک کـورد)، (شـێخ شـەروان)، (سـمـایلاوا)، (یەدیقـوو)، (شـابان شـارە) لەسـەرێتکە، لە زوورگـەکـەی ئاوا بێن بە دیوی دەشتی ملکیەی گوندەکانی شێخ شەروان - شـابان شـارەیە، زوورگـەکـەش هەر زوورگی (زوورگـە زراوە) بەڵام لە کـەرخی گـوندی (بەرزەوار)ی زوورگی بەرزەواری پێـــدەڵێن، ناوی (بـەرزەواریش) لـە (بـەرزە هەوار)دوە هاتووە واتە (هەوارە بەرزە)، هەر بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە چونکە کـاتی خـۆی شـوانکارە و مـەرِدارانی دەشتی هەولێرێ هەواریان لەو زنجـیرە زوورگـانە دەگرت و رەشـمـاڵیـان لێ هەڵدەدا، شـوێنەکەی بەرز و بڵـند بووە بە (بەرزەوار - بەرزە هەوار) ناسـراوە، وشـەکـەش ناوێـکی لێکدراوی کـوردییـە لە (بەرز + ئامـرازی ە + وار) واتە لە (ئاوەڵناو + ئامرازی ە + ناو) پێکهـاتووە، وشـەی (وار) بە مـانای (هەوار) دێت، لە باکـووری کـوردسـتـانیـش بە (هەوار) دەڵێن (وار). ئەو گـوندە تیـرە و هۆزی جـۆراو جۆری تێدایە، لەوانە: (لەک، ئۆرمزیار) ئەو گوندەش وەکو هەمـوو گوندەکـانی دەشـتی کـەندیناوە لە سـاڵی ١٩٨٧ز خاپوور و وێران کراوە، ژمارەی دانیشتوانی بە پێی ئاماری سـاڵی ١٩٥٧ز (٢٤٠) کـەس بووە، خـەڵکەکـەی ئاوارە و دەربەدەر بووە لە کـۆمـەڵگا زۆرەملێکان وەکـو دارەتوو - کونە گورگ - بنەسڵاوە گیرساونەتەوە، لە پاش پرۆسەی ئازاد کـردنی عـیـراق هەندێ لە خـێـزانەکـان گـەڕاونەتەوە گوندەکانیان، ئەویش چەند ماڵێکن.

**چەغە میرە (تەلە میرە)**

(چەغـە مـیـرە) یان (چۆغ مـیـران) نـاوی گـوندێکە کەوتۆتە ناوچەی کەندیناوە سەر بە ناحیەی دیبەگەی قەزای مـەخـمـورە لە پارێزگـای هەولێـر، بە دووری (١٤)کم لە خـوارووی رۆژهەڵاتی ناحـیـەکـە هەڵکەوتووە، رووبەری گشـتی زەوییـەکـەی (٧٦٠٠) دۆنمە، سروشـتی زەوییـەکـەی دێمە کـارە، زەوی مـوڵکدارەکـان (٣٠٠) دۆنمە، (٧١٥٣) دۆنمیش زەوی ئەمـیـــریەیە، (١٤٧) دۆنمی ناچێندرێت، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کاریتان)، (دیبەگە سلێـمـان)، (کـەنداره قـەل)، (دێمـەکـار)، (چیـغلۆک)، (لاوەر)، (حـاجی شـێـخـان)، (حـەسـەن برباس)، (دارە خورما) (عـاڵلا) لەسەرێتکە، گوندێکی کۆنە، کاتی خۆی (رەسوڵ) ناوێک کە سـەر بە (میران بەگی) یەکانی سۆران بووە کـەوتۆتە ئەو دەشـتـە، سـەرەتا لە گـوندی (تریە سـپـیـان)ی دەشـتی مـرکـیـیـەی بووە پاشـان لەگـەڵ (سنجـاوییـەکـان) بە تایبـەتی بنەمـاڵەی (شـێـرە) ئاوای زوورگەزراو بوونە، لە دەشتی کـەندیناوە (مام رەسوڵ) ئەو گوندەی ئاوەدان کـردیتـەوە بە ناوی (چۆق مـیـران - چۆخ میران)، پاشان باوکی (کانەبی حەوێزەی) کە لە بنەماڵەی بایزییـە هاتۆتە وێ ئەو گـوندە بوویتـە مـوڵکی وان، جـا نازانم لەو (رەسوڵ) ناوەیان کـڕیوە یان نەڕ؟!، ئەو گـوندە ئاقـارێکی گـەورە و فـراوانی هەیە، تیـرە و هۆزی جـۆراو جۆری تێدایە لەوانە (سنجاوی) کە گەرەکێکی تایبەتی بە خۆیان هەیە، (گەرەکی سنجـاوییان)یان پێدەڵێن، کارەوان (شـێـروانی)، (گـەردی) ئەو گوندە لە کۆنەوە مـزگـەوت و قوتابخانەی ئایینی هەبووە، خوا لێخۆشبوو (مەلا ئەحمەدی رەش) کە بە رەسـەن خـەڵکی گوندی (باشبەرد)ی ناوچەی پێنجوێن بووە، مودەریسی قوتابخانەکە بووە، لە دەڤەرەکە زانایەکی نـاسـراو و بەناوبـانگ بـووە، ژمـارەیەکی زۆر لە زانایان لەسـەر دەسـتی ئەو مـامـۆسـتـا بەرێزە بڕوانامـەی زانستیـان وەرگرتووە یەکێک لەوانە خوا لێخۆشبوو (مەلا عومەر یوسف گردەسۆری) بووە، مامۆستا چەند ساڵێک لەوێ ماوەتەوە پاشان هاتۆتە گوندی (مورتکەی گەورە) لە ناوچەی قـوشـتـەپە، تا لە سـاڵی ١٩٥٣ز هەر لەو گـوندە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە، هەزار رەحمەت لە گۆڕەکەی بێت، ئەم زانایە دەکاتە باوکی نووسەری هێژا کـاک (عـەزیزی مـەلای رەش)، قـوتابخـانەی مـیـریشی لە سـاڵی ١٩٦٠ز لێکراوەتەوە یەکـەم مـامـۆسـتـای قوتابخانەکەش خوا لێخۆشبوو مامۆستا (مولود ئەحمەد مـسـتـەفا) بووە. خەڵکی گوندی (کەنداره قـەل)ی هەمـان ناوچەکە بووە، ئەم بەرێزە دەکاتە باوکی هەردوو نووسەری بەرێز (کاک خالید جۆتیار) و (کاک جەلال سنجاوی)،

فەراشی گوندەکەش (حەمە زیاد موسا) بووە، لە دوای سالێک مامۆستا (ئەحمەد شوان) بوویتە مامۆستای گوندی، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە پێی ئاماری سالی ١٩٥٧ز (٣٩٤) کەس بووە.

**شێخ مەحمودی حەفید و قەلای دێرێ**

لە پاش ئەوەی کە لە سالی ١٩٠٨ (شێخ سەعیدی حەفید) باوکی شێخ مەحمودی نەمر لەگەل (شێخ ئەحمەد) ی کوڕی و ژمارەیەک لە پیاوەکانی لە شاری موصل بە دەستی چەند کەسانێکی گێرەشێوێن و ئاژاوەچی شەهید دەکرێن (شێخ مەحمودی حەفید) هەردەم لە هەلێک دەگەڕا کە تۆلەی باوکی و برایی و ئەو پۆلە شەهیدانە لەو کەسانە بکاتەوە کە بوونە هۆی شەهیدبوونیان، بۆیە شێخ دەستی لە هەندێکیان وەشاند و بە سزای گەلی گەیاندن.

ئەوەبوو فەرمانی دەستگیرکردنی لەلایەن دەولەتی عوسمانییەوە بۆ دەردەچێت، بەو هۆیەوە شێخی حەفید شاری سولەیمانی جێ دەهێلێ ڕوو دەکاتە سنووری پێنجوێن، لە سالی ١٩١٠ ز شێخ لەو ناوچەیە بووە سەروەختێکیش بە نهێنی خۆی گەیاندۆتە شاری قەلا و منارە، شاری پیرە هەولێر، دێت مالی (شێخ صالحی بەرزنجی ـ ١٩١٦) کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو (شێخ محی الدین بەرزنجی) ئەو بنەمالەیە بنەمالەیەکی دیار و ناسراون لە شاری هەولێر و لە ناو شاردا خاوەن تەکیەن لە گەڕەکی عارەبان.

(شێخ صالح) مانەوەی شێخ مەحمودی لە شاری هەولێر بە چاک نەزانیوە و ترسی ئەوەی هەبووە شوێنەکەی ئاشکرا بێت و بگیرێت بۆیە وای بە باش زانیوە شوێنێکی وای بۆ دابین بکات کە دوورە دەست و لا چەپ بێت و جێگاکە ئەمین و شیاوی (شێخ مەحمود) بێت بۆیە (گوندی دێرێ) ی (مەجیداغای کاکلاغای کوڕی شێمحەمەداغای گەردی) هەلبژاردووە و پیاوی ناردووە و پەیوەندی بە مەجیداغای دێرێ وە کردووە و کێشەکەی شێخ مەحمود ی پێڕاگەیاندووە، کاتێ کە شێخیان بردووە و گەیاندوویانەتە (دێرێ) مەجیداغا پێشوازییەکی گەرمی لێکردووە و هەستاوە لە (قەلای دێرێ) ی داناوە چونکە قەلاکە زۆر شوێنێکی عاسی و مەحکوم بووە و شوێنی حەوانەوە و بیری ئاویشی تێدا بووە.

دەرێن ماوەیەکی زۆر (شێخی حەفید) لەلای مەجیداغای لە گوندی دێرێ ماوەتەوە، بەلام ماوەکە چەند بووە، ئێمە نایزانین و هیچ زانیارییەکیشمان دەربارەی نییە. ئەو ڕووداوەش پێدەچێت لە نێوان سالانی ١٩١١ـ ١٩١٢ـ ١٩١٣ بووبێت چونکە شێخ لە سەرەتای سالی ١٩١٤ عەفو کراوە و لە ٢٠ تەموزی هەمان سالدا سەرکردایەتی لەشکری کوردستانی کردووە و بەشداری لە یێک دوو لەو شەڕانەی کردووە کە لە خوارووی عێراقدا لەگەل ئینگلیزەکاندا ڕوویانداوە بە تایبەتی لە شاری (شوعەیبە) کە زیاتر هەزار سوارەی کوردی لەگەلدا بووە و، لەو شەڕەدا ژمارەیەک لە کوردەکان شەهید دەکرێن، تەنانەت سەید ئەحمەدی خانەقاش بریندار دەبێت. با لە باسەکەمان لا نەدەین (شێخی نەمر) کاتێ لە سولەیمانییەوە هاتۆتە هەولێر بە مندالەکانی و خزم و کەس و کاری خۆی گوتووە: ئەگەر ویستتان لە من بپرسن پەیوەندی بە (شێخ صالحی بەرزنجی) بکەن ئەو دەزانێ، گەلەک جاران خوالێخۆشبوو (شێخ محی الدین) لە مەجلیساندا ئەو ڕووداوەی گێڕایەتەوە دەربارەی شێخ مەحمودی حەفید و مەجیداغای گەردی و قەلای دێرێ.

(شێخ محێدین) گوتوویەتی: ڕۆژێکیان لە سولەیمانییەوە (٢) کەس هاتن کە لەلایەن بنەمالەی شێخی حەفیدەوە ڕەوانەی هەولێر کرابوون بۆ تەکیە و مالی ئێمە، گوتیان: دەمانەوێ (شێخ مەحمود) ببینین و هەندێ ئەمانەتیش هەیە بیدەینێ ئەمانەتەکانیش هەندێ لیرەی زێڕ بوو کە بۆ (شێخی نەمریان ) هێنا بوو.

(شێخ محێدین) دەرێت: ئەمن بە خۆم بە گەریان کەتم و چووینە دێرێ و بۆ لای ( مەجیداغای گەردی)، پێمگوت: دەمانەوێ شێخ ببینین، مەجیداغا وتی شێخ لێرە نەمایە و ڕۆییە، شێخ محێدین گوتبوویە مەجیداغای دە کەواتە ئەمە ئێزندە دەگەڕێینەوە، بەلام مەجیداغا ڕازی نەبوو. نەیهێشتبوو بگەڕێنەوە هەولێرێ.

گوتبووی: (دەبێ ئەوشۆ میوانی من بن)، ئەوجا لە پاش نان خواردنی ئێوارێ مەجیداغا لە دیوەخان دەچتە دەرێ، پیاوێکی خۆی دەنێرێتە لای شێخ محێدینی کە بێتە دەرەوە، شێخ محێدین لە دیوەخان دێتە دەرێ، مەجیداغا دەرێ: ئەگەر دەتەوێ دەتبەم بۆ لای شێخ مەحمود، پێشتریش شێخ مەحمودیان ئاگادار کردبۆوە و پرسیان

پێکردبوو ئەوجا مەجیداغا لە گەڵیان دەچێتە قەڵا بۆ کن شێخ مەحمود و دەیبینن و ئەمانەتەکانیشی دەدەنێ و پاشان دەگەڕێنەوە، پاش ماوەیەکی زۆر عەفو بۆ شێخی حەفید لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانی دەردەچێت شێخ دەگەڕێتەوە سولەیمانی لە خەڵکی ناوچەکەی بیستووە و گوێی لێ بووە دەڕێن شێخ کە گەڕایتەوە سولەیمانی (خەنجەرە دەبان)ە تایبەتییەکەی خۆی لە بەر پشتی خۆی دەریناوە و لە بەر پشتی مەجیداغەی راکردووە، بە هەدیە دایتێ بۆ یادگاری ئەو خەنجەرە هەر مابووە و نەوەکانی مەجیداغەی قیمەتیان زانیوە پاراستوویانە تا لە ساڵی ١٩٧٢ ز پێشکەش بە سەرۆک بارزانییان کردووە.

لە پاش مردنی شێخ صالحی بەرزنجی لە ساڵی ١٩١٦ ز بە نەخۆشی رشانەوە، ئەو پەیوەندییە بە تینە هەر مابووە لە نێوان (شێخی حەفید) و ( شێخ محێدین) ئەو دە ساڵەی کە شێخ مەحمود لە خوارووی شاری بەغدا (١٩٣١ـ ١٩٤١) بووە، شێخ محێدین سەری لێ نەبڕیوە و هەردەم چووەتە لای لە بەغدا پاشان کە شێخ گەڕاوەتەوە کوردستان و لە گوندی (داریکەلی) نیشتەجێ بووە و شێخ محێدین لەگەڵ گەورە پیاوانی شاری هەولێر سەردانیان کردووە لەوانە (شێخ عبدالکریمی دارەخورما ) (سەید ئەحمەدی خانەقا ) لە کەرکوک کاک سەیدی هەڵەجە خەڵکی گوندی هەرەجەی قوشتەپە، ( شێخی حەفید ) زۆری خۆشویستووە، شەڕی پێفرۆشت و بە شیعر نامەی بۆ ڕەوانە کردووە و داوای توونتنی خۆشناو و (بێ شەما )ی لێ کردووە چونکە شێخی حەفید دەیزانی کەوا شێخ محێدین هەندێ پارچە زەوی باشی لە گوندی قەلاسنجی بن چیای سەفین هەیە، هەموو ساڵێک دەیکردە توونتن، جۆرە توونتنێکی بۆنداری باشی دەبوو (شێخ محێدین) هەموو ساڵێ بە جاغان لەو توونتنە بۆندارەی بۆ شێخ دەنارد (شێخی حەفید) فەرموویەتی:

**نە موحتاجی دەست و تفەنگتم نە شان و عەبا**
**بەڵکو موحتاجی چنگێ توونتنی (خۆشناو)م یا (بێشەما)**

### زوورگەبات

(زوورگەبات) یان ( زوورگەباد) ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەڕانەتی لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە سەر بە ناحیەی عینکاوەی مەڵبەندی قەزای هەولێرە، گوندەکە گوندێکی زۆر کۆن نییە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵانی چلەکان بە موڵک کاتی خۆی هی برا مەسیحییەکانی عینکاوە بووە، بەڵام ناوی ئاقار و گوندەکە زۆر کۆنە، کاتی خۆی دیانەکانی عینکاوەی فرۆشتویانەتە خوالێخۆشبوو (حاجی معروف کریم سلیم) ئەو لەوانی کڕیوە و یەکەم جار ئەحمەدی برای نارده وێ پاشان چەند ماڵێک دەوردیان لێدا، ماوەیەک حاجی معروف خۆشی لەوێ دادەنیشت و ماڵەکەی لەوێ بوو، ئەم بنەماڵەیە بە رەسەن خەڵکی شاری مەهاباد ی کوردستانی رۆژهەلاتن لە ئاخر و ئۆخری فەرمانڕەوایی شای قاجارەکان لە بەر چەند کێشەیەکی کۆمەڵایەتی ئەوێیان بەجێهێشتووە و هاتوون کەوتوونە شاری هەولێر، لێرە بە مزگەری خەریک بوونە، لە ساڵی ١٩٦٠ بنەماڵەی حاجی معروف گوندەکەیان فرۆشتە کوڕانی (مەجیداغەی دیزێ) بنەماڵەی حاجی مەعروفی لەگەڵ بنەماڵەی پێشەوا قازی محمد بە چەند پشتێک دەبنەوە یەک. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گونددکانی سێبیران و گەزنە و قەڵانچۆغان و عەنکاوە و ڕەشکێن و هەولێر، لە سەر یێکە، لە ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن حکومەتی عیراقییەوە رووخێنراوە و کاول کراوە. لە راپەرینی ساڵی ١٩٩١ دووبارە ئاوەدان کرایتەوە، نزیکەی ١٢ ماڵێک دەبوون بەڵام لە بەر ئەوەی ئاقاری ئەو گوندە کەوتە ناو سنووری (فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی ) خەڵکەکەیان لێرە گواستەوە، ئەو گوندە تیرەی جۆراو جۆری تێدا بوو لەوانە گەردی، ئاری کوتکی.... حەیرانبێژەکان لە حەیران گوتندا ناوی زوورگی زوورگەبات یان هێناوە، ئەو ئاقارە وەکو زوورگ زیاتر ناسراوە نەک وەکو گوند چونکە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکە زۆر لە مێژ نییە بەڵام ناوی زوورگەبات زۆر ناوێکی کۆن و ناسراوە هەتا لە پێش زەمانی پاشای گەورەی ڕەواندز (١٧٨٣ـ ١٨٣٧) هەر ئەو ناوی هەبووە.

### گومەتەکەی مێرەمە دیانێ

گومەتی مێرەمە دیانێ ئەمەش ناوی ئەو مەزارگەیەیە ناوی (مریەم ـ مێردم) بە دووری (٥) کیلۆمەتری لە باکووری رۆژئاوای شارۆچکەی عەنکاوەی پارێزگای هەولێر

هەڵکەوتووە، دەرێن ئەو شوێن کاتی خۆی کەنیسە ـ کلێسە بووە ئەو مەزارە پێشان دوو گومەتی هەبوو لە خشت و قوڕ دروست کرابوو بەڵام هەنوکە مەزارگەکە نۆژەن کراوەتەوە، گومەتەکانیش لە سەر شێوەی بازنەیی لە بەردی حەلان دروست کراون هەر لە کۆنەوە زیارەتگەی برا مەسیحییەکان بووە. مریەم لە شێوە زاری دەشتی هەولێر دەڵێن مێرەم، ئەو گومەتە لە حەیران و ئەدەبی فۆلکلۆریاندا زۆر ناوی هاتووە بۆ نموونە لەو حەیرانەی خوارەوە وا هاتووە:

**حەیران... راوکەرەک بووم دەگەڕام لە راوێ، لە بەینی بەحرکە و گەزنەی جاران، شینکم هەردەستاند لە گەرمەلانێ، جۆتە تاژیەکی شلکەی چار پەل بە خەنەی گێ ریشۆرم بەر دەدانێ، سەرەکیان دەبردەوە بەرد و بێ بەردی، هەورازی قەلەمان لە منی غەریب و مار وێران دەگرتەوە دەو بەستێرەی گۆرانان، لە عەردیان دەداوە لە بن گومەتەکەی میرەمە دیانێ.**

### بێرکۆت

ناوی گوندێکە دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی شاری هەولێر سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی شاوێس، پیرزین، کەرک، شارۆچکەی عەنکاوە، شاری هەولێر لە سەر یێکە و شاری هەولێر چۆل و هۆل بوو هەنووکە شار زۆر گەورە بووە بێرکۆت لەگەڵ شار تێکەڵ بووە، ئاقارێکی کەمی ماوە جاران لە گرد و تەپۆلکە و شانەی بیرکۆت ی کەرویشک و مامز دەدیتران، بێرکۆت گوندێکی کۆنە زۆر گەورە نەبوو ژمارەی دانیشتوانی گوندەکە بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (١٢٥) کەس بووە شاعیری گەورەی کورد (د. عەبدوڵڵا پەشێو) لەو گوندەی لە دایک بووە و خەڵکی ئەو گوندەیە.

### پیرزین

ناوی گوندێکە دەکەوێتە باکوری شاری هەولێر لە سەرەوەی گوندی بێرکۆت سەر بە ناحیەی عەنکاوەیە ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (براغ، کەلەکان، بەحرکە، کەرک، بێرکۆت، شاویس، مەلائۆمەر) لە سەرییێکە.

(پیرزین) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە دوو وشە پێکهاتووە (پیر + زین) واتە لە (ناو+ناو) کاتی خۆی گوندێکی گەورە بووە ژمارەی دانیشتوانی گوندەکە بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (٣٥٤) کەس بووە لە ساڵی (١٩٠٨-١٩٠٩) خوالێخۆشبوو مامۆستا (عوسمان شەوەکی) مەلای ئەوێ بووە (مەلا شێخ محەمەدی تاهیری ئەتروشی) لەوێ لەلای خوێندووە پاشان مامۆستا عوسمان لەوێ باری کردووە چووەتە گوندی بەحرکەی بوویتە مەلای کاکلاغەی گەردی. پاش ئەوەی حکومەتی عیراق گوندەکانی سنووری چۆل کردوو گوندەکانی وێران کرد خەڵکەکەی هێنا لە شاوێس و پیرزین و مەلائۆمەر نیشتەجێی کردن و کردییە کۆمەڵگا.

### شاوێس

ناوی گوندێکە دەکەوێتە لە باکوری رۆژهەڵاتی شاری هەولێر. بە دەستە راستی رێگای هەولێر - پیرمام بەرامبەر گوندی پیرزینە سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کەلەکێن، پیرزین، بێرکۆت، کۆڵەکی گەورە، شاری هەولێر) لە سەرییێکە.

لە ساڵانی پەنجاکان ئەو گوندە (٢٥) ماڵێک دەبوون هەموویان عەشیرەتی میرەبەگی بوون، ژمارەی دانیشتوانی گوندەکە بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (٢٧٦) کەس بووە بەڵام پاش ئەوەی حکومەتی بەعس گوندەکانی سنووری چۆل و وێران کرد خەڵکی گوندەکانی دەڤەری باڵەکایەتی هێنا لە شاوێس و پیرزین نیشتەجێی کردن. هەنووکە زۆر گەورە بووە و بووەتە شار و چەندین قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی کوڕان و کچان و بنکەی تەندروستی و شارەوانی لێیە.

### لۆفەی خانزادی

لۆفەی خانزادی دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی شاری هەولێر لە سەرەوەی گوندی (مەلا ئۆمەر) هەڵکەوتووە دەرێن کاتی خۆی (خانزاد خانی کچی شاقوڵی بەگی کوڕی سلێمان بەگی میری سۆران لە هەریر) دوە هاتۆتە ئەو ناوەو لەو شوێنە کە هەنووکە لۆفەی خانزادی پێ دەرێن لە سەر ئەو زوورگە وچان دەگرێت و کەمێک دەحەسێتەوە، ئەو جێگایە دیمەنێکی جوان و دڵڕفێنی هەیە بە تایبەتی لە

کەژی بواراندا دەڕوانێتە دەو روباری بەستۆڕە و چیای پیرمەمی، دۆڵی بەستۆڕەی هەموو لێدیارە، کاتی خۆی لە ناو ئەو دۆڵە زوورگانە کانی و کانیاو هەبووە، جا لەو ساوە ئەو شوێنە بە خانزاد ناسراوە، کاتی دروستکردنی ڕێی سەرەکی هەولێر - حاجی ئۆمەران دەستی پێکرد کە لە مێژوودا بە ڕێگای هامیلتون بە ناوبانگە ڕێگاکە بە زوورگی (سێنک ـ سێلک ـ سێلق) تێدەپەڕێت، ئەو شوێنەی خانزاد بە لۆفەی خانزاد ناونرا، ئەو شوێنە لە کۆنەوە سەیرانگەی دانیشتوانی شاری هەولێر بووە، هەنووکە لە تەوقە سەری زوورگەکە (هوتێلی خانزاد) دروست کراوە، شوێنێکی خۆش و دڵگیرە. خانزاد خان لە کاتی حوکمی خۆیدا گەلێ قەڵا و مزگەوت و خوێندنگای دروست کردووە، لەوانە قەڵای خانزاد لە چیای بەنی هەریر ئەو قەڵایە کەوتۆتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ناحیەی هەریر هەنووکەش شوێنەوارەکە هەر ماوە،

**ئۆغسەر (ئوغسر)**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە سەر (زوورگی سێنک) ی لە دەو ڕووباری بەستۆڕەی لە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، گوندێکی کۆن نییە لە پاش ساڵی ١٩٥٧ ز ئاوەدان کرایتەوە، کابرایەکی خەڵکی گوندی (مەلائۆمەر) بە ناوی (حەمەدەمینە شەل) کە (مینە شەل)یان پێدەگوت باخچەیەکی لەو شوێنەی کە هەنووکە گوندی ( ئۆغسەر) ی لێ ئاوەدان کرایتەوە هەبووە، هەستاوە گوندی (مەلائۆمەر) ی بەجێهێشتووە لە نزیک باخچەکەیەوە خانوویەکی دروست کردووە بە تاقە ماڵە ئاوەدانی کردۆتەوە، پاشان ئەو بنەماڵە کوڕ و نەوە و نەوەزای لێ کەوتۆتەوە، هەنوکە بوودتە گوندێکی گەورە و دەکەوێتە بەرامبەر (لۆفەی خانزاد) ی جادە نوێیەکەی هەولێر- پیرمام بە تەنیشتییەوە دەڕوات، قوتابخانە و مزگەوتێکی خنجیلانەشی هەیە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (قەرەمان، براغ، مەلا ئۆمەر، کوڵەکی گچکە) لە سەرێتکە. لایەکیشی ڕووباری بەستۆڕەیە و خۆشی کەوتۆتە سەر ڕووبارەکە و لە سەر زوورگەکە هەڵکەوتووە. هیچ زەوییەکی کشتوکاڵی نییە تەنیا ئاقارەکەی زوورگ و پاوانە بۆ بەخێو کردنی مەڕ و ماڵات باشە.

**قەرەمان**

ناوی گوندێکە لە ناو دۆڵە (زوورگی سێنک) لە دەو ڕووباری بەستۆڕەی لە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە لە نزیک گوندی ئۆغسەریدایە بەلای ڕۆژهەڵاتیەوە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی ( براغ، ئۆغسەر، کوڵەکی گچکە، مەلا ئۆمەر) لەسەر ییێکە. لە لایەکیش ڕووباری بەستۆڕەیە، سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای ناوەندی هەولێرە، گوندێکی بچووک بووە ٢-٣ ماڵێک دەبوو.

(قەرەمان) ناوێکی داڕێژراوی کوردییە، لە (ناو+ پاشگری ان) پێکهاتووە (قەرەم +ان)، (قەرەم) بە مانای (قەمیش ) دێت، (ان) پاشگرە و نیشانەی کۆیە لە زمانی کوردیماندا کاتی خۆی ئەو ناوە و دەو ڕووباری بەستۆڕەی قامیشی یەکجار زۆر بووە، بۆیە ئەو شوێنە بە (قەرەمان) ناو نراوە و ناسراوە، لە پیاوە ناودارەکانی ئەو گوندە (مەلا حوسێن قەرەمان) ی بوو، ئەو مرۆڤ پاکە ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی هەبووە لە دەڤەرەکەدا بۆ کوردایەتی و بڵاو کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی، ژمارەی دانیشتوانی گوندەکە بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (١٩) کەس بووە، شوێنە جوگرافیەکانی (چاکی کڵاو ڕەش) و (هەورازی قەرەمان) کە لە زۆر لە حەیران گاسکردندا ناوی دێت.

**شا ئۆمەر**

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناو زوورگەکانی پشتی گوندەی پیرەشی سەر بە ناحیەی عەنکاوەیە، لە ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، گوندێکی کۆن نییە، کاتی خۆی ئەو ناوە زستانە هەواری ڕەوەند و کۆچەرەکان بووە دەهاتن پاوانیان لەو زوورگانە دەکری، خەیلانییەکان دەهاتن چەند بنەماڵەیەک لە هۆزی شێخ مەموند ی بە ڕەوەندی زستانان دەهاتنە بناری زوورگی پیرەش لەو ناوە دادەمەزران، بە تایبەتی بنەماڵەی (مەحمود ڕەوشەن) لەو شوێنەی کە هەنووکە (شائۆمەری) پێدەرێن (کاولگە) بووە واتە کاولە گوند بووە، لە ساڵانی حەفتاکانەوە لەو شوێنە دامەزران و ناویان لێنا

(شائۆمەر) هەنووکە ٢٠ ماڵێک دەبن، قوتابخانە و مزگەوتیان هەیە ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی ( پیرەش، کوڵەکی گەورە، شەرەبۆت) لە

سەرییەکە. هەنووکەش لەو ناوە بوویتە پەند دەرێن:
( بویتە مەڕی مەحمود ڕەوشەنی؟!) یان ( خۆ نەبوویتە مێگەلە مەڕی مارێ مەحمود ڕەوشەنی)

## کۆلەکی گچکە

٢ گوند بەو ناوە هەیە، هەردووکیان دەکەونە باکوری ڕۆژهەلاتی شاری هەولێر ئاقاریان لە سەرییەکە، لە ناو زوورگەکانی (سێنک) ی هەڵکەوتوون، یەکێکیان بە ناوی کۆلەکی گەورەیە ئەوی دیکەیان بە ناوی کۆلەکی گچکەیە سەر بە ناحیەی عەنکاوەن. ئاقاری کۆلەکی گچکە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی ( ئۆغسەر، مەلائۆمەر، قەرەمان، شەوەک، کۆلەکی گەورە، کەلەکێن) لە سەر یەکە.

گوندێکی گچکەیە لە عەشیرەتی (میرەبەگی – میران بەگی) نە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ ز (٥٦) کەس بووە، برا گەورەیان خوا لێخۆشبوو (عوسمان کۆلەکی) بوو پیاوێکی ئازا و نەبەرد و چاو نەترس بووە لە ناوچەکەدا.

## کۆلەکی گەورە

ناوی گوندێکە لە ناو زوورگەکانی (سێنک) لە باکوری ڕۆژهەلاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (پیرڕەش، شەرەبۆت، شاوێس، شائۆمەر، کۆلەکی گچکە) لەسەر یێکە سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە. هەنووکە ئەو گوندانەی بناری ئەو زوورگانە سەر بە ناحیەی کەسنەزانن.

دانیشتوانەکەی لە عەشیرەتی (زێدبەگی)نە، ئەو عەشیرەتەش کاتی خۆی لە باکووری کوردستانەوە هاتوون لە بنار و ناو دۆڵە زوورگەکانی سێنک ی گوندەکانی (شەرەبۆت و بانەمان و کۆلەکی گەورە) نیشتەجێ بوونە، ژمارەی دانیشتوانی بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ (١٤٧) کەس بوونە ناوی (کۆڵەک) ناوێکی داڕێژراوی کوردییە، لە (ناو + پاشگری ە ک) پێکهاتووە (کۆل + ە ک)، کاتی خۆی خەڵکەکە مەڕدار بوونە و لە ناو ئەو زوورگانە ڕەشماڵ نشین بوونە، لەو شوێنە (کۆل) یان بۆ ئاژەڵەکانیان دروست کردووە، کۆل یش جاران قەدی داری گەورەیان دەینا ناوەکەیان دەردەینا ئاویان تێ دەکرد پاشان مەڕدارەکان لەو شوێنە دامەزران ناویان لێنا کۆلەک ئەو شوێنەی کە (کۆلەکی گەورە)ی لێ بوو ناونرا کۆلەکی گەورە، ئەوی دیکە ناونرا (کۆلەکی گچکە).

## سێنک ـ سێلک

ناوی زنجیرە زوورگێکە دەکەوێتە باکور و باکوری ڕۆژهەلاتی شاری هەولێر، لە سەرەوەی گوندی (بەریبیتانی گچکە) و (قەرەمورتکیان) لە دەو بەستۆرە دەست پێدەکات بەرەو ڕۆژهەلات دەکشێت و بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە بەرامبەر دەربەندی گۆمەسپان ی زوورگی سێنک ی پێدەرێن. ئەو گوندانەی خوارەوە کەوتۆتە ناو دۆڵە زوورگەکانی (زوورگی سێنک) ی گوندەکانیش ئەمانەن (مەلائۆمەر، قەرەمورتک، براغ، شائۆمەر، قەرەمان، شەوەک، کۆلەکی گەورە، کۆلەکی گچکە، گوندی ئۆغسەر) یش کەوتۆتە سەر زوورگەکەی، بەرامبەر (لۆفەی خانزاد)ییە. بەرزترین شوێنی ئەو سەرە زوورگە (سەری تارینان)ە، بەرامبەر گوندی گراو و سەری ڕەش، سەری تارینا لە ساردی بەربەرەکانی چیای سەفین و سەری ڕەش دەکات هەر کە لە چیای سەفین بەفر ببارێت (سەری تارینانیش) بەفر دەگرێت و بەفری لێ دەکەوێت. تەنانەت لە ناوچەکەدا گوتنەک هەیە دەرێن: سێنکی گۆتە سەفینی، یاخوا عەمرت نەمینی، لە جیاتی توو بم سواری ڕەقەکەم لە سەر زینی. گوندی پیرڕەش دەکەوێتە بنارەکەی ئەو زوورگە لە سەرەوەی گوندی مام چۆغان دەبێتە نیوەکەوانە و بەرەو خوارووی ڕۆژهەلات دەبێتەوە لەوێ لە سەرەوەی گوندی کەسنەزانی (زوورگی کەسنەزان)ی پێدەرێن، گوندەکە کەوتۆتە بناری زوورگەکە، ئەو گوندانەش کەوتوونەتە ناو دۆڵە زوورگەکان وەکو (مام چۆغان) لە سەرەوەی گوندی (کانی شاوێردی)یە، لە دەستە چەپی ڕێگا سەرەکییەکەی لە هەولێرەوە دەچینە کۆیێ، کانی سەگان، کانی گەلی، شەرەبۆتی گەورە، شەرەبۆتی گچکە، ئەو زوورگە بەرەو خوارووی شاری هەولێر دەکشێت (زوورگی زەرگەتە)ی پێدەرێن، لەگەڵ زوورکی بیستانە و دوشیوان دەبنەوە یەک دەچێتەوە سەر زێی گچکە دەو زێی پردێ هەر لە سەرەوەی گوندی بیستانەی زوورگەکە لقێکی بۆ ڕۆژهەلات دەکشێت بەرەو (ڕوولکە) و (سەید عوزێر) هەتا دەگاتە ئازیانە، گردەسۆر، قەشقە، خوڕخوڕ و سەر زێی لە سەرەوەی بیستانەی (سەری گیرەی ڕەش)ە.

هەندێ کانی و ئاو و شوێنە جوگرافیەکانی ئەو زوورگەی لە کەرخی کەسنەزاندا (کانی دلۆپەی، کانی گەنی، کانی شاوێردی، هەورازە نەفتە، بەردەباز، شاخی سەقەران، کۆرتی هەمەوەندان، کانی سەگان، دۆرەخانێ).

هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە دەرێن وشەی (سێنک) لە (سێلک ـ سێلق)ەوە هاتووە، بە عەرەبی پێیدەرێن (جبل السلق).

ناو و شوێنە جوگرافییەکانی (زوورگی سێنک)ی رەز و باغ و چاکی (شێخ زەینەل)، ئەم رەز و باغە لە ناو دۆڵە زوورگەکانی دۆڵی سێنکی هەڵکەوتووە، لە دەو رووباری بەستۆرەی، بەرانبەر بە گوندی (دۆنگزاوە) ی چاکەکە لە بەرزاییە، رەز و باخچەکەش کەوتۆتە دۆڵەکەوە، جاران باخچەیەکی جوان و شوێنێکی خۆش و دڵرفێنی هەبوو، کانیاوێکی لێ هەڵدەقوڵا، ئاوێکی شیرین و سازگاری هەبوو باخچەکەیان پێ ئاو دەدا. باخچەکەش هەنار و هەنجیری زۆری هەبوو، بنە دارگوێزێکی تێدابوو، دەربارەی ئەو شێخ زەینەلە، هیچ زانیارییەکمان بە دەستەوە نییە بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم پیاوە پیاوێکی خێرخواز و پیاو چاکێک بووە لەوناوە، لە دوای مردنی لەوێ نێژراوە و مەرقەدەکەی خەڵک بۆ زۆر مەبەست زیارەتی دەکەن.

بیری عەودالی ناوی بیرێکە لە سێنگی زوورگی (سێنک)ی دایە، بە لای (سەری تارینان) دوە هەڵکەوتووە و ئاوێکی شیرین و سازگاری هەبوو لە بەری دەرۆیشت، جاران رەز و باخی هەبوو.

### کەسنەزان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر، لە بناری زوورگەکە هەڵکەوتووە، کە (زوورگی کەسنەزان) ی پێ دەرێن لە سەر جادە سەرەکییەکەی هەولێر ـ کۆیە (١٠) کم لە شاری هەولێرەوە دوورە، کەسنەزان کاتی خۆی گوندێکی بچوک بووە زۆربەی دانیشتوانەکەی خەڵکی گوندی پیر رەش بوون. کاتی خۆی بنەماڵەی فارساغا ماڵی حاجی عەلۆی خورشیدی شێخ وەسمان ی گوندی (پیرەش) و بەشێکی گوندی (کەسنەزان) یان لە بنەماڵەی (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) کرِیبوو سەردەمێک (حاجی عەلۆ) ماڵی بردبووە گوندی پیرەشی، پاشان بووە ناخۆشی لەگەڵ گەردییەکاندا، حاجی عەلۆ هەستا ئەوێی بەجێ هێشت گەراوە گردعازەبان. لە ساڵی ١٩١٧ ز لە شەرێکی ناوەخۆیی لەگەڵ بنەماڵەی بایزی کوژرا، ئەو بەشەی گوندی کەسنەزانی لە سەر سمایلی کوری تاپۆ کردبوو، بە (کەسنەزان سمایل) دەناسرا کەوتبووە دەستە چەپی رێگاکە کە دەچووین بۆ کۆیە، لایەکەی دیکە بە دەستە راست (کەسنەزان عەلی پاشا)یان پێدەگوت، هەر گوندەک ببووە دوو بەش و دوو گەرەک، ئاقاری گوندی (کەسنەزان سمایل) لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (حەسارۆک، کەسنەزان پاشا، شەرەبۆت، یوسف ئاودەل، شاری هەولێر) لە سەر یێکە، لە ساڵی ١٩٧٥ ز کەسنەزانم دیت ٦-٧ ماڵێک دەبوون لە سەرەوەی گوندی کەسنەزان کارێزەکی گەورە هەیە ئاوێکی زۆری هەیە (کارێزی کەسنەزان) ی پێدەرێن، ئاوەکەی دێتە خوارەوە شینایی لە بەر دەکرێ لە کۆتایی ساڵی حەفتاکان حکومەت گۆمێکی گەورەی لە بەردەم دروست کردبوو، ئاوەکەی لەبەر دەرۆیشت بە مەبەستی ئەوەی بیکاتە شوێنێکی گەشت و گوزاری و گازینۆیەکی لێ دروست کرد بەڵام کارەکە نەکراو سەری نەگرت ئەو گۆمە هەنووکەش هەر ماوە لە زیان بەولاوە هیچ سوودێکی لێ نەکەوتەوە، ژمارەیەکی زۆریش لە گەنجان کە دەچوون بۆ مەلەوانی ساڵانە لەو گۆمەیدا خنکاون.

ئاقاری (کەسنەزان عەلی پاشا) ش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (حەسارۆک، کانی گەنی، کانی شاوێردی، مام چۆغان، کەسنەزان سمایل، شەرەبۆت) لە سەریێکە.

ژمارەی دانیشتوانی کەسنەزان سمایل بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (٥٣) کەس بووە بەڵام هی کەسنەزان پاشا (١١٨) کەس بووە. دیارە ئەو کاتی واتە ساڵی ١٩٥٧ ز گوندی کەسنەزانی گەورە بووە.

### کانی شاوێردی

ناوی کانیاوێکە لە سەرەوەی (ئاوی دلۆپە ـ درۆپە) ی لە ناو دۆڵە زوورگەکانی (کەسنەزان) ی هەڵکەوتووە، لە پاشان لە ساڵانی حەفتاکان ١-٢ ماڵێکی لێبوو هەنووکە بوویتە گوندێک ١٠-١٢ ماڵێک دەبێت، بە گوندی کانی شاوێردی ناسراوە، سەر بە ناحیەی کەسنەزان قەزای دەشتی هەولێرە، خەڵکەکەی کاتی خۆی رەوەند بوون لە گوندی (کانی گەنی) دوە هاتوونەتە ئێرە و دامەزراون (کانی گەنی) کەوتۆتە رۆژئاوای ئاوی دلۆپەی. (هەورازە

نەفتە) ناوی هەورازێکە لە سەر ڕێگا سەرەکییەکەی هەولێر ـ کۆیەدایە، لە سەرەوەی گوندی (شاوێردی) لە ناو زووورگەکانی کەسنەزانی هەڵکەوتووە. بەرامبەر بە گوندی مام چۆغان، لە سەرەوەی هەورازە نەفتەش بە دەستە ڕاستی ڕێگاکە کە دەچێت بۆ کۆیە بە ٢ کیلۆمەترێک بەردەبازە.

### مام چۆغان

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناو دۆڵە زووورگەکانی (زوورگی کەسنەزان) ی بە دەستە چەپی ڕێگە سەرەکییەکەی هەولێر ـ کۆیە بەرامبەر (هەورازە نەفتە) هەڵکەوتووە. کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری هەولێر بە (١٢) کم لێیەوە دووره، جاران سەر بە عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی دەشتی هەولێر بوو، هەنووکە سەر بە ( ناحیەی کەسنەزان) ی قەزای دەشتی هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (شەرەبۆت، باخچە، بیۆکە، کانی گەلی) لە سەر یێکە، گوندێکی کەون نییە لە پاش ساڵانی شەستەکانەوە ئاوەدان کرایتەوە. خەڵکەکەی ڕەوەند بوون بە مەڕ و ماڵات بەخێو کردن خەریک بوون.

### کوڕتی هەمەوەندان

وشەی کوڕت بە مانای (قوڕت) دێت لە هەندێک ناوچە و دەڤەران لە ناو هەندێک لە هۆزەکانی کورد پیتی (ک) دەبێتە (ق) بۆ نموونە کوڕت = قوڕت، کاغەز =قاقەز، ئەمەریکا =ئەمەریقا.

خەڵکی ئەو بنار و زوورگەی دەرێن کوڕت، کوڕتی هەمەوەندان ناوی قوڕتەکییە کەوتۆتە ئاقاری گوندی شەرەبۆت ی نێزیک بەردەباز کاتی خۆی چەند تیپە سوارەکی سەر بە عەشیرەتی هەمەوەند فێر ببوون دەهاتنە ئەو قۆرتەی بۆسەیان دادەنا و خەڵکیان ڕووت دەکردەوە بە تایبەتی پێش شەڕی یەکەمی جیهانی، دەگێڕنەوە لە ساڵی ١٩١٢-١٩١٣ جارێکیان مام و برازایەک خەڵکی گوندی گەرۆتەی دۆڵی هیرانێ دەبن بە کاروان لە هەولێرەوە دەگەڕێنەوە لە نزیک (بەردەباز) لەو قۆرتەی چەند پیاوەکی هەمەوەند بۆیان لە بۆسەی دادەنیشن دەیانەوێ ڕووتیان بکەن و چەکەکانیان لێ بستێنن، مامەکە لە ترسان هەڵدێ برازایەکەی هەرچەندە مێرد منداڵ دەبێ هەڵنایێ لە پەنا بەردێک بۆیان دادەنیشێ دەست بە تەقە کردن دەکات و دووانیان لێ دەکوژێت و وا دەزانێ هەر ئەو دووەنە بە گورجی ڕادەکات و خۆی داوێتە سەر پشتی هێسترەکی بەڵام یەکێ لە هەمەوەندەکان تەقەی لێ دەکات و لە سەر پشتی ئێسترەکەی بەری دەداتەوە وا دەزانێ مردووە کابرای هەمەوەند گورج لاشەی برادەرەکانی لە هەسپەکانیان بار دەکات و ئەو ناوە بەجێ دێڵێ ئەسپ و زین و هێستری خۆشناوەکان بە خوینەوە دەگاتە گوندی گۆمەسپان، خەڵکی گوندی گۆمەسپان کە ئەو هەواڵەیان زانی چاویان بە زین و لغاوی هێستری بە خوین کەت دەچنە شوێنی ڕووداوەکە دەبینن کوڕەکە هەر ماوە بەڵام لە بەر ئەوەی خوێنێکی زۆری لە بەر چووبوو لە ڕێگا دەمرێ، مەیتەکەی ڕەوانەی گوندی سولاوک دەکەن بۆ ئەوەی (کێخوا جەردیسی سولاوک) بینێرێتەوە بۆ گوندی گەرۆتەی لەوەتی هەنگینێوە کە ئەو ڕووداوە لەو شوێنە ڕوویداوە بەو قوڕتەی دەرێن (کوڕتی هەمەوەندان).

### بیۆکە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناو دۆڵە زووورگەکانی (کەسنەزان)ی لە سەرەوەی ناحیەی (کەسنەزان) ی هەڵکەوتووە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کانی گەنی، کانی سەگان، مام چۆغان، باخچە، شاوێردی، بنەسراوەی گچکە) لەسەر یێکە کاتی خۆی سەر بە ناحیەی عەنکاوەی بوو بەڵام هەنووکە سەر بە ناحیەی (کەسنەزان) ی قەزای دەشتی هەولێرە بە موڵک هی بنەماڵەی حاجی رەشید ئاغای وەیسی ئاغای هەولێری بووە، ئەو بنەماڵەیەش لە بنەماڵە گەورە و ناودارەکانی شاری هەولێرن، حاجی رەشید اغا لەزەمانی عوسمانییەکاندا لە نێوان ساڵانی ١٨٩٩-١٩٠٤ دا سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە، بە رەسەن لە عەشیرەتی (مەموند)ن، لە ساڵی ١٩٣٩ ز مردووە و لە گۆڕستانی شێخی چۆلی بە خاک سپێردراوە، حاجی رەشید اغا دەکاتە باپیری شەهید (رەمزی نافیع) ە.

وشەی (بیۆکە) ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە (بی+ۆکە ) واتە (ناو + پاشگر) پێکهاتووە، (بی) مەبەست لە داری بییە (ۆکە)ش پاشگرە، ئەم پاشگرەش لە زمانی کوردیماندا بۆ بچووککردنەوەی ناو بە کاردێت،

کەواتە بیۆکە بە مانای دار بییەکی بچووک دێت کە لەو ئاقارەی بووە. کاتی خۆی ١-٢ماڵ بوونە لەو شوێنە دامەزراون خەڵکەکە ناویان لێناوە (بیۆکە) ئەم گوندە کانیاوی هەیە بەڵام ئاوی زۆر نییە باخچەی گچکە گچکەی هەیە.

### پیرەش

ناوی گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر، لە بناری زوورگەکە هەڵکەوتووە کە (زوورگی پیرەش)ی پێدەرێن، جاران سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بوو، لەم ساڵانەی دوایی کە لە پاش ئەوەی (کەسنەزان) بووە ناحیە، هەنووکە سەر بە ناحیەی (کەسنەزان)ی قەزای دەشتی هەولێرە کە مەڵبەندەکەی (بنەسلاوە)یە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (شەرە بۆت)، (کەسنەزان سمایل)، (سێبەردان)، لەسەر یێکە. (پیر رەش) ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە (پیر+ رەش) پێکهاتووە، واتە لە ناوێکی (ناو + ئاوەڵناو ) ئەو گوندە بە ناوی پیاو چاکێکەوە، ناونراوە. جاران لە زەمانێکی زووەوە لە ناو کوردەواری وشەی پیر بە ماناە سەید دەهات بۆ وێنە پیر شاهۆ مەبەست پیر خدری شاهۆ بووە، (پیر مەنسوور) لە پاشان بە (شێخ) و پیاو چاکان و خواناسانیش دەگوترا پیر لە دەشتی هەولێریێ دەرێن (چاک و پیر) کەواتە ناوی ئەو گوندە لە پیری رەش)ەوە هاتووە (پیررەش ) پیتی (ر)ەکە لابردراوە بۆ سووکی لە سەر زاران بووە بە پیرەش. هەنووکە گۆڕی ئەو پیاو چاکە لەوێیە بوویتە گۆڕستانێکی گەورە، خەڵکی ناوچەکە بۆ زۆر مەبەست زیارەت و سەردانی دەکەن.

لە خەڵکی ناوچەکە و ئەو زوورگ و بنارەم بیستووە دەرێن کاتی خۆی سێ برا بوونە بە ناوی شێخ پیربار کە هەنووکە مەرقەدەکەی لە ئاقاری گوندی پیرەشییە ئەو گوندە بە ناوی وی کراوە کە بە پیری رەش بەناوبانگ بووە و ناسراوە، ئەوی دیکەیان ناوی (پیر خدر) بووە گۆڕەکەی هەنووکە لە ئاقاری گوندی (کوڵەکی گەورەیە) ئەوی دیکەیان ناوی (شێمحەمەد) بووە گۆڕەکەی لە ئاقاری گوندی کەسنەزان لە نزیک کارێزەکەی. دەرێن کاتی خۆی ئەو سێ برایە لەو ناوە و لە بناری ئەو زوورگەی سێنک) و (کەسنەزان) و (پیرەش ) ژیاون. کاتی خۆی بنەماڵەی (حاجی عەلۆی قورشیدی شێخ وەسمان) گوندی پیرەشی کڕیوە، سەردەمانێک بنەماڵەکەی لەوێ بوو پاشان لەگەڵ گەردییەکان بووە ناخۆشییان، حاجی عەلی ئەوێی بەجێ هێشت. چووە گوندی گردعازەبان، لە ساڵی ١٩١٧ ز لە شەرێکی ناوخۆیی لەگەڵ بنەماڵەی بایزی کوژرا.

کاتی خۆی کە مانگی ئادار دادەهات مەڕدارانی ئەو دەشتە و بناری ئەو زوورگە گوندیان بەجێ دەهێشت و هەڵدەکشان بەرەو زوورگەکانی رۆژهەڵاتی هەولێر، لەو زوورگە و بنارەدا هەواری نوێیان دەگرت، رەشماڵیان لێ هەڵدەدا، هەوا خۆش دەبوو، گژ و گیا زۆر دەبوو، مەڕیان دەلەوەڕاند، لە هەندێ لە بەیتە فۆلکلۆرییەکانی دەشتی هەولێرێکەدا ناوی ئەو چاک و پیر و شوێنە جوگرافییانە هاتوون کە کاتی خۆی کابان و شەنگەبێرییە شۆخ و شەنگەکانی لە کاتی مەشکە ژەنیندا دەیان وت و هاواری ئەو چاک و پیرانەیان دەکرد.

فۆلکلۆر دەڵێت:

**مەشکە مەشکەی گارەشی، دەک مارە بابم مەشکێ**
**هاوار وە بەر پیرەشی، دەک مارە بابم مەشکێ**
**کابان روونی وە بەشی، دەک مارە بابم مەشکێ**
**بار دەکەین لۆ پیر خدری، دەک مارە بابم مەشکێ**
**خوایە مەرمان لێ نەمری، دەک مارە بابم مەشکێ**
**کابان گوناحی هەرناگری، دەک مارە بابم مەشکێ**
**بار دەکەین لۆ (جانداران)، دەک مارە بابم مەشکێ**
**رۆنی دەگرین بە باران، دەک مارە بابم مەشکێ**

دانیشتوانی ئەو گوندەش تیرە و عەشیرەتی جۆرا و جۆری تێدایە لەوانە (گەردی، زێدبەگی، برباس - بلّباس، شێخ مەموندی)

### سێبەردان

ناوی گوندێکە لە رۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، ٣کم لێوەی دوورە، جاران سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بوو هەنووکە سەر بە ناحیەی کەسنەزانییە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (حەسارۆک، پیرەش، کەسنەزان ئیسماعیل) لە سەرییێکە.

ناوی سێبەردان ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە ( سێ

+بەرد +ان) واتە لە (ئاوەڵناو +ناو+ئامرازی کۆکردنەوەی ان) پێکهاتووە، دەرێن کاتی خۆی سێ بەردی گەورەی لێ بووە بەڵام هەنووکە ئەو بەردانە نەماون بردوویانە، (١٣٠) ساڵێک لە مەوبەر بنەماڵەی فەقێ محمد سەر بە هۆزی برباس لە گوندی پیرەش بار دەکەن و دێنە ئێرە دادەمەزرێن و ناوی لێدەنێن سێبەردان بە ناوی ئاقارەکەی، کە لە کۆنەوە ئاقارەکەی هەر بە سێبەردان ناسراو بووە، دەرێن فەقێ محمدی باوکی کێخوا سابیری ئاوەدانی کردۆتەوە، هەنووکە نزیکەی (٧٠) ماڵ دەبێت. لە ساڵی ١٩٦٣ ز ئەو گوندە سووتاوە. تیرە و هۆزی جۆراو جۆری تێدایە لەوانە (برباس، نانەکەلی، گەردی، سیان) دانیشتوانی سێبەردان و کەسنەزان بە زۆری بە رەسەن خەڵکی گوندی پیرەش بوونە.

**بەحرکە**

یەکێکە لە گوندە هەرە کۆن و گەورەکانی ناوچەی بەرانەتی دەشتی هەولێر، گوندێکی کۆنە لە باکوری شاری هەولێر هەڵکەوتووە، سەر بە عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گردجوتیار، شێخەشەل، براغ، کەلەکان، تەل مووسەک، قەرەموورتک، گرد ئارەق، جێژنیکانی ئەبا بەکر، شەوزار) لە سەر یێکە، ئاقارێکی گەورە و فراوانی هەیە، کاتی خۆی ئاقاری گوندەکانی تەل مووسەک - کەلەکان - شێخەشەل لە ئاقاری گوندی بەحرکە جیا بوویتەوە.

با بزانین وشەی بەحرکە لە چییەوە هاتووە؟

(بەحرکە) وشەیەکی داڕێژراوی کوردیی عەرەبییە لە دوو برگە پێکهاتووە (بەحر) کە وشەیەکی عەرەبییە، برگەی دووەم پاشگری (کە) یە (بەحر + کە) واتە لە (ناو + پاشگر) پاشگری (کە) لە زمانی کوردیماندا بۆ بچوککردنەوە بەکاردێت بۆ نموونە، دەرێن: ئەحمەد دەبێتە: ئەحمەدکە، حەمەد دەبێتە: حەمەدکە یان پاشگری (ۆک) ئەحمەد + ۆک دەبێتە ئەحمەدۆک حەمەد +ۆک دەبێتە حەمەدۆک لە دەڤەری دزەییاتی هەولێرێکەدا ئەو پاشگرانە (کە - ۆک) زۆر بەکاردێت بۆ بچووککردنەوەی ناوان وەک حوسێن = حوسێنۆک -حوسە - حوسێنە -حوسێنکە، سمایل - سمایلۆک - سمە -سمکۆ -سمەکە.

مێژووی ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندە دەگەڕێتەوە بۆ پێتر لە (٢٥٠) ساڵ لە مەوبەر، لە ساڵی ١٩٨٧ مامۆستا بووم لەکۆمەڵگای بەحرکەی گەلەک جاران لە پیرە بە ساڵاچووەکانی دەڤەرەکە گوێبیست دەبووم دەربارەی گوندی بەحرکە و ناوچەکە دەیانگێڕایەوە کاتی خۆی بۆ یەکەم جار کابرایەکی مەڕداری گەردی ناوی (عەباساغا) دەبێت ناسراوە بە عەباسە شەل باپیرە گەورەی ئاغاکانی گەردییان بووە، بە مەڕداری لەگەڵ هەندێک لە خزمەکانی دەکەونە دەشتی بەرانەتی لە سەر کانی ئاوی بەحرکەی کانیاوێک بووە لەو شوێنەدا ئاوی لە بەر دەڕۆیشت ئاوەکە ئاوێکی زۆر بووە، لە شوێنێک خڕ ببووە و ببووە گۆمێکی گەورە، مەڕدارەکان ڕەشماڵیان لە دەوروبەری هەڵداوە و مەڕ و ماڵاتیان لێ ئاوداوە، بۆیە هەر لەو شوێنە و لە دەوروبەری کانیییەکە دامەزراون و بوویتە گوند و ناو نراوە بەحرکە واتە بەحرێکی گچکە بەهارانیش لە دەو رووباری بەستۆڕە و زوورگی شێمحەمەدە سوورە و زوورگی سێنک دەمانەوە، دەرێن ئاغاکانی گەردی لە ناوچەی شەمزینانی سەر بە ویلایەتی (چۆلەمێرگ) لە باکووری کوردستانەوە هاتوون و کەوتوونەتە ئەو دەشتە پان و پۆڕە و بناری (زوورگی سێنک) و دۆڵی بەستۆڕە گوندی (ئەشکەو سەقا) و گوندەکانی دەوروبەری تا دەگاتە دێگەڵە ئەوانە گەردی بوونە، گەردی سەرێیان پێ دەرێن یا گەردی بناری یان گەردی لای کەندێ ئەمانە سەر بە قەزای کۆیەنە. بەحرکە هەردەم مەڵبەندی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و بازرگانی و ئایینی دەشتی بەرانەتی و ئاغاکانی گەردییان بووە هەردەم لە ٢٠٠ ماڵ کەمتر نەبوونە سەرۆکیان) کاکلاغەی کوڕی شێمحەمەداغەی گەردی) بووە کە لەوێ دادەنیشت لە ساڵی ١٩١٠ کۆچی دوایی کردووە، هەر لە کۆنەوە ئەو گوندە قوتابخانە و خوێندنگەی ئایینی هەبوود، خوێندنگاکە لەلایەن خوالێخۆشبوو (مەلا عوسمان شەوەک)ی بەڕێوە دەچوو، ئەو بنەماڵەیە لە کۆنەوە لە زەمانی (کاکلاغەی) لە گوندی (شەوەک)ی نزیک مەلا ئۆمەرەوە کەوتوونەتە بەحرکەی، هەردەم قوتابخانەکەی جمەی دەهات، ژمارەیەکی زۆر لە زانا و مەلاکانی کوردستان لەو قوتابخانەیە بڕوانامەی زانستییان وەرگرتووە و گەڕاونەتەوە گوند و ناوچە و دەڤەرەکانی خۆیان، خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و گەل و ولاتیان کردووە، لە زانا و مەلا چاکەکانی ئەو دەڤەرەش مەلا محەممەد عومەر رەسول

بەربیانی، مەلا خدر بەحرکەی، مەلا ئەحمەد مەلا محمد شەوەکی لە زەمانی پاشای گەورەی میرنشینی سۆران ژیاوە، هەنووکەش مامۆستا مەلا تەیب و مامۆستا مەلا تاهیر عەبدوڵڵا سولەیمان لە زانایانی دەڤەرەکە و کوردستانن.

ئەم پارچە شیعرەی خوارەوەش یەکێکە لە شیعرە تەڕ و ناسکەکانی مامۆستا (مامۆستا مەلا تاهیری عەبدوڵڵا سولەیمان) کە تێیدا باسی قوتابخانە و خوێندنگا ئاینییەکانی کوردستان دەکات:

**ئەی دێ تاکەی دەناڵی    وا بەهار نوو بوویتەوە**
**دار و باری وشکی کوردان    سەرلەنوو شین بوویتەوە**
**هیمەتی بازووی دلێران    بۆ دەکاتن مەفتەنێ**
**خانی و کۆشک و قەڵات    باغ و باغچەی دادەنێ**
**هەر لە (ئەتروش) تاکو (بتوێن)    دەشتی هێرتێ و میرەدێ**
**ماوەتان و دیبەگە و    باقلان و چۆڕ و نۆدەهێ**
**هەم چورستان و بیارە    شێخ وەتمان و شانەشێن**
**کەسنەزان و شاقولاوە    وەک (حەیری) شانوشێن**
**هەر لە پشدەر تا قەراجی    بالەکان و خۆشناوەتی**
**لای بەڕانیان دەشتی هەولێر    لای خودایێ یارمەتی**
**ماوەران و بالیسان و    هەرتەل و پێنجوین لەگەر**
**وەک شەوەک و هەرشەم و بەحرکە    تا خەتە و جەلی و ئاغجەلەر**
**روستە و گرتک و زیارەت    هەم ڕەواندز و گڕاو**
**ئاکرەو ئامێدی و مائێ    وەک بریفکان و گەناو**
**بێ چریکەی بولبول بۆی    سونبولان هاشەی رووبار**
**لێ بخینن لێ سەماع کەن    لێ بنووسن سەت هەزار**

با بزانین خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا محەمەدی چروستانی) کە یەکێک بووە لە زانا بەناوبانگەکانی وڵاتی سولەیمانی کاتی خۆی لە ساڵانی ۱۹۰۹ تا ساڵی ۱۹۱۲ لە گوندەکانی هەولێر و دەوروبەرەکەی بە فەقێیاتی خوێندوویەتی لە تریەسپیان لەلای خوالێخۆشبوو (مەلا شێخ جەلال بەرزنجی) لە (دیبەگە) لە هەولێر لە مزگەوتی قەڵا. مامۆستا چروستانی لە لاپەڕەی ۸۵-۸۷ی کتێبەکەیدا بە ناوی (یاداشتەکانی منالی و بەشێکی سەردەمی فەقێیەتی) چیمان دەربارەی بەحرکەی بۆ دەگێڕێتەوە لە ساڵی (۱۹۱۱-۱۹۱۲ز) مامۆستا دەڵێت:

(لە هەولێر لە مزگەوتی مەلا فەندی لە قەلات لای مەرحوم مەلا عبداللە ی کوڕی حاجی مەلا حەسەنی بورهانی کە موستەعیدی ئەفەندی بوو دامەزرام، دەستم کرد بە (عەبدوڵڵا یەزدی) چەند مانگێک لە حوجرەکان بووین، بە ناو فەقێ بوو، برنجی مەلا بوو، رۆژێ پێش رەمەزان وتی کاکە حەمە فلان کتێبم لازمە لای (مەلا عوسمانی بەحرکە) هەیە ئەتوانی بچیت بۆم بهێنی؟ وتم: بەڵێ، چاکم کرد بەلادا هەیپێتم لێ کرد بۆ (بەحرکە) ناشارەزا، هەر بە پرسیار پێش نیوەڕۆ گەیشتمە ئەوێ، کاغەزەکەی مەلا عەبدوڵلام دا بە مەلای بەحرکە، پاش نوێژی نیوەڕۆیێ مەلا بە کوڕەکەی وت: بچۆ نان بێنە، کوڕە رۆیشت جامێ دۆ و چوار نانی هێنا، زۆریشم برسی بوو، ئەمما سێ نانم خوارد، نانێکم پارووی شەرم هێشتەوە، مەلا وتی بە کوڕەکەی: رۆڵە! ئەوە بۆیە ئەوەندەت نان نەهێنا کە میوانەکە تێر بخوات؟ ئەوە رۆنە کەرەمان بوو، بۆچی نەتهێنا؟ ئەوە بۆیە چوار نانت هێنا میوانەکە سیانی بخوا و یەکێکی بهێڵێتەوە، ئەنجا تفێکی لێ کرد و وتی کەر بە قوزی داکتدا ببا، پاش نیوەڕۆ گەڕامەوە بۆ هەولێر، کتێبەکەم هێنا بۆ مامۆستام، شەو ڕەمەزان بوو.

**چەند ناوێکی جوگرافی ئەو گوندە:**

(کەلەگەور) لە کەڵەکە گەورەوە هاتووە، بەو زوورگە و تەپۆلکانەی ئاقار و رۆژهەڵاتی گوندی بەحرکە دەگوترێت هەتا دەگاتە گوندی مەلا ئۆمەری ئەو زنجیرە زوورگانە لە گوندی (بەربیان و قەرەمورتک)ەوە لە دەو بەستۆرەی دەست پێدەکات پێ بە پێ بەرەو رۆژهەڵات دەکشێ) زوورگی سێنک)ی پێ دەڵێن (کەلەگەور) کەڵەکە بەردی گەورە گەورەی لێیە بۆیە ئەو ناوەیان لێناوە، گوندی (عەلەکان) کەوتۆتە ناو ئەو ئاقارەوە بۆیە بەو ناوە ناونراوە.

**مەلائۆمەر**

مەلائۆمەر ناوی گوندێکە لە باکوری رۆژهەڵاتی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، کەوتۆتە بناری زنجیرە زوورگەکانی سێنک لە ئاقاری مەلائۆمەری زوورگی مەلائۆمەری پێدەڕێن، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (پیرزین، کەلەکین، شەوەک، کۆلەکی گەورە، کۆلەکی

گچکە، قەلەمان، ئۆغسەر، براغ) لە سەر یەکە، دەگێرنەوە کاتی خۆی (٣) برا لە کوردستانی ئەودیو (کوردستانی رۆژهەلات) هاتوون کەوتوونەتە گوندی (دێرێ) حاجی مەحمود ناوێکیان لە گوندی دێرێ مردووە گۆرەکەی لەوێیە بە گۆرستانی حاجی مەحمودی بەناوبانگە. برای دووەمیان ناوی مەلا وەیس بووە لەگوندی هەرشەمی مردووە نزیک بەگوندی دێرێیە ئەوی دیکەیان ناوی مەلا ئۆمەر بووە، ئەو گوندە واتە گوندی مەلا ئۆمەر بە ناوی وی ناونراوە و ناسراوە، گۆرەکەی لەوێیە بەلام مێژووی هاتنیان و کەی بووە؟ ئێمە نایزانین. دانیشتوانی مەلا ئۆمەر کاتی خۆی هەموویان لە عەشیرەتی هەنارەیی بوون بەلام هەنووکە خەلکی غەوارەشی تێدایە گوندێکی گەورەیە. پاش ئەوەی لە سالی ١٩٧٨ حکومەتی بەعس خەلکی گوندەکانی دۆلی رۆستێ بە تایبەتی گوندەکانی (رۆست و گرتک و شیلانە و سومەریان) و دەڤەری بالەکایەتی هێنای لە کۆمەلگای مەلائۆمەری نیشتەجێ کردن، هەنوکەش هەر لێرە ماونەتەوە، کەمیان گەراونەتەوە ناوچەکەی خۆیان. ئەو گوندە هەتا سالەکانی هەشتاکانیش گوندێکی بچووک بووە، ژمارەی دانیشتوانی بە گوێرەی ئاماری گشتی سالی ١٩٥٧ ز، ١٠٠ کەس بووە بەلام هەنوکە گۆراوە و قوتابخانەی سەرەتایی کوران و کچان و ناوەندی و بنکەی تەندروستی تێدایە، گوندێکی گەورەیە.

## براغ

(براغ) یا (براخ) ناوی گوندێکە کەوتۆتە باکوری رۆژهەلاتی شاری هەولێر، لە ناو دۆلە زوورگەکانی (زوورگەکانی سێنک) هەلکەوتووە سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای ناوەندی هەولێرە. لە دەستە چەپی رێگا سەرەکییەکەی کە لە هەولێرەوە دەچین بۆ هاوینە هەواری سەلاحەدین هەلکەوتووە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەل ئاقاری گوندەکانی (قەرەمورتکیان، بەحرکە، پیرزین، مەلائۆمەر) لە سەرێکە، لایەکیشی بەستۆرەیە، بە مولک هی بنەمالەی شێخ مستەفای نەقشبەندی بووە، دەرێن ناوی براغ لە وشەی (پرباخ - پرباغ)ەوە هاتووە گوایە کاتی خۆی باخ و باخات و باخچەی زۆری هەبووە، وەختی شەست تا حەفتا سالێک لەمەوبەر بەفر و بارانێکی زۆر دەباری، وەکو هەنوکە نەبوو، هەنوکە کەش و هەواش گۆراوە، زوورگی سێنکی بەفرێکی زۆری دەگرت، ئاو و کانیاوی زۆر هەبووە، باخچەیان لە بەر دەکرد و پێیان ئاو دەدا، هەنووکەش ئەو گوندە کەم کەمە لێرەو لەوێ باخچەی گچکەی هەیە، بە تایبەتی هەنجیر و هەنار، جا وشەکە کە لە پرباخەوە بۆ سووکی لە سەر زاران سواوەو بووە بە (براغ). هەندێک دەرێن وشەکە تورکیە لە وشەی (بولاغ- بولاخ)ەوە هاتووە کە بە کوردی بە مانای (کانی - کانیاو) دێت، براغ گوندێکی کۆنە، لە زەمانی عوسمانییەکاندا هەر ئاوەدان بووە، خەلکی دەڤەرەکە دەرێن (براغ -براخ) چونکە لە دەوروبەری شاری هەولێر بە تایبەتی لە دەشتی هەولێر هەندێ ووشەی بە (غ) و (خ) دەخوێندرێتەوە وەکو لە وشەکانی غەم و خەم، باغچە - باخچە، باغ-باخ، داغ-داخ.

ئەو گوندە تیرەی جۆراو جۆری تێدایە لەوانە گەردی، میرەبەگی، هەنارەیی، ژمارەی دانیشتوانی بە گوێرەی ئاماری گشتی سالی ١٩٥٧ ز، ٣١٠ کەس بووە، دکتۆر عەبدوللا خدر مەولود خەلکی ئەو گوندەیە. لە پیرە بە سالاچووەکانی ئەو گوندەم گوێ لێ بووە کە کاتی خۆی ئەو شەرەی لە زەمانی کاکلاغای کوری شێخمحەمەداغەی گەردی (........ - ١٩١٠) کە لە نێوان هۆزی گەردی و تیرە و هۆزەکانی دزەییاتی روویدا لە زەمانی عوسمانییەکاندا لە سەر ئەو گوندە بووە، کە بە داخەوە ژمارەیەک لە رۆلەکانی گەلەکەمانی تیا چووە.

## کەلەکین

ناوی گوندێکە کەوتۆتە باکوری شاری هەولێر نزیکەی (١٠کم) لە سەنتەری شارەوە دوورە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەل ئاقاری گوندەکانی (شاویس،، پیرزین، مەلائۆمەر، کۆلەکی گچکە و کۆلەکی گەورە) لە سەرێکە کاتی خۆی کەلەچین شاویس یان پێدەوت.

## کەرک

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەرانەتی لە باکوری شاری هەولێر هەلکەوتووە، سەر بە ناحیەی عەنکاوەیە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەل ئاقاری گوندەکانی ( پیرزین، گردجۆتیار، بێرکۆت و کەلەکان و شارۆچکەی عەنکاوە) لە سەر یێکە، جێگایەکی بلندی هەیە شوێنەکەی تەپۆلکەیە و

بەرزاییــە دەڕوانێــتــە ئەو دەشــتــە پان و پۆڕ و بەرینەی بەڕانەتی، وشەی کەرک لە هەندێ شوێنی کوردسـتـان بە مانای قەڵا دێت، ئەو گوندە گوندێکی بچووک بوو (١٠) ماڵێک دەبوون ژمارەی دانیشـتـوانی بە گـوێرەی ئاماری گشـتـی سـاڵی ١٩٥٧ ز، ٧٠ کەس بووە، بە مـوڵـک هی بنەماڵەی (مەلا ئیسحـاق)ی هەولێری بووە، کە بە مەلا ئیسحاق ئەفەندی موفتی) بە ناوبانگ بووە، کە خواناس و زانایەکی گــەورەی شــار بووە، بۆیە لە زەمــانی عوسمانییەکاندا کردوویانەتە موفتی شار، مزگەوتێکی بچووکیـان لە گەڕەکی تەعـجـیل هەبووە هەنوکەش ئەو مزگەوتە هەر ماوە بە مزگەوتی موفتی بەناوبانگە لە پاش کۆچی دوایی مـەلا ئیـسحـاق، مـەلا عـبدالرحمن بوویتـە موفـتی لە سـاڵی ١٨٩١ - ١٨٩٢ ئەندامی ئەنجـومـەنی شکاتکار و بەڕێوەبردنی سنجەقی هەولێر بووە، ئەو مەلا عەبدولڕەحمانە دەکاتە باوکی عبداللە مفتی.

### شەوەک

ناوی گوندێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی گوندی مەلائۆمەر لە ناو زوورگی سـێنک هەڵکەوتووە سـەر بە ناحـیـەی عەنکاوەیە، ئاقاری ئەو گـوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (مـەلا ئۆمـەر، کـەلەکێن، کـۆلەکی گـچکە) لە سـەر یێکە، دەڕێن کـاتی خـۆی دانیـشـتـوانی گـوندەکـانی شـەوەک - مـەلائۆمـەر هەنارەی دەو بەسـتـۆڕەی لە گـوندی هەنارۆک هاتوون، ئەو گـوندەش دەکـەوێتـە ئوسـتـانی (ورمێ) لە کـوردسـتـانی رۆژهەلات / ئێران، کـە هاتوونە ئەو ناوە لە دەو بەستۆڕە لە بناری ئەو زوورگە دامەزراون، بە هەنارەیی دەناسرێن، خۆیان بە عەشیرەتی گەردی دادەنێن. لە بنەماڵە هەرە کۆنەکانی گوندی شەوەک، بنەماڵەی خوا لێخۆشبوو (مەلا عـوسمـان) شەوەکییە ئەو زاتە کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد کوڕی مەلا رەسول کوڕی مەلا ئەحمەدی کـوڕی مـەلا قـادرە، بە بنەمـاڵە مـەلا بوونە (مـەلازادەن) مـامـۆسـتـا (مەلا عـوسـمـان) لە کوردسـتـان لە زۆر شـوێنا خـوێندوویەتی تا دواجـار بڕوانامـەی زانسـتی لە کـۆیە لە خزمەت مەلا عـبداللە ی جەلیزادەوە ١٩٠٨ وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە دەبێتە مـەلای گوندی پیـرزین، بڕوانامـەیەکی تریشی لە شێخ ئەبو بەکری هەرشەمی وەرگرتووە، پاشـان خوالێخۆشبوو شێخ ئەبو بەکری هەرشەمی دەیننێرێتە گوندی بەحرکە ئەوکاتی (کاکلاغـای شێمحەمەداغەی گەردی) لە ژیاندا مـابووە شێخ نامـەی بۆ کاکلاغـا نوسـیـوە و دەڵێت: (ئەوا ئەو مـەلایە چاکـەم لۆ ناردی دەبێ زۆر حـورمـەتی بگری) کاکلاغەش زۆر حورمەتی دەگرێت و مەدرەسەی بۆ دادەنێت لە (بەحرکە) ی چەند ساڵێک لە بەحرکە مایەوە پاشـان چۆتە گـوندی گـردمـەلا ی ناوچەی قـوشـتـەپە لە ناو دزەییـان بوویتـە مـەلای مـەحـمـودی کـاکەخـانی، پاشـان گـەڕاوەتەوە بەحرکـە تا لە سـاڵی ١٩٣٠ ز کـۆچی دوایی کـردووە، لە گـوندی شـەوەک لە تەنیـشت باب و باپیـرانی نێژراوە (٣) کوڕی لە پاش بەجێماوە لەوانە مامۆستا مەلا عبداللە کە لە ساڵی ١٩٥٠ لە شاری مەککە کۆچی دوایی کردووە ئەوی دیکەیان مەلا سـابیـر بوو سێیـەمـیـان مـەلا محمد بوو ژمارەیەکی زۆر لە مەلایان و زانایانی ناوچەکە و دەڤـەرەکـانی دیکەی کـوردسـتـان لە بەر دەسـتی ئەو زاتە پێگەیشـتوون، مەلا ئەحمەدی باوکیشی لە زەمانی پاشای گەورەی رەواندز مەلایەکی زانا و دیاری ناوچەکە بووە.

### قەرەمورتک

قـەرەمـورتک یان قـەرەمـورتکیـان ناوی گـوندێکە لە دەشتی بەڕانەتی دەکەوێتـە سەرەوەی گوندی بەحرکە لە دەو ڕووباری بەستۆڕەی هەڵکەوتووە سەر بەناحیەی عەنکاوەی قـەزای ناوەندی هەولێـرە نزیکەی ٢٠ کم لە هەولێـرەوە دوورە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی تەلە مووسک، بەحرکە، براغ لە سەر یێکە لایەکیشی ڕووباری بەسـتـۆڕەیە. ئەو گـوندە گـوندێکی کـۆنە لە دەو ڕووباری بەستۆڕەی لە نزیک ئەو گوندەدا سەنحاریب مەلیکی وڵاتی ئاشـوور لەوێوە ئاوی خـواردنەوەی هێناوەتە ناو شـاری هەولێـر، ئەو پرۆژەیە بە پرۆژەی ئاوی سـەنحـاریب بەناوبانگە هەنووکـەش بەردەکـان شـوێنەواری هەر مـاوە، قـەرەمـورتـک ناوێکی کـوردی و تورکی لێکدراوە لە (نا و+ناو) واتە (قەرە + مورتک) پێکهاتووە قەرە تورکیە بە مـانای رەش دێت مـورتـک ناوی ڕوەکێکە کە سـاڵ (١٢) مـانگ سـەوزە بۆنێکی خـۆشی هەیە بۆ ناو لێنانی ئەو گـوندەش زۆر بیـر و بۆچوون هەیە هەندێک دەڕێن کـاتی خـۆی ئەو ناوە واتە دەو بەسـتـۆڕەی (ڕوەکی مـورتک) ی یەکجار زۆر بووە، هەندی بەژنی زەلامەکی دەبوو هەردەستا جـۆرە بەرێکی دەگـرت ڕەنگەکـەی ڕەش بوو بۆیە کـە ئەو

گوندە ئاوەدان بۆوە بە قەرەمورتک ناونرا، دانیشتوانی ئەو گوندە لە عەشیرەتی گەردینە بە مولک هی قادری مەجیداغەی بووە، کاتی خۆی جۆگەلەیەکی ئاویان لە دەو رووباری بەستۆڕەی لە نزیک ئەو گوندەی راکێشابوو بۆ بن گردی تەل موسەک ی ئاشی ئاوییان پێ دەگەڕاند، شوێنەواری کەونە ئاشەکە و جۆگەکە هەتا بەو ساڵانەی دواییش هەر مابوو.

## تۆبزاوەی گەردی

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ئەوبەری رووباری بەستۆڕە لە باکووری شاری هەولێر هەڵکەوتووە سەر بە ناحیەی سەلاحەددینە لە ناوچەی بەڕانەتیدایە، کاتی خۆی ٣-٤ماڵێک دەبوون. کوڕانی قادراغەی مەجیداغای گەردی لەوێ دادەنیشتن، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی دڕەش، بەربیان، پەرپیتان لە سەر یێکە، لەگەڵ ئاقاری قەرەمورتکیان و تەل موسەکی بەستۆڕەیان نێوانە، وشەی تۆبزاوەش ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە (تۆبز ئاوا) وە هاتووە لە (ناو + پاشگر) پێکهاتووە ژمارەی دانیشتوانی بە گوێرەی ئاماری گشتی ساڵی ١٩٥٧ ز، ١٣ کەس بووە.

## رەشکێن

ناوی گوندێکە لە گوندەکانی دەشتی بەڕانەتی کەوتۆتە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر لە سەر رێگا کۆنەکەی هەولێر -موسڵ بە دەستەراست هەڵکەوتووە، نزیکەی ٩ کم لە هەولێرەوە دوورە، گوندێکی کۆنە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی سێبیران و شەمعوناوە و عەنکاوە و شاری هەولێر لە سەر یێکە، وشەی رەشکێن ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (رەش + کین) هاتووە لە (ئاوەڵناو + ناو) (رەش)، بەهاران ئاوەڵناوە (کین) بە مانای (کۆن: کوین: رەشماڵ) دێت کاتی خۆی ئەو زوورگ و دەور و بەرە چۆڵ بووە، بەهاران لەو ئاقارەدا بە سەدان هۆبە رەشماڵ هەڵدەدران، مەرداردکان دەهاتنە ئێرە زوورگ بوو لەوەری خۆش بوو، خەڵکەکە بە مەڕداریەوە خەریک بوون بۆیە بەو شوێنە وتراوە رەشکێن لە دوورەوە ئەو زوورگە رەش دەچۆوە لە بەر هۆبە رەشماڵان، زوورگەکەش زوورگی رەشکینی پێدەرێن کاتی خۆی ئەو زوورگە لەگەڵ زوورگی نۆغەران مامز و کەروێشکی زۆر زۆر بووە هەندێ دەرێن رەشکێن لە (رەشکێر)ەوە هاتووە کورت کراوەی (رەش کێڵگە) یە لە بەر ئەوەی خاکەکەی رەش و بۆر خۆی دەنوێنێ بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە.

لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێر وا هاتووە:

**ئەستێرەکم لێ هەردێ، هەردێ لە سەر سەفینی**
**وەکی زەینی خۆم داێ، شەوقی دایە پیرزینی**
**ماری بابێ حەیرانێ، هەریاندا لە رەشکینی**
**بەژنی یارێ گچکۆکەی، کەتە ناو خانەی زینی**

## کەلەکان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەڕانەتی سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، کاتی خۆی لە ئاقاری گوندی بەحرکەی جودا بوویتەوە، بە مولک هی ئاغاکانی گەردیانە، تۆفیق ئاغای برای بایزئاغا لەوێ دادەنیشت، گوندێکی زۆر کۆن نییە ١٠-١٢ ماڵێک دەبن ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی پیرزین. کەرک، بەحرکە لە سەر یێکە، وشەی کەلەکان ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە وشەی (کەلەک + ان) پێکهاتووە (ناو + نیشانەی کۆکردنەوەی ان) پێکهاتووە کەلەک مەبەست لە کەڵەکە بەردە چونکە ئەو ناوە کەڵەکە بەردی گەورەی هەیە زوورگ و تەپۆلکەکانی رۆژهەڵاتی گوندی بەحرکە پێی دەگوترێت (کەرەگەور - کەلەگەور) کاتی خۆی ٢-٣ ماڵێک لە گوندی بەحرکە جیابوونەتەوە هاتوون لەو شوێنە دامەزراون پاشان ئەو گوندە بەکەلەکان ناو نراوە و ناسراوە، ژمارەی دانیشتوانی بە گوێرەی ئاماری گشتی ساڵی ١٩٥٧ ز، ٨٤ کەس بووە.

## کەلەکان - کەلەکێن

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەڕانەتی سەر بە ناحیەی عەنکاوە کاتی خۆی لە ئاقاری گوندی بەحرکە جیابوویتەوە، بە مولک هی ئاغاکانی گەردیانە، تۆفیق ئاغای برای بایزئاغا لەوێ دادەنیشت گوندێکی زۆر کۆن نییە ٦-٧ ماڵێک دەبن ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی پیرزین، کەرک، بەحرکە لە سەر یێکە، وشەی کەلەکان ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە وشەی (کەلەک + ان) پێکهاتووە (ناو + نیشانەی کۆکردنەوەی ان)

پێکهاتووە کەلەک مەبەست لە کەڵەکە بەردە چونکە ئەو ناوە کەڵەکە بەردی گەورەی هەیە زوورگ و تەپۆڵکەکانی رۆژهەڵاتی گوندی بەحرکە پێی دەگوترێت (کەرەگەور - کەلەگەور) کاتی خۆی ٢-٣ماڵێک لە گوندی بەحرکە جیابوونەتەوە هاتوون لەو شوێنە دامەزراون پاشان ئەو گوندە بەکەلەکان ناو نراوە و ناسراوە ژمارەی دانیشتوانی بە گوێرەی ئاماری گشتی ساڵی ١٩٥٧ ز. ٨٤ کەس بووە.

### شەمعوناوا

ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەرانەتی لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کانی قرژاڵە، سوێری، رەشکێن، شاری هەولێر، سێبیران لە سەر یێکە، وشەی شەمعوناوە وشەیەکی دارێژراوی کوردییە لە ٢ برگە پێک دێت برگەی یەکەم (شەمعون)ە برگەی دووەم (پاشگری ئاوا)یە لە (ناو + پاشگر) پێکهاتووە (شەمعون + ئاوا) ناوی ئەو گوندە لەوەوە هاتووە کاتی خۆی پیاوێک لە برا مەسیحیەکانمان ناوی شەمعون بووە مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبووە لەو ناوە دامەزراوە و ئاوەدانی کردۆتەوە، گوندەکە بە ناوی وی کراوە و ناسراوە، پاشگرای (اوە __ئاوە) دەلکێت بە دوای ناوێکەوە لە کوردەواریدا ئەو جۆرە ناوانە زۆرن وا پیشان دەدەن کە ئەو کەسە لەو جێگە و گوند و گەرەکەی ئاوەدان کردۆتەوە، من بە دووری نازانم ئەو شەمعوناوە بە ناوی ئەو شەمعونە کرابێت کە برازای یوحنا هورمز بووە لە ساڵی ١٧٩١ ز چاوی بڕیبووە گوندەکانی دەوروبەری هەولێر و لە ئابی هەمان ساڵدا شەمعونی برازای ناردە ناوچەکە بیر و باوەری کاسۆلیکی لەو دەوروبەرەدا بڵاو دەکردەوە.

### قەلاچۆغان

قەلاچۆغان ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەرانەتی لەباکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، جاران سەربەناحیەی عەنکاوەی بووە بەڵام پاش ئەوەی کەلەک بووە ناحیە ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی دەشتی بەرانەتی خرانە سەر، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دارەبەن، گەزنە و خرابەدراو، گردەشێر و سێبیران گەورە، سێبیران گچکە، سمایلاوە، عەنکاوە) لە سەرییێکە بە شێوە ناوچەییەکەی دەشتی هەولێریێ دەرێن (قەراچۆغان - قەرانچۆغان) وشەی قەلاچۆغان ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە ٢ ناو پێکهاتووە (قەلا +چۆغان) واتە (ناو + ناو) قەلا بەشێوەی دەشتی هەولێر قەراتە بۆ نموونە دەرێن قەراتی هەولێر هەندێ جاریش بۆ کورتکردنەوە دەرێن قەرا، چۆغانیش ناوی روەکێکی خۆڕسکە کە لە کاتی خۆی لە جیاتی سابوون بەکار دەهات و کۆریان پێدەکرد، ئەو گوندە گردێکی توورەکەرێژی لێیە کە قەراتی پێدەرێن، لە دەور و بەری ئەو گردە و ئاقاری ئەو گوندەدا ئەو روەکە زۆر بووە بۆیە قەراتەکە و گوندەکە بەو ناوەوە ناونراوە و ناسراون، جاران چۆغان لە ناوچەی بەرانەتی یەکجار زۆر بووە بە تایبەتی لە ئاقاری ئەو گوندەدا کاتی خۆی سابوون و تایت نەبوو، تایت هەر نەبوو برا دیانەکانی عەنکاوە لە دەشتی بەرانەتیدا دەچوون ئەو گیایەیان دەکرد بە باران دەیان هێنایە دەشتی دزەییاتی و دەیانفرۆشت خەڵکەکەش دەیانکرِی ئافرەتان دەیانکردە سابوون لە کاتی جل شوشتن و کۆر کردندا وەکو تایت بە جلکانیان وەردەکرد کەفێکی یەکجار زۆری دەکرد بۆنێکی خۆشیشی هەبوو. ئەو گوندە بە موڵک هی ئەسعەدییەکانی هەولێری بووە، ئەسعەدییەکانیش چەند گوندێکیان لە دەشتی بەرانەتی هەبوو لەوانە (بەرحوشتر و قەلاچۆغان).

لە دەشتی دزەییاتیش ئەو گوندانەیان هەبوو (هەمزەکۆر، ئێلنجاغ، یەددقزلەر، قونیان، قەلا چۆغان) هی (عەبۆی تەها ئاغای ئەسعەدی) بووە، سەرووەختەکی لەوێ دادەنیشت. کاتی خۆی لە زەمانی عوسمانییەکاندا کاکلاغای شێمحەمەداغای گەردی لە سەرای هەولێر لە قەلاتێ حەپس دەبێت، عەبۆ ئاغا یارمەتییەکی تەواوی مەجیداغا و جەمیل ئاغای کوڕانی کاکل ئاغای دا بۆ رزگارکردنی کاکل ئاغا.

### چالوک (چاروک)

چالوک (چاروک) ناوی دوو گوندانە لە ناوچەی بەرانەتی دەشتی هەولێر هەڵکەوتووە ئاقاریان لە سەریەکە، چالوکی گەورە ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کەورەبەن، جدیدە زاب، تۆبزاوە زاب، گردەرەشە زاب، چالوکی گچکە) لە سەر یێکە، هەردوو گوندی چاروک کەوتوونە دەستە چەپی رێگا سەرەکییەکەی لە هەولێرەوە

دەچن بۆ کەلەک. لە دوورەوە مەخفەری پۆلیسی چاروکی گەورە دیارە. ناوی (چاروک) لە چاراو - چالاو هاتووە زەوی زار و ئاقارەکەی بەرزی و نزمی هەیە کاتی خۆی لە کەندەکانەوە زەوییان هەڵکۆڵیوە وەکو چالاویان لێ کردووە ئاویان لەوێ هێناوە، هەر لەو دەوروبەرە دامەزراون ئەم چاراوانە بووە بە چاروک، چالوک بە یارمەتی پاشگری (وک) کە نیشانەی بچووککردنەوەی ناون لە زمانی کوردیماندا کەواتە وشەی (چاروک، چالوک) بە واتای چاراوکی گچکەوە دێت. کەواتە وشەی چالوک (چاروک) وشە یا ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە (چاڵ + پاشگری ۆک) پێکهاتووە (ناو + پاشگر) پاشان لە رۆژاوای چالوکی گەورە گوندێکی دیکە بە ناوی چاروکی گچکە ئاوەدان کراوەتەوە، ئاقارەکەی لەگەڵ (چاروکی گەورە، گردەرەشە زاب، هەنجیرۆک، مەلا عمر، دێرەبیش براغ، چەمە دوبز) لە سەر یەکن. بە موڵک کاتی خۆی هی بنەماڵەی مەلا فەندی بووە لە چلەکاندا بنەماڵەی حاجی صادقی خەزنە کڕیویانە. ئەو پیاوەش پیاوێکی هۆشمەند و لێوەشاوە و خێرخواز و دەوڵەمەند و دیار بووە لە دەشتی شەمامکی، مەڕ و ماڵاتێکی یەکجار زۆریان هەبووە ژمارەی مەڕەکانی خۆی لە (٢٠٠٠) سەر مەڕ داوە بە مەرداری و کشتوکاڵیەوە خەریک بووە بە تایبەتی ڕەسەنایەتی مەڕی حاجی صادقی خەزنەی لە دەشتی هەولێر و هەموو کوردستاندا بە ناوبانگ بووە هەنووکەش لە دەشتی هەولێر و دەڤەرەکەدا مەڕێکی باش ببینن دەڕێن: دەڕێی لە ڕەسەنی مەڕی حاجی صادقی خەزنەیە، یان بوویتە مەڕی حاجی صادقی خەزنەی، یان خۆ لە ڕەسەنی مەڕی حاجی صادقی خەزنەی نییە. ئەو بنەماڵەیە لەگەڵ خزمەکانیان توانییان ئەو گوندانەی خوارەوە بکڕن و هەندێ لە خزمەکانی خۆیان لێ دابنێن، ئەو گوندانەش ئەمانە بوون (چالوکی گەور دو گچکە، دوستەپە، شیوەڕەش، خەبات، کەلەک، مامەلۆک) خوالێخۆشبوو (حاجی جەمیل) دەهامی کوڕی لە گوندی چارەکی گەورەی دانابوو، ماڵ و دیوەخانەکەی لەوێ بوو، پیاوێکی دیار بوو، ژمارەی دانیشتوانی چاروکی گەورە بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز ١٤٨ کەس بووە

**ئاغولان**

ناوی گوندێکە کەوتۆتە ناوچەی بەڕانەتی، لە دەو زێی بادینان (زێی گەورە ـــ سەروو) دایە لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، جاران سەر بە ناحیەی عەنکاوە بوو، بەڵام پاش ئەوەی خەبات بووە ناحیە ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی دەشتی بەڕانەتی کە سەر بە ناحیەی عەنکاوە بوون خرانە سەر ناحیەی خەباتی قەزای مەڵبەندی هەولێر. هەنووکە خەبات کراوەتە قەزا، ئاغولان گوندێکی کۆنە ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کەورگۆسک، گاینج، تۆبزاوە زاب) لە سەر یێکە لایەکیشی زێی گەورەیە، کاتی خۆی بەشێک لەو گوندە بە موڵک هی بنەماڵەی خوالێخۆشبوو (شێخ محمدی نەقشبەندی) ناسراو بە (شێخی چۆلی ١٨١٧ ز -١٨٩١) بووە، بەشەکەی دیکەشی هی بنەماڵەی مەلا فەندی بووە. شێخی چۆلی مەڕ و ماڵاتێکی زۆری لەو گوندە هەبووە، خەزوورەکەی ناوی سۆفی محمد خدر بوو سەرپەرشتی دەغڵ و دانەکەی بۆ دەکرد. ئەو بنەماڵەیە پێشتر لە گوندی (گاینج)ی نزیک ئاغولان دادەنیشتن پاشان لە سەر داوای شێخ ئەوییان بەجێ هێشت و گوازتیانەوە گوندی ئاغولان.

خوالێخۆشبوو (زولەیخا) کچی ئەو (صۆفی محمد)ە کە دەکاتە خوشکی (کێخوا عەلی - عەلۆ) خێزانی شێخ بووە، کوڕە تاقانەکەی (شێخ مستەفا........١٩١٢ ز) لەو ژنەی بوو، شێخ مستەفا گەلەک کەیفی بە ڕاو و شکار دەهات ناوە ناوە دەچووە ڕاوێ بۆ گوندی ئاغولانێ تەنانەت لە دوای مردنی باوکیشی خانووبەرەیەکی باشی لە گوندی ئاغولانی دروست کردبوو، (ئاغولان) چەمێکی چڕ و پڕی هەبوو، کەوتبووە دەو زێی (چەمی ئاغولان)یێان پێدەگوت، هەنووکەش لە دەشتی هەولێرێکەدا چەند پەندێک هەیە دەڕێن:

- **دەڕێی چەمی ئاغولانێیە.**
- **دەمنی چەمی ئاغولانێیە.**
- **بوویتە چەمی ئاغولانێ.**
- **خۆ نەبوویتە چەمی ئاغولانێ؟ !**

ناوە جوگرافییەکان و شوێنەوارەکانی ئەو گوندە:

(چاکی ئەسحابە ڕەش) قەبری پیاو چاکێکە خەڵکی دەڤەرەکە (چاکی ئەسحابەڕەشی) پێدەڕێن گوایە ئەسحابە بووە، گۆڕەکە غەرێکی بە بەرد لە دەورەی دروست کراوە بەرزاییەکەی مەترێک دەبێ، هەردەم خەڵکێکی زۆر لە

دەڤەرەکە و دەوروبەری دێنە زیارەتی بۆ راز و نیاز و زۆر مەبەستی دیکە، هەر لە نزیک ئەو چاکە کانییەک هەیە پێی دەرێن کانی ئەسحابە رەش ئەو کانییە جاران ئاوێکی زۆری هەبووە و لە بەری دەرۆیشت، ئاوەکە ئەوەندە زۆر بووە کردوویەتیە چەم کە بە چەمی ئاغولانی ناسراوە کە چەمەکە زۆر چڕ بووە، درندە و بەرازی زۆر بووە هەموو کەسێک نەیوێراوە خۆی لێ بدا. ئەو کانییەش هەر بە ناوی ئەو چاکە کراوە. ئەو چەمەش ئاوەکەی لە (زێی بادینان)ی کردیتەوە، کاتی خۆی شێخی چۆلی لە سەر ئەو چەمەی ئاشێکی ئاوی دامەزراندبوو هەنووکەش شوێنەواری ئەو ئاشە هەر ماوە (ئاشی حاجی عەباسی) پێدەرێن. هەنووکەش ئەو کانییە هیشک بووە و ئاوی نەماوە، لەوێ بیرێکی ئیرتوازی لێدراوە. (شێخی چۆلی) دوو ئاشی دیکەی ئاوێی هەبووە لە بناری چیای قەرەچووغی لە سەر ئاوی دەرماناوەی لە شارۆچکەی (مەخمور) ی لە دەشتی قەراجیدا.

ئاغولان هەنووکە بوویتە ٢ گوند (ئاغولانی کۆن) ژمارەی دانیشتوانی ٦٠ کەس بووە بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ ز هەر لە ئاقاری ئەو گوندە کاتی خۆی حکومەت چەند ماڵە هەرکییەکی لێ دامەزراند کە بە ئاغولان ئەسعەد ناسراوە و بوویتە گوند و نزیکەی ١٠ - ١٢ ماڵێک دەبن کاتی خۆی ئەو هەرکییانە لەو بەری زێی بادینانەوە کەوتوونە ئێرە و دامەزراون

### شیوەڕەش

(شیوەڕەش) ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی بەرانەتی، جاران سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بوو هەنووکە سەر بە قەزای خەباتە لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە. ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (افراز، شاخۆران، سەیدان، گاینج، خرابەدراو، کەورگۆسک) لە سەر یێکە لایەکیشی زێی گەورەی بادینانە.

وشەی شیوەڕەش ناوێکی لێکدراوی کوردییە (شیو + ە + رەش ) واتە لە (ناو + ئامرازی ە + ئاوەڵناو) شیو بە مانای دۆڵ دێت ئەو دۆڵەش خاکەکەی مەیلەو رەش خۆی دەنوێنێت بۆیە ئەو گوندە کە ئاوەدان کراوەتەوە بەو ناوە ناسراوە. ئەو گوندە کاتی خۆی هی بنەماڵەی مەلا فەندی بووە خوالێخۆش بوو حاجی صادقی مستەفای هەمزەی وسوو)ی ناسراو بە (حاجی صادقی خەزنەیی) کە دەکاتە باپیری وەزیری دادی هەرێمی کوردستان (کاک فاروق جمیل صادق)، ئەو پیاوە پیاوێکی لێهاتوو خێرخواز و دیار و دەوڵەمەند بوو لە دەشتی شەمامک و دەڤەرەکەدا هەستا لەگەڵ خزمەکانی ئەو گوندانەی خوارەوەیان لە بنەماڵەی مەلا فەندی کڕی، گوندەکانیش ئەمانە بوون:

(شیوە رەش، چاروکی گەورە، چاروکی گچکە، دوستەپە، مامەلۆک)

حاجی صادق هەستا لە هەر گوندێک خزمێکی خۆی لە سەر دانا و جێنشینی کردن. کاتی خۆی ژمارەیەکی یەکجار زۆری ماڵە جوولەکەی تێدا بوو، زیاتر لە نیوەی گوندەکە جوولەکە بوون، بە ئیش و کاری جۆلایی و خەمچییاتی و دروستکردنی کر واتە (قوماشی رانک و چۆغەر) دروستکردن خەریک بوون، کری شیوە رەش زۆر بەناوبانگ بوو.

### تۆبزاوە زاب

(تۆبزاوە زاب) ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی بەرانەتی، لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی خەباتی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، ئەو گوندە لە دەستە راستی رێگا سەرەکییەکەی هەولێر - موصل هەڵکەوتووە بەرامبەر بە گوندی چاروکی گەورە ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (ئاغولان، جدیدە زاب، گردەڕەشە، چاروکی گەورە، کەورەبەن، گاینج) لە سەر یێکە، لایەکیشی زێی بادینانە، ئەو گوندە نزیکەی ٣٠ ماڵێک دەبن بە زۆری دانیشتوانەکەی لە هۆزی بامەندن، ٥-٦ ماڵە هەرکیشی تێدایە ئەو هۆزەش بە زۆری لە ناوچەی کەندێناوە لە گوندی سێبیران و دەشتی قەراجێ لە گوندەکانی (لاسۆر، برایم باول، قەراتە سۆرانی بامەندان) نیشتەجێنە، لە هۆزەکانی دەشتی دزەییاتێن هەر لەوێوە کەوتوونەتە ئەو ناوەی هاتوچۆ و خزماتیان لەگەڵ دەشتی قەراج هەیە.

### ئیفراز

(ئیفراز) ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەو زێی گەورە - بادینان، لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە،

جاران سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بوو، هەنووکە سەر بە قەزای خەباتە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (مەمووندان، گردمامک، شیوەڕەش، رووباری بەستۆڕە، زێی گەورە) لە سەر یێکە. کاتی خۆی یێک گوند بووە پاشان لێک جودا کراوەتەوە بوویتە سێ گوند (ئیفرازی سەرێ، ئیفرازی خوارێ، ئیفرازی ناوەند) بیست ماڵێک دەبن وشەی ئیفراز بە مانای جیاکردنەوە دێت یا ئەوەتا بە مانای گیا و گۆل دێت، دەرێن وەختی خۆی لە ئاقاری گوندی گردمامکی جودا بووینەوە لە عەشیرەتی میرەبەگینە گوندەکانی (گردمامک، کەورەقەل، ئیفراز شاوێس، کۆلەکی گچکە) هەموویان لە عەشیرەتی میرەبەگینە،ئیافراز سەرەوەی زوورگە و شاخە، رەوەزی زۆرە، زوورگەکە زوورگی ئیفرازی پێدەرێن، کمال ئاغا گەورەیانە، ئیفراز شوێنێکی عاسێی هەیە، لە باکوریەوە رووباری بەستۆڕەیە کە لە باکوری رۆژئاوای ئەو گوندە لە زێی دەکاتەوە، رۆژئاواشی زێی گەورەی بادینانە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ ز ٨٣ کەس بووە.

**تەل مووسەک**

ناوی گردێکە کەوتۆتە ناوچەی بەرانەتی دەشتی هەولێرێ، سەر بە ناحیەی عەنکاوەیە لە سەرەوەی گوندی بەحرکەی لە نزیک رووباری بەستۆڕەی هەڵکەوتووە گردەکە توورەکە ریژە، کاتی خۆی ئاشێکی ئاوی لێ هەبوو، لە گوندی قەرەمورتکیانی دەو رووباری بەستۆڕەوە بە جۆگەلە ئاویان هێناوەتە بن ئەو گردە، شوێنەواری ئاشەکە و جۆگەلەکە هەتا ئەو ساڵانەی ئەم دواییەش هەر مابوو، لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا چەند ماڵێک لە گوندی بەحرکەی جودا بوونەوە و چوونەتە ئەوێ و لێی دامەزراون، گوندەکەش بە ناوی گردەکە واتە تەل مووسەک ناونراوە و ناسراوە، بنەماڵەی حاجی رەشید بەیتار لەوێنە، دانیشتوانی لە عەشیرەتی گەردینە، تەل مووسەک وشەیەکی لێکدراوی کوردی و عەرەبییە لە دوو ناو پێک هاتووە یەکەم (تەل) وشەکە عەرەبییە بە مانای گرد دێت، وشەی دووەم (مووسەک) ناوی مرۆڤانە، کەواتە (تەل + مووسەک) لە (ناو + ناو) پێکهاتووە. من وای بۆ دەچم پەیوەندییەک لە نێوان ئەو ناوە و (ئەبولحەسەنی کوڕی مووسەک)ی کوردی هەزبانی دا هەبێت، کە فەرمانڕەوای شاری هەولێر بووە، یا ئەوەتا بە ناوی (عزالدین مووسەک کوری چکۆ) کراوە. کە یەکێک بووە لە میرەکانی کورد و کوری خاڵی سولتان سەلاحەددینی کوری یوسف کوری ئەییوب بووە، ئەو پیاوە شۆڕە سوارێکی ئازا و کەڵە مێرد بووە، یەکێک لە شاعیرانی عەرەب بەم جۆرە مەدحی دەکات و دەڵێت:

**كل الانام عبيد    لموسك لجل چكو**

هەروەها گوندێکی دیکەش لە ناوچەی خۆشناوەتی دۆڵی هیرانێ کە پێی دەڵێن (کامووسەک) هەیە، سەر بە ناحیەی خۆشناوی قەزای شەقڵاوەیە، کەوتۆتە بناری چیای هەورێ، لە گوندی کۆلکە رەشەوە نزیکە. لەوانەیە وشەی کامووسەک لە کاک مووسەکەوە هاتبێ، لە هەندێ شوێنی کوردستاندا بە کاک دەرێن کا کورتی دەکەنەوە بۆ وێنە دەرێن: کاک عەلی = کا عەلی، کاک خدر = کا خدر، کاک رسول = کا رسول، کاک باییز -= کا باییز.

کاتی خۆی کە ئاشی ئاگر نەبووە ئاشەکانی کوردستان بە ئاوێ دەگەڕان، ئاشی ئاوییان پێدەگوت، خەڵک دەچوون (بەرد ئاش = بەرداش) یان لە گوندی کامووسەکی دەڤەری خۆشناوەتی دەبینا چونکە کارگەی بەرداشی هەبوو، هەموو بەردێکیش نابێتە بەرداش، چونکە بەردی تایبەتی دەوێت، ئەو جۆرە بەردانە لە هەموو چیایەک و شوێنێکدا نییە، بەردەکە ئاگردارە و بەتینە، وەستای کارامەی شارەزاو لێهاتووی دەوێت بیکاتە بەرداش، بەرداشی کامووسەکی لە هەموو بەرداشی شوێنەکانی دیکەی کوردستان باشتر بووە. هەروەها لە ناوچەی حاجی ئۆمەرانیش بەرداشیان دروست کردووە بەڵام نەگەیشتۆتە بەرداشی گوندی کامووسەکی خۆشناوەتی، کاتێک کە بەرداشەکە کەون دەبوو نزیکەی دوو ساڵێک کاری پێدەکرا ئەنجا دەوی کول دەبوو باش گەنمی نەدەهاڕی، بە ناچاری دەیانکردە دەستاڕ بۆ هاڕینی ساوار لە ماڵاندا بەکاریان دەبینا.

**قەفەر**

ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەو رووباری بەستۆڕە، لە باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، لە رۆژئاوای گوندی قەرەقاجین هەڵکەوتووە، هەنووکە قەرەقاجین

کراوەتە مەڵبەندی ناحیە و ئەو گوندانەی خراوەتە سەر، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گردەچاڵ، جێژنیکان ئەبوبەکر، مەندان، جێژنیکان ئەفەندی، شاخۆران) لە سەر پێکە لایەکیشی رووباری بەستۆڕەیە. دەربارەی ناوی قەفەر هەندێک دەڕێن ناوی قەفەر لەوەوە هاتووە کاتی خۆی ئەو ناوە قەفرا بووە واتە چۆڵ و هۆڵ بووە ئاوەدانی کەم بووە پاشان کە ئاوەدان کراوەتەوە ئەو ناوەیان لێناوە. بە موڵک هی بنەماڵەی هەولێرییەکان بووە، بەشێکی هی بنەماڵەی (سەید عبدالله اغای هەولێری بووە بەشەکەی تری هی بنەماڵەی (محمد علی مختار) بووە ئەو پیاوە لە زەمانی عوسمانییەکاندا لە ساڵی ١٨٩١ بەڕێوەبەری تاپۆی سنجەقی هەولێر بووە، کاتی خۆی ئەوان کڕیویانە پاشان فرۆشتوویانەتە بنەماڵەی (فەتاح اغای هەرکی) هەنوکە بیست ماڵێک دەبن، دانیشتوانەکەی لە عەشیرەتی هەرکینە (ئەکو) ی برازای فەتاح اغای هەرکی لەوێ دادەنیشێت. دانیشتوانەکەی بە کشتوکاڵ و مەڕدارییەوە خەریکن.

## دڕەش

(دڕەش) یان (دڕڕەش) ناوی گوندێکە دەکەوێتە ئەوبەری رووباری بەستۆڕەی لە بناری زنجیرە زوورگی (شێخ محەمەدە سوورە) هەڵکەوتووە، ئاقاری ئەو گوندەکەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (تۆبزاوەی گەردی، بەربیان، پەرپیتان، هەرشەم) لە سەر یەکە. لایەکیشی رووباری بەستۆڕەیە سەر بە ناحیەی سەلاحەددینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێر. لە بنچینەدا وشەکە (دڕڕەش) بووە بۆ سووکی لە سەر زاران بووە بە (دڕەش) پیتی (ڕ) قرتێندراوە وشەکە ناوێکی لێکدراوی کوردییە.. زەوییەکەی دڕ و ڕەنگی خاکەکەی مەیلە و ڕەش خۆی دەنوێنێ بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە و ناسراوە، لەوانەشە لە (دەر ڕەش) دوە هاتبێت بە واتای دەور و بەرەکەی ڕەشە، مەبەستی ڕەنگی زەوییەکەیە. کاتی خۆی بە موڵک هی بنەماڵەی ئاغاکانی گەردیان بووە، عەولا ی مەجیداغای کاکلاغەی لەوێ دادەنیشت پاشان فرۆشتوویانەتە ماڵی ئەسعەد فەتاح اغای هەرکی. هەنوکە دانیشتوانەکەی لە عەشیرەتی هەرکینە، مەحموداغای ئەسعەداغای هەرکی لەوێ دادەنیشێت و ژمارەی دانیشتوانی بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (٣٣) کەس بووە، هەنووکە گوندێکی گەورە و خۆش و دڵگیرە.

## بەربیان

دوو گوند لە دەشتی بەرانەتیدا بەو ناوە هەیە یەکێکیان (بەربیانی گەورە) ی سەرووی پێ دەڕێن کەوتۆتە ئەوبەری رووباری بەستۆڕەی، ئەوی دیکەیان (بەربیانی گچکە) خوارووی پێدەڕێن کەوتۆتە ئەوبەرەی رووباری بەستۆڕەی لە نزیکی گوندی قەرەمورتکیانە، کاتی خۆی یێک گوند بووە دوایی لێک جودا بووینەتەوە بوویتە دوو گوند بەرامبەر یەکترن تەنیا رووباری بەستۆڕەی لێکیان جیا دەکاتەوە. ئاقاری (بەربیانی گەورە) لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گەلیاوە، شێخان، هەرشەم، دڕەش، تۆبزاوە) لە سەر یێکە لایەکیشی رووباری بەستۆڕەیە. (بەربیان) وشەیەکی دارێژراوی کوردییە لە (بەر + بی + ان) پێکهاتووە واتە (پێشگر + ناو + ئامرازی کۆکردنەوەی ان) پێکهاتووە. ئەو شوێنە پێش ئەوەی ئاوەدان بکرێتەوە چەند دارێکی لێ بووە، دارەکانیش (داری بی) بوون کە خەڵکەکە لەوێ دامەزراون، عالەم گوتوویانە ماڵەکانی لە بەربییەکان تا وای لێ هاتووە بۆ سووکی سەر زاران بووە بە بەربیان، نموونەشمان لەو جۆرە ناوانە لە کوردەواریدا زۆرە وەکو (بەرتەکیە، بەرچەم، بەرزنجە) کاتی خۆی قەرەنی سمایلاغەی گەردی لەوێ دادەنیشت، دانیشتوانەکەی لە عەشیرەتی گەردینە.

## دەربەندی سەیدی خواروو

ناوی گوندێکە لە دەشتی زرارەتی، لەوبەری رووباری بەستۆڕەی هەڵکەوتووە، لەو یەک دوو ساڵەی دواییدا گوندی (قەرەقاجین) کرایە مەڵبەندی ناحیە و ناویان لێنا دارەشەکران، هەنووکە لەگەڵ گوندەکانی ئەو ناوچەیە خرانە سەر ئەو ناحیەیە گوندێکی نوێیە، کۆن نییە، ١٥- ٢٠ ماڵێک دەبن لە ساڵی ١٩٨٣ ز (سەید حوسێن) لە دەربەندی سەید تەهای گەورد کە دەربەندی سەرووی پێ دەڕێن بە تاقە ماڵ باریکردووە هاتۆتە ئەو پێدەشتە و لە دەو رووباری بەستۆڕەی ئەو گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە و ناویان لێناوە دەربەندی سەیدی خواروو یا دەربەندی سەید حوسێنی، هەندێ کەس حوسێناوەشی پێدەڕێن. پاشان

بەرەبەرە هەندێک لە ئامۆزا و خزمەکانی باریان کردووە و دەربەندی سەید تەهایان بەجێ هێشتووە و هاتوون دەوردیان لێ داوە لە ساڵی ۲۰۰۱ بە مەبەستی لێکۆڵینەوە چوومە ئەو گوندە ۱۵ - ۲۰ ماڵێک دەبوون، هەموویان ئامۆزا و خزمی یەکدی بوون. شوێنەکەی پێدەشتە و بۆ کشتوکاڵکردن زۆر لەبارە و پرۆژەی ئاو و مزگەوت و قوتابخانەیان هەیە، ڕێگای هاتوچۆی بەسەرەوەیە، ڕێگاکە قیرتاوە، گەلێک لە شوێنەکەی دیکەیان کە گوندی دەربەندی سەیدی سەروو بوو خۆشترە. چونکە ئەوێ دوور و لا چەپ و ڕێگای هاتوچۆی زۆر بە سەرەوە نەبوو، شوێنەکەشی هەڵەت و زەوی و زارەکەشی کەم بوو زۆر لە بار نەبوو بۆ کشتوکاڵ ئاویشی کەم بوو. کاک سەید حوسێن ئاوا باسی گوندە کۆنەکەی خۆیانی بۆ باس کردم، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کەپران، قەرەقاجین، لایەکیشی ڕووباری بەستۆرەیە) لە سەرێتکە، ئەو گوندە هەرچەندە لە ناو سنووری زراربیەکاندایە و کەوتۆتە دەشتی زرارەتی بەلام دانیشتوانەکەی سەیدن لە کۆنەوە ئەو بنەماڵەیە لەو دەڤەرە نیشتەجێ بوونە پیاوی ئازا و چاونەترس و سەرکردەی وەکو سەید حەسەنی ڕەشوانی لەو بنەماڵەیە کە کاتی خۆی لە زەمانی پاشای گەورەی ڕەواندزی میر محمد ڕواندزی ۱۷۸۳ تا ۱۸۳۷ ز میری میرنشینی سۆران، سەید حەسەن یەکێک بووە لە سەرکردەکانی لەشکری سۆران.

**سەروکانی**

سەروکانی ناوی گوندێکە دەکەوێتە کلکەی خوارووی زنجیرە چیای پیرمام لە بن چیایەکە هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینە. لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دارە بزمارە، دێرە، هەرشەم، شێخان) لە سەرێتکە، بە موڵک هی بنەماڵەی (مەجیداغای کاکلاغای گەردی)یە. کاتی خۆی لە گوندی دێرێ جودا بوویتەوە سەردەمێکیش ماڵی مەجیداغای لەوێ بووە پاشان مەجیداغا یەکێک لە کوڕەکانی لە سەر داناوە، دانیشتوانەکەی عەشیرەتی گەردی بوون، لە پاش مردنی مەجیداغای کوڕەکانی گوندەکەیان فرۆشتووەتە (عێلی هەرکی) ئیدی لە پاشان گەردییەکان ئەو ناوەیان بەجێ هێشتووە. هەنوکە نزیکەی بیست ماڵێک دەبێت، هەموو دانیشتوانی لە خێڵی هەرکینە.

با بزانین ناوی سەروکانی لە چییەوە هاتووە؟

سەروکانی وشەیەکی کوردییە هەندێک لە دانیشتوانی ئەو گوندە دەڵێن ناوەکە لەوەوە هاتووە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی گوندەکە ۲ کانی لێیە ئاوەکەی سازگارە بۆیە ناونراوە سەروکانی. هەندێکی دیکەیان دەڵێن لە سەرەوەی گوندی سێ کانی دیکە هەیە ئاوەکەی تاڕاوە واتە تاڵە و ناسازە بەکەڵک خواردنەوە نایەت کانی گەرمکی پێدەڵێن، زستانان ئاوەکەی گەرمە بۆیە ناو نراوە گەرمک ئەو کانیاوانەش گەورەن، کاتی خۆی ئاوێکی زۆری هەبوو ئاوی هەرسێکیان لە خوارەوەی سەرچاوەکانیان دەبنەوە یەک و بەچەمەکەی خوار گوندی دەچووە خوارێ هەتا نێزێک گوندی دێرێ دەڕۆیشت. وەختی خۆی برنج و شینایییەکی زۆری لە بەر دەکرا. جا وشەی سەروکانی لەمەوە هاتووە لە سەرچاوەی کانیاوەکانەوە، سەری کانییەکە، سەرچاوەی کانییەکە لەوێندەر دەردەبێت یا (سەر کانی)یەکە ئەوجا ئەم وشانە (سەرەکانی) (سەرکانی) بووە بە (سەروکانی) لە ناوچەی شەمدینان سەر بە ویلایەتی (چۆلە مێرک - هەکاری - حەکاری) دا گوندێکی دیکە بە هەمان ناو هەیە ئەویش هی عەشیرەتی گەردییەکانی تورکیایە. تۆ بڵێی ناوی گوندی سەروکانی لە ناوی گوندی سەروکانی کوردستانی تورکیاوە نەهاتبێ! چونکە ئاغاکانی گەردی دەشتی بەڕانەتی و ئەشکەوسەقای کۆیێ خۆیان دەڵێن (خالید)ین لە دەڤەری شەمدینانی باکوری کوردستانەوە کەوتوونەتە ئێرە، گوندێکی دیکەش لە دیوی سنووری باشووری کوردستان/ عێراق لە ناوچەی شێروان مەزن بە ناوی سەروکانی هەیە دانیشتوانی ئەو گوندە لە عەشیرەتی شێروانین.

**ناوی هەندێ لە گردەکانی دەوروبەری گوندەکە:**

(گردەشین - گردەسۆر - گردی عەولا خەیلانی) ئەو گردە بە ناوی کابرایەکی خەیلانی کرا ناوی عەبدوڵا - عەولا بووە، کۆچەر بووە، مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبووە لە سەر ئەو گردە ڕەشماڵی هەڵداوە بۆیە ئەو گردە بەو ناوە ناونراوە.

**میر ئاخوڕ (میراخوڕ)**

میراخوڕ ناوی گوندێکە کەوتیتە ڕۆژاوای

هاوینەهەواری سەلاحەدین، لە باکوری رۆژهەلاتی (دەربەندی سەیدان) هەلکەوتووە سەر بە ناحیەی سەلاحەددینە، میراخور ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە دوو وشە پێکهاتووە (میر + ئاخور) واتە (ناو + ناو) لە کوردەواری بۆ سووکی لە سەر زاران بووە بە میراخوڕ چونکە لە زمانی کوردیماندا ئەگەر پیتی (ء) پیتی بزوێنی (ا)ی لە دوای هات ئەوە پیتی (ء) لادەبرێت نموونەشمان لەو جۆرە ناوانە یەکجار زۆرە وەکو (ئاری ئاوا) بووە بە (ئاریاوە) (عەلی ئاوا) بووەتە (عەلیاوە) (میر ئاوا) بوویتە (میراوە). ئەو گوندە لە گۆرەپانێکی گەورە و فراوان هەلکەوتووە هەر چوار دەوری زوورگ و تەلان و تەپۆلکە و هەڵەت و هەڵدێرە، ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی ددربەندی سەیدی، هەرشەم، دێرێ، کاوانیان، سەرسول، قەپەکیان لە سەر یەکە، ددگێڕنەوە ددرێن کاتی خۆی میرێک لەو ناوە بووە مەڕ و ماڵات و وڵساتێکی یەکجار زۆری هەبووە ئاخوڕێکی زۆری لەو شوێنە دروست کردووە بۆ ئاژەڵەکانی بۆیە بەو شوێنە وتراوە ئاخوڕی میری پاشان وشەکە بووە بە (میرئاخوڕ = میراخوڕ). خێڵی هەرکی کە خێڵەکی کۆچەری گەورەی کورد بووە، هەر لە دێر زەمانەوە بەخێو کردنی مەڕ و ماڵات و کۆچەرایەتییەوە خەریک بوونە کوێستان و گەرمێنیان دەکرد، هەوار و کوێستانەکانیان بە زۆری لە رۆژهەلاتی کوردستاندایە، زستانە هەواریشیان هەر لە کۆنەوە دەو رووباری بەستۆڕە و ئەو زوورگ و هەڵەتانەی خوارووی رۆژاوای زنجیرە چیای پیرمەمی بووە، بە تایبەتی دەشتی زرارەتی و ناوچەی گەردیاتی بووە لە لیوای هەولێر بەلام لە دەڤەری بادیناندا لە دەشتی ناڤکوڕ لە گوندی (گردەسێن) ی سەر بە قەزای ئاکرێ لە پارێزگای موسل نیشتەجێ بوونە، هەنوکە (گردەسێن) ناحیەیە، هەواردکی عێلی هەرکی بە زۆری لە کوردستانی رۆژهەلات بووە لە دەڤەری مەرگەوەڕ و (تەرگەوەڕ) و (دەشتە بێڵ) و دەشتی براندیز و ناوچەی شنۆ و رۆژهەلاتی کێلەشین بووە وەکو (هەوار خاتوون، هەوار مامز، مێرگە زەر و مێرگە میر و هەواری کانی فاسکێ) کە کوێستانی زۆر سارد و دلڕفێنە دەکەوێتە سەر سنووری کوردستانی عیراق و ئێران، هاوسنوورە لەگەڵ دەڤەری برادۆست. سەرچاوەی (چۆمی گادەر) لەو کوێستانەو دەوروبەریەوە دەست پێدەکات و بە ناو خاکی ئێراندا تێدەپەڕێت لە باکوری کوردستانیشدا لە ناوچەی شەمدینان هەواری (چارچەل)یان هەیە کە بە ناوبانگە بە (چارچەلی هەرکییان) هەر لە کۆنەوە زستانە هەوارەکانیشیان لە باشووری کوردستاندا لە میراخوڕ و دەوروبەرەکەی بووە لەگەڵ دەشتی زرارەتی لەوێ پاوانیان دەکرێ. ئەو خێڵە لە پایزەکی درەنگ هەوارەکانیان لە کوێستانەکان بەجێ دەهێشت بەرەو گەرمێن دەبوونەوە بە کۆچەری دەهاتنە خوارێ بەرەو زستانە هەوارەکانیان لە کێلە شین ئاوای ئەو دیوە دەبوونەوە بەرەو سیدەکان لە ناوچەی برادۆست و بەرەو خوار دەبوونەوە لە (سەری بەردی) و ئەنجا (دەشتە دیانا) و هەندێ جار بە گەلی عەلی بەگ دەهاتنە سپیلکی خەلیفانێ و ئەوجا دەشتی هەریر و بە ناو سورچیان تێپەڕ دەبوون دەهاتنەوە مەڵبەندە سەرەکییەکەیان کە میراخور و دەوروبەرەکەی بووە. هەندێ جاریش نەدەهاتنەوە گەلی عەلی بەگ یەکسەر بە کەرخی باڵەکیان لە چیای برادۆست ئاوا دەبوون بە بن چاکی (پیری خەل) دەهاتنەوە خەلان لە (دۆری بیاوێ) لە پردی خەلان دەپەڕینەوە و دەهاتنەوە گوندەکانی (جۆنەرە) و (کانی کۆلک) و بە بەینی گوندەکانی (بەنۆک و سێناوە)ی تێدەپەڕین بە ناو عەشیرەتی سورچی دەهاتنە خوارێ لە چیای سپیلکی شۆر دەبوونەوە بەرەو دەشتی هەریر. ئەوجا میراخور لەو شوێنانە هۆبە و رەشماڵەکانیان لێ هەڵدەدا بە تایبەتی لە ناو دۆڵە زوورگەکانی زنجیرە (زوورگی غەیبی) و کلکەی رۆژئاوای چیای (پیرمەم) و زوورگی (شێرەسوار)ی و دەو رووباری بەستۆڕەی بە تایبەتی لە ئاقاری گوندەکانی دارەبزمارە و هەرشەم و دێرە و سەروکانی لە ناوچەی گەردیاتی و دەربەندی سەیدی و زیارەتی مەلازادان، یا ئەوەتا پاوانیان لە زراریان دەکری و پاوانەکانیان لە دەشتی زرارەتی لە گوندەکانی (خاروان و رەشوان و قەفەر و قەپەکیان و کودەری و هەبابان و گەروو دەلالان) هەبوون لەوێ بۆ ماوەیەک جێنشین دەبوون و هۆبە و رەشماڵەکانیان لێ هەڵدەدا، مەڕ و ماڵاتەکەیان لێ دەلەوەڕاند، سەرەک خێڵەکانیان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا واتا لە ساڵی ۱۹۰۰ دا (ئەحمەد خانی هەرکی) و (خورشید ئاغای کوری صادق ئاغای شێراغای هەرکی) بووە کە دەکاتە برا گەورەی (فەتاح ئاغای هەرکی)، (تاهیراغای هەرکی، نیعمەتاغای هەرکی)، خورشیداغا

مرۆیەكی چاو نەترس و ئازا بوو لەگەڵ سمایل ئاغای شكاك و دەستەیەك لە سەرۆك هۆزەكانی دیكەی كورد لە سەر داوای حكومەتی رەزا شای ئێران بۆ گفتوگۆ دەچنە شنۆیێ لەوێ عەجەمەكان پیلانێكی گەورەیان بۆ دارێشتبوون لە رێكەوتی (٢٢/٦/١٩٣٠) كەوتنە بۆسەیەكەوە سمكۆی قارەمان و چەند سەرەك هۆزێكی كورد شەهید بوون یەكێك لەوانە (خورشید ئاغا سادق ئاغای هەركی) بووە چەند كەسێكیش بریندار دەبن لەوانە (فەتاح ئاغا، عەزیز بیبۆی هەركی).

لە كوردستانی ئێرانیشدا خێڵی هەركی زۆرە بە تایبەتی لە سنووری ئۆستانی ورمێ لە دەڤەری تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ، ئەو دوو ناوچەیەش دەكەونە نزیك سنووری توركیا و ئێران، دەكەونە باكوری رۆژاوای شاری شنۆیە. ئەمەش ناوی هەندێك لە گوندەكانی تیرەی (مەندا= مەندان)ی سەر بە عەشیرەتی هەركییە، تیرەو بنەماڵەكانی هەركی لە كوردستانی گەورەدا ئەمانەن جگە لە مانە تیرەی تر هەنە:

سیدا (سیدان)، مەندا (مەندان)، سەراتی (سەرهاتی). ئەو گوندانە لە (دەشتە بێڵ) دایە كە كەوتووەتە نێوان شنۆ و مەرگەوەڕ، ناوی گوندەكان:

(سەنگەرا، بێرونە، بۆریا، بۆكە، چەپان، سیاوان، كانی سپی، گەلاس، مەلا عیسا، گرە كویر، دۆربە، سێ كانیا، شیوەبێرو).

ژمارەی دانیشتوانی گوندی میراخوڕ بە گوێرەی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ز (١٣٠) كەس بووە، لە ساڵانی حەفتاكان چەند ماڵێك لە میراخوڕی جودا بوونەوە گوندێكی دیكەیان لە خوارووی رۆژهەڵاتی وی ئاوەدان كردیتەوە ناویان لێناوە میراخوڕی گچكە. هەنووكە نزیكەی ١٥-٢٠ ماڵێك دەبن. كاتی خۆی ئەو ناوە هەمووی دەحل و دڕی بووە، درەختی قەرەقاجێن یەكجار زۆر بووە مەڕ و ماڵات نەیدەتوانی بە هەموو شوێنێكدا بڕوات بەڵام پاش پەیدابوونی تراكتۆر ئەو دڕك و داڵە نەماون و فەوتاون. هەركییەكان لە ناحیەی شێروان مەزن چەند گوندێكیان هەیە لە سەر سنووری عیراق - توركیا ئەو ناحیەیەش لە تۆمارگەكانی میری بە ناحیەی مزووری باڵا تۆمار كراوە و ناسراوە دەكەوێتە باكوری قەزای زێباری سەر بە پارێزگای هەولێرە، ناوی گوندەكانیش ئەمانەن:

(بێداو، هەركێ، ستونی- ستونێ، كێ، دری، ناوچەل، ئەودێل) ئەو گوندە نزیكەی سی ماڵێك دەبوون هەردوو گوندی بێداو و هەركێ بەشێكیان دەكەوێتە باكوری كوردستانی توركیا بەشەكەی دیكەیان دەكەوێتە باشووری كوردستانی عیراق (شیوی هەركی) لێكیان جودا دەكاتەوە، ئەو هەركییانە نیشتەجێن (هەركی بنەجێ)یان پێ دەرێن واتە نیشتەجێن و نایەنە خوارەوە بۆ گەرمێن (گەرمیان). ئەو گوندانەش لە باكوری گوندی (هەرگوش - ئەرگوش) هەڵكەوتوونە چەند گوندێكی دیكەیان لە دەڤەری شەمزینان‌دا هەیە لە سەرەوەی گوندەكانی دیكەیان كە دەكەونە ناو خاكی كوردستانی عیراقەوە لەوانە (بێگالتە، زەرن، هەرس، گەڤنە گوند)، مامۆستای نووسەر و هۆزانڤان هێدی لە وەرگێرانی كتێبی كورد و كوردستانی واسیلی نیكیتیندا لە لاپەرەی ٣٦٤-٣٦٥ دەڵێت: بە پێی ئەو داستانەی ناو كۆمەڵە چیرۆكەكانی خۆم كە لەمەڕ كوردان كۆم كردوونەوە باپیرە گەورەی ئەو هەركییانە پیاوێك بووە بە ناوی (بابەكر) كە لە ئازایەتی و چاونەترسی بە ناوبانگ بووە چوار كوڕی هەبووە سێ كوڕ لەو چوار كوڕەی بابەكر بە ناوی (مەندۆ، سەیدۆ، سەرهات، مام شێر) ئەوانەن كە سێ بەرەی عەشیرەتی هەركی ئەورۆ لەوان كەوتوونەتەوە ناوی وانی پێوەیە، بەو جۆرە مەندان كە ژمارەیان لەوانی دی زیاترە، سەیدان كە لە هەموویان ئازاترن، سەرهاتی.

#### هەرشەم

ئەمەش ناوی گوندێكە ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەكانی (شێخان، سەروكانی، دێرە میراخوڕ، دەرِەش، بەربیان، پەربیتان) لە سەر یەكە، گوندێكی كۆنە سەر بە ناحیەی سەلاحەدینە لە باكوری شاری هەولێر هەڵكەوتووە. دەرێن كاتی خۆی هی بنەماڵەی (شێخ ئەبوبەكری هەرشەمی هەولێری) بووە شێخ لەوێ لە دایك بووە پاشان بوویتە گوندی مەجیداغای كاكلاغای گەردی، دانیشتوانەكەی لە عەشیرەتی گەردی بووینە، بنەماڵەی شێخ ئەبو بەكری نەقشبەندیش هەر لە عەشیرەتی گەردی بوونە، لە پاش مردنی مەجیداغای گەردی ساڵی ١٩٥٣ ز منداڵەكانی ئەو گوندانەیان فرۆشتووەتە هەركییەكان وەك گوندەكانی (دێرە - دێرێ)، (هەرشەم، سەروكانی، دڕەش، بەشێكیش لە

گوندی شێخان) پاشان زۆربەی گەردییەکان ئەو گوندانەی سەرەوە و ئەو ناوەیان بەجێ هێشتووە، هەنوکە دانیشتوانی گوندەکانی (دێرە، هەرشەم، سەروکانی، درەش) لە عەشیرەتی هەرکین، کاتی خۆی سالّی ۱۹۳٦ ز هونەرمەند و لاوک زانی گەورەی کورد خوالێخۆشبوو کاوێس ئاغا (۱۸۸۹-۱۹۳٦) رەحمەتی لە قەزای شەقلاوەوە بە سەردان دێتە ناو هۆبە رەشماڵەکانی گوندی هەرشەم لە ناو خزمەکانی لە هۆبە رەشمالانی هەرکیان لە دەوروبەری هەرشەمێ دەسووڕایەوە لە ناکاو هەر لەوێ نەخۆش دەکەوێ و دەمرێ هەر لەوێش دەیشارنەوە، هەنووکە گۆڕەکەی لەوێیە دەرێن وشەی (هەرشەم) لە (هەر شەو) هاتووە. گوایا شوێنەکەی دارستان بووە و هەردەم سێبەر بووە بەلاّم ئەوەی راستی بێت هەرشەم شوێنەکەی نەوی نییە بەرزە پاشان زنجیرە چیای پیر مەم و زنجیرە زوورگی شێرە سواری تەواو لێ دوورن و ئەوە نییە بلّێیت پێشی گرتووە و رۆژی لێ نادا و سێبەرە، کاتی خۆی بنەماڵەی (محمد هەرشەمی) کە دەکاتە باوکی (شێخ ئەبوبکر) و باپیری شێخ مستەفای نەقشبەندی لە گوندی هەرشەم دادەنیشێت مزگەوت و قوتابخانەی ئاینییان هەبووە پاشان شێخ ئەبو بەکر کە لە سەر دەستی (شێخ عوسمانی تەوێلە) تەریقەتی نەقشبەندی وەردەگری و دەگەرێتەوە هەرشەم و پاشان لەوێ باری کردووە و هاتۆتە شاری هەولێر و دەستی کردووە بە رێنماییکردنی موسلّمانان. دەرێن گوندی گردەرەشە زاب ی دەو زێی بادینانیش لە ناوچەی بەرانەتی دەشتی هەولێردا هی وان بووە.

لە کتێبی (هەولێرم وا دیوە و وا بیستووە) لە بەرگی دووەمدا لە نووسینی بەرێز مامۆستا (سەید مەولود قادر بێخالّی) لە لاپەرەی ١٤٥ دا دەربارەی بنەماڵەی (شێخ ئەبوبەکری نەقشبەندیدا) وا هاتووە دەڵێت: (شێخ ئەبوبەکر کوری محمدی کوری عەبدولاّی سۆرانی لە گوندی (هەرشەم) لە ناوچەی (داری شەکران) یان (سەکری سەکران) لە داوێنی چیای هەڵگورد)، ئەگەر مەبەستی شوێنی لەدایکبوونی شێخ بێت، ئەوە گومان لەوەدا نییە شێخ لە گوندی هەرشەم لە دایک بووە بەلاّم ئەو گوندە ناکەوێتە ناوچەی داری شەکران (سەکری سەکران) چونکە داری شەکران دەکەوێتە ناوچەی زرارەتی لە سەر زوورگێکی بەرزە و دارەکەش دار بەرووە، بەلاّم گوندی هەرشەم دەکەوێتە خوارووی کلکەی چیای پیرمام لە ناوچەی گەردیایەتییە، گوندی هەرشەم و داری شەکرانی لێک دوورن خۆ (سەکری سەکران) یش ئەوە ناوی چیایەکی بەرزە لە دەڤەری باڵەکایەتی هەڵکەوتووە، لەگەڵ چیای شێخ ناسری پشتی قەسر و ماکۆسان و گوندی سۆرەبان ی پێکەوە نووساون.

گوندی (ولزە - ولزێ) لە بن شاخی (سەکری سەکران) هەڵکەوتووە، پاشان (سەکری سەکران) لە کوێ و بناری چیای هەڵگورد لە کوێ؟ نووسەر لێرەدا بەهەڵەدا چووە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندەش بە پێی سەرژمێری سالّی ۱۹۵۷ ز. (۳۲) کەس بووە بەلاّم هەنوکە گوندێکی گەورە و ئاوەدانە.

### شێخان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە رۆژاوای ناحیەی هاوینەهەواری سەلاحەددین، لەناو گەلییەکدایە لە کلکەی رۆژاوای زنجیرە چیای پیرمەم لە کەرخی گوندی شێخان (چیای شێخان)ی پێدەرێن. ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گەلیاوا، سەروکانی، هەرشەم) لە سەر یەکە، شێخان ناوێکی کوردی لە وشەی (شێخ +ان) واتە (ناو + ئامرازی کۆکردنەوە ان) پێکهاتووە، (شێخان) کۆی وشەی شێخە دەرێن کاتی خۆی بنەماڵەی شێخ مستەفای نەقشبەندی لەوێ دانیشتوونە گوندەکە هی وان بووە بۆیە (شێخان) ناونراوە پاشان بوویتە هی بنەماڵەی مەجیداغای گەردی، مەجیداغا (رەشید) ی کوری لەوێ دانا بوو.

کاک (سەعید رەشید عوسمان دێرەیی) کە بە رەسەن خەڵکی گوندی (دێرە)یە هەنوکە لە گوندی شێخان نیشتەجێیە بۆی گێرامەوە گوتی: ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندە دەگەرێتەوە بۆ سالاّنی پێش گرانییە گەورەکەی ۱۸۷۹- ۱۸۸۰ هەنووکە واتە سالّی ۲۰۰۱ زایینییە ئەو گوندە ۱۷ ماڵێک دەبن.

٤-٥ ماڵە هەرکی تێدایە، بەشێک لە شێخان (مەحمود ئاغای کوری ئەسعەد فتاح ئاغای هەرکی) کریبوەتی، ئەوانی دیکە هۆزی گەردینە. کاک سەعید لە درێژەی قسەکانیدا لە دەمی باوکییەوە دەیگێرێتەوە و

دەڵێت: ئەو کاتەی پڵنگی قارەمانی کوردستان سمکۆی شکاک ساڵی (١٩٢٢-١٩٢٣ز) هاتۆتە خوارووی کوردستان بۆ ماوەیەک لە گونددکەمان ماوەتەوە هەروەها لە گوندی سەروکانی جیرانماندا. لە رۆژاوای گوندی قووچێکی نیشاندام وتی: ئەو قووچە هەنوکەش پێیدەڕێن (قووچی سەنگەران) بۆیەش ئەو ناوەیان لێناوە چونکە کاتی خۆی سمکۆی قارەمان بۆ ماوەیەک لێرە بووە، پیاوەکانی لە سەر ئەو قووچەک سەنگەر و نۆبەتیان گرتووە، رۆژەکیان پیاوانی سمکۆ لە سەر قووچی سەنگەران بە دووربین تەماشای ئەو ناوەیان دەکرد کە دەڕوانێتە ئەو دەشت و هەڵەتە تا چاو حوکم دەکات هەر لە زنجیرە (زوورگی غەیبی و دەربەندی سەیدی و زوورگی شێردسواری بگرە تا دەشتی بەڕانەتی) دیارە، لە پڕ پیاوێکیان گوتی (ئەها وەڵلا تەیارە هات) سمایلاغا دووربینەکەی لێ وەرگرت و تەماشای ئەو بنارەی کرد و کەمێک داما ئەوجا گوتی (ئای سمکۆی شکاک با وەت لێ بێ خەرتەلی عاسمانانیش لەتوو بوویتە تەیارە) تومەز خەرتەل بووە لە پیاوەکەی وابوو تەیاردیە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ ز. ١٨٣ کەس بووە، هەنوکە ئەو گوندە بیری ئیرتیوازی و قوتابخانە و بنکەی تەندروستی لێیە.

**دێرە یان (دێرێ)**

دێرە یان (دێرێ) عوسمانییەکان (دێرە حەریریان) پێدەگوت، سەر بە سنجەقی رەواندز بووە، ناوی گوند و قەلایەکە دەکەوێتە کلکەی رۆژاوای چیای پیرمام ی سەر بە ناحیەی سەلاحەددین.

ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سەروکانی، هەرشەم، میراخور، سەرسول، دارەبزمارە) لە سەر یێکە، لە باکووری گوندەکە قەڵایەکی گەوردی لێیە، قەڵاکە کەوتۆتە دەشتێکەوە دەڕوانێتە هەر چوار دەوری خۆی، قەڵاکەش هەر بە ناوی گوندەکە کراوە و ناسراوە (قەڵای دێرێ) ی پێدەڕێن، دەڕێن کاتی خۆی ئەو قەڵایە لەگەل قەڵاکانی (بانەمان) و قەڵای (دەربەندی گۆمەسپان) لە سەردەمی پاشای گەورە (میر محمد رواندزی ١٧٨٣ - ١٨٣٧) بە دەستی یەکەم بیناسازی میرنشینی سۆران وەستا (برایمی ماویلی) دروست کراوە، قەڵاکە لە دوو نهۆم پێکهاتبوو، هەر نهۆمی هەشت ژوور بووە، بیری ئاویشی لە ناو بووە، قەڵایەکی زۆر قایم و عاسێ بووە، سەردەمێک بە دەستی میردکانی میرنشینی بابانەوە بووە بەڵام میرەکانی سۆران توانیویانە لێیان بستێننەوە و لەو ناوە دەریان پەرێنن. پاشان کەوتۆتە بن دەستی عوسمانییەکان تا هاتنی لەشکری ئینگلیز و گرتنی شاری هەولێر، عوسمانییەکان ئیدی قەڵاکەیان بەجێ هێشتووە، لە ساڵی ١٩٧٤ حکومەتی بەعس قەڵاکەی تێکداوە و ژوورەکانی رووخاندووە، هەنووکە رووخاوە و کەلاوەیە و شوێنەوارەکەی هەر ماوە، لە پاش رووخانی میرنشینی سۆران عوسمانییەکان کردوویانەتە سەنگەری خۆیان و (دێرە) کراوەتە ناحیە و بە دێرە حەریر ناسراوە، لە ساڵی ٢٠٠١ کە سەردانی ئەو ناوچەیەم کرد بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە هەندێک لە دانیشتوانی ناوچەکە وایان نیشاندا کە گوندی دێرە پێش هاتنی بنەماڵەی کاکلاغەی گەردی هی بنەماڵەی (میرەبەگی) یەکانی سۆران بووە، پاشان بووەتە هی بنەماڵەی گەردییەکان (کاکلاغای شێمحەمەداغای گەردی)، (مەجیداغای) کوڕی رەوانەی ئەو ناوچەیە کردییەو هاتۆتە گوندی (دێرێ) لەوێ دانیشتووە، لە پاش مردنی مەجیداغای لە ساڵی ١٩٥٣ منداڵەکانی گوندەکانی (دێرە، هەرشەم، سەروکانی) لەگەڵ بەشێک لە گوندی (شێخان)یان فرۆشتە هەرکییەکان، گەردییەکان ئەو ناوچەیان بەجێهێشت تەنیا گوندی (شێخان) نەبێت گەردی زۆر تێدا ماوە. هەنووکە ساڵی ٢٠٠١، ئەو گوندە ١٥ ماڵێک دەبێت هەموویان لە عەشیرەتی هەرکینە.

(مام حاجی ئەحمەد سولەیمان هەرکی) کە سەر بە تیرەی (سیدان) ی هۆزی هەرکییە لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠ ز ئەو گوندەیە، بۆی گێڕامەوە گوتی: ئەمە باو باپیرانمان کۆچەر و رەشماڵنشین بووینە، کاتی خۆی ئەو ناوە زستانە هەوارمان بووە، باپیریشم هەر لەو ناوە لە گوندی (سەروکانی) لە دایک بووە، ئەو گوندە گوندێکی کۆنە، باسی ئەوەشی بۆ کردم کە ساڵی ١٩٢٢-١٩٣٢ کاتێ سمایلاغای شکاک هاتۆتە باشووری کوردستان لەوێ ماوەی زیاتر لە دوو مانگ بە خۆی و عەیالی لەگەڵ سەید تەها کوڕی شێخ سەدیقی نەهری لەوناوە بووە واتە لە گوندەکانی (سەروکانی، دێرە، هەرشەم، شێخان)

ماونەتەوە لەلای (ئەحمەد خانی هەرکی) و (خورشید اغای هەرکی) چونکە ئەو کاتی ئەوان لەو ناوە بوون، پاشان سمایلاغا چووە سولەیمانی بۆ خزمەتی مەلیکی کوردستان (مەلیک مەحمود) هەر لەوێش گەڕایەوە ناو خاکی تورکیا.

دەڕێن لە زەمانی مەجیداغای گەردی هەندێ لە عەشیرەتەکانی دەوروبەریان ویستوویانە ناوچەی دێرێ بۆ گەردییەکان بەجێ بێڵن، مەجیداغاش گووتوویەتی:

**ئەگەر خودا بدا دەمێ (دێرێ) دەبەمە سەر هەرشەمێ**
**ئەگەر خودا نەیدا دەمێ کیری (دێرێ)ش بە قوونی هەرشەمێ**

مەجیداغا پیاوێکی لێوەشاوە و پیاوانە بووە کوڕی کاکلاغای کوڕی شێمحەمەداغای گەردی بووە، لە گوندی بەحرکەی لە دایک بووە پاشان کە ژنی هێناوە باوکی ناردوویەتیە ناوچەی دێرێ کە سەرپەرشتی گوندەکانی (دێرێ، هەرشەم، سەروکانی، شێخان) بکات، ئەو گوندانەش دەکەونە ئەو بەری رووباری بەستۆرەی لە رۆژاوای کلکە چیای پیرمام هەڵکەوتوون، مەجیداغا چووە دێرێ و ئاوەدانی کردەوە و دیوەخانی لێ دامەزراند و باخ و باخاتی لێ داچاند،، لەو ساوە بە (مەجیداغای دێرێ) ناسرا. دەڕێن لە ژیانیدا نۆ ژنی هێناوە (٢٢) کوڕ و (١٤) کچی هەبووە، لە ساڵی ١٩٥٣ کۆچی دوایی کردووە لە گوندی دێرێ نێژراوە، کوڕەکانی (رەشید، قادر، سەرتیپ، عەولا) بوون.

### دارە بزمارە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە کۆتایی کلکەی زنجیرە چیای پیرمەمی بەلای رۆژاوادا، لەوێ ئەو زنجیرە شاخە کۆتایی دێت زوورگ و هەڵەت دەست پێدەکات، بەرەو باکووری رۆژاوا سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەیە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سەروکانی، دێرێ، زیارەتی مەلازادان) لە سەر یەکە، گوندێکی زۆر کۆن نییە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش گرانی ساڵی ١٩١٧ واتە لە زەمانی عوسمانییەکاندا ٢-٣ ماڵ بووە بەڵام هەنووکە ساڵی ٢٠٠١، نۆ ماڵ دەبێت هەموویان عەشیرەتی هەرکین، بە مەڕدارییەوە خەریکن. زەوییەکەی واتە رووی خاکەکەی هەڵەت و هەڵدێر و رەقەنە بە کەلک کشتوکاڵ نایەت تەنیا بۆ مەڕداری باشە. ناوی ئەو ئەو گوندە لە ناوی ئەو دارەوە کراوە و ناسراوە کە لە سەر گۆڕستانێکی کۆنی گچکەدایە، دارەکەش دار بەرووە بە سەدان بزماری لێ کوتراوە، وەختی خۆی خێڵەکانی هەرکی خەیلانی کە بەو ناوە تێپەڕ دەبن بەرەو هەوارەکانیان بۆ کوێستانەکانیان دەچوون هەر کەسێکیان مرازێکی هەبووایە یا ددانی بهێشابوایە یا ژانی بکردابایە ئەوە بزمارێکی دەینا و لە قەدی ئەو دارەی دەکوتا بە مەبەستی ئەوەی ئێش و ژانی ددانەکەی بشکێ وەیان ئەو مرازەی هەیەتی بێتە دی، گوایە ئەو قەبرەی کە ئەو دارەی لە سەر رواوە پیاو چاکێکە ئێستاشی لەگەڵ دابێت ئەو بیرو باوەڕە لێرە هەر باوە و هەر ماوە. بە هەمان ناو و بە هەمان شێوە لە کلکەی قەربۆتک و قەرەبێتکان لە کلکەی رۆژهەلاتی چیای قەرەچوغی دارێک هەیە دارەکە (قەرەقاج)ە لە سەرینگانی یەک تا دوو گۆڕ رواوە پێی دەڕێن دارە بزمارە کلکەی چیایەکەش پێی دەڕێن کلکەی دارەبزماران کاتی خۆی شوانکارە و مەڕدارانی دەشتی دزەییاتی کە کۆچ و کۆچباریان لێدەنا بەرەو دەشتی قەراجی لێرەدا وچانیان دەگرت و ئاوای ئەودیوی دەبوون، ئەو ناوە (دارەبزماران) تێکەڵ بە حەیران و فۆلکلۆری ناوچەکە بووە.

### دارەبەن

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی بەرانەتی لە باکوری شاری هەولێرەوە هەڵکەوتووە (١٢) کم لێوەی دوورە، جاران سەر بە ناحیەی عەنکاوەی بوو بەڵام لە پاش هەشتاکان خرایە سەر ناحیەی خەبات لەگەڵ چەند گوندێکی دیکەی ناوچەکە. (دارەبەن) گوندێکی کۆنە و گەورەیە لە ناوچەکەدا ئاقاری لەگەڵ گوندەکانی (بەرحوشتر، ئاشۆکان، گەزنە، قەڵاچۆغان، خەرابەدراو، سەیدان، گردەچاڵ) لە سەر یەکە. دارەبەن ناوێکی کوردی رەسەنە. دەڕێن کاتی خۆی لەو ئاقارەدا دارێک هەبووە ئەو دارە دارەبەن بووە کە خەڵکی لەوێ دامەزراون ئەو گوندە ناوی بووە بە (دارەبەن) لە ساڵی ١٩٦١ قوتابخانەی سەرەتایی لێ کراوەتەوە ساڵی ١٩٧٣ قوتابخانەی ناوەندی بۆ کراوەتەوە لە بەر ئەوەی گوندێکی گەورە بووە قوتابی زۆر بووە لە ساڵی ١٩٩٩ قوتابخانەی ئامادەیی لێ کراوەتەوە هەر لە کۆنەوە قوتابخانە و خوێندنگەی

ئایینی هەبووە، مامۆستای خوالێخۆشبوو (مەلا خدری دەشتی ۱۹۰۹ -۱۹۵۷) لەوێ بووە، مامۆستا بە رەسەن خەڵکی دەشتی دزەییاتی بووە، لە ساڵی ۱۹۳٤ بروانامەی ئایینی لە مزگەوتی (حاجی قادری دەباغی هەولێری) وەردەگرێت لە خزمەت مامۆستا (مەلا عەولای مەلا حەمەدەمینی بێتواتەیی) لە ساڵی ۱۹۳۵ بە مەلا لە گوندی دارەبەن دادەمەزرێ و مەدرەسەی ئایینی دەکاتەوە حەڤدە ساڵان لەو گوندە مەلا بووە و بە وانە وتنەوە خەریک بووە تا ساڵی ۱۹۵۲ لەوێ بووە، مامۆستا سەرەرای مەلایەتییەکەی شاعیرێکی نیشتمانپەروەریش بووە، مەولودنامەکەی و دیوانەکەشی چاپ کراوە، ئەو زاتە دەکاتە باوکی کاک کەریم دەشتی شاعیر.

**گردەشێر**

گردەشێر ناوی گوندێکە دەکەوێتە دەشتی بەرانەتی، لە باکوری رۆژاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (خرابەدراو، قەلانچۆغان، گاینج، کەورەبەن جدیدەزاب) لە سەر یەکە، (گردەشێر) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (گرد +ە +شێر) واتە لە (ناو + ئامرازی ە + ناو) پێکهاتووە گوندێکی زۆر کۆنە گەرێدەی (نیپۆر) لە گەشتەکەیدا کە (موسل) ە هاتۆتە هەولێر و لەوێوەش بەرەو بەغدا رۆیشتووە، ناوی ئەو گوندەی هێناوە، ئەو گوندە گوندێکی ئاسەواری توورەکەرێژی لێیە گردی (گردەشێر) ی پێدەرێن گوندەکە و گردەکە بەو ناوە ناونراوە، گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لە ناوچەی خۆشناوەتی هەیە کەوتۆتە نێوان گوندی (سکتان و کۆلکە رەش) ی لە چیای هەورێ، وەختی خۆی لە شەستەکان تاقە ماڵ بووە، (حاجی عەبدولا) ناوێک لەوێ بوو پیاوێکی مەردار بوو جوامێر و نان بدەر و خانەدان بووە.

**بانەمان**

ناوی گوندێکە لە بناری چیای پیرمەم لە سەرەتای لۆفەکانی مەسیفی هەڵکەوتووە سەر بە ناحیەی سەلاحەددینە، گوندێکی کۆنە، قەڵایەکی کۆن و قاییمی لێیە قەڵای بانەمانی پێدەرێن. کاتی خۆی پاشای گەورەی رەواندز (میر محمد پاشای گەورەی سۆران ۱۷۸۳ - ۱۸۳۷) ئەو قەڵایەی دروست کردووە هەنووکەش قەڵاکە لە سەر پێیانە و هەرماوە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (سێوەکە، گەلیاوە، کۆمەڵگای بەستۆرە، شارۆچکەی سەلاحەددین / مەسیف) لە سەر یەکە ئەو گوندە لە کۆنەوە بنەماڵەیەکی سەیدی لێ بووە ناوی (سید محمد) بووە لەگەڵ هۆزی زێد بەگی بەڵام هەنوکە زێدبەگییەکانی لێ ماوە و سەیدەکان باریان کردووە، جاران هەر لە (دەربەندی گۆمەسپان و بناوی) یەوە هەتا دەگەیشتە بانەمان ئەو ناوە و بنارە یەک پارچە داری (مازوو، بەرو، قەرەقاچ) بووە، بانەمان ناوێکی دارێژراوی کوردییە لە (ناو + ئامرازی ە + پاشگر) واتە لە (بان +ە + مان) پێکهاتووە خوالێخۆشبوو مامۆستا (مسعود محمد جەلیزادە) دەڵێت: پاشگری مان واتای ئاوایی یاخود شوێنی تێدا بوون دەگەیەنێت وەکو، دارەمان، دیلمان، ئەو گوندە کانیاوێکی باشی هەیە باخچەی بچووک بچووکی هەیە خەڵکەکەی بە بەخێوکردنی ئاژەڵ خەریکن، ژمارەی دانیشتوانی بە پێی ئاماری ساڵی ۱۹۵۷ ز ۱۱۸ کەس بووە.

**کەورە سۆر**

کەورە سۆر ناوی دوو گوندانە یەکێکیان کەوتۆتە دەشتی زرارەتی گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو هەیە لە هەمان ناوچە (کەورە سۆر) ی گەردی پێ دەرێن هی هۆزی گەردییانە، هۆردووکیان سەر بە ناحیەی سەلاحەدینن، کەورە سۆر ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ناو + ئامرازی ە + ئاوەڵناو) واتە (کەور + ە + سۆر) پێکهاتووە وشەی (کەور) بە مانای شاخ، کەڤر، بەرد دێت، بۆ نموونە دەرێن کەورێکی گەورەیە، بەڵام لە دەشتی بەرانەتی و دەشتی زرارەتی وشەی (کەور) بە مانای (کەنداڵ- کەندار) دێت خاکی کەورەکە (کەنداڵە) کە سۆرە، بۆیە ئەو گوندە بەو ناوە ناسراوە، هەروەکو گوندی (کەورە قەل) ی دەو زێی ئەو کەنداڵە هێلانە قەلی زۆرە بۆیە گوندەکە بەو ناوەی ناسراوە.

ناوی گوندەکانی بناری چیای سەفین یان پاش سەفین و هەندێک لە گوندەکانی ناوچەی خۆشناوەتی ئەو گوندانەش ئەمانەی خوارەوەن:

(حوجران، تەوسکە، قەڵاسنجی خواروو، قەڵاسنجی سەروو، خۆران، زیارەت، حاجی ئەحمەدان، تۆیزاوە،

قیرژە، سارتکە، سولاوکی سەروو، سولاوکی خواروو، بیرۆکان، ناودارۆکان، سووسە (سووسێ)، گۆمەسپان، تۆپزاوە، گردەچاڵ).

**حوجران**

ناوی گوندێکە لە کلکەی کۆتایی رۆژاوای چیای سەفین هەڵکەوتووە، کەوتۆتە سەرەوەی (دەربەندی کۆرێ)، بەرامبەر چاکی (شێرەسوار)ە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (تەوسکە، گردەچاڵ) کە هەنووکە ئەو گوندە نەماوە، لەگەڵ (کۆرێ) دەربەندەکەیان نێوانە لەسەریەکە، بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، ئەو گوندە سەر بە ناحیەی خۆشناو بووە، واتە شارۆچکەی "هیران" سەر بە قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێر، ئێستا سەر بە ناحیەی سەلاحەدینە، ژمارەی دانیشتوانی لەوکات "١٩٥٧ز" (١٢٢) کەس بووە.

وشەی (حوجران) ناوێکی دارێژاوی کوردییە لە (حوجرە+ نیشانەی کۆکردنەوەی "ان") واتە لە "ناو+ ان" پێکهاتووە. خۆ ئەگەر بێتوو بە وردی تەماشای سەرەوەی گوندی واتە پشتی (حوجران) بکەین کە کلکەی چیای سەفینە و شاخەکە لەوێ کۆتایی دێت، رەنگی شاخەکە سپییە، کاتی خۆی پێیان دەگوت (سپیلکی سەرخانێ) چونکە لە شوێنی گوندی "حوجران"ی ئێستاکەدا کاتی خۆی (خان) واتە (کاروان سەرا) بووە، خانەکەش (حوجرە، حوجرە) بووە، بۆ کاروان و کاروانچییەکانی وڵاتی باڵەکایەتی، رواندز، دەڤەری بارزان، سورچیاتی، بۆیە ئەو جێگایە بە (سپیلکی سەرخانێ) ناسراو بوو، چونکە (سپیلکی خەلیفانێ)ش هەبوو، گەلەک جاران (سپیلکی کورەک)ی یان (سپیلکی رواندز)ییان پێ دەگوت، چونکە لە خەلیفانێ نزیکە و سەر بە وڵاتی رواندزێ بووە، بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە، (سپیلک)یش هەر شوێنێکە لە چیای هەریرێ، رەنگی شاخەکەی سپییە، (لۆفەی سپیلک)ی بەو شاخەوە تێدەپەرێ بۆ سەرەوە. ئەو شوێنانە رەنگیان لە حەیران داوەتەوە، گەلەک جاران حەیرانبێژان ناوی دێنن، هەروەکو دەڵێن:

"حەیران لە سپیلکان... لە سپیلکی سەرخانێ...)

هەروەکو لە سەرەوە گوتمان کاتی خۆی ئەو شوێنە (خان) بووە و خانەکەش حوجرە حوجرە بووە، واتە غورفە غورفە پاش ئەوەی رێگاوبان کراوەتەوە ئۆتۆمبێل پەیدابووە بە تایبەتی ئۆتۆمبێلی گەورە وەکو "لۆری- پەست باوی کاروان و کاروانچیاتی نەماوە، بۆیە خانەکەش نەماوەو خەڵکەکە لەوێ دامەزراون و ناویان لێناوە (حوجران)، لەکاتی کۆکردنەوەی ئەو جۆرە ناوانەی کە کۆتاییان بە پیتی بزوێنی (ە) بێت ئەوە پیتی "ە" نامێنێت، چونکە لە زمانی کوردیدا "٢" پیتی بزوێن لە دوای یەک نایەت وەکو:

دارە بزمارە+ ان= دارەبزماران
حوجرە+ ان= حوجران
بیستانە+ ان= بیستانان

**تەوسکە**

ناوی گوند و پیاو چاکێکە، کەوتۆتە رۆژهەڵاتی گوندی (حوجران)، کاتی خۆی ئەو گوندە نەبووە تەنیا چاکەکە هەبوو، (چاکی تەوسکە)یان پێدەگوت، خەڵک لەزۆر شوێنی کوردستان بۆ زۆر مەبەست دەهاتن زیارەت و سەردانیان دەکرد، لە ساڵی؟؟١٩ز پیاوێک لە گوندی (قەلاسنجی خواروو) باریان کرد چوون لە ئاقاری چاکی (تەوسکە)ی لەبن چیای سەفینی خانوویان کرد و لەوێ دامەزران ناویان لێنا (تەوسکە)، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (قەراسنجی خواروو، حوجران، گردەشێری خواروو) لەسەریەکە، ئەو گوندە سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، ژمارەی دانیشتوانی بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٢٥) کەس بووە، لەو ساڵانەی دوایی رێگایەکی خۆش و قیرتاوی بۆ کراوە، دەتوانین لە (دەربەندی گۆمەسپان)ەوە بە گوندەکانی (بناری سەفین)ەوە کە دەکەونە ئەمبەر و ئەوبەری شەقامەکە یا هەندێکیان کەمێک لە شەقامەکەوە دوورن وەکو گوندەکانی (زیارەت، سارتکە، حاجی ئەحمەدان، قیرژە، قەڵاسنجی سەروو، قەڵاسنجی خواروو) کە شەقامەکە بەناو گوندەکەدا دەڕوات، رێی (تەوسکە) لە "حوجرا،" لەگەڵ رێگا سەرەکییەکەی هەولێر- شەقڵاوە تێکدەکەنەوە بە پێچەوانەشەوە لە گوندی (حوجران)ەوە رێگای بۆ دەچێت هەتاکو دەگاتەوە (دەربەندی گۆمەسپان)، لەو ساڵانەی دواییدا بووەتە سەیرانگای بەهارانی دانیشتوانی شاری هەولێر و دەڤەرەکە، ئەو ناوە رەز و باخی هەیە، کارێزی ئاویشی تێدایە.

### گردەچاڵ

(گردەچاڵ) ناوی گوندێک بووە لە سەردەوەی (دەربەندی کۆڕێ) لە رۆژئاوای گوندی (حوجران) لەبن چیای (کۆرە) هەڵکەوتبوو، نزیکەی (١٥) ماڵێک دەبوون، بەڵام لە پاش ساڵی ١٩٥٨ز بەدواوە ئەو گوندە چۆڵ بووە و نەماوە، سەر بە ناحیەی (خۆشناو- هیران)ی قەزای شەقڵاوەی بوو، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (حوجران، کۆڕێ، ناوکەندان) لەسەر یەکە، بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی (١٨٧)کەس بووە، گوندێکی دیکەش بەهەمان ناو لە دەشتی بەرانەتی دەشتی هەولێردا هەیە، هەروەها لە (دەشتی قەراج)دا گوندێکی دیکە بەو ناوە هەیە.

### قەراسنج (قەڵاسنج)

لە دەڤەری خۆشناوەتیدا دوو گوند بەو ناوە هەیە، یەکێکیان (قەراسنجی سەروو)ە، قەراسنجی سەرێی پێدەڕێن، ئەویدی (قەراسنجی خواروو)ە، قەراسنجی خوارێی پێدەڕێن، هەردووکیشیان ئاقار و تخوبیان لەسەر یەکە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرن.

### قەراسنجی سەروو

ئەو گوندە قەراسنجی گەورەشی پێدەڕێن، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (خۆران، قەراسنجی خواروو، قیرژە، سارتکە، حاجی ئەحمەدان) لەسەریەکە، لەبن چیای سەفینی هەڵکەوتووە، لە گوندەکانی پاش سەفین دەژمێردرێن، ئەو گوندە کاتی خۆی (حوسێن بەگی کوڕی حەمەدەمیناغای) لێی دادەنیشت، ئەو بنەماڵەیە بە رەسەن لەگەڵ بەگزادەکانی هیران یەک دەگرنەوە و دەبنەوە یەک، ئەو پیاوە مرۆیەکی ئازاو چاونەترس بووە، لەبەلا کێشەی عەشایری گوندەکەی خۆی بەجێ دێڵێت و دەچێتە گوندی (پیرەش) لای حاجی عەلۆی (عەلی ئاغای دزەیی) باوکی سمایلی عەلۆی، ئەوکاتی ئەو گوندە بە موڵک هی (حاجی عەلۆی) بوو، لە گەردییەکانی کڕی بوو، ماوەیەک (حوسێن بەگ) لەوێ مایەوە پاشان لەسەر داواکاری (میرانی قادر بەگ) ماڵی حوسێن بەگ دەگەڕێننەوە گوندی (قیرژە)ی نزیک (قەڵاسنج)، چونکە لەوێ رەز و باغ و باخچە و کانیاوێکی زۆری هەبوو، پاش ماوەیەک (حوسێن بەگ) کوژرا، براو کوڕەکانی هەستان باریان کرد و ئەو ناوەیان بەجێهێشت و چوونە هەولێرێ، هەرچی زەوی و زار و رەز و باغ و باخچە و کانیاویان هەبوو هەستان بە پارەیەکی کەم فرۆشتوویانەتە (شێخ ساڵحی بەرزنجی) باوکی (شێخ محێدین........ - ١٩٨٢) سەردەمانێک میرانی قادر بەگی شەقڵاوە لەگەڵ خورشید بەگی برای لەوێ دادەنیشتن کە لە (گۆمەسپان)ەوە هاتبوونەوێ لە ساڵانی ١٩١٠-١٩١١ پاشان (میرانی قادر بەگ) باردەکات و دەچێتە شەقڵاوە، خورشید بەگی براشی لەوێ دەمینێتەوە، وشەی (قەراسنج) کە بە شێوەزاری ناوچەکە (شێوەی خۆشناوەتی)یە، ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (قەرا+ سنج) واتە لە (ناو+ ئاوەڵناو) پێکهاتووە، (قەرا) بە واتای (قەڵا) یان (قەڵات- قەرات) دێت، بچووککراوەی وشەی (قەرات) (قەرا)یە، وشەی (سنج) بە واتای (سەخت) عاسێ دێت، بەسەریەکەوە بە مانای قەڵای سەخت و عاسێ دێت، لەبەرئەوەی شوێنەکەی سەخت و عاسێیە بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە، ئەو گوندە ئاو و رەز و باخێکی زۆری هەیە بە تایبەتی رەزی دێم (ترێ، باوی، گێوژ، کرۆسک) تووتنی بەناوبانگە، بە تایبەتی (بێشەمە)ی لێ هەڵدەکەوێ، کە جۆرە تووتنێکی خۆش و بۆندارە.

### قەراسنجی خواروو

ئەو گوندەش یەکێکە لە گوندەکانی پاش سەفین، لەبن چیای سەفینی سەرکەش هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (تەوسکە، قیرژە، قەڵاسنجی سەروو، خۆران) لەسەریەکە، گوندێکی زۆر خۆش و دڵگیرە، رەز و باغ و کانیاوی هەیە بە تایبەتی رەزی دێم (ترێ)، لە ساڵانی سییەکان نورەدین بەگ کوڕی خورشید بەگ لەوێ دادەنیشت، زاوای میرانی قادر بەگ بوو، لە ساڵی ١٩٣٨ کۆچی دوایی کردووە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٣٣٧) کەس بووە، ئەو گوندە گەلەک جاران سووتاوە، هەنووکە جادەی بەناو دادێ و قوتابخانە و مزگەوتی هەیە، بیری ئیرتیوازیشی هەیە. لە پیاوە

ناودارەکانی ئەو گوندە (نورەدین بەگ، ڕەشاداغا، کێخوا وەسمان و برایم) بوون.

**خۆران**

خۆران ناوی گوندێکە دەکەوێتە بن چیای سەفینی سەرکەش و خۆراگر، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقلاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (قەلاسنجی سەروو، قەلاسنجی خواروو) لەسەریەکە و لایەکیشی چیای سەفینە، کانی و کانیاوێکی سازگار و ڕەز و باغێکی زۆری هەیە بە تایبەتی هەرمی و ترێ، ترێی خۆران زۆر بەناوبانگە، سەرەڕای ئەو هەموو ڕەز و باغە، تاکە گوند بووە لە کوردستاندا کە چاڵە بەفری زۆری هەبووە، لە سەرەوەی چیای سەفینی بەرامبەر گوندی (خۆران) نزیکەی (٣٠-٤٠) چاڵە بەفری هەبووە، ئەو چاڵە بەفرانەش نزیکەی دوو بەژن قووڵ دەبوو، هەر یەکەی (١٥٠٠) بارە بەفری دەگرت، لەکاتی خۆی لە زەمانێکی زووەوە دانیشتوانی ئەو گوندە ئەو چاڵە بەفرانەیان بە قوولایی دوو بەژن هەڵکەندووە لە بنەوەی چاڵەکاندا (نۆین)یان بۆ کردبوون بۆ ئەوەی ئاوی بەفرەکە لە (نۆین)ەکانەوە لە ژێرەوە بچێتە دەرەوە، تاکو نەبێتە هۆی توانەوەی هۆی توانەوەی بەفرەکە، لە وەرزی زستاناندا چاڵەکان خاوێن دەکرانەوە، ئەوجا لە مانگی (ڕێبەندان) دا کە بەفرێکی زۆر لە کوردستان دەباری خەڵکەکە سەرجەم چاڵەکانیان پڕ لە بەفر دەکرد و دەیان پەستانەوە بۆ ئەوەی بەفرەکە باش یەکدی بگرێت و بکەوێتە سەر یەکتری، ئەوجا ٣-٤ بارە (کا)یان پێدا دەکرد بۆ ئەوەی هەوا وەرنەگرێ و نەتوێتەوە، لە دواییدا گەڵای دار و چرۆیان دەخستە سەری، کاتێ گەرما دادەهات وردە وردە لە بارانیان دەکرد و سەری بارەکەشیان (کا) تێدەکرد بۆ ئەوەی بەفرەکە نەتوێتەوە باریان دەکرد و دەیان هێنا بۆ شاری هەولێر و دەوروبەری بە تایبەتی دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێر و دەوروبەری بە تایبەتی دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێ دەیان فرۆشت.

لەم بارەیەوە مام حاجی مەجید لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٥ی گوندی خۆران بۆی گێڕامەوە و گوتی: (کە گەرما دادەهات بە باران بەرەو شاری هەولێر دەکەوتینە ڕێ، لە پاش عەسرێکدا کاروان لە گوندی بەرێ دەکەوت، بەیانیان پێش ڕۆژهەڵاتی دەگەیشتینە (قەسری عەتاولاغای) للەو ڕێ و بانەدا نزیکەی زیاتر لە (٢٠٠) گوێ درێژ هاتووچۆی بوو، ئەوکاتی باری بەفری (٢٥٠) فلسی دەکرد باری ترێی (١٢٥) فلسی دەکرد، بۆ ئەو زەمانی ئەو پارەیە پارەیەکی کەم نەبوو، زۆر بوو، ناوە ناوەش بارە بەفرمان دەبردە (کۆیێ)، بەڵام کەمە، ئەگەر ئەوساڵی بەفر زۆر بباریبایە لە (چیای ئاوەگرد) ئەوانە دەچووینە کۆیێ، چونکە لە چیای ئاوەگردی چەند چاڵە بەفرێک هەبوو، خەڵکی دەڤەرەکە سوودیان لێ وەردەگرتن و بەفرەکەیان دەبردە شاری کۆیە، ئەمە بە زۆری دەمان بردە شاری هەولێر و دەشتی دزەییان دەمان فرۆشت، دەگێڕنەوە دەڵێن لە ساڵی ١٩٣٦ز هەندێک لە هەولێرییەکان گەمەو گاڵتە بە خۆشناوەکان دەکەن و ئەزیەت و ئازاریان دەدەن (میرانی قادر بەگی) سوندی خواردبوو نابێ یەک بارەبەفر بچێتە هەولێرێ، هەر کەسیش سەرپێچی بکات ئەوا توندترین جەزای دەدەم، هەندێک دەڵێن (نورەدین بەگ)ی زاوای میرانی قادر بەگ بووە، سوندی خواردبوو، لەم بارەیەوە خوالێخۆشبوو (کەمال خورشید میران) لە کتێبەکەیدا بە ناوی خۆشناو و خۆشناوەتی لە لاپەڕە ٩٤)دا بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت: (کابرایەک بە نهێنییەوە بارە بەفرێکی بردبوو بۆ هەولێر، کە (نورەدین بەگ) زانییەوە هێنای چاڵە بەفرەکەیان لێ تێکداو دارکاریشیان کرد).

لەم بارەیەوە خوالێخۆشبوو (حاجی عوسمان کامەلای) خەڵکی گوندی (مورتکەی گچکە) لە دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێ گێڕایتییەوە گوتبووی: (ماڵی شەهاب چەلەبی خۆیان دەخیلی مە کرد کە ئەگەر هاتوو بارە بەفر هاتە گوندی لۆمان بکرن و لۆمان بنێرن) دەڵێت: چەند جارێک بە دزییەوە بارە بەفرم لە مورتکەوە بۆ ماڵی شەهاب چەلەبی بردووە، پاشان گەلەک مەمنوون بوون، چونکە ئەو ساڵی هاوینەکەی زۆر گەرم بوو، پاشان ئاغاکانی هەولێری پیاویان ناردە لای (میرانی قادر بەگی) ڕێ بە خۆشناوەکان بدات، بەڵێنی ئەوەشیان پێ دابوو جارەکی دیکە شتی لەم بابەتە ڕوونەداتەوە. ئەو گوندە کاتی خۆی هی (میرانی ئەحمەد بەگ)ی برای میرانی خدر بەگی میر وسویی بوو، لەوێ دادەنیشت، شەش کوڕی هەبوو یەکێ لە کوڕە ئازاو چاو نەترسەکانی (ساڵح بەگ) بووە کە پیاوێکی زۆر ئازاو ڕەشید بووە، بەرهەڵستی

لەشکری ئینگلیزی کردووە، بۆیە ئینگلیزەکان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک گوندی (خۆران)یان بۆردومان کردووە، (سالّح بەگ) ناچار بووە لە چیای سەفینی ئەشقیا ببێت، هەنووکەش لووتکەیەک لە چیای سەفینی هەیە (لووتکەی سالّح بەگی) پێدەڕێن، (سالّح بەگ) سێ کوڕی هەبووە، ئەحمەد بەگ (مەمۆ ئاغا) کە ناوی (حەمەد بەگ) بووە، (کەریم بەگ) کاتی خۆی (نافیز بەگ)ی برازای سالّح بەگی خۆران پەیوەندییەکی بەتینی هەبووە لەگەلّ سەید عەبدولقادری کوڕی نەهری).

لەو گوندەدا پێنج مالّە جوولەکەی تێدا بوو، سێ مالّیان لەوێ باریان کرد، بەلاّم دوو مالّیان هەتاکو سالاّنی ١٩٤٨- ١٩٤٩ز هەر مابوونەوە، لە پاشان ئەوانیش لەگەلّ جوولەکەکانی دیکەی کوردستاندا چوونە فەلەستین. لەمبارەیەوە (مام حاجی مەجید) لە دایکبووی سالّی ١٩٢٥ز لە گوندی خۆران بۆی گێرامەوە گوتی: (باوکم پێی دەگوتن باوکم ئەنگۆ لۆ دەڕۆن، وا لۆخۆ لێرە دەژین، کەس حەقی بەسەرتانەوە نییە). ئەوانیش لە وەلاّمدا دەیانگۆت: (ئەوەل شام و ئاخیر شام، ئەمە هەر دەبی بچینەوە شامێ) ئەو جوولەکانەش بەکاری زێڕینگرییەوە خەریک بوون، تاس و گوارەو خەزێم و بازنیان لە زێڕ و زیو دروست دەکرد، ژمارەی دانیشتوانی بەپێی سەرژمێری گشتی سالّی ١٩٥٧ز (٩١٨) کەس بووە.

### سارتکە

سارتکە یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی خۆشناوەتی، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقلاوەیە، لە دامێنی چیای پیرمەمی هەلّکەوتووە کە لەو کەرخی (چیای سەری سارتکە)ی پێ دەڕێن، شوێنەکەی بەرزە، ئاقارەکەی لەگەلّ ئاقاری گوندەکانی (قیرژە، حاجی ئۆمەران، قەلاّسنجی گەورە) لەسەریەکە، گوندێکی خۆش و بە رەز و باغە، کانیاوێکی سازگاری هەیە، شوێنێکی دلّڕفێنە، زستانان زۆر ساردە، هاوینان فێنکە، ئاوی قەلاّسنج و کەندی قیرژە دێتەوە (رووباری سارتکە)ی ئەویش دێتەوە دەربەندی گۆمەسپانێ و لە رووباری بەستۆرەی دەکاتەوە، کاتی خۆی ئاوێکی زۆری هەبوو، بەلاّم هەنووکە لەبەر گۆڕانی کەش و هەواو کەم بەفرو باران بارین ئاوەکەش کەم بووە و هاوینان وشک دەبێت، خەلّکەکەی بە ئاژەلّداری و رەز و باغەوە خەریکن، لەو ناوە کەو، باز، زۆرە. ئەو گوندە کاتی خۆی ١٠٠ مالّێک دەبوون.

### سولاوک

لە ناوچەی خۆشناوەتیدا دوو گوند بەو ناوە هەنە، هەردووکیشیان ئاقاریان لەسەریەکە، سەر بە ناحیەی خۆشناون واتە (شارۆچکەی هیران) یەکێکیان (سولاوکی سەروو)ە، ئەوی دیکە (سولاوکی خواروو)ە.

(سولاوکی سەروو) ناوی گوندێکە کەوتۆتە بناری چیای سەفینی سەرکەش، لە ڕۆژهەلاّتی گوندی زیارەت هەلّکەوتووە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەلّ ئاقاری گوندەکانی (زیارەت، ناودارۆکان) لەسەریەکە، لایەکیشی چیای سەفینە، (سولاوک) ناوێکی دارێژراوی کوردییە، لە (ناو+ پاشگری- ک) واتە لە (سولاو+ک) پێکهاتووە، سولاو: بە واتای تاڤگە دێت، (ک) پاشگرە بۆ بچووککردنەوەی ناو بەکار دێت، کەواتە سولاوک بە مانای تاڤگەکی گچکۆکە دێت، لە پیاوە ناودارەکانی ئەو گوندە (کێخوا جەردیس) ناوێک بووە لە دەوروبەری سالّی ١٩١٢- ١٩١٣ کوژراوە. ژمارەی دانیشتوانی (١٣٣) کەس بووە، هەر لە خوار ئەو گوندە (سولاوکی خواروو)ە، ژمارەی دانیشتوانەکەی بە پێی سەرژمێری گشتی سالّی ١٩٥٧ز (٦٥) کەس بووە.

### قیرژە

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بناری ڕۆژهەلاّتی چیای (سەری رەش) بەلای ڕۆژهەلاّتییەوە هەلّکەوتووە، لە ناوچەی خۆشناوەتیدایە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقلاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقارەکەی لەگەلّ ئاقاری گوندەکانی (بیرێژ، گراو، سارتکە، قەلاّسنجی سەرێ، قەلاّسنجی خوارێ، سەری رەش) لەسەریەکە، وشەی (قیرژە- قیرژا) لە بنچینەدا لە (قیر ڕژا)وە هاتووە، ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە دوو برگە پێک هاتووە، برگەی یەکەم (قیر) ناوە، برگەی دووەم (ڕژا- ڕژە) کاری رابردووی رووتە، بەلاّم بۆ سووکی لەسەر زاران پیتی (را)یەکە لابردراوە و بووە بە (ژە)، (قیرژە) بۆیە ئەو ناوەشی لێنراوە، چونکە (قیرژەی) شاخێک هەیە پێی دەڕێن (شاخی قیرێ) لەو شاخەی لە دەرەزە بەردەکی

(قیـر)ی لێ دەردەچیـچت و دەرژێت، بۆیە ئەو گـوندە بە (قیـرژە) ناونراوە و ناسراوە، لە هەندێک شوێنی دیکەی گوندەکەدا ماددەیەکی رەش وەکی قیـر دەردەبێ، بۆیە ئەو ناوە گومانی ئەوەی لێ دەکرێت کە نەفتی هەبێ، ئەو گوندە ئاوی کەمە، خەڵکەکەی زۆر پەرێشانن، چەند کانیاوێک لەناو باخچە و رەزەکانیاندا هەیە، لەوێوە ئاو دێنن، ئەویش نزیکەی یەک کیلۆمەتر لە گوندە دوورە، لەگەڵ ئەوەشدا گوندێکی بە واریدات و بە خێر و بێرە، رەز و باخچە و داری میوەی کێوی زۆرە. ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٥٥٢) کەس بووە.

**زیارەت**

ناوی گـوندێکە دەکـەوێتـە سـەرەوەی (دەربەندی گۆمەسپان)، بە یەکێک لە گوندە گەورەکانی چیای سەفینی سەرکەش دادەنرێت، ئاقارێکی گەورەو فراوانی هەیە لە چاو گوندەکانی دیکەی ناوچەکەدا ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (ناودارۆکان، سولاوکی سەروو، سولاوکی خواروو، خۆران، قەراسنجی سەروو، حاجی ئەحمەدان) لەسەریەکە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقلاوەیە، گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لە (دۆڵی کـۆرێ) هەیە (زیارەتی مەلا زادان)ی پێ دەڵێن، هەندێ جار زیارەت (زیارەتی خۆشناوان)ی پێ دەڵێن، بۆ ئەوەی جـودا بکرێتـەوە لە زیارەتی دۆڵی کـۆرێ، ئەو گـوندە لە بنچینەدا هی بنەماڵەی (مەلازادان) بووە، بنەماڵەی مەلا مسـتەفـای زیارەتی کـە لە سـاڵی ١٧٨٣ز کۆچی دوایی کردووە. هەنووکە گۆڕەکەی لەوێیە، پیاوێکی پیاو چاک بووە، لەزۆر شوێنەوە خەڵک دێنە سەردان و زیارەتی، بۆیە ئەو گوندە بە (زیارەت) ناسراوە، ئەو شێخ مستەفایەش دەکاتە باپیرە گەورەی بنەماڵەی (خورشیدی عالیم)ی هەولێری، کە لە زەمانێکی زوودوە کەوتوونەتە هەولێر، ئەو گوندە لە ساڵی ١٩٦٠ز نزیکەی ١٠٠ ماڵێک دەبوون، قوتابخانەی میری لە ساڵی ١٩٥٧ز لێکراوەتەوە، ئەو گوندە چەند جارێک سووتێنراوە، شەهیدێکی زۆریشی داوە، لەوانە شەهید (مولازم حەسەن خۆشناو) بووە، کە لە ساڵی ١٩٥٧ز لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە زیارەت خوێندکار بووە، ئەو گوندە تایفەی گورگەشێن و مەلازادەی تێدایە، ژمارەی دانیشتوانی بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٤٨٠) کەس بووە.

**ناودارۆکان (ناودارۆک)**

یەکێکە لە گوندەکانی بناری چیای سەفینی سەرکەش، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقلاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (زیارەت، سولاوکی سەروو، سولاوکی خواروو، بیرۆکان، سووسێ) لەسەر یەکە، ئەو گوندە لە شۆڕشی ئەیلولدا ٣-٤ جار سووتێنراوە، لە ساڵی ١٩٧٨ز بۆ یەکەم جار قوتابخانەی لێ کراوەتەوە.

**سووسێ (سووسە)**

ناوی گـوندێکە لە ناوچەی خـۆشناوەتی هەڵکەوتووە، جاران سەر بە مەڵبەندی قەزای کۆیە بوو، بەڵام پاش دروستبوونی ناحیەی شۆڕش گوندەکانی (دەوبەستی شەرغە، دۆڵی سماقولی)یان خستە سەر ناحیەکە، گوندێکی کۆنە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (بیرۆکان، ناودارۆکان، سماقولی سەروچاوە، ونکە، کێشکێ) لەسەر یەکە، (سووسێ) یان (سووسە ناوێکی کوردییە، هەندێ لە پیرە بە ساڵاچووەکانی ئەو گوندە دەرێن: ناوەکە لە ساردییەوە هاتووە، بۆ نموونە دەرێن: بەخوا برا ئەورۆ سووی سـاردە، جاران ئەو گوندە (١٢٠) ماڵێک دەبوون، زۆربەیان خزم و کەسوکاری یەکدین، خەڵکەکەی بە چاندنی رەزو باخچەو ئاژەڵدارییەوە خەریکن، کاتی خۆی کاروانیان دەکرد دەهاتنە خوارێ بەرەو دەشتی هەولێرێ ئەو مێوەی کە هەیان بوو لە هەنار و ترێ و هەرمێ و هەنجیـر بە گـەنم و جـۆ دەیانگۆڕییەوە و دەیانبردەوە گوندی زەخیرەی ساڵانەیان دابین دەکرد و دایان دەنا، ئەو گوندە چەند جارێک سووتاوە و کاول و وێران راوە لە ساڵەکانی (١٩٦١، ١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٧٤، ١٩٨٤، ١٩٨٨)، ئەو گوندە نزیکەی ٢٢ شەهیدی هەیە لەگەڵ چەند کەسانێک کە سەقەت بوونەو دەست و قاچیان لە دەست داوە، ٣-٤ کەسیشیان بەبەر ئەنفالە بەدناوەکە کەوتوون، ئەم گوندە لە پاش راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ز دووبارە خەڵکە داماوەکەی هەندێکیان

گەڕاونەتەوە دێیەکەی خۆیان دەستیان کردۆتەوە بە دروستکردنی خانووەکانیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو شەهیدانەیان هەیە و (٥-٦) جاریش سووتاوە، یارمەتییەکی وایان نەدراوە شایانی باس بێت، ئەو گوندە کاتی خۆی ئاشی ئاوی هەبووە کە (ئاشی سووسێ)یان پێ دەگووت، ژمارەی دانیشتوانی (سووسێ) بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز (٤٧٧) کەس بووە.

* گوندەکانی (دۆڵی کۆڕێ) لە ناوچەی خۆشناوەتیدا، ئەو گوندانەی دەکەونە (دۆڵی کوڕێ) ئەمانەن: (کوڕێ، ئارماوانی سەروو، ئارماوانی خواروو، زڕگویز، ئاشگە، شێخ مەموندیان، زیارەتی کۆڕێ یان زیارەتی مەلازادان).
(دونگ زاوا، گراو، گەلیاوا، بانەمان، سێوەکە) هەرچەندە ئەو (٥) گوندە دەکەونە بن (چیای پیرمام)ی، هەروەها ئەو گوندانەی دەکەونە سەر چیای پیرمەم ئەوانیش هەر بە دۆڵی کۆڕێ دەژمێردرێن، وا پێدەچێت ئەو گوندانە لە ژێر دەسەڵاتی ئاغاکانی کۆڕێ بوو. لە رابردوودا وەکو گوندەکانی (بیرێژ، ماوەلۆ، گۆڕەشێری سەروو، گۆڕە شێری خواروو).

### ئاشگە (ئاژگە)

ناوی گوندێکە کەوتۆتە دۆڵی کۆڕێ، سەر بە شارۆچکەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەیە لە پارێزگای هەولێر، ٩کم لە سەنتەری ناحیەکەوە دوورە، لە سنووری ناوچەی خۆشناوەتی دایە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (زەرگوز، زێبارۆک، زیارەت کۆڕێ، شێخ مەمودیان، شارۆچکەی سەلاحەدین) لەسەر یەکە، (ئاشگە) ناوێکی دارێژراوی کوردییە، لە دوو برگە پێک هاتووە، برگەی یەکەم (ئاش)، برگەی دووەم (گە)یە، واتە لە (ئاش+ گە)، (ناو+ پاشگری -گە-) پێکهاتووە، کاتی خۆی ئاو زۆر بووە، بەفر و باران زۆر دەباری، ئاوی (شێرەسوار و حوجران و کۆڕێ) دەچۆوە ئەوێ و لەو شوێنە (ئاش) هەبووە، واتە شوێن و جێگای ئاش بووە، کاتێ کە ئەو گوندە ئاوەدان کراوەتەوە بەو ناوە ناونراوە و ناسراوە، یا ئەوەتە لە (ئاتاش+ گە)، (ئاتاشگە)وە هاتووە، خەڵکەکەی بە ئاژەڵداری و باخچەوانی خەریکن، باخچەو رەزی دێمی زۆرە، جۆرە هەنارێکی باشی هەیە، پەلکەکەی زۆر تەنک و ئاوداره، هەناری ئاشگەی پێ دەڵێن، لە کوردستاندا بەناوبانگە وەکو هەناری نازەنینێ، بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز، ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە (٣٩٠) کەس بووە.

### زەرگوز (زڕ گویز)

یەکێکە لە گوندەکانی (دۆڵی کۆڕێ) سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، ٧ کیلۆمەتر لە سەنتەری ناحیەکەوە دوورە، ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (زێبارۆک، ئاشگە، ئارماوانی خواروو، شارۆچکەی سەلاحەدین) لەسەر یەکە، (زڕ گویز) ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە (زڕ+ گویز) واتە لە (ئاوەڵناو+ ناو) پێک هاتووە، لە شێوەی خۆشناوەتیدا دەڵێن (زڕجیز) خەڵکی ناوچەی خۆشناوەتی و دزەییاتی بە (گوێز) دەڵێن (جیز)، لە کۆیە دەرێن (گوز) لە (دەڤەری بارزان) دەرێن (گویز). ناوی ئەو گوندەش لەوەوە هاتووە، کاتی خۆی ئەو شوێنە دار گوێزێکی لێ بووە، بەری نەدەدا واتە (زڕ) بووە، بۆیە کە ئەو شوێنە ئاوەدان کرایەوە ناویان لێنا (زڕ گویز).
لە کوردەواریدا ئەگەر هەر دارێک بەری نەداو نەگرێت دەڵێن (زڕە) وەکو (زڕ توو)، خەڵکەکەی بە ئاژەڵداری و باخچەوانی خەریکن، بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی ٢٤٧ کەس بووە.

### گۆڕەشێر

ناوی گوندێکە کەوتۆتە سەر چیای سەربەن، بەرامبەر (سەری ڕەش) بەلای چیای سەفین هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەیە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (بیرێژ، ماوەلۆ، مەسیف، تەوسکە، کۆڕێ) لەسەر یەکە، گوندێکی خۆش و دڵڕفێنە، ئاوێکی سارد و سازگاری هەیە، باخچە و رەزی زۆرە، شوێنەکەی گۆڕ و چەقێنە بۆ مەڕداری زۆر باش و لەبارە، زستانان مەڕ پێی بە قوڕ نابێ، کاتی خۆی (سادقاغای کۆڕێ) ٤٠٠-٥٠٠ سەر مەڕی هەبوو زستانان دەیبردەوە ئەوێ، وشەی (گۆڕەشێر) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (ناو+ ئامرازی "ە"+ ناو) واتە لە (گۆڕ+ ئامرازی خستنەپاڵی "ە"+ شێر) پێک هاتووە، لەوانەیە کاتی خۆی ئەو (گۆڕە) ئەو شوێنە گیانداری شێری

هەبوبێت، لەو شوێنە پاڵی دابێتەوە، جا ئەوەتە لەو ناوە کوژرا بێت، یا بریندار بێت، هەرچەندە لە ساڵانی چلەکان لێرە (پڵنگ) دیتراوە کوشتوویانە، بەڵام شێر نەدیتراوە، لەوانەیە ناوەکەی لەوەوە هاتبێت.

لەم ساڵانەی دوایی گوندێکی دیکە بە هەمان ناو لە خوارووی ئەو دامەزراو ئاوەدان کرایەوە ئەویش (گۆڕەشێری خواروو)ە، هەروەها گوندێکی دیکە بە هەمان ناو لە (دۆڵی مەلەکان)دا هەیە.

**گۆمەسپان و دەربەندی گۆمەسپان**

ناوی گوند و دەربەندێکە لە ناوچەی خۆشناوەتیدا، گوندەکە دەکەوێتە نزیک دەرکی دەربەندەکەوە، گوندەکەو دەربەندەکە بە "گۆمەسپان" ناونراوە و ناسراون، گوندەکە سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، دەرێن کاتی خۆی ئەو گوندە بە موڵک هی (بنەماڵەی مەلازادان) بووە، واتە هی بنەماڵەی مەلا (مستەفای زیارەتی) بووە، کە دەکاتە باپیرە گەورەی (خورشیدی عالیم) ئەو گوندە بە "گۆمەسپان"ی مەلازادان بەناوبانگ بووە، پاشان ئەو بنەماڵەیە فرۆشتوویانەتە (میرانی مەحمود بەگ)، سەردەمێکیش میرانی قادر بەگ و براکانی خورشید بەگ و کەریم بەگ و یەحیاو تاهیر بەگ لەوێ دادەنیشتن، کەریم بەگی برای میرانی قادر بەگی لە گۆمەسپان دادەنیشت، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و نێژراوە.

"گۆمەسپان" ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (گۆم+ ئامرازی "ە"+ سپان) واتە (ناو+ ئامرازی خستنەپاڵ+ ناو) پێک هاتووە، ئەو ناوە لە بنچینەدا لە (گۆمی ئەسپان)ەوە هاتووە، دیارە کاتی خۆی ئەو ناوە گۆماوی زۆر بووە، رەوەند و کۆچەرەکان هەسپ و وڵاغیان لێ ئاو دایە، بۆیە ئەو شوێنە کە ئاوەدان کرایتەوە بەو ناوە ناونراوەو ناسراوە، وشەکە سواوەو بە پیتی (ی،ھ) لابردراوە، لە (گۆمی هەسپان) بووە بە (گۆمەسپان) وەکو لە وشەی (بیرەسپان) لە بنچینەدا (بیری هەسپان) بووە، بووەتە (بیرەسپان). ئاقاری گوندی گۆمەسپان لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (ئەشکەو سەقا، بناوی، حاجی وسوو، کانی کەوان) لەسەریەکە، بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی (٢٢١) کەس بووە، هەر لە دەربەندی گۆمەسپانی چووینە ژوورەوە سنووری ناوچەی خۆشناوەتی دەست پێ دەکات، رووباری بەستۆڕەی تخووبە، خەڵکی دەڤەری دزەییاتی بە دەربەندی گۆمەسپانی دەرێن (دەربەندی خۆشناوان) دانیشتوانی ئەو گوندە زۆربەیان خۆشناون، چەند ماڵە گەردیشی تێدایە، دانیشتوانەکەی بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵییەوە خەریکن.

**گراو**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە بن چیای (سەری رەش) لە ناوچەی خۆشناوەتیدا هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دۆنگ زاوا، قیرژە، سێوەکە، سەری رەش) لەسەر یەکە، گوندێکی زۆر کۆنە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نازاندرێ، ئەوەندە هەیە لە دێر زەمانەوە سێ برا بە ناوەکانی (مەلا ئەحمەد، مەلا موسا، مەلا محەمەد) لە گوندی (بانەو بەرۆژەی) ناوچەی بانەی کوردستانی ئەودیودا هاتوونەتە ئەو ناوەو لێرە دامەزراون، هەنووکەش دانیشتوانی ئەو گوندە زۆربەیان لە نەوەی ئەو سێ برایانەنە لەگەڵ چەند ماڵێکی دیکە، کە لە گوندەکانی دەوروبەرییەوە هاتوونەتە ئێرە، وشەی "گراو" لە بنچینەدا لە (گرئاو- گەرئاو- گەڕاو)ەوە هاتووە، وشەیەکی لێکدراوی کوردییە لە (گر+ ئاو) پێک هاتووە، وشەی (گر) یان (گروو) یان (گوری)یە یان (گەر)ە، وشەی (گەر) لە زمانی فارسیدا بە مانای (کەچەڵ- گروو) دێت، (گەڕاو) دەرماناوەی پێدەرێن، (دەرمان ئاوە) دەرماناو ئاوەکەی وەک دەرمان وایە بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی خورشت و گەری و گروو- گوری و کەچەڵی دەبن، ئەو جۆرە ئاو و کانیاوانە لە کوردستاندا گەلەک زۆرن، وەکو (حەمام جەلی) دەرماناوەی شارۆچکەی مەخموور، لە گوندی (گراو)ێ سێ کانی هەیە: ١- کانی گراو (دەرماناوە)شی پێ دەرێن، ئاوێکی ساردی هەیە، بەڵام بۆ خواردنەوە دەست نادات مەگەر بە ناچاری نەبێت، ئاوێکی کانزاییە، باخچەی پێ ئاو دەدەن، ئەو بەروبوومەی ئەو باخچانەی کە بەو ئاوە ئاوەدەدرێن تام و بۆیەکی تایبەتی هەیە، کاتی خۆشی کە گوندی (گراو- گەڕاو) ئاوەدان بوویتەوە و ئەو ناوەی لێ نراوە، هەر بە ناوی ئەو کانییەوە کراوە و ناسراوە، کە ئاوەکەی (گەر) بووە.

٢- کانی هەنجیر ئەو کانییە لەبن دار هەنجیرێکەوە هەڵدەقوڵێت، ئاوێکی شیرین و سارد و سازگاری هەیە.

٣- کانی مزگەفتێ، ئەو کانییە لەناو حەوشی مزگەفتییە. زۆرجاران دەبینین ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی خورشت و گروو و کەچەڵی دەبن دێنە ئێرە لە (کانی گراوێ) خۆیان لە لیتەو قوڕی ئێرە هەڵچەدەسوون و خۆیان پێ دەشۆن، گەلەک جاران چاک دەبنەوە بەرایان لێ نامێنێ، بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی (٥٧٦) کەس بووە، لەو گوندەدا هەنووکەش شوێنەواری چەند چاڵە بەفرێک هەیەو ماوە. گراو کاتی خۆی قوتابخانەی ئاینیی هەبووە، لە زۆربەی ناوچەو دەڤەرەکانی کوردستاندا بۆ خوێندن دەهاتنە ئەوێ لەوانە (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) لەوێی خوێندووە، مامۆستا (محەمەد وەسمان) بۆی گێڕامەوە گوتی باوکم گێڕایەوە فەقێیەک خەڵکی شاری (ئەرزەڕۆم)ێ بوو لە باکووری کوردستان هاتبووە قوتابخانەی گراوێ، لەوێ نەخۆش کەوت و مرد، خەڵکەکە زۆر نیگەران بوون لەبەرئەوەی بێ کەس بوو بە ڕێوڕەسمێکی گەورەو زۆر بەڕێزەوە ناشتیان.

### دۆنگزاوا

ناوی گوندێکە لەدەو ڕووباری بەستۆڕەی، نزیک بە گوندی (گراو)ێ، بەرامبەر چاکی (شێخ زەینەلی) هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینی قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، بە ٦کم لە سەنتەری ناحیەکەوە دوورە، گوندێکی کۆنە ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گراو، سێوەکە، قەلەمان) لەسەریەکە، لایەکیشی ڕووباری بەستۆرەیە، کاتی خۆی بە مووڵک هی بنەماڵەی (.........) بووە، فرۆشراوەتە بنەماڵەی (حەمەدەمیناغای ماوەلۆی) کاتی خۆی لە ساڵانی پێش گرانی گچکەی ساڵی ١٩١٧ز، (١٠-١٢) ماڵێک دەبوون کاتی خۆی ئاغای (دۆڵی کۆڕێ) حەمەدەمیناغا کە گەورەی ئەو مەڵبەندە بووە، واتە دۆڵی کۆڕێ لە گوندی ماوەلۆ دادەنیشت، پیاوێکی ناودار بووە، شەش کوڕی هەبوو لەوانە مەجیداغای کۆڕێ بوو، دەگێڕنەوە دەڵێن لە کاتی هاتنی ئینگلیزەکان (حەمەدەمیناغا) تەقان بە ئینگلیزەکان وەدەنێ، ئێ خۆ ئەوکاتیش تەقەنان بە ئینگلیز شتێکی کەم نەبووە، خەڵکەکە لە ترسان گوندەکەی چۆڵ دەکەن، لەشکری بەریتانی گوندەکە دەسووتێنن، خەڵکەکە دەڵێن: بەخوای حەمەدەمیناغا ئیشێکی خراپت کرد، ئەویش دەڵێ: نا نا ئیشێکی باشم کردییە، خۆ خەڵک دەڵێن حەمەدەمیناغا لە ئینگلیزی عاسێ بووە، ناوم دەچێتە هۆندرێ (مەبەستی لە وشەی "هۆندرێ" شاری لەندەن بووە). بە پێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧ز ژمارەی دانیشتوانی ئەو گوندە (٦٤) کەس بووە.

### کونەفلوسە

ناوی گوندێکە لە ناوچەی خۆشناوەتیدایە، لەناو چیای هەورێ هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی (خۆشناو)ە، کە مەڵبەندەکەی شارۆچکەی (هیران)ە، سەر بە قەزای شەقڵاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندەش لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کامووسەک، بێلنگە، قریز، چیوە، شارۆچکەی هیران) لەسەریەکە، کونەفلوسە گوندێکی کۆنی ناوچەی خۆشناوەتییە، مێژووی ئاوەدان کردنەوەی نازاندرێ، وشەی (کونەفلوسە) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (کون+ ە+ فلوس+ە) واتە لە (ناو+ ئامرازی خستنەپاڵ+ ناو+ ئامرازی خستنەپاڵ) پێک هاتووە، بۆیە ئەو شوێنە ئەو ناوەی لێنراوە و بەو ناوە ناسراوە و پێی گوتراوە (کونەفلوسە) چونکە کانییەکی لێیە کونی کانییەکە هەندەی (فلووس)ێک دەبێت، ئەو گوندە ئاوی زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوندێکی بە واریدات و بەخێر و بێرە، لە نزیک ئەو گوندە گەلییەک هەیە بەناوی (گەلی مەندێر) لە چیای هەورێ چەند کانییەک هەیە وەکو (کانی هەورێ، کانی رەفتێ) لەسەر چیای هەورێ دایە. هەر لە کۆنەوە ئەو گوندە مەدرەسەی ئاینیی هەبووە، بنەماڵەی شێخ محەمەد کە دەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا محەمەدەمین بێتواتەیی) لەوێ مامۆستا و مودەڕیس بووە، تەنانەت مەلا محەمەدئەمینی کوڕی لەوێ لەدایک بووە، باوکیشی هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووەو لەوێش بەخاک سپێردراوە، پاشان مەلا محەمەدەمین لە ساڵی ١٩٠٤ز هاتۆتە ناو شاری هەولێر لە مزگەوتی حاجی قادری دەباغی هەولێری بوویتە ئیمام و وتاربێژ. کاتی خۆی ئو گوندەدا دوو ماڵە جوولەکەی تێدابووە، ١- ماڵی دانیال. ٢- ماڵی داودۆکەی ژنەکەی ناوی (خونچە) بوو.

### کامووسەک

یەکێکە لە گوندەکانی دەڤەری خۆشناوەتی، سەر بە

ناحیەی (هیران- خۆشناو)ی قەزای شەقلاوەی پارێزگای هەولێرە لە باشووری کوردستاندا، لە بناری چیای هەورێ هەڵکەوتووە، بە مـــێـــوەو تووتنی بۆندار بەناوبانگە، ئاقـارەکـەی لەگـەڵ ئاقـاری گـوندەکـانی (کـۆلکەرەش، کونەفلوسە، گردەشێر، شارۆچکەی هیران) لەسەر یەکە، گـوندێکی کـۆنە، (کـامـووسـەک) ناوێکی لێکدراوی کوردییە، لە (کاک مووسەک)ەوە هاتووە، پیتی "ک"ی دووەمی (کـاک)ە کە لابردراوە، بۆ سووکی لەسەر زاران بووە بە "کاموسەک"، ناوە لە "کاک+ مووسەک" واتە لە (ناو+ناو) پێکهاتووە، لە کۆمەڵگای کوردەواریشماندا ئەو جـۆرە ناوانە زۆرن وەکـو (کـاک بایز، کـاک رەسـول، کـاک عـەلی، کـاک وەیس) دەبنە (کـابایز، کـارەسـول، کـاعـەلی، کـاوەیس، کـاک حوسێن (کاحوسێن). ئەو گوندە نزیکەی ٩٠ مـاڵ دەبوو، بە چاندنی رەزو باخـچـە و ئاژەڵدارییـەوە خەریک بوون، بزنی زۆر بوو، بە تایبەتی (بزنە مەرەز) لەو شـوێنەدا باش هەردەکـەوێ، مـووەکـەشی سـوودێکی زۆری هەیە، دەکرێتـە (کـر). ئەو گـوندە ئاشـێکی ئاوی هەبوو، ئاوی هیـرانێ بە ئاقـارەکـەیدا دەڕۆیی، جـۆگـەلەکـیـان هەڵبەسـتـبـوو بۆ ئاشـەکـە، مزەی ئەو ئاشـە بەشـێکی بۆ مزگەوتی (کونەفلوسە)ی بوو، بەشەکەی دیکەی بۆ ئاشی وەسـتاکـە بوو کـە ناوی (وەسـتـا مـسـتـەفـا) بوو، خـەڵکی گوندەکە بوو، ئەو گـوندە دوو کارگەی بەرداشی تێدا بوو، هەر لە کـۆنەوە دەزگـاو کـارگەی دروسـتکردنی (بەرداش و دەســتــار)ی هەبووە، ئەو جـۆرە بەردەی کـە (دەســتــار و بەرداش)ی لێ دروست دەکـرێ، تەنیـا لـەو دەڤــەرەداو لە ئاقاری ئەو گوندەدا هەبووە، چونکە بەردی هەموو چیایەک نابێـتـە (بەرداش)، بەردی ئەو شـاخـە ئاگـردارە، بۆیە کارگەکەش هەر لەوێ دامەزرا بوو.

ئەو بنەمـاڵانەی لەو گونددا کـە دەزگـای (بەرداش)یان هەبووە ئەمانە بوون:

یەکەم: بنەماڵەی (مەلا حەسەن)ی و نەوەکانی (حەمەد مستەفا حەسەن و حوسێن مستەفا حەسەن) برا بوون، ئەو کار و پیشەیەیان لە باوک و باپیرانیانەوە بۆ مابۆوە.

دووەم: بنەمــاڵەی (حـاجی رەســول ســاڵح)ی، ئەو بنەمـاڵەیەش ئەو کـارانەیان دەکرد. لە گـوندەکـەدا ئاقـارەک هەیە پێی دەڵێن (بەردبڕ) لەوێ نزیکەی بەژنـەک خاکـەکـە هەڵدەقەنێن و ئەو تەختە بەردانە لەبن ئاخێ کە لە شێوەی (کـێل- تەخـتـە) بەرد دایە. دەردەهێنن، پاشـان زۆر بە ئەسپایی و لەسەرەخۆ ئەو تەختە بەردانە لە شوێنێکی زۆر تەخت و راست دادەنێن نەوەک خـــواروو خـــێـچ بێت و بشکێت، چونکە بەردەکـە لەبن ئاخـێـدا نەرمـە، بەڵام کـە هەوای سەر زەوی پێ بکەوێت، یەکسەر هیشک و رەق و توند دەبێت. ئەوجا وەستای تایبەتی و کارامە و شارەزاو پســپــۆڕ هەبوون (بەرداش)ەکـەیان دروست دەکـرد و لە (تۆق)یان دەگرت، جاری وا هەبوو ئەگەر (بەرداش)ەکە لە دەســتــیــان بشکابایە یان خـوارو خـێـچ بایە یا ئەوەتە لە دەســتــیــان دەرنەچووبایە ئەوە دەیان کـردە (دەســتــار) هەر لەوێوە ئەو (بەرداش و دەســتــار)انەیان بە کــەر و بار و هێــســتــران بار دەکــرد بۆ فــرۆشتن دەیان بردە ناوچەو دەڤـەرەکـانی دیکەی کوردسـتـان، وەکـو دەشـتی دزەییـان، دەشــتـی ســاڵەیی، دەشــتـی بیــتــوێن، پشــدەر، نـاوچەی باڵەکـایەتی، دەڤـەری بارزان، ناوچەی گـەرمـیـان، دەشتی بەڕانەتی، تەنانەت هەتاکو بۆ (بەری بادینان)یشیان دەبرد، ئەمـەش بە کـەر و بارو بە کـاروانان بوو، هەر گـوێ درێژەک دەستارەکـیـان لێ بار دەکرد بە گوریس یان بە کەژ (لنگە- تایە)ک لەمـلاو تایەکەی دیکە واتە (لنگە) دەسـتـارەکەی دیکە لەولای، هەر هێــســتــرێک دوو دەســتــاریان لێ بار دەکرد، چونکە هێستر بەهێزتردو ماڵی کاروانە، جاری واش هەبوو خـەڵکی لە نـاوچەو دەڤـەرەکـانی دیکەی کوردسـتـاندا بەخۆیان دەهاتن دەیان کڕی و دەیانبـردەوە، ئەو (بەرداش و دەسـتـار) دروسـتکردنەش بەهاو قـیـمـەتێکی باشی ئابووری هەبووە و بازرگـانی پێ دەکرا، لەم بارەیەوە (مـام مـحێـدین خۆشناو) کە لە دایکبووی گـوندی (کـامووسـەک)ەوە بۆی گێڕامەوە گـوتی: لە زەمـانی مـەلەکی (دەستار)مـان بە دوو دینـار دەفـرۆشت، بۆ ئەو وەخـتـی ئەو دوو دینـارە پارەیەکی کــەم نەبوو، زۆر بوو، هەمــوو کــەســێک نەیدەتوانی (دەسـتـار)ی بکڕێ تـەنیـا ئەو مـاڵانەی کە دەوڵـەمـەند و خـــاوەن مـــەڕومـــاڵات و زەوی و زار بوون، لە دەڤـــەری باڵەکـایەتی (بەرداش) و (دەســتــار) دروست دەکـرا بە تایبـەتی لە (حـاجی ئۆمـەران)دا، بەڵام دەسـتـاری ئەوێ نەدەگـەیشــتــە بەرداش و دەســتـاری (کـامـووسـەک)ی خـۆشناوەتی، بەرداش و دەسـتـاری کـامـووسـەکی لە هی هەموو شوێنێک و جێگایەک باشتر و بەناوبانگ تر بوو.

**گردەشێر**

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی خۆشناوەتی، لە نێوان

گوندی (سکتان و کۆلکەرەش)ی هەلکەوتووە، لە چیای هەورێ دایە، سەر بە ناحیەی (هیران)ی قەزای شەقلاوەی پارێزگای هەولێرە، ئاقاری ئەو گوندە لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (کامووسەک، پەرژین، کوونە فلوسە) لەسەر یەکە، کاتی خۆی لە شەستەکاندا تاقە ماڵە بووە، خوالێخۆشبوو (حاجی عەولا) ناوێک لەو گوندە بووە، پیاوێکی مەرد و جوامێر و نانبدەو خانەدان بوو، (گردەشێر) ناوێکی لێکدراوی کوردییە لە (گرد+ە+شێر) واتە لە (ناو+ ئامرازی خستنەپاڵ+ ناو) پێک هاتووە، گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لە دەشتی بەرانەتی دەشتی هەولێردا هەیە، سەر بە قەزای خەباتە، گردێکی گەورەو پانی لێ هەیە، گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو لە دۆڵی مەلەکاندا هەیە.

لەو گوندانەی بناری چیای سەفینی ئاشی ئاوی کەم بوو، سێ ئاشی ئاوی لە گوندی کۆڕێ هەبوو، یەکێکیان لە دەربەندی کۆڕێ بوو (ئاشی سپی)یان پێ دەگوت، ئەوی دیکەیان لە خوارەوەی وی بوو (ئاشی تایەر)یان پێ دەگوت، ئاشێکی دیکەش لە خوار گوندی بوو (ئاشی مەلازادان)یان پێ دەگوت.

لەمبارەوە (سەید حەمەدەمین) لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٠ لە گوندی (ئەشکەوسەقا) بۆی گێرامەوە گوتی: هەر لە (دەربەندی گۆمەسپان)ی هەتا دەگەیشتە گوندی (هەنارە)ی (٧) ئاش هەبوو، لەدەو بەستۆرەی لە گوندی هەنارەی ٣ ئاش هەبوو، لە دەربەندی گۆمەسپانیش ٢ ئاش هەبوو، لەدەو رووباری سارتکە (٢) ئاشی لێ بوو، لە گوندی (سووسێ) لە دۆڵی سماقولی ئاشێک هەبوو، جاری وا هەبووە دەچووینە ئاشی بە هەفتەیەکی بەبەرمان نەدەکەوت، شەو دوو شەو دەماینەوە لەوێ (خەروا)مان دروست دەکرد و دەمان خوارد.

## سکتان

ناوی گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی خۆشناوەتی سەر بە مەڵبەندی قەزای کۆیەیە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (گردگۆران، سیناوە، نازەنین، کۆلکەرەش، کامووسەک) لەسەر یەکە، سکتان گوندێکی زۆر کۆنە، دروستکردن و ئاوەدان کردنەوەی دەگەرێتەوە بۆ گەلەک پێش پەیدابوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بە گوێرەی قسەی پیرانی بەساڵاچووی ئەو گوندە کە دەماو دەم ئەوانیش لە باوک و باپیرانیانەوە گوێیان لێ بووە و بیستوویانە، ناوی ئەو گوندە لەوەوە هاتووە دەڵێن ئەو ناوچەیە پاشایەکی لێ بووە ناوی (ئەبرەهام) بووە لەسەر ئایینی مەسیحی بووە، کچێکی هەبووە ناوی (سکتان) بووە ئەو گوندە کە ئاوەدان کراوەتەوە بەناوی وی کراوە، وا پێ دەچێت سکتان کاتی خۆی زۆر گەورەو فراوان بوو بێت، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە قەبرستانێکی زۆری تێدایە (٢٦) گۆرستانی هەیە، کە شوێنەوارەکەی هەرماوەو هەندێکیان روویان بەرەو رۆژئاوایە، هەندێک بەرەو قودس شراونەتەوە، سەردەمێکیش بە (سکتان) وتراوە (مارەتوو)، سکتان زۆر شوێنەوار و کەلاوەی کۆنی تێدایە لەوانە کەلاوەی کەنیسەیەکە، قەڵایەکی پاشای گەورەی رواندزی تێدایە شوێنەوارەکەی هەر ماوە، گردێکی دیکە (گردە دیانا)، سکتان دوا سنووری میرنشینی سۆران بووە لەگەڵ میرنشینی باباندا، ئەو قەڵایە لە سەردەمی پاشای گەورە هەردەم جەمەی دەهات لە سەربازی پاشای سۆران، هەردەم کۆبوونەوە و راوێژکردنی سەربازییان لێرە بووە، کاتێ لەگەڵ پاشاکانی باباندا تەنگ و چەڵەمەکیان لە نێواندا هەبووایە، لەو قەڵایە کۆدەبوونەوە، سکتان جاران لە (٢٠٠) ماڵ زیاتر بووە، لە ساڵی ١٩٨٨ بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون، هەنووکە نزیکەی (١٥٠) ماڵێک دەبن لە چەند گەرەکێک پێک هاتووە، وەکو گەرەکی سەیدان، گەرەکی خزمانی رەوەند (چۆلپەرست)، ناو گوند، گەرەکی سەر جادەکە، پرۆژەی ئاو و کارەباو قوتابخانەو مەڵبەندی تەندروستی و جادەی هیران- هیندۆپ بەناو گوندەکەدا دەروات، سکتان لەو ساڵانەی دواییدا کراوەتە ناحیە.

### سەرچاوەکان

١- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لە گەرەکەکانی شاری هەولێر، ئازادی، رووناکی. کوران لەگەڵ پیرە بەساڵاچووەکانی دەشتی دزەییایەتیدا.
٢- دیوانی خوالێخۆشبوو مامۆستا ناسیح حەیدەری، ئامادەکردنی شێروان حەیدەری، هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین.
٣- دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، ئومێد کاکەرەش، سلێمانی ساڵی ١٩٩٩.

**پەراوێزەکان**

- دلدار - شاعیری شۆڕشگێری کورد - نووسینی عەبدولخالیق عەلائەدین - بەغدا ١٩٨٥ - ل ٤.
- گەشتی ژیانم - مەسعود محەمەد ل ١٥٣.
- یاداشتەکانی منداڵی و بەشێکی سەردەمی فەقێیایەتی- مەلای محەمەدی چرووستانی - ل٨٢-٨٣-٨٤.
- دلدار شاعیری شۆڕشگێری کورد ل ٥٤-٥٥.
- هەندێک دادوەری بەناوبانگ - جەمال بابان - بەغدا ١٩٨١، ل ١١٧.
- هوشیار عەبدوڵلا - دزەیی و ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێر - دەستنووس.
- مەلا محەمەدی چرووستانی - بەغدا ل ٨١-٨٢.
- هەولێرم وا دیوە و - بیستووە / مەولوود بێخاڵی -هەولێر ١٩٩٧.
- اصول اسماء المدن والمواقع العراقية - جمال بابان -ج١ - ص ١٦٤.

**بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لەم بەڕێزانەی خوارەوە وەرگرتووە.**

١- حاجی جەمیل سمایل، کە ئەحمەد کوڕی مستەفای کوڕی مستەفای کوڕی عەلی خاسەیە، لەدایکبووی ساڵی (١٩١٦ز.)ی گوندی (سوریەش)ە، لە ساڵی ١٩٢٧ کەوتۆتە شاری هەولێر، هەنووکەش لەژیاندا ماوەو شوکور تەندروستی باشەو لە هەولێر نیشتەجێیە.

٢- حاجی مەجید ئیسماعیل نەبی لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠ دانیشتووی گوندی (دارەتوو)ە.

٣- حاجی عەبدوڵلا وەسمان کوێخا شەریف، لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠ز. (گردەعازەبان)ە.

٤- کاک عەلی عومەر ئەحمەد مرۆت، لەدایکبووی ساڵی ١٩١٩ز.، خەڵکی گوندی (قورشاغلووە) ئێستا لە گەڕەکی ماجیداوەی هەولێر نیشتەجێیە.

١) سەید مەولود بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە ـ بیستووە چ١، هەولێر ١٩٩٨.

٢) حەمید گەردی، هۆزی گەردی لە بنەڕەتدا، چ١، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٨

٣) لەتیف بەرزنجی، شێخ محمود لە شیعری کوردیدا، چ١، بەرگی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٠.

## چاوپێکەوتنەکان

چاوپێکەوتنەک لەگەڵ (حاجی محمد قادر زێدبەگی) خەڵکی گوندی (شەرەبۆت) لە رۆژی ١٥/٤/١٩٩٨، هەنووکە لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

چاوپێکەوتنەک لەگەڵ (حاجی ئەحمەد سولەیمان ئەحمەد هەرکی) لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠ ی گوندی دێرەی سەر بە ناحیەی سەلاحەددین لە رۆژی ١٤/١/٢٠٠٠.

چاوپێکەوتنەک لەگەڵ کاک (سەعید رەشید عوسمان دێرەیی) لە ٢٠٠٢/٢/٧، هەنووکە لە گوندی شێخان نیشتەجێیە.

لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی جوگرافیا و مێژووی هەندێک لە گوندەکانی ناوچەی بەرانەتی دەشتی هەولێر

ناوچەی بەرانەتی یا (بەرانی - بەرانیان) بەشێکە لە دەشتە پان و پۆر و گەورە و فراوانەکەی دەشتی هەولێر، دەکەوێتە باکور و باکوری رۆژئاوای شاری هەولێر. سنوورەکەی لە رۆژهەڵاتەوە لە هەولێرەوە ئەو شارێگایەی کە دەست پێدەکات بەرەو ناحیەی مەسیف هەتا دەگاتە بەستۆڕەی بە دەستە چەپی رێگاکە ئەو گوندانەی سەرەوەی هەولێر تا دەگاتە رووباری بەستۆرەی، کە دەبێتە سنوور لە بەینی (دەشتی زرارەتی) و (ناوچەی بەرانەتی) لێک جودا دەکاتەوە. لە رۆژهەڵاتیشەوە لە رێگای هەولێر - کەلەک - موسل کە دەچین بە دەستە راستی رێگاکە ئەو گوندانەی کە دەکەونە سەرەوە و دەستە راستی رێگاکە تا دەگاتە زێی بادینان (زێی گەورە) ئەوە ئەو ناوچەیەیە بە بەرانەتی یا (بەرانیان)یان (بەرانی) دەخوێندرێتەوە و ناسراوە، دانیشتوانی ئەو ناوچەیەش بە زۆری لە عەشیرەتی (گەردی)نە لەگەڵ هەندێک لە هۆزەکانی دیکەی کوردەواری وەکو (شێخ بزێنی) لە گوندەکانی (کەورگۆسک و گاینج و جدیدە زاب و شیودرەش) نیشتەجێنە (مەموند)

لە گوندەکانی (چاروکی گەورە، چاروکی گچکە، مامەلۆک، خەزنە، تەرجان پێمەڕەبڕ، شەمامەر) نیشتەجێنە سەرۆک هۆزەکانی (حاجی جەمیلی حاجی سادقی مستەفای هەمزەی وسو ئامان) یێ بووە کە لە گوندی خەزنە دادەنیشت ئەو سێ گوندەی دوایی سەر بە ناوچەی شەمامک بووە (هۆزی کارەش) لە گوندەکانی (گەزنە، قەلاّنچۆغان)ی دادەنیشن (بامەند) لە گوندی (تۆبزاوەی زاب) دادەنیشن، جگە لەمانە (ئۆمەر بل) هەنە لە گوندی (گردەچاڵ)، سەید هەنە (هەرکی) کە هەندێکیانلە بەری بادیناوە هاتوون کەوتوونەتە ئەو ناوە لە گوندەکانی (دەشتی بەڕانەتی و دەشتی شەمامک)ی نیشتەجێ بوونە وەکو ئاغولان کە هەنووکە گوندە نوێیەکە بە (ئاغولان هەرکی) ناسراوە، لە ناو قەزای خەبات زۆرن لە گوندەکانی (لاجان و دەلوگول) نیشتەجێنە.

گەردییەکانیش لە گوندی (بەحرکە) نیشتەجێنە لە باکوری هەولێرەوە هەتا دەگاتە رووباری بەستۆڕەی بە درێژایی رووبارەکە بەلای باکور و باکوری رۆژاوە هەتا سەر زێی بادینان (زێی گەورە ـ سەروو) لەو بەری بەستۆڕەش ئەو گوندانە هەیە، (بەربیانی گەورە، بەربیانی گچکە، پەرپیستان، دەرەش، تۆبزاوەی گەردی، دێرە، شێخان، سەروکانی، هەرشەم) ئەو ٥ - ٦ گوندەی دوای جاران هی عەشیرەتی گەردی بووە، هی (مەجیداغەی کوڕی شێخ محەمەداغەی گەردی) بووە لە پاش مردنی (مەجیداغەی) کوڕەکانی فرۆشتوویانەتە هەرکییەکان، هەروەها گوندی (شێخان )هی بنەماڵەی (شێخ ئەبو بەکری هەرشەمی) بووە. زۆربەی دانیشتوانەکەی لە هۆزی گەردینە، ٥ - ٦ ماڵە هەرکیشی تێدایە، سەر بە ناحیەی سەلاحەدینە، جاران هەموو گوندەکانی دەشتی بەڕانەتی سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێر بوو، بەڵام پاش ئەوەی ناحیەی خەبات دروست کرا ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی ناحیەی عەنکاوەی دەشتی بەڕانەتی خرایە سەر ناحیەی خەبات هەنووکە گوندی بەحرکەش کراوەتە ناحیە و خەباتیش بوویتە قەزا.

ئەو گوندانەی ناوچەی بەڕانەتی کە سەر بە ناحیەی عەنکاوەن ئەمانەن (بەحرکە - گردجووتیار - شێخەشەل- تەل مووسەک - کەلەکان - قەرەمورتک- براغ - مەلائۆمەر - شەوەک - کەلەکین - کەرک- شاوێس - پیرزین -گەزنە - شەمعووناوە - ئاشۆکان - گرد ئارەق - گردەچاڵ - شەوزار - قەفەر - سەرکەور - جێژنیکان ئەبابەکر - جێژنیکان نەجیم - جێژنیکان صالح - بێرکۆت).

گوندەکانی دەشتی بەڕانەتی کە سەر بە قەزای (خەبات)ن ئەمانەی خوارەوەن:

(سێبیرانی گەورە - سێبیرانی گچکە - قەلاتگە - قەلانچۆغان - دارەبەن - بەرحوشتر - شاخۆران - سەیدان - مەموندان - شیوەڕەش - گاینج - ئاغولان - گردەشێر - سمایلاوە - جدیدە زاب - تۆبزاوە - گردەڕەشە زاب - چەمە دوبز - مەلا عومەر - چاروکی گەورە - چاروکی گچکە - کەوڕە بەن - ساتۆر - کەورگۆسک - جمکە - بن بێرز - قەریەتاغ - دەلوگول- کانی قرژاڵە).

زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەو گوندانەی سەرەوە سەر بە عەشیرەتی گەردین بەڵام گوندەکانی (کەورگۆسک - گاینج - شیوەڕەش) سەر بە عەشیرەتی شێخ بزێنین کە لە کاتی خۆی لە پارێزگای کەرکوک کەوتوونەتە دەو زێی بادینان.

(کەوڕەبەن، باڵەکین، کانی قرژاڵە) شێخ مەموندینە، گوندەکانی (کانی قرژاڵە، جمکە، بن بێرز، قەریەتاغ، دەلوگول) هەرچەندە سەر بە ناحیەی خەباتن بەڵام بە ناوچەی بەڕانەتی ناخوێندرێنەوە ئەو گوندانە بە (ناو ئاقار) دەخوێندرێنەوە واتە کەوتوونەتە ناو ئاقاری شاری هەولێر.

لە بابەتی ئەمجارەماندا لە جوگرافیا و مێژووی هەندەک لە گوندەکانی بەڕانەتی دەشتی هەولێر و هەندێک لە گوندەکانی هاوسنووری دەشتەکە و ناوچەکە دەدوێین.



# گوندی ساتو قەڵا

**ئەژین خالید**

ساتو قەڵا، گوندێکە لە گوندە دێرینەکانی کوردستان، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێر و سەر بەشارەوانی ناحیەی ئەقتەقە لە قەراغ زێی بچووک و سەر بە پارێزگای هەولێرە. ئەو گوندە پێش ئەنفال نزیکەی (١٥٠) ماڵ بوون، بەڵام ئێستا نزیکەی (١٠٠) ماڵێک نیشتەجێ بوونەتەوە، خەڵکی ئەو گوندە بەکشتوکاڵ کردنەوە خەریکن و بەرهەمی سەرەکیان گەنم و جۆو میودی هاوینەو توتنە. هەندێکیان بە ڕاوە ماسییەوە خەریکن و دەستی ئاوەدانکردنەوە گەیشتووەتە ئەو گوندە و قوتابخانەیەک و خانووی مامۆستا و پرۆژەی ئاوی لێ دروست کراوە، خەڵکی ئەو گوندە ئێستا سەرقاڵی کشتوکاڵ کردنن و ژیان بەخۆشی دەبەنە سەر.

**مێژووی دروستبوونی ئەو گوندە و قەڵا دێرینەکەی:**

مێژووی گوندی ساتو قەڵا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گاور کارەکان. کۆنی ئەو گوندە خۆی لەوە دەنوێنێ کە قەڵایەکی زۆر گەورە و بەرین لەناو ئەو گوندە دروست کراوە و دۆزینەوەی ئەو ئاسەوارە دێرینانە لەناو و لە دەوروبەری ئەو قەڵایە بەڵگەن بۆ کۆنی و دێرینی ئەو گوندە، هەبوونی چەند گۆڕستانێکی دێرین ئەوانیش خۆی لەخۆیدا بەڵگەن. لەپێش ئەنفالە بەدناوەکە دەرگایەکی بەقادرمە هەبووە بۆ چوونە ناو

قەلاکە، بەلام پاش ڕووخانی کۆشک و تەلاری ئەو گوندە ئەو دەرگایەش ون بووە و کەس نەیتوانیوە بچێتە ناو قەلاکەوە بەهۆی کوژانەوەی ڕووناکی و تاریکی ناو قەلاکە.

دروستکردنی ئەو قەلایە لە چەند بەش و چینێک پێکدێت، چینێکی لەخاک پێکهاتووە چینێکی لە لم و چینێکی لە بەرد و چینێکی لە خۆلەمێش دروست کراوە، ئەو خۆلەی ئەو قەلایەی لێ دروست کراوە جیاوازە لەگەڵ خۆلی دەوروبەرەکەی.

شوێنەوارناسان لەساڵی ١٩٩٨ هاتن پشکنیان و بڕیاریان دا کە ئەو قەلایە تەلبەند بکرێت و وەک شوێنەوارێکی کۆن بمێنێتەوە و خەڵکەکەی بگوێزرێتەوە بۆ خوارەوەی قەلا، بەلام ئەم کارە تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە.

**چەند بەڵگەیەکی مێژوویی:**

* کابرایەک بەناوی (حاجی مامەند سەعید) کە خەڵکی ئەو گوندە بووە و لە ساڵی (١٩٩٥) کۆچی دوایی کردووە، لە ساڵی (١٩٨٦) لەسەر قەلاکە چاڵێکی هەڵکۆڵیوە بۆ ئاوەڕۆ، کاتێ زەوییەکەی هەڵکۆڵییەوە گۆڕێکی دۆزیبیەوە، کە تابووتەکەی لە خشتی سوورەوەکراو دروست کرابوو کە هەیکەلی منداڵێکی تێدا بووە و فنجانەیەکی ئاو خواردنەوە لەپشت سەری منداڵەکە بووە، ئەوەش دەیسەلمێنێ کە ئەو قەلایە لەسەردەمی گاورکارەکان دروست کراوە، چونکە گاورەکان باوەڕیان وابوو کە مردوو دوای مردنی ئاو دەخواتەوە.

* کابرایەک بەناوی (مام عەولا) ئەویش زەوی هەڵکۆڵیوە لەسەر قەلاکە، لەناکاو گەیشتووەتە چەند بۆرییەکی لە خشتی سوورەوەکراو، کە هەر بۆرییەی (١) مەتر بووە و چەند بۆرییەکی لێ دەرکردبوو بەلام دوایی بۆی دەرکەوتبوو، کە ئەو بۆرییانە چوونەتە ناخی زەوی و لەبن قەلاکە چەسپ بوون.

* پیاوێکی دیکە لە ساڵی ١٩٨٤ کووپەیەکی دۆزیوەتەوە کە پڕی بووە لە خۆلەمێش، هەشت تەنەکە ئاوی گرتووە و دوایی شوێنەوارناسانی هەولێر بەچەند بڕە پارەیەک کڕیبوویان.

* یەکێکی دیکە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧ بە شۆفڵ زەوی هەڵکۆڵیوە بۆ بیری ئاو، کۆمەڵێک خشتی سوورەوەکراوی دۆزیبووەوە، کە لەدووری (٥٠٠)م لەقەلاکە بووە، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ ئەو ناوچەیە شار بووە و سەر قەلاکەش شوێنی سەرکردەکەیان بووە.

* ماڵێک لە خوار قەلاکەیە دووساڵ لەمەوبەر لەگەڵ کێلانی زەوی بۆ کشتوکاڵ چەند پارەیەکی سەردەمی (ئەسکەندەری)یان دۆزیوەتەوە، کە مس و زیو بوونە.



سەرچاوە:
خەڵکی گوندەکە و قسەی ڕیش سپیانی گوند.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٦، ٢٠٠٤ بڵاوبۆتەوە.**

# گوندی کەژەک

**نادر روستی**

ژمارەیەکی زۆری گوندەکانی کوردستان بە دەستی رژێمی بەعس وێران و خاپوور کران و ژێرخانی ئابوورییان کاول کرا، بەڵام دوای پرۆسەی ئازادی کوردستان بەشێکی زۆری گوندنشینان توانییان بە بازووی خۆیان گوندەکانیان ئاوەدان بکەنەوە و ژیانی ئاسایی دەست پێبکەنەوە. گوندی کەژەک یەکێک بوو لەو گوندانەی، کە دانیشتووانی توانییان ئاوەدانی بکەنەوە و دەست بە بەرهەمهێنان بکەنەوە و تاکو ئەمرۆش لە بەرهەمهێنان بەردەوام بن.

### ناوی گوندی کەژەک و دانیشتووانی

وەک مامۆستا "ئەسعەد سدیق" پێیڕاگەیاندم، کە کەژەک واتە سپی. ئەم ناوەش بە هۆی زۆری بەفر بارین و مانەوەی بۆ ماوەیەکی زیاتر لە شوێنەکانی دیکە ئەم ناوەی بەسەردابڕاوە. ئەم گوندە لە زستان ٨٠ ماڵ و لە هاوین زیاتر لە ١٥٠ ماڵ دەبێت، بەشێکی ماڵەکان دانیشتووی ئەم گوندە نین، بەڵکو تەنیا بۆ کشتوکاڵکردن دێن و زستان دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

### هەڵکەوتی جوگرافیایی گوند

کەژەک دەکەوێتە ناوچەی (ناحیەی) سیدەکان لە دەڤەری برادۆست سەر بە قەزای سۆران لە پارێزگای هەولێر. ئەم گوندە دەکەوێتە سەر رێگای سۆران -سیدەکان، بە دووری ٣٥ کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای سەنتەری سیدەکان. لوتکەی چیای حەسەن بەگ دەکەوێتە رۆژهەڵاتی گوندەکە، لە وەرزی زستان بەفرێکی زۆر لەو گوندە دەبارێت، ئەمەش وای کردووە خاکەکەی بەپیت و خێر بێت و ئاو و دار و درەختی زۆر بێت و لە هاویندا ئاو و هەوای فێنک بێت.

### شوێنەواری مێژوویی گوند

هیچ سەرچاوەیەکی نووسراوم بەردەست نەکەوت، کە ئاماژە بە مێژووی گوندەکە بدات، بۆ ئەم مەبەستە رووی پرسیارم لە مام سدیق کرد. بەڵام ئەویش بە روونی هیچی لەسەر کۆنی گوندەکە نەدەزانی: لەگەڵ ئەمەشدا چەند شوێنەوارێکی دێرینی پیشاندام کە ئاماژێکی روونی دێرینی ئەم گوندەن. لێرەدا زۆر بە کورتی ناوی ئەم شوێنەوارانە دەهێنم:

کوورەکانی قسڵ و گێچ: لە باکووری رۆژئاوای گوند، (٣) شوێن هەیە کە شوێنەواری کۆنن، مام سدیق بە بۆچوونی خۆی دەیگوت: ئەوانە شوێنی دروستکردنی قسڵ و گێچ بوونە (قسڵ و گێچ لە شێوەی گێچی سپیکاری ئەمڕۆ وابووە، بەڵام بەهێزتر و خۆڕاگرتر بووە و لە جیاتی چیمەنتۆی ئەمڕۆ بۆ دیوار و سەب بەکارهاتووە). بەو پێیەی من هێندە شارەزاییم لەم بوارە نییە، نەمتوانی ئەم بۆچوونە بسەلمێنم، کە ئەمانە کوورەن یاخود بۆ مەبەستی دیکە بەکارهاتوون. ئەم (٣) شوێنە لە شێوەی گومبەز دروست کراون، رووبەری ناوەوەی هەریەکەیان (٢) مەتر دەبێت، سەربانیان (سەقف) لە بەردی گەورە دروست کراوە، کە درێژییان ٥٠ - ٧٠سم پانییان ٢٠ - ٣٠سم دەبێت. بەردەکان بە شێوەی ستوونی لە پاڵ یەکتری دانراون (کە لەلای ژوورەوە سەیر دەکەی نازانی ئەم بەردانە چۆن وا هەڵواسراون و چوونەتە پاڵ یەکتری)، سەربانی کوورەکان ١٠٠سم ئەستوور دەبێت، گومبەزەکان ١٥٠سم لە ئاستی رووی زەوی دەوروبەری بەرزتر دەبن، دوو لەو کوورانە سەربانیان داتەپیوە، بەڵام یەکیان ماوە. دەرگایەکی چوار گۆشەی بچووکی بۆ چوونە ژوور هەیە.

گۆڕستانی کامەلار: ئەم گۆڕستانە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای گوندی کەژەک، لەناو گۆڕستانەکان (سێ) شوێنی شوێنەواریی بەدی دەکرێت:

یەکەم/ بناغەی دیواری ژوورێک هەیە، کە چەند بەردێکی زۆر گەورە لە دیواری ژوورەکە ماون. بەردەکان ١٢٠سم زیاتر درێژ و ٦٠سم پان دەبن. دووەم/ لە ناو گۆڕستان سەرچاوەی ئاوێک هەیە. کاتێ مام سدیق دەیەوێت ئاوەکە زۆر بکات بۆ ماڵەکەی، کە لە نزیک شوێنەکەیە سوودی لێ وەربگرێت، دەست بە هەڵکۆڵینی ڕێڕەوی ئاوەکە دەکات، لەو کاتەدا شوێنەواری دیوارێکی کۆن لە نزیک ئاوەکە دەدۆزێتەوە. لە هەمان کاتدا چەند پارچەیەکی گۆزە و کووپەی شکاو دەدۆزێتەوە. سێیەم کوورەیەکی قسڵ و گێچ لە نزیک ئەم دوو شوێنەوارە هەیە کە تەنیا وێرانەکەی ماوە.

دارەبەنێکی زۆر گەورە لە ناو گۆڕستانەکە هەیە، کە ئەستووری قەدەکەی ٧٠٠سم دەبێت، دیارە ئەم دارەبەنە تەمەنێکی زۆری هەیە.

لە ڕۆژئاوای گۆڕستانەکە شوێنێک هەیە پێی دەڵێن کەندە کۆخ، دوو بەرد لە شێوەی کێلی قەبر ملیان بە یەکتری داوە، دەڵێن هەرکەس کۆخەڕەشە بگرێ، بە ژێر ئەم دوو بەردەدا بڕوات، چاک دەبێتەوە. مام سدیق دەیگوت: بەبیر کەسمان نایەت، کە ئەم داب و نەریتە لێرە پەیڕەو کراوە، واتە لە باب و باپیرانمان بۆمان ماوەتەوە ئەم پاشماوە شوێنەوارییانە بەڵگەی دێرینی گوندی کەژەک نیشان دەدەن. لەلایەکی دیکەوە کەژەک لە گوندی مجێسەری پایتەختی ئەساسیر بە ٧کم دوور دەبێت، گوندی مجێسەر نووسراوێکی نەخشکراوی سەر بەردی لێ دۆزراوەتەوە، کە ئێستا لە مۆزەخانەی هەولێرە و ئاماژە بە دەسەڵات و سەرکەوتنی ئەساسیر دەکات بۆ سەدان ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە.

**بەرهەمە بەناوبانگە کشتوکاڵییەکانی کەژەک**

دوای ئاوەدانکردنەوەی کەژەک لەدوای ئازادی کوردستان (١٩٩١) دانیشتووانەکەی زیاتر لە جاران گرنگییان بە پیشەی کشتوکاڵیدا. لە بەرهەمە گرنگەکانی، کە بایەخیان پێدا چاندنی تەماتە و خەیار (ئاروو) بوون. دانیشتووانی کەژەک بە ماوەی چەند ساڵێک توانییان ناوبانگێکی باش لە بەرهەمهێنانی ئەم دوو بەرهەمە بەدەست بێنن و بەرهەمەکانیان بگەیەننە زۆربەی بازاڕەکانی کوردستان بەتایبەت شاری هەولێر، تا ساڵی ٢٠٠٠ سەرجەم دانیشتووانی بە چاندنی ئەم دوو بەرهەمە و چەند بەرهەمێکی دیکەی لاوەکی خەریک بوون. سەرەڕای دانیشتووانی گوند هاوڵاتییەکی زۆر لە دەقەری سۆران و شوێنی دیکە بۆ مەبەستی کشتوکاڵ و کاسبی روویان لە گوندی کەژەک کردبوو. ئەمەش وای کرد کە دانیشتووان و میوانەکانیش توانیبوویان بنەمایەکی ئابووری زۆر باش پێکەوە بنێن و ژیانێکی باش بگوزەرێنن و خانووبەرەی باش دروست بکەنەوە، کە لە خانووی جارانیان باشتر و لەسەر شێوازی نوێی خانووبەرە بن. جگە لە تەماتە و خەیار، گەنم و جۆ و چەندان جۆری شینایيان دەکرد. باخچە و رەزەکانیان بەجوانی دەهێنایە بەرهەم و لە بەهارانیش روویان لە کوێستانان و چیاکانی گوشینە و حەسەن بەگ دەکرد و سوودیان لە کەنگر و ڕێواس و کوارگ وەردەگرت. ئەوەی گرنگ و جێگای بایەخە لەم گوندە: سەرکەوتنی ئاوەدانکردنەوەی ئەم گوندە بوو، بە توانای هاوڵاتییانی گوندەکە و بە ئارەزووی کارکردن و وەبەرهێنان لە بواری کشتوکاڵی، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ جێگای سەرنجە لەم گوندەدا کەمبوونەوەی بایەخدانی گەشتیار و جووتیارانی ئەم گوندەیە بە بەرهەمی کشتوکاڵی، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێ دەگەڕێتەوە: وەک بایەخ نەدان بە ژیانی گوند و دابین نەکردنی پێداویستییەکانی کشتوکاڵ کردن و کەمی خزمەتگوزاری، وەک چاک نەکردنی ڕێگاوبان (لە سۆران تا ناو گوند ڕێگایەکە خەرابە)، یارمەتی نەدان بۆ جۆگە دروستکردن و حەوزی ئاو گلدانەوە بۆ کشتوکاڵ، یارمەتی نەدان بۆ دابینکردنی ئاوی خواردنەوە، یارمەتی نەدانی پێویست بۆ دەرمانی کشتوکاڵی و شتی دیکە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم گوندە خاوەنی قوتابخانەی سەرەتایی و بنکەی تەندروستی و مزگەوتی خۆیەتی. کەواتە ئەگەر پسپۆڕانی وەبەرهێنان و کشتوکاڵی و ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان پلانێکی سەرکەوتوویان هەبووایە بۆ گوندەکان، رام وایە کە گوندنشینان زیاتر سوور دەبوون لەسەر ژیانی گوند و بەرهەمهێنان لە گوند. نەک ئەم بێزارییەی ئەمڕۆ گوندنشینان بە دەستییەوە دەناڵێنن!!.



# گوندی روست

نادر روستی

لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بەتایبەت ئەوروپا و ئەمریکا، لقێکی توێژینەوەی زانستی بەناوی لادێناسی هەیە. لە زۆربەی زانکۆکانیشدا کۆلێژێک یان بەشێک لە کۆلیژ بۆ توێژینەوە و پلاندانان لەسەر لادێ تەرخان کراوە. کەواتە ئاوڕدانەوە لە لادێکانی کوردستان بە تێڕوانینێکی زانستییانە لە رابردووی ژیان و ئێستای ژیانیاندا هۆکارێکی یارمەتیدەر دەبێت بۆ تێگەیشتنمان لە بەشێکی گرنگی کەلتووری نەتەوایەتیمان، کە ٩٠٪ی ژیانی کوردەواری پێکدەهێنێ. بۆیە پێویستە لە گشت بوارەکانی (مێژوویی، جوگرافی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئاوەدانکردنەوە و بینایی و خزمەتگوزاری) توێژینەوە بکەین و پلان بۆ ئایندەی ژیان لە لادێ لەسەر شێوازێکی سەردەمییانە دابڕێژین.

**گوندی روست وەک نموونە**

گوندی روست سەر بە ناحیەی سمیلانە لە قەزای چۆمان، لە پارێزگای هەولێر، بە دووری ١٧٠ کیلۆ مەتر دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی هەولێر، لە نزیک گوندی بەرشیرین لەسەر رێگای گشتی سۆران -چۆمان، رێگای دیکەشی بۆ دەچێت، رێگایەکەی لە ژێر قیر کردندایە و تا ناحیەی سمیلان قیر کراوە، رێگاکە تا ژێر چیای هەڵگورد درێژ دەبێتەوە. دۆڵی روست ٣٧ گوند لەخۆ دەگرێت، ئەم دۆڵە بە گشتی و بە تایبەت گوندی روست ئاو و هەواکەی لە هاویندا زۆر فێنکە

و زۆربەی خاکەکەی بە دارستان و باخچە و کانی و چیای بەرز داپۆشراوە.

## گوندی روست لە تێڕوانینێکی مێژووییەوە

مێژووی گوندی روست بۆ سەردەمی زەردەشتییەکان دەگەڕێتەوە، لە رووی چەمکەوە روست لە وشەی (روستا) کە بە مانای گوند دێت لە زمانی پەهلەوی وەرگیراوە و لە ئەنجامی بەکارهێنان و سووانەوە تەنها وشەی (روست) ماوەتەوە تا ئەمڕۆ بەکاردێ.

پێش سەردەمی زەردەشتییەکانیش ژیان لە دۆڵی روست و بەتایبەتی گوندی روست هەبووە، دەتوانین لە رێگای چەند خاڵێکەوە ئەگەری بوونی ژیان لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ لەم گوندەدا بسەلمێنین:

گوندی روست زیاتر لە دە ئەشکەوتی لێیە، کە هەندێکیان نیشانەی ژیانی کۆنیان تێدا بەدی کراوە، بەتایبەت لە ئەشکەوتی مەمەندان.

کۆمەڵێک کەلوپەل بە تایبەت کووپە و گۆزەی قەبارە گەورە دۆزراوەتەوە، کە هەندێکیان مرۆڤی تێدا شاردراوەتەوە، کە رەنگە لە سەردەمی زەردەشتییەکان و بەر لەوانیش مرۆڤ لەناو کووپە لە گۆڕ نرابێ.

لە گوندی روست زیاتر لە (٦٢) گۆڕستان بە قەبارەی جیاواز هەیە، کە لە خانووی دەرەوەی گوند ٤ – ٥ کیلۆمەتر دوورن هەندێکیان پیاوچاک و بەناوی کوردی رەسەنەوە ناودارن (پیرەباو، پیری باغ، پیرتیمەت). لەناو ئەم گۆڕستانانە گۆڕستانی جوولەکە، کە نزیکەی (١٠٠٠) گۆڕێک دەبێت جگە لەوان، مەسیحی (دیان، فەلە) لەو گوندە ژیاون و شوێنەواریان ماوە.

**چەند شوێنەوارێکی کۆن لە روست دۆزراوەتەوە:**

ا- گۆڕبابیلە.

ب- قەڵای سۆر لە شاخی بۆغار و سەرۆکانی گێژی میران.

ج- کۆنەواری غەفان، ئەم کۆنەوارە لە ساڵی ١٩٦٢ لە دۆسیەی (المواقع الاثرية في العراق) تۆمارکراوە.

د- ساردآوی (سارنج) قەڵای گوندی روست و قەڵاکەی. (ئەم قەڵایە زۆر سەخت و قایم



بووە. لە ساڵی ١٨١٥ پاشای رواندز سێ جار هێرشی بۆ هێناوە، بەڵام نەگیراوە، تا دواجار بە رێکەوتنی هەردوولا تەسلیم کراوە).

گوندی روست لە سەردەمی عوسمانییەکان (پێش شەڕی یەکەمی جیهان) ناحیە بووە، بەڕێوەبەری ناحیەکە ناوی مەحموود بەگ بووە، هەروەها قازی تایبەت لەم ناحیەدا هەبووە، کە ناوی شێخ نەجیم بووە (نەوەکانی ئێستا لە گوندی روست دەژین) لە ساڵی ١٩٣٠ قوتابخانەی لێ کراوەتەوە، لە ساڵی ١٩٤٥ زیاتر لە (١٠٠) ماڵی لێ بووە، ژمارەیەک لەو ماڵانە جوولەکە بوون. لە ساڵی ١٩٦١ پاڵپشتییەکی تەواویان لە شۆڕشی ئەیلوول کردووە و زیاتر لە ١٥ کەسیان بوونەتە پێشمەرگەی شۆڕش. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سۆفییەکانی شێخ رەشید هێرش بکەنە سەر گوندی روست و تاڵانی بکەن (وەستا خدر چەکی بۆ شۆڕش چاک دەکردەوە لە ساڵی ١٩٦٢ شەهید کرا). گوندی روست یەکێک بووە لە پێگەکانی شۆڕشی ئەیلوول. بە رابەرایەتی سەرکردەی نەتەوەیی (مستەفا بارزانی)، بۆیە لە ساڵی ١٩٧٤ لەلایەن فڕۆکەکانی بەعس بۆردومان کرا، ئەمەش بووە هۆی شەهیدبوونی چەند کەسێک و برینداربوونی ژمارەیەکی دیکە و سووتان و رووخانی ژمارەیەک خانووی گوند - جگە لەمە چەند جارێکی دیکەش بۆردومان کراوە.

لە ساڵی ١٩٨٧ دانیشتووانی گوندی روست بۆ ئۆردووگای زۆرەملێ راگوێزران و خانووەکانی بە **TNT** تەقێنرانەوە، کاتی راگواستنی گوند ژمارەی ماڵەکانی زیاتر لە (٥٠٠) ماڵ دەبوو، ئەمە جگە لە گوندی گرتک، کە (٣٠٠) ماڵ و گوندی پیرئۆمەر (١٥٠) ماڵ و گوندی ئاشی بێکورە (١٥) و شلان (٧) ماڵ بوونە.

هەریەک لەم گوندانە چەند خولەکێک لە روست دووربوون، لە ساڵی ١٩٨٢ بەشێکی گوند ئاوەدان کرایەوە لە ساڵی ١٩٨٣ وێران کرایەوە و دانیشتووانی ئاوارەی ئێران بوون، لە ساڵی ١٩٩١ جارێکی دیکە ئاوەدان کرایەوە.

### پیشەکانی گوندی روست:

گوندەکە جگە لە کشتوکاڵ کردن و مەڕ و ماڵات بەخێوکردن، جۆرەها پیشەی لێ کراوە وەک: (جۆلایی، ئاسنگەری، دارتاشی، سابوون کەری، گۆزەکەری، پێڵاو دروستکردن، تەونکاری، ئاشگێڕی (ئاشەوانی)، چەخماخچی، سەففاری، تەنەکەچی، ئەمە جگە لەوەی دەیان کاری دیکەی دەست رەنگینی لەلایەن دانیشتووانەکەی کراوە.

### شوێنە گەشتوگوزارییەکانی روست:

دۆڵی روست بە گشتی شوێنێکی گەشتوگوزارییە. گوندی روستیش بەپێی هەڵکەوتەی شوێنە جوگرافییەکەی فێنکی و سازگاریی ئاووهەواکەی بە هاوین و زۆری لێڕ و دارستان و بوونی دەیان کانیاو و رووبارێکی بچووک بەناو دۆڵەکەدا و نزیکی لە چیای حەسارۆست و بەرزایی چیای هەڵگورد، کە بە هاوینیش بەفری لەسەر نابڕێ، دەکرێ بکرێتە شوێنێکی گەشتیاری و بایەخی پێویستی پێبدرێ و سەدان گەشتیار لە وەرزی هاوین رووی تێبکەن.

### شوێنە گەشتیارییەکان:

لە گوندی چۆمان و چۆمبارۆک بەدەم رووبار و ئاوەوە تا دەگاتە ناحیەی سمیلان، لە وێشەوە تا گوندی ئاشی بێکۆر لەوێشەوە هەربەدەم رووباردوە تا دەگاتە بناری چیای هەڵگورد، شوێنی زۆر لەبار و گونجاون، بەڵام ئەم دەم رووبارە پێویستی بە جادە و رێگا خۆشکردن هەیە، بۆ ئەوەی گەشتیار بتوانێ شوێنی پشوودان و مانەوەی هەبێ، ئەم دەم رووبارە هەمووی بە داری زۆر جوان تەنراوە.

کانیە سۆ: شوێنێکە دەکەوێتە کەندێ ئاشان لە نێوان گوندی روست و گوندی گرتک. ئەم شوێنە بە دار گوێز و دار چناری بەرز داپۆشراوە، کانییەکە دەکەوێتە دەم رووبار، کە لە چەند شوێنێک تاڤگە و دیمەنی جوانی هەیە. ئەم کانییە کەوتۆتە ناو ئەشکەوتێک لە دەم رووبار، کە پێشتر ئەم ئەشکەوتە لە ناودوە ٣×٤ بووە، بەڵام ئێستا بەهۆی هاتنە خواردوەی ئاو و کلس ئەشکەوتەکە بچووک بۆتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێ زۆر بە ئاسانی کاری تێبکرێ و گەورەتر لە جاران بکرێ و خۆشترین گازینۆی گەشتیاری لێ دروست بکرێ.

دەکرێ بنارەکانی چیای هەڵگورد خۆش بکرێ و لەسەر هەڵگورد گەورەترین و فێنکترین هاوینەهەوار دروست بکرێ، کە سەرنجی گەشتیارانی بیانی رابکێشێ، چونکە هەڵگورد بەرزترین چیای کوردستان و عێراقە.

### * ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە

چەند سەردانێکی مەیدانی (نووسەری ئەم وتارە)، چاوپێکەوتن لەگەڵ چەندان کەسایەتی گوندی روست.

المواقع الاثرية في العراق -وزارة الثقافة والاعلام ١٩٧٠.

د. جلیلی جلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و: د. کاوێس قەفتان.

فاضل البراك، مصطفي البارزاني -الاسطورة والحقيقة، بغداد ١٩٨٩.

مەنوچێهر موحسنی، دەروازەکانی کۆمەڵناسی. و رێبوار سیوەیلی و ٦ کەسی تر، هەولێر ٢٠٠٢.

ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیژیەتی عێراق و سێکوچکەی بەعسییان، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩.



# ناوی گردەکانی دەشتی هەولێر

هوشیار عەبدوڵڵا

دەشتی هەولێر دەشتێکی گەورەو پان و فراوان و کاکی بە کاکییە، لە چەند بەشێک پێکهاتووە و هەر بەشە و ناوی تایبەتی خۆی هەیە، وەکو:

١- دەشتی ملکیە (مرکییە).
٢- دەشتی پشترێ.
٣- دەشتی بەرانەتی
٤- دەشتی زرارەتی.
٥- دەشتی کەندێناوە.
٦- دەشتی شەمامک.
٧- دەشتی قەراج.

لەو دەشتانە ژمارەکی زۆری گردی توورەگەرێژی دەستکرد هەیە، کە کاتی خۆی لە زەمانێکی زووەوە بۆ کاری سەربازی و بۆ خۆپاراستن لە دوژمن دروستکراوە، مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغە جیا جیاکانی مێژوو، خەڵکی دەڤەرەکە، کە کۆچەر و مەڕدار و مەڕلەوەڕێن و ڕەشماڵ نشین بوونە، لەتەنیشت ئەو گردانە و لە نزیک گۆمە ئاوەکان دامەزراون و گوند و دێهاتیان ئاوەدان کردۆتەوە، گردەکانیش بەزۆری بە ناوی گوندەکان کراون، یان ئەوەتە هەر یەکە و ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەندێکیان بەناوی پیاوچاکان کراون وەک: (گردی شێخ گەزنەی) و (گردی پیرداودی گۆچان کەسک) و (گردی قەبری سەیدی) و (گردی ئەسحابان) و (گرد مەلا).

یان بەناوی ڕەنگی خاکەکەی کراوە، وەک: (گردە بۆر) و (گردە سۆر) و (گردە ڕەشە) و (گردە زەرد) و (گردی لاسۆر)ی. یان بەناوی ئەو گیاوگوڵەی، کە لێی شین دەبێت، وەک: (گردی گڵێخە) و (گردی قالۆرە) و (گردی قەلاچۆغان) و (گردی نیسکان) و (گرد شینە). یان هەندێکیان بەناوی شێوە و شکڵی گردەکان کراوە، وەک: (گردە چاڵ) و (گردە پان) و (گردە قوت).

ناوی گوند و گردەکانیش ئەمانەن، کە وشەی گردیان

تێدایە، لە دەشتی (مرکییە)ی ناحیەی قوشتەپەدا ئەو گردانە هەن:

١- گرد مەلا.

٢- گردە سۆر.

٣- گردی قەرەبەگی.

٤- گردی قشاغلووی.

٥- گردی سۆربەشی.

٦- گردی باقرتەی.

٧- گردی قوت، (گردی دۆرەزەی).

٨- گردی قازیخانە.

٩- گردلانکە سەعید.

١٠- گردلانکە مەجید.

١١- گردە شینە.

١٢- دووگردەکان ("٢" گردی تێدایە، گردی سەید وەسمان، گرد خنجیلە).

١٣- گردی قەرەچناغەی.

١٤- گردی پیرداودی.

١٥- گردی مامرەت.

١٦- گردی خەلیفەی.

١٧- گردی ساراودی.

١٨- گردی حەسەن ئاگاداری.

١٩- گردە رەشەی گەورە (ئەسعەد).

٢٠- گردە رەشەی گچکە (موفتی).

٢١- گردی نیسکان.

٢٢- گردی شێراوەی.

٢٣- گردی قووچەبرباسی.

٢٤- گردی سوورێژەیی، گردێکی گەورە و پانە، رووبەرێکی گەورەی داگیرکردییە، زۆر بڵند نییە، توورەگەرێژە، لەتەنیشت گردەکە گوندەکە ئاوەدان کراوەتەوە.

٢٥- چارە گرد دەرە.

٢٦- گردی قەتەوی.

٢٧- گردی ئارا.

٢٨- گردی عەلی مەولان.

٢٩- گردی باشتەپەی.

٣٠- گردی قوشتەپەی.

٣١- گردی دوزتەپەی.

٣٢- گردی قولتەپەی (یەعقوب تەپە)

٣٣- گردی کلک مشکی.

٣٤- گردی لەشکر.

٣٥- گردی قالینج ئاغا.

٣٦- گردی ئەحمەد باڵەکی.

٣٧-گردی حوسێنی (ئەو گردە لەناو ئاقاری گوندی "گردەسۆر"دایە).

٣٨- گردی شێمحەمەدی: ناوی گردێکە لە رۆژئاوای گوندی (یەدیقزلەر- ئێدیقزلەر)ی هەڵکەوتووە، لە سنووری ناحیەی قوشتەپەدایە، گردەکە توورەگەرێژە، لە گردی سورێژی گەورەتر و پانترە، پیاوچاکێکی لێیە، ئەو گوندە بەناوی ئەو پیاو چاکەوە ناونراوە و ناسراوە.

٣٩- گردی غەرابە میران: ناوی گردێکی بچووکی توورەگەرێژە لە نێوان ئاقاری گوندی (سورێژە و یەدیقزلەر)ی هەڵکەوتووە، لە سنووری ناحیەی قوشتەپەیە، دەڵێن: کاتی خۆی کاولە گوند بووە.

٤٠- گردی غەربیلان: ناوی گردێکی گەورە و پان و بڵندە، توورەگەرێژە، لەنێوان ئاقاری گوندی (پرینگە و قوشتەپە)ی هەڵکەوتووە، گردەکە بەقەدەر گردی قوشتەپەی دەبێت.

٤١- گردی قالۆرەی: ناوی گردێکە لەناو ئاقاری گوندی (دووکەڵە)ی دەشتی مرکییەی سەر بەناحیەی قوشتەپەیە، لە رۆژهەڵاتی گوندەکە هەڵکەوتووە، گردێکی گچکە و نزمی توورەگەرێژە، کۆنە خەرابەیە، دەڵێن: کاتی خۆی گوند بووە، شوێنەواری چەند گۆڕێکیشی لە نزیکیەوەیە، دووپشکی یەکجار زۆرە، لە دەڤەرەکە بوویتە پەند دەڵێن: (دەرێی دووپشکی قالۆرەیە).

(قالۆرە) یان (قالۆر) ناوی جۆرە گیایەکی بەهارییە، لە دەشتی شارەزوور یان لە هەندەک شوێنان لە دەشتی

هەولێر شین دەبێت، بەتایبەتی لە ئاقاری ئەو گردانە و ئەو گوندانەیە، بۆیە بەو ناوە ناونراوە و ناسراوە.

لە دەشتی (بەرانەتی) باکوور و باکووری رۆژئاوای شاری هەولێریشدا ئەو گوندانە گردیان لێیە:

٤٢- قەڵاتکە.

٤٣- گرد جۆتیار.

٤٤- گرد عارەق "ئارەق".

٤٥- گردە چاڵ.

٤٦- گردە پان.

٤٧- گردە شێر.

٤٨- گردە رەشەزاب.

٤٩- گرد مامک.

٥٠- گردی ماوان.

٥١- گردی قەڵا چۆغان.

٥٢- گردی تەلموسەکی.

٥٣- گردە زەرد.

٥٤- گردی شێخ گەزنەی، لە گوندی (گەزنە)یە.

لە دەشتی (کەندێناوە)شدا ئەو گردانە هەن.

٥٥- گردی گۆمێ.

٥٦- گردە شینە.

٥٧- گردی حوشتر بۆرێ: لەناو ئاقاری گوندی (بیرەباتی) هەڵکەوتووە.

٥٨- گردی کانەبی: ئەو گردە بە ناوی "کانەبی فەقێ وەیسی"ی کراوە، کە یەکێک بووە لە عەگیدسوارانی هۆزی بلباس، لە کاتی خۆیدا کۆچەر بوونە و بە مەرداری دەهاتنە خوارێ بەرەو دەشتی هەولێرێ، کەندێناوە و چیای قەرەچووغی، سەردەمانێک زستانە هەوار و بەهارە هەواریان بووە، لەگەڵ نەعمانی ئێزدی لەسەر پاوان بوویتە شەریان، هەردووک یەکدییان کوشتووە.

٥٩- گردی چەغەمیرەی: لە رۆژئاوای لەناو ئاقاری گوندەکە هەڵکەوتووە.

لە دەشتی (شەمامک)یش ئەم گردانە هەنە:

٦٠- گردی عەوێنەی.

٦١- گردی بلووروان.

٦٢- گردی تەلەرخێمی گەورە (شەهیدان)

٦٣- گردی خەزنەی.

٦٤- گردی شەمامک (سەعداوە).

٦٥- گردی عەبدولعەزیزی.

٦٦- گردی عازەبان.

٦٧- گردی سارەبی لە نزیک گوندی گعێتل.

٦٨- گردی قەراتە سۆران.

٦٩- گردی قادربەی.

٧٠- گردی ئەلیاس تەپەی: کەوتۆتە ناو گوندی (عەلیاوای شێخان)

٧١- گردی دۆغانی: لەناو ئاقاری گوندی دۆغانییە.

٧٢- گردی ئەلیاس تەپەی ناوی گردێکە کەوتۆتە ناو ئاقاری گوندی (عەلیاوەی شێخان) سەر بە ناحیەی قوشتەپە بوو، بەڵام هەنووکە سەر بەناحیەی (شەمامک)ە، گردێکی توورەگەرێژە، گردێکی گەورەیە، لە کەندی (قورەبەگ)ی نزیکە، دەڵێن: ئەو شوێنە لەشکرگای عوسمانییەکان بووە، (ئاشی غەرابە تاوسە)، کە ئاشێکی ناوی کۆنی دەڤەرەکە بووە، شوێنەکەی غەرابەیە، نەختێک بەرزاییە لە دەو کەندی قورەبەگییە، (ئاوی گامردی) دەهاتەوە سەری، لەنزیک ئەو گردەوەیە، شوێنەواردکەی هەتا ئەم ساڵانەی دواییش هەر مابوو.

٧٣- گردی سەعداوەی، هەندێک جار گردی (شەمامک)ی پێدەڵێن، ناوی گردێکی شوێنەواری گەورەیە، توورەگەرێژە، لەناو ئاقاری گوندی سەعداوەی دایە، نزیکەی (٢٥)کم لە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، سەر بەناحیەی گوێڕی قەزای مەخموورە، خەڵکەکە جاران گەلێک خشتی لاکێشەی گەورە گەورەیان لێ دۆزیوەتەوە و دەریانهێناوە، لەسەر ئەو خشتانە نووسینی مسماری هەبووە.

ناوی هەندێک لە گرد و گوندەکانی (دەشتی قەراج) ئەوانەی، کە گردیان لێیەو یان ئەوەتە بە وشەی گرد دەستپێدەکەن، ئەوانیش ئەمانەن:

٧٤- دووگردکان حەمەد وەتفە.
٧٥- دووگردکان حاجی حوسێن.
٧٦- گردە پان.
٧٧- گردە چاڵ.
٧٨- گردە هارە.
٧٩- گردی دێوانەی.
٨٠- گردی دۆم.
٨١- گردی لاسۆری.
٨٢- گردی گەزۆکی.
٨٣- گردی گڕاو.
٨٤- سێگردکان.
٨٥- گرد قۆشەنە.
٨٦- گردی سەڵماسی.
٨٧- گردە شێر.
٨٨-گردی قەراتە سۆر.
٨٩- گردی ئازیکەندی.
٩٠- گردی جووکوژی.
٩١- گردی لەنگەربیان.
٩٢- گردی بەراز کوژرای.
٩٣- گردە بۆر.
٩٤- گردی ئەسحابان.
٩٥- گردی مەحسوناوەی.
٩٦- گردی باقرتەی.
٩٧- خەرابە گردە.
٩٨- گردی قەبری سەیدی.
٩٩- گردی قوچە سپیلکەی.
١٠٠- گردە زەرد.
١٠١- گردی قیت.
١٠٢- گردی گۆم.
١٠٣- گردی تەلەمەتاری.
١٠٤- گردە رەشە.

١٠٥- گـردی برایم باولی: گـردێکی گـەورە و بڵندە لەناو ئاقاری برایم باول هەڵکەوتووە، توورەگەرێژە، دەڵێن: کـاتی خـۆی ئەو گـوندە لەوێ لە تەنیـشت گـردەکە ئاوەدان کراوەتەوە، پاشان گـواستـیتیـانەوە جێگای ئێـستـای، لە زەمـانی زووەوە بنەمـاڵەیەک لە تیـرەی (وەتک)ی سیـان بەناوی (برایمی سـۆفی باول) بە مـەرداری دەچێـتـە دەشـتی قەراجێ و دەوروبەری ئەو گردە، دەکاتە زستان هەوارو بوارە هەواری خـۆی، هاوینانیـش بەرەو گـوندەکـەی خـۆی (دۆڵەزە)، کە دەکەوێتـە دەشتی مرکیـەی دەشـتی هەولێر دەگەڕایەوە، تا وای لێهات نەگەڕانەوە و لە دەوروبەری ئەو گـوندە نیـشـتـەجێ بوون، بووە گـوند و ناوی لێنرا (برایم باول) کـاک (نەوشێـروان جەوهەر) باسی بۆ کـردم و وتی: ئەو باپیـرە گـەورەی منە، سـەرجـەلەکـەشـمـان ئەوەیە (نەوشـێـروان جـەوهەر قـادر ئۆمـەر حـوسێن برایم سـۆفی باول).

١٠٦- قـەراتی کـاولە مـەخـمـووری: (مـەخـمـووری گـچکەلە) ناوی گـردێکی گـەورە و پانە، بەڵام زۆر بڵند نییـە، دەکەوێتە خواروو رۆژئاوای شارۆچکەی مەخموور نزیکەی (٣)کم لێـیـەوە دوورە، لە نێـوانی گـوندی (گەڕەبەشە کاکۆ) و شارۆچکەکەدا هەڵکەوتووە، خەڵکی دەڤـەرەکـە بەوێندەرێ دەڵێن: (کـاولە مـەخـمـوور) یان (مـەخـمـوورە گـچکەلە) دیارە کـاتی خـۆی مـەخـمـوور لەوێندەرێ بووە، پاشـان گـوازراوەتەوە شـوێنی ئێـسـتـای، خوالێخۆشبوو (برایمی بایزی) کاتی خۆی، کە قوشتەپەی جێـهـێـشـتـووە، هاتووە لەسـەر (گـردی باقـرتە)ی دەشـتی مرکیـەی مـاوەیەک لەوێ مـاوەتەوە، پاشان لەوێ هەڵقەناو بەرەو (دەشـتی قـەراجێ) کەوتۆتە رێ، هات لەو قـەراتەی مەخـمووری نیـشـتـەجێ بووە و ئاوەدانی کردۆتەوە، لەسەر ئەو گـردەی خـانوو و شـوورەی لێ دروست کـردووە و دامەزراوە، شوورەکەی هەتا بەو دواییەش مابوو، لە خشت دروسـتکرابوو، چوار دەرگـەی هەبوو، بیـرێکی ئاویشی لێبوو، بیرەکە لەقەد گردەکەدایە، لەم بارەیەوە خوالێخۆشبوو (حاجی رەحمان سەفەر) (١٨٦٩-١٩٧٦) لەدایکبووی شارۆچکەی مەخموور گێڕاوێتییەوە و گوتوویەتی: برایمی حـاجی بایزی لەگـەڵ هەندێک لە خـزمـەکـان دێنە (گـردی

باقـرتە)ی نزیک گـوندی (قـشـاغلوو) و، (قـوشـتـەپە) بەجێدەهێڵێت، بە رەشمالنشینی چەند مانگێک لەوێ دەمێنێتەوە، لەو دەوروبەری ئەوکات هۆزی (ئۆرمزیار) لە گوندەکانی (قشاغلوو) و (میراوە) و (دووگردەکان) و (ترپەسپیان) و (سۆربەش) بوون، زەمانی (کێخوا شەریف)ی بوو، کە برا گەورە و سەرۆکیان بوو، لە قەلاتی قشاغلووی دادەنیشت، دیوەخانی لەوێ بوو، برایمی حاجی بایزی زۆر لەوێ نەمایەوە، هات لە قـەلاتی (کـاولە مەخمووری)، واتە (مەخموورە گچکەلە) لەوێ خانووی دروستکرد، پاشان بەرەبەرە مەخموور ئاوەدان بووەوە، رۆژێکیان هەندێکیان لە پیاوانی برایم ئاغا برازایەکی (ئەحمەد شەحادە) ناوێک لەگوندی (گۆڵ گامێشە)ی دەکوژن، پاش ئەم کارەساتە (ئەحمەد شەحادە) بار دەکات و لەو ناوە نامێنێت، بە قسەی مام حاجی رەحمان سەفەری دەیوت: کەوتە لای بەغدا، هەنووکەش ئاوێک لە مەخموور هەیە دەڵێن: (ئاوی شەحادەی)، کاتێک مەخموور ئاوەدان بووەوە، حکومەتی عوسمانی مەفرەزەیەکی رەوانەی ناوچەکە کرد و دەستی کرد بە دروستکردنی (قشڵەیەک) لەوێ و لە (گوێڕێ)، برایم بایز پێی ناخۆش بوو، دەیگوت: کوو دەبی حکومەت بێتە ئەو ناوەی، ئەمە قبوڵ ناکەین مەفرەزەکەی حکومەتی دەرکرد، حوکمەتی عوسمانی ئەمجارە چوار مەفرەزەی نارد، لە چوار لاوە هاتن لە رێی گوێڕ، شەرگات، هەولێر بازارگە، رێی پۆستان دەوری ئەو ناوەیان دا و هاوەنیان دامەزراند، چەند تۆپێکیان بە قەلاتی برایم ئاغای وەنا، برایم بەخۆی و چەند پیاوێکی هەلاتن، هەر چۆنێک بێت خۆیان گەیاندە چیای قەرەچووغ و نەگیران، لەشکری عوسمانی ژن و ماڵ و منداڵیان هەموو گرت و هەرچەند مەڕومالاتیان هەبوو هەموویان هێنا، برایم و پیاوەکانی بوونە ئەشقیا، (سەفەر)ی باوکم هەستا دەعوەتێکی گەورەی لەشکرەکەی کرد، (٧-٨) کاوڕ و مەڕیان بۆ سەربڕین و خزمەتێکی باشی کردن، داوای لە سەرلەشکرەکە کردبوو، کەوا ئەو ژن و ماڵ و منداڵانە بەربدات، ئەوەبوو ماڵ و منداڵەکەی پێ بەردان و



هێنایە سەر ماڵی خۆیان و مەڕ و مالاتەکەشی لێ وەرگرتنەوە، کە نزیکەی (٢٠٠٠) سەر مەڕ دەبوو، پاشان مام سەفەر ئەو ژن و منداڵانەی لای خۆی مایەوە و هەندێکی ناردەوە ماڵی باوکیان لەسەر ئارەزووی خۆیان، تەنیا ژنێکیان نەبێت، کە ناوی (گەرعە) بوو، عەرەب بوو، لە عەشیرەتی (ئەبو حەمدان) بوو، هەموو لچ و لێوی کوترابوو، ئەو لەلای مام سەفەر مایەوە، (مشیر) لەو ژنەیە، لەپاشان حاجی بایزی باوکی برایم، هاتە لای (مام سەفەر) و مەڕومالاتەکەی بە خودان کرد، گوتبووی: ئێمە هەتا مردنێ قەرداری ئەو بنەماڵەینە، پاشان هەوڵێکی زۆر درا (برایم ئاغا) خۆی تەسلیم کرد، (٤-٥) مانگان گیرا و دواتر بەربوو، کە هاتەوە ماڵەوە لە قەراتی مەخمووری گچکەلەی گواستەوە ناو (مەخموور)ی ئێستا و لێی نیشتەجێ بوو، تا لە مانگی ساڵی (١٩٢٠) کۆچی دوایی کرد، لە بەرزاییەک لەنزیک دەرکی بازارگەی، کە دەڕوانێتە دەشتی کاولە قەراجێ نێژراوە، ئەو کەڵە پیاوە هەقی خۆیەتی پەیکەرێکی چ لەدەرکی بازارگەی چ لە ناو شارۆچکەی مەخمووری بۆ بکرێت.

١٠٧- گردی تەپەی یان (تەپەی خاری)

کاتی خۆی لە زەمانێکی زووەوە بنەماڵەی حاجی (تاژدینی)، کە بنەماڵەیەکی خانەدان و گەورە و ناندە و دیاربوون، سەر بە تیرەی (وەتک)ی عەشیرەتی سیانن لە گوندی (گردە سۆر)ی دەشتی پشترێی سنووری ناحیەی قوشتەپەدا دادەنیشتن، ئەو بنەماڵەیە مەڕو مالاتێکی

زۆریان هەبووە، مالوەدەران، واتە (دەرە بواران) وەکو هەموو خێڵەساتی دژەبیاتی کۆچ و کۆچباریان تێکدەنا و بەرەو هەوارگەی جارانیان، کە دەشتی (قەراجێ) بووە، دەڕۆیشتن و لە دوو گۆمان و دەوروبەری گردەکان و دەو ماویان لەو دەشتە ڕەنگینەدا هۆبە و ڕەشماڵیان لێ هەڵدەدا، لەگەڵ بەیت و شیعری میللی و فۆلکلۆری دەڤەرەکەماندا ناوی گردی (تەپی خاری) و (حاجی تاژدین)ی هاتووە، فۆلکلۆر دەڵێت:

**ڕەشماڵە ڕەشی زراوە لە (تەپی خاری) هەردراوە**
**مار ماری (حاجی تاژدین)ی ڕەسوراغا مارت ئاوا**

٨٠١- گردی ڕەوەی: زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی دەشتی مرکیە و کەندیناوە و دەشتی شەمامکێ ئەوەی مەڕدار و شوانکارە بوایە (مالوەدەران)، واتە دەرەبواران بەرەو (دەشتی قەراج)ێ دەڕۆیشتن، هۆبە و ڕەشماڵیان لێ هەڵدەدا، جا لەو دەشتە پان و پۆڕرو لە بناری چیای قەرەچووغ و ئەو ناوەدا وڵاغەکانیان بەرەڵڵا دەکرد، لەو ناوە دەلەوەڕان بەرەوە ئەو وڵاغانە دەبینران، تەنانەت گەلییەک لە چیای قەرەچووغی هەیە (گەلی ئازیکەند)ی پێدەڵێن، لە بواراندا مەڕدار و شوانکارەکان ڕەوەیان تێدا بەرەڵڵا دەکرد، گەلییەکی عاسێیە، گردی ڕەوەی گردێکی گەوردیە، ڕەوە وڵاغەکانی مەڕداران، لە بناری ئەو گردە دەلەوەڕان و بەسەر ئەو گردە هەڵدەگەڕان و سەردەکەوتن و بە غاردان دەهاتنەوە خوارێ، جا خەڵکەکە ناویان لە گردەکە نا (گردی ڕەوەی)، هەر لەو شوێنە چەند



بنەماڵەیەکی مەڕدار لە عەشیرەتی سیان لێرە دامەزران و ئاوەدانیان کردەوە، لەو ساوە ئەو گوندە بە (گردی ڕەوەی) ناونرا و ناسرا.

٩٠١- گردی کۆزێ:

ناوی گردێکی گچکەیە، زۆر بڵند نییە، توورەگەڕێژە، لەناو ئاقاری گوندی (قەراتە سۆرانی مەرزان)دایە، لە ڕۆژهەڵاتی گوندەکە هەڵکەوتووە، لە نزیک چاکەکەوە (گۆڕستانی ئەسحابە)یە، دێتەوە یادم، کە منداڵ بووم تەمەنم (٥-٦) ساڵان دەبوو، ئەو کاتەی، کە ماڵ و مەڕو ماڵاتەکەمان ماوەیەک لە(دەشتی قەراجێ) بوو، لەگەڵ خوشکەکەم بەرخمان لێ لەوەڕاندییە، بەسەریدا هەڵگەڕاوین و دابەزیوین، گەمەمان لێ کردووە، هەنووکە دەڵێن: بۆتە قەبرستان، خەڵکەکە مردووەکانیان لەوێ دەشارنەوە.

٠١١- گردی گلێخە: ناوی گرد و گوندێکە کەوتۆتە (دەشتی قەراجێ)، سەر بەناحیەی باقرتەی قەزای مەخمووری پارێزگای هەولێرە، کاتی خۆی ئەو ناوە چۆڵ و هۆڵ بووە، تەنیا شوانکارە و مەڕداری دەشتی هەولێرێ، بواران دەچوونە ئەو دەشتە و ڕەشماڵیان لێ هەڵدەدا، ئەو ناوە هەموو دەبووە هۆبە ڕەشماڵ، تا ساڵی (١٩٣٧) ئەو شوێنە ئاوەدانی لێ نەبووە، گلێخە جۆرە گیایەکی خۆڕسکی بەهارییە، لە بەهاراندا دەردەکەوێت و شین دەبێت، ئاقاری ئەو گوندە ڕووەکی گلێخەی زۆرە، بۆیە گوندەکە و گردەکە بەو ناوە ناونراوە، ئەو ڕووەکە پەلکی وەکو کاردییە، سەلکی هەندی پیازەکی دەبێت، ئەو ناوە و دەوروبەرە ئاژەڵی سیخوڕی زۆرە، سیخوڕیش ئاژەڵێکی بچووکە لە شێوەی (ژووشک) دایە، هەندی عەلەشیشێک دەبێت، چوار پەلی هەیە، لەباتی پەڕ لەشی هەمووی بە دڕک داپۆشراوە، ڕەنگی پەڕەکان بەردکە، واتە ڕەش و سپییە، هەندی قەڵەمێک درێژ دەبێ، سەری سیخوڕ هەندی کەروێشکێکی کێوی دەبێت، ئەو ئاژەڵە زۆر حەز لە خواردنی سەلکی گلێخە دەکا، بە چڕنووکە درێژەکانی لەبن زەوی لە ڕەگ و ریشەوە دەری دێنێت و دەیخوات.